THE ROOM WHERE IT HAPPENED

- A WHITE HOUSE MEMOIR -

# ژووری ڕووداوەکان



## یادەوەرییەکان لە کۆشکی سپییەوە



جۆن بۆڵتن

ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا



دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

دەزگای فام بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دامەزراوەیەکە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب، لە 21/8/2019 دامەزراوە، هەوڵ دەدات بە شێوەیەک کتێب چاپ بکات، کە هەم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، هەم لە ڕووی هونەری و تەکنیکییەوە لە ئاستێکی بەرزدا بێت، هەروەها لە ڕووی نرخەوە، دۆخی خوێنەران لەبەرچاو دەگرێ و هەوڵ دەدات کتێب لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و منداڵان و.... چاپ و بڵاو بکاتەوە..

فام: ئاوەز، تێگەیشتن [هەنبانە بۆرینە، هەژار: ل516]، [فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی: ل664]. [فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ: ل313]

FAMpublication



دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
FAMpublication
بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری

**Orginal title**
**The Room Where It Happened**
**White House Memoir**
By: John Bolton
**Publisher:** Simon & Schuster (June 23, 2020)
**ISBN:** 978-1982148034



**چاپی یەکەم - ٢٠٢٠**

# ژووری ڕووداوەکان

یادەوەرییەکان لە کۆشکی سپییەوە

نووسینی

**جۆن بۆڵتۆن**

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

**دەستەیەک وەرگێڕ**

بابەت: **بیرەوەری (سیاسی)**
**پێوانە**
١٥*٢٣سم (٨٣٨) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٤٥٦)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێ دراوە.

# ژووری ڕووداوەکان

## یادەوەرییەکان لە کۆشکی سپییەوە


جۆن بۆڵتن

ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا


وەرگێڕانی

هاوکار عەبدوللا | سەنگەر حەسەن

بنار جەبار | یادگار ئیسماعیل

کاروان حەسەن

پێشکەشە بە:

گریێچین و جێنیفەر سارا

بۆردومانەکە سەختە، گەورەپیاوان؛ ڕێگە بدەن بزانین کێ زۆرترین بۆردومان دەکات؟!!

***شازادە ویلینگتۆن***

**کاتی کۆکردنەوەی سوپاکە ١٨١٥.**

# ناوەڕۆک

## لەبارەی وەرگێڕانی کتێبەکەی جۆن بۆڵتنەوە

لە پرسی کارکردنی بە گرووپ، گوتوومانە و دەیڵێینەوە کە:

**یەکەم:** لە کارکردنی بە گرووپدا شارەزایی هەمووان کۆ دەکرێتەوە و سوود لە ئەزموونی یەکتر وەردەگرین.

**دووەم:** ئەم گرووپکارییەی ئێمە دەیکەین، مانای ئەوە نییە هەر یەکە و هەندێکی لە کتێبەکە وەرگێڕاوە و ئێمەش پارچە و بەشەکانمان بەیەکەوە لکاندوون و تەواو، بەڵکو دوای تەواوکردنی کارەکان، ئەم کتێبە دوو جار پێداچوونەوەی بۆ کراوە، جارێك لە لایەنی زانیارییەکانەوە و جارێکیش لە لایەنی ڕێنووس و خاڵبەندی و زمانەوانی و یەکخستنی داڕشتنەکانەوە.

ئەوەی برایانی وەرگێڕم لەم کتێبەدا کردیان، هاوشێوەی ماراسۆنێکی دەستەجەمعی بوو، هاریکارییەکی تەواو، زانیاریی باش، وردی و خێراییش لە کارکردن.. بەدڵنیاییەوە خێراییەکەش لەسەر حیسابی کوالێتیی ناوەڕۆکی وەرگێڕانەکە و تەکنیککی کتێبەکە نەبووە، ئەم کارەی ئەوان زۆر جێی دەستخۆشییە، بەتایبەتیش ئەم کارەمان بۆیە کرد، بۆ ئەوەی چیتر بەو جۆرە نەبێ کە کتێب بە چەندین زمانی دیکە دەرچێ، ئینجا دوای هەمووان بگاتە ئێمەی کوردزمان، کە دەشگات زۆر جار بەداخەوە بە کوردییەکی ناڕێك، بەڵکو بەڵێنمان دا کە دەبێ ئێمەش لەگەڵ گەلانی دی دەست پێ بکەین و هاوشانی وەرگێڕان بۆ زمانانی دیکەی جیهان، لای ئێمەش کتێبەکە زوو بە زوو هەبێ، هەڵبەت پێش زۆرێك لە زمانەکانی جیهانیش کەوتین. ئەمەمان کرد و سەرکەوتووش بووین.

هەر بەهۆی دەوڵەمەندیی زانیاریی ئەم برایانە و شارەزاییان لە کارەکە،

تەنیا ئەوە نەبووە کتێبەکە وەرگێڕن و تەواو، بەڵکو کتێبەکە لە هەر شوێنێك پێویست بووبێ، پەراوێز و ڕوونکردنەوەی زۆری بۆ دانراوە و خوێنەری کورد لە بەرامبەر ناوی شوێن و ڕووداو و کەسایەتییەکان دانامێنێ، بەڵکو هەموو ئەوەی پێویستە، بۆی ڕوون کراوەتەوە، سەبارەت بە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی کتێبەکەش، کە بۆڵتن خۆی بەکاری هێناون، تەنیا لینك و سەرچاوەکانی هەواڵ بوون و ئەوانیش نزیکەی پەنجا لاپەڕەیان داگیر دەکرد، لە هەمان کاتدا هیچ خزمەتێکیشیان بە دەقی کوردیی کتێبەکە نەدەکرد، خۆ ئەو خوێنەرەی بیەوێ بگەڕێتەوە سەر سەرچاوە ئەسڵییەکان، دەبێ خوێنەری ئینگلیزی بێت و لەم حاڵەتەشدا دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر ئەسڵی کتێبەکە، بۆیە ئێمە دانانی ئەو سەرچاوانەمان بە پێویست نەزانی و ئەگەر شتێکی گرنگیش هەبێ وەرمانگێڕاوە.

لەبارەی ناونیشانی کتێبەکەوە، خۆی ناونیشانی کتێبەکە ئەگەر بکرێتە کوردی شتێکی لەم جۆرەیە: "ئەو ژوورەی کە ئەمانەی تێدا ڕوویدا"، بەڵام بێگومان ئەم جۆرە ناونیشانە بۆ کوردی نابێت و ئێمە وەرگێڕانی وشە بە وشە ناکەین، گرنگیی زۆریشمان بە وەرگێڕانەکە داوە و تا پێمان بکرێ زمانی وەرگێڕانەکە ڕوون و پاراوە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە زمانی نووسینی جۆن بۆڵتۆن، هەر بۆ خۆی زمانێکی چڕ و پڕ و پڕ تەوس و خوازەی ئەدەبییە و لە ڕووی زمانەوە کەسێکی زۆر شارەزایە، وەرگێڕانی ئەم جۆرە نووسینە و کورداندنی بە زمانێکی پاراو، کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام بە هیممەتی ئەم برایانە، ئەمە بۆ ئێمە هاتە دی.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو خوێنەرانەی ناشزانن، دیارە ئەو ژوورەی بۆڵتن باسی دەکات، نووسینگە فەرمییە هێلکەییەکەی سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە (ئۆڤاڵ)، ئەم نووسینگەیە لە ساڵی ١٩٠٩ دروست کراوە. دەکەوێتە بەشێکی ئاڵۆز لە ڕۆژئاوای کۆشکی سپی، کە

شوێنی دانیشتنی سەرۆک کۆماری ئەمریکایە. ژوورەکە لە سێ پەنجەرەی گەورە پێکهاتووە و پەنجەرەکان دەکەونە پشت مێزی سەرۆک کۆمار، ژوورەکە چوار دەرگای هەیە: دەرگای یەکەم: بەرەوڕووی باخچەی گوڵەکانە. دەرگای دووەم: بۆ بەشی خوێندنەوەی تایبەتی و بەشی نانخواردنی سەرۆکە. دەرگای سێیەم بۆ ڕێڕەوی باڵی سەرەکیی کۆشکی سپییە. دەرگای چوارەمیش: بەرەو ژووری سکرتێری سەرۆک کۆمار دەڕوات.

❊❊❊

ئەم کتێبەی بۆڵتن بەر لەوەی بڵاوبێتەوە دەنگدانەوەیەکی زۆری لەسەر ئاستی جیهانیدا هەبوو، تەنانەت کۆشکی سپیی ئەمەریکا زۆر هەوڵی دا ڕێ لە بڵاوبوونەوەی بگرێ، بەڵام دادگای باڵای ئەمەریکا پشتگیری لە بڵاوکردنەوەکەی کتێبەکە کرد، لەگەڵ بڵاوبوونەوەشی کاریگەرییەکەی زۆرتر بوو، ئەوە بوو یەکەم کەس دۆناڵد ترەمپی سەرۆکی ئەمەریکا، داوای زیندانیکردن و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی بۆڵتنی کرد.

بێگومان دوای خوێندنەوەی تەواوی کتێبەکە، خوێنەر لەوە تێدەگات کە ئەم کتێبە بۆچی ئەم دەنگدانەوە و کاریگەرییەی هەبووە و دەنگدانەوەکەشی لە ئاستی ناوەڕۆکی کتێبەکەدایە.

سەنگەر زراری
بەڕێوەبەری دەزگای فام

## بەشی یەکەم

## ڕێگەیەکی درێژ بەرەو نووسینگەی وێست وینگ کۆڕنەر

یەکێك لە خاڵە سەرنجڕاکێشەکان لەوەی کە ڕاوێژکاریی ئاسایشی نەتەوەیی بیت، ئەوەیە کە کارەکە هەمەجۆرە، ئەمە جگە لەو هەموو ئاڵنگارییەش کە ڕووبەڕووت دەبنەوە. ئەگەر تۆ حەز بە پەشۆکی و گومان و مەترسی ناکەیت، ئەگەر بەرگەی ئەو هەموو زانیارییە نوێیە ناگریت، هەروەها بڕیارگەلێك کە دەبێ بیاندەیت و ماوەیەکی زۆری کارکردن، هەروەها هەموو ئەو چالاکیانەی لەلایەن کەسانی ناوخۆ و نێودەوڵەتییەوە تووشت دەبن و دەبێ ئەنجامیان بدەی، ئەمە جگە لەو دژیەکییەی خود کە لە ناختدایە! ئەگەر هەموو ئەوانەت پێ ناکرێت، ئەوا باشتر وایە کارێکی تر بکەیت. ئەمە ئەگەرچی جێگای دڵخۆشییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەمە بتوانیت بۆ ئەوانی تری ڕوون بکەیتەوە، کە چۆن پارچەیەك بە یەکسانی لەگەڵ ئەوانی تر دابەش دەکەی، کە زۆر جاران ئەمە بە متمانەوە لەلایەن هەمووانەوە ناکرێت.

من ناتوانم بیردۆزێکی تەواو لەبارەی ئیدارەکەی ترەمپ بەدەستەوە بدەم، چونکە هیچ شتێك بۆ ئەمە شیاو نییە، بەڵام هەرچۆنێك بێت تێڕوانینی واشنتۆن بەرامبەر ڕێڕەوی ترەمپ هەڵەیە، ئەمەش حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگر و سەرنجڕاکێشە بۆ تەمەڵیی فیکری[1]. چونکە ترەمپ

(١) تەمەڵیی فیکری: نەبوونی هیچ ئامادەگییەك بۆ چارەسەرکردن، کێشە یان باس و پرسێك و لە هەمان کاتیشدا هەبوونی جۆرێك لە فزووڵ بۆ بەدواداچوون و پرسین.

هەمیشە سەیروسەمەرە بووە. بەڵام لە پازدە مانگی یەكەمدا، كە زۆر دڵنیا نەبوو لە شوێنە نوێیەكەیدا و لەلایەن "دەستەی گەوران"[(١)] خرایە ژێر تاقیكردنەوە و ئەو تیایدا نیگەران دەركەوت.

هەر چۆنێك بێت، لەگەڵ تێپەڕینی كات، ترەمپ باوەڕبەخۆبوونی زیاتر بوو، ئەوە بوو "دەستەی گەوران" نەما و شتەكان بەرەو نەمان چوون، چونكە ئەو بە كەسانێك دەور نەدرابوو، كە هەر شتێك بڵێت، ئەوانیش بڵێن "بەڵێ". هەندێك لەم گریمانانە ڕاستن، بەڵام وێنە گشتییەكە زۆر سادەیە، دەستەی گەوران لە زۆر لایەندا بوونە هۆی كێشەی بەردەوام، ئەمەش لەبەر ئەوەنا كە هەر خۆی بە عەقڵی زلزان دەزانی (ئەم وەسفەم لە فەرەنسییەكانەوە وەرگرتووە، بەوانە دەگوترێت كە خۆیان بە سەرمەشقی بیركردنەوەمان دەزانن)، بەڵكو لەبەرئەوەی كە زۆر بە وردی پێچەوانەكەیان كرد. ئەوان تەواوی جێبەجێكردنی فرمانەكەیان نەكرد، بەڵكو ئەوەی كردیان بەڕوونی خۆ-خزمەتكردن و بەڕاشكاویی ڕەتكردنەوەی ژمارەیەكی زۆری ئامانجەكانی ترەمپ بوون (ئینجا بەهادار بن یاخود بێبەها)، بەڕادەیەك بوونە هۆی تەمێكردنی مێشكە گوماناوییەكەی ترەمپ. بە جۆرێك كە كارەكە زۆر قورستر دەكات بۆ ئەوانەی لە دوای ئەوەوە دێن بۆ ئاڵوگۆڕیی سیاسیی سەرۆكایەتی. من زۆر دەمێكە لەوە گەیشتووم كە ڕۆڵی ڕاوێژكاری ئاسایشی نەتەوەیی بریتییە لە دڵنیابوونەوە لەوەی كە سەرۆك چەندە ئەگەری لەبەردەستە بۆ دەركردنی بڕیار و فرمانێك كە پێویستی بێت، هەروەها دڵنیابوونەوە لە جێبەجێكردنی ئەم فرمانەش لەلایەن بیرۆكراتە هاوپەیوەندیدارەكانەوە. دەبوو كە كاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی جیاواز بێت بەوەی كە سەرۆكگەلێكی

(١) كۆمەڵێك لە ڕاوێژكارانی ئاسایشی نەتەوەیی گرووپێك پێك دەهێنن بۆ ئەوەی سەرۆك بهێننە سەر ئەو باوەڕەی كە ئەمریكا ڕابەرایەتیی جیهان دەكات.

جیاوازی هەیە، بەڵام ئەمانە بابەتگەلێکی ڕەخنەیی بوون کە دەبوو کارەکە وەدەستی خستبا. چونکە هەرچۆنێك بێت دەستەی گەوران بەشێوەیەکی زۆر خراپ خزمەتی ترەمپی کردووە، ئەوەبوو دووبارە پێشبینی پاڵنەرەکانی خەڵکی کرد و توانی ئەو پیلانانە ببینێت کە لە پشت تاشەبەردەکانەوە خۆیان مەڵاس داوە، بە ورییش مایەوە لەمەڕ ئەوەی کە چۆن ئیدارەی کۆشکی سپی دەکرێت و ئەم حکوومەتە فیدراڵییە گەورەیەی بە تەنیا هێشتەوە. دەستەی گەوران بەشێوەیەکی تەواو لەم عەقڵییەتە بەرپرسیار نییە. چونکە ترەمپ ترەمپە؛ من هاتمە سەرئەوەی ئەو باوەڕی وابوو، کە دەتوانێت دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بەڕێوە ببات و پلانی ئاسایشی نەتەوەیی لەسەر نەژاد دابنێت و دەکرێ پشتی پێ ببەسترێت بۆ پەیوەندییە کەسێتییەکان لەگەڵ سەرکردە بیانییەکاندا، هەروەها تەواو توانای سەرنجڕاکێشانی هەیە هەر کاتێك کە لەسەر تەلەفزیۆنەکە دەربکەوێت. ئەگەرچی لە ئێستادا، ئەم غەریزانە و پەیوەندییە کەسێتییەکان و بەهرەکانیش خاسیەتی هەر سەرۆکێکن. بەڵام ئەمانە هەموو نین، بەڵکو لیستەکە درێژتر دەبێتەوە: شرۆڤەکردنەکان، پلاندانان، دیسپلینی زەینی، سەختی، هەڵسانگاندنەکان و ڕاستکردنەوەکان. هەروەها ئەوانەش کە هاوشێوەی ئەوانەن لە نەهێشتن و بەرزکردنەوەی بڕیارەکانی سەرۆکایەتی، کە لایەنە دڵڕفێنەکەی کارەکە نییە. دەرکەوتن و بە مانا دامەزراوەییەکەی هەر تەنها بەرەو دوور دەتبات، کەوابوو، ناکرێت نکۆڵی لەوە بکرێت کە گواستنەوەی ترەمپ و زیادکردنی ساڵێکی تر بۆی کارێکی خراپ و نارێك بوو.

ئەم پرۆسانەی کە دەبوو یەکسەر بەشێوەیەکی غەریزەیی جێبەجێ کرابوونایە، بەتایبەت بۆ زۆرێك لە ڕاوێژکارەکانی ترەمپ کە هیچ ئەزموونێکی لەپێشینەیان نییە، تەنانەت لە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش. ترەمپ و زۆرێك لە تیمەکەی هەرگیز "ڕێبەریی کارکردن"ی حکوومەتیان

نەخوێندووەتەوە. ڕەنگە درکنەکردن بەمە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی نایانکات بە حکوومەتی شاراوە"[1]. من چوومە نێو ئەم فەوزایە و سەیرم کرد بزانم چەندی بۆم دەکرێت ئەگەر لەوەو پێش چارە نەکرابێت، لە ماوەی سەد ڕۆژی یەکەمم بتوانم چارەی بکەم، ئەمە ڕوون بوو کە نە جێگۆڕکێی بەردەوامی فەرمانبەران ڕێگەی دا ئەم کارە بکەم و نە ڕوانگەکەی هۆبز "شەڕی هەمووان لە دژی هەمووان"[2]ی نێو کۆشکی سپیش.

لەوانەیە وەسفەکەی هۆبز بۆ مرۆڤایەتی بەوەی کە: گۆشەگیر، داماو، قێزەون، دڕندە و کورت"ـە تۆزێك زۆر بێت. بەڵام دەکرێت بڵێین ئەمە بۆ کۆشکی سپی زۆر ڕاستە. کەچی لەگەڵ کۆتایی هاتنی کاتی کارەکانیان، زۆرێك لە ڕاوێژکارەکان مەیلی ئەمەیان دەکرد. هەروەك من لە کتێبەکەمدا "خۆبەدەستەوەدان بژاردە نییە". ڕێگەی من لە کردنی کارەکانم لەنێو حکوومەتدا هەمیشە ئەوەبوو، کە زیاترینی وەرگرم لەبارەی ئەو بیرۆکراتییەتەی کە کارم تێیدا کردووە (دەوڵەت، دادپەروەری و هەروەها ئاژانسی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی)، بۆئەوەی بە ئاسانییەکی گەورە ئامانجەکانم بەدەست بهێنم. ئامانجی من دەستخستنی کارتی ئەندامێتی نەبوو، بەڵکو دەستکەوتنی مۆڵەتی شۆفێری بوو، کە دەڵێم مۆڵەتی شۆفێری، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر باو نەبوو لە نێو کۆشکە سپییەکەی ترەمپ. لە سەرەتای سەردانەکانم بۆ نووسینگەی وێست وینگ، جیاوازییەکان لەنێوان ئەم سەرۆکایەتییە و ئەوەی پێشوو کە

---

(١) Deep state باوەڕ وایە لەنێو حکوومەتی ئەمەریکی، دەسەڵاتێکی تری شاراوە و بەهێز هەیە کە بەرپرسە لە هەڵسووڕانی کاروبارەکان.

(٢) bellum omnium contra omnes: واتە (شەڕی هەمووان دژی هەمووان)، دەربڕینەکە لاتینییە و تۆماس هۆبز لە وەسفی وجوودیەتی مرۆڤ بەکاری دەبات لە ئەزموونکردنی سروشتدا، لێرەدا نووسەر بە هەردوو شێوەی لاتینی و ئینگلیزی هێناویەتییەوە.

تیایدا خزمەتم کردبوو، سەرنجڕاکێش بوو. ئەوەی لە یەکەم ڕۆژدا سەبارەت بە دۆزێکی تایبەت ڕووی دەدا، تاڕاددەیەکی زۆر هەمان ئەو شتە بوو کە لە دووەم ڕۆژ یان لە ڕۆژی دواتریش ڕووی دەدا. هەر تەنها کەمێك لەو کەسانەی لەوێ بوون، هەستیان بەو شتە دەکرد، یانیش گرنگییان پێ دەدا، یاخود بەرژەوەندییەکیان هەبوو لە چاککردنەوەی. هەروەها کارەکانیش بەرەو باشی نەدەچوون و ئەمەش ئەنجامێکی دڵخۆشکەر نەبوو، بەڵام چارە نەبوو. من ئەو کاتەی چوومە ناو ئیدارەکە و دەستبەکار بووم، گەیشتمە ئەم حەقیقەتە.

***

سیناتۆری پێشووی ویلایەتی نیڤادا، پۆول لاکسالت کە ئامۆژگاریکاری من بوو، دەیگوت: "لە سیاسەتدا پاکی و بێگەردی نییە". ئەم ڕوونکردنەوە گرنگە تەواوی ئەو دامەزراندنانە ڕوون دەکاتەوە کە لە دەسەڵاتی جێبەجێکردندا بوون. سەرەڕای بوونی گوشارێکی زۆری ڕاگەیاندنی وەکو: "من زۆر سەرسام بووم کاتێك سەرۆك سمیث پەیوەندی پێوەکردم ..."، ئەم جۆرە دەربڕینانە هەر تەنها لە ڕووکاردا پەیوەندییان بە حەقیقەتەوە هەیە و هیچ جۆرە کێبڕکێیەك لە ئارادا نەبوو بۆ وەرگرتنی شوێنە گرنگ و هەستیار و پلەبەرزەکان لە ماوەی "گواستنەوەی پۆستی سەرۆکایەتی"، ئەمەش داهێنانێکی ئەمریکییە کە لەم دەیەیەی دواییدا زۆر درێژدادڕی تێکەوت. تیمەکانی گواستنەوەی دەسەڵات توێژینەوەی باشیان پێشکەش بە کۆلێژەکانی بەڕێوەبردنی کار کردووە لەبارەی ئەوەی چۆن بەکاری بازرگانی هەڵنەستی. ئەمەش لە بۆ کاتێکی جێگیر و کاتییە (لەکاتی هەڵبژاردنەوە هەتا کاتی دانان) و پاشانیش بۆ هەتا هەتا دیار نامێنێت. ئەمانە نوقمی زریانێکی زانیاری وەدەستهاتوو بووینە (هەروەها زانیاری نادروستیش)؛ شرۆڤەکردنی ئاڵۆز، زۆرجاریش کێبڕکێ و لێکدانەوەی ستراتیژی و سیاسی، هەروەها بڕیارگەلێکی زۆر لەسەر ئاستی تاك و میدیا و بەرژەوەندیی گرووپەکان و ئەم هەموو گوشارەش.

نکۆڵی لەوە ناکرێت کە هەندێك گواستنەوە و گۆڕان لەوانی تر باشترن،

بەڵام چۆن هەموو ئەم شتانە لەبارەی ئیدارەی داهاتووەوە ئاشکرا دەکرێن. ماوەی گواستنەوەی دەسەڵاتەکان لە سەردەمی ڕیچارد نیکسۆن ١٩٦٨-١٩٦٩ یەکەم نموونەی پێشکەوتوو بوو، لەگەڵ بوونی شرۆڤەیەکی ورد بۆ هەموو ئاژانسەکان کە پەیوەندیدار بوون بە دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە؛ لەم ڕووەوەش ڕۆناڵد ڕیگان ١٩٨٠-١٩٨١ کەسێکی دیاربوو لە دەستگرتن بە بابەتی "کارمەندەکان بریتین لە سیاسەت" و بە گرنگییەوە تەرکیزی دەخستە سەر ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی بەرنامەکەی ئەویان دەکرد. هەروەها ماوەی گواستنەوەی ترەمپ ٢٠١٦-٢٠١٧ گواستنەوەکە... دۆناڵد ترەمپ بوو.

من شەوی هەڵبژاردنەکان ٩-٨ی تشرینی دووەمم لە ستۆدیۆکانی فۆکس نیوز لە مانهاتن بەسەر برد، لە چاوەڕوانیی لێدوانێك سەبارەت بە ئەولەویەتی سیاسەتی دەرەوەی "سەرۆکی داهاتوو"، کە هەموو وایان دانابوو کاتژمێر ١٠ی شەو ئەم لێدوانە بدرێت، واتە کاتژمێرێك دوای ڕاگەیاندنی بردنەوەی هیلاری کلینتۆن. دواجار بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر لێدوانەکەم پەخش کرا. شتانێکی زۆر وەکو پلان دانرابوو، نەك هەر تەنها لە فۆکس نیوز، بەڵکو لەنێو چادرگەی سەرۆکی-هەڵبژێردراویش.

تەنها کەمینەیەك باوەڕیان وابوو کە ترەمپ سەرکەوتوو دەبێت، ڕێك وەك هەڵمەتی هەڵبژاردنە فاشیلەکەی ڕۆبەرت دۆل لە دژی بیل کلینتۆن، هەڵمەتە پێشوەختەکەی ترەمپ بۆ هەڵبژاردنەکان سادە بوو، کە دەرخەری ئەوەبوو سەرناکەوێت. بە بەراورد بە هیلاری کلینتۆن، کە بە سوپایەکی گەورە دەچوو لە چوونە نێو دەسەڵات، ترەمپ بەتێپەڕبوونی کات دەستی کرد بە کۆمەڵێك مامەڵەی قورس. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکەوتنە چاوەڕواننەکراوەکەی، وایکرد خەبەری بێتەوە و هەر بەزوویی کەوتە جەنگ لەگەڵ خۆبەخشەکانی و هەموو بەرهەمیی بەر لە هەڵبژاردنەکانی

داخست. دەستپێکردنەوەی سەرلەنوێ لە ٩ی تشرینی دووەمدا باش و سەرکەوتوو بوو، بەتایبەت لەگەڵ زۆرێك لە فەرمانبەرانی گواستراوە لە واشنتۆن، هەروەها لەگەڵ نزیکترینی یارمەتیدەرەکانی لە نێو تاوەری ترەمپ[1] دا. ترەمپ زۆر لەوە نەدەگەیشت کە ئەم عیملاقە کۆمارییە بەر لە هەڵبژاردنی کردی، هەروەها شتانێکی زۆریشی دەست نەکەوت لە هۆشیاری لە ماوەی گواستنەوەدا، کە ئەمەش هیچ سەرەداوێکی چاك نەبوو بۆ ئەدای کورسییەکەی.

من دەورێکی گرنگم هەبوو لە کەمپینەکەی ترەمپ بۆ هەڵبژاردنەکان، تەنها جارێك نەبێت ئەویش لە بەیانیی ڕۆژی هەینی ٢٣ی ئەیلوول بوو، لە تاوەری ترەمپ، بەر لە سێ ڕۆژ لە دیبەیتی یەکەمی لەگەڵ هیلاری. هیلاری و بیل سالێك لە پێش من بوون لە کۆلێژی یاسای زانکۆی یێل، بۆیە جگە لە مەسەلەی ئاسایشی نیشتمانی، من بیرۆکەکانی خۆمم بە ترەمپ گوت سەبارەت بە ئەدای هیلاری، کە بریتیبوون لە: خۆئامادەکردنێکی باش و نووسراو، هەمان ڕەفتاری ئەو بەکارببە.

هیلاری چل ساڵە هیچ گۆڕانکاری بەسەر نەهاتووە. ترەمپ زۆریی قسەکانی کرد، هەروەك لە یەکەم بینین و بەیەك گەیشتنماندا لە ساڵی ٢٠١٤، بەر لە کاندیدکردنی. هەروەك بەم جۆرە کۆتاییمان پێ هێنا و ئەو گوتی: "بیروبۆچوونەکانی ئێوە و ڕوانگەکانی من زۆر لە واقیع نزیکە، زۆر زۆر". لەم قۆناغەدا، من بەشێوەیەکی فراوان بەشداریم تێداکرد: کەسی یەکەم لە ئینستیوتی (ئەمێرکان ئینترپرایز)، هاوبەشکار لە فۆکس نیوز، پارێزەر لە کۆمپانیای گەورەی پارێزەرەکان، ئەندامی بۆردی هاریکاری کۆمپانیاکان، ڕاوێژکاریی یەکەم لە کۆمپانیای تایبەتی پشکەکان و

(١) یەکێك لە تاوەرە گەورەکانە، خاوەنداریەتییەکەی هی دۆناڵد ترەمپە و لە ٥٨ نهۆم پێك دێت، دەکەوێتە مانهاتن لە نیویۆرك.

نووسەری وتاری ڕاوبۆچوون لە هەموو هەفتەیەکدا. جگە لەوەش لە کۆتاییەکانی ساڵی ۲۰۱۳دا، هەڵسام بە دروستکردنی (لیژنەی کاری سیاسی) و (لیژنەی کاری سیاسی باڵا) بۆ هاریکاریکردنی کاندیدانی ئەنجوومەنی پیران، ئەوانەی کە باوەڕیان بە بەهێزی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا هەیە، هەروەها دابەشکردنی سەدان هەزار دۆلار ڕاستەوخۆ بەسەر کاندیدان و بەخشینی ملیۆنەها دۆلار لە خەرجیی سەربەخۆ لە کەمپینی ۲۰۱٤ و ۲۰۱٦ و هەروەها خۆئامادەکردن بۆ هەمان شت لە ۲۰۱۸دا. شتانێکی زۆر هەبوو دەبوو ئەنجامم دابان، بەڵام من لە هەر سێ ئیدارەی ئەم دواییەی کۆمارییەکان خزمەتم کردبوو، جگە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش هەر لە ڕۆژانی کۆلێژم لەزانکۆی یێل. من لە ئامادەباشی دابووم بۆ ئەوەی جارێکی تر بڕۆم، بەڵام هەڕەشەکان و هەلی نوێش لەپڕ بۆمان هاتن و هەشت ساڵەی ئۆباماش مانای ئەوەبوو کە شتانێکی زۆر هەن دەبێ چاك بکرێنەوە. زۆر بە درێژی و بەرژدی بیرم لە ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا کردەوە لەنێو ئەم گەردەلوولەی جیهاندا: ڕووسیا و چین لەسەر ئاستی ستراتیژی، ئێران و کۆریای باکوور و ئەوانی تر کە خوازیاری وەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمین، هەڕەشەکانی ئیسلامی ڕادیکاڵ، تیرۆر لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا (سوریا، لوبنان، عێراق و یەمەن) و ئەفغانستان و ئەوانی تر؛ هەروەها هەڕەشەکانی نیوەگۆی زەوی تایبەت بە ئێمە، لە وڵاتانی کوبا، ڤەنزوێلا، نیکاراگوای. ئەمە لەکاتێکدا ناونانی سیاسەتی دەرەکی سوودێکی ئەوتۆی نییە مەگەر بۆ تەمەڵیی فیکری نەبێت، ئەگەر پرسیارم لێ بکەن، ئەوا من دەڵێم کە سیاسەتی من "پشتگیری ئەمریکا" بوو. من پەیڕەوکاری ئادەم سمیث بووم لە مەسەلە ئابوورییەکان و شوێنکەوتەی ئێدموند بورك بووم لە کۆمەڵگا و پاڵپشتی پرسی کۆمارییەکان بووم لە حکوومەتدا و هەروەها سەبارەت بە ئاسایشی نەتەوەیی بیرۆکەکانم تێکەڵەیەك بوون لەنێوان دین ئاچیسون و جۆن فۆستر

دالاس. یەکەم کەمپینیشم لە ساڵی ١٩٦٤ بوو لەلایەن باری گۆڵدوۆترەوە. من گەورە بەرپرسانی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی ترەمپم دەناسین، وەکو ستیف بانون، دەیڤ بووسی، کیلیان کونوەی لە کۆمەڵەکانی پێشوو و هەروەها لەبارەی پەیوەندیکردنیان بە ئیدارەی ترەمپەوە قسەم لەگەڵ کردن، ئەوکاتەی کە قۆناغی ڕاگواستنی دەسەلات دەستی پێ کرد، کاتێك کریس والاس لە کۆمەڵە کەناڵەکانی فۆکس هاتەدەرەوە لە کاتێکی زوویی ڕۆژی ٩ی مانگی تشرینی دووەم، پاش ئەوەی بانگهێشت کرابوو، تۆقەی لەگەڵ کردم و بەزەردەخەنەوە گوتی :"پیرۆزە، جەنابی سکرتێر".

بێگومان، ئەم پێشبڕکییەی هەبوو کەم نەبوو بۆ پۆستی وەزارەتی دەرەوە، کە ئەمەش قەبلاندن و دەنگۆیەکی زۆریی میدیایی دروست کرد لەوەی ئاخۆ کێ "کاندیدی یەکەم" دەبێت و ئەمەش لە نیوت جینگریشەوە دەستی پێ کرد و بەرەو ڕودی جولیانی و پاشان میت ڕومنی و دواتر گەڕایەوە سەر ڕودی. من لەگەڵ هەموویاندا کارم کردووە و هەموویان جێگای ڕێزن و هەمووشیان جێگای متمانەن بەشێوە تایبەتەکەی خۆیان. من بوومە جێگای سەرنج چونکە هێشتاش مشتومڕێکی زۆر هەبوو (ئەوە باسی گوشارەکان هەر مەکە) کە دەبێت من ڕازی بم بەوەی ببم بە جێگری سکرتێر، ئەوە ڕوون بوو کە ئەمە لە بژاردەی من نەبوو، ئینجا ئەوەی لە دوایی هات بڕیاری ترەمپی ئاشکرا کرد و هەروەها بوو (وەیان دەبوو ببێت) بە پەندێك بۆ وریاکردنەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە هەموو ئەو بەرپرسانەی لە پێشوودا لەکێبڕکێدا بوون، بەشێوەیەکی فراوان خودان چاکسازییەکی فەلسەفیانە بوون و پاشخانی جیاوازیان هەبوو، لەگەڵ بوونی ڕوانگەی جیاواز و شێوازی جیاواز و خاڵی ئەرێنی و نەرێنی جیاوازیان هەبوو. لەنێو ئەم ئەگەرانەشدا (هەروەها ئەوانی تری وەکو سیناتۆری ویلایەتی تینیسی بۆب کۆرکیر و حاکمی پێشووی ویلایەتی یوتا، جۆن هانتسمان)، ئایا هیچ سیفەتێکی بەردەوام و ورد هەبوو کە

ترەمپ هەوڵی بۆ دابێت؟ ئاشکرایە نەخێر! هەروەها دەبوو چاودێران بپرسن کە: ئایا ئەو بنەما ڕاستەقینەیە چییە کە ترەمپ لە هەڵبژاردنی بەرپرسان پەیڕەوی دەکات؟ ئایا بۆچی جولیانی لە پۆستی وەزیری داد نییە؟ کە ئەمە کارێکە وەك ئەوەی بۆ ئەمە دروست کراوە. ئەی چی لەبارەی ڕۆمنی وەکو سەرۆك ئەرکان لە کۆشکی سپی، کە لە ڕووی بەڕێوەبردن و ستراتیژییەت نکۆڵی لێ ناکرێت؟ هەروەها جینگریش، دەیان ساڵە خەریکی دانانی بیردۆزگەلێکی گرنگە، وەکو قەیسەری سیاسەتی نێوخۆی کۆشکی سپی دەردەکەوێت؟ ئایا ترەمپ تەنها بەدوای ئەم کەسانەدا دەگەڕا کە "ڕۆڵی سەرەکی" دەگێڕن؟ زۆرێك لە کارە ناپەسەندەکانی ئەو لەسەر حیسابی سمێڵی من کراون. بەڵام ئەمە سوودی چی هەیە، پێی گوتم کە باوکیشم سمێڵێکی لەم جۆرەی هەبوو. وەك ئەوانەی کە زیاد لە سنوور سەرسامن بە زیگمۆند فرۆید، ئەمەش شتێکە بێگومان من وانیم و لاشم وانییە کە ڕووخسارم شتێك بووبێت کە دەورێکی گرنگی هەبووبێت لە بیرکردنەوەی ترەمپ. ئەگەر واش بێت، ئەوا خودا یارمەتی ئەم وڵاتە بدات. لەگەڵ ئەوەشدا، ژنانی سەرنجڕاکێش کاتێك کارەکە پەیوەندی بە ترەمپەوە هەیە دەکەونە ژێر چەندین کاریگەری. دڵسۆزی، هۆکاری سەرەکی بوو، کە سەلماندی جولیانی سنووری پشت-سەرکێشی تێپەڕاندووە لەو ڕۆژانەی کە ڤیدیۆی گەیشتنی بە هۆلیودی بڵاوکرایەوە لە سەرەتاکانی مانگی تشرینی یەکەم. لیندۆن جۆنسۆن جارێکیان وتی: "من دڵسۆزیی ڕاستەقینەم دەوێت، دەمەوێت قاچەکانم ماچ بکات لەبەردەم پەنجەرەکەی مەیسی و لە کاتی نیوەڕۆ و پێم بڵێ کە بۆنی وەك بۆنی گوڵ وایە". کێ دەیزانی کە ترەمپ زۆر مێژووی خوێندووەتەوە؟ جولیانی لەدوای ئەوە زۆر بەڕێز بوو لەگەڵ مندا، دوای ئەوەی لە شەڕێکی دەستەویەخە لەپۆستی وەزیری دەرەوە کشایەوە "ڕەنگە جۆن هەڵبژێرم، پێم وایە کە جۆن تەواوە".

سەرۆکی هەڵبژێردراو لە ١٧ی تشیرینی دووەم پەیوەندی پێوەکردم و منیش پیرۆزبایيم لێ کرد لەوەی کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. ئەو

باسی ئەو پەیوەندییانەی کرد کە تازە ئەنجامی دابوون لەگەڵ هەریەك لە ڤلادیمێر پوتین و شی جینگ بین. هەروەها چاوەڕێی کۆبوونەوەی دوای نیوەڕۆی دەکرد لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی ژاپۆنی شینزو ئابێ. ترەمپ پەیمانی دا و گوتی: "چەند ڕۆژێکی تر تۆ دەهێنینە ئێرەو ئێمە بۆ کۆمەڵێك پرس ئومێدمان بە تۆیە". دیاریکردنی هەندێك لە بەرپرسەکان لەلایەن سەرۆکی نوێ کەوتە ڕۆژی دواتر، کە تیایدا جێف سیشنز وەکو وەزیری داد (ئەم بژاردەیەی بۆ جولیانی لابرد) هەروەها مایك فلین وەکو ڕاوێژکاریی ئاسایشی نەتەوەیی (چاکەی کەمپینە دڵڕەقانەکەی فلینی دایەوە) و مایك پۆمپیۆ وەکو بەڕێوەبەری سی ئای ئەی دیاری کرد. (دوای چەند هەفتەیەکی کەم لە دیاریکردنی فلین، هێنری کیسنجەر پێی گوتم: "لە ماوەی ساڵێکدا بەجێی دێڵێت"، ئەگەرچی ئەو نەیدەزانی کە چی ڕوودەدات، بەڵام کیسنجەر دەیزانی کە فلین لە شوێنێکی نەشیاو و هەڵە دانراوە).

ڕۆژان تێپەڕین و پۆستێکی زۆری وەزاری و ڕاوێژکاریی بە بەتاڵی لە کۆشکی سپی مانەوە، لەنێوشیاندا، لە ٢٣ی تشرینی دووەمدا، حاکمی ویلایەتی کارۆلینای باشوور نیککی هالێی وەکو باڵیۆز لە نەتەوە یەکگرتووەکان دیاری کرا و هەروەها بە پلەی ئەندامی ئەنجوومەنی وەزیران. ئەمەش هەنگاوێکی نامۆ بوو لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا وەزیری دەرەوە دیاری نەکرابوو. هالی شیاو نەبوو بۆ ئەم پۆستە، بەڵام نموونەی ئەوانە بوو کە تمووحاتی سەرکردەیی تێدا هەبێت و بیەوێت کاری "سیاسەتی دەرەوە" بخاتە نێو سی ڤییەکەی. ئیتر تۆ بە پلەی ئەندامی ئەنجوومەنی وەزیران بیت یان نا، خۆ باڵیۆزی نەتەوە یەکگرتووەکان بەشێکە لە دەوڵەت و هەروەها سیاسەتی ئەمریکا وایە کە نابێت لە یەك وەزیری دەرەوە زیاتر هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە ترەمپ بوو کە پۆستەکانی تری هەڵدەبژارد لەنێو دەوڵەتدا بەبێ ئەوەی ڕاوێژکاریی لەبەرچاو بگرێت. بەم جۆرە کۆمەڵێك کێشە دروست بوو، بەتایبەت

ئەوکاتەی کە لە یەکێك لە ستافەکەی هالی-یەوە زانیم کە ترەمپ وەکو سکرتێر داینەوە. ئەو کارمەندەی ستافیی هالی پێی گوتم کە داواکەی ڕەت کردووەتەوە بەهۆی کەمی ئەزموون لەم پۆستە، کە ئەم هیوای وابوو وەکو باڵیۆزی نەتەوە یەکگرتووەکان دیاری بکرێت. جارید کۆشنەر، کە پۆول مانافورت لە کاتی کەمپینەکە پێی ناساندم، لە کاتی جەژنی سوپاسگوزاری پەیوەندی پێوە کردم و دڵنیای کردمەوە کە من "هێشتا هەر یەکەمی لیستی کاندیدانی وەزیری دەرەوەم" ئینجا لەگەڵ بوونی ئەو هەموو کاندیدە، دۆناڵد ترەمپ زۆر بە تۆ سەرسامە، هەروەك ئێمەش بەهەمان شێوە. لە هەمان کاتدا، ڕۆژنامەی نیۆرك پۆست لەبارەی ئەم بڕیارەوە نووسیبووی کە لە میانەی جەژنی سوپاسگوزاری لە مارالاگۆ[1] دراوە، ئەو ڕۆژنامەیە لە یەکێك لە سەرچاوەکانی گواستبوویەوە کە "دۆناڵد ترەمپ لەمیانەی ئەو بۆنەیە هەر دەگەڕا و لە هەمووانی دەپرسی کێ باشە بۆ وەزیری دەرەوە". ڕەخنەیەکی زۆر لەسەر ڕۆمنی بوو، هەروەها دەربارەی خەڵکێکی تریش بە نموونە ڕودی. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێکی زۆر هەبوون کە لایەنگیری بۆلتۆن بوون. من دەمزانی کە دەبوو کارە سەرەتاییەکانی مارالاگۆم بەڕژدی کردبووایە! بەدڵنیاییەوەش من سوپاسی هەموو ئەو پشتگیرییە دەکەم لەلایەن لایەنگیرانی ئیسرائیلییە ئەمریکییەکان (جوولەکە و ئینجیلییەکان)ـەوە بە من بەخشرا، هەروەها لەلایەن ئەوانەی کە دەیانەوێت دووبارە چاکسازی لە دەستوور بکرێتەوە و کوبییە-ئەمریکییەکان و ڤەنزوێلییە-ئەمریکییەکان و تایوانییە-ئەمریکییەکان و هەروەها چاکسازیی خوازەکانیش بەگشتی.

---

(١) مارالاگۆ هاوینەهەوارێکە لە پام بیچ، فلۆریدا. لەنێوان ساڵانی ١٩٢٤ بۆ ١٩٢٧ دروستکراوە، لە ١٢٦ ژوور پێك دێت، ڕووبەرەکەی بریتییە لە ٦٢،٥٠٠ مەتری چوارگۆشە. لە ساڵی ١٩٨٥ لەلایەن دۆناڵد ترەمپەوە بە ١٠ ملیۆن دۆلار کڕدرا، تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت خۆی خاوەنیەتی. ئەمە پێگەی فەرمی شوێنەکەیە: www.maralagoclub.com

خەڵکێکی زۆر پەیوەندی بە ترەمپ و ڕاوێژکارەکانی کرد بۆ لایەنگیری من، کە ئەمەش جۆرێکە لە گوشار، بەڵام ئەم جۆرە کارانە نەك هەر تەنها کاردانەوەیەکن لە خۆیدا بۆ مەبەستی ڕێکخستنەوەی هەیکەلی حکوومەت، بەڵکو دەرخەری دەرکردنی بڕیارگەلێکیشن لەلایەن ترەمپەوە. چارلز کراو ماسەر کە ڕەخنەگرێکی سەرسەختی ئەوە، پێی گوتم کە ئەو بەهەڵەداچووە کە لە ڕابردوو کاتێك وەسفی ترەمپی کردووە بەوەی هەڵسوکەوتی وەکو منداڵێك وایە کە هێشتا نەگەیشتبێتە ١١ ساڵ، کراوماسەر گوتی کە من ئەگەرچی دە ساڵ دەبێت ئەویم جێ هێشتووە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو نەك لە یازدە ساڵ ناچێت، بەڵکو هەر تەنها لە منداڵی یەك ساڵی دەچێت و هەموو شتێك لەم ڕوانگەوە سەیر دەکات کە ئاخۆ سوودی دەبیت بۆ دۆناڵد ترەمپ یان نا! بێگومان ئەمە ئەو ڕێگەیە بوو کە بەرپرسانی پێ دیاری دەکرا لەد ەرەوە. هەروەك یەکێك لە کۆمارییەکان پێی گوتم کە باشترین ڕێگە بۆ بوون بە وەزیری دەرەوە ئەوەیە کە "هەوڵ بدەیت دواهەمین کەس بیت". جێگریی سەرۆکی هەڵبژێردراو (پێنس لە ٢٩ی تشرینی دووەم پەیوەندی پێوەکردم بۆئەوەی لە ڕۆژی دواتر بەشداری کۆبوونەوەیەك بکەم لە واشنتۆن. من لە لیژنەی کاروباری دەرەوە پێنسم ناسی، ئەوکاتە ئەو لایەنگیرێکی سەرسەختی مەسەلەی ئاسایشی نەتەوەیی بەهێز بوو. بەشێوەیەکی سادە لەبارەی کۆمەڵێك پرسەوە دواین، لەوانە سیاسەتی دەرەکی و هەروەها بەرگری، بەڵام من تووشی شۆك بووم کاتێك لەبارەی دەوڵەتەوە گوتی: "من ئەمە وادانانێم کە هاکا ئەم شتە ڕوویدا".

بە سەیرکردنی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە دەربارەی کشانەوەی جولیانی لە پۆستی وەزیر دەنووسران لەم کاتەدا، دەکرێت بڵێین کە کرداری هەڵبژاردنەکە بۆ تەواوی حکوومەت سەرلەنوێ دەستی پێ کردووەتەوە، کە ئەمەش پێشوەچوونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، بەو

جۆره‌ی پێشتر له‌ قۆناغی گواستنه‌وه‌دا وێنه‌ی نه‌بووه‌. كاتێك ڕۆژی دواتر گه‌یشتمه‌ نووسینگه‌كانی ڕاگواستنی ده‌سه‌ڵات، جێب هێنسه‌رلینگی جێگر خه‌ریك بوو دوای دیداری له‌گه‌ڵ پێنسدا ئه‌وێی جێ ده‌هێشت. هێنسه‌رلینگ هه‌روه‌كو ده‌یانگوت هێنده‌ له‌وه‌ دڵنیا بوو كه‌ گه‌نجینه‌كه‌ی ده‌ست ده‌كه‌وێت، به‌ڕاده‌یه‌ك داوای له‌ كارمه‌ند و یاریده‌ده‌ره‌كانی كردبوو كه‌ پلان دابڕێژن. دواتر ئه‌و ناوه‌كه‌ی خۆی له‌نێو لیسته‌كه‌ی كاتی ماكمۆریس ڕۆجێرز نه‌بینییه‌وه‌ كه‌ ده‌بوو به‌ وه‌زریی ناوخۆ دوای ئه‌وه‌ی كه‌ پێی گوترابوو ئه‌و ده‌بێت به‌ وه‌زیر و هه‌روه‌ها به‌ هه‌مان جۆریش سیناتۆر سكوت براون پێی گوترا كه‌ ئه‌و نابێت به‌ سكرتێر بۆ كاروباری جه‌نگاوه‌ره‌ دێرینه‌كان.

شێوازه‌كه‌ ڕوون و ئاشكرا بوو، من و پێنس گفتوگۆیه‌كی نه‌رمونیانمان كرد بۆ ماوه‌ی نیو كاتژمێر، له‌ ماوه‌ی ئه‌م نیو كاتژمێره‌دا به‌سه‌رهاته‌ به‌ناوبانگه‌كه‌ی ئاچێسۆنم گێڕایه‌وه‌، هه‌روه‌ك چه‌ند جارێكیش بۆ ترەمپم گێڕاوه‌ته‌وه‌، كاتێك له‌ ئاچێسۆنیان پرسی سه‌باره‌ت به‌و په‌یوه‌ندییه‌ نایابه‌ی له‌نێوان ئه‌و و سه‌رۆك ترومان‌دا هه‌بوو ئه‌و ده‌یگوت: "من هه‌رگیز ئه‌وه‌م بیرنه‌چوو كه‌ كاممان سه‌رۆك بووین و كاممان وه‌زیری ده‌ره‌وه‌، هه‌روه‌ها ئه‌ویش".

ترەمپ ناوی جیم ماتیسی وه‌كو وه‌زیری به‌رگری له‌ ١ی كانوونی یه‌كه‌مدا ئاشكراكرد، به‌ڵام گومان و نادڵنیاییه‌كان له‌باره‌ی حكوومه‌ته‌وه‌ هه‌ر به‌رده‌وام بوو. ڕۆژی دواتر گه‌یشتمه‌ تاوه‌ری ترەمپ بۆ چاوپێكه‌وتن و له‌نێو ڕێكخراویی ترەمپ له‌گه‌ڵ داواكاریی گشتی وڵات چاوه‌ڕێم كرد، هه‌روه‌ها سیناتۆرێكی ئه‌مریكیش چاوه‌ڕێی ده‌كرد. عاده‌ته‌ن، سه‌رۆكی تازه‌ هه‌ڵبژێردراو له‌ واده‌ی خۆی دواده‌كه‌وێت و ده‌بوو له‌وێدا بێته‌ ده‌ره‌وه‌، به‌ڵام بینیم كه‌ وه‌زیری به‌رگری پێشوو بۆب گیتس هاته‌ ده‌ره‌وه‌. من بیرم بۆ ئه‌وه‌ چوو كه‌ بۆب گیتس له‌به‌ر ئه‌وه‌ له‌وێ بوو تاوه‌كو گوشاری لێ

بکات کە ڕێکس تیلەرسۆن بکاتە وەزیری وزە یان دەرەوە. بەڵام گیتس ئاماژەی بە ئامانجەکەی نەدا، بەڵکو هەر تەنها کاتێك کە ڕۆیشت کۆمەڵێك قسەی ئاڵوگۆڕ کرد. دواجار چوومە نێو نووسینگەکەی ترەمپ بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکە کە کاتژمێرێکی خایاند و هەروەها ڕێنس بریبوسیش بەشداربوو (کە بەم زووانە لە کۆشکی سپی دەبوو بە سەرۆك ئەرکان) و هەروەها بانۆنیش (کە دەبوو بە گەورە چاودێرانی ستراتیژییەت لە ئیدارەکە). باسی پرسگەلێکی گەرممان کرد لە جیهان و هەروەها هەڕەشەکانی وەکو ڕووسیا و چین و تیرۆر و بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی. من بە بەسەرهاتە گرنگەکەی دین ئاچیسۆن دەستم پێ کرد، بەپێچەوانەی کۆبوونەوەکانی پێشووترم لەگەڵ ترەمپدا زۆرترین قسەم کرد و وەڵامی پرسیاری ئەوانی ترم دایەوە. پێم وابوو کە ترەمپ بە وریاییەوە گوێی گرتووە، چوون ئەو هیچ تەلەفۆنێکی نەکرد و هیچ پەیوەندییەکیشی بۆ نەهات، تەنانەت لە قسەکردنیش نەوەستاین تاوەکو ئیڤانکا ترەمپ هات بۆ باسکردنی کاروباری خێزانی، یان هەوڵیدا کە وادە و بەڵێنێك بیری ترەمپ بخاتەوە.

من باسی ئەوەم دەکرد کە بۆچی دەوڵەت پێویستی بە شۆڕشێکی کولتووریی هەبوو بۆ ئەوەی ببێتە بە ئامرازێکی چالاکی پلانەکان، کاتێك ترەمپ پرسیاری کرد: "ئێستا ئێمە لێرەدا قسە لەگەڵ وەزیری دەرەوە دەکەین، بەڵام ئایا بیرت لە پۆستی جێگرەکەی کردووەتەوە؟". پێم گوت نەخێر و ئەوەم ڕوونکردەوە کە دەوڵەت ناتوانێت لەم ڕووەوە سەرکەوتن بەدەست بێنێت. سەرەڕای ئەوەش من زۆر ئاسوودە نەبووم کار بۆ کەسێك بکەم کە باش دەزانێ من لەکێبڕکێدا بووم لەگەڵی بۆ پۆستەکەی. لەگەڵ کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەکە، ترەمپ دەستی گرتم و گوتی: "من دڵنیام کە بەیەکەوە کار دەکەین". دوایی لە ژوورێکی بچووکی کۆنفرانس، من و بریبۆس و بانۆن کۆنگرەیەکمان سازدا. هەردووکیان گوتیان کە

کۆبوونەوەکە زۆر بەباشی بەڕێوەچووە. هەروەها بانۆن گوتی کە ترەمپ "لەوەوپێش هیچ شتێکی لەم جۆرەی نەبیستووە" لە ڕووی جۆر و ڕوونکردنەوەی باسەکان و درێژەی گفتوگۆکان. لەگەڵ ئەوەشدا گوشاریان خستە سەر من کە پۆستی جێگری وەزیری دەرەوە وەربگرم، چوون بە منیان گوت کە ئەوان زۆر گەشبین نین لەوەی من پۆستی گەورە وەربگرم. جارێکی تر سەرلەنوێ ئەوەم ڕوونکردەوە کە بۆچی پۆستی جێگری وەزیر باش نییە بۆ من. بۆ ڕۆژی دواتر زانیاریم هەبوو کە ترەمپ لەگەڵ تیلەرسۆن کۆدەبێتەوە. یەکەم جار کە گوێبستی ئەوەبووم کە ناوی تیلەرسۆن بەرز کراوەتەوە، یەکسەر ئەوەم بۆ ڕوونبوویەوە کە بۆچی بریبۆس و بانۆن داوایان لێ کردبووم کە خۆم کاندید بکەم بۆ پۆستی جێگری وەزیر. نە ترەمپ و نە ئەوانی تریش پرسی ئەنجوومەنی پیرانیان نەخستە بەرباس. زۆربەی پاڵێوراوانی ترەمپ دەکرێت چاوەڕێی نەیاریی دیموکراتەکانی بکەن تەنانەت لە کۆبوونەوەکانیشدا. ڕاوبۆچوونە یەکلایەنەکانی ڕاند پۆول بەوە ناسرابوو کە دەشێت ببن بە کێشە بۆ من، بەڵام زۆرێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران لە کۆمارییەکان (تەنانەت جۆن مەککەین و لیندسی گراهام و کۆری گاردنەریش) پێیان گوتم کە بەسەر نەیارەکاندا زاڵ دەبن.

لەگەڵ ئەوەشدا، دوای ئەم کۆبوونەوەیە بێدەنگییەك دروست بوو لە تاوەری ترەمپ، کە باوەڕم پێ بکەن بەوەی من بە هاونیشتمانییەکی تایبەت دەمێنمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کاندیدکردنی تیلەرسۆن لە ١٣ی کانوونی یەکەم، شەپۆلێکی تری قەبلاندنی بەدوای خۆیدا هێنا (لە بەرژەوەندی و هەروەها لە دژی) ئەوەی کە من پۆستی جێگریی وەزیر وەربگرم. یەکێك لە ڕاوێژکارانی ترەمپ ئامۆژگاریی کردم و گوتی: "لە ماوەی پازدە مانگدا تۆ دەبیت بە وەزیر، چوون ئەوان سنووری ئەو باش دەزانن". یەکێك لەم سنوورانە ئەو پەیوەندییەی تیلەرسۆن بوو کە ساڵانێك

بوو لە ئیکسۆن مۆبیل لەگەڵ ڤلادیمێر پوتین و ڕووسیا هەیبوو، بەتایبەتی لەم کاتەدا کە ڕەخنەیەکی زۆر لەسەر ترەمپ بوو سەبارەت بە "دەستتێوەردانەکەی مۆسکۆ" بۆ شکستهێنان بە هیلاری کلینتۆن. ئەمە لەکاتێکدا کە لە کۆتایی ترەمپیان بەبێ تاوان لەقەڵەم دا لەبارەی ئەم پیلانگێڕیەوە، کاردانەوە و بەرگریی ئەو ئەوەبوو کە ڕەتی کردەوە ڕووسیا بەدەستی ئەنقەست دەستتێوەردانی کردبێت لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا. جگەلەوە چەند نەیارێکی تریش هەبوون وەکو چین، ئێران و هەروەها کۆریای باکوور کە لەم پرسە تێوەگلابوون.

لە لێدوانەکانی ئەو کاتمدا زۆر جەختم لەسەر ترسناکیی دەستتێوەردانی دەرەکی کردەوە لە سیاسەتی وڵاتمان. لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەم مەککەین لەم بارەیەوە سوپاسی کردم، بەوەی گوتی کە من "کەسێکی سەرڕاستم"، ئەو ئەگەر پێشتر ئەمەی زانیبوایە نەیدەهێشت لەگەڵ ترەمپ ڕێك بکەوم. لە وەزارتی بەرگری، کێشە لەسەر پۆستی جێگری وەزیریش هەبوو، هەروەك ماتیش لە سەردەمی ئۆباما بەشێوەیەکی فەرمی لایەنگیری لە میشێل فلورنوی دەکرد. فلورنوی کە لە دیموکراتەکانە، ئەگەر هیلاری سەرکەوتووبا لە هەڵبژاردنەکان، ڕەنگە ئەو بووبا بە وەزیری بەرگری، بەڵام ئایا بۆچی ماتیش ئەوی لەنێو ئیدارەی کۆمارییەکان دەویست، تێگەیشتنی ئەمە قورسە. دواتر، ماتیش گوشارەکانی دەست پێ کرد بۆ خاتری ئان پاترسون، بۆ پۆستی کاروباری دەرەوە، بۆئەوەی پۆستی بریکاری وەزیریی پڕبکاتەوە لە وەزارەتی بەرگری. من چەندین جار لەگەڵ پاترسون کارم کردووە و دەزانم ئەو بەشێوەیەکی فەلسەفی ڕەزامەندە بە پۆستێکی پایەبڵند لە ئیدارەیەکی دیموکراتیی لیبڕاڵدا، بەڵام هەمان شت زەحمەتە لە ئیدارەیەکی کۆماریی قەبووڵ بکات. سیناتۆر تێد کروز پرسیاری لە ماتیس کرد لەبارەی پاترسون، بەڵام ماتیس توانای ئەوەی نەبوو یان نەیدەویست ئەم هۆکارانە ڕوون بکاتەوە. ئەوەبوو

پاڵاوتنەکەی هەڵوەشایەوە، لەژێر هەڕەشەیەکی زۆری ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران لە کۆمارییەکان و ئەوانی تریش و لە کۆتاییشدا تەواو شکستی هێنا. هەموو ئەو ئاژاوەیە وایکرد کە گراهام و ئەوانی تر ڕاویژیان کرد بەوەی کە من سەرەتا لە دەرەوەی ئیدارەکە بمێنمەوە و دواتر پەیوەندی بە ئیدارەکە بکەم، ئەمەش ئەو باوەڕە بوو کە من پێی قایل بووم. بۆ ماوەیەك، باوەڕێك دروست بوو کە من ببم بە بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری، کە لەدواییدا سیناتۆری پێشوو دان کوتس خرایە ئەم شوێنە لە سەرەتای کانوونی دووەم. باوەڕم وابوو ئەم نووسینگەیەی کە کۆنگرێس دوای هێرشەکانی ١١ی سیپتێمبەر دروستی کرد بۆ هاریکاریکردنی دەزگای هەواڵگری، هەڵە بوو. چوون لەدواییدا بەشێوەیەکی سادە ببوو بە بیرۆکراتیی. لابردن یان دەستبەسەرداگرتنی ئەم نووسینگەیە یەکێك بوو لەوکارانەی کە من دەمویست بە پەرۆشەوە ئەنجامی بدەم. بەڵام بۆم دەرکەوت کە خودی ترەمپ هێندە بایەخی بەوە نەدەدا کە ئەمە فشارێکی سیاسی بێت. بەرەچاوکردنی ئەم جەنگە نابەجێیەی کە لەنێوان ترەمپ و هەواڵگری دروست بووە و درێژەی کێشا و هیچ لۆژێکێکی تیدا نەبوو، ئەوا من بەخت یاوەرم بوو بەوەی کە پۆستی بەڕێوەبەری هەواڵگریم نەهاتە سەر ڕێگا. بەم جۆرە ڕاگواستنەکانی دەسەڵات لە ئیدارەکەی ترەمپ کۆتایی هات و بەبێ ئەوەی من لە هیچ پۆستێك دابنێت. من گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە ئەگەر ئەم هەڵبژارن و بڕیارەی ترەمپ (ئەم وشەیەم بە نەرمونیانی بەکاربرد) لەسەر بنەمایەکی نامۆ و نەگونجاو لەگەڵ نەریتەکاندا لە دیاریکردنی بەرپرسەکان بەکاریهێناوە، ئەوا کێشە نییە من لە دەرەوەی ئیدارەکە بمێنمەوە. ئەگەر مرۆڤ بۆی هەبێت ئەم قسەیە بە وڵاتەکەی خۆی بڵێت. دواتر، کەمتر لە مانگێك بەر لە چوون بۆ ئیدارەکە، خودی مایك فلین وێران بوو. ئەمەش کاتێك دەستی پێ کرد کە فلین دەستی کرد بە ڕەخنەگرتن لە

لێدوانەکانی باڵیۆزی ڕووسیا سێرگی کیسلیاك، کە من باش دەیناسم و بۆ ماوەیەك لە مۆسکۆ هاوشانم بوو، کاتێك من بریکاری وەزیری دەرەوە بووم بۆ کاروباری چەك و ئاسایشی نەتەوەیی لە ئیدارەکەی بوش ٤٣.

ڕەخنەکان توندتر بوونەوە کاتێك فلین درۆی کرد لەگەڵ (بەڕواڵەت وادەردەکەوت) پێنس، لەبارەی گفتوگۆکانی لەگەڵ کیسلیاك. بۆچی دەبێت فلین سەبارەت بە گفتوگۆیەکی سادە درۆ بکات، من هەرگیز لەوە نەگەیشتم. ئەوەی گەورە ڕاوێژکاران و تەنانەت خودی ترەمیش دوای چەند ڕۆژێك پێی گوتم تەواو لۆژیکی بوو، لەوەی کە ئەوان بەتەواوەتی باوەڕیان بە فلین نەماوە، بەهۆی ئەوەی کە ئەدای باش نەبووە (هەروەك کێسنجەر پێشبینی کردبوو) و هەروەها بەهۆی "دۆزی ڕووسیا"ش، کە بەشێوەیەکی ساکار چیرۆکێکی سیاسی گونجاو بوو. فلین دواتر لە ١٣ شوبات دەستی لە کار کێشایەوە، ئەمە ڕۆژێك دوای باهۆز و فشارەکەی[1] کۆشکی سپی. هەرتەنها دوای چەند کاتژمێرێك لە وەرگرتنی پۆستەکە لەلایەن کیلیان کونوای، لە بەختی خراپی خۆی ڕاگەیاندنەکان وایان بڵاوکردەوە کە فلین تەواوی متمانەی ترەمپی هەیە. ئا ئەمەیە پێناسەی تەواوی نارێکی و سەرلێشێواوی.

بەداخەوە، سەرلێشێوان و نارێکی لە سێ هەفتەی یەکەمی ئیدارەکە کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیشی گرتبوویەوە. کارمەندەکان هەر تەنها یەك بژاردەیان هەبوو، ئەویش شپرزەیی بوو، هەروەك بەڕێوەبەری سی ئای ئەی هەنگاوێکی گرنگی نا، کە بەر لەوە هەنگاوی ڕەتکردنەوەی لەم جۆرە نەنراوە "زانیاریگەلێکی هەستیارن"، ئەو ئەم قسەیەی وەك ڕوونکردنەوە کرد بەرامبەر ئەو بژاردەیەی کە فلین ببێت بە

---

(١) Sturm und Drang باهۆز و فشار، یان گەردەلوول و گووشار: ڕەوتێکی ئەدەبیی ئەڵمانیی ڕۆمانتیکییە، لە کۆتاییەکانی سەددەی هەژدە سەریهەڵدا. گۆتە و شیللەر دوو گەورە دیاری ئەم ڕەوتەن.

بەڕێوەبەری گەورە، کە ئەمەش یەکێکە لە پۆستەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی. ڕەتکردنەوەی ئەم جۆرە لێدوانە، هەروەك هەموو دەزانن، ڕێگریی کرد لە کارکردنی ئەم کەسە لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، کە ئەمەش زەبرێکی کوشندە بوو بۆ فلین. هەروەها ئەو تووشی مشتومڕی زۆر بوو لەگەڵ گەورە بەرپرسانی نێو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ماوەی حوکمڕانیی ئۆباما، بەڵام هەروەك عادەتێك، تا ئەو کاتەش هەر لەوێ بوو کە ترەمپ دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەم مشتومڕ و جەنگانە زۆرجار بوونە هۆی ڕژانی خوێنی بیرۆکراتی لەسەر زەویی کۆشکی سپی و ئۆفیسی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی ئایزنهاوەر، کە بریتییە لە کۆمەڵێك گرانیتی جوان و ڕازاوەی ڕەنگ خۆڵەمێشی بەد ڕیژیی شەقامی خۆرئاوا و بەشێکی زۆری کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەخۆدەگرێت. بۆ نموونە، لە یەکێك لە کەمپینەکانی ترەمپ -سەبارەت بە کۆچی نا-یاسایی- کۆشکی سپی لە ڕۆژەکانی یەکەمیدا کەوتە نێو هەڵە دوای هەڵە، کە هەوڵی دەدا سەرلەنوێ ئاراستە سیاسییەکان و دەسەڵاتی جێبەجێکردن دابڕێژێتەوە. ئاڵنگارییە دادوەرییەکان شتانێکی حەتمی و لێ نەبوراو بوون و بە جۆرێك وەك ئەوەی کە زۆر سکاڵا بکرێت لەدەست ئەم هەموو تێپەڕاندن و پڕکردنەوەیە لە ماوەی هەشت ساڵەی دەسەڵاتی ئۆبامادا. بەڵام کۆشکی سپی بەتەواوەتی کێشەی کۆچکردووانی گرتە ئەستۆ، ئەمەش جۆرێك بوو لە ناپاکی لە ئامادەگی بۆ گواستنەوەی دەسەڵات و هەروەها گونجانە نێوخۆییەکان. "کەناڵی نارەزایی" دەوڵەت، کە دەبوو هەر لەنێوخۆدا بووایە، بەڵام ڕێگەیەکی دۆزییەوە و لەسەر ئینتەرنێت لە هەزارەها کارمەند ئیمزایان کرد و ڕەخنەیان لە دەستپێشخەرییەکەی بابەتی کۆچکردن گرت.

ڕاگەیاندنەکان بەم هۆیەوە بوو بە جەژنیان و کردیانە هەڵا، ئەگەرچی گفتوگۆ و ئارگومێنتی کەناڵەکە زۆر لاواز بوو. بەڵام بە جۆرێك لە

جۆرەکان، ئارگومێنتی کەناڵەکە و لێدوانی میدیاکان و نەیارانی هیلاری بەبێ وەڵام مایەوە، دەی کێ لەمە بەرپرس بوو؟ ئەی پلانەکە چی بوو؟ لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو تیلەرسۆن پەیوەندی پێوە کردم، دوای سێ ڕۆژ لە ڕەزامەندی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە لە ئەنجوومەنی پیران لەسەر کاندیدکردنی لە ٢٣ کانوونی دووەم بە زۆرینەی دەنگ و بە ڕێژەی ١١-١٠ دەنگ، ئەمەش پاڵی بە منەوە نا تاوەکو هاریکاری دانیشتنێك بکەم. بۆ ماوەی ٣٠ خولەك گفتوگۆمان کرد، زۆربەی گفتوگۆکە تایبەت بوو بە پرسی ڕێکستنەکانی دەوڵەت و چۆنییەتی کارکردنی پرۆسەی بڕیار-دەرکردنەکانی نێوان ئاژانسەکان. تیلەرسۆن هەم میهرەبان و هەمیش پرۆفیشناڵ بوو، بەڵام ئەوانی تر حەزیان بە چارەی من نەدەکرد وەکو جێگرێك بۆ ئەو. بێگومان ئەگەر منیش لە جێگای ئەو بوومایە هەر هەمان هەستم هەبوو. دواتر تیلەرسۆن بە ئیلیۆت ئابرامزیی گوتبوو، کە ئەم وای دانابوو، ئەو کەسێکی دەوێت لەپشت پەردەوە پشتگیری بکات، بەڵام کەسێك ڕای گشتی بەلای خۆیدا ڕانەکێشابێت، هەروەك من کە چاوی خەڵکیم لەسەر بوو، چوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان کارم کردبوو و هەروەها هەمیشەش لە کەناڵی فۆکس لێدوانم هەبوو.

تیلەرسۆن پرسیاری لێ کردم کە ئاخۆ جگە لە پۆستی "جێگری" چاوم لەسەر هیچ پۆستێکی ترە لەنێو حکوومەتدا، منیش گوتم نەخێر، چوون من دووەم باشترین پۆستم دەست کەوتووە کە باڵیۆزی نەتەوە یەکگرتووەکانە. ئەوەبوو تیلەرسۆن پێکەنی و پاشان باسمان لەم هەموو پەیوەندییە زۆرە کرد لەنێوان سکرتێران و باڵیۆزانی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەوە ڕوون و ئاشکرابوو کە لەگەڵ هالیدا قسەی نەکردووە سەبارەت بە پەیوەندییەکانیان و بگرە هیچ بیرۆکەیەکیشی نییە لەبارەی چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم بۆمبە تەوقیتکراوە. نیگەران بووم بەوەی کە تیلەرسۆن لە مەترسیدا بوو لەلایەن بیرۆکراسییەکانی وەزارەتی دەرەوە.

هەموو ژیانی خۆی کە ئێستا لە تەمەنی ٤١ ساڵیدایە لە ئیسکۆن[1] بەسەر بردووە، لە ژینگەیەکدا کە پێوەری ڕوون هەبوون بۆ جێبەجێکردن و هەروەها ڕاپۆرتەکانی قازانج و زیان بەوەی کە بەرپرسانی ئەوێ زۆر ڕەق بوون لە مامەڵە و هەروەها میکانیزمەکانی کارکردنی کۆمپانیاکە لەوەبوو لەناوەوە تووشی شۆڕشێك بێت بۆئەوەی سەرلەبەری سیاسەتەکانی بگۆڕدرێت. دوای ساڵانێکی مانەوەی لە لووتکەدا لەنێو ئیکسۆن، باوەڕی وابوو هەموو کەسانی بەرپرسی نێو کۆمپانیاکە لەبەرەی ئەو بوون، هەروەها ئەمە شتێکی خۆش و بەچێژ بوو بۆ تیلەرسۆن کە لە نهۆمی ١٧ی کۆمپانیاکە دابنیشیت و هیچ ئاگات لەم شتانە نەبێت کە لە نهۆمەکانی خوار خۆت یان لە سەرانسەری جیهاندا بەڕێوەدەچێت. تیلەرسۆن بەتایبەت بەهۆی پاشخانەکەیەوە، دەبوو خۆی بە کەسانێك دەور دابا، کە شارەزابوون لە خاڵی بەهێز و لاوازی دەرەوە و ناوەوە، بەڵام ڕێگەیەکی تەواو جیاوازی گرتەبەر. ئەو هەوڵی بۆ شۆڕشی کولتووری نەدەدا (هەروەك من دەمویست) و هەروەها "بیناکەشی" نەگرتە ئەستۆ (هەروەك هەموو ئەوانەی لەوێدا کاریان دەکرد ئاماژەیان بەوە دا) و تەنانەت هەوڵی ئەوەشی نەدا کە کۆنترۆڵی بیرۆکراسییەکان بکات و لە ڕەگەوەش بیانگۆڕێت (هەروەك جیم بەیکەر کردی)، لەجیاتی ئەوە، تیلەرسۆن خۆی تەنا کرد لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەوانەی کە متمانەی پێیان هەیە و ئەو باجەشی دا کە هەر دەبوو بیدات. بەڵام لەگەڵ تێکشکاندن و گرتێبەردانی فلین، ئینجا بە ویژدانەوە بێت یان بێویژدانانە، پۆستی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی کە من پێشتر بیرم لێ نەکردبوویەوە بەهۆی نزیکبوونی فلین لە ترەمپەوە، لە ئێستا ئەو پۆستە کراوە بوو بۆ من.

ڕاگەیاندنەکان وایان دانا کە جێگرەوەی فلین ژەنەڕاڵێکی تر دەبێت،

---

(١) مەبەستی ئیکسۆن مۆبیلی گەورە کۆمپانیای نەوت و سەرچاوە سروشتییەکانە.

لەمەشەوە ناوی هەریەك لە دەیڤید پێترایۆس و ڕۆبەرت هاروود (هێزیی دەریایی پێشوو، ئێستا لە لوکهیدە، لەلایەن ماتیسەوە بەزەبری هێز نێردراوەتە ئەوێ)، هەروەها کەیث کێلوج (پشتگیریکەری هەمیشەیی ترەمپ و ئێستاش سکرتێری نووسینگەی جێبەجێکردنە لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی). وادەرکەوت کە تیلەرسۆن لەمە تێنەگلاوە، کە ئەمەش ئاماژەیەکی تری کێشەکە بوو، لەبەرئەوەی کە ئەو هەم لەنێو ئەم ئەڵقەیەی دانەبوو، هەروەها چونکە وا دەرنەدەکەوت کە ئەو درکی بەم کێشەیە کردبێت لەوەی چی دەبێت ئەگەر هاتوو هاوپەیمانێکی ماتیس ئەم پۆستە وەربگرێت، ئەوا پەیوەندییەکانی تیلەرسۆن لەگەڵ کۆشکی سپیدا زۆر قورس دەبێت. لەڕاستیدا، هەواڵەکان هەموو ئاماژەیان بە لاوازیی تیلەرسۆن دەدا بەگشتی.

لە ڕۆژی هەینی، ١٧ی شوبات، بانون مەسجێکی بۆ ناردم و داوای لێ کردبووم کە لە مارالاگۆ ئامادەبم بۆ چاوپێکەوتنی ترەمپ لە پشووی کۆتایی هەفتەی سەرۆك. هەر لەم ڕۆژەدا، هەژماری فەرمی جۆی سکاربۆر و لە (ئێم ئێس ئێن بی سی) تویتێکی کرد، تێیدا هاتبوو: "من زۆر بەتوندی دژی ئەوەبووم کە جۆن بۆڵتن[1] ببێت بە وەزیری دەرەوە، بەڵام باڵیۆزی پێشووی نەتەوە یەکگرتووەکان تۆماس جێفرسۆنە لە پاریس بە بەراورد بە مایکل فلین". ئەوە ڕەنگە لەنێو دونیای ترەمپدا سوودی هەبێت. لە کاتی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان لە مارالاگۆ، لە کۆتایی ئەو هەفتەیە، یەکێك لە مێوانەکان پێی گوتم کە گوێبیستی ترەمپ بووە چەندین جار گوتوویەتی: "من خەریکە بەڕاستی بۆڵتنم خۆش دەوێت". ئەوەبوو ترەمپ لەگەڵ سێ پاڵێوراودا دیداری کرد: ژەنەڕاڵ ئێچ. ئار. ماکماستەر،

(١) ئاماژە بە هەژماری فەرمی جۆن بۆڵتن دەدات بە AmbJohnBolton@

نووسەری کتێبی "کەمتەرخەمیی ئەرك"[1]. لێکۆڵینەوەیەکی جوانە سەبارەت بە پەیوەندی سەربازی-مەدەنی لە ئەمریکا؛ ئەفسەر ڕۆبەرت کاسلین، بەرپرسی وێست پۆینت، هەروەها منیش.

من بەر لە ساڵانێك بۆ یەکەم جار ماکماستەرم بینی و قسەم لەگەڵیدا کرد، سەرسام بووم بەوەی کە پشتگیری باسە مشتومڕئامێزەکانی دەکرد. کاتێك بۆ یەکەم جار کاسلینم بینی، وەکو بەرپرسێکی قۆز و بەتوانا و تەواو فەرمی هاتە بەرچاوم. هەردووکیان جلی فەرمییان لەبەردابوو، کە ئاماژەیەك بوو لەوەی بەهرەی بازاڕکارییان هەیە، کەچی من، هەر خۆم و سمێڵم بووم. ترەمپ بە گەرمی پێشوازی لێ کردم، پێی گوتم ئەو چەندە ڕێزی لێ دەگرێت و هەروەها چەندە دڵخۆشە بەوەی ئەوی بە ڕاوێژکاریی ئاسایشی نەتەوەیی داناوە. هەروەها ترەمپ پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ بیر لە "ناونیشانێکی وەك ئەوەی بانون" دەکەمەوە (کە لەسەر توولێکی تایبەت هەبوو لە مارالاگۆ لە نهۆمی یەکەم لە تەنیشت پریبوس و کۆشنەر)، کە مەسەلە ستراتیژییەکانی دەگرێتەوە. بەم جۆرە، هەروەك دەردەکەوێت، دەکرێت ببم بە یەکێك لەو هەموو ژمارە زۆرەی "یاریدەدەریی سەرۆك" لەنێو کۆشکی سپیدا، لەگەڵ هەبوونی ڕەنجێکی کەم لە دیاریکردنی ڕۆڵ و بەرپرسیارییەتییەکانیان. ئەمە بەتەواوی نەبوونی توانای دەستپێکردن بوو بۆ من، بۆیە من بەڕێزەوە ڕەتم کردەوە، گوتم نەخێر من هەر تەنها ئارەزووی پۆستی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی دەکەم. هەروەك جارێکیان هێنری کیسنجەر گوتی: " بەبێ سندووقی پۆستە، هیچ پۆستێکی حکوومی وەرمەگرە".

سەرۆك دڵنیای کردمەوە کە جێگرەوەی فلین ئازادیی تەواوی هەیە لە

(١) Dereliction of Duty کەمتەرخەمیی وەیان دەسهەڵگرتنیی ئەرك، کتێبەکە باس و لێکۆڵینەوەیە لەوەی کە چۆن ئەمریکا چووە نێو جەنگی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

مەسەلەکانی ڕێکخستن و کاروباری کارمەندان، کە من باوەڕم وابوو ئەم باسە زۆر گرنگە لە بەڕێوەبردنی ستافێکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی چالاك و هەروەها کاری هاوبەشی نێوان ئاژانسەکان، بەم جۆرە باسی کۆمەڵێکی تەواوی کاروباری جیهانیمان کرد، دوایی هاتینە سەر کاکڵەی ناوەڕۆکی بابەتەکە، هەروەك وەزارەتی دەرەوە حەز بەم جۆرە ناوە دەکات و ترەمپیش لە خاڵێکدا لێدوانی هەبوو، "ئەمە زۆر جوانە، لەوەدەچێت جۆن هەر بەم جۆرە بێت کە لە تەلەفزیۆن دەردەکەوێت، من هەرتەنها دەتوانم گوێی بۆ بگرم، بەڕاستی من ئەوەم بەدڵە". کۆشنەر پرسیاری کرد، "چۆن لەگەڵ ئەم خاڵەدا هەڵ دەکەیت کە زۆر مشتومڕی لەسەرە، بە ڕاددەیەك خەڵکەکە یان خۆشی دەوێت یانیش ڕقی لێت دەبیتەوە؟"، کاتێك ویستم دەمم بکەمەوە بۆ وەڵامدانەوە، ترەمپ گوتی: "بەڵێ، ڕێك وەکو من! خەڵکی یان خۆشیان دەوێم یان ڕقیان لێمە، سەیرکە من و جۆن تەواو لە یەك دەچین". من هەرتەنها ئەوەم بۆ وەڵامەکە زیادکرد، کە لەسەر بنەمای ئەدائەوە پێویستە ئێمە حوکم لەسەر کەسێك بدەین، لەگەڵ لیستەکردنی کەمێك لەو شتانەی ئاماژەم پێدا، وەکو بەرنامەی کارم لە وەزارەتی دەرەوە. کۆبوونەوەکە بە گفتوگۆ دەربارەی ڕووسیا کۆتایی هات، ترەمپ گوتی: "بینیم کە ئێوە ئەو ڕۆژە باسی ڕێککەوتننامەی چەکی ئەتۆمی-تان دەکرد" ئاماژەی بە ڕێککەتنەکەی نێوان ئەمریکا و ڕووسیا کرد. دواتر ئەوەی ڕوونکردەوە کە بۆچی نایەکسانی هەیە و جگە لە ڕووسیا و ئەمریکا هیچ وڵاتێکی تر نییە (وەکو چین، ئێران، هەروەها کۆریای باکوور) کە پەرە بە هێزی درێژ-مەودا بدەن و هەروەها ڕووسییەکانیش پێشێلی ڕێککەوتننامەکە دەکەن. ئەمە ڕێك نزیکەی تەواوی ئەوەبوو کە گوتم، بۆیە هیچ گومانم لەوەنەبوو کە تائێستاشی لەگەڵدا بێت چاودێری

فۆکس نیوز دەکات[1]! من پێشنیارم کرد کە بە پوتین بڵێین پێشێلی ڕێککەوتننامەکە نەکات، گەرنا ئێمە دەکشێینەوە، دیاربوو ترەمپ هاوڕا بوو لەگەڵ من. من و بانۆن بەیەکەوە ئەوێمان جێ هێشت، بانۆن گوتی: "ئەمە زۆر باش بوو".

لەگەڵ ئەوەشدا، من باوەڕم وابوو کە ترەمپ ژەنەراڵێك هەڵدەبژێرێت. گەڕامەوە بۆ هۆتێلەکەم، لە کاتێکی تری هەمان ڕۆژدا، بانۆن و پریبۆس داوایان لێ کردم کە نانی بەیانییان لەگەڵ بخۆم لە مارالاگۆ بۆ ڕۆژی دواتر. پریبۆس پێشنیاری کرد بۆ جێگرەوەی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، ئەو بە ترەمپی گوت: "بیرت بێت کە مامەڵە لەگەڵ کێ دەکەیت". ئەوان پەیمانی کاریگەرییەکەی ڕاستەقینەیان بە ترەمپ دابوو، هەروەها لەگەڵ مسۆگەریی هەڵسوڕانی ئیدارەکە، ئەمەش مانای وابوو کە ئەگەرێك هەیە من ببم بە وەزیری دەرەوە یان شتێکی لەم بابەتە. بەپێی ئەو ئەزموونەی من لە حکوومەتدا هەمبوو، ڕوونم کردەوە کە لەپێناو بەگەڕخستنی بیرۆکراسیەتدا، دەبێت دەست بەسەر بیرۆکراسییەتدا بگریت، نەوەك هەر تەنها لە کۆشکی سپییەوە سەیری بکەیت. ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی میکانزمێك بوو بۆ گونجان و ڕێکخستنی ئاژانسەکانی

(١) نوام چۆمسکی، بیرمەند و سیاسەتوان و زمانناسی ئەمریکی لە وەسفی ترەمپ و گوێبیستی بۆ فۆکس نیوز دەڵێت: "ئەم جۆرە کەسانە بەدرێژایی ڕۆژ لەسەر کەناڵی فۆکس نیوزن، ئەگەر تۆ لە شوێنێکی ترەوە سەیری دەکەیت و پێت ئاساییە، ئەوا بزانە چی ڕوودەدات؟ ئەم شێتە لە کۆشکی سپی، هەر کات دێتە دەرەوە ئەوەی بێتە سەر زوبانی دەیلێت، بۆ ڕۆژی دواتر پێچەوانەکەی دەڵێت، لە فۆکس نیوز شتێك دەڵێت و بەپەرۆشییەوە دووبارەی دەکاتەوە و بۆ ڕۆژی دواتریش پێچەوانەکەی دەڵێت، هەمان شتیش لەم بارودۆخە، ئەمە لەکاتێکدا کە هەموو بەیانییەك سەیری فۆکس نیوز دەکات بۆئەوەی بزانێت کە چی دەڵێت، چونکە ئەوە سەرچاوەکەیەتی بۆ هەواڵ و گۆڕانکارییەکان، پاشانیش خەڵکانێکی زیرەکی وەکو مایك پۆمپەیۆی دەست دەکەوێت تاوەکو بلێت: "خودا ترەمپی بۆ سەرزەوی ناردووە تاوەکو ئیسرائیل لەدەست ئێران ڕزگار بکات" ئا ئەوەیە کەسی ژیرا" (س: چاوپێکەوتن لەگەڵ نوام چۆمسکی لەبارەی ڤایرۆسی کۆرۆناوە).

ئاسایشی نەتەوەیی، هەروەها ئەم پۆستە پێوستی بە جۆرە کەسێك بوو کە ئەزموونی هەبێت لەسەر ئاستی نزم لەبارەی ئەوەی کە چۆن کار دەکات و چۆن نایکات. من هیچ کاردانەوەیەکم جێ نەهێشت. پێم وابێت کە ترەمپ بەکاریگەرییەوە پێی گوتوون: "بیهێننە نێو ئیدارەی دەسەڵات تاوەکو بتوانێت لە تەلەفزیۆن بەرگریمان لێ بکات". لەڕاستیشدا ئەمە دوا شتێك بوو کە من بیکەم، لەوەی کە پەیوەندیی بەم سیاسەتانەوە هەبوو کە من هیچ پەیوەندییەکم بە دارشتنیان نەبوو. لەمیانەی گفتوگۆکە بانۆن گوتی: "لەمەدا یارمەتیم بدە، ئەی باڵیۆز"، لەڕاستیشدا ئەمە ئەو شتە بوو کە من دەمویست بیکەم، هەرچەندە دەبوو پێم گوتبا کە چ شتێکی تر ڕازیم دەکات بەوەی بێمە نێو ئیدارەی دەسەڵات. بە فڕۆکە گەڕامەوە بۆ واشنتۆن، لەنێو فڕۆکەکە وایفایم بینی کە ترەمپ بەتایبەت دایدابوو، ئەمەش جێگەی سەرسوڕمان نەبوو، بەڵام تووشی سەرسوڕمان بووم کاتێك گوێبیستی ترەمپ بووم، کە گوتی: "من جۆن بۆڵتن دەناسم، داوای لێ دەکەم بەگوێرەی توانا کارمان لەگەڵدا بکات، جۆن تا بڵێی کەسێکی زیرەکە، ئێمە هەندێك دانیشتنی باشمان لەگەڵ ئەو ئەنجام دا، ئەو زۆر شت دەزانێت. ئەو کۆمەڵێك بیرۆکەی زۆر باشی لابوو کە پێویستە بە ئێوەی بڵێم. من زۆر هاوڕام لەگەڵ ئەو، بۆیە ئێمە قسە لەگەڵ ئەودا دەکەین".

ئەوە ڕوون بوو کە من خۆم تەواو یەکلا نەکردبوویەوە دەربارەی باشترین پۆست و ڕۆڵ کە ببینم، بەدڵنیاییشەوە بۆ کۆشنەریش نا، کە دوای ماوەیەکی کەم پەیامێکی تەلەفۆنی بۆ ناردم، "کاتێکی زۆر خۆش بوو بەیەکەوە بەسەرمان برد، ئێمە بەڕاستی دەمانەوێت بێیتە نێو تیمەکەمان. ئینجا با سەرەتا شوێنێکی شیاو بۆ تۆ بدۆزینەوە، چونکە تۆ زۆر شتت هەیە پێشکەشی بکەیت". مادلین ویسترهوت کە سکرتێری ترەمپە لە ئۆفیسی

ئۆڤاڵ[1] پەیوەندی پێوە کردم (ئەو ژوورەی کە یارمەتیدەرانی تایبەت بە ترەمپ لێی دادەنیشن). ئەو ڕۆژی سێشەممە پەیوەندی پێوە کردم، تاوەکو بمخاتە سەر هێڵەکەی ترەمپ و قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام من مۆبایلەکەم لەسەر زەنگ نەبوو، بۆیە ئاگام لێی نەبوو. دواتر هەروەك پێشبینی دەکرا، کاتێك پەیوەندیم کردەوە ترەمپ سەرقاڵ بوو. بۆیە پرسیارم لە ویسترهوت کرد لەبارەی ئەوەی ئاخۆ دەزانێ کە بابەتەکە چی بوو؟! ئەو لە ترسی ڕاگەیاندنەکان گوتی: "ئۆو، ترەمپ هەر دەیویست بڵێت تۆ چەندە کەسێکی بەتوانایت"، هەروەها گوتی کە دەیویست سوپاسم بکات کە من بەدەم داواکەیان چووم بۆ مارالاگۆ. پێم گوت کە ئەمە جێگای سوپاسە، بەڵام نامەوێت خشتەی کارەکانی لێ تێك بدەم، بۆیە پێویست ناکات جارێکی دیکە پەیوەندی بکاتەوە، بەهیوای ئەوەی پەیامەکەم گەیشتبێت.

دوای ئەوە بە چەند ڕۆژێك، ویسترهوت پەیامی نارد کە سەرۆك ترەمپ دەیەوێت بمبینێت. وام دانابوو کە نەچمە ژێر باری هەموو پۆستێك. بەڵام خۆشبەختانە بۆ ماوەی دوو هەفتە بوو کە وڵاتم جێ هێشتبوو. دەتوانیت ڕابکەیت، بەڵام ناتوانیت خۆت ون بکەی. دواجار وابڕیار بوو لە ٢٣ی ئازار چاوم بە ترەمپ بکەوێت، دوای نانخواردن لەگەڵ ماکماستەر لەنێو قەرەباڵغی کۆشکی سپی. ئەوەتا پەیامم بۆ بانۆن نارد تاوەکو بەڕوونی پێم بڵێت: من هەر تەنها ئارەزووی وەزیری دەرەوە یان ئاسایشی نەتەوەییم هەبوو. بەڵام هیچ کامێکیان بۆ من دیاری نەکرابوون. دوای زیاتر لە دە ساڵ، بۆ یەکەم جار بە ڕێککەوت چوومە نێو نووسینگەی وێست وینگ، کە لە دەرەوەدا ڕاگەیاندنەکان ڕاوەستابوون بۆ چاوپێکەوتنی ئەندامانی کۆماری، ئەوانەی لە دەوری ترەمپ کۆبووبوونەوە بۆ پووچەڵکردنەوەی

(١) ئۆڤاڵ: ئۆفیسی سەرەکی سەرۆکی ئەمریکایە لە نێو وێست وینگی کۆشکی سپی لە واشنتۆن.

بەرنامەی تەندروستیی ئۆباما[1]. ئەوەی من دەمویست، سەرەڕای ئەوەی كە من پلانم دانەنابوو بۆ ئەوەوی وەڵامی هیچ پرسیارێك بدەمەوە. بەڵام لە سەر تۆڕی تویتەر، هەرچۆنێك بێت تەنانەت ئەو شتانەی كە ڕووداویش نین، دەبن بە ڕووداو، هەروەك یەك لە پەیامنێرەكان نووسیبووی:

گلین ثرەش: جۆن بۆڵتن تازە هاتبووە نێو ئۆفیسی وێست وینگ، پرسیارم لێ كرد كە ئەو چی دەكات، بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە "گرنگیپێدانی تەندروستی!!!!

دواتر بینیم كە پەیامنێری واشنتۆن پۆست، بۆب كۆستا تویتی كردووە:

ڕۆبەرت كۆستا: ترەمپ دەیەوێت جۆن بۆڵتن بێنێتە نێو ئیدارەكەی، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە كە بۆڵتن لەوێیە، بەگوێرەی یەكێك لە نزیكەكانی ترەمپ بێت، هێشتا گفتوگۆكان بەردەوامن.

لەگەڵ ماكماستەر خوانێكی ناوازەمان بەیەكەوە هەبوو، بە یەكەوە باسی عێراق و ئێران و كۆریای باكوورمان كرد، دواتر چووینە نێو ئۆفیسی ئوڤاڵ بۆئەوەی ترەمپ ببینین، كە خەریك بوو خوانەكەی لەگەڵ وەزیری گەنجینەدا ستیڤن مونشین و نیلسون بیلتز، پسپۆری دارایی، تەواو دەبوو. ترەمپ لەپاڵ مێزی ڕیزولوت[2] دانیشتبوو، كە سەرمێزەكە بەتەواوی چۆڵ

---

(١) Obamacare یان بەرنامەی تەندروستیی ئۆباما، یاسایەك بوو كە تیایدا پاراستنی نەخۆشان و گرنگیپێدانیان دەگرتە ئەستۆ بە نرخێكی گونجاو (هەندێكجاریش بە یاسای گرنگیپێدان بە نرخی گونجاو دەناسرێت) و ئەمە یاسایەك بوو ئۆباما لە ٢٣ی ئازاری ٢٠١٠ ئیمزای لەسەر كرد. هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایە یەكێك بوو لە كارە لەپێشینەییەكانی ترەمپ و تەنانەت پێش ئەوەی هەڵبژێردرێ پەیمانی دابوو.
(٢) ڕووزڤێلت: مێزێكی دروستكراوی تایبەتە بۆ یەكەم جار لە سەدەدەی نۆزدە دروستكراوە، تا ئێستا حەوت سەرۆك لە ئۆفیسی جێبەجێكردن بەكاریان هێناوە هەر لەنێو ئۆفیسەكەی ئوڤاڵ لە كۆشكی سپی. ئەم مێزە دیاریی شاژنە ڤیكتۆریا بوو بۆ سەرۆك ڕیزفورد هایز لە ساڵی ١٨٨٠.

بوو، پێچەوانەی ئۆفیسەکەی نیویۆرك، کە هەمیشە سەر مێزەکە پڕبوو لە ڕۆژنامە و ڕاپۆرت و پەڕاوی تێبینی. وێنەیەکی لابوو کە هی هەردووکمان بوو، دواتر لەگەڵ ماکماستەر و من دانیشت و کەوتینە گفتوگۆ. باسی ئەو هەوڵانەمان کرد لە پووچەڵکردنەوەی یاسای تەندروستی ئۆباما و پاشان چووینە سەر ئێران و کۆریای باکوور، زۆربەی ئەو شتانەی کە لەگەڵ ماکماستەر لە خوانەکە باسم کرد، لەوێدا دووبارەمان کردەوە.

ترەمپ گوتی: "دەزانی چی، من و تۆ لە زۆربەی شتەکان هاوڕاین، تەنها لە پرسی عێراق نەبێت". منیش گوتم: "بەڵێ، بەڵام هەتا ئێرە لەسەر ئەوەش هاوڕاین کە پاشەکشەکردن بە هێزەکانمان لەلایەن ئۆبامەوە لە ۲۰۱۱ وای کرد ئێمە بکەوینە نێو ئەم ئاژاوەیەی ئێستا". پاشان ترەمپ گوتی: "ئێستا نا، بەڵام لە کاتێکی گونجاو و هەروەها لە شوێنێکی گونجاو، داوات لێ دەکەم کە بێیتە نێو ئەم ئیدارەیە، تۆش ڕەزامەند دەبیت، وایە؟"، من پێکەنیم و هەروەك ترەمپ و ماکماستەریش پێکەنین (ئەگەرچی من لەلایەن ئەوەوە تۆزێك هەستم بە ناڕەحەتی کرد)، وەڵامم دایەوە و گوتم "بێگومان"، پێم وابوو کە لەو گوللـەیە ڕزگارم بوو، کە هەستم دەکرد بەدوامەوەبوو[(١)].

بەبێ گوشار و ئەمبازبوون، هەروەها بەبێ هیچ پۆستێکی نارێك لە کۆشکی سپی و تەنانەت بەبێ سندوقی پۆستە[(٢)]، کۆبوونەوەکە بۆ ماوەی

(١) مەبەستی ئەوەیە چوونی بۆ نێو دەسەڵات و ئیدارەکەی ترەمپ وەکو گوللـەیەك وابوو، هەر بەدوایەوەبوو. پێی وایە ئەوکاتـەی کـە دوای مارالاگۆ چوویـەوە ماڵـەوە و پاشان لەلایەن ویسترهوتەوە پەیوەندی پێوەکرا و ئەم ئاگای لـێ نـەبوو، لـە ئەسڵدا بـۆ ئەوەبوو کە داوای لێ بکرێت بۆ هاتنە نێو دەسەڵات.
(٢) ئاماژە بە قسەکەی هێنری کیسنجەر دەداتەوە، وەك لە چەند لاپەڕەی پێشوو گوتی: "بەبێ سندووقی پۆستە، هیچ پۆستێکی حکوومی وەرمەگرە".

بیست خولەك بەردەوام بوو، پاشان من و ماکماستەر ئەوێمان جێ هێشت و لە کاتی چوونە دەرەوە لای ئۆفیسەکەی بانۆن وەستاین. من و بانۆن بۆ چەند کاتێکی کەم سەردانی پریبوسمان کرد، لەوێشدا و لە ڕاڕەوەکە گەیشتین بە شۆن سپایسر و پاشان جێگری سەرۆکمان بینی، کە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کردم. شوێنەکە حەرەمی زانکۆی بیرخستمەوە، کە خەڵکان تێیدا دێن و دەچن و لەگەڵ یەکدا باسی چەندین شت دەکەن. ئەی ئەم خەڵکە لەنێو جەرگەی قەیرانەکان هەوڵی پووچەڵکردنەوەی بەرنامەی تەندروستی ئۆبامایان نەدەدا، کە یەکێك بوو لە کێشە گرنگەکانی ترەمپ بۆ ساڵی ٢٠١٦؟! ئەمە ئەو کۆشکی سپییە نەبوو کە من پێشتر لەمیانەی ئیدارەکانی تر بینیبووم. شوومترین شتێك کە بیستبێتم، ئەوەبوو لە مایك پێنس بیستم کە گوتی: "من بەڕاستی زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە دێیتە ئێرە"، ئەمە ئەو شتە نەبوو کە پێم وابوو من دەیکەم! دواجار لە کاتژمێر ٢ و پەنجا خولەك ئەوێم جێ هێشت، بەڵام هەستێکم هەبوو کە دەمتوانی تەواوی دوای نیوەڕۆ لەوێ بمێنمەوە.

من ئەوەم لەم پەیوەندییانەی کۆشکی سپی دەخوێندەوە کە ترەمپ ڕازی بوو ئەمە بۆ کات و ساتی تر دریژبکاتەوە، بەڵام من یەکەم سەد ڕۆژم لە دەسەڵات بەشێوەیەکی پاریزراو و هێمن بەسەربرد، لەبارەی ئەوەی لە مێشکمدا بوو کە بیکەم و ئەوەش کە نەیکەم. دوای هەموو شتێك، هەروەك کەیتۆی بچووك[1] لە یەکێك لە شانۆ دڵخوازەکانی جۆرج واشنتۆن دەڵێت: "کاتێك بەدکاری و گوناهـ دەبێتە عادەت و پیاوانی بێباوەڕ و بێویژدان حوکم دەکەن، ئەو کات مەردانەترین پۆست،

(١) مارکۆس بورسیوس کەیتۆ، لە ساڵانی ٩٥ بۆ ٤٦ی بەر لە زایین ژیاوە لە ڕۆما، بە کەیتۆی بچووك بەناوبانگە. ئەو سیاسییەکی دیار بوو، نەیاریی سەرەکی یولیوس قەیسەر بوو. بەڵام لێرەدا کەیتۆی بچووك ناوی یەکێك لەو شانۆیە دڵخوازانەیە کە جۆرج واشنتۆن حەزی پێ کردووە و بینیویەتی.

ویستگەیەکی تایبەت دەبێت". لەگەڵ ئەوەشدا، ژیان لەژێر سێبەری ترەمپ، هاوشێوەی ژیانی ژێر سێبەری کەیتۆ نەبوو کە بە کەیتۆکەی جۆزیف ئەدیسۆن ناسرابوو، ئەم پاڵەوانە هەوڵیدەدا لە دژی کۆماری ڕۆمانیی فاشل بجەنگێت و نەیاریی یولیوس قەیسەر بوو. لەجیاتی ئەوە، ئیدارە نوێیەکە زیاتر لە گۆرانیی هەڵۆکان "هۆتێل کالیفۆرنیا"[1] دەچوو: "هەر کاتێك دەتەوێت دەتوانیت بچیتە دەرەوە/ بەڵام هیچ کات ناتوانیت جێی بهێڵیت".

کاتێکی زۆری پێنەچوو کە بانۆن و پریبوس دووبارە پەیوەندییان پێوە کردم و پەیامیان بۆ ناردم بۆئەوەی بچم بۆ کۆشکی سپی، چوون نەیانتوانی بوو گونجان و هاوڕاییەك دروست بکەن لەنێوان ترەمپ و ماکماستەر و تیلەرسۆن. ڕوون بوو دیارترینی کێشەکان لەسەر ئێران بوون، بەتایبەت ڕێککەوتننامەی چەکی ئەتۆمی بۆ ساڵی ٢٠١٥، کە ئۆباما لای وابوو ئەمە دەستکەوتێکی گرنگ بوو (دەستکەوتەکەی تری بەرنامەی تەندروستیی ئۆباما بوو).

ڕێککەوتنەکە بەشێوەیەکی زۆر خراپ وێناکرابوو، ئینجا بەشێوەیەکی زۆر ناپەسەند داڕێژرابوو و هەروەها زۆر بەسوود بوو بۆ ئێران: شیاوی جێبەجێکردن نەبوو، شیاوی لێکۆڵینەوە نەبوو، لەڕووی ماوەکەی و بوارەکەی بەس نەبوو. ئەگەرچی ئەو وای نیشان دەدا کە کۆتایی بە هەڕەشەکانی بەرنامەی چەکی ئەتۆمیی ئێران دەهێنێت، بەڵام ڕێککەوتنەکە هیچ شتێکی ئەوتۆی تێدانەبوو. لەڕاستیدا، هەڕەشەکان زیاتر بوون لەمیانەی ئەو هەڵمەتەی کە ئەو ناوی نابوو چارەسەر و ئینجا لە ڕێگەی لابردنی سەرنجەکان لەسەر مەترسییەکان و هەروەها هەڵگرتنی سزا ئابوورییەکان

---

(١) "هۆتێل کالیفۆرنیا" یەکێکە لە تراکەکانی ئەلبوومی هەڵۆکان، بۆ یەکەم جار لە شوباتی ١٩٧٧ پەخش کراوە. ئەم گۆرانییە باس لە زیادەڕەوی و چێژی ناوەند دەکات لە ئەمریکا. یەکێك بوو لە گۆرانییە بەناوبانگەکان و ئەوکات دەنگی دایەوە.

کە بووە هۆی برینێکی قووڵ بۆ ئابووریی ئێران، لەگەڵ ڕێگەدان بە تاران بۆئەوەی بێ هیچ تەگەرەیەك هەنگاو بنێت. جگە لە هەموو ئەوانەش، ڕێککەوتنەکە بەڕژدی مامەڵەی لەگەڵ هەڕەشەکانی تری ئێران نەدەکرد، هەڕەشەکانی وەکو: مووشەکی بالیستی (کە هەوڵێکی شاراوەیە بۆ گەیشتن بە چەکی ئەتۆمی)؛ هەروەها ڕۆڵی سەرەکی بەوەی کە بانکی سەرەکی جیهانییە بۆ تیرۆری جیهانی و ڕۆڵگێڕانە ناشیرنەکەی لە ناوچەکەدا، لەڕێگەی دەستتێوەردان و بەهێزکردنی فەیلەقی قودس و هەروەها وەك باڵێکی سەرەکی سوپای شۆڕشی ئیسلامییە لە عێراق، سووریا، لوبنان، یەمەن و شوێنەکانی تر. دوای هەڵگرتنی سزاکانی سەری و سوودوەرگرتن لە گواستنەوەی ١٥٠ ملیۆن دۆلار لە نێو پوشوپەلاش لە ڕێگەی باری فڕۆکەوە و هەروەها پاراستنی بلۆککردنی بڕێکی زۆر کە ئەویش بە ١٥٠ ملیار دەخەملێنرا لە سەرئاستی جیهان، ئیتر بەم جۆرە ئایەتوڵلاکانی تاران گەڕانەوە نێو گۆڕەپانی بازرگانی.

ترەمپ و کاندیدانی تری کۆماری لە ساڵی ٢٠١٦ هەڵمەتێکیان لە دژی ڕێککەوتنەکە ڕاگەیاند، بەڵام بەبوونی سیانەی تیلەرسۆن و ماتیس و ماکماستەر، ئەوا ترەمپ هیوابڕاو بوو لە ڕزگاربوونی لەم ڕێککەوتنە و پاشانیش میدیاکان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن و خۆیان وەك "دەستەی گەوران" نیشان دەدان و چەپڵەیان بۆ لێ دەدرێت و ترەمپیش قەدەغە دەکەن لە خەونبینین. لەڕاستیدا ئەگەر هەر تەنها زانیبوایان ئەوا زۆرێك لە لایەنگرانی ترەمپ هەوڵەکانی ئەویان دەبینی لەوەی کە قەدەغەی ئەویان کرد لە زۆرێك لەو پەیمانانەی کە بە دەنگدەرانی دابوو. هەروەها ئەمە هیچ شتێکی باش نەبوو بۆ ماکماستەر لەوەی کە دژایەتی دەستەواژەی "تیرۆری ڕادیکاڵی ئیسلامی" دەکرد، بۆ وەسفکردنی شتانێکی وەك... تیرۆری ڕادیکاڵی ئیسلامی. جیم بەیکەر وا ڕاهاتبوو ئەو کاتەی کە کارم

لەگەڵیدا دەکرد لە وەزارەتی دەرەوە لە حکوومەتەکەی بوش ٤١[1] گوشاری خستووەتە سەری لەبەر خاتری شتێك، بەڵام بوش نەیویستووە ئەمە بکات: "ئەمە ئاماژەیەك بوو بۆئەوەی کە پێویستە من لە گوشار بوەستم، بەڵام لەنێو ئیدارەکەی ترەمپ، ئەوەی کە دەیویست ئەوەبوو "ئەو پیاوەی کە هەڵبژێردرابوو" تەنها خاڵێك کە ئەو دەیویست ئەوەبوو کە زۆرترین زانیاری بێت.

لە سەرەتاکانی مانگی ئایاردا، دوای ئەوەی گفتوگۆیەکی ترمان لە کۆشکی سپی کرد، لەگەڵ پریبوس و بانۆن، بردمیان بۆ شوێنێك کە وادەرکەوت چانسێکە بۆ وێنەگرتن لەگەڵ ترەمپ و پێنس لەو ڕاڕەوەی کە بارەگاکە بە ئۆفیسی وێست وینگەوە دەبەستێتەوە. کاتێك بەدرێژایی ڕاڕەوەکە دەڕۆیشتین کە پڕبوو لە وێنەگر، ترەمپ گوتی: "جۆن، زۆر باشە کە توانیم چاوم پێت بکەوێت". باسی فلیپین ئەو هەڕەشانەی چین-مان کرد، بەوەی کە نیازیەتی دەریای باشووری چین بەتەواوی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. کاتێك تەواو بووین، ترەمپ بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد، بە جۆرێك کە ڕاگەیاندکارەکان گوێیان لێ بوو: "ئایا ڕێکس تیلەرسۆن لێرەیە؟ پێویستە لەگەڵ جۆندا قسەبکات".

لەگەڵ ئەوەشدا ترەمپ بەرەو ئوڤاڵ ڕۆیشت، پریبۆس گوتی: "ئەوە شتێکی زۆر باش بوو، ئێستا ئیمە دەمانەوێت بە ڕێکوپێکی تۆ بگەڕێنینەوە ئێرە". کۆشکی سپی پەرەی بە ڕیتمی تایبەتی خۆی دا، کاتێك ترەمپ بانگی بەڕێوەبەری نووسینگەی FBIی دەکرد لە مانگی ئایار (بە قسەی بانۆن بێت، ئەو کارە بە پێشنیاری کۆشنەر بوو)، پاشان دانیشتن و چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری دەرەوەی رووسی سێرگی لاڤرۆڤ (کە من تا ئەوکاتە نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بوو ئەوم دەناسی) و هەروەها

(١) مەبەستی جۆرج بوشی باوکە، کە چل و یەکەمین سەرۆکی ئەمریکا بوو.

هەروەك دەگوترێ زۆر کەم وریابوو لەمەڕ باسکردنی بابەتەکان، بەگوێرەی ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمزی بێلایەن بێت، بە کۆمی دەگوت "دەبەنگ". من لە کۆتایی مانگی ئایار لە ئیسرائیل بووم، بۆ پێشکەشکردنی گوتارێك، لەوێدا سەرۆك وەزیران بنیامین نەتانیاهوم بینی، کە من لە سەردەمی بوش ٤١ یەکەم جارم بوو ببینم. هەرەشەکانی ئێران کرۆکی باسەکەمان بوو، هەروەك کە دەبێت ئەمە بەرنامەی کاری هەر سەرۆك وەزیرانێکی ئیسرائیل بێت، بەڵام ئەو لەگوماندا بوو لە ڕاسپاردنی کۆشنەر بە کاری کۆتاییهێنانی کێشەکانی نێوان ئیسرائیل و فەڵەستین، کە نەتانیاهو ساڵانێك بوو خانەوادەکەی دەناسی. بوونی وەك سیاسییەك بەس بوو، نەوەك وەستانەوە دژی ئایدیای گشتی، بەڵام وەك تەواوی جیهان، لامان سەیربوو کە بۆچی کۆشنەر لای وابوو سەرکەوتوو دەبێت لەکاتێکدا کەسانێکی وەك کێسنجەر شکستیان هێنا. لە مانگی حوزەیراندا گەڕامەوە بۆ کۆشکی سپی بۆ بینینی ترەمپ، لەگەڵ پریبوسدا دەچووین بۆ نێو ئۆفیسی ئۆڤاڵ[1]. ترەمپ دەرگاکەی کراوە بوو، ئێمەی بینی و گوتی: "جۆن بەخێربێی، خولەکێك ڕووخسەتم بدە، ئیمزا بۆ دادوەرەکان دەکەم".

من دڵخۆش بووم بەوەی تەواوی ئەوکاتەی دەیەویست پێم بەخشی، چونکە پێشهاتەکان لە پاڵاوتنی دادوەرەکان، لەم کاتەی کە خەریکە ڕێزی لێ دەنرێت لەلایەن دانپێدانانی هەریەك لە دادوەرکانی نیل گورسوش و بریت کاڤانە، ئەمەش بۆ پارێزکارەکان بەرزترین پلە و گەورەترین دەستکەوت بوو بۆ ماوەی دەسەڵاتەکەی.

کاتێك لەگەڵ پریبوس چوومە ژوورەوە، پیرۆزباییم لە ترەمپ کرد لەسەر کشانەوەی لە ڕێککەوتنی گەرمبوونی جیهان، کە "دەستەی گەوران" شکستی هێنابوو لەوەی بیوەستێنێت و کە من بە سەرکەوتنێکی گەورەم دەزانی دژی فەرمانڕەوایەتی جیهان. ڕێککەوتنی پاریس هەر تەنها

نمایشێك بوو بۆ ئەوانەی بەڕاستی بەدەم پرسی گەرمبوونی جیهانن و هەروەك لە زۆربەی حاڵەتەکانی تریش هەروایە، ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییەکان بەتەواوی باسە سەرەکییەکان تاوتوێ دەکات، کە ئەمەش شتێکی وەك متمانە دەدات بە سیاسییەکان، بەڵام هیچ جیاوازییەکی ڕاستەقینە دروست ناکات (لەم حاڵەتەدا دەرچەیەکی دایە دەست وڵاتانی وەك چین و هیند، کە لە بنەڕەتدا ئەم کۆتەیان نەبوو). کۆپییەك لە وتارێکی خۆمم دا بە ترەمپ کە لە ساڵی ٢٠٠٠ لە گۆڤاری شیکاگۆ بۆ یاسای نێودەوڵەتی بڵاوم کردبوویەوە، بەناوی "ئایا پێویستە کە فەرمانڕەوایەتی جیهان و کێشەکانی بە ڕژدی وەربگرین؟"[1]، ئەمەش لەبەرئەوە نا کە من پێم وابێت ئەو دەیخوێنێتەوە، بەڵکو بۆ بیرخستنەوەی لە پاراستنی سەروەری ئەمریکا. من ترەمپم ئاگادارکردەوە لە بەهەدەردانی سەرمایەی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی عەرەب-ئیسرائیل و زۆر بەتوندی پشتگیری گواستنەوەی باڵیۆزخانەی ئەمریکام کرد بۆ قودس و دواجاریش دانپێدانانی وەکو پایتەختی ئیسرائیل. لەبارەی ئێرانیشەوە،

(١) ئەمە پوختەی توێژینەوەکەی بۆڵتنە، لە بەرگی یەکەم، ژمارەی دوو، لە ٩ کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠ بڵاوکراوەتەوە:
من وەکو ئەمریکییەك، باوەڕم وایە کە ڕۆژە خۆشەکان ئیدی کۆتاییان پێ هات، ئینجا لامان خۆش بێت یان نا، چوون جیهانگیرییەکان زیاترینی هەلیان گلداوەتەوە کە شەڕی سارد دروستی کردبوو بۆ پەرەپێدانی ئەجێنداکانیان. بە پشتبەستن بە ساڵانێك لە نووسین و بەشداریکردن لە کۆنفرانس و دەرکردنی بڕیارێکی زۆر و پەیوەندیگەلێکی زۆر لە بوارەکانی مافی مرۆڤ، کارکردن، تەندروستی، ژینگە، کاروباری سیاسی و سوپا و هەروەها ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان. ئەوکات جیهانگیرییەکان بەرەوپێش دەچوون لەکاتێکدا ئەمریکییەکان خەوتبوون. ئارێشەکانی ئەم دواییە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا و دەوروبەری ئەوە دەردەخات کە حیزبی ئەمریکی وشیاربوونەتەوە و ئەم زەرەر و زیان و تێچووەی کە ئەمریکا دەبێت لە ئەستۆی بگرێت، لە سەروەریی گەل و دەستوور کەم دەکاتەوە و هەروەها هەریەك لە سیاسەتی ناوخۆ و نێودەوڵەتیش دەبەستێتەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەمریکییەکان بەجۆرێك خۆیان دەبیننەوە، کە دەور دراون بە سوپاسەکی بچووکی جیهانگیرییەکان و هەریەك لەوانە دەستی گرتووە بە ڕێککەوتنێکی نوێ و دڵخوازی خۆی یانیش پێشنیارێکی چەند لایەنە.

پێداگریم لەسەر ئەوە کرد کە لە ڕێککەوتننامەی چەکی ئەتۆمی ئێران بکشێتەوە و بۆم ڕوونکردەوە کە بۆچی بەکارهێنانی هێز بەرامبەر بەرنامەی چەکی ئەتۆمی ئێران تاکە چارەسەرە. ترەمپ گوتی: "تۆ بە بیبی[1] بڵێ کە ئەگەر ئەو هێز بەکاربهێنێت، ئەوا من پشتگیری دەکەم، ئەگەرچی من پێم گوتووە، بەڵام تۆ دیسانەوە لێی دووبارە بکەوە". گفتوگۆکانمان بەردەوام بوو، ترەمپ پرسی: "ئایا تۆ هاوڕایت لەگەڵ تیلەرسۆن؟"، منیش گوتم لە مانگی کانوونی دووەمەوە قسەمان نەکردووە. ئەوەبوو بانۆن دوای چەند ڕۆژێك پێی گوتم کە ترەمپ دیدارەکەی بەدڵ بووە. لەڕاستیدا، دوای چەند هەفتەیەکی کەم، تیلەرسۆن پەیوەندی پێوە کردم کە ببم بەنێردراوی تایبەت بە پرۆسەی ئاشتەوایی لیبیا، کە من وەکو تاقیکردنەوەیەکی تر دەمبینی بۆ ئەوەی لە سندووقەکە دڵنیابینەوە، بەڵام خۆ تیلەرسۆن دەیتوانی بڵێت ئەو داوای لێم کرد و منیش ڕەتم کردەوە.

لە هەمان کاتدا تیلەرسۆن داوای لە کورت فۆلکر کرد، کە نزیك و هاریکاری مەککەین بوو، بۆئەوەی ببێتە نێردراوی تایبەت بە ئۆکرانیا. هیچ لەم کارانە پێویستی بە دەوامی تەواو نەبوو، بەڵام بەڕای من یان ئەوەتا لە ئیدارەکە بیت یان نا، ئەوەش کە هەمیشە نیوە لە ماڵ بیت و نیوە لە ڕێگا، ئەوا هیچ سوودی نییە. کۆریای باکووریش بە هەمان شێوە لە بیرۆکەی ئیدارەکەی ترەمپ دابوو، هەر لەگەڵ ئازادکردنی ئۆتۆ وارمبیر کە بەدەست مامەڵەی وەحشیەتگەریی پیۆنگ یانگ ناڵاندی لەگەڵ گەیشتنەوەی بە ئەمریکا کۆچیدوایی کرد[2]، ئەم وەحشیەتگەرییە هەموو

(١) مەبەست بنیامین نەتەنیاهۆی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلە.

(٢) ئۆتۆ فردریك وارمبیر خوێندکارێکی ئەمریکی بوو لە زانکۆ دەیخوێند، سەردانی کۆریای باکووری کرد و لەوێدا لە ڕۆژی گەڕانەوەی لە فڕۆکەخانەی وڵاتی کۆریای باکوور دەستگیر کرا، بە بیانووی دزینی پۆستەرێك لە هۆتێلەکە و پێشێلکردنی یاسای ئەم وڵاتە لە ٢ی کانوونی دووەمی ٢٠١٦. بە ١٥ ساڵ حوکم درا، پاش ماوەیەکی کەم لە حوکمەکەی تووشی نەخۆشیی پەیوەست بە دەمارەکان بوو، ئەوەبوو بۆ ماوەی

←

شتێکی پێ گوتین دەربارەی هەرشتێك کە بمانەوێت بیزانین سەبارەت بە کۆریای باکوور. سەرەڕای ئەوەش پیۆنگ یانگ خەریکی تاقیکردنەوەی مووشەکی بالیستی بوو، لە ٤ی تەمموز و هەروەها لە ٢٨ی هەمان مانگیشدا، ئەمەش وای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد کە لە ٥ی مانگی ئابدا کۆمەڵێك سزای زیاتر بەسەر کۆریا بسەپێنێت.

دوای چەند ڕۆژێك ترەمپ هاندرابوو بۆ ئاگر و تووڕەیی[(١)] بەرامبەر کۆریای باکوور، وەك ئەوەی کە جیهان هەرگیز هەڕەشەی وای بەخۆیەوە نەبینیبێت. ئەگەرچی تیلەرسۆن هەر ڕاستەوخۆ گوتی: "پێویستە ئەمریکییەکان ئەمشەو زۆرباش بخەون و هیچ نیگەرانی ئەم وتارە نەبن لە چەند ڕۆژی داهاتوو". من لام سەیربوو و نەمدەزانی کە تیلەرسۆن گاڵتە بە کۆریای باکوور دەکات یان ترەمپ، چوون ئەم هەڵوێستە لە ١١ی ئاب هەڵگیرا ئەوەی کە گوتی ئەمریکا بەرامبەر کۆریای باکوور "داخراوە". بەڵگەیەکی کەم لەبەردەست دابوو کە بیەوێت بۆ هەر ئامادەکردنێکی نوێی سەربازی خۆی ئامادە بکات.

لە٣٠ی ئاب ترەمپ تویتێکی کرد و گوتی: ئیمە بۆ ماوەی ٢٥ ساڵە دانوستان لەگەڵ کۆریای باکوور دەکەین بەبێ بوونی هیچ ئەنجامێك، ئیتر دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ ئەم وڵاتە سوودی نییە، ترەمپ ئەم خاڵەی لە ٧ی تشرینی یەکەم دووبارە کردەوە:

---

زیاتر لە ساڵێك لە هۆش خۆی چوو. دواتر پاش ماوەیەك ئازاد کرا و گەڕێترایەوە بۆ ئەمریکا، کە هێشتا بارودۆخی خراپ بوو. دوای شەش ڕۆژ لە گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا لە ڕێککەوتی ١٩ی حوزەیرانی ٢٠١٧ و لە تەمەنی ٢٢ ساڵی کۆچیدوایی کرد.

(١) fire and fury ئاگر و تووڕەیی: ئەمە وتارەکەی ترەمپ بوو، بەڵام ڕەنگە بۆڵتن بیەوێت بە ناڕاستەوخۆ ئاماژە بە کتێبەکەی مایکل وۆلف بکات بەناوی: (ئاگر و تووڕەیی: لەنێو کۆشکی سپی ترەمپدا)، هەروەك لە چەند لاپەڕەی داهاتوو دەیبینین!

بەرپرسان و ئیدارەکەی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵە لەگەڵ کۆریای باکوور گفتوگۆ دەکەن، ڕێککەوتنەکان پارەیەکی زۆریان تێدەچێت .. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتوو نابێت و ڕێککەوتنەکان بەر لە وشکبوونی مەرەکەبی سەر کاغەزەکە پێشێل دەکرێن و دانوستانکارە ئەمریکییەکان فریو دەدەن. بەداخەوە، بەڵام یەك تاکە شت هەیە لەگەڵ ئەوانەدا کاریگەر بێت!

ماتیس لە کۆریای باشوور، ڕاستەوخۆ دوای ئەوە قسەی لەگەڵ ترەمپ کرد و گوتی هەمیشە دەرچەیەك هەیە بۆ کاری دیبلۆماسی، ئەگەرچی هەر زوو دوای ئەوە پاشەکشەی کرد و گوتی هیچ ڕووناکییەك لەنێوان ئەو و سەرۆکدا نییە.

ناکۆکییەکان زیاتربوون. کۆریای باکوور شەشەم تاقیکردنەوەی خۆی بۆ چەکی ئەتۆمی لە ٣ی ئەیلول ئەنجام دا، تاقیکردنەوەی ئەم جارەی بریتی بوو لە بەکارهێنانی بۆمباردی ئەتۆمی، دوازدە ڕۆژ دواتر مووشەکێکی تری بەسەر ژاپۆندا هەڵدا، کە ئەمەش دەرخەری خاڵەکەی ترەمپ بوو لە تویتەکەی.

دوای ئەوە سەرۆك وەزیرانی ژاپۆنی گوتارێکی لە ڕۆژنامەی واشنتۆن تایمز بڵاوکردەوە، کە پوختەکەی ئەمە بوو: "گفتوگۆی زیاتر لەگەڵ کۆریای باکوور کۆتاییەکی باشی نابێت و من بەتەواوی پشتگیری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەم بەوەی کە هەموو بژاردەکان لەسەر مێزدا ئەنجام دراون"، ئەمەش نزیکترین و ڕوونترین شتێك بوو کە هەموو سیاسییەکی ژاپۆنی بیڵێت بەوەی کە پشتگیری دەستتێوەردانی سەربازی دەکەن. بەپێچەوانەوە تیلەرسۆن گوتی: "ئێمە دەمانەوێت کۆریای باکوور بانگێشتی دیالۆگێکی بنیاتنەر و بەرهەمدار بکەین". شتێکی ڕوون بوو کاتێك ترەمپ سزای نوێی دارایی بەسەر کۆریادا سەپاند و چینیش ڕایگەیاند کە بانکی ناوەندی وڵاتی ئاگادارکردووەتەوە کە هەموو بانکە چینییەکان دەبێ بوەستن لە مامەڵەکردن لەگەڵ پیۆنگ یانگ، ئەمەش

هەنگاوێکی باشی پێشەوەچوون بوو، ئەگەر بەڕاستی جێبەجێکرابووایە (زۆرێکیش گومانیان لێی هەبوو).

لەگەڵ ئەوەشدا، ئێران وەك خاڵێکی درەوشاوە مایەوە و لە مانگی تەممووزدا ترەمپ ڕووبەڕووی بڕیارێکی تر کرایەوە کە ئاخۆ ئێران ناچار دەکات پابەند بێت بە ڕێککەوتننامەی چەکی ئەتۆمی، بۆ خۆی لە ئەسڵدا یەکەم بڕیار کە لەمبارەیەوە دەرچوو، هەڵەبوو، ئێستا ترەمپ خەریك بوو هەمان هەڵە دووبارە بکاتەوە. من گوتارێکم بۆ هیل نووسی کە لە وێبسایەتەکەی بڵاوکرایەوە لە ١٦ی تەممووز. وادەردەکەوت کە کە مشتومڕ و شەڕەکە ڕۆژێکی تەواوی لەنێو کۆشکی سپی خایاندبێت. ماکماستەر و منوشن لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە ڕاگەیاندنەکانیان ئاگادار کردەوە لەو بڕیارەی کە ئێران ملکەچ بە ڕێککەوتنەکە دەکات، کۆشکی سپی لە ڕێگەی ئیمێڵەوە هەڵسا بە ناردنی "خاڵەکانی بڕیارەکە" بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بەڵام یەکێك لە شرۆڤەکارەکانی دەرەوە پێی ڕاگەیاندم "فەوزایەك دروست بووە لەنێو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی"، خاڵە نوێیەکان پاشەکشەیان پێ کرابوو و هەروەها پێچەوانەی ئەم بڕیارە دەرچوبوو.

نیویۆرك تایمز لە بەرپرسێکی کۆشکی سپی وەرگرتبوو کە مشتومڕەکە نزیکەی کاتژمێرێکی خایاندبوو لەنێوان ترەمپ لەلایەك و هەروەها ماتیس، تیلەرسۆن و ماکماستەر لەلایەکی تر. لە کۆتاییدا ترەمپ خۆی بەدەستەوە دا، بەڵام بە ناچاری و تەنها ئەوکاتەی کە داوای جێگرەوەی کردبوو، کەچی ڕاوێژکارەکانی گوتیان کە هیچ جێگرەوەیەکیان نییە. بانۆن پەیامێکی تەلەفۆنی بۆ ناردم، "پۆتۆس بەدڵی بوو ... گوتارەکەی تۆ ئەوی برد بۆ ئێران". دوای چەند ڕۆژێك ترەمپ پەیوەندی پێوە کردم لەبارەی چۆنییەتی چارەکردنی کێشەی ئێران و بەتایبەت لەبارەی "کەسانێك کە لە وەزارەتی دەرەوەدان" کە هیچ بژاردەیەکی تریان نەداوەتێ.

دواتر ئاماژەی بە دواهەمین گفتوگۆی من و تیلەرسۆن دا و گوتی: "گوێگرە من گوێبیستی ئەوە بوویمە کە ڕێکس تیلەرسۆن بە تۆی گوتووە سەبارەت بەوەی کە ئەم ڕێگایانە چارە نین، بۆیە هەمان گەمژەیی ئەو دووبارە مەکەوە، ئەگەر شتێکی باشی پێشکەش کردیت ئەوا زۆرباشە، بەڵام تۆ چاوەڕێ بکەم، من پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە". پەیوەندییەکەی بەوە کۆتایی پێ هێنا کە "پێویستە هەفتەی داهاتوو لەوێ ئامادەبم و ببینم" سەبارەت بە ئێران. بانۆن دوای ئەوە ڕاستەوخۆ نامەیەکی بۆ ناردم "ئێمە هەموو ڕۆژ لەبارەی تۆ و ئەوەوە قسە دەکەین".

من گوتم کە پلانێك ئامادە دەکەم کە چۆن ئەمریکا لەم ڕێککەوتنەی ئێران پاشەکشە بکات، ئەمەش شتێکی قورس نەبوو. ڕۆژی دواتر، شۆن سپایسر وازهێنانی خۆی ڕاگەیاند لە وتەبێژی کۆشکی سپی وەکو نارەزاییەك بەرامبەر بەدیاریکردنی ئەنتۆنی سکاراموتشی وەك بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان، هەروەها سارە ساندەرز وەکو جێگری سپایسر دیاریکرا. دوای هەفتەیەك ترەمپ هەڵسا بەدەرکردنی پریبۆس، دواتر دەستنیشانکردنی جۆن کێلی و پاشان وەزیری ناوخۆ و ژەنەراڵی خاوەن چوار ئەستێرە وەکو ئەرکانی سوپا لە کۆشکی سپی. لە ڕۆژی دووشەممە ڕۆژی ٣١ی تەمموز، کێلی ساکاراموتشی دەرکرد لە ناوەڕاستی مانگی ئابدا، هەروەها کۆمەڵێك مشتومڕ کەوتنە سەر ترەمپ سەبارەت بە خۆپیشاندانی نیۆ-نازییەکان (نازییە-نوێیەکان) لە چارلۆتسڤیل لە ڤێرجینیا. لە ١٨ی مانگی ئابدا بانۆنیش دەرکرا. ئایا ئەمە هەموو ئەو زانیارییە بوو کە کۆلێژەکانی بەڕێوەبردن سەبارەت بە دامەزراوە گەورەکان؟ ئەوەی کە ڕوویندەدا ئەوەبوو کە هیچ ئاماژەیەك نەبوو لە کۆشکی سپی لایەنگری ڕێککەوتننامە ستراتیژییەکەی من سەبارەت بە ئێران بێت، کە من پێشتر بۆ بانۆنم ناردبوو. کاتێك بەدوای ئەوەبووم چاوم بە ترەمپ بکەوێت، ویسترهوت پێشنیاری کرد کە سەرەتا تیلەرسۆن ببینم، ئەمەش ئەو شتە بوو کە بەفیڕۆدانی کات بوو بۆ هەردووکمان.

من گومانم لەوە هەبوو کە هەوڵەکانی کێڵی بۆ لێکۆڵینەوە و ڕێکخستنی کارەکانی کۆشکی سپی و سنووردانان بۆ فەوزاکانی ئۆفیسی ئۆڤاڵ بەتایبەت دەبێتە هۆی "هاتنە ناوەوە" و هەروەها کۆمەڵێك شتی تر. پێم وابوو کە شەرمە بۆ من پلانەکەم سەبارەت بە ئێران ئاوا سیس و بێ ناز بێت، بۆیە پێشنیارم بۆ سەرنووسەری ناشناڵ ڕیڤیوو، بەڕێز ڕیچ لۆوری کرد کە بڵاوی بکاتەوە، ئەویش ئەوەبوو لە کۆتایی مانگی ئابدا بڵاوی کردەوە. وەزیری دەرەوەی ئێران جەواد زەریفی ڕاستەوخۆ ڕایگەیاند کە ئەم پلانەی من "شکستێکی گەورەیە بۆ واشنتۆن". من دەمزانی کە لەسەر ڕێگەی ڕاستم. لەجیاتی ئەوەی کە تەرکیزیان لەسەر جەوهەری پلانەکەم بێت، کەچی زۆرینەی ڕاگەیاندنەکان لە واشنتۆن تەرکیزیان لەسەر ئەوەبوو کە من دەستم لە چوونە نێو ئیدارەکەی ترەمپ بەربوو، ڕەنگە لەبەرئەوەی کە ئەوان داوای چوونە نێو پالاس باشتر ببینن لە سیاسەت. کۆشنەر پەیامێکی بۆ ناردم کە دەیگوت: "هەرکاتێك ویستت بێیتە نێو کۆشکی سپی بەخێربێیت" و هەروەها "ستیڤ (بانۆن) و من لەسەر زۆر شت ڕاجیا بووین، بەڵام سەبارەت بە ئێران هاوڕابووین". لەڕاستیدا، کۆشنەر داوای لێ کردم کە ڕۆژی ١٣ی ئاب لەگەڵیدا کۆببمەوە سەبارەت بە پلانەکەی کە پەیوەستە بە ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەروەها لەگەڵ ئێرانیش. تا ماوەیەکی درێژ، من بیرم بۆ ئەوە نەچوو کە ئەم کۆبوونەوەیە بە ڕێککەوت بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، تا ئەوکاتە هیچ وشەیەك لە ترەمپەوە گوێبیست نەبووم، سەرەڕای ئەوەی کە ڕەشنووسێکی تر سەبارەت بە ئێران لە ئارادا بوو، کە بەپێی یاسا دەبوو هەموو ٩٠ ڕۆژ جارێك ئەمە هەبێت، ئیدی ئەوەبوو لە تشرینی یەکەم هات. کۆشکی سپی ڕایگەیاند کە ترەمپ گوتارێکی گرنگ دەدات سەبارەت بە ئێران لە ١٢ی تشرینی یەکەم، بۆیە بڕیارم دا لە شەرمکردن بوەستم و پەیوەندیم کرد بە ویسترهوت بۆ بینینی ترەمپ. ئەوکات، تیلەرسۆن گوتبووی کە ترەمپ "گەمژەیەکی بێ قیمەتە"، کە هەر خۆیشی بەشیوەیەکی ڕەها ڕەتی دەکردەوە.

دەنگۆی ئەوە هەبوو کە کێلی ویستوویەتی واز لە پۆستی ئەرکانی سوپا بهێنێت و پۆمپەیۆ شوێنی بگرێتەوە، سەرەڕای بوونی دەنگۆی تریش کە گوایە پۆمپەیۆ شوێنی ماکماستەر دەگرێتەوە. منیش تا ئەوکاتە هەر بە پرسی ئێرانەوە خەریك بووم و دیسانەوە گوتارێکی تری ڕاوبۆچوونم بۆ هیل نووسی بەهیوای ئەوەی ئەمجارە جادووەکەم سەر بگرێت. لە ٩ی تشرینی یەکەم بڵاوبوویەوە، لە هەمان ئەو ڕۆژەی کە نانی نیوەڕۆمان لەگەڵ کۆشنەر خوارد لە ئۆفیسەکەی، سەرەڕای ئەوەی کە باسی پلانەکەیمان کرد سەبارەت بە ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشابوو ئەو وێنەیە بوو کە من تایبەت بۆ ئۆفیسەکەی ڕۆبەرت مولێرم هێنابوو، کە لە هەمان ئەو بینایەیە کە لیژنەی کاری سیاسی باڵای لێیە. ڕاگەیاندنەکان وایان بڵاوکردەوە کە ڕاوێژکارانی ترەمپ سوورن لەسەر ڕەتکردنەوەی دۆسیەی ئێرانی تایبەت بە چەکی ئەتۆمی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمریکا تیایدا دەمێنێتەوە. من ئەوەم وەك خۆ-زەبوونکردنێك دەهاتە بەرچاو، بەڵام ئەمە شتێکی دیاربوو کە ئەوانەی پشتگیری دۆسیەکەیان دەکرد ئامادەبوون ملکەچی ئەم خاڵانە بن، کە ڕەخنەی لەسەرە، هەر تەنها لەبەر ئەوەی دۆسیەکە سەربگرێت. ترەمپ لە درەنگانێکی دوای نیوەڕۆی ١٢ی تشرینی یەکەم پەیوەندی پێوە کردم (گوتارەکەی خرابوویە ڕۆژی هەینی ١٣ی مانگ) بۆئەوەی قسە بکەین، ئەو گوتی: "من و تۆ بەیەکەوەین لەم ڕێککەوتنە، ڕەنگە تۆ تۆزێك لە من توندتر بیت، بەڵام هەردووکمان وەك یەك دەیبینین". من بەوە وەڵامم دایەوە کە دەشێ لە پێگەی ئێران کەم بکەیتەوە، بەڵام ڕێککەوتنەکەش هەر دەمێنێت، ئەمەش هیچ نەبێت هەنگاوێکە بۆ پێشەوە. من داوام کرد کە ئەگەر کات هەبوو ئەوا زیاتر قسەی لەسەر دەکەین، ترەمپیش گوتی "سەد دەر سەد، سەد دەر سەد، من دەزانم ئەمە ڕای تۆیە، من زۆر بە ورياييەوە سەرنجی ئەوە دەدەم کە تۆ دەیڵێیت".

پرسیارم کرد کە ئاخۆ ئەم ڕستەیە دەخاتە نێو گوتارەکە، بەوەی بڵێت کە ڕێککەوتنەکە بۆ ماوەی ۷ ڕۆژ و هەر حەوت ڕۆژەش ۲ کاتژمێر لەژێر وردبینیدا بووە و شیاوی کۆتاییپێهێنان بووە لەهەرکاتێکدا (هەروەها ئەمەش وادەکات کە پێویست بەوە نەبێت ۹۰ ڕۆژی تر بوەستیت، بەرلەوەی هەڵی کشانەوەی هەبێت و بەئاشکرا شەڕ لەسەر کشانەوە بکە نەوەك قەبوولکردن، هەروەك لایەنگرانی ڕێککەوتنەکە پێیان باش بوو). باسی ئەو زمانەمان کرد کە ترەمپ لە ژوورەکە بەکاری دەبات و بەسەر ئەوانی دیکەشیدا سەپاندووە. پاشان ترەمپ باسی سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران کرد و پرسیاری ئەوەی کرد کە ئاخۆ دەکرێت وەکو دامەزراوەیەکی تیرۆریست ناوزەندیان بکەین و هەروەها وڵاتەکەش ملکەچی زیاتری سزاکان بکەین. من هانم دا کە وابکات بەهۆی ئەوەی کە ئەم سوپایە دەستی بەسەر بەرنامەی چەکی ئەتۆمی ئێران و مووشەکی بالیستیدا گرتووە، هەروەها یارمەتی تیرۆری ئیسلامی ڕادیکاڵی سوننی و شیعی دەدات. ترەمپ گوتی ئەو گوێبیستی ئەوە بوو کە ئێران بەم وەسفە بێزار دەبێت و ڕەنگە پەرچەکرداری کاردانەوەش هەبێت بەرامبەر هێزەکانی ئەمریکا لە سووریا و عێراق، ئەمەش بەم دواییە لە ماتیسم زانیوە. بەڵام قسەکەی هەڵە بوو، ئەگەر ماتیسیش ڕاست بوایە، ئەوا وەڵامەکە بەم جۆرە بوو بەوەی کە دەبێت هێزی زیاتر بۆ پاراستنیان بنێرین یان هێزەکان بکێشینەوە لەبەر هەڕەشەکانی ئێران. دوو ساڵی دەوێت تاوەکو سوپای پاسداران وەکو دامەزراوەیەکی تیرۆریست بناسێنین. هەروەها ترەمپ گوتی کە ئەو بیر لەوە دەکاتەوە شتێك لەبارەی کۆریای باکوورەوە بڵێت و منیش زۆر هانم دا تا وا بڵێت. ڕۆژی هەینی گوتی: "خەڵکانێکی زۆر لەو باوەڕەدان کە ئێران مامەڵە لەگەڵ کۆریای باکوور دەکات. من ئاژانسەکانی زانیاری ڕادەسپێرم بۆئەوەی کە لێکۆڵینەوەیەکی ورد بکەن و ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل سەبارەت بە دەرەنجامەکان پێشکەش بکەن لەوەی

کە دەستیان دەکەوێت". من بەوە دڵخۆش بووم و گوتم کە حەزدەکەم جارێکی تر بتبینم، ترەمپ گوتی: "بەدڵنیاییەوە". (دواتر لە تشرینی دووەم و لە ڕۆژی لەدایکبوونم، ترەمپ کۆریای باکووری خستەوە نێو لیستی ئەو وڵاتانەی کە پشتگیری تیرۆر دەکەن، کە ئیدارەی بوش ٤٣ بەهەڵە لەم لیستەی دەرهێنابوو).

لام وابوو کە قسەکانی ترەمپ چوار دەستەکەوتی وەدەست خستوون: (١) دۆسیەی ئێران لەژێر وردبینی و مشتومڕ دابوو، هەروەها شیاوی ئەوەبوو هەرکاتێك بیانەوێت لێی بکشێنەوە. (٢) باسکردنی پەیوەندی نێوان ئێران و کۆریای باکوور. (٣) ئاشکراکردنی ئەوەی کە سوپاسی پاسدارانی ئێرانی دەبێت وەکو ڕێکخراوێکی تیرۆریستی بناسرێن و هەروەها (٤) پابەندبوونی نوێ کە دەمتوانی ببینم بەبێ ئەوەی ڕەزامەندی تر وەدەست بخات. بەجۆرێکی تر، لەمیانەی قسەکردنی لەگەڵ من لە ڕێگەی بڵندگۆی تەلەفۆنەکە، هەموو ئەو خاڵانە ڕوون بوون، ئینجا بۆ هەرکەسێك کە لەگەڵیدا بوو لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ. لەڕاستیدا پرسیم کە ئاخۆ دەتوانم چیتر بکەم ئەگەر هەر بەراستی لەنێو ئیدارەکەدا بووام، لەوەی کە لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە و بەر لە چەند کاتژمێرێك بەر گوتارەکەی قسە بکەین.

کۆشنەر لە ١٦ تشرینی دووەم منی هێنایەوە کۆشکی سپی بۆ گفتوگۆکردن سەبارەت بە پلانەکەی کە تایبەت بوو بە ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. من هانم دا بەوەی گوتم کە ئێمە باشتر وایە لە ئەنجوومەنی مافەکانی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بکشێینەوە لەوەی کە بچینە ژێر باری پلانەکەی هالی بۆ "چاکسازی. (سەیری بەشی هەشتەم بکە). تەواو شوورەیی بوو بۆ ئەنجوومەنەکە کاتێك لە ٢٠٠٦ لە دژی ئەو دەنگیان دا، دوای ئەوەی پێشینەکان ئەم شتە بێنرخەیان لادا. ئیمە نەدەبوو هەرگیز بگەڕێینەوە هەروەك ئۆباما کردی. هەروەك من داوای ئەوەم کرد کە ئەو پشتگیرییە داراییە هەڵبوەشێنینەوە کە بە نەتەوە

یەکگرتووەکان دەدرێت بۆ پاڵپشتی پەنابەرە فەلەستینییەکان، بەڵام بەتێپەڕبوونی چەند دەیەیەك بوو بە دەزگایەکی فەلەستینی نەك ئەوەی کە دەزگایەکی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت. کۆشنەر دووجار گوتی کە چەندە باش دەبێت لەوەی کە ئەگەر من لەجیاتی ئەو بەڕێوەبەرێتییەی هەیە لەنێو حکوومەتدا کار بکەم. لە سەرەتاکانی مانگی ئەیلوول ترەمپ پابەندبوونی خۆی بە پەیمانەکانی ٢٠١٦ ڕاگەیاند، بەوەی کە قودس پایتەختی ئیسرائیلە و باڵیۆزخانەی ئەمریکاش دەگوازرێتەوە ئەوێ. بەر لە چەند ڕۆژێك پەیوەندی پێوە کردم و منیش پشتگیری خۆمم بۆ دووبارە کردەوە، ئەگەرچی ئەو دەمێك بوو بڕیاری ئەوەی دابوو ئەم شتە بکات. چاوەڕوانییەکەی زۆری کێشا و لە تەنگوچەلەمەکانی شەقامی عەرەبی شکستی هێنا کە هەروەك "ئەزموونداره‌کان" پێشبینیان کردبوو. زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان سەرنجیان خستە سەر هەڕەشە ڕاستەقینەکە، کە ئێران بوو نەوەك ئیسرائیل. لە کانوونی دووەم ئەمریکا هەڵسا بە بڕینی بوودجەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ خستنە سەرکار و یارمەتیدانی پەنابەران، ئەوەبوو تەنها ٦٠ ملیۆن دۆلاری خەرج کرد بە بەراورد بە پێشوو کە ١٢٥ ملیۆن دۆلار بوو، یان یەك لە شەشی تەواوی بودجەی ٢٠١٨ کە دەگەیشتە ٤٠٠ ملیۆن دۆلار. لە ٧ی کانوونی یەکەم ترەمپ جارێکی تر بانگێشتی کۆشکی سپی کردمەوە. من لە ئۆفیسی وێست وینگ دانیشتبووم و چاوم بڕیبووە درەختی کریسمسەکە و پێی سەرسام بووم کاتێك ترەمپ لەگەڵ چاك شومر و نانسی پیلۆسی هاتن ڕاستەوخۆ دوای کۆبوونەوەی سەرانی کۆنگرێس. ئێمە هەموو تەوقەمان کرد و بەرپرسەکان دەستیان بە وێنەگرتن کرد لەگەڵ درەختەکە. لەکاتێکدا کە من سەیرم دەکردن، جۆن کێلی ئانیشکی گرتم و گوتی: "با لێرە بڕۆینە دەرەوە بچینە نێو کۆبوونەوەکەمان".

چووین بۆ ئۆڤاڵ و ترەمپیش یەکسەر دوای ئەوە هات لەگەڵ پێنس. سڵاومان گۆڕییەوە و دواتر پێنس ڕۆیشت و من و کێلی بەرامبەر بە

ترەمپ دانیشتین، ئەویش لە پشت مێزەکەی ڕووزڤێڵت بوو. دەستخۆشیم لێ کرد بەوەی کە باڵیۆزخانەی ئەمریکای گواستەوە قودس و دواتر هەرزوو چووینە سەر پرسی ئێران و کۆریای باکوور. من باسی ئەم پەیوەندییانەم کرد کە لەنێوان هەر دوو دەوڵەتدان، وەکو فرۆشتنی مووشەکی سکود لەلایەن کۆریای باکوورەوە بە ئێران بۆ ماوەی زیاتر لە بیست و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا. هەروەها تاقیکردنەوەی مووشەکی هاوبەشیان لە ئێران لە ساڵی ١٩٩٨ (دوای خۆپیشاندانەکانی ژاپۆن، پیۆنگ یانگ ڕایگەیاند کە لە تاقیکردنەوەی مووشەك لە نیمچە دوورگەکە دەوەستێت، ئەمەش دوای ئەوەی کە مووشەکێك کەوتە نێو ئۆقیانوسی هێمن لە ڕۆژهەڵاتی ژاپۆن) و هەروەها ئامانجی هاوبەشی هەردوو وڵات لە پەرەپێدانی هۆکارەکانی وەدەستخستنی چەکی ئەتۆمی.

ئەوەی کە پەیوەندی بە چەکی ئەتۆمییەوە هەیە عەبدولقادرخانی پاکستانی تەکنۆلۆژیای پیتاندنی یۆرانیۆمی بە هەردوو وڵات فرۆشتبوو (کە ئەمیش لە کۆمپانیای یورینکۆی-سنووورداری ئەورووپی دزی بوو بۆ پاکستان) و هەروەها دیزاینی چەکی ئەتۆمی (یەکەمجار چین فرۆشتبووی بە پاکستان). کۆریای باکوور کوورەی چەکی ئەتۆمی لە سووریا دروست کردبوو کە ئیسرائیل لە ٢٦ی ئەیلوولی ٢٠٠٧ تەقاندیەوە، کە بە نزیکەیی لەوە دڵنیاین لەلایەن ئێرانەوە پاڵپشتی دارایی دەکرا، هەروەها من باسی ئەوەم کرد کە ئێران چۆن هەر شتێکی بوێت دەتوانێت زۆر بەئاسانی لە کۆریای باکوور بیکڕێت لەهەر کاتێك بیەوێت، (ئەگەر لەوەو پێش لێی نەکڕیبێت). هەڕەشەکانی وەدەستخستنی چەکی ئەتۆمی لەلایەن کۆریای باکوورەوە قابیلی بەدەستەوەدان بوو، بەڵام پاش گرتنی چەند ڕێوشوێنێك. یەکەم، ئەو ستراتیژییەتە دەوەستێتە سەر لێکۆڵینەوە لە نیاز و تواناکان. زۆربەی جاریش خوێندنەوە و زانستی ئەوەی لە نیەت و نیازی ئەوانی تردا هەیە زۆر قورسە؛ ئاسانە کە بەشێوەیەکی گشتی تواناکان هەڵ بسەنگێرێت (تەنانەت کە ئێمە گرەنتیی ئەوەمان لایە کە زیرەکیمان تەواو

نییە). بەڵام کێ دەیەوێت بزانێت چی لەنێو مێشکی ئەو بەرپرسانەی نێو دیکتاتۆریەتی شیوعی دەگوزەرێت، سەبارەت بە خێراکردن لە دەستخستنی تواناکان بۆ چەکی نەوەوی؟ دووەم، دەشێ کۆریای باکوور کە خاوەن چەکی ئەتۆمی بێت هەڕەشە لە وڵاتانی دراوسێی وەکو ژاپۆن و کۆریای باشوور بکات کە خودان هیچ هێزێکی ئەتۆمی نین (لەوێدا هێزێکی زۆری بەربڵاومان هەیە) و تەنانەت دەشێ ئەم هەڕەشانە دژی ئەمریکاش بن، بەتایبەت لە سەردەم و لەژێر سێبەری سەرۆکێکی لاواز و بێهێز. سێیەم، کۆریای باکوور چەندین جار ئەوەی نیشان داوە کە هەر شتێکی بیەوێت بە هەر کەسێکی دەفرۆشێت کە پارەی هەبێت، بۆیە فرۆشتنی ئەم چەکانە بە ناوچەی ئەمازۆن[1] زۆر لە ئێمەوە دوور نییە.

من ئەوەم ڕوونکردەوە کە چۆن و بۆچی لێدان لە کۆریای باکووری خاوەن بەرنامەی ئەتۆمی و مووشەکی بالیستی سەردەگرێت؛ چۆن دەتوانین کە مووشەکی ئاسایی بگرینە تۆپەکانی بیۆنگ یانگ و هەروەها باکووری ناوچەکەی کە لە چەك داماڵراوە و هەڕەشە لە سیئۆل دەکات، هەروەها کەمکردنەوەی زیانەکانیش و بۆچی ئەمریکا زیاتر لە بژاردەی دووانی نزیك دەبوویەوە، لەگەڵ گریمانەی ئەوەی کە چین بەشێوەیەکی گەورە مامەڵەی نەکرد، ئینجا بە ڕێگرینەکردنی لە کۆریای باکوور لەگەڵ بەرنامە ئەتۆمییەکەی و یان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی. جێگرەوەکانی

(١) سەبارەت بە نیوەگۆی باشوور، چۆمسکی پێی وایە کە بۆلسنارۆی بەرازیل لە ئێستادا کەوتووەتە خۆی و چەندین کۆمپانیای لەسەر ئەمازۆن دروستکردووە و خەریکی تێکدانی دارستانەکەیە و جگە لە وەدەستخستنی پارەی زیاتر، بیر لە هیچ شتێکی تر ناکاتەوە، ئەو پێی وایە کە بۆلسنارۆ ڕێك کۆپیی ترەمپە و لە داهاتووشدا ڕۆڵی سەرەکی دەبێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە دیارە ئەمەش جگە لە لەقکردنی پێگەی ئەمریکا، لە هەمان کاتدا هەڕەشەشە. بۆلتن بە جۆرێك لە جۆرەکان ئاماژە بەم هەڕەشەیە دەکات کە چی دەبێت ئەگەر وڵاتانی ئەم ناوچەیەی نزیك ئەمریکا چەکی ئەتۆمی دەستبخەن.

تر ئەوەبوون کە یان هەردوو کۆریا یەك بخرێنەوە و بخرێتە ژێر ڕکێفی کۆریای باشوور، یان دەسەڵاتی کۆریای باکوور بگۆڕدرێت، بۆ هەردوو بژاردەش دەبوو داوای هاریکاریی چین بکرێت، کە تا ئێستا هەر لەلایەنەوە باسیشمان نەکردووە. ترەمپ پرسیاری کرد: " لەبارەی جەنگ لەگەڵ کۆریای باکوور چی دەڵێی؟ پەنجا بە پەنجا؟". من گوتم کە پێم وایە ئەوە دەوەستێتە سەر چین، بەڵام ڕەنگە ئەوان پەنجا بە پەنجایان قەبووڵ بێت، ترەمپ ڕووی بۆ لای کێلی وەرگێڕا و گوتی: "ئەو لەگەڵ تۆ هاوڕایە". لەمیانەی ئەم یەکتربینین و گفتوگۆیە (کە نزیکەی سی و پێنج خولەکی خایاند)، ترەمپ نارەزایی خۆی لە تیلەرسۆن نیشان دا و گوتی کە ئەو لەوە دەچێت کۆنترۆڵی حکوومەتی پێ نەکرێت. ترەمپ پرسیاری کرد کە "بۆچی وایە؟"، منیش گوتم لەبەرئەوەیە کە تیلەرسۆن ئیدارەکەی بە کەسانی پسپۆڕ پڕنەکردووەتەوە. هەروەها باسی ئەوەم کرد کە دەوڵەت چەندە پێویستی بە "شۆڕشێکی کولتووری" هەیە بەهۆی نارەزوومەندبوونی لە بەڕێوەبردنی وەزارەتی دەرەوە هەر تەنها لەلایەن خۆیەوە، بەتایبەت لەژێر سێبەری سەرۆکە کۆمارییەکان، ترەمپ و کێلی هەردووکیان سەری ئەرێنیان بۆ قسەکانم لەقاند. ترەمپ لە کێلی پرسی ئاخۆ تیلەرسۆن هەڵەیە و کێلێش گوتی کە تیلەرسۆن دەیەوێت چەقی بڕیارەکان بەدەستی خۆی بێت. من هاوڕای بووم، بەڵام گوتم دەسەڵاتی جێبەجێکردن و ڕاسپاردن دەبێ بەهاوشانی و سەرپەرشتیاری بێت و هەروەها کەسانێك دابمەزرێن کە پسپۆڕ بن لەم بوارە. کێلی ڕەزامەند بوو و گوتی "جێبەجیکردن و ڕاسپاردن دەبێ بە سەرپەرشتیکردن بێت". پاشان ترەمپ بە کێلی گوت "جۆن دەزانێت کە چۆن ئەم شوێنە (دەوڵەت) دەچێتە پێش و دواوە". کێلی هاوڕا بوو. کاتێك کۆبوونەوەکەمان تەواو بوو، ترەمپ گوتی کە "تۆ ئامادەی کە بێیتە شوێنێکی شیاو.. ڕاستە؟" منیش پیکەنیم و گوتم "بۆ شوێنی شیاو، بەڵێ". کاتێك لەگەڵ کێلی

گەڕاینەوە بۆ هۆڵەکەی وێست وینگ، کێلی گوتی: "ئەم پیاوە تۆی بەدڵە، پاش ئەوەی تەواوی ڕۆژەکە لێرە بووین، ئەو لەماڵەوە پەیوەندیم پێوە دەکات لە کاتژمێر نۆ و نیو و دەڵێ "ئایا بۆلتن-ت بینییەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن؟". ئەوەبوو منیش بە کێلیم گوت کە هەرکاتێك پێویستت بە یارمەتی بوو پەیوەندیم پێوە بکە و دوای ئەوە ئەوێم جێ هێشت. بەر لەهەفتەیەك لە کریسمەس، جارێکی تر بۆ ماوەی چل خولەك لەگەڵ کۆشنەر کۆبوومەوە سەبارەت بە پلانی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەروەها لە ماوەی ئەو مانگەدا دووجاری تر بە تەلەفۆن قسەمان کرد. لە کۆتایی ئەو مانگەدا بۆ ماوەی مانگێك شتەکان هێورتر دەرکەوتن. ساڵی نوێتان پیرۆزا!..

لە٦ی کانوونی دووەم، لەمیانەی کۆمەڵێك لێدوانی ڕۆژنامەکان لەسەر کتێبی "ئاگر و تووڕەیی"[(١)] دەربارەی ترەمپ، تویتێکی کرد کە ئەو "بلیمەتێکی زۆر بێدەنگ بوو". لەگەڵ نزیکبوونەوەی بڕیارێکی تری سەرۆکایەتی سەبارەت بە ڕەزامەندی لەسەر سزای پێشوەختە لەسەر ئێران، من بڕیارم دا کە پشوویەك بدەم. بەڵام ئەوان دەیانزانی کە چۆن من بانگ بکەن کاتێك بیانەوێت، کەس تەلەفۆنی نەکرد. ترەمپ هەمان ئەو شتەی دووبارە کردەوە کە لە تشرینی یەکەم دووبارەی کردەوە، لەوەی کە ڕێگری کرد سزاکان سەرلەنوێ بگەڕێندرێنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێران ملکەچ نەکرا بە ڕێککەوتنەکە، کەوابوو هیچ بەرەوپێشچوونێك نەبوو. پاشان کۆریای باکوور گەڕایەوە سەنتەری باسەکان چوون کۆریای

(١) کتێبی (ئاگر و تووڕەیی: لەنێو کۆشکی سپیی ترەمپدا)ی مایکل وۆلف، ئەم کتێبە لە ساڵی ٢٠١٨ دەرکەوت و باس لە مامەڵەی ترەمپ دەکات لە دیاریکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ پڕکردنەوەی پۆستەکانی ئیدارەکەی لە ساڵی ٢٠١٦. جێگەی ئاماژەیە کە ئەم کتێبەش وەکو ئەم کتێبەی بەردەستت، هەڵایەکی گەورەی نایەوە و وای کرد ترەمپ لە تویتەر بە درۆ و هەڵبەستراو وەسفی بکات.

باشوور میوانداریی ئۆڵۆمپیادی زستانەی کردبوو. پێنس و ئیڤانکا ترەمپ نوێنەرایەتی ئەمریکایان دەکرد، بۆ قسەکردن لەگەڵ نوێنەرانی کۆریای باکوور. من چەند چاوپێکەوتنێکم ئەنجام دا کە لایەنگیری پێنسم کرد بەوەی نەیهێشتووە کۆریای باکوور پڕوپاگەندە بکات لەبارەی ئەمریکاوە. پێنس تویتێکی کرد کە نووسیبووی: "ڕاستت فەرموو جۆن بۆڵتن"، کە ئەمەش ئاماژەیەکی باش بوو. بەشێوەیەکی ئاسایی سەرۆکی کۆریای باشوور هەوڵی دەدا ئەمە وەك دەستکەوتێکی سیاسی سەیر بکات و لێکەوتەی چاکی هەبێت بەوەی کە هەردوو کۆریا لەسەر ئاستی باڵا دانیشتوون و بەتایبەتیش خوشکەکەی کیم جۆنگ ئوون، ناوی کیم یو جونگ بوو (کە ئەمریکا وەك پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ ناوەزەندی کردووە). لەڕاستیدا، کیم یو جونگ هەڵسا بە داوەتکردنی موون جای بۆ باکوور و ئەویش ڕاستەوخۆ قەبووڵی کرد. دواتر دەرکەوت کە سیئۆل خەرجیی بەشداریکردنی پیۆنگ یانگی لە ئەستۆ گرتووە بۆ بەشداریکردن لە ئۆڵۆمپیادەکە، ئەمەش لەبەر هیچ ڕۆحێکی ئۆڵۆمپیادی نەبوو، بەڵکو لەبەر پەیڕەوکردنی شێواز و نموونەیەکی باش-دامەزراو بەڵام غەمگین بوو. چەپەکانی کۆریای باشوور ئەم "سیاسەتی ڕۆشنایییە"یان بەگرنگ دەزانی و لە بنەڕەتدا لایان وابوو کە باشبوون لەگەڵ کۆریای باکوور دەبێتە هۆی ئاشتیی نیمچە دوورگەکە. بەڵام بەپێچەوانەوە ئەمە تەنها خزمەتی بە دیکتاتۆریەت دەکرد. لە ٦ی ئازاردا، من کۆبوونەوەیەکی ترم هەبوو لەگەڵ ترەمپ. لە هۆڵەکەی ئۆفیسی ویست وینگ چاوەڕوانم دەکرد، لە تەلەفزیۆنەکە سەیرم دەکرد کاتێك پەیامنێرێك پرسیاری ئەوەی لێ کرد کە بۆچی واهەست دەکات کۆریای باکوور ئامادەی دانوستانە؟! ئەوەبوو ترەمپ بە دڵخۆشییەوە وەڵامی دایەوە "من". من هیوام دەخواست ئەو لەوە بگات، کە کۆریای باکوور باش دەزانێت ئەو وەك ئۆباما نییە و گەر پێویست بکات ئامادەیە هێزی سەربازی دژی بجووڵێنێت. نزیکەی کاتژمێر

٤:٤٠ چوومە ئۆڤاڵ و جارێکی تریش بەرامبەر بە مێزە خاوێنەکەی ڕووزڤێڵت دانیشتم. کاتێك کێلی هاتە ژوورەوە ترەمپ پرسیاری کرد "ئایا من داوای ئەو دانیشتنەم کرد یان تۆ؟" منیش گوتم من داوام کرد. ئەو وەڵامی دایەوە: "وامزانی کە من داوام کردووە، بەڵام من خۆشحاڵم بەوەی کە تۆ لێرەیت چونکە من دەمویست بتبینم". دەستمان کرد بە قسەوباس سەبارەت بە کۆریای باکوور و من ئەوەم ڕوونکردەوە کە پێم وایە کیم جۆنگ ئوون دەیەوێت کاتی زیاتر دەستەبەر بکات بۆئەوەی چەند شتێکی گرنگ جێبەجێ بکات (ئەگەرچی جێگەی ڕەخنەش بێت) کە ئەم شتانە گرنگن بۆ دەستخستنی چەکی ئەتۆمی. ئەمەش مانای وایە کە کیم جۆنگ ئوون لە هێزی سەربازی دەترسێت. ئەو باش دەزانێت کە بە تەنها سزا ئابوورییەکان ڕێگریی لێ ناکەن لە بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە. لەوە دڵنیانەبووم کە ئایا ترەمپ بەڕاستی لەم خاڵە گەیشت و وەریگرت، بەڵام من جگە لەوە ڕاپۆرتیشم پێشکەش کرد لەبارەی فرۆشتنی چەك و کەلوپەلی کیمیاوی لەلایەن کۆریای باکوورەوە بە سووریا، کە ئەمیش شیاوی هەیە بیدات بە ئێران. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوە ئەم پەیوەندییە تەوەریی دەبێت بۆهەریەك لە کۆریای باکوور و ئێران، هەروەها مەترسی پیۆنگ یانگیش ئاشکرا دەکات، کە مەترسییەکان بریتین لە: ئێستا فرۆشتنی چەکی کیمیاوی، هەروەها هەرئەوەندی دەستی پێ بگات ئیدی چەکی ئەتۆمیش دەفرۆشێت. من هانم دا بۆ ئەوەی ئەم بەهانەیە بەکاربێنێت تاوەکو لە ڕێککەوتننامەی ئەتۆمی ئێران بکشێتەوە و هەڵوێستی توندیشی بەرامبەر کۆریای باکوور هەبێت. کێلی هاوڕام بوو، هانی دام کە بەردەوام بم و منیش گوتم هەر وادەکەم. سەبارەت بە ڕێککەوتننامەی چەکی ئەتۆمی ئێران، ترەمپ گوتی "نیگەران مەبە من لەم ڕێککەوتننامەیە دەچمە دەرەوە، پێم گوتن کە چاکی بکەن، بەڵام وادیارە ئەم شتە هەرگیز ڕوونادات". دواتر چوویە سەر ئەوەی کە چەندە دەیەوێت تیلەرسۆن

دەربکات، ئەو گوتی "تۆ دەزانیت کە هەڵە چییە، من حەزم دەکرد تۆ لەوێ بوویت". بەڵام گوتی کە ئەو پەسەندکردنە تۆزێك قورسە بە زۆرترین دەنگی کۆمارییەکان ٥١-٤٩. "ئەم کوڕی سۆزانییە"[١]، ڕاند پۆول لە دژی تۆ دەنگ دەدا، هەروەها ماکونیل دوودڵی ئەوەیە کە ئاخۆ بتوانێت کۆمارییەکانی تر ڕازی بکات، ئەوانەی کە پێویستیەتی بۆ دەنگدانی دادوەرەکان و شتی تر، ئەی تۆ دەڵێی چی؟". من گوتم، کە من دڵنیام دەنگی پۆوڵ بەدەست ناهێنم، بەڵام زۆر سەرسام دەبم کە ببینم ئەو دەنگی کۆمارییەکانی تریش بەدوای خۆیدا کێش بکات. (لەگەڵ ئەوەشدا، لەوەدەچوو ژمارەی ئامادەبووانی لە ئەنجوومەنی پیران بگاتە ٤٩-٥٠ چونکە تەندروستی جۆن مەککین خراپ بوو، بە جۆرێك لەوە دەچوو بۆ هەتاهەتا نەگەڕێتەوە واشنتۆن). من لەسەر بنەمای ئەوەی کە پێشتر لەگەڵ ئەندامانی کۆماری قسەم کردبوو، گوتم دەکرێت کە دەنگی هەندێك لە دیموکراتەکانیش کۆبکەینەوە، بەتایبەتی لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا. گومانم لەوە هەبوو کە قەناعەتم بە ترەمپ کردبێت، ئەو پرسی: "چ پۆستێکی ترت لەلا گرنگە؟" وەڵامم دایەوە کە "ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی". کێڵی بێدەنگی شکاند و گوتی ئەم پۆستە پێویستی بە پەسندکرن نییە لەلایەن ئەنجوومەنی پیرانەوە و ترەمپیش بە دڵخۆشی پرسی: "کەوابوو نیگەرانی ئەم گەلحۆیانە مەبە"، ئەوەبوو من و کێڵی هەردووکمان گوتمان "ڕاستە". پاشان من چوومە نێو باسی کرۆکی کارەکانی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، بۆ نموونە؛ پێشکەشکردنی

---

(١) پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە دەربڕینە ناشیرینەکانی ترەمپ هەر لەوکاتەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست، میدیاکانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. بۆ نموونە لە یەکێك لە کاریکاتێرەکانی (نیویۆرکەر) لە ١٨ی تەمموزی ٢٠١٩ بڵاوکرایەوە، تیایدا دایکێك ئامۆژگاری منداڵەکەی دەکات بەوەی "بە هیچ جۆرێك نابێت لە ماڵدا دەربڕینەکانی سەرۆك (ترەمپ) بەکاربێنێت.

چەندین بژاردە بە سەرۆك و پاشان جێبەجێکردنی بڕیارەکەی سەرۆك، بۆ ئەمە کێلی زۆر بەتوندی سەری ئەرێنی لەقاند. من گوتم کە واهەست دەکەم ڕاهێنانەکانم وەکو دۆزگەرێك[1] منی بۆ پۆستێکی لەم جۆرە ئامادە کردووە، چونکە من دەتوانم بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵبژاردان پێشکەش بکەم و لەگەڵ ئەوەشدا ڕای تایبەتی خۆم هەیە، هەروەها من لەوە گەیشتم کە ئەو دوابڕیاری داوە، منیش جارێکی تر چیرۆکەکەی دین ئاچێسۆن و هاری ترومانم بۆ گێڕایەوە. ترەمپ و کێلی هەردووکیان دەستیان بە پێکەنین کرد. ترەمپ پرسیاری لێ کردم سەبارەت بەوەی ئاخۆ ماکماستەر چی ڕاستی ئەنجام داوە، منیش گوتم کە ئەوە دەستکەوتێکی گرنگ بوو، بەتایبەت بۆ داڕشتنی ستراتیژییەتێکی نوێ بۆ ئاسایشی نیشتمانی لە یەکەمساڵیدا لە پۆستەکەی، کە ئەمە شتێك بووە پێشتر نەکراوە، بۆ نموونە لە ماوەی دەسەڵاتی بوش ٤٣ (بوشی کوڕ). سەبارەت بەوانی تریش ترەمپ پرسیاری کرد کە چی لەبارەی ماتیس-ەوە، منیش گەواهی ئەوەم دا بەرگریم کرد بەوەی کە زیادەیەکی زۆر چووەتە سەر بوودجە لە ساڵانی حوکمی ئۆباما کە ئەم ئیدارەیە بەدەستی هێناوە. بەر لەوەی کە من کۆتایی پێ بێنم هەریەك لە ترەمپ و کێلی گوتیان کە بردنەوەی ئەم بوودجەیە کاری ترەمپ بوو نەوەك ماتیس. هەستم کرد کە ئەمە وەك ئەوەی ڕای ڕاستەقینەی ترەمپ بێت بەرامبەر ماتیس. کۆبوونەوەکە دوای نزیکەی سی و پێنج خولەك کۆتایی هات، ترەمپ گوتی "باشە، ئارام بگرە؛ پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە". من و کێلی لە ئۆڤاڵ هاتینە دەرەوە و ئەو پرسی "بیرت لە کاردانەوەی میدیاکان کردووەتە ئەگەر هاتوو ناوت ئاشکرابوو بۆ ئەم پۆستە؟"، منیش گوتم کە بەم ئەزموونەدا ڕۆیشتووم لەو کاتەی وەك باڵیۆزی ئەمریکا لە نەتەوە

(1) litigator

یەکگرتووەکان دیاری کرام. کێلی گوتی: "بەڵێ بیرمە کاردانەوکان زۆر خراپ بوون، بەڵام دیسانەوە بیربکەوە، چوون ئەو ڕژدە لە بڕیارەکەی". من ساڵانێکی زۆر بەرگەی ڕاگەیاندنەکانم گرتووە، بەجۆرێك هیچ گوێم بە کاردانەوەیان نەداوە؛ لەم کاتەدا برینم کولایەوە. هەروەك شازادە ویلینگتۆن گوتوویەتی کە هەڵوێستەکانی "با چاپ بکرێن کێشە نییە ئینجا با بە نەفرەت بکرێن". من تا ئەو ئێوارەیە هەستم کرد کە حاڵم باشە. کاتێك لە ویلایەتی ڤێرجینیا بووم بۆ کۆکردنەوەی کۆمەك بۆ ئەندامی کۆنگرێس لە کۆمارییەکان باربرا کۆمستوك، کە من بۆ یەکەم جار لە وەزارەتی داد بینیم لە حکوومەتەکەی ڕیگان، ئیدی لەوێ بووم کاتێك گوێبیستی ئەوەبووم کە کیم جۆنگ ئوون داوای کۆبوونەوەی لە ترەمپ کردووە و ئەویش پەسەندی کردووە. من هەر قسەم بۆ نەدەهات، ئەم هەڵە گەمژانەیە تۆقاندمی. بۆ سەرۆکێکی وەك سەرۆکی ئەمریکا بەوەی کە بەبێ هیچ ئاماژەیەکی پێشوەختە ئامادە بێت لەگەڵ کیم دابنیشێت بەوەی کە بیەوێت دەستبەرداری بەرنامە ئەتۆمییەکەی ببێت، ئەوا وەکو پڕوپاگەندەیەکی بێ پێوانە وابوو. ئەمە زۆر خراپتریش کاتێك مادلین ئۆلبرایت لەگەڵ کیم ئیل سونگ دانیشت لە سەردەمی دەسەڵاتی کلینتۆن. خۆشبەختانە من ئەمشەوە لەگەڵ فۆکس نیوز هیچ چاوپێکەوتنێکم ئەنجام نەدا، ئەویش بەهۆی ئەوەی خەریکی کۆکردنەوەی کۆمەك بووین لە ڤێرجینیا. لە ڕۆژی دواتر وا دەردەکەوت کە سارە ساندەرز خەریکە پاشەکشە دەکات، ئەو گوتی کە سیاسەتەکانمان هیچ گۆڕانکاری بەخۆیەوە نەبینیوە.

من لە ڕۆژی سێشەممەوە کۆشکی سپیم جێ هێشتبوو، دواتر کۆشکی سپی ڕایگەیاند کە گاری کوهن سەرۆکی ئەنجوومەنی ئابووری-نیشتمانی دەستی لەکارکێشاوەتەوە، لەجێی ئەویش لاری کودلۆ جێگای گرتەوە. لەم کاتانەشدا و لە مانگی شوباتدا، سکرتێری کاروباری ناوخۆی کۆشکی

سپی ڕۆب پۆرتر دەستی لەکارکێشایەوە، بەهۆی چوونە نێو زانیارییە کەسێتییەکانی لەلایەن ئێف بی ئایەوە سەبارەت بە ڕابردووی، دواتر کارمەندەکەی ترەمپیشی (هۆپ هیکس) بەدواداهات، کە ماوەیەکی زۆربوو لای ئەو بوو، هۆپ بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان بوو. ئەم جۆرە خویترژانە تا ١٣ی ئازار بەردەوام بوو، لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەرکردنی تیلەرسۆن بەشێوەیەکی نا-فەرمی وەکو وەزیری دەرەوە. هەروەها گوترا کە پۆمپەیۆ جێگای دەگرێتەوە، هەروەها بۆ شوێنی پۆمپەیۆش جینا هاسپێل دانراوە. ڕۆژی دواتر کۆشنەر پەیوەندی پێوە کردم تاوەکو جارێکی تر لەگەڵیدا کۆببمەوە سەبارەت بە پلانەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە من پێم وابوو سەرگرتنی ئەمە زۆر ئەستەمە. پاشان لە ١٦ی ئازاردا، جێف سیشر بەردەوامی بە خویترشتنەکە دا بەوەی کە جێگری نووسینگەی ئێف بی ئای ئاندر و ماکابی دەرکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، ژیان لەم دەوروبەرە هەر بەردەوامی هەبوو. تاقمێکی ڕووسی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەپۆلی نۆڤیچۆك هێرشیان کردە سەر سیخوڕی پێشووی ڕووسی سێرگی سکریپاڵ و کچەکەی لە سالیزبووریی بەریتانیا. دوای ئەوەی مۆسکۆ تەنانەت هەر قیزی بوویەوە کە باسی ڕووداوەکەش بکات، سەرۆك وەزیران (مای) هەڵسا بە دەرکردنی ٢٣ کەس لە کارمەندانی ئاژانسی ڕووسی. لە چاوپێکەوتنەکاندا، باسم لەو کاردانەوەیە کرد کە دەبێت ئەمریکا بیگرێتە بەر بەرامبەر ئەم هێرشانە، کە ئەمەش بۆچوونێك بوو ئێستاش هەر لەسەر هەمان ڕاوبۆچوونم. بۆیە شتێکی تەواو بێزارکەربوو کاتێك تۆ لە ڕۆژنامەکان دەتخوێندەوە کە ترەمپ پیرۆزبایی لە پوتین کردووە بەبۆنەی دووبارە هەڵبژاردنەوەی، ئەمەش بەهۆی ئامۆژگارییەکانی ماکماستەرەوە، کە بەشێوەیەکی زۆر خێرا و فراون لە میدیاکان بڵاوبوویەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دواتر ترەمپ ٦٠ دیبلۆماتکاری ڕووسی دەرکرد، وەکو بەشێك لە ناتۆ و هەروەها هاوخەمی لەگەڵ لەندەندا.

هەروەك کۆمەڵێك لە ئەندامانی ئەنجوومەن هاریکارییان دەکردم لە کەمپینەکەم وەکو ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، بەم جۆرەش چەند ڕۆژێك مابوو بۆ ئەوەی ترەمپ بڕیار لەسەر ئەوە بدات کە کێ شوێنی ماکماستەر دەگرێتەوە. من دانم بەخۆداگرت، چونکە کارەکە وادەردەکەوت کە ماندووبوونێکی زیاتری بوێت وەك لەوەو پێش، بەڵام من بڕیارم دا کە پاشەکشە نەکەم. لە ڕۆژی چوارشەممە ۲۱ی ئازار، زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا کاتێك خەریك بوو لە جۆرج واشنتۆن پارکوەی میموریال بەرەو ستۆدیۆی فۆکس دی سی دەڕۆیشتم، بەمەبەستی چاوپێکەوتن (دەوامی حکوومەت و زۆربەی قوتابخانەکان و کۆمپانیاکانی ناوچەکە دادەخرێن)، من گوتم: "بەیانی باش جەنابی سەرۆك"، ترەمپ وەڵامی دایەوە "من پۆستێکم بۆت هەیە کە ڕەنگە بەهێزترین پۆست بێت لە کۆشکی سپیدا". کاتێك ویستم وەڵام بدەمەوە، ترەمپ گوتی: "نەخێر، بەڵکو لە پۆستی ئەرکانی سوپاش باشترە"، ئەوەبوو دەستمان بە پێکەنین کرد، ئەمەش مانای وابوو کە کێلیش لە ژوورەکەدایە و گوێبیستی گفتوگۆکەیە. ترەمپ گوتی "پێویست ناکات کە داوا لە دیموکراتەکان بکەیت لە ئەنجوومەنی پیران، هیچ پێویست بەوە ناکات، پێویستە بێیت و قسە لەسەر ئەمە بکەین، ئەمڕۆ یان سبەی وەرە، من کەسێکی پڕ بایەخم دەوێت، تۆ پشتگیرییەکی زۆر گەورەت هەیە، پشتگیری گەورە، لە هەموو جۆرە خەڵکێك، بۆ نموونە وەکو ئەوانەی نێو کۆنگرەی حیزبی (کۆمەڵێك لە کۆمارییەکان لەنێو کۆشکی سپیدا). من سوپاسی ترەمپم کرد و پاشان تەلەفۆنم بۆ ژنەکەم و کچەکەم کرد، گرێتچین و جێنیفەر سارە، بۆئەوەی پێیان بڵێم، لەگەڵ ئەوەشدا تاوەکو ترەمپ بە ئاشکرا ڕاینەگەیەنێت، ئەوا هێشتا دڵنیانیم. بۆ ڕۆژی دواتر لە کاتژمێر لە ئۆڤاڵ چاوم بە ترەمپ کەوت. بە جۆرێك دەستمان پێ کرد وەك ئەوەی کە ئەمەش چاوپێکەوتنێکی تر بێت و باسی ئێران و کۆریای باکوور دەکەین. زۆربەی

ئەو شتانە کە ترەمپ گوتی گەڕایەوە بۆ سەردەمی کەمپینەکانی، بەرلەوەی ئەم زنجیرە وتارە پێشکەش بکات. دامام بەوەی ئاخۆ هیچ بیرۆکەیەکی تری نییە بەوەی کە دەبوو پۆستێك پێشکەش من بکات، ئەو بەبێ پێچوپەنا گوتی کە لە ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ ئێراندا دەچێتە دەرەوە. بەڵام هیچ شتێکی لەبارەی دیدەنییە چاوەڕوانکراوەکەی لەگەڵ کیم جۆنگ ئوون نەگوت، کە ئەمەش جۆرێك لە بابەتپەڕاندن بوو کە قورس بوو بۆ من بیخوێنمەوە و لە مەبەستەکەی بگەم. هەروەها بەشێکی زۆری گفتوگۆکە باسی ئەوەبوو کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی چۆن و بە چ میکانیزمێك کار دەکات، ئەگەرچی من وەکو ناو، ناوی برێنت سکوکروفتم نەهێنا، بەڵام ئەو سیستەمەی کە من ڕوونم کردەوە، هەروەك کێلی باش دەیزانی، هەمان ئەو ئەو شتە بوو کە سکوکروفت لە ئیدارەکەی بوش ٤١ کردی. یەکەم، لە بەرپرسیارەتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوو کە بژاردە و خاڵە ئەرێنی و نەرێنییەکان بدات بە سەرۆك. دووەم، هەر ئەوکاتەی کە بڕیارەکە درا، ئەوا ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بەرپرس دەبێت لەوەی کە بیرۆکراسییەکان بڕیارەکەیان جێبەجێ کردووە، سەرەڕای ئەوەی کە پۆستەکەی بە ڕاستەوخۆ پێشکەش نەکردم، لەجیاتی ئەوە پرسی "کەوابوو پێت وایە کە تۆ دەتەوێت ئەم کارە بکەیت؟" خەریك بوو بپرسم کە ئاخۆ دەبێت ئەم کۆبوونەوانە کۆتاییان پێ بێت کە خەریك بوو یەك کاتژمێری دەخایاند تا ئەوکاتە ویسترهوت هات و بە ترەمپی گوت کە کۆبوونەوەیەکی تری هەیە. هەڵسایە سەر پێ و منیش بە هەمان شێوە، بەسەر مێزی ڕیزوڵوت تەوقەیەکمان کرد و سەرەڕای نەبوونی هیچ "پێشکەشکردن" و "قەبووڵکردنێککی ڕوون، من و کێلی هەروەك شارەزای ترەمپ بووین زانیمان کە چی ڕوویداوە. بەسەرنجدان لەو ئەزموونەی کە لێرەدا باس کرا و زیاتریش، ئەی بۆچی ئەم پۆستە قەبووڵ دەکەی؟ چونکە ئەمریکا ڕووبەڕووی ژینگەیەکی نێودەوڵەتی ترسناك

بووەتەوە و پێم وابوو کە من دەزانم دەبێت چی بکەم. من کۆمەڵێك گۆشەنیگای بەهێزم هەبوو سەبارەت بە کۆمەڵێکی زۆر لە کێشەکان، کە لە ڕێگەی چاودێریکردنە حکوومەتەکان پێشوو و کەرتی تایبەت دەستم کەوتبوو. هەروەها سەبارەت بە ترەمپ، ئەوا کەس ناتوانێت ئەوە ڕەت بکاتەوە کە ئەو هەست بەم مەترسییانە ناکات، بەڵام لە نزیکەوە من هەستم کرد کە دەتوانم مامەڵەیان لەگەڵ بکەم. ڕەنگە ئەوانی تر شکستیان هێنابێت، ئینجا لەبەر هەر هۆیەك بێت، بەڵام پێم وابوو کە من سەرکەوتن بەدەست دێنم، ئایا من لەسەر حەق نەبووم؟ فەرموون بەردەوام بن لە خوێندنەوە. لە دەرەوەی ئۆڤاڵ، چاوم کەوت بە دۆن ماکگاهن ڕاوێژکاری کۆشکی سپی و لەگەڵ کێلیش قسەم کرد بۆ چەند خولەکێکی کەم و پیم گوت کە هیچ کام لە ئێمە ناتوانێت هیچ شتێك بەدەست بهێنێت تاوەکو بەیەکەوە کار نەکەین و ئەویش قەبووڵی کرد. هەروەها لەبارەی ڕۆژی ڕاگەیاندنەکە پرسیم، ئەو پێی وابوو کە ڕۆژی دواتر یان هەفتەی دواتر، لە نزیکترین کاتدا. دواتر زانیم (هەروەك کێلیش) کە هەر دوای چەند خولەکێك لە ڕۆیشتنم لە ئۆڤاڵ، ترەمپ پەیوەندی بە ماکماستەرەوە کردبوو بۆئەوەی لەبارەی جێگرتنەوەکە پێی بڵێت و ڕابگەیەنرێت لە دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ. من چوومەوە بۆ هۆڵەکەی وێست وینگ تاوەکو کۆتەکەم بێنمەوە، کارمەندی پرسگەکە و هەروەها کارمەندی پەیوەندییەکانی کۆشکی سپی پێی ڕاگەیاندم کە ژمارەیەکی زۆر لە چاوەڕوانی چوونەدەرەوەی منن. ئەوان پێیان ڕاگەیاندم کە ئاخۆ دەمەوێت لە دەرگای دواوەی کۆشکی سپی، لە دەرگای باشووری-خۆرئاواوە بچمە سەر شەقامی حەڤدە، دوایی بە پشت ئۆفیسەکەی ئایزنهاوەردا بڕۆم بۆئەوەی خۆم لە ڕاگەیاندنەکان بشارمەوە، منیش بە خۆشحاڵییەوە ئەوەم کرد. پەیوەندیم بە گریتچین و جێنیفەر سارە کرد، هەروەها بیرم لەو ئامادەکارییانە کردەوە کە لە کۆشکی سپی بەڕێوەدەچن.

لە ڕێگادا بووم بۆ ستۆدیۆی فۆکس نیوز بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنم هەبێت لەگەڵ بەرنامەکەی مارثا مککالوم، بینیم ترەمپ تویتی کردووە:

بەخۆشحاڵییەوە ڕایدەگەیەنم کە لە ١٨/٩/٤ەوە جۆن بۆڵتن وەکو ڕاوێژکاری نوێی ئاسایشی نەتەوەیی دەست بەکاردەبێت، من زۆر سوپاسی خزمەتەکەی ژەنەڕاڵ ماکماستەر دەکەم، کە کاری جوان کرا و تاهەتایەش وەك هاوڕێی من دەمێنێتەوە. لە ٩/٤ بەفەرمی ڕادەستکردنەکە دەست پێ دەکات.

لەم کاتەدا، مۆبایلەکەم وەك ئەوە وابوو کە بۆمبێکە و دەتەقێتەوە لەگەڵ ئەو هەموو پەیوەندییەی دەهات و ئەو هەموو نامە و تویت و ئاگادارکردنەوەی هەواڵەکان. نزیکەی دوو هەفتەم لە ژیانی تایبەتەوە بۆ نێو حکوومەت بەسەربرد. بۆ ڕۆژی دواتر ترەمپ پەیوەندی پێوە کردم و گوتی "تۆ میدیایەکی زۆر باست دەکەن و ڕاگەیاندنیش دەورێکی گرنگی هەیە" هەروەها "تۆ پشتگیری باشت هەیە" و هتد. هەروەها ئەو گوتی کە "هەندێك پێیان وایە پۆلیسێکی خراپیت" منیش گوتم: "هەر کاتێك من پۆلیسێکی خراپ بم، ئەوا سەرۆك پۆلیسە چاکەکەیە"[1]، ترەمپ گوتم "ئاخر کێشەکە ئەوەیە ئێمە دوو پۆلیسی خراپمان هەیە"، لەوکاتەدا گوێم لە پێکەنینی ئەوانی تر بوو لە تۆڤاڵ. لەوکاتەوەی کە ترەمپ ڕایگەیاندبوو کە من لە ٩ی نیسان دەستبەکار دەبم، کاری لەپێشینە ئەوەبوو کە پشکنین و تاقیکردنەوە بۆ ڕاوێژکاری کۆشکی سپی بکرێت، دیارە ئەمەش خۆی دەبینێتەوە لە پڕکردنەوەی فۆڕم و پرسیار و وەڵام

(١) پۆلیسی خراپ/پۆلیسی چاك: تەکتیکێکی دەروونییە لە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە بەکاردێت. بەوەی دوو لێکۆڵەر پێچەوانەی یەکتر ڕۆڵ دەبینن بەجیا لێکۆڵینەوە لەگەڵ کەسی مەبەستدار دەکەن، هەندێك جاریش ڕێگەپێدراوە کە هەردووکیان بەیەکەوە بیکەن.

لەلایەن ئۆفیسی ڕاوێژکارانی پارێزەر سەبارەت بە دەرخستەی ئابووریم، ناکۆکییە شیاوەکان لە کاتی بەرژەوەندیدا، داواکردنەوەی ئەوەی کەپەیدات کردووە (من هێندەم نەبوو بۆ ئەوەی لێم بسەنەوە)، دەستهەڵگرتن لەکارەکانی ئێستام، دەستبەرداربوون لە لیژنەی کاری سیاسی و لیژنەی کاری سیاسی باڵا لە کاتی خزمەتی حکوومی و هەروەها هاوشێوەکانی. هەروەها زانیاری لەدایکبوونی منداڵەکان و ڕەگەز و داوودەرمان و میوزیکی دڵخوازیان لێم داواکرابوو. هەر لە کاتی پۆستی پێشوومەوە وەك باڵیۆزی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە میدیاکاندا چاوپێکەوتنێکی زۆر و باسکردنێکی بێ شومارم کراوە، بۆیە من تەنانەت وریابووم بەرامبەر هەموو شتێك هەتا ئەوەی ڕۆژنامەنووس و ڕاگەیاندکارە تەمەڵ و نابەهرەمەندەکان لەسەر حیسابی من قەڵەو بن، وەکو ئەوەی ماریانا بوتیان هەوڵی دا من وەك سیخوڕێکی ڕووسی بناسێنێت. (من لام وانییە کە "ڕاگەیاندن دوژمنی گەل بێت"، بەڵام هەروەك دوایت ئایزناهاوەر لە ساڵی ١٩٦٤ گوتوویەتی کە ڕیزەکانی ڕاگەیاند پڕە لە ستوونووسی هەستیار و تێبینیکار کە نووسینەکانیان وادەکات تۆزێك بە زرنگ نیشان بدرێن). هەروەها با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە نموونەی "میز"یان لێ وەرگرتم بۆ پشکنینی مادده هۆشبەرەکان. هەوڵیشم دا کە ڕاوێژ بە هەر دوو ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی بکەم، سەرەتاش بێگومان لەگەڵ کێسنجەر، کە گوتی: "من متمانەیەکی زۆرم پێتە و هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم. پێم وایە تۆ کە تۆ دەزانی بابەتەکە چییە، هەروەها دەشزانی کە بیرۆکراسیەت چییە، بۆیە لام وایە کە دەتوانی مامەڵەی لەگەڵ بکەیت". لە هەموویشی گرنگتر ئەوەبوو کە کێسنجەر وەکو هەموو ئەوانەی کە پێشووتر قسەم لەگەڵ کردبوون لە دیموکرات و کۆمارییەکان، پشتگیریی خۆیان بۆم دەربڕی. لەگەڵ کۆڵن پاوڵیشدا قسەم کرد (کە پێشتر بەڕێوەبەرم بوو کاتێك کە وەزیری دەرەوە بوو لە خولی

یەکەمی ئیدارەکەی بوش ٤٣)، هەروەها بریتنت سکوکروفت، جەیمس جۆنز، کۆندالیزا ڕایس، ستیڤ هادلی، سوزان ڕایس، جۆن بویندکستر، بود ماکفرلین و هەروەها بۆب گیتس، کە جێگری سکوکروفت بوو، دواتر بووە وەزیری بەرگری. سکوکروفت بە پوختی پێی گوتم کە: "جیهان فەوزایە، هەرتەنها ئێمەیش دەتوانین کە ڕێکوپێکی بکەین". هەروەها لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی پێشوو کە من کارم بۆیان کردبوون قسەم کرد، لەوانەش جۆرج شولتز و جیم بەیکەر (پاوڵ و کۆندالیزا ڕایس بەسەر هەردوو بەرەدا دابەش دەبن)، ئەمە جگە لە ڕامسفێلد و دیك چینی. لە کۆتاییشدا لەگەڵ سەرۆك جۆرج بوش قسەم کرد کە لە کاتی دەسەڵاتی خۆیدا زۆر سەخی بوو، هیوای هەموو "سەرکەوتن"ێکی بۆ خواستم. داوام لێ کرد کە تەلەفۆن بۆ باوکی بکات، بەڵام ئەو گوتی کە لە ئێستادا ئەمە زۆر ئەستەمە، بۆیە منیش زۆر بە سادەیی گوتم کە سڵاوی منی پێ بگەیەنە. لە ڕۆژی ٢٧ ئازار نانی نیوەڕۆم لەگەڵ ماکماستەر خوارد لە ژووی وارد. کە بەشێك بوو لە ئاژاوەی هێزی دەریاوانی لە کۆشکی سپی. ئەو کەسێکی میهرەبان و پاك بوو لە هەڵسەنگاندنەکانی بۆ مەسەلەکان و سیاسەت و هەروەها کارمەندەکانیش. دوای چەند ڕۆژێك نانی بەیانیم لەگەڵ جیم ماتیش خوارد لە پنتاگۆن. ماتیش حەزی خۆی لەگەڵ دەرکەوتن لە ڕاگەیاندنەکان نیشان دا بەوەی کە لە چوونەژوورەوەکە بەخێرهاتنی کردم و گوتی کە من "شەیتانێکی بەرجەستەکراوم". منیش بیرم لە وەڵامدانەوەی کردەوە ویستم بڵێم "هەموو هەوڵی خۆم دەدەم"، بەڵام زمانی خۆم گەستەوە و قسەم نەکرد. گفتوگۆیەکی زۆر و پڕ بەرهەممان کرد. ماتیش وای پێشنیار کرد کە من و ئەو و ماتیش هەفتەی جارێك نانی بەیانی لە کۆشکی سپی بخۆین بۆ تاوتوێکردنی کێشە هەڵپەسێردراوەکان. ئەگەرچی ئێمە زۆرجار بە تەلەفۆن هەر لە پەیوەندی دابووین، بەڵام نانخواردنەکانمان بەیەکەوە سەلماندی کە

ئەمە هەلێکی گرنگە بۆ هەرسێکمان بۆ قسەکردن لەسەر کێشە سەرەکییەکان. ئەگەریش یەکێکمان لە گەشتدا بوواین، ئەوا دووانەکەی تر کۆدەبوونەوە، عادەتەن لە ژووی وارد، بەڵام زۆرجاریش لەپنتاگۆن. کاتێك من و ماتیس تەواو بووین، منی برد بۆ دیتنی جۆی دەنفۆرد، سەرۆك ئەرکانی دەستەی هاوبەش، کە خولی سەرۆکایەتییەکەی تاوەکو مانگی ئەیلوولی ٢٠١٩ بەردەوام دەبێت. لێدوانەکانی دەنفۆردم بیرکەوتەوە کە لە بارەی دۆسیەی ئەتۆمی کۆریای باکوور پێشکەشی کردبوو لە کۆڕی ئاسایشی ئەسپن لە هاوینی ٢٠١٨:

خەڵکێکی زۆر باسی لە بژاردەی دەستێوەردانی سەربازی کـرد بە وشانێك کە ناتوانرێت وێنابکرێت. من ئەمە دەگۆڕم بەوەی دەڵێم کە ئەمە کارەسـت دروسـت دەکـات و زیـانی گیـانی دەبێـت و پـێچەوانەی ئەوەیە کە لە ژیانـدا دەبینـین، مەبەسـتم ئەوەیە کە هەرکەسێك لە جەنگـی دووەمـی جیهـانییە و تـا ئێسـتا لە ژیانـدا مابێت شتی لەم جۆرە نابینێـت ئەگەر هـات و جەنـگ لە نـیمچە دوورگەی کۆریـا دەسـتی پـێ کـرد. بەڵام هەروەك چـۆن بە هاوشانەکانم گوت، ئینجا دۆست بن یان دوژمـن، کە ئەمە سـەیر نییە ئەگەر بژاردەی هێزی سەربازی وەکو وەڵامێـك بـۆ کۆریـای بـاکوور. ئەوەی کە ناکرێـت وێنـا بکرێـت ئەوەیە کە ڕێـگەدانە بەوەی چەکی ئەتۆمی لە دێنڤر یان کۆڵۆرادۆ بدرێت. کاری مـن ئەوەیە کە بژاردە سەربازییەکان پەرە پێ بدەم، بە جۆرێك نەهێڵم ئەم شتە ڕووبدات.

دەنفۆرد سەری لەوە سوڕما کە من چەندە ئاگام لە لێدوانەکەی بووە، هەروەها گفتوگۆیەکی باشمان کرد، دەنفۆرد وەك ئەفسەرێکی سەربازیی دیار ناسرابوو، منیش هیچ گومانێکم نەبوو لەوە، لەم کاتە و تەنانەت لە

کاتەکانی دواتریش. بیرۆکەکەی ماتیسم پێشنیار کرد سەبارەت بە خوانێکی سێ قۆڵیمان هەبێت لەگەڵ مایك پۆمپەیۆ لە سی ئای ئەی دوای چەند ڕۆژێکی کەم، ئەویش یەکسەر ڕازی بوو. من و ئەو چەند ئیمەیلێکمان بۆ یەك نارد، لە یەکێکیاندا نووسیبووی: "من پەرۆشم کە وەکو بەشداربوویەك و دامەزرێنەرێکی ئەم کابینەی جەنگ بەشدار بم، من بە سیناتۆر پۆوڵ سلاوتان بۆ دەنێرم". هەروەها من هەلی ئەوەشم هەبوو کە جێگرەکەی جینا هاسپێل ببینم. من لە نزیکەوە چاودێری ترەمپم کرد بۆ ماوەی پازدە مانگ لە پۆستەکەی، من هیچ وەهمێکم نەبوو بەوەی کە دەتوانم ئەو بگۆڕم. لەوانەیە هەر جۆرێك لە ڕاوێژکاری کاری خۆی بکات، بەڵام هیچ جیاوازییەك دروست ناکات ئەگەر هات و هەروا بەسانایی بوو بە بڵق و کەف، یان میدیاکان زۆر پێی سەرسام بوون و پیاهەڵدانیان بۆ کرد، بەڵام لەلایەن سەرۆکەوە هیچ گرنگییەکی پێ نەدرا. من سووربووم لەسەر ئەوەی کە بە ڕێکوپێکی کارەکان بکەم، بەڵام من کارەکانم لەسەر بنەمای ئەوەی کە چۆن بەڕاستی شتەکان ڕێکخران، نەوەك لەسەر بنەمای ئەوەی کە بەراورد بکرێت بە ئیدارەکانی پێشوو. چەندین بڕیار لەم شرۆڤەکردنانەوە سەریان دەرکرد، یەکەم؛ کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی نەببوونە سەنتەری بیرکردنەوە بۆ ڕووداوەکان (کە کاتێك هاتمە نێو حکوومەت ژمارەیان ٤٣٠ کەس بوو، بەڵام کە دەسەڵاتم جێ هێشت ٣٥٠ کەس بوون). هەروەها ئەنجامەکانی بریتی نەبوون لە کۆمەڵێك گفتوگۆی بە گرووپ یان ڕاپۆرت بەڵکو هەرتەنها بڕیاربوون. دامەزراوە پێویستە سادە و ڕاستەوخۆ و کاریگەر بێت. من پلانم وابوو کە زۆرێك لەم کارمەند و هەیکەلانە لابەم. چوون ترەمپ دەسەڵاتی دەکردن و دامەزراندنی تەواوی پێدابووم، منیش زۆر بە خێرایی و کاریگەری کارم کرد، هەروەها یەکێکیش لە کارەکانی دی ئەوەبوو کە سەرلەنوێ ناو لە جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی

بنێمەوە بەوەی هەر دانەیەك هەڵبژێرم نەوەك زۆرێك، ئەمەش بۆ کاریگەرترکردن و سادەکردنی چالاکییەکانی کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی. ئەم ڕۆڵە کاریگەرەش سەرەتا لەگەڵ میرا ڕیکاردێل دەستم پێ کرد، کە کەسێکی بە ئەزموون و خاوەن خزمەت بوو لە بۆوینگ؛ ئینجا دواتریش لەگەڵ دکتۆر چارلز کوپرمان، ئەویش کەسێکی بە ئەزموون و خاوەن توێژینەوە بوو (لەگەڵ ئەوەی کە خزمەتی لە بۆوینگ-یش هەبوو) ئەوان کەسانێکی کاریگەرییان هەبوو، کە پێویست بوون.

لە ڕۆژی شەممە بەر لە ئیستەر و لە کاتژمێر شەشی ئێوارە، گفتوگۆیەکی سەیرم هەبوو لەگەڵ ترەمپ، ئەو باسی هەموو شتێکی کرد و لەوە دەستی پێ کرد کە گوتی: "ڕێکس زۆر خراپ بوو"، پاشان هۆکارەکەی ڕوونکردەوە، هەروەها تەرکیزی کردە سەر بڕیاری تەرخانکردنی ٢٠٠ ملیۆن دۆلار بۆ بنیاتنانەوەی سووریا. ترەمپ ئەوەی بەدڵ نەبوو: "من دەمەوێت وڵاتی خۆمان بنیات بنێمەوە، نەوەك وڵاتانی تر". بەهۆی ئەوەی من دەرچووی ئەکادیمیا ئەمریکی بووم بۆ گەشەپیدانی نێودەوڵەتی، من پشتگیریم لەو بڕیارانە دەکرد کە گرنگ بوون بۆ ئامانجی ئاسایشی نەتەوەیی، لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی ئەم هەوڵانە خاڵی بەهێز و بێهێزی خۆی هەیە. من دەمویست شتێك بڵێم بەلام ترەمپ هەر بەردەوام بوو، پاشان گوتی: "دەزانم تۆ لەمانە گەیشتی" پاشان گوتی "تۆ لێرەدا کەسانێکی زۆرت لەژێر دەستە کە قسە دێنن و دەبەن و زانیاری دەبەنە دەرەوە، بۆیە تۆ دەسەڵاتی تەواوت هەیە لەوەی کە هەرکەسێکت بوێ دەتوانی دەری بکەیت"، لەڕاستیدا من بەر لەوە دەستم پێ کردبوو. لە کۆتاییدا گفتوگۆکە کۆتایی هات و هەردووکمان بە یەکترمان گوت: "جەژنی ئیستەر پیرۆزبێت". لە ڕۆژی دووشەممە، بەیانیی جەژنی ئیستەر، ترەمپ جارێکی تر پەیوەندی پێوە کردم، منیش پرسیم "جەنابی سەرۆك

ئەم یاریی (ئێگ ڕۆڵ گەوینگ)[1]ـە چۆن بەڕێوەدەچێت؟" ئەو گوتی "زۆر بەباشی"،کە سارە ساندەرز و منداڵەکانی لە ئۆڤاڵ هاتنە دەرەوە و پاشان گەڕانەوە سەر مۆنۆلۆگەکەی خۆیان، ترەمپ گوتی: "من دەمەوێت لەم جەنگە ناخۆشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بچمە دەرەوە، ئێمە لەبەر خاتری وڵاتانێك داعش دەکوژین کە دوژمنی ئێمەن"، من پێم وابوو مەبەستی ڕووسیا و ئێران و سووریای ئەسەدە. هەروەها گوتی کە ڕاوێژکارانی بوونەتە دوو بەش، ئەوانەی کە دەیانەوێت بۆ هەتاهەتا لەوێدا بمێننەوە و ئەوانەش دەیانەوێت هەر تەنها بۆ ماوەیەك لەوێ بین. ترەمپ گوتی "من بە هیچ جۆرێك نامەوێت لەوێدا بمێنینەوە، من کوردەکانم خۆش ناوێت. ئەوان لە عێراقییەکان هەڵدێن، لە تورکەکان هەڵدێن، تەنها کاتێك ڕاناکەن ئەو کاتەیە کە ئێمە بە F-18 پشتگیرییان لێ دەکەین و ئەوانی دیکەیان بۆ بۆمباران دەکەین". ئەو پرسیاری کرد کە "چی بکەین؟". جەژنی ئیستەر کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ قسەکردن بە ستراتیژیەتی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆیە من گوتم تا ئێستا چاوەڕێی لێدوان و ڕاپۆرتی ئاسایشییانە دەکەم. پۆمپەیۆ کە تازە گەیشتبووە ئۆڤاڵ، بەر لەوەی کە ئەو منداڵ و دایبابانەی لەوێدا بوون قسەکەی پێ ببڕن گوتی: "پێویستە تۆزێك کات بە من و جۆن بدەن". ئەمە ڕوون و ئاشکرابوو کە ترەمپ دەیویست لە سووریا بکشێتەوە، لەڕاستیشدا هەروا بوو، لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بە وردی ئەمەی گوت (سەرنج بدە بەشی دووەم). لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا بڕیارگەلێکی زۆر هەبوون، کە ئەمەش متمانەی پێ دام بەوەی هێشتا دەتوانین بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە ناوچەکە بپارێزین، چوون

(١) یارییەکی کۆنە و لە جەژنی ئیستەردا بە هێلکەی ڕازاوە و ڕەنگکراو دەکرێت، هەر میللەتێك بە جۆرێك دەیکات، لە ئەمریکا ڕێگە دەدرێت بە منداڵان و دایبابان لە کۆشکی سپی بەشداریی ئەم یادە بکەن.

تێکشکانی خەلافەتی داعش نزیك ببووەوە. لە ڕۆژی هەینی ٦ی نیساندا، بەر لە ڕۆژێك لە دەستپێکردنی دەوامی فەرمیم، جارێکی تر لەگەڵ کێلی و کۆمەڵێکی تر کۆبوومەوە بەمەبەستی چاوخشاندنەوە بە ویێست وینگ. هەندێك لە پلانەکانم سەبارەت بە کارمەندەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و ڕێکخستنەوەی هەیکەلی دامەزراوەکە خستە ڕوو. من لەلایەن ترەمپەوە دەسەڵاتم پێ درابوو بۆئەوەی ئەم کارانە بکەم. کێلی تەواوی کۆبوونەوەوەکە کاتژمێرێکی تەواوی خایاند لەوێ بوو، باسی ئەوەی کرد کە چۆن ترەمپ لە کۆبوونەوەکان و لە تەلەفۆن قسە کردووە. کێلی گوتی کە ترەمپ "زمانێکی زۆر زبری بەکارهێناوە"، لە ڕاستیدا کێلی ڕاستی دەکرد "ئەو حەقی ئەوەی هەیە کە ئەمە بکات". ترەمپ ڕقی لە بوش و ئیدارەکەی بوو، کە ئەوەش وای لێ کردم بیر لەوە بکەمەوە ئەی ئاخۆ چی لەبارەی منە کە دە ساڵ لەو ئیدارەیە خزمەتم هەیە. هەروەها ترەمپ بە بەردەوامی ڕای خۆی دەگۆڕی. کێلی کۆتایی بە قسەکانی هێنا بە "جۆن، من دڵخۆشم بەوەی کە تۆ لێرەیت، سەرۆك هیچ ڕاوێژکارێکی ئاسایشی نەتەوەیی نەبوو ساڵی پار، ئەو پێویستی بە ڕاوێژکارە".

پشووی کۆتایی هەفتەم بە خوێندنەوەی نووسراوەکان و ئامادەکردنیان بۆ ٩ی نیسان بەسەربرد. بەڵام هەروەك لە بەشی دووەمدا دەردەکەوێت، تەنگوچەڵەمەکانی سووریا لەپڕ و بێ ڕاگەیاندن و چاوەڕواننەکراو بوون، هەروەك زۆربەی شتەکانی پێشوتری ئەو حەفدە مانگە. ئاچێسۆن لەبارەی ئەوەی کە ڕووزڤێلت چۆن کوردێل هایلی وەزیری دەرەوەی بە ئێدوارد ستیتینوس گۆڕیوە، نووسیویەتی، کە ئەمە شتێك بوو ڕۆژنامەکان وای بخەملێنن کە ڕووزڤێلت "بۆ هەمیشە بە وەزیری دەرەوەی خۆی دەمێنێتەوە"، ئاچێسۆن ڕوانگەیەکی جێگیری هەبووە لەمبارەیەوە، کە "بە هیچ جۆرێك نابێت سەرۆك ببێتە وەزیری دەرەوە، ئەمەش لەبەر ئەو سروشتە خۆڕسکەی کە هەردوو پۆست هەیانە، ئەوەی کە دەتوانێ

بیکات، کە زۆرجاریش دەرەنجامی ناخۆشی لێ کەوتووەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕێگر بێت لە هەر کەسێك کە ببێت بە وەزیری دەرەوە". سەرەڕای ئەوەی کە ئاچێسۆن لەبارەی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی نەینووسیوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن ڕوانگەیەکی قووڵ بووە. ڕەنگە ئەمە هەمان ئەو شتە بووبێت کە کێلی ویستویەتی لە دوا قسەیدا بە من بڵێت، بەر لەوەی من دەست بە قسەکانم بکەم. هەروەها دواتر کۆندالیزاڕایس پێی گوتم "وەزیری دەرەوە باشترین پۆستە لە حکوومەتدا و ڕاوێژکاریی ئاسایشی نەتەوەییش قورسترین پۆستە". من دڵنیام کە ئەو ڕاستی کرد.

## بەشی دووەم

## هاواربکە "وێرانەیە" و

## لێگەڕێ با سەگەکانی جەنگ بخلیسکێن[1]

ڕۆژی شەممە ٧ی نیسانی ٢٠١٨، هێزە چەکدارەکانی سووریا، بە چەکی کیمیایی هێرشیان کردە سەر شاری دوما لە باشووری-خۆرئاوای سووریا و شوێنەکانی تری نزیك ئەم ناوچەیە. ڕاپۆرتە سەرەتاییەکان وایان دەردەخست کە بە دەیان کوژراو و سەدان بریندار هەن، لەنێویاندا منداڵ هەیە و هەندێکیشیان بەهۆی مەترسیی چەکی کیمیاوی تووشی نەخۆشی سەیر بووینە. کلۆرین ماددەی سەرەکی بەکارهاتوو بوو لە چەکە کیمیاییەکان، بەڵام شیمانەی بەکارهێنانی گازی سارین و مەوادی تریش هەبوو.

هاوشێوەی ئەوە، هێزەکانی سەر بە ڕژێمی ئەسەد ساڵێك بەر لەوە، چەکی کیمیاییان بەکارهێنا کە گازی سارینیشی تێدابوو، لە ڕێککەوتی ٤ی نیسانی ٢٠١٧ بە جیاوازیی ٣ ڕۆژ لەوی دیکەیان لە خان شەیخوون لە

(١)دەستەواژەیەکە کە مارك ئانتۆنی لە ئەکتی ٣ دیمەنی ١ی شانۆنامەی یولیوس سیزاری ویلیام شەکسپیر بەکاری دێنێت. ئەو لەم دیمەنەدا لەگەڵ لاشەی سیزار بەتەنیایە ئەمەش پاش کوشتنی سیزار، ئەنتۆنی مەبەستی ئەوەیە کە بەدوای ئەم ڕووداوە تۆڵەکردنەوە دەبێت. لەنێو دونیای سەربازی ئەم دەستەواژەیە بۆ ئەوە بەکاردێت کە کاتێك کێشە و فەوزایەك هەبێت و بەرپرسێکی سەربازیی فەرمان بکات بە تۆڵەکردنەوە. لێرەشدا بۆڵتن مەبەستی وەشاندنی گورزی سەربازییە لە سووریا.

باکووری-خۆرئاوای سووریا. ئەمریکا زۆر بەهێز وەڵامی دایەوە و ٥٩ مووشەکی کرووزی گرتە ئەو شوێنانەی گومانی ئەوەی لێ دەکرا هێرشەکەی لێوە کرابێت. ئەمە ڕوون و ئاشکرابوو کە دیکتاتۆریەتی سووریا هیچ پەندێکی لەمە وەرنەگرت. بەرلێگرتنەکە شکستی هێنا و ئێستاش باسەکە ئەوەبوو کە چۆن بەشێوەیکی گونجاو وەڵامی ئەوە بدرێتەوە. شتێکی ناخۆش بوو دوای ساڵێك لە هێرشەکەی خان شەیخوون هێشتا سیاسەتی سووریا لە حاڵەتی فەوزادا بوو، پێویستی بە ڕێککەوتن و ستراتیژیەتێکی سەرەکی هەبوو. ئێستاش جارێکی تر هەر لە کێشەدا بوو. ئەو بەرپەرچدانەوەیەی ئەمریکا لەسەر هێرشەکەی سووریا بە چەکی کیمیایی کارێکی زۆر پێویست بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە پێویستمان بە ڕوونبینییەك هەبوو لە دیاریکردنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بۆ مەودایەکی درێژ. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم دانیشتنەی کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بەستی، دوای هەفتەیەك لە ڕووداوەکەی دۆما، پڕبوو لە ڕاوبۆچوونی پێچەوانە: کشانەوەی ئەمریکا لە سووریا. دیارە کشانەوەش دەبووە هۆی مەترسیی دەستکەوتە سنووردارەکان، ئەوەی لە سەردەمی ئۆباما بەدەست هاتووە لەژێر سیاسەتی هەڵەی ئەو لە عێراق و سووریا، بەم جۆرە ئەم ڕێگەیە تەنها زیادکردنی مەترسییەکان دەگرێتە خۆ. بەرپرسیار لە بوونی ئاژاوە لەم سیاسەتە، پاش ساڵێك لە کارەساتی خان شەیخوون، لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ لەسەر مێزەکەی ڕووزفێلت گیرسایەوە.

لە نزیکی کاتژمێر ٩ی بەیانی ڕۆژی ٨ی نیسان، دۆناڵد ترەمپی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوازی خۆی و ئەم سەردەمە تویتێکی کرد:

ژمارەیەکی زۆر کوژراو، لەنێویاندا منداڵ و ئافرەت، لە هێرشێکی کیمیایی گەمژانە لە سووریا. ناوچەیەك کە بەهۆی سوپای سووریا داخراوە و گەمارۆدراوە و وای لێ کردووە ئەم ناوچەیە دەنگی بە جیهانی دەرەوە نەگات. سەرۆك پوتین، ڕووسیا و ئێران بەرپرسن لە پشتگیریکردنی ئەسەدی ئاژەڵ. ئەمە نرخێکی زۆرە...

کە دەبێت باجەکەی بدرێت. هەر ئێستا ناوچەکە والا بکەن و گەمارۆ هەڵوەشێننەوە، تاوەکو یارمەتیە پزیشکی و پاڵپشتییەکان بگەن. ئەمە کارەساتێکی تری مرۆڤایەتییە بەبێ هیچ هۆیەك. نەخۆشینە!

پاش چەند خولەکێکی تر دیسانەوە تویتی کرد:

ئەگەر سەرۆك ئۆباما کاتی خۆی پلانی سووری ڕاگەیاندراوی لە بیابان جێبەجێ بکردایە، ئەوا کارەساتی سووریا دەمێك بوو کۆتایی پێ هاتبوو! هەروەها ئەسەدی ئاژەڵ ئێستا ببوو بە مێژوو!

ئەمانە ڕاگەیاندنی ڕوون و بەهێز بوون، بەڵام کێشە ئەوەبوو کە ترەمپ بەر لە ڕاوێژکردن بە تیمی ئاسایشی نەتەوەیی تویتی کردبوو. هەروەها مەکماستەر بەر لە من ڕۆیشتبوو پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی و هەروەها منیش تاوەکو ڕۆژی دووشەممە دەست بە کار نەبووم. کاتێك ویستم ڕۆژی یەکشەممە کۆبوونەوەیەکی فراوان ئەنجام بدەم، پارێزەرەکانی کۆشکی سپی ڕێگریان لێ کردم، چونکە گوتیان کە تۆ تا ئێستا نەبوویتە کارمەندی فەرمی حکوومەت تاوەکو ڕۆژی دووشەممە. ئەم کارەش هەر تەنها مانایەکی نوێی بەخشی بە وشەی "دامرکاندنەوە".

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممە، بۆ ماوەی ٢٠ خولەك من و ترەمپ قسەمان کرد (کە زیاتر ئەو قسەی دەکرد). ئەو درکی بەوەکردبوو کە

دەرچوون لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە شێوە ڕاستەکەی زۆر قورسە، لەمیانەی تەلەفۆنەکەیدا ئەم بابەتەی چەندین جار دووبارە و چەندبارە کردەوە. ترەمپ گوتی کە ئەو جاك کینی بینیوە (کە ژەنەڕاڵێکی خاوەن چوار ئەستێرە بوو، هەروەها جێگری پێشووی ئەرکانی سوپا بوو) لە شاشەی فۆکس نیوز و بیرۆکەکەی ئەوی بەدڵ بوو لەبارەی تێکشکاندنی هەر پێنج فڕۆکەخانە سەربازییەکەی سووریا، هەروەها لێدانی تەواوی هێزە پیادەکانی ئەسەد. ترەمپ گوتی: "شەڕەفی من محەکە"، ئەمەش تێبینییە بەردەوامەکەی "ثوسیدیدس"م بیردەخاتەوە کە "ترس و شەڕەف و گرنگی" بەگەڕخەری سەرەکی سیاسەتن. ئیمانوێل ماکرۆنی سەرۆکی فەڕەنسا تەلەفۆنی کردبوو کە فەڕەنسا بەرژدی لێکۆڵینەوە لەوە دەکات کە بەپێشەنگایەتی ئەمریکا بەشداری لە بەرپەچدانەوەی توندی سووریا دەکەن. هەروەها لە ڕۆژی پێشوو، زاواکەی جارید کۆشنەر پێی گوتم کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بۆریس جۆنسن پەیوەندی کردووە بۆ ئەوەی پەیامی لەندەنی پێ بگەیەنێت. ئەویش گرەنتی پشتگیریکردن بوو. بەڵام ئاخۆ بۆچی وەزیری دەرەوە پەیوەندی بە کۆشنەر کردووە، ئەمە شتێکە کە دەبێت لە ڕۆژانی داهاتوو باس بکرێت.

ترەمپ لەبارەی یەکێك لە کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پرسیاریی کرد کە من پلانم دانابوو دەریبکەم، ئەو، هەر لە کاتی بانگەشەوە یەکێك بوو لە لایەنگرانی ترەمپ. بۆ ئەو جێگای سەرسوڕمان نەبوو کاتێك پێم گوت ئەو کەسە بەشێکە لە "کێشەی دزەکردنی نهێنییەکان"، ئەو لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، گوتی: "خەڵکێکی زۆر شتانێکی زۆر دەزانن". ئەمە تیشکی خستە سەر یەکێك لە کێشەکانی ئەنجوومەنەکەم، ئەویش مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی سووریا و هەروەها لەگەڵ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بە ئامانجی یەك ئاڕاستەیی. ئەمە کاتی کاردانەوەی هێمنانە نەبوو

وەگەرنا ڕووداوەکان بەسەرماندا زاڵ دەبوون. ڕۆژی یەکشەممە، من هەر تەنها بۆم هەبوو "پێشنیار" بکەم بۆ کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کە هەموو ئەو شتەی کە بە بیرۆکەیاندا دێت بێلێن بەوەی کە چۆن بەرپەرچی ڕەفتارەکانی ئەسەد بدرێتەوە (ئەگەر هێرشی بەرپەرچدانەوەی تری هاوشێوەش هەبێت)، هەروەها لەگەڵ زیاترکردنی بژاردەی تر بۆ ئەمریکا تاوەکو بەرپەرچی سووریا بداتەوە. کاتژمێر ٦و چل و پێنج خولەکی بەیانی ڕۆژی دووشەممە پەیوەندیم بە کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کرد بۆ کۆبوونەوە و تاوەکو شوێنەکەمان بزانن، هەروەها تاوەکو هەڵسەنگاندن بۆ ئەو یارییە بکرێت کە ڕووسیا و ئێران دەیکەن. پێویستمان بە بڕیارگەلێك بوو بۆئەوەی لەگەڵ وێنەیەکی گەورەی سووریا و عێراق بگونجێت، هەروەها بۆ ڕێگرتن لە کاردانەوەی "لێدانی توند".

ماڵەوەم بەجێ هێشت و پێداویستییە نهێنییەکانم پێ بوو. کەمێك بەر لە کاتژمێر شەشی بەیانی، بە ئۆتۆمۆبێلە SUV ڕەنگ ڕەساسییەکەم بەرەو کۆشکی سپی بەڕێ کەوتم. کە گەیشتمە وێست وینگ، بینیم کە سەرۆك ئەرکان جۆن کێلی لە نهۆمی یەکەم لە ئۆفیسەکەی خۆی بوو کە لە خوار ئۆفیسەکەی من بوو، بۆیە وەستام تاوەکو سڵاوێکی لێ بکەم. لە ماوەی هەشت مانگی پێشوو، کاتێك هەردووکمان لەناو شار بووین، هەمیشە بەیەکەوە لە کاتژمێر شەشی بەیانی دەگەیشتین، ئەمەش کاتێکی زۆر نایابە بۆ دەستپێکردن لە هەموو ڕۆژێکدا. کۆبوونەوەکەی کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەوەی دووپات کردەوە -لەوە دەچوو کە ئەمە بەدڵی ترەمپیش بێت- کە هێرشەکانی دوما پێویستی بە کاردانەوەیەکی توندی سەربازییە لەسەر ئاستی ئامانجی کورت. هەر کەسێك و لایەنێك هەر چەکێکی کۆکوژ، ئەتۆمی، کیمیایی و بایەلۆژی بەکاربێنێت، ئەوا وەکو دوژمنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانیی سەیری

دەکات. ئینجا لە دەستی ڕکابەر، وڵاتانی پێشێلکار یان تیرۆریستان دابێت، چوون چەکی کۆکوژ ئەمریکا و هاوپەیمانانی دەخاتە مەترسییەوە.

پرسیاری زۆر گرنگی کۆبوونەوەکە ئەوەبوو کە ئاخۆ چی دەبێت کە کاردانەوەی ئەمریکا بچێتە خانەی تێوەگلانی ئەمریکا لە شەری ناوەخۆی سووریا. ئەمەش هەرگیز وانەبوو، دەکرا بیسەلمێنین کە بەرژەوەندیی پەرچدانەوەکانمان لە دژی هێرشەکان بە چەکی کیمیاوییە نەوەك لابردنی ئەسەد، سەرەڕای بوونی ڕای جیاواز لەوانەی کە دەیانەویست بەرپەرچدانەوەیەکی توندمان هەبێت و ئەوانەش کە دەیانگوت هیچ نەکەین. بوونی سوپای سەربازیی ئەسەد بەس بوو بۆئەوەی بەرپەرچی بدرێتەوە، هۆکارەکانی دیکەش بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بوو (یانیش ئەتۆمی و بایەلۆژی) لە داهاتوودا. لە ڕوانگەی ئێمەوە سووریا دیمەنێکی ستراتیژی بوو، ئینجا هەر کەسێك لەوێدا حکوم بکات ئەوا نابێت ببێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە بەوهۆیەوە چاوپۆشی لە ئێران بکەین، چوون ئێران هەڕەشە ڕاستەقینەکە بوو.

لە کاتژمێر ٨:٠٥ی بەیانی، پەیوەندیم بە جیم ماتیسی وەزیری بەرگری کرد، ئەو وای دەزانی کە ڕووسیا کێشە سەرەکییەکەی ئێمەیە، گەڕایەوە سەر ڕێککەوتنە ناژیرانەکەی ئۆباما لە ساڵی ٢٠١٤ لەگەڵ پوتین بۆ بنەبڕکردنی تواناکانی هێزی کیمیاوی لە سووریا، کە ڕوون و ئاشکرابوو ئەمە ڕووینەدا.

بەشێوەیەکی ئاسایی، ڕووسیا هەڵسا بە تۆمەتبارکردنی ئیسرائیل بەوەی کە ئەو هێرشەکەی دومای ئەنجام داوە. من و ماتیس کاردانەوە شیاوەکانمان تاوتوێ کرد بۆ هێرشکردن، ئەو گوتی کە بژاردەی "ئاسان، ناوەند هەروەها قورس" پێشکەش دەکات تاوەکو سەرۆك سەیری بکات، کە من پێم وابوو ئەمە ڕێگا ڕاستەکەیە. من تێبینی ئەوەم کرد بەپێچەوانەی ساڵی ٢٠١٧، کە هەریەك لە فەڕەنسا و بەریتانیا بیریان لەوە دەکردەوە کە لەگەڵ

ئەمریکا بەشدار بن لە کاردانەوەکان، من هەستم بەوەکرد کە ماتیس ئەو قسانەی دەیکرد لە تەلەفۆنەکەوە، وەك بڵێی لەسەر کاغەز بۆی ئامادە کرابێت و بیانخوێنێتەوە.

دوای ئەوە، ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بەریتانیا مارك سێدویل پەیوەندی پێوە کردم بۆ بەدواداچوونی داواکەی جۆنسن بۆ کۆشنەر. سێدویل یەکەم کەسی بیانی بوو کە پەیوەندیم پێوە بکات. هاوپەیمانانمان پشتگیریمان بکەن لەگەڵ ئامانجە سەرەکییەکانمان لە سیاسەتی دەرەوەی وڵات و بەرگریی یەکێك بوو لە ئامانجە باڵاکانی من. سێدویل گوتی کە بەرپەرچدانەوەکە ڕوون دیارە کە شکستی هێناوە و ئەسەدیش "زۆر لێزانتر بووە لە شاردنەوەی ئەو چەکە کیمیاویانەی کە بەکاریان دەهێنێت". لە سێدویل-ـەوە تێگەیشتم کە بەریتانیا دەیەوێت لەوە دڵنیابێتەوە کە بەرپەرچدانەوەکەمان زۆر سەربازیی و سیاسی بوو، بەوەی کە هێزیی چەکی کیمیایی ئەسەدی تێکشکاند و بووە هۆی بەرلێگرتن. ئەمە لەوە دەچوو کە ڕاست بێت. من ئەو هەلەم قۆستەوە و باسی ڕێککەوتننامەی چەکی ئەتۆمی ئێرانم کرد لە ساڵی ٢٠١٥، تەنانەت لەوکاتەی کە کێشەی سووریا لەئارادایە، لەسەر بنەمای قسەکردنم لەگەڵ ترەمپ بەوەی کە ئەگەری زۆر هەیە ئەمریکا لە سووریا بکشێتەوە. من جەختم لەوە کردەوە کە ترەمپ بڕیاری کۆتایی نەداوە، بەڵام ئێمە پێویستمان بەوە بوو کە دوای ئەوەی لە سووریا دەکشێینەوە چۆن ئێران کۆتوبەند بکەین و چۆن یەکێتی ئەتڵەسی بپارێزین؟

سێدویل تووشی سەرسورمان بوو کە گوێبیستی ئەوەبوو، چوون نە ئەو و نە هیچ ئەورووپییەکی تر شتی لەم جۆرەیان نەبیستبوو لە ئیدارەکە، هاوکات لەگەڵ دەستبەکاربوونی منیش ڕاوێژکارەکانی ترەمپ زیاتر لەپاشەکشەدابوون. ئەو ئەم خاڵەی بەهێمنی وەرگرت و گوتی کە پێویستە زیاتر قسە بکەین هەرکاتێك کێشە هەنووکەییەکانی چارەکران.

کاتژمێر ١٠ی بەیانی، چوومە خوارەوە بۆ ژووری هەڵوێستەکان، بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەی لیژنەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، کە ئەمەش کۆبوونەوەیەکە لەسەر ئاستی ئەنجوومەنی وەزیرانە. (کۆنەکان بەم ژوورە دەڵێن "ژووری دانیشتن" بەڵام جیلی ئێستا پێی دەڵێن: "Whizzer" وەکو کورتکراوەیەك بۆ "White House Situation Room" ژووری هەڵوێستەکان -وردەکاری- کۆشکی سپی)، کە سەرلەنوێ نوێکراوەتەوە و زۆر چاککراوە لەوکاتەوەی کە دواجار لەوێدا کۆبوونەوەیەکم هەبوو لە ساڵی ٢٠٠٦. (ئەمەش لەبەر هۆکاری ئاسایش و پەسەندبوونیش، منیش دواتر لە ئەیلوولی ٢٠١٩ گۆڕانکارییەکی زۆرترم تێداکرد). عادەتەن دەبێت من سەرۆکایەتی لیژنەکان بکەم و یەکەم جار دەست بە قسەکردن بکەم، بەڵام جێگری سەرۆك دەستی پێ کرد، ڕەنگە ویستبێتی کە یارمەتیم بدات، چونکە یەکەم ڕۆژم بوو. هەرچۆنێك بێت، سەری گفتوگۆکانم گرت و هەروەك لێ ڕاهاتبووم و هیچ جارێکی تر ئەم کێشەیە ڕوونەداوە. لەم کۆبوونەوە یەك کاتژمێرییە ڕیگەم دا بە بەشە جیاوازەکان کە بیرۆکە و ڕاوبۆچوونەکانی خۆیان پێشکەش بکەن دەربارەی ئەوەی کە چۆن هەنگاو بنێین. زۆر پێداگریم لەوەکرد کە ئامانجی سەرەکی ئێمە ئەوەیە وا لە ئەسەد بکەین کە باجێکی زۆری بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی بدات و سەرلەنوێ هەیکەلی بەرلێگرتن لەم ڕووداوانە دابڕێژینەوە تاوەکو جارێکی تر شتی وا ڕوونەداتەوە. ئێمە پێویستمان بە هەنگاوی سیاسی و ئابووری بوو، بۆئەوەی نیشانی بدەین کە بەرنامەیەکی تەواومان هەیە، هەروەها ڕەنگە بمانەوێت بەرەیەك پێك بێنین لەگەڵ فەڕەنسا و بەریتانیا (نەخشەکێشانی بەریتانی، ئەمریکی و فەڕەنسی هەر بەڕاستی لە گفتوگۆدابوون).

دەبوو ئێمە نەك هەر بیر لە بەرپەرچدانەوەیەکی پەلە بکەینەوە، بەڵکو بیر لەوە بکەینەوە کە سووریا و ڕووسیا و ئێران لەوەو پاش دەیکەن.

بەشێوەیەکی دوورودرێژ باسی هێرشەکانی سووریامان کرد و ئەوەش کە چۆن بەر لە ئەوە نەمانزانی سووریا چەکی کیمیاویی بەکاردێنێت، بەتایبەت ئاخۆ هەر بەڕاستی گازی سارینی بەکارهێناوە یان تەنها کلۆرینە. ئەمە ئەو شتە بوو کە ماتیس لە لێدوانەکانی پێشووی جەختی لەسەر کردەوە، بەوەی کە ئەمریکا بژاردەی ئاسان تاوەکو قورسی لەبەردەمدا دەبێت.

کارەکان سەبارەت بە سووریا بەردەوام بوون، ئەوە باسی نموونەکانی حکوومەتیش هەر مەکەن، چوون تاوەکو کاتژمێر ١ی نیوەڕۆ بەردەوام بووین، ئەوەبوو لە ئۆڤاڵ بانگ کرام. باڵیۆزی نەتەوە یەکگرتووەکان نیککی هالێی (کە بەشداربوو لە لیژنەی سەرەکی لە ڕێگەی پەیوەندیی پارێزراو و نهێنی لە نیویۆرکەوە) پەیوەندی کردبوو بۆئەوەی پرسیار بکات کە ئاخۆ دەبێت ئەم دوای نیوەڕۆیە لە ئەنجوومەنی ئاسایش چ بڵێت. ئەمە ئەو ڕێگە ئاساییە بە کە ئەو دەبێت لە ئەنجوومەنی ئاسایش بیگرێتە بەر، منیش پێم وابوو زۆر ڕێگەیەکی باشە. من وەکو باڵیۆزی پێشوویی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەبارەی نوێنەرایەتی هالی کە پرسیارم دەکرد لە نیویۆرك بەدرێژایی ساڵی ڕابردوو؛ ئێستا بینیم کە بەڕاستی چۆن کارێك دەکات. من لەوە دڵنیابووم کە لەگەڵ مایك پۆمپەیۆدا ئەم بابەتە تاوتوێ دەکەین بەتایبەت دوای ئەوەی کە بەدڵنیاییەوە وەکو وەزیری دەرەوە دیاریکرا. لەگەڵ ئەوەشدا گفتوگۆکە دەستی پێ کرد و ترەمپ پرسیاری کرد کە بۆچی وەزیری دەرەوەی پێشوو ڕێکس تیلەرسۆن بەرلەوەی کورسییەکەی جێ بهێڵێت ڕەزامەندیی دەربڕیوە لەسەر پێشکەشکردنی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار وەکو یارمەتی ئابووری بۆ ئەفریقیا. پێم وابوو کە ئەم برە پارەیە کۆنگرێس ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیبوو لە چوارچێوەی پرۆسەی تەرخانکردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوتم کە بەدواداچوونی بۆ دەکەم. هەروەها ترەمپ داوای لێ کردم کە سەیری ڕاپۆرتەکان بکەم تا بزانم

بۆچی هیندستان سیستەمی بەرگری S-400ی ڕووسی کڕیوە، هیندستان گوتوویەتی کە ئەم سیستەمەی S-400ی ڕووسی لە سیستەمی بەرگری پاتریۆتی ئەمریکی باشترە. پاشان هاتینە سەر سووریا. ترەمپ گوتی کە هالی دەبێت بەشێوەیەکی سەرەکی بڵێت: "گوێم لە وشەکانی سەرۆك بوو (لە ڕێگەی تویتەرەوە) و هەروەها تۆش دەبێت گوێت لێ بێت". من پێشنیارم کرد کە پاش دانیشتنی ئەنجوومەنی ئاسایش، پێویستە هالی و باڵیۆزەکانی بەریتانیا و فەرەنسا بەیەکەوە بۆ ڕاگەیاندنەکان قسە بکەن و بەرەی یەکگرتوو ڕابگەیەنن. من چەندین جار ئەوەم کردووە، بەڵام هالی ڕەتی کردووەتەوە، ئەو زیاتر ئەوەی پێ باشترە کە بە تەنیا وێنەی بگیرێت کاتێك بەیاننامەی ئەمریکی دەخوێنێتەوە لە ئەنجوومەنی ئاسایش. ئەمە شتێکی بیرخستمەوە، لەپاش نیوەڕۆدا، ئەو کارمەندانەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییم بینی لەوانەی کە تایبەتن بە لێکۆڵینەوەی دۆسیەی ئەتۆمی ئێران، داوام لێ کردن کە ئامادەبن لە ماوەی ئەم مانگەدا بۆ دەرچوون لە ڕێککەوتننامەی ٢٠١٥ لەگەڵ ئێران. ترەمپ دەیویست ئەو بڕاردەیە لەبەردەمی ئامادەبێت بۆئەوەی هەرکاتێك ویستی بڕیاری کشانەوە بدات، منیش دەمویست بەدڵنیاییەوە بڕاردەکەی بۆ ئامادە بکەم.

هیچ دانوستانێك لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیادا نەبوو بۆ "چاکسازی" لە ڕێککەوتنەکە. ئێمە پێویستمان بە کشانەوە و داڕشتنی ستراتیژیەتێکی چالاك هەبوو بۆ ڕێگریکردن لە ئێران لەوەی کە چەکی ئەتۆمی دەست بکەوێت. ئەوەی کە من گوتم نابێت جێگای سەرسوڕمان بێت، چونکە من چەندین جاری تریش لە ڕاگەیاندنەکان باسم کردووە، بەڵام ئێستا هەست دەکەم کە چی دەگوزەرێت لەنێو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە بەرژدی کاریان دەکرد تاوەکو پارێزگاری لە ڕێککەوتنەکە بکەن. گەڕامەوە بۆ ئۆڤاڵ لە کاتژمێر ٤:٤٥ ئێوارە لەبەر ترەمپ تاوەکو پەیوەندی بە ماکرۆنەوە بکات. من عادەتەن

بەشداربووم لە پەیوەندی سەرۆکانی جیهان، کە ئەمەش لە دەمێکەوە هەبوو. ماکرۆن سەرلەنوێ دووبارەی کردەوە هەروەك بە ئاشکرا لە ڕاگەیاندنەکانیش دەیگوت سەبارەت بە کاردانەوە و بەرپەچدانەوەی هاوبەش لە دژی هێرشی کیمیایی. هەروەها ئاماژەی بەوەشدا کە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا "تێریزا مەی"یش حەز دەکات کە بەم زووانە ئەم هێرشە بکرێت. جگە لەوە ئاماژەی بە هێرشەکە سەر بنکەی تیاسی ئاسمانی سووریی دا لە ڕۆژی دووشەمە، کە کەلوپەلی ئێرانی لەخۆ گرتبوو، هەروەها باسی مەترسییەکانی بەرپەرچدانەوەی ئێرانمان کرد ئەگەر هات و ئێمە وەڵامی هێرشەکان بدەینەوە. دواتر من قسەم لەگەڵ فیلیپ ئیتیان کرد، کە ڕاوێژکاری دیبلۆماسیی ماکرۆن بوو، بۆ ڕێکخستنی گفتوگۆکانی ترەمپ-ماکرۆن.

من درکم بەوەکرد کە ئەگەر بێت و لە کۆتایی هەفتە هێرشی سەربازی بکەین -کەوا پێدەچوو ئەمە ڕووبدات- ئەوا مانای وایە ترەمپ لە دەرەوی وڵات نابێت .

کاتێك پەیوەندییەکە کۆتایی هات، من پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد کە نەچێتە کۆنفرانسی لووتکەی ئەمریکی لە پیرۆ کە لەم کاتەدا بوو، لەجیاتی خۆی پێنس بنێرێت. ئەوەبوو ترەمپ ڕەزامەند بوو، هەروەها پێی گوتم کە لەمبارەوە کار لەگەڵ پێنس و کێلی-دا بکەم. کاتێك ئەمەم بە کێلی گوت ئەو لەدەست ئەو هەموو ئامادەکارییە کە تازە کرابوو دەستی بە بۆڵە بۆڵ کرد، من گوتم "ڕقت لێم نەبێت چوون ئەوە یەکەم ڕۆژی منە" ئەویش ڕازی بوو. چووم بۆ ئۆفیسی جێگری سەرۆك کە ئۆفیسەکەی لەنێوان ئەوەی من و کێلیدا بوو تاوەکو بابەتەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە، لەکاتێکدا قسەمان دەکرد، کێلی هات و گوتی کە ئێف بی ئای بەسەر ئۆفیسەکەی مایکل کوهین، پارێزەری ترەمپیان داداوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەتەواوی ئەو هەفتەیەی کە لەگەڵ ترەمپدا بەسەرم برد کە کاتێکی زۆربوو، هەرگیز

باسی مەسەلەی کۆهینی نەکرد. هیچ بەڵگەیەك نەبوو کە کوهین هەر لە خەیاڵی ترەمپیش دابێت، یان هیچ نەبێت لەوکاتانەی کە من لەوێم.

ڕۆژی دووشەممە ترەمپ خوانێکی ئامادە کردبوو بۆ ئەرکانی هاوبەش و سەرانی سەربازی بۆ تاوتوێکردنی مەسەلە گرنگەکان. بەهۆی ئەوەی هەموویان لە شار بوون ئیدی هەلێك بوو بۆ گوێگرتن لە ڕاوبۆچوونەکانیان سەبارەت بە سووریا. ئەگەر ئەمە یەکەم ڕۆژی من نەبوایە کە دۆسیەی سووریا زۆر گوشاری لێ کردبووین، ئەوا من یەك یەك دەمدواندن و ڕاوبۆچونەکانیانم وەردەگرت. بەڵام ئەمە شتێکە دەبێت چاوەڕێ بکرێت.

لە ڕۆژی دواتر کاتژمێر هەشت و نیو، جارێکی تر لەگەڵ سێدویل قسەم کرد، هەروەها پەیوەندیم کرد بۆ ئامادەکاریی پەیوەندی نیوان مای و ترەمپ کە بڕیار وابوو پاش کەمێکی تر بەڕێوە بچێت. سێدویل جارێکی تر پێداگری کردەوە لەبارەی کاتەکە، من بیرم لەوەکردەوە ئاخۆ دەبێت گوشارە سیاسییە ناوخۆییەکانی بەریتانیا کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەی مایو هەیە، لەگەڵ ئاماژەدان بەوەی کە پەرلەمان دەگەڕێتەوە بۆ دانیشتن لە ١٦ی نیسان. سەرۆك وەزیرانی پێشوو دەیڤد کامیرۆن شکستی هێنا لەوەی کە ڕەزامەندیی دانیشتنەکە بەدەست بێنێت بۆ ئەوەی لە سووریا بدرێت، ئەمە پاش ئەوەی کە ئەسەد "هێڵی سووری" بەزاند سەبارەت بە ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ ئۆباما لەبارەی دەستخستنی چەکی کیمیاوی، کە ئەمەش ببووە جێی نیگەرانی من. ڕوون دیاربوو ئەگەر بەر لە دانیشتنی پەرلەمان هێرشەکە ئەنجام بدەین، ئەوا مەترسییەکە نامێنێت. سێدویل دڵخۆش بوو بەوەی گوێبیستی ئەوە بوو کە پنتاگۆن بیر لە قورسترین کاردانەوەی سەربازی دەکاتەوە لەجیاتی ئاسانترین و سووکترینیان، کە ئەمەش بە دڵی بەریتانیا بوو. کاتێك ترەمپ و مای قسەیان کرد، مای هەمان قسەکانی سێدویلی کردەوە کە دەبێت بە زووترین کات

کاردنەوەمان هەبێت. بەدرێژایی پەیوەندییەکە، ترەمپ وا دەردەکەوت کە زۆر پێداگرە، وادیاربوو کە زۆر کەیفی بە مای نەدەهات ئەمەش هەستێك بوو منیش هاوبەشی بووم لەگەڵیدا. هەروەها من چەندین جار لە ماوەی ئەو هەفتەیە قسەم لەگەڵ هاوتا ئیسرائیلیەکەم کرد، موئیر بن شابات، لەبارەی ئەو ڕاپۆرتانەی باس لە لێدانی بنکەی تیاسی ئاسمانی سووری دەکەن و هەروەها بوونی ئێران و هەڕەشەکانی لە سووریا.

لە ماوەی هەفتەیەکدا، زانیاری زیاتر لەبارەی هێرشەکان هات، منیش کاتێکی زیاترم بەسەر برد لە چاوخشاندنەوە بەم زانیارییانە، جگەلەوەش چەندین پەڕاوی تری جیهانیم سەیرکردن. من تەنانەت لە کارەکانی پێشووترم لە دەسەڵاتدا، هەمیشە زیاد لە قەبارە خۆم ماندوو دەکرد. ڕەنگە زۆر جاران ڕەزامەند بووبم لەسەر نووسراوێك یان نەخێر، بەڵام هەمیشە ئامادەگیم تێدابووە کە زیاترینی زانیاری وەربگرم. لە زۆربەی ڕاپۆرت و زانیارییەکاندا بەڵگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن ڕژێمی ئەسەدەوە پشت ڕاست کرابوویەوە. سەرەڕای ئەوەش کە پەیامنێرە چەپەکان و تەنانەت هەندێکیش لەسەر فۆکس نیوز دەیانگوت هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نییە، بەڵام ئەوان هەڵە بوون.

دووەم کۆبوونەوەی سەرۆك لێژنەکان سەبارەت بە سووریا، لە کاتژمێر یەك و نیو بەڕێوەچوو، ئەمجارەیان زۆرینەی ئاژانسەکان بە پلان و چالاکییەکانیان بەشدار بوون، هەروەها هەمووشیان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە دەبێت گورزێکی توند لە ڕژێمی ئەسەد بوەشێنرێت. هەرزوو درکم بەوە کرد کە ماتیس کێشەی سەرەکیی ئێمەیە. ئەو هیچ بژاردەیەکی لەبەردەمی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و پارێزەری کۆشکی سپی دۆن ماکگاهن نەهێشتبوویەوە، کە خەریك بوو سەبارەت بە یاساییبوونی هەر بڕیارێك کە ترەمپ دەیدا لە کۆتاییدا بنووسێت. من بەهۆی ئەوەی ئەزموونێکی تاڵم هەبوو، دەمزانی کە لێرەدا چی ڕوودەدات، ماتیس باش

دەیزانی کە کەی دەیەوێت ترەمپ هێزی سەربازیی بەکاربێنێت، هەروەها باش دەیزانی کە بۆئەوەی هەمان ڕوانگەش لەلایەن ئەوانی تر هەبێت ئەوەیە کە ئەوانی دیکە بێبەش بکات لە زانیارییەکان کە حەقی شەرعی خۆیانە. ئەم ڕاستییەکی ڕوون و سادە بوو کە بژاردەکان تاوەکو ساتی کۆتایی دەرنەخرێن و لەوەش دڵنیاببنەوە کە ئەم زانیاریانە بە ئاڕاستەیەکی "ڕاست" گۆڕاون، پاشان خستنەڕوو، پاشان دواخستن، ئەو هەموو شتە هەر تاوەکو بیرۆکراتییەکی وەکو ماتیس ڕێگەیەك دەدۆزێتەوە. کۆبوونەوەکە بەشێوەیەکی تەواونەکراو کۆتایی پێ هات، ئەگەرچی ماتیس هەندێك کاتی دا بە ماکگاهن بەرلەوەی مێزەکە لەژێر دەستی گڕ بگرێت. من بڕیارم وابوو کە تەگەرەی لەم جۆرە ڕوونادات، بەڵام ئەمە ڕوون بوو کە ماتیس چاڵی بۆ هەڵکەندوون. من واهەستم نەدەکرد کە ئەو تا ئێستا سنووری بەزاندبێت، بەڵام لەوەدا ڕاست بوو، هەروەك من دوای کۆبوونەوەکە بە پێنس و کێلیشم گوت.

لە کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆوە نزیکەی دوو کاتژمێرم لە ئۆڤاڵ بەسەربرد لە کۆبوونەوەیەك کە لەبابەتێکە دەچووینە سەر بابەتێکی تر. دیاربوو ترەمپ نیگەران بوو بەوەی کە ڕووسیا لە سووریا زیانی دەبێت، بە چاوخشاندنەوە بە بوونی هێزێکی زۆری ڕووسی لەوێدا، کە ئەمەش لە ماوەی دەسەڵاتی ئۆباما زۆر زیاتریش بوو. ئەمە سەرچاوەی نیگەرانییەکانی بوو، لەمیانەی گفتوگۆکانماندا بانگی دەستەی ئەرکانی هاوبەشمان کرد، جۆی دەنفۆرد و هاوتاکەی ڤالیری گیراسیمۆڤ بۆئەوەی پێی بڵێن کە هەر شتێك بڕیاری لێ بدەین ئەوا دڵنیابن کە هێزەکانی ڕووسیا ناکەینە ئامانج.

دەنفۆرد-گراسیمۆڤ تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بوونەتە جێگەی ڕەخنەی هەردوو وڵات بەدرێژایی کات، بەڵام لە زۆر کاتی پێویست ئەوا بۆ هەردوو لا، باشە بەتایبەت کاتی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانی نێوان واشنتۆن و مۆسکۆ بۆ پاراستنی ئامانج و بەرژەوەندییەکانی هەردوو لا.

کاتژمێر ٣:٤٥ خولەك پەیوەندییەکی تری نێوان ترەمپ-ماکڕۆن

بەڕێوەچوو، ماکرۆن هانی ترەمپی دا کە بەزووترین کات کاردنەوەی هەبێت گەرنا ئەوان یەك لایەنە وەلامیان دەبێت، کە ئەمەش هەلوێستێکی ئاشکرابوو پێشتر جەختی لەسەر کردبوویەوە.

ئەمەش کارێك بوو پێچەوانەی عەقل بوو، هەروەها دەکرا کە ترسی زۆریشی هەبێت. بەلام لە کۆتاییدا ترەمپ جلەوی فەرەنسییەکانی گرتەوە. لەگەل ئەوەشدا، ماکرۆن لەسەر حەق بوو لەمەڕ ئەوەی کە دەبیت بە زووترین کات کاردانەوە هەبێت، کە ئەمەش پێچەوانەی ترەمپ بوو، چوون ئەو لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا. تاوەکو زووتر بەرپەرچمان دابووایەوە ئەوا زووتر پەیامەکە بۆ ئەسەد و ئەوانی تر ڕوونتر دەبوویەوە. بەلام تا ئەوکاتە هیچ بژاردەیەکمان لە پنتاگۆنەوە نەبینیبوو، ئەم دوو سەرکردەیەش گفتوگۆیان لەسەر ئامانجە دیاریکراوەکان نەکردبوو. سەرەڕای ئەوەش، لەودەچوو کە ماکرۆن دەیویست بژاردەی "ناوەند" (نە قورس و نە سووك) دیاری بکات بۆ لێدانی ئامانجەکان، ئینجا کارەکە هەر جۆرێك بێت. ئەو گوتی کە بژاردەی سووك، دیارە کە ئاسانە، بەلام بژاردەی قورس زۆر توندە. من هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو کە ئەو مەبەستی چییە!

---

لەمیانەی ڕوونکردنەوەی پەیوەندییەکەم لەگەل ڕەجەب تەیب ئەردۆگان بۆ ترەمپ، من ئەوەم دووپات کردەوە کە ڕێسایەکی ڕاستمان هەیە، چونکە: (١) لەبەرئەوەی کە هێرشەکە لەگەل بەریتانیا و فەرەنسا سێ لایەنە دەبێت، نەوەك هەر تەنها لێدانێکی ئەمریکی تاك لایەنە بێت وەکو لە سالی ٢٠١٧ ڕوویدا؛ (٢) ڕێگەیەکی بەتوانامان هەیە، ئەویش بە بەکارهێنانی هۆکارەکانی وەکو سیاسەت و ئابووری و سەربازی، ئەمە جگە لەو پەیامانەی تیایدا ڕوونمان دەکردەوە کە چی دەکەین و بۆچی؛ (٣) بەردەوام بوون -نەوەك هەر تەنها یەك جار بێت-.

لەوەدەچوو ترەمپ ڕەزامەند بێت، هەروەها هانی دام کە "زۆرترینی شت

بۆتان دەکرێت لەسەر تەلەفزیۆن بیکەن"، گوتی: "بەدوای پەیڕەوەکەی ئۆبامادا بکەون هەرچەند کە دەتانەوێت". ئەم ئەوەی وا وەسف کرد کە "شتێکی باشە و دەبێت بکرێت". لە ڕاستیدا، من حەزم نەدەکرد لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن دەربکەوم لەم هەفتەدا، هەروەها کەسانێکی زۆریش هەبوون شەڕیان لەسەر ئەوە دەکرد کە لێدوانیان هەبێت لەسەر تەلەفزیۆن، بە جۆرێك هیچ جۆرە کەمایەسییەك نەبوو لە ئیدارەکە لە ڕووی گەیاندنی دەنگی حکوومەت.

پەیوەندییەکەی ئەردۆگان گۆڕا بۆ باسکردنی خۆی (ئاماژەکانی هەمیشە لێك دەدرانەوە)، ئەردۆگان وەك مۆسۆلینی وابوو، وەکو ئەوەی لە بەلەکۆنەکەی لە ڕۆما قسە بکات، هەر تەنها ئەو جیاوازییەی هەبوو کە ئەردۆگان بەم جۆرە تۆنە قسەی دەکرد لە تەلەفۆنەکەوە. کارەکە بە جۆرێك بوو وەکو ئەوەی جەنابیان لەسەر مێزی ڕیزولۆتەوە وانەمان فێردەکات، لەوەدەچوو کە ئەردۆگان خۆی لە قسەوباسی لێدانی هێزەکانی ڕژێمی ئەسەد لەلایەن ئەمریکاوە لابدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوتی کە ڕاستەوخۆ دوای تەلەفۆنەکە قسە لەگەڵ پوتین دەکات. ترەمپ هانی ئەردۆگانی دا کە ئەوان هەوڵ دەدەن خۆیان لە زیانگەیاند بە بەرژەوەندییەکانی ڕووسیا لە سووریا بەدوور بگرن. بۆ ڕۆژی دواتر واتە ڕۆژی پێنجشەممە، هاوتا تورکییەکەم، ئیبراهیم کالن (هەروەها وتەبێژی فەرمی بەناوی ئەردۆگان) پەیوەندی کرد بۆئەوەی پوختەی پەیوەندییەکەی ئەردۆگان و پوتینمان پێ بڵێت. پوتین پێداگری لەسەر ئەوە کردبوو کە ئەو نایەوێت لەگەڵ ئەمریکا بچێتە نێو هیچ بەرەنگارییەکی فراوان سەبارەت بە سووریا، هەروەها لەسەر هەمووانیش پێویستە کە ژیرانە مامەڵە بکەن.

لە کاتژمێر هەشتی ڕۆژی پێنجشەممە، دەنفۆرد پەیوەندی پێوە کردم تاوەکو پوختەی قسەکانی لەگەڵ گراسیمۆڤ بخاتە ڕوو کە لە درەنگانێکی شەوی ڕابردوو کردبوویان. دوای بەرگریکردنێکی ناچاریی لە

ڕژێمی ئەسەد، گراسیمۆڤ چووە ژێرباری ئەوە، کاتێك بۆی دەرکەوت کە ئێمە هەر بەڕاستی نیەتمان نەبوو ڕووسیا بکەینە ئامانج لە سووریا. دەنفۆرد بە جۆرێك وەسفی گراسیمۆڤی کرد کە "زۆر پرۆفیشناڵ و بە ئەندازەیە"، من و دەنفۆرد ڕەزامەند بووین لەوەی کە ئەمە دەرەنجامێکی ئەرێنییە، لە بەیانییەکەی ئەم قسانە و باسی پەیوەندییەکەی نێوان ئەردۆگان و پوتینم گەیاندە ترەمپ.

کاتژمێر یەك و نیو ترەمپ و پێنسم بینی لە ژوورە بچووکەکەی خواردن لە خوار هۆڵەکەی ئۆڤاڵ. ترەمپ کاتێکی زۆری لەم ژوورە بچووکەی خواردن بردە سەر، بەرامبەر شاشەیەکی گەورەی تەلەفزیۆن کە لەوێدا دانراوە و عادەتەن تەلەفزیۆنەکە هەر لەسەر فۆکس نیوزە. ژمارەیەکی زۆر لە پەڕاوی فەرمی و ڕۆژنامە و دۆکیۆمێنتی تر لەوێدا بوون لەجیاتی ئەوەی لەسەر مێزی ڕیزولۆت لە ئۆڤاڵ بن.

ترەمپ دەیویست زۆربەی هێزەکانی لە سووریا پاشەکشە پێ بکات و وڵاتانی عەرەبیش ڕازی بکات بەوەی هێزەکانیان لەوێدا بڵاوە پێ بکەن و لەگەڵ ئەوەشدا پارەی مانەوەی ئەو هێزانەی ئەمریکا لەوێدا بدەن. ئەو ئەم جێگۆڕکییەی عەرەبەکانی بە هێزەکانی ئەمریکا وەك سەرلەنوێ ئاڕاستەکردنەوەی ستراتیژیەتی نەدەبینی، بەڵام هەر بۆ ئەوە بوو کە بیکاتە هۆکارێك بۆئەوەی لەم هەموو ڕەخنەی زۆرەی نێو وڵات دەربازی بێت کە بەهۆی لێدوانەکانی سەبارەت بە کشانەوەی لە سووریا دابووی. من گوتم کە سەیرێکی بابەتەکە دەکەم. لەگەڵ کۆبوونەوەی تەواوی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (ئەم زاراوەیە کاتێك گونجاوە کە هەر تەنها سەرۆکی ئەنجوومەنەکە دانیشتنەکە بەڕێوە دەبات) پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، بە ترەمپم گوت کە ئێمە بەهۆی ماتیسەوە مامەڵەیەکی نادادوەرانەمان لەگەڵدا دەکرێت سەبارەت بە کۆمەڵێك لە ئامانجە ویستراوەکان، وێدەچوو ترەمپ بێزار بووبێت، بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی ڕوونیشی نەبوو.

کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە کاتژمێر سێ لە ژووری دانیشتن دەستی پێ کرد و نزیکەی حەفتا و پێنج خولەکی خایاند و بەشێوەیەکی تەواونەکراو کۆتاییی هات. پێشنیاری کاردانەوەی پنتاگۆن بەرامبەر هێرشی سووریا بە چەکی کیمیایی زۆر لەوە لاوازاتر بوو، ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی هۆیەکەی دەگەڕایەوە بۆ ماتیس، کە دیاربوو ئەو هەڵبژاردانەی کە پێشکەشی سەرۆك ترەمپ کرابوون، ئەو سڕیبوونیەوە و تەنها چەند بژاردەیەکی کەمی لەبەردەم دانابوو. لەجیاتی هەرسێ هەڵبژاردنەکە (ئاسان، ناوەند، قورس)، ماتیس و دەنفۆرد (کە وێدەچوو هەرشتێك ماتیس نەیەوێت ئەویش نەیکات، لەگەڵ ئەوەشدا لەوەنەدەچوو کە زۆر خۆشحاڵ بن بەرامبەر هیچ شتێك) پێنج بژاردەیان لەبەر ترەمپ دانابوو. من هەر تەنها چەند کاتژمێرێك بەر لە کۆبوونەوەکە ئەم بژاردانەم بینی، ئەمەش شتێك بوو تیمی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی وەکو نەشیاو دەیانبینی. بەشێوەیەك کە یامەتیدەر نەبوو، ئەو پێنج هۆکرە بە هیچ جۆرێك پۆلێن نەکرابوون، لەجیاتی ئەوە دووانیان وانووسرابوو کە "مەترسی کەم هەیە" و سیانەکەی تریش "مەترسی زۆر هەیە". هەر تەنها یەك بژاردە وادیارکرابوو کە ئامادەیە بۆ جێبەجێکردن (یەکێك لەو بژاردانە بوو کە مەترسییان کەم بوو)، یەکێکی تریش بەشێوەیەکی تەواونا (ئەویش هەر یەکێك بوو لەو هەڵبژاردانەی کە مەترسییان کەم بوو). سەرەڕای ئەوەش، تەنانەت لەنێو جێگرەوەکانیش ئامانجە شیاوەکان بەشێوەیەکی ناڕێك دانرابوون، ئەم هەڵبژاردانە زیاتر تووشی سەرلێشێواوی کردن. ئێمە بەشێوەیەکی ڕێك و ڕاست سەیری بژاردەکانمان نەدەکرد بەڵکو هەر لەسەر شێوەی سێو، پڕتەقاڵ، مۆز، تری و هەرمێ دەمانبینی، "ئەمەش شتێك بوو بەراورد نەدەکرا".

فەرمانکرد بە هێرش بەم زووانە، تاوەکو بیسەلمێنین ڕژدین، کە ترەمپ ئێستا ڕەزامەندی لەسەر داوە، بژاردەیەکی کەم یان هیچ بژاردەیەکی

لەبەردەم نەهێشتینەوە، بەتایبەتیش کە بەریتانیا و فەڕەنسا بە هۆکاری تایبەتی خۆیان دەیانویست زوو نەك درەنگ گورز لە سووریا بوەشێنن. ئەگەر ترەمپ یەکێك لەو بژاردانەی دیاری بکردایە کە زۆر مەترسییان هەبوو، ئەوا چەندین ڕۆژی تریش دەبوو چاوەڕێ بین و ئێمەیش وا خەریك بوو نزیك دەبووینەوە لە هەفتەیەکی تەواو لەوکاتەوەی ڕژێمی سووریا هێرشەکەی ئەنجام دابوو. ئەگەر بەگوێرەی ساڵی ٢٠١٧ ڕۆیشتباین، ئەوا دەبوو ئێستا گورزەکەمان وەشاندبووایە. سەرەڕای ئەوەش، چونکە ماتیس دەیویست تەنها ئەو شوێنانە بکرێنە ئامانج کە پەیوەستن بە چەکی کیمیایی، تەنانەت ئەو بژاردانەش کە ترەمپ و ئەوانی تر دەیانویست هەر نەخرابوونە نێو لیستەکە. لەگەڵ ئەوەشدا ماتیس گوتی تەنانەت ئەگەر هات و ڕووسیاش نەکرایە ئامانج ئەوا مانای وایە ئێمە لەگەڵ ڕووسیا کەوتووینەتە نێو جەنگ، ئەگەرچی ئێمە هەوڵی زۆریشمان داوە کە خۆمان لە زیانگەیاندن بە ڕووسیا بپارێزین و دەنفۆرد و گراسیمۆڤیش بەیەکەوە قسەیان کردووە. لە هێرشەکەی نیسانی ٢٠١٧ بە مووشەکی کرووز، ئەمریکا یەکێك لە ئامانجەکانی لە نزیك فڕۆکەخانەیەکی سەربازیی سووری کردە ئامانج، ئەگەرچی هیچ ڕووسیەکیشی لێ نەبوو، بەڵام ئێمە دەمانزانی کە ڕووسیەکان لە نزیکی ئەم ناوچەیەدان لەلای فڕۆکەخانەکە. لەوەدەچوو کە کەس ئێرانی بەلایەوە گرنگ نەبێت، لەگەڵ ئەوەی کە هەریەك لە ڕووسیا و ئێران بەشێوەیەکی زۆر لە سووریا بڵاوبوونەتەوە بەتایبەت لەو شوێنانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی ئەسەددان. ئەم بوونە زۆرەی هێزە بیانییەکان لەنێو سووریا کێشەیەکی گەورەی هەبوونی ستراتیژیەت بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ماتیس بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕا بۆئەوەی هیچ شتێك نەکەین بەڵام ئەو لە ڕووی تەکتیك و ستراتیژییەت هەڵە بوو.

لە کۆتاییدا، سەرەڕای ئەوەی کە ترەمپ بەدرێژایی هەفتەکە گوتی ئەو دەیەوێت گورزێکی توند بوەشێنێت، بەڵام تا ئەوکاتەش بڕیاری لەسەر

نەدرابوو. بژاردەی کۆتایی لەنێو بژاردەکانی تر لە خاڵی ستراتیژییەتی کەم بوو، کە دەبوو ماتیس بیزانیبووایە. هۆکاری سەرەکیمان لە ژووری دانیشتن ئەوەبوو کە لێدانەکەی ئەمریکا بۆ سووریا لە ساڵی ٢٠١٧ هێندە بەهێز نەبوو کە وا لە ئەسەد بکات جارێکی تر بیر لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەکاتەوە. ئێمە دەمانزانی کە ئەو نەك هەر لە دوما بەڵکو چەندین جاری تر لە چەند شوێنێك چەکی کیمیایی بەکارهێناوە لەوەتەی نیسانی ٢٠١٧، هەروەها چەند حاڵەتێکی تریش هەبوو کە زۆر لێی یەقین نەبووین.

هێرشی ٧ی نیسانی ٢٠١٨ خراپترین هێرش بوو. شیکردنەوەکان لە ساڵی ٢٠١٨ دەبوو بەم جۆرە بوونایە: ئەو قەبارەیە چەندە کە گورزێکی لەم جۆرە تیایدا سەرکەوتوو دەبێت. بە ڕای من دەبوو ئەم هێرشانە زۆر زیاتر لەوە بووان کە هەر تەنها شوێنەکانی چەکی کیمیایی بکاتە ئامانج لە سووریا. دەبوو زیاترین هۆکارە سەربازییەکانی سووریا بکەینە ئامانج وەکو: بنکەکان، فڕۆکەخانە، هیلیکۆپتەرەکان (هەموو ئەو هۆکارانەی کە دەبوونە هۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی یان فڕێدانی بۆمب و یان هەموو ئەو ئامێرانە کە چەکیان بەسەرەوە بوو). هەروەها دەبوو ڕژێمەکە بخەینە ژێر مەترسییەوە، بۆ نموونە هێرشکردنە سەر کۆشکەکانی ئەسەد، ئەمە هەموو ئەو خاڵانە بوو کە من ئاماژەم پێدان. بەڵام ئێمە شکستمان هێنا لە ئاستی ئەم هێرشە، هەرئەوەشە وای کردووە کە هەریەك لە ڕووسیا و ئێران و ئەسەد گرەنتی هەناسەدانیان هەبێت بە حەساوەیی. ماتیس دڵەڕاوکێانە ئەم بابەتەی برد بەرەو بژاردە بێزیانەکانی. لەکاتێکدا پێنس ویستی یارمەتی من بدات، وەزیری گەنجینە ستیڤن منوشن زۆر پێداگرانە لایەنگری ماتیسی کرد ئەگەرچی نەشیدەزانی بابەتەکە بەتەواوی چۆنە. نیککی هالێی ڕوونی کردەوە کە مێردەکەی پاسەوانی نیشتمانییە، بۆیە پێویست دەکات کە لە بژاردەی بەکارهێنانی هێزی سەربازیی دووربکەوینەوە. کاتێك ماکگاهن هەوڵی دا جارێکی تر زانیاری زیاتر لەسەر ئامانجەکان کۆبکاتەوە، ماتیس هەر بەشێوەیەکی زۆر توند ڕەتی

کردەوە، ئەگەرچی ماکگاهن تەنها بۆ شیکردنەوەی لایەنە یاساییەکە دەیویست نەوەك بۆ کاری ئامانجداری، کە ئەمەش لە دەرەوەی پسپۆریەکەی خۆی بوو (ڕێك وەك لێدوانەکانی هالی و منوشن). ماکگاهن دواتر پێی گوتم کە ئەو نەیدەویست ڕاستەوخۆ بەرەنگاریی ماتیس بکا، چونکە حەزی بەوە نەدەکرد کە زیاتر لەوە کۆبوونەوەکە تێك بدات، لەگەڵ ئەوەشدا دواجار ئەوەی دەست کەوت کە پێویستی بوو بۆ ڕاوبووچونە یاساییەکەی. باشترین شتێك کە بمانەوێت بیڵێین ئەوەیە، هەروەك دەنفۆرد گوتی، کە ترەمپ بڕیاری داوە لە نێو دڵی چەکی کیمیاویی سووریا بدات. ئێمە دەبێت دوو هێندە زیاتر مووشەك بهاوێژین وەك لەوەی ساڵی ٢٠١٧ و هەروەها زیاتریش بۆ ئامانجە مادديیەکان. ئینجا ئایا ئەوە هەر تەنها دەبێتە هۆی خاپوورکردنی زۆرترینی بینایە یان نا، ئەوە پرسیارێکی تری جیاواز بوو. تەنانەت ئەگەر سەرۆکیش بڕیاری گورزێکی ئارەزوومەندانە بدات، ئەوا پرۆسەی بڕیار دەرکردنەکە بەتەواوی قبووڵ نییە. چوون ئێمە زۆرمان چەشت بەدەست فێڵی بیرۆکراسییە کلاسیکییەکان و دارِشتنی بژاردە و زانیارییەکان هەر تەنها بۆئەوەی بژاردەکانەکانی ئەوان ڕاست و دروست دەربکەون. بێگومان ترەمپ هیچ یارمەتیدەر نەبوو، چونکە ئەو نەیدەزانی کە چی دەوێت، ئەو هەر لەپرسیارێکەوە هەڕەمەکییانە دەچوویە سەر پرسیارێکی تر و هەروەها بێئومێدکردنی هەموو هەوڵەکان دەربارەی ئاکامی پەیرەوکردنی بڕیارێك. ڕاگەیاندنەکان هەر ئەوکات بڵاویان کردەوە، بەهۆی ئەوەی کە زانیارییەکان دزەیان دەکرد، "ماتیس"یان کردە ئامانج و گوتیان ئەو "میانڕەو"ەکەیە. لەڕاستیدا ڕۆحانییەتی ستونول جاکسۆن[1] لەنێو ماتیس و پەیرەوانیدا دەژیا

---

(١) تۆماس جۆناثان ستونوول جاکسون (١٨٢٤-١٨٦٣) وەکو ژەنەراڵێکی کۆنفیدراڵی خزمەتی کردووە و بە یەکێك لەو سەرکردانە دەژمێردرێت کە خاوەن تەکتیکێکی زۆر بەهێز بووە.

("جاکسون وەك دیوارێکی بەردین وەستاوە" هەروەك کۆنفیدراڵییەکان لە جەنگی بول ڕەنی یەکەم[1] دا گوتیان) بەدەستخستنی ئاماجێکی باشتر هەرچۆنێك بێت جەنگانی زیاتری بیرۆکراسیەکانی پێویست بوو، هەروەها دانیشتنێکی تری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیش، بەم جۆرەش کاتێکی زۆر گرنگ لەدەست دەچوو، ماتیسیش ئەمەی باش دەزانی. لە ڕاستیدا، سووریا هەڵسا بە گواستنەوەی مەواد و کەلوپەلەکانی بۆ زۆر دوورتر لەو ئامانجانەی کە ئێمە هیوامان وابوو خاپووری بکەین. من لەو هەڵسوکەوتەم ڕازی بووم وەکو ناوەندگیرێك، بەڵام ماتیس خەریك بوو یاری بە کارتی ڕەنگکراو و نیشانکراو[2] دەکرد. ئەو زۆر لە من باشتر دەیزانی کە ترەمپ لەم حاڵەتانەدا چۆن هەڵسوکەوت دەکات. هەروەك چۆن ماکگاهن چەندین جار بە چپەوە پێی دەگوتم کە ئەمە "ئیدارەکەی بوش نییە"، چوون کارەکان پێچەوانەی ئەزموونی ئێمە بوون.

دوای ئەوەی کۆبوونەوەکە تەواو بوو، واهەستم کرد کە ترەمپ دەیەوێت هەر تەنها بڕیارێك بدات و بگەڕێتەوە بۆ ئۆڤاڵ، چوون لەوێدا زیاتر هەستی بە باوەڕبەخۆبوون و ئیسراحەت دەکرد. بیرۆکراسییەك توانی بەسەر مندا زاڵ بێت، من بڕیارم دا کە جارێکی تر ئەم شتە ڕوونەداتەوە. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەبوو کە وڵات و سەرۆك بە باشی خزمەت نەکرابوون، بۆیە من پەیمانم بەخۆم دا کە جارێکی تر شتی لەم جۆرە ڕوونەداتەوە. لە ماوەی چەند مانگی داهاتوو، چەندین ڕێگەم بەکاربرد تاوەکو دەرگای پلانی سەربازیی بۆ پنتاگۆن بکەمەوە بۆ حاڵەتی فریاکەوتنی لەم جۆرە، تاوەکو زانیاری زیاترم دەست بکەوێت بۆ دەرکردنی بڕیاری سیاسی

---

(١) جەنگی بول ڕەنی یەکەم لە نێوان هێزە یەکگرتووەکان و هێزی کۆنفیدراڵەکان ڕوویدا لە ٢١ی تەمموزی ساڵی ١٨٦١ لە سەردەمی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا لە ناوچەی پرنس ویلیام لە ویلایەتی ڤیرجینیا. تیایدا هێزەکانی کۆنفیدراڵی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

(٢) جۆرێك فێڵکردنە.

سەربازی کە زۆر گرنگ و کاریگەر بێت، هەندێك جار سەرگەوتوو بووین هەندێك جاریش نەخێر.

دوای ئەوەی ژووری دانیشتنمان جێ هێشت، بۆ ڕاگەیاندنەکانمان ڕوون کردەوە کە تا ئێستا نەگەیشتووینەتە هیچ بڕیارێکی کۆتایی و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی جارێکی تر کۆدەبێتەوە لە ڕۆژی هەینی کاتژمێر پێنجی ئێوارە، کە ئەمەش وای لە هەمووان کردبوو وادابنێن کردەوەی سەربازی پاش چەند ڕۆژی تر ئەنجام دەدرێت. بەڵام ئێمە لەلایەن خۆمانەوە ئەوەمان ڕوون کردەوە کە چاوەڕێی گوتاری ترەمپ دەکەین کە ئاڕاستەی میللەتی دەکات لە کاتژمێر پێنجی ئێوارە لە ڕۆژی هەینی (نیوەی شەو بە کاتی سووریا) کە تیایدا هێرشی سەربازی سێ لایەنە ڕادەگەیەنێت. من ڕاستەوخۆ چووم ڤیدیۆ کۆنفرانسێکی بچووکم لەگەڵ سێدویل و ئێتیان ئەنجام دا، بە بەکارهێنانی ژوورێکی تر لە ژوورەکانی دانیشتن. من تیایدا ئەوەم ڕوون کردەوە کە بڕیارەکانی ئێمە چی دەبێت تاوەکو لەم ڕووەوە ئامادەی هەر پەیوەندییەکی نێوان ترەمپ و ماکرۆن و مای بین. پاشان بەرەو ئۆڤاڵ چووم، کە ترەمپ یەکەم جار لەگەڵ مای قسەی کرد لە کاتژمێر ٤:٤٥ خولەك؛ ئەو ڕەزامەند بوو لە دوابڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، کە هەریەك لە سوپای بەریتانی و فەرەنسی تاوتوێیان کردبوو، ئەمەش ئاماژەیەکی ترە کە ماتیس دەستکاری تەواوی شتەکانی کردبوو.

لەمیانەی چاوەڕێکردنی بۆ پەیوەندییەکەی ماکرۆن لە ئۆڤاڵ، ترەمپ دەستی کرد بە باسی تیلەرسۆن و بەوەی کە چەندە ڕقی لێی دەبوویەوە، ئەو باسی ئێوارەیەکی کرد کە نانی ئێوارەیان لەگەڵ تیلەرسۆن و هالی خواردووە، ترەمپ گوتی کە هالی هەندێك ناکۆکی لەگەڵ تیلەرسۆن هەبووە، هالی گوتبووی: "جارێکی تر بەم جۆرە قسە لەگەڵ من نەکەیت"، بەرلەوەی هالی بتوانێت هیچی تر بڵێت، تیلەرسۆن گوتی: "تۆ جگە لە

مرۆڤێکی سووك هیچی تر نیت و هەرگیز ئەم قسەیەش لەبیر مەکە". لە زۆربەی ئیدارەکان ئەمە سەرەنجام دەبوو بەهۆی دەرکردنی تیلەرسۆن، بۆیە من بیرم لەوە کردەوە کە ئاخۆ هەر بەڕاستی تیلەرسۆن ئەو قسەیەی کردووە، بەڵام ئەی ئەگەر وای نەگوتووە بۆچی ترەمپ شتێکی لەم جۆرە بۆ من باس دەکات؟ دوای ئەوە پەیوەندییەکەی ماکرۆن دیاریکراو نەبوو. لەو ماوەیەدا خۆمان ئامادەکرد. دواجار لە کۆتاییدا و لە کاتێکی درەنگی ئێوارە، کۆشنەر هاتە نێو ئۆفیسەکەم بۆئەوەی پیم بڵێت ترەمپ دەڵێت کە من "کارێکی زۆر باشم کرد".

ڕۆژی هەینی، پەیوەندیم بە چەند وڵاتێکی عەرەبی کرد بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکەیەی ترەمپ باس بکەم کە ئەو دەیەوێت هێزی سەربازیی وڵاتانی عەرەبی بخاتە جێگەی هێزە ئەمریکییەکان لە سووریا و عێراق. ترەمپ وای دانابوو کە وڵاتانی عەرەبی جگە لەوەی هێزی پیادە دەنێرن، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەدا بیست و پێنجی پارەی مانەوەی هێزەکانمان دەدەن، پاشان برەکەی زیاتر کرد و گوتی لە سەدا پەنجاش دەدەن. من دەمویست کاردانەوەکان بزانم، بەڵام من ئەوەم بۆ دەرکەوت کە تەنانەت ئەگەر وڵاتانی عەرەبیش هێز نەنێرن، ئەوا ترەمپ ئەو هێزە کەمانەی لە سووریا ماونەتەوە دەیانکێشێتەوە، ئەمەش بەم زووانە دەکات و دوای ناخات. لەگەڵ وەزیری دەرەوەی قەتەڕی محەمەد کوڕی عەبدولڕەحمان قسەم کرد، هەروەها لەگەڵ هاوتا ئیماڕاتییەکەم جەنابی شێخ تەحنوون بن زاید ئال نەهیان قسەم کرد، پاشان لەگەڵ عەباس کامل سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی نیشتمانی میسری، لەگەڵیاندا ئەوەم ڕوونکردەوە کە ئەم بیرۆکەیە ڕاستەوخۆ هی سەرۆکە، هەموو پەیمانیان دا کە مەسەلەکە بە جددی وەربگرن. دوای ئەوە باکگراوندی بابەتەکەم ڕوون کردەوە، دواتریش هەموو ئەو شتانەم بۆ پۆمپەیۆ برد کاتێك کە بوو بە وەزیری دەرەوە، ئەو گوتی ئێمە بەخێرایی ناچین بۆ هیچ شوێنێك، ئەو زۆر بە ئاسانی قبووڵی کرد و ئیتر بەم جۆرە شتەکە لەوێدا کۆتایی هات.

لە کاتژمێر ٩:١٥ بەیانی، کێلی بانگی کردمە ئۆفیسەکەی خۆی و گوتی کە ترەمپ هەر ئێستا تەلەفۆنی کردووە و لەنێو کۆمەڵێك بابەت، ئەو باسی ئەوەی کردووە کە دەیەوێت ئەو پاکێجەی سەبارەت بە لێدانی گورزی سەربازی لە سووریا دوێنی لەسەری ڕێککەوتن و بڕیاریان دا، دەیەوێت ئەمڕۆ سەرلەنوێ پێداچوونەوەی بۆ بکاتەوە. من و دەنفۆرد و ماتیس پەیوەندییەکمان ئەنجام دا و پاشانیش پەیوەندیمان کرد بە ترەمپەوە، ئەو گوتی: "من حەز بەم ئامانجانە ناکەم، دەکرێ ئەمە وەکو شتێکی هیچ تەماشا بکرێت"، دەیویست ئاماژە بەم خاڵە بکات کە من لە کۆبوونەوەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ڕۆژی پێنجشەممە وروژاندم. هەروەها ئێستا "تۆزێك نیگەران" بوو لەسەر "باسی کیمیاویی" دوای هێرشەکە، سەرەڕای ئەوەی کە ماتیس لە ڕۆژی پێشوو دڵنیایی دا کە وەزارەتی بەرگری پێی وایە هیچ چەکێکی کیمیایی لە سووریا بوونی نییە. ترەمپ گوتی کە ئەو بیری لەوە دەکردەوە تویتێك بکات بەوەی کە ئەو پلان دادەنێت بۆ هێرشەکە، بەڵام پەشیمان بوویەوە چونکە ئامانجەکانی گورزەکە باش نین، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەتا ئێستا پەنجەی هەر لەسەر پەلەپیتکەکەیە. من خەریك بوو بتەقم لە خەفەتا، هەر تەنها وێنای ئەوەم دەکرد کە ماتیس و دەنفۆرد چی دەکەن، کێلیش زۆر بێبایەخانە شتەکەی دەهاتە بەرچاو، چوون ئەو چەندین جاری بێشومار بەم ئەزموونەدا تێپەڕیوە. ترەمپ دیسان دووبارەی کردەوە کە "ئێمە بەم گورزە هیچ شتێك دەست ناخەین".

من گوتم کە دەبێت لەسەر گورزێکی کوشندە ڕێك بکەوین، بەڵام ئێستا ئێمە ئەو خاڵەمان جێ هێشت کە بتوانین ڕای خۆمان بگۆڕین و هەر تەنها دەتوانین تویتێك بکەین، ئەوەبوو ئەوانی دیکەش ڕازی بوون. ترەمپ زۆر لە ئەڵمانیا تووڕەبوو، تەنانەت ئامادەبوو لە ناتۆ بچێتە دەرەوە، هەروەها بڕیاری دا کە نۆرد ستریمی دووەم بوەستێنێت (پرۆژەیەکە کە بۆڕی غازیی ڕووسیا بە ئەڵمانیا دەبەستێتەوە). پرۆژەی نۆرد ستریمی دووەم

هیچی پەیوەندییەکی بەمەوە نەبوو، بەڵام دووبارە بە منوشنی گوتەوە تاوەکو دڵنیابێتەوە کە کار لەسەر ئەمە دەکات. هەروەها گوتی: "کاتی ئەم کێشەی سووریا لە مێرکڵ بەفیڕۆ مەدەن" ئەمەش وەکو ئاماژەیەك بۆ پرۆژەی بۆڕیی غازەکە. پاشان ترەمپ دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد لە کاردانەوەکانی ڕووسیا ئەگەر هاتوو ئەوان گورزەکەیان وەشاند، بۆ نموونە لێدانی کەشتیی سەربازیی ئەمریکی لەلایەن ڕووسیاوە، کە ئەمەش ماتیس دڵنیای کردەوە لەوەی کە ئەم ئەگەرە دوورە، سەرەڕای هەبوونی چەندین کەشتیی سەربازیی ڕووسی لە خۆرهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست. پاش هاتن و چوونێکی زۆر، لەوەدەچوو ترەمپ تەواو گیرسابێتەوە، بۆیە کێلی بەخێرایی گوتی: "ئەمە وەك ئەوە دادەنێین کە بچین بۆ ساڵی ٢١٠٠"، مەبەستی ئەوەبوو کە کاتی قسەکردنی ترەمپ نزیك بووەتەوە، بەوەی کە ڕەنگە ئێوارەی ڕۆژی هەینی گورزوەشاندنەکە ڕابگەیەنێت، ترەمپ گوتی: "بەڵێ". ترەمپ پەیوەندی بە کێلییەوە کرد و گوتی کە چ کارێکی من هەیە تۆ بیکەیت، هەروەك ماکماستەر لە هەفتەی پێشوو دەیکرد، ئەمەش وەك وەڵامێك بۆ دەستێوەردان و خۆتێهەڵقورتاندن، بۆیە من دڵخۆش بووم ئەم جارەیان بەوەی ئەزموونی کێلی لە کۆشکی سپیی ترەمپدا ئەم ئاژاوە بەربڵاوەی ڕاوەستاند و ڕێگەی دا بە گرتنەبەری بڕیارێکی تەواو (لە ڕوانگەی منەوە ئەگەر بڕیارەکە تەواو نەبووبێت) بۆ ئەوەی هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بڕۆین.

خۆشبەختانە ئەمڕۆ هەناسەتەنگییەکی وامان نەهاتووەتە پێش، بۆیە دەستمان کرد بە پەیوەندیکردن بە ئەنجوومەنی پیران و نوێنەران. ماکرۆن جارێکی تر پەیوەندی کردەوە بۆئەوەی بڵێت کە قسەی لەگەڵ پوتیندا کردووە و لەوە دەچێت لە مۆسکۆ هەموو شتێك باش بێت. پوتین گوتبووی کە هێزەکانی ئەسەد بە هیچ جۆرێك چەکی کیمیاوییان بەکارنەهێناوە، بەڵام ئەمە شتێکی ڕوون بوو کە ئێمە و ماکرۆن و هەمووان دەیانزانی کە پوتین

ڕاست ناکات. هەروەها پوتین نیگەرانیی خۆی دەربڕی بوو لەوەی ئەمە چەندە کاریگەری لەسەر پەیوەندییە گشتییەکان دەبێت، ئەگەر هاتوو ڕاگەیەنرا کە ئەسەد چەکی کیمیاویی بەکاربردووە، کە من وای تێگەیشتم ماکرۆن دەیەوێت بڵێت ڕووسیا بانگەشە و پڕوپاگەندە بلاودەکاتەوە لە هەریەك لە بەریتانیا و فەڕەنسا سەبارەت بە سووریا، هەروەها ڕێی تێدەچێت کە لە ئەمریکاش بیکات.

دوای پەیوەندییەکە، من لە ئۆڤاڵ بۆ ماوەی نیو کاتژمێر لەگەڵ ترەمپ مامەوە. ترەمپ پرسیاری لێ کردم کە کارەکان چۆن دەڕۆن، بە ئاماژەوە گوتی: "ئەمە ئەوە بوو کە تۆ ڕاهێنانت بۆ دەکرد"، هەروەك چەند ڕۆژ پێش ئێستا کردی سەبارەت بەوەی کە ئەگەر ڕێی تێ بچێت سکوتر لیبی ببوردرێت، کە من زۆر پشتگیرم دەکرد. من هەر لە ئیدارەکەی بوش ٤١ لیبیم دەناسی و هەستم دەکرد لە کەیسی ڤالیری پلیم و چۆنیەتی مامەڵەکرن لەگەڵیدا وایکرد کە چەمکی "ڕاوێژکاری سەربەخۆ" ببێتە عەیبە و زۆر نادادپەروەرانە بێت.

ترەمپ دوای چەند کاتژمێریك ئیمزای لەسەر لێبوردنەکە کرد. لە ماوەی دوای نیوەڕۆ ستیڤن میلەر تیمی نووسەرەوانی گوتارەکانی سەرۆکی هێنا بۆ قسەکردن لەسەر گوتاری ئێوارەی بۆ میللەت. ڕەشنووسەکە باش دەردەکەوت، لە نزیکی کاتژمێر ٥ی ئێوارە ترەمپ لە ئۆڤاڵ دەستی بە قسەکانی کرد وشە دوای وشە هەمووی گوت. دەوروبەری کاتژمێر ٣:٤٠ پۆمپەیۆ پەیوەندی کرد و منیش پیرۆزبایم لێ کرد لەسەر بەستنی ئەم دانیشتە سەرکەوتووانە لە ڕۆژی پێنجشەممە. ئەو داوای لە جینا هاسپێل کردبوو کە بە ترەمپ بڵێت ئەو ئامادەیە بۆ ئەوەی ڕێکاری توندتر بەرامبەر سووریا بگرێتە بەر، ئەمەش شتێك بوو باش گوێبیستی بووین، بەتایبەت لە حاڵەتی هەڵوەشاندنەوەی شتەکانی تر لە چەند کاتژمێری داهاتوو. ڕێکارەکان بۆ هێرشکردن لە کاتێکی زووی ئێوارە ئامادە

کرابوون. هەروەها چونکە ئەمە هێرشێك بوو "لە ئامانج و لە هەمان کات" بۆیە هەندێك لە چەکەکان زووتر هاوێژرابوون تاوەکو ئەوانی تر، بۆئەوەی هەموویان بەیەکەوە بگەن و ئامانجەکە بپێکن.

لە کاتژمێر هەشت و نیو، زۆرێك لە ئێمە چووین بۆ ژووری دیبلۆماسییەت کە لەوێدا پەخشی گوتارەکە دەکرا. ئێمە لە هۆڵەکەوە نەڕۆیشتین، بۆ ئەوەی کەسانێك نەزانن و بەمەش ڕێگر بین لە ڕوودانی هەرشتێك، بۆیە لە ڕێگەی باخچەکەی لای باشوورەوە ڕۆیشتین، هەروەها تاوەکو دیمەنی شەوی کۆشکی سپی ببینین کە بە ڕووناکی درەوشاوەتەوە.

ترەمپ لە نهۆمی سەرەوە بوو، لە نزکی کاتژمێر ٨:٤٥ خولەك بە بەرزکەرەوەکە هاتە خوارەوە. لەمیانەی گوتارەکەی جارێکی تر بە خێرایی چووینەوە. ترەمپ بە جوانی گوتارەکەی دا و پاشان تۆقەی لەگەڵ دەوروبەرەکەی کرد و گەڕایەوە ژوورەوە. من گەڕامەوە ئۆفیسەکەم و بۆئەوەی شتەکانم هەڵگرمەوە و بڕۆمەوە ماڵەوە، سەرم سوڕما کاتێك بینیم وێست وینگ پڕە لە سەردانیکەر، لە کاتژمێر ٩:٣٠ی شەو!

گورزوەشاندنەکە بەباشی بەڕێوەچوو، کە هێزەکانی بەرگری ئاسمانی سووری زیاتر لە چل مووشەکی زەوی بۆ ئاسمانیان هاوێشت هیچ کامێکیان نەیانتوانی مووشەکە کرووزەکان بپێکن. ئێمە باوەڕمان وابوو کە ئەسەد سەری سوڕما لە زەرەروزیانەکان و هیچ کەلوپەل و چەکێکی کیمیایی نەهێشت. ڕۆژی شەممە ترەمپ بەدڵخۆشییەوە تویتی کرد سەبارەت بە هێرشەکە و هەروەها پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ هەریەك لە مای و ماکرۆن. کە ئەوانیش بە هەمان دەرەنجام ڕازی بوون. ئەنتۆنیۆ گوتیریسی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕەخنە لە هێرشەکان گرت بەوەی کە بە ڕاوێژ لەگەڵ ئەنجوومەنی ئاسایش نەکراوە و هەروەها دژی "یاسای نێودەوڵەتی"یە، کە هەندێك لە ئێمە بە شتێکی پێکەنیناوییان هەژمار دەکرد. من زۆربەی ڕۆژەکەم لە وێست وینگ بەسەر برد و تەنها

لە کاتی هەبوونی پێویستی بۆ بەدواداچوونی شتێك دەڕۆیشتم.

ئایا ئێمە لە کۆتاییدا لەبەرپەرچدانەوەی ئەسەد سەرکەوتین؟ نەخێر. دوای وازهێنانم، جیهان هەموو دەزانێت کە ئەسەد دووبارە چەکی کیمیاویی بەکارهێنایەوە دژ بە خەڵکی سڤیل لە ٢٦ی ئایاری ٢٠١٩ و هەروەها دەکرێت جاری تریش بەکاری هێنابێت.

بەکورتی لە ساڵی ٢٠١٧ هێرشەکانی ئەمریکا بوونە هۆی ڕێگری لەبەردەم بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بۆ ماوەی دوازدە مانگ، هەروەها لە ساڵی ٢٠١٨ بووە هۆی ڕێگری بۆ ماوەی سێزدە مانگ کە زیاترین ماوە بوو. سەبارەت بە سیاسەتی گشتی سووریا و چارەسەری هەیمەنەی ئێران لەسەر ناوچەکە، کێشەی سووریا کاریگەری لەسەر سیاسەتی ئەمریکا دەبێت، بۆ ئەمەش ئەم وتەیەی پرۆفیسۆر ئیدوارد کوروین بە نموونە دەهێنینەوە کە دەڵێت، سیاسەتی سووریا "هێشتاش تێکۆشانی دەوێت"[1].

(١) پرۆفیسۆر ئیدوارد ساموێل کوروین ١٨٧٨-١٩٦٣ لە ئەمریکا لەدایك بووە و هەر لەوێشدا کۆچی دوایی کردووە، سیاسەتناسێکی ئەمریکیی بەناوبانگ بوو، ئەم گوتەیەی لە بنەڕەتدا سەبارەت بە دەستووری ئەمریکا کردووە، لە کتێبەکەی بەناوی "سەرۆك: ئۆفیس و هێزەکەی"، چوارەم چاپ، ١٩٥٧؛ لاپەڕە ١٧١.

## بەشی سێیەم

## ئەمریکا خۆی ئازاد دەکا

ڕۆژی دووشەممە، لە پاش هێرشی بۆ سەر سووریا، لەگەڵ ترەمپ چووین بۆ فلۆریدا، یەکەم گەشتی من بوو بۆ هێزی دەریایی یەک کە لە باشووری لاون بوو، دواتر چووین بۆ بنکەی ئاسمانیی ئەندریووس، ئینجا بۆ هێزی ئاسمانیی یەک لە میامی. ئامانجی ئێمە بریتی بوو لە گەیشتن بەو شوێنەی کە ترەمپ دەیویست هەنگاوە بازرگانییەکانی خۆی لێوە دەست پێ بکا. لەو شوێنە نزیکەی پێنج سەد گوێگری باشی هەبوو کە زۆربەیان کووبی، ڤەنزوێلی و ئەمریکایی بوون، ترەمپ منی لە ڕێگای هێرشەکانی سووریاوە بەو خەڵکە ناساند، کە لەو بارەیەوە پێشوازیی باشم لێ کرا، بەڵام ترەمپ کە ئەو پێشوازییەی بینی سەری سوڕما و پرسی؛ ئەو هەموو پێزانینەیان بۆ تۆیە؟ چەند سەیرە؛ بەوانی گوت؛ دەزانن کە ئەوە مانای کۆتایی کارەکەیەتی". هەڵبەت سیناتۆر مارکۆ ڕووبی لەوێ بوو کە پێشتر پێیدا هەڵگوتبووم و پشتگیری ئەوەی کردبووم کە وەکو ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بەربژێر بکرێم، گوتبووی: "دانانی بۆڵتن ڕۆژێکی خراپ دەبێ بۆ مادۆرۆ و کاسترۆ، بەڵام ڕۆژێکی گرنگ دەبێ بۆ ئازادی"، لەبەر ئەوەی من پێشتر کارم لەسەر ئەو وڵاتانە کردبوو، ئەوانەی لەوێ بوون ئەو شتانەیان دەزانی، ئەگەرچی ترەمپ پێشتر ئەوەی نەزانیبێ. لە پاش سەردانی هێزی ئاسمانیی یەک، یەکسەر چووین بۆ پام-بیچ،

لەوێشەوە بۆ مارالاگۆ و لەوێ من بەردەوام بووم لە کارکردن بۆ ئامادەکاریی کۆبوونەوەی ترەمپ لەگەڵ "ئابێ"ی سەرۆک وەزیرانی ژاپۆنی و کارکردنی چڕ لەسەر بابەتی پرۆگرامی ناوکیی کۆریای باکوور، کە هەر ئەوەش مەبەستی سەرەکیی سەردانی ئابێ بوو.

ئامادەکاریی کۆبوونەوەی ترەمپ لە لەگەڵ ئابێ، ئەرکێکی سادە، بەڵام قورسیش بوو، چونکە پێشبینی دەکرا هەندێ شتی خراپ ڕووبدەن. ئێمە بە گوێرەی خشتەی دانیشتنی نێوان ئابێ و ترەمپ دوو کورتە باسمان ئامادەکردبوو، یەکێکیان پەیوەست بوو بە پرسی کۆریای باکوور و ئاسایش، دووەمیش تایبەت بوو بە پرسی ئابووری و بازرگانی. هەرچەندە کە پرسی یەکەمی کۆبوونەوەکە بریتی بوو لە بابەتە سیاسییەکان، کەچی هەر ئەوەندەمان زانی بابەتەکە گۆڕا بۆ بازرگانی، دەنگێک بەرزبوویەوە کەوا کورتە باسێک هەیە و دەبێ پێشکەش بکرێ، بەڵام تازە درەنگ بوو، چونکە ترەمپ قسەی کردبوو، تازە هەڵەکە لەلایەن ترەمپەوە ڕوویدابوو، بۆیە گوتم؛ یەکەم جار گفتوگۆی بابەتی بازرگانی دەکەین، دواتر دەچینە سەر باسی کۆریای باکوور. ترەمپ قسەکەی بەوە دەست پێ کرد کەوا؛ ئەمریکا هاوپەیمانێکی باشتری لە ژاپۆن نییە، دواتر یەکسەر هاتە سەر باسی هێرشەکانی ژاپۆن بۆ سەر پێرڵ هاربەر[1] لێرەوە دانیشتنەکە خراپ ڕۆیشت، کێلیم بردە لایەک و پێم گوت: کە پێویستە کورتە باسەکە پێشکەش بکرێ، ئەگەرنا سوودی نابێ. ئەو گوتی: "تۆ لەو کارەت پەشیمان دەبیەوە". وەڵامم دایەوە: "نەخێر پەشیمان نابمەوە، ئەگەر هاتوو هەموو شتێک وەکو خۆی و بەگوێرەی پەیڕەو بڕوات، ئەوە کێشەی ترەمپ نییە، بەڵکو کێشەی ستافی کۆشکی سپییە". "من پێویستم بەوە نییە کە تۆ ئامۆژگاری من بکەی" کێلی وەڵامی دایەوە و گوتی: " من

(١) ئەو هێرشەی ژاپۆن لە ساڵی ١٩٤١ ڕوویدابوو، مەبەستی بۆلتن ئەوەیە کە ئەو بابەتە هیچ پەیوەندی بە دانیشتنەکە نەبوو، بەڵام ترەمپ باسی لێوە کرد.

ئامۆژگاری تۆ ناکام، بەس ڕاستییەکانت پێ دەڵێم کە خۆشت دەیانزانی".
کێلی وەستا و دواتر گوتی: "ئەوە هەڵەی خۆتان بوو کە ڕێگەتان دا ئەو جۆرە خەڵکانە لە کۆشکی سپی دەسەڵات وەربگرن (خەڵکی بازرگان، مەبەستی ترەمپە)، بەڵام ڕێککەوتین کە جارێکی تر ئەو کێشەیە چارەسەر بکەین.

قسەکانی کێلی ڕاست بوون و من هەڵەبووم؛ کێشەکە ترەمپ بوو، کە تازە چارەی نییە.

ئابێ و ترەمپ سەرەتا کوبوونەوەیەکی دووقۆڵییان ئەنجام دا، دواتر لە کاتژمێر ۳ی پاش نیوەڕۆ ئابێ و ترەمپ لەگەڵ شاندەکانیان لە هۆڵی سپی و زەردی مارالۆگۆ کۆبوونەوەکەی تریان ئەنجام دا کە لە ڕاستیدا ڕەنگی هۆڵەکە زۆر سپی و زەرد بوو. ئابێ کە چاوی بە من کەوت سڵاوی کرد و گوتی: "بەخێر بێتەوە"، لەبەر ئەوەی ئێمە پێشتر بۆ ماوەی زیاتر لە ۱۵ ساڵ یەکترمان دەناسی. وەکو هەر کۆبوونەوەیەکی تر سەرەتا ڕۆژنامەنووسان لەگەڵماندا بوون و دواتر ئەوان دەرکرانە دەرەوە. ئابێ باسی ئەوەی کرد کە، دوای ئەوەی لەگەڵ ترەمپ بە تەنیا کۆبوونەتەوە جۆرێک لێکتێگەیشتن لە نێوانیاندا هەبووە. گوتیشی: من و ترەمپ باسی ئەوەمان کردووە کە پێویستە هەموو بژاردەکان لەسەر مێزی گفتوگۆ بن، لەناویاندا "فشاری بەهێز بۆ سەر کۆریای باکوور" تەنانەت بەکارهێنانی هێزی سەربازییش.

بەدڵنیاییەوە ئەمە هەر ئەوە بوو کە من دەمویست، لەوکاتەدا پۆمپەیۆ سەرقاڵی ڕێکخستنی گفتوگۆ و دانیشتنی نێوان ترەمپ و کیم جون ئون. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو سەردانەی ئابێ گرنگ بوو بۆ گەڕانەوەی ترەمپ بۆ ڕێچکە ڕاستەکە، کاتێک میدیاکاران کرانە دەرەوە ترەمپ و ئابێ قسەی زۆریان لەسەر کۆریای باکوور کرد، دواتر چوونە سەر بابەتی بازرگانیی نێوان هەردوولا.

کە کۆبوونەوەکە هێشتا بەردەوام بوو، میدیا باسی شتێکی دیکەی دەکرد،

هەر دەربارەی بابەتی هێرش بۆ سەر سووریا، ترەمپ لەسەر ئەوە ڕازی بیوو کە سزای زیاتر بەسەر ڕووسیادا بچەسپێنی، چونکە هەبوونی ڕووسیا لە سووریا هۆکاری مانەوەی ئەسەد بوو لە دەسەڵات، یان بەلایەنی کەم ڕووسیا ئاسانکاری دەکرد بۆ ئەوەی ئەسەد بمێنێ و هەندێ هێرشی کیمیایی و کوشتبڕ ئەنجام بدات. پاش ماوەیەک ترەمپ ئەو بیرکردنەوەیەی خۆی گۆڕیبوو، ترەمپ گوتی: "ئێمە خاڵەکانمان دەستنیشان کردبوو کە چی لەگەڵ ڕووسیا بکەین". ڕۆژی شەممە زوو، ترەمپ بە منی گوت کە ئێمە دەتوانین "بەهێزتر لێیان بدەین، ئەگەر پێویستی کرد"، کەچی ٦ی مانگی چوار هەندێ سزای سووک بەسەر ڕووسیادا سەپێنرا، هەرچەندە بڕیار و ڕێگەپێدان دژی ئەو وڵاتانە هەیە کە ململانێ لەگەڵ ئەمریکا دەکەن. بەڵام ترەمپ حەزی بەوە نەدەکرد، چونکە ئامانجەکە ڕووسیا بوو. ترەمپ باوەڕی وابوو کە ڕووسیا دەستێوەردان لە سیاسەتی ناوخۆی ئەمریکا دەکات، نەک هەر ئەمریکا بەڵکو دەستێوەردان لە زۆر وڵاتی دیکەش دەکات، لەناویاندا ئەورووپا، تەنانەت ترەمپ بە ناڕاستەوخۆ باسی ئەوەی کردبوو کە هەماهەنگییەکانی لەگەڵ ڕووسەکان لە کەمپینی هەڵبژاردنی ٢٠١٦، وەکو تاکتیک بەکارهێناوە. بەڵام ئەو جۆرە ڕەفتارانە لە ڕووی لۆژیکی و سیاسییەوە هەڵەن. دەبوایە ترەمپ بەهێزەوە مامەڵە لەگەڵ ڕووسیا بکات، بۆ ئەوەی ئەو گومانە لەسەر خۆی لابدا، کەچی ئەو دەیویست خۆی لەوە گێل بکات، تەنانەت لە بابەتەکانیش دەربارەی ڕووسەکان، بە تایبەت ئەگەر پەیوەست بوایە بە ڕووبەڕووبوونەوە و سزدانی ئابووری بەسەر ڕووسیا، هەرچەندە ئیدارەی ڕووسیان بەجددی وەرگرتبوو بە تایبەت لە بابەتی ئەو سزایانەی ڕاستەوخۆ پوتینیان دەکردە ئامانج، بەڵام ترەمپ هەرگیز باسی پوتینی لەگەڵ من نەدەکرد، یان لەبەر چاوی من باسی نەدەکرد، منیش قەت پرسیارم نەدەکرد کەوا ئەو چۆن لە پوتین دەڕوانێ؟! بێگومان دەترسا

کە قسەکانی ئەوم گوێ لێ بێ، هەربۆیە بابەتە کەسییەکانی سەرۆکی ڕووسیا بۆ من هەر بە نهێنی مانەوە، لەوەی کەوا ترەمپ چۆن بیریان لێ دەکاتەوە.

هەوڵم دا قەناعەتی پێ بکەم کە هەندێ سزای نوێ دەربکرێن، کەچی ئەو هەر گوێشی پێ نەدا، بە منوشنم گوت کە نابێ گەنجینەی ئەمریکا جارێ هیچ شتێك ڕابگەیێنێ، بەڵام بەداخەوە، لەبەر ئەوەی بەرپرسە گەورەکان شارەزا بیوون کە بڕیارەکان چۆن دەردەکرێن، بۆیە بەبێ چاوەڕێکردن بەوەی کە قەناعەت بە ترەمپ بکرێ کە سزای نوێ دەربکا، ئەوان سزا کۆنەکەیان ڕاگەیاند. واتە تەنها ئەوە مابوو کە بڕیارەکان بۆ ڕای گشتی ڕابگەیەندرێن یان ڕانەگەیێندرێن، لە ڕۆژی شەممە بە ڕیکی وادێڵ و بریکاری ماکماستەرم گوت کەوا جارێ هیچ ڕانەگێنرێ. چونکە دەبوایە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش بابەتەکانیان دەستنیشان بکەن و دواتر ڕابگەیێندرێ، پاشان دەبوا ئەوانی تریش سەیریان کردبا، بەڵام گەنجینەی ئەمریکا هەمووانی بەبێ ئەو هەنگاوە ئاگادار کردەوە.

ڕۆژی یەکشەممە هەموو بابەتەکان ئاشکرا بوون، هێلی گوتی کەوا گەنجینەی ئەمریکا ڕۆژی دووشەممە بە فەرمی سزاکانی سەر ڕووسیا ئاشکرا دەکا، هەر لێرە زەنگی مەترسی لێ درا و ئاڵای سوور هەڵکرا. جۆن لێرنەر، ڕاوێژکاری سیاسیی هێلی بە وادێلی گوتبوو کەوا نوێنەری ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە سزاکانی زانیووە، لە میدیاکانیش بۆ ئەوە باسی کردبوو کە سەرنجی ڕاگەیاندنەکان بۆ خۆی ڕابکێشێ و ئەمەش جۆرێک لە پشێویی سیاسی دروست کرد، بە جۆرێک کە ڕاگەیاندنی سزاکان لە لایەن گەنجینەی ئەمریکا، پێشوازییەکی ئەوتۆی لێ نەکرێ. نوێنەری ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆڵی ئەوە نەبوو کە ئەمە ئاشکرا بکات، تەنیا ویستی لەم ڕێگا هەڵەیەوە ناوبانگێک بۆ خۆی پەیدا بکا. ترەمپ کاتژمێر شەش تەلەفۆنی بۆ کردم و پرسیاری کرد

دەربارەی ئەو خۆدەرخستنەی ڕۆژی یەکشەممە کە بۆچی ڕوویداوە، پێم گوت؛ کە لەوەی ڕووسیا هەڵە کراوە، لە هەوڵی ئەوەدایین چارەسەری بکەن. ترەمپ گوتی: "ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە" و یەکسەر گوتی: "بەس پێم بڵێن چی ڕوودەدات، خۆ ئەو منداڵ نییە تازە فێر بکرێ". دواتر گوتی تەلەفۆن بۆ ڕووسەکان بکە و پێیان ڕابگەیێنە کەوا ئەو من بووم ئەو کارەم کرد، منیش وام کرد، تەلەفۆنم بۆ ئانتۆلی کرد؛ نوێنەری ئەمریکا لە مۆسکۆ کە لە سەردەمی جۆرج بوشەوە دەیناسم، بڕیار نەبوو کە هەموو شتەکانی بۆ ڕوون بکەمەوە، بۆیە بە کورتی تەنیا هەڵەکەی هێلیم بۆ ڕوون کردەوە. ئەنتۆنی پیاوێکی تەنیا بوو لەوێ، چونکە ئەو کاتە خەڵک دەترسان کە لەگەڵ ڕووسەکان قسە بکەن، لەگەڵ قسەکردن لەسەر ئەو بابەتە داوەتم کرد بۆ کۆشکی سپی بۆ قسەکردنی زیاتر لەسەر هەمان بابەت، بە ترەمپیشم ڕاگەیاند کەوا ئەوم داوەت کردووە بۆ کۆشکی سپی، ئەوە بووە هۆی دڵخۆشبوونی ترەمپ، چونکە ئەوە هەنگاوی سەرەتایی دەستپێکردنی چاوپێکەوتنی بوو لەگەڵ پوتین، هەر لەبارەی هەڵەی هێلی لەهەمبەر ڕووسیا، قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆش کرد، ئەویش شۆک ببوو.

بە هەرحاڵ، مۆسکۆ بێدەنگ بوو، بەڵام میدیاکانی ئەمریکا گەرم بوون دەربارەی چیرۆکی سزاکانی سەر ڕووسیا. ترەمپ ئامۆژگاریی ساندەرزی کرد دەربارەی چۆنییەتی قسەکردن بۆ میدیاکان بەوەی کە ئێمە بەهێزەوە لەگەڵ ڕووسیا مامەڵ دەکەین، بە تایبەت لە ڕێگای سزاکان، ئەمەش تەنیا بۆ ڕاگرتنی ئەو برینانەی لە هەڵەکەی هێلی دروست ببوو. من قسەم لەگەڵ جۆن سولیڤان، بریکاری وەزیری دەرەوە کرد (جۆن سولیڤان لە شوێنی تیلەرسۆن دەستبەکاربوو، چونکە تیلەرسۆن لە پۆستەکەی دوورخرابووەوە)، ئەو پێی وابوو کە پێویستە دەوڵەت هەماهەنگی و بەرپرسیاریتیی گشتی هەبێ، چونکە لە کاتی تیلەرسۆن هەماهەنگی و پەیوەندی لە نێوان دەوڵەت و نوێنەری دەوڵەت لە نەتەوە یەکگرتووەکان

نەبوو. هێلی بۆ خۆی سەربەخۆ بوو لە کارکردن، ئەو وا ڕاهاتبوو کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ ترەمپ پەیوەندی بکا. لەگەڵ جۆن سولیڤان باسی ڕووداوێکی شەڕە قسەمان کرد کە لە سەردەمی ئیدارەی ڕەیگان لە نێوان ئەل هێیگ و جین کپاتریك ڕوویدابوو، بەڵام سولیڤان بە تەنزەوە گوتی: "بەلایەنی کەم ئەوان پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر هەبوو، هەرچەندە شەڕیان لەنێوان بوو، بەڵام قسەیان لەگەڵ یەک دەکرد".

ڕۆژی سێشەممە، میدیا هەر لەسەر باسی خۆی بەردەوام بوو. هێلی کاتژمێر ٩ و نیو تەلەفۆنی کرد و دەترسا کە لە کارەکەی دوور بخرێتەوە، کەچی دەیگوت: "من ئەم ئەرکە هەڵناگرم، من بەرپرسی ئەوە نیم کە ڕوویداوە". هێلی خۆی لەوە گێل کردبوو کەوا ڕۆژی شەممە خۆی یان ستافەکەی ئاگادار کرابوونەوە کە ئەو کارە نابێ ئەوان بیکەن. بەڵام من پێم گوت کەوا زیاتر لەو بابەتە دەکۆڵمەوە، سەرەڕای ئەوەی کە دەمزانی خۆی و ستافەکەی کارێکی هەڵەیان کردبوو. داوام لە وادێل کرد کە دووبارە قسە لەگەڵ گەنجیەی ئەمریکا بکاتەوە، بەس ئەویش لەوە بێزاربوو کە لەلایەن گەنجینەی ئەمریکاوە لۆمە بکرێ لەسەر ئەوەی کە ڕوویداوە. ئەوان هەر باسی ئەوەیان دەکرد کەوا ڕۆژی شەممە بە هەمووانیان ڕاگەیاندبوو، تەنانەت بە نوێنەری ئەمریکاش لە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بڕیارەکانی ترەمپ هەرچی بن نابێ ئاشکرا بکرێن و ڕابگەیێندرێن، تاکو ڕۆژی دووشەممە پێش ئەو کاتەی بۆرسەکان و بازاڕی ئەمریکا دەکرێنەوە.

خۆی کێشەکە ئەوەبوو گەنجینە بە هەمووانی گوتبوو کە نابێ ڕۆژی یەکشەممە ئەو کارە بکرێ، تەنانەت ڕێگەیان نەدا کەوا ستافی ئەنجوومەنی ئاسایشیش ئەو کارە بکەن، بەڵام بەهەرحاڵ بۆچی نوێنەرەکەمان لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەوەی لەوێ ڕاگەیاند؟! ئەوە پرسیارەکەیە. وادێل قسەی لەگەڵ یاریدەری هێلی بەناوی جۆن لێرنەر کردبوو؛ ئەو گوتبووی کە "هێلی نەدەبوایە ئەو کارە بکا، بەڵام ئەو بابەتی سزای سەر ڕووسیای لە کاتی قسەکردندا لە دەم دەرچووە". لە هەمان

کاتدا ترەمپ گلەیی دەکرد دەربارەی ئەوەی کە ڕاگەیاندن ئەم بابەتە لە دژی ئەو هەڵدەقۆزێتەوە و وا لێک دەدرێتەوە کەوا سیاسەتی ترەمپ بەرامبەر بە ڕووسیا لاوازە.

وەکو دەڵێن ئاگرەکە هەتا دەهات بەتینتر دەبوو، پریشکی دەچووە هەموو لایەک، بەڵام لاری کودلۆ لە پرێسکۆنفراسێک لەبارەی کۆبوونەوەی ئابێ و ترەمپ باسی ئەو بابەتەی کرد. ساندەرز دەیویست منیش لە پریسکۆنفراسەکەی کۆدلۆ بەشدار بم، بەڵام من ڕەتم کردەوە، چونکە پێم وانەبوو کە لە یەکەم هەفتەی دەستبەکاربوونم ببم بە پاڵەوانی میدیا. هەر لەگەڵ دەستپێکی پرێسکۆنفرانسەکەدا کۆدلۆ ڕاستەوخۆ باسی ئەوەی کرد، چونکە نەدەکرا لەو بابەتە ڕابکا، کودلۆ دەربارەی سزاکانی سەر ڕووسیا ڕایگەیاند کەوا هەندێ هەڵەتێگەیشتن و سەرلێشێوان هەبووە، هەر ئەوەی باسکرد کە ترەمپ لە سەربازگەی بنکەی ئاسمانی یەک بە ساندەرزی گوتبوو. بەڵام هێلی لە پاش ئەوە یەکسەر پەیامی خۆی ناردبوو بۆ دەزگای میدیایی فۆکس دانا-پێرینۆ کە گوتبووی: "لەگەڵ هەموو ڕێزمدا من سەرم لێ نەشێواوە!". لەگەڵ ئەو پەیامە جارێکی تر بابەتەکە تەقیەوە. هێلی جارێکی تر بوویەوە سەردێری هەواڵی ئەم ڕووداوە، کە لەگەڵ هەموو ڕێزێکم هێلی سەری لێ نەشێوابوو بەڵکو هەڵەی کردبوو.

لە بەیانیی ڕۆژی چوارشەممە ترەمپ و ئابێ کۆبوونەوە، پاشان هەندێ کار هەبوو دەبوایە دەستیان پێ بکرێ؛ بەتایبەتی لەسەر بابەتی بازرگانی، کە تا کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ دەستی پێ نەکرد. هەردوو سەرۆک پرێسکۆنفرانسێکی میدیایی هاوبەشیان ساز کرد، لە کاتژمێر حەوت و چارەگی ئێوارە نانی ئێوارەشیان بەیەکەوە خوارد، کە خواردنێکی زۆر بە ماوەیەکی کەم ئامادە کرابوو. من هەر ئەو کاتە بە فڕۆکەی خانمی یەکەم گەڕامەوە واشنتۆن، پێم وایە دانیشتنێکی سەرکەوتووبوو، بە تایبەت لەسەر بابەتی کۆریای باکوور.

ئێستا تیشك دەخەمە سەر ئێران و باسی سزاکان، ئەمە دەرفەتێك بوو، ١٢ی

مانگی چوار، ئەو کاتە بوو کە باسی کشانەوە هاتە گۆڕێ. پۆمپەیۆ لە فلۆریدا بوو، ڕۆژی سێشەممە تەلەفۆنی بۆ کردم و پرسیاری ئەوەی کرد کە چی لە ڕێککەوتننامەی ناوکیی لەگەڵ ئێران بکەین؟! ئەو دوای ئەوەی سەرەتا تووشی هەندێ کێشە ببوو، نەیدەزانی ئێستا پشتگیریی لێ دەکرێ، بۆیە لە بارودۆخی ئەو تێدەگەیشتم، یانیش ئەو پاش هەموو زەحمەتی و ڕەخنەکانی پیاوانی دەوڵەت، هێشتا لەناو کۆشکی سپی یاریی پێ دەکرێ لەوەی کە دوودڵە لە کشانەوە، پۆمپەیۆ گوتی کە قسەی دەوڵەتی پێیە لەوەی دەبێ لە ڕێککەوتنەکە بکشێینەوە، ئەوە شتێك بوو ئەو پێشتریش سوور بوو لەسەری، ئەوەی منی نیگەران دەکرد ئەوەبوو کە پۆمپەیۆ هێشتا لەوە دوودڵ بوو دواجار ببێتە هۆی ئەوەی کشانەوەکە دوابکەوێ، ئەویش بەهۆی ئەوەی بیرۆکراتییەتی دەوڵەت لە کشانەوە لە ڕێککەوتنێکی نێودەوڵەتی و پەلەکردن لەو کارە، هەڵەیەکی گەورەی لە ئاستی ئیدارەی سیاسی لێ بکەوێتەوە.

ترەمپ ماوەی هەفتەیەك لە فلۆریدا مایەوە و پاشان گەڕایەوە واشنتۆن، کە گەڕایەوە من تەرکیزم خستە سەر ئێران. بەس لە بیرم نەچێ من لەمێژبوو باوەڕم وابوو کەوا مەترسیی پرۆگرامی ناوکی ئێران، وەکو کۆریا باکوور پێشکەوتوو و مەترسیدار نییە، بەڵکو بابەتەکە زیاتر پەیوەستە بە ئەقڵییەتی شۆڕشی ئایینی و سەرۆکایەتی لە ئێران، بەڵام توانای ناوکیی ئێران لەگەڵ تواناکانی لە بواری چەکی بایۆلۆژی و کیمیایی و مووشەکی دوورمەودا، دەبنە هۆی مەترسی لە ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی. هەر پێشکەوتنێکی ئێران دەبێتە هۆی هاندانی وڵاتانی تری ناوچەکەی وەکو تورکیا، میسر و سعودیە کە هەوڵبدەن هەنگاو بنێن بۆ دەست گەیشتن بە توانای ناوکی. لە لایەکی ترەوە نادڵنیایی لەسەر ئێران هەبوو کە ببێتە ناوەندێکی جیهانی بۆ هاوکاریکردنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی، وەکو ئەو ڕۆڵە چالاکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەیبوو بۆ هاوکاریکردنی سەربازی و دارایی

گرووپە تیرۆریستییەکان، یان پەرەپێدانی توانا سەربازییەکانی لە وڵاتانی تر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. لەبەر ئەوەی ماوەی چل ساڵی ڕابردوو سیاسەتەکانی ئێران لەو بارەیەوە گۆڕانکارییان بەسەردا نەهاتبوو.

چاوم بە مارك سێدویڵی بەریتانی کەوت، دواتر هاوتا ئەڵمانییەکەم جان هێکر، تەلەفۆنیشم بۆ فلیپ ئیتێن کرد لە فەڕەنسا، بە درێژی پرسی کشانەوەی خۆمان لە ڕێککەتنی ناوکیی ئێران لەگەڵدا باس کردن. من بەردەوام دەمگوت کەوا ڕێککەوتنەکە نەچۆتە قۆناغی کۆتایی. هەموو ڕێگایەکیشم بۆ ئەوە بەکارهێنا ڕوونی بکەمەوە کە ئەو ڕێککەوتنە ئەگەرچ چاککردنیشی نییە، چونکە وەزارەتی دەرەوەش ماوەی ساڵێک داوای دەکرد کە تەنیا پێداچوونەوەی پیدا بکرێ. بۆ هەر سێ وڵاتی هاوپەیمان و حکوومەتەکانیان ئەوە هەواڵێکی قورس بوو. بۆیە من هەر دووبارەم دەکردەوە کە بڕیاری کشانەوەی ترەمپ لە ڕێککەوتنەکە تەنها ماوەی هەفتەیەکی تری پێدەچێ. دەمزانی کە ئەو هەواڵە بۆ هاوپەیمانەکانمان دەبێتە جێگای سەرسورمانێکی گەورە، بۆیە بۆ ئەوەی ئەوە ڕوونەدات من پێشتر ئەوانم ئاگادار کردەوە. ئەو دوو سەردانەشی کە هەبوون بۆ ماکرۆن و مێرکڵ ئەوانیش بزانن کەوا دەرفەتەکان بۆ گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتە کەمە و دەبوایە ئەوان بزانن کە ترەمپ ئەم جارە جددییە و بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەک لە ڕێککەوتنەکە دەکشێتەوە.

من هەستم بە دوودڵی لە پۆمپەیۆ دەکرد، چونکە کە لە مارالۆگ بوو شڵەژابوو، ئەو هەوڵی دەدا کەوا باردۆخەکان ڕاست بکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ڕاند پاوڵ تووشی کێشە ببوو، پاوڵ ڕایگەیاندبوو کە هاوکاری پۆمپەیۆ دەکا ئەگەر ئەو بڵێت؛ ١- شەڕی عێراق لە ٢٠٠٣ هەڵە بووە. ٢-

بەگوێرەی تویتی پاوڵ، گۆڕینی ڕژێمەکان بیرۆکەیەکی هەڵەبووە، دەبێ بە زوویی لە ئەفغانستان بکشێینەوە. من دڵگران بووم بۆ پۆمپەیۆ، چونکە دەمزانی ئەوانە بیرۆکەی خۆی نین. من قەت تووشی بارودۆخی لەو شێوە نەبوومەتەوە کەوا تەنها بۆ ئەوەی دەنگێکی ئیجابی لەسەر من زیادبێ، تێڕوانینی خۆم بگۆڕم، یان تەنها بۆ ئەوەی لە لێژنەی ئەنجوومەنی ئاسایشی ترەمپ ئیشێکم دەست بکەوێ، بۆیە دروستکردنی بڕیار لای من وەکو ئەوە نەبوو کە پۆمپەیۆ تووشی دەبوو.

لەبارەی ڕەوشتی پاوڵ لە کاتی دانانی لە پۆستەکەی، جۆن سولیڤان دواتر پێی گوتم. کە پاوڵ گوتبووی ئەو بۆیە دەنگ بە سولیڤان دەدا، لەبەر یەک هۆکار، ئەویش ئەوەیە کە؛ "چونکە ئەو ناوی بۆڵتن نییە"، تەنانەت کێلیش بە منی گوت کە کاتێک خەریکی گفتوگۆ بوون لەسەر دانانی من، پاوڵ گوتبووی: "ئەوە خراپترین بڕیاری ترەمپ بووە"، بەس کێلی وەڵامی دابووە کە ئەو لەگەڵیدا زۆر بەڕێزە، ئەوەش پاوڵی زیاتر تووڕە کردبوو، بەڵام ئەوە وای کرد من شانازیی بەمەوە بکەم.

دوو هەفتە خۆشەکەی یەکەم، من بەشداریی چەند کۆبوونەوەیەکم دەربارەی بابەتی بازرگانی کرد. من خۆشم بازرگانێکی ئازادم، بەڵام لەگەڵ ترەمپ هاوڕابووم کە هەندێ ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی هەیە پەیوەندی بە بازاری ئازادەوە نییە، تەنانەت هەندێکیان لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکاشدا نین، من هاوڕابووم کە چین یاری بە سیستەمەکە دەکا، لەلایەک باسی سیاسەتی بازاری ئازادی دەکرد لە ڕێگای ڕێکخراوی بازرگانیی نێودەوڵەتی (WTO) لەلایەکی ترەوە خەریکی دزینی داهێنان و پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆژیای ئەمریکا بوو، کە ئەوەش بردنی سەرمایە و بازرگانییەکانمان بوو بۆ ماوەی دوو دەیە. ترەمپ تێدەگەیشت کە توانا ئابوورییەکانی ئەمریکا کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر توانا سیاسی و سەربازییەکانمان دەبێ (دەیویست لەوبارەیە کار لەسەر پرۆژەکانی بکا)،

دەیویست وانەیەک فێری چین و ئەوانی تر بکا. بۆیە بڕیار و ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی بازرگانیی نێودەوڵەتی هەرچییەك بان، زۆر گرنگیمان پێ نەدەدا. لەسەر ئەوە، من و هاوڕێکەمان لەو ڕێکخراوە بۆب لایتهایزەر و هاوڕێیانم کەڤینگتەن و بێلینگ، کە لە حەفتاکانەوە یەکتر دەناسین، هەماهەنگ بووین.

هەرچەندە بڕیارە بازرگانییەکان لە سەردەمی ترەمپ بەئازار بوون و دەکرا کارەکان ڕێکتر بەڕێوە بچن، بەتایبەت دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان ئەنجومەنی ئاسایشی ئەمریکا و ئەنجوومەنی ئابووریی نەتەوەیی کە لە لایەن کۆدلۆ سەرکردایەتی دەکرا، بۆ ئەوەی ئەو دوو ئەنجوومەنە سیاسەتەکانی بازرگانی دابڕێژن، تەنها من بووم کە ئەو بیرۆکەیەم پێ باش بوو، ئەگەرنا کەسی لەگەڵدا نەبوو. بابەتە بازرگانییەکان ببوونە بابەتی ئەو کۆبوونەوە هەفتانەی کە ترەمپ خۆی لە هۆڵی ڕووزڤێلت یان لە هۆڵی کۆشکی سپی سەرپەرشتی دەکردن، کۆبوونەوەکان زیاتر لە داوەتێکی شەڕە خواردن دەچوون نەك کۆبوونەوەی دروستکردنی بڕیار، بێ ئەوەی لە خوارەوەش هیچ بژاردەیەکیان پێ بگا لەوەی پێویستە چی بکەن؟! پاش ئەوە، من هەر فکرم دەچووە سەر ئەوەی یۆگا بکەم لە جیاتی ئەوەی بەشداریی ئەو کۆبوونەوانە بکەم!

کۆبوونەوەی کۆتایی مانگی چوار لەسەر ئامادەکاری بوو بۆ سەردانکردنی پەکین لە وڵاتی چین، ترەمپ پێی وابوو کەوا "گومرگ باشترین هاوڕێ دەبێ"، بەڵام بە منوشنی گوت: "تۆ دەچی چینەکان دەکەیە فیلم!" من ئەوەم پێ خۆشبوو. ترەمپ گوتی کە چین سزاکانی سەر کۆریای باکوور جێ بەجێ دەکا، چونکە لە شەڕی ئابووریی ئەمریکا دەترسن، لەوەدا ئەو ڕاستتر بوو لە من، چونکە من پێم وابوو کە چینییەکان سزا لە دژی کۆریای باکوور بە جددی وەرناگرن. هەرچی

منوشن و کودلۆ بوون، ئەوا ئەوان پێیان وابوو وابوو ئەگەر شەڕی ئابووری لە نێوان چین و ئەمریکا ڕوویدات، بازرگانیی جیهانی تووشی قەیران دەبێ، بەڵام ترەمپ وەڵامی دانەوە کەوا "چینییەکان خوێنساردن، گوێ بەوە نادەن کە ئەمریکا چی بەسەر دێ"، منیش دەمزانی قەیرانی بازرگانی کاریگەرییەکەی زیاتر دەبێ.

ماکرۆن لە ٢٤ی مانگی چوار گەیشتە ئەمریکا، دەبوایە پێشوازییەکە بۆ فەرەنساییەکان سەرسوڕهێنەر بێ، بەداخەوە لە چاوی کامێرا هیچ شتێکی خراپ نەبینرا. شاندی ئیدارەی ئەمریکی و فەرەنساییەکان چوون بۆ باشووری لاون، سەرۆک و خانمی یەکەم لە ژووری دیبلۆماسی چاوەڕێ ماکرۆنیان دەکرد، مارشی سەربازی دەنگی دەهات، لە دەنفۆردم پرسی کە ناوی ئەر گۆرانییە (مارشەکە) چییە، ئەویش لە دوو بەرپرسی سەربازیی واشنتۆنی پرسی، بەڵام هیچ کامیان نەیانزانی ناوی ئەو مارشە چی بوو کە لێدرا، بۆیە من و دەنفۆرد دەستمان بە پێکەنین کرد. نمایشە سەربازییەکە زۆر سەرەنجڕاکێش بوو، بەتایبەت کە پاسەوانەکان و تەپڵلێدەرەکان جلوبەرگی شەڕی شۆڕشیان لەبەرکردبوو، لە ڕۆیشتن مۆسیقای "یانکیی دووڵ"یان لێدەدا.

پێش دانیشتنی دووقۆڵی، ترەمپ و ماکرۆن کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییان ئەنجام دا، وەکو هەموو جار وێنە گیران و پرسیار کرا، ترەمپ وەسفی ڕێککەوتننامەکەی لەگەڵ ئێران بە "گێلانە" کرد، من بیرم دەکردەوە کە ئەو خەڵکەی لەوێ بوون چەندە ئەوە بە جددی وەردەگرن، ترەمپ و ماکرۆن لەوە زیاتر قسەیان کرد کە پێشبینی دەکرا، هەموو دڵمان خۆش بوو. تەنها ماکرۆن نەبێ کە دەیویست قەناعەت بە ترەمپ بێنێ کە لە ڕێککەوتننامەکە نەکشێتەوە. ماکرۆن بۆ ئەوە کاری کرد کە ماوەی گفتوگۆی ڕێککەوتننامەکە درێژ بکرێتەوە، بەتایبەت لەسەر چوار کۆڵەکە

سەرەکییەکەی، کە لە کۆبوونەوەیەک لەنێوان ترەمپ و ماکرۆن باس لە چوار کۆڵەکە سەرەکییەکە کرا؛ (پرۆگرامی ناوکیی ئێران لە ئێستا، چارەسەرکردنی لە داهاتوو، پرۆگرامەکانی مووشەکی ئێران، ئاشتی و ئاسایشی هەرێمایەتی). ماکرۆن سیاسییەکی زیرەک بوو، هەر شکستێک کە تووشی دەبوو هەوڵی دەدا لە لایەنی ئەرێنییەوە لێی بڕوانێ. ماکرۆن بە باشی بە ئینگلیزی قسەی دەکرد، ئەو گوتی کە گومانی هەیە لەسەر ڕێککەوتنەکە، "کەسیش ناڵێت کە ڕێککەوتننامەیەکی بێ کێشەیە"، هەروەها باسی ئەوەی کرد کە دەکرێ کار بکرێ لەسەر ڕێککەوتنێکی باشتر، بە لەبەرچاوگرتنی چوار کۆڵەکە سەرەکییەکە. لە کاتی کۆبوونەوەکەدا ترەمپ لە منی پرسی کە ئاخۆ چۆن دەڕوانمە ڕێککەتننامەکە؟! من گوتم کەوا ئەو ڕێککەوتنە ناتوانێ ئێران ڕابگرێ بەوەی دەستی نەگاتە چەکی ناوکی، هەروەها هیچ ڕێگاچارەیەک نییە بۆ چارەسەرکردنی ئەوە. هەروەها قسەیەکی ئایزەنهاوەرم بیرهێنانەوە کە گوتوویەتی: " ئەگەر نەتوانن کێشەیەک چارەسەر بکەن، گەورەی بکەن"، هەستم دەکرد هەر ئەوەش بوو کە ماکرۆن کاری لەسەر دەکرد. ئەو کارە دەبوایە لە پاش کشانەوە لە ڕێککەوتننامەکە بکرێ، لە ڕێگای دانانەوەی سزاکان بۆ سەر ئێران، کە منوشن باسی ئەوەی کرد ئێمە بە تەواوی ئامادەی ئەو هەنگاوەین.

لەسەر ئەو ڕێککەوتنە و کارکردن لەسەری ترەمپ گوتی: "ناتوانی کە بناغەیەک خراپ بوو کاری لەسەر بکەی، کێری ڕێککەوتنێکی خراپی کردووە، من ناڵێم کە چی دەکەم، بەس من دەرگا دەکەمەوە کەوا ڕێککەوتننامەیەکی نوێ بکرێ بۆ ئەوەی چارەی هەموو شتێک بکا". لەجیاتی ئەوەی ڕێککەوتنێکی کارە خراپەکان چاک بکەینەوە، لە سەرەتاوە یەکێکی نوێ دەست پێ دەکەین. (ماکرۆن بە ڕاشکاوانە گوتی

منیش پەلەمە بۆ ئەوەی ئەو ڕێککەوتنە نوێیە دروست بکرێ، بەڵام نابێ هەمووی بەس بە دڵی ترەمپ بێ). لە پاش ئەو کۆبوونەوەیە بابەتە بازرگانییەکان هاتنە گۆڕێ تا ١٢:٢٥ خولەک کە پاش ئەوە ئامادەکاری کرا بۆ ئەنجامدانی پرێسکۆنفرانسی ڕۆژنامەوانی.

لەو کاتەدا هیچ یەکێک لە ترەمپ و ماکرۆن شتێکی جیاوازیان لەسەر ئێران باس نەکرد، هەر لەسەر ئەوە ترەمپ پێی وابوو کەس فکری لەسەر ئەوە نییە کەوا من چی دەکەم، بەڵام من پێم گوت کە تۆ بیرۆکەی باشت لەسەر ئەوە هەیە. لە پاش ئەوە کاتی نانی ئێوارە هات. زۆر خۆشە کە بتوانی تاکو ١٠:٣٠ی شەو نان بخۆیت! تەنانەت من و گرێتچین هەوڵمان دا کاتبەسەربردنەکەی ئەو شەوە زووتر جێ بهێڵین، هەروەکو جۆن کێلی و خیزانەکەشی هەمان کاریان کرد، چونکە زوو هەوڵمان دا جانتاکانی خۆمان بپێچینەوە، بۆ ئەوەی بگەڕێینەوەماڵەوە.

خۆئامادەکردن بۆ گەڕانەوە دەستی پێ کرد، سەرەڕای ئەوەی ماتیس دایانابوو ٢٥ی مانگی ئەپرێل بگەڕێینەوە، بەڵام دیاربوو ماتیس زۆر بەمە دڵگران نەبوو، ترەمپ بە ماتیسی گوتبوو کە ناتوانێ چەند ڕۆژێک زیاتر لێرە بمێنێتەوە، هەر بەوەشدا من زانیم کەوا لە ٢٥ی مانگی ئەپرێل ئێمە ئێرە جێ دەهێڵین. هەروەها ترەمپ بە منی گوت کەوا دەبێ منوشن هەموو کارێک بکا بۆ ئەوەی سزای زۆر قورس ئامادە بکرێن بۆ سەر ئێران. بۆ بەیانی من ئێتینم بینی کە لەگەڵ نێردەی فەرەنسا بوو، بە ڕاشکاوی پێم گوت کەوا لە کۆبوونەوەی دوو قۆڵیی نێوانیاندا، ماکرۆن هیچ شتێکی بۆ ترەمپ پێ نەبوو، ئەوەش ڕوون بوو، چونکە ترەمپ بە ڕاشکاوی بە ماکرۆنی گوتبوو بە هەر جۆرێک بێ ئێمە دەکشێینەوە.

ئەم جارە دێینە سەر باسی کۆبوونەوەی نێوان مێرکڵ و ترەمپ لە ٢٧ی ئەپرێل، ئەو کۆبوونەوەیە زیاتر کۆبوونەوەیەک بوو لەبارەی کارکردن

نەوەک سەردانێکی تەشریفاتیی نێوان دوو دەوڵەت، بەڵام لە ڕووی ئاستی پێشوازییەوە، ئەوەی بۆ ماکڕۆن کرا بۆ مێرکڵ نەکرا. کۆبوونەوەی دووقۆڵیی نێوان ترەمپ و مێرکڵ تەنها ١٥ خولەکی خایەند، دوای ئەوە دیدارێکی گەورەتر هەبوو. لە کۆبوونەوە گەورەترەکەدا ترەمپ بە گلەییکردن دەستی پێ کرد و گوتی ئەڵمانیا لە ڕێگای هێڵی بۆڕیی نەوتی نۆرد ستریم ٢ەوە خواردن بە دڕندەکە دەدات (مەبەستی لە ڕووسیا بوو)، پاشان چووە سەر باسی یەکێتیی ئەورووپا و پێی وابوو مامەڵەی یەکێتییەکە لەگەڵ ئەمریکادا زۆر خراپە. ڕوون بوو لام ترەمپ پێی وابوو ئەڵمانیا گرفتاری ڕووسیایە. ترەمپ لەوێدا بۆ یەکەمین جار دێڕێکی بەکارهێنا کە لەوەودوا بێشوومار لێم بیستەوە: "یەکێتیی ئەورووپا لە چین خراپترە، بەس ئەوەیە بچووکترە." پاشان گوتی یەکێتیی ئەورووپا کەڵکی بێجێ لە ئەمریکا وەردەگرێت، مێرکڵیش ناکۆک بوو (بە ئینگلیزی، تەواوی دیدارەکە ناکۆک بوو). مێرکڵ داوای سێ بۆ چوار مانگ درەنگخستنی کرد لە سەپاندنی ئەو گومرگە جیهانییەی کە ترەمپ دەیویست و دەخرایە سەر ئاسن و ئەلەمنیۆم، بۆ ئەوەی یەکێتیی ئەورووپا لەگەڵ ئەمریکادا مامەڵە بکات. لە وەڵامدا ترەمپ گوتی نایەوێت لەگەڵ یەکێتیی ئەورووپادا مامەڵە بکات. لە مێشکی خۆمدا گوتم خۆزگە هەمان هەڵوێستی بەرامبەر بە کۆریای باکووریش دەبوو. ترەمپ چووە سەر باسی شکستی ئەڵمانیا لە پابەندییەکەی ناتۆدا بۆ بەرزکردنەوەی بوودجەی سەربازیی بۆ سەدا ٢، هەروەها بە مێرکڵی گوت ئەو یەکێکە لە سەرنجشێوێنترین و خۆدزەرەوەترینەکانی ناتۆ؛ ئێستا ئەو سیفەتانەی گواستبوویەوە بۆ بازرگانی و مامەڵە. مێرکڵ پێداگریی لەسەر درەنگخستنی باجی گومرگەکان دەکرد، وای لێ هات بە دوو مانگیش قایل بوو، بەڵام ترەمپ گوتی ئەوەش هەروەک ناتۆ کاتکوشتنە. ترەمپ پرسی کەی ئەڵمانیا بوودجەی بەرگری

دەگەیەنێتە سەدا دوو، مێرکڵ بە داماوییەکەوە گوتی ٢٠٣٠، ئەوەش هەموو ئەڵمانییەکانی هێنایە پێکەنین و ترەمپیش گوتی ئەوە ١٦ مانگە هەر ئەو قسەیە دەکاتەوە. لە کۆتاییدا مێرکڵ بە ترەمپی گوت دەتوانێت چی دەوێت لەبارەی باجی گومرگەوە ئەوە بکات، چونکە ئەو پیاوێکی ئازادە.

بە شێوەیەکی بێسەروبەرە ناوی ئێران دەهێنرا. مێرکڵ داوای لە ئێمە کرد لە ڕێککەوتنەکەدا بمێنینەوە، ترەمپیش گوێی بەو قسەیە نەدا. لە دیدارە ڕۆژنامەوانییەکەدا، ترەمپ دەربارەی ئێران گوتی: "ئەوان چەکی ناوکی بەکار ناهێنن." بەگشتی ئەوە هەمووی بوو. لەوانەشە بە ڕووداوتر بووبێت لە هێرشە وازانراوەکەی ڕۆژی دواتری ئیسرائیل بۆ سەر پێگەکانی ئێران لە سوریا، کە بووە هۆی نیگەرانبوونی ماتیس و پنتاگۆنییەکانی تر لەسەر ئەوەی نەکا ئێران تۆڵە لە هێزەکانی ئەمریکا بکاتەوە (لە ڕێگای گرووپە میلیشیا شیعەکانی عێراقەوە). هیچ ڕووینەدا و ترەمپیش هیچ نیگەرانییەکی پێوە دیار نەبوو. ترەمپ لەسەر بیرکردنەوەکانی دەربارەی ئێران قسەی لەگەڵ ناتەنیاهۆدا کرد و گوتی تەواوی ڕێککەوتنەکە لەسەر بنەمای درۆ بووە و ئێران ئەمریکای هەڵخەڵەتاندووە، بۆیە ئیسرائیل بۆی هەیە بە ئاشکرا ڕێککەوتنەکە پێشێل بکات و خودی ناتەنیاهۆش خەریکی ئەوە ئەوە بوو.

لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژەکاندا، لەگەڵ منوشن، هایلی و کۆتس و هاسپێڵ و ئەوانی تردا گوتمان هەموو شتەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن لە سەرەتای ئایاردا پاشەکشە لە ڕێککەوتنەکەی ئێران بکرێت، هەروەها دەبوو بیر لە ڕێکاری باش بکەینەوە بۆ قۆناغی دوای ئەو پاشەکشەیە. منوشن پێداگریی لەوە کرد کە بۆ گەڕاندنەوەی سزاکان بۆ جێی خۆیان شەش مانگی دەوێت، منیش لەوە تێنەدەگەیشتم. نەدەکرا لە ماوەیەکەی کەمدا، تۆ بڵێ سێ مانگ، سزاکان بسەپێندرانایەتەوە؟ ئەوە کێشەی گەورەی وەزارەتی گەنجینە بوو لەژێر دەستی منوشندا. وا دەردەکەوت ئەو چەندێک خەیاڵی

لای سەپاندنی سزاکان بێت ئەوەندەش خەیاڵی لای کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانیان بێت. جێی سەرسوڕمان نەبوو ئێران و کۆریای باکوور و ئەوانی تر زۆر باش خۆیان لە سزاکان لادەدا: کاتێکی زۆریان هەبوو بۆ خۆدەربازکردن لە شێوازەکەی منوشن (کە لە بنەڕەتدا جیاوازیی لەگەڵ شێوازەکەی ئۆبامادا نەبوو). پەمپەیۆ لەگەڵ مندا هاوڕا بوو کە دەبێت سزاکان کاریگەریی یەکسەرییان هەبێت. سەرکەوتنێکی بچووکمان بەدەست هێنا کاتێک منوشن ماوەکەی بۆ زۆرێک لە خزمەتگوزارییەکان لە ۱۸۰ ڕۆژەوە بۆ ۹۰ ڕۆژ کەم کردەوە، بەڵام بۆ نەوت ئەوەی نەکرد و هەر بە ۱۸۰ ڕۆژ مایەوە. بێگومان نەوت گرنگترین بابەتی ئابووری بوو، بۆیە کەمکردنەوەکانی منوشن گرنگییەکی وایان نەبوو. هەروەها مەبەستی ئێمە نزیکخستنەوەی کاتی جێبەجێکردنی سزا هەبووەکان نەبوو، بەڵکو کاتێکی نزیکیشمان دەویست بۆ جێبەجێکردنی سزای نوێ. ئەوە شکستبەخۆهێنانێکی ناپێویست بوو.

لە ۲ی ئایاردا لە کاتژمێر شەشی بەیانیدا پەمپەیۆ و ماتیس و من ئامادەی یەکەمین خوانی بەیانیی هەفتانەمان بووین لە پنتاگۆن، لەوێ ماتیس بەردەوام بوو لە قسەکردن دژی کشانەوە. ڕوون بوو ترەمپ بڕیاری خۆی دابوو. لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا ئامادەکارییەکان بۆ ڕاگەیاندنی پاشەکشە و دەرچوون لە ڕێککەوتنەکە زیادیان کرد، بە تایبەتی لە بابەتی ئامادەکردنی نووسراوی بڕیاری سەرۆکدا، بۆ ئەوەی هیچ بوارێک نەبێت بۆ ئەوەی پاڵپشتەکان لێوەی بگەڕێنەوە. ستیڤن میلەر و گوتارنووسەکانی کاریان لەسەر وتارەکەی ترەمپ دەکرد و کارەکەشیان بە باشی دەچووە پێش. ترەمپ زۆری بۆ وتارەکە زیاد کرد و کارکردن لەسەر نووسراوەکە بەردەوام بوو بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ خستنە سەر شاشەی خوێندنەوە. من ۷ی ئایارم بە باش دەزانی بۆ ڕاگەیاندنەکەی ترەمپ، بەڵام ساندەرز گوتی خاتوونی یەکەم ئەو ڕۆژە کارێکی هەیە، بۆیە خستمانە ۸ی ئایار.

بەوشێوەیە لە بابەتە قورسەکانی پرۆسەکە ڕزگارمان بوو. لە ڕاستیدا ترەمپیش هەر لەسەر ڕۆژێک ڕێک نەدەکەوت و تا دواخولەک ڕای دەگۆڕی.

لە ٥ی ئایاردا ترەمپ و تێریزا مەی پەیوەندیی ماندووکەریان لەسەر ئێران و کێشەکانی تر ئەنجام دا، شەوی یەکشەممەش بۆریس جۆنسنی وەزیری دەرەوە بۆ گفتوگۆی زیاتر گەیشتە واشنتۆن. لەو شەوەشدا، ماتیس نووسراوێکی تری پۆلێنکراوی نارد بۆ من لە ماڵەوە و تیایدا دژایەتی کشانەوەی دەکرد، بەڵام هێشتا بۆ تاوتوێکردنی داوای دیدارێکی باڵای نەدەکرد. ویستم بنووسم پێگەکەی ئەو هەڵگیراوە بۆ مێژوو، بەڵام وام نەکرد. هێشتا پنتاگۆن پێی نەگوتبووین لە ڕووی کردەییەوە لە ئەگەری کشانەوەی ئەمریکادا دەبێت چی بکرێت، چونکە ئەوان لە دژایەتیکردنێکی ئاشکراوە بووبوون دۆخەکەیان کردبوو بە جەنگی پارتیزانی. ئەوە ئێمەی خاو نەکردەوە.

کاتژمێر نۆی بەیانیی ڕۆژی دووشەممە جۆنسنم لە نووسینگەکەم بینی و بە درێژی باسی کۆریای باکوور و ئێرانمان کرد. یەکەمجار ئەوم لە لەندەن لە ساڵی ٢٠١٧ دیتبوو. قسەمان لە دیدارەکانی ترەمپ کرد لەگەڵ ماکرۆن و مێرکڵدا، هەروەها باسی بیرۆکەی "چوار کۆڵەکەکە"ی ماکرۆنیشمان کرد؛ جۆنسن گوتی ئەوانیش بیریان لەوە کردووەتەوە. من گوتم خۆشحاڵ دەبم بە بیرۆکەکە بڵێم "چوار کۆڵەکەی جۆنسن،" هەموومان بە هاوڕابوونەوە پێکەنین. ئەویش وەک ماکرۆن جەختی کردەوە لەوەی بەریتانیا لە لاوازییەکانی ڕێککەوتنەکانی ئێستا تێدەگات، ئەوەش هەندێک لە شوێنکەوتوانی ئەویان سەرسام دەکرد. ڕوونم کردەوە بۆچی بەزوویی ڕاگەیاندنەکە دەبینین، بەڵام لەبەرئەوەی چاک ترەمپم دەناسی نەمگوت ڕاگەیاندنەکە سبەینێیە. لە پاش ڕاگەیاندنەکە نەدەکەوتینە دۆخی ناچالاکییەوە، بەڵکو ئەو سزایانەمان بەگەڕ دەخستەوە کە پەیوەندییان بە چەکی ناوکییەوە هەبوو و بەهۆی ڕێککەوتنەکەوە وەستێنرابوون. کاتێک

جیابووینەوە، بیری جۆنسنم خستەوە کە چۆن هاوینی پێشوو پێم گوتووە ئامادەم لە برێگزیتدا یارمەتیی بدەم، هێشتاش ئەو ئامادەییەم تێدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێکی وامان نەبوو قسەی لەسەر بکەین. دواتر لەسەر ئەو گفتوگۆیە قسەم لەگەڵ سێدویلدا کرد و دواتریش لەگەڵ ئێتیاندا دوام و گوتی ترەمپ تویتی کردووە:

سبەینێ کاتژمێر دووی نیوەڕۆ لە کۆشکی سپییەوە بڕیاری خۆم لەسەر ڕێککەوتنەکەی ئێران ڕادەگەیەنم.

هیچ گومانێک نەما. ئێتیان لە من زیاتر ئاگاداری تویتەکانی ترەمپ بوو! تا ڕادەیەک دەمانزانی چی دەبێت، ئەوەشم بە ڕۆن دێرمەری باڵیۆزی ئیسرائیل و چەند کەسێکی تریش گوت، هەرچەندە کەسیشیان پێویستیان بە ڕوونکردنەوە نەبوو.

لە یادی ڕۆژی پیادەڕەوەیی نۆرماندیدا، ترەمپ هەشتی بەیانی پەیوەندیی بە شیی جینگ پینگەوە کرد تا هەندێک بابەت تاوتوێ بکەن، لە نێویشیاندا کۆریای باکوور. ترەمپ گوتی بەزوویی قسە لەسەر ئێران دەکات، پاشان هەروەک منداڵ بە جینپینگی گوت: "دەتەوێت بزانیت دەمەوێت چی بڵێم؟" جینپینگ گوتی دیارە ترەمپ حەز دەکات پێی بڵێت، ئەوەش بۆچوونێکی دروست بوو. ترەمپ هەستی بە متمانە دەکرد بەرامبەر بە جینپینگ، بۆیە گوتی دەیەوێت ڕێککەوتنەکە ناوکییەکە هەڵبوەشێنێتەوە. جینپینگ گوتی هەواڵەکە ئاشکرا ناکات، هەروەها گوتیشی ئەمریکا بە باشی ئاگاداری پێگەی چینە لەو بابەتەدا؛ ئەوەش واتای ئەوە بوو جینپینگ نایەوێت ئەوە بکاتە کێشەیەکی گەورەی سێلایەنە. ماکرۆن پەیوەندیی کرد و پرسی ترەمپ بەتەمایە چی لەسەر ئێران بڵێت، بەڵام ترەمپ ویستی لە وریایی ماکرۆن دڵنیا بێت. ترەمپ ماکرۆنی وریا کردەوە لەوەی نابێت هەواڵەکە بڵاو بکاتەوە. ماکرۆن گوتی وریا دەبێت و بڵاوی ناکاتەوە. ماکرۆن باوەڕی وابوو نابێت ئێران

ڕێککەوتنەکە جێ بهێڵێت، هەروەها فەڕەنساش چونکە کاریان لەسەر بەدیهێنانی ڕێککەوتنێکی نوێ کردبوو و دوو سەرکردەکەش پێشتر باسی ئەوەیان کردبوو. ترەمپ پێی وانەبوو ئێران لە ڕێککەوتنەکە دەربچێت، چونکە پارەیەکی زۆریان دەست دەکەوت. ترەمپ باسی ئەوەی کرد دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕۆحانی ببینێت، ئەوەش ماکرۆنی سەرسام کرد. ترەمپ گوتیشی ماکرۆن دەبێت بە ڕۆحانی بڵێت ترەمپ لەسەر حەق بووە.

ترەمپ لە کاتژمێر ٢:١٥ی نیوەڕۆدا وتارەکەی هەروەک لە نووسراوەکە هەبوو پێشکەش کرد، من و پێنس و منوشن و ئیڤانکا و ساندەرز ئامادە بووین. لەدوای ئەوە، گەڕاینەوە بۆ نووسینگەی هێلکەیی و پێمان وابوو وتارەکە بەپێی نەخشەکە ڕۆیشتووە و مەبەستەکە باش گەیشتووە. پاش چەند خولەکێک لە ٢:٣٠، لە ژووری چاوپێکەونی کۆشکی سپی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی نزیکم لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکاندا هەبوو کە دەنگم تۆمار دەکرا نەگ ڕەنگم، بۆیە وێنەی ڕاگەیاندنەکان هی وتاردانەکەی سەرۆک بوو. ئەو بابەتە تەواو بوو.



پارچەپارچەکردنی ڕێککەوتنەکەی ئێران مانگێکی پێ چوو، ئەویش دەیسەلماند بەجددی وەرگرتنی پرۆسەکە زۆر ئاسانی کردبوو. هەوڵی زۆرم دا بۆ ئامادەکردنی هاوپەیمانەکانمان (بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەڕەنسا) بۆ ڕووداوەکە، چونکە وا دەردەکەوت ئامادە نەبن بۆ پاشەکشەی ئێمە. بۆ بەچۆکداهێنانی ئێران و لەناوبردنی ڕژێمەکەیان دەبوو کاری زۆر زیاتر بکەین، سەرەڕای ئەوەی سیاسەتە ڕاگەیەندراوەکەی ترەمپیش وای نەدەنواند، بەڵام سەرەتای باشمان هەبوو.

بۆ ماوەی چەند مانگێک پاش پاشەکشەکە، کارەکە بۆ جێبەجێکردنی

بڕیارەکەی ترەمپ بوون بۆ سەپاندنەوەی سزاکان، هەروەها بۆ هەڵگرتنی هەنگاوی تر بۆ زیادکردنی فشارەکان بۆ سەر تاران. پلانەکە گەڕاندنەوەی هەموو ئەو سزایانە بوو کە ڕێککەوتنە ناوکییەکەی سەردەمی ئۆباما وەستاندبوونی، هەروەها دەشمانویست ڕێگەی دەرچوون بۆ ئێران نەهێڵینەوە و زۆرترین فشاریان لێ بکەین. ٢٦ی تەمووز کاتی کۆبوونەوەیەک بوو لەسەر ئەوەی شتەکان چۆن بەڕێوە دەچن و کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ ئەوەمان کرد. سەرنجڕاکێشترین بەشی کۆبوونەوەکە بریتی بوو لە کۆششەکانی ماتیس بۆ بچووککردنەوەی ڕۆڵ و گرنگی ئێران لەو هەڕەشە نێودەوڵەتییانەدا کە لەسەر ئەمریکا بوون. ئەو گوتی ڕووسیا و چین و کۆریای باکوور هەڕەشەی گەورەتر بوون، بەڵام زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی پەمپەیۆ و منوشن ڕاستەوخۆ قسەکانی ئەویان ڕەت کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هۆکارەکانی ماتیس ڕوون نەبوون، چونکە ئێران لە ستراتیژیی ئاسایشی نەتەوەییدا بە یەکێک لە چوار مەترسییە گەورەکە هەژمار کرابوو و ترەمپیش ئەوەی پەسەند کردبوو. بەڵام تارمایی بەرەنگاریکردنی ماتیس بەرامبەر بە گرنگی و ڕۆڵی ئێران تا کۆتایی ٢٠١٨ لەگەڵماندا مایەوە، واتا تا ئەوکاتەی کە کۆشکی سپی جێهێشت و دواتریش. کۆبوونەوەکە هێندە بایەخدار بوو دزەی کردە دەرەوە و ڕۆژی دواتر ڕاگەیاندنەکان باسیان لێی کرد. لە هەمان کاتدا، دراوی ئێران بە تەواوەتی کەوتبوو.

لە ناوەڕاستی ئابی ٢٠١٨دا، پاشانیش لە کانوونی دووەمی ٢٠١٩دا، سەردانی ئیسرائیلم کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ ناتەنیاهۆ و هەندێک بەرپرسی دیکەی ئیسرائیلدا باسی هەندێک بابەت بکەم، بە تایبەتیش ئێران. ئەوە بابەتێکی هەستیار بوو بۆ ئیسرائیل، ناتەنیاهۆش بووبووە ستراتیژیستی ڕێبەر لە بەرەنگاریکردنی بەرنامە ناوکی و مووشەکە بالیستیکییەکانی ئێراندا. بە باشیش لەوە تێگەیشتبوو گۆڕینی ڕژێمەکە باشترین ڕێگا بوو بۆ گۆڕینی ڕەفتاری ئێرانییەکان. تەنانەت ئەگەر ڕووخانی ڕژێمەکەش سیاسەتی

ڕاگەیاندراوی حکوومەتەکەی ترەمپیش نەبووبێت، دەکرا بەهۆی کاریگەریی سزاکانەوە ئەوە ڕوویدات. لەوەش زیاتر، بە لەبەرچاوگرتنی بۆچوونی وڵاتە عەرەبییە نەوتدارەکان، هاوڕاییەکی چەند ساڵە لەسەر هەڕەشەی ئێران هەبوو بۆ سەر ئیسرائیل و ئەوان، بەڵام بە هۆکاری جیاواز. ئەو کۆڕاییەی لەسەر ئێران هەبوو دەیتوانی ڕێگا بۆ چارەکردنی کێشەی ئیسرائیل و فەلەستین بکات، ئەوەش سوودێکی زۆری ستراتیژیی بۆ ئەمریکا تێدا دەبوو. بەڵام ئەوەی ئایا دەمانتوانی زۆرترین کەڵک لەو یەکگرتنە وەربگرین یان نا، بابەتێکی جیاواز بوو.

لە سەرەتای ئەیلوولدا، هێرشەکان بۆ سەر باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە بەغداد و کۆنسوولخانەی ئەمریکا لە بەسرە کە بە بۆچوونی من گومانی تێدا نەبوو کاری میلیشیا شیعەکانە و فەرمانیان لە ئێران وەرگرتووە، گرژیگەلێکی نوێی خستە ناو حکوومەتەوە، چونکە زۆر کەس لە وەزارەتەکانی بەرگری و دەرەوە بەرهەڵستیی وەڵامدانەوەی توندیان دەکرد. خواستی تۆڵەنەکردنەوە و وەڵامنەدانەوە و ئومێدخواستن بە ڕێکگریلێکردنیان لە داهاتوودا،، هیچ نەبوو جگە لە زیندووبوونەوەی سیاسەتی سەردەمی ئۆباما. تەنانەت پاش ٢٠ مانگیش لە سەرۆکایەتیکردنی ترەمپ، هێشتاکە بەرپرس و سیاسەتە نوێیەکان جێی خۆیان نەگرتبوو. ئەگەر هێشتا لە سەرەتای ٢٠١٧دا بووینایە بۆی هەبوو کێشەکە قبوولکراو بێت، بەڵام ئەوە لە هەڵەکارکردنێکەوە دروست بووبوو کە بێهەڵوێستیی بیرۆکراتیک لە بابەتە هەستیارە سیاسییەکاندا پێداگریی لێ دەکرد. ئەو دیبەیتانەی لەسەر وەڵامدانەوەی هێرشگەلی لەم جۆرە دەکران پەستیان دەکردم، چونکە کۆنەپەرستی و ئارەزووی ترەمپ بۆ کشانەوەی هێزەکانمان لە وڵاتە جیاوازەکان، زیاتر ئێمەی بەرەو ئاراستەی بێهەڵوێستی دەبرد. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕقە زۆرەی ترەمپ لە حکوومەتەکەی ئۆباما هەیبوو، ئەوە زۆر پێکەنیناوی بوو کە بۆچوونە سەیرەکانی خۆی زۆر لە خواستە

بیرۆکراسییەکان دەچوون و زیانیان بۆ بەرژەوەندیی ئەمریکا هەبوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

شتێکی تریش کە بێزاری کردبووم بێمەیلیی وەزارەتی گەنجینە بوو بۆ پووچەڵکردنەوەی بەشداریکردنی ئێران لە سیستمی ئابووریی جیهانیدا کە بە SWIFT ناسرابوو، کۆمارییەکانی کۆنگرێس پێیان باش بوو پەیوەندیی ئێران بەو سیستمەوە بپچڕێندرێت، بەڵام منوشن و وەزارەتی گەنجینە بەرهەڵستییان کرد. ئەوان تا ڕادەیەک نیگەران بوون، بەڵام هیچ هەوڵێکیان نەبوو بۆ گۆڕینی سیاسەتەکە کە بریتی بوو لە بێهەڵوێستیی بیرۆکراتی. وەڵامە ڕاستەکە ئەوە بوو فشاری زۆر زیاتر بخرێتە سەر ئێران و کار بۆ ڕێگای تر بکرێت بۆ چاودێریکردنی ئێران، بە ڕادەیەک کە هیچ ڕێگایەکی دەرچوونیان نەبێت. ستافی ئەنجوومەنی ئاسایش و من بە ناڕاستەوخۆیی هەوڵمان بۆ ئەوە دەدا و هەر لەو ساڵەشدا سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، بەڵام ساڵی دواتر لە سیاسەتی ئێراندا کێشەی قورسترمان ڕووبەڕوو بوویەوە.

## بەشی چوارەم

## کۆکتێلی سەنگافوورە

سەرەڕای ئەوەی لە پاشەکشەکردن لە ڕێککەوتنە ئەتۆمییە بەدبەختەکەی ئێران نزیک دەبووینەوە، هێشتا ترەمپ هەر سەرنجی بەرنامە ناوکییەکەی کۆریای باکووری دەدا. تا زیاترم دەزانی، زیاتر لە دیدارەکەی کیم و ترەمپ سارد دەبوومەوە و ڕەشبینتر دەبووم. زۆر بەگومان بووم لەو کۆششانەی بۆ ئەنجامدانی دانوستان دەکران بۆ ئەوەی کۆریای باکوور دەست لە بەرنامە ناوکییەکەی هەڵبگرێت. شایەنی باسە کۆریای باکوور چەندجارێک لە بەرامبەر سوودی ئابووریدا پەیمانی بە ئەمریکا و وڵاتانی تر دابوو دەست لەو بەرنامەیە هەڵبگرێت. کۆریای باکوور بەردەوام پەیمانەکانی دەشکاند و پابەند نەدەبوو، کەچی هەمیشە ئەمریکایەکی ساویلکەی دەهێنایەوە سەر مێزی گفتوگۆ، بۆ ئەوەی پاشەکشەی زیاتر بکات و کاتی زیاتری بۆ خۆی دەکڕی. کەچی ئەوەتا دیسانەوە هیچ فێر نەبووبووین و هەمان کارمان دەکردەوە. لە هەمووشی خراپتر، بە ڕێکخستنی ئەو دیدارە لەگەڵ ترەمپدا ڕەوایەتیمان بە کیم جۆنگ ئونی فەرمانڕەوای زیندانی کۆریای باکوور دەدا. ئەوە گوفتارە تاریکەکەی وینستۆن چەرچڵی هێنایەوە یادم، کە لە ساڵی ١٩٣٥دا دەربارەی سیاسەتی شکستخواردووی بەریتانیا بەرامبەر بە ئەڵمانیا کردبووی:

کاتێک دۆخەکە لەژێر دەستدا بوو فەرامۆش کرا، ئێستا کە تەواو لەدەست دەرچووە ئەو چارەسەرە درەنگانە بەکار دەهێنین کە دەکرا کاتی خۆی کێشەکە چارە بکەن. لەم چیرۆکەدا هیچ شتێکی نوێ بوونی نییە. بە ئەندازەی چیرۆکە جادوگەرییە کۆنەکان کۆنە. یەکێکە لەو هەموو ئەزموونە ناخۆش و بێبەرهەمانەی کە پشتڕاست کراونەتەوە لەوەی مرۆڤایەتی فێریان نابێت. دووربینیت دەوێت، لەو کاتەی هەڵوێست سادە و کاریگەرە هەڵوێستت نابێت، ناتوانیت بە باشی بیر بکەیتەوە، تا کاتی نالەباربوونی دۆخەکە ڕاوێژکردن بە ئاڵۆزی دەمێنێتەوە — ئەمانە تایبەتمەندییەکانی دووبارەبوونەوەی ناکۆتای مێژوون.

من کە بەرگەی هەشت ساڵ لە هەڵەکانی ئۆبامام گرتبوو و بەردەوام دەترسام پاشەکشەی مەترسیدار بۆ کۆریای باکوور بکات، هەروەک چۆن بۆ ئێرانی کرد، (ئەوە باسی گوفتارە شەش لایەنییەکەی بوش و ڕێککەوتنە شکستخواردووەکەی کلینتن هەر مەکە)، زۆر بێزار بووم لەو شەیداییەی ترەمپ بۆ دیداری کیم جۆنگ ئون هەیبوو. پەمپەیۆ پێی گوتم شەیدایی ترەمپ بۆ دیداری کیم بۆ سەراتاکانی ئەم حکوومەتە دەگەڕێتەوە؛ ڕوون بوو هەڵبژاردنەکان سنووردار بوون.

لە ١٢ی نیساندا، لە ناوەندی گێژەڵوکەکەی سووریادا، چونگ ئوی یۆنگی هاوشانی خۆمم لە کۆریای باشوور دی ، ئەو بەڕێوبەری ئاسایشی نەتەوەیی بوو. لە لە مانگی ئازاردا کیم لە نووسینگەی هێلکەیی بانگێشتنامەکەی کیمی بۆ ترەمپ درێژ کردبوویەوە و ترەمپیش لە جێدا قبووڵی کردبوو. ئەوەی پێکەنیناوییە ئەوەیە چونگ دواتر دانی پێدا نا ئەو پێشنیاری بۆ کیم کردووە کە ئەو یەکەمجار بانگێشتنامە بنێرێت. ئەم سەما دیپلۆماسییە دەستکردی کۆریای باشوور بوو و زیاتر پەیوەندیی بە بەرنامەکەی خۆیەوە هەبوو "یەکخستن" هەتا ستراتیژییە جددییەکانی کیم و

ئەمریکا. لە ڕوانگەی منەوە، تێگەیشتنی باشوور لە مەبەستی ئێمە بۆ وازپێهێنانی کۆریای باکوور لە چەکی ناوکی، هیچ پەیوەندییەکی بە خواستی نەتەوەیی ئەمریکاوە نەبوو. بە بۆچوونی من ئەوە شانۆییەکی مەترسیدار بوو. داوام لە چونگ کرد لە دیدارەکەی ٢٧ی نیساندا لە نێوان باکوور و باشوور باسی وازهێنانی ناوکی نەکات، بۆ ئەوەی کۆریای باکوور پەیوەندیی نێوان کۆریای باشوور و ژاپۆن و ئەمریکا نەشێوێنێت، چونکە ئەوە یەکێک بوو لە ستراتیژییە دڵخوازەکانی باکوور. بە ترەمپم گوت دەبێت نزیکترین هاوکاریمان لەگەڵ موون جای ئیندا هەبێت، بۆ ئەوەی کۆریای باکوور نەتوانێت پەیوەندیی واشنتۆن و سیئۆڵ تێک بدات. دەمویست یەکگرتوویی ئەمریکا و کۆریای باشوور بپارێزم و حەزم نەدەکرد لە سەردێڕی ڕۆژنامەکاندا بنووسرێت "ترەمپ ڕێککەوتنی کۆریای باشووری ڕەت کردەوە،" بەڵام ترەمپ گوێی بەوە نەدەدا.

هەمان بەیانی شاتۆرۆ یاچیی هاوشانە ژاپۆنییەکەی خۆمم بینی. یاچی دەیویست گوێ بۆ ڕوانینی ئەو بگرم. گۆشەنیگای ژاپۆن بۆ دیدارەکەی ترەمپ و کیم ١٨٠ پلە پێچەوانەی گۆشەنیگای کۆریای باشوور بوو —بە کورتییەکەی وەک گۆشەنیگای من وابوو. یاچی گوتی ئەوان باوەڕیان وایە کۆریای باکوور ئامادەیی تێدایە واز لە چەکی ناوکی بهێنێت، هەروەها لە دواهەلی چارەسەرێکی ئاشتیخوازانە نزیکین. ژاپۆن پێی خۆش نەبوو ئەو ڕێککەوتنە "کردار بە کردار"انەی لە دیدارە شەش لایەنییەکەی بۆشدا هەبوون، لێرەشدا هەبن. (کردار بە کردار) گونجاو دیار بوو، بەڵام لە بەرژەوەندیی کۆریای باکوور دەبوو، چونکە سوودی ئابووریی پێ دەگەیاندن و بۆشی دیاری نەدەکردن لە چ داهاتوویەکدا دەبێت بەرنامە ناوکییەکەیان پووچەڵ بکەنەوە. سوودی بچووکترین یارمەتیی ئابووری (بۆ نموونە ئاسانکردنی سزاکان) بۆ کۆریای باکوور زۆر گەورەتر بوو لە سوودی پووچەڵکردنەوەی ناوکیی هەنگاو بە هەنگاو بۆ ئەمریکا. لەو

خاڵەدا، ژاپۆن داوای ئەوەی کرد پووچەڵکردنەوەکە ڕاستەوخۆ دوای دیدارەکەی کیم و ترەمپ دەست پێ بکات و دوو ساڵ زیاتری پێ نەچێت. من بەپێی ئەزموونەکەی لیبیا گوتم نابێت لە شەش بۆ نۆ مانگ زیاتر بخایەنێت. لە وەڵامدا یاچی زەردەخەنەی کرد، بەڵام کاتێک دوای هەفتەیەک ئابێ و ترەمپ یەکتریان بینی (سەیری بەشی سێ بکە)، ئابێ داوای کرد پووچەڵکردنەوەکە شەش بۆ نۆ مانگ زیاتر نەخایەنێت!

یاچی جەختی لە فڕاندنی هاوڵاتیە ژاپۆنییەکانیش کردەوە لە لایەن کۆریای باکوورەوە، چونکە ئەوە کێشەیەکی زۆر بەهێزی هەستی بوو لای خەڵکی ژاپۆن و خاڵێکی گرنگی سەرکەوتنی ژیانی سیاسیی ئابێش بوو. لە دیدارەکەی ترەمپ و ئابێدا، ترەمپ پەیمانی دا گرنگی بەو بابەتە بدا و لە هەموو دیدارێکیشیدا لەگەڵ کیم باسی ئەوەی دەکرد.

پەمپەیۆ خەریکی دانوستان بوو لەسەر شوێن و بەرواری دیدارەکە، هەروەها لەسەر ئازادکردنی سێ دیلی ئەمریکایی. کیم دەیویست دیدارەکە یان لە پیۆنگ یانگ بێت یانیش لە پانمونجۆم، من و پەمپەیۆش پێمان وابوو نابێت دیدارەکە لە هیچ کام لەو دوو جێیە بێت. پەمپەیۆ جێنێڤا و سەنگافوورەی بە دوو بژاردەی قبوولکراو زانی، بەڵام کیم نەیدەویست بە فڕۆکە گەشت بکات. هەرچۆنێک بێت فڕۆکە بێکەڵکەکانی کۆریای باکوور نەدەگەیشتنە ئەو دوو جێیە، کیمیش نەیدەویست زۆر لە پیۆنگ یانگ دوور بکەوێتەوە. ئومێدی من: بابەتەکە تێک بچێت.

لە یەکتربینینەکەی ترەمپ و ئابێدا، ئابێ بە درێژی باسی بەرنامە ناوکییەکەی کۆریای باکووری کرد و هەروەک یاچی ئەویش جەختی لە هەبوونی ڕێککەوتنێکی زۆر کاریگەر کردەوە، نەک وەک ئەوەی ئێران کە ترەمپ زۆر لێی بە ڕەخنە بوو و خودی حکوومەتەکەی ئۆباماش ئاماژەی بەوەدا ئەو ڕێککەوتنە هەر واژووش نەکراوە. بێگومان، پیۆنگ

یانگ چەندێک دەیتوانی دەربارەی ڕێککەوتنی واژووکراویش درۆ بکات نەک تەنها واژوونەکراو، بەڵام ڕێککەوتنی واژوونەکراو پاڵنەرێکی زیاتر دەبێت بۆیان. ئابێ پێداگری لە پێگەی لەپێشینەی ژاپۆنیش کردەوە کە ئەوان مووشەکە کیشوەربڕ و مامناوەند و کورتمەوداکانیش هەر بە مووشەکی بالیستیکی دەزانن. هەروەها ژاپۆن داوای پووچەڵکردنەوەی چەکە کیمیایی و زیندەییەکانی کۆریای باکووری دەکردەوە، منیش هاوڕا بووم لەسەر ئەوەی هەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ باکووردا بکرێت دەبێت ئەوەی تێدا بێت. ترەمپ لە ئابێی پرسی بۆچوونی چییە لەسەر سەردانەکەی کیم جۆنگ ئون بۆ لای شی جینگ پینگ لە چین و ئابێش گوتی ئەوە ئاماژە بووە بۆ کاریگەریی هەڕەشەی ئەمریکا بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی و سزادان و بڕینی ئەو نەوتەی لە چینەوە دەڕوات. ئابێ گوتی ئەو زەبرەی ئەمریکا چەند ڕۆژێک لەوەوبەر لە سووریای داوە پەیامێکی بەهێزی بۆ کۆریای باکوور و ڕووسیا ناردووە. کاتێک بوش کۆریای باکووری بە یەکێک لە جەمسەرەکانی خراپە دیاری کردبوو، کیم جۆنگ ئیلی باوکی کیم جۆنگ ئون زۆر ترسابوو. پێم وابوو پێشکەشکردنە قەناعەتپێکەرەکەی ئابێ بە تەواوەتی سەرنجی ترەمپ ڕادەکێشێت، بەڵام کاریگەرییەکەی سنووردار بوو. ژاپۆنییەکانیش هەستیان دەکرد ترەمپ پێویستی بە بیرخستنەوەی بەردەوامە، ئەوەش ڕوونی دەکردەوە بۆچی ئابێ ئەوەندە زوو زوو دەربارەی کۆریای باکوور لەگەڵ ترەمپدا دەدوا.

لە ٢١ی نیساندا، کۆریای باکوور بە هەرایەکی زۆرەوە ڕایگەیاند وازی لە تاقیکردنەوەی زیاتری ناوکی و تاقیکردنەوەی مووشەکی بالیستیکی هێناوە، چونکە بووە بە هێزێکی ناوکی. ڕاگەیاندنی خۆشباوەڕ ئەمەی بە هەنگاوێکی مەزن زانی و ترەمپیش بە پێشکەوتنێکی زۆری زانی. من ئەوەم بە پروپاگەندەیەکی تری فریودەر زانی. ئەگەر تاقیکردنەوە

پێویستەکان تەواو ببوونایە، ئەوا پیۆنگ یانگ زۆر بەسادەیی دەیتوانی ئەو کارانە بکات کە بۆ چەکەکان و سیستمی توانای بەرهەمهێنان پێویستن. چونگ لە بەرواری ٢٤ی نیساندا و لەپێش دیدارەکەی دوو کۆریاکە لە ناوچەی بێسوپا سەردانی کردەوە. ئاسوودە بووم کاتێک چونگ ئاماژەی بەوە دا "ڕاگەیاندنی پانمونجۆم"ی تەنها دوو پەڕە دەبێت، ئەوەش واتای ئەوەیە هەرشتێک دەربارەی وازهێنانی ناوکی بلێت تێروتەسەل نابێت. هەستم کرد کۆریای باشوور باوەڕی وایە بەهۆی فشاری سزاکانەوە کۆریای باکوور شەیدای ڕێککەوتنە، تا ئەوجێیەشی کۆریای باکوور بووە بە دەوڵەتێکی خاوەن چەکی ناوەکی، بەرەوپێشچوونی ئابووری لەپێشینەترین شتە بۆی. ئەم بیرکردنەوەیە ئاسوودەی نەدەکردم. لە هەمان کاتدا، پەمپەیۆ هەڵبژاردنەکانی شوێن و کاتی دیدارەکەی ترەمپ و کیمی تەسک دەکردەوە و پێدەچوو بەروارەکە ١٢ یاخود ١٣ی حوزەیران بێت لە جێنێڤا یاخود سەنگافوورە.

فێستیڤاڵەکەی ٢٧ی نیسانی مون و کیم هەر فڕینی کۆتر و پیشاندانی لقی دار زەیتوون بوو، واتا تا ڕادەیەکی زۆر خاڵی بوو لە قسەکردن لەسەر بابەتی گرنگ. لە بەیانیی هەینیدا بە کاتی واشنتۆن، کۆپییەکی نیویۆرك تایمزم دا بە ترەمپ کە بابەتێکی نیک ئێبەرستادتی تێدا بڵاوکرابووەوە، ئەو یەکێک بوو لە زیرەکترین ئەوانەی چاودێریی کۆریای باکوور دەکەن و ڕاستەوخۆ بە دیدارەکەی گوتبوو: "ستایلی پی تی بارنەم، لە هەموو خولەکێکی دیپلۆماسیدا کەسێک هەیە حەز بکات فریو بدرێت." پێم وا نەبوو ترەمپ بیخوێنێتەوە، بەڵام ویستم جەخت لەوە بکەمەوە مەرج نییە بەرنامەی کۆریای باشوور هەمیشە وەک هی ئێمە بێت، هەروەها دەبێت خواستەکانی خۆمان بپارێزین. خۆشبەختانە ڕاگەیاندنەکەی پانمونجۆم ئازارکوژێکی نایاب بوو، بە تایبەت دەربارەی بابەتە ناوکییەکان. ڕۆژی شەممە مون پەیوەندیی بە ترەمپەوە کرد تا هەواڵی گفتوگۆکانی پێ بدات.

مون هێشتا بەجۆش بوو. کیم پابەندبوونی خۆی بە وازهێنانی تەواو لە چەکی ناوکی ڕاگەیاندبوو و بۆ ئەو مەبەستەش پێشنیاری داخستنی پێگەی یونجایری ناوکیی کردبوو. ئەوە پاشەکشەیەکی درۆینەی تر بوو، هەروەک چۆن کاتی خۆی کیم جۆنگ ئیل پەیمانی دا تاوەری فێنککەرەوەی کارتێکەری ناوکیی یۆنگبیۆن بتەقێنێتەوە. مون پێداگریی لەسەر ئەوە کرد دیدارەکەی ترەمپ و کیم ڕاستەوخۆ پاش دیدارێکی ئەمریکا و دوو کۆریاکە بێت. ئەمە کۆششی مون بوو بۆ ئەوەی لە وێنەکەدا دەربچێت (وەک چۆن لە حوزەیرانی ۲۰۱۹شدا دەمانبینییەوە). وا دەردەکەوت ترەمپ نوقمی شادی بووبێت و داوای دەکرد لە نیوەڕۆدا کیم ببینێت، ئەوەش لە ڕووی لۆژیکییەوە ئەستەم بوو. خۆشبەختانە مون گوتی کیم بە سەنگافوورە قایلە، ئەوەش تا ڕادەیەکی باش شوێنی دیدارەکەی دیاری کرد. لە کۆتاییدا گوتی من و پەمپەیۆ لەگەڵ موندا کار لەسەر بەرواری دیدارەکە بکەین، ئەوەش خۆشحاڵکەر بوو.

مون داوای لە کیم کردبوو لە ماوەی ساڵێکدا چەکە ناوکییەکانی پووچەڵ بکاتەوە، ئەویش قایلبوونی خۆی دەربڕیبوو، ئەوەش نزیک بوو لەو کاتەی من پێشنیارم کردبوو. ئەوەی پێکەنیناوی بوو ئەوە بوو، لە مانگەکانی داهاتوودا وای لێ هات قایلکردنی حکوومەتی ئەمریکا بە یەک ساڵ قورستر بێت لە قایلکردنی کیم. دوو سەرکردەکە باسی ستراتیژییەتەکانیان کردبوو بۆ دیدارەکە، هەروەها کیم لە مونی پرسی بە دیاریکراوی ئاماژە بەوە بدات کە دەبێت لە کۆریای باکووری داوا بکەین، ئەوەش زۆر بەسوود بوو. ئەوە دیپلۆماسییەتێکی زیرەکانە بوو، چونکە مون هەر شتێکی بنووسیبایە گلەیی نەبوو ئەگەر ئێمە داوای بکەین، هەروەها ئەگەر شێوازی ئێمە لە هی مون توندتر بوایە کێشە نەدەبوو، چونکە هەرچۆنێک بێت ئەو قسەی خۆی کرد. مون ستایشی سەرکردایەتیی ترەمپی کرد. لە بەرامبەردا، ترەمپ داوای لە مون کرد بە ڕاگەیاندنەکانی کۆریای باشوور بڵێت ڕۆڵی

ترەمپ لە تێکڕای ئەو بابەتانەدا چەندێک بووە. پاش ئەوە ترەمپ لەگەڵ ئابێدا قسەی کرد بۆ ئەوەی لە ڕوانگەی ڕاپۆرتەکەی مونەوە لەسەر دیدارەکەی خۆی و کیم، قسەی ستراتیژی لەسەر دیداری ترەمپ و کیم بکەن. ئابێ هەموو ئەو خاڵانەی دووبارە کردەوە کە جاری پێشوو ئاماژەی پێ دابوون و بە پێچەوانەی مونەوە زۆر گەشبین نەبوو. لەبەرئەوەی ژاپۆن متمانەی بە کۆریای باکوور نەبوو، پێداگریی لەسەر پابەندبوونی ڕوون و ئاشکرا کردەوە لەسەر بابەتی ناوکی و کێشەی فڕێندراوەکانی ژاپۆن. ئابێ بە ترەمپی گوت ئەو لە ئۆباما توندترە، ئەوەش بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی ئابێ بە گرنگی دەزانێت زوو زوو ئەوە بە بیری ترەمپ بهێنرێتەوە.

پاشان گەشتم بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرد و قسەم لەگەڵ پەمپەیۆدا کرد، چوون ئەو لەوێوە گوێی لە پەیوەندییەکانی ئابێ و مون گرتبوو. من گوتم: "پەیوەندییەکەی مون ئەزموونێکی نزیکەمەرگ بوو". پەمپەیۆ لە وەڵامدا بە تەنزەوە گوتی: "خەریک بووە لە سعودییە دڵی بوەستێت." پاش بڕێک تاوتوێ لەسەر ١٢ و ١٣ی حوزەیران ڕێک کەوتین و بۆ شوێنی دیدارەکەش سەنگافوورەمان هەڵبژارد. لە بەرەبەیانی دووشەممەدا، ترەمپ پەیوەندیی پێوە کردم بۆ ئەوەی باسی دەرکەوتنی من بکات لە دوو بەرنامەی سەندەی تۆک شۆدا کە بەگشتی بابەتی گفتوگۆکان دەربارەی کۆریای باکوور بوون. ئەو گوتی: "تۆ زۆر باش بوویت لەسەر تەلەڤیزیۆن، بەڵام دەبوو زیاتر ستایشی من بکەیت، چونکە لەمەوپێش هەرگیز شتی وا ڕووینەداوە." هەرچۆنێک بێت، مون گوتی ترەمپ دەپاڵێوێت بۆ خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی. لەگەڵ ئەوەشدا ترەمپ گوتی پێی خۆش نەبووە کە باسی مۆدێلەکەی لیبیام کردووە بۆ دەستەهەڵگرتنی تەواو لە چەکی ناوکی، ئەویش لەبەرئەوەی موعەممەر قەزافی حەوت ساڵ دواتر لە بەهاری عەرەبیدا کەوت و لەناوچوو. هەوڵم دا ڕوونی بکەمەوە ئەو مۆدێلە سڕینەوەی سەرتاپای بەرنامەی ناوکیی لیبیا بووە و پەیوەندی بە کەوتنی

پێشبینینەکراوی قەزافییەوە نەبووە.

مێژوو سەلماندی ڕوونکردنەوەکەم نەگەیشتە جێ. ترەمپ نەیدەتوانی تێبگا لەوەی هۆکاری کەوتنی قەزافی بەهاری عەرەبی بووە کە لە ساڵی ۲۰۱۱دا دەستی پێ کرد، نەک وازهێنانی لیبیا لە بەرنامەی ناوکی لە ساڵی ۲۰۰۳دا. ئەوە تەنها هەڵەی ترەمپ نەبوو. زۆر کەس کەوتبوونە ناو ئەم هەڵە لۆژیکییە کلاسیکییەکەوە بە ناوی "ئەمیان دوای ئەویان ڕوویدا، کەوایە هۆی ئەمیان ئەویان بوو." لەم بابەتەی ۲۰۱۹ی نیویۆرك تایمزدا نموونەیەک هەیە: "موعەمەر قەزافیی دیکتاتۆری لیبی پاش ئەوەی وازی لە بەرنامە ناوکییە ساواکەی لیبیا هێنا، لە ساڵی ۲۰۱۱دا کوژرا." لەگەڵ ئەوەشدا، ترەمپ بە گوتنی "دەستخۆش" کۆتایی بە گفتوگۆکە هێنا. ئەوەی خەنیهێنەر بوو ئەوە بوو دواتر ترەمپ لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا گوتی لە بەکارهێنانی چەمکی "مۆدێلەکەی لیبیا"دا مەبەستی تیاچوونی تەواوی لیبیا بووە: "ئێستا ئەگەر ڕێککەوتن نەکەین، بۆی هەیە ئەو مۆدێلە بەسەر کۆریای باکووردا دووبارە ببێتەوە." پاش ئەوەی ترەمپ ئەو قسانەی کرد، جێگری سەرۆک پێی گوتم لێی بدەرەوە و گوتیشی: "پشتی گرتیت!" خودی ترەمپ گوتی: "بۆم چارە کردیت."

لە بابەتی دیلەکانیشدا بەرەوپێشچوونی باش هەبوو. ئاماژە هەبوو بۆ ئەوەی کۆریای باکوور سێ دیلە ئەمریکییەکە ئازاد دەکات، بەو مەرجەی خودی پەمپەیۆ بچێت بۆ کۆریای باکوور و بە فڕۆکە دیلەکان بهێنێتەوە. من و پەمپەیۆ بیرۆکەی چوونی ئەومان بەدڵ نەبوو بۆ کۆریای باکوور، بەڵام ئازادکردنی دیلەکان هێندە گرنگ بوون گوێمان بەوە نەدا. ترەمپ لای گرنگ نەبوو کێ دەچێت دیلەکان دەهێنێتەوە. چونکە لە ٤ی ئایاردا بۆ سێهەمین جار هاتەوە بۆ دیتنم و وردەکاریی زیاتری پێدام لەسەر دیدارەکەی مانمونجۆم. ئەو گوتی پێداگریی لە کیم کردووە بۆ ئەوەی بە وازهێنانی یەکجارەکی و پشتڕاستکراوە و تەواوی ناوکی قایل بێت،

ئەوەش دارشتنی ئێمە بوو لە سەردەمی بوشدا و هەنگاوێکی گرنگی گوفتاریش بوو بۆ کۆریای باکوور. بە گوتەی مون کیم گوێڕایەڵ بوو، بەڵام کیم هەرگیز بە ئاشکرا پابەندبوونی خۆی دەرنەبڕیبوو. مون جەختی لە کیم کردبوویەوە ڕێککەوتنێکی گەورە لەگەڵ ترەمپدا بکات، چونکە هەموو ئەو سوودانەی باکوور دەستی دەکەوێت لە پاش وازهێنانی ناوکییەوە دێت. بە گوتەی مون، کیم گوتوویەتی لە هەموو ئەوانە تێگەیشتووە. مون داوای کرد لە ناوەڕاست و کۆتاییەکانی ئایاردا و پێش دیدارەکەی ترەمپ و کیم چاوی بە ترەمپ بکەوێت، ئێمەش یەکسەر قایل بووین. لە هەمان ڕۆژدا یاچیی ژاپۆنی هات بۆ نووسینگەکەم تا باسی دیدارەکەی ترەمپ و کیم بکەین، ئەوەش دەرخەری ئەوە بوو ژاپۆنییەکان بە وردی چاودێریی پرۆسەکەیان کردبوو. یاچی ویستی ئاماژە بەو شادییە بکات کە کۆریای باشوور هەستی پێ دەکات و پێداگری لەوە کرد نابێت بکەوینە ژێر کاریگەریی شێوازی باوی هەنگاو بە هەنگاوی کۆریای باکوورەوە.

پەمپەیۆ سێشەممەی هەشتی ئایار بەڕێ کەوت بۆ پیۆنگ یانگ تا سێ دیلە ئەمریکییەکە بهێنێتەوە و لە دووی بەیانیی ڕۆژی پێنجشەممەدا شانبەشانی هەر سێ دیلەکە گەیشتەوە واشنتۆن. ترەمپ لە ڕێوڕەسمێکی جوانرێکخراو و نایاب و ڕاستەوخۆدا لە نیوەشەودا بەخێرهاتنەوەی لە پیاوەکان کرد. سێ پیاوە ئازادبووەکە زۆر شاد بوون و کاتێک لە فڕۆکەکە دابەزین و گەیشتنە بەر چاوەکان لە خۆشیدا باڵیان کردەوە. ئەوان پێیان خۆش بوو لێدوان بۆ ڕاگەیاندنەکان بدەن و ناوەندی سەرنجی شەوەکە بوون، هەروەها چێژیان لە گەڕانەوەیەکی زۆر جیاوازتر لەوەی ئۆتۆ وارمبایر وەردەگرت، کە بە ئەشکەنجەدراوی و نزیکەمردوویی گەڕایەوە. کە فڕۆکەی مارین وان گەڕایەوە بۆ کۆشکی سپی و بەلای مۆنۆمێنتە درەوشاوەکەی واشنتۆندا تێپەڕی هەستێکی تایبەتی هەبوو.

تەنانەت کاتێک کاتژمێر سێی بەیانیش لە ساوس لاون نیشتینەوە، ترەمپ هێشتاکە لە ئەوپەڕی شادیدا بوو، چونکە ئەوە سەرکەوتنێک بوو دژترین ڕاگەیاندنیش نەیدەتوانی لە گرنگییەکەی کەم بکاتەوە.

ئامادەکارییەکان بۆ دیدارەکەی ترەمپ و کیم بەخێرایی دەکران. بە دیاریکراوی نیگەرانی ئەوە بووین چین بۆ ئەوەی کاریگەری بخاتە سەر کۆریای باکوور چی دەکات، بە تایبەت ئەوەی ئایا کەسێکی وەک یان یێچی کە باڵیۆزی پێشووی چین بوو لە سەردەمی بوشدا و پێشتر وەزیری کاروباری دەرەوە بوو و ئێستا ڕاوێژکاری دەوڵەت بوو چی بە کۆریای باکوور دەڵێت. نیگەرانی ئەوە بووم پەکین خۆی بۆ ئەوە ئامادە بکات لە ئەگەری سەرکەوتوونەبوونی گفتوگۆکاندا گلەیی لە ئەمریکا بکات، هەروەها ئاگاداری ئەوە بدات گوایە توندڕەوەکانی کۆریای باکوور ئەوەیان بەدڵ نەبێت کە کیم جۆنگ ئون هەر ئاوا و بێبەرامبەر دیلەکانی ئازاد کردووە. لەم سیناریۆیەدا، هیچ هاوڕاییەک لە سیستمی کۆریای باکووردا نەبوو و بەرەنگاریکردنی سوپای پیۆنگ یانگ ئاماژە بوو بۆ ئەوەی گفتوگۆکان هەر پێش ئەوەی دەست پێ بکەن کەوتوونەتە مەترسییەوە. چارەسەر؟ پاشەکشەی تر لە لایەن ئەمریکاوە. ئەوە یەکێک بوو لە کۆنترین یارییەکانی دەفتەری کۆمەنیستەکان: ڕۆژئاواییگەلێک ترساو و ساویلکە ناچارن لە نێوان "میانڕەوەکان" و "توندڕەوەکان"دا یەکێکیان هەڵبژێرن، لە ئەنجامیشدا وەک پاڵپشتی لە میانڕوەکان دەرئەنجامگەلێکی ناخۆش قبووڵ دەکەن. چونگ نیگەرانی ڕاگەیاندنەکەی کۆریای باکوور بوو لەسەر ئەوەی تەنها ڕۆژنامەنووسان بەشداری لە داخستنی پێگەی ناوکیی پونجایریدا دەکەن، لە کاتێکدا پێشتر شارەزایانی ناوکیش بەشدارییان دەکرد. لەگەڵ ئەوەی ئەم تەڵەیە لەناوبردنی شتێک

بوو نەک بونیادنانی، بەڵام هەستم دەکرد ڕۆحی گریگۆری پۆتێمکین[1] لە جێیەکەوە ئاهەنگی بۆ دەرکەوتنەوەی خۆی بۆ دەگێڕا.

مـن و چونـگ بەدرێژایـی هەفـتەکە پەیوەنـدیمان پـێکەوە هەبـوو و ئامادەکاریمان بۆ سەردانەکەی موون جای ئین بۆ واشنتۆن و دیدارەکەی ترەمپ و کیم دەکرد. باسی داخستنی پونجایریمان کردەوە کە فریـودانێکی تەواو بـوو. سـەرەتا باسـی نەبـوونی پشـکنەری ئەمریکـی و نێودەوڵەتیی پێگە ناوکییەکانمان کرد کە پێویستن بـۆ پشـکنینی تونێلەکـان پێش ئەوەی ئامادەکاری بۆ لەناوبردن و تەقاندنەوەی دەرگـای تونێلەکـان بکرێت. کۆریـای بـاکوور ڕێگـای بەو پشـکنینانە نەدەدا، لەو ڕێگایەشـەوە زانیاریی گرنگی دەشـاردەوە. شـارەزا دادگـاییە ناوکییەکـان دەیـانتوانی بە خەمڵاندن دەرئەنجامگەلی گرنگیـان دەسـت بکەوێـت لەسـەر فراوانـی و قەبـاری بەرنـامەی چەکە ناوکییەکـان و لەسـەر پـێگە ناوکییەکـانی تـری کۆریـای بـاکوور کە دەمانویسـت بیانپشـکنین و دایـانبخەین. بەهـۆی ئەزموونی دەزگای نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمییەوە لە عێراق لە ساڵانی ٩١ و دواترەوە باش دەمانزانی ئەگەر پێش و پاش لەکارخستنی پێگە ناوکییەکان پشـکنین نەکرێـت، ئەوا بـواری شـاردنەوەی زانیـاریگەلی زۆر گرنـگ دروست دەبێـت. پشـکنینی پـاش ڕووداوەکە، بـۆ نمـوونە ئەوەی دەزگـای نێـونەتەوەیی وزەی ئەتـۆمی نمـوونەی خـاکی دەوروبەری تونێلەکـان کۆبکـاتەوە، نەدەبـوونە جێگـرەوەی چـاودێریکردن و پشـکنینی چیـای پونجـایری، کۆریـای بـاکووریش ئەوەی چـاک دەزانـی. ئەم نوانـدنە

(١) گریگۆری پۆتێمکین، وەزیرێکی ڕووسی بوو بۆ سەرنجڕاکێشانی شـاژنە کاترینـای دووەم هەستا بە دروستکردنی لادێیەکی ساختە. هەرکاتێک شاژن سەردانی نـاوچەکەی دەکرد پیاوەکانی گریگـۆری پـۆتێمکین جلـی جووتیارییـان لەبەردەکـرد و لادێکەیـان ڕاست دەکردەوە و شـاژنیان بەوە فریـو دەدا کە ئەوە لادێیەکـی ڕاسـتییە، کە شـاژنیش دەڕۆیشت لادێکەیان دەخستەوە و دەچوونەوە بە لای کاری خۆیانەوە.

پڕوپاگەندەییە بەڵگەی باوەڕی باشی پیۆنـگ یانـگ نەبـوو، بە پێچەوانەوە بەڵگە بوو لەسەر باوەڕی بێکەڵک و خراپی. تەنانەت سی ئێن ئێنیش دواتر هەڵوێستی کۆریای باکووری بە "شاردنەوەی دیمەنی تاوان" چواند. چونگ پێـی وابـوو دەکرێـت ئەو بـابەتە لە کۆتـایی هەفـتەدا لە دیـداری دوو کۆریاکەدا لە پانمونجۆم بـاس بکرێـت، بەڵام بـاکوور لە دواخولەکەکانـدا دیدارەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوەش پلانێکی تری نموونەیی پیۆنـگ یانـگ بـوو. پـاش ئەوە بە جۆرێـک لە جۆرەکـان هەڕەشـەی هەڵوەشـاندنەوە دیدارەکەی ترەمپ و کیمیان کرد و گلەییـان لە چالاکییەکی سـەربازیی ساڵانەی ئەمریکا و کۆریـای باشـوور دەکـرد بە نـاوی "مـاکس سـەندەر." ئەوەش تەڵەیەکـی تـری پڕوپاگەنـدەیی بـوو، بەڵام هەرچۆنێـک بێـت گلەییەکانی کۆریا لەسەر چالاکییە سەربازییەکە، کە زۆر گرنـگ بـوو بـۆ ئامـادەیی سـوپای یەکگرتـووی دوو وڵاتەکە، بە جۆرێـک کـاریگەریی لەسەر ترەمپ دانا کە کۆریای باکوور لە خەونیشیدا چاوەڕێی نەدەکرد.

کـاتژمێر شـەش و نیـوی ئێـوارە لەگەڵ ترەمپـدا باسـی ئەم هەڵچـوونەی کۆریای باکوورم کرد، ئەویـش گـوتی دەبێـت گـوتەی ئێمە لە کـۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەدا ئەمە بێت: "دۆخەکە هەرچی بێت، بەلای منەوە ئاسـاییە، ئەگەر مەیلیان بـۆ دیـدار بێـت، مـن ئامـادەم. ئەگەر نەشیانەوێت یەکـدی ببینـین، دیسـانەوە هەر پـێم ئاسـاییە. بە تەواوەتـی تێـدەگەم." کـاتژمێر ٧ی ئێـوارە پەیوەنـدیم بە تـرەمپەوە کـردەوە و بە دوورودرێـژی ڕەخـنەی لە چالاکییە هاوبەشەکەی کۆریای باشوور و ئەمریکا گـرت: ئەو بـۆ مـاوەی سـاڵێکی تەواو دژی ئەو چـالاکییە بووبـوو، تێنەدەگەیشـت لەوەی بـۆچی ئەوەندە پارەی زۆر دەوێت، هەروەها پێی خۆش نەبـوو B-52 لە نـاوچەی گەومە بفڕێنێـت تـا بەشـداریی لەو چـالاکییەدا بکـات و زۆری تـریش. نەمـدەتوانی بـاوەڕ بـکەم بەوەی مەبەسـت لەو چالاکیـانە پێشـتر ڕوون نەکراونەتەوە (مەبەست لێیان ئامادەیی تەواو بوو بۆ وەڵامـدانەوەی هێرشـی

کۆریای باکوور). ئەگەر ڕوونیش کرابێتنەوە ئەوا کاریگەرییان نەبووە. سوپا شایستەکان بەردەوام مەشق و چالاکییان هەیە. ڕاهێنانی هاوبەش زۆر گرنگە بۆ ئەوەی وڵاتانی هاوپەیمان لە کاتی قەیراندا خۆیان تووشی کێشە نەکەن. دروشمی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆریا "ئەمشەو بجەنگە" بوو، ئەوەش وێنەدانەوەی ئەرکەکەی بوو بۆ شکاندنی توندوتیژی. کەمبوونەوەی ئامادەیی هێزەکان دروشمەکەی دەگۆڕی بۆ "مانگی داهاتوو بجەنگە،" ئەوەش باش نەبوو. هەرچۆنێک بێت، بۆم دەرکەوت ترەمپ نایەوێت گوێی لەو قسانە بێت. ئەو چالاکییانە کیمیان بێتاقەت دەکرد و گرانیش بوون. دۆسییەکە داخرا.

لە هەمان کاتدا کارمان لەسەر پێگەی خۆمان دەکرد لە سەنگافوورە؛ پەمپەیۆ لە جێیەکی هەستیاردا پێشنیاری کرد هەرکاتێک ترەمپ لەگەڵ کیمدا بوو ئەو و کێلی و منی لەگەڵدا بین، من و کێلیش یەکسەر قایل بووین. نیگەرانی ئەوەش بووم چۆن تەقینەوە ڕۆژانەکانی ناو کۆشکی سپی لە سەردەمی ترەمپەوە چۆن کارمان لێ دەکات. نموونەیەکی ئەو حاڵەتە ناخۆشانە لە نیوەڕۆدا ڕووی دا و لە قسەیەکی سووکی کێلی سادلەری فەرمانبەری پەیوەندییەکانی کۆشکی سپییەوە هات لەسەر جۆن مەکین. لێدوانەکە دژی جۆن مەکین بوو و ئاماژە بوو بۆ ئەوەی بۆی هەیە بۆ بەڕێوبەری سی ئای ئەی دەنگ بدات بە جینا هاسپێل، چونکە "هەرچۆنێک بێت دەمرێت." قسەکە گەیشتە ڕاگەیاندنەکان و تەقییەوە. ترەمپ دەیویست پلەی سادلەر بەرز بکاتەوە، لە کاتێکدا ئەوانی تر دەیانویست لە کارەکەی دەربکرێت، یان لانی کەم ناچار بکرێت لەبەر چاوی ڕای گشتیدا داوای لێبوردن لەسەر بێهەستییەکەی بکات. ڕەتی کردەوە داوای لێبوردن بکات و بەهۆی ترەمپەوە بۆی دەرچوو، چونکە ترەمپ ڕقی لە مەکین بوو و ڕێگەی بەویش دابوو ڕقی لێی بێت. سادلەر بێهەستییەکەی خۆی گۆڕیبوو بۆ چەکێک بۆ تۆمەتبارکردنی ئەوانی تر،

ئەوەش تاکتیکێکی باو و ناخۆشی کۆشکی سپیی ترەمپ بوو. ترەمپ بە باوەشێک و ماچێک پاداشتی سادلەری دایەوە. هەرچەندە ئەو کارەساتە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبوو، بەڵام سەردانی کێلیم کرد، چونکە پێم وابوو مرۆڤێکی لۆژیکی دەتوانێت فەرمانبەرە یاخییەکەی ناچار بە داوای لێبوردنێک بکات. پاش گفتوگۆیەکی دووبەدوو لە نووسینگەکەیدا، کێلی گوتی: "نازانیت چەندێک ئارەزوومە ئەم شوێنە جێ بهێڵم. ئێرە شوێنێکی ناخۆشە بۆ کارکردن، تۆش بەزوویی ئەوەت بۆ دەردەکەوێت." بەیانیان ئەو یەکەم کەس بوو ترەمپ ببینێت و ئێوارانیش دواکەس، منیش دەمتوانی مەزەندەی بکەم ئەو لە ماوەی خزمەتیدا ڕێگری لە چەند هەڵە کردووە. پاشان کێلی هێرشی کردە سەر ڕاگەیاندن (بە بۆچوونی من مافی خۆیەتی) و گوتی: "نۆرەی تۆش دێت، وازت لێ ناهێنن." گومانم لە قسەکەی کێلی نەبوو.

کۆریای باکوور بەردەوام بوو لە هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەی دیدارەکەی ترەمپ و کیم، هەروەها بە دیاریکراویش هێرشی کردە سەر من. ئەوە شتێکی نوێ نەبوو، چونکە ساڵی ٢٠٠٢ لە سەردەمی بوشدا کۆریای باکوور ڕێزی لە من نا و پێی گوتم، "مرۆڤێکی سووک." ئەوان لەسەر ئەوە هێرشیان کردبووە سەرم کە باسی مۆدێلەکەی لیبیام کردبوو (دەمپرسی تۆ بڵێی سەرچاوەیەکیان لە کۆشکی سپی نەبووبێت و نەزانن کاردانەوەی ترەمپیش چۆن بووە) و گوتبوویان: "لە ڕابردووشدا ئاماژەمان بە کوالیتیی کەسایەتیی بۆڵتن داوە و نایشارینەوە ڕقمان لێیەتی." بێگومان لایەنی ئێمە باش دەمانزانی کۆریای باکوور چەمکی "وازهێنانی یەکجارەکی و پشتڕاستکراوە و تەواوی ناوکی" ڕەت دەکاتەوە. کۆریای باشوور هەر نیگەرانی کۆششەکانی باکوور بوو بۆ پەکخستنی چالاکییە هاوبەشەکان. تەنانەت حکوومەتە نەرمەکەی مونیش تێگەیشتبوو لەوەی ئەو مەشق و چالاکییانە چارەنووسسازن بۆ ئاسایشی کۆریای باشوور و

دەترسان پیۆنگ یانگ ناکۆکی بخاتە نێوان سیئۆڵ و واشنتۆنەوە. چونگ گوتی گوتی کۆریای باکوور بە ئاشکرا هەوڵی تێکدانی پەیوەندیی من [بۆلتن] و ترەمپ دەدات و گوتی لە دیدارەکەی ٢٧ی نیسانی کیم و موندا چەند بەرپرسێکی کۆریای باکوور دەربارەی ڕۆڵی من پرسیویانە لە دیدارەکەی ترەمپ و کیمدا. دیسانەوە هەستم کرد ڕێزلێنانم بۆ کراوە. بەڵام لەوەش گرنگتر، کۆریای باکوور بەردەوام بوو لە قسەگوتن بە چالاکییە هاوبەشەکان و ئەمجارەیان هێرشیان کردە سەر مون: "بەرپرسە باڵاکانی ئێستای کۆریای باشوور سەلماندیان کۆمەڵەیەکی نەزان و بێتوانان..." ئەو هێرشانە ڕێگایەکی زۆر ورد نەبوون بۆ هاندانی مون بۆ کردنی کارەکانی کۆریای باکوور و فشارخستنە سەر ئێمە، ئەوەش تەڵەیەک بوو ئێمە بڕیارمان دا تێی نەکەوین.

لەوەش جددیتر، سەرۆکی ستافەکەی کیم وەک ئەوەی بڕیاری لەسەر درابوو لە ١٧ی ئایاردا نەگەیشتە سەنگافوورە. هەمیشە ئامادەکارییەکان بۆ سەرۆکە هەستیار و نیگەرانەکەی کۆریای باکوور زۆر ورد بوون، تەنانەت ئەگەر لە چاو ئامادەکارییەکانی سەرۆکی ئەمریکاشدا هیچ نەبووبێتن. دواکەتنی کارە سەرەتاییەکان دەکرا ببێتە هۆی دواکەوتن یاخود هەڵوەشاندنەوەی خودی دیدارەکە. تا ڕۆژی دووشەممەی ٢١ ئایار هیچ کەسێک لە تیمی کۆریای باکوورەوە نەهاتبوو، بەو بۆنەیەوە تیمەکانمان لە سەنگافوورە یەکترییان نەبینیبوو. ترەمپ دەیپرسی دەبێت چ باس بێت و بە دڵنیاییەکەوە بە منی گوت: "دەمەوێت من پێش ئەوان سەنگافوورە بەجێ بهێڵم." ئەو باسی ئەو ئافرەتانەی کرد کە لە ڕابردوودا لەگەڵیدا بووبوون و ئاماژەی بەوە دا هەرگیز حەزی نەکردووە ئەوان لەم جیا ببنەوە؛ ئەو هەمیشە ویستبووی خۆی بڕیاری جیابوونەوە بدات. (کاتێک ئەوەم بۆ کێلی باس کرد گوتی: "ئاشکرایە.) یەکێک لە پرسەکان ئەوە بوو ئایا لەگەڵ هاتنی موون جای ئیندا دیدارەکەی سەنگافوورە هەڵبوەشێنینەوە

یاخود تا کاتی ڕۆیشتنی چاوەڕێ بکەین. داوام لە ترەمپ کرد یەکسەر بڕیار بدات، چونکە هەڵوەشاندنەوەی دیدارەکە پاش ڕۆیشتنی مون دەبێتە سووکایەتییەکی ئاشکرا بۆ ئەو و ئەوەش پێویست نییە. ترەمپ قایل بوو، هەروەها گوتی: "بۆی هەیە ئەمشەو تویت بکەم". لەسەر داوای ترەمپ قسەم لەگەڵ کێلی و پێنسدا کرد، ئەوانیش هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی پێویستە خێرا تویت بکات. ئەوەم بە ترەمپ گەیاندەوە و ئەویش دەستی کرد بە باسی ئەوەی بۆی هەیە لە تویتەکەیدا بینووسێت. پاش چەند هەوڵدان و سڕینەوەیەک، تویتەکە یان تویتەکان ئەمەیان لێ دەرچوو:

بەهۆی ئەوەی دیالۆگەکە دەربارەی کۆریای باکوور و وازهێنانی ناوکی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، داوام لە نوێنەرەکانم کرد هەواڵ بە کۆریای باکوور بدەن دیداری ١٢ی حوزەیرانی سەنگافوورەمان هەڵوەشاندووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا تامەزرۆی دیدەنیکردنی کیم جۆنگ ئون و دانوستانکردنم لەگەڵیدا و ڕەنگە لە داهاتوودا دەرفەتێکی ترمان بۆ برەخسێت. لە هەمان کاتدا، ئازادکردنی سێ ئەمریکییەکە بەرز دەنرخێنم کە ئێستا لەگەڵ خانەوادەکانیاندا لەماڵەکانی خۆیانن.

تویتێک بەدوای ئەو تویتەدا دەهات:

نائومێد بووم لەوەی چین نەیتوانیوە ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، بە تایبەتی لەسەر سنوورەکان [واتا جێبەجێکردنی سزاکان]، بۆ ئەوەی درێژە بە بەرقەراربوونی ئاشتی بدەین

نووسینگەی هێلکەیی پڕ بوو لە فەرمانبەر بۆ ئامادەکاری بۆ خوانێکی ترەمپ لەگەڵ پارێزگاری هەرێمەکاندا. ترەمپ لەگەڵ ڕۆیشتنیدا گوتی بۆی هەیە دەوروبەری کاتژمێر هەشت و نۆ تویتەکە بکات. چووم بۆ نووسینگەکەی پێنس تا هەواڵی تویتەکانی بدەمێ؛ هەردووکمان دڵنیا بووین لەوەی ترەمپ ئەو ئێوارەیە دیدارەکەی سەنگافوورە

هەڵدەوەشێنێتەوە. بەڵام کاتێک بەیانیی ڕۆژی دواتر بەخەبەر هاتین، دیتمان هیچ تویتێک نەکراوە. ترەمپ بە کێلیی گوت شەوی پێشوو مۆبایلەکەی باش کاری نەکردووە، بەڵام بە منی گوت دەیەوێت مون پێش هەڵوەشاندنەوەکە قسەی خۆی بکات. بەو بۆنەیەوە جۆشێکی زۆرم نەبوو بۆ دیتنی چونگ و هاوکارەکانی لە کاتی خوانی بەیانیدا، بۆ قسەکردن لەسەر دیداری مون و ترەمپ لە هەمان ڕۆژدا. کۆریای باشوور هێشتا دەیویست پاش دیدارەکەی ترەمپ و کین هەر سێ لایەنەکە دیدارێکی سیانییان هەبێت.

بابەتێکی گرنگی تری گفتوگۆکەمان ڕاگەیاندنی "کۆتایی جەنگی کۆریا" بوو. لە سەرەتادا پێم وابوو "ڕاگەیاندنی کۆتایی جەنگ" بیرۆکەی باکوور بووە، بەڵام دواتر گومانم کرد بیرۆکەی مون بێت و لە بەرنامەی یەکخستنەوەکەیەوە بێت، ئەوەش هۆکارێک باش بوو بۆ قبووڵنەکردنی ئەو ڕاگەیاندنە. هیچ بیانوویەکی باش بۆ بیرۆکەی "کۆتایی جەنگ"ەکە نەبوو مەگەر ئەوەی چەمکێکی جوان بووبێت. بە هەبوونی ئەگەری ئەوەی هیچ شتێکی بەکەڵک لە دیدارەکەی سەنگافوورەوە سەوز نەدەبوو، بۆشی هەبوو ڕەوایەتی بدەین بە کیم جۆنگ ئون ئەویش نەک تەنها ڕێکخستنی دیدار بۆی لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکادا، بەڵکو بە گرتنی دیدارێکی ئاشتی کە تیایدا سزاکانی سەر کۆریای باکوور کەم دەکرێنەوە و ئاماژە بەوە دەدرێت باکوور چیتر مەترسیدار نییە. ئامانجی من ڕێگریکردن بوو لە هەموو دەقێکی پابەندکەری یاسایی خراپ، لەگەڵ کەمکردنەوەی زیانی هەر ڕێککەوتنێک کە ترەمپ قایل بێت بەوەی واژووی لەسەر بکات. نیگەرانی ئەوە بووم مون ئەو بیرۆکە خراپانە بخاتە مێشکی مونەوە، بەڵام هەرچۆنێک بێت نەمدەتوانی بیوەستێنم.

بەرەو ماڵی بلێر بەڕێ کەوتم بۆ دیتنی پەمپەیۆ پێش دیدارەکەی کاتژمێر دەی بەیانیمان لەگەڵ مون و کانگ کوینگ وای وەزیری کاروباری

دەرەوە و چونگ. مون زۆر گەشبین بوو بە سەنگافوورە. پاش کاتژمێرێک گەڕامەوە بۆ کۆشکی سپی تا بە ترەمپ بڵێم باسی چیمان کردووە. بەشداریم لە یەکێک لەو چاوپێکەوتنە هەواڵگرییانەدا کرد کە ترەمپ هەفتانە لەگەڵ هاسپێلی بەڕێوبەری سی ئای ئەی و بەڕێوبەری هەواڵگریی نەتەوەیی و دوو فەرمانبەریانەدا هەیبوو. نە من ئەو چاوپێکەوتنانەم بە سوودبەخش دەزانی نە کۆمەڵگای هەواڵگریش، چونکە زۆرینەی کات ترەمپ قسەی دەکرد و ئەوان گوێیان دەگرت نەک بە پێچەوانەوە. چەندجارێک هەوڵم دابوو بوار بڕەخسێنم ئەوان قسە بکەن و زانیاری بدەن بە ترەمپ، بەڵام شکستم هێنابوو. ئەوە بوو کە هەبوو. کاتێک لە ماڵی بلێرەوە هاتمەوە، ترەمپ بە ئامادەبوانی دەگوت شەوی پێشوو ویستویەتی بە تویت دیدارەکەی سەنگافوورە هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام بڕیاری داوە زیاتر چاوەڕێ بکات، چونکە "هێشتا ئەگەری دیدارەکە ماوە" و ناشیەوێت تا دواخولەک هەڵی بوەشێنێتەوە. هەستم بە نەخۆشی دەکرد کە دەمبینی چەندێک نزیک بووینەتەوە.

مون گەیشت و لەگەڵ ترەمپدا سڵاویان لە ڕاگەیاندنە ئامادەکانی ناو نووسینگەی هێلکەیی کرد. پرسیارەکان درێژبوونەوە و زۆرینەشیان لەسەر کێشەکانی چین بوون، ئەوەش ماوەی دیدارە دووبەدووەکەی مون و ترەمپی کەم کردەوە. پاش ئەوەی دوو سەرکردەکە چوونە ژووری ئەنجوومەنی وەزیرانەوە، ترەمپ گوتی ئەگەری سەدا ٢٥ هەیە دیدارەکەی سەنگافوورە بەڕێوە بچێت، گومانم دەکرد پێشتریش بە نهێنی ئەوەی پێ گوتبێت؛ لە وەڵامدا مون جەختی لە پاڵپشتیی خۆی کردەوە بۆ وازهێنانی ناوکیی تەواو و یەکجارەکی و پشتڕاستکراوە، هەروەها ڕاشیگەیاند زۆر گەشبینە و ئەگەری ئەنجامدانی دیدارەکەی سەنگافوورە سەد لە سەدە. ترەمپ نیگەرانی ئەوە بوو دوودڵ دەربکەوێت، بەڵام مون دڵنیایی پێدا بەو پێیەی هەتا ئێستا شتی وا ڕوویەنەداوە ئەوەی دوودڵە کۆریای باکوورە.

ترەمپ گوتی دیدارێکی پێکهاتەیی دەوێت لە سەنگافوورە، ئەوەش منی سەرسام کرد و هەرگیزیش ڕوونەدابوو. پرسیی بۆچی ڕێگا بە هیچ شارەزایەک نەدراوە سەردانی پونجایری بکات، ئێمەش بۆمان ڕوون کردەوە زۆرینە باوەڕیان وایە (بە خۆشمەوە) کیم جۆنگ ئون بە دەم پەیمانی داخستنی پێگەی ناوکیی پونجایریی داوە، بەس نەیزانیوە چی دەڵێت.

وەک ئەوەی شتەکان بەشی خۆیان خراپ نەبن، نیک ئایەرزی بەڕێوبەری ستافەکە ئێوارەیەکی درەنگ پەیوەندیی کرد تا بڵێت چۆی سۆن هویی جێگری وەزیری کاروباری دەرەوەی کۆریای باکوور لەسەر لێدوانەکانی پێنس هێرشێکی قورسی کردووەتە سەر پێنس و پێی گوتووە "گێلێکی سیاسی"، هەروەها هەڕەشەی جەنگی ناوەکیشی کردووە. پێنس پەیوەندیی پێوە کردم بۆ ئەوەی هەواڵەکە بە ترەمپ بڵێم، منیش بڕیارم دا یەکسەر پێی بڵێم. پاش دەستخستن و چاوپیاخشاندنێک بە وتارەکەی پیۆنگ یانگدا، کاتژمێر دەی شەو پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد و بابەتەکەم بۆ باس کرد، هەروەها پێشنیارم بۆ کرد داوا بکات داوای لێبوردن لە ئەمریکا بکرێت و لە ئەگەری ڕەتکردەوەی داوای لێبوردندا دیدارەکە هەڵبوەشێنێتەوە. پێنس وەک جێگری سەرۆک هەر خاوەنی ئەو بۆچوونە بەهێزانە بوو لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی کە لە سالانی پێشتریدا هەیبوو، منیش ئەوم بە هاوپەیمانێکی پێداگر دەزانی. هەروەها وەک جێگرە سەرۆکەکانی پێشوو وردبوو و پێش ئەوەی بۆچوونی ترەمپیش بزانێ، بە وریاییەوە سەرنجی لایەنگیری سیاسەتی خۆیی دەدا. ڕێزم لە سەختییەکانی کارەکەی ئەو دەگرت و دەمزانی باشترین کاری ئەو لە گفتوگۆ دووبەدووەکانیدا بوو لەگەڵ ترەمپ.

ڕۆژی دواتر، زووتر چوومە سەر کار و سەیری هەواڵەکەی کۆریای باکوورم دەکرد لە هەموو ڕاگەیاندنە ئاسایەکاندا، بەڵام سەرنجم دا

هەواڵەکە لە ڕاگەیاندنە ئەمریکییەکاندا کەمە و دەکرێت هۆی ئەوەش ئەو کاتە بووبێت کە هێرشەکەی تێدا کراوە بۆ سەر پێنس. بابەتەکەم بۆ کێلـی باس کرد و پێیم گوت کاتژمێر هەشتی بەیـانی گفتوگـۆی دوورمەوداماـن لەگەڵ ترەمپدا هەیە. ئایەرز هاتە ژوورەوە تا بڵێـت ئەو و پێـنس پاڵپشـتیی هەڵوەشـاندنەوەی دیـدارەکەی سـەنگافوورە دەکەن؛ کێلـی هـاوڕا بـوو و دواتـریش پەمپەیـۆ هـات و ئەویـش هـاوڕا بـوو. هەمووماـن لە دەوری سپیکەرەکە بووین بۆ ئەوەی پەیوەندیی بە ترەمپەوە بکەیـن. مـن بە وردی باسی هێرشەکەی باکوورم کرد بۆ سەر پێـنس و پێشـم گـوت ڕاگەیانـدنە نێودەوڵەتییەکـــان و ڕاگەیانـــدنەکانی ئەمریکـــا چـــۆن هەواڵەکەیـــان گواستووەتەوە. ترەمپ داوای لێ کردم تەواوی قسەکانی چۆی سۆن هوی بخوێنمەوە، منیش ئەوەم کـرد. پـاش ئەوەی خوێنـدمەوە ترەمـپ گـوتی: "مەسـیح، قسـەکانی زۆر تونـدن." هەمووماـن هـاوڕا بـووین لەسـەر ئەوەی ناکرێت گوفتارێکی هێندە توند لە کۆریای باکوورەوە بێت و کیم جۆنگ ئون بەڵێی بۆ نەکردبێت؛ ئەوە تەنها ڕادەربڕینێکی تونـدی فەرمـی نەبـوو و بەس. بێگومان ڕەخنەگرەکانمان دەیانگوت کاردانەوەکەماـن لەڕادەبەدەرە، چونکە کۆریای باکوور هەر ئاوا بە ڕەقی قسە دەکات. ئەوە ڕاسـت بـوو، بەڵام ئەوەش ڕاست بـوو حکوومەتەکـانی پێشـووتری ئەمریکـا ڕاهـاتبوون بەبێ وەڵامـدانەوە و سـەپاندنی سـزا گوفتـارە ڕەقەکـانی کۆریـای بـاکوور قبووڵ بکەن. دەبوو ئەوە بوەستێندرێت، ئێستاش کاتی ئەوە بوو.

ترەمـپ لە هەڵوەشـاندنەوەی دیـدارەکەی سـەنگافوورەدا دوودڵـی نەکـرد. نامەیەکی نووسی کە چەنـدجارێک دەسـتکاری کـرا، بەڵام لە کۆتاییشـدا هەر ڕەنگوبـۆی ترەمپی پێوە دیـار بـوو. نـامەکە کـاتژمێر نـۆ و چلـوپێنج خولەکی بەیانی بڵاو کرایەوە و دوای ئەوەش سەرۆک دوو تـویتی کـرد. نووسراوێکیشمان ئامادە دەکرد کە دەیتوانی لە ڕێورەسمێکی واژووکردندا کە لە نووسـراوەکەدا جەخـت لەوە کرابـوویەوە "ئەوپەڕی فشـار" لەسـەر

کۆریای باکوور بەردەوام دەبێت. پەیوەندیم بە ڤێڤیان بالاکریشنانی وەزیری دەرەوەی سەنگافوورەوە کرد تا پێی بڵێم چی دەگوزەرێت، ئەو لەو کاتەدا لە فڕۆیەکەی دابەزیبوو و دەچووە ناو یەکێکی تر. هەواڵەکەی بە سەنگێکی فراوانەوە وەرگرت، هەروەک چۆن چەند هەفتەیەک لەوەوبەر هەواڵی ئەوەی وەرگرتبوو کە سەنگافوورە دەبێتە شوێنی دیداری ترەمپ و کیم. کۆرییە باشوورییەکان زۆر خۆشحاڵ نەبوون. چونگ لە درەنگانێکی ئەو بەیانییەدا پەیوەندیی کرد و گوتی هەڵوەشاندنەوەکەمان شەرمەزارییەکی سیاسیی گەورە بووە بۆ مون، چونکە مون تازە لە واشنتۆنەوە گەڕاوەتەوە و ئومێدی زۆری بۆ کۆریای باسوور بردووەتەوە. بە چونگم گوت بە وردی ئەوە بخوێنێتەوە کە چۆی سۆن هوی بە جێگری سەرۆکی ئەمریکای گوتووە، بەڵام ئەوە نە چونگی هێور کردەوە نە مون، کە هەمان قسەکانی چونگی پێ گوتمەوە. بە پێچەوانەوە یاچی (ژاپۆن) گوتی زۆر خۆشحاڵ بوون بە هەڵوەشاندنەوەی دیدارەکەی سەنگافوورە. لە کاتێکدا ئەم درامایە زیاتر دەکرایەوە، کۆریای باکووریش شانۆییەکی بۆ خۆی بەرپا کرد و داخستنی پونجایریی ڕێک بە ستایلی لادێکەی پۆتێمکین ئەنجام دا کە چاوەڕێمان دەکرد.

هەر ئەو ئێوارەیە، کەمتر لە دوازدە کاتژمێر پاش ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی دیدارەکەی سەنگافوورەکە، دۆخەکە هەڵگەڕایەوە. بەرپرسێکی تری وەزارەتی کاروباری دەرەوەی کۆریای باکوور گوفتارێکی کەمتر توندی دا کە فەرمانی بە ئێمە دەدا دیدارەکەی ١٢ حوزەیران بخەینەوە جێی خۆی، ترەمپیش ئەوەی بەدڵ بوو. بە بۆچوونی من ئەوە هەڵەیەکی ڕوون بوو، دەیسەلماند ترەمپ بە هەر نرخێک بێت دیداری دەوێت، ڕاگەیاندنەکانی جیهانیش بەو حاڵەتەیان دەگوت دیپلۆماسییەکی وەڵامدەرەوە و ئەوەش هاوپەیمانەکانمانی بێزار کردبوو. بێگومان ڕاگەیاندن ئاگاداری ئەوە نەبوو ڕۆژی دووشەممە زۆر نزیک

بووین لەوەی دیدارەکە هەڵبوەشێنینەوە، بەڵام ترەمپ پەشیمان بووەتەوە. پەمپەیۆ لەگەڵ کیم یۆنگ چۆلی کۆریای باکووردا دەدوا بۆ ئەوەی دیدارەکە زیندوو بکەنەوە و بڕیاریان دا بۆ ئامادەکاریی زیاتر کیم سەردانی واشنتۆن بکات. پەمپەیۆ و کێلی و من هاوڕا بووین لەسەر ئەوەی دەبێت پێداگریی بکەین کیم جۆنگ ئون خۆی ڕاگەیاندنێکی ئاشکرا دەربکات و پشت بە گوفتاری بەرپرسەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە نەبەستێت، هەروەها گوتیشمان دەبێت بۆ دڵنیایی یەک مانگ دیدارەکەی سەنگافوورە دوا بخەین. نزیکی ٨:٥٠ خولەکی بەیانی پەیوەندیمان بە ترەمپەوە کرد تا ئەو پێشنیارانەی بۆ بکەین، بەڵام ئەو گوێی بە هیچیان نەدا. لەجیاتی ئەوە، ئەو تەواو بە "نامەیەکی گەرموگوڕ" خرۆشا بوو، کە کۆریای باکوور بۆمانی ناردبوو. ئەو گوتی نایەوێت ئەو جووڵەیە بخاتە مەترسییەوە کە ئێستا دروست بووە. دەمویست وەڵام بدەمەوە، "کام جووڵە؟" بەڵام خۆم خواردەوە. ترەمپ درێژەی پێدا: "ئەمە سەرکەوتنێکی مەزنە. ئەگەر ڕێککەوتن بکەین، ئەوا یەکێک لە مەزنترین ڕێککەوتنەکانی مێژوومان کردووە. دەمەوێت ئەو [کیم] و کۆریای باکوور زۆر سەرکەوتوو بکەم." بەڕاستی ئەوە خەمهێنەر بوو. زۆر نزیک بووبووینەوە لە هەڵهاتن لە تەڵەکە، بەڵام وای لێ هات.

ڕۆژی یەکشەممە بۆمان دەرکەوت ڕۆژی پێشتر مون و کیم بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لە ناوچەی بێسوپا بەیەکەوە بوون. کانگی وەزیری کاروباری دەرەوە بە پەمپەیۆی گوت کیم داوای دیدارەکەی کردووە و بێگومان مونیش هاوڕا بووە. چونگ قسەی لەگەڵ منیش کرد، گوتی ئەو لە ناوچەی بێسوپا نەبووە، بەڵام هەموو شتێک باش بووە و دوو سەرکردەکە دوپاتیان کردووەتەوە قایلن بە وازهێنانی ناوکیی تەواو و یەکجارەکی و پشتڕاستکراوە. کیم بە مونی گوتبوو چاوەڕێ دەکات لە سەنگافوورە ڕێککەوتنێکی گشتگیر بکات و بۆ ئەو مەبەستەش کۆریای باکوور هەموو

ئامادەکارییەک دەکات. کیم سەرسام بووبوو بەوەی ترەمپ بڕیاری هەڵپەساردنی دیدارەکەی داوە و زۆر خۆشحاڵ بووبوو بەوەی ئەمریکا بۆچوونەکەی گۆڕیوە. مون پێداگریی کرد لەوەی نابێت ئەمریکا ڕێککەوتنی "کردار بە کردار" قبووڵ بکات، بەڵام دواتر پێچی کردەوە و گوتی دەکرێت ئەمریکا کەڵکی سیاسی وەربگرێت ئەگەر کۆریای باکوور هەنگاو بەرەو وازهێنانی ناوکی هەڵبگرێت، ئەوەش بە بۆچوونی من دەیسەلماندەوە پێویستە لەسەرمان مون بخەینە دەرەوەی بابەتەکە. لە هەمان کاتدا، زیاتر نیگەرانی ئەوە بوو هەڵوێستمان لە گفتوگۆکاندا وەک شێوازی گفتوگۆ شەش لایەنییەکانی لێ بێت و هەستیش بەو گۆڕانکارییە نەکەین. لەو کاتەدا ترەمپ سەقاڵی تویتکردن بوو لەسەر ئەوەی هیچ دووبەرەکییەک لە تیمەکەی ئەودا نییە:

به پێچەوانەی ئەوەی نیویۆرك تایمزی گەندەڵ و شکستخواردوو بە خەڵکی دەڵێت، لە حکوومەتەکەی ترەمپدا هیچ ناکۆکییەک نییە لەسەر شێوازی مامەڵەکردنمان لەگەڵ کۆریای باکوور. نیویۆرك تایمز هەر لە سەرەتاوە بە هەڵەی زانیم!

ڕۆژی پاشتر، لە ناوچەی بێسوپا، کۆریای باکوور بە سەرکردایەتی چۆی سۆن هویی ڕووخۆش، لە گفتوگۆیەکی دوانیدا لەگەڵ ئەمریکا، ڕەتی کردەوە لە وشەی "وازهێنانی ناوکی" لە بەرنامەی دیدارەکەی ترەمپ و کیمدا بەکار بهێنێت. ئەوە بابەتێکی ناسراو بوو و نیگەرانی ئەوەش بووم وەزارەت بەزوویی قایل بە پاشەکشە دەبێت، با باسی ترەمپ هەر نەکەین کە تەواو شەیدای سەرکەوتن بووبوو لە سەنگافوورە. پەیوەندیی بەردەواممان لەگەڵ کۆریای باشووردا هەبوو و خێرایی ئامادەکارییەکانیشمان لەزیادبووندا بوو. ئابێ و ژاپۆنییەکانیش بەردەوام لەسەر خەت بوون و دەیانویست ترەمپ لە پابەندییەکانی پێشووی لا

نەدات. ئابێ لە ڕۆژی بیرەوەریدا بە ترەمپی گوت مامەڵەی ئەو لەگەڵ دیدارەکەدا زۆر جیاواز بووە لە هی سەرۆکەکانی پێشووی ئەمریکا و گوتیشی کیم هەرگیز چاوەڕێی نەکردووە ترەمپ بوێری هەڵوەشاندنەوەی دیدارەکەی هەبێت. ئابێ گوتی ترەمپ ئێستا لە پێگەی هێزدایە، دیار بوو بەئومێد بوو ئەویش هەڵەی سەرۆکەکانی پێشتر دووبارە نەکاتەوە. ئابێ فشاری لە ترەمپ کرد جەخت لە چەمکی وازهێنانی ناوکی بکاتەوە و بەوەشەوە نەوەستێت و داوای پووچەڵکردنەوەی بەرنامەی چەکە کیمیایی و زیندەکییەکان و مووشەکە بالیستیکییەکانی پیۆنگ یانگیش بکات.

ڕۆژی دوای ڕۆژی بیرەوەری لەگەڵ ترەمپدا، باسی دۆخی یارییەکەم دەکرد و ئەو بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گوتی: "ناکرێت کۆمەڵێک کۆتری سپی بەسەر شاندەکەمانەوە بن. ئەوە بە پەمپەیۆ بڵێ. دەبێت جڵەوی ئەم ڕێکەوتنە بکەم. دەبێت لە سەنگافوورە باسی وازهێنانی ناوکی بکەین و بەدەستی بهێنین." پاشان گوتی: "پەیوەندی بە ڕێبەری شاندەکەوە بکە." خێرا ئەوەمان کرد و قسەمان لەگەڵ فەرمانبەرێکی سەرسووڕماوی خزمەتگوزاری دەرەوەی ئەمریکا لە سیئۆڵ کرد. ترەمپ لەپاش سڵاو و هەواڵپرسین گوتی: "فرۆشیاری ڕێککەوتنەکە منم، نابێت دانوستان لەسەر وازهێنانی ناوکی بکەیت و پێویستە ئەوەیان پێ بڵێیت. نابێت لە باسی وازهێنانی ناوکیدا سازشی زۆر هەبێت." ترەمپ پێی گوتین بەرنامەیەکی "گەورە و فەرمی" ناوێت و هەتا نافەرمیتر بێت باشترە. بەوشێوەیە بوو. پاش چەند خولەکێک لە پەیوەندییەکەی ترەمپی بێتاقەتەوە بە شاندەکە، پەمپەیۆ پەیوەندیی کرد. ڕووداوەکەم بۆ روون کردەوە و باسی نیگەرانییەکانی خۆشم کرد دەربارەی زمانی لاوازی ڕاگەیەنراوەکە. پەمپەیۆ گوتی: "لەوەدا هاوڕاتم." مەبەستی ئەوە بوو پێویستە باسی "وازهێنانی ناوکی" بکەین، بەڵام ڕوون نەبوو ئایا تێگەیشتبوو لەوەی دانوستانکارانی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵماندا هاوڕا نین لەسەر نەبەزاندنی سنوورەکە لە کاتی

دانوستانەکاندا. پەمپەیۆ پێی گوتم ترەمپ دەیەوێت لە نووسینگەی هێلکەیی چاوی بە کیم یۆنگ چۆل بکەوێت؛ ترەمپ ئەو بیرۆکەیەی بە بلیمەتانە دەزانی. من و پەمپەیۆ بە هەڵەمان دەزانی، کاتێکیش لەگەڵ کێلیدا قسەمان کرد ئەویش هەر بە هەڵەی زانی، لەگەڵ ئەوەشدا وا دەردەکەوت پەمپەیۆ ملی بۆ ئەو بڕیارە دابێت. لەو کاتەدا لە لایەکەوە لە خۆمم دەپرسی باشتر نییە لەجیاتی جەنگان بەرامبەر بە هەڵوەستە پاشەکشەییەکان و گۆڕانکارییە لەناکاوە سیاسییەکانی ترەمپ، واز لە کێشەکەی کۆریای باکوور بهێنم و لێ بگەڕێم ترەمپ چۆنی دەوێت وا بکات. لە لایەکی تریشەوە بە بۆچوونی من ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ چەکی ناوکیدا دەکرد لە دەستی ڕژێمێکی مەترسیدار، بۆیە دوودڵ بووم لەوەی پشتکردنە بابەتەکە و دەستلەکارکێشانەوە لە کارە باشەکە بێت.

وا دەردەکەوت ترەمپ هێشتا بڕیاری نەدابێت لەسەر ئەنجامدان و ئەنجامنەدانی دیدارەکەی سەنگافوورە. پێش ئەوەی پەمپەیۆ بکەوێتە ڕێ بۆ نیویۆرك و دیتنی کیم یۆنگ چۆل، ترەمپ برێک هاتوچۆی کرد و لە ئەنجامدا گوتی: "پێم باشترە دیدارەکە بکرێت، بەڵام ئەگەر وازهێنانی تەواوی ناوکیمان دەست نەکەوێت، ناتوانین بە هیچی تر قایل ببین." ئەو گوتی: "ئەگەر گفتوگۆکان شکست بهێنن باجێکی زۆر دادەنێم [یان مەبەستی سزاکان بوو یانیش چین، نەک کۆریای باکوور]. بڕیارم داوە جارێ دوایان بخەم، بەڵام کاتیان دێت." پاشان قسەی کۆتایی کرد، "دەمەوێت بڕۆم، دیدارەکە دەکەین. ئەوە شانۆییەکی گەورە دەبێت." هیچ قسەیەک لەسەر هاتنی کیم یۆنگ چۆل بۆ کۆشکی سپی نەکرا، من و پەمپەیۆش کاتێک لە نووسینگەی هێلکەیی هاتینەدەر هاوڕا بووین لەسەر ئەوەی هێشتا هەلی خۆڕزگارکردن ماوە. هەرچۆنێک بێت ئەوە ئەوەی لەبەرچاو نەگرت کە کیم یۆنگ چۆل سوور بوو لەسەر دیتنی ترەمپ بۆ ئەوەی نامەیەکی کیم جۆنگ ئونی بداتێ. کیم یۆنگ چۆلیش لەسەر

زۆرێک لە بابەتە بنچینەییەکان کەللەڕەق بوو. هەواڵە باشەکە ئەوە بوو ئەو هیچ جێیەکی بۆ مون دانەنابوو و ئارەزووی دیداری سێلایەنەی نەدەکرد. ئەوە لە نێوان ئێمەدا بوو و کۆریای باشوور لە دەرەوەی بابەتەکە بوو. پەیوەندیمان بە ترەمپەوە کرد پێمان گوت کیم یۆنگ چۆل دەیەوێت نامەیەکی کیم جۆنگ ئونی بداتێ. ترەمپ گوتی: "شاهانەیە، با ئەنجامی بدەین." من و کێلێ ڕوونمان کردەوە بۆچی دژی هاتنی کیم یۆنگ چۆلین، بەڵام سوودی نەبوو. هیچ بەڵگەهێنانەوەیەک لە کاریگەریی سیاسیی سەردانەکە و لەسەر خودی کیم یۆنگ چۆلیش (بکوژێکی بێبەزەیی، بە ئەگەرێکی زۆر ئەو بەرپرسیار بووبوو لە ئەشکەنجەدانی ئۆتۆ وارمبایر) سوودی نەبوو. دواتر هەوڵمان دایەوە بە قایلبوونی جێگری سەرۆک هیچ نەبێت دیدارەکە ببەینە دەرەوەی نووسینگەی هێلکەیی، بەڵام ئەوەش سوودی نەبوو. بۆ ئەوەی بیسەلمێنم پیۆنگ یانگ پێشتریش ئەم یارییەی کردووە وێنەیەکی بیل کلینتنم هێنا کە لەگەڵ ژەنەڕاڵەکانی کۆریای باکووردا لە نووسینگەی هێلکەیی دانیشتبوو، تەنانەت ئەوەش سوودی نەبوو.

ئەندامانی ئاسایشی دیپلۆماسی لە کاتژمێر یەک لە نیویۆرکەوە بەڕێ کەوتن بۆ دیدارەکەی نووسینگەی هێلکەیی لەگەڵ ترەمپدا. چاومان بە ترەمپ کەوتەوە بۆ ئەوەی قسەی بۆ بکەین. پێنس دیسانەوە هەوڵی دایەوە قەناعەتی پێ بکات دیدارەکە لە جێیەکی تر بێت، بۆ نموونە ژووری پێشوازیی دیپلۆماسی. ترەمپ گوێی نەدەگرت. لە ڕاستیدا بیری لەوە دەکردەوە کیم یۆنگ چۆل بیات بۆ ژووری خەوتنی لینکن، ئێمەش دیسانەوە هەوڵمان دا ئەو بیرە لە سەری دەربکەین. بە وەرگێڕەکەی ئەمریکام گوت ئامادە بێت و چووم بۆ لای دەرگای باشووری بیناکە، کە پێنس لەوێ چاوەڕێی هاتنی کۆرییەکان بوو تا بەرەو ژووری هێلکەیی ڕێنماییان بکا. کاتێک لەوێ بووم، بریکارێکی خزمەتگوزاریی نهێنی پێی

گوتم سەرۆک دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ نووسینگەی هێلکەیی. سەرەتا بۆم پرسیار بوو، بەڵام کاتێک چوومە نووسینگەی هێلکەییەوە و لەگەڵ پێنسدا قسەم کرد تەواو سەرسام بووم، ئاخر ئەو پێی گوتم کەسمان بەشداریی دیدارەکەی ترەمپ و کیم یۆنگ چۆل ناکەین. لە ڕووخساری پێنس و ئایەرزدا شۆکێکی گەورە دیار بوو. ئایەرز گوتی ترەمپ ویستوویەتی دیدارەکە گەورە نەکرێت؛ ترەمپ و پەمپەیۆ و وەرگێڕەکە لەم لای مێزەکە، لە لای کۆریای باکووریش کیم و وەرگێڕ یان وەرگێڕەکانی. کەمترین کەس ئامادە دەبوون و کەمترین کەس گوێیان لە قسەکانی ترەمپ دەبوو. لەو کاتەدا ترەمپ سەرقاڵی بابەتی هەستبزوێنی بەخشینی دیارییەکانی کۆشکی سپی بوو. بۆکسێکیان برێک ڕووشا، ترەمپ بە توندی بە مادلین وێستەرهاوتی گوت: "ئەمەیانت تێک دا، یەکێکی تر بهێنە." پاشان وێنەگری فەرمیی کۆشکی سپی شکاندەوە، چونکە دەیویست لە کاتی هاتنی کیم یۆنگ چۆلدا کەمێک لەوێ بێت. پێنس بە منی گوت: "بۆچی بۆ خۆت ناچی بۆ نووسینگەکەی من؟" ئەوە میهرەبانانە بوو؛ کەسمان پێمان وانەبوو پێدانی نامەیەکی کیم جۆنگ ئون چەند خولەکێک زیاتری پێ بچێت. هێشتاکە سەرسوڕماو بووم لەوەی خراومەتە دەرەوەی دیدارەکە، بەڵام نەک بە ئەندازەی پێنس کە بە تەواوەتی هەستەکانی بێدەنگ کردبوو.

کاتژمێر یەک و چارەک کیم یۆنگ چۆل گەیشت، کێلیش بەرەو نووسینگەی هێلکەیی ڕێنموونی کرد. دواتر کێلی پێی گوتین کیم زۆر دوودڵ دەرکەوتووە، کاتێکیش چوونەتە ناو وێست وینگەوە بیری کەوتووەتەوە نامەکەی کیم جۆنگ ئونی لە ئۆتۆمبێلەکەدا بیر چووە. وەرگێڕەکەی کۆریای باکوور نێردرابوو بیهێنێت. دەبوو کیم یۆنگ چۆل چۆن بۆ کیم جۆنگ ئونی ڕوون بکاتەوە نامەکەی ئەوی لە ئۆتۆمبێلەکەدا بیر چووە. لە نووسینگەکەی جێگری سەرۆک تەماشای تەلەڤیزیۆنمان

دەکرد کاتێک ڕاگەیاندنەکان لە ساوس لاون بوون و هەوڵیان دەدا بزانن چی لە دەرەوە دەگوزەرێت. کات تێنەدەپەڕی. لە کۆتاییدا دیدارەکە کاتژمێر دوو و چل و پێنج خولەک کۆتایی هات. ترەمپ و پەمپەیۆ لە نووسینگەی هێلکەیی دەرچوون و کیم یۆنگ چۆلیان بەڕێ کرد بۆ لای ئۆتۆمبێلەکانی، پاشان ترەمپ لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ نووسینگەی هێلکەیی قسەی بۆ ڕاگەیاندنەکان کرد.

کە دەرچوونی کیمان لە نووسینگەی هێلکەیی دی، لەگەڵ پێنسدا چووینە ژوورەوە و کێلیش یەکسەر نامەکەی کیم جۆنگ ئونی بە زمانی ڕەسەن و بە وەرگێڕدراوی پێدام و گوتی: "هەر ئەو تاکە نوسخەیەیە." نامە سەرتاپا ستایشی درۆ بوو و بۆی هەبوو فەرمانبەرێکی نووسینگەی پروپاگەندەی کۆریای باکوور نووسیبێتی، بەڵام ترەمپ بەدڵی بوو. ئەوە سەرەتای پەیوەندییە دۆستایەتییەکەی ترەمپ و کیم بوو. خانەوادەی شاهانە بۆ کۆتایی هەفتە دەچوون بۆ کامپ دەیڤد و بەرەو مارین وانەکە دەچوون. کاتێک ترەمپ نووسینگەی هێلکەیی جێ هێشت بزەیەکی بۆ کردم و دەستی بۆ بەرز کردمەوە.

ئەوانی ترمان چووین بۆ نووسینگەکەی پێنس و پەمپەیۆ و کێلی قسەیان لەگەڵدا کردین. کیم یۆنگ چۆل هیچ شتێکی نوێ و جیاوازی دەربارەی پێگەی کۆریای باکوور نەگوتبوو. ڕوون بوو ئەوان پێش قایلبوون بە وازهێنانی ناوکی دڵنیایی سیاسییان دەویست، واش دەردەکەوت ترەمپ مەیلی هەبێت ئەوەیان بداتێ. ئەوەی سەیر بوو ئەوە بوو هەروەک گفتوگۆکانی پێشتر لەگەڵ کۆریای باکووردا سزا ئابوورییەکان بابەتێکی لاوەکی بووبوون. لەوانەیە ئەوە ئاماژە بووبێت بۆ ئەوەی کۆریای باکوور زیاتر لە سوپای ئەمریکا دەترسێت تا سزا ئابوورییەکانی، هەروەها بۆشی هەبوو بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی سزا ئابوورییەکان بەشی پێویست کاریگەر نەبێت. کێلی گوتی کۆریای باکوور خۆیان پاراستووە لەوەی بە

ڕەفتارەکانیان بە ترەمپ بڵێن چی بکات. ترەمپ گوتبووی نیازی هەیە چالاکییە سەربازییەکانی ئەمریکا و کۆریای باشوور کەم بکاتەوە، هەروەها گوتبووشی تێچووی ئەو چالاکییە سەربازییانە زۆرە و بێزارکەریشن. ڕەنگە ئەوە خراپترین ساتی دیدارەکە بووبێت، چونکە سەرەڕای نکوڵیکردنەکانی پێشوو، ئێستا کۆریای باکوور لە زمانی سەرۆکی ئەمریکایەوە دەیبیست ئێمە ئامادەین دانوستان لەسەر هێزە سەربازییەکانمان بکەین لە پێنینسولا. دەکرا ئەوە موون جای ئین و شوێنکەوتوانی سیاسەتەکەی نیگەران بکات، کە هەژمارکردن و چاوەڕوانییەکانیان پێویستی بە ئامادەیەکی بەهێزی ئەمریکا بوو. بەلای زۆر کەسەوە ئەوەی ڕێگای بە سیاسەتی چەپڕەوی کۆریای باشوور دابوو خەیاڵەکانی "سیاسەتی تیشکی خۆر"[(١)] بهێنێتەوە ناو بابەتەکەوە ئامادەیی ئەمریکا بوو. ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان کۆریامان جێ بهێشتایە، ئەوا ئەوان بە تەنها دەمانەوە و سزای گێلێتییەکانی خۆیانیان وەردەگرت، بە بۆچوونی من خۆشیان لەوە دەترسان. هەرچەندە خراپ دەردەکەوت، بەڵام پێم وابوو دەتوانین قسە لەگەڵ ترەمپ بکەین و بیگەڕێنینەوە دواوە تا بەڵکو زیانەکان نەبن بە ڕاست. ئەو گفتوگۆیە بە چی ٧٥ خولەکی پێ چووبوو؟ دەکرێت بڵێین وەرگێڕانەکە کاتی زیاتری بردووە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە لەگەڵ ترەمپدا باسی هەرچی بکەیت، دەشێ زۆری پێ بچێت! لە ماوەی کارکردنمدا لە کۆشکی سپی چەند جارێک گوێم لێی بووبوو دەیگوت: "من قسەکەرم و حەزم لە قسەکردنە".

کاری دواتر چی بوو؟ کێلی گوتی ترەمپ بە ڕووی ئەگەری ڕوونەدانی هیچ شتێك لە سەنگافوورە کراوەیە. ئەوەم بە گەشبینانە زانی. باسی دانانی کاتگیرییەکمان کرد بۆ ئەوەی پێشانی بدەین ناکۆتا کاتمان نییە بۆ

---

(١) بە سیاسەتی دەرەوەی کۆریای باشوور دەگوترێت بەرامبەر بە کۆریای باکوور.

چارەکردنی بابەتەکە، لە کاتێکدا کۆریای باکوور سەرقاڵی دروستکردن و پەرەپێدانی چەکی ناوکی و مووشەکی ناوکی بوو. نزیکەی کاتژمێر ٣:٤٥ لە یەکتری جیا بووینەوە من گەڕامەوە بۆ نووسینگەکەی خۆم. بەڵام سەرسام بووم بەوەی کاتژمێر ٤:١٠ خولەک موبایلەکەم زەنگی لێدا و دەنگێک گوتی: "لە کامپ دەیڤدەوە لەگەڵت دەدوێم". یەکەم جار بوو ئەوە ببیستم. قسەکەرەکە پێی گوتم سەرۆک دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات. ترەمپ گوتی: "نامەکە زۆر دۆستانە بوو، تۆش پێت وا نییە؟!" من هاوڕایی خۆمم بۆ دەربڕی، بەڵام گوتیشم نامەکە ئاماژەی بە بابەتە بنچینەییەکان نەکردووە. ئەو گوتی: "ئەوە هەنگاوێکە بەرەوپێشەوە، ئێستا تێدەگەم. دەبێت یەک ببینین بۆ ئەوەی باشتر یەکتر بناسین و پاش ئەوە بزانین چی ڕوودەدات. ڕەنگە زیاتر لەوەی پێی بچێت کە سەرەتا پێم وابوو." جەختم لە بۆچوونەکەم کردەوە لەسەر ئەوەی نابێت نە سزاکان ئاسان بکرێن نە باس لە ڕاگەیاندنی "جەنگی کۆریا" بکرێت، هەتا کۆریای باکوور بە وازهێنانی تەواو و یەکجارەکی و پشتڕاستکراوە قبووڵ نەکات، ئەوەش هەمیشە سیاسەتی حکوومەتەکە بووە. وا دەردەکەوت بە ڕووی لێکدانەوە و ڕێنماییدا کراوە بێت. گوتم هەبوونی گفتوگۆگەلێکی دوورمەودای سوودبەخش و قبوولکراوە، بەڵام دەبێت شتێک لەبەرچاو بگیرێت. کات هەمیشە لە بەرژەوەندیی پەرەپێدەرەکە بوو و تێپەڕینی کاتیش ستراتیژی سەرەکیی کۆریای باکوور بوو. ئێمە ناکۆتا کاتمان لەبەردەستدا نەبوو، واش دەردەکەوت ترەمپ ئەوەی قبووڵ بێت. لە کۆتایی پەیوەندییەکەدا گوتی: "گفتوگۆیەکی زۆرباش بوو". ترەمپ ڕێک ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکانەوە دەست کەوت کە دەیویست؛ سەردێڕەکان بووبوون بەمە: "دیدارەکەی ١٢ی حوزەیرانی سەنگافوورە بەڕێوە دەچێت".

کۆتایی هەفتە لەگەڵ چونگدا باسی دیدارەکەی کیم یۆنگ چۆلم کرد، ئەو گوتی مون زۆر خۆشحاڵ بووە بە دەرئەنجامەکە. چونگ بێ ئەوەی

بەخۆی بزانێت قسەکەی ترەمپی دووبارە کردەوە و گوتی ئەوەی لە سەنگافوورە ڕوودەدات هەر دیدارێک نابێت و بەس، بەڵکو هەنگاوێکیش دەبێت بەرەوپێشەوە. منیش ڕێک لەوە دەترسام کاردانەوەیان ئاوا بێت. لە هەمان کاتدا، لە دیدارە دوولایەنییەکەی ئەمریکا و کۆریای باکوور لە ناوچەی بێسوپا، باکوور نووسراوەکەی ئێمەیان ڕەت کردبوویەوە بۆ دیدارەکەی سەنگافوورە. وەزارەتی دەرەوە کاتێک ڕووبەڕووی ڕەتکردنەوە بووبوویەوە، هەستابوو بە مامەڵەکردم، "ئەم نووسراوەتان بەدڵ نییە، ئەی ئەمەیان چۆنە؟" ئەگەر کۆریای باکوور ئەوەشی بەدڵ نەبوایە، بۆی هەبوو دانوستانکارانی وەزارەتی دەرەوە بڕێک پاشەکشەی تر بکەن و نووسراوێکی تر پێشکەش بکەم. هەموو ئەوەیان بۆ لەپێناوی قایلکردنی کۆریای باکووردا دەکرد. خۆشبەختانە پەمپەیۆ هاوڕا بوو لەگەڵمدا و پێمان وابوو نابێت نووسراوی نوێ پێشکەش بکەین، بەڵکو دەبێت چاوەڕێی وەڵامی پیۆنگ یانگ بین بۆ نووسراوەکەی ترمان. لە کۆتاییدا پیۆنگ یانگ قسەیان لەسەر نووسراوەکەمان کرد و گوتیان ڕۆژی دواتر تێبینیی خۆیان دەنووسن. سەرنجڕاکێشە کە بەوشێوەیە کار دەکات. من جەختیشم لەوە کردەوە دەبێت دانوستانەکان ببرێنە سەنگافوورەوە و کۆریای باکوور لە ناوچەی بێسوپای دڵخوازیان بهێنینە دەر. پاش کۆششێکی زۆر لەگەڵ شاندی ئەمریکادا تا شاندی کۆریای باکوور، توانیمان ئەوە بکەین. تەنانەت چونگیش هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی کاتی ئەوە هاتووە باسەکە ببرێتە سەنگافوورە.

بڕیارم دا ڕووبەڕووی ئەو خەمڵاندنانەی ڕاگەیاندن ببمەوە کە گوایە من لە بابەتەکانی کۆریای باکوور دەرکراوم و ناچم بۆ سەنگافوورە. بە کێڵیم گوت: "لەمەوپێش چەند جارێک بەم ڕێگایەدا ڕۆیشتووم". پێشم وانەبوو بێبەشکردنم لە دیدارەکەی کیم یۆنگ چۆلدا ڕێکەوت بووبێت. کێڵی گوتی سەرسام بووە کاتێک لەگەڵ کیمدا چووەتە نووسینگەی هێلکەییەوە

و منی نەبینیوە. بۆم ڕوون کردەوە پێنس چی گوتووە و پێشم گوت بێ ئەوەی لە ترەمپ بپرسم بۆ بەشدار نیم، چووین بۆ نووسینگەی جێگری سەرۆک. کێلی گوتی ئەویش چاوەڕێی نەکردووە لە دیدارەکەدا بێت، بەڵام ترەمپ داوای لێ کردووە بمێنێتەوە. باسی دەنگۆی ئامادەنەبوونمم کرد لە سەنگافوورە، کە ئەگەر ڕاست بوایە بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی من کارەکەم بە باشی ناکەم، لە حاڵەتێکی واشدا دەستم لە کار دەکێشایەوە. کێلی گوتی: "بێگومان چاوەڕێم نەدەکرد قسەیەکی تر بکەیت. قسە لەگەڵ ترەمپ دەکەم." ئەوەم وەک هەنگاوی یەکەم قبووڵ کرد. هەمان ڕۆژ کێلی پێی گوتم ترەمپ گوتوویەتی ئامادەنەبوونی من لە دیدارەکەی کیم یۆنگ چۆلدا مەبەستێکی دیاریکراوی نەبووە و لە هەموو دیدارەکانی سەنگافوورەدا دەبم. بۆ ئەو ساتە ئەوە قایلی کردم.

ماتیس لە ڕۆژی ٤ی حوزەیراندا پاش خوانی نیوەڕۆ لەگەڵ ترەمپدا هات بۆ لای من بۆ ئەوەی باسی دیدارەکەی ترەمپ و کیم بکات. ماتیس جەختی لە نیگەرانییەکانی خۆی کردەوە دەربارەی نەرمیی پێگەی ئێمەی کرد لە هەمبەر بەرنامە ناوکییەکەی کۆریای باکوور، هەروەها پرسیشی ئەو دەنگۆیانە ڕاستن کە ناچم بۆ سەنگافوورە. کاتێک گوتم دەچم ماتیس بە پشتڕاستکردنەوەیەکەوە گوتی: "بەڵێ، ئەوە زۆر باشە." ئەو گوتی ژاپۆن و چەند وڵاتێکی تری زۆر گرنگی ناوچەکە پاڵپشتی منن لەوەدا کە هەتا کۆریای باکوور بە وازهێنانی ناوکی قایل نەبێت، نابێت ئێمە سزاکان سووک بکەین. ئەو گفتوگۆیە کەمێک نامۆ دیار بوو، چونکە ئەوە یەکەم جار بوو هەست بە نادڵنیایی و دوودڵبوونی ماتیس بکەم. لە هۆی دوودڵییەکەی ماتیس تێنەگەیشتم، هەتا ئایەرز پێی گوتم ترەمپ و ماتیس بەشێکی زۆر خوانی نیوەڕۆیان پێکەوە بەسەر بردووە و ترەمپ بە شێوەیەکی کەموێنە لەسەر دیموکراتبوون و زۆر شتی تر لۆمەی ماتیس کردووە. ماتیس بە پێویستی زانیبوو بزانێت مەبەست لەو لۆمەکردنانە چی بووە. تەماشاکردنی ئەوە خۆش دەبوو.

ڕۆژی سێشەممە، ٥ی حوزەیران، من و پەمپەیۆ خوانی نیوەڕۆمان لەگەڵ ترەمپدا خوارد. یەکێک لە بابەتە گرنگەکانی کاتی خوانەکە ئارەزووی بەردەوامی موون بوو بۆ ئامادەبوون لە دیدارەکەدا، کە خۆی لە خۆیدا ئەو بابەتە بەهۆی دزەکردنی هەواڵەکانی کۆریای باکوورەوە بووبوو بە باسی ڕاگەیاندنە ئاسییاییەکان. من و پەمپەیۆ بۆ هاوشانەکانی خۆمانمان لە سیئۆل ڕوون کردبوویەوە بۆچوونمان لەوبارەیەوە چۆنە. هەواڵە خراپەکە خەیاڵی ترەمپ بوو بە گوتنی ئەوەی ئەو کۆتایی بە جەنگی کۆریا هێناوە. بەلامەوە ئاسایی بوو لە بەرامبەر شتێکدا ئەو پاشەکشەیە بە کۆریای باکوور بفرۆشینەوە، بەڵام نەدەبوو هەرئاوا بە بەلاش ئەو پاشەکشەیە بکەین کە ترەمپ ئامادەیی تێدا بوو بۆ کردنی. زۆر بەسادەیی ئەوە بەلایەوە گرنگ نەبوو. ئەو ئەوەی بە ئاماژەیەک و بە سەرکەوتنێک لە ڕاگەیاندنەکاندا دەزانی و پێی وا نەبوو دەرئەنجامی نێودەوڵەتی لێ بکەوێتەوە. من و پەمپەیۆ پاش خوانەکە چووین بۆ نووسینگەکەی من. بڕیارمان دا وەک جێگرەوەیەک شتێک دابنێین بۆ پێشکەشکردن، بەڵام هیچ بیرۆکەیەکی باشمان بۆ نەهات. چاک دەمزانی ژاپۆن ئەو پاشەکشەیەی پێ خۆش نابێت، بۆیە چاوەڕێ بووم بزانم یاچی لە سەردانەکەی ئەو ڕۆژەیدا بۆ واشنتۆن چیم پێ دەڵێت.

هەروەها دەرفەتەکەشم قۆستەوە و بە پەمپەیۆم گوت وەک دەنگۆی ڕاگەیاندنەکان دەیڵێن ئەو هیچ کێشەیەکی لەگەڵ من هەیە یان نا. ئەو بە شێوەیەکی دڵنیایانەوە گوتی کێشەی لەگەڵمدا نییە و باسی ئەوەی کرد چۆن چەند ڕۆژێک لەوەوبەر بە ڕێگریکردنی دیداری بالیۆزێکی ئەمریکی لەگەڵ ترەمپدا یارمەتیی ئەوم دابوو. پەمپەیۆ لەو کاتەدا گوتی: "خوا بتپارێزێت، جۆن!" هەردووکمان بەو قسەیە پێکەنین. ئەوەی ئایا لەم قۆناغە سەرەتاییەشدا زیاتر هەبوو لەوەی دەردەکەوت یان نا، من نازانم، بەڵام وا دەرنەدەکەوت. کاتێک ڕۆژی دواتر لەگەڵ پەمپەیۆدا نانی

بەیانیمان دەخوارد و ماتیس لە دەرەوەی وڵات بوو، باسی ئەوەمان کرد لە بەرامبەر ڕاگەیاندنی "کۆتایی جەنگ"دا چی لە کۆریای باکوور وەربگرین، کە پێشنیاری سەرەکی ڕاگەیاندنێک بوو لەسەر ڕاگرتنی بەرنامەی چەکە ناوکی و مووشەکە بالیستیکییەکانیان. پێم وانەبوو کۆریای باکوور نە بەوە و نە بە هیچ بیرۆکەیەکی تر قایل بێت، بەڵام هیچ نەبێت ئەوە ڕێگریی لە پاشەکشەی بەلاشی "کۆتایی جەنگی کۆریا" دەکرد. هەمان ڕۆژ، ئابێی سەرۆک وەزیران لە ڕێگاکەیدا بەرەو دیداری G7 کە ئەو ساڵە لە چارلیڤۆیکسی کەنەدا دەکرا، کەمێک لە واشنتۆن وەستا تا دیسانەوە جەخت لە ترەمپ بکاتەوە مامەڵەیەکی باش بکات. ئابێ پێداگریی کرد کۆرییە باکوورییەکان دەمێننەوە، "ئەوان ژیانیان خستووەتە سەر سیستەمەکە. ئەوان سیاسەتمەداری توند و بیرتیژن. ئەگەر ئەمەش بە مامەڵە بزانن، ئەوا دەگەڕێنەوە سەر ڕێگا کۆنەکانیان." هەرچەندە دوو سەرکردەکە گفتوگۆیەکی باشیان لە پیۆنگ یانگ هەبووبوو، بابەتە بازرگانییەکان زۆر ڕۆشن نەبوون و ترەمپ زۆری لەسەر بودجەی نادادپەروەری بازرگانییەکان کرد، بە تایبەتی تا ئەو جێگایەی ئەمریکا قایل بووبوو بەوەی بەرگری لە ژاپۆن بکات، "ئێمە بە ڕێککەوتن بەرگریمان لە ئێوە کرد. ئێمە بەرگریمان لە ئێوە کردن نەک ئێوە لە ئێمەی بکەن. دانوستانکەرەکانی ئێمە خراپ بوون، ئەی وانییە جۆن؟" ئەو پرسیارەی کرد و ڕووی کردە من. پاشان درێژەی پێدا و گوتی: "بەبێ ڕێککەوتن بەرگریتان لی دەکەین. ئەوە دادپەروەرانە نییە."

* * *

پاش ئەوە سەرنجمان لە کیم جۆنگ ئونەوە چووە سەر بەشداریکردنی لە G7. دەرکەوت ڕێگای سەنگافوورە بە پاشماوەکانی چارلیڤۆیکس دروست کرابوو. دیدارەکانی G7 و کۆبوونەوە نێودەڵەتییەکانی تر لە سەردەمێکی دیاریکراودا ئامانجدار بوون و لە زۆر ڕووەوە سوودیان

هەبووبوو، بەڵام چیتر هەر بۆ ئەوە دەکران کۆتاییان پێ نەیەت.

لە ڕۆژی ٨ی حوزەیراندا، ترەمپ یەک کاتژمێر درەنگ کەوت لە جێهێشتنی کۆشکی سپی بەرەو ئاندروز. ئەیرفۆرس وەن لە بنکەی ئەیرفۆرسی باگۆتڤایل نیشتەوە و لەوێشەوە بەرەو شوێنی دیدارەکە گوازراینەوە و هێشتا کاتژمێرێک دوا کەوتبووین. لە جێیەکی خۆش دەچوو و لە چۆڵەوانیدا بوو. ئەوە زۆر گرنگ نەبوو؛ وەک هەمیشە ئێمە تەنها ناوەوەی هۆتێلەکەمان دەبینی کە تیایدا حەوت سەرۆکەکە و شاندەکانیان دەمانەوە. ترەمپ پێداگر بوو لەسەر ئەوەی دیسانەوە ڕووسیا بانگ بکرێتەوە کە ساڵی ٢٠١٤ لەسەر هێرشکردنە سەر کریمیا دەرکرابوو. لە کارێکی یەک هەفتە لەوەوبەردا بووبوو بە هاوپەیمانی جیۆزێپی کۆنتیی سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیادا. کۆنتی لەبەر ئەو ڕێککەوتنە چەپ-ڕاستە پۆپۆلیستییە نائاساییە هاتبوو بۆ ئەمریکا کە سیاسەتی ئیتاڵیای تەواو ناجێگیر کردبوو. دانیشتنە سەرەتاییەکانی G7 ناوەڕۆکی بوون و هێرشەکان لەسەر ترەمپ بوون لەبەر سیاسەتە بازرگانییەکانی، بەڵام زۆری نەخایاند ترەمپ بەرپەرچی دانەوە: پێویستە G7 هەموو گومرگەکان و هەموو سنوورە ناگومرگییەکان لابدات. ئەوە ئەوروپییەکانی بێدەنگ کرد، چوون بەنیاز نەبوون کارێکی وا بکەن. گفتوگۆکە دووڕوویی گفتوگۆ بازرگانییە نێودەوڵەتییەکانی دەردەخست، بازرگانی ئازاد بۆ هەمووان باش بوو جگە لە سێکتەرە خوازراوەماڵییەکان، بە دیاریکراویش جوتیارەکانی ژاپۆن و فەرەنسا، یاخود ئەمریکا و کەنەدا.

ترەمپ دیداری سێلایەنەی لەگەڵ ترۆدۆی کەنەدا و ماکرۆنی فەرەنسا هەبوو، کە تیایدا گفتوگۆکان لەسەر بازرگانییە سێلایەنەکان زۆر نەرمونیانتر بوون. ترەمپ نە کەیفی بە ماکرۆن دەهات نە بە ترۆدۆ، بەڵام بەرگەی دەگرتن و جاروباریش لە گفتوگۆکاندا بەرکەوتنی لەگەڵدا دروست دەکردن. پێم وابێت ترەمپ دەیزانی چی دەکات و ئەوانیش بە

جۆرێک لە جۆرەکان وەڵامیان دەدایەوە، چونکە بۆ خۆیان باشتر بوو کە لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکا نەکەونە دەمەقاڵێیەکی ناکۆتا. ترەمپ لای ئەو دوو سەرۆکە گلەیی لە چین کرد و گوتی چین لە بازرگانیکردنی نێودەوڵەتیدا یاساکانی شکاندووە و دەمێکیشە بۆی چووەتە سەر. ترەمپ لە کەنەدای دەویست ڕێککەوتنە تازە ئەمریکیە - باکوورییەکە لەسەر بازرگانیی ئازاد بچەسپێندرێت، ئەوەش ئامانجە بازرگانییەکانی ئەوی بەدی دەهێنا لەگەڵ مەکسیک و کەنەدادا. لەگەڵ فەڕەنساش مەبەستی سەرەکیی ترەمپ، یەکێتیی ئەوروپا بوو. وەک هەمیشە گوتیەوە: "یەکێتیی ئەوروپا لە چین خراپترە، تەنها ئەوەیە بچووکترە." ترەمپ گلەییشی لە چین و زۆرێک لە وڵاتانی ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانیش گرت لەسەر ئەوەی بە بیانووی ئەوەی "تازەپێگەیشتوو"ن، کەڵکی زیاتر وەردەگرن. ئەوە یەکێک بوو لەو هەموو بوارەی دەکرا لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیدا گۆڕانکاریی گەورەی بەسەردا بهێنرێت و وڵاتانی G7یش دەیانگوت پاڵپشتی لەوە دەکەن، بەڵام هەرگیز بەوە هەڵنەستابوون. دواقسەی ترەمپ لەگەڵ ماکرۆندا ئەمە بوو: "دەزانیت جۆن هەموو ژیانی خۆی بۆ ئەم کارە ئامادە کردووە. ئەو لە تەلەڤیزیۆنی فۆکس بلیمەت بوو و ئێستاش دەبێت بڕیارە قورسەکان بدات، لە کاتێکدا لە تەلەڤیزیۆن ئەو ئەرکەی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکەکەی بە نایابی جێبەجێ دەکات." فەڕەنسییەکان چێژیان لەوە وەرگرت و منیش بە هەمان شێوە.

خوانێکی باش هەبوو بۆ سەرکردەکان، پاش ئەوەش نمایشێکی سێرکی کۆمپانیای سێرکی دو سۆلیل هەبوو. وازم لەو خۆشییانە هێنا بۆ ئەوەی درێژە بە ئامادەکارییەکانم بدەم بۆ دیدارەکەی سەنگافوورە. بەداخەوە وەک هەمیشە ئەو بەرپرسانەی بەرپرسیار بوون لە کرۆکی دیدارەکە، نەیاندەتوانی لەسەر ڕاگەیاندنێکی کۆتایی ڕێکبکەون. ئەوروپییەکان پێیان خۆش بوو یاری بەو ڕاگەیاندنانە بکەن و ئەمریکا بخەنە دۆخی نالەباری

هەڵبژاردن لە نێوان ئەوەی یان بە بنەما بنچینەییەکان قایل ببن، یانیش بە تەنها بمێننەوە جیاواز بن لەوانی تر. بۆ زۆرینەی دیپلۆماتە پرۆفیشناڵەکان تەنهاکەوتن لە مردن ناخۆشترە، بۆیە قایلبوون بە بنەماکان باشترە. ئەوروپییەکان نەیاندەزانی دەکرێت ڕاگەیاندنی کۆتایی نەبێت، چونکە نەبوونی ڕاگەیاندن وەک ئەوە بوو دیدارەکە ڕووینەدابێت، ئەوەش کارەساتێکی گەورە بوو بۆ مرۆڤایەتی! بۆیە سەرکردەکانی تر لەجیاتی ئەوەی چێژ لە نمایشەکە وەربگرن، ترەمپیان هەراسان دەکرد و بۆڵەبۆڵیان دەکرد لەسەر ئەوەی گوایە ئەمریکا توندە. خوانەکەش بێ ناکۆکی نەبوو، چونکە سەرۆکەکانی تر دژایەتیی بیرۆکە ڕەچاونەکراوەی ترەمپیان دەکرد بۆ گەڕاندنەوەی ڕووسیا بۆ کۆبوونەوەکانی G7، بەو بۆنەیەوە کەشەکە بڕێک توند بوو. تا ئەو جێیەی G7 دەگەڕایەوە بۆ ساڵانی حەفتاکان و لە بنەڕەتدا بریتی بوو لە کۆبوونەوەیەک بۆ تاوتوێکردنی بابەتە ئابوورییەکان، زۆرینەی کارەکان دەگەڕانەوە بەردەست لاری کودلۆی سەرۆکی ئەنجوومەنی ئابووریی نەتەوەیی. بەرپرسەکەی ئەمریکا و ستافە نێودەوڵەتییە ئابوورییەکەی ڕاپۆرتەکانیان بە من و کودلۆو دا.

دەبوو ترەمپ بڵێت: "ئەوە بۆ بەرپرسەکان جێ بهێڵن، لێبگەڕێن تەواوی شەوەکە کاری لەسەر بکەن." بەڵام بەوپێیەی پێی وابوو خۆی نزیکترە، پێشنیاری کردبوو ئەو و سەرۆکەکانی تر کۆببنەوە و خۆیان دانوستانەکە بکەن. لەو خاڵەدا کودلۆو هاتبوو و ئامانجی ئەوە بووبوو لە بابەتە ئابوورییەکاندا لایەنی سەرۆکە ئەوروپییەکان بگرێت. کێلی هەستی بە کێشەکە کردبوو و نزیکی ١٠:٣٠ی خولەکی شەو بەدوای منیدا نارد. کاتێک من چوومە ژوورەوە کێلی دەهاتە دەرەوە و گوتی: "ئەمە کارەساتە!" پاش چەند خولەکێک وردبوونەوە بۆم دەرکەوت هەر بەڕاستی کارەساتە. سەرۆکەکان لەسەر کورسی و قەنەفەی قەدیفە دانیشتبوون و چەندین بیرۆکە لە نێوانیاندا دەهات و دەچوو. هیچ شتێکی باش لەوە

سەوز نەدەبوو. ترەمپ زۆر ماندوو دیار بوو؛ لە ڕاستیدا زۆربەی سەرۆکەکانی تریش ماندوو دیار بوون، بەڵام ماکرۆن و ترۆدۆ و یاریدەدەرەکانیان نا، کە جەختیان لە بەرنامەگەلێکی سیاسیی پێچەوانەی ئەوانەی ئێمەوە دەکردەوە. ئەوە وەک دێژاڤو وابوو بۆ من؛ لە ساڵانی ڕابردوودا چەندین جار لە نزیکەوە ئاگام لەم کارەساتە هێواشانە بووە. دەمویست بزانم ئایا ترەمپ بە نیازە لە ڕاگەیاندنی کۆتاییدا بەشدار بێت و پاشەکشەی زیاتر بکات، یاخود بەلایەوە گرنگ نییە. ئەوەم نەدەزانی، بەڵام دەمزانی ترەمپ نازانێت دەکرێت چی لەدەست بدات. کاتێک من گەیشتم، ترەمپ و کودلۆو خەریک بوون پێکەکەلێکی چارەنووسازیان دەبەخشی. لە خاڵێکی دیاریکراودا قسەم دژی بیرۆکەیەکی ئەڵمانییەکان کرد لەسەر ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی، بەڵام وا پێنەچوو کەسیان لە کێشەکە تێگەیشتبن، ئەوەش ئاماژە بوو بۆ ئەوەی تەنها ترەمپ نەبوو لە وردەکاریی گفتوگۆی بەرپرسەکان تێنەدەگەیشت. لە کۆتاییدا، لە کاتژمێر ١١ی شەودا سەرکردەکان بڕیاریان دا بەرپرسەکان بەتەنها درێژە بە گفتوگۆکە بدەن؛ بەرپرسەکانیش بە خۆشحاڵییەوە ئەوەیان جێبەجێ کرد و تا ٥:٣٠ خولەکی بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە بەردەوام بوون. گەر من بوومایە دەمگوت: "خۆماندووکردنی بۆ چییە؟ با واز لەو ڕاگەیاندنە بهێنین و تەواو." بۆی هەبوو ئەو قسەیە ئەوروپییەکان و کەنەدا سەرسام بکات. بەڵام وەک جیم بەیکەر بیری دەخستمەوە، من ئەو کەسە نەبووم کە لە لایەن گەلی ئەمریکاوە هەڵبژێردراوم.

٧:١٠ خولەکی بەیانی کودلۆو و بەرپرسەکەی خۆمانم بینی، هەردووکیان گوتیان شتێکی وا ڕوووینەداوە. پێش دەستپێکردنەی گفتوگۆکانی G7 ڕاوێژمان لەگەڵ ترەمپدا نەکرد، چونکە ئەو ڕۆژە درەنگ هەستا. هێشتا جێهێشتنی گفتوگۆکانم بەبێ ڕاگەیاندن لا ئاسایی بوو، بەڵام دەمویست دڵنیا بمەوە لەوەی ترەمپ لە دەرئەنجامەکان تێدەگات. هەرگیز ئەو

گفتوگۆیەمان نەبوو، لەجیاتی ئەوە، پێشنیارم کرد جێهێشتنی کەنەدا پێش بخەین بۆ کاتژمێر ٩:٣٠ خولەک، ئەویش بۆ ئەوەی بڕیارێک بدرێت. بێ ئەوەش هەر لە بەرنامەماندا بوو پێش کۆتاییهاتنی کاتی ئاسایی G7 کەنەدا جێ بهێڵین، بۆ ئەوەی ئێوارەی یەکشەممە لە کاتێکی گونجاودا بگەینە سەنگافوورە؛ هەموو ئەوەی من پێشنیارم دەکرد ئەوە بوو کەمێک زووتر بڕۆین. بیردۆزەکەی من ئەوە بوو ئەگەر لە کەشی توندی دیدارەکە دەربچین، ترەمپ مێشکی سافتر دەبێت و دەتوانێت هێمنانەتر بڕیار لەسەر ڕاگەیاندنەکە بدات. کێلی و کودلۆو هاوڕا بوون. ترەمپ ماندوو و بێزار بوو، هەروەها بڕیار بوو بەشداریی خوانێکی بەیانی بکات لەسەر یەکسانیی ڕەگەزی، بەڵام بۆ ئەوەش دواکەوتبوو. کاتێک ئەوروپییەکان کە بیرۆکەی جیاوازتریان هەبوو بیستییان ترەمپ زووتر دەڕوات، پێش ئەوەی ئێمە بچینە سەر بۆ ئەوەی ماڵئاواییان لێ بکەین، ئەوان هاتنە خوار. ئەو دیمەنەی ئێستا بەناوبانگ بووە سەلماندی لە کاتی خۆیدا ترەمپمان نەهێناوەتە دەر:

دۆخەکە وەک جەنگی لیتڵ بیگهۆرن وابوو. تەواوی پرۆسەکە کاتکوشتن بوو، بەڵام گفتوگۆکان بەردەوام بوون و من و کودلۆو دانوستانەکانمان دەکرد. لەسەر زۆر بابەتی ورد و ناپێویست ڕۆیشتین (بەندێکی ئەوروپییەکانمان سڕییەوە لەسەر ئەوەی گوایە ئێران پابەندی ڕێککەوتنی ناوکییە، لە کاتێکدا پابەند نەبوو). بەڵام لە بنەڕەتدا هەموو ئەوەی دەمانکرد دەردانی دوانەئۆکسیدی کاربۆن بوو و ئەوەش یارمەتیی گەرمبوونی زەوی دەدا کە ئەوروپییەکان گوتبوویان نیگەرانی ئەو بابەتەن. ترەمپ هێشتا وەڕەز بوو. لەسەر نووسراوێکی کۆتایی ڕێک کەوتین و دەبوو بەشداریش لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا بکەین. پاشان دەچووینەوە بۆ بنکەی باگۆتفایلی ئەیرفۆرس و کودلۆومان جێ دەهێشت بۆ ڕاگرتنی قەڵاکە. لەگەڵ پەمپەیۆدا یەکمان گرت و ئەیرفۆرس وەن بەرەو سەنگافوورە بەڕێ

کەوت و دوازدە کاتژمێر لە ناوچەی هاوکاتەوە بوو، هەروەها لە ڕێگای بنکەی کەنداوی سۆدای دوورگەی کریتەوە دەڕۆیشتین بۆ ئەوەی لەوێ بوەستین و سووتەمەنی تێبکەین. پێم وابوو کارمان لە G7 تەواو بووبێت.

***

ترەمپ خۆشحاڵ بوو بەوەی لە ڕێگایە بۆ دیتنی کیم. لە کاتی فڕینی فڕۆکەکەدا ڕووداوەکانی چارلیڤۆیکسم بۆ پەمپەیۆ باس کرد. ویستم سەرخەوێک بشکێنم بۆ ئەوەی خۆم لەگەڵ کاتی سەنگافوورەدا بگونجێنم و پێش گەیشتن بە کەنداوی سۆدا بێدار ببمەوە، واتە ڕۆژی یەکشەممە بە کاتی یۆنان. ئەیرفۆرس وەن بۆ گەشتی شاهانە دیزاین نەکراوە (بێجگە لە جێی سەرۆک)، کورسییەکانی تەخت نابن و زۆرجار سەرنشینان لەسەر ڕووی فڕۆکەکە پاڵ دەکەون. کاتێک من خەوتبووم، ترەمپ بە دوو تویت پاشگەزبوونەوەی خۆی ڕاگەیاندبوو لە پشتگیریکردن لە ڕاگەیاندنەکەی G7، ئەوەش شتێک بوو لەوەو پێش ڕووینەدابوو. پێش چەند کاتژمێرێک پەمپەیۆی هەستاندبوو و بانگی کردبوو تا پێی بڵێت ڕەخنەی لە ترۆدۆ هەیە، چونکە ترۆدۆ لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەدا دژی ترەمپ قسەی کردبوو. ترەمپ لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەدا قسەی باشی لەسەر ترۆدۆ کردبوو، بۆیە زۆر تووڕە بووبوو لەوەی ترۆدۆش هەمان کاری بەرامبەر بەو نەکردووە. ڕاگەیاندنەکە زیانی لاوەکی بوو. کەس منی بێدار نەکردەوە و کاتێکیش هەستام بیری تویتم نەبوو، لە کاتێکدا تا گەیشتنمان بە سەنگافوورە هەموو هەواڵەکانی داگیر کردبوو. پەیوەندیم بە کودلۆوە کرد تا بزانم چی ڕوویداوە، ئەو لە وەڵامدا گوتی هەموو شتەکان باش کۆتاییان پێ هاتووە، بەڵام کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی ترۆدۆ تێکی داوە. کێشە هەنووکەییەکە ئەوە بوو کودلۆو لە سەندەی تۆک شۆدا چی بڵێت، ئاراستەی ترەمپیش ڕوون بوو: "نیشانە لە ترۆدۆ بگرەوە و کارت بەسەر ئەوانی ترەوە نەبێت. ترۆدۆ لەو کەسانەیە کە لە پشتەوە لێت

دەدات." ترەمپ دەشیویست ئاماژە بە دیدارەکەی کیم جۆنگ ئونیش بدرێت و دەیگوت ڕەتکردنەوەی ڕاگەیاندنەکەی G7 پیشانی دا "ئێمە فرتوفێڵ و گەندەڵکاری قبوول ناکەین،" ئەوەش خاڵێکی گرنگ بوو. ترەمپ دەیویست ئازادی بە کودلۆو و پیتەر ناڤارۆ (یاریدەدەرێکی تری سەرۆک کە تاوتوێم لەگەڵ کرد) و لیندسی گراهام بدات. ناڤارۆ گوتی: "لە دۆزەخدا جێیەکی تایبەت بۆ ترۆدۆ دانراوە، لەبەرئەوەی مامەڵەی بەرامبەر بە ترەمپ زۆر ناشرین بووە." ڕەخنەی زۆر لە ناڤارۆ گیرا، بەڵام ڕێک ئەوەی گوت کە ترەمپ دەیویست.

ترەمپ ماندووتر دیار بوو و پێی دەچوو لە گەشتەکەدا زۆر نەخەوتبێت. ئەو سەیری ڕاگەیاندنەکانی دەکرد و تەماشای گەیشتنی کیم جۆنگ ئونی دەکرد بە سەنگافوورە و دەیویست بزانێت گەیشتنی خۆی چۆن دەبێت. پاش نیشتنەوە، ترەمپ بڕیاری دا نایەوێت تا سێشەممە چاوەڕێ بکات بۆ دیداری کیم جۆنگ ئون و دەیەوێت ڕۆژی دووشەممە ببینێت. من هاوڕا بووم. سەرەڕای ئەوەی دەمانویست پێش دیداری ترەمپ و کیم ترەمپ پشوویەکی باش بدات، بەڵام هەتا کاتێکی کەمترمان لە سەنگافوورە بەسەر ببردایە، کاتی کەمتر دەبوو بۆ پاشەکشە. ئەگەر بە ڕێککەوتنێکی کارەساتبار سەنگافوورەمان بەجێ بهێشتایە، ئەوا لەوانەیە بمانتوانیایە شتەکان بخەینەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە. ڕۆژی یەکشەممە، ترەمپ لە بینای ئیستانا (پێشتر شوێنی ژەنەڕاڵە بەریتانییەکان بوو و ئێستا نووسینگەی سەرەکیی سەرۆک وەزیران) چاوی لی ساین لۆنگی سەرۆک وەزیرانی سەنگافوورە کەوت. من لەگەڵ ترەمپدا لە بیستدا (بیست — دڕندە- ناوی نافەرمیی لیمۆزینەکەی سەرۆک بوو) بووم و سەرنجم دا میزاجی باش نییە. پێی وابوو دیدارەکەی کیم شکست دەهێنێت و چینیشی بە هۆکاری شکستەکە دەزانی. ترەمپ و لی دووبەدوو قسەیان کرد، پاشان لی خوانێکی کاتی کارکردنی ڕێک خست. بالاکریشنانی وەزیری

دەرەوەی سەنگافوورە تازە بۆ ئامادەکاریی دیدارەکە چووبووە پیۆنگ یانگ و تازە هاتبوویەوە، ئەو گوتی پێی وایە کۆریای باکوور لە ڕووی ئابوورییەوە کێشەیان نییە و بووشن بە خاوەنی چەکی ناوکی. لە وەڵامدا ترەمپ گوتی لەپێناوی دیدارێکی کورتدا گەشتێکی درێژی کردووە. بالاکریشنان گوتی هەتا ئێستا ئەمریکا سێ شتی لەدەست داوە: یەکەم شت خودی دیدارەکەیە کە بەخششێکە بە کۆریای باکوور، ئەوەش بۆ هەمووان ڕوون بوو تەنیا بۆ ترەمپ نەبێت؛ دووەم بریتییە لە لەدەستدانی "ئەوپەڕی فشار" کە چیتر گەڕانەوە بۆی سەختە، ئەمەشیان بۆ هەمووان ڕوون بوو تەنیا بۆ ترەمپ نەبێت؛ سێیەم لەدەستدان بۆ چینە، چونکە سەرنجی سەرەکیمان خستووەتە سەر کۆریای باکوور لە کاتێکدا یارییە ستراتیژییە مەزنەکە چینە. قسەکانی بالاکریشنان قەناعەتپێکەر و بەهێز بوون، ترەمپیش بە بیستنیان دڵخۆش نەبوو.

پاش خوانەکە پەمپەیۆ لە هۆتێلەکە دەربارەی دۆخی دانوستانەکان لەگەڵ کۆریای باکووردا قسەی بۆ کردین؛ گەیشتبووین بە ڕێگایەکی داخراو. ترەمپ گوتی: "ئەمە مەشقێکی دەرکەوتنە لە ڕاگەیاندنەکاندا." ڕوون بوو ئەو تەواوی دیدارەکە بەوشێوەیە دەبینێت. کێلی پێی گوتم ترەمپ چاکوچۆنییەکی لەگەڵ ستافی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا کردووە لە سەنگافوورە. کێلی گوتی: "دەروونناسییەکە لێرەدا ئەوەیە ترەمپ دەیەوێت لەپێناوی ڕاگرتن و زاڵبوون بەسەر کیم جۆنگ ئوندا ڕێککەوتن نەکات." هاوڕا بووم و ئەوەم بە بەسوود دەزانی بۆ خۆپاراستن لە پاشەکشەی مەزن. پاش دیتن و سڵاو، ترەمپ بە من و کێلی و ساندەرسی گوت ئامادەیی تێدایە واژوو لەسەر ڕاگەیاندنێکی فەرمیی بێناوەڕۆک بکات و لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەدا سەرکەوتن ڕابگەیەنێت، پاشان شارەکە جێ بهێڵێت. ترەمپ گلەیی لەوە کرد کیم جۆنگ ئون بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لە گفتوگۆکاندا زاڵتر بکات چاوی بە سەرۆکی چین و ڕووسیا کەوتووە،

پاشان گوتی: "هەرچۆنێک بێت دیداری سەنگافوورە سەرکەوتن دەبێت. هەموو ئەوەی پێویستە بیکەین زیادکردنی سزای ترە، بێگومان چینیش سزا دەدەین چونکە سنوورەکانیان کردووەتەوە. کیم پڕە لە گەندەڵی و پیسی، ئێمە سێ سەد سزای ترمان بەدەستەوەیە و دەتوانین لە ڕۆژی هەینیدا بیانسەپێنین." ئەوە هەموو نەخشەکانی شپرزە کرد (هەرچەندە لەوکاتەوەی کەنەدامان جێ هێشتبوو شپرزە بوون)، من و کێلی پێمان گوت دواتر پێی دەڵێین چ بژاردەیەکی هەیە. ترەمپ قسەی لەگەڵ موون جای ئین کرد کە هێشتاکە دەیویست بەشداریی دیدارەکەی سەنگافوورە بکات، بەڵام دەبوو موون بۆی بیزانیبایە دیداری سێلایەنە ڕوونادات: ئەو هەر لە سەنگافوورەش نەبوو. ڤیدیۆیەکی کورتی ناونووسکردنمان پیشانی ترەمپ دا کە ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دروستیان کردبوو، بۆ ئەوەی کیم هەڵبخەڵەتێنن بەوەی ئەگەر واز لە چەکە ناوکییەکانی بهێنێت، وڵاتەکەی سەرکەوتنی ئابووری بەدەست دێنێ. ترەمپ قایل بوو بەوەی ڕۆژی سێشەممە ڤیدیۆکە پیشانی کیم بدات (لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەشدا پیشانی دا).

بەدرێژایی ڕۆژ دانوستانەکان لەگەڵ کۆریای باکووردا بەردەوام بوون، دەگوترا نزیکن لە ڕێککەوتن. پاش کەمێک لەگەڵ کۆمەڵێک بەرپرس لە وەزارەتی بەرگری و دەرەوە و ئەنجوومەنی ئاسایش بەوەدا چوومەوە کە لێی نووسرابوو "نووسراوی کاتژمێر شەش". پێم گوتن پێم باش نییە ترەمپ واژووی بکات. پاش کەمێک پەمپەیۆ و هەندێک بەرپرسی تری وەزارەتی دەرەوە هاتن لەو شوێنەی بۆ ستافی کۆشکی سپی دیاریکرابوو تاوتوێی نووسینەکەمان کرد. دیسانەوە ڕوونم کردەوە بۆچی ئەگەر هەموو ناکۆکییەکە لە بەرژەوەندیی ئەمریکاش کۆتایی بێت (ئەوە ڕووی نەدەدا) هەر واژووی ناکەم. کۆریای باکوور ڕەتی دەکردەوە بە وازهێنانی تەواو و یەکجارەکی و پشتڕاستکراوەی ناوکی قایل ببێت. ئەوان تەنها "وشە

جادووییەکانیان" ڕەت نەدەکردەوە، بەڵکو تەواوی چەمکەکەیان ڕەت دەکردەوە، بە بۆچوونی من ئەو ڕەفتارەیان تەواوی دیدارەکەی بێبەها دەکرد. گوتم نابێت بە هیچ بەندێک قایل ببین لەسەر کۆتایی جەنگ، هەتا شتێکی گرنگمان لە بەرامبەردا نەدەنێ. پەمپەیۆ هەڵچوو، هەروەک چۆن کاتێک لە مانگی نیساندا بە تەلەفون بەرامبەر بە من هەڵچوو، کاتێک باسی پاشەکشەکەمان دەکرد لە ئێران. ئاماژەم بەوە دا دیموکراتەکانی کۆنگرێس لەسەر ئەم نووسراوە پارچەپارچەمان دەکەن، چونکە ئەوە کاری خۆیانە، کۆمارییەکانی کۆنگرێسیش بە هەمان شێوە پارچەپارچەمان دەکەن، چونکە ئەو نووسراوە ناکۆکە لەگەڵ هەموو باوەڕەکانماندا. پەمپەیۆ بەرگری لەوە نەکرد کە من ڕەخنەم لێ گرت، هەروەها تێشگەیشت واژوونەکردنی هیچ نووسراوێک باشترە لە واژووکردن لەسەر نووسراوێکی خراپ. پەمپەیۆ تەنها دەیزانی کە ترەمپ واژووکردنێکی دەوێت. هەرچۆنێک بێت نەیدەویست دان بەوەدا بنێت کە هەردووکمان دەمانزانی: ئەوان ئێمەیان بە بنبەستێک گەیاندبوو کە یەک لە دوای یەک پاشەکشەمان دەکرد و لە بەرامبەریشدا هیچمان دەست نەدەکەوت. ئێستا کە لە دواساتەکاندا بووین تەنها چەند بژاردەیەکمان هەبوو، کە هیچکامێکیان باش نەبوون.

یەک دوو چرکە بێدەنگیی ژوورەکەی داگرت و وەک ئەوەی هەمووان لە بێدەنگیدا ڕێک کەوتبن، ژوورەکەیان جێ هێشت و تەنها من و پەمپەیۆ ماینەوە. پاش هەندێک هێنانوبردن، گەیشتین بە هاوڕایی لەسەر پاشەکشەنەکردن لە بیرۆکەی وازپێهێنانی ناوکی و بەندی ١٧١٨ ئەنجوومەنی ئاسایش (پابەندکردنی کۆریای باکوور بە تاقینەکردنەوەی ناوکی و مووشەکی بالیستیکی)، لەگەڵ ئەوەشدا چەند دێڕێکیش دەربارەی ڕفێندراوەکانی ژاپۆن زیاد بکەین، هەروەها داوای گەڕاندنەوەی جەستەی ئەمریکییە کوژراوەکانی جەنگی کۆریاش بکەین. ئەگەر ئەوە

سەری نەگرتایە، دەگەڕاینەوە بۆ ڕاگەیاندنێکی زۆر کورت، کە گرنگییەکەی لە کورتییەکەیدا دەبوو. من و پەمپەیۆ ئەوەمان بۆ بەرپرسەکانی وەزارەتی بەرگری و دەرەوە و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ڕوون کردەوە و دەیانزانی دەبێت تا درەنگانی شەو لە دانوستاندا بن. ترەمپ زووتر بەو دۆخە ناخۆشەی زانیبوو و بۆ خۆی تا بەیانیی سێشەممە دەخەوت.

مات پوتینگەری بەڕێوەبەری ئەنجوومەنی ئاسایش لە ئاسیا یەکی شەو بێداری کردمەوە بۆ ئەوەی پێم بڵێت دانوستانەکان وەستاون (ئەوە چاوەڕوانکراو بوو) و پەمپەیۆ و کیم یۆنگ چۆل کاتژمێر حەوتی بەیانی لە هۆتێلی کاپێلا یەک دەبینن تا بزانین چی دەکرێت. شوێنی دیداری ترەمپ و کیمیش هەمان هۆتێل بوو. ترەمپ کاتژمێر هەشت دەرکەوت و بەرەو کاپێلا بەڕێ کەوتین. ترەمپ گوتی قایلە بە ڕاگەیاندنە کورتەکە، ئەوەش سەرسامی کردم، چونکە ئەو ڕاگەیاندنە بە هیچ جۆرێک باسی کۆتایی جەنگی کۆریای تێدا نەبوو. لە ڕاستیدا ئەو ڕاگەیاندنە هیچ شتێکی گرنگی دەربارەی هیچ شتێك تێدا نەبوو. لە مەترسییەکی تریش ڕزگارمان بووبوو. لە ماوەی هەموو ئەمانەدا، ترەمپ تویتێکی لەسەر سەرکەوتنی بڕیاری ٥-٤ی دادگای باڵا ئامادە دەکرد لە کەیسێکی دەنگداندا لە ئۆهایۆ، هەروەها ئومێدی زووچاکبوونەوەی بۆ کودلۆو دەخواست کە تووشی سەکتەیەکی هێواشی دڵ بووبوو و بۆی هەیە کۆبوونەوەی G7 هۆکاری بووبێت.

پاشان بەڕێ کەوتین بۆ ڕێوڕەسمی گەیشتن و دیداری ترەمپ و کیم، پاش ئەوەش دوو سەرۆکەکە دیدارێکی دووبەدوویان هەبوو؛ پاش ئەوەش کیم جۆنگ ئون و چوار یاوەری هاتنە ئەو ژوورەی دیدارە سەرەکییەکە. کیم جۆنگ ئون تەوقەی لەگەڵ لای ئەمریکییەکاندا کرد (بە منیشەوە) و دانیشت و ڕێگای بە ڕاگەیاندنەکان دا زۆر بەهێواشی وێنە بگرن. کاتێک

ڕاگەیاندنەکان ڕۆیشتن و قەرەباڵغییەکە نەما، کیم ئەو ڕاپۆرتانەی خەملاند کە هەوڵیان داوە بڵاویان بکەنەوە و ترەمپیش گلەیی لەو ناڕاستگۆییە کرد کە لە ڕاگەیاندەکانـدا هەبـووە. ترەمـپ گـوتی پێـی وایە دیـدارە دووبەدووەکەیـان زۆر ئەرێنـی بـووە و چـاوەڕێ دەکـات لە داهـاتوودا پەیوەندیی تەلەفونیان هەبێت. کیم بە پێکەنینەوە ترەمپی لە سێ سـەرۆکی پێشتری ئەمریکا جیا کردەوە و گوتی ئەو سـەرۆکانە نەیـانتوانیوە ئەوەنـدە سەرکردایەتی بنوێنن کە دیـدارێک ڕێك بـخەن. ترەمـپ پۆزی لێـدا و گوتی ئۆباما ئامادەیی ئەنجامدانی چەنـد هەڵەیەکـی گەورەی تێـدا هەبـوو لەسـەر کۆریـای بـاکوور. ترەمـپ گـوتی چـاک زانیـویەتی ئەو و کـیم یەکسەری پێکەوە دەگونجێن. کیم لە وەڵامدا لە ترەمپی پرسـی: "ڕوانینـی تۆ بۆ من چۆنە؟" ترەمپ گوتی کە پرسـیارەکەی بە دڵە. پاشـان بە کیمـی گوت ئەو کەسێکی زۆر زیرەک و نهێنی و بـاش و ڕاسـتگۆیە، هەروەهـا خـاوەنی کەسـایەتییەکی باشیشـە. کـیم گـوتی ئەوان لە سیاسـەتدا وەک ئەکتەر وان.

ترەمپ لە خاڵێکدا ڕاست بوو. کیم جۆنگ ئون دەیزانی چی دەکـات کاتێـک لە ترەمپـی پرسـی چـۆن بیـر لە ئەو دەکـاتەوە؛ ئەو پرسـیارە دوو کاردانەوە زیاتری نەبـوو: یـان وای لە ترەمـپ دەکـرد وەڵامێکـی ئەرێنـی بداتەوە، یانیش وەڵامێکی نەرێنـی بـداتەوە و کۆتـایی بە دیـدارەکە بێـت. کیم لە ڕێگای ئەو پرسیارە ساویلکەیەوە بـار و مەترسـیی وەڵامـدانەوەی خستە سەر شانی بەرامبەر. ترەمپی ڕاو کرد.

کیم پێداگری کرد لەسەر ئەوەی پابەندە بە وازهێنـانی ئەتـۆمی. گـوتی هەرچەنـدە هەنـدێک هەن گومانیـان لە ڕاسـتگۆیی ئەو هەیە، بەڵام ئەو کەسـانە بەهـۆی کـرداری سـەرۆکەکانی پێشـووەوە هەڵەداوەریـی لەسـەر دەکەن. ئەو جیاواز بوو. ترەمپ هاوڕا بوو کیم شتەکانی گۆڕیـوە. لەگەڵ ئەوەشـدا کـیم هەر لەسـەر سـتایلە کـۆنەکە، لەبەر مێـژووی پڕکێشـەی

ئەمریکا-کۆریای باکوور ڕەخنەی لە سیاسەتە دوژمنانەکانی حکوومەتەکانی پێشووی ئەمریکا گرت. ئەو گوتی ئەگەر ئەو و ترەمپ زوو زوو یەکتری ببینن، دەتوانن ئەو بێمتمانەییە بتوێننەوە و وازهێنانی چەکی ئەتۆمی خێراتر بکەن. من پێشتر هەموو ئەو قسانەم بیستبوو، بەڵام ترەمپ نەیبیستبوو و هاوڕای کیم جۆنگ ئون بوو بە تایبەت لەو بەشەی باسی حکوومەتەکانی پێشووی کرد، هەروەها ئاماژەشی بەوە کرد لە لای ئەمریکا کەسانێکی دژ بە کۆریای باکوور هەن. بە پێچەوانەی هەڵوێستی ئۆباماوە لە ڕێککەوتنی ئێراندا، ترەمپ گوتی هەر ڕێککەوتنێکی ناوکی لەگەڵ کۆریای باکووردا بکات، سەرەتا مۆڵەت لە ئەنجوومەنی پیران وەردەگرێت. لەو خاڵەدا، پەمپەیۆ نۆتپادەکەی دایە دەستم کە لەسەری نووسرابوو، "ئەو پیاوە کەسێکی پڕوپووچە." هاوڕا بووم. کیم پەیمانی دا چیتر تاقیکردنەوەی ناوکی نەکات و بەرنامە ناوکییەکەیان بە شێوەیەکی یەکجارەکی پووچەڵ دەکەنەوە.

پاشان تەڵە گەورەکە هات، کە جۆزێف ستالین لە دیدارەکانی کاتی جەنگدا لەگەڵ فرانکلین ڕووزڤێلتدا بە باشی دروستی کردبوو، کاتێک لە مەکتەب سیاسیی سۆڤیەت توندڕەوەکان ناسرانەوە. کیم دانی پێدا نا کە بۆ ئەویش لە ئەمریکا کۆمەڵێک بەربەستی سیاسیی ناوخۆیی هەبووە. لەبەرئەوەی لە کۆریای باکووریش هەروەک ئەمریکا کەسانی دژ هەن. کیم گوتی پێویستی بە ڕێگایەک بووە بۆ دروستکردنی پاڵپشتیی گشتیی لە کۆریای باکوور و لە کاتی کردنی ئەو قسەیەدا بە زۆر خۆی گرت تا پێنەکەنێت، پاشان باسی چالاکییە سەربازییە هاوبەشەکانی کۆریای باشوور و ئەمریکا کرد و گوتی ئەوە خەڵکی بێزار کردووە. کیم دەیویست چالاکییەکان کەم بکرێنەوە یان هەر نەهێڵدرێن. کیم گوتی لە یەکەم دیداری خۆی و موندا (کە ڕاگەیاندنی پانمونجۆمی لێوە بەرهەم هات) باسی ئەو چالاکییە هاوبەشانەی کردووە و مون گوتوویەتی تەنها ئەمریکا

دەتوانێت ئەو بڕیارە بدات. ترەمپ ڕێک بەوشێوەیە وەڵامی دایەوە کە من لێی دەترسام و دیسانەوە گوتی چالاکییە هاوبەشەکان بێزارکەرن و بەفیڕۆدانی کات و پارەن. ئەو گوتی فەرمان بە ژەنەڕاڵەکان دەکات و بڕیار دەدات تا کاتێک دوو لایەنەکە گفتوگۆی ئومێدبەخشیان هەبێت نابێت چالاکی هەبێت. ترەمپ بە دڵخۆشییەوە گوتی کیم بە کردنی ئەوە پارەیەکی زۆری بۆ ئەمریکا گەڕاندووەتەوە. کیمیش زەردەخەنەی بۆ دەکرد و هەندێک جاریش لەگەڵ کیم یۆنگ چۆلدا پێدەکەنین. بەڵێ هەر دەبێت پێبکەنن و دڵخۆش بن. بە دڵنیاییەوە چێژمان وەردەگرت! لە گواستنەوەیەکی هەواڵیی دواتری ئەمریکادا هەندێک هەواڵ دزەیان کردبوو (لەوانەیە لە وەزارەتی بەرگرییەوە دزەیان کردبێت) کە گوایا ماتیس بێتاقەتە لەوەی ترەمپ بەبێ ئەوەی ڕاوێژ بەو بکات ئەو پاشەکشەیەی کردووە. بێگومان کێلی و پەمپەیۆ و منیش کە لەوێدا دانیشتبووین بەو پاشەکشەیە خۆشحاڵ نەبووین. ترەمپ گوتی هەر لە یەکەم ڕۆژی کارکردنییەوە زانیویەتی مامەڵەکردن و ڕێککەوتنی وەک ئەو دیدارە بۆ ئەو ئاسان دەبێت. ترەمپ لە کێلی و پەمپەیۆی پرسی تا بزانێت هاوڕان لەگەڵیدا. هەردووکیان گوتیان بەڵێ. خۆشبەختانە لە منی نەپرسی. کیم گوتی دژ و توندەکانی کۆریای باکوور بە بڕیارەکەی ترەمپ لەسەر چالاکییە هاوبەشەکان سەرسام دەبن، هەروەها گوتیشی دەکرێت هەنگاوی تر بەرەو قۆناغی پاشتری دانوستانەکە هەڵبگیرێت. کیم بە گاڵتەوە گوتی دەکرێت چیتر بەراوردی دوگمەی چەکە ناوکییەکان نەکرێت، چونکە چیتر ئەمریکا لەژێر هەڕەشەی کۆریای باکووردا نییە و قایلە بە هەڵوەشاندنەوەی پێگەیەکی تاقیکردنەوەی بزوێنەری مووشەک.

لەگەڵ بەرەوپێشچوونی گفتوگۆکەدا، کیم پیرۆزبایی لە خۆی و ترەمپ کرد لەسەر ئەوەی لە ماوەی یەک کاتژمێردا شتگەلێکی زۆریان بەدەست هێناوە، ترەمپیش هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی سەرۆکەکانی تر

نەیانتوانیوە ئەوە بکەن. پاشان هەردووکیان پێکەنین. پاشان ترەمپ دەستی بۆ کیم درێژ کرد و پێی گوت هەر ئەو گرنگە. کیم گوتی هاوڕایە لەسەر ئەوەی شتەکانی بە شێوازی خۆی دەکات و هەروەها ئەو و ترەمپ بە باشی پێکەوە دەگونجێن. ترەمپ دیسانەوە گەڕایەوە سەر باسی چالاکییە سەربازییەکان و ڕەخنەی لە ژەنەڕاڵەکان گرت، بەو ڕەخنەگرتنەش خزمەتی کیمی دەکرد. کیم دیسانەوە پێکەنییەوە. ترەمپ بە کیمی گوت شەش مانگ لەوەوبەر پێی گوتووە "مووشەکەوانی بچووک"، پاشان لە کیمی پرسی ئایا ئیلتۆن جۆن دەناسێت یان نا؟! ترەمپ مووشەکەوانی بە ستایش دەزانی. لەو خاڵەدا، ترەمپ داوای کرد ڤێرژنی کۆریی فیلمی ناونووسینە سەربازییەکە پیشان بدرێت. کۆرییەکان لەسەر ئەو ئاپیادانەی ئێمە پێمان دان زۆر بە وردی سەیری فیلمەکەیان دەکرد. کاتێک فیلمەکە تەواو بوو، ترەمپ و کیم ویستیان یەکسەر ڕاگەیاندنێکی هاوبەش واژوو بکەن، بەڵام هەندێک ناچوونییەکی لە وەرگێڕاندا ئەوەی دواخست، بۆیە گفتوگۆکان بەردەوام بوون. کیم دووپاتی کردەوە گفتوگۆکەیان باش بووە و گوتی خۆشحاڵە بەوەی ترەمپ بە شێوازی "کردار بە کردار" قایل بووە. ئاگام لێ نەبووبوو ترەمپ ئەو پاشەکشەیەی کردبێت، بەڵام هەرچۆنێک بێت ئەو قسانە گوفتارگەلی جادوویی بوون و لەو گوفتارانە بوون کە من دەمویست نەکرێن و کیمیش پێی وابوو دەتوانێت بیانکات و بۆشی دەربچێت. کیم لە ترەمپی پرسی دەکرێت سزاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەنگاوی دواتر بێت، ترەمپیش گوتی بە ڕووی ئەو بابەتەدا کراوەیە و دەیەوێت بیری لێ بکاتەوە، بێگومان لەگەڵ ئەوەشدا سەدان سزامان هەبوو ئامادەی سەپاندن بوون. من و پەمپەیۆ تێنەگەیشتین مەبەستی چییە! ترەمپ نوقڵە نەعناکانی هەڵگرت و دای بە کۆرییەکان. کیم زۆر گەشبین بوو بە هەنگاونانی خێرا بەرەوپێشەوە، هەروەها سەرسامی خۆی دەربڕی بەوەی سەرۆکەکانی پێش ئەوان

نەیانتوانیوە ئەوە بکەن. ترەمپ بە خێرایی گوتی سەرۆکەکانی پێش ئەوان گێل بوون. کیم هاوڕا بوو لەوەی کە بەدەستهێنانی ئەو دەستکەوتانە، کەسانی وەک ئەو و ترەمپی پێویستە.

پاشان ساتە ناسکەکە هات. کیم ڕووی کردە ئەولای مێزەکە و پرسیاری بۆچوونی ئێمەی کرد. ترەمپ داوای لە پەمپەیۆ کرد سەرەتا ئەو قسە بکات، پەمپەیۆش گوتی تەنها دوو سەرۆکەکە دەتوانن نووسراوە مێژوویەکەی ئەو ڕۆژە دیاری بکەن. ترەمپ بە خۆشحاڵییەوە گوتی ئەگەر تیلەرسۆن بمایە ئەمریکا نەیدەتوانی ڕێککەوتنەکە بکات.

خۆشبەختانە کیم بابەتەکەی گۆڕی بۆ باسی تەرمی ئەمریکییەکان لە جەنگی کۆریادا، بەو هۆیەوە من قسەم نەکرد. ئەو فیشەکەشم بەرنەکەوت. وێنەگرە فەرمییەکانی هەردوو لا هاتنە ژوورەوە. پاشان کاتژمێر ١١:١٠ دیدارەکە کۆتایی هات. پاش چاوەڕوانییەکی کەم لە ژووری چاوەڕوانی بۆ ترەمپ بۆ ئەوەی سەیرێکی ئەو باسوخواس و گواستنەوەی ڕاگەیاندنەکان بکات، لە کاتژمێر ١١:٣٠ خولەکدا دەستمان کرد بە خوانی نیوەڕۆی کاتی کار. هەندێک ڕاگەیاندنکار و ڕۆژنامەنووسی تر هاتنە ژوورەوە و پاش ماوەیەک ئەوێیان جێ هێشت، پاشان کیم گوتی: "وەک ئەوەیە ڕۆژێکیان لە خاکی سەرسوڕهێنەر بەسەربردبێت." لە کۆتاییدا قسەیەک کرا تەواو هاوڕای بم. سەرەتای گفتوگۆکە نەرم بوو، کیم باسی سەردانی شەوی پێشتری خۆی دەکرد بۆ گازینۆ و هۆتێلەکەی شێڵدن ئەیدڵسن، کە یەکێک بوو لە جێگا شەوانە نایابەکانی سەنگافوورە. کیم و ترەمپ باسی گۆڵف دێنیس ڕۆدمانیان کرد، هەروەها باسی سەرکەوتنی تیپی ژنانی تۆپی ئەمریکاشیان کرد بەسەر کۆریای باکووردا لە ئۆلۆمپیاتی ساڵی ٢٠١٦.

ناڕاستەی گفتوگۆکە گۆڕا و ترەمپ ڕووی لە من کرد و گوتی: "چۆن ڕۆژێک لە ڕۆژان هەڵۆ بووە، بەڵام ئێستاکە کۆترە. هیچت هەیە

پاش ئەو پێشەکییەم بیڵێیت؟" خۆشبەختانە هەمووان پێکەنین. هەوڵم دا پێنەکەنم و گوتم، "گەلی ئەمریکا سەرۆک ترەمپیان هەڵبژاردووە چونکە ئەو لە سیاسەتمەدارەکانی تر جیاوازە. ئەو گۆڕانکاری دروست دەکات. ئارەزوومە سەردانی پیۆنگ یانگ بکەم، ئەوە سەرنجڕاکێش دەبێت".

کیم ئەوەی بە پێکەنیناوی زانی و گوتی: "بەخێرهاتنی گەرمت لێ دەکرێت. لەوانەیە وەڵامدانەوەی ئەمەت لا قورس بێت، بەڵام پێت وایە دەتوانیت متمانە بە من بکەیت؟"

ئەوە یەکێک بوو لەو پرسیارە فێڵاویانەی کیم لە کردنیاندا شارەزا بوو. نەمدەتوانی نە ڕاستییەکە بڵێم نە درۆش بکەم، بۆیە گوتم: "سەرۆک خەڵک بە باشی دەناسێت. ئەگەر ئەو بتوانێت متمانە بە تۆ بکات، ئەوا ئێمەش لەو خاڵەوە هەنگاو دەنێین".

ترەمپ باسی ئەوەشی کرد من بەردەوام لە فۆکس نیوز بووم و داوای جەنگی دژ بە ڕووسیا و چین و کۆریای باکوورم کردووە، بەڵام ئەوە لە ناوەوە جیاواز بوو. ئەوە ئازاری کۆرییەکانی دا. کیم گوتی: "بیستوومە بەڕێز بۆڵتن قسەی زۆر باش دەربارەی ئێمە ناکات. پێویستە لە کۆتاییدا وێنەیەک بگرین بۆ ئەوەی بە دژە ناوخۆییەکانی کۆریای باکووری بسەلمێنم تۆ ئەوەندە کەسێکی خراپ نیت".

پرسیم، "دەتوانم بچم بۆ یۆنگبیۆن؟" پێکەنینی زیاتر.

ترەمپ گوتی: "دەتوانم پێتان بڵێم بۆڵتن باوەڕێکی پتەوی بەمە هەیە". ئەوە دەیسەلماند ڕاستەقینە شتێکی لاستیکییە.

پاشان گوتم، "بەڕێز سەرۆک، خۆشحاڵم بەوەی تەماشای فۆکس نیوز دەکەیت." هەمووان پێکەنین. (ترەمپ لە کاتی گەڕانەوەماندا بۆ واشنتۆن پێی گوتم، " لەگەڵ ئەواندا ئاشتم کردیتەوە." ڕێک ئەوەی من پێویستم بوو!)

خوانەکە لە کاتژمێر ١٢:٣٠دا کۆتایی هات، بەڵام هێشتا هەر دەبوو چاوەڕێ بین چونکە ڕاگەیاندنە هاوبەشەکە ئامادە نەبوو. ترەمپ و کیم

بڕیاریان دا بچنە باخچەی هۆتێلەکەوە و ئەوەش تەنها سوودی بۆ تەلەڤیزیۆنەکان هەبوو. لە کۆتاییدا ڕێوڕەسمی واژووکردنەکە ئامادە بوو. شاندی کۆریای باکوور سەرنجڕاکێش بوو. هەموویان پێکەوە چەپڵەی بەهێزیان لێ دەدا، بەتایبەتی لەو کاتانەی کیم قسەیەکی گرنگی دەکرد، ئەوەش ڕێک پێچەوانەی شاندەکەی ئەمریکا بوو. ترەمپ چەند گفتوگۆیەکی ڕووبەڕووی کرد پێش ئەوەی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییە گەورەکە لە کاتژمێر چواردا دەست پێ بکات و ئەو بە شێوەیەکی چاوەڕوانەکراو ڤیدیۆ ناونووسینە سەربازییەکە پیشان بدات. گواستنەوەی هەواڵەکان نایاب بوو. پاشان بەرەو واشنتۆن بەڕێ کەوتین، ئەوەش گەورەترین ئارەزووی من بوو پێش ئەوەی شتێکی خراپ ڕوویدات. پاش کەمێک لە فڕینی ئەیرفۆرس وەن، ترەمپ پەیوەندی بە مونەوە کرد بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات، پاش ئەویش پەیوەندی بە ئابێوە کرد. پەمپەیۆ لە سەنگافوورە مایەوە و بڕیار بوو بچێت بۆ سیئۆل و پەکین و تۆکیۆ بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر لەسەر دیدارەکە بدات. ترەمپ بە مونی گوت شتەکان زۆر بە باشی بەرەوپێش چوون، پاشان هەردووکیان بە باشی باسی ئەوەیان کرد کە لە ئەنجامی دیدارەکەوە بەدەست هێنراوە. پاش ئەو قسانە ترەمپ لە مونی پرسی چۆن ڕێککەوتنەکە بخرێتە جێبەجێکردنەوە. ئەوجا هەمان ئەو قسەیەی دووپات کردەوە کە لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەشدا کردی، کە گوایە ٢٧ کاتژمێری تەواوە نەخەوتووە، من و کێلیش دەمانزانی ئەوە ڕاست نییە. مونیش هەروەک نوێنەرانی سیئۆل لە کاتی ڕاگەیاندنە گشتییەکاندا پێداگریی لەسەر ئەوە کردەوە کیم پابەند دەبێت بە وازهێنانی ناوکییەوە. ئابێ نەیویست خۆشییەکە لە ترەمپ تێک بدات و سوپاسی ترەمپی کرد، چونکە لە دیدارە دووبەدووەکەی کیمدا باسی بابەتی فڕێندراوەکانی ژاپۆنی کردبوو. ترەمپ گوتی باوەڕی وابووە کیم ڕێککەوتنی ویستووە و کاتی ئەوە بووە لە ڕێککەوتنێک نزیک ببینەوە.

منیش چەند پەیوەندییەکم کرد و لەگەڵ پێنسدا باسی "یارییە جەنگییەکانم کرد،" کە کۆمارییەکانی کۆنگرێس ڕەخنەیان لێ دەگرت. پەمپەیۆ کە بەهۆی کێشەیەکەوە لە فڕۆکەکەیدا لە سەنگافوورە گیری خواردبوو، گوتی ماتیس پەیوەندیی پێوە کردووە و زۆر نیگەرانی پاشەکشەکە بووە. من و پەمپەیۆ کۆک بووین لەسەر ئەوەی هەر کە گەیشتینەوە بە واشنتۆن دەبێت لەگەڵ ماتیس و دەنفۆرددا قسە بکەین و بزانین چیمان پێ دەکرێت هێشتنەوەی ئامادەیی ئەمەریکا لە ناوچەکە و ڕێگەنەدان بە پەکخستنی مەترسیداری چالاکییەکان. دەبوو هەڵوێستی ئێمە ئاوا بێت، "هیچ مەکە و تەنها دابنیشە،" هەتا دەگەیشتین بەوەی کردنی چی پێویستە. ئەو خاڵە پشتڕاست بوویەوە کاتێک لە نووسینگەکەی ترەمپ لە فڕۆکەی ئەیرفۆرس وەندا پێکەوە سەیری فۆکس نیوزمان دەکرد. پەیامنێرێک قسەی وتەبێژێکی ناونەهێنراوی پنتاگۆنی هێنایەوە کە گوایە پلاندانان بۆ چالاکییەکان هەروەک پێشوو بەردەوام دەبن، ئەو قسەیەش ترەمپی تەواو تووڕە کرد. ترەمپ داوای لە من کرد پەیوەندی بە ماتیسەوە بکەم و پێی بڵێم هەموو شتەکان ڕابگرێت، بەڵام من داوام لە میرا ڕیکاردێل کرد کە ئەویش لە فڕۆکەکەدا بوو و پێم گوت پەیوەندیی بەوانەی پنتاگۆنەوە بکات و پێیان بڵێت جارێ هیچ قسەیەک لەسەر ئەو بابەتە بۆ ڕاگەیاندنەکان نەکەن.

کەمێک پاش ٥:٣٠ خولەکی بەیانیی چوارشەممە کە دەیکردە ١٣ حوزەیران لە ئاندروز دابەزین و ترەمپ گەڕایەوە بۆ کۆشکی سپی. لە ڕێگای گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە تێبینیم کرد ترەمپ تویتێکی کردووە:

هەرئێستا دابەزیم، گەشتێکی درێژ بوو، بەڵام ئێستا هەمووان دەتوانن زۆر زیاتر لە یەکەم ڕۆژی بوون بە سەرۆکم هەست بە ئاسایش بکەن. چیتر کۆریای باکوور هەڕەشەی ناوکی نییە. دیدەنیکردنی کیم جۆنگ ئون ئەزموونێکی سەرنجڕاکێش و ئەرێنی بوو. چاوەڕێی داهاتوویەکی ڕۆشن لە کۆریای باکوور دەکرێت.

وەستاندنی نەبوو. ڕۆژی دواتر قسەم لەگەڵ یاچی و ژاپۆنییەکاندا کرد، پێم وابوو زۆر نیگەرانی ئەوەن زۆر شتمان بە کۆریای باکوور داوە و لە بەرامبەردا شتێکی وامان دەست نەکەوتووە. هەوڵم دا شتەکان بە هێمنی بهێڵمەوە، بەڵام دەرئەنجامی سەنگافوورە ئەوەندە ناڕوون بوو، پێویستی دەکرد شتەکان بهێنینەوە سەر ڕێڕەوی خۆیان بۆ ئەوەی جڵەوی ڕووداوەکانمان لەدەست دەرنەچێت. ژاپۆن و کۆریای باشوور سەریان لەو شێوازی گفتوگۆیە شێوابوو کە ترەمپ لەگەڵیاندا بەکاری هێنابوو، گوتبووی مون نزیکتر دەبێت لە ڕێککەوتنی ناوکی؟ چی لە مێشکی سەرۆکدا بوو؟ مون و ئابێ دەیانویست ئەوە بزانن. من و پەمپەیۆش ئەوەمان نەدەزانی، بەڵام هەردووکمان دڵنیا بووین لەوەی خودی ترەمپیش نازانێت. بە بۆچوونەکەی پێشترمدا دەچوومەوە، دەمپرسی بڵێی هەبوونی کۆریای باشوور لە بابەتی وازهێنانی ناوکیدا شتەکان ئەوەندە ئاڵۆز نەکات کە ببێتە هۆی لەناوچوونی سیاسەتی ڕێگریکردنی بەکارهێنانی ناوکی و ستراتیژیی ڕێلێگرتنمان لە ناوچەکە و لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

دەربارەی "یارییە جەنگییەکان" و شێوازی هەڵوێستیشمان دەربارەیان قسەم لەگەڵ ماتیسدا کرد. ماتیس گوتی هاوشانە کۆریای باشووری و ژاپۆنییەکانی پەیوەندیی پێوە دەکەن و نیگەرانن. شتێکیشی گوت کە من نەمبیستبوو، گوایە شەش مانگ لەوەوبەر ترەمپ خەریک بووە چالاکییە سەربازییەکان هەڵبوەشێنێتەوە، لەبەرئەوەی ڕووسیا و چین گلەییان لێ کردووە، ئەوەش شتێکی بێزارکەر بوو. دەنفۆرد ئەو چالاکییانەی هەژمار دەکرد کە بۆی هەبوو کاریگەرییان لێ بکرێت، ئێمەش قایل بووین بەوەی لە واشنتۆن یەک ببینین. بەڵام ماتیس وازی نەدەهێنا و دەیگوت دەیەوێت لێدوانێک بۆ ڕاگەیاندنەکان بدات. بە بۆچوونی من ماتیس هەرچییەکی بگوتایە بۆی هەبوو فەرمانێکی تری سەرۆکی بەدوای خۆیدا بهێنایە و بێگومانیش ماتیس ناوەڕۆکی فەرمانەکەی بەدڵ نەدەبوو. چ

پێویستی بەو مەترسیکردنە دەکرد؟ لەوانەیە لەبەرئەوەی ئەوە فێڵێکی بیرۆکراتیی وەزارەتی بەرگری بوویێت: ئەگەر بڕیارەکانی پنتاگۆن دەرئەنجامی چاوەڕواننەکراوی لە کۆنگرێسدا هەبوایە، ئەوا دەیتوانی خۆی لە هەر بەرپرسارییەتییەک لە بابەتی زیانگەیاندن بە ئامادەیی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆریا خۆپارێزی بکات. بەڵام ئەوە ستراتیژییەکی مەترسیدار بوو. چونکە دەکرا ترەمپ زیاتر جەخت لە قەدەغەکردنی چالاکییەکان بکاتەوە. پاش کۆششێکی زۆر، ماتیس قایل بوو بەوەی وەزارەتەکەی بە بێدەنگی بمێنێتەوە.

ڕۆژی دووشەممە ١٨ی حوزەیران من و پەمپەیۆ و ماتیس بۆ خوانی بەیانی یەکترمان بینی. دەنفۆرد لیستی ئەو چالاکییانەی تەواو کردبوو کە دەکرا بڕیاری قەدەغەکردن بیانگرێتەوە. ماتیس گوتی ئامادەیی هێزەکانی ئەمریکا لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی هەر چالاکییەکدا کەمتر دەبێتەوە، هەروەها بە تێپەڕینی کاتیش کەمبوونەوەکە خێراتر دەبێت. هەموومان نیگەرانی ئامانجە نزیک و دوورمەوداکانی هێشتنەوەی ئامادەیی هێزەکانی ئەمریکا بووین لە کۆریا. کاتێک کاتی گۆڕانکاری لە پلەی ئەفسەرەکاندا دەهات و کەسانی نوێ جێی کەسە بەئەزموونەکانیان دەگرتەوە، کاریگەریی نەبوونی چالاکییە سەربازییەکان زیاتر دەبوو. ئەم گفتوگۆیە ڕۆژی یەکی ئەیلوولی کردبوویە ڕۆژێکی گرنگ.

ماتیس نیگەرانی هەڵوەشاندنەوەی ژمارەیەکی کەمی چالاکی و تووڕەیی ترەمپ بوو، بەڵام من پێم وابوو بێواتایە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکان هەڵبوەشێنینەوە، چونکە ئەوە دەبووە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی ناپێویست لەگەڵ کۆمارییەکانی ڕۆژنامەی هیڵدا و شتەکانی خراپتر دەکرد. لە کۆتاییدا بڕیارمان دا پنتاگۆن وەستاندنی دوو گەورەترین چالاکیی سەربازیی ساڵانە ڕابگرێت. پێمان وابوو وشەی "ڕاگرتن" زۆر گرنگە، چونکە هەڵوەشاندنەوە نییە. هەرچۆنێک بێت، ئەوەمان بیر بوو کە

چینییەکان لە پەکین پێشنیاریان بۆ پەمپەیۆ کردبوو لە ماوەی دوو مانگی داهاتوودا، فشاری تەواو لە پیۆنگ یانگ بکەین بۆ بەرەوپێشچوونی پرۆسەکە، بۆیە ڕۆژی ١ی ئەیلوولمان دیاری کرد بۆ خەملاندنی ئەوەی ئایا دانوستانەکان بەرهەمدار بوون یان نا؟!

ترەمپ لە ماوەی یەکەم هەفتەی پاش سەنگافوورەدا زۆر دڵخۆش بوو. ڕۆژی هەینی لە کاتی چاوپێکەوتنێکدا بۆ پێدانی زانیاریی سەربازی و سیاسی ترەمپ گوتی: "ئەگەر هێشتا ماکماستەر و تیلەرسۆن هەبوونایە نەمدەتوانی ئەمە بکەم. پەمپەیۆ کارەکانی بە نایابی بەڕێوە دەبات، ئەم پیاوەش بە هەمان شێوە". دەستی بۆ من ڕاکێشا. ئەو دڵخۆش بوو بەوەی چیتر یاریی جەنگی نامێنێت و گوتیشی دڵخۆشە بەوەی لە هەوڵەکانی پێشتریدا ڕەتکراوەتەوە، چونکە ئەگەر وا نەبووایە "هیچی نەدەبوو بێبەرامبەر بیبەخشێت!" ترەمپ کاتێک بیری لە نیگایەکی بێزار و توندی کیم دەکردەوە بۆ یەکێک لە بەرپرسەکانی، گوتی کیم جۆنگ ئون جۆرێک لە دڕندەیی تێدا بووە و دەکرێت بێبار بێت. ترەمپ هەندێک تێبینی و وێنە و وتاری ڕۆژنامەی بۆ کیم جۆنگ ئون واژوو کرد، بۆ ئەوەی ئەو دیدارە درەوشاوەیەی سەنگافوورە لەیاد نەکات؛ دیدارەکە بە ئاسانی لە خەیاڵی من دەرنەدەچوو.

لە کۆتایی حوزەیراندا ترەمپ ئاماژەی بە خاڵێکی گرنگ کرد کە بەڵگە بوو لەسەر دوورکەوتنەوەی ئەمریکا و مون جای ئیم لە یەکتری، ئەوەش ئێمەی نیگەران کردبوو. ترەمپ لە تەماشاکردنی هەڵوێستەکانی مونەوە تێگەیشتبوو بەرنامەی مون جیاوازە لە بەرنامەی ئێمە، ئەوەش ڕوونە چونکە هەموو حکوومەتێک بەرژەوەندیی نەتەوەکەی خۆی دەخاتە پێشەوە. بەلای مونەوە بەرژەوەندیی نەتەوەکەی لە جەختکردنەوەدا بوو لەسەر پەیوەندیی دوو کۆریاکە لە بابەتی وازهێنانی ناوکیدا. لەوەش زیاتر، ترەمپ دەیویست پێش هەڵبژاردنی کۆنگرێسی ٢٠١٨ هەواڵی خۆش لە

کۆریای باکوورەوە ببیستێت. ئەو بەڕادەیەک چاوەڕێی هەواڵی خۆش بوو کە داوای لە باشوور کرد چیتر هێندە پێداگریی لەسەر یەکگرتنەوە نەکەن، چونکە ئامانجی سەرەکیی ئەمریکا وازهێنانی ناوکی بوو. وازهێنانی ناوکی هەمیشە بەلای ئەمریکاوە لەپێشینە بووە. ترەمپ بە خەیاڵی خۆی ئەو کێشەیەی چارە کردبوو، ئەوەش وای لە ئێمە کردبوو وریا بین لەوەی بە تەواوەتی چاومان لەسەر بابەتەکە لابچێت.

نیگەران بووم پێش هەڵبژاردن ترەمپ تەنها بە بیستنی هەواڵی خۆش قایل بێت، ئەوەش شتێکی نامسۆگەر بوو. نیگەرانی ئەوەش بووم پەمپەیۆ نەیەوێت ببێتە گەیەنەری هەواڵە خراپەکان، ئەو ڕۆڵەش بە پاشەکشەکردن بۆ کۆریا لەکۆڵ دەکرایەوە.

بۆ خێراکردنی دیپلۆماسی لەگەڵ کۆریای باکووردا، پەمپەیۆ ڕۆژی ٦ی تەمموز گەڕایەوە بۆ پیۆنگ یانگ. نیگەران بووم بیرۆکراسیەتی وەزارەتی دەرەوە ئەوەندە خۆشحاڵ بێت بەوەی دانوستانەکان بەردەوامن، هەروەک گفتوگۆ شەش لایەنییەکان لەگەڵ هەر دیدارێکدا کۆمەڵێک پاشەکشە بکەن. هەرواش بوو، وەزارەتی دەرەوە پێش دیدارەکان نەخشەی پاشەکشەکردنیان بۆ شاندی ئەمریکا دادەنا. جەختم لە پەمپەیۆ کردەوە هەتا پیۆنگ یانگ نەیسەلمێنێت بە تەواوەتی پابەندە بە وازهێنانی تەواو لە بەرنامە ناوکی و مووشەکە بالیستیکییەکان، نابێت هیچ دانوستانێکی جددیان لەگەڵدا بکەین. بۆ جڵەوکارانی چەک سەرکەوتنی ئەوە یەکەمین هەنگاو بوو. دەبوو دانوستانکاران بەراوردی بانگەشەکە و توانای چەکداریی لایەنی بەرامبەر بکەن، چونکە بە کردنی ئەو بەراوردە ڕوون دەبوویەوە دانوستانەکان چەندێک جێی متمانەن، لەم دۆسیەیەی کۆریای باکووریشدا ڕوونی دەکردەوە ئایا ئەوان تا چ ڕادەیەک بە وازهێنانی ناوکییەوە پابەندن. ئەگەر وڵاتێک لە خەمڵاندنی توانای ناوکیی خۆیدا ڕاستەقینەی نەگوتایە، ئەوا دەبوو دانوستانەکان جددی نەبن. من زۆرجار

گوتوومە: "بە پێچەوانەی زۆرینەی خەڵکەوە، باوەڕم بە کۆریای باکوور هەیە. ئەوان هەمیشە ئەوە دەکەن کە چاوەڕێی دەکەم." ئەوەشم بە پەمپەیۆ گـــوت کە شـــارەزایانی ئەنجـــوومەنی ئاســـایش و شـــارەزایانی بەرەنگاربوونەوەی پەرەپێدانی ناوکی لە کۆمەڵگای هەواڵگری لەسەری کـــۆک بـــوون: ئەگەر کۆریـــای بـــاکوور لە لەنـــاوبردنی چەکە کۆمەڵکوژەکانیدا جددی بوونایە، ئەوا بە خێرایی دەستیان بە چەکداانان دەکرد و ئەوەش کەمتر لە ساڵێکی پێ دەچوو (تاقیکردنەوەیەکی تری جددیبوونی کۆریای باکوور). کارمەندانی وەزارەتی دەرەوە کاتێکی زۆر درێژتریان دەویست بۆ چەکدااانی کۆریای باکوور، ئەوەش تووشی کێشەی دەکردین. پەمپەیۆ دڵی بە بیرۆکەی وازهێنانی ناوکیی خێرا و یەکسەری خۆش نەبوو، لەوەیە نیگەرانی ئەوە بووبێت کۆریای باکوور ڕەتی بکاتەوە و ئەوەش یەکسانە بە هەواڵی ناخۆش بۆ ترەمپ کە نەیدەویست پێش هەڵبژاردن هیچ هەواڵێکی ناخۆش ببیستێت؛ لەو ڕوانگەیەوە تەواوی بیرۆکەکە بۆ پەمپەیۆ ناهەموار بوو.

پەمپەیۆ لە چواری تەمموزدا بەرێ کەوت بۆ پیۆنگ یانگ. ئەو شەوە لە مۆڵی ئەمریکاوە یاریی ئاگربنیان هەڵدەدا بە بۆنەی پێشوازیکردنی نەریتییەوە لە باڵیۆزە دەرەکییەکان و پەمپەیۆش لە بینای وەزارەتی دەرەوە چاوی لێیان بوو. ئێوارەی ڕۆژی هەینی (بە کاتی کۆریا بەرەبەیانی هەینی) پەیوەندی بە واشنتۆنەوە کرد بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ ترەمپ و کێلی و مندا بکات. پەمپەیۆ گوتی پێنج کاتژمێری لە دوو دیداری جیادا لەگەڵ کیم یۆنگ چۆلدا تێپەڕاندووە، کە هەردووکیان "نائومێدکەر" بوون و هیچ بەرەوپێشچوونێکیان تێدا نەبووە. پەمپەیۆ بۆ ڕۆژی شەممە دیداری تری هەبوو و کاتژمێر پێنج و چارەکی ئێوارە پەیوەندی کردەوە بۆ ئەوەی هەواڵ بدات کە کیم یۆنگ چۆلی بینیوە، نەک کیم جۆنگ ئون، ئەوەش دەریدەخست کۆریای باکوور دەیەوێت قسە لەگەڵ کێدا بکات. (پاش

چەند ڕۆژێک چونگی کۆریای باشوور پێی گوتم ئەوانیش سەرسام و نائومێد بوون لەوەی پەمپەیۆ چاوی بە کیم جۆنگ ئون نەکەوتووە.) پاش ئەوەی پەمپەیۆ پیۆنگ یانگی جێ هێشت، کۆریای باکوور گوتیان، "دیدارەکان پەشیمانکەرەوە بوون و بە شێوەیەکی نالاوەکی و مافیایانە داوای وازهێنانی ناوکییان کردووە." خەونی هەواڵە باشەکان لەناو چوون. پەمپەیۆ گوتی کۆریای باکوور پێش وازهێنانی ناوکی "گەرەنتیکردنی ئاسایش"ی ویستووە، هەروەها پاش کۆتاییهاتنی وازهێنانی ناوکی پشتڕاستی دەکەنەوە نەک پێشی، ئەوەش واتای ئەوە بوو ڕاگەیاندنێکی بنچینەیی نابێت و بەراوردی پێش و پاشی وازهێنانی ناوکی ناکرێت. بە بۆچوونی من ئەوە پەکخستنی دانوستانەکان بوو و ڕێگایەکی باشی دەستپێکردن نەبوو.

ترەمپ هاوڕا بوو و زیرەکانەترین قسەی خۆی لەسەر پیۆنگ یانگ کرد لەو چەند مانگەدا، "متمانە ئاوا دروست ناکرێت، ئەمە هەتا بڵێی بێواتایە." پەمپەیۆ گوتی: "هەموو ئەمانە کۆششن بۆ لاوازکردنی سزاکان و لە تاکتیکێکی دواخستنی زۆربەکارهێنراو زیاتر هیچ نین." قسەکەی تەواو بوو. پەمپەیۆ ویستی هەواڵێکی خۆش بدات و ئاماژەی بە دێڕێکی ڕاگەیاندنەکەی کۆریای باکوور کرد کە گوایە کیم جۆنگ ئون "هێشتا متمانەی بە سەرۆک ترەمپ هەیە." لە پەیوەندییەکەی ڕۆژی هەینی و ئەوەی ڕۆژی شەممەشدا ترەمپ پرسیی: "چین چ کاریگەرییەکی لەسەر کۆریای باکوور هەبووە؟" پەمپەیۆ کاریگەریی چینی بچووک کردەوە، لە کاتێکدا ترەمپ ئەوەی زۆر بە گرنگ دەزانی. پێم وابوو خەمڵاندنەکەی پەمپەیۆ وردتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خراپ نەبوو چاودێریی ڕۆڵی چین بکرێت. پاشان ترەمپ باسی ئەوەی کرد کە تێناگات بۆچی جەنگی کۆریامان کردووە و هێشتاش سەربازی زۆرمان لەوێ هەیە، باسی یارییە جەنگییەکان هەر مەکە. ترەمپ گوتی: "چیتر گەمژە نابین." دەربارەی

کۆریای باکووریش قسەیەکی زۆر ڕاستی کرد، "ئەمە کاتکوشتنە. ڕوونە نایانەوێت واز لە بەرنامە ناوکییەکەیان بهێنن." وا دیار بوو ترەمپ نەیدەزانی پەمپەیۆ چاوی بە کیم جۆنگ ئون نەکەوتووە، بۆیە لێی پرسی: ئایا ئەو سیدیی فیلمی "ڕۆکێتمان —مووشەکەوان-ی ئێلتۆن جۆنی داوە بە کیم کە ترەمپ خۆی واژووی کردووە، دیار بوو پێی نەیدابوو. بۆ ماوەی چەند مانگێک گەیاندنی ئەو سیدییە بە دەستی کیم جۆنگ ئون کارێکی لەپێشینە بوو. پاش ئەو پەیوەندییە پەمپەیۆ پەیوەندییەکی تایبەتی پێوە کردم دەربارەی ئەوەی چۆن قسە لەگەڵ ڕاگەیاندنەکانی ژاپۆن بکات، چونکە بۆ پڕکردنەوەی سووتەمەنی فڕۆکەکەی لەوێ وەستابوو. تاکە ڕەفتاری کۆریای باکوور کە منی سەرسام کردبوو، ئەوە بوو چۆن ئاوا بەخێرایی پاش دیداری سەنگافوورە قورس و ئەستەم بووبوون. کاتیان نەدەکوشت.

ڕوون بوو ترەمپ دەیویست هەواڵە خراپەکە کپ بکات بۆ ئەوەی لە ناوەڕاستی کەمپینەکەی کۆنگرێسدا ئاشکرا نەبێت، بە دیاریکراویش لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەک لەسەر جددیبوونی کۆریای باکوور نەبوو لە بابەتی وازهێنانی ناوکیدا. بۆیە لەجیاتی باسکردنی ئەوە، ئاماژەی بەوە دا کۆریای باکوور چەکی ناوکی و مووشەک تاقی ناکاتەوە. هەوڵم دا ڕوونی بکەمەوە ئەو دواخستنە لە بەرژەوەندیی کۆریای باکووردایە، وەک چۆن هەمیشە دواخستن لە بەرژەوەندیی وڵاتی پەرەپێدەردایە. بە ئەگەرێکی زۆر، لەبەرئەوەی کۆریای باکوور دەیانزانی بۆ ساتی ئێستا بەرنامەی تاقیکردنەوەی چەکەکانیان ئامانجی خۆی پێکاوە، چەک و مووشەک و پێگەی بەرهەمهێنانەکانی دەگواستەوە بۆ شوێنی سەلامەتتر و نهێنیتر، هەروەک چۆن بۆ چەندین دەیە شوێنەکانیان وەها بوو، پاشان درێژەیان بە بەرهەمهێنانی چەک دەدا. ئەوە ڕوانینی ژاپۆن بوو و یاچیش لە پەیوەندییەکیی تەلەفونی ٢٠ی تەمووزدا ئەوەی لێ دووبارە کردمەوە. لەوانەش بوو هەندێک لە کەرەستەکانیان لە وڵاتی تر هەڵگرتبێت. ئەوە

ترەمپی بێزار نەدەکرد و ئەو دەیگوت، "ئەوان چەندین ساڵە ئەوە کاریانە." بێگومان ئەوە ڕاست بوو و کرۆکی کێشەکەش بوو. بەڵام ئەو دیسانەوە نارێکیی نێوان بەرنامەکەی ئێمە و بەرنامەکەی کۆریای باشووری بینی، بۆیە بڕیاری دا هەتا کۆریای باشوور پشتڕاستی نەکاتەوە سزاکانی سەر کۆریای باکوور جێبەجێ دەکات، دژی واژووی ڕێککەوتنی KORUS بێت. لەوەیە ترەمپ باوەڕی وابووبێت دەتوانێت بۆ مامەڵەکردن کەڵک لە KORUS وەربگرێت و بۆ ماوەیەکی کەمیش واژووکردنی ڕێککەوتنەکە دواکەوت، بەڵام لە کۆتاییدا لە ٢٤ی ئەیلوولی ٢٠١٨ واژوو کرا. بەڵام نەشدەکرا بۆ ماوەیەکی درێژ مەترسییەکانی کۆریای باکوور پشتگوێ بخەیت، بە تایبەتیش کاتێک کە ترەمپ باوەڕی وابوو چین لە پشت یاخیبوونەکەی کۆریای باکوورەوەیە. لەوانەیە وای بیرکردبێتەوە دەتوانێت کێشە بازرگانییەکان لەگەڵ چیندا چارە بکات و بە کردنی ئەوەش هەموو شتەکان باش دەبنەوە. ئەگەر وای بیر کردبێتەوە لە خەون و خەیاڵدا بووە.

لە ڕۆژی هەینی، ٢٧ی تەمموز، کۆبوونەوەیەکم ڕێک خست بۆ تاوتوێکردنی ئەوەی لە پاش سەنگافوورەوە ڕوویدابوو، کەسیش نەبوو بڵێت شتێکی وا ڕوونەداوە. پەمپەیۆ جەختی کردەوە کۆریای باکوور هیچ هەنگاوێکی دیاری بەرەو وازهێنانی ناوکی هەڵنەگرتووە و ئەگەری سەرکەوتنی پرۆسەکە سفرە. ڕێک هەمان بۆچوونم هەبوو. کۆڕاییی هەبوو لەسەر توندکردنی سزاکان بە چەندین شێواز: دیپلۆماسی، ئابووری، هەروەها سەربازییانە. نە ماتیس و نە پەمپەیۆ و نە منیش باسی ١ی ئەیلوولمان نەکرد، بەڵام چاک بیرم بوو تەنها پێنج هەفتەی مابوو.

هەڵوێست و ڕوانینی کۆریای باکوور جیاواز بوو. کیم لە سەرەتای ئابدا یەکێک لە نامە خۆشەویستییە ناودارەکانی خۆی بۆ ترەمپ نارد و تیایدا ڕەخنەی لەوە دەگرت کە لە پاش سەنگافوورەوە بەرەوپێشچوون نەبووە و پێویستە ئەو دوانەیان بەزوویی یەکتر ببینن. من و پەمپەیۆ هاوڕا بووین

لەسەر ئەوەی دەبێت هەرچۆنێک بووە ڕێگا بە دیداری وا نەدرێت، بە تایبەتیش پێش هەڵبژاردنەکەی تشرینی دووەم. کێ دەیزانی ترەمپ لەژێر فشارێکی وەها بەهێزی سیاسیدا چ پاشەکشەیەک دەکات؟!

هەردووکیشمان هاوڕا بووین لەسەر ئەوەی باشترین وەڵام بۆ نامەکە گوتنی ئەوەیە کە پەمپەیۆ ئامادەیە سەردانی پیۆنگ یانگ بکاتەوە. بەڵام کاتێک نامەکەم پیشانی ترەمپ دا و پێشنیارەکەی خۆم و پەمپەیۆم بۆ باس کرد، ئەو یەکسەر گوتی: "دەبێت کیم جۆنگ ئون ببینم، پێویستە بانگی بکەین بۆ کۆشکی سپی!" ئەوە کارەساتێکی سیاسی بوو و کاریگەریی زۆر بەرفراوانی دەبوو. پێشنیارم کرد لەجیاتی بانگردنی ئەو بۆ کۆشکی سپی، دەکرێت مانگی ئەیلوول لە کرانەوەی کۆڕی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە نیویۆرک یەکتر ببینن، بەڵام ترەمپ قبووڵی نەدەکرد: "نابێت، ئەوێ زۆر قەرەباڵغە و شتگەلێکی زۆریشی لێ دەگوزەرێت." لەو کاتەدا ئەوانی تریش هاتن بۆ نووسینگەی هێلکەیی، کێڵیشیان تێدا بوو و کە چرپاندم بە گوێیدا، "نابێت بە هیچ جۆرێک کیم ببینێت." کێڵی بە تەواوەتی هاوڕا بوو. پەمپەیۆ کە لە ئاسیا بوو پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ پەیوەندیی کرد و بابەتەکەم بۆ باس کرد. ئەو گوتی: "خۆزگە ڕووخسارتم دەبینی ئەوکاتەی سەرۆک گوتوویەتی دەیەوێت کیم بهێنێت بۆ کۆشکی سپی!" گوتم ئەو سەردانە زۆر ئەستەمە، چونکە دەبێت پێشتر بەسەر لاشەی مندا بڕۆن. ترەمپ ئەو عەسرە تویتێکی بۆ کیم کرد، "سوپاس بۆ نامە جوانەکەت، چاوەڕێی دیدارتم." ئەوە بڕێک چاوەڕواننەکراو و مەترسیدار بوو، بەڵام هەرچۆنێک بێت ڕۆژی دواتر نامەیەکمان بە ترەمپ واژوو کرد کە تیایدا پێشنیاری سەردانی پەمپەیۆمان دەکرد بۆ کۆریای باکوور. ترەمپ گوتی بیرۆکەکەی بەدڵ نییە و بە سووکایەتی دەزانی بەرامبەر بە کیم. کاتێک لە خوارەوەی نامەکە نووسی: "چاوەڕێی دیدارتم". گوتی: "لەمەدا هاوڕای تۆ و پەمپەیۆ نیم. ئەمە کارێکی دادپەروەرانە نییە بەرامبەر بە کیم. هیوادارم ئەمە شتەکان نەشێوێنێت." لانی کەم واژووی کرد.

سەرەڕای پلانەکان بۆ سەردانەکەی پەمپەیۆ بۆ کۆریای باکوور، لە کۆتایی

ئابدا کاتێک پەمپەیۆ نزیک بووبوویەوە لە جێهێشتنی ئەمریکا، کۆریای باکوور پەمپەیۆیان ئاگادار کردەوە لە سەردانەکەیدا کیم جۆنگ ئون نابینێت، هەروەها ئەگەر پێشنیاری تەواو نوێشی پێ نییە باشترە نەیەت، وەک پێشنیاری ڕاگەیاندنی کۆتایی جەنگ. زۆر بەسادەیی ئاگاداریان کردینەوە وازهێنانی ناوکی لە بەرنامەکەدا نییە، بەڵام پەمپەیۆ ویستی هەڕەشەکە پشتگوێ بخات، بۆیە بە تویتێک گوتی چاوەڕێ دەکات لە سەردانەکەیدا چاوی بە کیم جۆنگ ئون بکەوێت. ئەوەی چاوەڕوانەکراو بوو ئەوە بوو ترەمپ گوتی پێویست ناکات پەمپەیۆ سەردانی کۆریای باکوور بکات. پەمپەیۆ و پێنس وەڵامیان دایەوە و پێداگرییان لەسەر سەردانەکە کرد، بەڵام ترەمپ سوور بوو لەسەر ناردنی پەیامەکە بە شێوازێکی تر. ئەو وەک هەمیشە شێوازی ئاسوودەیی تویتەری پەسەند کرد و دەستی بە نووسینی تویتەکە کرد. ترەمپ لە منی پرسی، "جۆن، تۆ دەڵێیت چی؟" یەکسەر وەڵامم دایەوە، "هاوڕام. بە هیچ جۆرێک نابێت مایک پەمپیۆ بچێت بۆ پیۆنگ یانگ کاتێک ئەوە هەڵوێستی ئەوانە." پێنس هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی دەبێت هێز پیشان بدەین نەک لاوازی. زۆری پێ نەچوو ترەمپ تویتەکانی کرد:

داوام لە مایک پەمپەیۆ کرد لە ئێستادا سەردانی کۆریای باکوور نەکات، چونکە هەست دەکەم بەرەوپێشچوونی باشمان لە بابەتی وازهێنانی ناوکیدا نەکردووە و نایکەین...

هەروەها لەبەرئەوەی دۆخێکی ناهەمواری بازرگانیمان لەگەڵ چیندا هەیە، باوەڕم وا نییە ئەوان وەک پێشوو لە پرۆسەی وازهێنانی ناوکیدا ڕۆڵیان هەبێت (سەرەڕای ئەوەی سزاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەجێی خۆیاندان)...

🐦 پەمپەیۆ پێی خۆشە لە داهاتوویەکی نزیکدا سەردانی کۆریای باکوور بکات، بە تایبەتی پاش چارەکردنی پەیوەندییە بازرگانییەکانمان لەگەڵ چیندا. لە هەمان کاتدا گەرمترین سڵاو و ڕێز بۆ سەرۆک کیم دەنێرم. چاوەڕێی دیداری دەکەم!

بوژامەوە. خۆمان لە فیشەکێکی تریش وەلانا. پاش کەمێک لە تویتەکان قسەم لەگەڵ پەمپەیۆدا کرد و گەیشتبوو بەو قەناعەتەی بڕیارەکەی ترەمپ ڕاست بووە. خودی ترەمپ پاش چەند ڕۆژێک گوتی: "دەبێت سزاکان لە ئەوپەڕی بەهێزیدا بن. بواری هەناسەشیان بۆ مەهێڵنەوە. سزای زیاتر بخەنە کار."

ترەمپ هێشتا لای بابەت بوو بزانێت شیی جینگ پینگی چین چی بە کیم جۆنگ ئون دەڵێت، منیش پێم گوت دڵنیابە شتی باشی پێ ناڵێت. پەڕەیەکی نووسراوی خۆمم بە ترەمپ دا کە خەملاندنی خۆم بوو بۆ ئەوەی دەکرێت جین پینگ بە کیم جۆنگ ئونی بڵێت. ئەو پەڕەیەم بەپێی ئەزموونی چەند ساڵەی خۆم لەو بابەتانەدا نووسیبوو. هەموو شتێکی ترم تاقی کردبوویەوە، بۆیە باوەڕم وابوو هیچم نییە لەدەستی بدەم. ترەمپ نووسراوەکەی خوێندەوە، بەڵام کاردانەوەی نەبوو. هیچ نەبێت دۆخەکەی لە ڕوانگەی منەوە بینی. خەملاندنی من بۆ گوفتارەکانی شیی جینگ پینگ بۆ کیم بەم شێوەیە بوو:

"تەماشا بکە کیم، ترەمپ هەرچەندێک نامەی جوانت بۆ بنووسێت هێشتا هەر ناتوانیت متمانەی پێ بکەیت. ئەو هەروەک هەموو بازرگانە سەرمایەدارەکانی تر نیازی هەیە بتدۆشێت. تێنەکەویت. ترەمپ دەیەوێت کۆریای باکوور وەک کۆریای باشوور لێ بکات. ترەمپ و پەمپەیۆ و بۆڵتن هیچ جیاوازییان نییە و هەموویان وەک یەکن. تەنها بە ڕواڵەت جیاواز دەردەکەون بۆ ئەوەی فریوت بدەن. ئەوان پێشبینینەکراون و بۆچوون دەگۆڕن، هەروەها جێی متمانە نین. لەوەش زیاتر، موون جای

ئینیش وەک ئەوان بیر دەکاتەوە، بەڵام ئەو خراپترە. ئەو ئاشتیخوازە. دەتوانین مون پێشێل بکەین، بەڵام ئەمریکییەکان لە هێز تێدەگەن.

لەبەر ئەوە پێویستە لەگەڵ مندا بیت. ئەوە تاکە ڕێگایە بۆ ئەوەی درێژە بە بەرنامە ناوکییەکەت بدەیت و یارمەتیی دارایی وەربگریت، هەروەها بە بەهێزییش بمێنیتەوە. ئەگەر مل بۆ دانوستانەکان بدەیت بەزوویی لەناو دەچیت. گەرەنتی ئەوە دەکەم.

هەموو ئەوەی لەسەرتە شاردنەوەی چەکە ناوکییەکان و مووشەکە بالیستیکییەکانتە. هاوڕێکانمان لە ئێران درێژە بە تاقیکردنەوەی مووشەکەکانت، دەدەن وەک چۆن بۆ ماوەی دوو دەیە ئەوەیان کردووە. لە بەرامبەردا، دەتوانێت لە بنکە ژێرزەمینییە شاراوەکاندا گوللەتۆپی ناوکی دروست بکەیت. نەوتی زیاتری ئێرانی دەکڕم و لەوێ بازرگانی دەکەم و قەرەبووی سزاکانی ئەمریکا دەکەمەوە. پاش ئەوە ئێران بە گوێی من دەکات.

"بەردەوام تەرمی سەربازە ئەمریکییەکانی جەنگی کۆریا بۆ ئەمریکا بگەڕێنەرەوە، بۆ ئەوەی فریویان بدەیت. ئەوان لەو شتانەدا هەستیان دەبزوێت. هەمان کار لەگەڵ ژاپۆنیشدا بکە. جەستەی ئەو کەسانەیان بۆ بنێرەوە کە باوکت فڕاندبوونی. ئابێ لەبەر کامێرادا دەگری و بە جانتا دۆلارت بۆ دەنێرێت.

لە ئێستادا جەنگێکی بازرگانیم لەگەڵ ترەمپدا هەیە. ئەو زیان بە ئابووریی چین دەگەیەنێت، ئەگەر درێژەش بەم جەنگە بازرگانییە بدات، زیانی گەورەمان پێ دەگەیەنێت. خۆشبەختانە ترەمپ ئامۆژگاریکەری وۆڵ ستریتی زۆرە کە هەموویان وەک موون جای ئین و زۆرینەی ئەمریکییەکان کورتبینن. هەندێک سۆیا و هەندێک تەکنەلۆژیایان لێ دەکڕم (کە دواتر دەیاندزم و بە نرخی هەرزانتر دەیفرۆشمەوە بە کڕیارەکانیان)، ئەوجا پاشەکشە دەکەن.

کاتێک مانگی داهاتوو یەکمان بینی، ڕوونکردنەوەی زیاترت دەدەمێ. هەروەها یارمەتیگەلێکیشت پێشکەش دەکەم کە ژاپۆنیش نەتوانێت شتی وا بکات. هیچ سزایەکی یوئێن پێشێل ناکەم، چونکە پێویست ناکات. ئەو یارمەتییانەت دەدەم کە سزاکان قەدەغەیان ناکەن، ئاگاشم لە چاودێریی سەرسنوور دەبێت و نایەڵم زۆر لە بابەتەکە تێبگەن. کێشەت نابێت. نەک هەر پێویست ناکات دەستبەرداری چەکەکانت ببیت، بەڵکو بەزوویی کۆریای باشوور وەک میوەی پێگەیشتوو دەکەوێتە بەر پێت.

جۆنگ ئون دووربین بە. تۆ دەتەوێت لەپاڵ لای سەرکەوتووی مێژوودا بیت، ئەوەش چینە. ئەمریکییەکان هاوڕێی ئێمە نین."

لە ٢٩ی ئابدا، بە هەر هۆکارێک بێت ماتیس و دەنفۆرد کۆنگرەی ڕۆژنامەوانیی کارەساتباریان گرت، کە لەژێر ڕۆشنایی وەستاندنی یارییە جەنگییەکاندا پرسیاری ئامادەیی هێزەکانی ئەمریکایان کرد لە کۆریا. ئەو وەڵامێکی درێژ و شێواوی دایەوە، کە لە ناوەڕۆکدا جیاڕایی پێوە دیار بوو لەگەڵ ترەمپدا. ئەوە ترەمپی تووڕە کرد، بۆیە دەستی کرد بە قسەکردن لەسەر هەڵەبوونی ماتیس و جەنەراڵەکان و یارییە جەنگییەکان. گوتم ماتیس هەوڵ دەدات شێواوییەکە چاک بکاتەوە، بەڵام ترەمپ ویستی تویت بکات و کردیشی:

🐦 گوفتارێک لە کۆشکی سپییەوە: سەرۆک دۆناڵد ترەمپ هەست دەکات چین فشارێکی گەورە دەخاتە سەر کۆریای باشوور، چونکە

🐦 کێشەی بازرگانیمان لەگەڵ حکومەتی چیندا هەیە. لە هەمان کاتدا، چاکیش دەزانین چین یارمەتیی کۆریای باکوور دەدات و پارە و سووتەمەنی و زۆر شتی تریان بۆ دابین دەکات...

🐦 ئەوە هیچ یارمەتیدەر نییە! لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆک باوەڕی وایە کیم جۆنگ ئون زۆرباش و گەرموگوڕە، هەروەها هیچ هۆیەک نییە بۆ ئەوەی

لە ئێستادا پارەیەکی زۆر لە یارییە جەنگییەکانی ئەمریکا-کۆریای باشووردا سەرف بکەین...

هەروەها، ئەگەر سەرۆک بیەوێت دەتوانێت لە هەر ساتێکدا چالاکییە سەربازییە هاوبەشەکان لەگەڵ کۆریای باشوور و ژاپۆندا دەست پێ بکاتەوە. ئەگەر ئەوە بکات، ئەوا زۆر لەوانەی پێشتر گەورەتر دەبن. دەربارەی ناکۆکییە بازرگانییەکان و جیاوازییەکانی تری ئەمریکا و چینیش، لە داهاتوودا سەرۆک ترەمپ و شیی جینگ پینگی سەرۆکی گەورەی چین چارەیان دەکەن. پەیوەندیی نێوان ئەوان بەهێزە و واش دەمێنێتەوە.

ئەوەم بە پێکەنیناوی زانی، بەڵام پێگەکانی ئێمەی بچووک نەکردەوە. بە پێوەرەکانی کۆشکی سپی لە سەردەمی ترەمپدا، ئەمە سەرکەوتن و ڕۆژێکی باش بوو. ڕۆژی داهاتوو چین ڕەخنەی لە تویتەکان گرت، بەرەوپێشچوونی زیاتر بە بۆچوونی من. ماتیس لە خوانە هەفتانەکامدا لە ڕۆژی ٣٠ی ئابدا بە من و پەمپەیۆی گوت پەشیمانە لەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەی بووەتە هۆی ئەمانە، منیش پێم وانەبوو بۆ ماوەیەکی درێژ کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی بگرێتەوە.

مون و ترەمپ لە ٤ی ئەیلوولدا قسەیان کرد. ترەمپ گلەیی لەوە کرد کە لە سەنگافوورە دیدارێکی نایابی هەبووە و هاوڕێیەتییەکی باشی لەگەڵ کیمدا دروست کردووە، کەچی ئێستا لەناکاو ڕێککەوتن نەماوە. دەیپرسی دەبێت چی ڕوویدابێت! بێگومان سەنگافوورە نایاب نەبوو، مەگەر بۆ کۆریای باکوور؛ کیم جۆنگ ئون لەگەڵ دوژمنەکانیدا نەدەبووە هاوڕێ؛ هەروەها ڕێککەوتنیش بوونی نەبوو. لەوە بەدەر... مون هێشتا هەر ئاوازی سیاسەتەکانی دەرەوەی دەخوێند و دەیگوت کیم بە تەواوەتی پابەندە بە پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەمریکا و لە بابەتی وازهێنانی ناوکییشدا بە هەمان شێوەیە، بەڵام کیم یۆنگ چۆل و ئەوانی تر ئاوا توندیان

کردووە، ئەوەش خەملاندنێکی سەرنجڕاکێش بوو. مون پێشنیاری کرد ترەمپ و کیم بەزوویی یەک ببیننەوە. ڕێک ئەوەی کە ئێمە پێویستمان بوو! مون هێشتاکە جەختی لە دیداری خۆی و کیم دەکردەوە لە ناوەڕاستی ئەیلوولدا، لەوەشدا مەبەستی سیاسیی ناوخۆیی هەبوو.

پەمپەیۆ و کێلی و من لە ١٠ی ئەیلوول نامەیەکی تری کیم جۆنگ ئونمان دا بە ترەمپ، ئەویش لە نووسینگەی هێلکەیی خوێندییەوە و لەگەڵ خوێندنەوەی قسەی دەکرد: "ئەمە نامەیەکی سەرسوڕهێنە! بەڕاستی نامەیەکی جوانە!" "گوێ بگرە چ قسەیەک لەسەر من دەڵێت." وەک کێلی و من دواتر گوتمان، وەک ئەوە بوو کۆمەڵێک دەروونناسی پاڤلۆڤی ئەو نامەیەیان نووسیبێت کە بە تەواوەتی بزانن چۆن دەمارەکانی ترەمپ بجووڵێنن بۆ ئەوەی ڕێزلەخۆگرتنی بەرز بکەنەوە. پاش نامەکە، ترەمپ دیداری کیمی دەویست و نەشیدەویست بۆچوونی پێچەوانە ببیستێت، لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە بووبێت نەیویستبێت ڕوونی بکەمەوە دیداری تر بیرۆکەیەکی باش نییە. ئەو گوتی: "جۆن تۆ دوژمنایەتییەکی زۆرت بەرامبەر بە ئەوان هەیە." منیش وەڵامم دایەوە: "نووسەری ئەو نامەیە دیکتاتۆری وڵاتێکی بێکەڵکە. ئەو شایەنی دیداری تۆ نییە هەتا سەرەتا پەمپەیۆ نەبینێت، وەک چۆن چەند هەفتەیەک لەمەوپێش بەمە قایل بووبوو". ترەمپ گوتییەوە: "دوژمنایەتییەکی زۆرت هەیە. بێگومان من زۆرترین دوژمنایەتیم هەیە، بەڵام تۆش وایت!" قسەمان لەسەر ئەوە دەکرد هەتا لەناکاو ترەمپ گوتی: "یەک هەفتە پاش هەڵبژاردن دیداری کیمم دەوێت. مایک پێویستە هەر ئەمڕۆ پەیوەندی بکەیت و داوای ئەوە بکەیت. پێویستە بشڵێیت نامەکەی کیم زۆر جوان بووە و سەرۆک خۆشەویستییەکی زۆری بۆ سەرۆک کیم هەیە. لێشی بپرسە بەلایەوە ئاساییە نامەکە بڵاو بکرێتەوە، چونکە زۆر باش دەبێت ڕای گشتی هێزی پەیوەندییەکە ببینن، هەروەها بشپرسە حەز بە دیداری تر دەکات پاش هەڵبژاردن؟ حەز دەکات لە کوێ یەک ببینین؟"

کێلی لە دەرەوەی نووسینگەی هێلکەیی پێی گوتم، "بەداخەوەم کە ئەم کۆبوونەوەیە زۆر توند بوو لەسەر تۆ." پەمپەیۆش ساردبوونەوە و بێزاریی پێوە دیار بوو. گوتم سەرسام بووم بە دەرئەنجامی کۆبوونەوەکە. هەرچۆنێک بێت، ئێمە تازە توانیبوومان بۆ ماوەی پێنج هەفتە دیداری ترەمپ و کیم دوابخەین، لەو ماوەیەدا لە جیهانی ترەمپدا هەموو شتێک ئەگەری ڕوودانی هەبوو. دەبوو ئەوە قبووڵ بکەین و ڕابکەین.

کێشەیەکی بەردەوام و گەورە، ئارەزووی سەرکەشی ترەمپ بوو بۆ کشاندنەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆریا، ئەوەش بەشێک بوو لە بیرۆکەکەی بۆ کەمکردنەوەی هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا لە وڵاتە جیاجیاکان. یەکی ئەیلوول هات و ڕۆیشت، ماتیسیش لە سەرەتای تشرینی یەکەمدا نیگەرانییەکانی خۆی دووپات کردەوە لە هەمبەر ئامادەیی هێزەکانمان لە ناوچەی کۆریا. دەبوو ئەو و دەنفۆرد لەپاش کانوونی یەکەم لە ماوەی پرۆسەی بوودجەدا شایەتی بدەین لە کۆنگرێس، زۆر سەختیش بوو کێشەکە تا ئەوکاتیش هەر وا بە کپی بمێنێتەوە. لە کۆتاییدا پەمپەیۆ وادەی دیدارێکی تری لەگەڵ کیم جۆنگ ئوندا دیاری کرد لە ناوەڕاستی تشرینی یەکەمدا، کە کیم جۆنگ ئون بەدرێژی گلەیی لە سزاکانی ئەمریکا کردبوو، کەچی هیچ بیرۆکەیەکی نوێی پێشکەش نەکردبوو. دەرئەنجامی سەرەکیی ئەو دیدارە سفرکردنەوەی گفتوگۆکان دەبوو. من ئەوەم بە شتێکی چاوەڕوانکراو و هەرهاتوو دەزانی، بەڵام هەواڵێکی خراپیش بوو. دووکەڵی شەمەندەفەری پاشەکشەکانی ئەمریکا لێرەوە دیار بوو. بەڵام هیچ نەبێت بەبێ کارەساتی گەورە هەڵبژاردنەکانی تشرینی دووەمی کۆنگرێسمان تێپەڕاند و ئێستا دەمانتوانی ڕووبەڕووی قۆناغی دواتری جۆشوخرۆشی ترەمپ ببینەوە بۆ دیتنی کیم جۆنگ ئون.

## بەشی پێنجەم

# سەرگوزشتەی سێ شار[1] لووتکەی

# بڕۆکسل، لەندەن و هێلسنکی.

دوای مانگێك لە دیدارەکەی سەنگافوورە لە مانگی حوزەیران لەگەڵ "کیم جۆنگ ئوون"دا، سێ لووتکەی تر بەدوای یەك بەڕێوە دەچوون، لە مانگی تەمموز: لووتکەی ناتۆ کە دەمێك بوو بڕیاربوو لە بڕۆکسل لەگەڵ هاوپەیمانە گرنگەکانی ئەمریکا بەڕێوە بچێت؛ ترەمپ و تێریزا مەی لە لەندەن، کۆبوونەوەیەکی دووانەی تایبەت بوو. هەروەها ترەمپ و پوتین لە هێلسنکی، ئەوێ شوێن و خاکێکی بێلایەن بوو تاوەکو لەگەڵ ڕووسیای نەیارمان کۆببینەوە. بەر لە بەجێهێشتنی واشنتۆن، ترەمپ گوتی: "ناتۆم لەبەردەستە، ئینجا بەریتانیا -کە وادەردەکەوێت لە نێو ئاژاوەدا بێت- هەروەها پوتینیش، بەڕاستی بڵێم کە پوتین ئاسانترینیانە، کێ بیری بۆ ئەوە دەچێت؟". لەم مانگی تەممووزە کە پڕبوو لە سەرقاڵی، بۆم دەرکەوت کە ترەمپ هەرگیز نە پەیڕەوی هیچ ستراتیژیەتێکی نێودەوڵەتی کردووە، نە ڕێگەیەکی ڕاستیشی گرتووە. بیرکردنەوەی ئەو وەك دەریایەکی پڕ لە دوورگە وابوو (بۆ نموونە وەك مامەڵەکانی کڕین و فرۆشتنی خانووبەرە وابوو)، هەمووی بۆ ئێمە جێ دەهێشت کە بڕیاری لەبارەیەوە بدەین یان سیاسەتێکی بۆ دابڕێژین. ئەمەش خاڵی باش و خراپی خۆی هەبوو.

---

(١) سەرگوزشتەی دوو شار، شاکارێکی بەناوبانگی چارلز دیکنزە.

دوای سەنگافوورە، گەشتم بۆ کۆمەڵێك پایتەختی وڵاتە ئەورووپییەکان کرد بۆ ئامادەبوون لەم لووتکانە. یەکێك لە گەشتەکانم وا بڕیاربوو بەرەو مۆسکۆ بێت، بەڵام پلانەکە وەستا، کاتێك بە ترەمپم گوت لەبارەی چوونە ئەوێ بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ گەشتەکەی ئەو خۆش بکەم، ئەو پرسی: "ئایا پێویست دەکات کە تۆ بچیتە ڕووسیا؟ تۆ ناتوانیت ئەم شتە بە تەلەفۆنێك ئەنجام بدەیت؟". لە کۆتاییدا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگر نەبوو لەبەردەم ئەوە کاتێك بۆم ڕوونکردەوە چەندە گرنگە کە بۆ پێداچوونەوە بە دۆزە سیاسییەکان، سەرەتا زووتر ئێمە لەوێ بین. دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت پرسیارم لە کێلی کرد کە بۆچی ترەمپ لەمە ناڕازی بوو، ئەو گوتی: "شتێکی ئاساییە، ئەو نیگەرانی ئەوەبوو کە تۆ پشتی لێ بگریتەوە"، ئەمەش جگە لە ترەمپ بۆ هەر سەرکردەیەکی تر ئاساییە، بەڵام ئەگەر ئەمە ڕاست بێت کەوابوو جێگای مەترسییە. من نازانم دەبوو چی بکەم لەبارەی ئەمەوە؟ ڕوون دیارە کە وەڵامێکی ڕاستم لەمبارەیەوە دەستگیر نەبوو.

ترەمپ هەر بەڕاستی دەیویست پوتین سەردانی واشنتۆن بکات، ئەمەش ئەو شتە بوو لە مێشکی ئەواندا نەبوو کە بیریشی لێ بکەنەوە، هەروەها ئێمە باس و خواسی هێلسنکی و ڤییەنامان دەکرد وەکو هەر شوێنێك کە دەشێ شتی تیادا ڕووبدات. ڕووسیا ڤییەنای هەڵبژارد و ئێمەش هێلسنکی، بەڵام وادەرکەوت کە ترەمپ هێلسنکی بە دڵ نییە، ئەو پرسیاری کرد کە "ئەی فینلەندا وەکو مانگێکی دەستکرد نییە بۆ ڕووسیا؟" (لە کاتێکی تری بەیانی هەمان ڕۆژدا ترەمپ پرسیاری لە کێلی کرد کە ئاخۆ فینلەندا بەشێك نییە لە ڕووسیا). من ویستم باکگراوندێکی مێژوویی ئەم وڵاتە باس بکەم، بەڵام زۆری لەسەر نەڕۆیشتم کاتێك ترەمپ گوتی کە ئەویش ڤییەنا هەڵدەبژێرێت. ترەمپ گوتی پێیان بڵێن کە "هەر شوێنێك ڕووسیا دەیەوێت ئێمە ئەوێ هەڵدەبژێرین، ئینجا هەر شوێنێك بێت"، لەگەڵ ئەوەشدا پاش مشتومڕی زۆر، دواجار بڕیار لەسەر هێلسنکی درا.

ڕۆژی سێشەممەی ٢٦ی حوزەیران لە فڕۆکەخانەی ڤنوکۆڤۆ لە مۆسکۆ دابەزین، بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر چووم بۆماڵی سپاسۆ کە زۆر دەمێکە ماڵی باڵیۆزی ئەمریکایە لە مۆسکۆ. "جۆن هەنتسمان" خوانێکی گەورەی لەگەڵ گەورە بیریار و چالاکوانە ڕووسییەکان ئامادە کردبوو، لەنێویشیاندا وەزیرەی دەرەوەی پێشوو ئیگۆر ئیڤانۆڤ کە من دەمناسی و کاتێك لە ئیدارەکەی بوش ٤٣ بووم کارم لەگەڵیدا کردبوو، هەروەها کەسانی تری وەکو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرپرسانی باڵیۆزخانەش بەشداربوون. ڕووسییەکان گومانیان لە ئاسۆی ئەم کۆبوونەوانە هەبوو بۆ چاککردنی پەیوەندییەکانی نێوان ڕووسیا و ئەمریکا، بەتایبەت لەوەی کە ترەمپ بەم حاڵەوە دەبینین. ئەوان لایان وابوو کە ڕوانگەی بنەڕەتیی ئەمریکا، ئینجا لە کۆنگرێس بێت یان لەنێوان خەڵکی بە گشتی؛ ئەوا هەر وەك خۆیەتی و بەرامبەر ڕووسیا نەگۆڕاوە، کە ئەمەش ڕاست بوو. من زۆر پێداگریم لەسەر دەستێوەردانەکانی ئەوان کرد لە هەڵبژاردنەکان، ئەگەرچی دەشمزانی کە زۆرینەی ئامادەبووان هەر زوو دوای ئەو خوانە پەیوەندی بە هاوکارەکانیان دەکەن لە کریملن و زانیارییەکانیان بۆ دەگوازنەوە.

پاشان هەنتسمان و وەفدەکەی و ئێمە؛ بەرەو ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕووسی کەوتینە ڕێ، بۆ ئەوەی هاوتاکانمان ببینین. من بەرامبەر بە نیکۆلای پاترۆشیڤ بووم کە سکرتێری ئەنجوومەنەکە بوو، بەڵام ئەو لە دەرەوەی وڵات بوو، لەگەڵ ئەوەشدا تەواوی تیمەکە لەوێ بوون بۆ باسکردنی هەموو بابەتەکان، هەر لە فرۆشتنی چەك بە ئێرانەوە بگرە تاوەکو هەموو بابەتەکانی تر، ئەمەش بابەتێك بوو کە ترەمپ و پوتین دەبوو دواتر قسەی لەسەر بکەن. پوتین لە کاتی خۆیدا جارێك بۆ ماوەیەکی کەم ببوو بە سکرتێری ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕووسی، پاترۆشیڤیش ئەوکات لە کەی جی بی بوو (هەروەها کەی ئێس بی، کە جێگرەوەکەی بوو لە

مامەڵەکردن لەگەڵ هەواڵگریی ناوخۆیی و ئاسایش)، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩٩ پوتین وەکو بەڕێوەبەری ئێف ئێس بی دیاری کرا. پاترۆشیڤ ئێستاشی لەگەڵدا بێت پەیوەندییان لەگەڵ پوتین زۆر باش بوو، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نەبوو بەوەی کە هەردووکیان پاشخانێکی نزیکیان هەبوو. نانی نیوەڕۆمان لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ڕووسیا سێرگی لاڤرۆڤ خوارد لە خانەی مێوانداریی ئۆسۆبنیاك، ئەم شوێنە جێگایەکی شاهانە بوو دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی بەر لە شۆڕش، کە لەلایەن یەکێك لە پیشەسازە هاوسۆزەکانی بەلشەفیەت دروست کرابوو، من جاری تریش هاتوومەتە ئەو شوێنە. پێداگریم کرد لەسەر مەسەلەی دەستێوەردان لە هەڵبژاردنەکان، لاڤرۆڤ خۆی لە باسەکە لادا، بەوەی گوتی کە ئەوان دەسەڵاتیان بەسەر هاککەرەکاندا نییە و ئەمەش پەیوەندی بە حکوومەتی ڕووسیاوە نییە.

دواتر لە ئۆسۆبنیاکەوە چووین بۆ کرملین تاوەکو پوتین ببینین لە کاتژمێر دوو و نیو، ئێمە زووتر گەیشتین. لەکاتێکدا کە چاوەڕوان بووین، وەزیری بەرگری سێرگی شویگۆ لەگەڵ وەفدێکی سەربازیی هات و خۆی ناساند (پاشانیش هات و بەشداریی کۆبوونەوەکەی کرد لەگەڵ پوتین). دواتر بەڕێ کراین بۆ ئەم ژوورەی کە کۆبوونەوە سەرەکییەکەی تێدا ئەنجام دەدرا، تا ڕاددەیەك لەوە دڵنیابووم هەمان ئەو ژوورەیە کە بۆ یەکەم جار پوتینم تێدا بینی لە ساڵی ٢٠٠١، لەگەڵ وەزیری بەرگری ئەوسا دۆناڵد ڕامسفێڵد، ڕاستەوخۆ دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر. ژوورەکە زۆر گەورە بوو، هەمووی ڕەنگی سپی و شین بوو، هەروەها مێزێکی هێلکەیی بە ڕەنگی سپی و شین لە ناوەڕاستیدا بوو. ڕاگەیاندنەکان لەوێ بوون و ئامادەبوون بۆ وێنەگرتنی پوتین کاتێك لە دەرگاکەوە دێتە ژوورەوە لەمسەری ژوورەکە (کە زۆر دوور بوو). لەسەر بنەمای پرۆتۆکۆڵی ڕووسی، من دەبوو لە ژوورەکە چاوەڕێ بکەم تاوەکو پوتین دێت و بەخێرهاتنم دەکات، ئیدی بەم جۆرە لەوێ چاوەڕێمان کرد و دەستمان بۆ

کامێراکان هەڵدەبڕی. پوتین وا دەردەکەوت کە زۆر باوەڕی بەخۆ بێت، زیاتر لەوکاتەش کە من بیرم بێت لە یەکەم کۆبوونەوەمان لەگەڵیدا لە ساڵی ۲۰۰۱. هەروەها هەریەك لە لاڤرۆڤ، شویگو هەروەها یری ئۆشاکۆف-یشم بینی (ڕاوێژکاریی دیبلۆماسی پوتین و باڵیۆزیی پێشوو بو لە ئەمریکا)، لەسەر مێزە جوان و سەرنجڕاکێشەکەی کۆبوونەوە دانیشتین. دواتر ڕاگەیاندنەکانی ڕووسیا (بەشێوەیەکی ناڕاست) بڵاویان کردەوە کە پوتین لە کاتی خۆیدا ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەو هەمیشە مێوانەکانی لە چاوەڕوانیدا دەهێڵێتەوە، تەنانەت پاپا و شاژنی بەریتانیاش. پوتین بە ڕاگەیاندنەکانی گوت کە پەیوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و ڕووسیا پاشەکشەی کردووە، خەتاکەشی گەڕاندەوە بۆ سیاسەتی ناوخۆی ئەمریکا. من نەمویست سەر بخەمە سەر پوتین و پێشبڕکێ لەگەڵ ئەودا بکەم، بەڵام مۆسکۆ مێوانداریی جامی جیهانی ۲۰۱۸ی کرد، هەروەها ئەمریکا (لەگەڵ مەکسیك و کەنەدا) مێوانداریی جامی جیهانی ۲۰۲٦یان بەدەست هێناوە، پێم گوت کە من بەتاسەوەم ئەوە ببیستم کە چۆن بەسەرکەوتوویی مێوانداریی جامی جیهانی بکەین. پاشان ئەوەبوو ڕاگەیاندنەکان چوونە دەرەوە و ئێمەش دەستمان بە کارەکان کرد.

شێوازی پوتین لە سەرەتادا بە جۆرێك بوو کە لەسەر کاغەز دەیخوێندەوە و دەوەستا تاوەکو وەرگێڕ قسەی دەکرد، بەڵام جار جارەش وەك بڵێی کاغەزەکانی دادەنا و شتێکی لەم بابەتەی دەگوت "ئەوە بە سەرۆك ترەمپ بڵێ". لە کۆبوونەوەکەدا یوشوکۆف، شویگو هەروەها لاڤرۆڤ هیچ شتێکیان نەگوت تەنها ئەوە نەبێت کە وەڵامی پرسیارەکانی "پوتین"یان دایەوە، هەورەها ئەوانەش کە لەگەڵ من بوو بە هەمان شێوە (باڵیۆز هەنتسمان، بەڕێوەبەری یەکەمی ئاسایشی نەتەوەیی ئەورووپا — ڕووسیا، فیۆنا هێڵ، هەروەها بەڕێوەبەری ئاسایشی نەتەوەیی ڕووسیا جۆی وانگ و وەرگێڕەکەمان).

پوتین نزیکی چل و پێنج خولەك قسەی کرد، چوون قسەکانی وەرگێڕانیشی بۆ دەکرا، زۆرینەی قسەکانیش لەبارەی ئەجێندای کۆنتڕۆلکردنی چەکی ڕووسی بوو (توانای بەرگریی مووشەکی نیشتمانی ئەمریکی، ڕێککەوتننامەی مەودا ناوەندیی چەکی ئەتۆمی INF، پەیماننامەی ستارتی نوێ، هەروەها بڵاوبوونەوەی چەکە کۆکوژەکان). کاتێك نۆرەی من هات، من گوتم کە دەتوانین پەیڕەوی یەکێك لەم دوو ڕێگەیە بکەین بۆ کۆنتڕۆلکردنی فرۆشتنی چەك: دانوستان لەگەڵ ئەو دوولایەنەی کە دژی یەکترن تاوەکو بیانبەستێتەوە، یان دانوستان لەگەڵ ئاڵنگارەکان سەبارەت بەو چالاکییانەی کە ڕەنگە کێشە دروست بکات.

من پاشەکشەی ئەمریکام لە ساڵی ٢٠٠١ لە ڕێککەوتنی مووشەکی ئەنتی-بالیستیکی بۆ ساڵی ١٩٧٢ بە نموونە هێنایەوە، ئەمە ئەوەبوو کە وای لە پوتین کرد لە داخا هەڵبچێت بەوەی کە بۆب گیتس و کۆندالیزا ڕایس بوونە هۆی ئەم گاڵتەپێکردنە بە ڕووسیا. من گوتم کە پوتین دەستبەرداری زۆرێك لە مێژوو بووە لەنێوان ساڵانی ٢٠٠١ بۆ ٢٠٠٣، کە هانی ڕووسیامان دا لەوەی ئەویش بە هەمان شێوە پاشەکشە بکات لە ڕێککەوتننامەی ئەنتی ئەی بی ئێم ABM و هەروەها هاریکاریی توانای مووشەکی بەرگری نیشتمانی بێت، ئەمەش ئەو کارە بوو کە پوتین ڕەتی کردەوە بیکات - من وام هەست کرد، لەبەر ئەوەبوو کە ئەوکات ئەوان ئەم جۆرە تەکنۆلۆژیایەیان هەبوو جارێ ئێمە دەستمان نەخستبوو. دۆسیەی سنووردانانی فرۆشتنی چەك شتێك نەبوو کە لە ئیدارەکەی ترەمپ زۆر قسەی لەسەر کرابێت. بەڵام ئەمە ڕوون بوو کە ئەم کۆبوونەوەیە گرەنتی زۆر شتی دا بەرلەوەی ترەمپ بێت و بەشداری ئەم جۆرە کۆبوونەوەیە بێت.

سەبارەت بە سووریا، پوتین پرسیاری ئەوەی کرد لەبارەی ویستی ئێمە لە سەر کشانەوەی ئێران لە سووریا، ئایا کێ ئەمە دەکات؟ ئەمە ڕێك

ئەوکاتە بوو کە پوتین ئاماژەی بە من دا کە بە ترەمپ بڵێم، ڕووسیا پێویستیان بە ئێرانییەکان نییە بۆ ئەوەی لە سووریا بن، هەروەها هیچ سوودێکیشی بۆ ئەوان نییە کە ئێران لە سووریا بێت.

ئێران خەریکی پەیرەوی ئەجێندای تایبەتی خۆی بوو، بەسەیرکردنی ئامانجەکانی لە لوبنان و هەروەها لەگەڵ شیعەکان، کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئامانجەکانی ڕووسیا نەبوو، بەڵکو کێشەی بۆ ئەوان و ئەسەدیش دروست دەکرد. پوتین گوتی کە ئامانجیان پشتگیریکردنی سووریایە بۆ ئەوەی فەوزا دروست نەبێت هەروەك ئەمە حاڵی ئەفغانستانە، بەڵام ئێران ئامانجی زیاتری هەیە. لەکاتێکدا ڕووسیا دەیویست ئێران لە سووریا بچێتە دەرەوە، ئەگەرچی پوتین گرەنتی پاشەکشەی تەواوی نەدەدا، هەروەها نەیدەویست کۆمەڵێك پەیمان بدات کە نەتوانێت جێبەجێیان بکات. ئەگەر هات و ئێرانییەکان پاشەکشەیان کرد، ئیتر کێ هێزە سوورییەکان لەم دوژمنداریيە بەرفراوانە دەپارێزێت، کە ڕەنگە مەبەستی ئۆپۆزسیۆنی سووریا و یارمەتیدەرەکانیان بێت لە خۆرئاوا. پوتین نیەتی ئەوەی نەبوو کە هێزە ڕووسییەکان بە هێزە ئێرانییەکان جێگۆڕکێ پێ بکات لە کێشمەکێشی ناوخۆیی سووریا لەکاتێکدا ئێران دەیگوت: "تۆ لە دەرەوەی سووریا شەڕیان لەگەڵدا بکە". ئەو دەیویست لێکتێگەیشتنێکی ڕوون هەبێت سەبارەت بە سووریا لەگەڵ ئەمریکا، پاشان هاتە سەرباسی بواری جیاجیای وەکو ڕێکخستنە سەربازییە ڕووسی و ئەمریکییەکان لە وێدا، لەگەڵ تەرکیز خستنە سەر ناوچەی (ئەت تەنف) بەشێوەیەکی تایبەت (نزیکی سەرسنوور کە هەر یەك لە وڵاتانی سووریا، عێراق و ئوردن بەیەکەوە دەگەیەنێت). پوتین بە متمانەوە گوتی بەگوێرەی پڕوپاگەندەکان بێت نزیکی ٥٠٠٠ لە خەڵکی ناوچەیەکی نزیك (ئەت تەنف) لە ڕاستیدا چەکداری داعش بوون و بە ڕواڵەت پەیڕەوی ئاماژەکانی ئەمریکایان دەکرد، بەڵام هەر کاتێك بۆیان بلوێت خیانەتمان لێ دەکەن. (پوتین

گوتی کە هەندێك لە شەڕکەرانی داعش بە بەشێکی دیاریکراوی سیاسەتەکانمان ڕازین، ئەگەرچی وەرگێڕەکە بەم جۆرە وەری نەگێڕا!) من هەستم کرد کە ئەم باسە لە هەموو کۆبوونەوەکە سەرنجڕاکێشتر بوو. لە ئاماژەکردن بە ئۆپۆزسیۆنی سووریا، پوتین گوتی کە ئەوان لە ئەسڵدا هاوپەیمانی بە متمانەی ئێمە نەبوون و ناکرێت متمانەیان پێ بکرێت. لەجیاتی ئەوە پێداگریمان لەسەر بەرەوپێشبردن و هاندانی کردەی ئاشتی لە سووریا کرد. من گوتم کە ئەولەویاتی ئێمە ئەوەیە کە داعش لەناو ببەین و هێزە ئێرانییەکانیش بە تەواوەتی لە سووریا دەربکەین. ئێمە بەشداریی شەڕی ناوخۆی سووریامان نەدەکرد، بەڵکو ئەولەویاتی ئێمە ئێران بوو.

پوتین هەڵوێستێکی توندی هەبوو بەرامبەر بە ئۆکرانیا، بە درێژی باسی لایەنە سیاسی و سەربازییەکانی ئەم ناکۆکییەی کرد. ئینجا بە تۆنێکی زۆر نارازییانە گوتی ئەم چەکفرۆشتنەی ئەمریکا بە ئۆکرانیا نایاساییە و تەنانەت ڕێگایەکی باشیش نییە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان. هەروەها ئەو ڕەتی کردەوە هەر باسی نیمچە دوورگەی کریمیا بکات و بەوە وەسفی کرد کە ئێستا بەشێکە لە تۆماری مێژوو. پاشان لە دووەم کاتی زۆر سەرنجڕاکێش لە کۆبوونەوەکە پوتین گوتی، ئۆباما لە ساڵی ٢٠١٤ بە ڕوونی پێی گوتم کە ئەگەر ڕووسیا زیاتر لە نیمچە دوورگەی کریمیا بڕوات، ئەوا دەکرێ بەرەنگاری ئۆکرانیا ببێتەوە. بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت ئۆباما ڕایەکەی خۆی گۆڕی و گەیشتین بەم ڕێگە داخراوەی ئێستا. تا ئەوکاتەی منیش خەریك بوو قسەکانم تەواو بکەم، لە ٩٠ خولەك نزیك ببووینەوە و وام هەست کرد کە لە کۆتایی کۆبوونەوەکەش نزیکین، من گوتم ئێمە ئێستا لە پرسی ئۆکرانیا دوورین و کاتیش نەماوە بۆ باسکردن و چارەکردنی هەموو شتێك.

هەروەها پوتین باسی کۆریای باکووریشی کرد، کە ڕووسیا پشتگیری ڕێگەی "کردار بەرامبەر کردار" دەکات، کە باکووریش هەمان شتی

دەوێت، بەڵام لە سەرەتادا وادەرکەوت کە زۆر گرنگی بەم دۆسیەیە نادات. ئەوەش کە پەیوەندی بە ئێران بوو، گاڵتەی بە کشانەوەی ئەمریکا کرد لە ڕێککەوتنی ئەتۆمی ئێران، بەوەی پرسیاری کرد، ئێستا ئەگەر ئێران پاشەکشە بکات چی ڕوودەدات؟ هەروەها گوتی کە ئیسرائیل ناتوانێت بە تەنها کردەی سەربازی بەرامبەر ئێران ئەنجام بدات، چونکە ئەو هێز و توانایەی نییە، بەتایبەتیش ئەگەر هات و عەرەب یەکیان گرت و پشتی ئێرانیان گرت، کە ئەمەش پێچەوانەی عەقڵ بوو. منیش بەوە وەڵامم دایەوە کە گوتم ئێران ملکەچی ڕێککەوتنەکە نییە و هەروەها باسی ئەو پەیوەندییەشم کرد کە لەنێوان ئێران و کۆریای باکووردا هەبوو هەروەها لەبارەی ئەو کوورانە قسەم کرد، کە ئیسرائیل لەساڵی ٢٠٠٧ لە سووریا تەقاندنییەوە، جگەلەوەش گوتم ئێمە بە پەرۆشییەوە چاودێریی ئەو بەڵگانە دەکەین کە بوونەتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەمە. هەر چۆنێك بێت، سەرلەنوێ داسەپاندنی سزا بەسەر ئێران هەر بەڕاستی بووە هۆی ئەوەی زیانێکی زۆر گەورە لە ئێران بدات، لە ناوخۆ و تەنانەت لە سەر ئاستی نیودەوڵەتیش. هەروەها ترەمپ ئێستاشی لەگەڵدا بێت خۆشحاڵە بەرامبەر بە کۆریای باکوور و باسی ئامۆژگارییەکەی شی جین بینگم کرد بۆئەوەی تا زووە هەنگاو بنێین.

پوتین باسی دەستێوەردانی لە هەڵبژاردنەکان نەکرد، بەڵام بەدڵنیاییەوە من باسم کرد و پێداگریشم کرد، چونکە هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێسمان لە پێش بوو بۆ ساڵی ٢٠١٨. هەر ئەندامێکی کۆنگرێس خۆی ئامادەکردبوو بۆ دووبارە هەڵبژاردنەوەی و هەموویشیان ڕکابەری خۆیان هەبوو، لەگەڵ بوونی بەرژەوەندی کەسێتی لەم باسەدا، کە لە ساڵی ٢٠١٦ بەتەواوەتی نەیان خەملاندبوو، هەروەها لەگەڵ جەختکردنە سەر دەستێوەردانی سەرۆکایەتی.

من گوتم بەڕاستی مەحاڵە کە ترەمپ و پوتین یەکتر ببینن، بەڵام ترەمپ

ئەمە لە بەرژەوەندیی نیشتمانی ئەمریکی دەکات، هەروەها ئەگەر بۆشی بکرێت پەرە بە پەیوەندییەکان دەدات. دوای چەندین مشتومڕ، ئەو کۆبوونەوەیە کۆتایی هات کە نزیکەی ٩٠ خولەکی خایاند. پوتین تووشی شۆکی کردم کە پێی گوتم تۆ هێمن و باوەڕبەخۆبووی، ئینجا ئاڵنگارییە ئابووری و سیاسییە ناوخۆییەکانی ڕووسیا هەرچییەك بن. ئەو بەتەواوەتی ئاگای لە ئاسایشی نەتەوەیی مۆسکۆ هەبوو. من نەمدەویست کاتێك لەگەڵ ترەمپ کۆبێتەوە بە تەنیا لە ژوورەکەدا جێیان بهێڵم.

## برۆکسل

لە ساڵانی ڕابردوو، لووتکەی ناتۆ، ڕووداوێکی زۆر گرنگ بوو بۆ هاوپەیمانان. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوو کۆبوونەوەکان بوونە ساڵانە و بەڵام کاریگەرییەکەی کەم بوویەوە. تاوەکو ساڵی ٢٠١٧ لووتکەی ناتۆ لە برۆکسل، کە ترەمپ تیایدا شتەکانی زیندووکردەوە، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئاماژەی نەدا بە ماددەی ٥ی بەناوبانگ لە هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی، کە تیایدا هاتووە "هێرشکردنی سەربازیی بۆ هەریەك لە وڵاتانی ئەوروپا یان ئەمریکای باکوور مانای وایە کە هێرشە بۆ سەر هەموویان". ئەم خاڵە لە ڕاستیدا پابەندبوونی کەمترە لە بەناوبانگییەکەی، چوون هەر ئەندامێکی ئەم ناتۆیە "هەر کاردانەوەیەك کە بەپێویستی دەزانێت دەیگرێتە بەر". ئەمە هەرتەنها جارێك بە باشی کاری پێ کرا، ئەویش دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر بۆ سەر واشنتۆن و نیویۆرك. لەگەڵ ئەوەشدا ناتۆ ساڵانێك هەیکەلێکی بەرپەرچدانەوەی سەرکەوتوو بوو لە ڕێگەگرتن لە سوپای سوور بۆ سەر ئەڵمانیا و ئەوروپای خۆرئاوا. بێگومان ئەمریکا گەورەترین بەشداربووی ناتۆ بوو. چوون ئەوانە هاوپەیمانی ئێمە بوون و ئەمەش لە بەرژەوەندیی ئێمەدابوو، نەك هە رتەنها لەبەرئەوەی کە ئێمە وەك بڵێی بەکرێگیراوی بەرگریکردن

بین لە ئەورووپا، بەڵکو بەرگریکردن لە خۆرئاوا لە بەرژەوەندیی ستراتیژیەتی ئەمریکادا بوو. ئەمەش وەك قەڵغان و قەڵایەك بەرامبەر فراوانبوونی زیاتر سۆڤیەتی. ناتۆ لە مێژوودا سەرکەوتووترین هاوپەیمانی سیاسی-سەربازی بووە.

ئایا ناتۆ ڕووبەڕووی کێشە بۆتەوە؟ بەڵێ، بێگومان. با سەرنج بدەینە گوتارە بەناوبانگەکەی هێنری کیسنجەر لە ساڵی ١٩٦٥ بەناونیشانی "هاوپەیمانێتییەکی کێشە تێکەوتوو": دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی هاوپەیمانی ئەتڵەسی. لیستی بەرەنگاربوونەوەکان لە نێو ناتۆدا لیستێکی درێژ بوو، لەوانەشدا دوای دارمانی یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٩١، زۆربەی ئەندامە ئەورووپییەکان دەستیان لە بەرپرسیارییەتییان هەڵگرت لە بەرگریکردن لە خۆیان. لە ماوەی دەسەڵاتی سەرۆك کلینتۆندا، ئەمریکا بەدەست کەمبوونەوەی سەربازیی دەیناڵاند، کە ئەو و ئەوانی تریش دارمانی شیوعیەتیان بە "کۆتایی مێژوو" دادەنا و بوودجەی سەربازییان لە بەرنامەی ڕەفاهییەت و سوودی سیاسی خەرج دەکرد. وەهمی "ئاشتی وەدەستهاتوو" لە زۆربەی ئەورووپا کۆتایی نەهاتبوو، بەڵام لە ئەمریکا بە کوشتنی بەکۆمەڵی خەڵکی لە هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەرەوە لە واشنتۆن و نیویۆرك لەسەر دەستی تیرۆریستان کۆتایی هات. بۆیە داهاتووی ناتۆ بووە باسوخواسی سەرەکیی بەئەزموونەکان لە نێو ئاسایشی نەتەوەیی بە دەیان ساڵ، کە سوور بوون هەندێکیان لەسەر ئەوەی لە دوای جەنگی سارد ئامانجەکان فراوانتر بکەن. باراك ئۆباما ڕەخنەی لە ئەندامانی ناتۆ گرت بەوەی هەریەکە و "سوارێکی سەربەخۆیە" و بەشێوەیەکی تەواو بوودجە خەرج ناکەن لە بەرگریکردن لەخۆیان. ترەمپ لە یەکەم لووتکەی لەگەڵ ناتۆدا لە ٢٠١٧، گلەیی لەوە کرد کە زۆرێك لە ئەندامان پابەندنەبوون بە ڕاسپاردەکانی ٢٠١٤، کە بەکۆمەڵ پێشکەش کرابوو لە کاردیف، وەیلز؛ بۆ خەرجکردنی لە سەدا دووی قازانجی بەرهەمە ناوخۆییەکانیان بۆ

مەبەستی بەرگری تاوەکو ساڵی ٢٠٢٤، کە ئەمەش بۆ زۆرێك لە ئەورووپییەکان واتە بەرگریکردن لە شانۆی ئەورووپی. ئەڵمانیا یەکێك بوو لە خراپترین سەرپێچکاران کە تەنها نزیکەی لە سەدا ١,٢ لە بەرهەمە ناوخۆییەکانی بە مەبەستی بەرگری خەرج کردبوو، بە بەردەوامیش لەژێر گوشاری سۆشیال دیموکراتەکان و چەپەکاندا بوو بۆئەوەی کەمتر خەرج بکات. ترەمپ سەرەڕای ئەوەی، یان ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە باوکی بە ڕەچەڵەك ئەڵمانی بوو، بۆیە جۆرێك لە شەرمەزاری پێوە دیاربوو. لە کاتی دانوستان و قسەکردن سەبارەت بە گورزوەشاندن لە سووریا لە مانگی نیسان، ترەمپ لە ماکرۆنی پرسی کە بۆچی ئەڵمانیاش نایەتە نێو بەرەی تۆڵەکردنەوە لە دژی ڕژێمەکەی ئەسەد. ئەمە پرسیارێکی باش بوو، بەبێ بوونی هیچ وەڵامێك جگە لە بوونی مشتومڕی نێوەخۆیی ئەڵمانیا، بۆیە ترەمپ ڕەخنەی توندی لە ئەڵمانیا گرت و وەکو ئەندامێکی زۆر خراپی ناتۆ وەسفی کرد و دووبارە هێرشی کردەوە سەر پرۆژەی نۆرد ستریمی بۆڕیی غاز، کە وای دەبینی ئەڵمانیا پشتگیری لە ڕووسیا دەکات، کە ئەویش دوژمنی ناتۆیە. ترەمپ لە میانەی کەمپینەکەی لە ساڵی ٢٠١٦، هاوپەیمانیی ناتۆی بە "کۆن و بەسەرچوو" وەسف کرد، بەڵام لە نیسانی ٢٠١٧ گوتی کە ئەم کێشەیە لە ماوەی سەرۆکایەتی ئەو "چارەسەرکراوە". ئەو وای دادەنا کە مەسەلەی ماددەی ٥ لە ٢٠١٧ تەنانەت گەورە ڕاوێژکارانیشی سەرسام کرد بەوەی کە لە ڕەشنووسی گوتارەکەی سڕابوویەوە. بەڵام ڕاست بێت یان نا، ئەوا لووتکەی ٢٠١٧ ڕێگای بۆ ئەو تەنگوچەڵەمانە خۆش کرد کە لە ٢٠١٨ ڕووبەڕووی بووینەوە.

ئەم گەردەلوولە دەمێك بوو هەڵی کردبوو، بەرلەوەی من بچمە وێست وینگ، بەڵام ئێستا کە لەوێم زۆر ڕاستەوخۆتر گەردەلوولەکە لێمان دەدا. ترەمپ لەسەر حەق بوو لەبارەی ئەم خاڵانەوە، هەروەها ئۆباماش، ئەمەش ڕای هەردووکیانی لە یەکتر نزیك کردبوویەوە و ببووە هۆی

باوەڕبەخۆبوون لەلایەن ترەمپەوە. کێشەکە لە ڕوانگەی ئەمریکاوە بریتی بوو لە جێگیرنەبوون و بەڕێوەبردنی هاوپەیمانەکان. ئەمەش ئەو ڕەخنە توندەبوو کە ترەمپ بێزاریی خۆی لێی دەردەبڕیی لە نەهێنانەدی ئامانجەکانی لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە، لە هەندێك حاڵەتیشدا لەوەدەچوو کە ئەسڵەن هەر گرنگیشی پێ نەدەن. لەڕاستیدا سەرۆکەکان لە ڕابردوودا سەرکەوتوو نەبوون لە چاکسازی لەپاش شەڕی سارد. پێم وایە لە ماوەی دەسەڵاتی کلینتۆن و ئۆبامادا ئیدارەکەیان سەرکەوتوو نەبوو لە خەرجیی بەرگریکردن، ئەمە جگە لەوەی کە هەریەك لە هاوپەیمانان چی دەکرد یان چی نەدەکرد. ئەوە ئەگەر هەر تەنها ڕەخنە بێت لە ترەمپ کە لای زۆرێك لە ڕەخنەگران وایە، ئەوا مانای وایە شتێکی پڕوپووچە. من هەرگیز شەرمم لەوە نەکردووە کە قسە لەڕوو بم، تەنانەت لەگەڵ نزیکترین هاوپەیمانەکانیشمان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، دەشتوانم پێتان بڵێم کە ئەوانیش بەم جۆرەن و هیچ شەرم لەوە ناکەن کە بە ئێمەی بڵێن بیر لە چی دەکەنەوە؟! بەتایبەت سەبارەت بە کەمتەرخەمییەکان لە ئەمریکا. لەڕاستیدا ئەمە قسەلەڕوویی ترەمپ نەبوو کە ئەندامانی ناتۆی بێزار کرد، بەڵکو ئەو نەیارییە شاراوەیە بوو کە لەنێوان ئەندامان خۆیاندا بوو.

لە کاتژمێر نۆی بەیانیی ڕۆژی هەینی ٢٩ی حوزەیران، ترەمپ داوای کرد کە پەیوەندی بە جێنس ستۆلتنبێرگ ئەمینداریی گشتی ناتۆ بکەن، واتە تەنها دوو هەفتە بەر لە بەستنی لووتکەکە. کاتێك لە ئۆڤاڵ یەکترمان بینی، ترەمپ گوتی بە ستۆلتنبێرگ دەڵێم کە ئەمریکا بوودجەی بەشداری لە ناتۆ کەم دەکاتەوە تا ڕاددەی ئەڵمانیا و داوای لێ دەکەم کە بەر لە لووتکەکە ١١-١٢ی تەمموز بە هەمووان بڵێت. (لێرەدا ئێمە کێشەمان هەیە لە ناونانی شتەکان. پابەندبوون لە کاردیف بە مانای "بەخشین" نایەت لە ناتۆ، بەڵکو سەبارەت بە کۆی خەرجکردنە لە مەسەلەی بەرگریکردن. ئینجا ئاخۆ ترەمپ لەوە گەیشتبێت، یان هەر بە هەڵە چەمکی "بەخشین"ی

بەکار بردبێت. کاتێك گوتی کە ئەمریکا بەشداری و "بەخشین"ەکانی کەم دەکاتەوە تا ئاستی ئەڵمانیا مانای وابوو کە ئەمریکا دەبێت زیاتر لە سەدا چواری خەرجییەکانی لە بەرگریکردن کەم بکاتەوە، کە دەکاتە لە سەدا ٧٥ی بەرهەمی ناوخۆی، کە من پێم وایە ترەمپ ئەو مەبەستەی نەبووە. هەروەها ناتۆ سندوقی بەخشینیشی هەیە لەنێو بارەگاکەی، کە ساڵانە دەگەیشتە ٢,٥ ملیار دۆلار. ئەندامان "بەخشین"ەکە دەخەنە نێو سندوق، بەڵام خەرجکردنی ئەوەی لە سندوقەکە دایە، ئەوە نەبوو کە ترەمپ مەبەستی بوو. ئەڵمانیا دواتر ڕەزامەند بوو لەسەر زیادکردنی بەخشینی بۆ نێو سندوقەکە لەسەر پێشنیاری من، هەروەها کەمکردنەوەی ئەم بەشداریکردنە لەلایەن ئەمریکاوە لە بەرامبەردا، ئەگەرچی ئەوە تاوەکو ٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٩ کۆتایی نەهات).

کاتێك ستۆڵتنبێرگ هاتە سەر هێڵ، ترەمپ گوتی کە ئەو ئاژاوەیەکی ئابووری لە دەسەڵات بۆ ماوەتەوە و هەروەها ناتۆش زۆر خراپ بوو، ئینجا گلەیی لە ئیسپانیا کرد کە تەنها لە سەدا ٠,٩ قازانجی بەرهەمە ناوخۆییەکانی لە بەرگری و بەخشین بە ناتۆ خەرج کردووە. لەبارەی ئەڵمانیاوەش، ترەمپ خۆشحاڵ بوو کاتێك گوێبیستی ئەوە بوو کە ستۆڵتنبێرگ گوتی ئەو رەزامەند بووە بەوەی کە ئەڵمانیا زیاتر ببەخشێت و هەروەها گوتی کە پلانی هەیە ئەندامانی ناتۆ پابەندیی زیاتری کاردیف بن تاوەکو ساڵی ٢٠٢٤. ترەمپ بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی کە ئەمریکا لە سەدا ٨٠-٩٠ی تێچووی ناتۆی داوە، کە ئەمەش ژمارەیەکە کەس پێشتر گوێبیستی نەبووە ئەم برە پارەیە خەرج کرابێت. تێچووی ئەمریکا لە بەرگریکردن (لە سەرانسەری جیهاندا) زیاترە لە تێچووی لە سەدا ٧٠ی ئەندامانی ناتۆ، بەڵام بێگومان زۆربەی تێچووەکانی ئەمریکا تایبەت کرابوو بە بەرنامە جیهانییەکان یان ناوچەکانی دیکەی جیهان. ترەمپ ڕەنگە دواتر بڵێت کە ئەو پێی وایە لە سەدا سەدی تێچووەکانی

ناتۆی گرتووەتە ئەستۆ. سەرچاوەی ئەم ژمارەیە دیار نییە، بۆیە ئەوکاتە ترەمپ بە ستۆڵتنبێرگی گوت کە ئەمریکا هەر ئەوەندە دەدات کە ئەڵمانیا بیدات، چوون بەخشینەکان لەلایەن ئەندامانی ناتۆ زۆر نادادپەروەرانەیە. ترەمپ دواتر گوتی کە ستۆڵتنبێرگ بە بەردەوامی باسی ماندووبوونی ئەوی کردووە لەوەی کە هاوپەیمانە ئەوروپییەکان دەستیان کردووە بە بەخشینی زیاتر بە ناتۆ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیگوت کە هۆکاری سەرەکی ئەو بەخشینە ئەوەبوو کە لایان وابووە ترەمپ ئەمریکا لە ناتۆ دەکشێنێتەوە. ترەمپ دیسانەوە پێداگری لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەوان چیتر ناچنە ژێر باری خەرجکردنی هیچ برە پارەیەك بەبێ هۆ. ستۆڵتنبێرگ گوتی کە ئەو لەگەڵ ترەمپ هاوڕایە، چونکە بەخشینەکان زۆر نادادپەروەرانەیە، هەروەها گوتیشی کە پاش ساڵانێك لە کورتهێنان لە بوودجەی ناتۆ ئێستا وا خەریکە دەبینین زیاد دەبێتەوە. ترەمپ لە ڕێگەی ستۆلتنبێرگەوە گوتی کە ئەم شتانە بە ڕاگەیاندنەکان بڵێن، هەروەها داوای لە من کرد کە قسەی لەگەڵدا بکەم سەبارەت بەم تێچووانە کە ئەمریکا ئیتر ناچێتە ژێرباریی و هیچ سوودێکی بۆ ئەمریکا نییە. ترەمپ گوتی کە ئەمریکا پێشتر لەلایەن گەمژەکانەوە بەڕێوە دەبرا، بەڵام بۆ لەمەودوا نەخێر. ئەوروپییەکان بایەخیان بۆ ئەمە نەبوو، هەروەها بێبەشیان کردین لە بازرگانیکردن و چیتر بەم جۆرە نابەخشین، بەڵکو هەر هێندەی ئەڵمانیا دەبەخشین.

ستۆلتنبێرگ کاتژمێر دەی بەیانی پەیوەندی پێوە کردم، من داوام لە هەموو کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و کارمەندانی ژووری دانیشتن کرد کە پەیوەندییەکەی ڕەت بکەنەوە تاوەکو ئەوکاتەی من بەتەواوی ئامادە دەبم. من پێم گوت کە ئەم "دەستەی گەوران"ـە زۆر ترەمپیان هان داوە بۆ ئەوەی دەست لە زۆر شت هەڵگرێت. من گوتم کە ئێمە تێبینیی ڕوونمان هەیە لەوەی کە ڕەنگە لە لووتکەی ناتۆدا ڕووبدات، بەڵام دوای

نزیکەی سی خولەك لە هێرشی بێوچانی ترەمپ و هەورەها ڕوونکردنەوەکانی منیش ئینجا ئەو لە مەبەستەکە تێگەیشت. باڵیۆزەکەمان لە ناتۆ، کای بایلی هەچیسۆن لە کاتی نیوەڕۆ پەیوەندی پێوە کردین، منیش پوختەی قسەکانی نێوان ترەمپ و ستۆلتنبێرگم پێ گوت، هەروەها پێم گوت ئێمە فێڵ لە خۆمان دەکەین ئەگەر بڵێین ئەم پەیوەندییەی نێوان ترەمپ و ستۆلتنبێرگ وەك ئەوە وابێت کە ڕووینەداوە و هەروەك شێوەی جاران کارەکان بەڕێوە ببەین.

لە کاتێکی تری هەمان ڕۆژ دیسانەوە پوختەکەیم بە پۆمپەیۆ گوتەوە، هەروەها لەجیاتی قسەکردنی ڕاستەوخۆ لەسەر ناتۆ، ئەو پێشنیاری ئەوەی کرد کە لەگەڵ بوونی کێشەیەکی زۆر (بەتایبەتیش کەمپینەکەی کاڤانو بۆ دادگای باڵا) ئەوا لە تواناماندا نابێت کە کۆمارییەکان ڕازی بکەین لە کێشەکانی تری لە پێشمانن، چونکە ٥١ سیناتۆری کۆماری هەبوو، هەروەها ئێمە نەماندەویست کە هیچ کامێکیان لەدەست بدەین بەهۆی کێشەکانی ناتۆوە. من و پۆمپەیۆ لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە هەریەکەمان بەجیا ئەم کێشەیە لەگەڵ ترەمپدا باس بکەین و بەبێ ئەوەی هیچ ژەنەراڵێك لەوێ بێت، ئیدی ترەمپ وا هەست دەکات کە جارێکی تر کێشەی نابێت لەگەڵ "دەستەی گەوران". کێلی لەسەر ستراتیژییەتەکەی ئێمە ڕەزامەند بوو، هەروەها ماتیسیش، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەزامەند بوو لەسەر ئەوەی کە دەنفۆرد بەشداری نەکات. من ماکگاهنم هاندا بۆئەوەی چاوی لەسەر کاڤانو بێت و وەکو "پلان بی" بەکاری بێنێت ئەگەر هاتوو من و پۆمپەیۆ شکستمان هێنا.

ڕۆژی دووشەممە ٢ی تەمموز ترەمپمان بینی، لەوێدا ئەوە ڕوون بوویەوە کە کارەکە زۆر لەوە ئاسانترە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد. باسی ئەو ژیربێژییەی نەکەوتنە شەڕەوە لەگەڵ هەمووانمان کرد، نەچوونە ژێرباری شەڕێك لەوەی کە زیاتر لە تواناماندایە، ئەمە بێجگە لە لەناوبردنی کاڤانو.

هەروەها باسی ئەوەمان کرد کە هانی ئەندامانی تری ناتۆ بدات بۆئەوەی بەخشینەکەیان بگەیەننە لە سەدا دووی داهاتی بەرهەمی ناوخۆییان. لەڕاستیدا ترەمپ بەبێ هیچ گفتوگۆیەك ڕازی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە چەند ڕۆژی دوای ئەوە لێی پرسیم کە بۆچی بەتەواوەتی لە ناتۆ نەکشێینەوە، بەڵام ئێمە ڕێگەمان لێ گرت. ئەمە ڕوون بوو کە کاری ئێمە هەر بەردەوامی هەبوو، یەکێکی دیکەش لەو هەنگاوانەی کە گرتمانەبەر تاوەکو لە گریمانەی هەڵچوون لەگەڵ هاوپەیمانانمان لە برۆکسڵ دووربکەوینەوە و هەروەها ترەمپیش لە شیمانەی کشانەوەی لە ناتۆ، ئەوەبوو کە دانوستانەکانمان سەبارەت بە نووسینەوەی ڕاگەیەنراوی کۆتایی خێراتر کرد. من گوشارم خستە سەر هەچیسۆن تاوەکو هەرچی زووە ڕاگەیەنراوەکە تەواو بکەین بەر لەوەی کە بەرپرسان بێنە برۆکسڵ، ئەمەش بۆ ئەوەی لە ڕوودانی هەر کێشەیەکی تر کەم بکەینەوە کە ڕووبەڕووی کۆمەڵەی حەوت ببێتەوە. ئەمە شتێکی نوێ بوو بۆ ناتۆ، هەروەها بووە هۆکاری بێزاریی هەندێکیان، لەوانەش فەرەنسا! هەروەها ئەوانەی سوودمەند بوون لە فرۆشتنی چەك بە ئەوانی تر لەگەڵ نزیکبوونەوەی کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکان و لەگەڵ ئەم هەڕەشە دیبلۆماسییەش: لەگەڵماندا ڕێك بکەون یان هیچ ڕاگەیەنراوێکی کۆتایی وجودی نابێت! من هەمیشە دەست خۆشی لە دەرەنجامێکی لەم جۆرە دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆری ویست بۆ ناتۆ تاوەکو ڕاگەیەنراوێکی کۆتایی لە سەرەتادا تەواو بکرێت. لە کۆتاییدا سەرکەوتین بەڵام پاش تێپەڕبوون بە بارودۆخێکی سەخت.

لەم کاتانەدا و لە ڕۆژی دووشەممە ٩ی تەمموز، ترەمپ دەستی کرد بە تویت:

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەموو وڵاتانی تر زیاتر بە ناتۆ دەبەخشێت. ئەمە دادپەروەرانە نییە و جێگای قبووڵیش نییە. ئەمە لەکاتێکدا

ئەم وڵاتـانە لەوەتەی مـن ئەو پۆسـتەم وەرگرتـووە دەسـتیانکردووە بە زیـادکردنی بەخشـینەکانیان بە نـاتۆ، پێویسـتە زیـاتریش ببەخشـن. ئەڵمانیـا بەڕێژەی ١%، ئەمریکا بەرێژەی ٤%، هەروەها ناتۆ سوودمەندە بۆ ...

.ئەورووپـا وەك لەوەی بـۆ ئەمریکـا. بەپێـی هەنـدێك حیسـابات بێـت، ئەمریکـا لە ٩٠%ی تێچووەکـانی نـاتۆ دەدات، لەکاتێـك کە وڵاتـانی تـر ناگەنە ٢%، سەرەڕای ئەوەی کە ئەورووپا بازرگانییەکی زیـاد لە پێویسـتی بە بڕی ١٥١ ملیۆن دۆلار هەیە لەگەڵ ئەمریکا، لەگەڵ بوونی بەربەستێکی زۆر گەورە لەسەر بەرهەمە ئەمریکییەکان. نەخێر!

ئەم تویتانە هەمان ئەو شتانەیان دووبارە گوتەوە کە ترەمپ بە ستۆلتنبێرگ و ئەوانی تری گوتبوو، بەڵام جیاوازییەکەی ئەوەبوو کە ئەم جارەیان خەڵکانێکی زۆرتر دەیبینن، هەروەها زۆرتریش لە ڕێگاوەن.

بەیانییەکی زوو "مارین وان"مان بەرەو "ئاندروز" بەجێ هێشت، کاتژمێر سێ، لەگەڵ ترەمپ بە چالاکیی؛ باسی هەڵبژاردنی کاڤانومان کرد. بەر لەوەی سواری هەلیکۆپتەرەکە بێت، ترەمپ بۆ ئەو ڕاگەیاندنانە قسەی کرد کە لەوێدا کۆببوونەوە، هەروەك هەموو جار لەو حاڵەتانە قسەی دەکرد. ترەمپ ئاماژەی بەوەدا کە لەگەڵ ئەو هەموو کێشانەی کە لەنێوان ناتۆ و بەریتانیادا هەن، بینینی پوتین ڕەنگە ئاسانترینیان بێت". ترەمپ لە زۆربەی گفتوگۆکان لە کاتی گەشتدا لەوە نەدەچوو زۆر دڵخۆش بێت لەبەر هەر هۆکارێك بێت. هێلیکۆپتەرەکە دواجار نیشتەوە و دابەزین، ئەویش لەگەڵ هەر سێ باڵیۆزی ئەمریکی لە برۆکسل بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشت (باڵیۆزی ئەمریکی لە بەلژیکا، باڵیۆزی ئەمریکی بۆ یەکێتیی ئەورووپی هەروەها باڵیۆزی ئەمریکی بۆ ناتۆ) بەرەو بارەگای دانیشتنی باڵیۆزمان لە بەلژیکا. لەنێو ئۆتۆمبێلەکەدا ترەمپ ڕەخنەی لە هەچیسۆن گرت سەبارەت بە قسەکانی لە ڕۆژی یەکشەممە لەبارەی ناتۆوە، ترەمپ گوتی هاچیسۆن ئەو ڕۆژە وەك ئەوە وابوو کە باڵیۆز بێت لە ئیدارەکەی ئۆباما. پاشان چووە

سەر بابەتی ئەوەی کە هاوپەیمانان لە ناتۆ پارەی تەواو خەرج ناکەن بەقەد ئەمریکا و هەروەها ئەم نادادپەروەرییەی کە لە بازرگانیکردن هەیە لەگەڵ ئەورووپا. من ئەگەرچی لەگەڵیاندا نەبووم بەڵام دەمتوانی بەتەواوی مێشکی بخوێنمەوە کە چی تێدایە، بێگومان سەرەتایەکی دڵخۆشکەر نەبوو. لە بەیانیی ڕۆژی چوارشەممە، ڕۆیشتم تاوەکو ترەمپ ئاگادار بکەمەوە لە نانی بەیانی لەگەڵ ستۆڵتنبێرگ و ڕاوێژکارانی. ترەمپ هاتە نێو ژوورە بچووکەکەی خواردن لە نهۆمی دووەمی شوێنەکە، کە من و ماتیس، پۆمپەیۆ، کێلی و هاچێسۆن چاوەڕێمان دەکرد، ترەمپ گوتی: "دەزانم من پشتگیریکەرێکی زۆرم نییە لەم ژوورە". پاشان باسی لێکهەڵوەشاندنەوەی ناتۆی کرد. ئەو زۆر لەسەر قسەکانی بەردەوام نەبوو کاتێك ستۆڵتنبێرگ گەیشت و ڕاگەیاندەکانیش هاتنە نێو ژووری نانخواردنەکە، ترەمپ گوتی: "زۆرێك لە (هاوپەیمانانی ناتۆ) بڕێکی زۆر قەرزاری ئێمەن و ئەمە چەندین دەیەیە بەم جۆرەیە". پاشان ستۆڵتنبێرگ ئەوەی ڕوونکردەوە کە لەوەتەی ترەمپ بووەتە سەرۆکی ئەمریکا ئەوا ٤٠ ملیار دۆلار لە ناتۆ زیادی کردووە، بەهۆی ئەوەی کە وڵاتانی تر پارەی زیاتریان داوە. پاشان ترەمپ بەردەوام بوو: "بەڕاستی جێگای داخە کە ئەڵمانیا ڕێککەوتنی گاز و نەوتی لەگەڵ ڕووسیادا کردووە. ئێمە ئەو وڵاتانە دەپارێزین کەچی ئەوان دەچن ڕێککەوتنی گاز و نەوت مۆر دەکەن، تۆ سەرنج بدە ئێمە دەتپارێزین کەچی تۆ دەچیت ئەو هەموو پارەیە دەخەیتە نێو دەستی ڕووسیا...! ئەڵمانیا بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی ڕووسیادایە، ئەڵمانیا لە سەدا یەك شتێك زیاتر دەداتە ناتۆ، کەچی ئێمە زیاتر لە سەدا چوار دەدەین، ئەمەش چەندین ساڵە بەم جۆرەیە و بەردەوامە، ئێمە بێگومان شتێك لەمبارەیەوە دەکەین، چونکە لەوە زیاتر بەرگە ناگرین، ئەڵمانیا بەتەواوەتی لەلایەن ڕووسیاوە دەستی بەسەردا گیراوە".

ستۆڵتنبێرگ هەوڵیدا سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە، دوای ئەوەی

ڕاگەیاندنەکان ڕۆیشتن گوتی کە زۆر خۆشحاڵە بەوەی ترەمپ لە بڕۆکسلە. بەڵام ترەمپ زۆر خۆشحاڵ نەبوو، ئەو گوتی کە تەنانەت ئەو زیادانەی بەم دوایە لەلایەن هەندێك ئەندامی ناتۆ بەخشرا هێشتا بەس نییە، بگرە هەر لە گاڵتە دەچێ. ئەو زۆر خەمبار و دڵتەنگ بوو بەرامبەر ناتۆ و یەکێتیی ئەورووپا. دووبارە گلەیی لە بارەگا نوییەکەی ناتۆ کردەوە، کە دەبوو پارەکە لە تانك خەرج کرابووایە نەوەك بارەگا، ئەمەش وەکو هەموو خاڵەکانی تر کە ترەمپ ورووژاندی بەڵام بەرگەی شالاوی وشەکانی نەدەگرت. دواتر پرسیاری کرد کە بۆچی ناتۆ لەجیاتی بارەگای سەرکردایەتی هەڵنەستاوە بە دروستکردنی عەمارێك بە بڕی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار. کە بەم جۆرە وەسفی کرد ئەم عەمارە ئامانجەکە بوو نەوەك بارەگاکە، ئەو گوتی ئەم بارەگایە تەنها تانکێك دەتوانێت خاپووری بکات. ئەو ئاماژەی بەوەشدا کە ناتۆ بۆ ئەورووپا زۆر گرنگە، بەڵام بۆ ئەمریکا کەمتر. ئەمریکا هەمیشە زیاد لە پێویست خەرجیی ناتۆی دابین کردووە. ستۆڵتنبێرگ جارجارە دەیویست قسەکانی پێ ببڕێت بەڵام نەیتوانی. هەروەها یەکێتیی ئەورووپاش نەیتوانی ئەمە بکات، چوون ترەمپ ڕەخنەی لە جان کلود یونکر (سەرۆکی کۆمسیۆنی ئەورووپا) گرت بەوەی کەسێکی دزێوە و زۆر ڕقی لە ئەمریکا دەبێتەوە. ترەمپ گوتی کە یونکر بوودجەی ناتۆ دیار دەکات، بەڵام ئەو ڕوونی نەکردەوە کە چۆن؟! دیسانەوە ترەمپ هاتەوە سەر ئەوەی کە ئەمریکا بوودجەی بۆ ناتۆ کەم دەکاتەوە تا ئاستی ئەڵمانیا بەرلەوەی زیادی بکات، هەروەك چۆن لە دواپەیوەندییان باسی ئەم شتانەی کرد. دوای ئەمجارە ترەمپ باسی دۆستایەتی خۆی کرد لەگەڵ ستۆڵتنبێرگ و پاشان جاریکی تر هاتەوە سەر ئەوەی کە هەموو دەیانزانی ئێمە لە هەمووان زیاتر خەرجیی ناتۆمان دابین کردووە، بەڵام ئەمە ئیتر بەردەوام نابێت. لەم کاتەدا ماتیس هەوڵی دا هەندێك قسە لە بەرژەوەندیی ناتۆ بکات، بەڵام ترەمپ دووری خستەوە.

کاتێك ترەمپ پرسی کە بۆچی ئێمە بچینە نێو جەنگی سێیەمی جیهانی لەجیاتی هەندێك دەوڵەت کە تەنانەت حەقی خۆشییان نادەن، بۆ نموونە مەکدۆنیا؛ ئەگەرچی دواتر دانی بەوە دانا کە بەقەد ئەڵمانیا بێزاری ناکات، ئەڵمانیاش وڵاتێکی دەوڵەمەندە کەچی خەرجییەکانی خۆی بۆ بەرگری دابین ناکات. هەروەها گلەیی لە ڕاوێژکارەکانی خۆی کرد بەوەی گوتی ئێمە لەم کێشەیە نەگەیشتبووین، ئەگەرچی ئەمە ڕاستییەکەمان پێ دەڵێت. ترەمپ بە ڕوونی وای بیردەکردەوە کە تەنها ڕێگەیەك وا بکات ئەم وڵاتانە پارەی زیاتر بدەن ئەوەیە کە بڕوا بکەن ئەمریکا لە ناتۆ دەکشێتەوە، ئەمەش شتێك بوو کە باکی بەرامبەری نەبوو، چوون ئەو باوەڕی وابوو کە ناتۆ سوودی بۆ ئەمریکا نییە.

ستۆڵتنبێرگ دیسانەوە هەوڵی دا قسەکانی پێ ببڕێت بەڵام ترەمپ بەردەوام بوو ل ەقسەکردن سەبارەت بەوەی کە زۆربەی ئەندامانی ناتۆ پارەی تەواویان نەداوە و هەروەها ترسی خۆی دووبارە کردەوە لەوەی کە ئەمریکا لەجیاتی ئەم وڵاتانە بچێتە جەنگی سێیەمی جیهانی. ئینجا هەر بەردەوام بوو، ئەوەبوو پرسیاری کرد باشە بۆ دەبێت ئەمریکا پارێزگاری لەم وڵاتانە بکات، وڵاتانی وەکو ئەڵمانیا! چەندین جار ئەوەی دووبارە کردەوە کە بۆ دەبێت ئەمریکا ئەم خەرجییە زۆرە بدات و هەروەها گوتی کە هاوپەیمانانی ناتۆ کاتێك ئێمە لێرە نەبووین بە ئێمە پێکەنیون و گاڵتەیان پێ کردووین!

پاشان چووینە سەر باسی ئۆکرانیا و هەروەها نیمچە دوورگەی کریمیا، لەوەی کە ئاخۆ ڕووسیا پارەیەکی زۆری لەوێ خەرج کردووە، چونکە ئەو ڕێگە بەوە نادات سەرەڕای ئەوەی کە ئۆباما کردی. بۆچی ترەمپ باسی جەنگی ئەمریکای کرد، لەلایەکی تر ستۆڵتنبێرگ وەڵامی دایەوە کە ئۆکرانیا جیاوازە و وڵاتێك نییە سەر بە ناتۆ بێت. ترەمپ بەوە وەڵامی دایەوە کە ئۆکرانیا وڵاتێکی گەندەڵە، دواجار نانی بەیانییەکە لە کۆتایی

نزیك بوویەوە. پاشان ستۆلتنبێرگی دڵنیاکردەوە کە ئەو سەد لە سەد لەگەڵیەتی، ئاماژەی بەوە دا کە ئەو پشتیوانیی ستۆلتنبێرگ دەکات لە مانەوەی وەکو ئەمینداری گشتی ناتۆ. لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا دەبوو وڵاتانی تری ناتۆ پارەی زیاتر بدەن و ئەمریکاش تا ئاستی ئەڵمانیا بوودجەی بۆ ناتۆ کەم بکاتەوە. لەم کاتەدا ماتیس ڕووی کردە من و بە هێمنی گوتی: "بەڕاستی ئەم بابەتی خەریکە بێتام دەبێت"، پاش ماوەیەکی کەم ترەمپ گوتی بە ژەنەڕاڵ ماتیس دەڵێم کە ئیتر پارە بۆ ناتۆ سەرف نەکات، ستۆلتنبێرگ لە کۆتاییدا گوتی ئێمە لەسەر خاڵی سەرەکی ڕێککەوتین.

نانی بەیانی تەواو بوو، تۆ بڵێی ڕۆژ هەبێت لەمە خراپتر؟! بەڵێ.. چووین بۆ بارەگای ناتۆ، ئەمە یەکەم جارم بوو بچم بۆ ئەوێ. بیناکە بەڕاستی نموونەی تەلارسازی بوو، ئەوە لە تێچووەکەی ڕەنگی دابووەوە. لووتکەکە لە کردنەوەی نزیك بوویەوە، من لە تەنیشت جێرمی هەنتەوە دانیشتم، کە ئەویش دووەم ڕۆژی بوو وەکو وەزیری دەرەوەی بەریتانیا. ئەو گوتی کە سەیری سەرانی وڵاتان دەکات لەوکاتەی وێنەی خێزانی دەگرن، کە شتێکی پڕ ئەتەکێت و مۆدێلە، هەروەها هەندێك سەرۆك هەن کەم قسە دەکەن و هەندێکیش هەن زۆر؛ تۆ دەتوانیت لە یەك خولەکدا بۆت دەربکەوێت کە ئەوانە کێن". ئەمە ڕوانگەیەکی تایبەت و گرنگ بوو، دواجار مەڕاسیمەکە دەستی پێ کرد و سەرەتا ستۆلتنبێرگ قسەی کرد و ڕاگەیەنراوی ئامادەکراوی خوێندەوە، ئەمەش جیاواز بوو لە دانیشتن و لووتکەی پێشوو، هۆکارەکەشی پلانی پێشوو بوو.

ترەمپ یەکەم کەس بوو وتار بدات، وتارەکەشی کە لەلایەن ستافی نووسەرانی بە وریاییەوە ئامادەکرابوو، بێگومان بە یارمەتی ئەوانی دیکەش، وتارەکەی وەك ڤانێلایەکی سادە و ڕوون لە ڕووی مەبەستەوە. یەکەمین ئاڕاستەی بۆ مێرکڵ بوو کاتێك گوتی: "ئێمە هێشتا بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی ڕووسیادا نین" مێرکڵ لەبارەی پوتینەوە پرسیاری کرد، بەڵام

ترەمپ خۆی دزییەوە، بەوەی گوتی کە ئەو هیچ ئەجێندایەکی نییە. لەجیاتی ئەوە ویستی دووبارە قسەی زیاتر لەسەر باجی گومرك بکات کە ئەو وای دادەنا لەسەر بەرهەمە ئەمریکییەکان دانراوە، لەسەر بەرهەمەکانی وەکو ئۆتۆمبێل و بارهەڵگرەکان، کە ئەمەش زۆر زیان بە ئەڵمانیا دەگەیەنێت، پاشان گلەیی کرد -هەروەك زۆرجاری تریش وای گوتووە- کە ئەو باجەی لەسەر ئۆتۆمبێلی ئەمریکی هەیە زۆر لەوە زیاترە لە باجەکانی ئێمە. پاشان هاتە سەر ماکرۆن و بەوە تۆمەتیاری کرد کە هەمیشە زانیارییەکانی ئەوان دەبات بۆ ئەوانی تر، کە ئەمەش لەلایەن ماکرۆنەوە ڕەتکرایەوە و پێدەکەنی. هەروەها ترەمپیش پیکەنی و سەیری ماتیسی کرد وەکو ئەوەی بە ئاماژە پێی بڵێت کە دزەکردنی زانیارییەکان لەلایەنی ئەمریکاوە لە کوێوە هاتووە. ماکرۆن دەیویست بزانێ کە ترەمپ لە جەنگی ئابووری لەگەڵ چین و یەکێتیی ئەورووپا تا کوێ دەڕوات، بەڵام ترەمپ گوتی ئەمە گرنگ نییە. سەبارەت بە یەکێتیی ئەورووپا ئەو باوەڕی وابوو کە ئەوان باجی ئۆتۆمبێل و بارهەڵگرەکان کەم دەکەنەوە، تا ڕاددەی سەدا بیست و پێنج. پاشان هاتە سەر جان کلود یونکر، کە ئەو پێی وابوو ڕقی لە ئەمریکا دەبێتەوە. ماکرۆن دەیویست "ڕێککەوتنێکی گشتگیر" لەگەڵ ئێران بکرێت هەروەك لە مانگی نیسان قسەیان لەسەر کردبوو، بەڵام لەوە دەچوو کە ترەمپ زۆر گرنگی پێ نەدات. لەگەڵ ئەوەشدا بە ئۆتۆمبێل تا ناوەڕاستی شاری برۆکسل ڕۆیشتین. من ئەو شەوە جێگەکەم دا بە هەچیسۆن لە خوانی ئێوارە وەکو ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە بەم بارودۆخەدا ڕەت بوو، جگە لەوەش من هێندەم بەس بوو، هەروەها خەریك بوو شتەکان هێور دەبوونەوە.

کاتژمێر پێنج و چل و پێنج خولەکی بەیانیی ڕۆژی پێنجشەممە هۆتێلم جێ هێشت بۆ ئەوەی ترەمپ ببینم، بەڵام ئەو لەنێو ئۆتۆمبێلەکە پرسیاری لێ کردم "من دەمەوێ پێت بڵێم کە ئایا ئەمڕۆ تۆ ئامادەی لە نێو تاخم و

كۆمەڵە گەورەكاندا ڕۆڵ ببینیت؟" ئەو مەبەستی لەم فەرمانە بوو كە "ئێمە ڕێزی ناتۆ دەگرین، بەڵام تا ئێستا نادادپەروەرانە لەگەڵمان هەڵسوكەوت كراوە، تاوەكو كانوونی دووەم دەبێت هەموو وڵاتانی ناتۆ پابەند بن بە خەرجكردنی لە سەدا دوو، هەروەها ئێمەیش لەو قەرزانە خۆش دەبین كە لە كاتی خۆیدا نەدراونەتەوە، یان دەكشێینەوە و بەرگری لەم وڵاتانە ناكەین كە ئەم شتانە جێبەجێ ناكەن. ئێمە لەگەڵ ڕووسیا ناگەینە ڕێككەوتن كەوابوو لەگەڵ ناتۆشدا نین، چوون وڵاتانی ناتۆ چەندین ملیار دەدەن بە ڕووسیا، بۆیە ئەگەر ئیمزا لەسەر پرۆژەی بۆری گازەكە بكەن، ئەوا ئێمە لە ناتۆ دێینە دەرەوە". ئەمە بەتەواوی ڕێك نەكرابوو، بەڵام دیاربوو مەبەست و ئاڕاستەكەی ڕوون بوو. ئەوكاتە دەمویست بڵێم ئاخۆ لە كۆتایی ئەمڕۆ دەست لەكاردەكێشمەوە، ئەوەبوو یەكسەر پەیوەندییەكە پچڕا. بە خۆمم گوت كە تەنها ١٠ خولەكم لەپێشە بەرلەوەی ترەمپ ببینم تاوەكو بزانم كە دەبێت چی بكەم. پەیوەندیم كرد بە كێلی و باسەكەم بۆ ڕوونكردەوە، هەروەها پێم گوت كە پێچەوانەی پلانەكەی دەبوو بچێتە بارەگای ناتۆ. كاتێك چووم بۆ بارەگای باڵیۆزخانە بە جێگری سەرۆكی كاروباری سەربازیم (كە تۆپە بەناوبانگەكەی لەدەست بوو، ئەوەی كە ڕەمزی هاوێشتنی ئەتۆمی لەسەرە) گوت كە ماتیسم بۆ بدۆزێتەوە، من نەمدەتوانی یەكسەر بیخەمە بەرباس (شتێكی باش بوو كە لە حاڵەتی جەنگدا نەبووین). دەركەوت كە ماتیس جەستن ترۆدۆ دەبینێت لە بارەگای ناتۆ. هەر بەڕاستی ئەو كەوتبووە نێو گاڵتەیەكی ترسناك، بە خۆمم گوت ئایا ماتیس سزا دەدرێت. لەولاوە پۆمپەیۆ لە بارەگای ناتۆ چاوەڕێی دەكرد، منیش هەڵوێستی ترەمپم بۆ ڕوونكردەوە: "ئەمڕۆ هەڕەشەی كشانەوە دەكات"، بەڵام خۆشبەختانە وەك هەموو جار ترەمپ دواكەوت. بۆیە زانیمان كە دەبێت چی بكەین، تاكو ئەوكاتەش سیناریۆكەی كاڤانو باشترین شت بوو. هەروەها بیرمان لەوە كردەوە كە بوودجەی خەرجیی

ئەمریکا بۆ ناتۆ کەم بکریتەوە لە سندوقی بەخشینەکە تاوەکو دەگاتە ئاستی ئەڵمانیا، هەروەها بەشی ئەمریکاش کەم بکریتەوە لە سەدا ٢٢ بۆ سەدا ١٥.

ترەمپ لە کاتژمێر هەشت و نیو گەیشت؛ پرسیاری کرد، "ئایا دەتەوێت شتێکی مێژوویی ئەنجام بدەیت؟"؛ ئەوەبوو هەمان ئەو شتەی گوتەوە کە پێشتر گوتبووی: "ئێمە ئیدی دەچینە دەرەوە"، پاشان گوتی کە ئەو نەیدەویست لە خوانی دوێنێ ئێوارە هەچیسۆنی لەگەڵدا بێت، ترەمپ پێی گوتم کە "دەبوو تۆ لە خوانی دوێنێ ئێوارەدا بووایت". "من دەمەوێ بڵێم کە ئێمە دەچینە دەرەوە، چونکە ئێمە زۆر دڵخۆش نین"، ترەمپ لە قسەکانی بەردەوام بوو، بە پۆمپەیۆی گوت "دەمەوێ ئەوە بەدەست بێنیت". ترەمپ گوتی کە "کیث کیلوج (ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی پێنس) هەموو شتێك لەبارەی ناتۆوە دەزانێت. تۆ دەزانیت کە من لە دوای ماکماستەر دەمویست ئەو بکەم بە ڕاوێژکار بۆ ئاسایشی نەتەوەیی، ئەو هەرگیز ڕایەکانی خۆی ناڵێت هەتا من داوای لێ نەکەم، جگە لەوەش ئەو کەسێکی ناسراو نییە و لەسەر تەلەفزیۆن دەرناکەوێت، بەڵام من جۆنم بەدڵە بۆیە ئەوم هەڵبژارد". (دواتر کە من و پۆمپەیۆ بیرمان لێ کردەوە، زانیمان کە ئەم قسەیەی ترەمپ دەرخەری ئەوەیە ئەگەر هاتوو من بەم نزیکانە دەستم لە کار کێشایەوە، ئەوا کێ دێتە شوێنەکەی من. هەروەها گوتم "بێگومان ئەگەر دەستم لە کارکێشایەوە ئەوا ڕەنگە کیث بێتە وەزیری دەرەوە". ئێمە پێکەنین و پاشان پۆمپەیۆ وچانێکی دا و گوتی " ئەگەر هاتوو هەردووکیشمان بەیەکەوە دەستمان لە کار کێشایەوە، ئەوا دەشێ کیث بێت بە هێنری کێسنجەر و دوو پۆستی هەبێت".)

لەگەڵ ترەمپ تا بۆمان کرا مەسەلەی کاڤانومان خستە بەرباس و پاشان چووینە نێو ئۆتۆمبێلەکە. ئەوەبوو لە ڕێگادا بۆ بارەگای ناتۆ گەیشتمە ماتیس، لەنێو دانیشتنی گشتی دەرم کرد تاوەکو سەبارەت بە جۆرجیا و

ئۆکرانیا بدوێم، کە لە غیابی ترەمپ دا قسەی لەسەر کرا، ئەوەی پێویست بوو بە پوختی پێم گوت.

کاتێك گەیشتین، ترەمپ چووە نێوان کورسی ستۆڵتنبێرگ و تێریزا مەی (سەرۆکان لەوێ لەسەر بنەمای ئەلف بێ کورسییەکانیان لەسەر مێزی ناتۆ دیاری کرا بوو). ترەمپ ئاماژەیەکی کرد و لێی پرسیم "ئایا شتێکی وابکەین؟"، منیش هانم دا کە وانەکات و گوتم کە پێویستە بەتوندی ڕەخنە لەو وڵاتانە بگرێت کە بەتەواوی خەرجییەکان لە ناتۆ دابین ناکەن، بەڵام هەڕەشەی کشانەوە یان بڕینی هاوکارییەکانی ئەمریکا نەکات، بۆیە "بچۆرە سەر هێڵەکە، بەڵام تێمەپەڕێنە"، بەم جۆرە کۆتاییم بە قسەکەم هێنا. ترەمپ سەری ئەرێنی لەقاند، بەڵام هیچ وشەیەکی نەگوت. گەڕامەوە بۆ کورسییەکەی خۆم بەبێ ئەوەی بزانم کە ئەو چی دەکات. وام هەست کرد کە ژوورەکە هەموو سەیری ئێمە دەکەن. ترەمپ لە نزیك کاتژمێر ٩:٢٥ خولەك دەستی پێ کرد و بۆ ماوەی پازدە خولەك قسەی کرد، هیچ شتێکی لەسەر ئۆکرانیا و جۆرجیا نەگوت، بەڵام دەستی کرد بە گازندە و ویستی جۆرێك لە سکاڵا بگەیەنێت، بەڵام هەستی کرد کە ئەم کارە قورسە، چوون خەڵکانێکی زۆر لە ئەمریکا هەستیان بەوە دەکرد کە وڵاتانی ئەوروپا هاوکارییەکانیان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە ناگەیەنن کە دەبوو بگاتە چوار لە سەدا (بەپێچەوانەی ڕێککەوتنی کاردیف بۆ ساڵی ٢٠١٤ کە دەگەیشتە دوو لە سەدا).

ترەمپ گوتی کە ساڵان دێن و سەرۆکی تری ئەمریکی دێن و سکاڵا دەکەن، بەڵام دوایی دەڕۆن و هیچ شتێك ڕوونادات، ئەگەرچی ئێمە سەدا ٩٠ی خەرجییەکانمان دەدا وەکو هاوکاری بۆ ناتۆ، بەڵام هیچ شتێکی زۆر نەگۆڕاوە. ترەمپ گوتی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێی وایە کە ناتۆ گرنگە، بەڵام زیاتر بۆ ئەوروپییەکان گرنگترە، کە ئەمەش لە ئێمەوە دوورە. ئەو ڕێزی زۆر بۆ مێرکڵ هەبوو، ئاماژەی بەوە دا کە

باوکی ئەڵمانییە و دایکی سکۆتلەندییە. پاشان گازندەی ئەوەی کرد کە ئەڵمانیا ١,٢ لە سەدای لە قازانجی بەرهەمی ناوخۆی وەك هاریکاری داوەتە ناتۆ، تاوەکو ساڵی ٢٠٢٥یش بەنیازە تەنها بیگەیەنێتە ١,٥ لە سەدا. لە ٢٩ ئەندامی ناتۆ[1] تەنها پێنجیان لە سەدا دوویان داوە. ترەمپ گوتی ئەگەر ئەم وڵاتانە دەوڵەمەند نەبووان، ئەوا دەکرا لێکتێگەیشتنێك هەبێت، بەڵام ئەم وڵاتانە هەموویان دەوڵەمەندن. ترەمپ گوتی کە ئەمریکا دەیەوێت لە پارێزگاریکردن لە ئەوروپا بەردەوام بێت، بەڵام ئەوە بووە بێسەروبەرییەکی گەورە و دووروودرێژ سەبارەت بە بازرگانی و یەکێتیی ئەوروپا، بۆیە ئەو پێی وایە دەبێت ئەمە لەگەڵ ناتۆدا گرێ بدرێت، تاوەکو بەتەواوەتی شرۆڤەی بۆ بکرێت.

یەکێتیی ئەوروپا پێشوازی لە بەرهەمەکانی ئەمریکا ناکات، ئەمەش شتێکە چیتر ئەمریکا ڕێگەی پێ نادات، بەڵام هەر تەنها ئەلبانیا باسی ئەم بابەتەی کرد لەمیانەی خوانی دوێنێ ئێوارە. هەموو ئەو شتانە خستنییەوە هەمان ئەو بارودۆخەی کە چوار ساڵ بوو تێیدا بووین. ترەمپ لە کۆمەڵێك شتدا لەگەڵ ئەوروپییەکان جیاواز بوو، بۆ نموونە وەکو مەسەلەی کۆچبەران و هەروەها کۆنترۆڵەکردنی سنوورەکان لەلایەن یەکێتیی ئەوروپاوە. یەکێتیی ئەوروپا ڕێگەی دەدا بە کەسانێك بێنە نێو وڵاتەکانییەوە کە دەشێ لە داهاتوودا ببنە دوژمن و شەڕکەری لە دژیان، بەتایبەتیش زۆرینەی ئەو کۆچبەرانە گەنج بوون.

---

(١) لە ئێستادا ئەندامانی ناتۆ ٣٠ وڵاتن، کە بەم جۆرە بەپێی ساڵانی ئەندامێتییان ڕیز دەکرێن: بەلژیکا، کەنەدا، دەنیمارك، فەرەنسا، ئایسلەند، ئیتاڵیا، لوکسمبۆرگ، نەیدەرلاند -هۆڵەندا-، نەرویژ، پرتوگال، بەریتانیا، ئەمریکا ١٩٤٩، یۆنان، تورکیا ١٩٥٢، ئەڵمانیا ١٩٥٥، ئیسپانیا ١٩٨٢، کۆماری چیك ١٩٩٩، هەنگاریا ١٩٩٩، پۆڵەندا ١٩٩٩، بولگاریا، ئەستۆنیا، لاتیڤیا، لیتوانیا، ڕۆمانیا، سلۆڤاکیا، سلۆڤینیا ٢٠٠٤، ئەلبانیا، کرواتیا ٢٠٠٩، مۆنتینیگرۆ -چیای ڕەش-، ٢٠١٧، هەروەها مەکدۆنیای باکوور ٢٠٢٠.

ترەمپ بەم جۆرە لە قسەکانی بەردەوام بوو، ئەو گوتی کە زۆر ڕێز لە ناتۆ و ئەمینداری گشتی، ستۆلتنبێرگ دەگرێت. هەروەها گلەیی لەوەکرد کە ئەندامانی ناتۆ دەیانەوێت سزای ڕووسیا بدەن کەچی لەولاوە ئەڵمانیا لە ڕێگەی پرۆژەی نۆرد ستریمی دووەمەوە بە ملیار دۆلار دەبەخشێت بە ڕووسیا. ئەو دەیگوت کە ڕووسیا بەهۆی گەمژەییەکەوە یاری بە هەموومان دەکات، چوون ئێمە ملیاران دۆلارمان خەرج کردووە بەهۆی ئەم پرۆژەی گازەوە، کە لەسەر ئێمە پێویستە ڕێگر بین لەبەردەم جێبەجێکردنی. ئەمریکا دەیەوێت ببێت بە هاوبەشێکی نوێ لەگەڵ ئەورووپا، بەڵام لەسەر هاوپەیمانانیش پێویستە کە بەشی خۆیان هاریکاری ناتۆ بکەن. ترەمپ گوتی بۆ نموونە ئەڵمانیا دەتوانێت لە ئێستاوە لە سەدا دووی خەرج بکات و چاوەڕێی ساڵی ٢٠٣٠ نەکات، هەروەها مێرکڵیشی بەناوی خۆیەوە بانگ کرد لە نێو ئەم ژووورە گەورەیە. هەروەها گوتی کە ئەمریکا بە هەزاران میل لێرەوە دوورە، ئاماژەی بەوە کرد کە بۆ نموونە ئەڵمانیا یارمەتی ئۆکرانیای نەداوە. هەرچۆنێك بێت ئۆکرانیاش یارمەتی ئەمریکای نەداوە، بەڵکو یارمەتی ئەورووپای داوە، کە وەکو هاوسنووری ئەورووپایە لەگەڵ ڕووسیا. بە گەڕانەوە بۆ خاڵی سەرەکی، ترەمپ گوتی کە ئەو دەیەوێت هەر ئێستا هەموو ئەندامان هاریکارەکانیان بگاتە لە سەدا دوو، کە هەر تەنها پێنج وڵات لەکۆی ٢٩ وڵات لە ئێستادا ئەم بڕە وەك هاریکاری پێشکەشی ناتۆ دەکەن، تەنانەت لەنێوان ئەو هەموو وڵاتە دەوڵەمەندە و بگرە تانەت فەرەنسای دۆستیش. ترەمپ گوتی کە ئەو نایەوێت ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانی ببینێت سەبارەت بەم لووتکەیەی ناتۆ، کە تێیدا هاتبێت هەموو ئەندامانی ناتۆ دڵخۆش بوون، چونکە تا ئێستا ئەمریکا یاری پێ کراوە و پاشانیش شتی زیاتر و زۆرتر هەیە.

دوای ئەوە، کە نزیکی کۆتایی بوویەوە، ترەمپ گوتی کە ئەو سەد لە سەد لەگەڵ ناتۆدایە و تەنانەت ملیۆن لە سەداش. بەڵام لەسەر ئەندامان

پێویست بوو کە تا کۆتایی کانوونی دووەم لە سەدا دوویان بەخشیبوایە، یان ئیدی لەمەوپاش ئەمریکا هەر بڕاردەیەکی بویێت دەیکات. پاشان گەڕایەوە سەر ئەوەی کە بۆچی ئەو بارەگا سەرەکییە نوێیەی ناتۆی بەدڵ نییە، کە ئێستا ئێمە هەموو لێی کۆبووینەتەوە، چوون ئەو پێی وابوو هەر تەنها یەك تانك دەتوانێت ئەو بینایەیە خاپوور بکات. ترەمپ بەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنا کە ئەو زۆر پابەندبووە بە ناتۆ، بەڵام چیتر پابەند نابێت بەم بارودۆخەی ئێستا. ئەو دەیویست ئەندامانی ناتۆ چەندی لەتوانایاندا هەیە هەر ئێستا ببەخشن نەوەك دوای چوار یان شەش ساڵی دیکە، چونکە ئەم بارودۆخەی ئێستا بۆ ئەمریکا جێگەی قبووڵ نییە، ئەو دەیویست ئەمە تۆمار بکرێت.

ترەمپ ئەوەی کرد کە من هیوام بۆی دەخواست، ئەگەر پەنجە پێیەکانی چەندین جار ئەم هێڵەیان تێپەڕاند. لەگەڵ ئەوەشدا، لێکدانەوەی قسەکانی زۆر قورس بوو بەوەی وێنا بکرێن کە ئەمە ئاماژەیە بۆ کشانەوە لە ناتۆ. لەوانەیە کاتێك بەسەر ئەمەدا تێپەڕیبێت کاتێك خەڵکان دەپرسن، کە بۆچی من لەم پۆستەدا مامەوە. بێگومان ئەمەی باس کرا یەکێك بوو لە هۆکارەکان.

پاش چەند خولەکێك، سەرەی مێرکڵ هات بۆ ئەوەی قسە بکات، پێشنیاری ئەوەی کرد کە ستۆڵتنبێرگ مێزێکی بازنەیی بێنێت تاوەکو هەموو چانسی ئەوەیان هەبێت وەڵامی قسەکانی ترەمپ بدەنەوە. لە کۆبوونەوەکە حکوومەتەکان باسی کێشە ناوخۆییەکانیان کرد، ڕێك وەك ئەوەی کە ئێمە دەبێت خەم بۆ کێشە ناوخۆییەکانی ئەوان بخۆین یان وەك ئەوەی کە ئێمە کێشەی ناوخۆمان نەبێت. سەرۆك وەزیرانی هۆڵەندی مارك ڕوتی خاڵێکی زۆر گرنگی وروژاند، ئەویش ئەوەبوو کە گوتی ترەمپ لەسەر حەقە و لەوەتەی بۆتە سەرۆك پێداگریی لەمە کردووە. ڕوتی گوتی کە بەپێچەوانەی ئەمەوە ئەورووپییەکان وەك ئەوەی تازە تێگەیشتبن لەگەڵ

ئامانجەکانی ئۆباما لەوەی دوو لە سەدا بدەن ئەوا بەتەواوی بۆ ئەوکات بوو، بەلام ئێستا زەمەن گۆڕاوە. وادیاربوو ئەو بەتەواوەتی لە پەیامەکە گەیشتووە. دواتر شێتانەترین لێدوان لەلایەن سەرۆك وەزیرانی چیکەوە درا، کە گوتی ئەو هەموو هەولێك دەدا بۆئەوەی کە تاوەکو سالی ٢٠٢٤ بیگەیەنێتە لە سەدا دوو، بەلام لەڕاستیدا بەرهەمە نێوخۆیەکانیان زۆر بەخێرایی بەرز دەبوویەوە، لەگەل ئەوەشدا دلنیا نەبوو لەوەی ئاخۆ ئەم هاریکاری بەرگرییە بەردەوام دەبێت یان نا. لەڕاستیدا ئەمە مانای وابوو کە ئەوانە زۆر بەخێرایی دەولەمەندبوون بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باش بەرگری لەخۆیان بکەن. لەپڕ ترەمپ هەلیدایێ و گوتی کە ئەوانیش هەمان کێشەیان هەیە، هەمان کێشە و بگرە گەورەتریش، ئەمەش بەهۆی گەشەکردنی ئابووری ئەمریکا. هەروەها گوتی کە بارودۆخەکە زۆر نادادپەروەرانەیە و زۆر ناجێگیرە، بۆیە پێویستە بگەینە ئەنجامێك، یان دەبێت ئەندامان بەرپرسیارەتی لەئەستۆ بگرن، یان دوای ئەوە کێشەمان دەبێت.

ترەمپ ئەوەی ڕوونکردەوە کە هەوالی نۆرد ستریم گەورەترین هەوالە لە واشنتۆن. خەلکی دەلێن کە ئەلمانیا خۆی ڕادەستی ڕووسیا کردووە (بەدلنیاییەوەش لەڕاستیدا هەر وای گوت). ترەمپ پرسی کە چۆن خۆمان لە ڕووسیا بپارێزین، ئەگەر هاتوو هاوپەیمانان خەرجیی ئەوە لە ئەستۆ نەگرن؟! ترەمپ گوتی کە ئەو هەریەك لە هەنگاریا و ئیتالیای خۆش دەوێ، بەلام ئەمە تەواو بۆ ئەمریکا نادادپەروەرانەیە کە ئەوان بەشی خۆیان هاریکاری پێشکەش ناکەن. ئەمریکا ئەو ولاتانەی دەپاراست کە بازرگانی لەگەل دەکردن. لەوە زیاتری پێ نەبوو بۆ گوتن، بەلام جارێکی تر دووپاتی کردەوە کە دەبێت ئەنجامێکی ڕازیکەر هەبێت، پاش ئەوە ئەمریکا دەبێت بە هاوبەشێکی گەورە. ترەمپ گوتی کە ئەو نایەوێت چیتر ئەزیەتی ولاتەکەی بدات بەوەی بلێن ئاخ ئێمە چەندە گەمژەبووین کە

هاریکاریمان پێشکەش کرد بۆ پاراستنی پرۆژەی نۆرد ستریم.

ترەمپ لەگەڵ سەرانی تری وڵاتان کە لە ژوورەکەدا بوون خەریکی ڕێککەوتنێك بوو، بەبێ ئەوەی ئەوان هیچ نووسراوێکی ئامادەکراویان لەبەردەست بێت. شتێکی تر کە بینیمان ئەوەبوو هەندێك لە سەرکردەی وڵاتان گوتیان ناتوانین ئەوە قبووڵ بکەین کە ترەمپ داوای دەکات سەبارەت بە بڕی هاریکارییەکان، چونکە ئەمە پێچەوانەی ئەو خاڵانەیە کە پێشتر لەسەری ڕێککەوتوون، هەروەك منیش بە ستۆڵتنبێرگم گوت کە ئەمە دەبێتە هەڵەیەکی گەورە. ئەگەرچی ئەو ڕازی بوو، بەڵام ڕێی لە ڕوودانی گرت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە دیاربوو کە بارودۆخە زۆر قورسە.

جەستن ترۆدۆی کەنەدی پرسیاری کرد "باشە چۆن، ئایا ئەم مەسەلەیە ئیتر دەتەقێتەوە؟" منیش وەڵامم دایەوە "کاتێکی زۆر لەبەردەست ماوە، ئەم هەڵەیە چییە کە دەبێت ڕووبدات؟" ئیتر هەردووکمان پێکەنین. ئەو تێبینییەم دایە ترەمپ کە سەبارەت بە کەمکردنەوەی هاریکاری و خەرجییەکانی ئەمریکا بوو بۆ سندوقی هاوبەشی بەخشین، کە ئەویش دایە دەستی ستۆڵتنبێرگ و ئەویش کە بینی یەکسەر زەرد هەڵگەڕا. بەڵام هیچ نەبێت ئێستا لەسەر مێزەکەیە، لەگەڵ هەندێك لێدوان لەلایەن ئەوانەوە، ئەوەبوو کۆبوونەوەکە کۆتایی هات و ئیتر بەرەو ئامادەکردن بۆ کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی ترەمپ ڕۆیشتین کە بە بەراورد بەوەی سەنگافوورە زۆر هێمنتر بوو. ئەوەبوو ترەمپ باسی ڕۆڵی ئەرێنی خۆمانی کرد بۆ ڕووداوەکانی ئەمڕۆ. دەرەنجامەکان ئاشکرا و ڕوون بوون: ئەمریکا پێداگری کرد لەسەر ئەندامانی ناتۆ کە دەبێت پابەند بن بەو بڕەیەی کە دەبوو پێشکەشیان کردبوایە. بەڕاستی ئەمە پێشتر زۆر جێگای سەرنج نەبوو، بەڵام ئاخۆ چەندە ڕەنج و هەوڵی دا هەر تاوەکو بگات بە شتێکی پڕوپووچ. لە ڕاستیدا، بەدڵنیاییەوە ئەمە ماوەی سەرۆکایەتی ئۆباما نەبوو. ترەمپ لە کۆنفرانسی سەرۆکان وەستا سەبارەت بە ئەفغانستان بۆئەوەی

هەندێك ئاماژە بدات کە پێشتر ئامادەکرابوون، هەروەك ئاماژەی بەوەش کرد ڕۆحییەتێکی گەورە هەیە کە ئەو بە پێشوەچوونی ناتۆی دەزانێت. لەگەڵ ئەوەشدا، گوشارمان لێی کرد کە دوای ئەوە ڕاستەوخۆ بەرەو فڕۆکەخانە بڕۆین هەروەك بڕیار بوو، بۆئەوەی نەکەوینە نێو قەرەباڵغیی هاتوچۆی نێو بڕۆکسل و لەوە زیاتر قەرەباڵغتر نەبێت. کاتێك ڕۆیشتین، مێرکڵ قسەی دەکرد، ترەمپ ڕۆیشت بۆ لای تاوەکو ماڵئاوایی لێ بکات و ئەویش هەڵسایەوە بۆئەوەی تەوقەی لەگەڵدا بکات. بەڵام لەجیاتی ئەوە ترەمپ هەر دوو ڕومەتی ماچ کرد و گوتی "من ئەنجێلام خۆش دەوێ". ژوورەکە هەمووی بەیەکەوە چەپڵەیان لێدا. ئەوێمان جێ هێشت. لەم شەوەدا ترەمپ تویتێکی کرد کە:

ئەمڕۆ لە ناتۆ سەرکەوتنێکی گەورەمان بەدەست هێنا! ئەندامانی ناتۆ چەندین بلیۆن دۆلار زیاتریان پێشکەش کرد، لەوەتەی من هەڵبژێردراوم. ڕۆحییەتێکی چەندە گەورەیە!

گەشتەکە لە ڕێگەی وشکانی بوو، بەڵام ناتۆ ترەمپی نارد بۆ هێلسنکی بۆ دیداری پوتین و تاوەکو دوای ئەوە هاوپەیمانێتییەکی گشتگیر ڕابگەیەنن، لەجیاتی ئەو هەڵوێستە توندەی ئێمە کە داهاتووی ناتۆی دیاری دەکرد.

## لەندەن

فڕۆکەی سەرۆك بەرەو فڕۆکەخانەی ستانستێدی لەندەن بەڕێ کەوت، کە تیایدا "مارین وان"مان بۆ "وینفیلد هاوس"ی بارەگای باڵیۆزمان بردبوو. پاش ئەوە چووین بۆ هۆتێلەکەمان تاوەکو جلی فەرمی لەبەر بکەین و پاشان گەڕاینەوە بۆ وینفلد هاوس، ئینجا بە هێلیکۆپتەر چووین بۆ کۆشکی بلینهایم، کە لەوێدا سەرۆك وەزیران تێریزا مەی خوانی ئێوارەی ساز کردبوو. ئەم کۆشکە کاتی خۆی بۆ جۆن چەرچڵ بنیات نرابوو، لەلایەن شازادە مارلبۆڕۆ وەکو خەڵاتێك بەرامبەر سەرکەوتنی لە ساڵی ١٧٠٤ بەسەر سوپای لویسی چوادەیەم لە جەنگی ئیسپانی، کە ئەمەش وای لە بەریتانیا کرد، ئەوکات ببێتە هێزێکی بێڕکابەر، بەڕاستی کۆشکی بلینهایم ناوازە بوو. پێیان گوتین کە ئەمە تاکە پاڵاس بوو لەلایەن بنەماڵەی شاهانەوە خاوەندارێتی نەکراوە. وینستۆن چەرچڵیش هەر لێرە لەدایك ببوو، کە دەکاتە کوڕەزای شازادەی یەکەم. ئاهەنگەکە بە هاتنی هێزێك کە جلی سووریان لەبەردابوو، هەروەها یەکەی سەربازی لە کاتی خۆرئاوابوون، دیمەنێکی زۆر سەرسامکەر بوو، هەروەك چوونە ناو کۆشکەکەش زۆر گەورە بوو. من و سێدویل لەسەر مێزەکە و لەتەك بەرپرسانی تر و خێزانەکانیان دانیشتین. شازادە مارلبۆرۆی ئێستا و باڵیۆزانی بەریتانیا و ئەمریکا و خێزانەکانیان. من دەمتوانی هەندێك تیایدا بگەڕێم بەڵام کەشوهەوایەکی ناخۆش نزیك بوو. یان دەبوو لە کاتژمێر دە و نیوی شەو بگەڕێینەوە بۆ لەندەن، یان هیچ کاتێك دیارنەبوو بۆ گەڕانەوە، بۆیە ئێستا کاتی گەڕانەوە بوو.

بۆ بەیانیی ڕۆژی هەینی، لەگەڵ چاوپێکەوتنێکی ترەمپ ڕۆژم کردەوە، کە لە برۆکسل لەگەڵ ڕۆژنامەی سەن ئەنجامی دابوو، بەشێوەیەکی بنەڕەتی باسی تێکدانی ستراتیژیەتی چوونە دەرەوەی بەریتانیا بوو لە

یەکێتیی ئەوروپا. دەرچوونی بەریتانیا لە یەکێتیی ئەوروپا مەسەلەیەکی وجوودیی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گرنگییەکی تایبەتی هەبوو بۆ ئەمریکا. هاندەری سەرەکی دەرچوونی بەریتانیا لە یەکێتیی ئەوروپا بریتیی بوو لەوەی کە توانای کۆنترۆڵکردنیان نەماوە بەسەر یاسای هاوڵاتیبوون، کە میکانیزمەکانی لە برۆکسل دەردەچوو. بیرۆکراسیەت لەسەر ئەم پەرلەمانانە کۆمەڵێك یاسای دادەنا کە دەبوو پێیەوە پابەند بن، هەروەها لەدەستدانی دیموکراسییەت لەزیادبووندا بوو. بۆ بەریتانییەکان، برۆکسل بەشێوەیەکی گاڵتەجارانە بریتی بوو لە جۆرجی سێیەم، دەزگای دووری (بە شێوەیەکی سیاسی ئەگەر جەستەیش نەبێت) و بێسەروبەری، دەزگایەکی چەوسێنەر بوو کە لە ساڵی ٢٠١٦ لەلایەن زۆرینەی دەنگدەرە بەریتانییەکانەوە ڕەتکرایەوە و ٤٣ ساڵەی یەکێتیی ئەوروپای پێچەوانە کردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، جێبەجێکردنی دەنگدانەکەش بەشێوەیەکی زۆر خراپ بەڕێوەبرا، کە دەبووە هۆی هەڕەشە لە جێگیریی سیاسی لە خودی بەریتانیا خۆی. دەبوو زیاتر و زیاترمان کردبوایە بۆ ئەوانەی کە دەیانویست لە یەکێتیی ئەوروپا دەرچن، هەروەها بەدڵنیاییشەوە من هەوڵم دا، بەڵام بەداخەوە جگە لە من و ترەمپ، لەوەدەچوو هیچ کەسێکی تر لە ئیدارەکە گرنگی پێ نەدا. ئەمەش بە ڕاستی کارەساتێك بوو دەبوو بەرگەی بگرین. وەفدی ئەمریکی بە هێلیکۆپتەر چوون بۆ ساندهێرست، ئەکادیمیای سەربازیی بەریتانی، کە لەوێدا وەزارەتی بەرگری ڕاهێنانێکی بۆ هێزی هاوبەشی نێوان بەریتانیا و ئەمریکا ساز کرد، بۆ ئەوەی سەربازگەیەکی تیرۆریستان خاپوور بکەن. کاتێك ترەمپ، تێریزا مەی بینی داوای لێبوردنی لە ڕاگەیاندنەکان کرد و هیچ لێدوانێکی نەدا. وام بە مێشکدا هات کە هیچ کەسێك لە ماوەی هەژدە مانگی ڕابردوو ترەمپی نەبردووەتە دیار ڕاهێنان و تاقیکردنەوەکانی سەربازانی ئەمریکی. ئەگەر شتێکی لەم جۆرەی بینیبوایە لەوەو پێش، ئەوا ڕەنگە توانیبامان کە نیمچە

دوورگەی کۆریا لە جەنگ ڕزگار بکەین. دواتر لە ساندهێرستەوە بە هێلیکۆپتەر چووین بۆ چێکوێرس، بۆ کۆبوونەوە سەرەکییەکانی بازرگانی.

جێرمی هەنت و ئەوانی تر هاتنە پاڵ مای و سێدویل، لە ژووری سەرەکی لە بەرامبەر ئاگردانەکە دەستمان بە کۆبوونەوەکە کرد، پاش ئەوەی بە باسی یەمەن دەستمان پێ کرد، مای چووە سەر باسی سووریا، بە تایبەت چۆن ڕەفتار لەگەڵ بوونی ڕووسیا لە سووریا بکەین، زۆر دووپاتی ئەوەی کردەوە کە پوتین هەر تەنها حیساب بۆ هێزەکانی خۆی دەکات، دیاربوو بۆ ئەوەی بوو کە ترەمپ سەرنج بدات و ئەمە بگرێتە ئەستۆی. من ئەوەم ڕوون کردەوە کە پوتین بەر لە چەند هەفتەیك پێی گوتبووم (پێشتر باسکرا) سەبارەت بە دەرکردنی ئێران لە سووریا، کە بەریتانییەکان گومانیان لێی هەبوو. گوتم: "من شایەتیی لەسەر ڕاستگۆیی پوتین نادەم"، تێریزا مەی وەڵامی دامەوە: "زۆرباشە جۆن، ئێمە بەشێوەیەکی تایبەت ئەمەمان لە تۆ چاوەڕێ نەدەکردا"، بە گشتی هەموو پێکەنین.

ئەمەش وای کرد کە ڕووسیا هێرش بکاتە سەر سکریپاڵ (کە خۆی و کچەکەی بوون)[1]، سێدویل بە جۆرێك وەسفی کردن کە ئەمە هێرشێك بوو بە چەکی کیمیاویی بەڵام بە هێزی ئەتۆمی بوو. ترەمپ پرسیاری کرد، ئۆهـ، ئەرێ تۆ هێزی ئەتۆمی؟، کە من پێم وابوو ترەمپ مەبەستی گاڵتە نەبوو لەمە.

مای پرسیاری کرد کە بۆچی ڕووسییەکان ئەمەیان کرد، ترەمپیش گوتی کە ئەویش دوێنێ شەو لە بلینهایم هەمان پرسیاری کردووە، پێی وایە کە

---

(١) سێرگی سکریپاڵ، ئەفسەری ڕووسی و بریکاری هەواڵگریی بەریتانی بوو. واتە هەواڵگری دوو-لایەنە بوو. لە ڕۆژی ٤ی ئازاری ٢٠١٨ لەگەڵ کچەکەی یولیا (٣٣ ساڵ) هەوڵی ژەهراویکردنیان درا بە گازیی نوفیچوك، هەروەك حکوومەتی بەریتانی ئەوکات وای بڵاوکردەوە. پەنجەی تۆمەتیش بۆ ڕووسیا درێژکرا و ڕووسیاش ڕەتی کردەوە.

ئەوان دەیانەوێت بەم کردارە پەیامێك بگەیەنن. ڕەنگە ئەمە ئەوە بگەیەنێت کە ڕووسیا مەبەستیەتی هەرچییەك بیەوێت دەتوانێت بیکات لە دژی ئەوانەی لە پاراستنی ڕووسی کاریان کردووە و دواتر دابڕاون و جیابوونەتەوە، ئەمەش بۆ ترساندنی ئەوانەی کە بیر لە کارێکی لەم جۆرە دەکەنەوە.

تێریزا مەی گوشاری لەسەر ترەمپ کرد کە لە هێلسنکی بە هێزەوە لەگەڵ پوتین دابنیشێت، ترەمپیش ڕازی بوو و گوتی کە پوتین داوای دانیشتنی کردووە (ئەمەش پێچەوانەی حەقیقەت بوو)، دووپاتیشی کردەوە کە لەسەر هیچ شتێك نایەتە خوارەوە. (دواتر زانیم کە وەزارەتی داد خەریك بوو ڕاگەیەنراوێك دەربکات بەناوی لیستەی تۆمەتبارکردنی میولەر لە دژی ١٢ ئەفسەر لە ئەفسەرانی هەواڵگریی ڕووسی بە تۆمەتی دەستێوەردان لە هەڵبژاردنەکان، کە من پێم باش بوو بەر لە لووتکەکە ڕابگەیەنرێت، بۆ ئەوەی پوتین بیربکاتەوە).

لەمیانەی خوانی نیوەڕۆ کە لە پاش کۆبوونەوەکە ئامادەکرابوو، باسمان لە کێشەی دەرچوونی بەریتانیا لە یەکێتیی ئەورووپا کرد، هەروەها گۆشەنیگای ترەمپ لەبارەی دانوستان لەگەڵ کۆریای باکوور، پاشان چین و سەردانەکەی ترەمپ لە مانگی تشرینی دووەمی ٢٠١٧. هەروەها گوتی کە بە هەزارەها سەرباز بەخێرهاتنیان کردووە و "هیچ شتێکی لەم جۆرە پێشتر لە مێژووی جیهاندا نەبووە". لە کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی کۆتاییدا، ترەمپ هەموو هەوڵێکی خۆی دا تاوەکو بەسەر ئەم گەردەلوولە ئاگرینەدا زاڵ بێت کە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ ڕۆژنامەی سەن نابوویەوە، کە ئەمەش وای لە ڕاگەیاندنی بەریتانی کردبوو ناوی بنێت "تەواو پێچەوانە"، لەڕاستیشدا هەر لەوە دەچوو.

ترەمپ پەیوەندیی نێوان ئەمریکا و بەریتانیای بە جۆرێك وەسف کرد کە لە ئاستی "بەرزترین پەیوەندیی تایبەت"دایە، ئەمەش جۆرێکی نوێی

پەیوەندییە. دوای گەڕاندنەوەی مارین وان بۆ وینفیلد هاوس، بە هێلیکۆپتەر چووین بۆ قەڵای ویندسۆر بۆ ئەوەی ترەمپ شاژن ئەلیزابێس ببینێت، کە ئەمەش کەرنەڤاڵێکی تر بوو، هەروەها پڕبوو لە باندی سەربازی و پاڵتۆسوورەکان. هەر یەك لە ترەمپ و شاژن بە بەردەمی سەربازیی شەڕەفدا ڕابووردن، دواتر بۆ ماوەی کاتژمێرێك کۆبوونەوە (هەروەها خانمی یەکەمی ئەمریکاشی تێدابوو). بەڵام ئەوانی دیکەی وەك ئێمە، چای و فینگەرمان بۆ ئامادەکرابوو لەگەڵ ئەندامانی ماڵە شاهان، کە زۆر جوانپۆش و ڕێکوپێك بوون، بەڵام ئێمەی باش پەروەردەنەکراوی کۆلۆنیاڵ، لەسەر دڵی هەندێ کەس قورس بووین. پاشان جارێکی تر بە مارین وان ڕۆیشتین بۆ ستانستێد و لەوێ بە فڕۆکە ڕۆیشتین بۆ سکۆتلەندا، بۆئەوەی لە هاوینەهەواری تێرنبێریی ترەمپ بۆ گۆلف بمێنینەوە.

هاوینەهەوارەکە لە فیرث کلاید زۆر گەورە بوو، زۆرێك لە ئێمە لە دەرەوە کۆبووینەوە تاوەکو چێژ لە دیمەنەکە ببینن، تاوەکو کەسێك هات ئۆتۆمبێلی کەم-کێشی دەهاژۆشت، وەکو پایسکیلێك وابوو کە باڵی هەبێت (وەك دواتر زانیمان ئەمە یەکێك بوو لە خۆپیشاندەرانی گرینپیس) بە ڕێگاکەدا دەڕۆیشت و لافیتەیەکی بەرزکردبوویەوە نووسرابوو "ترەمپ بێئاستە". ئەوەبوو خزمەتگوزاریی هەواڵگریی ترەمپیان لە ژوور ڕاگرت لەگەڵ هەمووواندا، تەنها من و کێلی نەبێت، کە بە چەند هۆکارێك لە دەرەوە بووین بۆئەوەی چێژ لەم دیمەنە ببینین، بەڵام دواتر بڕیاریان دا کە ئێمەیش دەبێ بچینە ژوورەوە.

ئێمە تاوەکو ڕۆژی یەکشەممە لە تێرنبێریدا ماینەوە، هەروەها ترەمپ لەوێ یاری گۆلفی کرد، پاشان لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلی نەتەنیاهۆ قسەمان کرد. بابەتی سەرەکی بریتی بوو لە چاوپێکەوتنەکەی ئەم دواییەی نێوان پوتین و نەتەنیاهۆ کە بە تایبەت لەبارەی سووریاوە قسەیان کردبوو. لە یەکبینینی من و ئەو لەپێشتردا، نەتەنیاهۆ پێی گوتم، پوتین گوتوویەتی

دەبێت ئێران لە سووریا بچێتە دەرەوە، هەروەها گوتبووی کە ئەویش هەمان ئامانجی ئێمەی هەیە، بەڵام ئەسەد کێشەی هەیە کە ڕێگری لە پوتین دەکات بۆئەوەی گوشار بخاتە سەر ئێران. بێگومان ئەسەد پشتی بە هێزە ئێرانییەکان بەستبوو بۆ پێشوەچوونەکانی لە ئیدلیب لە دژی ئۆپۆزسیۆنی سووریا و ژمارەیەك گرووپی تیرۆریستی. مامەڵەکردن لەگەڵ ئیدلیب شتێکی جیابوو، بەڵام ئەسەد هیچ بەهانەیەکی نەبوو بۆ ئەوەی ئەم جۆرە چەکانە بێنێت کە تەنها بۆ هەڕەشەکردن لە ئیسرائیل بەکاردێت. پوتین گوتی کە ئەو تێدەگات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پەیمانێکی نەدا. هەروەها ئیسرائیل پێی وابوو کە ئەمریکا نیگەرانە لە بوونی ئێران لە سووریا، کە ئەمەش هەمان ئەو شتە بوو کە پوتین گوتی، بەوەی کە لەم مەسەلەیە دەگات تەنانەت ئەگەر ڕایان جیاوازیش بێت. نەتەنیاهۆ گوشاری لە پوتین کردبوو لەسەر مەسەلەی "سنوورێکی هەمیشەیی" لەسەر بەرزاییەکانی جۆلان، کە ئەمەش ئامانجی درێژمەودای ئیسرائیلە لەگەڵ سووریا لەلایەك و ئیسرائیل لەلایەکی تر. ئەمەش بۆ من مانای وابوو کە لابردنی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ناوچە جیاکراوەکان و گەڕانەوە بۆ حاڵەتی "ئاسایی". ئیسرائیل ماوەیەکی زۆر بوو کە جۆلانی کردبوو بە پاشکۆی خۆی و دەیویست ئەم ڕاستییە بچەسپێنێت، بۆیە جێبەجێکردنی باری سنوور هەنگاوێکی گرنگ دەبوو. من گومانم هەبوو لەوەی کە ترەمپ ئەم بابەتە لەگەڵ پوتین دەخاتە ڕوو، ئەو ئەوەندە بە وردی ورووژاندی، کە ترەمپ پێشتر ڕووبەڕووی شتێکی لەم جۆرە نەبووەتەوە.

فڕۆکەی سەرۆکایەتی لە ڕۆژی ١٥ی تەمموز فڕۆکەخانەی "پرستویك"ی بەرەوە هێلسنکی بەجێ هێشت. ترەمپ خەریکی سەیرکردنی یاریی جامی جیهانی تۆپی پێ بوو لە مۆسکۆ، من هەوڵم دا لەوکاتەدا بە پوختی باسی کێشەی چەك داماڵینی بۆ بکەم کە دەشێت لەگەڵ پوتیندا قسەی لەسەر

بکات. ئەوەم بۆ ڕوون کردەوە کە بۆچی ڕێککەوتنی ستارتی نوێ کە ئۆباما واژووی لەسەر کردبوو؛ کارەساتە، هەروەها ترەمپ لە میانە بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی ۲۰۱٦ ڕەخنەی لێ گرتبوو، بێگومان ئەمە شتێکیش نییە کە بشێت بۆ ماوەی پێنج ساڵی تر درێژی بکەینەوە، کە ئەمە ویستی مۆسکۆ بوو. باسی ئەوەم بۆ کرد کە کۆمارییەکان لە ساڵی ۲۰۱۰ لە ئەنجوومەنی پیران لە دژی ئەم ڕێککەوتنە بە جیاوازیی ۲٦-۱۳ دەنگ دەنگیان دا، هیوام خواست ئەمە باوەڕ بە ترەمپ بکات. هەروەها باسی ڕێککەوتننامەی مەوداناوەندیی چەکی ئەتۆمی INF ـمان کرد (هەروەها بۆچی من دەمویست دەستبەرداری ببین) و بەرنامەی نیشتمانی بۆ مووشەکی بەرگری (کە من گوتم نابێت لەگەڵ ڕووسیادا بکەوینە ڕێککەوتن لەبارەیەوە)، بەڵام من زۆر دوور نەڕۆیشتم. خەریکی قسە بووین لەکاتێکدا ترەمپ سەیری یارییەکەشی دەکرد، ترەمپ لەبارەی "ماتیس"ەوە گوتی "ئەو دیموکراتیی لیبراڵییە، تۆ ئەوە دەزانی، ئەی وانییە؟" هەروەها ترەمپ پرسیاری کرد کە ئاخۆ من مارك میلی دەناسم، پاشان سەرۆك ئەرکانی سوپا، کە ئەمەش شتێکی زۆر سەنجڕاکێش بوو، چونکە میلی پاڵێوراو بوو بۆ سەرۆك ئەرکان کاتێك ماوەی دەنفۆرد لە ئەیلوولی ۲۰۱۹ کۆتایی دەهات. لە پنتاگۆنەوە باوەڕێکی فراوان هەبوو کە ماتیس لەسەر ئەوە سوورە ڕێگری لە میلی بکات. من بە ترەمپم گوت کە پێویستە بەلایەنی کەمەوە سێ ناوی لەبەردەستدا بێت لە وەزارەتی بەرگرییەوە بۆ هەموو شوێنە گرنگەکانی وەکو ستاف و شوێنەکانی فەرمان و سەربازی. ئەم کردارەش بەجۆرێك بوو کە کاتێك گەیشتمەوە، بە ماتیسم گوت بۆ هەر شوێنێك ناوێك ئامادە بکات، من پێم وابوو ئەمە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە لەکۆنترۆڵکردنی سوپا، ئەمەش مەسەلەیەك بوو لە تەواوی ماوەکەم وەکو ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی لەسەری ڕۆیشتم، لەگەڵ بوونی تەنها چەند سەرکەوتنێکی تێکەڵ. هەروەها باسی ئەوەم لەگەڵ ترەمپ کرد، کە پێویستە چۆن لەگەڵ پوتین سەبارەت

بە دەستێوەردان لە هەڵبژاردنەکان مامەڵە بکات.

بەتایبەتیش لە ئێستادا کە تۆمەتەکانی میولەر بۆ یەکەی هەوڵگریی سەربازی بە شێوەیەکی ئاشکرایە. ئێمە هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی ڕادەستکردنەوەمان لەگەڵ ڕووسیادا نەبوو، هەروەها دەستووری ڕووسیا ڕێگری دەکات لە ڕادەستکردنەوەی تاوانباران، بۆیە ئەگەری ڕادەستکردنەوەی ئەوانە زۆر لەڕادەبەدەر بچووك بوو. لەسەر ئەم بنەمایەش من وا ئامۆژگاریم کرد کە شتێکی لەم جۆرە داوا لە ڕووسیا نەکات، هەروەك زۆرێك لە دیموکرات و کۆمارییەکان پێشنیارییان کردبوو. داواکردنی شتێك کە باش دەیزانین نامانکات بە پەککەوتە، لەجیاتی ئەوە من پێشنیارم کرد ترەمپ بڵێت: "من دەمەوێ بیانهێنمەوە بۆ ئەمریکا تاوەکو بێتاوانییان بسەلمێنم"، کە لەوەدەچوو ئەمەی بەدڵ بێت. ترەمپ گوتی: "تۆ پێویستە لەسەر ئەمە دەستخۆشیت لێ بکرێت". دەیویست بڵێت کە ئەگەر هاککەری ڕووسی هێندە ترسناك بوو، دەبوو ئۆباما لە ساڵی ٢٠١٦ شتانێکی زۆری لەمبارەیەوە کردبوایە، کە ئەمەش ڕاست بوو.

نووسراوێکم سەبارەت بە دەستێوەردانەکانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکان دا بە ترەمپ، داوام لە ئۆفیسی ڕاوێژکاریی کۆشکی سپی کردبوو سەرلەنوێ دایبڕێژێتەوە. ترەمپ گۆڕانکارییەکی زۆری تیدا کرد کە ئەمەش ئاماژە بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ بابەتەکە زۆر نائاسوودەیە. ئەو بە وردی مامەڵەی لەگەڵ ئەم نائاسوودەییەی کرد سەبارەت بەم نووسراوە و توانی بە خاڵێکی توند بەرهەڵستی بکات و لە ڕادەستکردنی نووسراوەکە بە پوتین. لە کۆتاییدا، ترەمپ بڕیاری دا نووسراوەکە بەکارنەهێنێت، دواتر ئەوەبوو داوای لە من کرد ئەم بابەتی دەستێوەردانی هەڵبژاردنەکان بووروژێنم، منیش گوتم لە کاتی خوانی نیوەڕۆدا وادەکەم، بەڵام بێگومان من هەر تەنها کەسێك نەبووم کە لەوێ بووم و بەتایبەتیش بەم جۆرە و بە تەنیا لەگەڵ پوتین.

# هێلسنکی

لە هێلسنکی دابەزین و بەرەو هۆتێل کالاستاتۆرپا[1] بەڕێ کەوتین. لە بەیانیی ڕۆژی دووشەممە بەنێو تونێلەکەدا ڕۆیشتم بەرەو خانەی مێوانداریی هۆتێلەکە، تاوەکو ترەمپ ئاگادار بکەمەوە لە خوانی بەیانی لەگەڵ سەرۆکی فینلەندا؛ سولی نینستو. من بۆ یەکەم جار لە ئەیلوولی ١٩٩٠ لەگەڵ جەیمس بەیکەر لەم تونێڵەدا ڕۆیشتم تاوەکو ئامادەکاری بکەین بۆ کۆبوونەوەی جۆرج بوش لەگەڵ میخائیل گۆرباشۆف، لەدوای شەڕی سەدام لەگەڵ کویت لە مانگی ئاب. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە تەلەفزیۆنی فینلەندی چەندین دیمەنی نێوان کۆبوونەوەی بوش-گۆرباشۆف نیشان دا کە بێکۆتا بوو، ڕەنگە بۆ ئەوەبوو بێت کە ئەمە دواجاربوو سەرانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت/ڕووسیا لە هێلسنکی کۆببنەوە. من یەکێك بووم لەو کەسە کەمانەی لەنێو ئیدارەکەی ترەمپ کە ئەم لووتکەیەی نێوان بوش-گۆرباشۆفیان لەبیر بێت، ئەوە لەوەش مەپرسە کە تیایدا ئامادە بووبن. لەم کۆبوونەوە بچووکەماندا کە بۆ ئامادەکاری بوو، ترەمپ بە زۆری سکاڵای لەدەست جێف سیشنز کرد بەهۆی سنوور تێپەڕاندنەکانی ئەم دواییەی، ترەمپ گوتی ئەو "عەقڵی لەدەست داوە". من سەرلەنوێ جەختم لەسەر مەسەلەی دەستێوەردانەکانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا کردەوە، بەڵام ترەمپ هەروەك یەکەم جار وابوو، بەوەی هیچ حەزی لە ورووژاندنی ئەم بابەتە نەدەکرد، چوون ئەو پێی وابوو کە ئەمە پرسیار دەخاتە سەر شەرعییەتی هەڵبژاردنی ئەو و حەکایەتی ڕاونانی جادووگەرەکان لە دژی ئەو.

لە کاتژمێر ٩:٣٠ی بەیانی بۆ خواردنی نانی بەیانی بەرەو کۆشکی مانتینیمی

(١) Kalastajatorppa لە دەقە ئینگلیزییەکەدا، لە دوای ئەم ناوە بۆڵتن بە تەوسەوە لە نێو دوو کەوانەدا نووسیویەتی (فەرموو، هەوڵبدە بیخوێنەرەوە) ئەمەش وەکو ئاماژەیەك بۆ قورسیی خوێندنەوەی وشەکە بۆ ئەوان.

ڕۆیشتین کە لەوێوە نزیك بوو، ئەم کۆشکە ماڵی سەرۆکی فینلەندی بوو. ئەگەرچی ئێمە بابەتگەلێکی زۆرمان تاوتوێ کرد، بەڵام نینستۆ ویستی بە سێ خاڵ لەبارەی ڕووسیاوە دەست پێ بکات، یەکەم چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ پوتین بوو. نینستۆ باسی ئەوەی کرد کە پوتین کاتی خۆی جەنگاوەر بووە، بۆیە لەسەر ترەمپ پێویستە هەرکاتێك ئەو هێرشی کرد، ترەمپ کاردانەوەی هەبێت. دووەم، نینستۆ جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە زۆر ڕێز لە پوتین بگرێت، چونکە ئەگەر هاتوو توانییان ڕاستگۆیی دروست بکەن لەنێوانیاندا، ئەوا شتەکە زۆر تایبەتتر دەبێت. سێیەمیش، دیسانەوە نینستۆ ترەمپی ئاگادار کردەوە وەك ئەوەی لە یاریی بۆکسێن بێت، نابێت ترەمپ بە هیچ جۆرێك دەستپێك یان تەنانەت یەك ئینجیش نەدەیتە پوتین. نینستۆ قسەکانی خۆی بە وتەیەکی فینلەندی کۆتایی پێ هێنا "قەوقازییەکان هەموو شتێکی شلوخاو لەگەڵ خۆیاندا دەبەن"، هەروەها نینستۆ گوتی کە سوپای فینلەندی لە ۲۸۰۰۰۰ سەرباز پێك دێت. ئەمە مەبەستی ئەوە بوو کە ئەگەر هاتوو شەڕیان لەگەڵ کرا، ئەوە باجەکەی قورس دەبێت.

ترەمپ پرسیاری لێ کرد کە ئاخۆ دەیەوێت بێنە نێو ناتۆ، بەڵام نینستۆ نە گوتی بەڵێ و نە گوتی نەخێر، بەم جۆرە مەسەلەکەی بە کراوەیی جێ هێشت. نینستو گەڕایەوە سەر بابەتەکەی خۆی و گوتی کە پوتین هێندە گەمژە نییە کە هێرش بکاتە سەر وڵاتێکی ناتۆ. ئەمە لەکاتێکدا پێی وابوو کە پوتین هەڵەیەکی کرد کاتێك هێرشی کردە سەر دونباسی ئۆکرانی، چوون ئەو لای وا نییە کە پوتین بیەوێت نیمچە دوورگەی کریمیا بگەڕێنێتەوە سەر ڕووسیا. ترەمپ خەتاکەی خستە سەر ملی ئۆباما، هەروەها ئەو ڕێگە بە هیچ جۆرە هەڵسوکەوتێکی لەم جۆرە نادات، جەختیشی لەوە کردەوە کە ئەگەر ئەو سەرۆك بوایە بە هیچ جۆرێك نەیدەهێشت ئەمە ڕووبدات.

گەڕاینەوە بۆ کالاستاتۆرپا، ئێمە هەواڵێکی وامان پێ گەیشت کە فڕۆکەکەی پوتین درەنگ لە مۆسکۆوە بەڕێ کەوتووە، ئەمەش وەکو هەڵسوکەوتی خۆی کە هەمیشە وادەکات مێوانەکانی لەچاوەڕوانیدا بمێننەوە. من هیوام دەخواست کە ترەمپ بێزار بێت بۆئەوەی زیاتر لە پوتین تووڕە بێت، هەرچۆنێك بێ بڕیارمان دا کە پوتین هەندێك چاوەڕێ بکات لە نێو کۆشکی سەرۆکایەتی فینلەند (کە تیایدا لووتکەکە لەوێ دەبەسترێت، هەروەك لە ساڵی ١٩٩٠ دا کرا).

بەشێوەیەکی سەرسامکەر لە کۆبوونەوەکە تەواو بووین، کۆبوونەوەکە دوو کاتژمێر و دووچۆڵی بوو. ئەوەبوو دواتر ترەمپ پوختەی کۆبوونەوەکەی بۆ کێلی و پۆمپەیۆ و هەنتسمان و من ڕوون کردەوە. زۆربەی قسەکان دەربارەی سووریا بوون، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر یارمەتییە مرۆڤایەتییەکان و سەرلەنوێ بنیاتنانەوە (کە ڕووسیا بە گشتی دەیویست خۆرئاوا پارەکە دابین بکات) هەروەها لەگەڵ وەدەرنانی ئێران. ترەمپ گوتی کە پوتین زۆربەی قسەکانی کردووە و ئەو گوێی گرتووە، کە ئەمەش کلیلەکە بوو. لە ڕاستیدا وەرگێڕە ئەمریکییەکە دواتر بە فیۆنا هێڵ و جۆی وانگی وتبوو کە پوتین لە سەدا نەوەدی قسەکانی ئەم کۆبوونەوەیەی کردووە (ئەمە جگە لە کاتی وەرگێڕانەکە)؛ هەروەها نەوەشی گوتبوو کە ترەمپ پێی گوتووە نابێت هیچ تێبینییەك بنووسێت، بۆیە ئەو هەر تەنها دەیتوانی زانیارییەکان لەنێو مێشکیدا پوخت بکاتەوە، کە ئەمەش یارمەتیدەر نەبوو. ترەمپ گوتی کە پوتین دەیەوێت لە سووریا بچێتە دەرەوە و هەروەها ئەو نەتەنیاهۆی بەدڵە. جگە لەوە ترەمپ گوتی کە لەوە دەچێت پوتین زۆر گرنگیی بە دەرچوونمان لە ڕێککەوتنی ئەتۆمی لەگەڵ ئێران نەدات، ئەگەرچی ئەو گوتوویەتی کە ڕووسیا لە ڕێککەوتنەکە دەمێنێتەوە. سەبارەت بە مەسەلەی بازرگانی لەگەڵ چیندا، ڕووسیا ڕەخنەی لە سیاسەتی توندی ئەمریکا گرتبوو، بەڵام ترەمپ

گوتبووی کە هیچ بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نەبووە. پوتین خوازیاری ئەوەبووە کە ئەمریکا کاری بازرگانی زیاتر لە ڕووسیادا بکات و ئاماژەی بەوە دابوو کە یەکێتیی ئەورووپا بە ڕێژەی بیست هێندەی ئەمریکا بازرگانی لەگەڵ کردوون. خاڵی سەرەکی ئەوەبوو کە هیچ ڕێککەوتنێك لە ئارادا نەبوو لەبارەی هیچ شتێك، نە هیچ دەستلێهەڵگرتن و دەستلێبەردانێك، تەنانەت هیچ گۆڕانکارییەکی جەوهەریش لە ئارادا نەبوو لە سیاسەتی دەرەوە. من دڵخۆش و ئاسوودە بووم. هیچ سەرکەوتنێکمان بەدەست نەهێنا، بەڵام ئەمە هیچ کێشە نەبوو، چونکە من سەراپای ئەم کۆبوونەوەیەم وەکو کرداری کۆنترۆڵکردنی زیانەکان دەهاتە بەرچاو.

پاشان چووینە سەر باسی دەستیوەردان لە هەڵبژاردنەکان، ترەمپ گوتی یەکەم جار من ئەم باسەم وروژاند. بەڵام ئەفسوس، پوتین ئامادەی ئەم پرسیارە بووە، ئەو گوتبووی کە ڕێگە دەدات بە میولەر لێکۆڵینەوەکانی خۆی بکات، هەتا ئەوکاتەی کە لێکتێگەیشتن هەیە سەبارەت بە بیل برۆودەر، کە بازرگانێك بوو و ڕژێمەکەی پوتین لە ڕووسیا پارێزەرەکانی دەستگیر کردبوو. هەروەها سێرگی ماگنیتسکی کە ئەمیش لەلایەن ڕژێمەکەی پوتینەوە دەستگیرکرابوو و دوای کوژرا. ئێرل برۆودەر کە باپیری برۆودەر بوو، بۆ چەندین ساڵ سکرتێری حیزبی شیوعی ئەمریکی بوو لەنێوان ساڵانی ١٩٣٠ بۆ ١٩٤٠، هەروەها ژنێکی سۆڤیەتیی هێنابوو. ئەم کوڕەزا کاپیتالیستە، کە ئێستا هاووڵاتی بەریتانی بوو، لەڕووی بازرگانییەوە زۆر باش بوو بۆ ڕووسیا، بەڵام کوشتنی ماگنتسکی و ئەو هەنگاوانەی دژی وەبەرهێنانەکانی گیرایە بەر، کەوتە بەر شاڵاوی نارەزاییەکانی جیهانی دژی مۆسکۆ. ئەو توانی قەناعەت بە کۆنگرێس بێنی بۆ تێپەڕاندنی یاسایەك کە ئەمریکا بتوانێت سزای سەرپێچیکارانی مافی مرۆڤ لە ڕووسیا بدات، هەروەها چەندین وڵاتی تریش هەمان شتیان پەیڕەو کرد. لە ڕوانگەی پوتینەوە، برودەر هەڵمەتی کەمپینەکەی هیلاری کلینتۆنی لە

ئەستۆ گرتبوو، کە نزیکەی ٤٠٠ ملیۆن دۆلار بوو، سەرچاوەکەی ئەوەبوو لە ڕووسیا دزرا بوو، کە ئەمەش سەرنجی ترەمپی ڕاکێشابوو. هەموو شتێك گەرماوگەرم بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ترەمپ زۆر بە پەرۆش بوو. من ویستم تۆزێك لە پەرۆشییەکەی کەم بکەمەوە، بۆ ئەوەی هیچ نەبێت بتوانم زیاتر لەبارەی ئەو ڕێککەوتنەی کە پوتین پێشنیاری کردووە بزانم. ئەمە وەك ئەوە دەردەکەوت کە تەڵەیەك بێت، ئەگەر هەر بەڕاستی ڕێککەوتنێك لەئارادابوایە. پاشان چووین بۆ خوانی نیوەڕۆ، کە وەك بڵێی خوانی ئێوارە بێت و پێشخرابێت.

ترەمپ داوای لە پوتین کرد کە وەسفی کۆبوونەوە دووقۆڵییەکە بکات، پوتین گوتی کە ترەمپ یەکەم جار باسی دەستێوەران لە هەڵبژاردنەکانی وروژاندووە، دوایی گوتی کە ئەو هیواخوازە لێکۆڵینەوەیەکی هاوبەش بۆ ئەم مەسەلەیە بکرێت (ئینجا دەرەنجامەکەی هەرچییەك بێت). پوتین گوتی کە دەبێت ئێمە پەیمان بدەین چیتر هێرشی چەتەکانی ئینتەرنێت نەکرێنە سەر هەردوولامان. بێگومان ئەمەش باش دەبێت. ئینجا بەردەوام بوون لەسەر ئەو باسانەی سەبارەت بە ئۆکرانیا، سووریا، ئێران و کۆریای باکوور کردبوویان، هەندێك جاریش ترەمپ کۆمێنتی هەبوو، هەموو ئەم شتانەش هێمن دەرکەوتن هەروەك پێشتر ترەمپ وای کردبوو. هەروەها باسی سنووردانانیشیان کردبوو بۆ مەسەلەی چەك، بەڵام هەرتەنها بەشێوەیەکی ڕووکەشانە. من بڕیارم دا کە ئەم باسەی دوایی جارێ بێدەنگی لێ بکرێت، چوون نیگەران بووم لەوەی دەبێتە هۆی زیندووکردنەوەی کۆمەڵێك کێشە. ترەمپ پرسیاری کرد کە ئاخۆ هیچ کەسێك پرسیاری هەیە، بۆیە من پرسیارم لە پوتین کرد کە بە درێژی باسی سنووری نێوان سووریا و ئیسرائیل بکات بۆ ساڵی ١٩٧٤، تاوەکو زیاتر بزانین لەبارەی ئەوەی کە چی بە نەتەنیاهۆ گوتووە.

پوتین ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئەو هەر تەنها باسی لە پێکهێنانی هێڵێکی

زۆرەملێ کردووە نەوەك سنووری ڕاستەقینە. هەروەها پرسیاری یارمەتییە مرۆییەکان و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەم لێ کرد، لەبەرئەوەی من دڵنیابووم لەوەی کە هەرچەند پوتین لەبارەی زیاتری یارمەتییەکان قسە بکات، ئەوا ترەمپ بێبەهاتر لەم مەسەلە دەڕوانێ. ئەوەی کە هەردووکیان بەڕاستی گفتوگۆی لەسەر بکرێت، تەنها زیاترکردنی ڕێژەی بازرگانی و وەبەرهێنانی ئەمریکییەکان بوو لە ڕووسیا، کە ئەمەش گفتوگۆیەك بوو بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو بەوەی کە هەردووکیان زیاتریان لەبارەیەوە نەگوت، هەروەها لەگەڵ بوونی هەندێك کارسازی ئەمریکی کە هەر بە ڕاستی دەیانەوێت بێنە نێو زەلکاوی سیاسی و ئابووریی ڕووسی.

دوای خوانی نیوەڕۆ، بەرەو پرێسکۆنفرانسی ترەمپ و پوتین ڕۆیشتین، کە نزیك کاتژمێر شەشی ئێوارە دەستی پێ کرد. هەروەك کێلی سەرنجی دابوو کە ئێستا دوو یارمەتیدەری سەربازی لە ژوورەکە بوون، هەریەك لەوان تۆپە بەناوبانگەکەیان لەدەست بوو کە ڕەمزی هاوێشتنی ئەتۆمی بوو، هەریەکە و تایبەت بە وڵاتی خۆی. پوتین ڕاگەیەنراوێکی خوێندەوە کە بە کاتێکی درێژی بەر لە کۆبوونەوەکە ئامادەکرابوو، بەڵام پوتین گوتی کە ترەمپ یەکەم جار باسی دەستێوەردان لە هەڵبژاردنەکانی خستووەتە بەرباس. پوتین گوتی: "دەوڵەتی ڕووسیا هەرگیز دەستی نەخستووەتە ناو کاروباری ناوخۆی ئەمریکا و هەرگیزیش لەداهاتوودا دەستێوەردان ناکات، تەنانەت لە مەسەلەی هەڵبژاردنەکانیش"، هەروەك لە چاوپێکەوتنی ڕابردووش لەگەڵ مندا ئەم شتەی گوت. فیۆنا هێلیی وتەبێژە ڕووسییەکە ئاماژەی بەوەدا کە ئەم وشانە هەلبژێرن، چونکە ئەگەر پێشتر لەلایەن "ڕێکخراوێکی ناحکوومی" یان "کۆمپانیایەك" (نەوەك هەر تەنها چەندین ڤێرژنی لەم جۆرە هەن بۆ هەردوو شێوە لە ڕووسیا)، بۆیە دەتوانرێت بگوترێت کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ حکوومەتی ڕووسیا ئەم شتەی نەکردووە. دەبوو ئێمە زیاتر گوشار بکەین بۆئەوەی تیشك بخرێتە سەر ئەم

خاڵە، بەڵام جارێکی تر ئەوە پێویستی بەمە بوو کە ڕەزامەندی لە کەسی یەکەمەوە وەربگیردرێت. پاشان ترەمپ ڕاگەیەنراوی تایبەتیی خۆی خوێندەوە و دواتر پرسیاری ڕۆژنامەوانان دەستی پێ کرد. پوتین گوتی کە ترەمپ پشتگیری ئەم هەڵوێستەی ئەمریکای کردووە کە خستنە سەری نیمچە دوورگەی کریمیا نایاساییە.

من پێم وابوو کە ئێمە بۆ ماوەیەك کێشەمان نابێت. پەیامنێرێکی ئەمریکی لە پوتینی پرسی کە بۆچی دەبێت ئەمریکییەکان باوەڕ بە ڕەتکردنەوەی ئێوە بکەن لە دەستێوەردان لە هەڵبژاردنەکان لە ساڵی ٢٠١٦؟ پوتین وەڵامی دایەوە کە "ئایا تۆ بیرۆکەیەکی لەم جۆرەت لە کوێ هێناوە کە سەرۆك ترەمپ باوەڕ بە من دەکات یان من دەبێت باوەڕ بە ئەو بکەم؟ ئەو بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەکات و منیش بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی خۆم دەکەم ... ئایا تۆ دەتوانیت تەنها ناوی حەقیقەتێك ببەیت کە ئەم پیلانگێڕییە بسەلمێنێت؟ بەڕاستی ئەمە شتێکی بێمانایە". دواتر، دوای دەرکەوتنی زانیاریی زیاتر لەبارەی لیستەی تۆمەتەکانی ئەم دواییەی مۆلەر، پوتین باسی ڕێککەوتنی ئاڵوگۆڕکردنی یاسایی ساڵی ١٩٩٩ی کرد. پوتین لە ناوهێنانی ئەمە هەڵەی کرد (یانیش بە هەڵە وەرگێڕانی بۆ کرا) لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە، پوتین گوتی کە دەکرێت مۆلەر سوود لەم ڕێککەوتننامە ببینێت، هەروەها لەسەر ڕووسیاش پێویستە کە سوود لەمە ببینێت بۆ چاودێریکردنی تاوانەکانی بیل برۆودەر، کە ئەمەش لەگەڵ ترەمپدا لە کاتی کۆبوونەوەکە باسی لێوە کرابوو. ئەم وەسفەی پوتین لەبارەی ئەم ڕێککەوتنە یاساییە زۆر لە ڕاستی دوور بوو، بەڵام لە هەمان ئەو کاتەی کە بۆ ڕاگەیاندنەکان ئەم خاڵەیان ڕوون کردەوە، مانای وابوو ئەمە وەك ئەوەیە پوتین پڕوپاگەندەی بۆ خۆی کردبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پوتین بە نیگەرانییەوە گوتی کە ئەو دەیەوێت ترەمپ لە

هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٦ دەربچێت "چونکە ئەو باسی لە گەڕاندنەوەی پەیوەندییەکانی ڕووسیا-ئەمریکا کرد بۆ سروشتی خۆی"، ئەمەش لادانێکی زۆر گەورە بوو لە ستانداردی گشتی کە نابێت دەوڵەتان دەست بخەنە نێو کاروباری ئەوانی تر. بەم جۆرە ئەم ڕەنگی زەرد بوو بەرلەوەی ترەمپ وەڵام بداتەوە، کاتێك گوتی: "میللەت هاتوونە بۆ لای من -دان کۆوتس و ئەوانی تر هاتوون بۆ لام- گوتوویانە واهەست دەکەن ئەمە ڕووسیا بێت. ئێستا من سەرۆك پوتینم لایە، ئەو هەر ئێستا ئاماژەی پێدا کە ئەو نییە. بۆیە من دەڵێم: "من هیچ هۆیەك نابینم بۆ ئەمە، بەڵام هەر بەڕاستی من دەمەوێت ئەو خزمەتکارە ببینم. بەڵام من -من متمانەم بە هەردوو لا هەیە... بۆیە متمانەیەکی گەورەم بە هەواڵگری هەیە، بەڵام من پێتان دەڵێم کە سەرۆك پوتین زۆر بەهێز بوو لە ڕەتکردنەوەی ئەمە". من و کێڵی کە لە تەنیشت یەك دانیشتبووین لەنێو ئامادەبوان، لەگەڵ ئەم وەڵامەی ترەمپدا تەزین. ئەمە ڕوون بوو کە پێویستی بە ڕاستکردنەوەیەکی گەورە بوو بەهۆی ئەم برینەوە، بەڵام زۆر زۆر دوور بوو لە بەڵگەوە. هەروەها ڕاگەیاندن و گواستنەوەی بابەتەکە بە شێوەی ڕاستەوخۆ کارەسات بوو.

دوای چاوپێکەوتنە تاکە کەسییەکانی ترەمپ، بە هێلیکۆپتەری سەرۆکەیاتییەوە چووین بۆ فڕۆکەخانە، کە کاتژمێر هەشتی ئێوارە بە کاتی ئەوێ بەڕێ کەوت. دان کۆوتس دەیویست من ببینێت، پاشان من ڕاستەوخۆ پەیوەندیم پێوە کرد دوای ئەوەی کە بە ڕێگەی وشکانی ڕۆیشتین. ئەو کەمتر جاڕس بوو. ئەو گوتی "شەپۆلێك شۆك بوون دەوروبەری واشنتۆنی تەنیوە"، هەروەها هەواڵگری پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەبووە کە بۆ ئەوەی ڕێگری لە کۆمەڵەکە بکەن لە بنکەنکردنی تەواو. کۆوتس شتێکی ئامادە کردبوو لە گۆشەنیگای خۆیەوە کە زۆر گرنگ بوو بۆ بەرگریکردن بە کۆمەڵ، کە من داوام لێ کرد جارێ دوابخات بۆ چەند خولەکێك تاوەکو لەگەڵ کێڵی-دا قسە بکەم.

من بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو کە ئەو بیر لە دەستلەکارکێشانەوە دەکاتەوە، بەڵام هەستی زۆر ڕوون بوو کاتێك گوشاری کرد. من پەیوەندییەکەم داخست و کێڵیم دۆزییەوە، ئەو پێی وابوو کە ئەم ڕاگەیەنراوە زۆر گرنگ و یارمەتیدەر دەبێت ئەگەر کۆوتس باسی لە هەوڵەکانی ترەمپ کرد بۆ ڕێگریکردن لە دەستێوەردانەکان، کە ئەمەش زۆر لەوە گەورەتر بوو کە ئۆباما کردبووی. کۆوتس حەزی نەکرد هیچ گۆڕانکارییەك بکات لەم ڕاگەیەنراوەی کە لە تەلەفۆنەکەوە بۆی خوێندمەوە، من لەو باوەڕەدا نەبووم، کە ئەمە شتێکی خراپ یان چاوەڕواننەکراو بێت. تاوەکو ئەوکاتەش من هیچ ئاماژەیەکم نەبینی کە کۆوتس دەیەوێت دەست لە کار بکێشێتەوە، بۆیە من پێم گوت کە هەنگاو بنێ و ڕاگەیەنراوەکە بڵاوبکەوە.

لێدوانەکانی کۆوتس کە دوای چەند کاتێکی کەم دەرچوو، بەنزینی بەسەر ئاگردا کرد، بەڵام هێشتاش بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی ڕاگەیاندنەکان دەیانکرد هیچ نەبوو. ئێمە بەرژدی کارمان کرد لە گەڕان بەدوای یاسای هاریکاریی یاسایی ئاڵوگۆڕکردن، لەوە دڵنیابووین کە پوتین یاساکەی بەتەواوەتی شێواندووە، ئینجا لەسەر هەردووکیان، واتە جێبەجێکردنی لەسەر بیل برۆودەر بێت یان تیمەکەی میولەر. ئەمەش پڕوپاگەندەیەکی لاواز بوو لەسەر شێوازی سۆڤیەتی. نیك ئایەرز پەیوەندی کرد تاوەکو بڵێت کە پێنس دووجار ئاماژەی بەوەی داوە کە ئەو باوەڕی تەواوی بە هەواڵگریی ئەمریکی هەیە، کە من گوتم بیرۆکەیەکی زۆر چاکە. بە ترەمپم گوت سەبارەت بەوەی کە پێنس دەیەوێت بیکات، ئەویش زۆر پشتگیری کرد و بگرە تویتێکی تایبەتیشی لەبارەیەوە کرد. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندنەکان لە کاری خۆیان هەر بەردەوام بوون. دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر، ئەم چوار خاڵەم نووسی کە دەبوو ترەمپ لەبارەیەوە ڕوونکردنەوە بدات: "(١) من هەموو کات پشتگیری ئاژانسی

هەواڵگری ئەمریکیم کردووە؛ (٢) هیچ پیلانگێرییەکی ڕووسی لە ئارادا نەبووە؛ (٣) هەر دەستێوەردانێکی ڕووسی (یاخود هەر وڵاتێکی تر) جێگای قبووڵ نییە؛ (٤) ئەمە لە ٢٠١٨ ڕووناداتەوە". ئەمانەم نووسی و دام بەدەستی کێلی، ساندرز، سارە تینسلی (بەڕێوەبەری یەکەمی پەیوەندییەکان)، میلەر، بیل شاین (بەرپرسی گەورەی جێبەجێکردنی پێشوو لە فۆکس نیوز، دان سکاڤینۆ (بەرپرسی سۆشیال میدیای ترەمپ)، هەروەها ئەوانی تر. پاشان لە نزیکی نیوەشەو بە کاتی فینلەندا) سەرخەوێکیان شکاند. دواتر فڕۆکەکە لە ئاندروز لە کاتژمێر ٩:٥٠ خولەکی شەو بەکاتی واشنتۆن نیشتەوە، ئەوەبوو من چوومەوە بۆ ماڵەوە.

ڕۆژی دواتر، تیمی پەیوەندییەکان (هەموو تیمەکە) لە کۆشکی سپی و لەنێو ئۆڤاڵ لەگەڵ ترەمپدا کۆبوونەوە. چوون ئەو هێشتا سەری سوڕما بوو لە کاردانەوە نەرێیەکان، ئەو چاوی خشاندەوە بە ڕاگەیەنراوی پرێس کۆنفرانسەکەوە و گوتی کە لە نووسینەوەیدا هەڵە کراوە. لەو دێرەی کە دەڵێت "من هیچ هۆکارێك نابینم لەوەی ئەوە بێت"، واتە "من هیچ هۆکارێك نابینم کە بۆچی ئەوە دەبێت ڕووسیا بێت"، ئەوە مەبەستی ئەوەبوو بڵێت: "ئەمە (ڕووسیا) نەبوو"، بەم جۆرە ڕستەکەی پێچەوانە کردەوە. ترەمپ بەوە بەناوبانگ بوو کە لە شتێك پاشگەز نابێتەوە کە گوتوویەتی، بەڵام لەڕاستیدا وەك ئەوە وابوو ئەمە بشارێتەوە، بۆیە ئەمە گۆڕانکارییەکی گەورە و لەناکاو بوو. بێگومان ئەم گۆڕانکارییەش بە تەنها نەبووە هۆی لابردنی کێشەی لێدوانەکانی ئەم دواییەی کە قبووڵی هاوتایی ئەخلاقی لەنێوان ڕوانگەی پوتین و ڕوانگەی هەواڵگریی تایبەت بە خۆمان دەکا. بەڵام بۆ کارمەندانی ئۆفیسی ڕاگەیاندن، هەر ڕاستکردنەوەیەکی ترەمپ، پێشوەچوون بوو. بۆیە ستیڤن میلەر هەڵسا بە ئامادەکردنی ئاماژەکان و ترەمپیش لە دوای نیوەڕۆ بەدەستی گەیشت.

ئەمە ئەو ڕێگەیە نەبوو کە دەبوو لە ڕێیەوە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ

ڕووسیا بنیات بنێین، هەروەها پوتین دەبوو بە دەنگی بەرز پێبکەنێت لەوەی کە لە هێلسنکی لەدەستی دەربازی بوو. کۆندالیزا ڕایس پەیوەندی کرد تاوەکو پێم بڵێت کە ئەو هیچ لێدوانێك نادات لەسەر هێلسنکی، بەڵام گوتیشی کە "دەزانی چۆن، پوتین جگە لە دوو ڕێگە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا هیچ ڕێگەیەکی تر نازانێت، یان ئەوەیە گاڵتەیان پێ دەکات یان کۆنترۆڵیان دەکات، هەروەها تۆ پێویستە ڕێگە نەدەیت کە ئەوەی بەسەردا ڕابورێت"، منیش هاوڕای بووم. خەڵکانێکی زۆر داوایان لە گەورە بەرپرسان دەکرد کە دەست لە کار بکێشنەوە، لەنێویشیاندا کێلی، پۆمپەیۆ، کۆوتس، هەروەها منیش. ئەگەرچی من هەر تەنها سێ مانگ بوو دەستم بە کار کردبوو. بەدڵنیاییەوە شتەکان لە ئیدارەکەی ترەمپدا خێرا ڕۆیشتن!

## بەشی شەشەم

# گیرۆدەکردنی ڕووسیا و کۆتایهێنان

# بە ڕێککەوتننامەی (INF)

لەوکاتەوەی لەگەڵ ئیدارەی سەرۆك جۆرج دەبلیو بوش کارم دەکرد، دەمویست ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێککەوتننامەی (مەودای ناوەند بۆ چەکە ناوکییەکان: INF) [1]ڕزگار بکەم. ئەمە لەوانەیە وەك فەرمانێکی دوورودرێژ بێت، بەڵام زۆر پێش ئەم بابەتەش هەر خەریك بووم و هەوڵم داوە. دەمزانی دەبێ چی بکەم، چونکە پێشتر یارمەتی جۆرج بوشی کوڕم دابوو تا ئەمریکا لە ڕێککەوتننامەی (دژەموووشەکی بالیستیك)ی ساڵی ١٩٧٢ ڕزگار بکەم کە بەڕاستی ڕێککەوتننامەیەکی ترسناك و بێکەڵك بوو، هاوکات ڕێگری لە ئەمریکا کردبوو لەوەی نەتوانێ بەشێوەیەکی کاریگەر برەو بە سیستەمی بەرگریی دژەموووشەکی نیشتیمانی بدات. هیچ وانەیەك لەمەدا وەرنەگیرا، هەروەها لەوکاتەی کە ترەمپ و پوتین لە هێلسنکی پایتەختی فنلەندا چاویان بەیەك کەوتبوو، گەیشتبوونە ئەو دەرئەنجامەی کە پێویستە لەمەودوا هەماهەنگیی زیاتر لەنێوان ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی هەردوولا هەبێت، بۆیە ئامراز و ڕێگە پێویستەکان لەبەردەستدابوون. هەر لەبەرئەوە من پێشنیارم کرد بۆ نیکۆلای پاتروشێف (سکرتێری ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕووسیا) تا لە جنێف

(1) Intermediate-Range Nuclar Forces

چاومان بەیەکتری بکەوێت، ئەویش ڕازیبوونی خۆی نیشاندا تا لە ٢٣ی ئاب کۆببینەوە.

ڕووسیا ماوەی چەند ساڵە پێشێلی ڕێککەوتننامەی (INF) دەکات، لەکاتێکدا ئەمریکا پێوەی پابەندە و سەیری کردووە تا بزانێ چی ڕوودەدات. تەنیا مووشەك و مووشەکهاوێژە مەودا درێژەکان نەبێ کە لە مەودای ٥٠٠- ٥٥٠٠ کم (٣١٠- ٣,٤٢٠ میل) دیاریکرابوون، ئەگەرنا ڕێککەوتننامەی نێوان سەرۆك ڕەیگان- گۆرباچۆڤ (واتە نێوان ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەتی جاران) بۆ ئەوەبوو تا شەڕی چەکی ناوکی لەنێوان وڵاتانی ئەورووپیدا قەدەغە بکات. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، بەهەرحاڵ، مەبەستی سەرەکی ڕێککەوتننامەی (INF) بەهۆی سووربوون و یاساشکێنیی ڕووسەکان لاوازکرا، گۆڕانی بەسەر ڕاستەقینەی ستراتیژیەتی جیهانی و بەرەوپێشچوونە تەکنەلۆژییەکان داهێنا. تەنانەت بەرلەوەی ترەمپ بێتەسەر دەسەڵات، ڕووسەکان دەستیان کردبوو بە بەزاندنی مەرجەکانی ڕێککەوتننامەی (INF) و مووشەکانیان بەرەوپێش بردبوو، بەتایبەتی لە ناوچەی (کالینینگراد) کە بە دەریای باڵتیك دەور دراوە، بەمەش بناغەی هەڕەشەیەکی بەردەوامیان لە دژی وڵاتانی ئەورووپی ئەندامی ناتۆ جێگیر کرد. لەمەش زیاتر، تەنانەت بۆ هەندێ دەرئەنجامی دیکەی درێژمەودا، ئەم ڕێککەوتنە سنووری بۆ هیچ وڵاتێکی دیکە دیاری نەکرد (جگە لە هەندی وڵات کە پاشماوەی وڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران بوون)، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی هەڕەشەی گەورەن بۆ سەر ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی. بۆ نموونە، چین، خاوەن توانایەکی یەکجار بەرز و پێشکەوتووی مووشەکیە کە گەر بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی (INF) بێت، هەبوونی ئەو توانایە قەدەغەیە، ئەمەش مەترسی دەخاتەسەر هاوپەیمانەکانی ئەمریکا کە ژاپۆن و کۆریای باشوورن. هەروەها، وڵاتانی دیکەی وەك هیندستان و خودی ڕووسیاش، بۆیە لەڕاستیدا ئەمە جگە لە گاڵتەجارییەك

هیچی دیکە نییە. هەندێ مووشەکی بالیستیکی ئێرانی هەڕەشەن لەسەر ئەورووپا و ئامادەیە بۆ فراوانبوونیش، هاوشێوەی وڵاتانی دیکەی وەك کۆریای باکوور، پاکستان، هیندستان و ئەوانی دیکەش کە لە داهاتوودا دەبنە خاوەن چەکی ناوکی. دواجار، ڕێککەوتننامەی (INF) لەڕووی تەکنەلۆژییەوە ماوەی بەسەرچووە و بەکەڵك نایەت. لەکاتێکدا ئەم ڕێککەوتنە تەقاندنی مووشەکی لەمیانەی ناوچە قەدەغەکراوەکاندا قەدەغەکردووە، بەڵام ڕێگری لە بەکارهێنانی ئەو مووشەکانە نەکردووە لەنێو دەریا و ئاسماندا، بەتایبەتی لەنزیك ناوچە ئاوییەکان و بۆشایی ئاسمان کە دەکرێ هەمان ئامانجی ئەوەی مووشەکەکە لەسەر زەوی دەیپێکێ، بیکاتە ئامانج.

بەگوێرەی هێڵی دیاریکراوی ئەو ڕێککەوتنە بێت، سنوور تەنیا بۆ دوو وڵات دیاریکراوە، یەکێك لەو دووانەش فێڵ لەو ڕێککەوتنە دەکات. تەنیا یەك وڵات لە جیهاندا ڕێگری لێ کراوە تا پەرە بە توانا مووشەکە مەودابڕەکانی نەدات، ئەویش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. ئەم بڕیارە لەمڕۆدا هیچ ژیرییەکی تێدا نییە و بێمانایە، تەنانەت ئەوکاتەی لەناوەڕاستی ساڵانی ١٩٨٠کان خرایە بواری جێبەجێکردنەوە. هەروەك لیبراڵەکان حەز بەو قسەیە دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە (دەور و زەمانەکە گۆڕاوە).

من و پاترۆشێڤ (من وەك شاندی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەشداربووم) لە جنێڤ کۆبووینەوە. سەرەتا، ستافی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بە فراوانی لەگەڵ حکوومەتی ئەمریکی لەمەڕ ئەم کارنامەیە ڕاوێژیان کردبوو، من و پۆمپەیۆ چەندین جار لەسەر بابەتی (کۆنترۆڵکردنی هەموو جۆرەکانی چەك) گفتوگۆمان کردبوو، بۆیە پۆمپەیۆ ڕازیبوونی خۆی لەسەر ئەو مامەڵەیەی دەمویست لەگەڵ پاترۆشێڤ ئەنجام بدەم، نیشاندا. بەشێوەیەکی نموونەیی و هاوشێوەی

سەردەمی جەنگی سارد، پاترۆشێڤ و من سەرەتای گفتوگۆکانمان بە باسکردن لە کۆنترۆڵکردنی چەك و زیادنەکردنیان دەست پێ کرد، بەتایبەتی قسەکردن لەسەر ئێران و کۆریای باکوور. ڕووسەکان شوێن مامەڵەی پوتین کەوتن کە لەمیانەی کۆبوونەوەکەی لەگەڵ ئێمەدا کە لە مۆسکۆدا کردبووی، بەجۆرێك جەختیان لەسەر "سەقامگیریی ستراتیژی" دەکردەوە، قسەی سەرەکیان ئەوەبوو هێرشیان دەکردە سەر ئەوەی کە ئێمە بۆچی لە ڕێککەوتنی (دژەموووشەکی بالیستیك: (ABMکشاوینەتەوە. ڕووسەکان ئەوکاتەی ئێمە لە ساڵی ٢٠٠١ کشاینەوە ئەو قسەیان نەدەکرد، بەڵام ئێستا سووربوون لەسەری و دەیانگوت سیستەمی بەرگریی مووشەکی لە بنچینەدا لەڕووی ستراتیژییەوە بە ناسەقامگیریی ماوەتەوە، هاوکات بەئاشکرا داوای وردەکاری و گفتوگۆی زیاتریان دەکرد تا لەنێوان ئەنجوومەنی ئاسایشی هەردوولا، لە هەنبەر ئەو پێشنیارە ئەنجام بدرێ. منیش بەخێرایی ئەو بابەتەم بۆ ڕوونکردنەوە و پێمگوتن کە ئێمە بۆیە لە ڕێککەوتنی (دژەمووشەکی بالیستیك) دەرچووین بەمەرجی ڕێککەوتنێکی دیکە، بەلایەنی کەم لەسەرەتادا، چونکە هەندێ وڵات ببوونە خاوەن چەکی ناوکی کە ئەمە هەڕەشەی مەترسیداری بۆ سەر ئەمریکا هەبووە و ترسی ئەنجامدانی هێرشی مووشەکیمان هەیە لەلایەن ڕووسیا و (چین)ەوە. پاترۆشێڤ گوتی ئاستی ڕێز و متمانەی ئێمە بەرامبەر ئەو ڕێککەوتنە دەریدەخات کە ئێمە چەند سەرکەوتوو دەبین، دواتر باسی لە ڕێککەوتننامەی (INF) کرد و ئاماژەی دا بەوەی لێدوانی هەڤدژ لەمەر پابەندبوون بەو ڕێککەوتنە دراوە. ئەم قسەیەشی پروپاگەندەیەکی تەواو بوو. ڕووسیا زیاترە لە دە ساڵە ئەم ڕێککەوتنە پێشێل دەکات، ئەم قسەیە لەمیانەی سەردەمی ئۆبامادا چەندانجار دووپات دەکرایەوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. لە هەموو ئەو ڕێککەوتنانەی ئەمریکا تێدا بەشدارە، هەریەك لە وەزارەتی بەرگری و وەزارەتی دەرەوە زیاتر لە ڕێگەی

(پارێزەر)ەکانیانەوە لە بابەتەکان تێگەیشتوون و شەنوکەوی دەکەن، بۆیە گەر بشمانەوێ، ئەوا ناتوانین ڕێککەوتنێك پێشێل بکەین.

وەك هەمیشە، ڕووسەکان لیستێکی درێژی ئەو پێشێلکارییانەیان لەلابوو کە گوایە ئێمە وەك ئەمریکا ئەنجاممان داون تا لەنێو گفتوگۆکاندا بە وردەکاری و دروستکردنی نارەحەتی بۆمان باسی لێوەبکەن. ئێمەش لە بەرامبەردا لیستێکی درێژتری پێشێلکارییەکانی ڕووسیامان لەلابوو کە من هەردەم جەختم دەکردەوە لەوەی نامەوێ کاتی پێ بکوژم. ئێمە بیرمان لە ئەگەرە تیۆرییەکان(theoratic possibility) دەکردەوە و دەمانویست ڕێککەوتنامەی (INF) بەجیهانی بکەین، ئەمیش لە ڕێگەی هێنانە ناوەوەی هەریەك لە چین و ئێران و وڵاتانی دیکەش، بەڵام ئەمەیان لە خەیاڵێك دەچوو بەوپێیەی ئەوان ئاوا خۆبەخشانە نایەن ئەو ڕێژە زۆرەی مووشەك کە لە جبەخانەکانیان هەیە لەناوی ببەن، چونکە گەر بەو ڕێککەوتنە ڕازی بوونایە، ئەوا دەبوو ئەو کارە بکەن. لەجیاتی ئەمە، من ڕوونم کردەوە کە دەرچوونی ئەمریکا لەم ڕێککەوتنەدا واقیعیترین ئەگەرە، لەگەڵ ئەوەی ئەمریکا هەڵوێستێکی فەرمی نەبوو، هەڵوێستێك کە دەبوو ببێتەهۆی سەرسامکردنی وڵاتانی دیکە.

من، هەروەها گوتم پێناچێ بەو درێژکردنەوە پێنج ساڵەی نێو ڕێککەوتنامەکەی ئۆباما لەگەڵ ڕووسیا بەناوی (دەستپێکی نوێ ( New Start: ڕازی بین، کە تیایدا مۆسکۆ و لیبراڵەکانی ئەمریکا دوعای بۆ دەکەن. چەندان هۆکار هەبوو وایان دەکرد کە نەدەبوو خۆمان ڕادەستی ئەو درێژکردنەوەیە بکەین کە هاوشێوەی فلتەی ئەژنۆ کەموکووڕی هەبوو، یەك لەوانەش ئەوەبوو کە دەبوو (چین) بێتەنێو ئەو ڕێککەوتنە و لە گفتوگۆیە ستراتیژییەکانی تایبەت بە چەك هەر لە سەرەتاوە بەشداری بکات، دەمزانی ئەو ڕوانینە وادەکات ڕووسەکان دووچاری سەرسامی بن. خاڵێکی دیکەی ئەوەبوو کە ئێمە وەك ئەمریکا دەبوو مەسەلەی چەکە

ناوکییە تاکتیکییەکان پەردەپۆش بکەین (کە ئەم ڕێککەوتنەی ئۆباما لەگەڵ ڕووسیا باسی نەکردبوو)، هەروەها ئێستا ڕووسیا و چین بەتوندی دەستیان بە تەکنەلۆژیاکانەوە گرتووە (نموونەش وەك بەرهەمهێنانی فڕۆکەی بارهەڵگری یەکجار خێرا)[1] کە لەوکاتەی ئۆباما ئەم ڕێککەوتنەی لە ساڵی ٢٠١٠دا واژووکرد، ئەمانە لە سەرەتای دیزاینکردنی ئەو فڕۆکانە بوون، (هەروەك خۆیشم هەندێ بەدرێژی باسم لێوەکرد). دواجار، پێویستە بگەڕێینەوە سەر ڕێککەوتننامەی مۆسکۆی ساڵی ٢٠٠٢ کە مۆدێلێکی زۆر ساناتری هەبوو (ئێوە خۆتان وەك بەرپرسانی ئەوکاتە گفتوگۆی ڕاستینەتان لەسەر کردووە). چەندان شتی دیکەش هەبوون دەبوو باسیان لێوە بکرێ، بەڵام ئەمەیان دەسپێکێکی باشی هەبوو. دوای کۆبوونەوەکەی جنێڤ، چووم بۆ کییڤ بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگەکانی یادی ڕۆژی سەربەخۆیی ئۆکرانیا و ڕاوێژکردن لەگەڵ سەرۆك پێترۆ پۆرۆشینکۆ و سەرۆك وەزیران و بەرپرسانی دیکەی ئۆکرانیا. من بەکورتی باسی گفتوگۆکانم بۆ کردن کە لەسەر ڕێککەوتننامەی (INF) کردبوومان، کە ڕاستەوخۆش کاریگەریی دەخستەسەر پلانی بەرگری وڵاتەکەیان. کێ دەیزانی کە لە ماوەی سێ ساڵی دواتردا ئۆکرانیا ئاوا بەچڕی بیر لە سیاسەتەکانی ئەمریکا دەکاتەوە؟!

لە کاتی گەڕانەوەم بۆ واشنتۆن، چەند مانگێکی دواترم بۆ هەنگاوێکی دراماتیکی بەسەربرد، کە ئەویش ئامادەکاری بوو بۆ چوونەدەرەوەی ئەمریکا لە ڕێککەوتننامەی .(INF) بۆ ئەوەی ڕێگری بکەین و ئەو هەنگاوە بەنهێنی بهێڵینەوە و نەکەوێتە دەست میدیاکان و دامەزراوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، چونکە دەبووەهۆی خرۆشاندیان، بۆیە پێم وابوو پێویستە بە مامەڵەیەکی بێدەنگ و نهێنی و خێرا کارەکان بکەین،

---

(1) Hypersonic Glide Vehicles

لەبری ئەوەی بێ وچان کۆبوونەوە لەنێوان ستافەکان ئەنجام بدرێ، بەتایبەتی ئەوانەی لەگەڵ هەوڵەکانی حکوومەت لەنێو ئەو ڕێککەوتنەدا دەژیان و بەرگەی ئەوەیان نەدەگرت ببینن وا ڕێککەوتنەکە کۆتایی پێ دێت. من باوەڕم وابوو، تێکەڵی ئەم بابەتە ببووم، لەگەڵ ئەوەی هەرگیز دڵنیا نەبووم لەوەی ئاخۆ ترەمپ تێدەگات کە ئەم ڕێککەوتنە ڕێکارییەك دانانێت بۆ ڕێکخستنی چەکی ناوکی، بەڵکو تەنیا ڕێکاری بۆ )فڕۆکەی بارهەڵگری گوێزەرەوە(Delivery Vehicles دادەنێت. من دەمویست ئەمریکا لەو ڕێککەوتنە بچێتەدەرەوە (کە ئەمە دەبێتە ئاگەدارکردنەوەیەکی گرنگ بۆ چین، وەك وڵاتێك لەنێو وڵاتەکانی دیکە)، یان تەنانەت بەهاوبەشی پاشەکشە بکەین بەرلەوەی لە کۆتایی تشرینی یەکەم جارێکی دیکە لە مۆسکۆ لەگەڵ پاترۆشێڤ کۆببەمەوە. ئەزموون فێری کردم بەبێ دیارکردنی دوابەروار و ئەنجامدانی کار بەزەبری هێز، ئەوا ڕۆتینیات دەتوانێ بەوپەڕی ڕژدی و سەرکەوتنەوە ڕووبەرووی گۆڕانکارییەکان بوەستێتەوە.

هاوکات، لەسەر ئێمە پێویستی دەکرد هاوپەیمانەکانمان لەنێو ناتۆدا ئامادە بکەین لەمەڕ ئەو دەرچوونەمان و بێهیوابوونمان لە ڕێککەوتننامەی (INF)دا. زۆرێك لە سەرکردە سیاسییەکانی ئەورووپا باوەڕیان وابوو کە لە سەردەمێك ژیاون کە تا ئەودیو "کۆتایی مێژوو" چووە و پێویست ناکات هیچ هۆکارێکی دەرەکی ڕێگەی پێ بدرێت تا وڵاتە سەقامگیرەکانیان لێ تێکبدات. ئەمەیان بیرۆکەیەکی باشبوو: ئەم قسەیە بە ڕووسیا و چین بڵێن، نەوەك هەموو دۆستە باشەکانی ئەورووپا لە ئێراندا. نموونەیەك لەم جۆرە گفتوگۆیانە کە پێویستە ئەنجام بدرێ لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا هایکۆ ماس کردمان. هایکۆ ماس سەر بە سۆشیاڵ دیموکراتەکانە، ئەو پارتەی کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەنجێلا مێرکڵ هەیە، گومانیشی تێدا نییە کە پشتگیرییان لە ڕێککەوتننامەی (INF) دەکرد. من ناڵێم کە

بیرکردنەوەکانمان چەندە لێك دووربوو، بەڵام جەختم کردەوە لەوەی ئەورووپا پێشتریش لەژێر هەڕەشەی گەشەسەندووی ڕووسیا بووە و هیچ لایەنێك کێبڕکێی لەگەڵدا نەکردووە. هەروەها، ڕوونم کردەوە لەوەی بۆچی پێویست ناکا لەمەڕ "سەقامگیریی ستراتیژی" لەگەڵ مۆسکۆ گفتوگۆ بکەین، بەو مانایەی ڕووسیا حەز بە پرۆگرامی نیشتمانیی بەرگری-مووشەکیی ئەمریکا ناکات، کە ئێمە هیچ مەبەستێکمان نییە گفتوگۆی لەبارەوە بکەین، بۆیە با بە تەنیا گۆڕانکاری تێدا بکەین یاخود ئەوەتا پشتگوێی بخەین.

باشترین هەواڵ ئەوکاتە گەیشت کە من و (جەیمس ماتیس)ی وەزیری بەرگری لە (وارد ڕووم (دوو ڕۆژ دواتر بەیەکەوە نانی بەیانیمان خوارد (پۆمپەیۆ لەلامان نەبوو)، ئەو کۆبوونەوەیەمان دوای کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەی وەزیرانی بەرگری وڵاتانی ئەندام لە ناتۆ بوو. ماتیس بەوپێیەی بۆ هاوشانەکانی خۆی باسکردبوو کە ڕووسیا لایەنی تێکدەر و ترازانە لەنێو ڕێککەوتننامەی (INF)دا، ماتیس باوەڕی وابوو وەزیرەکانی دیکەش بەتەواوی لە مەبەستەکەی گەیشتوون. ماتیس پێشنیاری کردووە کە پێویستە مایك پۆمپەیۆش لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ناتۆ لە یەکەم هەفتەی مانگی کانوونی یەکەمدا، هەمان قسە دووپات بکاتەوە، هەروەها بە ڕووسیاش ڕابگەیەنێت ٩٠ ڕۆژتان لەبەردەمە بۆ گەڕانەوە و پابەندبوون بەو ڕێککەوتنە، ئەگەرنا ئەمریکا لەو ڕێککەوتنە دەچێتەدەرەوە. من پێم وابوو واباشترە مەسەلەی ئەو ٩٠ ڕۆژە لابەرین، بەوپێیەی هیچ ڕێگەیەك نەبوو تا وابکات ڕووسیا ناچار بە گوێڕایەڵی بکات. لەگەڵ ئەمانەش، خودی ڕێککەوتننامەکە دەڵێت، دوای تێبینیکردنی ئەوەی لایەنێك پاشەکشە دەکات، ئەوا شەش مانگ وەك کاتی چاوەڕوانی دیاریکراوە بۆ ئەو لایەنە بەرلەوەی پاشەکشە بکات.

ئەمەیان لایەنێکی ستانداردی نێو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانە، هاوشێوەی

ڕێککەوتنی (دژە-مووشەکی بالیستیك)ی کە ئێمە لە ساڵی ۲۰۰۱دا داوامان دەکرد. ئەو کاتەی بۆ چاوەڕوانیکردن دانرابوو، هیچ هۆکارێکی لۆژیکی لەپشت نەبوو تا کاتی زیاتر بە مۆسکۆ بدرێت و ئەوانیش لەلای خۆیانەوە تۆوی شێواندن و دڵەراوکێ لەنێو ئەوروپییەکاندا بچێنن، بۆیە من پارێزگارییم لەمە کرد و لەوکاتەوە هەژماری ۱۸۰ ڕۆژ کشانەوە لەو ڕێککەوتنە دەستی پێ کرد.

لە یەکێك لەو هەفتانەی من و پۆمپەیۆ و ماتیس لە ۱۱ی تشرینی یەکەم بەیەکەوە نانی بەیانیمان دەخوارد، هەرسێکمان پێداگرییمان کرد کە لەگەڵ ئەوەین لە ڕێککەوتننامەی (INF) بچینەدەرەوە. بەهەرحاڵ، هەرچەندە ماتیس هەندێ ڕای جیاوازی لەگەڵ باوەڕی من و پۆمپەیۆ هەبوو، چونکە دەترسا لەوەی "ململانێی ئاکاریی "moral equivalence لەنێوانمان دروستبێ. هەرچەندە من و پۆمپەیۆ پێمان وانەبوو ئەمە ڕوویدات، هاوکات لەگەڵ باوەڕەکەی جەیمس ماتیسیش نەبووین، چونکە پاشەکشەی هاوبەش دەتوانێ شتێك بە ترەمپ ببەخشێ کە دەیتوانی سەرکەوتنی خۆی بەسەر ڕووسیا ڕابگەیەنێت و لەوانەشە بتوانێ ئەو پاڵەپەستۆیە کەم بکاتەوە و ئیمتیازی ڕاستەقینەی زیاتر لە بوارەکانی دیکەدا بەدەست بێنێ. ئەو ئێوارەیە تەلەفۆنم بۆ سکرتێری گشتیی ناتۆ جێنس ستۆڵتنبێرگ کرد و بۆم ڕوونکردەوە کە ئێمە بەتەمای چین. ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی کە نابێ ڕێگە بدەین ڕووسیا ئێمە دابەش بکات و بەو کارەشیان دڵخۆشبن، بەتایبەتی بە جیاکردنەوەمان لە ئەڵمانیا. من ڕازی بووم لەسەر ئەو قسەیە، بەڵام بۆ ستۆڵتنبێرگ و بۆ هەموو ئەوانەی گوێیان دەگرت ڕوونم کردەوە کە کشانەوەی ئەمریکا لەم ڕێککەوتنە هەڕەشە نییە بۆ سەر ئەوروپا. ئەوەی هەڕەشەیە بریتییە لە پێشێلکارییەکانی ڕووسیا لە هەمبەر ئەو ڕێککەوتنەدا، هەروەها هەموو ئەو توانا مووشەکییەی ئێستا هەیانە بۆ هێرشکردنە سەر ئەوروپا پێچەوانەی ڕێککەوتنەکەیە. ستۆڵتنبێرگ

پرسیاری کرد لەوەی ئێمە چۆن لە ڕووسیا تێگەیشتووین وەك لایەنێکی ڕێگری ئەم ڕێککەوتنە؟ هەروەها پرسیاری کرد ئاخۆ بەتەواوی وازدەهێنین لەوەی چاوەڕوانی ڕووسیا بکەین تا پابەندیی خۆی نیشان بدات؟ لە پرسی تێکدەری و یاساشکێنیدا ڕووسیا، پێم وایە پریزێنتەیشنەکەی جەیمس ماتیس لە کۆبوونەوەی وەزیرانی بەرگریی ناتۆ سەلماندبووی کە هەموو لایەك ڕازین لەوەی ڕووسیا یاساشکێنی کردووە. هەر تایبەت بە ڕووسیا، ئایا هیچ کەسێك بە جددی باوەڕی ئەوەی لا دروستبووە کە ڕووسیا واز لە هەموو ئەو شتانە دەهێنێت کە پێشتر وەك پێشێلکاریی نێو ڕێککەوتنەکە ئەنجامی داون، بەتایبەتی ئەوکاتەی پەرەسەندنی مووشەکەکانی چین بۆتە مەترسی لەسەر سنووری وڵاتانی ئاسیا و هەر ئەمەش وای کردووە ڕووسیا زیاتر هەوڵ بدات بۆ ئەو ئامانجانەی لە ئەوروپا هەیەتی بەدەستیان بێنێت! بۆیە، ستۆڵتنبێرگ گەشبین بوو، پێی وابوو بەشێوەیەکی ڕاست دەتوانین کارتەکانی بەردەستمان لەو بابەتەدا بەکار بێنین.

لە۱۷ی تشرینی یەکەمدا، هەفتەیەك بەر لە کۆبوونەوەکەم لەگەڵ پاترۆشێڤ لە مۆسکۆ، لەسەر ئەوەی کاروبارەکان لە کوێ وەستاون، کورتەیەکم بە ترەمپ دا، تەنانەت هەموو ئەو کارانەش کە لەنێو بریکارەکاندا ئەنجام دراون، هەروەها دیپلۆماسییەتی سەرەتایی ئێمە لەگەڵ هاوپەیمانەکانی نێو ناتۆ و ئەوانی دیکەش، هاوکات ئەو خشتەیەش کە بۆ کشانەوە لە ڕێککەوتنەکە لە ٤ی کانوونی یەکەمدا دەستی پێ دەکرد، بۆ ئەمەش پۆمپەیۆ ئاگەداری بە ڕووسیا دەدا لەوەی یان دەبێ پابەند بن، یان ئەوەتا کاری دیکە دێتە پێشەوە. لە وەڵامدا ترەمپ گوتی "بۆچی پێویستە ئەم ماوە درێژە چاوەڕوان بین؟ بۆچی ئێستا ڕاستەوخۆ ناتوانین لەو ڕێککەوتنە بچینە دەرەوە؟!" منیش گوتم، بەدڵنیاییەوە من ئامادەم. من بۆم ڕوونکردەوە کاتێ ئێمە ویستی خۆمان بۆ پاشەکشە ڕادەگەنین، ئەوا

ڕووسەکانیش هەمان شت دەکەن، ئێمەش تاوانبار دەکەن بەوەی پێشێلی ڕێککەوتنەکەمان کردووە، کە لەڕاستیدا ئەمە ڕاست نییە، بەڵام ئەمە دووچاری زنجیرەیەك لێدوانی تاوانبارکردنی یەکتریمان دەکات و (مۆسکۆ و واشنتۆن)یش پێوەی سەرقاڵ دەبن. لەبری ئەوە، بۆم ڕوون کردەوە بۆچی داوام لە پاترۆشێڤ نەکرد کە هەردوو وڵات بەهاوبەشی پاشەکشە دەکەن، ئەو مامەڵەیە ئێمە لە کۆمەڵێك خەم و ناڕەحەتی ڕزگار دەکات و ڕێگەمان پێ دەدات ڕێککەوتنێك لەگەڵ ڕووسیا لەسەر شتێك ڕابگەیەنین کە گرنگیی خۆی هەیە. بەهەرحاڵ، ترەمپ گوتی" من نامەوێ ئەمە بکەم. تەنیا دەمەوێ لەو ڕێککەوتنە پاشەکشە بکەم." من پێموابوو گەر هەردووولامان بەهاوبەشیی پاشەکشە بکەین، ئەوا ڕێگەیەکی کاریگەر و بایەخدار دەبێ بۆ ترەمپ، بەڵام ئەگەر وانەبێ، لێگەرێ با وەك خۆی بێ. من خۆم نەمدەتوانی کەمتر لە ڕووسیا گرنگی بەم بابەتە بدەم.

ڕۆژی شەممە بنکەی هاوبەشی (ئەندرۆس)م بەجێ هێشت، بۆ نزیکەی ٢٠ خولەك لە ئاسماندا هیچ شتێکی نەوتۆی گرنگ ڕووینەدا، پاشان بینیمان کە لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیاری ڕۆژنامەنووسێك لە کاتی هەڵمەتێکی هەڵبژاردن لە شاری (ئیلکۆ)ی ویلایەتی نیڤادا، ترەمپ گوتی ئێمە لە ڕێککەوتنی (INF) پاشەکشە دەکەین. یەکەم بیرکردنەوەم ئەوەبوو "باشە، ئەو قسەیە ئەم کێشەیە چارەسەر دەکات." کاتی ئەو قسەیەی ترەمپ هەمان ئەوکاتە نەبوو کە من و پۆمپەیۆ و ماتیس لەسەری ڕێکەوتبووین، بەڵام بەئاشکرایی دیاربوو کە ترەمپ بڕیاری داوە لەوەی "ئێستا" باشترە لە داهاتوو بۆ پاشەکشەکردن (داهاتوو مەبەست لەو چاوەڕوانیکردنە بوو بۆ ماوەی ١٨٠ ڕۆژ). من ڕاستەوخۆ تەلەفۆنم بۆ (سارا سەندەرس)ی وتەبێژی کۆشکی سپی کرد لە واشنتۆن، وادیاربوو ناوبراو گوێبیستی قسەکانی ترەمپ نەببوو، پێشنیاریشم کرد بۆی کە هەرچی زووە دەستنووسێك ئامادە بکرێ بۆ ئەم لێدوانەی ترەمپ، ئەویش ڕازیبوونی خۆی نیشان دا. دواتر

تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆ کرد و گوتی بەڕاستی ئەمە "ترسناکە" و سەیرە کە ترەمپ لێدوانی ئاوەهای داوە کە هاوشێوەی کشانەوەمان لە ڕێککەوتنەکە گرنگە و وەڵامی پرسیاری ئەو پەیامنێرەی داوەتەوە. ئەوە یەکەمجار بوو پۆمپەیۆ (بەدەگمەنیش نەبێ) ئاوا بەڕوونی ڕەخنەی لەکارێك گرت کە ترەمپ کردبووی. من لەگەڵ ئەمە ڕازی نەبووم، لەوکاتەی هەموو ئەوەی ترەمپ کردبووی خێرایی زیاتر بەو کاروبارانە دا کە ئێمە لە خشتەکەدا ئامادەمان کردبوو، بەڵام بۆ من کێشەیەك نەبوو. لەگەڵ ئەوەی بڕیارەکەی ترەمپ بەئاشکرایی و لەنێو خەڵکی عەوام درابوو، لەگەڵ ئەوەش دەمانتوانی ئاگەدارکردنەوەیەکی فەرمی بدەین بەوەی لە ماوەی شەش مانگدا پاشەکشە دەکەین. من گوتم، هەروەها پێویستە یەکسەر هەڵپەساردنی پابەندبوونی خۆمان بە ڕێکارییەکانی ڕێککەوتنەکە ڕابگەیەنین، ئەمەش وادەکات دەستبکەین بە کێبڕکێ بۆ لێدانی ڕووسیا، چین و وڵاتە بەتواناکانی دیکەی نێو ڕێککەوتننامەی .(INF) لەنێو فڕۆکەدا ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانیم لەگەڵدابوو، بۆیە دەستیان کرد بە تەلەفۆن بۆ هاوڕێکانیان لە وەزارەتی بەرگری و وەزارەتی دەرەوە تا ڕەشنووسێك بنووسن و بڕیارەکەی بڵاوبکەنەوە. بەداخەوە، ئەو بڕیارە هەرگیز بڵاونەکرایەوە، لەبەر چەند هۆکارێك بووە کە من تا ئێستاش نازانم بۆ، بەڵام لەوانەیە بەهۆی ئەوەبێ کە پۆمپەیۆ و ماتیس نەیانویستووە کارێك بکەن کە پێشتر ترەمپ لەبەرچاوی خەڵکی عەوامدا ئاماژەی پێدابوو.

دوای دووبارە پڕکردنەوەی بەنزینی فڕۆکەکە لە شاری (شانۆن)ی ئێرلەندا، ئیدی بەرەو مۆسکۆ چووین، هاوکات بەیانیی ڕۆژی یەکشەممەش بە کاتی ئەوروپا تەلەفۆنم بۆ ستۆڵتنبێرگ کردبوو. ئەوکاتە گوێبیستی لێدوانەکەی ترەمپ ببوو، بۆم ڕوونکردەوە کە چی ڕوویداوە و ئێستا خێرایی زیاتر دەدەین بە ڕاوێژکارەکانمان لەگەڵ هاوپەیمانان و لایەنەکانی

دیکە، چونکە بەڕاستی تازە ناتوانین بگەڕێینەوە سەر شتێك کە ترەمپ بەئاشکرایی گوتوویەتی ئێمە لێی دەردەچین. ستۆڵتنبێرگ هاوشێوەی ئێستا نیگەران بوو لەوەی بڕیارەکەی ناتۆ بە کۆڕایی نابێ، هاوکات داوای کاتی زیاتری کرد تا ئەو کارە جێبەجێ بکات. ئەمە شتێکی باش بوو، بەوپێیەی هیچ کەسێکمان بیرمان لە بڕیاری ناتۆ نەکردبووەوە و ئاوا بەزوویی بخرێتە گەڕ. ستۆڵتنبێرگ هاوشێوەی هەندێ لە ئەوروپییەکان ترسنۆك نەبوو، بەڵام بەئاشکرایی دیاربوو تووڕەیە. دواتر پێم گوت دوای کۆبوونەوەکەم لەگەڵ ڕووسەکان هەواڵت پێ دەدەمەوە.

کاتێ لە مۆسکۆ دابەزیم، باڵیۆز جۆن هەنتسمان دیدەنیی کردم و گوتی ڕووسەکان خرۆشاون، کار لەسەر ترسی ئەوروپییەکان دەکەن و پشتگوێیان دەخەین، هەروەها بەبێ بەرگرییش جێیان دەهێڵین. ئەم وەك کشانەوە لە ڕێککەوتننامەی (دژە-مووشەکی بالیستیك)ی هەمان کاریگەری لەسەر ئەوروپا هەبوو. ئەمە بۆ ئەوکاتە ڕاست بوو، بەڵام بۆ ئێستا نا. کەسێك دەبوو بیگوتبایە "ئەی ئێوەی ئەوروپییەکان، لەسەر قاچی خۆتان بوەستن و جێگیربن." هەرچۆنێك بێت، من هێشتا نازانم بۆچی ترەمپ لە ویلایەتی نیڤادا ئەم لێدوانانەی دا یان ئەو ڕاگەیاندراوەی لەسەر ئەو لێدوانانەی هەبوو، بڵاونەکرانەوە. بەشێوەیەکی ناڕوون، میرا ڕیکاردێل (جێگری باڵیۆزی ئاسایشی نیشتیمانی)، کاتژمێر ٤ی ئێوارەی ڕۆژی یەکشەمم هەواڵی ئەوەی بەدەست گەیشتبوو کە جەیمس ماتیس داوای کۆبوونەوەی لەگەڵ ترەمپ کردووە لە کۆشکی سپیدا. تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆ کرد، ئەویش نەیدەزانی بۆچی ئەو کۆبوونەوە لەناکاوە دەکەن، تەنانەت دوای قسەکردنیش لەگەڵ ماتیس لە ڕۆژی شەممەدا. پۆمپەیۆ باوەڕی وابوو کە لەوانەیە ماتیس داوای گەڕانەوە بکات بۆ خشتە بنەڕەتییەکە کە تایبەت بوو بە پاشەکشەکردن لە ڕێککەوتنەکە، نەوەك دیسانەوە ئەو بڕیارە سەرەکییە بخرێتەوە بەرباس. لەوکاتەوەی کە ترەمپ

بەشێوەیەکی کاریگەر پاشەکشەی ڕاگەیاندبوو، نەمدەزانی چۆن تازە دەتوانین لەو قسەیە پاشەکشە بکەین، پۆمپەیۆش هەمان باوەڕی منی هەبوو. کێشەی زیاتر نەبوو، تەنیا دەبوو لەگەڵ هاوپەیمانەکانمان زیاتر گفتوگۆ بکەین، بەڵام ئێستا ئێمە لە پێگەی تەواو جیاوازدا بووین پێش ئەوکاتەی ترەمپ لێدوانەکان بدات. بۆچی نا، کەواتە بڕیاری ڕێکارییەکان نێو ڕێککەوتنەکە هەڵپەسێرن و لەگەڵی بەردەوام بن؟! پۆمپەیۆ گوتی ئەمە ئەو شتەیە کە ماتیس دەیویست خۆی لێ بەدوور بگرێت، کە ئەمەش وادەکات بپرسم ئاخۆ ماتیس بەراستی دەیەوێ هەنگاوەکانی چوونەدەرەوە هێواش بکاتەوە، یاخود ئەوەتا بڕیاری خۆی گۆڕیووە لەمەڕ پاشەکشە لە ڕێککەوتنەکە و دەیەوێ یاری بە کات بکات. دەتوانم پێشبینی بکەم کە کەسانی پایەبەرزی واشنتۆن پێشتر تەلەفۆنیان بۆ ماتیس کردووە، منیش حەزم دەکرد بزانم کە ئەو حەزی نەکردووە بێزارم بکات و تەلەفۆنم بۆ بکات، بەڵکو لەبری ئەمە بەخێرایی لەکۆتایی هەفتەدا کە من لەوێ نەبووم کۆبوونەوەیەك گرێ بدات. پرسیارم لە پۆمپەیۆ کرد ماتیسیش چ کێشەیەکی لەگەڵ کاتەکە هەیە. ئەو گوتی ماتیس هەندێ گومانی هەیە و ناتوانی بەو شێوەیە بەردەوام بێ.

ڕۆژی دواتر کۆبوونەوەکەم لەگەڵ پاترۆشێڤ لە باڵەخانەی ئۆلسوفیڤسکی پیریۆلوك بوو کە ناوبراو بەدڵخۆشییەوە وەسفی بۆ دەکردم و گوتی ئەمە بارەگای پێشووتری هێزە تایبەتەکانی (دەزگای ئاسایشی فیدراڵی)ی ڕووسیای ناسراو بە گرووپی ئەلفا بووە، هەر لەلایەن ئاژانسی پاراستنی وڵات ناسراو بە (KGB) لە ساڵی ١٩٧٤دا بنیات نراوە. گرووپی ئەلفا (هێزی ئەرکداری دژە تیرۆر بوو)، یارمەتییەکانی ئەو هێزەی بەبیری ئێمە هێنایەوە، من پێم وابوو ئەوەی باسی دەکرد پێش ئەوکاتە بوو کە پاترۆشێڤ وەك سەرۆکی دەزگای ئاسایشی فیدراڵی ڕووسیا کاری دەکرد. ئێمە دیسانەوە بە باسکردنی بابەتی کۆنترۆڵکردنی چەك دەستمان پێ

کردەوە، هەروەك ڕووسەکان ڕێنموویان کردین کە ڕێبازی فەرمی ڕووسیا هیچ پلانێکی نییە بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتی سەربازی بۆ ئامانجگەلێکی شەڕ و شەڕانگێزی، هاوکات دەسەڵاتی بەرگریش کلیلی سەقامگیریی ستراتیژییە. پاترۆشێڤ بۆی ڕوونکردمەوە بۆچی نایانەوێ ئێمە لە ڕێککەوتنەکە دەرچین، ئاماژەی بەو ڕەخنانە کرد کە هەندێ هاوپەیمانی هاریکار لە وڵاتانی ئەوروپا لە بڕیارەکەی دەگرن. لە وەڵامدا، باسی ئەو هۆکارانەم کرد کە وای کردووە ئێمە هەست بکەین بەوەی ڕووسیا پێشێلی ڕێککەوتنەکەی دەکات و توانای وڵاتەکانی وەك چین و ئێران و وڵاتانی دیکەش ڕێگرە لەوەی نەتوانین ئەم ڕێککەوتنە بەجیهانی بکەین، پێچەوانەی ئەوەی ڕۆژانێك پێمان وابوو ئەمە شتێکی گونجاوە و دەکرێ جێبەجێ بکرێت. وەزیری پێشووتری دەرەوەی ڕووسیا ئیگۆر ئیڤانۆڤ بەباشترین شێوە کاردانەوەی ڕووسیای دەربڕی و گوتی: "ئەگەر ئێوە دەتانەوێ بچنەدەر، فەرموو پاشەکشە بکەن، بەڵام ئێمە لەنێو ئەو ڕێککەوتنە بەردەوام دەبین". ئەو قسەیە بەلای منەوە ئاسایی بوو.

دواتر گوێبیستی وانەیەك (محازەرەیەك) بووین تێیدا نیشاندرابوو کەوا چۆن ئێمە لە ڕێککەوتنەکەی ئۆباما بەناوی (دەستپێکی نوێ :New Start) چەندان پێشێلکارییمان کردووە. بۆ دووەمجار بۆ پاترۆشێڤ و شاندەکەیم ڕوون کردەوە کە ئێمە بۆچی ئەو ڕێککەوتنەمان درێژنەکردەوە، باسی گفتوگۆکانی پەسەندکردنی ئەو ڕێککەوتنەم کرد، تیایدا زۆرێك لە کۆمارییەکان ناواخنی سەرەکی ئەو ڕێککەوتنەیان ڕەت کردبووەوە، نموونەش وەك چەکە ناوکییە تاکتیکییەکان کە بە هیچ شێوەیەك باسی لێوەنەکرابوو. من دووبارە فشارم خستەسەر تا ڕێککەوتنی مۆسکۆی ٢٠٠٢ نوێ بکەینەوە، کە بە جۆرێك ئاسانتر، ڕوونتر و باشتر کاری دەکرد. پاترۆشێڤ ئەو بیرۆکەیەی پشتگوێ نەخست. لەبری ئەمە، گوتی کە ڕێککەوتنی مۆسکۆی ٢٠٠٢ زۆر ئاڵۆزتر بوو لەوەی وادیاربوو، چونکە

پشتی بەستبوو بە ڕێککەوتنی (دەستپێکی دوو (Start 2 و ئەو ناواخنەی هەیبوو، ئەمەش تەواو ڕاستگۆیانە نەبوو، بەڵام من کاتی زیاترم بۆ دووبارە باسکردنی ئەو کێشانە نەکوشت. ئەوەی هێرشی بۆ هێنابووم ئەوەبوو کە تەنانەت لەگەڵ نەمانی ڕێککەوتنی (INF)، ڕووسەکان ئامادەن وەك مۆدێلێك سەیری ڕێککەوتنەکەی ٢٠٠٢ بکەن. لەگەڵ ئەمانەش، هێشتا هیوایەك هەیە بۆ ڕێککەوتن.

ئێوارەیەکی درەنگی ئەم ڕۆژە و دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکان، تەنیا شەوەکەی نەبێ کە بۆ نانخواردن لەلایەن وەزیری دەرەوەی ڕووسیا سێرگی لاڤرۆڤ لە شاری ئۆسۆبنیاك داوەت کرابووین، تەلەفۆنم بۆ ڕیکاردێل کرد تا بزانم لە کۆبوونەوەکەی ڕۆژی یەکشەممە لەگەڵ ترەمپ چی ڕوویداوە و چی باسکراوە؟ ڕیکاردێل گوتی ماتیس ڕێگری دەکا لەو پلانە هەژدە مانگییەی بۆ کشانەوە لە ڕێککەوتنی (INF) دانرابوو، ئێستاش ئەم قسەیە هیچ گرنگییەکی نییە. ماتیس دەیەوێ بگەڕێنەوە پێش ئەوکاتەی ترەمپ هێشتا لێدوانی نیڤادای نەدابوو و لەمبارەیەوەش لێدوانێکی ڕۆژنامەوانی بدات. من هێشتا تێنەدەگەیشتم ئێمە چۆن دەتوانین ئەم کاتە بگەڕێنەوە، وا نیشانی دەدا کە ئێمە ڕاوێژ بکەین یان ئەوەتا ڕێککەوتنەکە جێ بهێڵین، یاخود ڕووسیا هەندێ کاردانەوەی دەبێ و پابەندی ڕێککەوتنەکە دەکات (بۆ ئەمەش تەنانەت کەمترین ئاماژە بوونی نەبوو). ئایا مەبەستی لەم تەمسیلکردنە چی بوو؟! ترەمپ گوتی کە هیچ هۆکارێك نابینێ لەم پاشەکشەیە بەردەوام نەبین، بەڵام هیچ نارەزایەتیەکیشم نییە گەر لە ٤ی کانوونی یەکەم بە فەرمی ئەم پاشەکشەیە ڕابگەیەنین، کە ئەمە پێچەوانەی ئەو لێدوانەی خۆیەتی و پشتگوێخستنی ئەم ڕاستەقینە نوێیەیە کە خودی لێدوانەکەی دروستی کردبوو. دوای کۆبوونەوەکەی ترەمپ، هەریەك لە ماتیس و پۆمپەیۆ و ڕیکاردێل لەمەر ڕەشنووسی لێدوانێکی ماتیس گفتوگۆیان کردبوو، کە لە باشترین حاڵیدا

دەبووەهۆی خراپکردنی ڕەوشەکە، هاوکات ئامانجیشی ئەوەبوو بگەڕێتەوە سەردەمی پێش لێدوانەکەی ترەمپ. من بە ڕیکادرێلّم گوت هەرچی لەتوانایدایە ئەنجامی بدە بۆ شکستهێنان بەوەی ماتیس دەیەوێ بیکات.

ئەوە ئەو شتە بوو کە بێزاری کردبووم، بەڵام ترەمپ وایکرد ئەو بابەتە مشتومڕی زیاتر هەڵگرێت (ئەگەر ئەو قسەیە گونجاو بێت). لە ڕۆژی دواتر کە دووشەم بوو، لە یەکێك لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکانی وەك هەمیشە و لە کاتی جێهێشتنی دەروازەی باشووری کۆشکی سپی و سواربوونی کۆپتەرەکەی، ترەمپ گوتی: "من کۆتایی بەو ڕێککەوتنە دەهێنم کە ڕووسیا پێشێلی کردووە، من کۆتایی بەمە دەهێنم." پرسیار کرا ئاخۆ ئەمە مەترسییە بۆ پوتین، ترەمپ لە وەڵامدا گوتی: "ئەمە هەڕەشەیە بۆ هەرکەسێك کە تۆ دەتەوێ، ئەمە چین و ڕووسیا و هەرکەسێك دەگرێتەوە کە دەیەوێ لەم یارییە بەشدار بێ. تۆ ناتوانی ئەم یارییە لەسەر حیسابی من ئەنجام بدەی." چ قسەیەکی دیکە هەبوو دەبوو لەمبارەیەوە بکرێ؟ من لەوکاتەدا درکم بە هیچ نەکرد، بەڵام دواتر حەزم دەکرد بزانم بەتایبەتی لەگەڵ دەستلەکارکێشانەوەی ماتیس لە دوو مانگی دواتردا، ئایا ئەوە هەوڵی کەسیی خۆی بوو بۆ دروستکردنی کاریگەری و نیشانی بدات کە تا کۆتایی جەنگاوە بۆ پاراستنی ئەو ڕێککەوتنە. تەواوی ئەو کارە تەنیا بریتیبوو لە بەفیرۆدانی کات و وزە، بەبێ ئەوەی باسی دڵەراوکێی دۆستە دەرەکی و دوژمنەکانمان بکەم. ئەو ئێوارەیە دواتر قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد، ئەویش سووربوو لەسەرئەوەی کە ماتیس لەڕاستیدا داوای هیچ گۆڕانکارییەکی لە سیاسەتەکەماندا نەکردووە. من هەستم کرد دوورم و لەو بابەتە و بێهیوا ببووم، بەڵام سووربووم لەوەی بەردەوام دەبم لە کارکردن بۆ ئەوەی کەمترین کات بە نەیارەکانمان بدەم تا نەتوانین ئەوەی ترەمپ دووجار لەبەرچاوی خەڵکی عەوامدا ئاماژەی پێدا، شکستی پێ بهێنن. دەوروبەری کاتژمێر ٤ی ئێوارە بە کاتی مۆسکۆ تەلەفۆنم بۆ

ترەمپ کرد و گوتی نازانم ئەو هەڵاوهۆسەیە لەسەر چییە و نازانم بۆچی ماتیس پێی وایە ئەمە زۆر گرنگە. من بە ترەمپم گوت کە بە ڕووسەکان دەڵێم ترەمپ بە ڕوون و ئاشکرایی گوتوویەتی ئێمە لەو ڕێککەوتنە دەردەچین، دواتر ترەمپ گوتی: "من حەزم لەمەیە و پێم باشە ئەو کارە دەکەی." ئەوەی پێویستمان پێیە ئەوەیە کە تۆ دەیکەی.

ڕۆژی دواتر چاوم بە وەزیری بەرگریی ڕووسیا، سێرگی شۆیگۆ، کەوت. لەگەڵ ڕێزم بۆ ڕێککەوتننامەی (INF)، وادیاربوو ناوبراو کەمتر لە ماتیس نیگەرانی ئەو بابەتەیە. ناوبراو لە ڕێگەی (وەرگێڕ)ەکەوە گوتی کە پەیامەکەی ترەمپ ڕوون و ئاشکرایە، ڕووسەکانیش بەتەواوی گوێبیستی ئەمە بوون. ناوبراو زیاتر گوتی، لەژێر ئەو بارودۆخەی ئێستا، پیاوی ژیر دەکرێ ببینێ کە بارۆدۆخی ژێر ئەم ڕێککەوتنە شتێکی ناواقیعییە، ئەمەش بەهۆی وڵاتی چین و ئەو گۆڕانکارییانەی لەوەتەی ساڵی ١٩٨٧ەوە بەسەر تەکنەلۆژیا و خودی ڕێککەوتنەکەدا هاتووە. شۆیگۆ حەزی دەکرد دیسانەوە ڕێککەوتنەکە بنووسرێتەوە و وڵاتی دیکەش بێنە ناویەوە، چونکە پێی وابوو دەرچوونی یەك لایەنەی ئەمریکا تەنیا لە بەرژەوەندیی دوژمنە هاوبەشەکانمانە، کە دواتر بەردەوام هەر دووپاتی دەکردەوە. من پێم وابوو ئەمە ئاماژەکردنە بە وڵاتی چین قسەیەکی هەڵە نییە. شۆیگۆ دواتر گوتی ئەمە ماوەیەکی زۆرە ئەم ڕێککەوتنە واژوو کراوە، ئاڵنگارییەکەش ئەوەیە کە تەکنەلۆژیاکان ئێستا لەدەست کەسانێکن کە نابێ بگاتە دەستیان. لەبیرمە کە ناوبراو کۆتایی بە قسەکانی هێنا بەگوتنی ئەوەی کە کاریگەری ئەم ڕێککەوتنە بەسەرچووە، ئەمە هەستیارترین شت بوو کە کەسێك لەنێو ڕووسیادا لەبارەی ئەم بابەتە دەیگوت. بەشێوەیەکی کە جێگەی بایەخە، شۆیگۆ و ماتیس هەرگیز چاویان بەیەك نەکەوت و کۆنەبوونەوە، لەراستیدا پۆمپەیۆ و لاڤرۆڤیش هێشتا کۆنەبوونەتەوە، منیش هەموو ئەوکاتە قسەم لەگەڵ ڕووسەکان دەکرد.

ئەو ئێوارەیە، من و هەنتسمان تاجەگوڵینەمان لەسەر پردێك دانا نزیك بە کریملن، نزیکەی ١٠٠ یاردێك کەمتر لەولای کڵێسەی سەینت باسیل بوو، ئەمە ئەو شوێنە بوو کە بۆریس نیمتسۆڤی تێدا کوژرا، زۆرێك باوەڕیان وایە لەلایەن پیاوانی بەکرێگیراوی (کریملن)ەوە کوژرا. دواتر تاجەگوڵینەمان لەسەر ئارامگەی سەربازی نەناسراوی ڕووسی دانا لە نزیك دیواری کریملن، نزیکەی (٣٠) ساڵێك پێشتر ساڵ لەگەڵ دۆناڵد ڕامسفێڵد بەشداری ئەو یادەمان کردبوو. دوای ئەوە یەکسەر چاوم بە پوتین کەوت، دیسانەوە هاوشێوەی کۆبوونەوەی پێشتر بە هەمان قسەوباس دەستمان پێ کرد، لە هەمان ژووری ڕازاوە بوو، هەمان ڕێکاری، هەمان مێزی کۆنفرانس بوونیان مابوو. پوتین بە ئاشکرایی دەیویست قسەیەك بکات بەڵام کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئامادەییان هەبوو، ڕایگەیاند کە دڵتەنگە بەوەی ئەمریکا لە ڕێکەوتنی (INF) دەکشێتەوە. پوتین تێبینی ئەوەی کرد کە ئەو بازەی لە لۆگۆی حکوومەتی ئەمریکادا هەیە بە یەك چنگ چەندان لقی دار زەیتوونی گرتووە، (لەگەڵ ئەوەشدا پوتین نەیزانی کە بازەك لەلاکەی تریش بە چنگی (تیری)ەکانی گرتووە). دواتر پرسیاری کرد ئەگەر بازەکە هەموو زەیتوونەکانی خوارد، منیش گوتم زەیتوونی نوێم لەگەڵ خۆم نەهێناوە. ئەم گاڵتەپێکردنە بە هەمان شێوەی سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت بوو.

کاتێ ڕاگەیاندکاران دەرچوون، پوتین گوتی کە ڕاپۆرتی بەدەست گەیشتووە لەمەڕ کۆبوونەوەکانی پێشترم و هەر خۆشیان ئەم پەیوەندییە بە بەزری دەنرخێنن، گوتیشی کە هەردەم جێگەی دڵخۆشییە چاوی بە من دەکەوێ. هەریەکەمان بەدرێژی باسمان لە ڕوانینی خۆمان کرد دەربارەی ڕێککەوتنی (INF)، بەڵام ئەوەی جێگەی بایەخی پوتین بوو ئەوە بوو کە لە دوای ئەمە چی ڕوودەدات؟ بەو مانایەی ئێمە دواتر چۆن بیر لە بەرەوپێشچوونەکانی ئەوروپا دەکەینەوە؟ گوتیشی کە تەنیا ڕووسیا و

ئەمریکا بەهۆی ئەو ڕێککەوتنەوە سنووردارکراون و دەستوپێیان گیراوە. منیش گوتم، پێم وایە هەر لەدوای کۆبوونەوە پوتین خۆی گوتی کە ڕووسەکان لە کاریگەریی ستراتیژی ئەم ڕاستییە تێگەیشتوون، مەبەست لەمە بریتبوو لە توانا گەورە و پێشکەوتووەکانی مووشەك، مووشەکی بارهەڵگر و بالیستیکیەکانی وڵاتی چین. پوتین ڕازیبوونی خۆی نیشاندا و ئاگەداری خۆی لەمەڕ ئەو ڕەوشەی وڵاتی چین دووپات کردەوە، بەڵام گوتیشی کە من هیوام نەخواستووە ئەمریکا لەم ڕێککەوتنە بکشێتەوە، هاوکات هاوڕابوو لەگەڵم کە ئەم ڕێککەوتنە تەنیا بووەتەهۆی ئەوەی ئەمریکا و ڕووسیا تواناکانیان سنووردار بکرێت. پوتین دواتر بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی بۆ کاتی ئێستا کشانەوە لەم ڕێککەوتنە بابەتی هەر گرنگ نییە، بەڵکو پلانی داهاتووی واشنتۆن چی دەبێ ئەو گرنگە. هەروەك چۆن لە زۆربەی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکانم ئاماژەم پێداوە، پێمگوت ئەمریکا تا ئێستا هیچ پلانێکی دەربارەی بەرەوپێشچوونەکانی داهاتوو نییە. بەڕوونی، پوتین زیاتر نیگەرانی ئەوەبوو ئاخۆ ئێمە چ مامەڵەیەك لەگەڵ ئەوروپادا دەکەین، هەفتەی دوای ئەمەش پوتین ڕێگەی تۆقاندنی وڵاتانی ئەورووپی هەڵبژارد بەوەی گوتی کە ئێمە دەگەڕێینەوە سەر هەمان ئەو ململانێیانەی لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٨٠کان لە دژی ئەمریکا بەرپامان کرد لە هەمبەر ئەوەی ئەمریکا (مووشەکی جۆری پێرشینگ ٢)ی دامەزراند. پوتین بەڕوونی ئەم خاڵەی بە باوەڕی گشتی ڕاگەیاند، بە جۆرێك هەڕەشەی لە هەر وڵاتێك کرد گەر سیستەمی مووشەکی ئەمریکا قەبووڵ بکات، لەکاتێکدا گەر پابەندی مەرجەکانی ڕێککەوتنی (INF) نەبێت. بێگومان، ڕووسیا پێشتر لە ڕێگەی دامەزراندنی سیستەمی مووشەکی لە شاری (کالینینگراد) ئەم پێشێلکارییەی کردبوو کە ئەمە تەنیا یەکێك بوو لە پێشێلکارییەکانیان، هەر ئەمەش هۆکاری سەرەکییە تا ئێمە لەو ڕێککەوتنە پاشەکشە بکەین.

پوتین گوتی خۆت دەزانی ئێمە هەردووکمان (پارێزەر)ین، دواتر گوتی: "ئێمە دەتوانین هەتا خۆرئاوابوون ئاوا بەم جۆرە قسە بکەین"، دواتر هەندێ نوکتەمان گۆڕییەوە لەسەر پارێزەران. تایبەت بە ڕێککەوتنی (دەستپێکی نوێ New Start)؛ ئێمە پێداچوونەوەمان بە هەڵوێستە پەیوەندیدارەکانمان کرد، دیسانەوە سووربوونی خۆم نیشاندا لەوەی پێویستە لەسەر ڕێککەوتنێکی هاوشێوەی (ڕێککەوتنی مۆسکۆ) ڕێکبکەوین و بگەڕێینەوە سەری و سوودی بۆمان دەبێت. دواتر گوتی، بۆچی بگەڕێینەوە سەر ئەو ئازار و نارەحەتییە و دیسانەوە گفتوگۆ لەسەر ڕێککەوتنی دەسپێکی نوێ بکەینەوە، بۆ نموونە، کەمکردنەوە یان سنووردارکردنی چەکە ناوکییە تەکنیککییەکان، ئەمە گرنگییەکی زۆری بۆ ئەمریکا هەیە و ڕێژەی زۆر لەم جۆرە چەکانە بە ئەمریکا دەدات کە ڕووسیا هەیەتی؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەی پوتین، من گوتم هیچ نیازێکمان نییە لە ڕێککەوتننامەی (دەستپێکی نوێ) بکشێینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دڵنیا نین ئاوا بەئاسانی پێنج ساڵی دیکە درێژی بکەینەوە، هەروەك ئێوە داوای دەکەن (هاوکات نزیکەی تەواوی ئەندامە دیموکراتەکانی ئەنجوومەنی پیران داوای دەکەن). خۆشبەختانە، خۆمان بەدوورگرت لە گفتوگۆی درێژخایەن لەوەی کێ لەگەڵ ڕێککەوتنەکەیە و کێی دیکەش پێشێلی ڕێککەوتنەکانی (INF) و (دەستپێکی نوێ)ی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش گوتم کە ئەم جۆرە لادانانە نیشانی داوە لەوەی تا چەند ئەو ڕێککەوتنانە دەکرێ تێکدەر بن، لەبری ئەوەی ئامانجە بەرزەکان بەرەوپێش ببەن و ململانێکان هێوربکەنەوە.

دەربارەی ڕەوشی سووریاش، پوتین جەختی کردەوە کە ڕووسەکان پێویستیان بە هەبوونی ئێرانییەکان نییە لە سووریادا، ئەمەش باشترین شتە بۆ هەردوولامان تا ئەنجامی بدەین و هانیان بدەین تا لە سووریا دووربکەونەوە. پوتین گوتی ئەم بابەتەم لەگەڵ نەتەنیاهۆ باسکردووە، منیش ئاماژەم کرد بەوەی لە ڕێککەوتنی ناوکی ئێران کشاوینەتەوە،

ئەمریکا دیسانەوە ئابلووقەکانی دەخاتەسەر ئێران، کە ئێمە چاوەڕوان دەکەین بەتوندی زیانیان پێ بگەیەنێت، بەڵام ڕووسیا ئامادەی ئەوەی تێدانەبوو تا ئێران لە سووریا دەربکەن. پوتین گوتی من لەو لۆژیکە تێگەیشتووم، تێشدەگەم لەو ڕوانینەمان کە خەڵکی ئێران لەدەست ئەو ڕژێمەیان ماندووبوونە. بەهەرحاڵ، پوتین ئاگەداری دا کە ئەگەر ئێمە شەڕی ئابووری لە دژی ئێران ڕابگەیەنین، ئەوا وادەکات پشتگیرییەکان بۆ ئەم ڕژێمە یەك بخات و زیاتریش بێت. من بۆم ڕوونکردەوە کە بۆچی بابەتەکە وانابێت و بۆچی سەپاندی ئابلووقەی بەهێز وادەکات پشتگیری بۆ ڕژێم کەم دەبێتەوە، کە هەر خۆیان ماوەیەکە لەژێر پاڵەپەستۆی زۆردان. پوتین هەروەها گوتی کە دەزانم هەریەکەمان خاوەن تیۆرگەلی خۆمانین لە هەمبەر چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئێراندا، دەشبینین کە کام لەمانە بەکەڵك دێت. پوتین گاڵتەی بەو زیانە دەهات کە ئێمە لەمەڕ سعودیەی عەرەبی و بابەتی کوشتنی ڕۆژنامەنووس (جەمال خاشوقچی) دووچاری هاتین، تەنانەت گوتی ئەگەر ئێوە چەك بە سعودیە نەفرۆشن، ئەوا ئێمە پێیان دەفرۆشین، کە ئەمە بێگومان قسەیەکی ڕاست بوو. پوتین هاوکات تێگەیشتبوو لەوەی بۆچی ترەمپ نایەوێ دەستبەرداری ئەو چەکانە بێت کە خەریکبوو بفرۆشرێتە سعودیە. دوای کاتژمێرێك و سێ چارەگ و لە کاتژمێر حەوت و پێنج خولەکی ئێوارە کۆتاییمان بە کۆبوونەوەکە هێنا. پوتین لەمیانەی یادی سەدساڵەی ئاگربەستی ١١ی تشرینی یەکەم لە شاری پاریسدا، بە ترەمپی گوتبوو کە گفتوگۆکەی لەگەڵ من زۆر خۆش بووە و منی بە کەسێکی پرۆفیشناڵ و تایبەت وەسفکردبوو، منی بە کەسێك دانابوو جیاواز لەوانەی هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر ترەمپ نییە. ئەوکاتەی تەوقەمان لەگەڵ یەکتری کرد و خوداحافیزیمان لەیەکتری کرد، پوتین زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی تۆم بینی کە بەرەو قەوقازیا دەچووی.

من گەڕامەوە وڵات و هەستم کرد ڕووسیا دڵخۆشە بەوەی هەردەم

پەنجەی لۆمەکردن بۆ ئێمە ڕابکێشێ، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو ئەورووپییانەی بەردەوام تووڕەن، ئیدی دەزانم دەستەکەن بە هەڵمەتێکی ئۆپۆزسیۆنانە لە دژی دەرچوونی ئێمە لە ڕێککەوتنەکەدا یان نا، ئەمە مایەی بێزارییە، بەڵام هەڕەشەیەکی لەگەڵدا نییە. من پێشبینی هیچ پڕوپاگەندەیەکی جددی یان هەر شتێك کە ببێتە بێهیوابوونی ئێمە لە دەرچوونمان لەو ڕێککەوتنە، نەدەکرد. لەو کەینوبەینەدا، پێدانی دواهەمین بەرەوپێشچوونەکان بە هاوپەیمانەکانمان لەنێو ناتۆدا لە برۆکسل و لەنێو پایتەختەکانی دیکەش بەباشی بەڕێوەچوو. لە تەبلیسی پایتەختی جۆرجیا گەڕامەوە، دواتر وەك دوا وەستانم لە فرۆکە قسەم لەگەڵ ستۆڵتنبێرگ کرد، ئەویش لەلای خۆیەوە گوتی زۆرینەی هاوپەیمانەکانمان لە لۆژیکی ئەو هەڵوێستەی ئێمە تێدەگەن. بەهەرحاڵ، ناوبراو هەروەها گوتی چەندان وڵات هێشتا نکۆڵی دەکەن لەوەی دان بنێن بەوەی کە ڕووسیا پێشێلکاریی کردووە، چونکە ئەوان دەترسن لەوەی ئەگەر ڕازی بن بەوەی ڕووسیا پێشێلکاریی کردووە، ئەوا لەوانەیە مانای ئەوەبێ کە ڕۆژانێك دەبێ لەسەر سنووری وڵاتەکانیان چەکی ناوکی قەبووڵ بکەن. بە ڕوانینی من ئەمەیان قسەیەکی بێمانا بوو، هاوپەیمانانی ناتۆ ئامادەبوون نکۆڵی لەم ڕاستییە بکەن، چونکە لە دەرئەنجامەکانی ئەو ددانپیانانە دەترسان. ئایا لەڕاستیدا بڕوایان وابوو ئەگەر ددان بەو ڕاستییە نەنێن، کەواتە قسەکەی ئێمە ڕاست نییە؟ زۆرێك لە لایەنەکان فشاریان دەکرد کە پڕۆسەکە دوابخەین بەر لە پاشەکشەکردن، ئەمەیان ڕێگەیەکی ئاشکرابوو دەیانویست کاتیان دەستکەوێ و بە هەموویان نەیەڵن ئەو پاشەکشەیە ڕووبدات، هەر ئەمەش وایکرد نیگەرانی ئەو بەرهەڵستییە ئاشکرایەی ماتیس بم. لە شاری پاریس و لە یادی سەد ساڵەی ئاگربەستی ١١ی تشرینی دووەم، چاوم بە (سێرویل، کیتینی و جان هێکەر) کەوت (ئەمانە ڕاوێژکاری ئەڵمانیا بوون)، بۆ قسەکردن لەسەر خواستی ئەڵمانیا لەمەڕ ئەوەی جارێکی دیکە بۆ ماوەی ٦٠ ڕۆژ

دەرچوونی ئێمە لە ڕێککەوتنی (INF) دوابخەین. من خۆم بەمە ڕازی نەبووم، بە تایبەتی بەوپێیەی ترەمپ بە ئاشکرا خواستی لەسەر ئەوەبوو هەرچی زووترە لەو ڕێککەوتنە دەربچین، بەڵام ئەو بابەتە بە هەڵپەسێردراوی مایەوە.

لە ناوەڕاستی تشرینی دووەم و لە لووتکەی یەکێتیی نەتەوەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا کە لە وڵاتی سەنگافورە بەڕێوەچوو، یاوەری (مایك پێنس)ی جێگری سەرۆکم دەکرد، کۆبوونەوەیەکی خۆڕسکانەمان لە گۆشەیەکی ئەو هۆڵە گەورەیە لەگەڵ (پوتین)دا هەبوو. ئێمە لەلایەن پیاوانی هەواڵگری و ئاسایشەوە دەور درابووین، لەوکاتەی زۆر لە خەڵکەکە دەردەچوون ئێمە زیاتر جەختمان دەکردەوە. مایك پێنس ویستی مەسەلەی دەستوەردانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکان بخاتە بەرباس، بەڵام گفتوگۆکان بەخێرایی بە ئاراستەیەکی دیکە چوو. پوتین پرسیاری کرد کاروبارەکان گەیشتوونەتە کوێ لەگەڵ ترەمپ بەتایبەتی لە کۆبوونەوەی داهاتووی (G20) لە وڵاتی ئەرژەنتینیدا، تایبەتتر بۆ قسەکردن لەسەر سەقامگیریی ستراتیژی و ڕێککەوتننامەی (دەستپێکی نوێ)، کە ئەمانە بابەتگەلی بایەخدار دەبن. وادیاربوو پوتینیش چی دیکە نەیدەویست گرنگی بە ڕێککەوتنی (INF) بدات، لە ڕێگەی وەرگێڕەکەوە پێی گوتم کە لەو لۆژیك و گفتوگۆیانە تێگەیشتووم کە ئێوە هەتانە لە هەمبەر بڕیاری چوونە دەرەوەتان لە ڕێککەوتنی (INF)، کە من پێم وایە ئەمە هەمان ئەو ڕوانینە هاوبەشەیە کە لەسەر وڵاتی چین هەمانە. منیش لە وەڵامدا گوتم لە کاتی کۆبوونەوەی G20و بەگوێرەی خشتەی کارەکان دەگەڕێینەوە سەر ئەو بابەتە.

بەهەرحاڵ، ئەڵمانەکان بەردەوام بوون لەسەر سووربوونی خۆیان و داوای دواخستنیان دەکرد، بۆیە بە ترەمپم ڕاگەیاند کە پێویستە ئێمە لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ناتۆ لە ٤ی کانوونی یەکەمدا

پاشەکشەی خۆمان لە ڕێککەوتنەکە ڕابگەیەنین لەبری ئەوەی ٦٠ ڕۆژی دیکە بە ئەڵمانیا بدەین، ڕووسیاش هێشتا هەوڵ دەدات وڵاتانی ئەورووپی بترسێنێت، هەروەها مەترسی دواخستنەکانی داهاتوو بەسادەیی شیاوی ئەمە نییە. ترەمپ بەمە ڕازی بوو، هەروەها ئێستا نیگەرانی ئەوەبوو کە دواخستنەکانی داهاتوو وادەکات ئێمە لەچاوی ڕووسیا وەك وڵاتێکی لاواز دەربکەوین. ترەمپ لەمەدا لەسەر هەق بوو. ڕۆژی دواتر هەر لەوێ کۆبوونەوەکان بەردەوام بوون، لە کۆبوونەوەیەکیش لەگەڵ ترەمپ لەسەر چەند بابەتێکی دیکەدا، ماتیس لەگەڵ ئەوەبوو ٦٠ ڕۆژی دیکە کات بە ئەڵمانیا بدرێت و داکۆکی لێ دەکرد. ئایا ماتیس قسەی لەسەر کارنامەیەك دەکرد کە پێشتر باسی لێوە نەکرابوو؟! من دیسانەوە گوتم پێویستە ترەمپ لە ٤ی کانوونی یەکەمدا ئەم گوللەیە بتەقێنێت، بۆیە ترەمپ گوتی: "من ڕازیم، ئەم کارە وەك سەرکەوتنێك دەبێ بۆ جۆن بۆڵتن، ئێمە لە ٤ی کانوونی یەکەم پاشەکشەی خۆمان ڕادەگەیەنین." دواتر فشارم خستەسەر ترەمپ تا لەهەمان کاتدا هەڵپەساردنی پابەندییەکانی ئێمە بەهۆی پێشێلکارییەکانی ڕووسیاوە لەم ڕێککەوتنەدا ڕابگەیەنێت، ئەمەیان چەمکێك بوو جیاواز لە پاشەکشە، ئەمەیان ڕێگەمان پێ دەدا دەستبکەین بە پێشێلکاری تەنانەت گەر مەودای ئەو ١٨٠ ڕۆژەش دەست پێ بکات، ترەمپ ڕازیبوونی خۆی لەسەر ئەمە نیشان دا. میگن کیلّلی وەك ڕۆژنامەنووس ئەویش ئامادەبوو، پرسیاری لە ترەمپ کرد "سەرۆك، کەوابێ هەموو شتێك تەواو؟" ترەمپیش گوتی: "بەڵێ".

بەڵام، بێگومان، ئەم بابەتە بەتەواوی کۆتایی نەهاتبوو، لە کۆبوونەوەی G20 لە بۆینس ئایرێس و لە ١ی کانوونی یەکەمدا، مێرکڵ لە کۆبوونەوە دووقۆڵییەکەی لەگەڵ ترەمپدا هەوڵێکی دیکەی دا. مێرکڵ گوتی من بەتەواوی ڕازیم لەسەر ئەوەی کە ڕووسیا پێشێلکاری کردووە، بەڵام گلەیشی کرد لەوەی هیچ گفتوگۆیەکی سیاسی لەنێوان ئەمریکا و ڕووسیا

بوونی نەبووە، کە بەراستی ئەمە شتێکی بێمانایە، لەکاتێکدا نەك هەر لە کاتی ئیدارەی ترەمپ، بەڵکو لە سەردەمی ئۆباماش گفتوگۆی لەم جۆرەمان هەبووە. ترەمپ پرسیاری لێ کردم ئاخۆ بۆچوونی من چییە، منیش پێم گوت پلانەکان چۆن دانراوە پێویستە ئاوایی بەردەوام بین بەجۆرێك لە ٤ی کانوونی یەکەمدا پاشەکشە بکەین. ترەمپ گوتی نامەوێ بەرامبەر ڕووسیا لاواز دەرکەوم، مێرکڵیش گوتی ئەگەر ٦٠ ڕۆژی تر دەرفەتم پێ بدەن، ئەوا پشتگیری ئەمریکا دەکەم. دوای چەندان خولەك لە گفتوگۆی بەردەوام، ترەمپ پێی گوتم من لەگەڵ تۆ ڕازیم، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەو دوو مانگە دەرفەت بە مێرکڵ دەدەین کە خۆی داوای کردووە، دوای ئەو ماوەیە بێگومان دەتوانین لەو ڕێککەوتنە پاشەکشە بکەین. من و پۆمپەیۆ بۆ سووربوون لەسەر ئەوەی کە تەنیا (دوو مانگ) نە زیاتر، مێرکڵیش ڕازی بوو. من گوتم لە کاتی ئێستادا ئەڵمانەکان پشتگیری بڕیاری پاشەکشە دەکەن، دواتریش نابێ هەندێ زاراوەی دیکە بەکار بێنن، نموونەش وەك (تێدەگەم) کە پێشتر هاوشانەکەم (هێکەر) لەگەڵ مندا ئەمەی بەکارهێنا، مێرکڵیش دیسانەوە ڕازیبوونی خۆی نیشاندا. بیرم کردەوە کە هەموو ئەوەی دەمەوێ دەکرێ بەدەست بێت، بەڵام بە بەراوردکردنی ئەمە لەگەڵ لادانی باندجەکە بەهێواشی لەسەر برین و ئازارەکە، ئەوا لە ئاست ئازارەکەدا نییە. ئێمە هەموو ئەو شتانەمان بۆ هاوپەیمانەکانمان لەنێو ناتۆدا ڕوون کردەوە، ترەمپیش گوتی: "لەسەر داوای ئەڵمانیا و هەندێ وڵاتی دیکە لە ماوەی ٦٠ ڕۆژی داهاتوودا لەو ڕێککەوتنە پاشەکشە دەکەین". ئەوەی جێگەی نارەحەتی بوو ئەوەبوو کە ترەمپ هێشتا سوپاسگوزار نییە بەرامبەر ئەو ١٨٠ ڕۆژەی دەبوو تێپەڕبێت بەرلەوەی بەراستی پاشەکشەمان بکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام بۆ دووبارە باسکردنەوەی ئەم بابەتە تازە درەنگ بوو.

ڕاگەیاندنی پاشەکشەمان لەو ڕێککەوتنە لە ٤ی کانوونی یەکەمدا بەباشی بەڕێوەدەچوو، هەروەها ئاگەداری ئەو چوونەدەرەوەیەمان لە ١ی شوباتی ٢٠١٩ بڵاوکردەوە. ڕووسەکان ڕاستەوخۆ ڕایانگەیاند کە هەر گفتوگۆیەکی دیکە دەربارەی کۆنترۆڵکردنی چەك هەڵدەسپێردرێ، ئەمەش لایەنێکی بەسوود و چاوەڕوانکراو بوو. بەرپرسی باڵا لەنێو چاودێریکارانی چەکی ئەمریکا بە "پیاوی بکوژی ڕێککەوتننامەی چەکی ناوکی" بانگی کردم، منیش وەك دەستکەوتێك سەیری ئەو نازناوەم کرد. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات هەندێ هەڵاوهۆسە دروستبوو، بەڵام لە کاتژمێر ١٢:٠١، ڕۆژی هەینی، بەرواری ٢ی ئاب ئەمریکا لەو ڕێککەوتنە پاشەکشەی کرد. بەڕاستی ڕۆژێکی گەورە و مێژوویی بوو!

ڕێکەوتنە دوولایەنی و هەمەلایەنەکانی دیکە کە ئەمریکا و ڕووسیای تێدایە، ئەوانیش پێویستە بخرێنە ژێر ئەم چنگەوە، مەبەستم لەو ڕێککەوتنە هەمەلایەنانەیە کە ئەمریکا بە نائەقلانییەوە بەشداری تێداکردووە. بۆ نموونە، ترەمپ ئامادەی خۆی پیشانداوە و ڕازییە لەسەر ئەوەی (ڕێککەوتنی بازرگانی چەك)ی سەردەمی ئۆباما پوچەڵ بکاتەوە کە هەرگیز لەلایەن ئەنجوومەنی پیرانەوە پەسەند نەکراوە، هاوکات ماوەیەکی زۆرە (گرووپەکانی دژە-کۆنترۆڵکردنی چەك) لە ئەمریکادا لە دژی وەستاونەتەوە، ئەو ڕێککەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە من لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکای سەردەمی جۆرج بوشی کوڕدا، خزمەتم دەکرد. ترەمپ لەکاتێکدا لە کۆبوونەوەی ساڵانەی (یەکێتیی چەکی ئەتۆمی) لە شاری ئیندیاناپۆڵس لە ٢٦ی نیسانی ٢٠١٩دا، بە هەیەجانێکی زۆرەوە بەخێرهاتنی لێ دەکرا، کەچی لەپێش چاوی خەڵکەکە واژووی لەسەر پووچەڵکردنەوەی ڕێککەوتنەکە کرد.

ترەمپ، هەروەها ڕێککەوتنی (پاریس)ی دەربارەی گۆڕانی کەشوهەوا (climate change) پووچەڵ کردەوە، ئەمەیان کارێك بوو کە پشتگیریم

لێ دەکرد. ئەم ڕێککەوتنە هەموو ئەو کاریگەرییە جیهانییە ڕاستەقینانەی لەسەر بابەتی گۆڕانی کەشوهەوا هەیەتی لە خۆی گرتووە، تەنانەت باسکردنی تەسبیحی نوێژخوێنان و مۆمی داگیرساوی نێو کڵێسا (کە لەوانەیە لە داهاتوودا کەسێك ئەمەش قەدەغە بکات بەهۆی ئەو کاربۆنەی لە سووتانی مۆمەکان دروست دەبێت). ئەم ڕێککەوتنە بەشێوەیەکی سادە پێویستی بە واژوو هەبوو تا ئامانجە نەتەوەییەکانی تێدا جێگیر بکرێت، بەڵام ڕوونی ناکاتەوە دەبێ ئەو ئامانجانە چۆن بن، هاوکات هیچ میکانیزمێکی بەهێزبوون و پاڵپشتی لەخۆ نەگرتووە. ئەمەیان هاوشێوەی زانستی ئایینناسییە، بەڵام وەك سیاسەتێك ڕۆڵ دەگێڕێ، هاوکات وەك دیاردەیەکی گەشەسەندووی نێو کاروبارە نێودەوڵەتییەکانە.

لیستی ئەو ڕێککەوتنانەی دیکە کە پێویستە پشتگوێ بخرێن زۆرە، لەوانەش (یاسای ڕێککەوتنی دەریایی) و دوو ڕێککەوتنی دیکەش کە ئەمریکا پێویستە هەرچی زووە خۆی لێیان ڕزگار بکات. ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٩٢ی تایبەت بە ئاسمانە کراوەکان (open skies) کە تەنیا لە ساڵی ٢٠٠٢ کارا کرا، بەشێوەیەکی تیۆری ڕێگە بە فڕۆکە چاودێرییە-سەربازییە بێ چەکەکان دەدات بەسەر ناوچەگەلێك بفڕن کە واژووی تەنانەت زیاتر لە سی کەسی لەسەرە، بەڵام لەوەتەی داهێنراوە ئەو ڕێککەوتنە هەر مشتومڕی لەسەرە. ئەو ڕێککەوتنە سەلماندوویەتی کە وەك بەخششێك وایە بۆ ڕووسیا، بەڵام بۆ ئەمریکا بەراستی بەسەرچووە و هیچ گرنگییەکی نییە، چونکە چیتر ئێمە پێویستیمان بەوە نییە بەسەر ئەو شوێنانە بفڕین. کشانەوەی ئەمریکا لەم ڕێککەوتنە بەئاشکرایی دەبێتە بەرژەوەندییەکی نەتەوەیی، ڕووسیاش نکۆڵی لەوە دەکات، بەتایبەتی توانای ئەوەیان دەبێ فڕۆکەکانیان بە بەرزییەکی کەم بەسەر واشنتۆن دی. سی و شوێنە هەرە هەستیارەکانی ئەمریکا بفڕن. کاتێك دەستم لە کار کێشایەوە، ئیعتیبارەکان لەمەڕ پاشەکشەکردن لە ڕێککەوتنی (ئاسمانە

کراوەکان) بەردەوام بوو، ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکانیش ئاماژە بەو هەوڵانە دەدەن، کە من هێشتا پشتگیری تەواوی لێ دەکەم، هاوکات ئەو هەوڵانەش هەر بەردەوامە.

بە هەمان شێوە، پێویستە ئەولەویەت بەوە بدەن کە لە ڕێککەوتننامەی (قەدەغەکردنی تاقیکردنەوەکانی چەکی ناوکی گشتگیر) بکشێینەوە، چونکە ئەمریکا جارێکی دیکە دەتوانێ لەژێر زەوی تاقیکردنەوەی چەکی ناوکی ئەنجام بدات. ئێمە لەوەتەی ساڵی ١٩٩٢ەوە تاقیکردنەوەی چەکی ناوکیمان نەکردووە، لەکاتێکدا ئێمە خاوەن پرۆگرامەگەلی زۆرین بۆ تاقیکردنەوە لە سەلامەتی و باوەڕپێکراوی یەدەگە عەمبارکراوەکانمان، بەبێ تاقیکردنەوە هەرگیز ناتوانین دڵنیایی تەواو (ڕەها) بەدەست بێنین. ئێمە هەرگیز ئەو ڕێککەوتنەمان پەسەند نەکرد، بەڵام بەهۆی نادڵنیایی لە "یاسای نێودەوڵەتی" گیرمان خواردووە. ماددەی ١٨ لە ڕێککەوتننامەی ڤیەننا تایبەت بە یاسای ڕێککەوتنەکان پشتی بەستووە بە "یاسای نێودەوڵەتی ئاسایی "customary international law، مانای وایە وڵاتێك کە ڕێککەوتنێکی واژوو کردووە، بەڵام پەسەندی نەکردووە، ئەوا ڕێگری لە بەردەمی دروست دەبێ بەوەی ناتوانێ کاردانەوەی هەبێ و بەرامبەر "ئامانج و مەبەست"ی ڕێککەوتنەکە شکست دەهێنێت. وازهێنان لەم ڕێککەوتنەی (قەدەغەکردنی تاقیکردنەوەکانی چەکی ناوکی گشتگیر) بۆ ئەمریکای ڕوون دەکاتەوە و دەسەڵاتی ئەوەی پێ دەدات لە داهاتوودا هەڵسەنگاندن بۆ (تاقیکردنەوەی چەکی ناوکی) بکات بە پشتبەستن بە بەرژەوەندییە نیشتیمانییەکانی لەژێر زەویدا. بە شێوەیەکی مەجازی، ئەمریکا واژووی لەسەر ڕێککەوتننامەی ڤیەننا کرد بەڵام هەرگیز پەسەندی نەکرد، کاریگەرییەکانی "یاسای نێودەوڵەتی ئاسایی" بابەتێکە کە گفتوگۆی زۆر هەڵدەگرێت. وڵاتانی دیکەی وەك چین و هیندستان کە خاوەن چەکی ناوکین نە واژوو، نە پەسەندی ئەو ڕێککەوتنەیان کردووە، هەر لەبەر

ئەمەشە تا ئێستا وەك ڕێککەوتنێکی کاریگەر نەچووەتە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەمریکا کشانەوەی خۆی لە هەندێ ڕێککەوتنی دیکەش ڕاگەیاند، لە هەمووان بەرچاوتر لە سەردەمی جۆرج بوشی کوڕدابوو، کاتێ پاشەکشەی لە ڕێککەوتننامەی ڕۆما کرد کە تایبەت بوو بە دامەزراندنی دادگای نێودەوڵەتی تاوانەکان.

## پاراستنی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا لە کردەی شەڕانگێزی

لەمیانەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠١٦دا، من باسم لە هەوڵەکانی ڕووسیا کرد بۆ دەستوەردان لە هەڵبژاردنەکان و پێم وابوو وەك "کردەیەکی شەڕانگێز" وایە بەرامبەر پێکهاتە دەستوورییەکانمان، هاوکات بەوپەڕی ترسەوە سەیری ڕاپۆرتەکانی کۆبوونەوەی پوتین و ترەمپم دەکرد لەمیانەی کۆبوونەوەکانی G20 لە شاری هامبۆرگی ئەڵمانیا، تیایدا پوتین بەوپەڕی ڕەهاییەوە نکۆڵی لە هەر هەوڵێکی دەستوەردانی ڕووسیا دەکرد.

ئێمە هەر ئەوە نییە پێویستمان بە یاسایەکی پاڵپشتی هەیە لە بەرامبەر هەڕەشەکانی هێرشی ئەلیکترۆنی نێودەوڵەتی، بەڵکو پێویستمان بە توانای سەربازی گەورە و نهێنی هەیە. هەر بۆ ئەم مەبەستە، یەکێك لەو شتانەی من ئاماژەم پێ کرد بریتی بوو لە تواناکانمان بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی هێرشبەرانەی هێرشی ئەلیکترۆنی لە دژی نەیارەکانمان، لەوانەش گرووپە تیرۆرستی و ئەکتەرە نادەوڵەتییەکان (non-state actors)ی دیکە. ململانێی هێواش بەڵام دوورمەودا هەبوو لەنێوان ئەوانەی بڕوایان بە مامەڵەی ئیدارەی ئۆباما هەبوو، کە بڕوایان وابوو تەنیا هەوڵە بەرگریکارییەکان لە دژی هێرشی ئەلیکترۆنی شانبەشانی هەندێ حاڵەتی دەگمەن نەبێ، ئەوا کارکردن لەم بوارە بەپێی پێویستە و پێویست بە هیچی دیکە ناکات، کەچی لە بەرامبەردا ڕوانینێکی دیکەی بەهێز هەبوو کە پێیان وابوو هەبوونی توانای هێرشبردنی هێرشی ئەلیکترۆنی لایەنێکی

بنچینەییە و پێویستە کاری بۆ بکرێت. ستراتیژیەتی ئۆباما لەم بوارەدا پشتی بەستبوو بە ڕوانینێکی هەڵە بەوەی فەزای ئەلیکترۆنی(cyber space) مەترسییەکی ئەوتۆی نییە و تەنانەت ناکرێ خراپ بکرێت، بۆیە پێیان وابوو باشترین مامەڵە ئەوەیە بە نەرمونیانییەوە مامەڵە لەگەڵ کێشەکان بکرێت و هیچ مەترسییەك تاقی نەکرێتەوە تا شتەکان خراپتر نەکات. من تێناگەم بۆچی فەزای ئەلیکترۆنی دەبێ لە ڕووی ماددییەوە جیاواز بێت لە تەواوی ئەزموونەکانی دیکەی مرۆڤایەتی: بەشێوەیەکی سەرەتایی، وڵاتێك کە گێرەشێوێنە و لایەنی بەهێز و چارەسەرەکانی هەردەم لەڕێگەی ئەو توانا سەربازییەی هەیەتی پشتگیری لێ دەکرێت، ئەوا دەتوانێ پێکهاتەی بەرگری خۆی لە دژی مەترسی نەیارەکانی دروست بکات کە دواجار دەتوانێ ئاشتیش بەرقەرار بکات. ئەگەر، هەروەك خۆشمان زیاتر هەستمان پێکردووە، ڕووسیا و چین و کۆریای باکوور و ئێران و وڵاتانی دیکەش لە بابەتی هێرشی ئەلیکترۆنی ڕکابەری ئێمەیان دەکرد، ئێستا کاتی ئەوەیە کاردانەوەمان لە دژیان هەبێت. ئەم ستراتیژیەتە بۆ ئەوە دیزاین نەکراوە تا ململانێی زیاتر لەو بوارەدا دروست بکات، بەڵکو بۆ ئەوەبوو سنوورێکی بۆ دابنێت. لەراستیدا، (ستراتیژیەتی تەنیا بەرگریکردن) زامنی دروستبوونی بێزارکردنی زیاتر و ململانێی زیاتر و مەترسی زیاتر دەکات بۆ سەر کاروبارەکان و قەوارە تایبەتەکانی دیکە، تەنانەت مەترسی لەسەر خودی حکوومەتی ئەمریکاش دروست دەکات.

ئەو مامەڵەیەی سەردەمی ئۆباما بە دەگمەن نەبێ، ئەگەرنا هیچ سیمایەکی شۆڕشگێڕی پێوە دیار نەبوو. بەرلەوەی بگەمە کۆشکی سپی، گفتوگۆی فراوان لەنێوان بریکارەکان هەبوو تا گۆڕانکاری لە یاساکانی سەردەمی ئۆباما بکەن، کە تایبەت بوو بە بڕیاردان لەسەر بابەتی ئیدارەدانی هێرشی ئەلیکترۆنی. ئەم یاسایانە زیاتر جەختی لەسەر بەهێزکردنی بەرگری کردبووەوە، بەشێوەیەکی ڕۆتینیش فشاری زۆرمان لەسەر بوو، ئەنجامدانی

هێرشی ئەلیکترۆنی لە سەردەمی ئۆباما شتێکی دەگمەن و مەحاڵ بوو. ئۆباما بە جەختکردنەوە لەسەر پرۆسەکە نەوەك سیاسەتێك، ڕێگری لە ئەمریکا دەکرد ئۆپەراسیۆن لە فەزای ئەلیکترۆنی ئەنجام بدات، مەگەر ئەوکاتەی پێشتر بەئاشکرایی خۆی ئاماژەی بۆ کردبێ، بەمەش خۆی دەرکەنار دەگرت لەو گفتوگۆیە گشتی و ڕەوایەتییەی پێویستە هەمانبێ لەمەڕ ئەو جیهانە نوێیە و شەڕکردن لە دژیدا. بەداخەوە، سستی و ڕۆتینیات، شەڕی لایەنەکان، هەروەها هەندێ کێشەی چارەسەنەکراوی ڕاستەقینە، مانگ دوای مانگ وایان کرد ئیدارەی ترەمپ ئیفلیج بێ. ئەم بابەتە دەبوو گۆڕانکاری تێدا بکرێ. یەکێك لەو شتانەی لە سەرەتادا کردم بریتی بوو لە دیاریکردنی دەسەڵاتی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی کە مامەڵەیان لەگەڵ کێشەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و نێوخۆییدا دەکرد، چونکە ئەوانە هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا هەر هەمان دەموچاو بوون و هەمان کاریان دەکرد. هەروەها، هەر خۆم وامکرد دووڕوویی، ململانێ لەکارکردن، کۆنترۆڵکردنی کاروبارەکان لەلایەن کەسێکەوە چیتر بوونی نەمێنێ، وامکرد هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی بەیەك دەنگ قسەبکەن و هاوڕابن. کاتێ ئەو ئەنجوومەنە لەکەسانی بێکەڵك پاکرایەوە، ئیدی ئێمەش دەستمان لەسەری هەڵگرت. لەگەڵ ئەوانەش، هێشتا شەڕی ڕۆتینیات و بێهیوایی و ڕەتکردنەوە، بەشێوەیەکی کاریگەر بوونی ماوە.

ئێمە پێویست بوو دوو شت بکەین: دانانی ستراتیژیەتێك بۆ بواری هێرشی ئەلیکترۆنی تایبەت بە ئیدارەی ترەمپ. دووەم، یاساکانی سەردەمی ئۆباما نەهێڵین و بە پێکهاتە-یاسایەکی خێرا و خێرایی لە بڕیاردان شوێنەکەی پڕ بکەینەوە. تا ئەوکاتەی من کاروبارەکانم وەرگرت کاری زۆر لەم بوارانە ئەنجام درابوون، بەڵام هێشتا پێویستی بە هەوڵێکی فراوان و ڕاستەقینە هەبوو تا دوا ڕۆتینیاتەکان بنەبڕ بکرێن و ئامانجەکان بەدەست بێن. من

زۆر کات وا بیرم کردووەتەوە بەوەی ئەگەر بەرپرسەکانمان ئەوەندە ململانێیان لەگەڵدا نەکرێ هاوشێوەی ئەوەی نەیارە دەرەکییەکانمان لە بابەتی ململانێ و دروستکردنی کاریگەرییدا لە کاتی هەبوونی مەترسییدا لە دژی یەك ئەنجامی دەدەن، ئەوا بەئاسانییەکی زۆر زیاتر پشوومان وەردەگرت و هیچ کێشەیەکمان نەدەبوو. سەرەڕای کارکردن بەوپەڕی تواناوە، کەچی هێشتا پێویستی بە ٥ مانگ هەیە، بەدیاریکراوی (تا ٢٠ ئەیلوول) تا ببینە خاوەن ستراتیژیەتێکی نوێی تایبەت بە بواری هێرشی ئەلیکترۆنی و بە خەڵکی ڕابگەیەنین. لەگەڵ ئەوەی سووربوونی ئێمە بۆ کاراکردنی ئۆپەراسیۆنەکانی هێرشی ئەلیکترۆنی ببووە سەردێری هەواڵەکان، بەڵام بەگشتی ستراتیژیەتەکە گشتگیر و زیرەکانە بوو، هاوکات دەستپێکێکی باشیشی هەبوو. تەنانەت شارەزایەکی ئەم بوارە بەڵام هی سەردەمی ئۆباما گوتوویەتی: "ئەو دۆکیومێنتە نیشانی دەدات بەوەی پێویستە ستراتیژیەتی نیشتیمانی چۆن بێت لەمەڕ بابەتێك کە هیچی مەرامێکی حیزبی لەگەڵدا نییە. ئەم ستراتیژیەتە توانیویەتی هاوسەنگییەك لەنێوان کاردانەوە بەرگریکارییەکان دروست بکات و دەیەوێ کاریگەریی دەرئەنجامەکان لەسەر لایەنەکان لەسەر دڵەکان بسەپێنێت. لەمەش زیاتر، ئاشکرایە کە ئەم ستراتیژیەتە ڕەنگدانەوەی پرۆسەیەکی بەهێز و گەشەسەندووی سیاسەتی تەواوی ئیدارەکانی ئەمریکایە."

نوێکردنەوەی ئەم ستراتیژیەتە کارێکی تەواو زەحمەت بوو، بەڵام لەناوبردنی یاسا کۆنەکان لەوە زەحمەتترە. پرۆسەی ململانێی نێوان بریکارەکان تەواو چەقی بەستووە. وەزارەتی ئاسایشی ناوخۆ و ئەوانی دیکەش دەیانەوێ توند یەخەی وەزارەتی بەرگری بگرن و بیخنکێنن، هەروەك چۆن کۆمەڵگەی هەواڵگریش هەمان کاریان کردووە. پێنتاگۆن هەڵەی لە هیچ کەسێك قەبووڵ نەدەکرد، تەنانەت لە (کۆشکی سپی)یش، لە گفتوگۆکانیش سیاسەتی "هەموو یان هیچ"یان جێبەجێ دەکرد، کە

ئەمەش دەبووە هۆی تووڕەبوونی هەموو ئەو کەسانەی بەشداری نێو گفتوگۆکان بوون. لە دەرئەنجامدا، پێگەی سیاسەت لەو هەژدە مانگەی دەسەڵاتی ئیدارەی ترەمپ دەست بەکاربووبوو، زۆر زەحمەت ببوو. من هەمان هەستی (ژەنەڕاڵ یولیسێس گرانت)م هەبوو بەر لەداگیرکردنی شاری (ریچمۆند) و گوتم: "پێشنیاردەکەم لە دەرەوەی ئەم هێڵەش بجەنگین، تەنانەت گەر ئەمە هەموو وەرزی هاوینەکەش بخایەنێت"، وادیاربوو ئەمە شتێکی هیوابەخشیشە. جەیمس ماتیس بەردەوام دەیگوت کە بەر لە هەڵبژاردنەکانی مانگی تشرینی دووەم ناتوانین هیچ ئۆپەراسیۆنێکی هێرشی ئەلیکترۆنی ئەنجام بدەین (ئەو دەیزانی ئەمە کاری هەرە لەپێشینەی منە)، ئەگەر ئەم ڕوانینەی سەرنەکەوت، کە پێی وابوو ئەمە پرۆسەیەکی ستانداری کارکردنییەتی: بۆیە سووربوو لەوەی ئەوکاتە دەبێتە زەروری، هەروەها پێی وابوو ئەگەر ئەم کارە سەرنەگرێت، ئەوا پێشبینی فەوتان و دڵتەنگی زیاتر دەکەم.

ئێمە پێویست بوو کارێك بکەین. لە٧ی ئابدا، ئێمە لەگەڵ کۆمیتەی بەرپرسەکان کۆبوونەوەمان هەبوو، منیش لە سەرەتای قسەکانم گوتم - دوای نۆزدە مانگ و ئەنجامدانی چەندان کۆبوونەوەی بێ ئەنجام لە ئاستی خوارەوەدا- ئیدارەی ترەمپ شکستی هێناوە لەوەی ستراتیژیەتێك بۆ شوێنگرتنەوەی ئەوەی سەردەمی ئۆباما دابنێت. ئێمە ئێستا ڕەشنووسی نووسراوێکی سەرۆکایەتیمان هەیە کە دەستکراوەیی و ڕێژی زیاتر بە سیاسەتداڕێژەران دەدات، بەڵام نابێ مەترسی دەرئەنجامەکانی بڕیاردانیش لەبیر نەکەین. من گوتم ئەگەر هێشتا باوەڕی جیاواز هەیە، بەرلەوەی سەرۆك بڕیارێکی کۆتایی بدات، دەیانخەمەڕوو. ئەم قسەیە سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا. بەهەرحاڵ، هەروەك لەمیانەی کۆبوونەوەکانم لەم کابینەیەدا، زۆرێك لە بەرپرسان تەنیا دەیانتوانی لەسەر بابەتە ئامادەکراوەکان قسە بکەن، پشتیان بە کارمەندەکانیان دەبەست تا

هاریکاریان بکەن. هەستم کرد پێویستە یاسایەك هەبێ بەوەی ئەگەر زۆر گرنگ و پێویست نەبێ، ئەوا وەزیرەکانی کابینەی حکوومەت گەر لە بابەتەکە تێنەگەن، ئەوا پێویست ناکا بەشداری کۆبوونەوەکە بکەن. ماتیس هێشتا دەیویست گۆڕانکاریی سەرەکی ئەنجام بدات، بەڵام گینا هاسپێل، سوو گۆردن (جێگری دان کۆوتس)، جێف سیشنز و FBI ڕەشنووسەکەیان وەك خۆی قەبووڵ کرد. پۆمپەیۆ و (ستڤن منوشن)ی وەزیری گەنجینەی ئەمریکا هەندێ قسەیان لەسەر هەبوو، بەڵام ئەوانیش ڕازی بوون. بەداخەوە، ماتیس نەیدەتوانی ئەو هۆکارانە ڕوون بکاتەوە بەوەی بۆچی دەیەوێ گۆڕانکاری بکات. لە یەکەم ساڵی کابینەی ترەمپدا، پێیان گوتم کە ماتیس توند دەستبەسەر ڕێسا هاوبەشەکان دەگرێت، تیلەرسۆن ڕازی دەبێ، هەموویان ڕازیبوونی خۆیان نیشاندەدەن بەبێ ئەوەی هیچ لێدوانێکی ئەوتۆی گرنگ بدەن، بۆیە دوای ئەمە کۆبوونەوەکەش کۆتایی هات. ئەم سیاسەتە لەوانەیە پێشتر کاری خۆی کردبێ، بەڵام من چیتر ئەمەم قەبووڵ نەبوو. دواتر کۆتاییم بە کۆبوونەوەکە هێنا و گوتم ئەو ڕێگەیە لەبەردەممانە کۆڕاییەکی فراوانی لەسەرە (تەنانەت گەر جەیمس ماتیسیش ڕازی نەبێت)، هیواخوازیش بووم هەرچی زووە کۆتایی بەو ڕەشنووسە بهێنین.

ماتیس بەخێرایی ئەوێی جێ هێشت، بەڵام پارێزەرانی وەزارەتی بەرگری لە دەورم کۆببوونەوە و ڕازیبوون لەسەرئەوەی ئێمە کۆکین لەسەر شتێك کە وەزارەت پێویستە کاری لەگەڵ بکات، ماتیس لەگەڵ ئەم بابەتە نەبوو. لەمیانەی چەند ڕۆژی دواتر و گفتوگۆی چڕوپڕ، ماتیس هەر لەسەر کەللەڕەقیی خۆی مایەوە و هەندێ کەسیش لەنێو دەزگاکانی هەواڵگری باوەڕی جیاوازیان هەبوو، ئەمەش پەیوەست بوو بە ئیرەیی دەسەڵاتی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی. ئەمە ڕەنگدانەوەی ئەو گرژییە لەمێژینە و بنەڕەتییەیە کە لەنێوان CIA و پێنتاگۆندا هەیە. لەگەڵ ئەمانەش، من بە

ترەمپم گوت کە ئێمە لەسەر کارەکانمان بەردەوام دەبین. دوای ئەوەی کۆشکی سپی بەهۆی ڕۆتینیاتی ماندووکەر و هۆکارگەلێکی ناروون، دواجار لە ١٥ی ئابدا ترەمپ واژووی لەسەر ستراتیژیەتەکەی ئێمە کرد و ئێمەش خستمانە بواری جێبەجێکردنەوە. سەرەتا جەختمان کردەسەر ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە هەڵبژاردنەکانەوە هەبوو، بە جۆرێك سەرەتایەکی خێرامان هەبوو تا ڕێگری بکەین نەك هەر بۆ هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٨، بەڵکو بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتووش. هەنگاوەکانی دواتریش بەدوای دادێت تا بنەمایەکی گشتگیر بۆ تواناکان لە بواری هێرشی ئەلیکترۆنی دابنێین.

ئێمە، لەژێر سەرۆکایەتی ترەمپدا (فەرمانێکی جێبەجێکردن Executive Order)ی تازەمان نووسی، لەمەدا ڕێکاری کرابوو لەوەی بە ئاسانتر ئابلووقە بخەنەسەر هەوڵی لایەنە دەرەکییەکان گەر بیانەوێ دەست لە هەڵبژاردنەکان وەربدەن. ئێمە وامان کرد ئەم دەستنووسە بەدوور بگرین لەوەی وەك یاسایەکی نوێ پەسەند بکرێت، چونکە بەدڵنیاییەوە بەهۆی دوژمنایەتی پارتەکانەوە شکستی دەهێنا. تەنانەت هەندێ لە کۆمارییەکان ترسیان لە کاردانەوەی لاوازی ترەمپ هەبوو لە بەرامبەر کارە بێزارکەرەکانی ڕووسیا، بۆیە دەیانویست بەیاسایی بکرێت، بەڵام ئێمە بەئاراميیەوە ڕوومان کردەوە لەوەی بۆچی ئەم فەرمانی جێبەجێکردنە کاریگەری دەبێ، گەر لایەنگری پارتەکان پشتگوێی نەخات، ئەوا هەموو یاسایەك بەشێوەیەکی حەتمی کاریگەری خۆی دەبێ. لە هەمووش گرنگتر، هیچ گەرەنتییەك نییە ئاخۆ کۆنگرێس هەموویان بەیەکەوە بەر لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٨ ئەمە پەسەند دەکەن، خودی ئەم فەرمانەش دەبێ بەخێرایی بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە. لە ١٢ی ئەیلوولدا لەکاتێکدا لە ژوورە بچووکەکەی نانخواردنی ئێوارە لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵك دانیشتبوو و باسی دروستکردنی دیوارێکی سنووریی لەگەڵ مەکسیك دەکرد، بە ترەمپم ڕاگەیاند کە مەبەستمان چییە لەو فەرمانی جێبەجێکردنە و

ئامانجمان چییە؟ پێم گوت ئەمە ڕێگەیەکە بۆ نیشاندانی کۆشش و ڕەخنە ڕاستینەکان لە بەرامبەر ئیدارەکەت بەوەی کە دەڵێن تەواو بەهێز نییە بۆ پارێزگاریکردن لە پاکێتی هەڵبژاردن، هەروەها بۆ ئەوەیە هەرچی ڕێتموویی ناپەسەند هەیە و لەلایەن کۆنگرێسەوە دەردەچێ، ڕایبگرین. پرسیاری کرد "کێ خاوەن ئەو بیرۆکەیە؟" منیش گوتم هی خۆمە. دواتر گوتی" ئۆە"، ئینجا یاساکەی واژوو کرد. پاشان شەهیرە نایت، بەڕێوەبەری کاروبارە یاساییەکانی کۆشکی سپی پێی گوتم کە دڵخۆشە بەوەی توانیت ڕوانینە جیاوازەکان لەسەر یاسای هەڵبژاردنەکان بەشێوەیەکی کاریگەر چارەسەر بکەی، "پیرۆزە، ئەمە کارێکی سەرنجراکێش بوو."

تا کۆتایی ئەیلوول، بووینە خاوەن چوارچێوەیەکی کارکردنی تایبەت بە سیاسەتی پاراستنی هەڵبژاردنەکان، هاوکات دەمانتوانی هەوڵەکانمان خێراتر بکەین بۆ پاراستنی هەڵبژاردنەکانی تشرینی دووەمی ٢٠١٨، نەوەك ئەوەی پێشتر کە بواری هێرشی ئەلیکترۆنی و گەرەنتی تەواوی پاراستنی هەڵبژاردنەکانی تێدا نەبوو. تەنیا دوای مانگێك بەسەر وەرگرتنی کاروبارەکان، لە دانیشتنەکانی ٣ی مایسی ٢٠١٨، بەڕێوەبەری FBI (کریستۆفەر ڕەی)، وەزیری ئاسایشی ناوخۆ (کریستن نیلسۆن)، بەڕێوەبەری ئاژانسی نیشتیمانی دان کۆتس و چەندان دیکەش بە کورتی بۆ ترەمپیان باس کرد لەوەی چ کارێك کراوە بۆ پاراستنی هەڵبژاردنەکانی مانگی تشرینی یەکەمی داهاتوو. ترەمپ دەیویست ئاژانسەکانی کارکردن زیاتر خۆیان دەرخەن و هەواڵی زیاتر دروست بکەن و کارەکان زۆر گەورەتر نیشان بدەن، بەتایبەتی ئەوانەی میدیا بەتەواوی تیشکیان ناخاتەسەر. لەڕاستیدا، وەزارەت و ئاژانسەکان وایان هەست دەکرد خەریکی کارێکی باشن، ئەوانە دەیانزانی هەڕەشەکە چییە، هیچ کەسێکیش ڕێگری لێ نەدەکرد و هەوڵ بدەن پارێزگاری لەمە بکەن. لە ٢٧ی تەمموز جارێکی دیکە وەك ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی

کۆبوونەوەی دووەممان ئەنجام دا بۆ چاوخشاندنەوە بە هەوڵەکانمان، تەواوی ئاژانسەکان ڕایانگەیاند کە ئێستا زۆر باشتر لە هەڵمەتەکەی ساڵی ٢٠١١ خۆیان ئامادەکردووە و زۆر باشتر ئاگەدارن لە هەر هەڕەشەیەك کە لەوانەیە لە بوارەکانی کارکردنی خۆیان ڕووبەڕووی ببنەوە.

دوای کۆبوونەوەکەی ئێمە وەك ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی لە ژووری کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکان، لە ٢ی ئابدا کورتەیەکمان بە کۆشکی سپی دا، هاوکات لەوکاتەدا جگە لە خۆم، هەریەك لە دان کۆوتس، نیلسۆن، ڕەی، ژەنەراڵ (پۆڵ ناکەسۆن)ی بەڕێوەبەری ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی ئامادە بوون، ئەو شوێنە هاوکات بارەگای فەرماندەی سایبەر (Cyber)ی ئەمریکی بوو. هەریەك لە بەرپرسەکان باسی ئەوەیان کرد کە ئاژانسەکانیان چییان کردووە، کە دەبوو ئەو کارانەیان زووتر ئەنجام بدایە، بۆیە ئەم زانیارییانە بەشێوەیەکی باش لەلایەن میدیاکارانەوە وەرگیرا (ئەگەر بەتووڕەیی نەبووبێ). یەکێك لەو بەرپرسانە باسی لەوە کرد کە پێویستە ئیدارەی ئەمریکا "هێزی خۆی نیشان بدات" تا بیسەلمێنێ ئێمە بەراستی خەریکی کارێکین بۆ پاراستنی هەڵبژاردنەکان لە دەستوەردان. لە توانامدا نەبوو ڕەخنە لە تەواوی ئەو هەوڵە بگرم، دواتر میدیاکان گوتیان ترەمپ خۆی شوێنی سیاسەتێك دەکەوێ، ئێوەش وەك بەرپرسان شوێنی سیاسەتێکی دیکەی جیاواز. بەداخەوە، لەم بابەتەدا شتێك هەبوو، بەڵام هەروەك ترەمپ بەردەوام دووپاتی دەکردەوە کە نابێ ڕەخنە لە ڕووسیا بگرین و نابێ لەبەرچاوی عەوام ئاوا زۆر ڕژد بین بەرامبەر ڕووسیا.

هەموو ئەو کارە ئامادەکارییانە ئەرکی بنەڕەتی بوون، چونکە لەوانەیە پێویستی بکردایە کورتەیەك لەسەر هەندێ هەڕەشەی تایبەت بە کۆنگرێس بدەین. لەنێو گرووپێکی دیاریکراوی ئاژانسەکاندا، ئەوانەی کە پێیان وابوو بەرژەوەندییەکانی سیاسەتی بەرگری بەرامبەر هێرشی ئەلیکترۆنی لە مەترسیدایە، جیاوازی بیروڕا بەئاشکرا لەنێوانیاندا هەبوو بەتایبەتی لەوەی چ

زانیارییەك بە کۆنگرێس بدەن و بە چ خێراییەك ئەو زانیارییانە دەگاتە دەست میدیاکاران. هەردەم کێشەگەلی ئاڵۆز هەبوون، لەکاتێکدا یەکێك لە ئامانجەکانی نەیارەکانمان هەر ئەوەنەبوو کاریگەری بخەنەسەر هەڵبژاردنەکان، بەڵکو چاندنی تۆوی ترس و بێمتمانەیی بوو لەنێو تەواوی هەیکەلی سیاسەتماندا، بەمەش متمانەی هاوڵاتیان لە بەرامبەر پاکێتی سیستەمەکە بەگشتی لاواز دەبوو. لە ڕێگەی زانیاری ناڕاست و ناتەواو کە تیایدا دەرئەنجامە باشەکان ڕاستەوخۆ دەرناکەون، ئەمە وادەکات زیانی گەورە و پێشوەختە بگەیەنێت، هاوکات ئەمە دەبێتە ئاگرخۆشکەری شەڕی نێوان پارتە سیاسییەکان. من بڕوا ناکەم هێرشکارەکان کار بۆ پارتەکان بکەن و زانیاری ناڕاست بڵاوبکەنەوە، جا بۆ کۆنگرێس بێت یان ئەو هەڵمەتانەی لەوانەیە لەژێر هەڕەشەدا بن. خۆشبەختانە، دەستوەردانی دەرەکی بەشێوەیەکی بەرچاو لە ساڵی ٢٠١٨ کەم کرایەوە، تەنیا چەند ڕووداوی بچووك نەبێ کە بەتەواوی چارەسەرمان کردن. بەڵام ئەمە ئاشکرایە کە ئەگەر مەترسییەکان زیاتر بێت، ئەوا جیاوازیی بیروڕای نێوان هەندێ بەرپرس و لایەن ڕەنگە کێشەی ڕاستەقینە دروستبکەن.

---

ئیدارەی ترەمپ لە ساڵی ٢٠١٧ ئابلووقەیەکی ئابووریی بنەڕەتی خستبووەسەر هاونیشتیمانیانی ڕووسی و قەوارەکانی، ئەمەیان پەیوەندی بە لکاندنی (کریمیا)ەوە هەبوو، ئەمە درێژکراوەی ئەوەبوو کە ئۆباما کردبووی، هاوکات فراوانکردنی ئابلووقەکانی دیکەش بوو. کونسوولخانەکانی ڕووسیایان لە سان فرانسیسکۆ و سیاتڵ داخست، نزیکەی ٦٠ هەواڵگری ڕووسی ڕەوانەی وڵات کردەوە (کە لە ئەمریکا وا خۆیان نیشانداوە وەك دیپلۆماتکار کاریان کردووە). بەدیاریکراوی دوای

هێرشی مۆسکۆ بۆ سەر بنەماڵەی سکریپاڵ[1]، دواتر ئەمریکا ئابلووقەی خستەسەر ڕووسیا لە هەمبەر پێشێلکردنی هەردوو یاسای (کۆنترۆڵکردنی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی) و (بڕیاری کۆتایهێنانی شەڕ)، هەروەها هەر بەهۆی هێرشکردنەسەر بنەماڵەی سکریپاڵ، ئەمریکا ئابلووقەی خستەسەر ئاژانسی گەڕانی ئینتەرنێتی ڕووسیا، کە ئەمەیان چەکی بەرگری ڕووسیا بوو بەرامبەر هێرشە ئەلیکترۆنییەکان، هەروەها سزای زیاتر لە دەرزەنێك بەرپرسی ڕووسیای دا لە هەمبەر پێشێلکردنی ئابلووقەکانی ئەمریکا بۆ سەر سووریا. هەرکاتێ پێشێلکاری نوێ دەدۆزرانەوە، ئابلووقەی زیاتر دەخرایەسەر کەسەکان و ئەو قەوارانەش کە بە یارمەتیدان تێوە گلابوون.

ترەمپ وەك دەستکەوتی سەرەکی ستایشی ئەم کارانەی دەکرد، بەڵام بە نزیکەیی هەموویان دەبوونە هۆی دروستبوونی بیروڕای دژ، یان بەلایەنی کەم بۆڵەبۆڵ و سکاڵاکانی درێژ دەکردەوە، تەنانەت لەلایەن خودی دۆناڵد ترەمپیشەوە. یەك لەو نموونانەش بریتییە لەو ئابلووقەیەی خرایەسەر ڕووسیا بەهۆی ئەوەی بە چەکی کیمیایی هێرشیان کردبووە سەر بنەماڵەی (سکریپاڵ). ئەم یاسایە بەم دواییانە بۆ یەکەم جار بەکارهات، بەدیاریکراوی دوای ئەوەی کیم جۆنگ ئوون فەرمانی دا بە کوشتنی زڕبرایەکی لە مالیزیا بە چەکی کیمیایی، هەروەها دوای هێرشی ڕژێمەکەی ئەسەد لە سووریا. هەندێ ڕەخنە هەبوو لەوەی ئابلووقەکان تەواو گشتگیر نین، بەڵام ترەمپ ڕەتیکردەوە لەوی چی دیکە ئابلووقە نەخەینە سەر کەس. ترەمپ دواجار هەندێ لە ئابلووقەکانی قەبووڵ کرد بەر لە (لووتکەی هێلسنکی)، بەڵام ڕاگەیاندنی ئابلووقەکانی تا دوای کۆتایهاتنی لووتکەکە دواخست. ئێمە بۆ ترەمپمان ڕوونکردەوە کە ئەم

(١) لە ئازاری ٢٠١٨، سێرگی سکریپاڵ ئەفسەری پێشووی سەربازیی ڕووسیا و سیخوڕی دوولایەنەی ئاژانسی هەواڵگری بەریتانی، خۆی و کچەکەی لە شاری سالسبێری ئینگلتەرا ژەهرخوارد کران.

ئابلووقانە یەکەم ئەلقەی زنجیرەیەکە، لەکاتێکدا ئەم یاسایە دەسەڵاتی زیاتر بە ئەمریکا دەدات بەوەی ئابلووقەی توندتر بخاتەسەر هەر وڵاتێکی تاوانبارکراو، گەر نەتوانێ بەڵگەی دڵنیاکەرەوە بەدەستەوە بدات لە هەمبەر ئەوەی دەستی لە چەکی کیمیایی یان بایۆلۆژی هەڵگرتووە، تەنانەت ڕێگە بە چاودێریکارانی نێودەوڵەتی دەدات بەدواداچوون بۆ پابەندبوونی ئەو وڵاتە بکەن. هیچ کەسێك بڕوای نەدەکرد کە ڕووسیا ئەم کارە ئەنجام دەدات. کاتێ لووتکەی هێلسنکی کۆتایی هات، ئەمریکا ئابلووقەکانی ڕاگەیاند، لەوکاتەی پێویستی بە هیچ بڕیارێکی نوێش نەدەکرد، من دەمویست بزانم ئاخۆ تەواوی ئەو قەیرانە بەهۆی دواسەردانی سیناتۆری ئەمریکی (ڕاند پۆڵ) بوو بۆ مۆسکۆ، کە ڕووماڵێکی میدیایی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا و هەر لەوێ ڕووسەکان بەدڵنیاییەوە سووربوون لەوەی زۆر دڵتەنگن بەرامبەر ئابلووقەکان. ئەمەیان قسەیەکی مەجازی بوو، تیایدا سیاسەتمەدارانی لیبڕاڵیی وەك ڕاند پاوڵ زۆر نیگەرانی تێگەیشتنە نەرمەکانی کریملن بوون. گوێمان لە گفتوگۆیە هەڤدژەکان بوو، (منوشن)ی وەزیری گەنجینەی ئەمریکا بانگی من و پۆمپەیۆی کرد و گلەیی لێ کردین بەوەی بۆچی دەربارەی ئابلووقە نوێیەکان ئاگادارمان نەکردووەتەوە، ئەم قسەیەش ناڕاست بوو، چونکە ئابلووقەکان پێشتر بە پرۆسەی پێداچوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی تێپەڕیبوو، هیچ کەسێکیش بەرهەڵستی نیشان نەدابوو. لەمیانەی چەند کاتژمێرێکدا، ترەمپ ڕایگەیاند کە زۆر هەست بە نارەحەتی دەکات لە هەمبەر ئەو بڕیارە تایبەتەی دواجار داویەتی، بەڵام هێشتا بیر لەوەدەکاتەوە کە بەرامبەر پوتین زۆر توند بووینە. ترەمپ بە پۆمپەیۆی گوت تا تەلەفۆن بۆ سێرگی لاڤرۆڤ بکات و پێی بڵێت کە "هەندێ فەرمانبەر" ئەو ئابلووقانەیان بڵاوکردووەتەوە- ئەم تەلەفۆنە هەرگیز نەکرا و ناشکرێ.

هەر لە سەرەتای ڕەتکردنەوەی ئابلووقەکان، ترەمپ لەسەر لێدوانێکی

هێورکەرەوە هەڵوەستەی کرد و لەیادی ١٠ ساڵەی داگیرکردنی جۆرجیادا ڕەخنەی لە ڕووسیا گرت، ئەم قسەیەی ترەمپ هەڵەیەکی زۆر زەق بوو. ڕووسیا ئەمەی پشتگوێ خست، بەڵام وڵاتانی ئەورووپی تێبینی غیابی خۆیان کرد و زیاتر بایەخیان بە چارەسەرەکانی ئەمریکا دا. ئەمەیان یەکێکە لە هەڵسوکەوتە نموونەییەکانی ترەمپ، هەروەها لە حوزەیرانی ٢٠١٩دا ترەمپ ڕەشنووسی بڵاوکراوەیەکی قەدەغە کرد کە لە یادی ١٣ ساڵەی کۆمەڵکوژی (مەیدانی تیانانمێن Tiananmen ) نووسرابوو، تەنانەت ڕەخنەی لە وەزارەتی دەرەوەش گرت بەوەی بەرلەوەی (ئەو) پێی بزانێ ڕاگەیاندراوێکیان بڵاوکردبووەوە. دیارە ترەمپ وابیردەکاتەوە کە ڕەخنەگرتن لە سیاسەت و کاردانەوەی حکوومەتە بیانییەکان کارەکەی لەسەر زەحمەت دەکات و ناتوانێ پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ سەرکردەکانیان هەبێت. ئەم ڕەنگدانەوەی ئەو زەحمەتییەیە کە ترەمپ هەیەتی بەوەی ناتوانێ پەیوەندی نێوان کەسایەتی و بەرپرسەکان لە یەکتری جیابکاتەوە. من ئاگەداری هیچ کەیسێك نیم تیایدا ڕووسیا و چین خۆیان دوورگرتبێت لە ڕەخنەگرتن لە ئەمریکا بەوەی ترسیان هەبێ سەرکردە هەستیارەکانمان جاڕس و بێزاربکەن.

---

ڕوانین و بڕیارە هەڤدژەکانی ترەمپ لەسەر ڕووسیا هەموو کارەکانی تیمەی ئاڵۆزتر کردبوو، هاوکات کێشەی هێرشی ئەلیکترۆنی و نائەلیکترۆنی زۆر کات تێکەڵ بە یەکتری دەبوون. لەمەش زیاتر، دامەزراندنی بەرگری لە دژی هێرشی ئەلیکترۆنی، گوتنی لە جێبەجێکردنی ئاسانترە، لەکاتێکدا نزیکەی هەموو ئەو ئۆپەراسیۆنانەی بۆ بەرگریکردن لە هێرشی ئەلیکترۆنی دەمانویست ئەنجامی بدەین، پێویست بوو، کەچی هەر ئاوا بە پۆلێنکراوی مانەوە. بۆیە، هەموو ئەوانەی ڕاستەوخۆ بەم بابەتە کاریگەر بوون، ئەوا زیانیان بەرکەوت، بەڵام خۆیان

هەستیان پێ نەکردووە مەگەر خۆمان پێمان گوتبن. هەر لەمبارەیەوە، پێویستە هەندێ گفتوگۆی گشتی دەربارەی تواناکانم لەم بوارەدا بکرێت، تا نەیارەکانمان ئاگەدار بکەینەوە کەوا ساڵانی نادیاری و ناچالاکیی ئەمریکا ئیدی کۆتایی هاتووە و دۆستەکانیشمان دڵنیا بکەینەوە کەوا ئەمریکا لەسەر ڕێگەیە و تێکەڵ بە فەزای ئەلیکترۆنی دەبێت. لە کۆتایی تشرینی یەکەمدا، لەبەرچاوی عەوامدا لە واشنتۆن هەندێ قسەم کرد، بەگشتی دەرباری ئەوەی کە بۆ کۆتایهێنان بە یاساکانی سەردەمی ئۆباما لە ڕەگوریشەوە چیمان کردووە. بەرپرسانی دیکەی ئیدارەی ئۆباما، نموونەش وەك ژەنەراڵ ناکاسۆن هەمان شتی کرد. ئەمەیان بوارێکی ئاڵۆزی بڕیاردان بوو، سەرەڕای ئەو زەحمەتییەی لە ئاڵوگۆڕکردندا هەیە بەتایبەتی لەنێوان ئەو شتانەی دەبێ بە خەڵك بگوترێ و ئەوانەشی دەبێ پۆلێن بکرێن. هێشتا دەتوانین شتی زیاتر بە خەڵك بڵێین، دەتوانین پارێزبەندیی زیاتر لەنێو ئاوەزی خەڵکی عەوام و بڕیاربەدەستان لە تەواوی جیهاندا دابمەزرێنین. بەڵام بەداخەوە، ئەوەی زیاتر ب ئاشکرایی بە خەڵکمان گوت، ئەوەندەی زیاتر لەسەر تواناکانمان دەرمانخست، ئیدی خەڵکانی دیکە بۆ بەرەوپێشبردنی پرۆگرامەکانی (هێرش) و (بەرگری)ی ئەلیکترۆنی سوودیان لێ وەرگرت. ئەمە بوارێکە شیاوی گفتوگۆکردنی زیاترە لە ئیدارەی داهاتووی ئەمریکا. بەڵام هەڵوێستی کەسیی ترەمپ هەر چییەك بێت، ئێمە کاری بنەڕەتیمان ئەنجام دا بۆ پاراستنی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا لەدەست ڕووسیا و هەر کەسێکی دیکە.

## بەشی حەفتەم

## ترەمپ لە دەرچەیەک دەگەڕێت بۆ سوریا و ئەفغانستان، بەڵام نایدۆزێتەوە!

شەڕی تیرۆرستە توندڕەوەکان لە دژی ئەمریکادا زۆر پێش ١١ی سێپتێمبەر بوونی هەبووە و تا ماوەیەکی زۆری دوای ئەمەش درێژە دەکێشێ. حەز بەمە بکەی یان نا، ئەمە ڕاستییەکە و دەبێ قبووڵ بکرێت. دۆناڵد ترەمپ حەزی بەمە نییە، بەشێوەیەکیش مامەڵە دەکات وەك بڵێی ئەمە بەراست دانانێت. ترەمپ دژی "شەڕە بێکۆتاکان"ی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و هیچ پلانێکی ڕوونی نییە بۆ دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا و خەریکە هاوپەیمانە سەرەکییە هەرێمییەکان پشتگوێ دەخات و هێشتا هۆکاری کشانەوەشی ڕوون نەکردووەتەوە. ترەمپ حەزی دەکرد بڵێ: "ئەو شوێنانە چەندان میل لە ئێمە دوورن و کارمان پێیان نییە". بەپێچەوانەوە، لەمیانەی ئەوکاتەی لە کۆشکی سپی دەستبەکاربووم، هەوڵم داوە بەگوێرەی ڕاستییەکان کار بکەم، سەرکەوتنمان بەدەستهێناوە، بەڵام ڕەخنەشمان لێ گیراوە.

## سوریا: لاورنسی[1] عەرەب، بێئاگابوون لە زانیارییە گرنگەکان!

دوای ئەوەی لە مانگی نیسان کاردانەوەمان هەبوو بەرامبەر ئەو هێرشە کیمیاییەی ئەسەد لە شاری دوما ئەنجامی دا، بابەتی سووریا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ جارێکی دیکە سەری هەڵدایەوە، ئەویش لە ڕێگەی ئەوەی تورکیا قەشە (ئەندرۆ برۆنسن)ی خستبووە زیندانەوە. ناوبراو قەشەیەکی پرۆتێستانتی بوو، خۆی و بنەماڵەکەی بۆ ماوەی دوو دەیە بوو لە تورکیا دەژیان بەرلەوەی لە ساڵی ٢٠١٦ دەستگیر بکرێت، کە ئەمە هەر خۆی دوای شکستهێنانی کۆدەتایەکی سەربازی بوو لە دژی سەرۆك ڕەجەب تەیب ئەردۆگاندا. برۆنسن ماددەیەکی کەم بایەخبوو بۆ سەوداگەری، بەشێوەیەك کە مایەی گاڵتەجارییە تۆمەتبارکرابوو بەوەی لەگەڵ شوێنکەوتووانی (فەتحوڵلا گویلەن) پیلانگێڕی کردووە، گویلەن مامۆستایەکی ئیسلامییە و لە ئەمریکا دەژی، ڕۆژانێك هاوپەیمانی ئەردۆگان بوو، بەڵام ئێستا دوژمنێکە و بەئاشکرایی وەك تیرۆرست لە قەڵەمی دەدەن. ڕاستەوخۆ دوای گەڕانەوەی ترەمپ لە کۆبوونەوەکەی هێلسنکی (فنلەندا)، ئەردۆگان داوای لە کەسایەتییە تورکییەکانی نێو (ناتۆ)ی کرد تا بەدواچوون بکەن (دواتریش پەیوەندی تەلەفۆنیشی کرد) تا بزانێ پەیوەندیی ئەو قەشەیە لەگەڵ گویلەن چییە. ئەردۆگان بابەتێکی دیکەی پەسەندی وروژاند، ئەردۆگان بەردەوام قسەی لەگەڵ ترەمپ دەکرد، ئەویش تۆمەتبارکردنی موحەممەد ئەتیللا بوو، ناوبراو بەرپرسێکی باڵای تورکیایە و (هالك بانك)ی تورکی بەڕێوە دەبات، وادیارە ناوبراو لەو پارە زۆرەی وەك ئابلووقە خستبوومانە سەر ئێران، فێڵی کردووە. ئەم لێکۆڵینەوە تاوانکارییە هەڕەشەی تەنانەت لە خودی ئەردۆگان دەکرد،

---

(١) ئەم زاراوەیە لە نـاوی ئەفسـەرێکی بەریتـانی وەرگیـراوە کە بەنـاوی (ئیـدوارد لاورنـس) بـوو، تیایـدا لە سـەروبەندی جەنگـی یەکەمـی جیهانیـدا سـەرکردایەتی عەرەبەکانی کردووە لە دژی تورکەکاندا.

چونکە خۆی و بنەماڵەکەی (هالك بانك)یان بۆ مەبەستی کەسیی خۆیان بەکارهێنابوو، هاوکات ئاسانکاری زیاتریشیان بۆ کراوە، چونکە زاواکەی وەك وەزیری دارایی تورکیا خزمەتی دەکرد. بەگوێرەی ڕوانینی ئەردۆگان بێ، گوڵەن و بزووتنەوەکەی بەرپرسیارن لە دروستکردنی ئەو تۆمەتانەی بۆیان دروستکراوە و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ هالك بانك هەیانبووە، هەموو ئەمانە بەشێکی پیلانگێرییەکن لە دژی ئەردۆگان، نەوەك بەرامبەر سامانی کەڵەکەبووی بنەماڵەکەی. ئەردۆگان دەیوست بابەتی هالك بانك دابخرێت، پێچەوانەی ئەوەی ئێستا کە داواکارانی گشتیی ئێمە بەتوندی بەدواچوون دەکەن بۆ کارە گزییەکانی ئەو بانکە. دواجار، ئەردۆگان نیگەرانی ئەو ڕێکارییە یاساییانە بوو کە لەنێو کۆنگرێسدا گیریان خواردبوو و تایبەتبوو بە فرۆشتنی فڕۆکەی جۆری ئێف ٣٥ بە تورکیا، وەستانی ئەم پرۆسەیەش پەیوەندی بە کڕینی سیستەمی بەرگریی ئاسمانی ئێس ٤٠٠ەوە هەبوو کە تورکیا لە ڕووسیای کڕیووە. ئەگەر ئەمە کۆتایی پێ بێت، ئەم کڕینە دەبێتە هۆی ئەوەی ئابلووقەی زیاتر بخرێتەسەر تورکیا لەژێر (یاسای ئابلووقەکانی دژی-ڕووسیا)ی ساڵی ٢٠١٧. بۆیە، زۆر شت هەیە تا ئەردۆگان بۆیان نیگەران بێت.

بەهەرحاڵ، ئەوەی ترەمپ دەیوست زۆر سنووداربوو: کاتێك قەشە برۆنسن ئازاد دەکرێ و دەگەڕێتەوە ئەمریکا، کە پێی وابوو ئەردۆگان لەمبارەیەوە بەڵێنی داوە؟ ئەردۆگان گوتی کە پرۆسەی دادگاییکردنەکەی لە تورکیا بەردەوامە، برۆنسنیش چیدیکە لەنێو بەندیخانەدا نییە، بەڵکو لە ماڵەکەی لە شاری (ئیزمیر)ی تورکیا دەستبەسەرە. ترەمپ وەڵامی داوە کە ئەمە بە هیچ شێوەیەك یارمەتیدەرمان نابێ، چونکە ترەمپ وابیری دەکردەوە گوێبستی ئەردۆگان بێت و پێی بڵێت کە برۆنسن -کە تەنیا کارمەندێکی نێوخۆیی بوو- وا ئازاد دەکرێ و دەگەڕێتەوە ئەمریکا. ترەمپ پاڵەپەستۆی خستەسەر ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئەردۆگان هەیبوو، ئاماژەشی دا کە ئەو کێشانەی

لە پەیوەندیی نێوان ئەمریکا و تورکیادا هەیە خراپتر دەبێت تا ئەوکاتەی قەشە برۆنسن ئازاد دەکەن و دەگەڕێتەوە ئەمریکا. ترەمپ زیرەکانە خرۆشابوو. دوای بێزارکردنی ڕێکس تیلەرسۆن بۆ چەند جارێك و دەربڕینی چەند گوتەیەکی سەرسامکەر دەربارەی گویلەن (کە ترەمپ بانگەشەی دەکرد ئەوە یەکەمجارە گوێبیستی ناوی ئەو پیاوە بم)، ترەمپ بە گومان و بێ وردبینەکی تەواو، گوتی کە ئەردۆگان پێی گوتووە برۆنسن ناگەڕێتەوە ئەمریکا. لەبەر ئەمەیە کە هیچ کەسێك مامەڵە لەگەڵ ئەردۆگان ناکات، لەمبارەیەوە ترەمپ گلەیی دەکرد، چونکە تەواوی کۆمەڵگەی مەسیحییەکانی ئەمریکا نیگەرانی ئەو تاکە قەشەیە بوون، ئەو خەڵکانە خەریك بوو شێت دەبن. ئەردۆگان وەڵامی دایەوە و گوتی کۆمەڵگەی موسڵمانانیش لێرە لە تورکیا خەریکە شێت دەبن، بەڵام ترەمپ قسەکەی بڕی و گوتی هەموو مەسیحییەکانی جیهان دووچاری شێتگیریی دەبن و خۆشیان ئازادن لەو شێتبوونەیان. دوای ئەمە، ئیدی گفتوگۆکەیان کۆتایی هات.

ترەمپ دواجار کەسێکی دۆزیەوە کە حەزی لە سەپاندنی ئابلووقەکان بوو و گوتیشی: "ئابلووقەی فراوان" دەخرێتەسەر تورکیا ئەگەر قەشە برۆنسن ئازاد نەکرێ و ڕەوانەی ئەمریکا نەکرێتەوە. لە ٢ی ئابدا، وەزارەتی دارایی ئابلووقەی خستەسەر هەریەك لە وەزیرانی داد و ناوخۆی تورکیا، دوو ڕۆژی دواتریش، تورکیا لە کاردانەوەی ئەمەدا ئابلووقەکەی خستەسەر هاوشانەکانیان لە حکوومەتی ئەمریکادا کە ئەوانیش (سیشنز و نیلسۆن) بوون، واتە وەزیرانی داد و ناوخۆی ئەمریکا. لەگەڵ ئەوەی ئەو پێوەرانەمان لەگەڵ ترەمپ باسکرد، ڕۆژی دواتر پێی گوتم مایەی شەرمەزارییە بۆ تورکیا ئابلووقە بخاتەسەر بەرپرسانی کابینەی حکوومەت.

لەجیاتی ئەمە، ترەمپ دەیویست باجی سەر بەرهەمی پۆڵای تورکی دوو هێندە بکات و تا ٥٠% زیاتری بکات، ئەمەش بووەهۆی سەرسامبوونی

تیمی ئابووری. ترەمپ لە ئازاری ٢٠١٨ باجی سەر پۆڵا و ئەلەمنیۆمی پەیوەست کرد بە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی و پشتی بە برگەی ٢٣٢ی بڕیاری فراوانخوازی بازرگانی ساڵی ١٩٦٢ی بەست، ئەمەیان یاسایەکە بۆ کەم کەس ئاشنایە، بەڵام خزمەتێکی زۆری بە سیاسەتیی بازرگانیی ترەمپ کرد. بنەماکانی "ئاسایشی نەتەوەیی" لە باشترین حاڵەتدا شیاوی گۆڕانکاری بوون، برگەی ٢٣٢ لەو یاسایە کە تایبەت بوو بە باج بە شێوەیەك پۆڵێن کراوە کە گرنگی بە بەرهەمی خۆماڵی بدرێت. لە ئێستادا بەکارهێنانی ئەم یاسایە بۆ مەبەستی سیاسی و لەپێناو ئازادبوونی قەشە برۆنسن پێشێلکاری هەرچی لۆژیکە کە لەم یاسایەدا هەیە، بەهەرحاڵ، بەڵام خودی بابەتی (قەشە)ش شیاوی ئەمە بوو. بێگومان، ترەمپ وابیری دەکردەوە هیچ کەسێك لەم بارودۆخانەدا لە دژی ناوەستەوە، بۆیە ئێمەش خۆمان لێی بەدوور گرت.

تورکەکان نیگەرانی ئەوەبوون کێشەکانیان لەگەڵ ئەمریکا زۆرتر بێت، پێویستیان بە دەرچەیەك هەبوو بۆ دەرچوون، یان سەودایەك بکەین، ئەویش ئازادکردنی قەشە برۆنسن بەرامبەر داخستنی لێکۆڵینەوەکان لەمەڕ ئەو تاوانانەی هالك بانك ئەنجامی دابوون. هەرچەندە ئەمە باشترین بژاردە نەبوو، بەڵام ترەمپ دەیویست قەشە ئازاد بکرێت، بۆیە پۆمپەیۆ و ستیڤن منوشن[١] لەگەڵ هاوشانە تورکییەکانیان گفتوگۆیان کرد (منوشن بۆیە بەشداری کرد چونکە نووسینگەی گەنجینەی مولکە دەرەکییەکان چاودێری هالك بانکیان دەکرد). بە سێ ڕێگەی گفتوگۆ، واتە من و پۆمپەیۆ و منوشن گەیشتینە سەر ئەو باوەڕەی کە هیچ شتێك ناکرێ مەگەر داواکارانی گشتی ئێمە لە وەزارەتی داد لە هەرێمی باشووری شاری نیویۆرك ڕازیبوونی خۆیان لەسەر کەیسێك نیشان بدەن، خودی

---

(١) وەزیری گەنجینە (دارایی) ئەمریکا.

کەیسەکەش بریتی بوو لەو پێشێلکارییەی لە ئابلووقەکانی سەر ئێران کراوە، کە بڕەکەی دەگاتە ٢٠ ملیار دۆلار و هێشتا چارەسەر نەکراوە. (ئەو ڕۆژانەی کە لە وەزارەتی داد کارم دەکرد ناومان لە هەرێمی باشوور (Southern District) نابوو هەرێمی سەربەخۆیی نیویۆرك، چونکە چەندین جار ڕەتیانکردووەتەوە ڕێگە بدەن لەلایەن وەزارەتی دادەوە کۆنترۆڵ بکرێن، بەڵکو تەنیا هەر سەر بە کۆشکی سپیین). چەندین جار، منوشن بەخرۆشانەوە دەیگوت گەیشتوومەتە ڕێککەوتنێك لەگەڵ وەزیری دارایی تورکیا. ئەمەیان کارێکی نموونەیی بوو: منوشن لەگەڵ کەسانی فێڵبازی تورکی دانوسانی کردووە یان لەگەڵ بارزگانە (چین)ییە ماندەرییەکان، ئەمەیان ڕێککەوتنێك کە هەردەم لەبەرچاوان بوو. لە هەریەك لەم حاڵەتانەدا، ئەگەر وەزارەتی داد تێکەڵ ببووایە، ئەوا ڕاستەوخۆ شکستی دەهێنا، ئەمە هەر بۆیە هەوڵدان لەم ڕێگەیەوە بۆ ئازادکردنی قەشە برۆنسن هەرگیز سوودێکی نەبوو و بە کەڵك نەدەهات. پۆمپەیۆ گوتی: "تورکەکان تەنیا دەکرێ بە ڕێگەی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ"، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە داواکارانی گشتیی وەزارەتی داد بوون کە ڕەتیانکردەوە ڕێککەوتن لەگەڵ تورکیا بکەن لەکاتێکدا کە ئەم ڕێککەوتنە لە ڕوانینی حکوومەتی ئەمریکی هیچ بەهایەکی نەبوو. لەو نێوەندەدا، دراوی تورکی بەردەوام و بەخێرایی دادەبەزی، بازاری ئاڵوگۆڕیشیان هەر ڕوو لە خراپی بوو.

ئێمە کێشەمان لەگەڵ زۆری ژمارەی ئەو هەموو دانوستکارە هەبوو لە هەردوولادا. نیککی هالێی لەگەڵ بالیۆزی تورکیا لە یوئێن گفتوگۆی دەکرد، وادیاربوو تورکەکان بەم ڕێگەیە لە بابەتەکە تێنەگەیشتبوون. ئێمەش هەروا تێنەگەیشتبووین. پۆمپەیۆ بە تووڕەییەوە گوتی من ئەو کێشەیە چارەسەر دەکەم ئەویش لە ڕێگەی ئەوەی بە هالێی دەڵێم لەوەی لەخۆیەوە بەبێ ڕازامەندی پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان دروست نەکات،

ئەمەش وای کرد ئەو ناتێگەیشتن و ڕەوشە خراپەی پێشتر هەبوو، زیاتربێ. خۆشبەختانە، ئەم جارەیان ئەو جوولەیە کاری کرد. بەهەرحاڵ، هەوڵە دیپلۆماسییەکان نەیانتوانی هیچ کارێك بۆ برۆنسن بکەن. ترەمپ ڕێگەیدا گفتوگۆکان بەردەوام بن، بەڵام ئەو باوەڕەی لەسەر ئەردۆگان هەیبوو ڕاست دەرچوو: ئەویش ئەوەبوو کە تەنیا فشاری ئابووری و سیاسی دەتوانێ برۆنسن ئازاد بکات. لێرەوە، سەرەڕای ئەوەی منوشن گفتوگۆی دڵخۆشکەری ئەنجام دابوو، بەڵام ترەمپ هیچ کێشەیەکی نەبوو لە سەپاندنی ئەو فشارانە. ئەردۆگان ڕاستەوخۆ لە دۆستێکی نێودەوڵەتی ترەمپەوە بوو بە دوژمنێکی توندوتیژ. ئەمە وای کرد هیواکانم هەر بەزیندوویی بمێننەوە بەوەی لە داهاتوودا هەریەك لە ڤلادیمێر پوتین، شی جینگ پینگ، کیم جۆنگ ئوون و سەرکردەکانی دیکەش ڕوو ڕاستەقینەی خۆیان بە ترەمپ نیشان دەدەن، ئەوکاتە دەتوانین سیاسەتە گەرۆکەکانمان بکەینە ڕاستی و بخەینە بواری جێبەجێکردنەوە. هەروەها گونجاوە، کە ترەمپ دەگەڕێتەوە سەر باشترین شێوازی خۆی، هەرواش بوو چەند مانگێکی کەم دواتر ئەو گۆڕانە ڕووی دا. بەشێوەیەکی مەجازی، میدیاکان وا ترەمپیان نیشاندا کە کەسێکە لە ناخیدا ڕقی لە موسڵمانەکان و لە دژیان دەوەستێنەوە، ترەمپ هەرگیز لەمە تێنەگەیشت - سەرەڕای هەوڵە بەردەوامەکانی سەرکردەی هاوپەیمانە سەرەکییەکانمان لە ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تەنانەت خودی ڕاوێژکارەکانی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ئەردۆگان خۆی ئیسلامییەکی توندئاژۆیە. ئەردۆگان سەرقاڵی ئەوەبوو تورکیا لە سەردەمی کەمالیستی و عەلمانی ئەتاتورك بگۆڕێت بۆ دەوڵەتێکی ئیسلامیستی. ئەردۆگان پشتگیری (ئیخوان موسلیمین) و گرووپە توندڕەوەکانی دیکە دەکات لە تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا، دارایی بۆ هەریەك لە حەمماس و حیزبوڵڵا دابین دەکات، پێویست ناکا باسی ئەوەش بکەین کە چەندە دوژمنکاری هەیە بەرامبەر ئیسراییل،

هاوکات یارمەتی ئێرانیشی داوە تا لە ئابلووقەکانی ئەمریکا ڕزگاری بێت. ئەمە پێ ناچێ هەرگیز سوودێکی هەبێ و سەرکەوتووبێت.

لەو نێوەندەدا، ترەمپ لە دواخستن و ئاڵۆزیی مامەڵەکانی تورکیا ماندوو بوو، بۆیە لە ١٠ی ئابدا، سەرەڕای ئەوەی دەسەڵاتی یاسایی گومانیان هەبوو و لەگەڵیشی نەبوون، کەچی ترەمپ باجی لەسەدا ٥٠ی خستە سەر پۆڵای تورکی و لەسەدا ٢٠یشی خستە سەر ئەلەمنیۆمەکەی، ڕەنگە ئەوە یەکەمجار بێ لە مێژوودا کە نرخی باجەکان بە (تویت)ێك ئاوایی بەرزبێتەوە:

هەر ئێستا بریارم دا بە دووهێندکردنی باجەکان لەسەر پۆڵا و ئەلەمنیۆمی تورکی کە تورکیا وەك دراو سوودیان لێ دەبینن. بەهای لیرەی تورکی بەرامبەر دۆلاری بەهێزی ئێمە بەخێرایی دادەبەزێت! لە ئێستاوە باجی لە ٢٠% دەخەینەسەر پۆڵا و ٥٠% دەخەینەسەر ئەلەمنیۆم. لە کاتی ئێستادا پەیوەندییمان لەگەڵ تورکیا لە ڕەوشێکی باشدا نییە.

تورکیا بەهۆی باجەکانی خۆیەوە تۆڵەی کردەوە، ترەمپیش لە وەڵامدا داوای ئابلووقەی زیاتری کرد. منوشن هەوڵیدا ترەمپ لەسەر سەپاندی ئابلووقەکان هێور بکاتەوە، کە من پێم وابوو ئەمە ترەمپ زیاتر بێهیوا دەکات. دواتر (مایك پێنس)ی جێگری سەرۆك پێشنیاری (جارێد کۆشنەر) ڕاوێژکاری باڵای (ترەمپ)ی کرد تا تەلەفۆن بۆ وەزیری دارایی تورکیا بکات، چونکە هەردووکیان زاوای سەرۆکی وڵاتەکانیان. لە ڕاستیدا، چ شتێکی هەڵە دەکرێ ڕووبدات؟ من بڕوام وابوو پۆمپەیۆ و منوشن لە ڕێگەی ئەم کەناڵە نوێیە کە لە ڕێگەی زاوای سەرۆکی هەردوولا بوو، هاوکات لەمبارەیەوە هەردووکیان تەقیبوونەوە، منوشن بەهۆی ئەوەی زاواکەی ئەردۆگان (هاوشانی خۆی وەزیری دارایی بوو)، پۆمپەیۆش لەبەر ئەوەی کە نابێ جارێد کۆشنەر دانوستانی نێودەوڵەتی

بکات (سەرەڕای ئەوەی ئەو پلانەی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو، هەرگیز بەتەواوی ئامادەنەبوو). من هەردەم چێژ لەوە وەردەگرم هەواڵی نوێ ڕابگەیەنم.

ترەمپ و (جارێد کۆشنەر)ی زاوای بەرەو شاری (هامپتۆنس) چوون بۆ بەشداریکردن لە کارێکی کۆمەککۆکردنەوەی سیاسی، منوشنیش پێشتر گەیشتبووە ئەوێ، دواتر کۆشنەر تەلەفۆنی بۆ کردم تا پێم بڵێت کە منوشن هێور بووەتەوە. کۆشنەر هەروەها گوتی کە بەو وەزیرە تورکەم گوتووە من لەلایەنی توانای کەسیی خۆم و هاورێیەتییەوە تەلەفۆنم بۆت کردووە، ئەمە بە هیچ شێوەیەك ئاماژەیەك نییە بۆ لاوازیی تورکەکان. من گومانم هەیە تورکەکان بڕوایان بە هیچێك لەمانە کردبێ.

لە ٢٠ی ئابدا، ترەمپ لە ئیسرائیلەوە پەیوەندی پێوە کردم دەربارەی ئەو تەقەکردنەی ئەو بەیانییە لە نزیك کونسوولخانەی ئەمریکی لە ئەنکەرە ڕوویدابوو. من پێششتر بەدواچوونم بۆ ئەو ڕووداوە کردبوو، زانیم کە ئەوە کارێکی تاوانکاریی نێوخۆیی تورکیایە و هیچ پەیوەندی بە ئەمریکاوە نییە. لەگەڵ ئەوەش ترەمپ گوتی پێت چۆنە گەر باڵیۆزخانەمان لەوێ دابخەین، بەمەش ناکۆکییەکان بەهۆی کێشەی برۆنسنەوە گەرمتر دەبێت، یان ڕەنگە بتوانین شتێکی دیکە بکەین، ئەویش ئەوەیە گرێبەستی فرۆشتنی فڕۆکەی شەڕکەری جۆری ئێف ٣٥ بە تورکیا هەڵبوەشێنینەوە. تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆ و ئەوانی دیکە کرد تا ئاگەداربن و داوام لە ستافی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کرد لەگەڵم گەشت بکەن و بیر لەوە بکەنەوە چ بژاردەیەك بەردەستە. پۆمپەیۆ پێی وابوو پێویستە ڕابگەیەنین کە باڵیۆزی تورکی کەسێکی پەسەند نییە و فەرمان بە پارێزەرانی دەوڵەت بکەین تا بچنە پاڵ ئەنجوومەنی کۆشکی سپی تا ڕاوێژی زیاتر بکەن. ئەو هەنگاوانە کارێکی تەقلیدی نەبوون، بەڵام کات و دەرفەتی زۆرمان تەرخانکرد لەپێناو برۆنسن و کەچی هێشتا گەرەنتی ئازادبوونی نەبوو.

بەهەرحاڵ، لە چەند ڕۆژێکی کەمدا، ترەمپ پێچەوانەی ئەمە جووڵایەوە، لە دژی ئەنجامدانی هەر کارێك بوو لە دژی باڵیۆزخانەی ئێمە و خودی باڵیۆزە تورکەکە، لەبری ئەمە لەگەڵ بیرۆکەی سەپاندنی ئابلووقەی زیاتربوو. ترەمپ بە منی گوت: "ئێستا ئەوە تورکیا دەناسی"، بەشێوەیەکی بنەڕەتی بزانە دەبێ چی لەگەڵیان بکەین. چەند ڕۆژێکی دواتر هەمان ڕوانینی دووپات کردەوە و گوتی: "لێیان دە، کۆتاییان پێ بێنە، تێگەیشتی"، هاوکات لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی بە مێرکلی گوت ئەردۆگان لە پرسی ئازادکردنی قەشە برۆنسن زۆر گەمژانە مامەڵە دەکات، هەر بۆیە لە چەند ڕۆژی داهاتوودا ئابلووقەی گەورە و فراوانیان بەسەردا دەسەپێنین. قەتەرییەکان کە یارمەتی تورکەکانیان دەدات بۆ وەستان لە دژی ئەو قەیرانە ئابوورییە، هاوکات خۆبەخشانە هاتنە پێش تا لە بابەتی برۆنسن یارمەتی پێشکەش بکەن، بەڵام وا دەرکەوت کە ئەم هەوڵەیان هیچ سوودێکی نەبوو.

لە ڕاستیدا، لە ڕووی دیپلۆماسییەوە پێشکەوتنێکی کەم بەدی کرا، تەنانەت کاریگەرییەکانی ئەو ئابلووقانە تەواو دەرکەوت و پەیوەندیی نێوان تورکیا و ئەمریکا لەسەر مەسەلەی قەشە برۆنسن و هەندێ کێشەی دیکەش (نموونەش کڕینی سیستەمی بەرگری ئاسمانی ئێس ٤٠٠ لە ڕووسیا) تەگەرەی زۆر تێکەوت و مەترسی گەورەی بۆ سەر ئابووریی تورکیا دروستکرد. تورکیا، هاوکات پێویستی بە (وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆی دەرەکی) زیاتر هەبوو، هەر بەخێرایش ئەمە پێچەوانەی خواستی خۆیان کاری کرد، دواجار کاریگەری خستەسەر بڕیاردانی تورکیا. سیستەمی دادوەریی تورکیا لە ڕۆژی هەینی کە ١٢ی تشرینی یەکەم بوو، لە شاری ئیزمیر کۆبوونەوەیەکی دیکەی ئەنجام دا، ئەو شارەی کە لەوەتەی مانگی حوزەیرانەوە قەشە برۆنسنی لەنێو ماڵەکەی تێدا دەستبەسەر بوو. ئاماژەی بەهێز هەبوو کە دادگا کار دەکات تا برۆنسن ئازاد بکات، وەزارەتی

بەرگریش فرۆکەیەکی لە ئەڵمانیاوە ئامادەکرد بۆ ئەوەی گەر پێویستی کرد، ئەوا برۆنسن و بنەماڵەکەی بگوازنەوە. بەشێوەیەکی سەیر، دادگا ڕۆبنسنی بە تۆمەتی سیخوڕی و بەشداری لە تاوان تاوانبارکرد (کە بەڕاستی ئەمە هەر لە گاڵتەجاڕی دەچوو)، بۆیە سزای زیندانی پێنج ساڵی بۆ بڕایەوە، دواتریش بەهۆی ئەوکاتەی کە خزمەتی کردبوو، شانبەشانی هەندێ هۆکاری دیکەی تایبەت بە کەمکردنەوەی سزا، برۆنسن ئازاد کرا. ئەم دەرئەنجامە دەریخست کە چارەسەری سیاسی کاری خۆی کرد: بانگەشەی ئەردۆگان کە گوتبووی برۆنسن سیخوڕە، بۆ هەندێ مەبەستی سیاسیی نێوخۆ پشتراست کرایەوە، بەڵام دواجار هەر ئازاد کرا.

لە کاتژمێر ٩:٣٥ خولەکی ئێوارە، تەلەفۆنم بۆ ترەمپ کرد کە وەك هەمیشە هێشتا هەر لە نووسینگەکەی خۆی بوو، پێشم گوت لە ٩٥% دڵنیاین کە برۆنسن ئازاد کراوە. ترەمپ بەمە زۆر دڵخۆشبوو، بۆیە هەر یەکسەر تویتێکی کرد، ئەم تویتەی لەگەڵ تویتێکی دیکە تێکەڵ کرد بەوەی نووسیبووی "بۆنا، ئیڤانکای کچم دەبێتە یەکێك لە باڵیۆزە مەزنەکانی یو ئێن". ترەمپ دەیویست هەرچی زووە برۆنسن بهێنن بۆ کۆشکی سپی، تەنانەت گەر پێویستیشی کرد نەیەڵن بۆ چاودێری پزیشکی لە نۆڕینگەی پزیشکی (لاندستوهل) لە ئەڵمانیا بوەستێت. دواکەوتنی فڕۆکەکەی پێنتاگۆن بۆ ئیزمیر مانای وابوو ئەو شەوە دەبوو برۆنسن لە ئەڵمانیا بمێنێتەوە. بەم شێوەیە بێت، مانای وایە سەردانیکردنی برۆنسن بۆ کۆشکی سپی دەکەوێتە نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممە، ئەوکاتە ئەندامانی کۆنگرێسی ویلایەتی کارۆلینای باکوور، دەسەڵاتدارانی شارەکەی خۆی، شانبەشانی خێزان و دۆستەکانی بەشداری دەکەن. دوای ئەوەی بینیم کە دکتۆرەکەی کۆشکی سپی ئامادەیە پشکنین بۆ ئەو دیمەنە سروشتییە بکات کە خەریکە ڕوودەدات، ئەوکاتە برۆنسن و ژنەکەی بەرەو باڵی ڕۆژئاوای کۆشکی سپی ڕێگەیان تەی کرد. بە کورتی قسەم لەگەڵ

کردن، سەرسامیش بووم بەوەی هەموو ئەو ماوەیە شوێنی هەنگاوەکانی من کەوتووە و لە زۆربەی کارەکانیش هەمان باوەڕی منی هەبووە. برۆنسن لەگەڵ ژنەکەی بەرەو نووسینگەی ترەمپ چوون و دواتریش هەرسێکیان بەیەکەوە هاتنە نێو کۆشکی سپی، هاوکات ئەوانەی لەوێ بوون بە خۆشی و شادییەوە سڵاویان لێ کردن. ئەوکاتەی سەرۆك و برۆنسن قسەیان دەکرد ئیدی ئاپۆرای ڕۆژنامەنووسانیش خۆیان کرد بە ژووریێ. لە کۆتاییدا، برۆنسن لە کورسییەکەی تەنیشت ترەمپ دانیشت، قۆڵی خستەسەر شانی ترەمپ و دوعای بۆ کرد، ئەو دیمەنە بە ڕوون و ئاشکرایی بووە بابەتی هەر گرنگی ئەو ڕۆژە. کەوابێ، کێشەی برۆنسن کۆتایی هات، بەڵام پەیوەندی دوولایەنە لەگەڵ تورکیا ئەوکاتە لە خراپترین ئاستی مێژوویی خۆیدا بوو.

بەر لەئازادکردنی برۆنسن، باردۆخی سووریا خراپتر ببوو. ئێمە لە مانگی ئەیلوول نیگەرانی ئەوە بووین کە ئەسەد پلانی هەیە پێشێلکاری لە ئیدلیب ئەنجام بدات، ماوەیەکی زۆرە ئیدلیب وەك ناوچەیەکی ئۆپۆزسیۆن لە باکووری ڕۆژئاوای سووریا ئامادەگی هەیە. ئێستا ئیدلیب بووەتە شوێنی سەدان هەزار پەنابەری سووری، کە تێکەڵ بە تیرۆرستە توندئاژۆکان و سوپای تورکی ببوون، ئەوەی دواهەمینیان وا خۆی نیشان دەدات ڕێگری لە هەر هێرشێکی ئەسەد دەکات. ڕووسیا و ئێران تەقریبەن بەدڵنیاییەوە یارمەتی ئەسەد دەدەن، هۆکاریشن بۆ خوێنڕێژی و دروستکردنی ئاژاوە، هاوکات هەر ئەوانن وایان کردووە ئاپۆرایەکی زۆری پەنابەران لە سووریاوە بەرەو تورکیا کۆچ بکەن. شانبەشانی ئەو پەنابەرە یاساییانە، هەزاران لە تیرۆرستانیش ڕادەکەن، زۆرێك لەوانە ڕوو لە ئەورووپا دەکەن کە بەڕاستی بە شوێنی دڵخوازی خۆیانی دەزانن. من بەتایبەتی بۆ ئەوە نیگەران بووم ئەگەر ئەسەد جارێکی دیکە چەکی کیمیایی بەکاربێنێ، بۆیە بەخێرایی داوام لە وەزارەتی بەرگری کرد بیر لە ئەگەر کاردانەوەی

سەربازی بکات (هیواخوازبووم دیسانەوە لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا ئەمە بکەین) ئەگەر دیسانەوە ئەسەد چەکی کیمیایی بەکارهێنا. من نەمدەویست بەبێ ئامادەکاری دەرکەوم، بەتایبەتی بۆ مانگی نیسان. ئەگەر پێویستیشی کرد، ئەوا پێویستە تۆڵەسەندنەوە هەر ئەوە نەبێ بۆ لەناوبردنی توانای چەکی کیمیایی سووریا بێت، بەڵکو کۆتایی بە ویستی ئەسەد بێنن لەوەی نەتوانێ جارێکی دیکە ئەو چەکە بەکار بێنێت. ئەوکاتە، جەیمس ماتیس بەرپرسە هاوبەشەکانی ئازاد کرد لەوەی پێویستە چ کارێك بکەین، پلانێکی پێشکەوتووی گشتگیر هەبوو کە پشتی بەستبوو بە گریمانە جێگیر و سنووردارەکان (بۆ نموونە، بەتوندی خۆگرتن لەوەی کەسانی مەددەنی بخەینە مەترسییەوە) و ئامانجەکانیش بپارێزین. پێچەوانەی مانگی نیسان، ئەگەر شتەکان لە خراپترەوە بەرەو خراپترین چوون، ئەوا پێویستە بژاردەی ڕاستەقینە بخەینە بەردەست ترەمپ تا یەکیان هەڵبژێرێت.

لەو نێوەندەدا، ئیسرائیل چاوەڕوانی نەکرد، بەبەردەوامی هێرشی دەکردە سەر کەشتییە بارهەڵگرەگانی ئێران کە چەك و پێداویستییان دەگواستنەوە و هۆکاری دروستکردنی مەترسی بوون. ئۆرشەلیم خاوەن پەیوەندیی خۆیان بوون لەگەڵ مۆسکۆ، چونکە نەتەنیاهۆ بەدوای ئامانج و کەسایەتییە ڕووسەکان نەبوو، بەڵکو لە دژی ئێرانییەکان و تیرۆرستان دەجەنگا. کێشەی ڕاستەقینەی ڕووسیا بریتی بوو لە هاوپەیمانەکانی سووریا، ئەوانەی لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوولدا فڕۆکەیەکی چاودێری ڕووسییان خستە خوارەوە، هەر ئەمەش وای کرد ڕووسیا پێدانی سیستەمی بەرگری ئاسمانییەکەی بەناوی ئێس ٣٠٠ بە سووریا پشتگوێ بخات و کێشەی گەورەشی بۆ ئیسرائیل دروست دەکرد.

لە عێراقیش، لە ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ٨ی ئەیلوول، گرووپی میلیشا شیعەکان کە بێگومان لەلایەن ئێرانەوە هاوکاری دەکرێن، هێرشیان کردە سەر باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە بەغدا و کونسوڵخانەکەمان لە بەسرە،

ئێرانیش هێرشی مووشەکی کردبووە سەر ئامانجەکان لە نزیك شاری هەولێر لە کوردستانی عێراقدا. چەند ڕۆژێك بەر لە یادی هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر و هاوکات هێرشکردنە سەر کەمپی دیپلۆماتیکی ئێمە لە بەنغازی، هێشتا لەنێو ئاوەزماندا بوو، بۆیە دەبوو بەشێوەیەکی ستراتیژی بیر لە کاردانەوەکانمان بکەینەوە. ئێمە هیچ کاردانەوەیەکمان نەبوو. جۆن کێلی (بەرپرس لە کۆشکی سپی) پێی گوتم دوای ڕووداوی هەڵمەتەکە، ترەمپ پێی ڕاگەیاندووە کە دەیەوێ بەتەواوی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین پاشەکشە بکەین. کوژرانی ئەمریکییەکان لە عێراق و خودی ئەو تراژیدیایەی لەخۆی گرتووە، ئەمە پاشەکشەمان لەوێدا خێراتر دەکات، هەموو ئەمانەش گەر بەوریاییەوە بیر نەکەینەوە، ئەوا کاریگەریی دەخاتەسەر ڕژدبوونی چەند ساڵەمان، ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییە هاوپەیمانەکانمان. بەهەرحاڵ، تا ڕۆژی دووشەممە، کاردانەوەکەمان بچووك بوویەوە بۆ تەنیا لێدوانێك ئەویش تیایدا ڕۆڵی ئێرانیان لەو هێرشانەدا ئیدانە کرد. ماتیس دژی ئەمە بوو، هێشتا دەیگوت کە دڵنیانین ئاخۆ گرووپە میلیشا شیعەکان پەیوەندییان بە ئێرانەوە هەیە یان نا، هاوکات بەوپەڕی برواوە بەرگری لەمە دەکرد. تا سێشەممە هیچ بڕیارێکمان پێ نەدرا، تا دواتر ئەم قسە پڕوپاگەندەیەی ماتیس وای کرد هەریەك لە ترەمپ، پێنس، ماتیس، پۆمپەیۆ، کێلی و من لە کۆشکی سپی کۆببینەوە. ئێستا هەروەك (هەندێك) تێبینیان کردبوو کاتەکەی زۆر درەنگ بووە، جا هەرچییەکیشیان گوتبێ. ئەمە شێوازی ڕێگریکردنی ماتیس بوو لە کارکردندا، بە جۆرێك پێی وابوو نابێ هیچ کاردانەوەیەکی داینامیکیمان هەبێ، تەنانەت پێویست ناکا لێدوانێکی ڕۆژنامەوانیش دەرکەین وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەو هێرشانەی کرابووە سەر کەسایەتی و بارەگا ئەمریکییەکان. پرسیار ئەوەیە ئایا ئێران و گرووپە میلیشیاکان چ وانەیەك لەو بێدەنگی و ناچالاکییەی ئێمە وەردەگرن؟!

بەشێوەیەك کە چاوەڕوانکراو بوو، چەند هەڕەشەی نوێ لە ماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا لەلایەن گرووپە ملیشا شیعەکان دووپات کرایەوە، پاشان دوو مووشەکی دیکەش ئاراستەی کونسوولخانەی ئەمریکا کرا لە شاری بەسرە. تەقریبەن ڕاستەوخۆ پۆمپەیۆ بڕیاری دا بە داخستنی کونسوولخانەکە (کە ئەمە کاریگەری دەکردە سەر هەزاران لە خەڵکی دامەزراوی حکومی و گرێبەست) بەو مەبەستەی ئەو کارەساتەی بەسەر کەمپەکەمان لە بەنغازی ڕوویدا، دووبارە نەبێتەوە. ئەوجارەیان تەنانەت (ماتیس)یش نەیدەتوانی نکۆڵی لە پەیوەندی ئێران بە گرووپەکانەوە بکات. بەهەرحاڵ، بێ ئەوەی ناپاکی لەو هەستە مەجازییەی بکات، ماتیس هێشتا دژی هەر کاردانەوەیەکی دینامیکی بوو، نیگەرانی ئەوەش بوو کە بەداخستنی ئەو کونسوولخانەیە مانای ئەوەیە ئێمە لە عێراق پاشەکشە دەکەین. لە ٢٨ی ئەیلوول، پۆمپەیۆ داخستنی کونسوولخانەکەی ڕاگەیاند. کاتێ هاتینەسەر ڕووداوەکانی هاوینی ٢٠١٩، بەتایبەتی خستنەخوارەوەی فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکانی ئەمریکا و کردە توندئاژۆکانی ئێران لەو ناوچەیەدا، گەیشتینە ئەو باوەڕەی کە ئەم ئیدارەیە ماوەی ساڵێکە شکستی هێناوە لەوەی کاردانەوەی هەبێ بەرامبەر ئەو کردە بێزارکەرانەی لەو ناوچەیەدا (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) بوونیان هەبووە.

کەمێك دواتر، ترەمپ دیسانەوە گەڕایەوە سەر بابەتی ئەردۆگان و تورکیا. شەش هەفتە دوای ئازادکردنی برۆنسن، لە١ی ئەیلوول هەردوو سەرۆك لە لووتکەی (G20) لە بۆینس ئایرێسی ئەرژەنتین کۆبوونەوە و بە فراوانی باسیان لە کێشەی هالك بانك کردبوو. ئەردۆگان دۆکیۆمێنتێکی نیشاندابوو کە پشتئەستوور بوو بە ڕێکاری یاسایی هالك بانك، کەچی ترەمپ هیچی نەکرد و تەنیا دواتر گوتبووی کە هالك بانك تەواو بێتاوانە لەو پێشێلکارییەی لە ئابلووقەی ئەمریکا بۆ سەر ئێران کراوە. ترەمپ پرسیاری کرد ئاخۆ دەتوانین لە جێگەی داواکاری گشتیی ئەمریکا مات ویتاکەر

مامەڵە بکەین، منیش گوێم پێنەدا و خۆم لێ بەدوورگرت. ترەمپ دواتر بە ئەردۆگانی گوت من خۆم گرنگی بە کاروبارەکان دەدەم، ڕوونیشکردەوە کە داواکارانی گشتیی هەرێمی باشوور خەڵکانێك نین سەر بە من بن، بەڵکو سەر بە ئۆبامان، کاتێ خەڵکانی خۆمان لەشوێنی ئەوان دادەنێین، ئەوا ئەو کێشەیەش چارەسەردەبێ.

بێگومان، هەموو ئەمانە شتی بێمانان، چونکە داواکارانی گشتی فەرمانبەری وەزارەتی دادن، ئەگەر لێکۆڵینەوەکان لەسەر هالك بانك لە ساڵی هەشتەمی ترەمپ دەست پێ بکات نەوەك ساڵی هەشتەمی ئۆباما، بێگومان ئەو داواکارانە هەمان لێکۆڵینەوەیان دەکرد. بۆیە ترەمپ هەوڵی دەدا نیشانی بدات کە هاوشێوەی ئەردۆگان چەندان دەسەڵاتی هەرەمەکی هەیە، هەر ئەردۆگان بیست ساڵ لەمەوبەر ئەوکاتەی سەرۆك شارەوانی ئیستەنبوڵ بوو گوتی: "دیموکراسی هاوشێوەی ئۆتۆمبێلی سەر شەقامە. دەتوانی تا ئەو شوێنەی دەتەوێ لێی بخوڕی، دواتریش لێی بێتە خوارەوە". ترەمپ بەردەوام بوو و گوتی کە ئەو نایەوێ هیچ شتێکی خراپ بەسەر ئەردۆگان و تورکیا بێت، هەر بۆیە خۆی بەوپەڕی جددیەتەوە کار لەسەر ئەم بابەتە دەکات. ئەردۆگان هەروەها گلەیی کرد لە هەمبەر هێزە کوردییەکانی سووریا (کە ترەمپ ئاماژەیەکی نەبوو بۆیان) و پاشان باسی فەتحوڵڵا گویلەنی کرد و پێی وابوو پێویستە ڕادەستی تورکیا بکرێتەوە. ترەمپ وای گومان کرد گەر گویلەن ڕادەستی تورکیا بکرێتەوە، ئەوا تەنیا یەك ڕۆژ دەتوانێ درێژە بە ژیانی بدات و دواتر دەیکوژن. تورکەکان پێکەنینیان بەم قسەیە هات و گوتیان گویلەن پێویست ناکا نیگەران بێت، بەوپێیەی تورکیا سزای لەسێدارەدانی نییە. خۆشبەختانە، کۆبوونەوە دووقۆڵییەکە کەمێك دواتر کۆتایی پێ هات. هیچ شتێکی باش، لەو پەیوەندییە نزیك و نوێبوویەوە لەگەڵ سەرکردەیەکی دیکەی بیانی زۆردار، نایەتە ئاراوە.

لە ڕاستیدا، ئەوروپییەکان پێشتر نیگەرانی خۆیان لە هێرشی ئەسەد بۆ سەر ئیدلیب گۆڕیبوو بۆ هێرشی تورکیا بۆ سەر باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا، بە دیاریکراوی مەبەست لەو هەرێمە سێگۆشەیەی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات، باشووری تورکیا و ڕۆژئاوای عێراق. بەشێکی فراوانی لەژێر کۆنترۆڵی هێزی ئۆپۆزسیۆنی سوریایە، زۆرینەی دەسەڵاتداریش بریتین لە شەڕڤانە کوردەکان، هاوکات چەندان هەزار سەربازی ئەمریکی و هاوپەیمانەکانی لەوێدا جێگیر کراون تا یارمەتییان بدەن لەو هێرشانەی دەکرێتەسەر خەلافەتی ناوچەیی داعش. ئەو شەڕە لە سەردەمی ئۆباماوە دەستی پێ کردووە، کە سیاسەتە ڕێونکەرەکانی لە عێراق هۆکاری سەرەکی بوون بۆ دروستبوونی داعش و دروستکردنی خەلافەتەکەیان، ئەو هێرشانە دوایی خەریکە سەرکەوتنی یەکجاری بەدەست دێنێت. نزیك بوو ئەو هێرشانە کۆتایی یەکجاری بە دەسەڵاتی ناوچەیی داعش بهێنێت لە ڕۆژئاوای عێراق و ڕۆژهەڵاتی سووریادا، بەڵام نەیتوانیووە کۆتایی بەخودی داعش بهێنێت، چونکە هێشتا گومان دەکرێ هەزاران چەکدار و تیرۆرست لەگەڵیان بن و لەنێوان عێراق و سووریادا هاموشۆیانە، بەڵام نەیانتوانیووە هیچ ناوچەیەکی دیاریکراو کۆنترۆڵ بکەن. وا گومان دەکرێ ئەردۆگان حەز بکات خەلافەتی داعش تێك بشکێنێت، بەڵام دوژمنی ڕاستەقینەی ئەردۆگان کوردەکانن، ئەو کوردانەی کە ئەردۆگان بەهۆی ئەو پاساوانەی هەیەتی، بڕوای وایە پەیوەندییان لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) هەیە، ئەو (پەکەکە)یەی ماوەیەکی زۆرە لە ئەمریکادا وەك گرووپێکی تیرۆرستی ڕەچاویان بۆ دەکرێت. بۆچی ئێمە لەگەڵ یەك گرووپی تیرۆرستی هاوسۆز بین بۆ شکاندنی گرووپێکی تر، کەچی لە کابینەی ئۆباماوە شکستیان هێناوە لەوەی درك بکەن کە هەم لە ئێستا، هەم لە داهاتووش ئێران مەترسییەکی زۆر جددیترە. زۆرێك لە لایەنەکان لەو ململانێیەدا دژی داعشن، لەوانەش

ئێران، حیزبوڵلا کە وەکیلی ناوچەیی خۆیەتی، هەورەها سووریاش کە خەریکە لەلایەن لایەنی دیکەوە کۆنترۆڵ دەکرێ. تاران پێچەوانەی ئۆباما، جەخت دەکاتە سەر شەڕی دواتر، ئەو شەڕەی دوای شکستهێنان بە داعش سەرهەڵدەدا.

هەر کە خەلافەتی داعش کۆتایی هات، ئێران دەستی بە فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی کرد لەو ناوچەیەدا، ئەمریکاش لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوپەیمانی گەوج مایەوە. هەروەك گوتوویانە، ئەمریکا لەمێژە پشتگیری هەوڵەکانی کوردی کردووە بۆ خۆڕێبەریی زیاتر و تەنانەت بەدەستهێنانی سەربەخۆییش لە عێراق، هاوکات دەوڵەتی کوردی پێویستی بە ڕێککەوتنێکی سنووریی هەیە لەگەڵ ئەو وڵاتانەی بوونیان هەیە و بوونەتە دراوسێی. ئەمەیان پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، بەڵام ئەوەی ئاڵۆز نییە ئەوەیە هەستی بەهێز و دڵسۆزی ئەمریکییەکان بۆ کورد -ئەو کوردانەی کە شانبەشانی ئەمریکییەکان شەڕی داعشیان کرد- ترسانە لەوەی کە پشتگوێخستنی کوردەکان نەك هەر ناپاکییە، بەڵکو بەتوندی دەرئەنجامەکان لە جیهاندا سەراوژێر دەکاتەوە بەتایبەتی بۆ هەر هەوڵێك لە داهاتوودا گەر بیانەوێ هاوپەیمانی نوێ پەیدا بکەن و لەوانەشە وەك بابەتێك سەیر بکرێت کە ڕەنگە بکرێتە قوربانی.

لەو نێوەندەدا ئاژاوەیەك لەنێو پێنتاگۆن سەری هەڵدابوو. لە ڕۆژی هەینی، ٧ی کانوونی یەکەمدا و لە نانخواردنی هەفتانەی نێوان خۆماندا، ماتیس بەدڵتەنگییەوە بە من و پۆمپەیۆی ڕاگەیاند: "ئێوەی هەردووکتان شارەزایی سیاسییتان لە من زیاترە"، ئەم قسەیەی نیگەرانی پێوە دیاربوو. دیارکردنی (مارك مێلّلی) بۆ شوێنی (جۆزێف دەنفۆرد) وەك (سەرۆکی ئەنجوومەنە هاوبەشەکان[1]) بەیانی بەر لە ململانێی نێوان سوپا و هێزی دەریایی

(١) مەبەست لەمە (Joint Chiefs of Staff)ە، ئەمەیان وەك ئەنجوومەنێکە لەنێو
←

ڕادەگەیەندرێ، بەڵام ئێمە دەمانزانی ئەوە ڕوودەدات. میلّلی دەبێتە سەرۆك ئەرکانی سوپا، ناوبراو توانی سەرنجی ترەمپ بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و بەهۆی تواناکانییەوە ئەو پۆستە بەدەست بێنێت. ماتیس هەوڵی دا فشار بخاتەسەر ترەمپ تا کاندیدەکەی خۆی بخاتە ئەو پۆستە، بەڵام زۆرێك لە پشتگیریکارانی ترەمپ بڕوایان وابوو دواهەمین شت پێویستە بکرێت ئەوەیە کەسێکی هاوشێوەی ماتیس بکرێتە سەرۆکی دەستە هاوبەشەکان. لە ڕێگەی فشاری بەردەوام، چونکە ماتیس دەیزانی بەرلەوەی ئەرکەکەی جۆزیف دەنفۆرد کۆتایی پێ بێت لە ٣٠ی ئەیلوولی ٢٠١٩دا ئەویش کارەکەی لەدەست دەدا، ماتیس خۆی زیانی بە پۆستەکەی گەیاند. لە نانخواردنی بەیانی دواترمان لە (وێست ڕووم[1])، پێنجشەممە بەرەوای ١٣ی کانوونی یەکەم، ڕەوشەکە لەبەر چەندان هۆکار دڵتەنگیی پێوە دیاربوو، بەڵام هۆکاری سەرەکی کە هەمووومان هەستمان پێ دەکرد، کە بەدڵنیاییەوە دەبوو بە بێدەنگی تێپەڕبێ، ئەویش ئەوەبوو کە ئەرکی ماتیسیش وەك وەزیری بەرگری ئەمریکا خەریکە کۆتایی دێت. ئەو کەللەرەقی و ئاستەنگ دروستکردنەوەی ماتیس هەیبوو زانیم لەگەڵ خۆی کۆتایی پێ دێت و ئەمەش نەبووەهۆی بێزارکردنی من، بەڵام جێهێشتنی کارەکەی هەندێ کێشەی دروست دەکرد، ئەمەش تەقریبەن دەبووە ڕێسایەکی حەتمی. هیچ یەکێك لەو سێ ئیدارەی پێشتری ئەمریکا کە لەلایەن کۆمارییەکانەوە بەڕێوە براون و من کارم لەگەڵ کردوون، شتێکی بەم جۆرەیان نەدیووە کە کەسێکیان لە ئاستێکی ئاوا باڵادا کارەکانی بەسەریدا سەراوژێر بکرێتەوە.

لە ١٤ی کانوونی یەکەمدا، ترەمپ و ئەرۆدگان بە تەلەفۆن قسەیان کرد.

---

وەزارەتی بەرگری دروستکراوە، تیایدا زانیاری و ڕێنمووییی بە سەرۆکی ئەمریکا، وەزیری بەرگری، وەزیری ناوخۆ، ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی دەدات.

(١)ئەمەیان ژووری کۆنفراس و کۆبوونەوەکانیشی پێ دەگوتری لەنێو کۆشکی سپییدا.

من پێشتر کورتەیەکم بە ترەمپ دا لەسەر ڕەوشی سووریا، ئەویش گوتی: "پێویستە لەو دۆزەخەی ئەوێ بچینە دەرێ"، کە من ترسی ئەوەم هەبوو ئەمە ڕاستەوخۆ بە ئەردۆگانیش بڵێت. ترەمپ دواتر گوتی ئێمە زۆر نزیکن لەوەی بگەینە چارەسەرێك بۆ کێشەکەی هالك بانك. ترەمپ قسەی لەگەڵ منوشن و پۆمپەیۆش کردبوو و گوتیشی ئێمە لەگەڵ زاوا گەورەکەی ئەردۆگان (هاوکات وەزیری دارایی تورکیایە) مامەڵە دەکەین تا ئەو ئەرکەی لەسەر شانی کەم بکەینەوە. ئەردۆگان هەندێ بە ئینگلیزی هاتەگۆ و سوپاسگوزاری خۆی نیشاندا. دواتر بابەتەکەی گۆڕی و چووە سەر سووریا. ئەردۆگان گوتی ترەمپ دەزانێ چاوەڕوانییەکانی تورکیا لەهەمبەر (یەپەگە: هێزێکی کوردیی میلیشیایی سووریایە، بەشێکن لە هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی بەرگری سووریا) و تۆڕی تیرۆرستی گویلەنییەکان، ئەوەیە کە ئەردۆگان وەك هەڕەشە بۆ سەری ئاسایشی نیشتیمانی تورکیا سەیریان دەکات و هۆکارن بۆ تێکچوونی پەیوەندیی دوولایەنەی نێوان واشنتۆن و ئەنکەرە. لەگەڵ ئەمانەش، ئەمریکا بەوپێیەی مەشق بە هێزەکانی یەپەگە دەکات، ئەمەش گوزارشتە لەوەی ئەمریکا پێچەوانەی خواستی ئەردۆگان کاری کردووە و ئەردۆگانیش لەلای خۆیەوە هەر سکاڵای دەکات، ئەمریکا ئێستا مەشق بە زیاتر لە ٣٠ بۆ ٤٠ هەزار شەڕڤانی یەپەگە دەکات. ئەردۆگان ڕەخنەی لەو جیاوازییە گرت کە لەنێوان خواستی سیاسیی ترەمپ و چالاکییە سەربازییەکانی ئەمریکا لەسەر خاکی سووریا هەیەتی، کە هەر ئەمەش چەندان پرسیاری لەنێو ئاوەزیدا دروست کردبوو. ئەردۆگان گوتی، تورکیا دەیەوێ لەدەست داعش و پەکەکە ڕزگاری بێت. لە ڕوانینی من کە گوتی پەکەکە مەبەستی ڕزگاربوون بوو لە هەموو شەڕڤانە کوردەکان بەگشتی.

ترەمپ گوتی ئێمە ئامادەین لە سووریا بکشێینەوە ئەگەر تورکیا ئامادەیە چارەی تەواوی پاشماوەکانی داعش بکات، تورکیا ئەوەی ماوەی چارەی

بکات، ئیدی ئێمەش ڕاستەوخۆ پاشەکشە دەکەین. تورکیا لەم بابەتە بەڵێنی دا، بەڵام گوتی هێزەکانی پێویستییان بە پشتگیریی لۆجستیکی هەیە. دوای ئەمەش بەشە ناخۆشەکەی ئەم گفتوگۆیە هات. ترەمپ گوتی کە پرسیار لە من دەکات (منیش وەك هەمیشە گوێم لە تەلەفۆنەکە گرتبوو)، کاتێ گوتی پێویستە ڕاستەوخۆ پلانێك بۆ کشانەوەمان لە سووریا ئامادە بکەی، بەوپێیەی تورکیا شەڕکردنی چەکدارانی داعش لەئەستۆ دەگرێت. دواتر گوتی بەبێدەنگی کار لەو بابەتە دەکەم و دەشڵێم بۆیە ئەوێ جێ دێڵین چونکە داعش کۆتایی پێ هاتووە. ترەمپ پرسیاری کرد ئاخۆ دەتوانم قسە بکەم، منیش قسەم کرد و گوتم گوێبیستی فەرمایشتەکانت بووم. هەروەك خەریك بوو پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە کۆتایی دێت دوای قسەکردنی زیاتر لەسەر بابەتی هالك بانك، ترەمپ گوتی ئەردۆگان پێویستە لەگەڵم کار بکات لەسەر بابەتی سوپا (ئەردۆگان پێم دەڵێت کارێکی باش دەکەم) و منوشنیش کار لەسەر بابەتی هالك بانك بکات. پاشان ئەردۆگان سوپاسی ترەمپی کرد و وەك سەرکردەیەکی زۆر پراکتیکی وەسفی کرد. کەمێك دواتر، ترەمپ گوتی پێویستە ڕاگەیاندراوێك ئامادە بکەین و تێیدا ئاماژە بکەین کە ئێمە شەڕی دژی داعشمان بردەوە، کۆتاییمان بە ئەرکەکەمان هێنا لە سووریا، ئێستاش لەوێ پاشەکشە دەکەین. هەندێ گومان لە ئاوەزمدا هەبوو بەوەی ترەمپ دەیەوێ بابەتی کشانەوە لە سووریا وەك بەڵێنێکی هەڵبژاردن بەکار بێنێت، هاوشێوەی پاشەکشە لە ئەفغانستان، کە هەردەم ئەو قسەشی دووپات دەکردەوە. کەمێك دوای ئەوە تەلەفۆنم بۆ ماتیس کرد، شیاوی باس نییە، بەڵام ئەو بە هیچ شێوەیەك سەرسام نەبوو.

ئەمەیان کێشەیەکی کەسی بوو بۆ من. هەستم دەکرد کشانەوە لە سووریا هەڵەیەکی زۆر گەورەیە، ئەمیش لەبەر دوو هۆکار، هەڕەشەی جیهانی داعش بەردەوامی هەیە، هۆکاری دووەمیش ئەوەیە کە کاریگەریی ئێران

بێگومان زیاتر دەبێت. لە مانگی حوزەیران قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ و ماتیس کرد و پێم گوتن پێویستە سیاسەتی پارچەبووی (سووریا)مان کۆتایی پێ بهێنین، بە جۆرێك چاودێری یەك پارێزگا یان ناوچەیەك بکەین (بۆ نموونە، مەنبەج، ئیدلیب و هەرێمی دوورەدەستی باشووری ڕۆژئاوا و چەندان شوێنی دیکەش)، هەروەها پێویستە جەخت بکەینەسەر وێنە گەورەکە. لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی ناوچەیی خەلافەتی داعش کۆتایی پێ هاتبوو (بەڵام هەڕەشەی خودی داعش دوورە لەوەی ئاوا بەئاسانی کۆتایی پێ بێت)، لە کاتی ئێستادا وێنەگەورەکە بریتییە لە وەستاندنی ئێران. بەهەرحاڵ، ئێستا ئەگەر ئەمریکا کوردەکان پشتگوێ بخات، ئەوا دوو بژاردەیان بۆ دەمێنێتەوە، ئەویش یان ئەوەیە ببنە هاوپەیمانی ئەسەد و لە دژی تورکیا بجەنگن، کە کوردەکان هەر خۆیان ئەمە بە هەڕەشەیەکی گەورە دادەنێن (گەر ئەمە ڕوویدات، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئەسەد کە هەر خۆی وەکیلی ئێرانە)، یاخود ئەوەتا دەبوو کوردەکان بە تەنیا بجەنگن، کە ئەمەش دواجار نزیکەی بە شکستی خۆیان کۆتایی دێت. بۆیە لەنێوان ئەسەد و ئەردۆگان گیرمان خواردبوو، پێویستە چی بکەین؟!

سەرەتا، لە ١٨ی کانوونی یەکەمدا، ماتیس، دەنفۆرد، کۆوتس، هاسپێل، پۆمپەیۆ و من (هەندێ کەسی دیکەشمان لەگەڵ بوو) لە ژووری کۆنفراسی نێو پێنتاگۆن کۆبووینەوە نەوەك لە ژووری کۆبوونەوەکان، بۆ ئەوەی سەرنجی کەمترمان بکەوێتەسەر. بە پشتبەستن بەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەی نێوان ترەمپ و ئەردۆگان، بێگومان تورکەکان بە هەرکەسێك کە گوێیان بۆ دەگرێت دەڵێن بەرەو باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا دەچین، بە پشتبەستن بەو کەمە بەزەییەی هەیانە. ئەگەری هەڕەشەکان لەسەر خاکی سووریا مەترسیداربوو، یەك لەوانەش ئەو چەند هەزار چەکدارە بەندکراوانەی داعش بوو کە لەلایەن کوردەکان دەستبەرسەرکرابوون، بۆیە دەکرا بەگوێرەی میزاجی خۆیان هەندێ بڕیار بدەن. خەمڵاندن بۆ ژمارەی

ڕاستەقینەی بەندکراوەکان بە ژمارەی جیاواز باسی لێوە دەکرا، ئەمەش بەشێکی پەیوەست بوو بەوەی چۆن پێناسەی بەندکراوەکان دەکرا: لەوانەش ئایا ئەوانە "شەڕکەری تیرۆرستی بیانین" ، بیانی بەو مانایەی خەڵکی دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن؟ یان خەڵکی دەرەوەی سووریا و عێراقن؟ یان خەڵکانی نێوخۆیین؟ ژمارەکە هەر چەندێك بێ، ئێمە نەماندەویست ئەو خراپەکارییە بگوازنەوە ئەمریکا و ئەورووپا. لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمدا، ترەمپ پێشنیاری کرد بەندکراوەکانی داعش لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریاوە بهێنینە بەندیخانەی گوانتەنامۆی ئەمریکا، بەڵام ماتیس بەمە ڕازی نەبوو. ترەمپ دواتر سووربوو لەسەر ئەوەی وڵاتانی دیکە جەنگاوەرانی خۆیان لە کەمپە کوردییەکانەوە بگەڕێننەوە، کە ئەمەشیان هیچ لۆژیکێکی تێدانەبوو، هاوکات وڵاتانی بیانیش بەتوندی دژی ئەمە وەستانەوە و نەیاندەویست تیرۆرستان بگەڕێتەوە نێو وڵاتەکانیان. هیچ وڵاتێك ئەمەی نەکرد، بەڵام ئەم ڕژدبوونەش هیچ چارەسەرێکی پێ نەبوو. هەروەك ڕووداوەکان زیاتر بەرەوپێشچوونیان بەخۆیەوە بینی، تا ئەوکاتەشی کۆشکی سپیم جێ هێشت، هێشتا ئەو کێشەیەمان چارەسەر نەکردبوو.

دواجار، چەندی کاتی پێویستە تا ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکانی دیکە بە سەلامەتی و ڕێکوپێکی بکشێنەوە؟ کەسانی پلاندارێژەری سوپا و لەژێر سەرکردایەتی جۆزیف دەنفۆرد پێشبینیان کرد پێویست بە ١٢٠ ڕۆژ دەکات، ئەمە بێگومان بابەتێك نییە لە ٤٨ کاتژمێردا پیادە بکرێت. پرسیارم کرد ئەی ئەگەر لە بنکەی سەربازی (ئەت تەنف)ی بمێننەوە کە دەکەوێتە ناوەوەی سووریا و نزیکە لە سێگۆشەی سنووری لەگەڵ سووریا و ئوردن و عێراقدا، (نەوەك هێشتنەوەیان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا)، بۆیە هەر لەوێ هێزەکانی ئەمریکا جێگیر کران. کۆنترۆڵکردنی بنکەی سەربازی (ئەت تەنف) سەقامگیریی دروست دەکات بەتایبەتی لەو سنوورە

سەرەکییە کە خاڵی پەڕینەوەی سنووری نێوان بەغدا و دیمەشقە، هاوکات فشار دەخاتەسەر ئێران و لایەنانی دیکەش لە کاتی پەڕینەوە لە سووریاوە بۆ عێراق لە خاڵێکی دوورتر بەو ناوچەیە تێپەڕبن و بەرەو باکوور بچن. بەشێوەیەك کە جێگەی سەرسامییە، ماتیس گومانی لەسەر بنکەی سەربازی (ئەت تەنف) هەبوو، ڕەنگە ئەمەش بۆ ئەوەبێ کە ماتیس جەختی لەسەر داعش دەکردەوە نەوەك ئێران. لە ڕوانینی مندا ئێران بابەتی هەرە گرنگ بوو، هەموو ئەوکاتەشی وەك ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی کارم دەکرد سووربووم لەسەر باوەڕی خۆم و پێم وابوو بنکەی سەربازی (ئەت تەنف) بژاردەیەکی گونجاوە. لەگەڵ ئەمانەش، بۆچی لەپێناو هیچدا لەو ناوچەیە دوورکەوینەوە؟

هەروەك ئێمە ڕازیبوونی خۆمان نیشاندا، بۆیە هەریەك لە ماتیس، دەنفۆرد، پۆمپەیۆ و من دەستمان کرد بە تەلەفۆنکردن بۆ هاوپەیمانەکانمان تا خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەو ڕووداوانەی خەریکە ڕوودەدەن، هیچ ئاماژەیەکی پشتگیریی ئەو لایەنەمان بەدەست نەگەیشت. کاربەدەستانی فەڕەنسا لە شاری (سان ئیتیان)ەوە پێیان ڕاگەیاندم کە سەرۆك ماکرۆن لەسەر ئەم بریارە دەیەوێ لەگەڵ ترەمپ قسە بکات، کە ئەمە بە هیچ شێوەیەکی جێگەی سەرسامیم نەبوو. هەندێ کاردانەوەی دیکەش هەبوون کە هەموویان چاوەڕوانکراو بوون. ئەو دوانیوەڕۆیە لە کۆشکی سپی بووم کاتێ ماکرۆن پەیوەندی کرد و دڵخۆشیش نەبوو. ترەمپ بە فەرامۆشییەوە پێی گوت ئێمە لەگەڵ شەڕی داعش بە کۆتایی گەیشتین، ئێستاش تورکیا و سووریا گرنگی بە پاشماوەکانی داعش دەدەن. ماکرۆن لە وەڵامدا گوتی تورکیا جەخت دەکاتەوە لەوەی هێرش بکاتەسەر کوردەکان، هاوکات لەگەڵ (داعش)یش هەماهەنگی دەکەن. ماکرۆن تکای لە ترەمپ کرد نەکشێنەوە، گوتیشی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەتوانین سەرکەوتن بەدەست بێنین، پێویستیشە ئەم کارە کۆتایی پێ بێنین. ترەمپ ڕازیبوو

لەوەی جارێکی دیکە لەگەڵ ڕاوێژکارەکانی قسە بکاتەوە، ترەمپ پێی گوتم پێویستە لەگەڵ خەڵکانی کاربەدەستی ژێردەستی ماکرۆن قسە بکەم (ئەمەیان کارێك بوو کە پێشتر خۆم ئەنجامم دابوو)، هەروەها ماتیس و دەنفۆردیش پێویستە لەگەڵ هاوشانەکانیان لەنێو حکوومەتی فەڕەنسی قسە بکەن. نزیکەی ڕاستەوخۆ دوای ئەمە، ماتیس تەلەفۆنی کرد و گوتی کە وەزیری بەرگری فەڕەنسا- فلۆرنس پارلێی- بە هیچ شێوەیەك بەم بڕیارەی ترەمپ دڵخۆش نییە. باڵیۆزی ئیسرائیل -ڕۆن دێرمەر- بە منی گوت تا ئێستا ئەمە خراپترین ڕۆژە لە ئیدارەی ترەمپ کە من وەك ئەزموون پێیدا تێپەڕیووم.

ڕۆژی دواتر، چوارشەممە، ١٩ی کانوونی یەکەم، پۆمپەیۆ و ماتیس و من لە کاتی کۆبوونەوەی بۆ خواردنی نانی بەیانی لە وێست ڕووم، زۆربەی قسەکانمان لەسەر سووریا بوو، ڕازیش نەبووین لەسەر ئەو گفتوگۆیە فراوانەی ڕۆژی پێشتر لەنێو پێناگۆن کردبوومان. چەندان هەواڵی ڕۆژنامەوانی لەسەر دروست کرا، کە پڕبوون لە زانیاری ناتەواو، کە من پێم وایە زۆرینەی ئەمانە لە ڕێگەی پێنتاگۆن و هاوپەیمانەکانیان لەنێو کۆنگرێسدا ڕوویدا. هەر ئەو ڕۆژە بەڵام لە کاتێکی دواتردا، ترەمپ ڤیدیۆیەکی تویت کرد کە ڕوونکردنەوەی خۆیشی لەگەڵ نووسیبوو، ڕۆژنامەنووسان و داواکارییەکانی کۆنگرێس کۆشکی سپی تەنیبوو، کە تیایدا جگە لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، کەچی ترەمپ هێشتا جەختی لەسەر دروستکردنی دیواری سنووریی لەکەڵ مەکیسك و هەندێ بابەتی دیکە پەیوەست بە کۆچبەران دەکردەوە. کۆمارییەکانی نێو کۆنگرێس بەنزیکەیی هەموویان لە دژی بڕیارەکەی ترەمپ بوون بۆ کشانەوە لە سووریا، بەڵام زۆربەشیان گوتیان خۆمان لە میدیا بەدوور دەگرین، ئەمەیان ڕێگرییەك بوو کە دیموکراتەکان هەمان شتیان نەکرد. ڕەزامەندیی هەڵەی کۆمارییەکان بەرامبەر سیاسەتەکانی تایبەت بە ئاسایشی نەتەوەیی، هەرچۆنێك بێت نەیتوانی یارمەتی ئەمریکا یان خودی پارتی

کۆمارییەکانیش بدات. من دەربارەی کاردانەوەی نەرێنی (فیۆنا هێڵ)[1] م ئاگەدارم کردنەوە، بەڵام ترەمپ بڕوای پێ نەکرد، چونکە پشتی بەستبوو بەوەی سەردانەکەی (پۆڵ ڕاند) بۆ ڕووسیا تەنیا گوزارشتی لە بنچینەی ڕاستەقینەی پارتەکەی کردووە. هەروەك بڵێی ئەمە هێشتا بەس نییە، تورکیا ئەمجارەیان پاسەوانێکی نیشتیمانیی ویلایەتی تێکساسی دەستگیرکرد کە لە بنکەی ئینجەرلیك لە نزیك (ئەدەنە) لەکاردابوو (ئەم کێشەیە پێچەوانەی ئەوەی قەشە برۆنسن بەخێرایی چارەسەرکرا).

تا ڕۆژی پێنجشەممە، ترەمپ بەهۆی بڕیاری کشانەوەی لە سووریا دووچاری هێرشی میدیاکاران ببووەوە و زۆریش بێزاربوو، کە هەموو ئەمانە بەشێك بوون لەو ڕووداوانەی چاوەڕوان دەکرا ڕووبدەن ئەگەر هاتوو بەتەواوی لە ئەفغانستانیش بکشابایەوە. ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕەی کارێکی ژیرانە نییە گەر (دوابەروار)ێك بۆ کشانەوە دابنێین، بەڵام سووربووین لەسەرئەوەی کە پێویستە بەگوێرەی خشتەی کارەکان و بە ڕێکوپێکی پاشەکشە بکەین. سوپای تورکیا لەمبارەیەوە یارمەتییەکی باشی پێشکەش کرد. تورکەکان باش دەیانزانی پێویستە گفتوگۆی سەربازی (سوپا لەگەڵ سوپا) ڕێك بخرێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئەو گواستنەوەی دەسەڵاتە ئەنجام بدرێ لەنێو ناوچەیەکی بێیاسا و کۆنترۆڵنەکراودا بەرلەوەی ئەو ڕادەستکردنەوەی ترەمپ دەیەوێ بتوانێ سەرکەوتوو بێت. ئەم گفتوگۆیانە پێویستی بە کاتە، لە ڕاستیشدا شاندی ئەمریکی پلانیان دانابوو تەنیا لە ئێوارەی دووشەممەی ڕۆژی کریسمسی هەفتەی داهاتوو سەردانی ئەنکەرە بکەن.

ئەو ئێوارەیە، زانیم کە ماتیس بە تەنیا لەگەڵ ترەمپ لە کۆشکی سپییە، ئاهەنگی واژووکردنی بڕیارێك لەلایەن سەرۆکەوە کە بەگوێرەی خشتەی

---

(١) فیۆنا هێڵ، ڕاوێژکاری سەرۆك ترەمپ بوو، لە ساڵی ٢٠١٩ دا کاتێ ویستیان دادگایی ترەمپ بکەن، وەك شایەتحاڵێك لەنێو کۆشکی سپییدا لێدوانی دا.

کارەکان دانرابوو، زۆر بە درەنگی دەستی پێ کرد. هەروەك ئێمە قسەمان دەکرد، ماتیس هاتەدەرەوە، ترەمپیش یەکسەر بەدوای ئەودا هات. یەکسەر زانیم شتێك هەیە. ماتیس وادیاربوو شۆك بوو کاتێ بینی من وا چاوەڕێم، بەلام بەبێ دەربڕینی ووشەگەلێکی زۆر تەوقەی لەگەڵ کردم. ترەمپ گوتی: "جۆن وەرە ژووەرەوە"، من چوومە ژوورەوە و تەنیا ئێمە دوو کەس لەنێو کۆشکی سپی بەیەکەوە بووین. ترەمپ گوتی: "ماتیس دەست لە کار دەکێشێتەوە". "لە ڕاستیدا، من هەرگیز حەزم پێی نەکردووە."

دوای ئاهەنگی واژووکردنی بڕیارەکە، لەگەڵ ترەمپ نزیکەی بیست خولەك قسەمان کرد لەوەی چۆن شوێنی ماتیس پڕبکەینەوە. ترەمپ دەیویست تویتێك بلاوبکاتەوە بەرلەوەی مەککەینەی پەیوەندییە گشتییەکانی ماتیس بکەویتەکار. ماتیس نامەیەکی درێژی دەستلەکارکێشانەوەی دابوو بە ترەمپ و تیایدا ڕوونی کردبووەوە بۆچی واز لە کارەکەی دێنێ، بێگومان نامەکەی بۆ ئەوەبوو نووسیبوو تا لەنێو تەواوی خەڵکدا بلاوبێتەوە، کە لە ڕاستیدا ترەمپ هەر نەیخوێندەوە. لەبری ئەمە، هەر ئاوا بەئاسانی لەسەر مێزی ڕیزولوت بەجێی هێشت، کە لەوکاتەدا بۆ واژووکردنی بڕیارەکەی پێشتر لابرابوو. کاتێ نامەکەمان خوێندەوە، من سەرسام بووم بەوەی ماتیس دەیەوێ تا کۆتایی مانگی شوبات خزمەت بکات، ئەو ماوەیەی ماویەتی دەیەوێ وەك وەزیری بەرگری لەبەردەم کۆنگرێس شایەتی بدات و لە کۆبوونەوەی وەزیرانی ناتۆ لە مانگی شوباتدا بەشداری بکات و قسە بکات. ئەمە تەنانەت جێگەی سەرسامی زیاتری ترەمپ بوو، لەکاتێکدا دوا گفتوگۆی خۆی لەگەڵ ترەمپ بەباشی باسکردبوو و جێگەی ڕەزامەندی ترەمپ بووە، کەچی ئێستا سیاسەتەکانی ترەمپ ڕەتدەکاتەوە. من بۆ ترەمپم ڕوونکردەوە کە بەپێی ئەو خشتەی کارەی دانراوە بە هیچ شێوەیەك ناکرێ کاری لەگەڵ بکەین، دڵنیاش نەبووم ئاخۆ لەو قسەیەم تێگەیشتووە یان نا!

بەهەرحاڵ، ترەمپ بەردەوام قسەی دەربارەی ئەوە دەکرد کە چەندە ڕقی لە ماتیس بووە. دواتر گوتی: "من دڕندەیەکم دروستکرد کاتێ ناوم لە ماتیس نا سەگی شێت"، ئەم قسەیەی تا ڕادەیەك ڕاستیی تێدا بوو. (نازناوی ڕاستەقینەی ماتیس بریتیبوو لە "ئاژاوە"). دواتر لە کاتژمێر ٥:٢٠ ئێوارەدا گەڕامەوە نووسینگەکەم تا تەلەفۆن بۆ پۆمپەیۆ بکەم، دوای ئەمەش تویتەکەی ترەمپ بڵاوبوویەوە و هێرشی خێرای ماتیس لە کۆنگرەی ڕۆژنامەوانیدا دەستی پێ کرد. پۆمپەیۆ لە کاتی چوونی بۆ کۆشکی سپی لەلایەن دەوڵەتەوە ڕێگری لێ کراوە و کۆپییەکی نامەی دەستلەکارکێشانەوەی بە من دا. ماتیس گوتی: "سەرۆك ترەمپ چیتر بایەخ بە من نادات. ئەمە قسەی خۆیەتی کە چیتر پێویستی بە من نییە. بۆیە ئێستا کاتی جێهێشتنە." پێم وابوو هەموو ئەو قسانە ڕاست بوون، پۆمپەیۆش هەمان باوەڕی هەبوو و ڕازیبوونی خۆی نیشاندا.

هەموو ئەو هەڵایەی لەسەر ماتیس هەبوو، بێگومان کاریگەرییان لەسەر ڕووداوەکانی سووریا و ئەفغانستان هەبوو، بەتایبەتی بەوەی ماتیس وای کرد ترەمپ بڕیاری پاشەکشە لە سووریا بدات و هەر ئەمە هۆکاری سەرەکی دەستلەکارکێشانەوەکەشی بوو. لەگەڵ ئەمانەش، بابەتی پڕکردنەوەی شوێنی ماتیس هەر ئاوا مابوویەوە. تا ڕۆژی شەممە، دوو ڕۆژ دوای کۆبوونەوەکەی ماتیس لەگەڵ ترەمپ لە کۆشکی سپیدا، ترەمپ دەوروبەری کاتژمێر ٦ی ئێوارە پێی گوتم کە تا مانگی شوبات ناوەستێ تا ماتیس دەست لە کار دەکێشێتەوە و بۆیە بڕیاری داوە جێگری وەزیری بەرگری (پات شانەهان) بۆ شوێنی ماتیس دابنێت. (لەو بابەتەدا، ترەمپ دوودڵ بوو لەوەی پات شانەهان یان ژەنەڕاڵی خانەنشین جاك کین بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێرێ). لەگەڵ ئەمانەش، ترەمپ دەیەوێ ماتیس ئێستا ڕاستەوخۆ دەستهەڵبگرێت، نەوەك تەنانەت ڕۆژی دووشەممە بێنە پێنتاگۆن. من گوتم ئەوکاتە نزیکەی هاوکاتە لەگەڵ جەژنی کریسمس، ترەمپیس گوتی" هەتا

سێشەممە جەژنی کریسمس نییە، بۆیە پێویستە ئەمڕۆ لە کارەکەی دووری بخەینەوە."

لە ڕۆژی یەکشەممە ٢٣ی کانوونی یەکەم، بەر لە تەلەفۆنەکەی ترەمپ لەگەڵ ئەردۆگان لە کاتژمێر ١٠ بەیانیدا، من پێشتر قسەم لەگەڵ ترەمپ کرد. ترەمپ گفتوگۆیەکی باشی لەگەڵ پات شەنەهان کردبوو و پێی وابوو کەسێکی زۆر گونجاوە. ترەمپ دەیویست بزانی بۆچی لە ڕووبەڕووبوونەکانی پێشتری لەگەڵ پات شەنەهان ئەوەندە پێی سەرسام نەبووە. ترەمپ هەر خۆی وەڵامی خۆی دایەوە و گوتی: "شەنەهان لەلایەن ماتیسەوە لەنێو پێنتاگۆندا بێدەنگ کرابوو و بەسەریدا زاڵ بوون"، ترەمپ گوتیشی: "خودی شەنەهان تۆ و پۆمپەیۆی خۆش دەوێ." لە ١ی کانونی دووەمدا و سەرەتای کارکردن لە ساڵی تازەدا، هێشتا مانەوەی بابەتی ماتیس بەدیاریکراوی تا ٣١ کانوونی یەکەم هەر وەك خۆی مابووەوە، کەچی ترەمپ دیسانەوە هاواری لێ هەستا و گوتی دەیەوێ ڕاستەوخۆ لە کارەکەی دووری بخاتەوە. منیش گوتم با بزانم دەتوانین چی بکەین و دواتر ڕاستەوخۆ تەلەفۆنم بۆ شەنەهان کرد، ناوبراویش لەگەڵ خێزانەکەی لە ویلایەتی سیاتڵ بوو. من پێشنیارم کرد، جەژنی کریمیس بێ یان نا، پێویستە هەر ئێستا بەخێرایی بگەڕێتەوە واشنتۆن. هەروەها تەلەفۆنم بۆ جۆزیف دەنفۆردیش کرد، ئەوکاتە تازە لە بنکەی ئاسمانی بەگرام لە ئەفغانستان دادەبەزی. پێم گوت چی دەربارەی سووریا لەگەڵ ئەردۆگان باسکراوە، هەورەها بابەتی (ماتیس)یش، کە تیایدا ناوبراو ئەمەی بەرزنرخاند چونکە پێی وابوو هیچ کەسێکی ئەو هەواڵەی پێنتاگۆنی نەگەیاندووە. من جۆزیف دەنفۆردم دڵنیاکردەوە کە ترەمپ دەیەوێ لەپۆستەکەی وەك سەرۆکی ئەنجوومەنە هاوبەشەکە بمێنێتەوە، کە من خۆم دەستم لەمەدا هەبوو. بەڵام ئەوەی پێشبینم دەکرد ڕاست دەرچوو، لەوەی ناوبراو کەسێکی گونجاوە دەتوانێ ئەو هەڵایەی دەستلەکارکێشانەوەی

ماتیس دروستی کردبوو، هێوری بکاتەوە. بەلایەنی کەم بۆ کاتی ئێستا، وادیاربوو ئێمە دیسانەوە خۆمان ڕێکخستبووەوە و ئامادەین.

بەڵام سووریا هێشتا لە ڕەوشێکی ناسەقامگیردابوو. تا کۆتایی هەفتەکە، ترەمپ بڕیاری دا تەلەفۆنێکی دیکە بۆ ئەردۆگان بکات لەپێناو دوو خاڵ: یەکەم، نابێ هێرش بکرێتە سەر هیچ هێزێکی ئەمریکی لە سووریا. دووەم: دڵنیام کەرەوە کە هێرش دەکەیتە سەر داعش نەوەك کوردەکان، هەردوو خاڵەکە ڕاست و دروست بوون، بەڵام کاتەکە هەندێك دواکەوتبوو، بەتایبەتی دوای ئەو تەلەفۆنەی دواجار بۆ ئەردۆگانی کردبوو و خەڵکی عەوام پێیان زانیبوو. بۆیە، دوای سڵاوکردن و قسەکانی پێشەکی، ترەمپ گوتی، یەکەم، ئەردۆگان ویستی لە داعش ڕزگاری ببێ و گەر تورکیا پێویستی پێ بوو ئەوا ئێمەش یارمەتی بۆ دابین دەکەین. دووەم، فشاری خستووەتەسەر ئەردۆگان کە دوای کوردەکان نەکەوێ و نەیانکوژێت، تێبینی بکە کە خەڵکێکی زۆر کوردەکانیان خۆش دەوێ بەرامبەر ئەوەی چەندین ساڵە لەگەڵ ئێمە لە دژی داعش جەنگاون. تورکیا و کورد پێویستە بەیەکەوە بەدوای چەکدارانی داعش بچن و لە دژیان بجەنگن. ترەمپ زانی کە ئەم جۆرە ستراتیژییەتە لەوانەیە وەك گۆڕانێك بێت بۆ ئەردۆگان، بەڵام دیسانەوە جەختی لەسەر ئەو پشتگیرییە کرد کە لەنێو ئەمریکادا بۆ کوردەکان هەیە. ترەمپ دواتر هاتەسەر باسێك کە بابەتێکی یەکلاییکەرەوە بوو: ئەویش ڕوانین بوو لە بابەتی بازرگانی فراوانتری ئەمریکا لەگەڵ تورکیادا. ئەردۆگان ئازاری خۆی دا کاتێ گوتی من کوردەکانم خۆشدەوێ و ئەوانیش بەهەمان شێوە منیان خۆش دەوێ، بەڵام گوتیشی هێزەکانی یەپەگە -پەیەدە- پەکەکە (سێ گرووپی کوردی کە لە تورکیا و سووریان، ئەو نۆ پیتەی بەشێوەیەك گۆ کرد وەك بڵێی ناوی خۆی دەهێنێت)، ئەمانە فێڵ لە کوردەکان دەکەن و فریویان دەدەن، بە هیچ شێوەیەك گوزارشت لە کوردەکان ناکەن. ئەردۆگان ئاماژەی بۆ

حکوومەتەکەی کرد کە لەنێویدا چەندان ئەندام پەرلەمان و وەزیری کورد هەن، هەربۆیە کوردەکان خۆشەویستی و هاوسۆزییەکی تایبەتیان بۆ من هەیە، تەنانەت من تاکە سەرکردەم کە توانیم بانگەشەی گەورەی هەڵبژاردن لە ناوچە کوردییەکان بەرپابکەم. ئەردۆگان گوتی: "من هیچ نیازێکم نییە کوردەکان بکوژم، ئەوانەی من دەیانکوژم تیرۆریستن". ئێمە پێشتر گوێبیستی هەموو ئەمانە بووین، ئەمە لایەنی ستانداردی پڕوپاگەندەی ڕژێمەکەی ئەردۆگانە.

هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن؟!! ئەوە چ تکاکردنێکە لە ترەمپ! لەو خاڵەدا، هەستمان کرد ئەردۆگان کەوتووەتە تەڵەی کوردەکانەوە -کوردەکان ئەوانەی ئەردۆگان لەلایەك دەیویست قڕیان بکات و لەلایەکی دیکەش هەندێکیان هەروەك خۆی گوتەنی خۆشیان دەوێ و دەیانەوێ گوێبستی دەنگی بن- ئەم هەڤدژییە کاری ئێمە نەبوو، بەڵام دەمانویست یارمەتی ئەردۆگانی پێ بدەین. ترەمپ لە منی پرسی کە بۆچوونم لەسەر قسەکانی ئەردۆگان چییە؟ لەو ساتەوەختەدا، من گوتم پێویستە ئەمە بۆ گفتوگۆی سەربازیی نێوان ئێمە و ئەوان جێ بهێڵین تا جیاوازی بکەن لە نێوان ئەوەی کێ تیرۆرستە و کێش تیرۆرست نییە. هەستی ئەوکاتەم ئەوەبوو کە پێدانی ڕوونکردنەوە بۆ ئەم پرسیارە بەدڵنیاییەوە ناگا بە هیچ شوێنێك، بۆیە دواخستنی پاشەکشەمان لە سووریا پێ پەسەندتر بوو.

ئێوارە و ڕۆژی جەژنی کریسمس بەبێدەنگی تێپەڕبوو. لە کاتژمێر ٩:٤٥ خولەکی شەو، من و بریکارە نهێنییەکەم بەرەو بنکەی (ئەندرۆس) چووین، لەوێدا لەژێر پارێزبەندی سەرووئاسایی هێزەکانی ئاسایش، ترەمپ و خانمی یەکەمی ئەمریکا و کۆمەڵێکی بچووك لە کەسانی دیکە سواری فڕۆکەی سەربازی سەرۆکایەتی ئەمریکا بوون تا بەرەو عێراق بچین (بەگوێرەی کاتی واشنتۆن ئەو گەشتە هەشت کاتژمێری دەخایەند). من سەرخەوێکم شکاند، دواتر وەئاگا هاتم تا ببینم هێشتا کەشی گەشتەکە

تێکنەچووە و ڕەوشی ئاسایش تەواو بەرقەرارە، بەمەش دەتوانین بۆ گەشتەکەمان بەردەوام بین کە بەرەو بنکەی ئاسمانی (ئەلئەسەد) بوو لە عێراقدا، لەوێدا لەنێو پێشبینییەکان، چاوەڕوان دەکرا چاومان بە سەرۆك وەزیران عادل عەبدولمەهدی و چەندان بەرپرسی باڵای دیکە بکەوێت. ترەمپیش زوو لە خەو هەڵسا، لە عێراقیش کاتەکەی دوای نیوەڕۆ بوو، کاتێکی بەرچاومان بە قسەکردن لە نووسینگەی بەسەر برد و هێشتا هەندێ کەس لەوێ بەئاگابوون. لەو نێوەندەدا زۆر قسەمان کرد، هەر لەوەی (چی قسەیەك بۆ هێزە سەربازیی و دەریاییەکانمان بکەین لە بنکەی ئەلئەسەد، قسەکردن لەسەر گوتارەکەی ترەمپ لە کۆبوونەوەی ساڵانەی وڵاتان، ناردنی پیرۆزبایی بۆ شی جینگ پینگی سەرۆکی چین، هەروەها قسەکردن لەسەر ئەوەی ئاخۆ ترەمپ خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئاشتی وەردەگرێت).

ترەمپ بابەتێکی دیکەشی باسکرد ئەویش ئەو دەنگۆیە سیاسییەی کە گوایە ترەمپ (مایك پێنس)ی جێگری لە هەڵمەتەکانی ساڵی ٢٠٢٠ دووردەخاتەوە و لەبری ئەو (نیککی هالێی) جێگەی دەگرێتەوە، لەمبارەیەوە پرسیاری بۆچوونی منی کرد. لەنێو کۆشکی سپی دەنگۆیەکی باو هەبوو بەوەی (ئیڤانکا)ی کچی و (کۆشنەر)ی زاوای ئەو مامەڵەیەی ترەمپیان پێ خۆشە، کە ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ کۆتاییهاتنی ئەرکی نیککی هالێی وەك باڵیۆزی ئەمریکا لە یوئێن لە کانوونی یەکەمی ٢٠١٨دا، بەمەش ڕێگە بە نیککی دەدرێت هەندێ کاری سیاسی لە تەواوی وڵات بکات بەرلەوەی ناوی بخرێتە نێو ڕکابەرییەکانی ساڵی ٢٠٢٠. گفتوگۆی سیاسی لە بەرژەوەندیی هالێی بوو بەوەی پێیان وابوو هالێی دەتوانێ دەنگی ئەو ژنانە بباتەوە کە دەنگیان بە ترەمپ دابوو. بەپێچەوانەش هەندێکی دیکە دەیانگوت مەسیحییە پرۆتێستانتەکان لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٢٠ چیدی کە پشتگیری لە مایك پێنس دەکەن، بۆیە

گەر نیککی هاڵێی شوێنەکەی بگرتایەوە، ئەوا هیچ مەترسییەك لەسەر دەنگەکانیان نەبوو. منیش لەلای خۆمەوە ڕوونم کردەوە کە ئەوە بیرۆکەیەکی خراپە بتەوێ کەسێکی دڵسۆز پشتگوێ بخەی، بێگومان ئەو دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەو خەڵکەی پێویستی پێیانە (کێ دەتوانێ لە ماڵەوە بمێنێتەوە، تەنانەت ئەوانە گەر دەنگ بە ڕکابەرەکەی ترەمپیش نەدەن)، بۆیە پێویست ناکا تەنیا لەپێناو شوێنگرتنەوە پشتگیری تازە پەیدا بکرێ. وادیاربوو بیرکردنەوەی ترەمپیش هەر بەو شێوەیە بێت.

دەوروبەری کاتژمێر ٧:١٥ ئێوارە بە کاتی نێوخۆی عێراق لە بنکەی (ئەلئەسەد) دابەزین، خەریك بوو کەشەکە تەواو تاریك دەبێ و توندترین ڕێوشوێنی ئاسایش گیرابووەبەر. لە فڕۆکەی سەربازی سەرۆکایەتی دابەزین و سواری چەندان ئۆتۆمۆبێلی بەرزی سەربازی بووین تا بەرەو ئەو چادرگەیە بچین کە لەوێدا دەبوو چاومان بە فەرماندە ئەمریکییەکان بکەوێت. هەروەك بۆ ماوەیەکی باش بەڕێوەبووین، دڵنیانەبووین ئاخۆ عادل عەبدولمەهدی دێتە دیدەنیمان یان نا. لەبەر هۆکاری ئاسایش و پاراستن، ناوبراو کەمتری ئاگەداری پێدرابوو، بەڵام گوێبیست بووین کە فڕۆکەیەك لە بەغداوە بەڕێوەیە، دیسانەوە دڵنیا نەبووین ئاخۆ عادل عەبدولمەهدی تێدایە یان نا. سەرۆك و خانمی یەکەمی وڵات لەنێو ئەو چادرگەیەدا سڵاویان لێ کردن. مێز، کورسی و ئاڵای ئەمریکا ڕێکخرابوون، هەرلەوێدا ژەنەراڵی سوپا پۆڵ لاکەمارا، فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی چارەسەری بۆماوەیی (لە عێراق و سووریا)، فەرماندەی هێزی ئاسمانی دان کەین (ناسراو بە ڕەیسین)، جێگری فەرماندە و چەندان کەسایەتی دیکەش ئامادەبوون. من دەمویست هەندێ زانیاری زیاتر لەسەر (ئۆپەراسیۆنی چارەسەری بۆماوەیی) نێو ئیدارەی ترەمپ بەدەست بێنم، بۆیە فەرماندە لاکەمەرا خستەلاوە و پێم گوت جەختی زیاتر لەسەر ئەو هەڕەشەیە بکەوە کە لە سووریا و عێراق دا هەیە، شانبەشانی ئەو پلانەی بۆ خۆتان داتاناناوە.

ئەگەر پێویست بێ یەك لایەن هەڵبژێرم لەنێو ئەوکاتەی کە سوپای ئەمریکا لە سووریا بوونی هەبووە و خزمەتی کرد (بەلایەنی کەم ئەوکاتەی کە دواساتی کارەکانم بوو لە کۆشکی سپی)، ئەوا بەم شێوەیە خوارەوە دەبێ: دانیشتن لەنێو ئەو چادرەدا، لەسەر مێزێکی کۆنفرانس لە تەنیشت سەرۆکی وڵات و خانمی یەکەمی وڵات، تەواوی ئەوانی دیکەش لەلایەکەی تر وەستابوون. دوای ئەنجامدانی مەشقێکی ناچاری لەبەرچاوی میدیاکاران، پاشان میدیاکاران لە دەوربەری کاتژمێر ٨ی ئێوارە ئەوێیان جێ هێشت، لاکەمارا و دۆستەکانی دەستیانکرد بەقسەکردن لەسەر ئەو بابەتەی کە من دڵنیابووم ئەمە دەبێتە کورتەیەکی ستاندارد لەسەر ڕووداوەکان، لەکاتێکدا کە ئەوان قسەیان دەکرد، سەرۆك ترەمپیش گوێی لێ گرتبوون. ئەو فەرماندانە تا ڕادەیەك سەرسامبوون! لاکەمارا گوتی: "ڕوون و ئاشکرایە کە ئێمە دەبێ لە سووریا دەربچین"، دواتر ترەمپ بەهۆی پرسیار و لێدوانەکانی قسەکانی ناوبراوی بڕی. لاکەمارا لەیەکێك لە خاڵەکانی گوتی "من دەتوانم ئامانجەکانم لە سووریا بپارێزم لەوکاتەی کە پاشەکشە دەکەین، من هەر لێرەوە لە عێراق دەتوانم ئەو کارە بکەم." ترەمپ گوتی من بە ئەردۆگانم گوتوە کە نابێ هێرش بکاتەسەر هێزەکانمان لە سووریا، کاتێ ترەمپیش پرسیاری کرد، لاکەمارا و کەین ئەوەیان ڕوونکردنەوە کە لە ئێستادا چۆن ڕووبەرووی داعش وەستاونەتەوە. دواتر ترەمپ پرسیاری کرد: "ئایا بەو ڕێگەیە دەتوانن کۆتایی بە داعش بهێنن؟" ئەوانیش هەردووکیان گوتیان بەڵێ سەرۆك دەتوانین. ترەمپ دواتر گوتی: "ئەوە فەرمانی منە، ئێرە لەو داعشانە پاك بکەنەوە." لاکەمارا دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی ئەمریکا چەند ساڵەیە بەدوای ئەوەیە "توانای هاوبەش" بنیات بنێت، بەڵام ترەمپ قسەکانی بڕی و گوتی من چەندجارێك جەختم لەسەر درێژکردنەوەی کاتەکە کردووەتەوە بۆ کۆتاییهێنان بە داعش و بێزاریش بوومە ئەوەندەی شەڕی داعش بکەم.

پاشان ترەمپ پرسیاری کرد: "دەتوانین چی بکەین بۆ پاراستنی کوردەکان؟" منیش خۆم خستە نێو بابەتەکان و بە فەرماندەکانم گوت سەرۆك ترەمپ بەڕوونی بە ئەردۆگانی گوتووە کە نامەوێ هیچ زیانێك بە کوردەکان بگات کە لە سووریا یارمەتی ئێمەیان داوە. لاکەمارا و کەین ڕوونیان کردەوە کە لە ماوەی دوو تا چوار هەفتەی داهاتوودا دەتوانین کۆتایی بە دەسەڵاتی خەلافەتی ناوچەیی داعش بهێنین. ترەمپیش گوتی" کەواتە بیکەن، ئێستا ڕەزامەندیی ئەو کارەتان وەرگرتووە". پرسیاری ئەوەشی کرد بۆچی ماتیس و ئەوانی دیکە نەیانتوانیووە لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا ئەو کارە تەواو بکەن. ترەمپ باوەڕی ئەوەی لا دروست بوو کە زۆرێك لەو زانیارییانە یەکەم جارە گوێبیستیان دەبێ، کە لەوانەیە/لەوانەش نییە ڕاست بێت، بەڵام ئەوە ڕوانینی خۆی بوو.

لەگەڵ ئەوەی گفتوکۆکان بەردەوامی کێشا، لاکەمارا گوتی کە بنکەی ئاسمانی ئەلئەسەد شوێنێکی زۆر گرنگە و دەتوانین لێرەوە فشار بخەینەسەر ئێران. ترەمپ بەشێوەیەك کە بیەوێ بەدوای زانیاری بگەڕێت، پرسیاری کرد و گوتی: "مانەوە لە عێراق و فشاری زیاتر دەخەنەسەر ئێران؟" باڵیۆزی ئەمریکا بۆ عێراق دۆگلاس سۆلیمان بە جەختکردنەوە گوتی: "بەڵێ"، لاکەمارا و ئەوانی دیکەش ڕازیبوونی خۆیان نیشاندا. ترەمپ کۆتایی بە کۆبوونەوەکە هێنا بە گوتنی ئەوەی کە دەمەوێ "پاشەکشەیەکی نەفرەتییانەمان" لە سووریا هەبێ و پێشی وابوو مانەوەی ئەمریکا لە عێراق لەبەر چەند هۆکارێك پێویستییەکی سەرەکییە. منیش هەوڵم دا چانسی خۆم تاقی بکەمەوە، بۆیە پرسیارم لە لاکەمارا و کەین کرد بەوەی باوەڕتان چییە لەسەر مانەوەی هێزەکان لە بنکەی (ئەت تەنف). لاکەمارا گوتی: "هێشتا هیچ ڕاپۆرتم بە بەرپرسەکانی سەرووی خۆم نەداوە" کاتێ قسەکانیم بڕی و گوتم ئەی ئەو باردۆخانە چی لێدێ تا هەڵمەتی بەرایی هەڵبژارنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٢٠دا،

لاکەماراش بۆ ستایشی کەسیی خۆی، بەخێرایی وەك بلێی قسەکانی چاکردەوە و گوتی پێویستە هێزەکان لە بنکەی ئەت تەنف جێگیر بکەین. ترەمپیش وەڵامی دایەوە و گوتی: "باشە، تۆش دواتر لەسەر خشتەی ئەم کارە بڕیار دەدەی." ترەمپ و خانمی یەکەمی ئەمریکا کەمێك دواتر چوونە نێو ئەو ئاپۆڕایەی نزیك چادرگەکە تا چاویان بەو خەڵکانە بکەوێ کە لەوێدا خزمەت دەکەن، هاوکات ستیڤن میلەر، سارا ساندەرز و من لەتەك لاکەمارا و کەین و فەرماندەکانی تر وەستاین بۆ نووسینی ڕاگەیاندراوێك کە دەمانتوانی بۆ خەڵکی عەوامی بڵاوبکەینەوە. نووسیمان کە سەرۆك ترەمپ و فەرماندەکان "گفتوگۆیان لەسەر پاشەکشەیەکی بەهێز، ڕەچاو بۆکراو و ڕێکوپێك لەلایەن ئەمریکا و هێزەکانی هاوپەیمانان لە سووریا کرد، هاوکات جەختکردنەوە لەسەر گرنگیی مانەوەی ئەمریکا لە عێراق بۆ ڕێگریکردن لە دووبارە سەرهەڵدانەوەی داعش و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر ئەو هەڕەشانەی داعش هەیەتی"، هەمووشمان ڕازی بووین لەوەی ئەو ڕاگەیاندراوە کورتکراوەیەکی گونجاوی کۆبوونەوەکەیە. پێم وابوو دەرئەنجامەکە زۆر باشە و بە دڵی ئێمە دەبێ، نەك هەر بۆ ئەوەی گەیشتینە بڕیاری کۆتایی لەمەڕ چالاکیی سەربازی ئەمریکا لە سووریا، بەڵکو لەبەر ئەوەی ترەمپ بەم کارەی وەك بلێی سوپاسگوزارییەکی جیاوازی خۆی نیشاندا بەرامبەر ئەو کارانەی خەریکی بووین و هەر بۆیە ئەمە زۆر گرنگ بوو. ئەم پرۆسەیە چەند کاتی دەوێ؟ ئەمەیان پرسیارێکی دیکە بوو، بەڵام من پلانم دانابوو گۆڕانکاری بکەم و خودی دەربڕینەی ترەمپیش بەهێز و سەرنجڕاکێش بوو. هاوکات، بۆچی ڕاوێژکارەکانی ترەمپ پێشتووتر وایان نەکردووە ترەمپ خەریکی عێراق و ئەفغانستان بێت؟ لەم بابەتەدا بەنزیکەیی هەموومان شکستمان هێناوە.

تا ئەوکاتەی ڕەشنووسی ئەو ڕاگەیاندراوەمان تەواوکرد، دەرکەوت کە

سەرۆك وەزیران عادل عەبدولمەهدی نایەت، ئەمەشیان هەڵەیەکی گەورەی ناوبراو بوو. ڕاوێژکارەکانی باوەڕیان پێ هێنابوو کە جوان نییە سەرۆك وەزیرانی عێراق لە بنکەیەکی سەربازی ئەمریکییەکان چاوی بە سەرۆك ترەمپ بکەوێت، سەرەڕای ئەوەی ئەو بنکەیەکی ئێمە بەتەواوی لەلایەن بنکە سەربازییەکانی عێراقەوە دەور درابوو (کە ڕۆژانێك ئەوانیش هەر هی خۆمان بوون). لەبری دیتن، پەیوەندییەکی تەلەفۆنیی باش لەنێوانیان ئەنجام درا، ترەمپیش ناوبراوی داوەت کرد بۆ کۆشکی سپی کە ئەمەیان ئاماژەیەکی ئەرێنی بوو. دواتر ئێمە بەرەو (هەنگەر[1])ێك چوون، لەوێدا ترەمپ قسەی بۆ سەربازەکان کرد و بەپەرۆشییەوە بەخێرهاتنی لێ کرا. تەنانەت ئەوانەی بەرامبەر وڵاتەکەمان بێهەستن و لەسەر گەورەیی ئەمریکا بۆچوونی جیاوازیان هەیە، بەڵام بەهۆی ئەو پەرۆشی و گەشبینی و گیانی بەهێزی ئەو سەربازانەی خزمەت دەکەن بەڕاستی دووچاری ورووژان دەبن، لەکاتێکدا ئەوانە لە ناوەڕاستی بیابانێکی عێراقدان. ئەمەیان بەڕاستی ئەو "چارەسەرە بۆماوەییەیە" کە لەنێو خوێن و گۆشتنی ئەمریکییەکاندا هەیە. ئەم کەرنەڤاڵە تەقریبەن لە دەوروبەری کاتژمێر ١٠:٢٥ خولەك کۆتایی هات، دواتر بەرەو بەشی دواوەی فڕۆکەی سەربازی-سەرۆکایەتی چووین و بەرەو بنکەی ئاسمانی ڕامستین لە ئەڵمانیا بۆ پرکردنەوەی بەنزینی فڕۆکەکە بەڕێ کەوتین.

تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆ کرد تا زانیاری لەسەر ئەو سەردانەی عێراق پێ بدەم و دواتریش قسەم لەگەڵ شەنەهان و جۆزیف دەنفۆرد کرد (کە ناوبراو شەوی پێشتر بنکەی سەربازیی ئەلئەسەدی بەجێ هێشتبوو و ئێستاش لە پۆڵەندا بوو). لە کاتژمێر ١:٤٥ خولەکی شەو بە کاتی ئەڵمانیا لە بنکەی

(١) هەنگەر، شوێنێکە لەنێو فڕۆکەخانە و بنکە سەربازییەکاندا کە فڕۆکەکانی لێ رادەوەستێ و کاروباری چاککردنەوەی فڕۆکەکانیشی تێدا ئەنجام دەدرێ.

ئاسمانی ڕامستن دابەزین، لەوێش چاومان بە فەرماندە ئەمریکییەکان کەوت، دواتریش بەرەو هەنگەرێك چووین کە ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەوێ خزمەتیان دەکرد، چاوەڕوانیان دەکرد تا چاویان بە فەرماندەی گشتیی هێزە سەربازییەکان (مەبەست لە ترەمپ)ە بکەوێ و کاتەکەش دووی نیوەشەو بوو. ترەمپ تەوقەی لەگەڵ کردن و چەندان سەربازیش وێنەی سێلفییان لەگەڵ گرت لەودیو ئەو هێڵەی بنکەکە دیاریی کردبوو. دواتر سواری فڕۆکەی سەربازی سەرۆکایەتی خۆمان بووینەوە و بەرەو بنکەی (ئەندرۆس)ی ئەمریکا گەڕاینەوە، بەدیاریکراوی لە ڕۆژی ٢٧ مانگ و لە کاتژمێر ٥:١٥ خولەکی بەرەبەیاندا نیشتینەوە، بیست خولەکیش لە کاتی خشتە بۆ دانراوی خۆمان دواکەوتین.

هەر ئەو ڕۆژە بەڵام دوای نیوەرۆکەی ترەمپ پەیوەندیی پێوە کردم و داوای کرد بەگوێرەی ئەو "پلانە دوو هەفتەییە"ی باسیان کرد بەخێرایی کۆتایی بە دەسەڵاتی ناوچەیی خەلافەتی داعش لە سووریا بهێنین. منیش گوتم ئەوەی من لە زاری لاکەمارا و کەین گوێبیستی بووم "دوو یان چوار هەفتە" بوو، هەرچەندە ناڕەزایی دەرنەبڕی، بەڵام هەرچۆنێك بێ گوتی: "با هەر بڵێین پلانی دوو هەفتە". من بە کورتی زانیاریی زیاترم بە (دەنفۆرد)دا، تێگەیشتم لەوەی دوای ڕۆیشتنی ماتیس، دەنفۆرد دەتوانێ ئەو شێواوییە چارەسەر بکات، بەتایبەتی کۆمەڵێك لەو کارانەی ترەمپ بە کاری پێشینەی دەزانی، لەوانەش (کشانەوە لە سووریا، تێکشکاندنی داعش، پاراستنی کوردەکان، بڕیاردان لەوەی چۆن چارەی بنکەی ئەت تەنف بکەین، بەندکراوەکان ئازاد نەکرێن، هەروەها فشاری زیاتر بخەینەسەر ئێران). ئەمانە تەقینەوە و قسە و کاردانەوەی بێ بیرکردنەوەی سەرۆکایەتین، نەوەك ستراتیژیەتێکی یەکگرتوو و ڕاست، بەڵام پێویستمان بە هەموو وردەکارییەك هەبوو بۆ دیاریکردنی ڕێگەکەمان تا دەرئەنجامێکی دڵڕازیکارمان دەستکەوێ. ئەوەی دەنفۆرد و من و

شانبەشانی چەند کەسێکی دیکە لێی دەترساین، گەڕانەوەی داعش بوو بۆ ئەو ناوچانەی پێشتر کۆنترۆڵی کردبوون، بۆیە دیسانەوە ئەم هەڕەشەیە دەبێ بە بنەمایەك بۆ ئەنجامدانی هێرشی تیرۆرستی لە دژی ئەمریکا و ئەوروپادا.

هەروەها، دەمویست دەسەڵاتی ئێران کەم بکەمەوە و نەیەڵین هیچ دەستکەوتی زیاتری هەبێت، ئەمەیان بابەتێك بوو کە وادیاربوو ماتیس هەرگیز نەیکردبووە پێشینەی کارەکانی، بەڵام دەنفۆرد باشتر لەمە تێدەگەیشت. بۆیە لەگەڵ دەنفۆرد پلانێکمان بەرەوپێشبرد تا هەموو ئەو کارە لەپێشینانە لەخۆ بگرێت، هەرچەندە زەحمەتبوو، بەڵام زۆر لە سەرووی شێوازی کارکردنی (ماتیس)ەوە بوو، ماتیس هەمان ئەو باوەڕەی نەمابوو کە دەبێ لە سووریا بکشێینەوە. ماتیس لە کردارەکانییدا کینەی بەرامبەر سەرۆك هەبوو و تەواو پێچەوانەی ئەو قسەیەی ترەمپیش وەستایەوە کە گوتی: "پێویستە ڕاستەوخۆ لە سووریا بکشێینەوە". لەوکاتەی ئەردۆگان باوەڕی وابوو: "کوردی باش تەنیا ئەو کوردانەن کە مردوون"، بۆیە هەڵمەتە فراوانەکانی لە دژی ئەردۆگان بوون. دەنفۆردیش پێی وابوو ئامانجی سەربازیی ڕاستەوخۆی تورکیا لە سووریا، ئەوەیە کوردەکان لەو ناوچانە دەرکەن کە دەکەونە سنووری نێوان تورکیا و سووریا، دواتریش سەدان هەزار پەنابەری سووری لە تورکیاوە بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ناوچە سنوورییەی کە لەئێستادا خەڵکێکی زۆر ڕووی تێ کردبوو. دەنفۆرد پێشنیاری دروستکردنی بنکەیەکی کرد تایبەت بە هێزە چاودێریکارەکانی ناتۆ، بە جۆرێك لەلایەن هەواڵگریی و چاودێریی و پشکنینی پێشوەختە و ڕووماڵی ئاسمانیی ئەمریکاوە پشتگیری بکرێت، هاوکات هاوشێوەی ژمارە تەلەفۆنی فریاگوزاری ئەمریکا ناسراو بە (٩١١) توانای ئەوەی هەبێ هەرکاتێ ئەو هێزە چاودێریکارانە دووچاری کێشە بن، بتوانێ دەستوەردان بکات و بەهانایانەوە بێت، لەگەڵ ئەمانەش هێزەکانی ئەمریکا کەمترین

ئامادەگییان لەسەر زەمین هەبێ. من هەروەها دڵخۆش بووم بەو قسەیەی دەنفۆرد کە ڕازیبوو هێزەکانی ئەمریکا لە بنکەی ئەت تەنف بمێننەوە، چونکە ماتیس بەمە ڕازی نەبوو. پێم وایە ڕێگەیەکی ڕوون لەبەردەممان هەبوو.

دەنفۆرد پێشنیاری کرد دەیەوێ بەشداری ئەو گەشتەم بکات کە لە سەرەتای کانوونی دووەمدا وا پلانم بۆ دانابوو بچم بۆ تورکیا و دوای ئەمەش لەوێ دەمێنێتەوە تا قسە لەگەڵ بەرپرسانی سەربازیی تورکیا بکات، منیش ڕازیبوونی خۆم نیشاندا. بەم ڕێگەیە تورکەکان گوێبیستی پەیامی یەکگرتووی ئەمریکا دەبن، بەمەش دەتوانین ئەو ئیستغلالە کەمتر بکەینەوە کە تورکیا لە بۆچوونی جیاوازی بەرپرسە جیاوازەکانی ئەمریکا کردوویەتی، چونکە ئەمە هەردەم ستراتیژیەتێکی پەسەندی حکوومەتی بیانییە. دەربارەی ئەو گفتوگۆیانە، کورتەیەکم بە پۆمپەیۆ دا، پێم گوت ئێمە ڕێگرییمان لە دەرئەنجامێکی زۆر خراپ کردووە لە سووریا و ئێستاش هەنگاو دەنێین بۆ دامەزراندنی شتێکی ورد و کرداری. پۆمپەیۆ دەیویست دڵنیابێ کە نێردەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ گرتنەدەستی کاروبارەکانی سووریا لەو کۆبوونەوانەی بڕیارە لە تورکیا بکرێ، ئامادەبێ. منیش بە دوودڵییەوە ڕازیبوونی خۆم نیشاندا. ئەمە لەبەرئەوەبوو کە هەر پۆمپەیۆ خۆی دوو ڕۆژ پێش ئەو (جەژنی کریسمس)ە پێی گوتم جیمز جێفری، باڵیۆزی پێشووتری ئەمریکا بۆ تورکیا "حەز بە چارەی کوردەکان ناکات، هێشتاش تورکیا وەك هاوبەشێکی باوەڕپێکراوی ناتۆ دەبینێ". ئەمەیان ئاماژەی ڕوون بوون بەوەی "زەحمەتی لە مامەڵەکردنی بەرپرسەکان لەگەڵ یەکتری"یدا هەیە، ئەمەیان دەردێکە لەنێو وەزارەتی دەرەوەدا بوونی هەیە و هەمیشە ڕوانینی دەرەکی زۆر گرنگتر بووە لە ڕوانینەکانی خودی دەوڵەتی ئەمریکا. پۆمپەیۆ، شەنەهان، دەنفۆرد و من ڕازی بووین لەسەر ئەوەی شتێك لە یەك لاپەرەدا بنووسین بەناوی

"نووسراوێك دەربارەی پرەنسیپەکان"ی سووریا تا خۆمان لە (هەڵەتێگەیشتن) بەدووربگرین، وەزارەتی دەرەوەش ئەمەیان زۆر پێ گرنگ بوو.

سەرکردەی زۆرینەی ئەنجوومەنی پیران میتچ ماککۆنێل تەلەفۆنی بۆ کردم کە خەریك بوو بەرەو ئیسرائیل دەچووم، ئەمەیان یەکەم وەستانم بوو بەرلەوەی بچم بۆ تورکیا. ناوبراو بۆ ئەوە تەلەفۆنی کردبوو تا بلێت "تۆم لە خەیاڵ بوو" تا لەبارەی سووریا و ئەفغانستان قسەت لەگەڵ بکەم، تێبینیم کردووە ئاگادارییەکی زۆر لە ئاستی بەرزدا لەنێو ئەنجوومەنی پیران لەهەمبەر ئەو بەرەوپێشچوونە هەنووکەییانە لەئارادایە. منیش گوتم ئامانجی سەرەکیی ئەو چوونەم بۆ ئەوەیە تا بە ڕاستوڕەوانی پێیان بڵێم ئێمە بەتەمای چین لە سووریا. لە ڕاستیدا، لە کۆبوونەوەیەکی تۆمارکراو لەگەڵ میدیاکارێك کە گەشتی لەگەڵم کردبوو، لە ڕۆژی یەکشەممە بەرواری ٦ی کانوونی دووەم، لەنێو هۆتێلی (کینگ دەیڤد) لە ئیسرائیل گوتم: "ئێمە پێشبینی دەکەین ئەوانەی شانبەشانی ئێمە لە سووریا جەنگان، ئەوانەی لە بەرەی ئۆپۆزسیۆنن و بەتایبەتیش کوردەکان، هەروەها هەموو ئەوانەشی شانبەشانی ئێمە شەڕیان کردووە، بە کشانەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان ژیانیان ناخەینە مەترسییەوە. ئەمەیان خاڵێکە سەرۆك ترەمپ زۆر بەڕوونی لەگەڵ سەرۆکی تورکیا ئەردۆگان باسی کردووە". لە ڕاستیدا ئەمە ئەو قسەیە بوو کە ترەمپ خۆی ئاماژەی پێ دابوو، ئەمە هەر ئەو قسەیە بوو کە منیش لە ئیسرائیل دووپاتم کردەوە. هەر هەمان ڕۆژ بە کاتی واشنتۆن، بەڵام دواتر، لەکاتێکدا خەریك بوو سواری کۆپتەری سەرۆکایەتی دەبوو بەرەو کامپ دەیڤد دەچوو، دەربارەی قسەکانی (من) پرسیاریان لە ترەمپ کرد، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: "جۆن بۆڵتن ئێستا هەروەك خۆتان دەزانن لەوێیە (ئیسرائیل). من خاوەن دوو ئەستێرەی گەورەم. جۆن بۆڵتن و مایك پۆمپەیۆ خەریکی ئەوەن کاری گەورە ئەنجام دەدەن. ئەو دووانە زۆر

بەهێزن و کاری زەحمەت ئەنجام دەدەن... لە داهاتوودا هەندێ هەواڵی خۆشمان بەدەست دەگات: "بێگومان، ئەوەش ڕاستبوو کە تورکەکان دوای خوێندنەوەی ئەمە و ئەو لێدوانەی دیکەش کە لە ئۆرشەلیم دام و کۆبوونەوەم لەگەڵ سەرۆك وەزیران نەتەنیاهۆ کرد، باوەڕی خۆیان گۆڕی. بەڵام دەستپێکی ئەم گەشتەمان لەوێوە دەستی پێ کرد.

لە ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەم و لە دەوروبەری کاتژمێر ١١:٤٥ خولەکی شەو ترەمپ تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی "تۆ هێشتا بەخەبەری، وانییە؟" کە بەدڵنیاییەوە ئەوکاتە بەئاگا نەبووم. کەسێك پێی گوتبوو کە تورکەکان بەو لێدوانا جیاوازانەی بۆ میدیاکانم داوە دڵخۆش نین. بێگومان، من هیچ شتێکی زیاترم نەگوت لەوەی کە ترەمپ بە ئەردۆگانی گوتبوو. لەگەڵ ئەوەش، ترەمپ لەمیانەی ئەو تەلەفۆنە کورتەی چەندین جار گوتی: "ئامانجی سەرەکیم ئەوەیە لە سووریا بکشێینەوە"، ئەمەش مانای وایە سەردانیکردنی تورکیا بەدڵنیاییەوە کارێکی پێکەنیناوی دەبێ. لە ڕاستیدا، ڕۆژی دواتر، ئەوکاتەی لە ئۆرشەلیمەوە گەشتمان کرد بەرەو تورکیا، باڵیۆزخانەی ئەنکەرە گوێبیستی ئەردۆگان ببوون لەوەی زۆر بێزار بووە و لەوانەیە ئەو کۆبوونەوەیە پلانی بۆ دانرابوو لەگەڵ من ئەنجام بدرێ، هەڵبوەشێنێتەوە. لەنێو بازنەی دیپلۆماسییدا، ئەمەیان شتێکی لاوەکییە، بەڵام بۆمی سەلماندی کە ئەو سیاسەتەی بۆ سووریا هەمانە بەگوێرەی ڕوانینی ئەمریکییەکان کارێکی ڕاستە، ئەگەر تورکەکانیش پێیان ڕاست نەبێ.

دوای ئەوەی کاتژمێر ٤:٣٥ خولەکی ئێوارە بە کاتی نێوخۆی ئەنکەرە گەیشتمە ئەنکەرە، پۆمپەیۆ تەلەفۆنی کرد تا پێم ڕابگەیەنێت کە ترەمپ دڵتەنگە لەهەمبەر ئەو هەواڵەی لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز بڵاوبووەتەوە، تیایدا زیاتر لە لێدوانێکی هەڵەی بڵاوکردووەتەوە، باسی ئەو هەڤدژیانەی کردووە کە لەنێو سیاسەتی ئەمریکا بۆ سووریا هەمانە، ئەو قسانەشیان بە پشتبەستن بە لێدوانی بەرپرسانی ئیدارەی ترەمپ نووسیوە. بێگومان،

چەندان قسەی دژ تەنانەت لەلایەن خودی ترەمپیش گوتراوە، پۆمپەیۆش ڕازیبوونی خۆی نیشاندا و دانی بەوەدا نا کە هەندێ لێدوانی داوە (بۆ نموونە، گوتوومە کە ڕێگە نادەین تورکەکان "کوردەکان کۆمەڵکوژ بکەن"، ئەمەیان هەرچەندە بایەخی میدیایی زۆری لەسەر نەبوو، بەڵام بەدڵنیاییەوە بووەتەهۆی بێزاربوونی تورکەکان). من و پۆمپەیۆ ڕازی بووین لەسەر ئەوەی پێویست ناکا باڵیۆزخانەی ئێمە داوای کۆبوونەوە لە ئەردۆگان بکات و دەشمانزانی تازە گەیشتبووینە ساتەوەختێکی حەتمی، کە تیایدا خواستی ترەمپ بۆ پاشەکشە لە سووریا لەگەڵ ئەو لێدوانەی یەك ناگرێتەوە، کە بۆ پاراستنی کوردەکان دابووی. ئەمەیان بابەتێکە ئەردۆگان قبووڵی نەدەکرد. نزیکەی کاتژمێری دواتر ترەمپ پەیوەندیی پێوە کرد. ترەمپ پەست بوو لەوەی باسی ئەو بیروڕا جیاواز و هەڤدژانە کراوە کە لەنێوخۆی ئیدارەکەی هەیە، بەڵام زیاتر نیگەرانی ئەوەبوو ئاخۆ وەزارەتی بەرگری هێشتا بە جددی کاردەکەن لەسەر ئەو "پلانەی بۆ دوو هەفتە" دانرابوو تا شکست بە خەلافەتی داعش بهێندرێت. منیش پێم گوت پێویستە تەلەفۆن بۆ شەنەهان بکات تا دڵنیایی زیاتری دەستکەوێ و گوتیشم من لە ماوەیەکی کەمدا چاوم بە جۆزیف دەنفۆرد دەکەوێ لە ئەنکەرە و شوێنی ئەو دەکەوم.

ڕۆژی دواتر، بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە، ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست بە نابەدڵییەوە نووسیبوویان کەوا ترەمپ و جۆن بۆڵتن لەسەر بابەتی ڕووسیا هەمان بیرکردنەوە و باوەڕیان هەیە، ئەمەیان بە نابەدڵی کردبوو، چونکە ئەو هەواڵەیان پێچەوانەی هەواڵەکەی ڕۆژی پێشووتریان بوو. هەموو ئەو هەواڵە شێواوانەی ڕوومالّی میدیاکاران گوزارشت لە ناجێگیریی بیرکردنەوەی خودی ترەمپ دەکات لەلایەك، لەلایەکی دیکەش گوزارشت لەوە دەکات کە ئەو میدیاکارانە پشت بە سەرچاوەی هەواڵی دەستی دوو و سێ دەبەستن، لەژێر سەرکردایەتی سەرۆکێك خراپتریش

بووە کە کاتێکی زۆری تەرخان کردووە بەوەی سەیری دەکات کەوا چۆن ئیدارەکەی خراوەتە بەر نەشتەری ڕوومالّی میدیاکارانەوە. زەحمەتە وەسفی ئەو سیاسەتە ئالّۆزە بکەیت لەو بەشە شەڕانگێزەی جیهان کە هەر خودی سیاسەتەکە شیاوی ئەوەیە بەردەوام گۆڕانکاری تێدا بکرێ، ئەمەش پشت بە تێگەیشتنی سەرۆك دەبەستێ لەو زانیارییانە ئاخۆ تا چەند ورد و نوێن کە لەلایەن نووسەرانێك بڵاو دەکرێنەوە کە بە هیچ شێوەیەك بەرژەوەندییە باڵاکانی ئەمریکایان لەلا ئەولەویەت نییە و لەنێو دڵیاندا نییە. ئەمە وەك ئەوەیە سیاسەتێك لەسەر مێزی یاریکردن جێبەجێ بکەی، نەوەك لەنێو نووسینگەکانی سەرۆك لەنێو کۆشکی سپی دایبڕێژی و جێبەجێ بکرێت.

لەو نێوەندەدا، پێچەوانەی ئەو نووسراوەی لەسەر پرەنسیپەکان لە یەك لاپەڕەدا نووسیبوومان، جیمز جێفری نەخشەیەکی هێنابوو کە بە ڕەنگاوڕەنگی کۆدەکانی لەسەر دیاری کردبوو، تیایدا ئەوەی نیشان دەدا کە تورکیا دەتوانێ کام بەشی باکووری ڕۆژهەلاتی سووریا بگرێتە دەست و کوردەکانیش لە کام شوێنانە دەتوانن بمێننەوە. دەنفۆرد بە هیچ شێوەیەك حەزی لەوە نەبوو کە لەو نەخشەیەدا نیشاندرابوو. پرسیارم لێی کرد چی دەبێ ئەگەر ئامانجەکەمان ئەوەبێ نەیەڵین تورکیا لەولایەی سنووری خۆی کە هاوتەریبە لەگەڵ سووریا و ڕۆژهەلاتی ڕووباری فورات بمێننەوە، دەنفۆرد گوتی بەدڵنیاییەوە ئەمە هەمان باوەڕی منیشە. من گوتم دەمویست ببینم و بزانم باکووری ڕۆژهەلاتی سووریا هەروەك ئێستا ئاوا گەورە و فراوانە، بەڵام بەبێ ئامادەیی هێزەکانی ئەمریکا، پێم وایە ئەو "ئەرکە زەحمەت دەبێ"، بەڵام بەلایەنی کەم با ئەوە ئامانجەکەمان بێ تەنانەت گەر نەشمانتوانی بەدەستی بێنین. دەنفۆرد لەسەر ئەمەش ڕازیبوونی خۆی نیشاندا. لەم خاڵەدا، ئیدی جێمز جێفریش ڕازیبوو، دواتریش چووینە سەر ئەو نووسراوە یەك لاپەڕەییەی لەسەر پرەنسیپەکان نووسیبوومان تاکو

بتوانین بیدەین بە تورکیا. من ڕستەیەکی دیکەم بۆ زیاد کرد تا ڕوون بێتەوە کە ئێمە وەك ئەمریکا نامانەوێ ببینین کوردەکان بەشێوەیەکی خراپ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، ئێش و ئازار قبووڵ بکەن تا پێمان نیشانبدەن کە هەبوونی تورکەکانیان لەو ناوچەیەدا قبووڵ نییە، جا بەشێوەی سەربازی یان بەهەر جۆرێکی دیکە بێت، بەدیاریکراوی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریادا. دەنفۆرد و جێفری ڕازیبوونی خۆیان لەسەر ئەم نووسراوە نیشان دا، تیایدا ئەم نووسراوە شانبەشانی نەخشەکەی جێفری لەسەر بەرەوپێشچوونەکانی ئەو ناوچەیە، تەنانەت دوای ئەوەی کۆشکی سپیشم جێ هێشت، کەچی هێشتا ئەم دووانە وەك بەرژەوەندییەکی پاکی مێژوویی ڕەچاویان بۆ دەکرێت.

بەشێوەیەك کە جێگەی سەرسامی نییە، ئەردۆگانی پێی ڕاگەیاندین کە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ (من) هەڵوەشاندووەتەوە، چونکە دەبوو لەنێو پەرلەمانی تورکیا گوتارێك پێشکەش بکات. هەروەك دواتر زانیمان، گوتارەکەی ئەردۆگان هێرشێکی پلان بۆ دارێژراو بوو بۆ سەر ئەو قسانەی بەناوی ئەمریکا درکاندبووم. ئەردۆگان یەك ئینچ لەسەر سووربوونی خۆیان لای نەدابوو بەوەی پێی وابوو تورکیا دەستی کراوەیە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا، ئێمەش گەر بمانەوێ تۆڵە لە کوردەکان نەکاتەوە، ئەوا نابێ ڕێگە بەمە بدەین. ئەردۆگان بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئەم قسانەی وەك هەڵمەتی هەڵبژاردن کردبوو (چونکە کاتەکەی ڕاستەوخۆ پێش هەڵبژاردنەکانی شارەوانییەکانی نێوخۆ بوو، کە هەر زوو ڕێژەی پشتگیریکارانی ئەردۆگان زۆر کەم ببوویەوە). ئەردۆگان گوتیشی: "هیچ تەنازولێك لەمەدا ناکەین، بە هیچ شێوەیەك قەرەبووی ئەمە ناکرێتەوە". لە کاتی گەڕانەوەم، قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد تا لەسەر ئەو کۆبوونەوەی تورکیا زانیاری پێ بدەم. هەردووکمان ڕازی بووین لەوەی کە کوردەکان لەگەڵ تورکەکان لە "ململانێ"ن و پێویستە لەمبارەیەوە "زۆر وریا" بین.

پۆمپەیۆ گوتی مەولوود چاوشئۆغلۆی وەزیری دەرەوەی تورکیا هەوڵیداوە پەیوەندیم پێوەبکات و پێم بڵێت:" یەك بژاردەتان لەبەردەستە. یان ئەوەتا دەبێ ئێمە لە سنووری خۆتان قبووڵ بکەن، یاخود ئەوەتا دەبێ ڕووسیی و ئێرانییەکان قبووڵ بکەن (کە بەدڵنیاییەوە لەگەڵ پاشەکشەی ئێمە ئەوان بەرەو باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا دەچن). منیش پێم گوت ئەمە قسەیەکی تەواوە.

دواتر، پەیوەندیم بە ترەمپیش کرد تا زانیاری پێ بدەم. ترەمپ پێی وابوو چەند مانگێك پێش ئێستا تورکیا ئامادە بوو سنووری سووریا ببەزێنێت، هەر لەبەر ئەمەش بوو دەیویست لە سووریا بکشێتەوە و بەرلەوەی تورکیا هێرش بکاتە سەر کوردەکان کە هێشتا خەڵکی ئێمەی ئەمریکیش لەوێ بوونیان هەیە. ترەمپ زیاتر گوتی: "ئەردۆگان گوێ بە داعش نادات"، ئەم قسەیەی ترەمپ ڕاستبوو، هەروەها گوتیشی ئەمریکا تەنانەت دوای کشانەوەش لە سووریا هەر توانای ئەوەی دەبێ زەبر بە داعش بگەیەنێت، ئەم قسەیەشی هەر ڕاست و دروست بوو. ترەمپ زیاتر قسەی لەسەر گوتارەکەی کرد کە ئەو ئێوارە دەبوو لەسەر دروستکردنی دیواری سنووری لەگەڵ مەکسیك پێشکەشی بکات، کە ئەمە یەکەم گوتاری کابینەکەی بوو لەوەتەی هاتبووە کۆشکی سپییەوە. دواتر گوتیشی: "تەنیا هیچ لایەنێکی لاوازی خۆمان و هەر شتێکی ئەم بابەتە نیشان مەدە"، وەها قسەی دەکرد وەك بڵێی تێنەگەیشتووە کە باسی ئەو ڕووداوانەی بۆ دەکەم کە پێشتر ڕوویان داوە. ترەمپ گوتیشی: "ئێمە نامانەوێ لە شەڕێکی نێوخۆیی ئێوە بگلێین. تورکیا و کوردەکان دوژمنی سروشتیی یەکترن. تورك و کوردەکان ماوەی چەند ساڵێکە لە دژی یەکتر شەڕ بەرپادەکەن. ئێمە تێکەڵ بەو شەڕە نێوخۆییە نابین، بەڵام ئێمە کۆتایی بە داعش دەهێنین".

لەو نێوەندەدا، دەنفۆرد تێگەیشتبوو لەوەی فەرماندە سەربازییەکانی تورکیا

هیچ بەرژوەندیەکی ئەوتۆیان نییە بچنە نێو سووریا لەچاو ئەردۆگان، هاوکات بەدوای ئەوەش بوون هەندێ هۆکار بدۆزنەوە تا خۆیان بەدوور بگرن لە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە باشووری سنووری تورکیا، لە هەمان کاتیشدا دەیانگوت کە تورکیا لە هێرشی تیرۆرستان دەپارێزین. دەنفۆرد گوتی: "ئەم سنوورە بۆ تورکەکان هەمان ئەو سنوورەیە کە ئێمە لەگەڵ مەکسیکییەکان دروستی دەکەین و وەك هۆرمۆنێکە بۆ بەهێزکردنی لەش". دەنفۆرد هەر لەسەر نووسراوی پرەنسیپەکە کاری دەکرد، بۆیە پێشنیاری دروستکردنی ناوچەیەکی بێلایەنی کرد کە ٢٠ بۆ ٣٠ کیلۆمەتر فراوان بێت، کە تیایدا چەکە قورسەکانی دەست کوردەکان دەبێ لابدرێت و پێویستە لەلایەن هێزێکی نێودەوڵەتی کە زۆرینەیان سەر بە (ناتۆ)ن چاودێری بکرێت، ئەمە دڵنیایی دەدات کە کوردەکانیش هێرش ناکەنەسەر تورکیا و بە پێچەوانەشەوە، هەروەك پێشتر لە واشنتۆنیش گفتوگۆمان لەسەر کردبوو. ئەمریکا بەردەوام دەبێ لە دابینکردنی چاودێریی ئاسمانی و تواناکان بۆ گەڕان و ڕزگارکردن بۆ هێزە نێودەوڵەتییەکان، من و دەنفۆردیش بڕوامان وابوو ئەمە وادەکات بەردەوام چاودێریی ئاسمانی باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا بکەین. هەرچەندە دەنفۆرد فشاری نەخستەسەر ئەمە، چونکە ئێمە لەژێر فەرمانی ترەمپ لە بنکەی ئەلئەسەد لە عێراق مابووینەوە، هەر ئەمەش وادەکات ئەگەر پێویست بکات بەخێرایی بتوانین بگەڕێینەوە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا و بەزەبری هێز دژی هەر مەترسییەکی ڕاستینەی داعش بوەستینەوە. لەوکاتەی ئەولەویەتی ڕاستەقینەی ئەردۆگان بۆ سیاسەتەکانی نێوخۆ بوو، بۆیە بە ڕوانینی من ئەم ئامادەکارییانە بەگوێرەی پێویست بوو. ئێستا دەبوو قەناعەت بە ئەوروپییەکان بهێنین تا ڕازی بن، بەڵام کێشەی داهاتووش بوو. لەکاتێکدا دەمانویست لەو کۆتوبەندییە ڕزگارمان بێت، یان بیرۆکەیەکی باشتر بەرەو پێش ببەین کە لەوانەیە پێویستی بە چەند مانگێك

بێ، کەچی ئەرگیومێنتێکی باشم هەبوو دەربارەی ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات بمێننەوە.

بۆ کوردەکانیش، جیمز جێفری ئەو بیرۆکەیە بە فەرماندەکەیان کە (ژەنەڕاڵ مەزڵووم عەبدی)یە ڕادەگەیەنێت، تا بزانێت ئەویش کاردانەوەی چی دەبێت. دەنفۆرد کەسێکە بڕوای بە چارەنووس هەیە، بڕوای وابوو کە بژاردەکانی مەزڵووم عەبدی زۆر سنووردارن، ئێستاش بەدوای هەندێ دڵنیاییەوەیە. دواتر قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد، ئەویش پێی وابوو ئەمە بیرۆکەیەکی تەواوە تا شوێنی بکەوین و پێویستە لایەنەکانی دیکەی ئەو ناوچەیەش پشتگیریی لێ بکەن. وڵاتە عەرەبەکان تورکیایان خۆش ناوێ، خاوەن سەرچاوەی ئابوورین کە ئەمە وادەکات ئاسانتر هاوپەیمانانی ناتۆ و وڵاتانی دیکەش پاساوی ئەوەیان پێ بدەن تا لەنێو ئەو هێزە هەمەنەتەوەییەی بۆ چاودێریکردن دروست دەکرێ، بەشداری بکەن. هەڵگرتنی ئەو فشارە لەلایەن لایەنەکانی دیکە بەتایبەتی وڵاتانی ئەندامی ناتۆ، ترەمپ بەردەوام جەختی لێ دەکردەوە، هاوکات بیرۆکەیەکی ڕاستیشە. لەساڵی ١٩٩٠-٩١ و لە کاتی هەبوونی ململانێ لە کەنداوی فارس، جۆرج بوشی باوك بەهۆی داواکردنی یارمەتی لەو وڵاتانەی لەو ململانێیە سوودمەند ببوون توانی لایەنی دارایی شەڕەکە فەراهەم بکات، بەتایبەتیش هەردوو وڵاتی کوەیت و سعودیەی عەرەبی، هەروەها هەندێ وڵاتی دوورەدەستی سوودمەندی دیکەش، نموونەش وەك ژاپۆن. ئەم کارە ڕەنگە جۆرێك لە ئیحراجی تێدابووبێ، بەڵام کاری خۆی کرد، هیچ کەسێکیش نەیگوت کارێکی ناپەسەند و ناوزڕاو بووە. هیچ هۆکارێکیش نییە بەوەی دیسانەوە ئەو شێوازە نەخەینەوەگەڕ.

من بەردەوام بووم لە ڕوونکردنەوەی ئەم مامەڵەیەمان لە سووریا بۆ ترەمپ. لە کۆشکی سپی و لە ٩ی کانوونی دووەمدا، دەنفۆرد پریزنتەیشنێکی پڕ لە وردەکاری پێشکەش کرد لەسەر ئەوەی بۆچی هەبوونی هێزێکی

بێ، کەچی ئەرگیومێنتێکی باشم هەبوو دەربارەی ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەلاتی ڕووباری فورات بمێننەوە.

بۆ کوردەکانیش، جیمز جێفری ئەو بیرۆکەیە بە فەرماندەکەیان کە (ژەنەڕاڵ مەزلووم عەبدی)یە ڕادەگەیەنێت، تا بزانێت ئەویش کاردانەوەی چی دەبێت. دەنفۆرد کەسێکە بڕوای بە چارەنووس هەیە، بڕوای وابوو کە بژاردەکانی مەزلووم عەبدی زۆر سنووردارن، ئێستاش بەدوای هەندێ دڵنیاییەوەیە. دواتر قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد، ئەویش پێی وابوو ئەمە بیرۆکەیەکی تەواوە تا شوێنی بکەوین و پێویستە لایەنەکانی دیکەی ئەو ناوچەیەش پشتگیریی لێ بکەن. وڵاتە عەرەبەکان تورکیایان خۆش ناوێ، خاوەن سەرچاوەی ئابوورین کە ئەمە وادەکات ئاسانتر هاوپەیمانانی ناتۆ و وڵاتانی دیکەش پاساوی ئەوەیان پێ بدەن تا لەنێو ئەو هێزە هەمەنەتەوەییەی بۆ چاودێریکردن دروست دەکرێ، بەشداری بکەن. هەڵگرتنی ئەو فشارە لەلایەن لایەنەکانی دیکە بەتایبەتی وڵاتانی ئەندامی ناتۆ، ترەمپ بەردەوام جەختی لێ دەکردەوە، هاوکات بیرۆکەیەکی ڕاستیشە. لە ساڵی ١٩٩٠-٩١ و لە کاتی هەبوونی ململانێ لە کەنداوی فارس، جۆرج بوشی باوك بەهۆی داواکردنی یارمەتی لەو وڵاتانەی لەو ململانێیە سوودمەند ببوون توانی لایەنی دارایی شەڕەکە فەراهەم بکات، بەتایبەتیش هەردوو وڵاتی کوەیت و سعودیەی عەرەبی، هەروەها هەندێ وڵاتی دوورەدەستی سوودمەندی دیکەش، نموونەش وەك ژاپۆن. ئەم کارە ڕەنگە جۆرێك لە ئیحراجی تێدابووبێ، بەڵام کاری خۆی کرد، هیچ کەسێکیش نەیگوت کارێکی ناپەسەند و ناوزڕاو بووە. هیچ هۆکارێکیش نییە بەوەی دیسانەوە ئەو شێوازە نەخەینەوەگەڕ.

من بەردەوام بووم لە ڕوونکردنەوەی ئەم مامەڵەیەمان لە سووریا بۆ ترەمپ. لە کۆشکی سپی و لە ٩ی کانوونی دووەمدا، دەنفۆرد پریزنتەیشنێکی پڕ لە وردەکاری پێشکەش کرد لەسەر ئەوەی بۆچی هەبوونی هێزێکی

نێودەوڵەتی لەو ناوچە بێلایەنە کە دەکەوێتە باشووری سنووری تورکیا دەتوانێ کارێکی باش بکات، هاوکات ئەمە وادەکات خۆمان بەدوور بگرین لەوەی بە قووڵی کوردەکان و ئەو هاوپەیمانانە نەخەینە مەترسییەوە کە لە دژی داعش دەجەنگن، پێویستیش ناکا ئاماژە بە ناوبانگی نێودەوڵەتیی خۆشمان بکەین. دەنفۆرد ئێستا بە ڕژدی داکۆکی لە مانەوەی هێزەکانی ئەمریکا دەکرد لە بنکەی (ئەت تەنف)، کە هاوکات پادشا عەبدوڵڵای ئوردنیش لە کاتی سەردانەکەی سووربوونی خۆی لەسەر ئەمە بۆ پۆمپەیۆ نیشاندابوو، جێگەی باسە هەرچەند زیاتر ئێمە لەو بنکەیە بمێنینەوە، ئەوا ئوردن زیاتر پارێزراو دەبێ لەوەی ململانێکانی سووریا بپەڕێتەوە نێو ئوردن. ترەمپ خۆشحاڵ بوو کە "پلانە دوو بۆ چوار هەفتەیەکە" بۆ کۆتاییهێنان بە داعش بەردەوامە، لەگەڵ ئەوەش ئەو هەر پێشبینی دەکرد لە ماوەی دوو هەفتەدا دەرئەنجامەکان ببینێت، کە ئەمەش ڕوویندا. وادیاربوو ترەمپ قەناعەتی هاتبوو، بەڵام هەر بەردەوام بوو لەوەی بۆچی ماتیس نەیتوانیووە سەرکەوتن لە ئەفغانستان و سووریا بەدەست بێنێت. دواتر ترەمپ دەیویست بزانێ بۆچی تەنانەت دوای بەشداریکردن لە شەڕی کۆریا لە ساڵانی ١٩٥٠کاندا، کەچی ئێمە هێشتا هەر لەوێ بوونمان ماوە، هەروەها ڕەخنەشی گرت لە مشەخۆریی و بێئەمەکیی هاوپەیمانە جیاوازەکانمان لە تەواوی جیهاندا. هەر تەنیا بۆ ئەوەی وەك ڕاستییەك تۆمار بکرێت، چەندان جار لەگەڵ ترەمپ گفتۆگۆم کردووە و پێم گوتووە کە مێژووی دابەشبوونی نیمچەدوورگەی کۆریا لە ساڵی ١٩٤٥دا، سەرهەڵدانی کیم سۆنگی دووەم، شەڕی کۆریا و گرنگیی جەنگی سارد -هەروەك دەزانی هەموو ئەمانە شتگەلی کۆنن و لە ڕابردوو بەجێ ماون- بەڵام من بەو قسانەم وادیاربوو هیچ کاریگەری و گۆڕانکارییەکم لەسەری دروست نەکردبوو. ئێمە بەردەوام لەنێو بازنەی ئەو قسە دووبارانە دەخولاینەوە، هەردەمیش هەمان دەرئەنجاممان هەبوو.

هەموو چەند ڕۆژ جارێك، کەسێك لەخۆوە و لەلایەك پلی بە دوگمەیەکەوە دەنا، ترەمپیش هەمان ئەو قسانەی وەك فیلمێك دووبارە دەکردەوە.

دەنفۆرد کارێکی باشی کرد کاتێ خۆی بەرگری لە خۆی دەکرد و منیش کەمترین بەشداریم هەبوو لەو گفتوگۆیەی نێوانیان، چونکە پێم وابوو واباشترە ڕێگە بدەم ترەمپ گوێی لە کەسێکی دیکە بێ تا هەندێ گۆڕانکاری ئەنجام بدات. هەندێ کەسی دیکەش لە ژوورەکە بوون، ئەوانیش (پێنس، شەنەهان، کۆوتس، هاسپێل، منوشن، سولیڤان و چەندانی دیکەش) کە زۆربەیان بەبێدەنگی دانیشتبوون. ئەمەیان درێژترین گفتوگۆ بوو لەنێوان دەنفۆرد و ترەمپ کە من بینیم، ئەمە یەکەمین گفتوگۆ بوو کە ماتیس ئامادەیی نەبوو. دەنفۆرد بەباشی خۆی کۆکردبووەوە، منیش لە خۆمم پرسی کارەکان چۆن جیاوازتر دەبوون ئەگەر ماتیس وەك ژەنەڕاڵێکی پێنج ئەستێرە فەرمانی لەسەر ژەنەڕاڵە چوار ئەستێرەکان نەکردبایە، بەڵام ئەوە ڕاستییە کە وەزیری بەرگری گەر بە ڕاستەقینەیی کار بکات، ئەوا تەواو مەککەینەی فراوانی پێنتاگۆن بەڕێوە دەبات. سەیری قسەی و نمایشی دەنفۆردم دەکرد، بۆم دەرکەوت کە حیکمەتێکی شاراوە لەنێو ئەو ڕێگرییە یاساییە هەبوو لە دژی ئەفسەرە ژەنەڕاڵەکانی پێشتر تا نەتوانن ببن بە وەزیری بەرگری. ئەمەیان ترسێك نەبوو بەرامبەر گرتنەدەستی دەسەڵاتی سەربازی، بەڵام بەشێوەیەکی مەجازی، نە دەسەڵاتی مەددەنی و نە دەسەڵاتی سەربازی لەنێو سەرکردایەتی پێنتاگۆن بەباشی ڕۆڵیان نەگێڕابوو، لەکاتێکدا هەردوو ڕۆڵ هەر سەربازییە. ڕۆڵی فراوان و سیاسیی وەزیری بەرگری بە خراپی دراوەتە کەسێك کە هەر خۆی پاشخانێکی سەربازی هەیە، ڕێگەدان بە ماتیس بەوەی تەنیا سەرپەرشتی دەنفۆرد و سەرکردەکانی دیکە بکات، کارێکی ڕاست نییە چونکە ئەم بەرپرسانە خۆیان پێویستیان بە سەرپەشتی

سەربازیی زیاتر نییە. هەروەها تیشك خرایە سەر ئەوەی ماتیس چەندە بێتوانا بووە لە ڕووی قەناعەتپێهێنانەوە لەنێو کۆبوونەوەکانیدا هەم لە (ژووری کۆبوونەوەکانی تایبەت بە بارودۆخەکان) و هەم لەنێو (کۆشکی سپی)یدا. لەوانەیە ماتیس هەوڵیدابێ خۆی وەك (زانایەکی بواری جەنگ) هاوشێوەی مارکۆس ئۆرۆلیۆس دروست بکات کە مارکۆس لەنێو کتێبەکەی بەناوی (بیرکردنەوەکان) وێنای کردووە، بەڵام ماتیس چیتر کەسێك نەبوو تا ڕۆڵی گفتوگۆکار و دانوستانکار بگێڕێت.

هەموو ئەو گفتوگۆیانە دەربارەی ڕۆڵی ئەمریکا لە سووریا بەهۆی خواستی بەردەوامی ترەمپ بوو، لەوەی داوای دەکرد ئەسەد بەندکراوە ئەمریکییەکان ئازاد بکات، ئاڵۆزیی زیاتری تێدەکەوت، من و پۆمپەیۆش پێمان وابوو ئەمە کارێکی خوازراو نییە. خۆشبەختانە، سووریا ترەمپی پاراست، تەنانەت ترەمپ ڕەتی کردەوە لەمەڕ ئەو بەندکراوانە قسەش لەگەڵ پۆمپەیۆ بکات. کاتێ ئێمە ڕاپۆرتمان لەبارەی ئەمەوە دا، ترەمپ بەتوورەییەوە گوتی: ئێوە پێیان بڵێن ئەگەر بەندکراوەکانمان بۆ نەگەڕێننەوە، ئەوا بەخراپی زەبریان لێ دەدەین، زۆر بە توندی لێیان دەدەین. ئێوە ئەمە بە بەشار ئەسەد بڵێن. ئێمە دەمانەوێ لەمڕۆوە تا هەفتەیەکی دیکە ئەو بەندکراوانە ئازاد بکرێن، یان ئەوەتا هەرگیز ئەوە لەبیرناکەن کە چۆن زەبریان پێ دەگەیەنین." ئەم قسەیەی ترەمپ وای کرد هیچ بژاردەیەکی گفتوگۆ لەنێوان ترەمپ و ئەسەد بوونی نەمێنێ. ئێمە بەگوێرەی ئەو قسەیەی ترەمپ بۆ لێدانی سووریا کارمان نەکرد.

بەهەرحاڵ، هەوڵەکان بۆ دروستکردنی هێزێکی چاودێریکاری نێودەوڵەتی هیچ بەرەوپێشچوونێکی بەخۆیەوە نەبینی. یەك مانگ دواتر و لە ٢٠ی شوباتدا، شەنەهان و دەنفۆرد گوتیان بەدڵنیاییەوە وەك مەرجێکی پێشوەختە بەرامبەر جووڵەی هێزەکانی دیکە، ئەوا بەلایەنی کەم هەندێ هێزی ئەمریکی لەو "ناوچە بێلایەنە" دەبن کە دەکەوێتە باشووری سنووری

تورکیا، هاوکات هاوکاری لۆجستیکیش لە بنکەی ئەلئەسەد لە عێراقەوە دابین دەکرێت. من بەدڵنیاییەوە هیچ کێشەیەکم لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە نەبوو، بەڵام باسکردنی ئەمە لەگەڵ ترەمپ بێگومان کێشەی دەنایەوە. لە دانیشتنێك لەنێو کۆشکی سپی و لەپێش پێدانی زانیاری بە ترەمپ بەرلەوەی ڕۆژی دواتر پەیوەندی بە ئەردۆگان بکات، بە ترەمپم گوت کە پێنتاگۆن بڕوای وایە مەگەر تەنیا "دوو سەد سەرباز"ی (ئەمەیان قسەیەك بوو بەئەنقەست کردم) ئەمریکی لەسەر زەمینی ئەو ناوچەیە بهێڵینەوە، ئەگەرنا ئاوا بەئاسانی ناتوانین هێزێکی هەمەلایەنە لەوێدا جێگیر بکەین. ترەمپ بۆ چرکەیەك بیری کردەوە و دواتر ڕازی بوو. ئەردۆگان گوتی من بەڕاستی دەمەوێ تورکیا کۆنترۆڵێکی گشتگیری هەبێ بەسەر ئەو ناوچەیەی پێی دەڵێن "هەرێمی پارێزراو: safe zone" لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریادا، کە من وەك جۆن بۆڵتن پێم وابوو ئەمە قبوولکراو نییە. لەکاتێکدا ترەمپ لە ڕێگەی تەلەفۆن قسەی لەگەڵ ئەردۆگان دەکرد و لەسەر مێزی سەرۆکایەتی دانیشتبوو، من پێشنیارم کرد بۆ ترەمپ تا بەسانایی بە ئەردۆگان بڵێت کە جۆزیف دەنفۆرد خۆی ئەم گفتوگۆیانە لە ئەستۆ دەگرێت، بەیانی شاندی سەربازی تورکیا لە واشنتۆن دەبن، بۆیە ئێمە دەکرێ ڕێگە بە لایەنی سەربازی هەردوولا بدەین بەردەوامی بە گفتوگۆکان بدەین. ترەمپیش بەو پێشنیارەی من ڕازیبوو.

دوای ئەوە گەیشتمە نووسینگەی خۆم تا ئەو هەواڵە خۆشە بە شەنەهان بدەم. چەند کاتژمێرێك دواتر، پەیوەندیم بە دەنفۆرد کرد تا دڵنیای بکەم لەوەی گوێبیست بووە و گوتیشی؟: "باڵیۆز، کاتی زۆرم لەبەردەست نییە تا قسەت لەگەڵ بکەم، چونکە ئێستا وا دەچینە دەرەوە تا بەشدار بین لە ڕێوڕەسمی ناونانی باڵەخانەی پێنتاگۆن بە (باڵەخانەی بۆڵتن)". دەنفۆرد زۆر دڵخۆشبوو، هەروەك هەمووشمان ڕازیبوون لەوەی هەبوونی دوو سەد سەرباز ڕەمزێکی زمانەوانی باش بووە (کە گەر خۆمان زۆر بە فۆرمی

شیعریی و زمانەوانییەوە پەیوەست نەکەین، ئەوا مانای وایە دەتوانین زیاتر لە چوارسەد سەربازیش بهێڵینەوە). دەنفۆرد بۆ تورکەکانی ڕوون دەکاتەوە کە نابێ هیچ سەربازێکتان لە سنووری باشووری وڵاتەکەتان بوونی هەبێ. دواتر پەیوەندیم بە لیندسی گراهام کرد و پێم گوت ئەو بابەتە بە نهێنی بهێڵەوە تا ڕێگە نەدەین خەڵکانی دی چانسی سەراوژێکردنی ئەم دەرفەتەیان هەبێ، ئەویش لای خۆیەوە گوتی باشە وادەکەم. هەروەها، خۆبەخشانە تەلەفۆن بۆ ئەردۆگانیش دەکات -بەوپێیەی پەیوەندییەکی باشیان لە نێواندا هەبوو- و پێی ڕادەگەیەنێت کە پشتگیریی تەواوی بڕیارەکەی ترەمپ دەکات. بەداخەوە، سارا ساندەرز ڕاگەیاندراوێکی بڵاوکردەوە، بەبێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە لەگەڵ ئەوانەی ڕاستییەکانیان دەزانی، بۆیە ئەو ڕاگەیاندراوەی سەرلێشێواوییەکی گەورەی دروست کرد. ئێمە دەبوو ڕوونی بکەینەوە کە "دوو سەد سەرباز" تەنیا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا دەبن، نەوەك لە بنکەی ئەت تەنف، لەکاتێکدا دوو سەد سەربازی ئەمریکی یان زیاتر لە تەواوی باکوور دەبن. من بەئەنقەست هەرگیز هەوڵم نەدا بچمە نێو وردەکاریی ئەم بابەتە، سەرەڕای سەرلێشێواویی میدیاکانیش. دەنفۆرد دڵنیاشی کردمەوە کە فەرماندەی ناوەندی ئەمریکاشی هێورکردووەتەوە بەوپێیەی ناوبراو دەربارەی هەواڵە هەڵدڕەکانی نێو ڕۆژنامەکان نیگەران ببوو، پێی گوتبوو: "نیگەران مەبە، فەرمانەکانی پێنتاگۆن هێشتا هەر لەژێر سەرکردایەتی تۆ دان".

سەرەڕای ئەوەی هەندێ بەربەست لەسەر ڕێگەکە هەبوو، بەڵام تا ئەوکاتەی دەستم لە کار کێشایەوە ڕەوشی سووریا هەر ئاوایی مابوویەوە. خەلافەتی ناوچەیی داعش کۆتایی پێ هێنرا، بەڵام هەڕەشە تیرۆرستییەکەی بێگومان هەر دەمێنێ. ڕوانگەکان بۆ دروستکردنی هێزێکی نێودەوڵەتی چاودێریکار شێوێنرا، بەڵام ئامادەگی ئەمریکا هەر بەردەوامی کێشا، هەر لەوێدا نزیکەی ١٥٠٠ سەربازی وڵاتانی جیهان بوونیان هەبوو.

ئەم "ڕەوشە" تا چەندی دیکە بەردەوام دەبێ، دیار نییە، بەڵام دەنفۆرد تا وادەی کۆتاییهاتنی ئەرکەکەی وەك سەرۆك دەستە هاوبەشەکان لە ٣٠ی ئەیلوول بە چاکی چاودێری ڕەوشەکی دەکرد. دوژمنایەتی ئەردۆگان هەر بەردەوام بوو و کەسیش بەرامبەری نەوەستا، ئەمەش ڕەنگە بەهۆی ئابووریی داتەپیووی تورکیا و کێشەکانی سیاسەتی نێوخۆیی خۆیەوە بووبێ. ترەمپ ڕەتی کردەوە هیچ ئابلووقەیەك لەسەر ئەردۆگان بسەپێنێت بەهۆی کڕینی سیستەمی بەرگری ئاسمانی ئێس ٤٠٠، ئەو هەڵایەی لەنێو (کۆنگرێس)یشدا هەبوو، پشتگوێی خست.

کاتێ دواجار ترەمپ لە ٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٩ تەقیەوە، دیسانەوە فەرمانی بە کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا کرد، منیش نزیکەی مانگێك لەمەوپێشتر بوو کە کۆشکی سپیم جێ هێشتبوو. دەرئەنجامی ئەو بڕیارەی ترەمپ بووەهۆی کارەساتێکی تەواو بۆ سیاسەتی ئەمریکی و متمانەی ئێمە لە جیهاندا. ئایا دەمتوانی ڕێگری لەو دەرئەنجامە بکەم هەروەك نۆ مانگ لەمەوپێش کردمان، ئەوا دڵنیانیم و نازانم، بەڵام کاردانەوەی نەرێتیی دوو پارتەکەی ئەمریکا ترەمپ وەك وەڵام وەری گرت تەواو چاوەڕوانکراو و شیاوی بوو. بۆ وەستاندنی ئەو بڕیارەی ترەمپ بۆ جاری دووەم، ئەوا پێویستی بە کەسێك بوو تا دیسانەوە لەبەردەم ئەم (پاس)ە بوەستێ و بتوانێ بەدیلێك بدۆزێتەوە و ترەمپیش قبوولی بکات. ئەمە وادیارە نەکرا. هەندێ هەواڵی خۆش هەبوون، بەهەرحاڵ، دوای هەوڵێکی یەك ساڵە، لە ٢٦ی تشرینی یەکەمدا، پێنتاگۆن و CIA توانیان لە هەڵمەتێکی بوێرانەدا سەرکردەی داعش ئەبوبەکر بەغدادی بکوژن.

## ئەفغانستان: بەرگرییەکی پێشوەختە

تا کۆتایی ساڵی ٢٠١٨، ئەفغانستان بابەتێك بوو کە جێگەی نارەحەتیی ترەمپ بوو، یەکێك بوو لە گیرۆدەییە سەرەکییەکانی ترەمپ لە بەرامبەر ئەو "دەستە ئاقلمەند"ەی زۆر خۆشەویست بوون لەنێو میدیاکاندا. ترەمپ باوەڕی وابوو، بە هەبوونی هەندێ پاساویش، هەموو دەسەڵاتێکی گونجاوی بە ماتیس داوە کە خۆی داوای کردبوو بۆ کۆتاییهێنان بە تاڵیبان، کە هاوکات بێ لەگەڵ کۆتاییهاتنی خەلافەتی ناوچەیی داعش. لە عێراق و سووریا، ئامانجە دیاریکراو و تایبەتەکان بەدەست هاتن (ئەگەر ئەمە تەنیا ئامانج بووبێ، ئەوا بێگومان کەواتە بابەتێکی جیاوازە). بەپێچەوانەوە، لە ئەفغانستان ئامانجەکە ڕوون و ئاشکرانەبوو، بێگومان کاروبارەکانیش بە جۆرێك کە ناکرێ نکۆڵی لێ بکرێ بە ئاراستەیەکی هەڵەدا دەچوو. ئەمەش ببووە هۆی نارەحەتیی ترەمپ. ترەمپ باوەڕی وابوو ئەو لە ساڵی ٢٠١٦ لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست بوو، باوەڕیشی وابوو دوای شکستە سەربازییەکانی ساڵی ٢٠١٧ و ٢٠١٨ هەر لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست بووە، ترەمپ دەیویست ئەوە بکات کە خۆی حەزی پێ دەکات. بۆیە بیرۆکەیەك سەری هەڵدا.

ترەمپ لە دژی مانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ئەفغانستان وەستایەوە لەبەر دوو هۆکاری پەیوەندیدار: یەکەم، خۆی بانگەشەی کردبوو کە "کۆتایی بە شەرە تەواونەکراوەکان دێنێ" لە ناوچە دووردەستەکاندا. دووەم، بەردەوامی لە خراپ ئیدارەدانی پارە و یارمەتی ئاسایشی بووەهۆی خراپبوونی کەسایەتی ترەمپ لە دژی ئەو هەموو پارەیەی لە پرۆگرامەکانی فیدراڵی خەرج دەکرا. لەگەڵ ئەمانەش، ترەمپ باوەڕی وابوو لە بابەتی عێراق لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە و هەمووش لەگەڵی ڕازی بوون. بەهەرحاڵ، هەموو کەسێك نا.

ئەو قسەیەی هەردەم دووبارەی دەکەمەوە و سوورم لەسەری دەربارەی "شەڕە بێکۆتاییەکان"، ئەوەیە کە ئێمە خۆمان ئەو شەڕانەمان دەست پێ نەکردووە و ناشتوانین تەنیا بە گوتنی ئەم قسانە کۆتایی بەو جەنگانە بهێنین. لەنێو جیهانی ئیسلامیدا، ئەو فەلسەفە توندئاژۆیانەی بووەتەهۆی مەرگ و وێرانکاری زیاتر، ئەوا فەلسەفەی ئایدۆلۆژی، سیاسی و ئایینین. هەروەك ئێستا هەست و سۆزی ئاینی وای کردووە ململانێی نێوان مرۆڤەکان بۆ چەندان سەدە درێژە بکێشێ، بۆیە ئەم ململانێیە لە دژی ئەمریکا و ڕۆژئاوا بە فراوانتری خراوەتەگەڕ. ئەم هەست و سۆزە لێمان دوور ناکەوێتەوە، چونکە ئێمە لەدەستی ماندوو بووینە، یان ئەوەی زانیمان کە زەحمەتە بتوانین باڵانسێك بۆ بودجەی خۆمان دروست بکەین. لە هەموو گرنگتر ئەوەیە کە ئەمە بۆ ئەوە نییە وڵاتانێکی وەك ئەفغانستان، عێراق، سووریا یان هەر وڵاتێکی دیکە بکەی بە وڵاتێکی خۆشتر و باشتر بۆ ژیانکردن. من بنیاتنەری نەتەوە نیم. دوای هەموو ئەمانە، بڕواناکەم دواجار بیرۆکەی شیکردنەوە مارکسیستییەکان (Marxist Analysis) بتوانێ ژیانێکی باشتر بۆ خەڵکی فەراهەم بکات و لە تیرۆریزم دووریان بخاتەوە. ئەمەیان بۆ ئەوەیە ئەمریکا لە هێرشێکی هاوشێوەی ١١ی سێپتێمبەر یان خراپتر بپارێزین، لە کاتی هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر تیرۆرستان چەکی ناوکی، کیمیایی یان بایۆلۆژیشیان هەبوو. هەتا ئەو هەڕەشەیە بوونی هەبێ، هیچ شوێنێك ئەوەندە دوور نییە تا بۆی نیگەران نەبی. تیرۆرستان لەسەر کەشتیگەلی دروستکراو لە دار نایەن بۆ ئەمریکا.

تا ئەوکاتەی من گەیشتمەجێ و کاروبارەکانم گرتەدەست، ئەم دیبەیتە چەندان جار دووبارە ببوویەوە، بۆیە من ڕووبەرووی ڕەوشێکی بێکێشە نەدەبوومەوە. یەکەم تێکەڵبوون و تێوەگلانم دەگەڕێتەوە بۆ ١٠ی مایسی ٢٠١٨ (دوای ئەو ڕۆژەی لەسەر بابەتی بارمتەکان لە کۆریا گەڕابوومەوە)، کاتێك زەڵمای خەلیلزاد، (وەك دۆستێك لەوەتەی ئیدارەی جۆرج بوشی

باوکەوە دەیناسم، هەر ئەوبوو لە ساڵی ٢٠٠٧ جێگەی منی گرتەوە وەك باڵیۆزی ئەمریکا بۆ یوئێن)، هەموو کەسێك بە (زەل) بانگیان دەکرد. ناوبراو ئەمریکییەکی بە ڕەچەڵەك ئەفغانییە و باڵیۆزی پێشتووتری ئەمریکاش بووە لە ئەفغانستان. خەلیلزاد گوتی هەندێ کەس بەناوی قەوارە جیاوازەکانی تاڵیبان هاتوونەتە لام و دەیانەوێ ئاشتی بەرقەرار بکەین. خەلیلزاد قسەی لەگەڵ حکوومەتی ئەمریکیش کردبوو بەتایبەتی ئەوانەی دەکرا هەڵسەنگاندن بۆ نییەتچاکیی ئەو مامەڵانە بکەن، بەڵام خەلیلزاد دەیویست ئاگەدارییەکی پێشوەختەم پێ بدات، بەتایبەتی ئەگەر دەرکەوت ئەوانە بەڕاستی بەدوای ئاشتییەوەن، کە دواجار لە کۆتایی حوزەیراندا خەلیلزاد گوتی بەڵێ بەڕاستی ئەوانە ئەو مەبەستەیان هەیە. من پێم وابوو پێویست ناکا چیتر پەیوەندیی زیاتر دروست بکرێ و پێشم وابوو ئەوەندە بەسیەتی، هەر بۆیە خەلیلزاد بووە بە کەناڵی گفتوگۆی پشتپەردە لەگەڵ تاڵیباندا. لەمیانەی مانگێکدا، ئەو ڕۆڵەی خەلیلزاد زۆر فراوانتر بوو تا بووە بە یەکێك لە "نێردە تایبەتەکان"ی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئەو ڕۆڵە گونجاوە وای کرد ڕێگریی بکات لەوەی هەندێ کەسی دیکە شوێنیان نەبێتەوە لەو پۆستە تەقلیدییانەی سیاسەتی ئەمریکا هەیەتی.

بەرامبەر هەندێ لە هەڵچوونە کاتییەکانی ترەمپ جارجار لەسەر ئامادەگیی هێزەکانمان لە ئەفغانستان هەندێ زانیاریمان پێ دەدا، هەندێ بابەت هەبوو کە دەبوو هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی نیشتیمانیی ئەمریکا بۆی کۆببینەوە، یان بەلایەنی کەم تا کۆتایی ساڵ هەندێ زانیاریی سەربازی لەمبارەیەوە بخەینەڕوو. دەمویست هەتا دەگونجێ هەر زانیارییەك لەبارەی ئەفغانستانەوە بکەوێتە دوای هەڵبژاردنەکانەوە، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك کە هەرگیز لێیان تێنەگەیشتم، ماتیس دەیویست زووتر ئەو زانیارانە بەدەست بگەن. دواجار بڕیاردرا کە ڕۆژی ٧ی تشرینی دووەم ئەم زانیارییانە بخرێتەڕوو کە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژی دوای کۆتاییهاتنی نیوەی یەکەمی

کۆنگرێس. من دڵنیابووم کەوا ترەمپ دڵتەنگ دەبێ گەر ببینێ کۆمارییەکان کۆنترۆڵی کۆشکی سپی لەدەست دەدەن، هەر شتێکیش لەنێو ئەنجوومەنی پیران ڕووبدات، ئەوا نابێتە کێشە. ئایا ماتیس دەیویست بڕیارەکەی ترەمپ بۆ پاشەکشە بەبێ هیچ دوودڵییەك قبووڵ بکات، کەوابێ ماتیس بەهۆی ئەم پرەنسیپانەوە دەست لە کار دەکێشێتەوە؟ یان ئەوەتا ئەمە هەوڵێکی فەرمی پێنتاگۆنە بەوەی دەیەوێ ڕاستەوخۆ بەرپرسیاریەتی بخاتەسەر ترەمپ، نەوەك بخرێتە ئەستۆی ئەو شکستانەی ئەمریکا لەمیانەی ئەو شەڕەدا دووچاریان هات، بەتایبەتی ئەو شکستەی لە ستراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی یاخیبووان هەبوو لە عێراق و ئەفغانستاندا؟ پۆمپەیۆ هەمان باوەڕی منی هەبوو بەوەی دەبێ زانیارییەکان لەسەر ئەفغانستان تا کۆتایی تشرینی دووەم ڕانەگەیەنرێ، بەڵام نەمانتوانی ئەو کارە بکەین و بەری پێ بگرین.

لە ڕۆژی هەڵبژاردن و لە کاتژمێر ١ی نیوەڕۆدا، چاوم بە خەلیلزاد کەوت، ناوبراو پێی وابوو کاتی زیاترمان لەبەردەستە تا گفتوگۆ لەگەڵ تاڵیبان بکەین، زیاتریش لەوەی من پێشبینیم کردبوو، بەگوێرەی پێشبینییەکانی من بووایە، پێم وابوو بەیانیی ڕۆژی دواتر ترەمپ کۆتایی بەو کارە دەهێنێت. مایك پێنس پێی گوتم ماتیس گوتوویەتی کە هێشتا لە ئەفغانستان پێشڕەویی سەربازی دەکات و پێویست ناکا گۆڕانکاری لەمەدا ئەنجام بدرێ. پێنس دەیزانی کە نە ترەمپ و نە من بڕوا بەمە ناکەین، چەندان بەڵگەی بنەڕەتیش هەبوون کە ماتیس هەڵەیە. لێرەوە، جارێکی دیکە من لەگەڵ ماتیس دژ بووم و دەمزانی خەریکە ئاسنی سارد دەکوتێ لە ئەفغانستان (هەروەك لە سووریاش وای کرد)، هیچ بەدیلێکیشی نەبوو تا خۆی دوور بگرێت لە وەڵامگەلێکی "هەڵە". کەیس کیلۆگ (ڕاوێژکار) بەشداری کۆبوونەوەکەی نێوان پێنس و ماتیسی کردبوو، دواتر بە منی گوت کە ماتیس هەمان ئەو شتانەی دووپات کردەوە کە دوو ساڵە هەر

باسیان دەکات. هیچ جێگەی سەرسامی نییە کە ترەمپ بێهیوا بووە لەو کەسانەی ماتیس بە ژەنەڕاڵەکانی بانگی دەکردن. بۆ ئەو داخوازییە غەریزەییانەی هەمبوو، دڵنیابووم ئەم ڕێگەیە بەرەو هەڵدێرم دەبات. لە ڕاستیدا، من وەڵامێکی باشترم نەبوو، هەر لەبەر ئەمەش بوو دەمویست دوای هەڵبژاردنەکان کاتێکی زیاتر تەرخان بکرێت بۆ ئەوەی ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندنی ڕەوشی ئەفغانستان بڵاوبکرێتەوە.

لە کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ٨ی تشرینی دووەمدا، لە کۆشکی سپی لەگەڵ پێنس، ماتیس، دەنفۆرد، کێللی، پۆمپەیۆ، کۆوتس، هاسپێل و چەندان کەسی دیکەی ئامادە، کۆبوونەوەیەکمان کرد. پۆمپەیۆ دەستی بە قسەکردن کرد، بەڵام ترەمپ بەخێرایی قسەکانی بڕی و گوتی: "ئێمە شکستمان هێناوە، ئەوانیش (لایەنەکانی ئەفغانستان) دەزانن کە سەرکەوتنیان بەسەر ئێمە بەدەستهێناوە." دواتر بەڕووی ژەنەڕاڵێکی پشکنین لە ئەفغانستان تەقیەوە کە لە ڕاپۆرتەکانی چەندان دۆکیومێنتی یاسایی تۆمار کردبوو، هەروەها باسی لەو هەموو دۆلارە کردبوو کە وەك باج بەفیڕۆ درابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەنێو ئەو ڕاپۆرتانەی زانیاریی وردی دەربارەی شەڕی ئەفغانستان باس کردبوو کە هەر حکوومەتێکی دیکە بێت پێویستە بە نهێنی بیهێڵێتەوە. ترەمپ گوتی: "پێم وایە ئەو ژەنەڕاڵە ڕاست دەکات، بەڵام پێم وایە شەرمەزارییە بۆ کەسێك ئەو شتانە بۆ خەڵکی عەوام بڵاوبکاتەوە." ترەمپ ناوی خەلیلزادی هێنا و گوتی: "گوێم لێ بووە دەڵێن کە ئەو پیاوێکی ساختەچییە، هەرچەندە بۆ ئەم بابەتەش پێویستت بە پیاوێکی ساختەچی دەبێت". پۆمپەیۆ دیسانەوە هەوڵی دا قسە بکات، بەڵام ترەمپ لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو: "ستراتیژیەتی من (مەبەستی لەو قسانە بوو کە ژەنەڕاڵەکانی لە ساڵی ٢٠١٧ بۆیان باس کردبوو) هەڵە بوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەمدەویست لەو شوێنە بین. ئێمە هەموو شتێکمان لەدەست دا. ئەمەیان شکستێکی تەواو بوو. ئەمەیان

تەنیا زیانێك بوو. بەڕاستی شەرمەزارییە. ئەو هەموو قوربانییە. من حەز ناکەم لەسەر ئەمە قسە بکەم".

دواتر، ترەمپ باسی لە یەکەم بەکارهێنانی (مووشەکی گەورەی تەقاندنەوەی هەوایی) لە کاتی شەڕدا کرد، لەمبارەیەوە بە ماتیسی گوت: "بەبێ ئاگەداری تۆ" و بێشومار ئەم تۆپەیان تەقاندووە و ئامانجەکەیان نەپێکاوە. هەروەك زۆربەی کات وابووە، دیسانەوە ترەمپ بەشێکی لە (ڕاستییەکە)ی تێکەڵ بە (ناتێگەیشتن و ڕق و کینەوە) کردبوو.

ماتیس ڕێگەی بە فەرماندە ئەمریکییەی ئەفغانستان دابوو تا (مووشەکی گەورەی تەقاندنەوەی هەوایی) بەکاربێنێت، بۆیە پێدانی دەسەڵاتی زیاتر بۆ تەقاندنی زیاتر کارێکی پێویست نەبووە. بابەتی تەقاندنی ئەم مووشەکە وەك کێشەیەکی هەڵپەسێردراو لەنێو پێنتاگۆن مایەوە. یەك شت هەبوو کە لێی دڵنیابووین: ماتیسیش لەم گفتوگۆیەی لەگەڵ ترەمپ سەرکەوتوو نابێ، ئەو ترەمپەی کە تەنیا دەیویست بزانێ کەی ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندنی شەڕی ئەفغانستانی دەگاتە بەردەست. من دەمزانی کە نامەوێ ئەو ڕاپۆرتە ئاوا بەزوویی بگاتە دەستم.

هەروەك پێشبینی دەکرا، ماتیس دیسانەوە چووە سەر کەللەڕەقیی خۆی، کاتێ ستایشی هەوڵەکانی وڵاتانی دیکەی ناتۆی کرد.

ترەمپ گوتی: "ئێمە پارە بە ناتۆ دەدەین".

ماتیس گوتی: "داعش هێشتا لە ئەفغانستانە".

ترەمپ گوتی: "لێگەڕێ با ڕووسیا چاودێرییان بکات. ئێمە حەوت هەزار میل لێیان دوورین کەچی هێشتا بووینەتە ئامانجی ئەوان، داعش دێت بەرەو کەناراوەکانمان، ئەمە ئەو شتەیە کە هەمووان وا دەڵێن". ترەمپ ئەو قسانەی بە گاڵتەوە دەکرد و گوتی: "ئەمە نمایشێکی ترسناکە. هەرچۆنێك بێت، پێویستە لەوێ ڕزگارمان بێت." دان کۆوتس پێشنیاری کرد کە ئەفغانستان بابەتی ئاسایشی سنووری بوو بۆ ئەمریکا، بەڵام ترەمپ گوێی

لێ نەگرت. ترەمپ بە منی گوت: "ئێمە هەرگیز ڕزگارمان نابێت. ئەمە لەلایەن کەسێکی گەمژەوە هەڵگیرسێنرا کە ناوی جۆرج بوش بوو. چەندان ملیۆن کەس کوژران، چەندان ترلیۆن دۆلار خەرج کرا، کەچی ئێمە هێشتا ناتوانین لەوێ ڕزگارمان بێت. هێشتا پێویستمان بە شەش مانگە، ئەمە ئەو کاتەیە کە دەڵێن پێویستمانە، کەچی هێشتا شاپ لە سمتەکانمان دەدەن". دواتر ترەمپ چووە سەر بابەتێکی دیکەی سەرنجڕاکێش، ئەویش ئەوەی چۆن بە هێلیکۆپتەر هەموو ڕۆژێك مامۆستاکانمان بردووەتە قوتابخانەکان، چونکە پێی وابوو ئەمە زۆر مەترسیداربووە و نەدەکرا بەخۆیان بچن بۆ قوتابخانەکان، ئەم کارە تێچوونی زۆر بووە. ترەمپ گوتی: "ئەو ژەنەڕاڵەی پشکنین قسەکانی ڕاست بووە. دواتر چووە سەر ڕاپۆرتێك لەسەر بنیاتنانی هۆتێلی (هۆڵیدەی ئین) بە بڕی ملیارێك دۆلار و گوتی: "ئەو کارە گەمژایەتی ئێمە دەردەخات. خەڵکی ئەفغانستان ڕقیان لێمانە و لە دواوە تەقەمان لێ دەکەن. سەری خەڵکی ئێمە دەپرژێنن، قاچ و پێیەکانیان ئەتك دەکەن (وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو هێرشەی بەم دواییانە کرابووەسەر پاسەوانێکی نیشتیمانیی ویلایەتی یوتا لە ئەفغانستان). هیندستان کتێبخانەیەك دروست دەکا، کەچی لە هەموو دونیا ڕێکلامی بۆ دەکا."

ئەم گفتوگۆیە هەر بەردەوامی کێشا. ترەمپ گوتی" پێویستە لەوێ بکشێینەوە. هەڵمەتی من بۆ ئەوەیە لە ئەفغانستان ڕزگارمان بێت. خەڵك تووڕەن. خەڵکی ئێمە زۆر زیرەکن، ئەمە بۆیە دین هیللەر (سیناتۆر) گرەوی دووبارە هەڵبژاردنەوەی بۆ ئەنجوومەنی پیران لە ویلایەتی نیڤادا دۆڕاند. چونکە ئەو پشتگیری هیلاری کلینتۆنی دەکرد." ماتیس دیسان هەوڵی دا قسە بکات، بەڵام ترەمپ لە قسەکردن بەردەوام بوو، ئەوجارە لەبارەی سووریا گوتی: "من تێناگەم بۆچی ئێمە داعشەکان دەکوژین لە سووریا. بۆچی ڕووسیا یان ئێران ئەمە ناکەن؟ ماوەیەکی زۆرە ئەو یارییە دەکەین. بۆچی ئێمە لەبەر خاتری ڕووسیا، ئێران و عێراق داعشەکان

بکوژین کە هەر خۆی ئێرانی کۆنترۆڵی کردووە؟"

پۆمپەیۆ گوتی: "ئەگەر ئەمە ڕێنموییە، ئیدی ئێمەش جێبەجێی دەکەین. بەڵام قسەکە ئەوەیە کە ئێمە سەرکەوتوو نابین."

ترەمپ وەڵامی دایەوە: "ئەوە هاوشێوەی ڤێتنامە. باشە بۆچی ئێمە کۆریای باشوور لەدەست کۆریای باکوور دەپارێزین؟" پۆمپەیۆ گوتی: "تەنیا ٩٠ ڕۆژ دەرفەتمان بدە"، بەڵام ترەمپ گوتی" هەرچەند درێژە بکێشێ، ئەوە هەر شەڕی ئێمەیە. من حەزناکەم شەڕەکان بدۆڕێنین. من نامەوێ ئەوە ببێتە شەڕی ئێمە. تەنانەت گەر سەرکەوتووش نەبین، بەڵام هیچیش بەدەست ناهێنین."

ماتیس گوتی " دەزانم ئەمە هەر ڕوودەدات. ئەمە ڕێگەی تۆیە لەو ڕۆژەوەی کە دەسەڵاتت گرتووەتەدەست."

ترەمپ ئامادە بوو بۆ وەڵامدانەوە، گوتی: "یەکەم ڕۆژ کە دەسەڵاتم گرتەدەست، دەبوو کۆتایی بەمە بێنم".

دواجار ترەمپ پرسیاری کرد: "چەند کاتتان دەوێ؟" پۆمپەیۆ گوتی: "تا کۆتایی مانگی شوبات یان ئازار، ئەوکاتە بژاردەکانی دەرچوون ئامادە دەکەین." ترەمپ هەندێ گرژ بوو، گرژبوو بەرامبەر ئەو شتانەی چەندان جار گوێبیستی ببوو. ترەمپ دواتر گەڕایەوە سەر خەلیلزاد و ڕەخنەی لێ گرت، گوتیشی ئایا ئەوەی لەگەڵ تاڵیبان واژووکراوە هیچ گرنگییەکی هەیە. "باشە ئێوە چۆن ڕزگارمان دەکەن کە ئەو هەموو خەڵکەمان لێ کوژراوە؟ ئەی چەند کەلوپەلمان لەوێ بەجێ دەمینێ؟"

دەنفۆرد بۆ یەکەمجار بوو قسەی کرد و گوتی: "زۆر نییە."

ترەمپ گوتی: "چۆن لەوێ دەکشێینەوە؟"

دەنفۆرد گوتی: "پلانێکی بۆ دادەڕێژین."

من تەواوی ئەوکاتە بێدەنگ بووم، چونکە هەموو ئەو کۆبوونەوەیە

شتێکی هەڵە بوو. بەشێوەیەکی حەتمی، ترەمپ پرسیاری کرد: "جۆن، بۆچوونی تۆ چییە؟" منیش گوتم: "وادیارە کە بیروڕای من وەك ئاوێنەی پشتەوەیە"، دیسانەوە بۆم ڕوون کردەوە کە بۆچی پێویستە لەسەر خاکی خۆیان بەرەنگاری تیرۆرستان ببینەوە و بۆچی پرۆگرامی چەکی ناوکیی پاکستان بووەتە زەروورەتێك، هاوکات دەبێ ڕێگریی بکەین ناوچەی تاڵیبان لە ئەفغانستان نەبێتە بەهەشتێك بۆ تیرۆرستان و بڕژێتە نێو پاکستانەوە. دەنفۆرد گوتی ئەگەر پاشەکشە بکەین، ترسی ئەوەم هەیە لە داهاتوویەکی نزیکدا هێرشی تیرۆرستی بکرێتە سەر ئەمریکا. ترەمپ جارێکی دیکە گوتی: "پەنجا ملیار دۆلار لە ساڵێکدا!" دواتر گوتی: "تا ڕۆژی ڤالانتاین دەرفەتتان لەپێشە."

زۆربەی بەشداربووانی نێو ئەو کۆبوونەوەی کۆشکی سپی بە دڵتەنگی دەرچوون، لەگەڵ ئەوەش من و پۆمپەیۆ ماینەوە و لەوکاتەدا سارا ساندەرز و بیل شاین پەلەپەلیان بوو تا بڵێن کە جێف سیشنز وەك داواکاری گشتیی دەستی لە کار کێشاوەتەوە، یەکەم کەس بوو لەوانەی لە کۆتایی ساڵدا ماڵئاوایی لە پۆستەکەی کرد. مانگێك دواتر، ترەمپ (بیل بار)ی لە شوێنی جێف سیشنز دانا. هەروەها پاش مانگێکی دیکە و دوای گەیشتنی ڕاپۆرتێکی دیکە کە ئێمە چەند ناوچەیەکمان لە بەرامبەر تاڵیبان لەدەست داوە، ترەمپ دیسانەوە تەقیەوە: "من دەبووایە شوێن خواستی خۆم کەوتبام، نەوەك قسەی ژەنەڕاڵەکانم. ئەو مووشەکە گەورانە هیچ کاریگەرییان نییە و ئامانجەکان ناپێکن". ترەمپ نەیدەویست چاوەڕوانی خەلیلزاد بێت و بەڵکو دەیویست بەر لە کۆتاییهاتنی ساڵی دووەمی سەرۆکایەتییەکی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا ڕابگەیەنێت، یان تەنانەت پێش ئەو ماوەیەش. ئەگەر ترەمپ تا ساڵی سێیەمی سەرۆکایەتییەکەی چاوەڕێ بکات، ئەوا شەڕەکە دەباتەوە، لەکاتێکدا گەر لە کۆتایی ساڵی دووەمی پاشەکشە بکات، ئەوا هێشتا دەتوانێ سەرزەنشتی کەسانی پێش

خۆی بکات. من بەسانایی لێم پرسی چۆن دەتوانێ ئەمریکا لە هێرشی تیرۆرستان بپارێزی کاتێ پاشەکشە دەکەین، ئەویش گوتی: "ئەگەر ئەوانە توانییان لە ئەفغانستانەوە هێرش بکەنەسەر ئەمریکا، ئەوا من خۆم ئەو وڵاتە وێران دەکەم." من گوتم ئێمە پێشتر کارێکی وامان کردووە، بۆیە پێویستمان بە وەڵامێکی باشتر هەیە. هەروەها، گوتم من لەوانەیە تاکە کەس بم کە نیگەرانی پاکستانم، لەکاتێکدا گەر تاڵیبان کۆنترۆڵی ئەو ناوچانەی دەوروبەری بکاتەوە، بەڵام ترەمپ قسەکانمی بڕی و گوتی منیش نیگەرانی ئەو بابەتەم، ئەو قسەیە دەبوو گوزارشت لەو کێشەیە بکات. بەشێوەیەکی بنەرەتی، کاتێ قسەمان دەکرد، من گوتم: "ئێمە کاری باشمان کردووە و خەڵکێکی زۆری خراپمان کوشتووە. ئێستا ئێمە پاشەکشە دەکەین، هەروەها پلاتفۆرمێکمان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی تیرۆرستان جێ هێشتووە." خۆشبەختانە، چەمکی پلاتفۆرمی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆرستان پێشتر بەجوانی لەنێو پێنتاگۆن گەنگەشەی لەسەر کرابوو، بەڵام بە زەحمەت دەیانکرد بە ئەولەویەتی کارەکانیان.

لە نانخواردنەکانی بەیانی لەگەڵ ماتیس و پۆمپەیۆ، ئەمجارەیان لە ڕۆژی یادکرنەوەی بەندەری مرواری[1] ، من گوتم پێویستە وەڵامی سێ پرسیار بدەینەوە: ئایا دوای ڕۆیشتنی ئێمە حکوومەتی ئەفغانستان شکست دێنێت، ئەگەر وابێ، کەواتە بۆ ئاوا بەخێرایی؟ هەروەها بە چ خێراییەك و بە چ ڕێگەیەك داعش، قاعیدە و گرووپە تیرۆرستییەکانی دیکە کاردانەوەیان بەرامبەر کشانەوەی ئێمە دەبێ؟ دواجار بە چ خێراییەك گرووپە تیرۆرستییە جیاوازەکان هێرش دەکەنەسەر ئەمریکا؟

بەرنامەمان دانا بۆ ڕۆژی دووشەم تا جارێکی دیکە لە کۆشکی سپی

(١) لە ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا، تیایدا هێزە دەریاییەکانی ژاپۆن هێرشیان کردەسەر هێزەکانی ئەمریکا و بۆمبارانی (بەندەری مرواری)یان کرد.

کۆببنەوە، ماتیس کەمێك پێش ترەمپ دەستی بە قسە کرد. دوای ئەوەی بە کورتی باسی لەوە کرد کە لە کۆبوونەوەی پێشتر باسی کردبوو، ترەمپ گوتی: "بەر لە ٢٠ی کانوونی دووەم دەمەوێ پاشەکشە بکەین. ئەو کارە بەخێرایی ئەنجام بدەن. دواتر باسی ئەو سەردانانەی کرد کە بۆ نەخۆشخانەی (والتەر ڕید) کردبووی، تیایدا سەربازە بریندارەکان کاریگەرییان لەسەر ترەمپ دروست نەکردبوو، کەچی کاریگەرییان لەسەر زۆر خەڵك جێ هێشتبوو، بە جۆرێك بەهۆی ئازایەتی و پابەندبوونیانەوە بۆ ئەرکەکان سەرنجی خەڵکیان بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو. ترەمپ ئاوا بەسانایی دووچاری ترس هاتبوو بەرامبەر سەختیی برینەکانیان (بێئاگاشبوو لەوەی کە بەرەوپێشچوونەکانی بواری پزیشکی سەربازی توانیوویەتی چەندان سەرباز ڕزگار بکات کە لە شەڕەکانی پێشتردا بەئاسانی گیانیان دەسپارد). دواتر، دیسانەوە گەڕاینەوە سەر بەکارهێنانی مووشەکی گەورە لە ئەفغانستان و نەیتوانیوە کاریگەری هەبێ و ئامانجە دوورەکان بپێکێت، بەتایبەتی ئەو گوتارە گەمژانەیەی لە ئابی ٢٠١٧ دابووی کە تیایدا ترەمپ ڕایگەیاندبوو ستراتیژیەتی نوێی تایبەت بە ئەفغانستان هێرشکارانە دەبێت. دواتر ترەمپ گوتی: "من گوتم هەرچییەکت دەوێ دەتوانی بیکەی"، دواتر سەیری ماتیسی کرد. "من دەسەڵاتی تەواوم پێدای، تەنیا بەکارهێنانی چەکی ناوکی نەبێت، ئێستا سەیرکە بزانە چی ڕوویداوە؟!". ترەمپ هەندێ ترشوتاڵ بوو بەتایبەتی دەربارەی گوتارەکەی ساڵی ٢٠١٧، ڕەنگە کەسێکیش بپرسێ ترەمپ هەستی چی دەبێ ئەگەر ئەو ستراتیژیەتەی سەرکەوتووبوو. پۆمپەیۆ بە پشتبەستن بەوکاتەی لە CIA بوو، دواتر پێی گوتم کە واهەست دەکەم ماتیس چەندان مانگی ٢٠١٧ی بەفیڕۆ داوە و هیچیشی نەکردووە، ترسی ئەوەم هەیە ترەمپ لە دژی خۆی بوەستێتەوە و دیسانەوە باس لە پاشەکشە بکات. ئێمە بەدڵنیاییەوە دەمانتوانی ئێستا ئەو چەند مانگە لەدەستچووە بەکاربێنین.

ترەمپ پرسیاری کرد: "لە ئەفغانستان بردنەوە چییە؟"

ماتیس بەتەواوی وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەمریکا هیچ هێرشێکی ناکرێتەسەر." دواجار ماتیس بیرۆکەی خۆی گۆڕی و گوتی: "با وادابنێین کە ئێمە کۆتایی بەو شەڕە دەهێنین، نەوەك بڵێین کە پاشەکشە دەکەین".

ترەمپ پرسیاری کرد: "ئێوە ئامادەن؟" ڕووی پرسیارەکەی بەدیاریکراوی بەرەو کەس نەبوو، بەڵام بەکارهێنانی ئەم قسەیەی وەك ئاماژەیەك بوو بەوەی شتێکی گەورە بەڕێوەیە. ترەمپ گوتی: "با بڵێین ئەوە هەشت ساڵە لە ئەفغانستانین. کارێکی گەورەمان کردووە. ئەگەر هەر کەسێك بێتە ئێرە، دەبینێ کە هەرگیز ئەو وڵاتە وەك جاران نەماوە. ئەمە قسەی ئێمەیە". ترەمپ دواتر بەردەوامی بە قسەکانی دا و باسی کشانەوەی کرد لە عێراق، سووریا و یەمەن. دواتر هاتەوە سەر ماتیس: "من هەرچیت داواکرد پێم دای. دەسەڵاتی بێ سنوور، هیچ بەربەستێکت لەبەردەم نەبوو. کەچی تۆ شکستت هێنا. واتکرد شاپ لە سمتت بدرێ. تۆ شکستخواردووی." ئەم قسە بە ئازارانەی ترەمپ کە هەر دووبارەی دەکردەوە، نیشاندەری ئەوەبوو کە سوورە لەوەی هەر خۆی بڕیارەکان دەردەکات، کێشە بۆ ئەوانە دروست دەکات کە بەرپرسیاریەتی وەردەگرن.

ماتیس پرسیاری کرد: "ئایا دەتوانین ئەو پاشەکشەیە زیاتر دوابخەین تا سەرباز و دیپلۆماتیکی زیاتر لەدەست نەدەین؟"

ترەمپ گوتی: "ناتوانین بەرگەی ئەمە بگرین. ئێمەی شکستمان هێنا. ئەگەر بە ڕێگەیەکی جیاوازیش بێ، من ڕێگە بەمە نادەم".

دواتر بەدڵتەنگییەوە بەرەو نووسینگەکەی (کێلی) چووین، تا بیربکەینەوە و بزانین بۆ داهاتوو دەبێ چی بکەین. دەنفۆرد کە لە زۆربەی کاتەکانی کۆبوونەوەکە بێدەنگ بوو، گوتی هیچ ڕێگەیەك نییە بەوەی لەو کاتەی ترەمپ دەیەوێ هەموومان بە سەلامەتی پاشەکشە بکەین، سووریش بوو لەوەی کۆبوونەوەیەکی دیکە بکەین تا ئەو بابەتە زیاتر ڕوون بکاتەوە.

کێلی تەواو بەو قسەیەی دەنفۆرد بێزار ببوو، بۆیە گوتی ترەمپ تەنیا گرنگی بە قسەکانی خۆی دەدا (لەمەدا مەبەستی لە نائامادەیی ترەمپ بوو بەوەی تا ئەو ساتەوەختە نایەوێ سەردانی عێراق و ئەفغانستان بکات). ماتیس بە دەنفۆردی گوت هەموو پیاوەکان لە ئەفغانستان بگوازەوە بۆ چوار پێنج بنکەی سەرەکی، لەوێوە دەتوانن وڵاتەکە جێ بێڵن، هەر بۆ سەلامەتی هەڵسان و نیشتنەوەی ڕێگەی فڕۆکەکان ئیدی سەرباز و کەلوپەکانیش بەرزدەکەینەوە و دەیانگوازینەوە. ئەو قسانەی بە جۆرێك بوو وەك بڵێی ژەنەراڵێکی چوار ئەستێرەیی مارینز نەتوانێ کارێکی لەو جۆرە بکات. بەڕاستی نەمدەزانی چۆن کێلی و دەنفۆرد چۆن خۆیان گرتووە و بە (ماتیس)یان نەگوتووە بەوەی ئەی چی لە پلانی پاشەکشەکردنەکەی دەکات، بەڵام چی دەکەی ناوبراو بەحیساب ژەنەراڵێکی پێنج ئەستێرەیە و خەریکی کارەکانییەتی. ماتیس دەبوو نیگەرانی ئەوەبێ چۆن باوەڕ بە ترەمپ بهێنێت، نەوەك پلانگەلێکی بنەڕەتی لەسەر زەمینی ئەفغانستاندا دابرێژێت.

دوای ئەمە، تا نزیك ئۆتۆمبێلەکەی لەگەڵ پۆمپەیۆ چووم، لە دەرەوەی باڵی ڕۆژئاوای کۆشکی سپی، هەردووکمان ڕازی بووین لەسەر ئەوەی کە هەڵسەنگاندنەکەی ترەمپ بەرامبەر ڕوانینی کۆمارییەکان لە بابەتی ئەفغانستان بەتەواوی هەڵە بوو. پۆمپەیۆ گوتی: "گەر وابڕوات ترەمپ لەڕووی سیاسییەوە شکست دێنێت و هەر شیاوی ئەمەشە." منیش گوتم کە ژەنەراڵەکان لە ڕاستیدا لەنێو چوارچێوەیەکی کاردان، خەریکی ئەنجامدانی دواهەمین جەنگن، نەوەك بەشێوەیەکی کاریگەر لەگەڵ هەڵوێستی ترەمپ مامەڵە بکەن، بەوپێیەی ئەوان بەشێکی ئەو بەرپرسیاریەتییە هەڵدەگرن. وەك کەسێك کە درەنگ بەرپرسیاریەتیم گرتبووە دەست، پێم وابوو ئەوەی ماتیس و هاوڕێکانی بە سەرکەوتنیان دەزانی نموونەش ئەو گوتارەی لە ئابی ۲۰۱۷ پێشکەشیان کرد، هەڵەیەك بوو. ترەمپ فشاری زیاتری دەکرد

لەوەی ماتیس دەیەوێ بۆی بچێ، بۆیە ئێستاش لە ئاراستەیەکی دیکە زیاتر کاردانەوەکانی نیشان دەدات. میدیاکان پێیان وابوو کە هەر ئەو (دەستە ئاقڵمەندەی) لەگەڵ ترەمپ کاریان دەکرد هەڵە نین، بەڵکو بەرلەوەی هەڵەکان چاکبکەینەوە، پێویستە دان بنێین بەوەی کە ئەوەی ترەمپ پشتی پێ بەستبوو، هەڵەبوو. خەلیلزاد دەیتوانی بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆکانی هەنگاوێك بنێت، بەڵام هەوڵەکانی بەهۆی ئەو ئەمرە واقیعییەی لەسەر خاکی ئەفغانستان هەبوو، تەگەرەی تێ کەوت. وادیاربوو دوو مانگی پەست و ناخۆش چاوەڕێمان دەکات.

لە ٢٠ی کانوونی یەکەمدا، هەروەك کە پۆمپەیۆ دواتر پێی گوتم، هاوکات چەند کاتژمێر بەرلەوەی دەست لە کار بکێشێتەوە، ماتیس هەر نامەی دەستلەکارکێشانەوەی نەدابوو بە پۆمپەیۆ، بەڵکو هەندێ دۆکیۆمێنتیشی پێدابوو، یەك لەوانە گرنگە بۆیە دەکرێ لێرەدا باسی بکەین. ئەویشیان ڕەشنووسی ڕاگەیاندراوێکی گشتیی بوو دەربارەی پلانە ئۆپەراسیۆنییەکانی کشانەوە لە ئەفغانستان، کە وادیاربوو لە بنەڕەتدا پێچەوانەی ئەوەبوو کە ترەمپ بڕیار بوو لە گوتارەکەی مانگی کانوونی دووەمی داهاتوو لە کۆبوونەوەی یەکێتیی وڵاتان ئاماژەی پێ بکات. بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش، پۆمپەیۆ بە ماتیسی گوتبوو بەئاسانی ناتوانین ڕێگە بە بڵاوبوونەوەی ئەو دۆکیومێنتە بدەم و هیچ ڕێگەیەکیش نییە تا هەندێ گۆڕانکاری تێدابکەین، تا وای لێ بکەین قبووڵ بکرێت. ماتیس داوای لێ کردبوو بەلایەنی کەم بۆ من (وەك جۆن بۆڵتن)ی بنێرێت، پۆمپەیۆش دەیزانی کە من بەمە ڕازی دەبم و کێشەیەکم لەگەڵیدا نییە. نە پۆمپەیۆ، نە منیش نەمانزانی کە لە یەکێك لە کاتەکاندا وەزارەتی بەرگری ڕەشنووسی "فەرمانێکی جێبەجێکردن"یان نووسیبوو و تیایدا ئاماژەیان دابوو کە ڕەشنووسی ئەم دۆکیۆمێنتەی ماتیس باسی چی دەکات، هاوکات بەنێو هەموو فەرماندە سەربازییەکانی ئەمریکا و باڵیۆزخانەکانی ئەمریکا لە

جیهاندا دابەشیان کردبوو، هەموو ئەمانە بەشێك بوو لە سیناریۆی دەستلەکارکێشانەوەکەی ماتیس. ئێمە تێگەیشتین کە ئەمە لایەنێکی ناڕوونی ئەو سەرلێشێواویانەیە، بەڵام ئەمە تەقینەوەیەکی زۆری لەنێو هەواڵی میدیاکان دروستکرد. ئەمە ڕەنگدانەوەی یەکێك لە تاکتیکە باوەکانی ماتیس بوو، با بڵێین یەك لە ڕق و کینەکانی. "کەوابێ، دەتەوێ پاشەکشە بکەی؟ فەرموو ئەوە پاشەکشەت کرد." هیچ کەسێك پەنجەی بۆ ماتیس درێژنەکرد لەهەمبەر ئەو هەموو ئاژاوەیەی دروستی کردبوو.

تەنانەت دوای ڕۆشتنی ماتیس، شەنەهان و پۆمپەیۆ و من بەردەوامبووین لە کۆبوونەوەکانمان لە کاتی خواردنی نانی بەیانیدا. لە ٢٤ی کانوونی دووەم، وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەو ڕوانینە جیاوازانەی لەسەر بابەتە سەرەکییەکان هەمانبوو، شەنەهان و من نیگەرانی ئەوە بووین کە خەلیلزاد زۆر دەبەخشێت، ئەمە بەهۆی ئەوە نییە کە دانوسکارێکی لاوازە، بەڵکو ئەمە بەهۆی ڕێنماییەکانی (پۆمپەیۆ)وەیە. تاڵیبان سووربوو لەسەرئەوەی کە ڕەشنووسی ڕاگەیاندراوی ئەمریکا-تاڵیبان (هەر خۆی چەمکێکی کێشەلەسەرە) و ئێستاش لەژێر گفتوگۆی زیاتردایە، نیشانیشی دەدات کە هێزە بیانییەکان (مەبەستی ئێمەی ئەمریکایە) کە لە ئەفغانستان پاشەکشە دەکەن. بێگومان ئەمە هیچ مەودایەك بۆ تواناکان بۆ وەستانەوە لە دژی تیرۆرستان ناهێڵێتەوە، تەنانەت لەگەڵ ئەوەی ترەمپ خۆی داوای ئەمەی کردبوو. نیگەرانی ئەوەبوو کە دەوڵەتی ئەمریکا زۆر پەلەی ئەوەیەتی بگاتە ڕێککەوتنێك لەگەڵ ئەفغانستان، بەڵام بەمە وێنە گەورەکەیان لەدەست دەچوو -ئەمە هەردەم کێشەیەکی بۆماوەییە لەنێو وەزارەتی بەرگرییدا بوونی هەیە. پۆمپەیۆ بە توندی دژی ئەمەبوو، لەگەڵ ئەوەش ڕازی بوو لەوەی پێویستە لە گفتوگۆکان بەقووڵی باس لە هەموو بابەتێك بکرێت، بەزەحمەت بە زاریان دادەهات بە تاڵیبان بڵێن "لایەنێکی هاوبەشی نێو دانوسانەکەیە"، کەچی لەنێوخۆی وڵات حەزیان بەو دەستەواژەیە

دەکرد. کێشەی سەرەکی لەگەڵ ئەم ستراتیژیەتە دیپلۆماتیکییە ئەوەبوو کە گەر تاڵیبان بەڕاستی وابیربکەنەوە ئێمە لەوێ پاشەکشە دەکەین، ئەوا هیچ هۆکارێك نابینن تا بەجددی گفتوگۆ لەمبارەیەوە بکەن، بەئاسانی دەتوانن چاوەڕوان بن، هەروەك پێشتریش چەندانجار ئاوایان کردووە، هاوکات هەروەك ئەفغانەکانیش چەند ساڵە چاوەڕوانی دەکەن. تاڵیبان پێمان دەڵێت: "ئێوە کاتژمێر لەدەست خۆتانە، کاتەکان بەدەست خۆتانە". ئەم نانخواردنی بەیانییە کۆتایی هات، بەڵام بابەتەکان هەر ئاوا بەکراوەیی مانەوە، دواتر شەنەهان پەیوەندی کرد و گوتی کە من بەڕاستی زۆر تووڕەم هەم بەرامبەر هەنگاوەکانی گفتوگۆکردن لەگەڵ تاڵیبان، هەم لە ناوەڕۆکی گفتوگۆکانیش. پۆمپەیۆ تەنیا دەیویست گفتوگۆ لەسەر ڕێککەوتنێك بکات و سەرکەوتن ڕابگەیەنێت، بەبێ هیچ وردەکاریی زیاتر. ئەم دابەشبوونە خەسڵەتی سەرەکی گفتوگۆکانی مانگەکانی داهاتوو دەبێت.

کۆبوونەوەی ساڵانەی وڵاتان چەند هەفتەیەك بەهۆی گفتوگۆی تاڵ لەسەر بودجە و داخراویی هەندێ لە دامودەزگاکای حکوومەت دواخرا. دواجار بۆ ٥ی شوبات دواخرا، کورتەی ڕەوشی ئەفغانستان بەو شێوەیە دەبێ: "لە ئەفغانستان، ئیدارەی ئەمریکا خەریکی ئەنجامدانی گفتوگۆی چڕوپڕە لەگەڵ ژمارەیەك لە گرووپە ئەفغانییەکان کە یەکێك لەوانەش تاڵیبانە. هەروەك ئێمە بەرەوپێشچوونی زیاتر لەو گفتوگۆیانە بەدەست دێنین، ئیدی توانای ئەوەشمان دەبێ ژمارەی هێزەکانمان کەم بکەینەوە و جەختیش لەسەر ڕووبەڕووبونەوەی تیرۆر دەکەینەوە. ئەم قسەیە سەرنجێکی کەمی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، بەڵام بەرجەستەی ئەو ململانێیانەی دەکرد کە تا دواڕۆژەکانی کارکردنم لە کۆشکی سپی هەر بوونیان مابوو. لەگەڵ ئەمەش، بەلایەنی کەم هێشتا کەمێك هیوا هەیە.

## بەشی هەشتەم

## ئاژاوە، وەک ڕێگەیەک بۆ ژیانسازی

"ئەگەر بتوانیت خۆت کۆنترۆڵ بکەیت، لەکاتێك ئەوانیتر
کۆنترۆڵی خۆیان لەدەست دەدەن و لۆمەکەی دەخەنە ئەستۆی تۆ، ئەوا.. "

ڕودیارد کیپلینگ[1] ، لە کتێبی شیعری (ئەگەر).

نزیکەی مانگێکی ویست تا ئەوکاتەی گەیشتمە کۆشکی سپی و کاروبارەکانم گرتنەدەست، ئەوکاتە دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخسا تا بتوانم لەوە تێبگەم ئاخۆ شتەکان چۆن لە ناوەوەدا بەشێوەیەکی سیستەماتیك کار دەکەن. جیاوازیی کارکردن لە زۆر شوێن هەبوو، زۆر کات ئەم جیاوازییانە ناکرێ لە ڕێگەی هەندێ سیاسەتی دیاریکراو شی بکرێتەوە، هەندێکی لەمانەم لەنێو ئەو کتێبەدا ڕوون کردووەتەوە. بەڵێ چەندان کێشە و جیاوازیی زۆر زیاتر هەبوون. لە کۆتایی مانگەکانی ٢٠١٨ و سەرەتای

(١) رودیارد کیپلینگ، نووسەر و شاعیر و رۆماننووسێکی ئینگلیزە. ئەم دێرە شیعرەی لە کۆمەڵە شیعری (ئەگەر) وەرگیراوە و تیایدا هەموو دێرەکانی ئەم چامەیە بە وشەی "ئەگەر" دەست پێدەکات، مەبەستی شاعیر ئەوەیە کە ئەگەر توانیت هەموو ئەو شتانە بکەیت ئەوا هەروەك لەکۆتاییدا ئاماژەی پێداوە ئەوا "هەموو زەوی و ئەوەشی لەسەریەتی دەبن بە مولکی تۆ..."

٢٠١٩، کە هاوکات بوو لەگەڵ ئەوەی ساڵی دووەمی سەرۆکایەتیی ترەمپ بەرەو کۆتایی دەچوو -بەدیاریکراوی هەشت بۆ نۆ مانگ دوای هاتنم بۆ نێو کۆشکی سپی- وادیاربوو چەندان بابەت و کەسایەتی بەیەکدا چوون تا ئیدارەی ترەمپ بەرەو ئاراستەیەکی نادیار ببەن.

بۆ نموونە، لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٨دا، جۆن کێلی تاکتیکێکی نوێی بۆ خشتەی کارەکانی ترەمپ بەکارهێنا، سەرەتاش هیواداربوو لەوەی بتوانێ ئەو سەرلێشێواوییەی هەموو ڕۆژێك لە کاتژمێر ١١ی بەیانی (بەگوێرەی زەوقی ئەوکاتەی سەرۆك دیوان[1] حەزی لێ دەکرد) کە ئەو موحازەرانەی دووجار لە هەفتەیەدا دەربارەی زانیارییەکانی هەواڵگری پێشکەشی دەکرد و بەهۆیەوە دروست دەبوو، کەمی بکاتەوە. بێگومان، ئەوەی زۆر مایەی نارەحەتیی زۆر خەڵك بوو ئەوەبوو کە کارکردنی فەرمی ڕۆژانەی ترەمپ تا نزیکەی کاتی نانی نیوەڕۆ دەستی پێ نەدەکرد. ترەمپ لە کاتی بەیانیدا خاووخلیسك نەبوو. بەڵکو، کاتێکی بەرچاوی بۆ وەڵامدانەوەی پەیوەندییەکان کە بۆ سەرۆکایەتی دەهات، تەرخان دەکرد. ترەمپ لەسەر هەموو هەڵسوکەوتێکی مرۆڤەکان قسەی دەکرد، هەندێك کات لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتی ئەمریکی قسەی دەکرد (من نزیکەی هەموو ڕۆژێك بەر لە هاتنی بۆ کۆشکی سپی لە ڕێگەی تەلەفۆن قسەم لەگەڵی دەکرد، ئەمەش بەهۆی فشاری زۆری کارەکان کە پێویستبوو بیانزانێ یان ئەوانەی من دەبوو بڕیاریان لەسەر بدەم)، بەڵام ترەمپ لەگەڵ خەڵکانی دەرەوەی حکوومەت بەدرێژی قسەی دەکرد. ئەمە خەسڵەتێکی نامۆی سەرۆکە هاوچەرخەکانی ئەمریکایە.

بەپێچەوانەوە، ڕۆژێکی ڕۆتینی جۆرج بوشی کوڕ کە لەلایەن یەکەم سەرۆك دیوانی سەردەمی خۆی و پارێزگاری ویلایەتی پێشووی

---

(1) Chief of Staff

هامبشەیەری نوێ جۆن سۆنونو، وەها وەسف کراوە:

سەرۆك بوش کاتژمێر 8ی بەیانی لە کۆشکی سپی دەستی بە کارەکانی دەکرد، کورتەیەك لەسەر زانیارییە هەواڵگرییەکانی پێشکەش دەکرا کە تیایدا سەرۆك بوش و جێگرەکەی، ڕاوێژکاری ئەنجوومەنی ئاسایش (برێنت سکۆکرۆفت) و من بەشدارییمان تێدا دەکرد. ئەو کۆبوونەوەیە کە مەبەست لە کورتەی کار و چالاکییەکانی سەرۆکە لەلایەن (CIA)وە پێشکەش دەکرا و نزیکەی 10 بۆ 15 خولەکی دەخایەند. دوای ئەمە، بە دیاریکراوی لە کاتژمێر 8:15دا نیو کاتژمێر کات دەدرا بە سکۆکرۆفت تا دوایین زانیاری بدات بە سەرۆك لەسەر ئەو بابەتانەی پەیوەستبوون بە سیاسەتی دەرەکی، بەتایبەتی ئەوانەی شەوی ڕابردوو ڕوویاندابوو و ئەوانەشی پێشبینی دەکرا لە چەند ڕۆژی دواتردا ڕووبدەن. دوای ئەم کورتەیە پاشان لە کاتژمێر 8:45 خولەکدا دەچووینەسەر کورتەیەکی دیکە کە من پێشکەشم دەکرد، تیایدا باسی هەموو بابەتەکانی دیکەم دەکرد لەودیوی ئەوانەی پەیوەندییان بە سیاسەتی دەرەکی ئەمریکاوە هەبوو. سکۆکرۆفت عادەتەن گوێی لە قسەکانی منیش دەگرت. کۆبوونەوەی من لەگەڵ ئەمانە بەگوێرەی خشتەی کارەکان، دەبوو لە کاتژمێر 9:15 خولەکدا کۆتایی پێ بێت.

من بیرم دەکردەوە لەوانەیە بمرم و بچمە بەهەشت ئەگەر بتوانم ڕۆژێکی ئاوا ڕێکوپێك هاوشێوەی ئەوەی سەرەوە بۆ ڕووداوێکی داهاتوو ئامادە بکەم. هەروەك وەك نەریتێك وایە، ترەمپ هەفتانە دووجار کورتەیەکی لەسەر زانیارییە هەواڵگرییەکان دەدا، لەنێو زۆربەی ئەو کورتەقسانەشی، زیاتر لەو کەسانەی پێشتر کورتکراوەیان داوە قسەی دەکرد، زۆربەی

کات لەسەر ئەو بابەتانە قسەی دەکرد کە پەیوەندی بە بابەتە بنەڕەتییەکەوە نەبوو.

مامەڵەکردن لەگەڵ خشتەی کارەکانی ڕۆژانەی ترەمپ ئاسانترین شت بوو. بەڵام یەکێك لە زەحمەترین شتەکانی ترەمپ مامەڵەکردن بوو لەگەڵ ڕق و کینەکەی، نموونەش ئەو ڕق و تەقینەوانەی بوو کە بەرامبەر جۆن مەککەین هەیبوو، تەنانەت کە مەککەین مرد، ترەمپ ئیدی لەوانەیە ئەو کات بوەستێ و چیدیکە زیانی بۆی نەبێت. یەکێکی دیکە لە کارە تروهاتەکانی ترەمپ بڕیارەکەی ڕۆژی ١٥ی ئابی بوو، کاتێ ڕەتی کردەوە بەڕێوەبەری پێشووی (CIA) جۆن برێنان دەسەڵاتی بەدەستگەیشتنی هەندێ زانیاریی ئاسایشیی هەبێ. ئێستا، جۆن برێنان هیچ نرخێکی بۆ نەماوەتەوە، لە ماوەی کارکردنی ناوبراویشدا، (CIA) لە هەموو کاتێك زیاتر لە مێژووی خۆیدا بە سیاسی کرابوو. برێنان نکۆڵی لەوە کرد کە هیچ هەڵسوکەوتێکی هەڵەی ئەنجام دابێ، بەڵام ترەمپ باوەڕی وابوو کە برێنان بە قووڵی ئیستغلالی یاسایی چاودێری هەواڵگری دەرەکی (FISA)ی کردووە تا سیخوڕی لەسەر هەڵمەتی هەڵبژاردنی ٢٠١٦ بکات، هەموو ئەمانەش لە دوای ئەوە هات، کە دەسەڵاتی گرتەدەست و بەردەوام لە میدیاکان بەدەردەکەوت و ڕەخنەی لە ترەمپ دەگرت.

دوای ئەوەی سارا ساندەرز لە کورتەی کۆنفراسی شەوانەی باسی لێوە کرد، ئیدی میدیاکان بەخێرایی کاردانەوەیان نیشاندا و ئەمەیان ڕەت کردەوە. کێلی پێی گوتم "ئەو کێشەیەی برێنان دەتەقێتەوە"، کاتێکی زۆری ئەو نیوەڕۆیەی بەم بابەتەوە بەسەربردبوو. "ئەمەیان کێشەیەکی گەورە بوو". لە گفتوگۆیەکی یەك کاتژمێریدا کە لەنێوان هەردووکمان بەڕێوەچوو، بەیەکەوە باسمان لەوە کرد کە چی ڕوویداوە. کێلی گوتی لەنێوان ناوەڕاست بۆ کۆتایی حوزەیران، پێی وابوو توانیویەتی بابەتی وەستاندنی دەسەڵاتی گەیشتن بە زانیاریی ئاسایشی لە ئاوەزی ترەمپدا

کۆتایی پێ بێنێت، بەڵام ترەمپ دەگەڕایەوە سەر ئەمە، چونکە میدیای دڵخوازی ترەمپ هەردەم لەسەر ئەو بابەتە قسەوباسیان هەبوو. سەرەتای ئەو ڕۆژە، دەیویست دەسەڵاتی بەدەستگەیشتنی زانیاریی ئاسایشی لە زۆر کەس وەربگرێتەوە کە لەنێو لیستێکی درێژدابوون و وای دانابوو سارا ساندەرز لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییدا بیانخوێنێتەوە، بەشێوەی ناڕاستەوخۆ دەیویست هەڕەشە لەوانە بکات کە لە داهاتوودا ئەو دەسەڵاتەیان لێ دەسێنێتەوە. منیش گوتم تەواوی بیرۆکەی ئەمە لەگەڵ (ڕاند پاوڵ) دەستی پێ کرد. ئەم کارە جوولەیەکی سیمبۆلی بوو، چونکە مانای وابوو تەنانەت دەسەڵاتی بەدەستگەیشتنی زانیاریی ئاسایشی چیتر ئەوە ناگەیەنێت کەسانی وەك برێنان یان هەر کەسێکی دیکە دەتوانێ بە دڵی خۆی بێتەنێو (CIA)و هەرچییەکیش جێگەی بایەخی بێ، بیخوێنێتەوە. ئەو کەسانە لەمەودوا پێویستە ڕێوشوێنی شتەکان بزانن و هەرشتێکیش کە زۆر گرنگ بێت پێویستە لەنێو شوێنێکی گونجاودا بیخوێننەوە.

کێلی گوتی لەبارەی ئەمەوە قسەم لەگەڵ ترەمپ کردووە و ئەمە یەکەم بەرکەوتنی توندم نییە لەگەڵی، بەڵام قسەکانی ئەوجارەی زۆر لەوانەی پێشتر توندتر بوون. کێلی بە ترەمپی گوتبوو ئەوەی دەیکەی لەگەڵ "سەرۆکایەتیی ئەمریکا" ناگونجێ، کە ئەمە قسەیەکی ڕاستبوو. کێلی بە منیشی گوت ئەوە لە سەردەمی (نیکسۆن) وابوو، کە ئەم قسەیەشی هەر ڕاستبوو. کێلی پرسیاری لێم کرد "ئاخۆ هیچ سەرۆکایەتییەك لەوانەی پێشوو بەم شێوەیە بووە؟" منیش دڵنیام کردەوە کە هیچیان وانەبوونە. من پێم وابوو ئەو کەیسە لە دژی برێنان دروستکراوە و تۆمەتی ئەوەی دەخەنەپاڵ کە کارەکانی (CIA)ی بەسیاسی کردووە، بەڵام ترەمپ بەهۆی ئەو مامەڵە سیاسییە ئەنقەستەی پیادەی کردووە، بابەتەکەی پەردەپۆش کردووە. پێم وایە هەرچەند زیاتر ئەو دەسەڵاتە لە کەسەکان وەربگیرێتەوە، ئەوا ڕەوشەکە خراپتر دەبێت. (کێلی)یش ڕازیبوونی خۆی لەسەر ئەمە نیشاندا.

تا ئەو خاڵە ئەوەی لەنێوانمان هەبوو بریتی بوو لە گفتوگۆیەکی سۆزدارانە، دواتر کێلی وێنەی کوڕەکەی پێ نیشاندام کە لە ساڵی ٢٠١٠ لە ئەفغانستان کوژرابوو. هەر ئەو ڕۆژە ترەمپ بە کێلی گوتبوو: "تۆ زۆرترین ناڕەحەتی و ناخۆشیت دیووە و خەمی زۆرت خواردووە." لەوکاتەی ترەمپ بە کەم سەیری شەڕی ئەفغانستان و عێراقی دەکرد، وەك بڵێی دەیەوێ بڵێ کوڕەکەی کێلی بێ ئەوەی پێویست بێ خۆی بەکوژ داوە، بەواتایەکی دیکە، کوڕەکەی لەپێناو هیچدا مردووە. کێلی گوتی "ترەمپ گوێنادا بەوەی چی بەسەر ئەو خەڵکانە دادێ، تەنانەت گوتوویەتی کارێکی (باش) دەبێ گەر ڤەنزوێلاش داگیر بکەین." لە ماوەی ئەم گفتوگۆیەمان قسەیەکی کەمم لەسەر ڤەنزوێلا کرد و کێلی زیاتر باسی لە بێهیواییەکانی خۆی دەکرد. لەگەڵ کەمێکی نەبێ، ئەگەرنا لەگەڵ زۆرێك لە قسەکانی بووم. نەمدەتوانی ببینم لەوەی چۆن گونجاوە و دەکرێ کێلی تا هەڵبژاردنەکانی ٢٠٢٠ بمێنێتەوە، بەوپێیەی ترەمپ چەند هەفتەیەکی پێشتر ڕایگەیاندبوو هەڵمەتەکان بەڕێوە دەبات. کاتێ نووسینگەی (کێلی)یم بەجێ هێشت، هیچ شتێکم لەمانە بە کەس نەگوت.

تەقریبەن وەك شتێکی بێهاوتا لە مێژووی سەرۆکایەتی ئەمریکادا، بەدیاریکراوی لەمەڕ ئەو مشتومڕەی لەسەر بەشداریکردنی سەرۆکەکان لە پرسەکان هەبوو، ترەمپ لەمپەری دروستکرد. سەرەتا لەگەڵ مردنی باربارا بوش لە نیسانی ٢٠١٨دا، تیایدا ترەمپ و (چوار لە سەرۆکەکانی پێشووتری ئەمریکا و خانمی یەکەمی ئەمریکا) بەشدارییان نەکرد، دواتر لە کۆتایی ئاب بەشداری پرسەی (جۆن مەککەین)یشی نەکرد. کێلی لە ٢٧ی ئاب دەستی کرد بە کۆبوونەوەی ستافی کۆشکی سپی بە گوتنی: "من ئەمرۆ لە ڕەوشێکی خراپدام، ئەویش بەهۆی ئەو جیاوازییە بەردەوامەی لەگەڵ ترەمپ هەمە، بەوەی ئاخۆ بەهۆی مردنی جۆن مەککەینەوە ئاڵای حکوومەتی ئەمریکا نیوەی بهێندرێتەخوارەوە و

(کێ)ش بەشداریی پرسەکەی دەکات. بنەماڵەی مەککەین نایانەوێ ترەمپ لەو پرسەیە بەشداری بکات، کەوابێ هەستی هەردوولا هاوبەشە. بڕیاری کۆتایی ئەوەبوو کە مایك پێنس نوێنەری ئیدارەی ترەمپ دەکات هەم لەو ڕێورەسمەی لە کۆشکی سپی بەڕێوە دەچوو، هەم ئەوەشی لە کڵێسای نیشتیمانیی واشنتۆن ساز دەکرا. خەڵکێکی بەرچاو بەشداری پرسەکەیان کرد، تەنانەت چەندان دۆستی لە کاتی گیانەڵلاشدا بەشێوەیەکی ڕۆتینی ئامادەگییان هەبوو. من، هەر لەوێدا چاوم بە سەرۆك جۆرج بوشی کوڕ و خێزانەکەی کەوت، تیایدا جۆرج بوش پرسی: "جۆن هێشتا لەو کارەت بەردەوامی؟" منیش گوتم: "هەتا ئێستا جارێ وا ماوم"، دواتر هەموومان پێکەنین. دواتر، کاتێ جۆرج بوشی باوك کۆچیدوایی کرد لەمیانەی کۆبوونەوەی (G20) لە بۆینس ئایرێس، ترەمپ ڕۆژێکی وەك پرسەی نیشتمانی ڕاگەیاند و ڕاگەیاندراوێکی گونجاوی سەرۆکایەتی بڵاوکردەوە، بەگەرمیش لە بەیانییەکەیدا لەگەڵ جۆرج بوشی کوڕ و جێب بوش دوابوو. ترەمپ و خانمی یەکەمی ئەمریکا بەشداری ڕێورەسمەکەیان کرد کە لە کڵێسای نیشتیمانی بەبێ هیچ کێشەیەك لە ٥ی کانوونی یەکەمدا بەرێوەچوو. دوای هەموو ئەمانە، بەشداریکردن کارێکی ئەوەندە زەحمەت نەبوو.

لەمیانەی ئەو مشتومڕەی لەسەر پرسەی مەککەین دروست ببوو، ترەمپ تویتێکی کرد کە تیایدا نووسیبووی کۆنسوولی کۆشکی سپی -دۆن ماکگاهن- دوای یەکلاییکردنەوەی کێشەکەی برێت کەڤەناوف، کارەکەی کۆتایی دێت. ماکگاهن زۆرکات نوکتەی بۆ دەگێڕامەوە و گوتی: "ئەمڕۆ تەنیا یەك تویتمان بڵاوکردووەتەوە"، ئەمەیان جۆرێك بوو لە نموونەی کارەکانی ترەمپ بەوەی لە ڕێگەی تویت بڕیارەکانی بڵاودەکردەوە کە پێشتر بڕیاری لەسەردابوو، بەبێ ئەوەی دەرفەتێك بە ماکگاهن بدات سەرەتا خۆی ڕایبگەیەنێت. من دەبوو سەرنجی زیاتر و

نزیکتر بە شتەکان بدەم. هەروەك دواتر کێلی پێی گوتم کە گرژیی نێوان ترەمپ و ماکگاهن هیچ پاساوێکی بۆ نەماوەتەوە، چونکە ماکگاهن (بەڕاستی) شایەتی لە دژی ترەمپ داوە و هاوکاری (ڕۆبەرت میولەر[1])ی کردووە بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانی. تەنانەت لەگەڵ ئەوەی پارێزەرانی دەرەکی ترەمپ ئەم ڕۆڵەی (ماکگاهن)یان پشتڕاست کردەوە و قبووڵیان کرد، کەچی سەرسامی کەسایەتی ماکگاهن بوون بەوەی چەندە کەسێکی ڕاستگۆ و قسەڵەڕوو بووە. لە هەر ڕووداوێکی ئاوادا، گەڕان بە دوای کەسی جێگرەوە ئاسان بوو، ڕاستەوخۆش جێبەجێ دەکرا.

---

کۆچبەرە نایاساییەکان، وەك دەستپێشخەرییەکی سەرەکیی ترەمپ ئەویش کێشەی زۆری دروست کردبوو. پارێزەری کۆشکی سپی، جۆن ئایزنبێرگ لە ناوەڕاستی مانگی مایسدا هاتە لام تا بزانێ ئاخۆ هیچ بژاردەیەکم هەیە بۆ سیاسەتی وێرانبووی کۆشکی سپی بەرامبەر بە کۆچبەران بەگشتی و خودی بابەتی دروستکردنی سنووریش لەگەڵ مەکسیك. من بەبێ پشتگیریی تەواوی کونسوولی کۆشکی سپی و وەزارەتی داد هیچ بایەخێکم بۆ ئەم بابەتانە نەبوو و نەشمدەویست تێکەڵی ببم. دۆن ماکگاهن لە هەموو ساتەوەختێك بەهۆی چەندان هۆکار جەختی دەکردەسەر بژاردەکانی دەسەڵاتی دادوەری، پێی وابوو ئەو سیاسەتەی بەرامبەر کۆچبەران دانراوە بۆ ئەوەیە بەسەر کۆچبەراندا زاڵبێت، بۆیە بڕیاری دا خۆی لەمە بەدوور بگرێت. بەهەرحاڵ، ئێستا ئاگاداری لەبارەی ڕەوشەکە درابوو، من بەردەوام چاوم لەسەر ئەم کێشەیە بوو، بەڵام زیاتر شوێنی مامەڵەکەی ماکگاهن کەوتم.

---

(١) ڕۆبەرت میولەر ڕاپۆرتێکی بڵاوکردبووەوە، تیایدا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەستوەردانەکانی ڕووسیا بۆ هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا ساڵی ٢٠١٦ کردبوو.

سەرەتا ئاشنابوونم بەو کێشەیە بۆ ئەو کۆبوونەوەیەی کابینەی حکوومەت دەگەڕێتەوە، کە لە ٩ی مایس لەسەر کۆچبەران ئەنجامی دا، ئەمە ڕۆژێك دوای کشانەوەمان بوو لە ڕێککەوتننامەی ناوکی لەگەڵ ئێراندا. وەزیری ئاسایشی نێوخۆ کریستن نیلسۆن و داواکاری گشتیی ئەمریکا جێف سیشنز خەریکی پێدانی زانیاری بوون لەمەڕ ئەوەی وەزارەتەکانیان خەریکی چین بۆ داخستنی سنوور لەگەڵ مەکسیك، دواتریش ئەندامانی دیکەی کابینەی حکوومەت باسیان لە ڕێوشێوینەکانی خۆیان کرد. بەڵام ئەمانە وەك "کورتکراوەیەك" نەدەبوو بەرامبەر ئەو هەوڵانەی ئەندامانی تیمەکەی ئەنجامیان داوە کە ترەمپ دەبوو بە سوپاسگوزارییەوە گوێیان لێ بگرێت. ترەمپ دواتر هەندێ پرسیاری کرد، پاشان هەندێ دەستخۆشی لێ کردن. دوای ئەوەی سیشنز لە قسەکانی بووەوە شتەکان بەرەو خراپی چوون، هەر لەوکاتەشدا نیلسۆن دەستی بە قسەکردن کرد. ترەمپ پرسیاری لێ کرد بۆچی ناتوانین سنوور دابخەین، (نیلسۆن)یش لە وەڵامدا باسی لەو هەموو زەحمەتییانە کرد کە خۆی و وەزارەتەکەی (وەزارەتی ئاسایشی ناوخۆ) دووچاری بوونەتەوە. ترەمپ قسەکانی بڕی، لەبەردەم تەواوی ئەندامانی کابینەکەی و دەستەیەك لە یاریدەدەرەکان دەنگی بەرزکردەوە و پێی گوت: "تۆ هەڵەی. هیچ ڕێگەیەك نییە ناتوانین سنوور دابخەین. بەو خەڵکانە بڵێ کە وڵاتەکەمان داخراوە. ئێمە خەڵکی ئاوامان نییە (نموونەش وەك دادوەریی تایبەت بە کۆچبەران) تا مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە شتانە بکات. کاتێ وڵات پڕ دەبێ لەمانە، هاوشێوەی شانۆی نمایشکردنی فیلمی لێ دێت."

ئەمەیان هەر خۆی پێشووتر وەك مردوو وابوو، بەڵام ئەمجارەیان خراپتر بوو. جۆن کێلی هەوڵی دا پشتگیری نیلسۆن بکات، بەوپێیەی ناوبراو کاریگەری لەسەری هەبوو و وەك مامۆستاشی وابوو، بەڵام ئەمە هەڵەبوو. هەموو کەسێك دەیزانی کە نیلسۆن تارادەیەکی زۆر بەهۆی (کێلی)یەوە لە

پۆستی وەزیری ئاسایشی ناوخۆ دانرابوو، ئەم دەستوەردانەشی وای کرد وەك بڵێی نیلسۆن نەتوانێ بەرگری لە خۆی بکات، کە بەداخەوە وا دەرکەوت ئەمە لەبەردەم ژووری کۆبوونەوەی وەزیرەکانی ئەمریکا ڕاستە. کێلی و نیلسۆن هەوڵیان دا شتەکان پەیوەست بکەن بە (سیشنز)ەوە، کە ئەویش لای خۆیەوە وادیاربوو دەیەوێ شتێکی نوێ و جیاواز بڵێت لەمەڕ دەسەڵاتی وەزارەتی ناوخۆ، لەسەر بابەتی سنوور. سیشنز وادیاربوو نارەحەتە کاتێ باسی لەم بابەتە دەکرد و پێچەوانەی خواستی دڵی خۆی دەجووڵایەوە، بەشێوەیەکی بنەڕەتی گوتی کە وەزارەتی ناوخۆ دەسەڵاتی ئەوەی نییە سنوور دابخات و ڕوونیشی کردەوە بۆچی ئەو دەسەڵاتەیان نییە. کێلی وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئێمە ئەوەی داواکاری گشتی داوای دەکات ئەوە جێبەجێ دەکەین، بۆیە ئەمە کارێکی نایاساییە و هەر لەبەر ئەمەشە کۆچبەران ڕەوانە دەکەینەوە"، سیشنز لەلای خۆیەوە زیاتر دەمارگیر بوو، بەڵام ترەمپ هێشتا بەدوای (نیلسۆن)ەوە بوو، هیچ هۆکارێکیشی لەبەردەست نەبوو ئاخۆ بەبێدەنگی بمێنێتەوە یان قسە بکات، دواتر گوتی: "جەنابی سەرۆك چەند ڕۆژێکی دیکە بە وەڵامێکی باشتر دەگەڕێینەوە لات." دواجار، وەك بڵێی هەموو خاڵێکیان لەبیر کردبێ، بۆیە ترەمپ گوتی: "من لەبەر ئەم بابەتە هەڵبژێردراوم، ئێستاش خەڵك دەنگم پێ نادەنەوە"، ئەم قسەیەی هەندێ ڕاستیی سیاسی تێدابوو. لەوکاتەی خەریك بوو کۆبوونەوە بەرەو کۆتایی دەچوو، پێم وابوو مەسەلەکە تەنیا کاتە، ئەگەر نا هەریەك لە نیلسۆن و کێلی دەست لە کار دەکێشنەوە. هەروەها بەگوێرەی ژمارەیەك لە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکان، دوای ئەمە نیلسۆن زۆر لە نووسینگەی (کێلی) نزیك دەبوویەوە. ئەم کێشەیە تەواو بێمانا و زەروریش نەبوو، چونکە دەکرا زۆر کاری باشتر لە دژی ئەو بانگەشە دەستبڕ و قبووڵنەکراوانە بکرێ، کە پەیوەستن بە بابەتی کۆچبەران لەنێو ئەمریکادا.

شته‌كان له‌ ٢٠ی حوزه‌یران خراپتربوون. له‌ سیاسه‌تێك كه‌ "هیچ لێبوردەییه‌كی" تێدا نه‌بوو، ترەمپ ئاماده‌كاری كرد تا منداڵان له‌ دایك و باوكیان جیابكاته‌وه‌ (یان ئه‌و خه‌ڵكانه‌ی كه‌ بانگه‌شه‌یان ده‌كرد كه‌ دایك و باوكی ئه‌و منداڵانه‌ن، به‌ڵام زۆرینه‌ی ئه‌و منداڵانه‌ بازرگانییان پێوه‌كرابوو) له‌سه‌ر سنووردا، هه‌روه‌ك ئیداره‌كانی پێشووتری ئه‌مریكاش ته‌نانه‌ت خودی ئیداره‌ی ئۆباماش ئه‌و كارانه‌یان ئه‌نجام داوه‌. به‌ڵام له‌ژێر فشاری سیاسییدا، ترەمپ دژی بڕیاره‌كه‌ی خۆی وه‌ستایه‌وه‌، هه‌ریه‌ك له‌ (نیلسۆن و سیشنز)ی سزادا. دوای ئه‌وه‌ی فه‌رمانی جێبه‌جێكردن كه‌ هیچ لێبوردەییه‌كی له‌خۆنه‌گرتبوو، واژووكرا، كێلیش چووه‌ ماڵه‌وه‌. ڕۆژی دواتر كێلی بۆمی دووپاتكرده‌وه‌ كه‌ پێی وایه‌ ترەمپ (نیلسۆن و سیشنز)ی دوورخستووه‌ته‌وه‌، به‌ڵام هیچ كه‌سێك پلانێكی ڕاسته‌قینه‌ی نییه‌ تا بزانین له‌ داهاتوودا ده‌بێ چی بكه‌ن. بابه‌تی كۆچبه‌ران هاتبووه‌ نێو گفتوگۆكان تا په‌سه‌ند بكرێت، هه‌روه‌ها هه‌وڵیش هه‌بوو بۆ په‌سه‌ندكردنی ڕێككه‌وتننامه‌ی (NAFTA[1]) له‌گه‌ڵ كه‌نه‌دا و مه‌كسیك و پرۆگرامی كۆمه‌كه‌ ده‌ره‌كییه‌كانی ئه‌مریكای ناوه‌ڕاست، هاوكات چه‌ندان ململانێ و شه‌ڕه‌قسه‌ش هه‌بوو له‌نێوان وه‌زاره‌تی داد، ناوخۆ، ته‌ندروستی و خزمه‌تگوزارییه‌ مرۆییه‌كان، ده‌وڵه‌ت و چه‌ندان لایه‌نی دیكه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كێ له‌م بابه‌ته‌ به‌رپرسیاره‌؟ ئه‌م كێشانه‌ به‌زۆری په‌یوه‌ندی به‌و ئاژاوه‌یه‌ هه‌یه‌ كه‌ له‌نێو داڕێژه‌رانی سیاسه‌تی نێوخۆییدا بوونی هه‌یه‌، كێشه‌یه‌ك كه‌ هیچ ئاماژه‌یه‌ك نییه‌ ئاوا به‌ئاسانی كه‌م بێته‌وه‌ و به‌ره‌و چاره‌سه‌ری بچێت.

سه‌ره‌ڕای هه‌وڵه‌كانم بۆ خۆبه‌دوورگرتن له‌ بابه‌تی كۆچبه‌ران كه‌ خه‌ریك بوو وروژابوو، كه‌چی هه‌ر به‌دوامه‌وه‌ ده‌هات. له‌ ٤ی تشرینی یه‌كه‌مدا،

(١) ڕێككه‌وتننامه‌ی ئه‌مریكای باكووری بۆ بازرگانی ئازاد North American Free Trade Agreement:

جارێد کۆشنەر بەهۆی ئەو هەوڵەی بۆ پێداچوونەوەی ڕێککەوتننامەی (NAFTA) هەبوو، هات تا چاوی پێم بکەوێت. کۆشنەر گوتی نیلسۆن و وەزارەتەکەی خەریکی گفتوگۆن لەگەڵ حکوومەتی مەکسیك بەبێ ئەوەی ڕەزامەندیی وەزارەتی دەرەوەیان هەبێ، ئەمەش گەر ڕاستبێت ئەوا پرۆسەیەکە کێماسی هەیە. چەند ڕۆژێك دواتر و لە ڕۆژی شەممەدا، کۆشنەر تەلەفۆنی کرد تا بڵێت کە ترەمپ خۆی ئەم کەیسەی کۆچبەران دەگرێتەدەست، ترەمپ وا هەست دەکا پاشەکشەی کردووە، چونکە پێی وایە کێلی خەریکی پاراستنی (نیلسۆن)ە لەهەمبەر ئەو دەرئەنجامانەی بێتوانایی خودی نیلسۆن دروستیان کردووە، هەر ئەمەش وای کردووە ئەم کێشەیە بێ چارەسەر بمێنێتەوە. ترەمپ پرسیاری کرد: "ئەی جۆن بۆڵتن؟ ئایا دەتوانێ ئەو کەیسە بگرێتە دەست؟" کۆشنەر گومانی هەبوو لەوەی لەوانەیە من وەك (جۆن بۆڵتن) هیچ مەبەستێکم نەبێ ئەو کێشەیە وەربگرم، بەڵام ترەمپ گوتبووی: "جۆن کەسێکی مەزنە، دەتوانێ کۆتایی بەو کێشەیە بهێنێت. ئەو دەتوانێ هەموو ئەو بڕیار و پێویستییانەم بۆ فەراهەم بکات. بەڕاستی جۆن کەسێکی مەزنە. ئایا دەتوانی داوا لە جۆن بکەی تا ئەو کێشەیە بگرێتە دەست؟" کۆشنەر گوتی هەر کەسێك کە ترەمپ هەڵی دەبژێرێ ئەوە دووچاری شەڕ دەبێ لەگەڵ کێلی، ترەمپیش لە وەڵامدا گوتی: "جۆن لە شەڕەکان ناترسێت. ئەو دەتوانێ بەسەر کێلیدا سەر بکەوێت." زۆر جوانە، پێم وایە ئەو شەممەیەکی گەورە بوو بۆ من.

لە بەیانیی ڕۆژی دووشەممە لە یادی ڕۆژی (کۆلۆمبەس[1])دا، چاوم بە ستیڤن میلەر کەوت، ئەو کەسەی کە سەرکردایەتی سیاسەتی کۆشکی سپی دەکرد لە بابەتی کۆچبەراندا. هەروەك ئێمە قسەمان دەکرد، کۆشنەر

---

(١) ڕۆژی کۆلۆمبەس، ئەم ڕۆژە لە ئەمریکا و زۆر شوێنی دیکە وەك پشووی نیشتیمانی دیاریکراوە. لە ئەمریکا ئەو ڕۆژە هاوبەرواره لەگەڵ ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٤٩٢ کە لەو ڕۆژەدا کۆلۆمبەس گەیشتووەتە ئەمریکا.

هاتەلامان و پرسیاری کرد: "دەتوانم بەشداری ئەو پیلانگێڕییە بکەم؟" من پێشتر ئیمەیلم بۆ پۆمپەیۆ کردبوو، ئەویش لای خۆی ڕازیبوو کێشەی پەڕینەوەی کۆچبەرانی مەکسیکی پێویستە بەشێوەیەکی کاریگەرتر بخرێتەنێو بەرنامەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە، کە چەندان مانگە ئەگەر چەندان ساڵیش نەبێ بەهۆی نەبووی هەماهەنگی لەنێو وەزارەتی ناوخۆدا بێهیوایی دروست کردووە و هەر ئاوا بە هەڵپەسێردراوی ماوەتەوە. وەزارەتی ناوخۆ نەیدەویست هەماهەنگییان لەگەڵدا بکرێ. ڕوانینی کەسی خۆم ئەوەبوو کە ئەمریکا سوود لە سیستەمێك وەردەگرێ گەر بابەتی کۆچبەران زیاتر بەیاسایی بکرێت و کۆنترۆڵ بکرێت، لەکاتێکدا کۆچبەرانی نایاسایی دەبێتەهۆی وێرانکردنی بنەما سەرووەرییە سەرەتاییەکان کە ئەمریکا بڕیاری لەسەر داوە بەوەی هەر کەسێك ڕێگەی پێ بدرێ، ئەوا وەك کۆچبەر هەژماری بۆ ناکرێت. یەك شت هەبوو بۆ من ڕوون و ئاشکرابوو: هەوڵەکەی نیلسۆن بۆ هێنانی کۆمسیاری باڵای یوئێن بۆ کاروباری کۆچبەران بۆ ئەوەیە یارمەتیمان بدات تا بڕیار بدەین بەوەی هەرچی ددان بەو یاسایەی ئەمریکا بنێت، ئەوا بە خراپی گیرۆدە دەبێت، چونکە یاساکە کەموکووڕی تێدایە. ئێمە ناتوانین دەستبەرداری ئەم جۆرە بڕیارە بنەڕەتی و سەربەخۆیانە بین لە بەرامبەر دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتییدا.

لە کۆتایی ئەم هەفتەیەدا، دوای ئەنجامدانی کۆبوونەوەیەکی ناپەیوەندیدار لەنێو کۆشکی سپییدا کە تیایدا نیلسۆن، پۆمپەیۆ و چەند کەسێکی دیکە بەشداربوون، ترەمپ دیسانەوە هێرشی کرد و گوتی: "ئێمە خەریکی خراپترین کارین لەسەر بابەتی سنوور لەنێو تەواوی ئیدارەکانی ئەمریکادا. من توانیم بەسەرکەوتوویی ئەو بابەتە تێپەڕێنم. ئێمە خاوەن فریاگوزارییەکی نەتەوەیین." ترەمپ دواتر دووپاتی قسەکانی کردەوە تا لەنێو بودجەی پێنتاگۆندا پارەیەکی دەستکەوێ بۆ بنیاتنانی ئەو دیوارە

سنوورییە کە ماوەیەکی زۆربوو بەڵێنی لەسەر دابوو. نیگەرانیی ترەمپ بەشێکی پەیوەستبوو بەو ڕاپۆرتە میدیاییە وروژێنەرانە دەربارەی "کاروانی ئەو کۆچبەرە نایاساییانەی لە ناوەڕاستی ئەمریکاوە بەرەو سنووری ئێمە دەهاتن، کە تیایدا ترەمپ ئەمەی وەك بەڵگەیەکی ئاشکرا دەبینی و یەکانگیر نەبوو لەگەڵ ئەو بەڵێنەی لە هەڵمەتی ۲۰۱٦دا دابووی. ترەمپ ڕووی لە نیلسۆن کرد و گوتی: "تۆ بەرپرسیاری لە سەلامەتیی سنوور"، دواتر ڕووی لە پۆمپەیۆ کرد و گوتی: "تۆ پەیوەندیت بەو کارە نییە." ئەمە ڕاستەوخۆ پێچەوانەی ئەوەبوو کە لە ڕۆژی شەممەدا بە (کۆشنەر)ی گوتبوو و قەناعەتیشی بە من هێنا کە هاوکات دڵخۆشیش بووم، بەوەی هەندێك لەو بابەتەدا ئەوەندەی بکرێ کاری تێدا بکەم. ئەم چەلەحانێیە لەنێوان ترەمپ و نیلسۆن درێژەی کێشا. لە یەکێك لە خاڵەکاندا، پۆمپەیۆ بە چرپەوە پێی گوتم: "کەوابێ ئێمە بۆچی هێشتا لێرە دانیشتووین؟" پرسیارێکی جوان بوو. ئێمە پێویستە ڕێگەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەو شەمەندەفەرە تێکشکاوە، بەرلەوەی ترەمپ بەهۆی شکستهێنانی سیاسەتەکەی تایبەت بە بابەتی سنوور، گلەیی لە ئێمە بکات!

بەهەرحاڵ، بەگوێرەی قسەی کۆشنەر بێت، هەروەها بەگوێرەی ئەو کۆبوونەوەیەی دوای نێوان ترەمپ و نیلسۆن، وای کردووە ترەمپ قەناعەتی بێ کە من وەك جۆن بۆڵتن کۆنترۆڵی ئەو بابەتی سنوورە بگرمە دەست. دوو ڕۆژ دواتر کۆشنەر بە منی گوت: "کریستن ئاوەزی ئەوەی نییە ئەو کارە چارەسەر بکات." ترەمپیش بە منی گوت: "تۆ کۆنترۆڵی سنووری باشوور دەگریتەدەست. نیلسۆن هەرچی کەیس هەیە دەیدۆڕێنێت. ئەو بەڕاستی زۆر لاوازە." ترەمپ دەیویست فریاگوزارییەکی نیشتیمانی ڕابگەیەنێت و پێشتریش لەسەر ئەمە لەگەڵ جۆن ئایزنبێرگ قسەی کردبوو. ترەمپ گوتی: "ئێستا دەسەڵاتی تەواوی منت پێ دراوە، یەك شت پێویستە بیکەی کۆنترۆلکردنی سنووری باشوورە. من و تۆ

بەیەکەوە. تۆ بەڕێوەبەری نەفرەتیی ئەم کارەی." چەند کاتژمێرێك دواتر، کە تەنیا لەگەڵ من و کێلی بوو لەنێو کۆشکی سپیدا، ترەمپ گوتی: "من بە جۆن بوڵتنم گوتووە کۆنترۆڵکردنی سنوور بگرێتەدەست." ئەم بابەتە جددیەتی زیاتری وەرگرت. بۆیە، منیش بڕیارم دا نەخشەی ئەو پرۆسەیە دیاری بکەم تا لەو ڕێگەیەوە کۆنترۆڵی کێشەی کۆچبەرە نایاساییەکان بکەین. ئەگەر ترەمپ ڕەزامەندی لەسەر نیشاندا، ئەوا منیش هەنگاوی بۆ دەهاوێژم، ئەگەریش نا، ئەوا چەندان کاری دیکەم هەیە تا بیانکەم.

(پلان)ێکی یەك لاپەڕەیەیم دانا کە تیایدا دەسەڵاتی نێودەوڵەتی بۆ گفتوگۆکردن لەلایەن وەزارەتی دەرەوە، دووبارە نووسینەوەی هەموو ڕێکارە پەیوەندیدارەکانی هەریەك لە وەزارەتەکانی ناوخۆ و داد، پێشنیارێك بۆ لابردنی یاسا نوێیەکە، بەرەوپێشبردنی دەسەڵاتی سیاسیی (ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی)، دانانی کەسانی نوێ بۆ شوێنی نیلسۆن و سیشنز و چەندان بابەتی دیکەش لەنێو ئەو لاپەڕەیەدا باس کرابوون. من ئەم پلانەم بۆ یەك کەس دەنووسی، بەڵام ڕەشنووسەکەم پیشانی هەریەك لە پۆمپەیۆ، میلەر، کۆشنەر، ئایزنبێرگ و چەند کەسێکی دیکەش دا کە بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییان بەم بابەتە هەبوو. لەو نێوەندەدا، بابەتی هاتنی کاروانی کۆچبەران زیاتر دووچاری دەمارگیری دەکردم. ترەمپیش لەلای خۆیەوە تویتی زۆری دەکرد، داوای کرد "فەرمانی جێبەجێکردن" بۆ داخستنی سنوور پێویستە بکرێتە ڕەشنووس، کەشی نێو کۆشکی سپیش هەر گەرموگوڕتر دەبوو. لە بەیانیی ڕۆژی ١٨ی تشرینی یەکەمدا، من و پۆمپەیۆ لە نووسینگەکەم باسی کوشتنی ڕۆژنامەنووس "جەمال خاشوقچی"یمان دەکرد کە لەوکاتەدا کێلی داوای لە هەردووکمان کرد بچین بۆ نووسینگەکەی. لەوێدا، کۆبوونەوەیەکی فراوان هەبوو (نزیکەی ١٥ کەس بەشداربوون) لەسەر بابەتی سنووری مەکسیك، هەر کە من و پۆمپەیۆش چووینە ژوورەوە، کیلّلی کورتەیەکی لەسەر ئەم کۆبوونەوەیە

بۆ باس کردین. کێلی دواتر پرسیاری لە نیلسۆن کرد دەربارەی ئەوەی چ پلانێکی هەیە، کە تیایدا کۆمسیاری باڵای یوئێن بۆ کاروباری کۆچبەران لەنێو ئەو بابەتەدا بوو و دەیویست ئاسانکاری لەنێوان سنووری گواتانامۆ-مەکسیك بکات. نووسینگەی کۆمسیاری باڵا هەر خۆیان بۆمان ڕوون دەکەنەوە لەوەی کێ کۆچبەری یاساییە، مەبەست لەوانەیە کە دواتر دەتوانن بێنە نێو ئەمریکا (یان هەر وڵاتێکی دیکە)، لەوانەی کە نە پاڵێوراون و شیاوی ئەوە نین بێنە ناوەوە، ئیدی ئێمەی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی دووەم ڕەوانەی وڵاتانی ڕەسەنی خۆیان دەکەینەوە.

کیلّلی پرسیاری لە پۆمپەیۆ کرد بۆچوونت چییە، ئەویش بەهێواشی وەڵامی دایەوە وەك بڵێی شتێك دەزانێ لەبارەی ئەوەی نیلسۆن باسی لێوە کرد. منیش هاتمەنێو بابەتەکە (پۆمپەیۆش بەدڵخۆشییەوە ڕێگەی پێ دام) تا بڵێم کە کۆمسیاری باڵا هیچ ڕۆڵێکی ڕاستەقینەی نییە لە کارێکی ئاوادا کە پەیوەستە بە پرۆسەی کاری کۆچبەران، بودجە و کەسەکانیان هەر لەمەوپێش بوونە ئەرك بەسەر بابەتەکەوە، لەنێو شتەکانی دیکەش، نموونەش وەك قەیرانی پەنابەرانی ڤەنزوێلی، بۆیە لە هەر بابەتێکی ئاوادا، ئەمریکا پێویستە بڕیارگەلێك نەدات تا یوئێن لەبڕی خۆی کاروبارەکانی بۆ ئەنجام بدات. نیلسۆن نەیتوانی وەڵامی ئەو خاڵانە بداتەوە، بۆیە من بەردەوام بووم بۆ قسەکردن لەسەر ئەوەی لەمەودوا ڕۆڵی ئاژانسەکانی پەنابەران چی دەبێ، هەروەك لەوکاتەدا نیلسۆن لەنێو وەڵامەکانی گیری خواردبوو. کێلی پرسیاری کرد: "باشە، کەواتە جۆن پلانی تۆ چییە؟" منیش گوتم بێگومان پلانەکەی شتێکە کە هیچ نیازێکم نییە تەنانەت بەرلەوەی بە ترەمپی نیشان بدەم لەنێو ئاپۆرایەکی ئاوادا کە هاوشێوەی یاریگایە، گفتوگۆی لەبارەوە بکەم. بەسانایی گوتم: "بەڵێ، پلانێکم هەیە کە ترەمپ داوای کردووە و هەر لەگەڵ ئەویش گفتوگۆی لەبارەوە دەکەم." ئەم قسەیەم وای لە نیلسۆن کرد ڕاپەڕێت و پشتی لە من بکات و

بڵێت" ئیم! یان شتێکی لەو جۆرەیە. منیش گوتم "لەبەرئەوەیە داوام کردووە بە تەنیا چاوم بە سەرۆك بکەوێت." ئەو گفتوگۆیە تا کەمێکی دواتریش هەر بەردەوام بوو، دەروبەری کاتژمێری ١٠ بەیانی، کاتێك پرسیارم لە کێلی کرد، ئەویش گوتی: "جۆن، پێویستە بچینە کۆشکی سپی تا لەبارەی سعودیەوە قسە بکەین"، تەنیا بۆ بیرخستنەوەی هەمووان کە هێشتا تەواوی جیهان لەمەدا بێئاگان. دواتر، پۆمپەیۆ، کێلی و من ڕۆیشتین. شیاوی باسە، ئەو گفتوگۆیە ئەوەندە گەرم و دژوار نەبوو کە هاوارمان بەسەر یەکتری کردبێ، هەروەك دواتر هەندێ میدیاکاری گەمژە باسیان لێوە کردبوو.

لە کۆشکی سپی لەسەر کوشتنی ڕۆژنامەنووس جەمال خاشوقچی لەگەڵ ترەمپ گفتوگۆمان دەکرد، کاتێ مادلین وێستەرهاوت[1] هاتەژوورەوە و گوتی کە جارێد کۆشنەر دەیەوێ زانیاریی ئەو گفتوگۆیەتان پێ بدا کە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی مەکسیك کردوویەتی. کێلی بە دەنگی بەرز پرسیاری کرد: "جارێد بۆچی پەیوەندی بە مەکسیکییەکانەوە دەکات؟"

ترەمپیش بە هەمان دەنگی بەرز گوتی: "چونکە من داوام لێ کرد تا پەیوەندییان پێوە بکات". پرسیار کرا: "ئەی چۆن کاروانی دیکەی کۆچبەران ڕادەگرین؟" کێلی گوتی: " کریستن نیلسۆن کار لەسەر ئەم بابەتە دەکات" کە هێشتا بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد. ترەمپیش هاواری بەسەردا کردەوە و گوتی: "هیچ یەکێك لە ئێوەی بیرمەند نەتانتوانیووە ئەو کاروانانە ڕابگرن". کاتێ ئەو قسەیەی کرد، ئیدی کێلی بەتوندی پێی بە زەویدا نا و بەخێرایی لە کۆشکی سپی چووە دەرەوە، ترەمپیش وەك پشتگوێخستنێك بەدەستی بای بای لە کێلی کرد کە بەرەو دەرەوە دەرۆیشت. ئەو گفتوگۆیە دەکرێ لە خانەی "هاوارکردن بەسەر یەکتری"

---

(١) بەڕێوەبەری پێشووی ئۆپەراسیۆنەکانی کۆشکی سپی.

پۆلێن بکرێت، بەڵام هیچ کردەیەکی نابەجێ بەرامبەر یەکتری ئەنجام نەدرا. کۆشنەر ئێستا بە بیستۆکی دەرەکی لە تەلەفۆنەوە قسەی دەکرد و باسی ئەو تەلەفۆنەی کرد کە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی مەکسیك لویس ڤیدگارەی کردبووی، لەکاتێکدا کۆشنەر جارێکی دیکە لە شوێنی ئەو کاری کردبوو، بۆیە پۆمپەیۆ (هەڵم)ئاسا بەبێدەنگی لێی دانیشتبوو. هەندێ گفتوگۆی دیکەی هەڕەمەکی هەبوون، دواتریش من و پۆمپەیۆ گەڕاینەوە بۆ نووسینگەی کێلی. (لە گفتوگۆیەکدا لە مانگی کانوونی یەکەم لەگەڵ ترەمپ، هەروەك لەوکاتەدا ترەمپ بڕیاری دا کەسێك لە شوێنی کێلی دابنێ، ترەمپ گوتی کە ئەم بیروڕاگۆڕینەوەیە لەگەڵ کێلی هاوشێوەی "یارییەکی هاوارکردن بەسەر یەکتری" وابوو، کە هەر دوای ئەمەش زۆرێك لە میدیاکاران چەندان هەواڵیان لەسەر دروست کردبوو).

چەندان خەڵك بەشێوەیەکی نائاسایی لە دەوری نووسینگە دەرەکییەکەی (کێلی) دەسووڕانەوە. کێلی خۆی بانگی من و پۆمپەیۆی کرد تا بچینە لای و گوتی: "من چیتر لێرە نامێنم"، دواتریش لە نووسینگەکە ڕۆیشتە دەرەوە. تا ڕادەیەك سەرم سوڕمابوو، من وا گریمانەم دەکرد من و پۆمپەیۆ پێویستە زیاتر لەبارەی سعودیەی عەرەبییەوە قسە بکەین، بەڵام ئەو قسەیەی کێلی کاریگەری هەبوو لەسەرمان بەوپێیەی مانای ئەوەبوو لەمەودوا "ئێوە دەتوانن نووسینگەکەی من بەکاربێنن". من دەرگەی نووسینگەکەم کردەوە تا بپرسم کێلی لە کوێ بوو، بەڵام کەس زانیاری نەبوو. کاتێ بەرەو ڕێڕەوەکە چووم، بینیم کێلی وا لەگەڵ کەسێك قسە دەکات، ڕامکێشا بۆ ژووری ڕووزڤێلت کە ئەوکاتە کەسی لێ نەبوو، دواتریش دەرگاکەم بەسەر خۆماندا داخست. ئەوە دووەم گفتوگۆی سۆزدارانەی نێوانمان بوو، ئەمجارەیان زۆر لەوەی یەکەم توندتربوو. کێلی گوتی: "من فەرمانم بە چەندان پیاو کردووە لەنێو جەنگدا، پێویستیش ناکا چیتر لەگەڵ نەفرەتییەکی ئاوا مامەڵە بکەم." لێرەدا مەبەستی ئەو قسەوباسانە بوو کە لەنێو

کۆشکی سپی لە کۆبوونەوەکەدا کران.

من دەمبینی کە خەریکە دەست هەڵدەگرێت، بۆیە پرسیارم کرد: "بەڵام ئەگەر دەست لە کار بکێشیەوە بەدیل چییە؟"

کێلی گوتی: "چی دەبێ گەر قەیرانێکی وەك ١١ی سێپتێمبەرمان هەبێ و جەنابی ترەمپیش بەو شێوەیە بڕیارەکانی بدات؟"

پرسیارم لێ کرد: "پێت وایە گەر وازبێنی ڕەوشەکە باشتر دەبێ؟ بەلایەنی کەم تا دوای هەڵبژاردنەکان چاوەڕێ بکە. ئەگەر دەست لە کار بکێشیەوە، تەواوی هەڵبژاردنەکە خراپ دەبێ."

ئەو بەترشوتاڵییەوە وەڵامی دایەوە و گوتی: "ڕەنگە ئەوها باشتر بێ"، بۆیە منیش گوتم: "هەرچییەك تۆ بیکەی وەك شانازییەك وایە، بەڵام هیچ شتێکی ئەرێتی نابینم لەوەی کەسانی وەك ئیلیزابێس وارن و بێرنی ساندەرز دەسەڵاتی زیاتریان هەبێت."

ئەو گوتی: "من بەرەو ئارلینگتۆن دەڕۆم"، پێدەچێ بۆ ئەوەبوو سەردانی گۆڕی کوڕەکەی بکات، چونکە زۆر کات ڕەوشەکە جددی بووایە ئەمەی دەکرد. ئێمە بەو شتەمان دەزانی، چونکە زۆر جار دووبارە دەبوویەوە.

ژووری ڕۆزفێلتم جێ هێشت و بەرەو نووسینگەکەی کێلی چووم، لەوێدا پۆمپەیۆ هێشتا چاوەڕێی دەکرد بەرلەوەی بڕوات دەربارەی کوشتنی ڕۆژنامەنووس جەمال خاشوقچی بۆ میدیاکاران قسە بکات. دوای ئەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییە قەرەباڵەغە، لە نووسینگەکەی خۆم قسەمان کرد دەربارەی ئەوەی دەبێ چی بکەین، کێلی ڕۆیشتبوو. ئەمەیان کارێك بوو مایەی دڵتەنگی بوو. پۆمپەیۆ گوتی: "ماتیس هەر لە دەرەوەی وڵاتە، مایك پێنسی جێگری سەرۆك لە ویلایەتی (میسیسیپی)یە بۆ قسەکردن دەربارەی سەربەستیی ئایینی، تاکە شتیش کە منوشن خەریکی بێ، ئەوەیە خۆی لە بەرپرسیارێتی بدزێتەوە. لەم کارەدا تەنیا من و تۆ بەیەکەوە ماوین"،

نیگەرانی ئەوە بووین کە کیلّلی لە هەموو ئانوساتێکدا دەست لە کار هەڵدەگرێت. "ئەگەر ترەمپ بیەوێ بزانێ جەنگاوەرانی ڕاستەقینە کامانەن، ئەوا تەنیا سەیری دەوروبەری خۆی بکا دەزانێ (مەبەستمان لە خۆمان بوو) کێن. بەڵام کێلّیش بەشێکە لەمەدا." من بەو قسەیەی ڕازی بووم. بە درککردن بەوەی ڕەوشەکە چەندە خراپ دیار بوو، پۆمپەیۆ گوتی: "هەموو ئەو کارانە ڕەنگە کۆتایی پێ بێت و دواجار تەنیا نمایشی ترەمپ، ئیڤانکا و جارێد کۆشنەری زاوای بمێنێتەوە!"

لە ناوەڕاستی هەموو ئەو کاروبارانەدا و لە سەرەتای نێوەڕۆدا، من پلانە یەك لاپەرەییەکەم دەربارەی کۆچبەران نیشانی ترەمپ دا. ترەمپ کاغەزەکەی خوێندەوە و ڕازیبوونی خۆی نیشاندا، بەڵام ئیزافەیەکی کرد و گوتی: "دەزانی، زۆربەی ئەو شتانەی دەتەوێ بکرێ من دوای هەڵبژاردنەکان دەتوانم ئەنجامیان بدەم". منیش گوتم تەواو تێگەیشتم. پرسیاری کرد ئاخۆ دەتوانێ ئەو پلانە ببات و لەنێو گیرفانی چاکەتەکەی هەڵیبگرێت. ئێستا تۆپەکە لە یاریگەی ترەمپ بوو، پێشم وابوو هەر لەوێش دەمێنێتەوە. کێشەی کۆچبەران بەردەوامی کێشا، بەڵام زیاتر من پێوەی سەرقاڵ بووم. من پێشنیارەکانی خۆم گوت، ئەگەر بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە لەوانەیە/ لەوانەش نییە بەتەواوی کاری خۆیان بکەن. دواجار ترەمپ هەندێکی لەو پێشنیارانە خستە بواری جێبەجێکردنەوە. بەڵام ترەمپ ئەو خاڵانەی بە ڕێگەی خۆی و لەوکاتەی خۆی دەیویست پیادە کرد، ئەمەش پەیوەستبوو بە میزاجی خۆیەوە. کێشەکانی کۆچبەران، لەبری ئەوەی بتوانێ سیاسەتێکی یەکگرتوو دروست بکات، زیاتر گیریان خوارد.

---

لەوکاتەی کە مشتومڕ لەسەر کۆچبەران هەبوو، دواتر بەشێوەیەك بوونی نەما کە جێگەی سەرسامییە، دواتریش بابەتی کوشتنی ڕۆژنامەنووسی سعودی جەمال خاشوقچی لە کونسوولخانەی سعودی لە ئیستانبوولی

بەدوای خۆیدا هێنا. مامەڵەی ترەمپ بەرامبەر كوشتنی خاشوقچی تەواو پێچەوانەی ئەو مامەڵانە بوو كە هەمیشە بڕیارەكانی دەردەكرد.

لە ٨ی تشرینی یەكەمدا، كۆشنەر پرسیاری كرد لەوەی چۆن دەتوانین بەرامبەر ئەو ڕەشەبایە بەهێزە كاردانەوەمان هەبێ. ئامۆژگاریی من بۆ سعودییەكان ئەوەبوو كە هەرچی زووە ڕاستییەكان ئاشكرا بكەن، ڕاستییەكان هەرچییەك بێت پێویستە مامەڵەی لەگەڵ بكەن. كۆشنەر ڕازیبوونی خۆی نیشاندا، ڕۆژی دواتریش قسەمان لەگەڵ پادشا محەمەد بن سەلمان كرد و جەختمان كردەوە لەوەی چەند بە جددی لە پێشووتردا لەو كێشەیەیان ڕوانیووە. من بە پادشام گوت هەرچی زووە بزانێ چی بەسەر خاشوقچیدا هاتووە و هەرچی زووە ڕاپۆرت لەمبارەیەوە بڵاو بكاتەوە، بەرلەوەی خەڵك بۆچوونی خۆی بڵێت و بە ڕووتاندا بتەقێنەوە. دواتر پۆمپەیۆش هەمان قسەی پێ گوت. من هەروەها پێشنیارم كرد كە باڵیۆزی سعودیە لە واشنتۆن ڕەوانەی ڕیاز بكەین تا ڕاستییەكانمان بۆ دەربخات و دواتریش بگەڕێتەوە ئێرە و كورتەی زانیارییەكانمان پێ بدات. ئەمەیان شێوازێكی نائاسایی بوو، بەڵام باڵیۆزەكەی سعودیە برایەكی گەنجتری پادشا محەمەد بن سەلمان بوو، هەستی بەوە كردبوو كە كەشی واشنتۆن لەمبارەیەوە چەندە جددییە و هەڵایەكی زۆری دروست كردووە.

بەهەرحاڵ، پێچەوانەی زۆرێك لە كێشە و بابەتەكانی دیكە، ترەمپ سەرەتا بڕیاری دا كەوا كاردانەوەی دەبێ، لە بەرنامەی تۆمارکراودا بەناوی (٦٠ خولەك) لە كۆتایی هەفتەكەدا ترەمپ تیایدا گوتبووی كە فرۆشتنی چەك بە شانشینی سعودی ڕاناگرێت. لە ڕۆژی شەممە، كاتێ بەخێرهاتنی قەشە برۆنسمان كرد بۆ كۆشكی سپی دوای ئازادبوونی لە توركیا، من پێشنیارم كرد پۆمپەیۆ بچێ بۆ سعودیەی عەرەبی، نەوەك بەرپرسێكی پلەنزم ڕەوانە بكەین كە پۆمپەیۆ و ترەمپ حەزیان لێ بوو ئاوا بێت. هیچ كەس نەیدەتوانی بڵێت كە ئەمە ئەو كێشەیە بەجددی وەرناگرین. ترەمپ لە

١٥ی تشرینی یەکەمدا ئەو بیرۆکەیەی لەگەڵ محەمەد بن سەلمان ورووژاند، بەڵام فشارەکان وای کرد ترەمپ پشتگرییەکی گشتیی شانشینی سعودیی بکات نەوەك کەمتر. گەشتە خێراکەی پۆمپەیۆ دواکەوت و هەندێ کاتی پێدایین، لەو ماوەیەدا کاتی زیاتر بۆ سعودیە بەردەست دەبێ و دەرفەتی زیاتریان دەبێ تا ڕاستییەکان ئاشکرا بکەن، بەڵام ترەمپ چاوەڕوانی نەدەکرد. سعودییەکان دوای ئەمە ڕوانینی خۆیان لەمەڕ ڕووداوەکان بڵاوکردەوە و چەندان بەرپرسی باڵایان لە کار دوورخستەوە. ڕاپۆرتەکەی سعودییەکان جێگەی ڕازامەندی زۆرێك لە شیکەرەوە سیاسییەکان نەبوو، بەڵام ڕەنگدانەوەی گوتارێك بوو کە بە هیچ شێوەیەك گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. لەو ماوەیەدا، لە ڕێگەی تویت و لێدوانەکانییەوە، ترەمپ پشتگیری لەو ڕوانینەی سعودیە کرد و هەرگیزیش لەو هاوپەیمانییەی نێوان ئەمریکا-سعودیە هەیە، هەروەها ئەو پرۆسە فراوانەی چەك فرۆشتن بە سعودیە هەیە و پێشتر گفتوگۆیان لەبارەوە کراوە، دوودڵ نەبوو.

لەکاتێکدا میدیاکان بەتوندی لەمبارەیەوە قسەیان دەکرد، ترەمپ بڕیاری دا لێدوانێك بدات تا پشتگیری لە محەمەد بن سەلمان بکات، ترەمپ لەمبارەیەوە پێشتر قسەی لەگەڵ پۆمپەیۆش کردبوو. تێکستی ئەو لێدوانەی ناتەواوی پێوە دیاربوو، لەوانەشە گەر ڕاستییەکان بەدەر بکەوتنایە و گۆڕانیان بەسەردا هاتبا، ئەوا زیانی بەخودی ترەمپ دەگەیاند. ئەوەندە زەحمەت نەبوو گەر هەندێ گۆڕانکاری تێدا بکرابایە هەر بۆ پاراستنی خۆیان، بەڵام پۆمپەیۆ هیچ گۆڕانکارییەکی قبووڵ نەبوو، تەنانەت ڕەشنووسی ئەو قسانەی ڕۆژێك لای خۆی هێشتبووەوە تا پێداچوونەوەی زیاتری بۆ بکات. پۆمپەیۆ گوتی: "ترەمپ داوای شتێکی ئاوای کرد، منیش وا بۆی دەنێرم." ئەم قسەیە وەك ئەوەیە سەرۆك شتێك داوا بکات، تۆش یەکسەر بڵێی بەڵێ قوربان بەسەرچاو و پەیامەکەت وەرگیرا. ڕۆژی

دواتر، ٢٠ی تشرینی دووەم کە ڕۆژی لەدایکبوونیشم بوو، ترەمپ دەیویست تەلەفۆن بۆ بن سەلمان بکات تا پێی بڵێت کە خەریکە ڕاگەیەندراوەکە بڵاودەبێتەوە و گوتیشی: "ئێمە چاکەیەك لەگەڵ سعودیە دەکەین"، هەروەها گوتیشی: "بن سەلمان ئەو کارەی کردبێ یان نا، ئێمەی پشتگیری سعودیە دەکەین."

ئێمە گفتوگۆمان دەربارەی ئەوە کرد ئاخۆ ترەمپ خۆی ڕاگەیاندراوەکە لەسەر سەکۆی کۆشکی سپی دەخوێنێتەوە، یان هەر خۆمان تێکستەکەی بڵاودەکەینەوە. ترەمپ گوتی: "ئەمە لادانە لە ئیڤانکا"، "ئەگەر من ئەوە بخوێنمەوە، ئەوا وەك ئەوە وایە (شتەکەی ئیڤانکا)م زەوت کردووە" (شتەکەی ئیڤانکا :Ivanka thing لێشاوێك لەو هەواڵانە بوو کە تیایدا ئیڤانکا ئیمەیلی کەسیی خۆی بۆ کاروبارەکانی حکوومەتی بەکار هێنابوو، تیایدا کۆشکی سپی هەوڵی دەدا ئەمە ڕوون بکاتەوە و ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەوەی هیلاری کلینتۆن بوو، چونکە ئەویش ئیمەیلی کەسی بۆ کاروبارەکانی حکوومەت بەکارهێنابوو). ترەمپ گلەیی کرد و گوتی: "بە نەفرەت بێ، ئیڤانکا بۆچی تەلەفۆنەکەی نەگۆڕیووە؟ ئەوە چ بەڵایەکە بەهۆی ئەو تەلەفۆنەوە دووچارمان بووە؟" دواتر ترەمپ ڕووی لە پۆمپەیۆ کرد، کە خەریك بوو تا تەلەفۆن بۆ محەمەد بن سەلمان بکات، و گوتی: "بە محەمەد بن سەلمان بڵێ ئەمە باوەڕپێکراو نییە، ئەوە چ کارێکی مەزنە من ئەنجامی دەدەم. دواتر بۆچوونی ئەو وەرگرە، ئەوجا بڕیار دەدەین بۆ داهاتوو چی بکەین." ئێمە بڕیارمان دا ڕاگەیاندراوێك بڵاوبکەینەوە و پۆمپەیۆش وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە، بەڵام گفتوگۆیەکی زۆر هەبوو لەوەی تێکستی ڕاگەیاندراوەکە پێش یان پاش جەژنی ساڵانەی (نیشاندانی سوپاسگوزاریی لە ڕێگەی کەلەشێر[1])ەوە بڵاوبکرێتەوە. (ئەمە وەك

---

(١) لەوکاتەی ویلیەم براتفۆرد نووسیبووی کەوا چۆن ئاکنجییەکانی سەر زەوییە

نوکتەیەك بوو پێویستی بە زیرەکی زیاتر نەبوو). بەرێز جەنابی پادشا، بمانبورە، چونکە هەندێ کاری لەپێشترمان هەیە. هەر ئەو ڕۆژە چاوم بە وەزیری دەرەوەی تورکیا کەوت، ئەمەشیان هەر وەك ڕووداوێکی لەناکاو بوو. پۆمپەیۆ و ترەمپ وەڵامی پرسیارەکانیان دایەوە، کە ترەمپ هەرچۆنێك بێت دەیویست ئەم کارە بکات. هەموو ئەمە نمایشێکی تەواوی ترەمپ بوو، ئەمە بۆ هەموو کەسێك ڕوون و ئاشکرابوو تەنیا ڕاند پاوڵ نەبێت، کە ئەویش لای خۆیەوە تویتێکی کردبوو و نووسیبووی وامزانی من ئەو ڕاگەیاندراوەم نووسیووە.

لەنێو لایەنە واقیعییەکانی جیۆپۆلەتیکدا، ترەمپ بە تەنیا هەر خۆی مامەڵەی کرداری بوو. هیچ کەسێك بەهۆی کوشتنی (خاشوقچی)یەوە داوای لێبوردنی نەکرد، هەندێکیش پێیان وابوو کوشتنی ناوبراو هەڵەیەکی کوشندە بوو. پێت خۆش بێ یان نا، ئێمە بەرژەوەندییەکی نیشتیمانیی گرنگمان لەگەڵ سعودیە و شانشینەکەی و بن سەلمان هەیە، نەوەك خاشوقچی. وەستاندنی پشتگیری بۆ سعودیە ڕاستەوخۆ دەبێتەهۆی ئەوەی نەیارەکانمان هەوڵی خۆیان بخەنەگەڕ لەو ناوچەیەدا، هەروەها ڕەوشەکە بۆ خۆیان دەقۆزنەوە تا زیان بە ئێمە بگەیەنن. پوتین پێشتر بەئاشکرایی ئەمەی بە من ڕاگەیاندبوو (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە بەشی شەشەم)، کاتێ لە ٢٣ی تشرینی یەکەمدا پێی گوتم ئەگەر ئێوە وەك ئەمریکا چەکیان پێ نەفرۆشن، ئەوا ئێمە وەك ڕووسیا چەکی خۆمان بە سعودییەکان دەفرۆشین. ترەمپ بەگوێرەی پێویست بڕیاری لەسەر ڕاستەقینەی بنەما جیۆستراتیژییەکان نەدەدا، بەڵام بەهۆی کردەکانییەوە ئەو فرۆشتنی چەکەی

---

داکیرکراوەکان لە پایزی ساڵی ١٦٢١ کەڵەشێری کێوی ڕاودەکەن، هاوکات بەوپێیەی ئەو کەڵەشێرە لە ڕەچەڵەکدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا و زۆر کات وەك ژەمێکی سەرەکی ئەمریکییەکانە، بۆیە سەرۆك لینکۆڵن ئەویش لەساڵی ١٨٦٣دا ڕۆژێکی وەك پشوویەکی نیشتیمانی بۆ ئەم مەبەستە دیاری کرد.

برەو پێ دەدا، کەم تا زۆریش لە شوێنی گونجاودا ئەو کارانەی دەکرد. ئەو مامەڵەیە بەتەواوی هاوشێوەی مامەڵەکەی جێن کیرکپاتریك بوو کە ناوبراو لە ساڵی ١٩٧٩دا لە وتارێکی لەسەر شێوازی کۆنەپارێزیدا بەناوی (دیکتاتۆریەت و بانێکە و دووهەوا) نووسیوویەتی: "ئایدیالیزمی لیبراڵی پێویستە لەگەڵ ماسۆشیزم[1] تێکەڵ نەکرێت، ناشبێ وەك پاساوێك بۆ بەرگریکردن لە سەربەستی و بەرژوەندی نیشتیمانی بەکار بێت."

---

دوای هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس لە تشرینی دووەمی ٢٠١٨دا، وا دیاربوو کێشەکانی پەیوەست بوون بە بەڕێوەبردنەوە لەلایەن کەسەکانەوە، ڕەخنەگرتن لە بەرەوپێشبردنی سیاسەت، هەموو ئەمانە مانای هەبوونی زنجیرەیەك گۆڕانکاریی دراماتیکی بوون. بۆ نموونە، جەیمس ماتیس و ستافەکەی، دەسەڵاتێکی زۆردارانەیان لەسەر پەیوەندییە ڕۆژنامەوانییەکان هەبوو، ماتیس بە وریاییەوە کەسایەتیی خۆی وەك (زانایەکی بواری جەنگ) دروست دەکرد. یەك لەو هەواڵانەی کە دڵنیابووم میدیا لە "ماتیس"ەوە گوێبیست نەبوون، بەڵکو ترەمپ بە کەسێکی گوتبوو لە ٢٥ی مایسدا کە لەوکاتەدا هەلیکۆپتەری تایبەت بە سەرۆکایەتیی ئەمریکا لە ویلایەتی ئەناپۆڵس بەرەو کۆشکی سپی دەگەڕایەوە، بەوپێیەی ترەمپ لە ئاهەنگی دەرچوونی سەربازانی دەریایی گوتارێکی پێشکەش کردبوو. ئەو کەسە دەیگێڕێتەوە کە چۆن ماتیس دەربارەی بەشداریی ترەمپ لە گفتوگۆکەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراوی سەرۆکایەتی بەرامبەر هیلاری کلینتۆن چەند ڕۆژێك دوای ئەو ئابڕووچوونانەی لە بەرنامەی (ئەکسێس هۆلیود) کە دواتر کەوتە دەستی ڕۆژنامەنووسانیش، لەمبارەیەوە ماتیس

---

(١) ماسۆشیزم: بریتییە لەوەی لەزەت وەربگری لەوەی بەدەست هاوسەرینەکەتەوە ئازار بدرێی.

گوتوویەتی: "ئەمە ئازایانەترین کار بوو تا ئێستا دیتبێتم کە هەر کەسێك دەتوانێ بیکات." بێگومان لە ڕوانینی کەسێکی سەربازی ئەمە مانای زۆر دەگەیەنێت. بەدڵنیاییەوە، ترەمپ دەیتوانی کاری ئاوا بکات، بەڵام ئەگەر نەشیتوانیبێ، ئەوە نیشانی (ماتیس)ی داوە کەوا چۆن بە شانوباڵی خەڵکی ئاوایدا بلێت.

هیچ گومانی تێدانەبوو کە لە هاوینی ٢٠١٨ ماتیس دووچاری هەندێ کێشە بوویەوە، هەر کە ساڵی نوێش هاتەپێش، پێگەی ئەویش بەردەوام لاواز دەبوو. دەوربەری کاتژمێر ٩:٤٥ی خولەکی ڕۆژی یەکشەم کە ١٦ی ئەیلوول بوو، ترەمپ پەیوەندی کرد و گوتی ئاخۆ ئەو هەواڵەم دیووە کە لەسەر ماتیس لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز بڵاوبووەتەوە؟ پێی گوتم بەجوانی بیخوێنمەوە، منیش گوتم بەڵێ خوێندومەتەوە. ترەمپیش گوتی: "من حەز بەو پیاوە ناکەم، ئەو بەردەوام ئەو کارانە دەکات." منیش گوتم پێم وایە ئەو وتارە زۆر نادادپەروەرانەیە و لەلایەن جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی میرا ڕیکاردێل نووسراوە و ناوبراو لەوەتەی سەرەتای ڕۆژەکانی لەگەڵ ماتیس لەنێو کۆشکی سپییدا دوژمنایەتی هەیە، ئەو دوژمنایەتییەش دوای ئەوەی هات کە ڕیکاردێل دژی هەوڵەکانی ماتیس بووە بەوەی ویستوویەتی کەسێکی نێو دیموکراتەکان بخاتە پۆستێکیان و هاوکات ڕوانینی ئەمانە لەگەڵ ترەمپ یەکانگیر نەبووە. ترەمپ پرسیاری کرد" ئەوە هەر ڕیکاردێل نەبوو کە ڕێگری کرد لەوەی ڕێکس تیلەرسۆن هەندێ خەڵکی خۆی بخاتە پۆستەکانەوە، وانییە؟" ئەم قسەیەی ترەمپ ڕاست بوو. ترەمپ دواتر بەو شێوازە خۆی پرسیاری کرد" بۆچوونت چییە لەسەر ماتیس؟" ئەو شێوازە ڕێکەی جۆرێك بوو کە هیچ کەسێك بڕوای نەدەکرد تیایدا ترەمپ دەیەوێ متمانە و بڕوابەخۆبوون لەنێو دارودەستەکەی دروست بکات. بەڵام زۆربەی کات ئاوایی مامەڵەی دەکرد. منیش وەڵامێکی "بەشەکی"م دایەوە کە هەم ڕاست بوو، هەم گرنگیش بوو. من گوتم: "ماتیس لەو کارانە باشە کە تۆ ناتەوێ بیکەی و

ئەو دەیکا، هەردەمیش بیروڕایەکی بەرزتری لە سەرووی بیروباوەڕی تۆوە هەیە". لەگەڵ گوتنی ئەمە، ترەمپ ڕوونیکردەوە کە متمانەی بە ماتیس نییە و زۆریش ماندووبووە لەو هەموو هەواڵەی کە لە ڕۆژنامەکانەوە بڵاودەکرێتەوە و دەبێژن کە ماتیس فێڵ لە ترەمپ دەکات. من ئەمەم بە ترەمپ نەگوت، بەڵام ئەمە خراپترین برینی خۆ-دروستکاری ترەمپ بوو کە (ئەو دەستە بیرمەندەی لەتەك ترەمپ کاریان دەکرد) هۆکاری بوون. ئەوانە وا بیریان دەکردەوە کە خەڵکانێکی زۆر زیرەکن و دەتوانن بە هەموو جیهانی بڵێن کە ئێمە چەندە زیرەکین و ترەمپیش ناتوانێ درك بەمە بکات. بەڵام ئەوانە ئەوەندە زیرەك نەبوون هەروەك خۆیان ئاوا بۆ خۆیان ڕەچاویان دەکرد.

کێڵی، بەیانیی ڕۆژی دواتر هاتە نووسینگەکەم بۆ قسەکردن لەسەر ئەو وتارەی نیویۆرك تایمز و گوتیشی: "ماتیس هێشتا ڕزگاری بووە و لەسەر قاچەکانی وەستاوە"، دواتر ئاماژەی بە ڕۆڵی ئەوانە کرد کە لە نووسینگەی (ریکاردێل)ەوە ئەو زانیارییە سەرنجراکێشانەیان دەستکەوتووە و بە بوێرییەوە بڵاویان کردووەتەوە. من لەبارەی بیرۆکەی دزەپێکردن، ئەو هەواڵەم بۆ دادوەر (لاری سیلبەرمان) ڕوونکردەوە، بەدیاریکراوی پرسیارم لەبارەی ئەوە کرد کێ لەمە سوودمەند دەبێ؟ لەو کەیسەدا ڕاستەوخۆ پەنجە بۆ ماتیس و هاوکارەکانی درێژ دەکرا لەوەی ئەو دزەیان بەو زانیارییانە کردووە. کێڵی لە کاتی خۆیدا لەنێو ڕیزی هێزە دەریاییەکان لەژێر سەرپەرشتیی ماتیس کاری کردووە، هەروەها جۆزێف دەنفۆردیش بە هەمان شێوە کاری لەگەڵ کردووە، ئەمەیان پەیوەندییەکی سەرنجراکێشە کە لەوانەیە میدیاکاران هەرگیز تێبینیان نەکردبێ، ڕۆماننووسێکی سیخوڕیش ناتوانێ باوەڕ بە لایەنی بڵاوکار بهێنێت کە ئەمە چیرۆکێکی باوەڕپێکراوە. من و ترەمپ و کێڵی ڕۆژی دواتر دیسانەوە لەسەر ئەو هەواڵەی نیویۆرك تایمز گفتوگۆمان کرد، کەمێك دواتر، دیسانەوە بابەتی دانانی کەسێك لە شوێنی ماتیس هاتەوە بەرباس.

دەمویست بزانم ئاخۆ ئەوەش جارێکی دیکە لەنێو کۆشکی سپییەوە دزەی پێ دەکرێت.

بەهەرحاڵ، هەفتەیەك دواتر، کاتێ من لە نیویۆرك بووم بۆ بەشداریکردن لە فیستیڤاڵەکانی یادکردنەوەی ساڵانەی ئەنجوومەنی گشتیی یوئێن، کێلی پەیوەندی پێوە کردم و گوتی کە خانمی یەکەمی ئەمریکا دەیەوێ ڕیکاردێل لە کارەکەی دوور بخرێتەوە، چونکە ستافەکەی گلەییان کردووە بەوەی هاریکار نەبوونە بۆ ئامادەکردنی گەشتەکەی خانمی یەکەمی ئەمریکا بۆ ئەفریقا. هەستم کرد ئەمە باسێکی سەرنجڕاکێشە، (کێلی)یش لەلای خۆیەوە گوتی: "نازانم چۆن کارەکان گەیشتنە ئەو ئاستە." کێلی دواتر پێی وابوو کە ستافەکەی خانمی یەکەمی ئەمریکا دەستەیەك پشیلەن، هاوشێوەی دەستەیەك ئافرەت خەریکی قسەوقسەلۆکن..

هیچ کەسێك هیچ شتێکی زیاتری لەمبارەیەوە پێ نەگوتم، منیش پێم وابوو تەواو ئیدی ئەم بابەتە کۆتایی هات. کێلی هێشتا لە واشنتۆنەوە بەهۆی خەریکبوونی بەوەی ئاخۆ جێگری داواکاری گشتی ڕۆد ڕۆزەنستین، هەرگیز ماددەی (بیست و پێنج[1])ی هەموارکراوی دەستووری لە دژی ترەمپ بەکارهێناوە، یان ئەوەتا عەبایەك لەبەر دەکات و دەچێتە نێو کۆشکی سپی تا بەڵگە بۆ ئەو مەبەستەی کۆبکاتەوە. ئەمە یەکەم جاربوو لە مێژووی ئیدارەدانی سەرۆکایەتیی ئەمریکادا شتی وا ڕوویدات.

---

مانەوەم لە نیویۆرك بەوە سەرقاڵی کردم کە بۆچی پێویست ناکا باڵیۆزەکانی یوئێن پلەی حکومییان هەبێت؟! (ئەمەیان مامەڵەیەکی کلاسیکیی کۆمارییەکان) بوو. یان، ئەگەر ئەو پلە وەزیفییە حکوومیەش

(١) بەگوێرەی ئەم ماددەی (بیست و پێنج)ە بێت، گەر سەرۆکی ئەمریکا نەتوانێ کارەکانی بەڕێوە ببا، ئەوا جێگرەکەی شوێنەکەی دەگرێتەوە.

وەرگرن، پێویستە سەرۆکی وڵات ئاگاداریان بکاتەوە کە تەنیا یەك وەزیری دەرەوە بوونی دەبێ. نیککی هاڵیی هەرگیز ئاگاداری ئەمە نەبوو، لە هەموو کەسێکیشم گوێ لێ بووە تەنانەت ڕاستەوخۆ لە خودی ترەمپیش، کە هەریەك لە نیککی و تیلەرسۆن بە نەرمی ڕقیان لە یەکتری بووە (باشە، ڕەنگە ئەوەندە نەرمیش نەبووبن بەرامبەر یەکتر). سەرەتای کێشەکانی نیککی ئەوکاتە بەدەرکەوت کە ناوبراو بە خراپی وەڵامی پرسیارێکی دایەوە کە دەربارەی ئابلووقەکانی ڕووسیا بوو، ڕاستەوخۆ دوای هێرشەکانی ئەمریکا لە مانگی نیساندا بۆ سەر سووریا. دیسانەوە لە مانگی حوزەیران ئەو کێشەیە سەری هەڵدایەوە، کاتێ هەڵەتێگەیشتن هەبوو لەبارەی کشانەوەی ئەمریکا لە ئەنجوومەنی مافەکانی مرۆڤی سەر بە یوئێن. ترەمپ ڕازیبوو واز لەو بابەتە بهێنێت، کە هەموو ڕاوێژکارەکانیشی ئاوایان بۆ پێشنیار کردبوو، ئەویش لە کۆبوونەوەیەك لەگەڵ پۆمپەیۆ و نیککی هاڵیی و مندا تەئکیدی لەسەر کردەوە. دواتر پرسیاری لە هاڵیی کرد "ئەو بابەتە بە کوێ گەیشت؟" ئەویش لە وەڵامدا باسی لە گفتوگۆگان کرد دەربارەی بازرگانی لەگەڵ وڵاتی چین، کە ئەمە بە هیچ شێوەیەك بەرپرسیارێتی نیککی نەبوو. دوای دووپاتکردنەوەی چەند قسەیەك لەلایەن ترەمپەوە یەك لەوانەش ئەو قسەیەی کە هەردەم دووبارەی دەکاتەوە (یەکێتیی ئەوروپا هاوشێوەی وڵاتی چینە، تەنیا ئەوەیە بچووکترە)، هاڵیی دەربارەی گەشتێك پرسیاری لێ کرد کە دەیویست بچێ بۆ هیندستان و سەردانی دالای لاما بکات. ئامانجی گەشتەکەی ڕوون نەبوو، مەگەر هەر ئەوەبێ کە هەر وێنەیەك لەگەڵ دالای لاما بگرێت بەو پێیەی هەردەم شتێکی باشە تا وێنە لەگەڵ سیاسییەکی کاریگەر بگری. بەڵام کێشەکە ئەوەبوو کە نیککی لە بابەتەکە لایدا و باسی لە کێشەی بازرگانیی وڵاتی چینی کرد و وا دیاربوو لە ڕووی سیاسییەوە دەستخۆشییەکی ئەوتۆی لێ نەکرا: کاتێ ترەمپ پرسیاری کرد

لەوەی وڵاتی چین چۆن سەیری سەردانەکەی دەکات بۆ لای دالای لاما، بۆیە گەشتەکەی لە بنەڕەتدا هەر بە مردوو هەژمارکرا. ئەم بابەتە جەختی لەوە دەکردەوە کەوا چۆن ترەمپ ڕێگە بە نیککی دەدات لە ڕێگە لابدات، بۆیە ناچاریش بوو لەم کارەی بیوەستێنێت. هەر چۆنێك بێت، لە ١٩ی حوزەیران، ئێمە وەك ئەمریکا لە ئەنجوومەنی مافەکانی مرۆڤی سەر بە یوئێن پاشەکشەمان کرد.

پڕکردنەوەی شوێنی بەرپرسانی باڵای ئیدارەی ترەمپ، ئەویش کارێکی زەحمەت بوو، بەتایبەتی بەوپێیەی نیوەی ماوەی سەرۆکایەتی ترەمپ نزیك دەبوویەوە. هەڵبژاردنی یەکێك بۆ شوێنی نیککی هاڵێی یەکێك بوو لەو کارە ماراسۆنی و خێرایانە. دوای ڕاوێژکردنم بە تەنیا لەگەڵ ترەمپ، ئیڤانکا و کۆشنەر، هاڵێی بە کێلی گوتبوو (نەوەك پۆمپەیۆ یان من) کە لە ڕۆژی ٩ی تشرینی یەکەم دەست لە کار هەڵدەگرم، ئەو دەستلەکارکێشانەوەی هاوکات دەبوو لەگەڵ پشووی درێژی کۆنگرێس کە تا ٣١ی کانوونی یەکەم بوو. هەندێ وایان گومان دەکرد کە کێبڕکێی کاندیدی کۆمارییەکان بۆ سەرۆکایەتی ساڵی ٢٠٢٤ لە ئێستاوە دەستی پێ کردووە. لە لێدوانێکی سەرنجڕاکێشدا کە لە تەنیشت سەرۆك ترەمپ لە کۆشکی سپیدا دانیشتبوو، هاڵێی گوتی کە خۆی بۆ هەڵبژاردنەکانی ٢٠٢٠ کاندید ناکات، بۆیە گوتی: "نەخێر، من خۆم بۆ هەڵبژاردنەکانی ٢٠٢٠ کاندید ناکەم، بەڵێنتان پێ دەدەم پێتان ڕابگەیەنم کە لە هەڵبژاردنی داهاتوو خەریکی چی دەبم." زۆرێك باوەڕیان وابوو کە نیککی هاڵێی لە شوێنی مایك پێنس بۆ هەڵبژاردنی ٢٠٢٠ خۆی کاندید دەکات و دەبێتە هاوەڵی ترەمپ و لەلایەن کۆشنەر و ئیڤانکاشەوە پشتگیری لێ دەکرێ، بەڵام هەموو ئەمانە گریمانەیەکی نموونەیی نەبوون.

یەکێك لە مەرجە پێشوەختەکانی ترەمپ بۆ شوێنگرتنەوەی هاڵێی ئەوەبوو، کە دەبێ ئەو کەسە لە ڕەگەزی مێ بێت. دینا پاوڵ کە لە ئەنجوومەنی

ئاسایشی نەتەوەیی بوو و لەلایەن بنەماڵەی ترەمپیش پشتگیری دەکرا، سەرەتا وا دەرکەوت کە کەسێکی سەرکەوتوو دەبێت. کۆمەڵێك بۆچوونی نەیار لە بەرامبەری قیت بوونەوە، بەهەرحاڵ، بۆیە هەر زوو گەڕان بەدوای کاندیدی دیکە دەستی پێ کرد. من و پۆمپەیۆ لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەوە بووین کە باڵیۆزی یوئێن پێویست ناکا پلەی وەزیفی لە حکوومەت هەبێ، بەڵام پێشتر دەبوو قەناعەت بە ترەمپ بهێنین. ترەمپیش لەبارەی دینا پاوڵەوە گوتی کە کابینەی حکوومەت "یارمەتی ناوبراو دەدات"، بۆیە منیش بێ قسە مامەوە. ئەگەر یەکێك پێویستی بەم جۆرە یارمەتییە بێت، ئەوا پێویستە بەدوای کاری کەسانی دیکەشەوە بگەڕێن تا یارمەتی بدەن. هەر تایبەت بەو بابەتە بۆ چەندان هەفتە من و پۆمپەیۆ گفتوگۆمان کرد، بیرمان لە بەدیلە گونجاوەکان کردەوە، ڕاوێژمان لەگەڵ زۆرێکیان کرد تا بزانین ئاخۆ دەیانەوێ ئەو پۆستە وەربگرن. کاتێ گەیشتینە کۆتایی، هەردووکمان گەیشتینە ئەو باوەڕەی کە باڵیۆزی ئەمریکا لە کەنەدا کێڵی کرافت گونجاوترین کەسە بۆ ئەم پۆستە. کرافت پێشتر لەنێو ئیدارەکە کاری کردبوو، بەتەواوی تاقیکرابووەوە و دەسەڵاتی تەواوی بەدەستگەیشتنی زانیارییە ئاسایشییەکانی پێ درابوو، بۆیە ئامادەبوو و بەخێراییش دەیتوانی ئەرکە نوێیەکان بگرێتەدەست.

لەو نێوەندەدا، کۆشکی سپی کەوتبووە نێو ڕەوشێکی پیلانگێڕییەوە، تیایدا هەرکەسێك بۆچوونی خۆی هەبوو لەوەی کێ شوێنی نیککی هاڵێی دەگرێتەوە. من هەرگیز بەوکاتە تێنەپەڕیووم کاتێ زۆرینەی خەڵك پێت دەڵێن لەسەر بابەتێکی دیاریکراو متمانە بە هەندێ کەس مەکە. ڕەنگە هەموو ئەمانە قسەی ڕاست بن. سیاسەتی نێوخۆیی لە مەترسیدابوو و خەریك بوو پڕدەبوو لە پیلانگێڕی، زۆربەی ئەمانەش میدیا ڕۆڵێکی سەرەکی تێدا دەگێڕان. کاندیدەکان بەرزدەکرانەوە و بە زەویشدا دەدرانەوە، دەهاتنە ناوەوە و دەردەچوون، دواتر دیسانەوە دەهاتنەوە ناو

باسەکە و نزیك دەبوونەوە، یان هەندێکیان بەڕاستی هەڵدەبژێردران، هەموو ئەمانە بۆ ئەوەبوو تا هۆکارێکی نابەجێ بدۆزنەوە و ئەو کاندیدانە دووربخەنەوە و ئێمەش پاش ئەو هەموو هەوڵە بگەڕێینەوە خاڵی سەرەتا. تەنانەت کاتێ من و پۆمپەیۆ پێمان وابوو ترەمپ بڕیاری لەسەر کەسێك داوە، ئەوا زۆر کات پێشبینییەکانمان هەڵە دەردەچوو. هەروەك لە کۆبوونەوەی (G20) لە تشرینی دووەمدا پۆمپەیۆ گوتی: "تۆ ناتوانی ترەمپ یەك خولەك بە تەنیا جێ بهێڵی." ئەمە وەك ئەوە وایە کە لە هۆڵێکی پڕ لە ئاوێنەدا بیت. هەروەك چەند هەفتەیەك تێپەڕبوو، هێشتا دەمویست بزانم ئاخۆ کاندیدێك یەکلایی دەبێتەوە بەرلەوەی ئەو سێ مانگەی درێژەی هاڵیی کۆتایی پێ بێت و بگەینە ئێوارەی سەری ساڵی تازە، دەستبەکاربێت.

لە ڕاستیدا، نەمانتوانی کەسێك یەکلایی بکەینەوە. تا ٢٢ی شوبات و لەنێو کۆشکی سپیدا، ئەوکاتە دوای نیوەڕۆکەی ترەمپ پەیوەندی پێوە کردم، ئایا ترەمپ و کێلی کرافت تەوقەیان کردووە و ڕازیبووە ئەوەی دووەم جێگەی نیککی بگرێتەوە. من خۆشحاڵ بووم، پۆمپەیۆش هەروا، بەڵام بێهوابووم لەوەی ئەو ٥ مانگەیان بە شتێك بەسەربرد کە هەر لە چەند ڕۆژێك دوای دەستلەکارکێشانەوەی نیککی دەکرا چارەسەر بکرێت. ترەمپ بە (کرافت)ی گوت: "ئەو پۆستە باشترین کارە لەتەك کارەکەی من لەنێو حکوومەتدا"، کە من پێم وابوو ئەو قسەیەی ترەمپ تا ڕادەیەکی زۆر ڕاست و دروستە. ئێمە کارەکەی خۆمان بەئەنجام گەیاند، بەلایەنی کەم پێنج مانگی ویست تا ئەو کارە تەواو بکەین و مامەڵە لەگەڵ بیرورا جیاوازەکانی یاسای جێبەجێکردن بکەین.

هەروەك کێشەکانی ماتیس بەردەوام لە بەرزبوونەوەدا بوو، پێشبینییەکان دواجار لەسەر ئەوە کۆبوونەوە کە کێلی کێشەی زۆری هەیە. پۆمپەیۆ گوتی" ئەگەر ماتیس لە پۆستەکەی نەمێنێ، ئەوا کێلیش نامێنێ"، کە دیارە

لۆژیکێکی بۆ ئەمە هەبوو. ئێستا ئەمە لەودیو سنووری بێتوانایی و ناکارامەیی کەسەکانەوە بوو، بەڵکو گۆڕانکاریی بنەڕەتی بوو کە لەنێو بەڕێوەبردنی کۆشکی سپیدا دەکرا. کێشە بێکۆتاییەکانی (نیلسۆن)یش وادیاربوو کە ئەویش زووتر دەست لە کار دەکێشێتەوە، ئەمەشیان هۆکارێکی هاندەری دیکە بوو کە وای دەکرد کێلی بڕوات، بەڵام نیلسۆن جارێ هەر بەردەوام بوو. لە ڕاستیدا، نیلسۆن تا نیسانی ۲۰۱۹ بەردەوام بوو، دوای ئەمە ئیدی خۆبەخشانە دەبوو لەسەر ویستی خۆی دەست هەڵگرێت. کێلی هەروەها پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کۆشنەری زاوای ترەمپیش نەبوو، ئەمەش دوای ئەوە هات کە کێلی مشتومڕی لەگەڵ کۆشنەر کردبوو لەوەی بۆی نییە زانیاریی ئاسایشی بەدەست بگات.

(کێللی)یش بایی خۆی کێشەی هەبوو، هاوشێوەی ئەوانەی کە ئەزموونم لەگەڵیان هەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ وەزیری گەنجینەی ئەمریکا —منوشن- کە جێگەی باوەڕی ترەمپ بوو. بۆ نموونە، لە تەممووزی ۲۰۱۸دا، منوشن بێوچان نیگەرانی ڕاگەیاندراوێکی ڕۆژنامەوانی ببوو کە دەیویست ئابلوقەی نوێ بەسەر بانکێکی ڕووسیدا ڕابگەیەنێت بەوپێیەی ئەو بانکە ئاسانکاریی بۆ مامەڵە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکانی کۆریای باکوور کردبوو. ترەمپ ڕازیبوو لەوەی ئەو ئابلووقانە پێویستە بخرێنەگەڕ، بەڵام نەیدەویست لە ڕێگەی لێدوانی ڕۆژنامەوانییەوە ڕابگەیەندرێت، بۆ ئەوەی خۆی بەدووربگرێت لە ئەگەری کاردانەوەی نەرێنی هەریەك لە مۆسکۆ و پیۆنگ یانگ. منوشن دەترسا لەوەی کۆنگرێس لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەن ئەگەر ئەمە لەپێناو ڕووسیادا پەردەپۆش بکات و شتێك لەمبارەیەوە بڵاونەکاتەوە. من پێم وابوو منوشن زیاد لە پێویست فشاری خستووەتەسەر خۆی. لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا، ترەمپ ڕازیبوو لەوەی ڕاگەیاندراوێك لەمبارەیەوە بڵاو بکرێتەوە. کێلی کە بێهیوابوو، پێی گوتم کە منوشن گرنگیی بە هەموو شتێك دەدا تەنیا لەبەرئەوەی هیچ

بەرپرسیارێتییەکی پێ نەدرێ و خۆی نەخاتە مەترسییەوە، لەگەڵ ئەوەش پێی وابوو منوشن خواستێکی سەرووئاسایی هەیە لەوەی دەیەوێ لە کۆبوونەوەکانی کۆشکی سپی بەشداری بکات و بە دەوری جیهانیشدا گەشت بکات. چەند ڕۆژێك لەمەوپێش لەگەڵ کێلی قسەمان کردبوو دەربارەی هەوڵەکانی منوشن تا بەشداربێ لەو گفتوگۆیانەی کە هیچ ڕۆڵێکی بۆ ئەو تێدانەبوو، تەنانەت لە هەندێکیان داوای لە ترەمپ کردووە تا بەشداری پێ بکرێ. کێلی گوتی کە دڵنیام نیوەی ئەو کاتەی لەسەر مێزی وەزارەتەکەی تەرخان نەکردووە، ئەوەندەی حەز دەکات بێتە نێو کۆبوونەوەکانی کۆشکی سپی و گەشتەکانی سەرۆك. کێلی بە ڕقلێبوونەوەوە گوتی: "کارمەندەکانی بە زەحمەت لەنێو باڵەخانەی وەزارەت دەیناسنەوە!".

لەو نێوەندەدا، هەوڵە بەردەوامەکانی ماتیس بۆ دەرکردنی ڕیکاردێل، شانبەشانی هەوڵە نهێنییەکانی ستافەکەی خانمی یەکەمی ئەمریکا، دواجار کاری خۆی کرد. من لە پاریس بووم بۆ ئەو کۆبوونەوانەی تایبەت بە بەشداریکردنی ترەمپ لە ئاگربەستی ڕۆژی ١١ی تشرینی یەکەمی جەنگی جیهانییەوە ڕێکخرابوو. لە ئێوارەی ڕۆژی ٩ی تشرینی دووەمدا، هەروەك لەوکاتەدا خەریك بوو بۆ خواردنی نانی ئێوارە لەگەڵ هاوشانە بەریتانی و فەرەنسی و ئەڵمانییەکانم دەچووم، کێلی لەنێو فڕۆکەی سەربازی سەرۆکایەتییەوە پەیوەندی پێوە کردم کە نزیك بوو لەوەی بگاتە پاریس. ئەو پەیوەندییەمان پارێزراو نەبوو، بۆیە تا درەنگانی شەو بە تێروتەسەلی قسەمان نەکرد، کاتێ کێلی گوتی نووسینگەی خانمی یەکەمی ئەمریکا هێشتا هەوڵ دەدات تا ڕیکاردێل لە کار دووربخەنەوە. کێلی هەروەها گوتی: "من لەم بابەتەدا هیچم لەدەست نایەت".

ڕۆژی شەممە، چووم بۆ شوێنی مانەوەی باڵیۆزی ئەمریکا، کە ترەمپ لەوێ مابوویەوە تا هەندێ زانیاری پێ بدەم بەرلەوەی کۆبوونەوە دوو

قۆڵییەکەی لەگەڵ ماکڕۆن دەست پێ بکات. کەشەکە ناخۆش بوو، من و کێلیش قسەمان کرد بەگوێرەی ئەو پلانەی دامانابوو تا سەردانی چیاکانی (چاتیۆ تێری بیلیۆ وود) و ئەو گۆڕستانەی نزیکی بکەین کە چەندان ئەفسەری ئەمریکی سەردەمی جەنگی یەکەمینی جیهانی لەوێدا نێژراون. دەستەی فڕۆکەوانیی فڕۆکەی سەربازی سەرۆکایەتی گوتیان کە ڕادەی بینین بە جۆرێکە مەحاڵە بە کۆپتەر بتوانین بەرەو ئەو گۆڕستانە بچین. ڕێژەی شاوڵیی بینین ئەوەندە خراپ نەبوو بەوەی مارینزەکانی جەنگ دەیانتوانی بفڕن، بەڵام لەکاتێکدا کە سەرۆکی ئەمریکا لەنێویدابێ ئەو کاتە بابەتەکە شتێکی دیکەیە و جیاوازە. ئەگەر بتەوێ بە پیادە بڕۆی، لەوانەیە نزیکەی ۹۰ خولەك بۆ ۱۲۰ خولەکت بوێ بۆ هەر سەرێکی ڕێگەکە، لەسەر ڕێگەکانیش هیچ ڕێگەی خێرا بوونیان نەبوو، بۆیە ئەمە دەکرا مەترسییەکی قبووڵنەکراو دروست بکا، لەبارێکدا ئەگەر ڕووداوێکی لەناکاو ڕوویبدابا و لەوانەیە نەمانتوابیا سەرۆك بە خێرایی لەنێو فەرەنسادا ڕزگار بکەین. بۆیە بڕیاری ڕاست ئەوەبوو سەردانی گۆڕستانەکە ڕەت بکەینەوە، بەڵام زۆر زەحمەت بوو بۆ سەربازێکی مارینزی وەك کێلی بەمە ڕازی بێت، چونکە ئەو تاکە کەس بوو کە پێشنیاری سەردانیکردنی بالیۆ وودی کردبوو (چونکە لەوێدا هێزە مارینزەکانی ئەمریکا شەڕێکی مێژووییان بەرپاکردبوو). ترەمپ ڕازیبوونی خۆی نیشاندا، بڕیاریش درا خەڵکانی دیکە پێویستە سەردانی گۆڕستانەکە بکەن. هەروەك کۆبوونەوەکە نزیکبوویەوە و ئێمەش بڕیارمان دا بەرەو کۆشکی ئەلیزێ بچین تا چاومان بە ماکڕۆن بکەوێ، ترەمپ من و کێلی بەلاوەنا و گوتی: "کەسێکی هاوشێوەی میرا ڕیکاردێل بدۆزنەوە. خەڵکی ژێردەستی مالینای خێزانم لە دژی ئەو لەجەنگدان." من و کێلی وا گومانمان برد کە پێویستە پۆستێکی هاوتای ئەمە لە کەشێکی ئارامتری واشنتۆن لەنێو حکوومەتدا بدۆزینەوە.

میدیاکاران باسیان لەوە دەکرد کە ترەمپ لە باران ترساوە بۆیە سەردانی

گۆڕستانەکەی هەڵوەشاندووەتەوە، لەبری ئەمە دڵخۆشیی خۆی هەڵبژاردووە، لەکاتێکدا کە سەرکردەکانی دیکەی جیهان هەر لەو ڕۆژەدا گەشتیان بەنێو ئەو گۆرستانەدا کردووە. بێگومان، هیچ یەکێك لەمانە هاوئاستی سەرۆکی ئەمریکا نەبوون، بەڵام میدیاکان تێناگەن لەوەی ڕێساکانی تایبەت بە سەرۆکی ئەمریکا جیاوازە لەگەڵ ڕێساکانی ١٩٠ سەرکردەکانی دیکە کە فەرماندەی گەورەترین هێزە سەربازییەکانی ئەو جیهانە نین. ترەمپ گلەیی لە کێلی کرد، ئەم گلەییەش نیشاندەری کۆتایی هاتنی کارەکانی کێلی بوو لەنێو کۆشکی سپیدا. ترەمپ لە تەواوی گەشتەکەدا دڵتەنگ بوو (هەروەك بێرنی ساندەرز گوتبووی کە ترەمپ لە ترسێکی پاشایانەدا بوو) ئەمەش بەهۆی بێهوابوونی بوو لە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکانەوە، هیچ شتێکیش نەیدەتوانی ڕەوشەکە باشتر بکات. تەواوی ڕووداوەکانی دیکەی ئەو سەردانەی پاریس هەر ئاوایی بوو. ماکرۆن دەستی کرد بە گفتۆگان بە باسکردنی (چەك و تەقەمەنیی وڵاتانی ئەورووپی) کە هەر خۆی پێشتر لەبەر چاوی عەوام ئەمەی باس کردبوو، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەمریکییەکان ئامادەبوون بەبێ ئێمەی ئەمریکاش هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپی ناسوپاسگوزار چەکی خۆیان هەبێ. ماکرۆن سووکایەتی بە گوتارەکەی ترەمپ کرد، کە لە یادی ئاگربەستی ١١ی تشرینی دووەمی سەردەمی جەنگی جیهانی لە (ئارك دی ترۆمفی) پێشکەشی کرد، ماکرۆن گوتی: "پاتریۆتیزم (نیشیتمانپەروەری) تەواو پێچەوانەی نەتەوەپەروەرییە. نەتەوەپەروەری وەك ناپاکیکردنە لە نیشتیمانپەروەری"، دواتر گوتیشی کە " بەرژوەندییەکانی ئێمە لەپێش هەموو شتێکە، کێ گرنکی بە ئەوانی دیکە دەدات؟" ترەمپ لە کاردانەوەی ئەمەدا گوتی گوێبیستی نکۆڵییەکانی ماکرۆن نەبووم بەهۆی ئەوەی لە زۆرێك لە خاڵە سەرەکییەکاندا پچڕانی زۆر لە بیستۆکەکە هەبووە.

دوای پاریس، بەرەو ئیمارات چووم و لەوێشەوە بەرەو سەنگافوورە بۆ یارمەتیدانی جێگری سەرۆك لە گەشتەکەی کە بەشداری لووتکەی ساڵانەی یەکێتیی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای کردبوو. لە کاتژمێر ۲:۲۰ بەیانی ڕۆژی ١٤ی تشرینی دووەمدا، ڕیکاردێل پەیوەندی کرد تا پێم بڵێت کە هەواڵێك لە ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵ بڵاوبووەتەوە، بەئاشکرایی وادیارە کە لە سەرچاوەیەکی نەیارەوە دەستیان کەوتووە و تیایدا نووسیبوویان کە ڕیکاردێل خەریکە لە کارەکەی دوور دەخرێتەوە. هەواڵەکە پڕبوو لە ئاماژە و پێشبینیی ئەوەی کە هەریەك لە (کێلی و نیڵسۆن)یش دوور دەخرێنەوە، بۆیە من ڕاستەوخۆ هەوڵم دا پەیوەندی بە ترەمپ (کاتی سەنگافوورە ١٣ کاتژمێر لە پێش واشنتۆنە) و ئەوانی دی بکەم تا بزانم چی ڕوودەدات؟! لەو نێوەندەدا، تویتێك لەلایەن نووسینگەی خانمی یەکەمی ئەمریکاوە بڵاوکرابووەوە، تیایدا نووسرابوو کە ڕیکاردێل چیتر شیاوی ئەوە نییە لە کۆشکی سپی خزمەت بکات. ئەمە قسەکردن بوو دەربارەی شتێك کە پێشینەی نەبوو. من هێشتا دەمویست لەمە تێبگەم کاتێ ترەمپ لە کاتژمێر ٥:٣٠ی بەیانی تەلەفۆنی بۆ کردمەوە. ترەمپ پرسی: "ئەوە چییە کە خانمی یەکەم بڵاوی کردووەتەوە؟" و داوای لە وێستەرهاوت کرد تا تویتەکەی نیشان بدات، کاتێ تویتەکەی خوێندەوە کە تازەش دیتبووی، ترەمپ هاواری کرد و گوتی: "بەنەفرەت بێ"، ئەوانە چۆن دەتوانن شتی وا بڵاوبکەنەوە بەبێ ئەوەی نیشانی منی بدەن؟" من پێم وابوو ئەوە پرسیارێکی باش بوو. دواتر ترەمپ کۆتایی بە قسەکانی هێنا و گوتی: "لێمگەڕێ با خۆم کار لەسەر ئەمە بکەم." ترەمپ دواتر داوای لە ڕیکاردێل و ستافی خانمی یەکەمی ئەمریکا کرد بێنە کۆشکی سپی، تیایدا ئەو ستافەی خانمی یەکەم باسیان لەوەکرد کە ڕیکاردێل ڕێگری کردووە لەوەی گەشتەکەی خانمی یەکەم بۆ ئەمریکا بەئاسایی تێپەڕێت، ئەمەش بەهۆی نەزانی و ناهەستیاریی ستافەکەی خانمی

یەکەم بووە. ڕیکاردێل هەرگیز چاوی بە خانمی یەکەم نەکەوتبوو، هەموو ڕەخنەکان لەلایەن ستافی خانمی یەکەمەوە لێی گیرابوو نەوەك خانم خۆی. ترەمپ بەهۆی تویتەکانی "نووسینگەی خانمی یەکەمەوە" بێزاربوو، هاوکات ستافەکەشی نکۆڵی دەکرد و خۆیان بە بەرپرسیار بەرامبەر ئەمە نەدەزانی. ترەمپ زۆر بەجوانی گوتی: "ئەو تویتە قسەیەکی قۆڕ و بێمانایە."

کاتێ من و پێنس بەیەکەوە نانی نیوەڕۆمان دەخوارد، لەسەر بابەتی ڕیکاردێل قسەم لەگەڵی کرد. مایك پێنس گوتی: "ڕیکاردێل کەسێکی مەزنە"، بەڵێن بێ من پشتیگری تەواوی بکەم. کێلی ئەو ڕۆژە تەلەفۆنی بۆ کردم تا پێم بڵێت کە ترەمپ دوای کۆبوونەوەکەی کۆشکی سپی ڕێنمووییی کردووە و پێی گوتووە: "شوێنێك بۆ ڕیکاردێل بدۆزەوە تا دابکاسێت... پێویستە ئەو هەر لەنێو حکوومەت بمێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەی ستافی خانمی یەکەمی ئەمریکا تۆمەتباریان کردووە، بەڵام ئەو کەسێکی خراپ نییە".

کێلی بەردەوامبوو و گوتی: "پاریس کارەساتێکی تەواو بوو"، ترەمپیش بەردەوام گلەیی لە فرۆکەی سەربازی سەرۆکایەتی دەکرد لەوەی گەڕاوەتەوە واشنتۆن، تەنانەت دوای گەڕانەوەش ترەمپ بەردەوام دەیگوت چ شتێکی هەڵە ڕوویداوە، شانبەشانی ئەوەی دەیگوت پێویستە ماتیس و نیڵسۆن لە کار دووربخرێنەوە، ئەمە بەزۆریش بەهۆی بابەتی دروستکردنی دیواری سنووریی بوو لەگەڵ مەکسیك. کێلی گوتی کە ترەمپ بەرنامەی بەدەستەوەیە کۆمەڵێك کەس لە کار لابدات، بەڵام دڵنیا نییە ئاخۆ دواتر چی ڕوودەدات. من داوام لێ کرد بەردەوام هەواڵم پێ بدات، ئەویش گوتی: "باشە، هاوڕێ"، هەروەها گوتی من دۆستی زۆرم نەماوە لەنێو کۆشکی سپیدا. ڕۆژی دواتر ترەمپ ڕاگەیاندراوێکی بڵاوکردەوە و ئاماژەیدا کە ڕیکاردێل دەگوازرێتەوە بۆ پۆستێکی دیکە

لەنێو حکوومەتدا، هەرچەندە تا ئێستا ئەو کارە نوێیەمان دیاری نەکردووە. بەداخەوە، کەشەکە بەهۆی ستافی خانمی یەکەمی ئەمریکاوە تەواو خراپ بوو، بۆیە ڕیکاردێل بە خۆی بڕیاری دا کە بەتەواوی واز لە کاری حکوومی دەهێنێت و دووبارە لە کەرتی تایبەت کار دەکات. هەموو ئەمە مایەی ناڕەحەتی بوو بۆم، بەئاشکراییش ئەوەی بەسەر ڕیکاردێل هات ئەوپەڕی نادادپەروەریی بوو.

دوای نزیکەی ٩ مانگ هەڵسەنگاندنێکم بۆ کارەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کرد. بەشێوەیەکی بنەڕەتی، چەندان کاری زەحمەتمان ئەنجام دا، تێکەڵ بە چەندان ڕێککەوتننامەی خراپیش ببووین کە پێشتر کرابوون و وەك میرات بۆمان مابوویەوە (نموونەش، ڕێککەوتننامەی ناوکیی ئێران، ڕێککەوتننامەی INF) بەڵام هەستم دەکرد کە ئاژاوە لەلایەکانی دیکە ڕوومان تێ دەکات.

هەروەك کە هەڵبژاردنەکانی تشرینی دووەم نزیك دەبوویەوە، دەنگۆکان بەخێرایی زۆر زیاتر بڵاودەبوونەوە. بەدیاریکراوی دوای بێهیوابوون لە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکان و دوای یادی ڕۆژی ئاگربەستی جەنگی جیهانی، دەنگۆکان بەردەوام باسیان لەوەدەکرد ئاخۆ کێ شوێنی کێلی دەگرێتەوە. بیرۆکەیەکی ڕاستینە هەبوو کە پێیان وابوو ترەمپ نیك ئایەرز هەڵدەبژێرێ بۆ شوێنگرەوەی کێلی، ناوبراو ئێستا وەك سەرۆکی دیوانی مایك پێنس کاری دەکرد. شتێکی نائاسایی بوو بەوەی کەسێك کە بۆ جێگری سەرۆك کار دەکات ئێستا پێی بڵێی برۆ بۆ سەرۆك کار بکە، بەڵام جیم بەیکەر ئەوکاتەی وەك بەڕێوەبەری هەڵمەتی هەڵبژاردنی جۆرج بوشی باوك بوو لە ساڵانی ١٩٨٠دا دواتر بوو بە بەڕێوەبەری دیوانی کۆشکی سپی لە سەردەمی ڕۆناڵد ڕەیگان. شارەزاییە سیاسییەکانی ئایەرز وای کردبوو کە هەڵبژاردنی ناوبراو دەبێتە بژاردەیەکی گونجاو، ئەگەر کێلی بڕیاری داوە واز لە کارەکەی بێنێت، ئەوا سەرۆك پێویستە دووبارە

کەسێکی دیکە بۆ بەڕێوەبەری هەڵمەتی هەڵبژاردنی خۆی هەڵبژێرێت، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئایەرز دەیەوێ ئەم کارە بکات؟ ئایەرز دەیویست دووبارە پێناسەی زاراوەی (ڕۆڵ) بکرێت، ترەمپیش وادیارە ڕازییە لەسەر ئەم کارە، بەڵام بەردەوام لە پەیڕەوی خاڵە سەرەکییەکان لای دەدا یان پێی وابوو کە تەواوی بیرۆکەی ئەم کارە بەکەڵك نایەت و پشتگوێی دەخست. ئەم کارە سەرنجی ئایەرزی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، ئەزموونی دوو ساڵی ڕابردووی ئەو باوەڕەی لا دروست کردبوو کە بەبێ هەبوونی گەرەنتییەك و سەرچاوەیەك تا لە کاتی تەنگانە پەنای بۆ ببات، خودی ئەو مەترسییە شیاوی ئەوە نییە ڕووبەڕووی ببێتەوە. بێگومان، ئەمە پرسیارێکی کراوە بوو، ئەویش ئایا وەرگرتنی ئەم پۆستە هیچ گرنگییەکی هەیە، بەڵام ئەم پرسیارە هەرگیز وەڵامێکی گونجاوی دەست ناکەوێت.

لەکاتێکدا کوڵانی مەنجەڵی ئایەرز هێواش دەبوویەوە، کەچی مەنجەڵی ماتیس خەریك بوو بڕکی دەکرد. لەگەڵ ئەمانەش، من هێشتا پێشبینیم دەکرد ئایەرز وەك جێگرەوەی کێلی دەستبەکار دەبێت، بەدیاریکراوی لە ڕۆژی دووشەممە کە ١٠ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٨ یە. کێلی ئەو بەیانییە کاتژمێر ٦:٣٠ خولەك پەیوەندی پێوە کردم و گوتی دوای دوو ڕۆژ کارکردن، وەك ئەزموون لەگەڵ ترەمپ و لە دواهەمین گفتوگۆدا، ئایەرز بڕیاری داوە کە نایەوێ ئەو کارە وەربگرێ. کێلی ڕاشیگەیاند باوەڕی تەواوی هەیە کە ترەمپ پلانی هەیە تا نیککی هالێی لە شوێنی مایك پێنس بۆ هەڵبژاردنەکانی ٢٠٢٠ کاندید بکات، ئەمەش وای دەکرد ئایەرز بخاتە پێگەیەکی مەحاڵەوە. بەهەرحاڵ، ئێمە گەڕاینەوە خاڵی یەکەم، هەموو جیهانیش ئەمەی دەزانی. تەنیا هەواڵی خۆش ئەوەبوو کە لە ١٠ی کانوونی یەکەمدا، پات سیپۆلۆن بووە کونسووڵ لەنێو کۆشکی سپییدا، ئەمەش هەر ئاوا بەزوویی ئەنجام نەدرا. بابەتی ڕۆیشتنی (ماتیس)یش بووە شتێك کە هەموو خەڵك دەیانزانی و چاوەڕوانیان دەکرد.

زۆرێك لە کاندیدەکان لەنێوخۆ و دەرەوەی ئەمریکا ململانێیان دەکرد بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی دیوانی کۆشکی سپی، بەڵام ترەمپ لە ١٤ی کانوونی یەکەمدا تویتێکی بڵاوکردەوە و تیایدا نووسیبووی ئەوکاتەی کێلی دەست هەڵدەگرێت، میك مولڤانێی -بەڕێوەبەری نووسینگەی بەڕێوەبردن و بودجە- دەبێتە سەرۆك دیوان. کۆشنەر ئەو نیوەڕۆیە هاتەلام تا بڵێت کە بەڕاستی بەو بڕیارە دڵخۆشم و لایەنی کرداری ئەو پۆستە جگە لە نازناوێك چیتر نییە. هەروەك دواتر کە خەریکی ڕێکخستنەوەی کاروبارەکان بووم، دەرکەوت کە هیچ گفتوگۆیەکی ڕاستەقینە لەنێوان ترەمپ و مولڤانێی لەسەر ناوەڕۆکی ئەو پۆستە نەبوو، بۆیە دەرکەوت ئەم بڕیارە بەلای منەوە لە کارێکی سەرەڕۆیانە زیاتر هیچی دیکە نییە. پۆمپەیۆ پێی وابوو مولڤانێی دەبێتە ئەو کەسەی کە ئەو کارانە دەکات کە ئیڤانکا و کۆشنەر دەیانەوێ بیکات، ئەمەش لەڕووی فەلسەفییەوە هەردووکمانی نیگەران کردبوو. دەستاودەستکردنی پۆستەکەی کێلی بۆ مولڤانێی لە ٢ی کانوونی دووەمەوە خراپە بواری جێبەجێکردن.

---

لە چاوپێکەوتنێك لە مانگی تشرینی یەکەمی ٢٠١٩دا و لە سەروبەندی لێپرسینەوەکان لە ترەمپ دەربارەی قەیرانی ئۆکرانیا، کێلی گوتی کە بە ترەمپم گوتووە: "هەرچی دەکەی -ئێمە هێشتا خەریکین بۆ دۆزینەوەی کەسێك تا شوێنەکەی من بگرێتەوە- پێم گوت هەرچییەك دەکەی، کەسێك مەهێنە شوێنەکەم کە تەنیا (بەڵێ) بزانێ و کەسێك بێ ڕاستییەکانت پێ نەڵێت- ئەم کارە مەکە، چونکە ئەگەر ئەمە بکەی، بڕوا بکە دووچاری لێپرسینەوە دەبیت." ترەمپ لەلای خۆیەوە نکۆڵی کرد لەوەی کیلڵی شتێکی وای پێ گوتبێ : "جۆن کێلی هەرگیز شتی وای بە من نەگوتووە، ئەو هەرگیز هیچ شتێکی لەو جۆرەی نەدرکاندووە. ئەگەر شتێکی وای گوتبێت، ئەوا لە نووسینگەکەی فرێم دەدا دەرەوە. ئەو تەنیا

دەیویست ئەو کارە بکات کە هەموو کەسێکی دیکە دەیکات." هەروەها، ستیفانی گریشام، وەك یەکێك لەوانەی هەواداری سەرسەختی خانمی یەکەمی ئەمریکا بوون، ئێستاش کە سکرتێری ڕۆژنامەوانیی کۆشکی سپی بوو، هاوکات بە کەسێك ناوزەند دەکرێ کە دەسەڵاتی تەواوی هەیە، گوتوویەتی: "من لەگەڵ جۆن کێلی کارم کردووە، بەڕاستی کێلی ئەوەندە کەسێکی بەتوانا نییە تا بتوانێ هەموو کاروبارەکانی سەرۆکی مەزنی ئێمە بەڕێوەببات." ئەو گوتەیە گوزارشت لە قسەی ئەو کەسانە دەکات کە دەربڕینی ئاواییان هەبوو.

لەگەڵ دەستلەکارکیشانەوەی (کێلی) و دەستبەکاربوونی مولڤانێی، هەموو هەوڵە کاریگەرەکان بۆ ڕێکخستنی نووسینگەی جێبەجێکردنی سەرۆك ترەمپ وەستا. نە ستراتیژیەتی سیاسەتی نێوخۆ، نە ستراتیژیەتی سیاسی هەرگیز بەبەهێزی دەرنەکەوت، هەموو ئەمانە هەبوون بەڵام ڕۆڵیان بەنادیاری مابوویەوە، بڕیارە کەسییەکان خراپبوونی زیاتریان بەخۆوە بینی، فەوزایەکی گشتیش بڵاوبوویەوە. قەیرانەکانی تایبەت بە ئۆکرانیایان بەدوادا هات. چەندان بەڵگە هەبوون کە گریمانەکانی کێلی هەموویان ڕاست و دروست بوون.

## بەشی نۆیەم

## ئازادکردنی ڤەنزوێلا

ڕژێمی ناشەرعیی ڤەنزوێلا وەك یەکێك لە سەرکوتکارترین و خراپترین ڕژێمەکانی بەری ڕۆژئاوای جیهان، دەرفەتێکی بۆ ئیدارەی ترەمپ هێنایە پێشەوە، بەڵام ئەمە لەسەرمان پێویست دەکات لە بەرامبەریان ڕژد بین و بێوچان فشاریان بخەینەسەر. ئێمە وەك ئەمریکا شکستمان هێنا لەوەی ئەو ستانداردە جیهانییە پیادە بکەین. سەرۆك ترەمپ لەمبارەیەوە لەرزۆك و دوودڵە، لەبری ئەوەی هەوڵی چارەسەرکردنی ناکۆکییە نێوخۆییەکانی ئیدارەکەی بدات، قووڵتریان دەکاتەوە و خراپتریان دەکات، بەردەوامیش بەربەست دەخاتە بەردەم هەوڵەکانمان لەوەی نەتوانین سیاسەتێك بەرامبەر ڤەنزوێلا پیادە بکەین. ئێمە هەرگیز متمانەی تەواومان بەخۆ نەبووە تا پشتگیریی هەوڵەکانی لایەنی ئۆپۆزسیۆنی ڤەنزوێلی بکەین تا شوێنگرەوەیەك بۆ نیکۆلا مادۆرۆ دابنێین، ناوبراو وەك میرات ئەو دەسەڵاتەی لە هۆگۆ چاڤێزەوە بۆ ماوەتەوە. بەڵکو ئەوەی دەیکەین نزیکەی پێچەوانەی ئەوەیە کە خواستی لەسەرە. نەیارەکانی مادۆرۆ لە کانوونی دووەمی ٢٠١٩ هەوڵی خۆیان دا، چونکە هەستێکی بەهێزیان هەبوو، پێشیان وابوو دوای چەندان ساڵ لە هەوڵدان و شکستهێنان، ئەمە دوادەرفەتە بۆ سەربەستی و ڕزگاربوون. ئەمریکا کاردانەوەی هەبوو، چونکە پێمان وابوو ئەمە لە بەرژەوەندیی نیشتیمانیی ئێمەیە ئەو کارە بکەین. ئەمە هێشتا بەو شێوەیەیە، ململانێکانیش هەر بەردەوامیان هەیە.

دوای چەندان هەوڵی شکستخواردوو بۆ لابردنی مادۆرۆ، ئیدارەی ترەمپ هیچ دوودڵییەکی نەبوو لەوەی بەئاشکرایی و وردەکاریی زیاترەوە باس لەوە بکەن کە ئۆپۆزسیۆنی ئەو وڵاتە چەندە نزیکن لە دوورخستنەوەی مادۆرۆ، هەروەها بۆچی ڕووداوەکان ئاوا بەئاراستەیەکی هەڵەدا چوون. ژمارەیەکی زۆر لە هەواڵە ڕۆژنامەوانییەکان باسی ئەوەیان کردبوو کە لەوەتەی ساڵی ٢٠١٩ ئێمە چەندە گوێبیستی ئۆپۆزسیۆنی ئەو وڵاتە بووینە، هەر ئەمەش لەو بەشەی ئەو کتێبەدا گفتوگۆی لەبارەوە کراوە. ئەمەیان لایەنێکی ئاسایی نێو گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕە دیپلۆماسییەکانە، ئەوەی ئێمە گوێبیستی بووینە هەر هەمان ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کۆنگرێس، کەسانی تایبەتی ئەمریکی، بەتایبەتی ئەندامانی کۆمەڵەی کووبایی-ئەمریکی، یان کۆمەڵەی ڤەنزوێلی-ئەمریکی لەنێو ویلایەتی فلۆریدان، گوێبیستی بوونە. ڕۆژانێك کە ڤەنزوێلا دیسانەوە ئازاد و سەربەست دەبێ، ئەو خەڵکانەی کە پشتگیری ئۆپۆزسیۆنی ڤەنزوێلییان دەکرد، ئەوانیش ئازاد دەبن تا چیرۆکەکانیان بۆ خەڵکی ئاسایی باس بکەن. تا ئەوکاتە، ئێستا تەنیا چیرۆکی ئەو کەسانەمان لەبەردەستە و (خۆیشم) یەکێکم لەوانە، کە تەواو خۆشحاڵم گەر ڕۆژێك بتوانم چیرۆکەکانی تایبەت بە خۆیان بۆ باس بکەم.

ماوەی دوو دەیەیە هەوڵەکان لە ڤەنزوێلا بەفیرۆ دەچێت، هاوکات بووەتەهۆی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز و بەربڵاو لە دژی ڕژێمەکەی چاڤێز—مادۆرۆ. کەمێك دوای ئەوەی بوومە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، ئەوا مادۆرۆ لە کاتی پێشەشکردنی خەڵات لە ئاهەنگێکی سەربازییدا لە ٤ی ئاب، لەلایەن دوو فڕۆکەی بێفڕۆکەوانە هێرشی کرایەسەر. لەکاتێکدا ئەو هێرشە شکستی هێنا، ئەمەش کاردانەوەی بەهێزی لەلایەن سوپاوە بەدوای خۆیدا هێنا. هەر لەگەڵ دەنگی تەقینەوەکان وای کرد وێنەیەکی کۆمیدی دروستبکات کەوا چۆن

ئەندامانی سوپا ئاوا بەخێرایی ڕادەکەن، سەرەڕای پڕوپاگەندەکانی ڕژێم، کەچی دەریخست کە سوپا چەندە (دڵسۆزە) بۆ مادۆرۆ.

ڕژێمە ستەمکارەکەی مادۆرۆ بەهۆی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ کووبا هەیەتی جێگەی مەترسییە، هەروەها بەهۆی ئەو (کرانەوە)یەش کە لەگەڵ ڕووسیا، چین و ئێران هەیەتی. هەڕەشە و مەترسیی ڕووسیا بە جۆرێکە نکۆڵی لێ ناکرێ، هەم لە ڕووی سەربازییەوە، هەم لە ڕووی ئابوورییەوە، بەوپێیەی سەرچاوە داراییەکانیان فراوانتر کردووە بۆ پشتگیریکردن لە مادۆرۆ، لایەنی باڵادەست لەنێو نەوت و گازی ڤەنزوێلا هەر خۆیانن، هاوکات وایان کردووە تێچوویەکی زۆر لەسەر ئەمریکا بکەوێت. (پەکین)یش دەورێکی کەمتری نییە. ترەمپ دوای یادی ڕۆژی نیویۆرك و دیدەنی لەگەڵ عەبدولفەتاح سیسی سەرۆکی میسر لە ساڵی ٢٠١٩، پێی گوتم کە من نیگەرانی ڕووسیا و وڵاتی چینم، هەر بۆیە گوتیشی: "من نامەوێ لەو دەوروبەرە دانیشم و سەیر بکەم." ئەوکاتەی دەستبەکاربووم ڤەنزوێلا کێبڕکێی لەگەڵ ئەو کارانەم نەدەکرد کە کاری گرنگ و لەپێشینەن بۆ من، بەڵام ئیدارەدانی ئاسایشی نیشتیمانی پێویستی بە مروونەتی زیاتر هەیە کاتێك هەڕەشەکان یان دەرفەتی تازە دێنە پێشەوە. ڤەنزوێلاش یەکێك بوو لەو حاڵەت و ڕەوشانە. ئەمریکا لەوکاتەوەی کە سەرۆك مۆنرۆ ڕێبازێکی تایبەت بە خۆی دانا و لە دژی هەڕەشەی دەرەکی وەستاوەتەوە، بەتایبەتی ئەو هەڕەشانەی لەبەری ڕۆژئاوای ئەمریکاوە سەرهەڵدەدەن، بۆیە ئێستا کاتی ئەوەیە ئەم ڕێبازە بەگەڕ بخرێتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی هەریەك لە ئۆباما و جۆن کێری (وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە سەردەمی ئۆباما) هەوڵیان دا ئەم ڕێبازە بنێژن.

ڤەنزوێلا هەر خۆی وڵاتێکی مەترسیدارە، هەروەك لە ٢٢ی کانوونی یەکەمدا و لە ڕووداوەکەی نێو (دەریا)دا لەنێوان سنووری ڤەنزوێلا-گوانا ئەمە دووپات بوویەوە. لەم ڕووداوەدا یەکە دەریاییەکانی ڤەنزوێلا هەوڵیان

دا دەست بەسەر کەشتییە دۆزەرەوەکانی کۆمپانیای (ئیگزۆن مۆبیل)دا بگرن، کە لەوکاتەدا لەژێر ڕەزامەندیی وڵاتی گوانا لە سنوورە ئاوییەکانی جێگیر کرابوون. چاڤێز و مادۆرۆ پیشەسازیی نەوت و گازی ڤەنزوێلایان تا بینەقاقا بردووە، هاوکات سەرچاوە فراوانەکانی هایدرۆکاربۆنی گوانا بێگومان هەڕەشەیە بۆ سەر ڤەنزوێلا. ئەم ڕووداوە هاوشێوەی ونبوونی کەشتییەکان کۆتایی هات، دوای ئەوەی گوانا داواکاری ڤەنزوێلای ڕەت کردەوە کە دەیانویست کۆپتەرێك لەسەر یەکێك لە کەشتییەکان بنیشێتەوە، هەر بۆیە کەشتییەکانیش بە خێرایی گەڕانەوە نێو سنوورە ئاوییەکانی گوانا کە هیچ کێشەیەکیان لەسەر نییە.

کەمێك دوای هێرشی فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکان، لە کاتی کۆبوونەوەیەکی ناپەیوەندیدار لە ١٥ی ئابدا، ڤەنزوێلا کەوتە بەرباسان، ترەمپیش بەوپەڕی جەختکردنەوە گوتی: "کۆتایی بەمە بێنە"، بەو مانایەی با لە ڕژێمەکەی مادۆرۆ ڕزگارمان بێت. دواتر لە قسەکانی بەردەوام بوو و گوتی: "ئەوە پێنجەمین جارە من ئەو داوایە دەکەم. لە کۆبوونەوەیەکی نێوان من و "کێلی"دا، باسم لەو (بیرکردنەوە)یە کرد کە ئێمەی ئەمریکا وا خەریکین، بەڵام ترەمپ سووربوونی خۆی نیشاندا لەوەی کە دەیەوێ بژاردەی سەربازی پیادە بکرێ و پێی وابوو " ڤەنزوێلا هەر بەشێکە لە ئەمریکا". ئەم بەرژوەندییەی سەرۆك و باسکردن لە بژاردەی سەربازی بۆ من جێگەی سەرسامی بوو، بەڵام هەروەك پێشتر درکم پێ کردبوو کە پێشتر بژاردەی لەم جۆرە لە ئاوەزدا نەبوو، هەر بۆیە لە وەڵامی پرسیارێکی ڕۆژنامەنووساندا کتومت ساڵێك پێش ئێستا واتە لە ١١ی ئابی ٢٠١٧دا و لە شاری بێدمیستەری ویلایەتی نیوجێرسی، ترەمپ گوتی:

"چەندان بژاردە هەیە تا بەرامبەر ڤەنزوێلا بەکاری بێنین، بەڵام هەرچۆنێك بێت من بژاردەی سەربازی بەکارناهێنم. ئێمە چەندان بژاردەمان هەیە بەرامبەر ڤەنزوێلا، ئەوان دراوسێی ئێمەن... ئێمە لە

هەموو شوێنێکی جیهان هەین، هێزەکانمان لە هەموو شوێنێك هەن، تەنانەت ئەو شوێنانەی کە زۆر زۆر دوورن. ڤەنزوێلا ئەوەندە دوور نییە لێمانەوە، خەڵکی ئەوێ ئازار دەچێژن و خەریکە لە برسان دەمرن. ئێمە بژاردەمان زۆرە تا بەرامبەر ڤەنزوێلا بەکاری بێنین، تەنانەت بژاردەی سەربازیش، ئەگەر پێویست بکات."

من ڕوونم کردەوە بۆچی بەکارهێنانی هێزی سەربازی وەڵامێکی گونجاو نییە، بەتایبەتی کاتێ لەنێو کۆنگرێسدا لایەنی ئۆپۆزسیۆن لە دژی ئەمە هەیە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ نەیارەکانی مادۆرۆ کار بکەین، ئەوان هەمان ئامانجمان بۆ دەپێکن. من بەردەوام هەوڵم دەدا تیشکی زیاتر بخەمەسەر ڤەنزوێلا، لە ویلایەتی مەیامی و لە ١ی تشرینی دووەمی ٢٠١٨ گوتارێکی پڕ لە زانیاریم پێشکەشکرد و تیایدا ئیدانەی سێکوچکەی ستەمکاریی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەمریکام کرد، ئەوانیش (ڤەنزویللا، کووبا و نیکاراگوا)ن. هەر لەو گوتارە ڕامگەیاند ئەو ئیدارە نوێیەی ئەمریکا پێچەوانەی سیاسەتەکەی ئۆبامای تایبەت بە کووبایە و ئابڵووقەی زیاتر دەخاتەسەر هاڤانا، هاوکات فەرمانێکی نوێی جێبەجێکردنی ئابلووقەکان بۆ سەر (کەرتی زێڕ)ی ڤەنزوێلا دەخاتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەوپێیەی حکوومەت تا قەرزار نەبێت زێڕ لە بانکی ناوەندییەوە دەفرۆشێت. ئەو گوتارەم کە تایبەت بوو بەو سێ وڵاتە دیکتاتۆرە، هەموو ئەو پەیوەندییانەی لەنێو ئەو سێ وڵاتە هەیە بەدەریخست، بنەمایەکیشی دامەزراند تا سیاسەتێکی ڕاست لە داهاتوودا بەرامبەریان پەیرەوی لێ بکرێت. ترەمپ حەزی لە دەستەواژەی "سێکوچکەی وڵاتە ستەمکارەکان" بوو و هەر خۆیشی گوتی: "جۆن، تۆ چەندان گوتاری باشت پێشکەش کردووە، بەتایبەتی ئەو دواهەمینەت لەسەر سێکوچکەی وڵاتانی ستەمکار"، منیش گوتم کە ئەم گوتارە لەلایەن یەکێك لە گوتارنووسەکانی خۆت نووسراوە.

بێگومان، سەروەختێك گوتی کە دەیەوێ چاوی بە مادۆرۆ بکەوێ تا هەموو کێشەکانمان لەگەڵ ڤەنزویلا چارەسەر بکەین، تیایدا نە پۆمپەیۆ، نە منیش ئەوەمان بە بیرۆکەیەکی باش نەدەزانی. کاتێکی دی چوومە لای ڕوودی جولیانی لە بەری ڕۆژئاوای باڵەخانەی کۆشکی سپی. ئەو خۆی داوای کردبوو من ببینێ دوای کۆبوونەوەی ترەمپ لەگەڵ کۆمەڵێك لە پارێزەران کە ڕودی خۆیشی بەشداری تێدا کردبوو. ناوبراو پەیامێکی بۆ ترەمپ هەبوو کە لەلایەن ئەندامی کۆنگرێس (پێت سیشنز)ەوە بۆی هاتبوو، ناوبراو ماوەیەکی زۆربوو داکۆکی لەوەدەکرد کە پێویستە ترەمپ چاوی بە مادۆرۆ بکەوێت، هەروەها سیناتۆر (بۆب کۆرکەر)یش ئەویش لای خۆیەوە ئەم بیرۆکەیەی پێ باشبوو. ئەو هۆکارانەی ئەوانە پێیان باشبوو ئەو کۆبوونەوەیە بکرێ، ئەوا ئەو دووانە هەرخۆیان باشتر دەیانزانی. من دواتر لەمبارەیەوە قسەی زیاتر دەکەم. پۆمپەیۆ پێشنیاری کرد سەرەتا پێویستە کەسێك بنێرین بۆ ڤەنزویلا تا چاوی بە مادۆرۆ بکەوێت، هاوکات بەوپێیەی خواستی ترەمپ بۆ قسەکردن لەگەڵ مادۆرۆ چیتر بوونی نەما، بۆیە دوای ئەمە ئیدی خودی ئەو بابەتە هەر ئاو مایەوە و هیچی دیکە ڕووینەدا.

هەواڵێکی گەورە ڕۆژی هەینی کە بەرواری ١١ی کانوونی دووەم بوو، لە ڤەنزویلاوە هات. کاتێ سەرۆکی گەنج و تازەی پەرلەمان —خوان گاودیۆ- لە هەڵمەتێکی فراوانی شاری کاراکاس ڕایگەیاند پەرلەمان باوەڕی وایە کە ئەو ڕاگەیەنراوە ساختەیەی مادۆرۆ داویەتی بەوەی دەیەوێ لە ساڵی ٢٠١٨ هەڵبژێردیتەوە نایاساییە، هەربۆیە نادروست و بێبایەخە. هەر لەمبارەیەوە، پەرلەمانی ڤەنزویلا وەك تاکە دامەزراوەی شەرعی و هەڵبژێردراو لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە، ڕایانگەیاند کە ئێستا سەرۆکایەتی وڵات پۆستەکەی چۆڵە و فەراغی سەرۆکایەتی هەیە. لەژێر هەبوونی فەراغ لەو دەستوورەی کە هۆگۆ چاڤێز هەر بەخۆی جێی

هێشتبوو، گاودیۆ گوتی من خۆم لە ٢٣ی کانوونی دووەمدا دەبمە سەرۆکی کاتیی وڵات، کە ئەمە هاوکاتە لەگەڵ ساڵیادی کودەتای سەربازی ساڵی ١٩٥٨ کە بووەهۆی ڕووخانی دیکتاتۆریەتی سەرۆك مارکۆس پێریز خیمینێز، هەروەها دەبێ مادۆرۆ دووربخرێتەوە و ئامادەکاری بۆ هەڵبژاردنێکی نوێ بکرێت. ئەمریکا بەدرەنگییەوە قسەی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە دەبێ پەرلەمانی وڵاتەکە کار لەسەر ئەم بابەتە بکات. ئێمە هیچ ڕۆڵێکمان نەبوو لە هاندان و هاریکاریکردنی ئۆپۆزسیۆنی ئەو وڵاتە. ئەو لایەنە ئۆپۆزسیۆنە وایان دەبینی کە ئەمە دوا دەرفەتییانە. ئێستا هەموو لایەنەکان لە ڤەنزوێلا لەسەر هێڵ بوون، ئێمەش دەبوو بڕیار بدەین لەوەی چۆن کاردانەوەی خۆمان نیشان بدەین. ئایا دابنیشین و سەیری ڕووداوەکان بکەین؟ من هیچ گومانم نەبوو لەوەی دەبێ چی بکەین. شۆڕش و بەرخودان تازە هەڵگیرسابوو. بۆیە بە (ماوریسیۆ کلاڤەر کارۆن)م گوت —ناوبراو بەو دواییانە هەڵم بژاردبوو تا وەك بەڕێوەبەری باڵای ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی شاری هەمسفیەری ڕۆژئاوا دەستبەکاربێت- کە ڕاگەیاندراوێك بڵاوبکاتەوە و پشتگیری بۆ ئۆپۆزسیۆنی ڤەنزوێلا دەرببڕێت.(١)

من لەبارەی ئەوەی ڕووی داوە کورتەیەکم بە ترەمپ دا، ناوبراوم لەو کۆبوونەوەیە پچڕاند کە لەگەڵ کەسێکی دەرەکی دەیکرد و ئەو کاتەی وەك خشتە بۆ ئەو کۆبوونەوەیە دانرابوو، پێشتر کۆتاییشی هاتبوو. ترەمپ لەوە بێزاربوو ئەوەندەی گوێ لەوە بێ پێویستە گۆڕانکارییەکی گونجاو لە

---

(١) وتەبێژی وەزیری دەرەوە ڕۆبەرت پۆلادینۆ گوتی" ئێستا کاتی ئەوەیە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەستاودەستی دەسەڵات بکرێ بۆ ئەو حکوومەتە نوێیە. ئێمە پشتگیری لە داواکەی پەرلەمان دەکەین کە داوای لە خەڵکی ڤەنزوێلا کردووە تا بەیەکەوە بە ئاشتی کاربکەین، حکوومەتێکی دەستووری بگەڕێنینەوە و داهاتوویەکی گەش بنیات بنێین.

ڤەنزوێلا ئەنجام بدرێ، بۆیە گوتی ئەو ڕاگەیاندراوە هەر لەژێر ناوی خۆم بڵاودەکەمەوە نەوەك ماوریسیۆ کارۆن. من دەمتوانی ئەوە بەبیری ترەمپ بهێنمەوە کە هەر کەمتر لە دە ڕۆژ لەمەوبەر گوتی: "من نامەوێ لە شوێنی خۆم دانیشم و سەیر بکەم"، بۆیە ئەو ڕاگەیاندراوەم لەژێر ناوی خۆمدا بڵاودەکەمەوە. مادۆرۆ بەتوندی کاردانەوەی نیشاندا، هەڕەشەی لە ئەندامانی پەرلەمان و بنەماڵەکانیان دەکرد. گاودیۆ خۆی لەلایەن هێزە نهێنییەکانی ڕژێم دەستگیرکرا، بەڵام هەر بەخێرایی ئازادکرا. هەندێ بیرورا هەبوو کە لە ڕاستیدا ئەوە کووباییەکان بوون کە گاودیۆیان دەستگیرکردبوو، بەڵام ئازادکردنەکەی نیشاندەری سەرلێشێواوییەکی تەواو بوو لەنێو ڕژێمدا، ئەمەش هەر خۆی لەخۆیدا ئاماژەیەکی باش بوو.

من خۆیشم وەك یەکەم کاردانەوە لەنێو ئەو تویتانەی لەسەر ڤەنزویللا کردبووم، تیایدا ئیدانەی دەستگیرکردنی (گاودیۆ)م کرد لەلایەن ڕژێمی دیکتاتۆری (مادۆرۆ)وە. من دڵخۆشبووم بەوەی حکوومەتەکەی مادۆرۆ بەتوندی تاوانبارم دەکەن بەوەی سەرکردایەتی کودەتایەکم کردووە لە دژی دیموکراسییەتی ڤەنزوێلا"، ئەمەیان مامەڵەیەکە کە هەموو ئەو کەسانەی دیکەش کە هێرشیان کردبووە سەر ڕاوێژکارەکانی ترەمپ. شوێنی کەوتوون و دەستیان بۆ بردووە. لەوەش گرنگتر، دەستمان بەگرتنەبەری هەندێ هەنگاوی پلان بۆ دانراو کرد لە دژی ڕژێمەکەی مادۆرۆ، هەروەها لە دژی کووبا کە بە پارێزەر و کۆنترۆڵکاری ڤەنزوێلامان دەزانی، دواجار لە دژی (نیکاراگوا)ش. بۆچی لە دژی هەرسێ وڵات نەوەستینەوە؟ ئابلووقە ئابوورییەکان بژاردەیەکی سروشتییە (natural choice)، بەڵام بۆچی ڕاینەگەیەنین کە ڤەنزوێلا "وڵاتێکە سپۆنسەری تیرۆریزم دەکات"، ئەمەیان قسەیەك بوو کە سەرەتا من لە ١ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٨ پێشنیارم کرد، هەروەها (کووبا)ش دووبارە بخەینەوە نێو لیستی ئەو وڵاتانەی سپۆنسەری تیرۆر دەکەن کە ئۆبامە دەریهێنابوو؟

لەژێر سەرکردایەتی هۆگۆ چاڤێز و ئێستاش لەژێر مادۆرۆدا، داهاتی هەناردەکردنی پەترۆڵ بەشێوەیەکی دراماتیکی دابەزینی بەخۆوە بینیووە، هەروەك وەبەرهێنانیش لەو بوارە دابەزیووە، چونکە لە ساڵی ١٩٩٩ کاتێ چاڤێز دەسەڵاتی گرتەدەست ڕۆژانە ٣,٣ ملیۆن بەرمیل ڕۆژانە دەردەهێنرا، کەچی لە ساڵی ٢٠١٩دا دابەزی بۆ ١,١ بەرمیل لە ڕۆژێکدا. لەوەتەی ساڵی ١٩٤٠کانەوە ئەم جۆرە دامرکانەیەوە لە وەبەرهێنان لە ڤەنزوێلا ڕووینەداوە، هەر ئەمەش وای کردووە وڵاتەکە بکەوێتە دارووخانێکی تەواوەوە. پاوانکردنی نەوتی وڵات لەلایەن ڕژێمەوە وای کردووە وەبەرهێنانی نەوت ڕۆژ دوای ڕۆژ کەمتربێتەوە، ئۆپۆزسیۆنی وڵات پشتگیری ئەم بابەتە دەکەن تا لەدەستی ئەمانە بێتەدەرەوە، هاوکات پێیان وایە ئەمە خۆی تەنیا هۆکارێکە کە وادەکات ڕژێمەکەی مادۆرۆ بەرەو لەناوچوون بچێت. چەندان ئابلووقەی دیکە پێویستە بخرێتەسەریان تا سەرچاوە نایاساییەکانی داهاتی ئەو ڕژێمە وشك بکرێت -بەتایبەتی بارزگانیکردن لەگەڵ (تیرۆرستانی بواری ماددە قەدەغەکراوەکان) کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە وڵاتی کۆلۆمبیا کارەکانیان ئەنجام دەدەن و ناوچەیەکی ئارامیان لەنێو ڤەنزوێلاش بەدەستەوەیە- بەڵام لێدان لە کۆمپانیاکانی نەوت کلیلی سەرەکی لەناوبردنی ڕژێمەکەیە.

لە ١٤ی کانوونی دووەمدا، کۆبوونەوەیەکم لەگەڵ کۆمیتەی بەڕێوەبەرەکان لە ژووری کۆبوونەوەکان کرد تا باسی ئەوە بکەین ئاخۆ دەتوانین چ ئابلووقەیەك بخەینەسەر ڕژێمەکەی مادۆرۆ، بەتایبەتی بۆ سەر کەرتی نەوت و گاز. پێم وابوو ئێستا کاتی ئەوەیە فشاری زیاتریان بخەینەسەر و پرسیم: "بۆچی هەوڵنەدەین لەوێ سەرکەوتن بەدەست بێنین؟" لە وەڵامەکاندا وا دەرکەوت کە هەموویان بەدوای ئەوەن کاردانەوەیەکی یەکلاییکەرەوەمان هەبێ، تەنیا وەزیری گەنجینەی ئەمریکا — منوشن_ نەبێت. ئەو دەیویست شتێکی نەرمتر یان هەر هیچ کاردانەوەیەکمان

نەبێت، هەروەك گوتی ئەگەر کاردانەوەی توندمان هەبێت، ئەوا دەبێتەهۆی ئەو کەمە وەبەرهێنانەی ئەمریکا لە بواری نەوت لەوێدا دەیکا، مادۆرۆ بە نیشتیمانیی بکا و نرخی جیهانیی نەوتیش بەرزدەبێتەوە. منوشن دەیویست ئەگەر ئێمە ئابلووقەیان لەسەر بسەپێنین، ئەوا پێویستە گەرەنتی سەرکەوتنی هەبێت و مادۆرۆش لە دەسەڵات لابچێ. بێگومان، ئەمەش کارێکی مەحاڵ بوو. ئەگەر من یەك یادەوەری منوشنم هەبێ لەنێو ئەو ئیدارەیەی ترەمپدا، ئەوا چەندان کۆپی دیکە لەو جۆرە قسانەی هەیە، منوشن دژی سەپاندنی پێوەرە توندەکان بوو، بەتایبەتی لە دژی وڵاتی چین -بەڵێ ئەمە بەو شێوەیەیە. پرسیارێك هەیە ئەویش ئەوەیە بۆچی ئابلووقەکانمان ئەوەندە کاریگەر و تێکشکێنەر نین هەروەك چاوەڕوانییان لێ دەکرێ؟ پێویستە لەمە زیاتر بخوێنیتەوە. هەروەك وەزیری بازرگانی ویلبەر ڕۆس (ناوبراو ئابووریزانێکی بەناوبانگە، لە ڕووی سیاسییەوە زۆر لە منوشن پارێزگارترە. لە بنەڕەتیشدا سەر بە دیموکراتەکانە) لە مانگی نیسان پێی گوتم: "منوشن زیاتر نیگەرانیی کاریگەرییە لاوەکییەکان لەسەر کۆمپانیا ئەمریکییەکان نەوەك خودی ئەرکەکەی سەری"، کە لەم بابەتەش هیچ وردبینییەکی نییە. ناچالاکی و نادیاریی منوشن بەتەواوی پەیوەست بوو بە لایەنی ئابوورییەوە، هاوکات گرنگتر لەمەش دواتر لاری کودلۆ (بەڕێوەبەری ئەنجوومەنی ئابووری ئەمریکا) بە خێرایی گوتی: "ئەوەی ڕوانینی جۆن بۆڵتنە، من بە ڕوانینی خۆمی دەزانم." کەیس کیلۆگ (بەرپرس لە حکوومەتی ئەمریکی) ئەویش لای خۆیەوە گوتی کە مایك پێنس باوەڕی وایە پێویستە باشترین هەوڵی خۆمان بخەینەگەڕ لە دژی کۆمپانیای نەوتی سەر بە حکوومەتی ڤەنزوێلی. ئەم قسەیە کاریگەرییەکی تەواوی هەبوو. چونکە پێنس زۆر بەدەگمەن لەو جۆرە بابەتانە ڕوانینی خۆی دەردەبڕی. ئەمەش بۆ ئەوەبوو تا کارەکان لەسەر ترەمپ زەحمەت نەکات. پۆمپەیۆ خەریك بوو گەشتی دەکرد، بەڵام جێگری وەزیری دەرەوە جۆن سولیڤان

ئەویش لەگەڵ سەپاندنی ئابلووقە بوو، هەرچەندە زۆر ڕاستینەش نەبوو. وەزیری وزە -ڕیك پێری- ئەویش بەتوندی لەگەڵ ئەوەبوو ئابلووقەکان بسەپێندرێت، هەرچی ئیعتیبارەکانی منوشن هەبوو دەربارەی وەبەرهێنانە سنووردارەکانی ئەمریکا لە بواری نەوت و گاز لە ڤەنزویلادا، پشتگوێ خران.

منوشن یەکێك بوو لەنێو ئەو دەنگە کەمانەی لەگەڵ ئابلووقە نەبوون، منیش گوتم پێویستە هەرلایەکمان بڕیاری خۆی بۆ ترەمپ بنێرێت، هەر کەسێك پێویستە ئارگیومێنتی خۆی بخاتە بەرباس، چونکە ئێمە بەخێرایی هەنگاو دەنێین. مایك پێنس پێشتر پێشنیاری ئەوەی کرد تا تەلەفۆن بۆ گاودیۆ بکات و پشتگیری ئێمەی بۆ دەربڕێت، کە پێم وابوو دوای گوێبیستبوونی قسەکانی منوشن ئەمەیان بیرۆکەیەکی باشە. ئەو تەلەفۆنە بەباشی کاری خۆی کرد، دەنگۆی ئەوەشی زیاتر کرد کە ئەمریکا زیاتر کاردانەوەی دەبێ نەوەك هەر بە زارەکی، هاوکات ستایشی پەرلەمانی ڤەنزویلیشیان کردبوو. لەگەڵ ئەمانەش، منوشن بەردەوامبوو لەو هەڵمەتەی تا هیچ کاردانەوەیەك نەبێ، پۆمپەیۆ پێی گوتم کە ڕۆژی پێنجشەممە تەلەفۆنێکی نیوکاتژمێریم لەگەڵ منوشن هەبووە و پێی وابوو نابێ تەنانەت بەشێکی ئابلووقەکان بسەپێنین. منیش لە وەڵامدا گوتم ئێمە بۆمبێکمان لەبەردەستە بۆ لادانی مادۆرۆ، ئەمە لەوانەیە کاتی زۆری بوێت، زۆر پێش ئەوەی کە بەرنامەیەکی باشترمان هەبوو. پیادەکردنی نیوەی ئەو پێوەرانە بەتەواوی کارەکانمان بۆ ناکات. پۆمپەیۆ ڕازی بوو لەوەی نابێ هەمان هەڵەی ئۆبامای ساڵی ٢٠٠٩ دووبارە بکەینەوە، بەوپێیەی سەیری ئەو خۆپیشاندانەیان دەکرد کە بۆ پشتگیری لە دیموکراسی بەرپاکرابوو، کەچی هیچ پشتگیرییەکیان بۆ نیشان نەدان. ئەمە مانای وابوو کە پۆمپەیۆ لەسەر ئاراستەیەکی ڕاست هەنگاو دەنێ. تەنانەت (ڕێکخراوی ویلایەتەکانی ئەمریکا) شانبەشانی چەندان ڕێکخراوی نێودەوڵەتی

پشتگیری خۆیان بۆ گاودیۆ دەربڕی، هاوکات ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی ئەمریکای لاتینی وەستانەوە و پشتگیریی خۆیان بۆ پەرلەمانی بوێری ڤەنزوێلا دەربڕی.

---

بەوپێیەی گاودیۆ بە سەربەستی مابوویەوە، بۆیە ئەمە دەرفەتێکی بۆ ئێمە ڕەخساندبوو. ئێمە پێوستمان بە بڕیاری ترەمپ بوو دەربارەی ئابلووقەکان و ئاخۆ (گاودیۆ)ش وەك سەرۆکێکی یاسایی-کاتی ڕەچاوی بۆ دەکرێت بەتایبەتی کاتێ لە ۲۳ی کانوونی دووەمدا ئەو بڕیارە بوێرانەیە دەدات. لە ڕۆژی ۲۱ی مانگ، بۆ ترەمپم ڕوون کردەوە کە ئەو هەنگاوە سیاسی و ئابوورییانە چین کە دەتوانێ لە دژی مادۆرۆ بیانهاوێژێت و زۆریش دەربارەی ئەو ڕووداوانەی دەکرێ لەو دوو ڕۆژەی دادێ ڕوودەدەن قسەم بۆ کرد و ڕوونکردنەوەم پێدا. ترەمپ گومانی لە کەوتنی مادۆرۆ هەبوو، بۆیە گوتی: "مادۆرۆ کەسێکی زۆر زیرەك و زۆر توندە"، ئەم قسەیەی جارێکی دیکە مایەی سەرسامیم بوو، چونکە لەو قسە پێشوەختانەی بۆم دەرکەوت کە پێی وایە ڕژێمەکەی مادۆرۆ هێشتا سەقامگیرە. (ترەمپ هەر خۆی ماوەیەکی کەم بەر لە ۲۵ی ئەیلوولی ۲۰۱۸ لە نیویۆرك گوتبووی: بە ڕوون و ئاشکرایی، ئەو ڕژێمە زۆر بەخێرایی لە ڕێگەی سوپاوە دەکرێ بڕووخێندرێت، ئەگەر سوپا بیەوێ بڕیار لەمبارەیەوە بدات). ترەمپ هەروەها گوتی دەمەوێ مەودای درێژی هەموو بژاردەکان کە دەکرێ لە دژی ئەو ڕژێمە بەکاری بێنین، بزانم. بۆیە ئەوەی ترەمپ داوای کرد، من ڕۆژی دواتر بە جۆزێف دەنفۆردم گەیاند. من و دەنفۆرد باسی ئەوەمان کرد چ شتێك پێویست بیکەین گەر کاروبارەکان لە کاراکاس بەرەو خراپی چوو، بەتایبەتی دروستبوونی مەترسی لەسەر ژیانی بەرپرس و هاوڵاتییە ئاساییەکانی ئەمریکا لەوێدا، ڕەنگە پێویست بکا بەشێوەیەك کە ڕێگەپێدراو نییە هەموو کەسەکانمان کە دەکەونە بارودۆخێکی مەترسیدار، لەوێ بگوازینەوە.

ئەوەی زیاتر بیرم لێ کردبووەوە، ئەوەی زیاتر لێی تێگەیشتبووم، تێگەیشتم لەوەی کە بڕیاردان لەسەر دانپیانانی سیاسی زۆر گرنگترە لە سەپاندنی ئابلووقە لەسەر بواری نەوت. یەکەم، دانپێدانانی ئەمریکا کاریگەریی سەرەکی لەسەر (دەستەی گەنجینەی فیدراڵی) دەبێت، هەروەها لەسەر هەموو بانکەکانی جیهانیش. دەستەی گەنجینەی فیدراڵی ڕاستەوخۆ دەست بەسەر موڵك و سامانی حکوومەتی ڤەنزوێلیدا دەگرێت و دواتر دوای کۆنترۆڵکردنی، ڕادەستی ئەو ئیدارەیەی دەکات کە گاودیۆ سەرکردایەتی دەکات. بەداخەوە، هەروەك ئێمە خەریك بوو درکی پێ بکەین، کە ڕژێمەکەی مادۆرۆ تەواو سوودمەند ببوو لە دزیکردن لەو موڵك و سامانانە، کەمێك لەو موڵك و سامانانە بەجێمابوو. بەڵام دەرئەنجامە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان بۆ دانانان بەمە ئەویش گرنگ بوو، بەتایبەتی زۆرێك لە بانکە مەرکەزییەکان و بانکە تایبەتەکان هیچ هۆکارێکیان نەدەبینی تا خۆیان بخەنەژێر لایەنی خراپی (دەستەی گەنجینەی فیدراڵی[1]). دووەم، لۆژیکی سەپاندنی ئابلووقە بەسەر ئەو کۆمپانیایەی نەوتی پاوان کردووە، هەروەها پیادەکردنی پێوەرەکانی دیکە کە هەریەك لە منوشن و وەزارەتەکەی لە دژی بوون، گەر وابێ ئەوا ناتوانین هیچ وەڵامێکمان بۆی هەبێ، بەدیاریکراویش کاتێ پشتگیری لە شەرعیبوونی گادیۆ دەکەین. بۆ ئەم مەبەستە، بەرنامەم دانا تا ڕۆژی ٢٢ی مانگ لە کاتژمێر ٨ی بەیانی لەگەڵ هەریەك لە پۆمپەیۆ، منوشن، ویلبەر ڕۆس و کودلۆ کۆبوونەوەیەك ساز بکەین.

لە نێوخۆی ڤەنزوێلا، گرژییەکان زیاتر دەبوون. چەند کاتژمێرێك بەرلەوەی کۆببینەوە، تەواوی شەوەکە خۆپیشاندانی نارەزایی بەرپاکرا،

---

(١) ئەمەیان سیستەمی مەرکەزیی بانکەکانی ئەمریکایە و لەوەتەی ساڵی ١٩١٣ەوە دامەزراوە.

تیایدا گرووپی (کاسەرۆلازۆ) لە هەژارترین ناوچەکانی کاراکاس کە شوێنی بنەڕەتیی پشتگیرکردن بوو لە ئایدۆلۆژیای سیاسیی (چاڤیستا)، خەریکی دەربڕینی نارەزایی بوون لە ڕێگەی کوتینی قاپ و دەفری چێشتەوە. کەمبوونەوەی کەلوپەلە پێویستیە بنەڕەتییەکان زیاتر ببوو، خۆپیشاندەرانیش بۆ ماوەیەك دەستیان بەسەر ئەو ڕێگایانەدا گرت کە بەرەو فڕۆکەخانەی کاراکاس دەچن. تەنیا گرووپی چەتەی (کۆلێکتیڤۆس) کە بە سواری ماتۆڕسکیلەوە بوون لەلایەن (چاڤێز و مادۆرۆ)ەوە بەکاردەهێنران بۆ چاندنی تۆوی تیرۆر و تۆقاندنی ئۆپۆزسیۆنی ئەو وڵاتە، هاوکات ئۆپۆزسیۆنەکان باوەڕیان وابوو ئەم گرووپە لەلایەن کووباییەکانەوە پێداویستییان بۆ دابین دەکرێ و ئاراستە دەکرێن، واش دیاربوو خەریکە دووبارە ڕێگەکان دەکەنەوە. سوپا هیچ دەورێکی نەبوو. وەزیری بەرگری ڤلادیمێر پادرینۆ (وەك یەکێك لەو کەسە لاتینییانەی کە ناوی یەکەمی ڕووسییە و ئەزموونی سەردەمی جەنگی ساردی هەیە) و وەزیری دەرەوە (جۆرج ئاریازە) هەردووکیان لە ئۆپۆزسیۆن نزیك ببوونەوە، بەدوای ئەوەبوون ئەگەر ئۆزسیۆن لە وڵات سەرکەوێ، ئەوا لێبوردەیی پەرلەمانی ئەو وڵاتە بۆ پشتگوێخستنی ئەفسەرانی سەربازی چ مانایەکی دەبێ. لەگەڵ ئەمانەش، دوای چەندان دوژمنایەتی لەنێوان هەردوولایەن، هێشتا بێمتمانەییەکی ڕاستەقینە لەنێو کۆمەڵگەی ڤەنزوێلیدا بوونی هەبوو.

لەگەڵ هەبوونی ئەم پێشینەیە، من پرسیارم کرد ئەگەر پەرلەمان گاودیۆ وەك سەرۆکی کاتی دەستنیشان کرد ئێمەش پێویستە دانی پێدا بنێین. یەکەم جار ڕۆس قسەی کرد، گوتی ئەمە ئاشکرایە کە پێویستە پشتگیریی گاودیۆ بکەین، دوای ئەمەش یەکسەر کودلۆ و پۆمپەیۆ هەمان قسەیان دووپات کردەوە. بەدڵخۆشییەوە منوشنیش ڕازیبوو، گوتیشی کە ئێمە لەمەوپێش گوتوومانە سەرۆکایەتی مادۆرۆ نایاساییە، بۆیە دانان بە گاودیۆ

هەنگاوێکی لۆژیکیی داهاتووە. لەبارەی ئەوەی دەرئەنجامە ئابوورییەکان چۆن دەبن گفتوگۆمان نەکرد، جا نازانم بەهۆی ئەوەبوو کە منوشن هیچ پەیوەندییەکی لەو نێوەندەدا نەدەبینی، یاخود ئەوەتا نەیدەویست لەسەر ئەم بابەتە بجەنگێت. منیش لەگەڵ هیچ یەکێك لەوانە کێشەم نەبوو. کاتێ بابەتی دانان بە گاودیۆ کۆتایی هات، ئیدی باسی هەنگاوەکانی دیکەمان کرد: یەك لەوانەش کارکردن لەگەڵ گرووپی نافەرمی (لیما) بۆ نەتەوەکانی ئەمریکای لاتینی تا دان بە گاودیۆ بنێن (کە وادیارە کەمێك یان هیچ جێگەی باوەڕکردنی ئێمە نەبوو)، ڕێکخستنی ئەو مەترسییانەی لە گەشتەکانمان کە بە مەبەستی پێدانی ڕاوێژکاری پێیان ئەنجامامان دەدا، ڕەچاوکردنی ئەوەی چۆن کووباییەکان دووربخەینەوە، هەروەها چارەسەکردنی ئەو هێزە نیمچە سوپاییە ڕووسیانەی کە دەیانگوت هاتوون تا پارێزگاری لە مادۆرۆ بکەن. من وا ڕەچاوم دەکرد ئەم کۆبوونەوەیە وەك سەرکەوتنێکی گشتگیر وابوو.

ڕۆژی دواتر بەیانییەکەی قسەم لەگەڵ ترەمپ کرد، کە ئێستا دڵنیایی دەویست لەوەی دوای نەمانی مادۆرۆ دەستمان دەگات بە سەرچاوە نەوتییەکانی ڤەنزویلا، هەوڵم دەدا دڵنیای بکەمەوە کە چیتر چین و ڕووسیا ناتوانن سوودمەند بن لەو ڕێککەوتنانەی لەگەڵ ڕژێمی نایاسایی چاڤێز و مادۆرۆ کردبوویان. ترەمپ وەك هەمیشە، نەیدەتوانی جیاوازی بکات لەنێوان ئەو پێوەرە بەرپرسیاریانەی هەبوون بۆ پاراستنی بەرژوەندییە یاساییەکانی ئەمریکا، لەگەڵ ئەو بەرژوەندییە زۆرانەی کۆببوونەوە و سەر بە حکوومەت نەبوون، تەنانەت دەکرا ڕەچاویشی بۆ نەکرابێ بەتایبەتی پێوەری دیموکراتی. پێشنیارم کرد ئەو بابەتە کە مایك پێنس دەبوو لەگەڵ گاودیۆ قسەی لەبارەوە بکات، بۆ کاتێکی دواتری هەمان ئەو ڕۆژە دوابخرێ، ترەمپیش بەمە ڕازیبوو. هاوکات، پەیوەندیم بە چەندان ئەندامی شاندەکەی فلۆریدا کرد کە لە ئەندامانی کونگرێس پێك هاتبوون،

ئەوانیش هاتبوون تا ئەو ئێوارە لەسەر بابەتی ڤەنزوێلا چاویان بە ترەمپ بکەوێ، بۆیە ئەگەر کێشەی کێڵگە نەوتییەکان سەریهەڵدابایە، ئەو لەمبارەیەوە ئامادەییان تێدابوو. هەریەك لە سیناتۆران مارکۆ ڕۆبیۆ و ڕیك سکۆت، هەروەها ئەندامانی کۆنگرێس لینکۆڵن دیاز باڵارت و ڕۆن دیتسانتیس پشتگیرییەکی بەهێزیان نیشاندا بۆ لادانی مادۆرۆ لە دەسەڵات. هەروەك ڕۆبیۆ گوتی: "ئەمە ڕەنگە دوا دەرفەت بێ، سەرکەوتنیش لەمەد دەبێتە سەرکەوتنێکی گەورە لە سیاسەتی دەرەکیدا". لەمیانەی کۆبوونەوەکەدا، ئەمانە ڕوونیان کردەوە کە پەرلەمانی ڤەنزوێلا باوەڕی وایە زۆرێك لە مامەڵە بزنسییەکانی ڕووسیا و چین لە ڕێگەی پێدانی بەرتیل و گەندەڵییەوە بەدەست هاتوون، ئەمەش وای کردووە کاتێ حکوومەتی نوێ پێکدێت، ئەوا بەئاسانی پووچەڵ بکرێتەوە. ئەم گفتوگۆیە زۆر بەرهەمدار و یارمەتیدەربوو، ترەمپیش بەڕوونی ڕازیبوو کە دان بە دەسەڵاتەکانی گاودیۆ بنێت و مایك پێنس کە لەم کۆبوونەوەیە بەشداربوو، بەتەواوی ئامادەبوو ئەو پەیامە بە گاودیۆ بگەیەنێت. ترەمپ بەشێوەك کە یارمەتیدەر نەبوو، گوتی: "من دەمەوێ گاودیۆ بڵێت کە بەوپەڕی توانایەوە دڵسۆزی ئەمریکا دەبێت، نەك هیچ لایەنێکی دیکە."

ترەمپ هێشتا لەگەڵ ئەوەبوو کاردانەوەی سەربازی بەکاربێت، بۆیە ئەم بابەتە لەگەڵ نوێنەرەکانی فلۆریدا کەوتە بەرباس کە بەڕاستی ئەمە بۆ ئەوان جێگەی سەرسامی بوو، تەنیا بۆ مارکۆ ڕۆبیۆ نەبێت، چونکە پێشتر گوێیستی ئەمە ببوو و دەشیزانی چۆن بەرێزەوە خۆی لێ لابدات. دواتر، پەیوەندیم بە شەنەهان و دەنفۆرد کرد تا پرسیاریان لێ بکەم ئاخۆ بیرکردنەوەیان لەم بارەیەوە چۆنە و تا چ ئاستێك چووە. هیچ کامێکمان لەوکاتەدا بژاردەی سەربازیمان پێ گونجاو نەبوو. من پێم وابوو پیادەکردنی بژاردەی سەربازی تەنیا بۆ پاراستنی بەرژوەندییەکای ترەمپە دژی ئەوەی کە دەمانەوێ مادۆرۆ لە دەسەڵات بهێنینە خوارەوە، بەبێ

ئەوەی کاتێکی زۆر بۆ ئەم شکستە تەرخان بکەین. پێنتاگۆن دەبووایە لە خاڵی سەرەتاوە دەست پێ بکات، چونکە لەژێر سەرکردایەتی ئۆبامادا وەزیری دەرەوە جۆن کێری ڕایگەیاندبوو کە سەردەمی (ڕێبازی مۆنرۆ[1]) کۆتایی هاتووە، ئەمەیان هەڵەیەك بوو کە لەنێو هەموو هەوڵە چاوەڕوانکراوەکانی یەکەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و ئاژانسەکاندا زەنگی ئاگادارکردنەوەی لێ دەدایەوە. بەڵام ئەمە سەلماندی کە ئەوەی هەندێ خەڵك بیریان لێ دەکردەوە تەنیا نوکتەیەك بوو، بەتایبەتی کاتێ ترەمپ لێدوانی دا و گوتی پێویستە دیسانەوە ئەو (ڕێبازی مۆنرۆ)یە چالاك بکەینەوە. ترەمپ لەمەڕ بابەتی ڤەنزوێلا لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست بوو. دەنفۆرد لە کۆتایی تەلەفۆنەکەدا بەڕێزەوە ڕایگەیاند کە سوپاسی ئەو هەوڵەت دەکەم کە من وەك جۆن بۆڵتن هەوڵ دەدەم تێبگەین لەوەی بە چ شێوەیەك لایەنی سەربازیی تیمە لەو بابەتە ڕۆڵی هەبێت. بێگومان، کارە ئاسانەکە هی من بوو، بۆیە لە کۆتایی تەلەفۆنەکەدا گوتم: "هەموو ئەوەی دەبوو بیکەم بریتیبوو لەو تەلەفۆنە بۆ تۆ". ئێستا دەنفۆرد کێشەی بۆ دروستببوو. دواتر پێکەنی و گوتی: "ئەوە منم، لەو کارانە تاگم بکە." دەنفۆرد هێشتا هەندێ هەستی قۆشمە و شۆخیکردنی هەبوو.

مایك پێنس داوای لێ کردم بچمە نووسینگەکەی تا ئاگەداری ئەو پەیوەندییە بم کە لەگەڵ گاودیۆ دەیکات، کاتەکەش دەروبەری ٦:١٥ ئێوارە بوو. گاودیۆ زۆر سوپاسگوزاربوو بەرامبەر ئەو ڤیدیۆیە پشتگیرییەی ڕۆژی پێشتر لەسەر ئینتەرنێت بڵاوی کردبووەوە، هاوکات گفتوگۆیەکی زۆرباش لەنێوانیان کرا. پێنس دیسانەوە پشتگیری تیمەی دووپات کردەوە،

---

(١) ئەم ڕێبازە لە ساڵی ١٨٢٣دا لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا جەیمس مۆنرۆ دانراوە، تایبەت بە وڵاتانی ئەمریکای لاتینی دەڵێت: داگیرکاریی وڵاتانی ئەورووپی بۆ سەر وڵاتانی سەربەخۆی ئەمریکای باکوور و باشوور وەك مانیفیستۆیەکی دوژمنکارانەیە بەرانبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

گاودیۆش بە ئەرێنی وەڵامی دەدایەوە، بەگشتی باس لەوە کرا کە ئەگەر ئۆپۆزسیۆن لەم دەرفەتەدا سەرکەوتوو بێت، ئیدی شۆن کارەکانی دەکات. گاودیۆ گوتی ڤەنزوێلا زۆر دڵخۆشە بەرامبەر بەو پشتگیرییەی ئەمریکا لێی دەکات، دەست لەناو دەست بەیەکەوە کار دەکەین، یارمەتیشمان دەدەن لەو مەترسییەی ڕووبەڕووی دەبینەوە. من هەستم کرد ئەمە دەبێتەهۆی دڵڕازیکردنی ترەمپ. دوای تەلەفۆنەکە، خۆم لارکردەوە بۆ سەر کورسییەکەی پێنس تا تەوقەی لەگەڵ بکەم و گوتم: "ئەمە ساتەوەختێکی مێژووییە". پێنس پێشنیاری کرد بچین بۆ کۆشکی سپی تا کورتەیەك لەمبارەیەوە بە ترەمپ بدەین، کە ئەویش تەواو دڵخۆشە بە دەرئەنجامەکە. چاوەڕوانی ئەوەش بووین ڕۆژی دواتر لێدوانێك لەمبارەیەوە بدات.

ترەمپ دەورووبەری کاتژمێر ٩:٢٥ی بەیانیی ڕۆژی ٢٣ی مانگ پەیوەندی پێوە کردم تا پێم بڵێت کە ڕەشنووسی ڕاگەیاندراوەکە ئەوکاتە بڵاودەبێتەوە کە پەرلەمانی ڤەنزوێلا بەفەرمی دەڵێت کە دەستووری ڤەنزوێلا لە دژی مادۆرۆ دەوەستێتەوە، منیش گوتم "زۆر جوانە"، هەرگیز پێشتر قسەی وام دەرنەبڕیبوو. منیش لە وەڵامدا سوپاسیم کرد و پێم گوت لە هەموو شتێك هەواڵت پێ دەدەم. گاودیۆ لەبەردەم ئاپۆڕایەکی گەورە لە کاراکاس بەدەرکەوت (بەگوێرەی زانیاریی باڵیۆزخانەی ئەمریکا بێت، ئەمە گەورەترین گردبوونەوە بوو لە مێژووی بیست ساڵەی ڕژێمەکەی چاڤێز-مادۆرۆ دا)، لەبەردەم نووسینگەکەشی وەك سەرۆکی کاتی سوێندی خوارد. تازە بڕیارەکە درا و نەدەکرا گۆڕانی تێدا بکرێ. مایك پێنس هاتە لام تا تەوقەم لەگەڵ بکات و ڕاستەوخۆش ڕاگەیاندراوەکەی ترەمپمان بڵاوکردەوە. ئێمە ترسی ئەوەمان هەبوو بڵاوە بە هێزەکان بکرێت، بەڵام هیچ هێزێك بەدەرنەکەوت (ڕاپۆرتەکان دەریانخستبوو کە ئەو شەوە چەتەکانی کۆلیکتیڤۆس چوار کەسیان کوشتبوو). باڵیۆزخانەی کاراکاس ئامادەگی خۆیان بۆ حکوومەتە نوێیەکەی گاودیۆ دووپات کردەوە.

هاوکات باڵیۆزەکانی لیما گرووپیش بەشدارییان هەبوو، هەموو ئەمانە پشتگیری خۆیان دووپات کردەوە. دەوروبەری کاتژمێر ٦:٣٠ی ئێوارە لەسەر ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە کورتەیەکم بە ترەمپ دا، ئەویش وا دیاربوو بەجددی چاودێری ڕەوشەکە دەکات.

ڕۆژی دواتر، وەزیری بەرگری (پادرینۆ) و ژمارەیەك لە ژەنەراڵەکان کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییان سازکرد و پشتگیری خۆیان بۆ مادۆرۆ دووپان کردەوە، ئەمەش ئەوە نەبوو کە ئێمە دەمانویست، بەڵام تا ئەو ساتەوەختەش ئەمە لە چالاکی ڕاستەقینەی سوپا ڕەنگی نەدابووەوە. ئۆپۆزسیۆن باوەڕی وابوو کە زیاتر لە سەدا ٨٠ی نێو سەربازە پلەباڵاکان، تەنانەت ئەفسەرە پێشکەوتووەکانیش ئەوانەی کە بنەماڵەکانیان هاوشێوەی خەڵکی مەدەنی نێو ڤەنزویلان هەمان زەحمەتی ژیان دەچێژن، پشتگیرییان لەو حکوومەتە نوێیە کردووە. لەکاتێکدا ناکرێ لەو ڕێژە زۆرەی خەڵك دڵنیابینەوە بەرامبەر ئەو سروشتە ستەمکارەی ڕژێمەکەی مادۆرۆ هەیەتی، کەچی گاودیۆ بەردەوام دەیگوت کە پشتگیری لە سەدا ٩٠ی خەڵکی ڤەنزویلای هەیە. تایبەت بە ئەفسەرە سەربازییە باڵاکان ئەوانەی کە لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە بەشدارییان هەبوو، وا دیاربوو چەندین ساڵە بەهۆی ڕژێمەکەی چاڤیزەوە لە گەندەڵی تێوەگلابوون، پێ نەدەچوو ئەوانیش لەسەر ئەو هەڵوێستەیان بەردەوام بن. لەلایەکی دیکە، ئەمانە فەرمانیان بە سەربازەکانیان نەکردبوو لەنێو سەربازگەکاندا تا وەڵامی یاخیبووان بدەنەوە، وەك بڵێی دەترسان لەوەی گوێڕایەڵی لەو فەرمانەیان نەکرێ، ئەمەش دواجار دەبووەهۆی ئەوەی ڕژێمەکەش لەناو بچێت. وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جێرمی هەنت لە واشنتۆن بوو بۆ چەند دیدارێك، خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و ئامادەیی خۆیانی نیشانی دا لەو هەنگاوانەی داهاتوو کە دەتوانن بیگرنەبەر، بۆ نموونە وشکردنی بڕی زێڕی ڤەنزویلا لە بانکەکانی ئینگلتەرا، بەمەش ڕژێم ناتوانێ چی دیکە زێڕ بفرۆشێت و لەو ڕێگەیەوە

بەردەوام بێت. ئەمە ئەو هەنگاوانە بوون کە ئێمە پێشتر جێبەجێمان کردبوو تا لە ڕووی ئابوورییەوە فشار بخەینەسەر مادۆرۆ. بە پۆمپەیۆم گوت کە پێویستە وەزارەتەکەت پشتگیری زیاتر لە دژی هەوڵەکانی کۆمپانیا ڤەنزوێلییەکە دەربڕێت کە نەوتی وڵاتەکەی پاوان کردبوو، منیش هێشتا نیگەران بووم لەوەی منوشن دژی دەوەستێتەوە، پۆمپەیۆش بەرامبەر پێشنیارەکەم ڕازیبوونی خۆی نیشاندا. پۆمپەیۆ هاوکات نیگەرانی ئەوەش بوو کە ئاماژە هەبوو لەوەی مادۆرۆ هانی چەتەکانی (کۆلیتکتیڤۆس) بدات تا هەڕەشە لە باڵیۆزخانەی ئەمریکی و کەسایەتییەکانمان بکات، هاوکات ترەمپیش نیگەرانی هەمان بابەت بوو.

یەکەم ئاماژەی هەبوونی کێشە لەلایەن ترەمپەوە ئەو ئێوارە بەدەرکەوت کاتێ دەوروبەری کاتژمێر ٨ی ئێوارە پەیوەندی کرد تا بڵێت "من حەزم لەو شوێنە نییە کە تێیداین"، ئەو شوێنە مەبەستی ڤەنزوێلا بوو. ترەمپ نیگەرانی گۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی پادرینۆ بوو و دەیگوت: "تەواوی سوپا لەپشت پادرینۆن." دواتر گوتیشی " من هەردەم گوتوومە مادۆرۆ کەسێکی ڕەقە. ئەو منداڵە (گاودیۆ) پێشتر کەس گوێی لێ نەبووە، ڕووسەکانیش لێدوانی توندیان داوە". منیش ترەمپم هێورکردەوە و بۆم ڕوون کردەوە کە کە سوپا هێشتا لەنێو سەربازگەکانن و جووڵەیان نەکردووە، ئەمەش زۆر گرنگە، ئەفسەرە پلەباڵاکانیش ماوەی دوو ڕۆژە خەریکی گفتوگۆن لەگەڵ ئۆپۆزسیۆن و داوا دەکەن ئەگەر بێنەنێو بەرەی ئۆپۆزسیۆن یان خانەنشین بن، چارەنووسیان چی دەبێت. هێشتا ڕووداوی زۆر بەرێوەن، هەرچەند کاتیش تێپەڕبێت ئەوا پێدەچێ سوپا دابەش بێت، ئەمەش لە ڕاستیدا ئەوەیە کە ئێمە دەمانەوێ.

پێم وانییە توانیبێتم قەناعەتم بە ترەمپ هێنابێ، بەڵام بەلایەنی کەم بە جۆرێك قسەم لەگەڵی کرد تا ئیدی بێدەنگ بێت. ئەوە تەنیا خودا دەیزانی ترەمپ دەبێ لەگەڵ کێ قسە بکات، یان ئەوەتا دووچاری جۆرێك لە

دڵەراوکێ بووە بەهۆی ئەوەی شتەکان هێشتا بە نادڵنیاییەوە مابوویەوە. من لە یەك شت دڵنیابووم: ئەگەر ئەمریکا هەروا بمێنێتەوە و بڕیارێك نەدات، ئەوا تەواوی ئەو دەرفەتە لەناو دەبات. گومانم دەکرد ترەمپیش ئەو ڕاستییەی دەزانی، بەڵام من سەرم سوڕمابوو لەوەی سیاسەتەکەمان کە تەنیا سێ کاتژمێر بوو خرابووەکار، خەریکە دەگۆڕێت. تۆ ناتوانی ئەم سیاسەتە بنیات بنێی.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، تەلەفۆنی بۆ پۆمپەیۆ کرد تا پێی بڵێم کەوا چۆن ترەمپ خەریکە ڤەنزوێلا بە تەنیا جێ دەهێڵێتەوە و دەمویست دڵنیاشبم لەوەی ئاخۆ پۆمپەیۆ شوێنی ترەمپ دەکەوێ. خۆشبەختانە، بەتەواوی پێچەوانەم پێچەوانەم گوێ لێ بوو، پۆمپەیۆ گوتی: "پێویستە هەرچۆنێك بێت پشتگیرییان بکەین" تا مادۆرۆ لەسەر دەسەڵات لابەرین. دواتر داوام لە کلاڤەر کارۆن کرد چاودێریی خەڵکانی ژێردەستی گاودیۆ بکەن تا دڵنیامان بکەنەوە ئێمە پەیامەکان بڵاودەکەینەوە، بۆ ئەوەی بگاتە دەست سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، بانکی پارەدەری نێودەوڵەتی و دامەزراوەکانی دیکەی هاوشێوەی ئەمانە، هەرچی زوو ئەمە بکرێ باشترە، تا ڕای بگەیەنین کە ئەو حکوومەتەی ئۆپۆزسیۆن پێکی هێناوە، شەرعیە. پۆمپەیۆ پێی وابوو ڕێگەیەك هەیە تا بتوانین کەسە ئەمریکییەکان لە کاراکاس بپارێزین، ئەمە ڕێگەمان پێ دەدا لەسەر ئەرکی خۆمان بەردەوام بین، پۆمپەیۆ خۆی دەویست ئەمە بکات. من ڕوونم کردەوە کەوا چۆن وەزارەتی دەرەوە ئەوەندە پەرۆشی ئەو کێشانەیە کە پەیوەستن بە سەلامەتییەوە و ئەمە وای کردووە ڕەوایەتی زیاتر بەو کێشانە بدات کە پەیوەستن بە سیاسەتی ئەمریکاوە، هاوکات داوام لێ کرد پێویستە ستافی فەرمی کارمەندانیش بپارێزن. من بەدڵنیاییەوە نەمگوت کە ئەو مەترسییەی لەسەر خەڵکی ئێمە هەیە لە ڤەنزوێلا پشتگوێ بخرێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە بڕوام وابوو کە واباشترە لەوێدا پاشەکشەیان پێ بکرێ لەبری ئەوەی

ڕەوایەتییەکی کرداریی بە حکوومەتەکان بدەن بەتایبەتیش حکوومەتەکەی مادۆرۆ.

یەکسەر دوای کاتژمێر ٩ی شەو، تەلەفۆنم بۆ ترەمپ کرد، زانیم کە ئەمشەو ڕەوشی باشترە لە ڕۆژی پێشووتر. ترەمپ هێشتا پێی وابوو کە ئۆپۆزسیۆن "شکستی پێ دەهێندرێت"، لەمەدا دیسان بیری لە وێنەی وەزیری بەرگری (پادرینۆ) و (هەموو ئەو ژەنەڕاڵە ڕووخسار جوانانە دەکردەوە کە پشتگیری خۆیان بۆ مادۆرۆ دووپات کردبووەوە. بە ترەمپم گوت کە فشاری ڕاستەقینە خەریکە دەست پێ دەکات، بەوپێیەی لەوکاتەدا ئێمە ئابلووقەمان دەخستەسەر پەترۆڵی ڤەنزویلا، بۆیە ڕژێم بەشێکی زۆری داهاتەکەی لەدەست دەدا. ترەمپ گوتی: "ئەم کارە بکەن"، ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوون بوو کە پێویستە هەوڵەکانی وەزارەتی گەنجینەی ئەمریکا سەراوژێر بکەم ئەگەر هێشتا لە دژی ئەوەن ئابلووقە بسەپێنین. دەربارەی کەسایەتییە دیپلۆماتکارەکانمان لە کاراکاس، ترەمپ دەیویست هەموویان لەوێ دووربخەینەوە، لەوەش دەترسا ئەگەر هەر شتێکی هەڵە ڕوویدات دواتر کاردانەوەی خراپ بەدوای خۆیدا بهێنێت. بەهەرحاڵ، تا ڕادەیەکی زۆر وا دیاربوو ئەمە جێگەی بایەخی ترەمپ نەبوو، هەر ئەو ڕۆژە و دواتر ئەمە دەرکەوت، بەوپێیەی بەشێکی حکوومەتەکەی داخست، هاوکات ئەمە لە ڕووی سیاسییەوە وەك ڕادەستبوونێکی تەواو بوو بە پرۆژەی دروستکردنی دیواری سنووریی لەگەڵ مەکسیکدا. هیچ جێگەی سەرسامی نییە کە ئەو ڕۆژە ترەمپ لە ڕەوشێکی باشدا نەبوو، بەڵکو تووڕە و هەڵچوو دیاربوو.

بڕیارم دا تەلەفۆن بۆ منوشن بکەم، ئەویش دیسانەوە لەبەر چەند هۆکارێك لە کالیفۆرنیا بوو، ناوبراو ڕازیبوو لەوەی کە پێویستە ئابلووقەکان بسەپێنین و "ئێستا ئێمە دان بەو ڕژێمە نوێیەدا دەنێین". تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆش کرد تا ئەو هەواڵە خۆشەی پێ بدەم، ئەویش گوتی کە وەزیری دەرەوەی

ڤەنزویلا ڕۆژی شەممە دێتە نیویۆرك تا بەشداری گفتوگۆی ئەنجوومەنی ئاسایشی یوئێن بکات کە ئێمە و چەندان وڵاتی دیکە داوامان کردبوو. ئێمە هەردووکمان پێمان وابوو ئەمە لەوانەیە دەرفەتێك بێ بۆ پۆمپەیۆ بەتەنیا چاوی پێی بکەوێ و بەڕوونی لە ئاوەزی ئەو پیاوە تێبگات و بەبێ ئەوەی گوێ لەو کەسانە بگرێ کە ڕەنگە وەك یاریدەدەر لەگەڵی بن، بە هەمان شێوەی ئەوەی ئێستا لە ئەرکە دیپلۆماسییەکانی دیکەمان لەگەڵ ڤەنزوێلییەکان لە تەواوی جیهاندا دەیکەین. بەهۆی ئەوەی تا ڕادەی دڵنیایی باوەڕمان وابوو کە هەر یەك لە چین و ڕووسیا ڤیتۆ بەکاردێنن، بۆیە چاوەڕوانمان نەدەکرد ئەنجوومەنی ئاسایشی یوئێن شتێکی کردارییمان بۆ بکات، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەمە کۆڕبەندێکی باش بوو تا پشتگیریی زیاتری خۆمان بۆ ئۆپۆزسیۆن لە ڤەنزوێلا دووپات بکەینەوە. گاودیۆ دواتر ڕۆڵێکی یارمەتیدەرانەی بینی، کاتێ داوای لە کووبا کرد خەڵکەکەی لە ڤەنزوێلا دووربخاتەوە و ڕەوانەی وڵاتی خۆیانیان بکاتەوە.

لە ڕۆژی شەممە، ٢٦ی کانوونی دووەم، کاتژمێر ٩ی بەیانی، ئەنجوومەنی ئاسایشی یوئێن کۆبوویەوە، پۆمپەیۆش بەشێوەی زارەکی هێرشی کردەسەر ڕژێمەکەی مادۆرۆ. وڵاتانی ئەورووپی ئەندام گوتیان کە مادۆرۆ ٨ ڕۆژی لەبەردەمە تا داوای هەڵبژاردن بکات، ئەگەرنا هەموومان دان بە گاودیۆدا دەنێین، ئەمەیان پێشڤەچوونێکی بەرچاوبوو لە هەمبەر ئەو باوەڕەی ئێمە بە پێگەی یەکێتیی ئەورووپامان هەبوو. ڕووسیا ئەم کۆبوونەوەی وەك هەوڵێك بۆ کودەتا ناوزەند کرد و بە شەخسی ڕەخنەیان لە من گرت بەوەی لەسەر "شێوازی بۆلشەڤیك" ڤەنزوێلامان بە موڵکی خۆمان زانیووە (من ئەمە بە شانازییەك بۆ خۆم دەزانم!)، بۆیە ئەمە دەریخست کە ئێمە لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستین و بەدوای ئەو پاوانکردنەی نەوتەوەین. هەواڵی نیمچە گرنگ ئەوەبوو کە شاندی سوپای ڤەنزوێلی لە واشنتۆن پشتگیری خۆیان بۆ گاودیۆ دووپات کردبووەوە. ئەمانە و پشتگوێخستەکانی دیکەی

ئۆپۆزسیۆن وای کرد خەڵکی دیکەش داکۆکییان لێ بکەن، تیایدا وەك ڕێوشوێنێکی ستاندارد ئۆپۆزسیۆن داوای دەکرد قەناعەت بە ئەفسەر و بەرپرسە مەدەنییەکان بهێنن کە هێشتا لە ڤەنزوێلان، هەرچەند بۆیان دەکرێ خەڵك بهێننە دەرەوەی ڤەنزوێلا و ڕزگاریان بکەن.

بەداخەوە، وەزارەتی دەرەوە لە (بار)ی هەڵچووندابوون لە هەمبەر ئەو گەرەنتییەی لە مادۆرۆیان داواکردبوو کە دەبوو کەسایەتییە دیپلۆماتکارەکانمان پارێزراو بن. ئەمەیان دەربارەی ئەوە نەبوو ئاخۆ چەند دڵنیایی و وردبینی لەو پارێزبەندییە هەیە کە ڤەنزوێلا دابینی دەکات، بەڵکو دەربارەی ئەوەبوو چۆن "تێبینییە دیپلۆماسییەکان" diplomatic notes ئاڵوگۆڕ بکەین، ئەمەیان تەواو ئاشکرابوو بۆ ئەو فراوانییەی کۆنتێکستی سیاسی هەیەتی. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەروەها ئاگەداری (کاربەدەستانی سیستەمی بانکی فیدراڵی) ئەمریکاشی کرد کە ئێمە دانمان بەو حکوومەتە نوێیەی کاراکاسدا ناوە، کە ئەمە هەر خۆی کردەیەکی سەرنجڕاکێشش بوو. ڕۆژی دووشەممە، نووسینگەی کاروبارەکانی ناوچەی هەمسفیەری ڕۆژئاوا[1] لە یاخیبوونێکی ئاشکرادا لە دژی سەپاندنی ئابلووقەکان بوون بۆ سەر پەترۆڵی ڤەنزوێلا، هەروەك من خۆم لێی دەترسام، ئەوانە دەیانگوت سەپاندنی ئەو ئابلووقانە مەترسی لەسەر ستافی باڵیۆزخانەی ئەمریکی دروست دەکات. سکرتێری نووسینگەی کاروبارەکانی هەمسفیەری ڕۆژئاوا (کیم برایەر) داوای ٣٠ ڕۆژ دواخستنی کرد بۆ سەپاندنی ئابلووقەکان، کە بەڕاستی ئەمە جگە لە بێمانایی هیچی دیکە نەبوو. لە سەرەتادا من ئەمەم بە جددی وەرنەگرت. بەڵام قسەکەی برایەر وادیاربوو ڕۆژ دوای ڕۆژ کارەکە زیاتر دوادەخات، هیچ

(١) نووسینگەی هەمسفیەری ڕۆژئاوا، ئەمەیان دامەزراوەیەکە سەر بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکایە، کار بۆ بەرەوپێشبردنی سیاسەتی دەرەکی و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەکات.

کارێکیشمان نەکرد تا فشار بخەینەسەر ڕژێمەکەی مادۆرۆ بۆ ئەوەی چیتر ستافی باڵیۆزخانەی ئێمە لەژێر مەترسیدا نەهێڵێتەوە (زۆربەی ستافی ئەو باڵیۆزخانەیە ئاسایش بوون، نەوەك دیپلۆماتکار). ئەگەر من وەك هەرزەکارێك خەریکی گاڵتەجاڕیی زیاتر بم، ئەوا لەوانەیە کۆتایی قسەکانم ئەوەبێ کە (برایەر) و نووسینگەکەی لە ڕاستیدا هەوڵدەدەن سیاسەتی بنەڕەتیمان سەراوژێر بکەن.

ئێوارەی ڕۆژی شەممە پۆمپەیۆ پەیوەندی پێوە کردم و دڵنیانەبوو لەوەی دەبێ چی بکەین بۆ بەرهەڵستی کەسانی مەدەنی. منیش قەناعەتم پێ هێنا کە نووسینگەی هەمسفیەری ڕۆژئاوا یاری بە کاتەوە دەکات، تۆش وەك (وەزیری دەرەوە) ڕازامەندی لەسەر هەر دواخستنێك بدەی، ئەوا دەبێتە بنەمایەك بۆ داواکردنی دواخستنی زیاتر. دواجار، ئەویش ڕازیبوو بەوەی گەر بەیانی دەست بە سەپاندنی ئابلووقەکان بکەین، ئیدی ئێمەش هەر ئەوەمان کرد. لەگەڵ ئەمانەش، بەرهەڵستی ئەو نووسینگەیە ئاماژەیەکی باش نەبوو. کێ دەیزانی ئەو دامەزراوەیە چ شتێك بە حکوومەتەکانی دیکە، ناوەندەکانی بیرکردنەوە/ لۆبی بەهێزی وڵاتانی ئەمریکای لاتینی دەڵێت کە لە واشنتۆن بوونیان هەبوو، یان تەنانەت چی بە دەزگا میدیاییەکان دەڵێت؟ من و منوشن ڕۆژی دووشەممە چەندینجار قسەمان کرد. تەواوی کۆتایی هەفتەکە قسەی لەگەڵ بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکانی کۆمپانیا نەوتییەکە کردبوو، ئابلووقەکانیش زۆر لەوەی ئەو لە سەرەتادا پێشبینی دەکرد توندتر دەبێت، ئەمەش هەواڵێکی خۆش بوو. بەگوێرەی پێشبینییەکان بووایە، زیاد لە پێویست دەیانگوت کە ئێمە ناتوانین لە دژی ئەو کۆمپانیایە نەو نییە کاردانەوەمان هەبێ کە حکوومەت خاوەندارێتی دەکرد، چونکە ئەمە کاریگەریی نەرێنی بۆ سەر پاڵاوگەکانی کەناری کەنداو (Gulf Coast) دەبێت، بەگوێرەی قسەکانی منوشنیش بێ، ئەو سوپاسگوزاری خۆی نیشاندا بەرامبەر ئەوەی ئەو ئابلووقانەی خراوەتەسەر پەترۆلی ڤەنزویلا و لە ماوەی چەند ساڵێکدا کاریگەری دەبێ، هاوکات

پاڵاوگەکانیش لە شوێنی باش هەڵکەوتوون بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی دیکەی نەوت، هاوردەکردنیش لە ڤەنزوێلاوە هەر خۆی لە خۆیدا کەمترە لە سەدا ١٠ی تەواوی کارەکانیان.

لە نیوەڕۆکەیدا، ئێمە دەبوو لە ژووری پێدانی زانیارییەکانی( briefing room) کۆشکی سپی ئابلووقەکان ڕابگەیەنین، بەڵام سەرەتا کارێکم هاتەپێش دەبوو بچمە نووسینگەی سەرۆك ترەمپ. ترەمپ زۆر دڵخۆشبوو بەوەی "بابەتی ڤەنزوێلا" ڕۆڵی باشی هەبوو لەنێو میدیاکاندا. ترەمپ پرسیاری کرد لەوەی پێت چۆنە گەر پێویستی کرد پێنج هەزار سەرباز بنێرینە کۆلۆمبیا، منیش لەسەر دەفتەرە زەردەکەی تێبینییەکانم نووسیم و گوتم لەمبارەیەوە لەگەڵ پێنتاگۆن قسە دەکەم. ترەمپ گوتی: "بڕۆ، چێژ لەو کاتە وەرگرە کە لەگەڵ ڕاگەیاندکاران دەتبێ، هەر واشمان کرد. کاتێ دەفتەری تێبینییەکانم کەوتە بەر زوومی کامێراکان، پێشبینی زۆری لەلایان دروست کرد. (چەند ڕۆژی دواتر، وەزیری دەرەوەی کۆلۆمبیا کارلۆس ترۆیلۆ چەندان دەفتەری تێبینی بۆ هێنام هاوشێوەی ئەو (دانە)یەی لە ژووری پێدانی زانیارییەکان لەلام بوو، بۆیە ئەوەی خۆم بەکارنەهێنا). بەشێوەیەکی بنەڕەتی، ئێمە باوەڕمان وابوو کە ئابلووقە خستنەسەر کەرتی نەوت لێدانێکی گەورەیە بەر ڕژێمەکەی مادۆرۆ دەکەوێت، زۆرێکیش دووپاتیان دەکردەوە کەوتنی مادۆرۆ تەنیا پێویستی بە کاتە. ئەم گەشبینییە لە ئاستێکی بەرزدا بوو و ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕا، چونکە پێیان وابوو خەڵکانی دڵسۆزی مادۆرۆ نموونەش وەك دیۆسدادۆ کابیللۆ و چەندانی دیکەش هەم موڵك و سامانەکانیان هەم بنەماڵەکانیان دەنێرنە دەرەوەی وڵات تا پارێزراو بن، بەزەحمەتیش دەنگێکت دەدۆزیەوە متمانەی بەو ڕژێمە مابێ.

لە ڕۆژی ٣٠ی کانوونی دووەم، نووسینگەکەم پڕببوو لە خەڵك، لەوانەش ساراساندەرز، بیل شاین و مێرسیدس شلاپ، تا گوێ لەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە بگرن کە لە دەوربەری کاتژمێر ٩ی بەیانییدا ترەمپ بە

(گاودیۆ)یەوە دەکرد. ترەمپ هیوای بەختێکی باشی بۆ خواست لەو خۆپیشاندانە بەرنامە بۆداڕێژراوەی بڕیار بوو ئەو ڕۆژە بەڕێوە بچێت، ترەمپ پێی وابوو ئەمە ڕۆژێکی مێژوویی دەبێت. ترەمپ دواتر دڵنیایی کردەوە کە مادۆرۆ لەسەر دەسەڵات دەهێنێتە خوارەوە، گوتیشی کە دڵنیام ڕۆژێك دادێ گاودیۆ ئەوەی دێتەوەبیر کە ئێستا وا خەریکە ڕوودەدات، ئەمە یەکێك بوو لە ڕێگەکانی ترەمپ و ئاماژەیەك بوو بۆ بەرژەوەندییەکانی لە بەرامبەر کێڵگە نەوتییەکانی ڤەنزوێلا. ترەمپ گوتی ئەمە ساتەوەختێکی مەزنە لە مێژووی جیهاندا. گاودیۆ سوپاسی ترەمپی کرد لە بەرامبەر ئەو دیموکراسییەت و پەیوەندییە بەهێزەی نیشانی دا، ئەمەش وای کرد من زەردەخەنەیەك بکەم. پەیوەندیی بەهێز؟ مەگەر هەر خۆی تەنیا هەست بەمە بکات. ترەمپ گوتی گاودیۆ پێویستە ئازادبێ لەوەی بە ئاپۆرای خەڵکەکەی بڵێت کە ئەو پەیوەندییە لەنێوانماندا ئەنجام دراوە، هاوکات چاوەڕوان دەکەم لە داهاتوودا چاوم بە خۆی بکەوێت. گاودیۆ گوتی ئەمە زۆر زۆر هاندەر دەبێ بۆ خەڵك گەر گوێبیستی ئەوە بوون قسەم لەگەڵ تۆ کردووە، لەکاتێکدا کە ئەوان لە دژی دیکتاتۆریەت دەجەنگن. ترەمپ گوتی قسەکردن لەگەڵت مایەی شانازییە، دواتر تەلەفۆنەکە کۆتایی پێ هات. بێگومان ئەمە وەك تەقینەوەیەك وابوو بۆ گاودیۆ گەر ڕایبگەیەنێت کەوا قسەم لەگەڵ ترەمپ کردووە، بێگومان ئەمەش هەر ئەو شتە بوو کە ئێمە دەمانویست. گاودیۆ تەنانەت بەر لە ترەمپ دەربارەی ئەو تەلەفۆنە تویتێکی بڵاوکردەوە، ڕووماڵی میدیاییش بەگشتی بەگوێرەی خواستی ئێمە بوو.

لە کاتژمێر ۱:۳۰ی خولەکی دوای نیوەڕۆ، چاوم بە بەڕێوەبەرانی جێبەجێکاری (کۆمپانیای پەترۆڵیۆمی ئەمریکی سیتگۆ) کەوت، کە زۆرینەی بەشی ئەم کۆمپانیایە لەلایەن کۆمپانیا نەوتییەکەی حکوومەتی ڤەنزوێلاوە خاوەندارێتی دەکرێت، تا پێیان بڵێم کە ئێمە پشتگیری

هەوڵەکانیان دەکەین، هەروەها هەوڵەکانی ئۆپۆزسیۆنی ڤەنزوێلاش بۆ بەردەوامبوون لە کۆنترۆڵکردنی پاڵاوگەکانی کۆمپانیای سیتگۆ و وێستگە خزمەتگوزارییەکانی لەنێو ئەمریکادا، بۆیە هەوڵ دەدەین ئەو پاڵاوگانە بپارێزین تا نەیەڵن مادۆرۆ لە ڕێگەی هەوڵەکانییەوە دەستیان بەسەردا بگرێت. (هەروەك بۆ ئەوانە و خەڵکانی دیکەشم ڕوون کردبووەوە، ئاماژەم دا کە ئێمە لەسەر خواستی گاودیۆ ڕێنمایی بۆ هەوڵەکانی گاودیۆ پێشکەش دەکەین بۆ دەستنیشانکردنی خەڵکانێك تا وەك بەڕێوەبەر و کارمەند لەنێو دەستە جیاوازەکانی کۆمپانیاکە کار بکەن، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو لقانەی کە کۆمپانیای سیتگۆ دواجار خاوەندارێتییان دەکات). دواتر داوام لەو بەڕێوەبەرانە کرد چاویان بە ویلبەر ڕۆس بکەوێت. ئەوانیش ڕۆژی دواتر لەگەڵی کۆبوونەوە، بەو مەبەستەی ڕێنموونی زیاتریان دەستکەوێ لەوەی چۆن خۆیان لە کاریگەرییەکانی حکوومەتی ڕووسیا بەدوور بگرن بۆ سەر عەمبارگەی کۆمپانیای نەوتی ڤەنزوێلا کە ئەمە لەوانەیە ببێتەهۆی ئەوەی دەسەڵاتمان بەسەر ئەوەی سەرچاوەی ئەمریکایە نەمێنێ، باشترین بەرژەوەندیی ڕووسیاش لەمەدایە. (لە موسکۆوە تێگەیشتین کە پوتین زۆر بایەخ بەو ١٨ ملیار دۆلارە دەدات کە ڤەنزوێلا قەرزاری ڕووسیایە، خەملاندنەکان لەسەر بڕی تەواوی ئەو پارەیە قسەی جیاواز دەکەن، بەڵام دواجار بڕێکی گەورە و بەرچاوە). بەڕێوەبەرانی کۆمپانیای سیتگۆی ئەمریکی لە سەرەتای ئەو ڕۆژەدا پێیان گوتم کە خەڵکی ڤەنزوێلا دڵسۆزن بۆ مادۆرۆ، هەوڵی شکستخواردوویان داوە تا بەرلەوەی ئەوێ جێ بێڵن، ئەو سەرمایە و کەلوپەلانە بگوازنەوە، بۆیە دواتر بە فڕۆکەیەکی هاریکاریی کۆمپانیای سیتگۆ ئەمریکایان بەرەو کاراکاس بەجێ هێشت. دڵنیابووم دەتوانین پێشبینی بکەین کە لە چەند ڕۆژی داهاتوودا شتی زۆر ڕوودەدەن.

تەنانەت لۆك ئۆیل، کۆمپانیای گەورەی ڕووسی، ڕایانگەیاند کە ئۆپەراسیۆنەکانیان لەگەڵ کۆمپانیای پاوانخوازی ڤەنزوێلی ڕادەگرین، ئەمە

بەلایەنی کەم دەرخەری ئەوەبوو کە ڕووسیا هەندێ خواستی ئەوەی هەیە خۆیان لەو زەحمەتییە بەدوور بگرن. چەند ڕۆژێك دواتر، پیترۆ چاینا، کۆمپانیای سەرەکیی وڵاتی چین، ڕایانگەیاند کە ئەوان چیتر ئەو کۆمپانیا پاوانخوازەی ڤەنزوێلا بە هاوبەشی خۆیان دانانێن کە لە پرۆژەی پاڵاوگەی (چین)یدا لەگەڵیان بەشداربوون، ئەمەش ئاماژەیەکی گرنگ بوو کە گرژییەك هەیە. دوای ئەمانەش، بانکی گازپرۆم، وەك سێیەم گەورەترین بانکی قەرزدەری ڕووسیا و نزیك لە (پوتین و کریملن)، هەموو هەژمارەکانیان ڕاگرت تا لە هەمبەر ئابلووقەکانمان خۆیان لە هەر یاساشکێنییەك بەدوور بگرن. ئێمە بڕوامان وابوو گاودیۆ و ئۆپۆزسیۆنی وڵات ئەو دەرفەتە دەقۆزنەوە تا قسە لەگەڵ دیپلۆماتکار و جۆری بزنسەکانی ڕووسیا و چین بکەن، سووربوونی خۆشیان نیشان بدەن کە ئەو دوو وڵاتە نابێ لە ناکۆکییەکانی نێوخۆی ڤەنزوێلا لایەنگریی لە لایەنێك بکەن. لەنێو حکوومەتی ئەمریکاشدا، ئێمە پلانمان بۆ ڕۆژی دوای نەمانی مادۆرۆ دادەنا و بیرمان لەوە دەکردەوە دەکرێ چی بکرێ بۆ باشکردنی ئابووریی وڵاتەکە تا لەنێو ئەو سەرلێشێواوی و خراپئیدارەدانەی دوو دەیەیە هەیە، ڕزگاری بکەین (تەنانەت پوتین ڕەخنەی لەو قۆرخکارییە گرتبوو)، هەروەها چۆن وابکەن وڵاتەکە لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێتەوە. ئێمە بیرێکی باشمان لەوە کردەوە کەوا چۆن دەتوانین لە زووترین کات یارمەتیی ئەو حکوومەتە نوێیە بدەین لە ڕووبەڕووبوونەوەی پێویستییەکانی خەڵك، هەروەها یارمەتیدانیان لەوەی لە ماوەیەکی درێژدا هەوڵ بدات ئەو وێرانکارییە سیستماتیکەی کراوە، چاکی بکاتەوە و ڤەنزوێلا ببێت بە یەکێك لە بەهێزترین وڵاتانی ئەمریکای لاتینی لە ڕووی ئابوورییەوە.

دەنگی دەهۆڵی دانانان بە گاودیۆ لە ڕووی دیپلۆماتیکییەوە بەرز دەبوویەوە و هیواداربووین نیشانی دڵسۆزانی مادۆرۆش بدەین کە ڕۆژەکانی ناوبراو لەسەر دەسەڵات وا خەریکە کۆتایی دێت، هاوکات دەمانویست دڵنیایی

هەبێ لەوەی گاودیۆ و سەرکردەکانی دیکەی ئۆپۆزسیۆن دەستگیر ناکرێن. ئەوانەی دەیلێم گریمانە نەبوون. پۆلیسی نهێنیی سەر بە مادۆرۆ چووبوونە نێو ماڵی گاودیۆ و هەڕەشەیان لە ژن و کچە گەنجەکەی کردبوو. ئەوانە زیانیان پێ نەگەیشتبوو، بەڵام ئامانجەکەیان ڕوون و ئاشکرابوو. وادیاربوو کە ئۆپەراسیۆنێك کە کووباییەکان ئاراستەیان دەکرد و دیسانەوە هەبوونی خۆیان لە ڤەنزوێلا دووپات کردەوە، نەك هەر کووبا بەڵکو ڕووسیاش هەوڵی ڕاستینە دەدەن تا مادۆرۆ لەسەر دەسەڵات بمێنێ. خۆپیشاندانەکان لە تەواوی وڵات بەردەوام بوون، ئەو ڕوانینەی کە پێیان وابوو مادۆرۆ لەسەر دەسەڵات دێتەخوارێ نەیدەتوانی ڕێگە لەمانە بگرێ. پەیوەندیی بەردەوام هەبوو لەگەڵ ئەفسەرانی سەرەکی سوپا تا لەسەر هەندێ مەرج ڕێك بکەون و بێنە پاڵ بەرەی ئۆپۆزسیۆن، هەروەها پەیوەندیی لەگەڵ ئەندامانی پێشووی کابینەکەی چاڤێز و سەرکردەی یەکێتییەکانی کرێکاران و سێکتەرەکانی دیکەی کۆمەڵگەی ڤەنزوێلا هەبوو تا هاوپەیمانییەك دروست بکرێ. ئێمە پێمان وابوو ئەو (وزە و هاوسۆزییە) لەگەڵ ئۆپۆزسیۆن دەمێنێتەوە، بەڵام ئەوانیش دەبوو هەنگاوێکی بۆ بهاوێژن.

لەنێو ڤەنزوێلادا کار لەسەر پلانێك کرا، تیایدا بەڵێن بدەین کە هاوکاریی مرۆیی لەسەر سنوورەکانی کۆلۆمبیا و بەڕازیلەوە بهێنین تا بەسەر خەڵکی ڤەنزوێلا دابەشبکرێت. تا ئەوکاتە، مادۆرۆ بەشێوەیەکی کاریگەر سنوورەکانی داخستبوو، دەکرا بەنێوبەربەستە بەرزاییە سەختەکان و چڕی دارستان و داروبارەکان بپەڕیتەوە، ئەگەرنا پەرینەوە بە ڕێگای خاڵە سنوورییە بەناوبانگ و دامەزراوەکان ئەستەم بوو. پرۆژەی هاریکاری مرۆیی دەری دەخات کە گاودیۆ گرنگی بە خەڵکی ڤەنزوێلی دەدات و نیشانی دەدات کە سنوورە نێودەوڵەتییەکان هێشتا کراوەن، هاوکات ڕەنگدانەوەی ئەوەیە کە مادۆرۆ کۆنترۆڵی ئەو سنوورانەی بەدەستەوە

نه‌ماوه‌. هه‌روه‌ها، هیوا هه‌بوو كه‌ به‌رپرسه‌ سه‌ربازییه‌كان فه‌رمانه‌كان جێبه‌جێ نه‌كه‌ن به‌تایبه‌تی داخستنی سنووره‌كان، به‌ڵام ته‌نانه‌ت گه‌ر ئه‌مه‌ش بكه‌ن، مادۆرۆ ده‌خرێته‌ پێگه‌یه‌كی مه‌حاڵه‌وه‌ به‌وه‌ی نه‌یهێشتووه‌ یارمه‌تی مرۆیی بگاته‌ ده‌ست خه‌ڵكه‌ هه‌ژاره‌كه‌ی. مادۆرۆ زۆر به‌و ستراتیژیه‌ته‌ قه‌ڵس ببوو ته‌نانه‌ت به‌ناوی خۆم ناوی منی هێنابوو و ڕه‌خنه‌ی لێ گرتبووم و گوتبووی: "به‌ڵگه‌م هه‌یه‌ كه‌ فه‌رمانی هه‌وڵی تیرۆركردنم له‌لایه‌ن جۆن بۆڵتن له‌ كۆشكی سپی دراوه‌". مادۆرۆ له‌وكاته‌دا وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی (ئاریێزا)شی له‌لاده‌بێ، دواتر مادۆرۆ گله‌یی ده‌كات و ده‌ڵێ: "بۆڵتن ده‌یه‌وێ چی بكات لێره‌، ده‌یه‌وێ فه‌رمانمان به‌سه‌ره‌وه‌ بكات؟" وڵاتی كووباش به‌ناوی خۆم هێرشیان كرده‌ سه‌رم، كه‌وابوو، من زۆر به‌مه‌ دڵخۆش بووم.

ترەمپ پرسیاری له‌و شانده‌ی كۆڵۆمبییه‌كان كرد و له‌ سه‌رۆك ئیڤان دۆكیوی پرسی چۆن ده‌بوو گه‌ر شه‌ش مانگ له‌مه‌وپێش قسه‌ت له‌گه‌ڵ مادۆرۆ كردبا، ئه‌ویش به‌ڕوونی گوتی بۆ ئه‌وكاته‌ ده‌كرا ببێته‌ سه‌ركه‌وتنێكی گه‌وره‌ بۆ مادۆرۆ، به‌ڵام له‌ ئێستادا قسه‌كردن له‌گه‌ڵی هه‌ڵه‌یه‌كی گه‌وره‌یه‌. ترەمپ گوتی من به‌و قسه‌یه‌ ڕازیم، هه‌ر ئه‌م قسه‌یه‌شی ئارامییه‌كی زۆری پێ دام. ترەمپ دواتر پرسیاری كرد ئاخۆ هه‌وڵه‌كان چۆن به‌رێوه‌ده‌چن و له‌ ئێستادا پشتگیری له‌ مادۆرۆ یان گاودیۆ ده‌كه‌ن، باڵیۆزی كۆڵۆمبیا فرانسیسكۆ سانتۆس كه‌ كه‌سێكی گاریگه‌ر بوو، گوتی كه‌ ته‌نانه‌ت دوو مانگ له‌مه‌وبه‌ر، پێم وابوو مادۆرۆ هێشتا باڵاده‌سته‌، به‌ڵام چیتر ئه‌و كه‌سایه‌تییه‌ نییه‌ و ڕوونیش كرده‌وه‌ بۆچی ئه‌و پێگه‌یه‌ی له‌ده‌ست داوه‌. ئه‌م قسانه‌ به‌ڕوونی له‌گه‌ڵ ترەمپ كرا.

له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌ش، نیگه‌رانی ئه‌وه‌بووم كه‌ حكوومه‌تی ئه‌مریكا هێشتا سووربوونی ته‌واوی خۆی نیشان نه‌داوه‌. به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش له‌نێو ته‌واوی حكوومه‌تدا باوه‌ڕێكی به‌رهه‌ڵستیش هه‌بوو، به‌ڵام وه‌ك ئه‌قڵیه‌تێك بڕه‌وی پێ

نەدراوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لە ماوەی هەشت ساڵی کابینەی ئۆباماد! هەریەك لە ڕژێمەکانی ڤەنزویلا، کووبا و نیکاراگوا وەك دوژمنی ئەمریکا ڕەچاویان بۆ نەدەکرا. کەمێك یان هەر هیچ بایەخێك لە ئەمریکا نەبوو بەوەی ئەمریکا دەبێ چی بکات بۆ خەڵکی ئەو وڵاتانە، گەر بیانویستایە حکوومەتەکانیان بگۆڕن. تەنانەت لەوەش گرنگتر، لە ڕوانینی مندا، زیادبوونی کاریگەرییەکانی ڕووسیا، چین، ئێران و کووبا لە تەواوی ئەو ناوچەیەدا وەك بابەتێکی گرنگ و کاری لەپێشینە ڕەچاوی بۆ نەکراوە. بۆیە، ئیدارەی ترەمپ لەمەڕ میکانیزمی داراییەوە دووچاری شکست دەبێتەوە لە ئەمریکای لاتینیدا و بۆ چارەسەرکردنی ئەمەش هیچ ئامادەکارییەکی نەکردووە.

ئۆپۆزسیۆن بیرکردنەوەی خۆی پوخت کردەوە لەوەی چۆن برەو بە یارمەتیی مرۆیی بدات بۆ خەڵکی ڤەنزویلا کە لە کۆلۆمبیا و بەرازیلەوە دەهات، هاوکات ڕۆژی شەممە کە بەرواری ٢٣ی شوبات بوو، وەك ڕۆژی ئامانجەکەیان دیاری کرد. شەممەی پێشتر، نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەس لە کاراکاس ناوی خۆیان بۆ وەرگرتنی یارمەتی تۆمار کرد. دوای هاریکارییەکی زۆر لەنێوان ئاژانسی بەرەوپێشبردنی نێودەوڵەتی ئەمریکا و پێنتاگۆن، فڕۆکە سەربازییە ئەمریکییەکان لە جۆری (سی ١٧) ئێستا لە ناوچەی کوکوتا دەنیشتنەوە، ئەمەیان یەکێك بوو لە خاڵە سنوورییە سەرەکییەکانی پەڕینەوە لە کۆلۆمبیادا، لەوێدا یارمەتییە مرۆییەکان دادەگیران و تا لەوێوە لە ڕێگەی ئەو پردانەی هەردوو وڵاتی بەیەك دەگەیەنێ، ڕەوانە بکرێن و بگوازرێنەوە. لەنێوخۆی ڤەنزویلادا خەڵك بەردەوام بەرەو ئۆپۆزسیۆن دەچوون. قەشەی کاسۆلیکی شاری سان کریستۆبال، کە هاوکات جێگری کۆنگرەی قەشە کاسۆلیکییەکانی وڵات بوو، لەبەرچاوی خەڵکی عەوام قسەی کرد و بەدیاریکراوی باسی لە دەستاودەستکردنی دەسەڵات دەکرد لە (مادۆرۆ)وە. ئێمە هیواداربووین

کڵێسا ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی زیاتر بگێڕێ، ئەمەش وادیاربوو خەریکە دەست پێ دەکا و ئەو ڕۆڵە دەبینێ. هەروەك ڕۆژی ۲۳ی مانگ نزیك دەبوویەوە، دەنگۆی بەهێز هەبوو سەکردەی پایەبەرزی سوپا، لەوانەش فەرماندەی سوپای ڤەنزوێلا خیسۆس سوارێز چۆریۆ بەئاشکرا ڕایگەیاندبوو کە چیدیکە پشتگیری لە مادۆرۆ ناکات. پێشتر دەنگۆی ئاوایی هەبوو، بەڵام پلانی مرۆیی بۆ بڕینی سنوور هۆکاری سەرەکی بوو لەوەی ئەمجارەیان ئەو جۆرە دەنگۆیە ڕاست بێت. لە هەمان کاتدا، سیناتۆر مارکۆ ڕۆبیۆ بە دیاریکراوی ناوی سوارێز چۆریۆ و وەزیری بەرگری و چوار کەسایەتی سەرەکیی سوپای هێنا کە ئەگەر بچنەپاڵ ئۆپۆزسیۆن، ئەوا لێبوردن دەیانگرێتەوە. هەندێ قسەی دیکەش هەبوو کە ئەم گۆڕانە دەبێتەهۆی ژمارەیەکی بەرچاو لە سەربازەکان شوێنیان کەون، هاوکات یەکە سەربازییەکان وا دیاربوو بەرەو سنوور دەچن، بەڵام دواتر فەرمانیان پێ کرا تا بگەڕێنەوە کاراکاسی پایتەخت تا دەوری کۆشکی میرافلۆرس بگرن، کە وەك کۆشکی سپی ڤەنزوێلا وابوو. بەهەرحاڵ، ئەو پێشبینییە گەشبینانە نەهاتنەدی.

ئێمە خەریکی کاری خۆمان بووین، گوتارەکەی ترەمپیش لە زانکۆی نێودەوڵەتیی فلۆریدا لە ویلایەتی میامی لە ۱۸ی شوباتدا، دەکرێ وەك هەڵمەتێکی گردبوونەوە ڕەچاوی بۆ بکرابا، خەڵکەکەش زۆر پەرۆش بوون. پلانەکان بۆ ڕۆژی ۲۳ی مانگ خرانبوونە کار، هەروەك سەرۆکی کۆلۆمبیا ئیڤان دۆکیو ڕایگەیاند کە شانبەشانی سەرۆکی پەناما، شیللی، پاراگوای و سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی ویلایەتەکانی ئەمریکا (لویس ئەلماگرۆ) لەناوچەی کوکوتا ئامادە دەبن. ئەمە بەدڵنیاییەوە دەیسەلمێنێ کە شۆڕشی ڤەنزوێلا "لە واشنتۆنەوە داڕێژراوە". یارمەتییە مرۆییەکان لەسەر سنوور زیاتر ببوو، بەڵگەش هەبوو کە هێزەکانی ئاسایشی مادۆرۆ گێچەڵەکانیان توندتر کردووە بەرامبەر ڕێکخراوە ناحکوومییەکان لەنێو

ڤەنزویلادا. گاودیۆ بەنهێنی ڕۆژی چوارشەممە کاراکاسی بەجێ هێشت و بەرەو سنووری کۆلۆمبیا چوو، لەوێدا هەروەك لەبنەڕەتدا پلانی بۆ دانرابوو، لەبەری ڤەنزویلا چاوەڕوان دەبێت لەوکاتەی کە یارمەتییە مرۆییەکان لە ڕێگەی پردی نێودەوڵەتیی تایندیتاس لە کۆلۆمبیاوە دەگاتەجێ. هەرچۆنێك بێت، گوێبست بووین کە گاودیۆ بەڕاستی بیری لەوە کردووەتەوە سنوور ببڕێت و بچێتە کۆلۆمبیا تا بەشداریی ئەو کۆنسێرتە بکات کە لەلایەن (ریچارد برانسن)ەوە سپۆنسەریی دەکرا لە شاری کوکوتا و لە شەوی هەینییدا بەرێوەدەچوو، تا لەوێوە پشتگیری بۆ خەڵکی ڤەنزویلا بەدەست بێنێ، دواتر بگەڕێتەوە سەر سنوور و سەرکردایەتی وەرگرتنی یارمەتییەکان بکات و ڕاستەوخۆش ڕووبەڕووی هێزەکانی مادۆرۆ ببێتەوە ئەگەر بەرەو ڕووی هاتن.

ئەمەیان بەهۆی چەندین هۆکارەوە بیرۆکەیەکی باش نەبوو. ئەم بیرۆکەیە زۆر دراماتیکی بوو، بەڵام مەترسیداریش بوو، نەك تەنیا لە ڕووی جەستەییەوە، بەڵکو لەوەش گرنگتر لە ڕووی سیاسییەوە. کاتێ سنوورێك دەبڕێ و لە دەرەوەی ڤەنزویلایە، ئەوا گەڕانەوەت زەحمەت دەبێ، بەتایبەتی بۆ گاودیۆ. چی بەسەر توانای گاودیۆ دێت بۆ ئاراستەکردن و کۆنترۆڵکردنی سیاسەتی ئۆپۆزسیۆن ئەگەر لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆی لە شوێنێك بەرکەنار کرا، لەوانەشە مادۆرۆ وەك پڕوپاگەندەیەك بڵێ کە گاودیۆ لە ترسان ڕای کردووە؟ هیچ ڕێگەیەکمان لەبەردەست نەبوو تا پێشبینی دەرئەنجامی ڕۆژی شەممە بکەین. لەوانەیە لە کارێکی توندوتیژەوە بچێ بۆ کارێکی توندوتیژی دیکە: شتەکان دەکرا بەرەو باشی بچن، لەکاتێکدا سنوورەکان کراوە بوون، بۆیە ئەمە دەبووە ئالنگارییەکی ڕاستەوخۆ بۆ دەسەڵاتی مادۆرۆ، یاخود دەکرا توندوتیژی و خوێنڕێژی لە خاڵەکانی پەڕینەوە ڕوویدات، دەکرا گاودیۆ دەستگیر بکرێت و یان خراپتریشی بەسەر بێت. پێم وابوو هێنانی ئەو یارمەتییە مرۆییە بۆ سەر

سنوور تێگەیشتنی باش لەبارەیەوە هەیە و بەتەواوی دەکرێ جیبەجێ بکرێ. بەهەرحاڵ، پلانی زیاتر و بێبەرنامە، لەوانەیە باش کار نەکات و بەئاسانیش هۆکار بێ بۆ دروستکردنی کێشە.

لە ناوەڕاستی هەموو ئەو کاروبارانەدا، هاوکات لەگەڵ چاوەڕوانی لە ئەنجامدانی لووتکەی نێوان ترەمپ و کیم جۆنگ ئوون، ئەو گەشتەی پلانم بۆ دانابوو تا بەرەو ئاسیا بچم، کورتترم کردەوە، بۆ نموونە کۆبوونەوەکانی کۆریام هەڵوەشاندەوە بەمەش دەمتوانی تا یەکشەممە لە واشنتۆن بمێنمەوە بۆ ئەوەی بزانم لە ڤەنزویلا چ ڕوودەدات. لەگەڵ ئەوەی میدیا جەختی لەسەر سنووری نێوان کۆلۆمبیا – ڤەنزویلا دەکردەوە بەتایبەتی ناوچەی کوکوتا، هاوکات بەرەوپێشچوونی بەرچاویش لەلای بەرازیلیش هەبوو. (پیمۆنییەکان) ئەو خەڵکە ڕەسەنەی نێوخۆی ڤەنزویلا کە ڕقیان لە مادۆرۆ دەبووەوە، دەگوترا بیست و حەوت پاسەوانیان دەستگیر کردووە کە تیایدا ژەنەڕاڵێکی لەخۆ گرتبوو و خاڵێکی پشکنینی فڕۆکەخانەیەکیشیان سووتاندبوو. تا ڕۆژی هەینی، پیمۆمنییەکان دەستیان بەسەر چەندان ڕێگەشدا گرت کە بەرەو ڤەنزویلا دێت.

دواتر لە ڕۆژی هەینی دا، ڕاگەیاندرا کە گاودیۆ بە کۆپتەر چووەتە نێو خاکی کۆلۆمبیا کە لەلایەن ئەندامانی هاوسۆزی سوپای ڤەنزوێلی هاریکاری کراوە. چاوەڕوان دەکرا هەر ئەو هێزانە ڕۆژی شەممە یارمەتییە میرۆییەکان لەو خاڵە سنوورییە وەرگرن و بیانگوازنەوە. من بێهیوا بووم، بەڵام بەلایەنی کەم گوێبستی ئەوەبووین کە خەڵکی زیاتر بەشداری کۆنسێرتەکەی (ریچارد برانسن)یان کردووە زۆر زیاتریش لەو کۆنسێرتەی مادۆرۆ لەنێو ڤەنزویلا وەك کێبڕکێیەك بۆ ئەم کۆنسێرتەی ریچارد ڕێکی خستبوو، کە من پێشم وابوو ئەمە هەر خۆی جۆرێکە لە سەرکەوتن. جێگرەکەی سەرۆك مادۆرۆ، دیلسی ڕۆدریگێز ڕایگەیاند هەموو خاڵە سنوورییەکانی پەڕینەوە لە ڕۆژی شەممەدا دادەخرێن، بەڵام ئێمە زانیاریی

دژی ئەمەمان هەبوو بەتەواوی لەسەر چی داخراوە و لەوانەشە ئێستاش هەر کراوە بێت.

بەیانیی ڕۆژی شەممە، ئاپۆڕایەکی زۆری خەڵك لەسەر سنوور لەبەری کۆلۆمبیادا خڕببوونەوە، پۆلیسی دژی ئاژاوەگێڕیش لەبەری بەرامبەر لە ناوچەی تەچیرا وەستابوون. هەندێ ئاژاوەگێڕی کەمیش لەنێو سنووری بەڕازیل ڕوویدا لەوکاتەی کە خەڵکەکە کۆببوونەوە. یارمەتی و کەلوپەلەکان لە چەند خاڵی سنووری نێوان هەردوو وڵات بۆ چەند هەفتەیەك دابین کرابوو، چاوەڕوانیش دەکرا هەر لەو ڕۆژەدا چەندان بارهەڵگری دیکەی یارمەتییەکان ئامادەکرابوو و بگەنە ئەو خاڵە سنوورییانە، هەموو ئەمانەش لەلایەن کەسانی خۆبەخش لە بەڕازیل و کۆلۆمبیاوە یاوەری دەکران و چاوەڕوان دەکرا لەبەری ڤەنزویلا لەگەڵ خۆبەخشانی نێوخۆییدا بگەنە یەکتری. بەلایەنی کەم ئەمە وەك پلانێك هەژماری بۆ دەکرا. ڕووداوەکانی وەك ڕاوەشاندنی بەرد، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پاسەوانانی نیشتیمانیی ڤەنزویلی، هاوکات بەوپێیەی لەو ڕۆژەدا چەندان هەوڵ هەبوو بۆ پەڕینەوە لەو سنوورە، بۆیە چەندان بەربەست دانرابوون و ژمارەیان زیاتر کرابوو. چەندان ئەفسەری ناوەندی و ڕیزەکانی هێزی دەریایی لە ڕژێم جیا ببوونەوە، دەشیانگوت کە چەندان پاسەوانی نیشتیمانیش بەدرێژایی ئەم سنوورە وازیان لە کارەکانیان هێناوە.

گاودیۆ لە دەوروبەری کاتژمێر ٩ی بەیانی گەیشتە پردی نێودەوڵەتی تایندیتاس و ئامادەبوو بپەڕێتەوە. ڕاپۆرتەکان دەیانگوت کە تەواوی ڕۆژەکە گاودیۆ خەریك بووە بپەڕێتەوە، بەڵام ئەمە ڕووینەدا بەبێ ئەوەی ڕوونکردنەوەیەکی تەواو بدەن. لە ڕاستیدا، ئۆپەراسیۆنەکە شکستی هێنا، تەنیا هەندێ حاڵەتی شاز نەبێ تیایدا هەندێ خۆبەخش هەوڵیان دا ئەو یارمەتی و کۆمەکە بپەڕێننەوە نێوخۆی ڤەنزویلا و ئەمانە لە سنووری بەڕازیل توانیبوویان بەسەرکەوتوویی ئەم کارە بکەن، بەڵام لە سنووری

کۆلۆمبیا نەیانتوانیبوو هەمان شت بکەن. پیمۆنییەکان هێشتا توندوتیژترین لایەن بوون، توانیان دەستبەسەر گەورەترین فڕۆکەخانە لە ناوچەی سنووریی لەگەڵ بەرازیلدا بگرن و چەندان پاسەوانی نیشتیمانی دیکەشیان دەستگیر کردبوو. لەنێوان کۆلێکتیڤۆسەکان و هەندێ یەکەی پاسەوانی نیشتیمانی ئاستی توندوتیژییەکان بەرامبەر هەوڵەکان بۆ پەڕینەوە لە سنوور زیاتر ببوو، بەڵام ئاستی گەیشتنی هاوکارییەکان ئاوا بەرز نەبوو. چەندان خۆپیشاندانی گەورە لەنێو شارەکانی ڤەنزویلا بەرپا کران، ئەمانە وا پلانیان بۆ دانرابوو کە هاوکات بێ لەگەڵ گەیشتنی هاوکارییە مرۆییەکان، یەك لەو خۆپیشاندانانەش لە دەرەوەی بنکەی سەربازی لا کارلۆتای کاراکاس بوو، لەکاتێکدا ئەو خۆپیشاندەرانە هەوڵیان دا قەناعەت بەو پیاوانە بێنن کە لەوێدا خزمەتیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە شکستیان هێنا.

تا کۆتایی ڕۆژی شەممە، پێم وابوو ئۆپۆزسیۆن شتێکی کەمی کردووە بۆ بەرەوپێشبردنی کێشەکەی. من بێهیوا ببووم بەوەی خەڵکێکی زۆر لەنێو سوپادا بەتایبەتی لە ئاستی بەرزدا کارتێکراو نەبن و نەیەنە نێو ڕیزی ئۆپۆزسیۆنەوە. هاوکات، سەرم سوڕما لەوەی گاودیۆ و کۆلۆمبیا چۆن پلانی بەدیلیان جێبەجێ نەکردووە لەکاتێکدا کۆلێکتیڤۆس و هێزەکانی دیکە کاروانی یارمەتییەکانیان وەستاندبوو و لەسەر پردەکانیش ئاگریان لە بارهەڵگرەکان بەردابوو. وادیاربوو شتەکان بە هەڕەمەکی کرابوون و پەیوەندی لەنێوانیان نەمابوو، جا نازانم بەهۆی ئەوەبوو کە لە ڕووی پلانێکی پێشکەوتووەوە کێماسیان هەبوو، یاخود شکستیان هێنا بەهۆی چەند هۆکارێك کە هەرگیز ڕاستەوخۆ ناتوانم باسی بکەم. بەڵام ئەگەر لە ماوەی چەند ڕۆژی دواتر شتەکان کۆنەکرێتەوە و گاودیۆ نەگەڕێتەوە کاراکاس، ئەوا نیگەرانییەکانی منیش دەستی پێ دەکرد.

ئێمە گوێمان لەوە بوو کە لەنێوخۆدا خەڵکی ڤەنزویلا ڕۆژی شەممەیان وەك سەرکەوتنێك بۆ گاودیۆ ناوزەند کردووە، هەر ئەمەش وای کرد

گەشبینییەکی زۆر ڕووم تێ بکات. زۆر دواتر زانیمان کە گریمانەیەك هەیە بەوەی کۆلۆمبییەکان متمانەی خۆیان لەدەستداوە، دەترسن لەوەی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی بەدرێژایی ئەو سنوورەیان لەگەڵ ڤەنزویلا ڕووبدات و شەڕەکە بێتە ناوەوەی وڵاتیان، هاوکات دوای چەندان ساڵ لە شەڕکردن لە دژی یاخیبووان و ئەوانەی بازرگانی بە ماددە قەدەغەراوەکان دەکەن لەنێوخۆی کۆلۆمبیادا، ئاوا بەئاسانی هێزەکانیان ئامادە نین لە شەڕێکی تەقلیدیدا ڕووبەڕووی هێزە چەکدارەکانی مادۆرۆ بوەستنەوە. هیچ کەسێك تا ڕۆژی شەممە درکی بەمە نەکرد؟ گاودیۆ تا نیوەڕۆ لە ناوچەی بۆگاتا بوو، ئامادەکاری بۆ ئەو کۆبوونەوەیە دەکرد کە لە ڕۆژی دووشەممە لەگەڵ گرووپی لیما هەیبوو. من هێشتا حەزم بەو بیرۆکەیەی گاودیۆ نەبوو کە دەیویست ڕاستەوخۆ لە سنوور تێپەڕ بێ و بگەڕێتەوە. پێم باشبوو چەند ڕۆژێك بە تەنیا لە کۆلۆمبیا بمێنێتەوە، ئەمەش وا دەکات مادۆرۆ پڕوپاگەندەی ئەوە بکات کە گاودیۆ داوای یارمەتی لە وڵاتێك دەکات کە دوژمنی تەقلیدی ڤەنزویلایە.

قسەم لەگەڵ مایك پێنس کرد، کە ئەویش بەرەو بۆگۆتا دەچوو تا وەك نوێنەری ئەمریکا لەنێو گرووپی لیما بەشداری بکات و سووریش بوو لەوەی قەناعەت بە گاودیۆ بهێنین بگەڕێتەوە کاراکاس. کلیلی سەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆن یەکڕیزی بوو، چونکە لە ڕابردوودا هەر پارچە پارچە بوون. هەر ڕۆژێك کە گاودیۆ لە دەرەوەی وڵات بوو ترسی ئەوەی لای مادۆرۆ دروستکردبوو تا هەوڵ بدات دیسانەوە لەیەکتریان جیابکاتەوە. مایك پێنس ڕازیبوو لەسەر ئەمە و گوتی لە کۆبوونەوەی سێ قۆڵیی هەرسێکمان واتە من و دۆکوی (سەرۆکی کۆلۆمبیا) چاومان بە گاودیۆ دەکەوێت. من هەروەها داوام لە پێنس کرد کە سووربن لەوەی ئابلووقەی زیاتر بخەنەسەر ڕژێمەکەی مادۆرۆ، تا نیشانی بدەن لەوەی دەبێ باجی ئەو سنوورداخستنە بدات کە نەیهێشت کۆمەکە مرۆییەکان بگاتە جێگەی

مەبەست. ترەمپیش لە گوتارەکەی مەیامی گوتی کە ژەنەڕاڵەکانی ڤەنزوێلا پێویستە بڕیارێك بدەن، بۆیە (مایك پێنس)یش دەکرێ جەخت لەسەر هەمان خاڵ بکاتەوە.

نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەم لەمبارەیەوە کورتەیەکم بە ترەمپ دا، بەڵام وا دیاربوو زۆر گرنگی پێ نادا کە بەڕاستی ئەمە مایەی سەرسامیش بوو. ترەمپ بە ژمارەی ئەو کەسانەی لە سوپا هەڵگەڕابوونەوە کاریگەربوو کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا ژمارەیان گەیشتە نزیکەی پێنج سەد کەس. گومانم دەکرد ئاوەزی ترەمپ لەلای کۆریای باکوور و ئەو لووتکەیە بێت کە بڕیارە لە داهاتوودا لە هانۆی ئەنجام بدرێ. هەر کە پەیوەندییەکەی کۆتایی هات، ترەمپ گوتی: "باش، پیاو"، ئەمەش ئاماژەیەك لەوەی کە ئەوەی گوێی لێ بووە مایەی دڵخۆشیی بووە. بەوپێیەی من دەچم بۆ هانۆی، من دیسانەوە قسە لەگەڵ پێنس دەکەمەوە، لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ واشنتۆن دوای پێشکەشکردنی گوتارێکی ڕژد لە بۆگۆتا لەبەردەم ئەندامانی لیما گرووپ، پێنس گوتی کە "ڕۆحییەتێکی یەکجار بەرز" لەنێو هۆڵەکەدا هەبوو و ئەمەی هۆکارێکی هاندەری گرنگە. گاودیۆش بەو گوتارەی سەرسام ببوو، بۆیە گوتی: "زۆر زیرەکانە و لێهاتووانە بوو، پێنس گوتارێکی زۆر بەهێزی لەبەردەم گرووپی لیمادا پێشکەش کرد". منیش وەك جۆن بۆڵتن داوام لە پێنس کرد ئەو قسانەی بگەیەنێت بە ترەمپ.

ئەوکاتەی ئێمە لە هانۆی بووین، ڤەنزوێلا لە شاشەی ڕادار و چاودێری ونبوو. بەڵام کاتێ لە ڤێتنام گەڕامەوە لە ١ی ئازاردا، بەوپێیەی ئەوێ هێشتا بەرەی پێشەوە و سەنتەر بوو. گاودیۆ ئێستا گەشتی ئەمریکای لاتینی کردبوو، ئەمە بە لایەنی کەم بە جددی ڕەچاوی ئەوەی بۆ دەکرا لەوەی چۆن گاودیۆ دووبارە بێتەوە نێو ڤەنزوێلا، جا لە ڕێگەی زەمینی بێت، یان ئەوەتا ڕاستەوخۆ بە گەشتی ئاسمانی بەرەو کاراکاس بگەڕێتەوە. من

بەردەوام هەواڵم بە ترەمپ دەدا، ئەویش لە ٣ی ئازار پێی گوتم: "ئەوەی لەوکارەدا پێویستە، ئەوا گاودیۆ لەبەردەستی نییە، هەندێك خۆت لەمە بەدوور بگرە، ئەوەندە سەرقاڵی ئەو بابەتە مەبە"، ئەم قسەیە وەك ئەوەبوو پێم بڵێن: "ئەوەندە دووگیان مەبە." هەرچۆنێك بێت، گاودیۆ ڕۆژی دواتر ئەو دەرفەتەی قۆستەوە و دەستپێشخەری کرد، سەرەڕای مەترسییەکان ئەو بەیانییە بەرەو ڤەنزوێلا گەشتی گەڕانەوەی کرد. ئەم کارەی دەرخەری ئەو ئازایەتییە بوو کە پێشتر نیشانی دابوو و بەمەش زۆر دڵخۆشی کردم. ڤیدیۆکان لەسەر ئینتەرنێت تەواوی ڕۆژەکە باسیان لە گەڕانەوەی سەرنجڕاکێشی گاودیۆ دەکرد بۆ کاراکاس، کە دەیسەلماند ئەمە هەر خۆی وەك سەرکەوتنێك ڕەچاو دەکرێت. یەکێك لە چاودێرانی بواری کۆچبەران بە گاودیۆی گوتبوو: "بەخێربێیەوە بۆ وڵات، جەنابی سەرۆك!" گاودیۆ لە فڕۆکەخانەوە بەرەو شاری خۆی چوو، لە تەواوی ڕێگەکە خەڵکێکی زۆر بەخۆشحاڵییەوە دیدەنیان کرد، هیچ ئاماژەیەکی سوپا یان پۆلیس نەبوو تا هەوڵی دەستگیرکردنی بدەن.

بەو گەڕانەوە سەرکەوتووەی گاودیۆ زۆر خۆشحاڵ بووم، من ئامادەش بووم تا باشترین هەوڵی خۆمان بدەین و فشارەکان لەسەر مادۆرۆ زیاتر بکەین، سەرەتاش بە سەپاندنی ئابلووقەکان بەسەر تەواوی حکوومەت و هەنگاونان لە دژی سێکتەری بانکی ڤەنزوێلا دەستمان پێ کرد، هەموو ئەمانەش دەبوو لە مانگی کانوونی دووەمدا پیادە بکەین، بەڵام پرسیار ئەوەیە دواجار لە ڕاستیدا کام لەمانە دەخەینە بواری جێبەجێکردنەوە. لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی بەڕێوەبەرەکان و گفتوگۆکردن لەبارەی پلانەکانمان، منوشن زۆر لەسەر قسەکانی ڕژد بوو، بەڵام کەسانی دیکەی بەشدار توانیان بەسەری زاڵ بن، تیایدا ڕیك پێری (وەزیری وزەی ئەمریکا) بەڕێزەوە بۆ منوشنی ڕوون کردەوە کەوا چۆن بازارەکانی نەوت و گاز بەشێوەیەکی جیهانی کاری خۆیان کردووە، (کودلۆ) و (ڕۆس)یش

دژی شیکردنەوە ئابوورییەکانی پێری بوون، تەنانەت کریستن نیلسۆن لە دژی ئەوەبوو ئابلووقەی توندتر بسەپێنین. لە زۆربەی کاتەکاندا پۆمپەیۆ بێدەنگ بوو. منیش دووبارە گوتم کە ئێمە لە ڤەنزوێلا دوو بژاردەمان لەبەردەستە: بردنەوە یان دۆڕان. وەك نموونەیەك کە هاوشێوەی ئێستا بوو، باسم لە قەیرانی کەنداوی سوێسی ساڵی ١٩٥٦ کرد، تیایدا گوتم ئێمە ئێستا لە کونی ئەم بۆرییە مادۆرمان هەیە، پێویستە ئەو کونە دابخەین، ئەمەش وای کرد منوشنیش دەست بە قسەکردن بکات. منوشن نیگەرانی ئەو هەنگاوانە بوو کە دەمانویست بیخەینەسەر سێکتەری بانکی ڤەنزوێلا و پێی وابوو کاریگەری خراپ لەسەر ڤیزا و ماستەرکارد دروست دەکات و دەیویست ئەو دووانە هەتا "ڕۆژی قیامەت" کاریگەرییان بمێنێ. منیش گوتم هەروەك پێری و کودلۆش هەمان قسەیان هەبوو، بەوەی ئەو کاریگەرییە هەتا "ڕۆژی قیامەت" نامێنێ مەگەر تەنیا بەشێوەیەکی دراماتیکی فشارەکانمان زیاتر بکەین، هەرچی زوو ئەمە بکرێ، ئەوا باشترە. ئەمەیان کردەیەکی ئەکادیمی نەبوو. منوشن پێی وابوو بەو کارەمان زیان بە خەڵکی ڤەنزوێلا دەگەیەنین، منیش گوتم مادۆرۆ هەر لەو چالاکییەی لایەنی ئۆپۆزسیۆن زیاتر لە چل کەسی کوشتووە، سەدان هەزاریش بە چوونە سەر شەقامەکان و ئەنجامدانی خۆپیشاندان هەموو جارێك ژیانی خۆیان خستووەتە مەترسییەوە. ئایا ئەوانە بیریان لە ڤیزا و ماستەرکارد نەدەکردەوە! هەژارترینی خەڵك خاوەن ڤیزا یان ماستەرکارد نەبوون، هەر پێشتر ئەمانە بەهۆی ئابووریی وێرانبووی ڤەنزوێلا ژیانێکی پڕ لە ناڕەحەتیان هەبوو. لە ڕاستیدا، شۆڕشێك وا خەریکە بەرێوەیە، کەچی منوشن خەمی (کریتد کارد)ی بوو!

لە کۆتایی ڕۆژی ٧ی ئازاردا، گوێبیست بووین کە پچڕانێکی گەورەی کارەبایی لە ڤەنزوێلا ڕوویداوە، ئەمەش بەهۆی تۆڕی کارەبای وڵاتەکەوە بوو. یەکەم بیرکردنەوەم ئەوەبوو کە گاودیۆ یان کەسێکی دیکە بڕیاری

داوە کە کاروبارەکان بخاتە ژێردەستی خۆیەوە. بەڵام هۆکارەکە، یان ماوەکە یان مەودای ئەو پچڕانە هەرچییەك بێت ئەوا هۆکاری نارەحەتبوونی مادۆرۆ بوو، هاوکات ئەمە وەك سیمبولێك بوو بۆ تەواوی ئەو کارەساتەی کە چەندین ساڵە ئەو ڕژێمە بەسەر ئەو خەڵکەیدا هێناوە. دەستکەوتنی هەواڵ لەسەر ئەم پچڕانەی کارەبا بەهێواشی دەگەیشت، چونکە نزیکەی تەواوی پەیوەندیی تەلەفۆنی ڤەنزویلا پچڕابوو. لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر ڕۆژێك تێدەگەیشتین کە ئەمە دەیسەلمێنێ ئەو وڵاتە بەرەو وێرانبوون چووە. نزیکەی لە تەواوی وڵات ڕێگری دانرابوو، فڕۆکەخانەی کاراکاس داخرابوو، دەزگای ئاسایشیش وا دیاربوو ونبوونە، چەند هەواڵێك هەبوو کە هەندێ تاڵانکاری کراوە، گرووپی خۆپیشاندەری (کاسەرۆلازۆ) دیسانەوە ڕژابوونە شەقامەکانەوە و نارەزایەتییەکی زۆریان لە دژی ڕژێم نیشان دابوو. ئەو تێکچوونەی کارەبا تا چ ئاستێك خراپ بوو؟ دوای چەند مانگێك زانیمان، شاندێکی سەردانیکاری بیانی ڕاپانگەیاندبوو کە ژێرخانی کارەبای وڵات شیاوی ئەوە نییە "تەنانەت چاکیش بکرێتەوە". ڕژێمی ڤەنزویلا هەوڵی دا لۆمەی ئەمریکا بکات، بەڵام خەڵك بەشێوەیەکی گشتی لەمە تێگەیشتبوون، هاوشێوەی وێرانکردنی پیشەسازیی نەوتی وڵاتەکە تۆڕی کارەبای نیشتیمانیش لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا بەهۆی فەرمانڕەوایەتی چاڤێز وێرانتر بووە، چونکە حکوومەت شکستی لەوە هێناوە بەردەوام و وەکو پێویست چاککاری لە تۆڕەکاندا بکات و وەبەرهێنانی دارایی نوێ بهێنێتە ئاراوە. ئەو پارەیەش بۆ کوێ چووە کە هەریەك لە کۆمپانیای نەوتی سەر بە حکوومەت و تۆڕی کارەبای نیشتیمانی پێویستیان پێ بوو؟ بەڵکو هەموو چووە دەستی ئەو ڕژێمە گەندەڵە. ئەگەر ئەمە بابەتێکە و هۆکارێك نەبێ بۆ ئەنجامدانی چەندان خۆپیشاندانی گشتی، ئەوا زەحمەتە بزانین ئاخۆ چ بابەتێکی دیکەی شیاوی ئەوەیە. ئێمە بەردەوامبووین لەوەی فشارەکان زیاد بکەین، هەر لەوکاتەدا

وەزارەتی داد دوو کەسایەتی تۆمەتبارکرد بەوەی مامەڵەیان بە ماددەی قەدەغەکراو کردبوو (هەردووکیان پێشتر بەرپرسیاری حکوومی بوونە)، هاوکات زۆرینەی ئەندامانی بانکی پێشکەوتووی نێودەوڵەتی ئەمریکی پشتگیریان لە لەکارلادانی نوێنەرەکانی مادۆرۆ دەکرد.

هەوڵەکانی ڕژێم بۆ چاکردنەوەی تۆڕی کارەبایی وەستا، بەوپێیەی وێستگە لاوەکییەکانی دیکەش بەهۆی ڕێگە کارەباییە تازەبنیاتنراوەکان ئەوانیش تەقینەوە، ئەمە کاردانەوەیەکی گشتی لێ کەوتەوە، هاوکات دەریخست کە حکوومەت پلانی درێژخایەنی چاککردنەوە (صیانة) نییە و کەلوپەلەکانیش کۆنن. نەمانی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان ئەمیش وای کرد هەماهەنگی و چالاکی بەرپا بکرێت، بەتایبەتی لە شارە سەرەکییەکان و شاری (ماراکایبۆ) بەدیاریکراوی. گاودیۆ لە هەڵمەتەکانی بەردەوامبوو، هێشتا ئاپۆرای گەورەی خەڵکی لەگەڵ بوو، خەڵکی دڵنیا دەکردەوە کە ئۆپۆزسیۆن بۆ داهاتوو فشاری زیاتر دەکات. پەرلەمانی وڵات بەهۆی نەمانی کارەباوە "باری ئاگەدارکردنەوە"ی ڕاگەیاند، ئەوانە دەسەڵاتی هەموو شتێکیان نەبوو، بەڵام بە لایەنی کەم نیشانی خەڵکیان دا کە ئێمەش وەك پەرلەمان بیر لە چی دەکەینەوە و پێچەوانەی ئەوەین کە ڕژێم دەیەوێ. لەوکاتەدا کە نزیکەی مادۆرۆ نیمچەون بوو، هەموو ئەمانە دەرخەری ئەوەبوون کە ڕژێم لە سەرلێشێواویەکی بەردەوامدایە. پەیوەندییەکان لەگەڵ بەرپرسانی ڕژێم بەردەوامی هەبوو، هەروەك لەوکاتەدا گاودیۆ چاوەڕێی ئەوەبوو سەرکردایەتی درزێکی تێ بکەوێت، تا ئەویش کۆتایی بە دەسەڵاتی مادۆرۆ بهێنێت.

بەداخەوە، شپرزەیی بە حکوومەتی ئەمریکیشەوە دیاربوو، بەتایبەتی لەنێو وەزارەتی دەرەوەدا. ئەمە هاوشان بوو لەگەڵ دوودڵی و جووڵە ئەنقەستەکانی وەزارەتی گەنجینەی ئەمریکی، هەر هەنگاوێك دەمانگرتەبەر بۆ فشار خستنەسەری زیاتری ڕژێمەکەی مادۆرۆ بەهۆی هەوڵی ئیدارییەوە،

کاتێکی زۆر زیاتری دەویست، زیاتر لەو کاتەی هەر کەسێك بتوانێ وەك بەهانەیەك قبووڵی بکات. هەر بڕیارێکی ئێمە کە لەبارەی ئابلووقەی نوێ دەماندا وەزارەتی گەنجینە وەك بلێی ئێمە خەریکی کەیسی تاوانکاری لەنێو دادگادا بین، بەو جۆرە سەیریان دەکرد، بەڵگەی تاوانبارکردنیشیان هەبوو، بەڵام بەبێ ئەوەی گومانێکی لۆژیکییان هەبێ. ئابلووقەکانمان نابێ بەو شێوەیە بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە، ئەمانە خەریکە دەسەڵاتی فراوانی ئابووری ئەمریکا بەکاردێنن بۆ بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندیە نیشتمانییەکانمان. ئەو ئابلووقانە گەر بەشێوەیەکی فراوان، نەرم و یەکلاییکەرەوە بەکاربێن و هەرچی دەسەڵاتی پاڵپشتی بەردەستە لەپشتیان بێت، ئەوا کاریگەری یەکجار زۆریان دەبێت. ئەمە وەسفی ئەوە ناکات کە ئێمە چۆن مامەڵەمان لەگەڵ ئابلووقەکانی ڤەنزوێلا کردووە (یان زۆربەی ئابلووقەکانی دیکە لە ئیدارەی ترەمپدا). لەجیاتی ئەمە، تەنانەت بڕیارە پاڵپشتییە لاوەکییەکانیش پێویستیان بە هەوڵی زۆر ڕاستەقینە و کاری زەحمەتی ستافی (ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی) و پشتگیریکارانی نێو ئاژانسەکانی دیکەش هەیە، لەکاتێکدا هەموو ئەوانی دیکە خەریکە سنوورێکی پارێزبەندی بۆ مادۆرۆ دابین دەکەن. ڕژێمی مادۆرۆ بێگومان هەروا بە سستی دانەنیشتبوو، بەڵکو بەردەوام هەوڵیان دەدا ئەو پێوەرانە بگرنەبەر تا خۆیان لە ئابلووقەکان بەدووربگرن و ئەو دەرئەنجامە خراپانەش کەمتر بکەنەوە کە نەیاندەتوانی لێی ڕابکەن. سستی ئێمە و نەبوونی گورجوگۆڵی وەك بەخششێکی خودا بۆ مادۆرۆ و ڕژێمەکەی. هەروەها بۆ پشتگیرکارانی لەنێو کووبا و ڕووسیادا. بارزگانە بێویژدانە جیهانییەکان و پسپۆڕانی ئابووری سوودیان لە هەموو بۆشاییەکی هەڵمەتی فشارەکانی ئێمە وەرگرت. سەیرکردنی ئەم ڕووداوانە بەڕاستی مایەی ئازار و ناڕەحەتی بوو.

پێدەچوو خراپترین بڕیار ئەوەبووبێ کە لە ١١ی ئازاردا درا، کاتێ پۆمپەیۆ بڕیاری دا باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە کاراکاس دابخات و هەرچی کەسی

ئەمریکییە لەوێدا بیانگوازێتەوە. بێگومان مەترسی هەبوو لەسەر ئەو ستافەی بەجێ مابوون، چەتەیی و بەرەڵلایی دەستەی کۆلیکتیڤۆس شتێکی بوو نکۆڵی لێ نەدەکرا. پۆمپەیۆ بەشێکی زۆری ئابڕووی سیاسیی خۆی لەو ڕێگەیەوە دروست کرد، کە ڕەخنەی لە سەردەمی ئۆباما گرت و پێی وابوو لە کاتی قەیرانی بەنغازی[1] لە ئەیلوولی ٢٠١٢دا هەڵەیەکی گەورەیان کرد. هەروەك پێشتریش کاتێ هەڵسا بە کەمکردنەوەی ستافی باڵیۆزخانەی بەغدا و داخستنی کونسوولخانەی بەسرە، پۆمپەیۆ سووربوو لەسەر ئەوەی خۆی دووربگرێت و لە سەردەمی ئەو جارێکی دیکە ئەوەی لە "بەنغازی" ڕوویدا دووبارە نەبێتەوە. ترەمپیش تەنانەت زۆر هەستیار بوو. هەر کە پۆمپەیۆ ئاماژەی بە هەبوونی توزێ مەترسی کرد، ترەمپیش ئیدی لەسەر پۆمپەیۆ بڕیاری دا بەوەی پێویستە ڕاستەوخۆ کەسایەتییە ئەمریکییەکان بکشێندرێنەوە، پۆمپەیۆش بەوپەڕی خێرایی و پەرۆشییەوە ئەو کارەی کرد.

ڕووداوەکان هەر لە سەرەتاوە ڕوون و ئاشکرابوون، بەڵام داخستنی باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە کاراکاس بێگومان زیانی بەو هەوڵانەمان دەدا کە لە دژی مادۆرۆ بەرپامان کردبوو. زۆرینەی باڵیۆزخانەکانی وڵاتانی ئەورووپی و ئەمریکای لاتینی هەر بەکراوەیی مانەوە بەبێ ئەوەی هیچ ڕووداوێکیان بەسەر بێت، بەڵام ئامادەگی ئێمە لەنێوخۆی ڤەنزوێلادا بێگومان کەمتر و بچووکتر بوویەوە. هەروەها بەهۆی هەڵوێستی نەرمی ئۆباما بەرامبەر ڕژێمە ستەمکارەکان و زیادبوونی هەڕەشەکانی ڕووسیا و چین لەو بەشەی جیهاندا، ئەمە وای کرد توانای گوێبیستن و بینینمان کەمتر بێتەوە. تەنانەت لەوەش خراپتر، وەزارەتی دەرەوە تەنانەت دوای

---

(١) قەیرانی بەنگازی: ئەمەیان هێرشێك بوو کرایە سەر دامەزراوە ئەمریکییەکان لە شاری بەنگازیی لیبیا، کە لەلایەن هێزە میلیشیاکانی ئەنسار ئەلشەریعەوە لە ساڵی ٢٠١٢ ئەنجام درا.

ئەمەش بە خراپی ئیدارەی دەرئەنجامەکانی دا، (جیمی ستۆری) وەك بەرپرسیار لە کاروبارەکانی ڤەنزوێلا- یان بەلایەنی کەم هەندێ کەسی لە تیمەکەیان ڕەوانە نەکرد تا بگەڕێنەوە کۆلۆمبیا، بەوپێیەی لەوێدا دەیانتوانی بەشێوەیەکی نزیك لە باڵیۆزخانەی بۆگۆتا کار بکەن و بەردەوامی بە کارەکانی ئەو سنوورە بدەن. لەجیاتی ئەمە، نووسینگەی هەمسفیەری ڕۆژئاوا ئەو تیمەی لە واشنتۆن هێشتەوە تا زۆر نزیکتر لەژێر چاودێری خۆیدا بیانهێڵێتەوە. ئەمە هیچ سوودێکی نەبوو بۆ ئەو هەوڵانەی کە دەمانویست لەو ڕێگەیەوە مادۆرۆ لە دەسەڵات بهێنینە خوارەوە.

بەشێوەیەکی زۆر ئەرێنی، گفتوگۆکانی ئۆپۆزسیۆن لەگەڵ کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕژێم ئاماژەی بەو درزانە دەدا کە ئێمە پێشبینیمان کردبوو و خەریکە سەرهەڵدەدەن. ئەو هەموو ساڵە لە پەرێشانی و بێمتمانەیی ئەوەندە ئاسان نییە، بەڵام ئێمە هەوڵمان دا تا نیشانی ئەو کەسانە بدەین کە لە دژی حکوومەت بوون -جا چ ئەوانەی لە ڕیزی ئۆپۆزسیۆن بوون چ ئەوانەی لە واشنتۆن بوون- لەوەی کە ئێمە جددین لە بابەتی لێبووردەیی و خۆدوورگرتن لە سزادانی ئەو کەسانەی لە ڕابردوودا تاوانکاری و کردەی خراپیان کردووە. ئەمەیان سیاسەتی ڕاستەقینە بوو. زۆرێك لە کەسایەتییە باڵاکانی نێو ڕژێم گەندەڵ بوون، سوودیان لە بازرگانیکردن بە ماددە قەغەکراوەکان وەردەگرت، هەروەها لە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤیش خاوەن تۆمار و چەندان نموونە لەسەریان هەبوو. بەڵام من هەستێکی بەهێزم هەبوو لەوەی هەندێ بنەما هەیە پشتگوێیان بخەین لەپێناو لەناوبردنی ڕژێم و سەربەستی بۆ خەڵکی ڤەنزوێلا دابین بکەین لەجیاتی ئەوەی هەڵوەستە لەسەر ئەو "پرەنیسیپانە" بکەین کە بووەتەهۆی چەوساندنەوەیان، هەرچی کووبا و ڕووسیاشە، ئەوا لەنێوخۆدا باڵادەست بوون. هەر بۆیە خەریکی یارییەکی سایکۆلۆژی و فریودەر بووین لە دژی ڕژێم، هاوکات تویتێکم کرد و هیوام خواست مادۆرۆ ببێتە خاوەن

خانەنشینییەکی درێژ و بێدەنگ لە کەناری شوێنێکی جیهاندا (نموونەش وەك کووبا). من حەزم لەم یارییە نەبوو، بەڵام ئەمە کارێکی زۆر پەسەندبوو لە بەرامبەر ئەو ڕۆژانەی مادۆرۆ لەسەر دەسەڵات مایبوو. بۆ هەڵسەنگاندنی ئۆپۆزسیۆنیش، بەهۆی چاودێری چڕەوە دووچاری کێشە ببووینەوە، هەریەك لە کووباییەکان و بەرپرسە سەرکردەکانی ڕژێم هەڕەشەیان دەکرد، هەروەها دروستکردنی پەیوەندی شیاو لەگەڵ ئەو کەسانەی چاوەڕوانییان لێ دەکرا کودەتایەك ڕێك بخەن، ئەویش هەر کارێکی زەحمەت بوو.

یەك لە پلانەکان ئێمە بیرمان لێ کردبووەوە بریتبوو لە ناردنی ئاماژە بۆ سەرکردە سەرەکییەکانی ڕژێم و پێیان ڕابگەیەنین، کە دەمانەوێ خێزان و ئەندامانی بنەماڵەکانیان لەنێو لیستی ئەو ئابلووقانە دەربێنین، ئەمەیان سیاسەتێکی باوی ئەمریکایە تا ئاماژە بۆ هەندێ کەس و قەوارەی دیاریکراو بنێرین بەو مەبەستەی کاریگەرییان لەسەر دروست بکەین. ئەم جۆرە کردانە کاردانەوەیەکی کەمی لەنێو خەڵکی عەوامدا دەبێ، بەڵام پەیامێکی بەهێز دەبێ بۆ بەرپرسانی ڕژێم کە ئێمە ئامادەکاریمان کردووە تا ڕێگەکەیان لەبەردەم ئاسان بکەین، جا چ لە دەرەوەی ڤەنزوێلا بێ، یان وابکەین وەك کەسانێکی پیلانگێڕ نەوەك وەك بەندکراو بچنە باوەشی ئۆپۆزسیۆن. هەر بەو شێوەیەش، ئەگەر ئەو خەڵکانە یارمەتیدەر بن بۆ لەکارلادانی مادۆرۆ، ئەوا هەر خۆیان دەبنە هۆکاری دەرهێنانیان لە لیستی ئەو کەسانەی ئابلووقەیان دەخرێتەسەر. لە ناوەڕاستی مانگی ئازاردا، کێشەیەك هاتەپێش کاتێ وەزارەتی گەنجینە بەئاشکرایی ڕەتیان کردەوە ناوی هەندێ کەسی دیاریکراو لەو لیستە بهێننەدەرەوە، سەرەڕای پشتگیرکردنی هەندێ کەسی دیکە کە لەگەڵ ڕژێم جیاببوونەوە. پۆمپەیۆ پەیوەندی بە منوشن کرد کە دیسانەوە ناوبراو لە لۆس ئەنجلس بوو، پێشی گوت کە بە دەوری کارگێریی وەزارەتەکەی هەڵسێ و واز بێنە لەوەی

ئەوەندە لەبری وەزارەتەکەی پێشبینی بکات. لەگەڵ ئەمانەش، وەزارەتی گەنجینە سووربوونی خۆیان نیشاندا، پرسیاریان دەربارەی گفتوگۆی نێوان ئۆپۆزسیۆن و کەسایەتییە دیارەکانی ڕژێمەکەی مادۆرۆ دەکرد. پرسیاری ئەوەش کرا ئەگەر وەزارەتی دەرەوە ناوی هەندێ کەس لەو لیستە دەربێنێ، ئەوا دەتوانێ ئەو دەرئەنجامە بەدەستبێنێ کە هیوای بۆ دەخوازێ. ئەمەیان کارێك بوو هیچ لێبوردەییەکی قبووڵ نەدەکرد. پێشنیارکرا بەوەی پێویستە تەواوی ئۆپەراسیۆنەکان لەدەستی وەزارەتی گەنجینە دەربێنین و بیخەنە سەر لایەنێکی دیکە. دواجار، منوشن گوتی من ڕێنموویی وەزارەتی دەرەوە قبووڵ دەکەم ئەگەر من وەك (جۆن بۆڵتن) تێبینییەکی بۆ بنێرم بڵێم منیش ئەمەم قبووڵە. ئەمەیان هیچ نەبوو جگە لە هەڵسوکەوتێك تا خۆی لە ڕەخنەگرتن بەدوور بگرێت، بەڵام من دڵخۆش بووم بەوەی (یادنامەیەکی کورت) بۆ پۆمپەیۆ، منوشن و (بار) بنێرم تا ڕوانینی خۆمیان بۆ ڕوون بکەمەوە و بڵێم وەزارەتی گەنجینە لایەنێك نییە لەنێو سیاسەتی دەرەکیدا. دوای ئەمە خۆشحاڵبووم کە ئیلیۆن ئەبرامز، وەك هاوڕێیەکی دێرین کە بەم دواییانە هاتبووەنێو وەزارەتی دەرەوە و وەك "نێردەی تایبەت" کاری دەکرد، ئیمەیلێکی بۆ ناردبووم و نووسیبووی: "نامەکەت کلاسیکییە، پێویستە ئەو نامەیە لە قوتابخانەکانی حکوومەت بخوێندرێت. بەداخەوە، کات و هەوڵەکان لێرەدا بەفیڕۆ دەدران، ئەگەرنا دەمانتوانی لەپێناو بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندنییەکانی ئەمریکا تەرخانی بکەین.

ئێمە لە هەمان کاتدا هەوڵمان دەدا (هاڤانا)ش بگوشین. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە دژی ئەو دەرئەنجامە نالۆژیکییەی ئۆباما وەستایەوە کە پێیان وابوو تیپی بەیسبۆڵی کووبا تا ڕادەیەك سەربەخۆیە و سەر بە حکوومەتی وڵات نییە، بەمەش ڕێگە بە وەزارەتی گەنجینە دەدات مۆڵەتەکەیان هەڵبوەشێنێتەوە و ڕێگەش بە بەرپرسانی خولی بەیسبۆڵی ئەمریکی دەدات تا ڕێککەوتنێك لەگەڵ یاریزانە کووباییەکان بکات. ئەو کردەیە ئێمەی

لای خاوەنەکانیان خۆشەویست نەدەکرد، بەڵام بەداخەوە ئەو یاریزانانە هەڵەن ئەگەر تێنەگەن لەوەی بەشداریکردنیان لەو پاڵەوانێتییە پرۆفیشناڵەی بەیسبۆڵ مانای وایە لەگەڵ دوژمنەکانیان دەخەون. تەنانەت لەوەش باشتر، تەنازوله هەمیشەییەکانی سەرۆکایەتی بۆ هەندێ لە کەلوپەلەکان کە لەنێو یاسای (هێلمس-بێرتۆن)دا هاتووە، ئەویش کۆتایی دێت. ئەم یاسایە ڕێگە دەدات بەوانەی کە خاوەن موڵك و سامان، هاوکات ئەو موڵکانەی لەلایەن حکوومەتەکەی ڤیدیل کاسترۆوە دەستی بەسەرداگیراوە و فرۆشراوەتە کەسانی دیکەوە، ئەوا دەتوانن لە دادگاکانی ئەمریکا سکاڵا تۆمار بکەن، جا یان ئەوەتا دەبێ موڵك و سامانەکەیان بۆ بگەڕێندرێتەوە یان ئەوەتا دەبێ خاوەنە تازەکان قەرەبوویان بکەنەوە، بەڵام ئەم کەلوپەلانە هەرگیز بڵاوەیان پێ نەکرا. ئێستا لەوانەیە ئەو کارە بکرێ. ترەمپ سووربوو لەسەر هەڕەشە گشتییەکانی و دەیویست "ئابلووقەی کامڵ و زۆر" بخاتەسەر کووبا بەهۆی ئەو ئاڵوگۆڕییە نەوتییەی لەنێوان هەردوولا (کووبا- ڤەنزوێلا) هەبوو، ترەمپ بەردەوام داوای لە وەزارەتی بەرگری دەکرد بژاردەی کونکریتییان هەبێ بۆ وەستاندنی ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕانە، تەنانەت دەیویست "قەدەغەکردن"یش پیادە بکرێ.

تا چەند کووبا کاریگەریی خراپی لەسەر ڤەنزوێلا هەبوو؟ تەنانەت ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز لەو کێشەیە تێگەیشتبوو، بۆیە لە ١٧ی ئازار هەواڵێکی بڵاوکردبووەوە و تیایدا نووسیبووی: "کۆمەکیی تەندروستی" کووبا بەکارهاتبوو بۆ پشتیگیرکردنی زیاتری مادۆرۆ لەنێو خەڵکی هەژاری ڤەنزوێلا و ڕێگریکردن لەوانەی ئامادەنەبوون فەرمانەکانی مادۆرۆ جێبەجێ بکەن. ئەو هەواڵە باسی لە ئامادەگی نهێنی کووباییەکان کردبوو لەنێو ڕژێمەکەی مادۆرۆدا و تا چ ئاستێکیش ڕەوشەکە لە ڤەنزوێلا خراپ بووە. لەگەڵ ئەمانەش، ژەنەڕاڵێکی باڵای ڤەنزوێلا کە بەرەو کۆلۆمبیا چووبوو، لە هەفتەی دواتر باسی لە قەبارەی ئەو گەندەڵییە کردبوو کە لەنێو

پرۆگرامی پزیشکیی وڵاتدا هەیە، چەندان بەڵگەی دیکەشی لەسەر گەندەڵیی ڕژێمی ڤەنزویلی نیشاندابوو. ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵیش کەمێك دواتر بابەتێکی بڵاوکردبووەوە، تیایدا بەوردەکارییەوە باسی لە مادۆرۆ کردبوو کەوا چۆن پشتگیری خەڵکی هەژاری لەدەست داوە، ئەمەیان شتێك بوو کە ئێمە لەوەتەی بەرپابوونی یاخیبوونەکەی مانگی کانوونی دووەمەوە بڕوامان پێی هەبوو. من باسم لەوە کرد کە پێویستە پێوەری زیاتر دانێین بەمەبەستی دروستکردنی بەربەست لەنێوان سوپای ڤەنزویلی و کووبابیەکان ئەو دەستە چەتەیيەی هەیانە بەناوی (کۆلێکتیڤۆس). سوپا پرۆفیشناڵەکە ڕقیان لەو کۆلێکتیڤۆسانە دەبووەوە، هەرچییەکیش بۆمان بکرابا پیادەمان دەکرد تا گرژیی لەنێوانیان دروست بکەین، هەر ئەمەش دەبێتەهۆی ئەوەی ئامادەگی کووبابیەکان بە ناشەرعی لەقەڵەم بدرێت و خودی ئەمە کارەش شتێکی ئەرێنییە.

وا دیاربوو مانەوە بەم شێوەیە بە هیچ شێوەیەك کێشەیەك نییە بەلای ترەمپەوە، بۆیە لە ١٩ی ئازار و لە کاتی کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ سەرۆك تازەی بەرازیل "جەیەر بۆلزۆنارۆ" گوتی: "لە ڕاستیدا تا ئێستا ئابلووقەی توندمان نەخستووەتە سەر ڤەنزویلا". بێگومان، ئەم لێدوانەی پرسیارێك دروست دەکات ئەویش ئەوەیە "بۆچی نا؟" بەڕاستی ئێمە چاوەڕێی چین؟ ستۆری، کلاڤەر کارۆن و کەسایەتییەکانی دیکەش بەردەوام گوێیان لە ڤەنزویلا دەبوو لەوەی گفتوگۆکان لەنێوان ئۆپۆزسیۆن و لایەنە هاوپەیمانەکان هەر بەردەوامی هەیە و بڕیار دراوە زیاتریش بێ. هەموو ئەمانە وا دیارە هەنگاوی هێواشن، بەڵام دواجار بە ئاراستەیەکی ڕاست دەڕۆن. لە ڕاستیدا، بەڵگەی دوولەتبوون لەنێو ڕژێمدا وای کرد دوو لە یاریدەدەرەکانی گاودیۆ دەستگیر بکرێن، بەتایبەتی سەرۆك دیوانەکەی بەناوی (ڕۆبەرتۆ ماریرۆ). مایك پێنس بەتوندی لەسەر ئەمە وەستابوو، هەوڵی دەدا قەناعەت بە ترەمپ بهێنێت تا بەسەر بەربەستەکانی

وەزارەتی گەنجینە زاڵ بێت و ئابلووقە بخەینەسەر دامەزراوەی ئابووری حکوومەتی ڤەنزوێلا و چوار لە لقەکانی دیکەشی. پێنس دواتر بە منی گوت کە ترەمپ داوای لە منوشن کردووە تا ڕێنماییەکانی خۆی پێ بدات، "لەوانەیە ئێستا کاتی ئەوە هاتبێ بەڕاستی مادۆرۆ لە کارەکەی دووور بخەینەوە". وەزارەتی گەنجینەش ڕازیبوو لەوەی تەواوی سێکتەری ئابووری ڤەنزوێلا دیار بکرێ تا ئابلووقەی بخرێتەسەر، ئەمەیان بابەتێك بوو کە ماوەیەکی زۆربوو بەرژدییەوە بەرهەڵستییان دەکرد. دڵخۆش دەبم گەر ئەم کارە دەرئەنجامێکی باشی هەبێ، بەڵام ئەگەر بەهۆی گفتوگۆی ناوخۆییەوە (کات) بەفیڕۆ بچێ، ئەوا وەك ئەوەیە پشتگیریمان لە مادۆرۆ کردبێ. لەو نێوەندەدا و لە کۆتایی مانگی ئازاردا، ڕووسیا هێزی تازە و کەلوپەلی نارد، وا نیشانی دا کە یەکێك لەو بارهەڵگرانە کۆمەکی مرۆیین، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەوڵی دەدا نارِوونی بخاتە نێو ئەو وجودەی لەوێدا هەیانە، جا لە ڕووی سەربازییەوە بێ یان لە ڕووی کۆمەکی مرۆییەوە بێت. ئاماژە هەبوو کە چەندان بارهەڵگری دیکەش لەو چەند مانگەی دواتردا لەلایەن ڕووسیاوە ڕەوانەی ڤەنزوێلا کراون. بەهەرحاڵ، لە هەمان کاتدا، وەزیری بەرگریی بەڕازیل فرناندۆ ئەزڤیدۆ پێی گوتم کە کۆتایی مادۆرۆ بە ڕوون و ئاشکرایی دیارە. منیش لە نووسینگەکەی خۆم چاوم بە سەرۆکی هیندۆراس "خوان هێرناندێز" کەوت، ئەویش بە هەمان شێوە گەشبین بوو، پێچەوانەی ئەو ڕەوشەی لە نیکاراگوا لەسەر سنووری وڵاتەکەی هەبوو.

لە ٢٧ی ئازاردا، ژنەکەی گاودیۆ، فابینا ڕۆزالێس گەیشتە کۆشکی سپی بۆ ئەوەی لە ژووری ڕووزڤێلت لەگەڵ مایك پێنس کۆببنەوە، تیایدا هیواداربووین ترەمپیش گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ سەرێك بدات. ناوبراو خێزان و خوشکی ماریرۆی لەگەڵدابوو، دواتر دوای گرتنی وێنە و لێداون بۆ میدیاکاران لەلایەن ڕۆزالێس و پێنس، ئیدی بەرەو نووسینگەی

سەرۆك چووین. ترەمپ بەگەرمی بەخێرهاتنی ڕۆزالێس و ئەوانی دیکەی کرد، دواتریش دەزگا ڕاگەیاندنەکان هاتنە ژوورەوە، وەك بلێی بۆ ماوەی بیست خولەك ئەمە درێژەی کێشا و هاوشێوەی پەخشێکی ڕاستەوخۆی لێ هاتبوو. ڕۆزالێس سوپاسی ترەمپ و پێنس و منی کرد بۆ ئەو پشتگیرییەی لێمان کردوون و گوتیشی: "بەرێز بۆلتن گەر ئەو کارانە بژمێرین کە تۆ ئەنجامت داون، جێی شانازین، ئێمەش باین هەر ئەوەمان دەکرد". ترەمپ کارێکی باشی کرد لەگەڵ میدیاکاراندا، کاتێ دەربارەی دەستوەردانی ڕووسیا لە ڤەنزویلا پرسیاریان لێ کرد، ئەویش گوتی: "ڕووسیا پێویستە لەوێ بچێتە دەرەوە"، ئەمەشیان کاردانەوەیەکی بەهێزی دروستکرد و ئەمە هەمان ئەو قسەیە بوو کە هیواخواز بووم ترەمپ بیکات.

تەنانەت گفتوگۆی گرنگتر دوای ڕۆیشتنی ڕۆژنامەنووسان کرا، هەروەك لەوکاتەدا گوێمان لە ڕۆزالێس گرتبوو کە باسی لە خراپی شتەکان دەکرد لە ڤەنزویلا، ژنەکەی ماریرۆش باسی لە پۆلیسی نهێنیی وڵات کرد کەو چۆن هاتبوونە نێو ماڵەکەیان و مێردەکەیان بە ڕاکێشان بردووە بۆ (هێلیکۆید) —هێلیکۆید ئەو شوێنە ئێستا وەك باڵەخانەی بارەگای گشتیی کاراکاس بەناوبانگە و وەك بەندیخانەش بەکاردێت. هەروەك گفتوگۆکان بەردەوام بوون، ترەمپ دووجار پێی گوتم، دەربارەی ڕووسیا، "پێویستە وەدەریان نێین"، لەگەڵ ڕێزیشم بۆ ڕژێمی کووبا، پێویستە ئەوانیش بوونیان نەمێنێ و کۆتاییان پێ بێت"، من بەخۆشحاڵییەوە هەردوو قسەیم قبووڵ بوو. لە یەك لە حاڵەکاندا، ترەمپ گوتی دەمەوێ "توندترین ئابلووقە بخرێتەسەر ڤەنزویلا"، منیش سەیری منوشنم کرد، کە ئەو بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەیەکی دیکە هاتبوو. هەمووومان، ئەمریکی و ڤەنزوێلییەکان پێکەنین، چونکە هەموو لایەك دەیانزانی منوشن تاکە بەربەستە لەوەی نایەڵێ ئەو قسەیەی ترەمپ جێبەجێ بکرێت. پێنس پرسیاری لە ڕۆزالێس کرد ئێستا ڕەوشی سوپا چۆنە، بەڵام ترەمپ قسەکەی پچڕاند و گوتی:

"ئەمە زۆر هێواشە، بەڵام سوپا لەمەوپێش بەشدارییان هەبووە." ڕۆزالێس وەڵامی داوە و وەسفی ئەوەی کرد کە بە چاوی خۆی توندوتیژترین کردەکانی سوپای دیووە و پەیوەندییەکی زۆر نزیك لەنێوان سوپا و کووبابیەکاندا هەیە. دوای ئەوەی کۆبوونەوەکی ڕۆزالێس کۆتایی هات، ترەمپ بە منوشن و منی گوت: "ئێوە تازە ناتوانن دوودڵ بن"، منیش گوتم: "من و منوشن چاوەڕوان دەبین تا ئەو کاتەی منوشن لەو گەشتەی بۆ وڵاتی چین دەگەڕێتەوە". من دڵنیام منوشن چێژی لەم گەشتەی وەردەگرت، بە هەمان شێوە بۆ منیش جێگەی دڵخۆشی بوو.

شتێکی ئەو کۆبوونەوەیە کە هەرگیز چاوەڕوانی لێ نەدەکرا ئەو قسەیەی ترەمپ بوو کاتێ گوتی ڕۆزالێس ئەڵقەی هاوسەرگیری لەدەست نییە و چەندە گەنجیش دیارە. بەشی دووەمی قسەکەی تەواو بوو (واتە بەڵێ ئەو خانمە گەنج بوو). ترەمپیش بە هەمان شێوە ئەڵقەی هاوسەرگیری لەدەست نەدەکرد. من هەرگیز نەمزانی گرنگیی ئەمە لە کوێدایە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ئەمە بابەتێکی باش نەبوو لەنێو ئاوەزی ترەمپدا. ترەمپ پێی وابوو گاودیۆ کەسێکی (لاوازە) بەرامبەر کەسێکی (بەهێز)ی وەك مادۆرۆ. تا وەزری بەهار، ترەمپ بە گاودیۆی دەگوت: "بێتۆ ئۆرۆرکی ڤەنزوێلا[(١)]" ئەمەیان وەك ستایشێك لە ئەمریکاوە بۆ ڤەنزوێلییەکان. ئەم قسەیە هەرچەندە کێشە دروستکەرە، بەڵام بەشێوەیەکیش قسەیەکی نموونەیی بوو بەوەی ترەمپ زۆر بەبێ ئاگاییەوە خەریکی سووکایەتیکردن بوو بەو کەسانەی لە دەوروبەری بوون، هەر لەوکاتەدا دەستی بە لۆمەکردنی من کرد لە بەرامبەر ئەوەی ئۆپۆزسیۆنی ڤەنزوێلا شکستیان هێنابوو و نەیتوانیبوو مادۆرۆ لەسەر دەسەڵات لابەرن. لەوانەیە ترەمپ لەبیری کردبێ کە ئەوە هەر خۆیەتی بڕیار لەسەر سیاسەتەکان دەدات، تەنانەت هەر

---

(١) بیتۆ ، سیاسەتمەداری ئەمریکی و نوێنەری ویلایەتی تێکساس بوو.

خۆی گوتبووی من تەنیا کەسم کە بڕیارەکان دەردەکەم. تا ئێستاش، لە کاتی کۆبوونەوەکەی لەگەڵ فابیانا ڕۆزالێس ئەم نمایشەی ترەمپ زۆر ڕژدبوو کە بەرامبەر ڤەنزوێلا نیشانی دابوو. بەڵام خراپ لەوەدایە کە هەریەك لە وەزیری گەنجینە و وەزیری دەرەوە لەوێ نەبوون تا ئەم نمایشەی ترەمپ ببینن.

یەك لەو تەکتیکانەی وەزیری بەرگری ڤەنزوێلا پادرینۆ دەیکرد، بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك تویت بوو، تیایدا هەوڵی دەدا ئاگری نیشتیمانپەروەری ڤەنزوێلا لە دژی ڕووسیا و کووبا بەکاربێنێت، منیش پێم گوت گەر دەتەوێ کارێکی ڕاست بکەی، ئەوا پشت بە دەستووری وڵاتەکەت ببەستە. وادیاربوو لەوەدا سەرکەوتوو بووین. لە وەڵامی پرسیاری ڕۆژنامەوانێك، پادرینۆ گوتی: "بەرێز بۆڵتن، من پێت دەڵێم ئێمە کارێکی ڕاست دەکەین. کاری ڕاست ئەوەیە، ئەو شتە ئەنجام بدەین کە لە دەستووردا نووسراوە.. ئەنجامدانی کاری ڕاست ئەوەیە ڕێز لە ویستی میللەت بگری". ئەمە ئەو شتەبوو کە ئێمە بۆ دەستپێکێکی نوێ و زنجیرە تویتێك پێویستمان پێ بوو، بۆیە "ویستی میللەت" ئامرازێك بوو دەکرا بۆ لەکارلادانی مادۆرۆ بەکاربێت و بەدڵنیاییەوە ئەمە قسەیەکی ڕاستیش بوو. بەلایەنی کەم ئێستا دەمانتوانی بڵێین کە ئێمە لەنێو ئاوەزی (پادرینۆ)ین و دەزانین بەتەمای چییە، تەنانەت بەرپرسانی دیکەش. لە ڕاستیدا، دوای کۆبوونەوەکەی لەگەڵ ترەمپ ڕۆزالێس بە ئەبرامزی گوتبوو: "ڕژێم دەیەوێ بزانێ ئاخۆ هەڕەشەکانی سوپای ئەمریکی تا چەندە ڕاستەقینەن، بەڵام ئەوکاتەی جۆن بۆڵتن تویتی دەکا زۆر دەترسن." ئێستا، ئەمەیان هۆکاری هاندەرم بوو!

لە ڤەنزوێلا، ئۆپۆزسیۆن و کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕژێمی مادۆرۆ خەریکی بەرەوپێشبردنی درامایەك بوون لەگەڵ (دادگای باڵای یاسایی وڵات)، ئەم دادگایە هاوشێوەی دادگای باڵای ئەمریکایە، تا بە

ئەنجوومەنی دەستووری نیشتیمانی ڕابگەیەنن کە ئەو (ئەنجوومەنە یاسادانان)ەی مادۆرۆ بە فێڵ هەڵی بژاردووە، ئەنجوومەنێکی ناشەرعییە. ئەگەر دادگای باڵای ڤەنزوێلا لەلایەن دەستوپێوەند و لایەنگرانی مادۆرۆوە پشتگیری بکرێ، هاوکات گەر لەلایەن لە یەکێك لە بەهێزترین پشتگیریکارەکانییەوە سەرکردایەتی بکرێ، هەر لە بنەڕەتیشدا ئەنجوومەنی یاسادانانیش ناشەرعی بێت، ئەوا بەشێوەیەکی دراماتیکی دەبێتەهۆی لاوازبوونی پشتگیریی بنکەفراوانیی مادۆرۆ لە ڤەنزوێلادا. لە هەمان کاتدا، خەڵکی مەدەنی ڤەنزوێلا بەربەستەکانیان شکاندووە کە لەلایەن پاسەوانانی نیشتیمانیی مادۆرۆ لەسەر پردی نێودەوڵەتیی سیمۆن بۆلیڤار نزیك بە کوکوتا و خاڵی پەڕینەوە بۆ کۆلۆمبیا دانرابوون، بەمەش دووبارە پەیوەندییان بە جیهانی دەرەوە دروست کردووەتەوە. پاسەوانانی نیشتیمانی بەئاسانی بەرشوبڵاو ببوون، ڕاپۆرتی نادڵنیاکەراوەش هەبوون کە پارێزگارە ناوچەییەکان لە چەندان خاڵی سنوورییدا وا دیاربوو بابەتەکانیان خستووەتە ژێر دەستی خۆیان، بەڵام ئەمە بۆ ماوەیەکی کاتی بوو. دوا ژمارەی ئەو کەسانەی لە نێو سوپای ڤەنزوێلا، پاسەوانی نیشتیمانی و پۆلیس کە لە ڕژێم جیاببوونەوە تا ٢٣ی شوبات، نزیکەی ١٤٠٠ کەس دەبوو، هیچ گومانیشمان نەبوو کە زۆرێکیش لەوانەی لەنێو سوپادا مابوون بەتوندی پشتگیری گاودیۆیان دەکرد.

ئەگەر بمانەوێ لەوێ سەرکەوتوو بین، ئەوا پێویستە ئێمەش پلانی خۆمان دابڕێژین. لە کۆبوونەوەیەکی "نافەرمی" لەگەڵ بەرپرسەکان کە لە ٨ی نیساندا من ڕێکم خستبوو، منوشن ئێستا زۆر میانڕەوتر بوو، هەردووکمان ڕازی بووین لەسەر ئەوەی ئابلووقەی زیاتر بخەینەسەر ڕووسیا هەم لەنێو دەسەڵاتی نووسینگەی هەمسفیەری ڕۆژئاوا و هەم لە دەرەوەی ئەوانیشدا، هەم لە ئۆکرانیا هەم لە ناوچەی باڵتیك، یان ئابلووقە خستنەسەر بۆڕییە نەوتییەکانی نۆرد ستریم ٢) . منوشن پێشنیاری ئەوەی کرد کە لە

کۆبوونەوەکانی کۆتایی هەفتە لەگەڵ سندوقی دراوی نێودەوڵەتی/ بانکی جیهانی فشار بخرێتە سەر وەزیری بەرگریی ڕووسیا. خەمڵاندنەکان دەربارەی تەواوی قەرزی ڤەنزویلا بەرامبەر ڕووسیا و چین (بەشێوەیەکی سەرەکی ڕووسیا) نزیکەی ٦٠ ملیار دۆلار بێت، یان لەوانەیە لەمەش زیاتر بێت، ئەمانە زۆر شت هەبوو دەبوو بۆی نیگەران بن، بەتایبەتیش ئەگەر ئۆپۆزسیۆن دەسەڵاتی بگرتابایە دەست. من تەنیا هیوای ئەوەم دەخواست ئەو فشار و مەترسییەی دەمانەوێ بیخەینەسەر ڕووسیا، ترەمپ بەرهەڵستی بەرامبەری نیشان نەدا.

هەریەك لە کلاڤەر کارۆن و ستۆری لە ٢٠ی نیساندا گوێبیستی ئەمە بوون. کە هاوکات ڕۆژێك پێش جەژنی ئیستەر بوو، ئەو ڕۆژە لەوانەیە ببێتە ڕۆژێکی مەبەستدار بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی ڕووخاندنی ڕژێمەکەی مادۆرۆ. تەنانەت سەرۆکی پۆلیسی نهێنی مانوێل کریستۆفەر فیگوێرا وەك ئەوەی ئێمە گوێبیست ببووین کە گوتبووی تەواو ئیدی مادۆرۆ کۆتایی هات. قسە لەگەڵ زۆرێك لە سەرکردە باڵاکان سوپای ڤەنزوێلی کرا، لەنێوانیشیان وەزیری بەرگری پادرینۆ و ئەمە ببوو بە شتێکی کرداری: قسەکردنە لەسەر ئەوە نەبوو ئاخۆ مادۆرۆ چۆن دووردەخرێتەوە، بەڵکو باس لە چۆنییەتی ڕوودانی ئەمە دەکرا. ئەم سەرکردە سەربازییانە هاوکات لە ڕاوێژکردندا بوون لەگەڵ دەسەڵاتدارە مەدەنییەکان، بەتایبەتی مۆرینۆ. کە هەوڵی زۆری دابوو بۆ وەستانەوە لە دژی مادۆرۆ و هەروەها ئەو کەسانەش کە هێشتا دڵسۆزییان بۆ ڕژێمەکەی نیشان دەدا. ئەمەیان گرنگ بوو، چونکە گۆڕانکاریی ڕاستەقینە پێویستی بە کاری زیاترە نەوەك هەر تەنیا مادۆرۆ لە دەسەڵاتەکەی لابەرین. قسەی من زیاتر لەسەر ئەوەبوو کە پێویستە لە گفتوگۆکاندا جەخت لەوە بکرێتەوە کاتی "دەستاودەستکردن"ی دەسەڵات چۆن دەبێت، چونکە ئەمە زۆر مەترسیدار دەبێ، لەوکاتەی کە پشتگیریکارانی بزووتنەوەی چاڤیستا تەنانەت دوای لادانی مادۆرۆ، هێشتا

کۆنترۆڵی دامەزراوەکانی حکوومەتیان لەدەستدا دەبێ. تێگەیشتم لەوەی بەشێوەیەکی کاتی ڕیزبەندی کارەکان بەو شێوەیە دەبێت: دادگای باڵا ڕایدەگەیەنێت کە ئەنجوومەنی دەستووری ناشەرعییە، مادۆرۆ دەست لە کار دەکێشێتەوە، دواتر سوپا گادیۆ وەك سەرۆکی کاتی دەناسێنێت و دانی پێدا دەنێت، ئەنجوومەنی نیشتیمانی وەك تاکە دامەزراوەی شەرعی یاساداناني ڤەنزوێلا دانی پێدا دەنرێ، دادگای باڵاش هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. ئەم قسانەم تەواو نەبوون، هەروەها چەندان مەترسی هەبوو لەبەردەم ئەو هەڵسەنگاندنەی من کردبووم بۆ لادانی مادۆرۆ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش مانەوەی ڕژێم لەسەر دەسەڵات دەبێتە یەکێك لە ئامانجە شاراوەکانی ئەو کەسایەتیانەی ڕژێم کە لەو بابەتەدا تێوەگلابوون.

لە ١٧ی نیساندا، لە هۆتێلی باڵتیمۆر شاری کارۆل گابلێس لە ویلایەتی فلۆریدا و لە یادی داگیرکاریی بۆ سەر کووبا کە پەنجا و هەشت ساڵ پێش ئێستا بوو، قسەم بۆ کۆمەڵەی جەنگاوەرە دێرینەکانی (کەنداوی بەراز) کرد، ئەمانە هەوڵیان دابوو شکست بە ڕژێمەکەی ڤیدیل کاسترۆ بهێنن، بەڵام شکستیان هێنابوو. ئەم دەستەیە کە (فەیلەقی ٢٥٠٦)شیان پێ دەگوترێ لەنێو فلۆریدا و تەواوی ئەمریکادا لایەنێکی بەهێزی سیاسەتەکانی نێوان (ئەمریکا-کووبا)ن، ئەم کۆبوونەوە ساڵانەشیان سەرنجی زۆری لایەنەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، بەتایبەتی کاریگەری لەسەر سیاسەتمەدارەکان دروست دەکات. منیش هەواڵێکی خۆشم پێدان لەوەی کە چیدیکە یاسای (هێلمس-بێرتۆن ٢) کاری پێ ناکرێت، ئەمەش دەرفەت بەو کەسانە دەدات کە ڕۆژانێك خاوەن موڵك بوونە و لەلایەن ڕژێمەکەی کاسترۆوە دەستی بەسەردا گیراوە، ئێستا دەتوانن سکاڵا تۆمار بکەن، هەروەها لەمەودوا پشتگیری تەواو لە (یاسای پاڵپشتی ٤) دەکەین کە ڕێگری لە پێدانی ڤیزا دەکات بەو خەڵکانە و نەتوانن بێنەنێو ئەمریکاوە، ئەمەش کێشەیەکی سەرەکی بوو بۆ دامەزراوە بیانییەکان کە

ئێستا خاوەنی زۆرێك لەو مولکانەن. چەندان پێوەری دیکەی شیاویش هەبوو کە ئێمە لە دژی کووبا و ڤەنزوێلا ڕامانگەیاند، بەتایبەتی بەئامانجگرتنی بانکی ناوەندی ڤەنزوێلا. تەواوی ئەو کاریگەرییە بۆ ئەوەبوو تا نیشانی بدەین کە ئیدارەی ئەمریکا چەندە ڕژدە بەرامبەر سێکوچکەی وڵاتانی ستەمکار، لەگەڵ ئەوەش من تەنیا کەس بووم لەنێو ئەو ژوورەی هۆتێلەکەی باڵتیمۆر کە دەیزانی ڕژدییەکی زۆر لاواز لە پشتەوەی مێزی سەرۆکایەتییەکەی ئەمریکادا هەیە.

بەهۆی چەندان هۆکاری جیاوازەوە ترازانێك ڕوویدا، بۆیە (ڕۆژی ئامانج)ی ئۆپۆزسیۆن کرا بە ٣٠ی نیسان. هەستم کرد کات زۆر بەخێرایی لە دژی ئێمە بەرەوپێش دەڕوا، کەچی ترەمپ بەئاشکرایی نیگەرانی گاودیۆ و لەدەستەنەکردنی ئەلقەی هاوسەرگیری بوو. پێشتر چەند هەڵەیەك ڕوویان دا، نموونەش وەك، جێهێشتنی وڵات لەلایەن گاودیۆوە، شکستەکەی مانگی شوباتی ئۆپۆزسیۆن و بێتوانایی کۆلۆمبیا لەوەی نەیانتوانی خاڵ سنووری تێپەڕێنن و یارمەتییە مرۆییەکان بگەیەننە شوێنی مەبەست، هەروەها داخستنی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە کاراکاس، هەموو ئەمانە هەر لەنێو ئاوەزمدا بوون. هەرچۆنێك بێت، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژی ٣٠ی نیسان دەستنیشان کرا، هەروەها گاودیۆ ڕایگەیاند کە ڕۆژی ١ی مایس خۆپیشاندانی جەماوەری ئەنجام دەدرێ، خەریك بوو کاتژمێرە یەکلاییکەرەوەکان نزیك دەبوویەوە، لە ڕاستیدا، ئەوە پۆمپەیۆ بوو لە کاتژمێر ٥:٢٥ بەیانیی ڕۆژی ٣٠ی نیسان پەیوەندی پێوە کردم تا پێم بڵێت: "چەندان جووڵە لەنێو ڤەنزوێلا دەستیان پێ کردووە"، هەروەها گوتیشی کە لەنێو شتەکانی دیکەدا، سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن لیۆپۆڵدۆ لۆپێز دوای چەند کاتژمێر لە دەستبەسەریی نێوماڵەکەی ئێستا لەلایەن سەرۆکی تازەی ئاژانسی پۆلیسی نهێنی ناسراو بە (سیبین) ژەنەڕاڵ مانوێل کریستۆفەر فیگوێرا ئازاد کراوە. پۆمپەیۆ گوتی پادرینۆ چووە تا چاوی بە گاودیۆ

بکەوێت، پلانی ئەوەشی هەیە کە بە مادۆرۆ بڵێت ئێستا کاتی ئەوەیە واز لە دەسەڵاتەکەت بێنی. پادرینۆ گوتی سێ سەد کەسایەتیی سەربازی یاوەرییم دەکەن، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی سەربەستە و بەربەستی کووباییەکانی تێکشکاندووە، لەگەڵ ئەوەش دواتر زانیمان کە زانیارییەکانی (هەم کۆبوونەوە بانگەشەبۆکراوەکەی هەم ژمارە کەسایەتییە سەربازییەکان) هەڵە بوون. ئەو کەمە ڕۆڵەی دەبوو دادگای باڵا بیگێڕێت کە بریتبوو لەوەی (ئەنجوومەنی دەستووری بە ناشەرعی لەقەڵەم بدات) هێشتا ئەمەی نەکردبوو، بەڵام کارەکانی دیکە خەریك بوو جێبەجێ دەکران. من پێشتر بڕیارم دابوو زووتر لە جارانی ئاسایی لە کۆشکی سپی بگەڕێمەوە و چاوەڕوانی ڕۆژێکی پڕ لە ئاژاوەم دەکرد. تا ئەو کاتەی گەیشتمە بەری ڕۆژئاوای کۆشکی سپی، گاودیۆ و لۆپێز لە بنکەی ئاسمانی لاکارلۆتای کاراکاس بوون، کە دەگوترا ئەو بنکەیەش چوونەتەپاڵ ئۆپۆزسیۆن. گاودیۆ لە تویتەر پەیامێکی ڤیدیۆی بڵاوکردەوە و ڕایگەیاند کە دەست بە "ئۆپەراسیۆنی ئازادکردن"ی ڤەنزوێلا دەکەین، داوای لە سوپا دەکرد واز لە دەسەڵاتەکەی مادۆرۆ بێنن و خەڵکی مەدەنیش بۆ خۆپیشاندان بڕژێنە سەر شەقامەکانەوە. کەمێك دواتر، زانیمان ئەو زانیارییەی لەسەر بنکەی ئاسمانی باس کرابوو، ڕاست نەبوو، گاودیۆ و لۆپێزیش هەرگیز لەنێو ئەو بنکە ئاسمانییە نەبوونە. لەمەش زیاتر، ڕاپۆرتەکان دەیانگوت کە ئەو یەك سەربازییانەی پشتگیری گاودیۆیان دەکرد بەلایەنی کەم دەستیان بەسەر هەندێ ڕادیۆ و و تەلەفزیۆندا گرتووە، ئەگەر ئەمانە ڕاستیش بن، ئەوا لە ماوەی چەند کاتژمێرێکی دواتردا دەردەکەوت کە دوورن لەڕاستییەوە.

ئەو بەیانییە ڕاپۆرتە سەرلێشێواو و هەڤدژەکان هەر بەردوام بوون، دیاردەی "تەمی شەڕ" لەنێو ئەو ڕووداوانەدا بوونی هەبوو، بەڵام بەڕوونی دەرکەوت کە گفتوگۆی نێوان ئۆپۆزسیۆن و کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕژێم ئیدی

بوونی نەماوە. یەکەم هەواڵ تا کاتژمێر ٦ی بەیانی نەگەیشت، دواتر گوێبیست بووین کە ئەندامانی دادگای باڵا لەلایەن (مۆرینۆ)ەوە کۆکرابوونەوە تا پێیان بڵێت بەو ڕۆڵە دیاریکراوەی هەڵسن کە هەیانە. ئەمەش بە جۆرێك دەبووە هۆی ئەوەی (پادرینۆ)ی وەزیری بەرگریش بکەویتە خۆی و کاردانەوەی هەبێ. بەڵام وا دیاربوو دادوەرەکان شوێنی فەرمانەکان نەکەوتبوون. تا نیوەڕۆ، هەڵسەنگاندنی من ئەوەبوو کە بەرپرسی باڵای کەسانی مەدەنی و سەرکردەکانی سوپا -ئەوانەی کە ڕژێمە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن- نموونەش وەك مۆرۆینۆ، هەموو ئەمانە خەریکە پاشەکشە دەکەن لەو هەوڵەیان، چونکە پێیان وابوو جارێ زووە بۆ خودی ئەم کارە. ژەنەڕاڵ کریستۆفەر فیگوێرا گوتی من خۆم پادرینۆم ئاگەدارکردووەتەوە کە پێویستە بەخێرایی ئەو کارانەی خشتەیان بۆ دانراوە ئەنجامیان بدات، بەڵام دەشیگوت کە پادرینۆ شڵەژاوە لەمەڕ گۆڕینی پلانەکان[1]. خشتەی کارەکان ڕێکخرابوو، بەڵام وا دیاربوو شەوی دووشەممە کووباییەکان خەریکی پیلانگێڕین، بۆیە هانی ئەو کەسانەیان دەدا کە لە بەرەی ئۆپۆزسیۆن بوون بەردەوام بن بەبێ ئەوەی لە دەرئەنجامەکان تێگەیشتبن. بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی من، هەموو ئەو

(١) کریستۆفەر فیگوێرا وەها وەسفی ئەو دایەلۆگەی کردبوو: "لە ٢٩ی نیسان فیگوێرا گوتی هێزە چەتەکانی مادۆرۆ کە بە (کۆلێکتیفۆس) بەناوبانگن، ئامادەکاریان کردبوو تا هێرشی فراوان لە ١ی مایس ئەنجام بدەن و ئەمە ڕەنگە دەرئەنجامی خوێناویی لێ بکەوتایە. دەربارەی خشتەی نوێی کارەکانی مادۆرۆ بە پادرینۆی گوتبوو "ئەتوو شێت بووی"، پادرینۆش گوتی بەڵێ لە داخی قسەکانی فیگوێرا شێت بوومە. دواتر پرسیاری کردبوو ئەی ڕۆڵی دادگای باڵای وڵات چییە؟ چۆن ئەم کارە دەکەی؟ ئێستا و خەریکە ڕوودەوەکان ڕوودەدەن. فیگوێرا لە وەڵامدا گوتبووی: "ئەگەر ڕۆژی ١ی مایس نەبێتە ڕۆژێکی خوێناوی... ئەوا پێویستە بەخێرایی هەنگاو بنێین." فیگوێرا و پیلانگێڕەکانی دیکە گوتیان کە ئێمە زانیاریی دڵنیاکەرەوەمان هەیە لەوەی مۆرینۆ ئامادەیە لە ٣٠ی نیسان فەرمانڕەوایەتی خۆی رابگەیەنێت. بەڵام دوای گوێبیستبوونی قسەکانی پادرینۆ و ئەو گومانانەی هەیبوو، فیگوێرا گوتی مۆرۆینۆ یەکسەر هەڵسا بە پەیوەندیکردن بە کەسایەتییە سەربازییەکانی دیکەوە.

بەڵگانە نیشانی دەدات کێ بەڕاستی بەرپرسیاری ڤەنزوێلایە، ئەو لایەنەش کووباییەکانن کە ئاگەداری مادۆرۆیان کردبووەوە. قسەیەك لەنێو کاربەدەستانی باڵای ڕژێم بڵاوبوویەوە گوایە لایەنی ئاسایشی پلانەکە تێکشکێندراوە، سەرۆکی دادگای باڵا (مۆرینۆ) زۆر شلەژابوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی شکست بێنێ لەوەی نەتوانێ لە ڕێگەی دادگاوە ئەو ئەنجوومەنی دەستوورییەکەی مادۆرۆ دروستی کردبوو، بە ناشەرعی لەقەڵەمی بدات، بەمەش تەنانەت سەرکردە باڵاکانی سوپاش سەریان سوڕمابوو. ئەمانە دوودڵ بوون و لە ڕووی گەرەنتی دەستوورییەوە کێماسیان هەبوو، هاوکات ئازادکردنی لۆپێز لە بەیانیی ڕۆژی سێشەممەدا تەنیا بووەهۆی زیادکردنی سەرلێشێواوی لەنێو ئەو کەسە پیلانگێرانەی کە لەنێو سوپادا پلەی باڵایان هەبوو. من پێم وابوو ئەو ژەنەڕاڵانە هەرگیز نەیانویستووە لە ڕژێم جیاببنەوە، یان بە لایەنی کەم دەیانەوێ خۆیان بپارێزن، ئەوکاتە لە ڕۆژی سێشەممە و دوای سەیرکردنی ئەوەی بزانن ڕووداوەکان بە کوێ دەگات، ئەوکاتە ڕێگەیەك بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

لەنێو ئەم بارودۆخە شۆڕشگێرییەدا هیچ شتێك بەگوێرەی ئەوەی پلانی بۆ دانرابوو، بەڕێوە نەچوو، هەندێ کاتیش ڕێکاری وا دەکات جیاوازیی لەنێوان سەرکەوتن و شکستهێناندا دروست بێ. بەڵام ئەو ڕۆژە کاروبارەکان لە ڤەنزوێلا کۆتاییان نەهات. ئێمە بەدڵنیاییەوە بێهیوا بووین، بەزۆرییش بەهۆی ئەوەی ئێمە لە واشنتۆن بووین، چونکە دووربووین لەوەی بزانین چی ڕوودەدا و بێتواناش بووین لەوەی بزانین ڕووداوەکان لە چ کاتێك ڕوو دەدەن. هەروەك دواتر لە سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە زانیمان، دوای ئەوەی کریستۆفەر فیگۆێرا لۆپێزی لەو دەستەبەسەرییەی ماڵەوە ئازاد کرد، لۆپێز و گاودیۆ بڕیاریان دابوو بەردەوامبن، هیواخوازیش بوون سەرکردە سەرەکییەکانی ڕژێم شوێنیان کەون. مێژوو تۆماری دەکات کە ئەوانە هەڵەبوون، بەڵام لۆژیکێك هەبوو بەوەی کاتێ دەستیان پێ کرد بڕوایان وابوو یارییەك هەیە پێویستە ڕۆڵی تێدا بگێڕن. کریستۆفەر

فیگوێرا دواتر باڵیۆزخانەی کاراکاسی کردە پەناگەی خۆی، لەبەر ڕژێمەکەی مادۆرۆ لە ژیانی خۆی دەترسا، دواتر ڕای کرد بۆ کۆلۆمبیا. ژنەکەی و ژنی چەندان بەرپرسی دیکەی ڕژێمەکەی مادۆرۆ پێشتر ڕوویان لە ئەمریکا و شوێنە پارێزراوەکانی دیکەی جیهان کردبوو.

من لەسەر ئەو بابەتە هەر کێبڕکێم دەکرد و دەمویست ترەمپ بەئاگا بێنمەوە تا کارێك بکات، ئەمەش دوای ئەوەی گەیشتە کۆشکی سپی و بەخێرایی پێداچوونەومان بە هەموو زانیارییەکان کرد. لە کاتژمێر ٦:٠٧ بەیانی تەلەفۆنم بۆی کرد، یەکەم جار لەوەتەی وەك ڕاوێژکاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کارم دەکرد لە خەوی هەڵسێنم. نازانم پێشتر هەریەك لە (میکائیل فلین یان هێربەرت ماکماستەر: وەك دوو ڕاوێژکاری پێشووتری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) پێشتر ئەو کارەیان کردووە یان نا. ترەمپ زۆر خەواڵوو بوو، بەڵام کاتێ ئەوەی دەمانزانی پێم گوت، ئەویش تەنیا گوتی "واو"؟ من سووربووم لەوەی کە دەرئەنجامەکە دوورە لە دڵنیاییەوە. ئەو ڕۆژە ڕەنگە وا کۆتایی بێت کە مادۆرۆ بخرێتە بەندیخانەوە، یان گاودیۆ بخرێتە بەندیخانەوە، یاخود هیچ شتێك لەو دووانە. لە کاتژمێر ٦:٢٢ تەلەفۆنم بۆ مایك پێنس کرد و هەمان پەیامم پێ دا، دواتر تەلەفۆنم بۆ ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و سەرکردە باڵاکانی کۆشکی سپی کرد، تیایدا لە هەردوو لایەن پشتگیرییەکی یەکگرتوو بۆ ئەو سیاسەتە ڕژدەی ئێمە لە ڤەنزوێلا، هەبوو. لە تەواوی ڕۆژەکەدا، من و پۆمپەیۆ خەریکی تەلەفۆنکردن بووین لەگەڵ حکوومەتە بیانییەکان، ئەوەی دەمانزانی پێمان دەگوتن و داوای پشتگیریمان لێ دەکردن بۆ ململانێیەك کە تیایدا هێشتا نەماندەتوانی پێشبینی کاتەکەی بکەین.

هیچ کەسێك بە مادۆرۆی نەگوت کاتی ئەوە هاتووە واز لە دەسەڵاتەکەت بێنی، هەروەك ئەمە بەشێکیش بوو لە پلانی ئۆپۆزسیۆن، بەڵام گومانی تێدا نییە کە سەرەڕای ئەو هەموو چاودێرییەی ڕژێم، بەڵام یاخیبوون ببوو،

هۆی ئەوەی مادۆرۆ دەستبەسەر بکرێ. مادۆرۆ بەخێرایی بردرایە بارەگای سەربازی (فیۆرتێ تیونا) لە نزیك کاراکاس، لەوێدا لەژێر توندترین پارێزبەندیی ئاسایشدا بۆ چەندان ڕۆژ مایەوە. ئەمە یان بۆ پاراستنی مادۆرۆ بوو، یان بۆ ئەوەبوو بەرلەوەی ڤەنزوێلا جێ بهێڵێت، بیوەستێنن، یان لەوانەیە تیکەڵەی هەردوو هۆکار بێ. بەهەرحاڵ، ئەمە مشتومڕی دروست کرد و تەنانەت تا ئێستا بە ناڕوونی ماوەتەوە. (کووبابیەکان هۆکارێکی باشیان لەبەردەست بوو تا بۆ مادۆرۆ نیگەران بن، پۆمپەیۆ ڕۆژی دواتر بەئاشکرایی گوتی کە مادۆرۆ خەریکی جێهێشتنی وڵاتەکەی بوو). ڕاپۆرتەکان ڕایانگەیاند کە (پادرینۆ)ش تەواوی ڕۆژەکە هەر لە (فیۆرتێ تیونا) بووە، هەروەك ئۆپۆزسیۆنیش هەمان باوەڕی هەبوو. بەڵام هۆکارەکان هەرچییەك بووبن، کووباییەکان و سەرکردە سەرەکییەکانی ڕژێم بێگومان زۆر نیگەرانی ئەو ڕووداوانە بوون کە خۆیان شایەتحاڵی بوون، ئەمەش دەرخەری هەڵەتێگەیشتنی خۆیان بوو لەوەی لەنێوخۆی ڤەنزوێلادا پشتگیری مادۆرۆ و ڕژێمەکەیان کردبوو.

نیگەرانیی من ئەوەبوو کە شکستهێنانی ئەو ڕاپەڕینە دەبێتەهۆی ئەوەی بەکۆمەڵ خەڵکی ئۆپۆزسیۆن دەستگیر بکرێت و ئەگەری ئەنجامدانی خوێنڕێژییش هەیە، کە ئێمە لەوەتەی مانگی کانوونی دووەمەوە ترسمان لێی هەبوو. بەڵام خراپترین دەرئەنجام ئەو شەو و ڕۆژە نەهاتە ئاراوە، تەنانەت لە چەند هەفتە و مانگی دواتریش ئەمە هەر ڕووینەدا. هۆکارەکەی ئەوەبوو کە مادۆرۆ و دەستوپێوەندەکانی بەباشی دەیانزانی جووڵانەوەی توندوتیژ دواجار وادەکات سوپا بێتە نێو بابەتەکەوە و تەنانەت پلەباڵاترین ئەفسەرەکانیش، لە دژی ڕژێم دەوەستنەوە. نە مادۆرۆ نەوەك سەرکارە کووباییەکان ئامادەنەبوون ئەو مەترسییە تاقی بکەنەوە، ئەم قسەیە بۆ ئەمرۆش ڕاستە و کەس نەوێراوە خۆی لەم کارە بدات.

لە ١ی مایس بەرنامەی کۆبوونەوەیەکم دانا لەگەڵ کۆمیتەی بەرپرسەکان

تا گفتوگۆ لەبارەی ئەوە بکەین کە دەبێ چی بکەین؟ هەر کەسە و پێشنیاری خۆی هەبوو، زۆرێك لەوانەشمان تەبەنی کرد، دیسانەوە پرسیاری ئەوە دروستبوو بۆچی هەموو ئەو کارانەمان لە مانگی کانوونی دووەمد نەکرد. ئێستا ئەوکاتە بوو کە دەرئەنجامی کارەکان بەهۆی ڕێکاری ڕۆتینییەوە ڕوون و ئاشکرا بوون، هەروەها (کۆشکی سپی)یش لە ڕووی ڕژدی و دانانی چارەسەرەوە کێماسی هەبوو و ئەمەش بەئاشکرایی دیاربوو. لەگەڵ ئەوەی هەندێ لایەن بەر لە ئاژاوەکەی ٣٠ی نیسان سەریان هەڵدابوو، بەڵام هیچ ڕێگەیەك نەبوو وا نیشانی بدەین ئەوە کارێکی لەدەستدێ مەگەر تەنیا شکستهێنانی ئۆپۆزسیۆن نەبێ. ئەمانە یارییەکیان دەست پێ کرد، بەڵام هیچ دەرئەنجامێکی نەبوو، هەروەك لەنێو ڕژێمی دیکتاتۆرییەتدا هەرگیز ناتوانی چاوەڕوانی هەواڵی خۆش بکەی. بەڵام ڕاستییەك هەیە ئەویش ئەوەیە گەر لە یارییەك شکستت هێنا، مانای ئەوە نییە یارییەکە کۆتایی هاتووە، سەرەڕای ئەوەی لەلایەنی ئێمەشدا بێهواییەکی زۆری هەبوو. ئێستا ئەرکەکە لەسەر ئۆپۆزسیۆن وەستابوو، دەبوو دیسانەوە دەست پێ بکەن و بەرەو داهاتوو هەنگاوبنێن.

یەکێك لە ئامانجە کاریگەرەکان بریتبوو لە خۆپیشاندانی جەماوەری کە پێشتر گاودیۆ بۆ ڕۆژی ١ی مایس پلانی بۆ دانابوو، لەگەڵ ڕژێم زۆر بە فراوانی لە دژی خۆپیشاندانەکان دەجووڵایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەبارەی خۆپیشاندانەکە، ئەوەندەی کە بینرا ئەوها گەورە و فراوان نەبوو. زۆرێك لە هاووڵاتییان بەدڵنیاییەوە نەیاندەزانی ڕژێم چۆن کاردانەوەی دەبێ، شڵەژاوی لەسەر شەقامەکان هەبوو، لەگەڵ ئەوەش لە تەلەفزیۆن وێنەکانی نیشاندەدا تیایدا پیاو و ئافرەتی گەنج لەنێو بەرەی ئۆپۆزسیۆندا دەیانەوێ شەڕ بکەن، هێرش دەکەنەسەر ئۆتۆمبێلە سەربازییەکانی پۆلیس کە هەوڵیان دەدا بەربەست بۆ خۆپیشاندەران دروست بکەن. گاودیۆ لەنێو خەڵك بوو، هەموو ڕۆژ قسەی خۆی دەکرد، داوای بەردەوامیی

خۆپیشاندانەکان و مانگرتنی یەکە تایبەت و حکومییەکانی دەکرد، تیایدا هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەوەی توانی کۆتایی بەو پشتگیرییەی چەند ساڵە بهێنێت کە بۆ بزووتنەوەی ڤاچێستا لەدوای مادۆرۆ هەیانبوو. ڕەوشی تێکشکاوی ئابووری مانای وابوو تەنانەت فەرمانبەرانی حکوومەتیش دەیانزانی پێویستە گۆڕانکاریی سەرەکی بکرێت بەرلەوەی شتەکان بەرەو باشتر بچن. مادۆرۆ، بەپێچەوانەی گاودیۆ هەر بەنادیاریی مابوویەوە و لەنێو خەڵکی عەوام بەدەرنەکەوت، پێدەچێ هەر لە (فیۆرتێ تیونا) مابووبێتەوە، گومان دەکرا ئامادەکاری دەکا تا کۆمەڵێکی زۆری خەڵك دەستگیر بکات، کە ئەمەش ترسی بۆ ئۆپۆزسیۆن و خەڵکی عەوام بەگشتی دروستکردبوو، بەڵام ئەمە هەرگیز ڕوویندا.

بەرەوپێشچوونی نەرێنی ئەوەبوو کە ترەمپ لە ۲۳ی مایس پەیوەندی بە (پوتین)ەوە کرد، ئەم تەلەفۆنە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەسەر هەندێ بابەتی دیکە بوو، بەڵام دواجار ڤەنزوێلاشی لە خۆ گرتبوو. پوتین لەسەر ستایلی سۆڤیەت پڕوپاگەندەیەکی جوانی کرد، پێم وایە هەر ئەمە قەناعەتی بە ترەمپیش هێنابوو. پوتین گوتی پشتگیریی ئێمە بۆ گاودیۆ تێکەڵە بە هەمان ئەو پشتگیرییەی بۆ مادۆرۆ هەمانە، ئەم قسەیەی پوتین بەتەواوی دووربوو لە ڕاستییەوە، هاوشێوەی ئەو قسەی هەڵەی دواتریش کردبووی بەوەی گوتبووی هەڵمەتە جەماوەرییەکانی مادۆرۆ لە ڕۆژی ۱ی مایسدا، زۆر لەوانەی ئۆپۆزسیۆن فراوانتر بوو. بەشێوەیەك کە گەرەنتی ئەوەبوو دەیەوێ داوای پێداچوونەوە لە ترەمپ بکات، پوتین گوتی گاودیۆ کەسێکە بانگەشە بۆ خۆی دەکات بەبێ هەبوونی پشتگیرییەکی ڕاستەقینە، هاوشێوەی ئەوەی کە هیلاری کلینتۆن لەبارەی خۆیەوە بڕیاری دا و پێی وابوو دەبێ بە سەرۆکی ئەمریکا. ئەم جۆرە قسەکردنە (ئۆرویل)یانەیە درێژەی کێشا تا ئەوکاتەی پوتین نکۆڵی کرد لەوەی ڕووسیا هیچ ڕۆڵێکی هەبێ لە ڕووداوەکانی ڤەنزوێلادا. پوتین دانی نا کە ڕووسیا پێشتر ڕۆڵی

هەبووە، ئەویش ١٠ ساڵ لەمەوبەر کاتێ چەکیان بە ڕژێمەکەی چاڤێز فرۆشتبوو، بۆیە ئێستاش لەژێر مەرجەکانی ئەو ڕێککەوتنە کە ئەو کاتە واژووکراوە، بەردەوامین لە هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی و چاکردنەوەی ئەو کەلوپەلانە، ئەگەرنا هیچ ڕۆڵێکی دیکەمان نییە. پوتین گوتی کریستۆفەر فیگوێرا (ناوی ئەوی بەکارنەهێنا، بەڵکو نازناوەکەی گوت) بریکاری ئێمەیە، دەیتوانی زۆر زیاتر ئاگەدارمان بکاتەوە. ئەوە چی کۆمیدیایەکە! پوتین بە ئاسانی دەیتوانی لەو بانگەشە دووربکەوێتەوە و پێی وابوو دەستێکی واڵای لە ڤەنزوێلادا هەیە. کەمێك دواتر، هەروەك کە وەزارەتی گەنجینە ئاگەداری کردینەوە، ترەمپ قسەی لەگەڵ منوشن کردووە، تیایدا ترەمپ بە خۆشحاڵییەوە دەیەوێ ئابلووقەکان بخرێنەسەر ڤەنزوێلا.

لە ماوەی چەند مانگی دواتردا، ئابووریی ڤەنزوێلا وێران بوو، ئەو هەرەسەی لە ماوەی بیست ساڵی فەرمانڕەوایی چاڤێز و مادۆرۆ هەیبوو. هەر درێژەی کێشا. سەرۆکی کۆمیتەی نێودەڵەوتی خاچی سوور دوای سەردانیکردنی ڤەنزوێلا پێی گوتم لەوەتەی دوا سەردانم بۆ کۆریای باکوور، لە هیچ شوێنێك نەخۆشخانەی ئاوا خراپم نەدیووە، وەك ئەوانەی لە ڤەنزوێلا هەن. گفتوگۆکان لەنێوان ئۆپۆزسیۆن و سەرکردە سەرەکییەکانی ڕژێم بەردەوامییان هەبوو. پێشکەوتنەکان بەپلەی جیاواز بوون، کاتێکی درێژی پێچوو کە دواتر گفتوگۆکان وەستان. ئۆپۆزسیۆن ململانێ دەکات تا ستراتیژیەتێکی نوێ بدۆزێتەوە بۆ دوای شکستەی ٣٠ی نیسان، سەرەڕای ئەوەی هەندێ ڕەخنەیان لێ گیراوە، بەڵام هەندێ سەرکەوتنیشیان بەدەست هێناوە. یەکێك لە ڕێگە سەرنجڕاکێشەکان بۆ لادانی مادۆرۆ بریتییە لەوەی ململانێ لە دژی مادۆرۆ زیاتر و بەهێزتر بکرێ. ئەگەر ئەو دووپشکانە بخرێنە نێو یەك شووشە لە دژی یەك و ببێتەهۆی لاچوونی مادۆرۆ، تەنانەت گەر ڕژێمەکەش لە شوێنی خۆی بمێنێ، ئەوا دەبێتەهۆی دروستبوونی سەقامگیری و تیژکردنەوەی ململانێی

ناوەکی، دەرفەتی زیاتریش بە ئۆپۆزسیۆن دەدا تا کاردانەوەی هەبێ. کۆمەڵەی ئەمریکی - ڤەنزوێلی لە فلۆریدا بەهۆی ئەم دەرئەنجامەوە پووکایەوە، بەڵام دواتر بەخێرایی هەستانەوە، ئەویش بەهۆی ئەو زەرورییەتە بەردەوامەی کە دەبوو ئەو پاڵپەستۆیە لەسەر دۆست و بنەماڵەکانیان نەهێڵن. سیاسەتمەدارەکانی ئەمریکاش هەر لە ترەمپەوە تا خوارێ، درکیان کرد بەوەی دەنگدەرە ئەمریکییە بە ڕەچەڵەک ڤەنزوێلییەکان، نەوەک ئەمریکییە بە ڕەچەڵەک کووبابییەکان یان ئەمریکییە بە ڕەچەڵەک نیکاراگواییەکان، هەبوونیان لە ویلایەتی فلۆریدا گرنگ و بەرچاوە، لەمەودواش لەسەر بنەمای ئەوەی چەندە کاندیدەکان پشتگیری ئۆپۆزسیۆنی ڤەنزوێلی دەکەن، ئەوا هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکەن و دەنگیان پێ دەدەن.

بەڵام ئەم دۆخە نالەبار و ئاڵۆزە لە فەنزوێلا هەر بەردەوام بوو. هیچ لایەنێك ناتوانێ بەسەر ئەوی دیکە زاڵ بێت. ئەوە هەڵەیە گەر بڵێین هەروەك زۆرێك لە چاودێران دەڵێن کە سوپا هەر بەدڵسۆزی بۆ مادۆرۆ ماوەتەوە. سوپا لەنێو سەربازگەکانی خۆیاندا ماونەتەوە، کە تیایدا بەبێ پرسیارکردن لەوەی کێ فەرمانیان بەسەردا دەکات سوود بە ڕژێم دەگەیەنن. لەگەڵ ئەمانەش، بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی من ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەفسەرە باڵاکان و ئەوانەی خراونەتە لیستەکەوە هیچ هەستێکی دڵسۆزانەیان بۆ ئەو ڕژێمە هەبێ کە وڵاتەکەی وێران کردووە، هاوکات ڕەوشی ئابووری ڕۆژ دوای ڕۆژ خراپتر دەبێت. لەجیاتی ئەمە، بەگوێرەی ڕوانینی من، ئەفسەرە باڵاکانی سوپا بەدڵنیاییەوە لەگەڵ ئەوەن یەکڕیزی لەنێو هێزە چەکدارەکان هەبێ و وەك دامەزراوەیەك ڕێك بخرێن. هەر فەرمانێك بۆ سەرکوتکردنی ئۆپۆزسیۆن دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەری نێوخۆیی، پێدەچێ یەکە سەربازییە ڕێکوپێکەکانیش پشتگیریی ئۆپۆزسیۆن بکەن لە دژی چەندان فۆرمی پۆلیسی نهێنی، میلیشیا، هەروەها چەتەکانی

کۆلیکتیڤۆس کە کووبا ئاراستەیان دەکات. ئەو جۆرە ململانێیە یەکێکە لە پێشکەوتنە نەشازەکان کە دەتوانێ زۆر لە جاران زیاتر ڕەوشەکە بەرەو خراپی ببات. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە لە بارودۆخە ڕاستەکاندا سوپا توانای تەواوی هەیە ڕژێمەکە لەناو ببات، نەوەك تەنیا مادۆرۆ، هاوکات ڕێگە بە گەڕانەوەی دیموکراسیش بدات.

ئەوەی ئێستا وەك هۆکارێکی سەرەکییە بۆ وەستاندنی ڤەنزویلا، بریتییە لە نەهێشتنی ئەو ئامادەگییەی کووبا لەو وڵاتەدا هەیەتی، هاوکات ڕووسیاش لە ڕێگەی سەرچاوە داراییەکانی بەشێوەیەکی بەرچاو پشتگیریان دەکەن. ئەگەر تۆڕە سەربازی و هەواڵگرییەکانی کووبا ئەو وڵاتە جێ بێڵن، ئەوا ڕژێمەکەی مادۆرۆش دەکەوێتە ڕەوشێکی سەختەوە، ڕەنگە کێشەکانیش کۆتایی بێت. هەموو کەسێك لەو ڕاستەقینەیە تێدەگات، بەتایبەتی مادۆرۆ، هەروەك زۆرێك بڕوایان وایە مادۆرۆ وەك پێگەی سەرۆك قەرزاری کووباییەکانە، بەوپێیەی دوای مەرگی چاڤێز کووباییەکان ململانێیان کرد تا کۆنترۆڵی ئەو پۆستە بکەن. گەر سەیری ڕابردوو بکەین، ئەمە شتێکە بۆ من ڕوون و ئاشکرایە کە (هاڤانا) مادۆرۆ وەك سەرۆکێکی گونجاو و نەرمتر دەبینن لە سەرکردە کاندیدەکانی دیکە، زەمەنیش ئەمەی سەلماندووە کە ئەو بیرۆکەیەیان قسەیەکی ورد و تەواوە.

---

لە دوازۆژی نیسانی ٢٠١٩دا، دوای دوو دەیە لە بێمتمانەیی هاوبەشی نێوان هەردوولا، بەهۆی ترسنۆکی زۆرێك لە سەرکردە دیارەکانی ڕژێم لەوەی بەڵێنیان دابوو کاردانەوەیان هەبێ، بەڵام دواتر لە ساتە گرنگەکەدا ئەو بوێرییەیان لەدەست دا، هەروەها هەندێ هەڵەی تەکنیککی لەلایەن ئەو ئۆپۆزسیۆنەی ئەزموونێکی کەمی هەبوو، نەبوونی هیچ ڕاوێژکارێکی ئەمریکی لە سەرزەمینی ئەو وڵاتە کە لەوانەبوو، من دەڵێم "لەوانەیە" بیانتوانیبایە جیاوازییەك دروست بکەن، هەروەها فشاری سارد و

گاڵتەجاڕانەی کووبا و ڕووسیا، هەموو ئەمانە وای کرد ئەو ڕاپەڕینەی هەوڵی بۆ درابوو بگەڕێتەوە خاڵی سەرەتا. لەوکاتەدا هەموو ئەو شتانەم ڕوون کردەوە، هیواداربووم هەوڵەکانی ئۆپۆزسیۆن بەردەوام بێ، ئەو تۆمارە مێژووییەش پاك بکرێتەوە[1]. دواى شکستهێنان ئیدی لۆمەکردن شتێکی حەتمییە، زۆر شتیش هەبوو دەبوو ئیدی گۆڕانی بەسەردا بێت، تەنانەت ڕاستەوخۆ خودی ترەمپیش.

بەڵام هیچ هەڵەیەك مەکە: ئەم ڕاپەڕینە زۆر نزیك بوو سەرکەوتن بەدەست بێنێ. بڕوا بکە، ئەگەر نا ئەو ڕاستییە پشتگوێ بخە، هەروەك لە چەند ساڵی داهاتوودا زانیاریی زیاتر دەکەوێتە بەردەست، ئەوکاتە ڕوونتر و ئاشکراتر دەبێت. لە دواى ڕووداوەکانی شکستەکەی ٣٠ی نیسان، ئۆپۆزسیۆن بەردەوام بوو لە نیشاندانی بەرهەڵستی، سیاسەتی ئەمریکاش پێویستە بەردەوام بێ لە پشتگیریکردنیان. هەروەك میتچ ماککۆنێل لە سەرەتای مایس پێی گوتم: "پاشەکشە مەکە". هەموو ئەمە وەك شانازیی و دەستکەوتێکە بۆ ئەوانەی لەپێناو ئازادکردنی خەڵکی وڵاتەکەیان ژیانیان خستە مەترسییەوە، شەرمەزارییشە بۆ ئەوانەی ڕەخنەیان لێ دەگرتن، ڕۆژێك دێ ڤەنزوێلا ئازاد و سەربەست دەبێ.

---

(١) لە ئێوارەی ڕۆژی ٣٠ی نیساندا، من تویتێکم کرد تیایدا ئاماژەم بە پادرینۆ و مۆرینۆ و ئیڤان هێرناندزی (بەرپرسی سوپا) کرد : ئێمە بەباشی ئەو ڕۆڵە دەزانین کە ئەمرۆ بۆ گەڕاندنەوەی دیموکراسی بۆ ڤەنزوێلا گێڕاوتانە. ئێوە ئێستا پێویستە هەڵوێستتان هەبێ و ئەوەی باشە بۆ ڤەنزوێلا بیکەن. خەڵك و جیهان ئێوە بە بەرپرسیار دەزانن بەرانبەر ئەوانەی ئەمڕۆ لە ڤەنزوێلا بریندار بوون." ڕۆژی دواتر لە گفتوگۆیەکی درێژی ڕادیۆیی لەگەڵ هەڤ هیویت باسم لەو مامەڵە ئاڵۆزانە کرد کە لەنێوان کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕژێم و ئۆپۆزسیۆندا، بەر لە ڕاپەڕینەکە بوونیان هەبوو.

## بەشی دەیەم

## هەورەتریشقەیەک لە چینەوە

لە سەدەی بیست و یەکەمدا پەیوەندییە ئابووری و جیۆسیاسییەکان لەگەڵ چین، بڕیار لەسەر پرسە نێودەوڵەتییەکان دەدات. بڕیارەکەی دنگ چیاوپینگ بەوەی سیاسەتی ئابووریی چین بەدوور بێت لە مارکسیبەتی ئارسۆدۆکسی کە لە ساڵی ١٩٧٨ەوە دەستی پێ کرد، هەروەها بڕیارەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە دانان بە کۆماری چینی میللی (هەروەها ڕەتکردنەوەی دانان بە کۆماری چینی میللی لە تایوان)، لە ساڵی ١٩٧٩ بریتی بوون لە خاڵی وەرچەرخان. مێژووی ئەم بڕیارانە و ئاکامەکانیان تۆزێك ئاڵۆزە، بەڵام ستراتیژیەتی ئەمریکا و ستراتیژیەتی خۆرئاوا بەشێوەیەکی فراوان، هەروەها ڕای گشتی سەبارەت بە چەندین دەیەی داهاتوو، ئەمانەی بەسەر دوو پێشنیاردا دابەش کرد. یەکەم، ئەوانەی کە پشتگیریی ئەم پێشکەوتنانەیان دەکرد و باوەڕیان وابوو کە چین بەشێوەیەك دەگۆڕێت کە ناتوانرێت ئیدی بەری لێ بگیرێت، ئەمەش بەهۆی ئەو پێشکەوتن و گەشەسەندنەی کە ڕووەو بازاڕکاری و زیادبوونی بەرهەمهێنانی بیانی و پەیوەندییە ئاڵوگۆڕە قووڵەکانی لەگەڵ بازاڕی جیهانی و قبوولکردنی زیاترین پێوانە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکاندا هەیەتی. هەروەك وتەیەك هەیە دەڵێت: چین چێژ لەم "هەڵکشانە ئاشتییانە" دەبینێت و بەم جۆرەش دەبێت بە "بەرپرسیاری گشت بەرژەوەندییەکان" و هەروەها دەشبێت بە "هاوبەشی بنیاتنان" لە کاروبارە نێودەوڵەتییەکاندا. بەم جۆرەش هێنانی چین بۆ ڕێکخراوی نێوەدەوڵەتیی جیهانی لە ساڵی ٢٠٠١

وەکو ئەوە وابوو کە بیکەن بە مێردەزمە. دووەم، هەموو ئەوانەی کە لایەنگری ئەم پێشکەوتنەی چین بوو، لایان وابوو کە بێگومان هەر چەندێك سامانی نیشتمانی چین زیاد بکات، ئەوا هێندەش دیموکراسی زیاد دەبێت. نموونەی ئەم هەڵبژاردنە ئازادانەی ئەم دواییە کە چاودێران بینیان لە هەندێك گوندی دوورە دەستی چین، بەم زووانە دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەکانی دیکە و دواتریش بۆ سەر ئاستی شارۆچکەکان و پاشانیش بۆ سەر ئاستی هەموو وڵات. هەروەها دەڵێن کە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان گەشەسەندنی ئابووریی سەربەخۆ و لەلایەك دەرکەوتنی چینی ڕاستەقینەی ناوەند و لەلایەکی تریش ئازادیی سیاسی و دیموکراسی. دوای ئەوەش، کاتێك چین زیاتر بەرەو دیموکراسییەت دەچێت، ئیدی ئاکامەکانی گریمانەی "دیموکراسی ئاشتییانە" دەردەکەون، بەم جۆرەش چین بەدوور دەبێت لە پێشبڕکێ لەگەڵ هەیمەنەی هەرێمی و جیهانی و هەروەها جیهانیش بەدوور دەبێت لە "تەڵەی ثیوسیدیدز"، هەروەها ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکانیش پاشەکشە دەکەن[1].

بەڵام لە بنەڕەتدا هەر دوو بۆچوون هەڵە بوون. یەکەم لە سەر ئاستی ئابووریدا، دوای ئەوەی چین چووە نێو ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی. ئەوەبوو چین ڕێك پێچەوانەی ئەم شتەی کرد کە پێشبینیکراو بوو. لەجیاتی پابەندبوون بە پێوەرەکانی ئێستا، کەچی چین هەڵسا بە یاریکردن لە ڕێکخراوەکە، بە جۆرێك هەڵسا بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی بازرگانی لە فۆڕمی سەربەخۆدا.

دووەم لەسەر ئاستی جیهانیشدا، چین دەستی بە دزینی بیرۆکەکان کرد. بەوەی کە تەکنۆلۆژیای وەبەرهێنەرانی بیانی برد و لە دژی وەستایەوە.

(١) تەڵەی ثیوسیدیدز، زاراوەیەکە کاتێك بەکاردێت کە وڵاتێکی زلهێز ڕووبەڕووی وڵاتێکی ڕاپەڕیو ببێتەوە.

هەروەها تێوەگلان لە "قەرزی دیبلۆماسی"[1] لە ڕێگەی ئامرازگەلێکی وەك "دەستپێشخەریی پشتێنە و ڕێگا"[2]؛ پاشان بەردەوامیش بوو لە کارگێڕیی ئابووری ناوخۆی بە ڕێگەی ستەم و زۆرداری. دەبێ ئەوەش بگوترێت کە ئەمریکا ئامانجی سەرەکیی ئەم سیاسەتەی چین بوو، هەروەها ئەورووپا و ژاپۆن و تەنانەت هەموو وڵاتە دیموکراتییە پیشەسازییەکانیش. ئەمە جگە لەو وڵاتانەی کە هیچ کام لەوانەی پێشوو نەبوون، بەڵام تاوەکو ئێستاش هەر قوربانیی ئەم سیاسەتەن. لەگەڵ ئەوەشدا، چین هەوڵی داوە کە سوودە سیاسی - سەربازییەکان لە چالاکییە ئابوورییەکانی دەست بخات کە کۆمەڵگاکانی بازاڕی ئازاد بەشێوەیەکی سادە هەستی پێ ناکات. بێگومان ئەمەشی لە ڕێگەی کۆمپانیاگەلێکی کەرتی تایبەت بەجێ هێناوە کە لە بنەڕەتدا ئەم کۆمپانیایانە ئامرازێکی سەربازی و هەواڵگری چینن، ئەمەش لە ڕێگەی تێکەڵکردنی هێزی مەدەنی و سەربازی بەیەکەوە و هەروەها تێوەگلان لە جەنگی ئەلیکترۆنی کە بەرژەوەندییە تایبەتەکانی کردووەتە ئامانج و زیاتر لەوەی نهێنییەکانی حکوومەت بکاتە ئامانج.

لەسەر ئاستی سیاسیش، چین لەجیاتی ئەوەی بەرەو دیموکراسی هەنگاو بنێت، ئەوەبوو لە دیموکراتیزەبوون دوورکەوتەوە. لە ڕوانگەی شیی جینگ پینگ، لە سەردەمی ماو تسی تونگ-ەوە، چین ئێستا خودان بەهێزترین سەرکردەیە و خاوەن بەهێزترین حکوومەتی ناوەندییە. ناکۆکییەکانی نێو حیزبی شیوعی بەڵگەیە لەسەر "خونچە سەوزەکان"[3]ی

(١) دیبلۆماسییەت لەسەر بنەمای قەرز، کاتێك بەکاردێت کە دوو وڵات لە پەیوەندیدابن لەسەر بنەمای قەرزپێدان لەلایەنی وڵاتێکەوە و ئەویی تر سوودی لێ دەبینێت، بەڵام ئاکامێکی نەرێنی هەیە و زۆرجاریش ئەم قەرزانە ڕاناگەیەنرێن.

(٢) "یەك پشتێنە و یەك ڕێگا"، یان "دەستپێشخەریی پشتێنە و ڕێگا"، ستراتیژییەتێکی نوێی چینە لەسەر بنەمای "ڕێگەی ئاوریشم" ی سەدەی نۆزدە داڕشتوو، بۆئەوەی وڵاتی چین بە جیهان ببەستێتەوە.

(٣) خونچە وەیان چرۆ سەوزەکان، زاراوەیەکە بەمەبەستی هەڵسانەوە و دووبارە

←

دیموکراسی. ئەگەر بەڵگەیەکی تری پێویست هەبێت لەوە زیاتر، ئەوا هاونیشتمانیانی هۆنگ کۆنگ بەخشیویانە، چوون ئەوان "یەك وڵات و دوو سیستەم" بە مەترسی دەبینن. نەژادەکانی هەریەك لە (ئۆیگۆر و تبتی)یەکان، هەروەها ئایینەکانی (کاسۆلیك و فالۆن گۆنگ) تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە. دواجاریش ڕێوشوێنەکانی پەکین بۆ بەکارخستنی "دەستەبەری کۆمەڵایەتی" بۆ هاووڵاتیانی لە سەرانسەری چین، دەبێتە هۆی داهاتوویەکی ترسناك، کە زۆر بە ئاستەم لە ڕوانگەی ئەمریکییەکانەوە بە ئازادی دەردەکەوێت.

بەدرێژایی ئەم کاتانە، هەروەك پێشتریش چەندین جار لە گوتار و نووسینەکانم دووبارەم کردووەتەوە بەر لەوەی بچمە نێو ئیدارەکەی ترەمپ، کە هێزی سەربازیی چین زۆر فراوان بووە، بە جۆرێك کە توانیویەتی: باشترین بەرنامەی هێرشی ئەلیکترۆنی دروست بکات بۆ هێرشکردنە سەر جیهان؛ بنیاتنانی هێزی سەربازی دەریایی-شین بۆ یەکەم جار لەوەتەی پێنج سەد ساڵدا؛ زیادکردنی چەکی ئەتۆمی و مووشەکی بالیستی، لەگەڵ هەبوونی بەرنامەیەکی ڕژد بۆ ئەو مووشەکانەی کە لەژێر دەریاییەکانەوە دەیهاوێژێت و هێزی ئەتۆمی؛ هەروەها پەرەپێدانی چەکی دژە-مانگی دەستکرد، ئەمەش بۆ کوێرکردن و ڕێگرتن لە هێزی بۆشایی ئەمریکی؛ دروستکردنی چەکی "دژە-گەیشتن" و هەروەك قەدەغەکردنی هێزەکانمان تاوەکو لە کەناراوەکانی ئاسیا بکشێنەوە؛ چاکسازی و نوێسازی لە سوپای ئاسایيدا و... چەندانی تریش. من ساڵانێکە سەیری پێشکەوتنەکانی چین دەکەم و وادەبینم کە هەموو ئەوانە هەڕەشەن لەسەر ستراتیژیەتی قووڵی ئەمریکا، هەروەها هەڕەشەن بۆ دۆست و هاوپەیمانەکانیشمان لە سەرانسەری جیهان دا. دەبێ بگوترێت کە

---

پێگرتنەوەی ئابووری دوای داڕووخانە ئابوورییەکان بەکاردێت.

ئیـــدارەكەی ئۆبامـــا دەستەوەســـتان بـــوو لەم شـــتانە و هەر تەنهـــا وەك سەیركەرێك تەماشای ئەمانەی كردبوو.

ئەمریكا زۆر هێواش بوو لە وریابوونەوە و ڕاستكردنەوەی ئەو هەڵانەی كە چەندین دەیەیە بەردەوام ئەنجامیان دەدات. ئێمە بەدەسـت چەنـدین زیـانی ئابووری و سیاسی گەورەوە ناڵاندوومانە، بەڵام خۆشبەختانە هێشتا یارییەكە كۆتایی نەهاتووە. هەر لەگەڵ زانینی ئەوەی كە چین ئیتر بەپێـی یاسـاكانی "ئێمە" نەجـوولاوەتەوە و لەوەش ناچێـت كە نیـازی ئەوەی هەبێـت بەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان وابكات، بۆیە جێگەی ئاماژەیە كە بڵێـین هێشـتاش ئـێمە دەتـوانین زۆر كـاریگەرانە وەڵامیـان بـدەینەوە. بـۆ ئەنجامـدانی ئەمەش، سەرەتا پێویستە ئەمریكییەكان ئەو ئاڵنگارییە ببینن كە چین بەدەستیەوەیەتی و هەروەهـا لە كـاتی گونجاویشـدا وەڵامیـان هەبێـت. ئەگەر ئەم شـتەش ڕووی دا، ئەوا نـیگەران مەبـن. هەروەك ئەدمیراڵـی ژاپـۆنی ئیزوروكـو یاماموتو لە دوای هێرشەكەی پێرڵ هاربەر دەڵێت "دەترسـم هەمـوو ئەوەی كە كردمان، تەنها بەئاگاهێنانەوەی زەبەلاحێكی خەوتوو بێت و تژی بێـت لە چارەسەرێكی ترسناك".

ترەمپ هەندێكجار لەم نیگەرانییەی ئەمریكـا دەگـات سـەبارەت بە چـین. هەروەها ئەو ڕاستییە بەرز دەنرخێنێت كە هێزی سیاسی-سەربازی بەنـدە بە ئابوورییەكی بەهێز. هەرچەندێك ئابووری بەهێز بێت، ئەوا كۆنترۆڵی زیاتر دەبێـــت لەســـەر بـــوودجەی ســـەربازی و هەواڵگـــری بـــۆ پاراســـتنی بەرژەوەندییەكانی ئەمریكا لە سەرانسەری جیهان و هەروەها بۆ كێبـڕكێش لەگەڵ زۆرێـك لە هەیـمەنەی ناوچەكـان. زۆرجـار ترەمـپ دەیگـوت كە وەسـتاندنی ئەم گەشەسـەندنە ئـابوورییەی چـین لەسـەر حیسـابی ئەمریكـا باشـترین ڕێـگەیە بـۆ زاڵبـوون بەسـەر هێـزی سـەربازیی چـین، ئەوەش بەشێوەیەكی سەرەكی ڕاستە. ئەم ڕاوبۆچوونەش واشنتۆنی دابەش كردووە بەسەر چەندین بەرەی جیاوازدا، بەڵام دوای ڕوونبـوونەوە و تێگەیشـتن لە

هەڕەشەکانی چین، پرسیارەکە ئەوەیە کە ئاخۆ ترەمپ دەربارەی ئەمە چی دەکات؟! لەم ڕووەوەش ڕاوێژکارانی ترەمپ بەسەر چەندین بیرۆکەدا دابەش بووینە. بۆ نموونە ئیدارەکەی ترەمپ کەسانێکی لەخۆ گرتووە کە بە ئاوێزانی پانداکان[1] ناسراون، وەکو منوشن، کە جەخت لەسەر بازرگانیی ئازاد دەکاتەوە، هەروەها کیڤین هاسیت، سەرۆکی دەستەی ڕاوێژکارانی ئابووری؛ هەروەها کودلۆ و هەروەها هەڵۆکانی چین[2]، وەکو ڕۆز، لایتهایزر، ناڤارۆ.

من ڕۆڵێکی زۆر نەزۆکانەم هەبوو: چوون دەمویست سیاسەتی بازرگانیی چین لەنێو چوارچێوەیەکی ستراتیژیی فراوان ڕێکبخەم. ئێمە دروشمێکمان هەبوو، دروشمێکی نوێ کە بانگەشەی بۆ ناوچەیەکی "ئازاد و کراوەی هیندی-هێمن دەکرد (بەداخەوە ئەمە کورت کرابوویەوە بۆ وشەی "فۆیپ"[3]). لە ڕوانگەیەکی ترەوە، مانای وایە کە شتێکی گرنگە ژینگەی ستراتیژیەتەکە فراوانتر بکرێت بە جۆرێك باکوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بگرێتەوە، ئەمەش مانای وایە کە هەموو شتێك لە دەوری چین ناخولێتەوە. بەڵام ئەوەی هەیە هیچ ستراتیژیەت نییە و لەم ڕووەوەش هەوڵمان داوە سەبارەت بە پرسی بازرگانی، لەنێو کونی ڕەشی چین دەربچین، کە چەندین جار ئەم شتە ڕوویداوە. ئەمەش بە شێوەیەکی پوخت، ئەو شوێنەیە کە لە داهاتوودا بۆی دەچین.

---

لەوکاتەی من چوومە نێو کۆشکی سپی، گفتوگۆیە بازرگانییەکان بە

---

(١) ئەوانەی پاندا لەباوەش دەگرن، زاراوەیەکە بەرامبەر هەر چالاکوان یان کەسێکی سیاسیی فەرمی بەکاردێت، کە پشتگیری لە وڵاتی "چین"ی کۆمۆنیست بکات.
(٢) هەر بەرپرسێك کە پشتگیری لە سیاسەتی نەیارانە بکات بەتایبەت لە پرسی سیاسەتی دەرەوەدا، بە هەڵۆی چین ناوزەند دەکرێت.
(٣) یاسای ئازادیی زانیارییەکان و پاراستنی تایبەتمەندێتی.

هەموو جۆرەکانییەوە لەگەڵ چیندا هەندێك کات بەردەوامی هەبوو. ترەمپ لە کورتهێنان لە بوودجە نزیك ببووە، وەکو ئەوەی سەرنجی دابێتە بوودجەی کۆمپانیاکان: بۆیە کورتهێنان لە بوودجە واتە ئێمە زیانمان پێ دەگات و زیادبوونییش واتە ئێمە سەردەکەوین. باجی گومرك دەبووە هۆی کەمکردنەوەی هێنانی شتومەك لە دەرەوە و زیادبوونی داهاتی حکوومەت، کە ئەمەش لە پێچەوانەکەی باشتر بوو. بازرگانە ئازادەکان، کە منیش پێشووتر یەکێك بووم لەوان، بەدرێژایی ئەوکاتەی لەگەڵ ترەمپ بووم و دوای ئەو کاتەش، گاڵتەمان بەم جۆرە گفتوگۆیانە دەهات. لەگەڵ ئەوەشدا، کەمهێنان لە بازرگانیدا دەرخەری چەندین کێشەی ترە، بۆ نموونە ئەو سوودە گەورە و زەبەلاحەی کە چین لە دزینی بیرۆکەکان پێی دەگات و وای لێ کردووە زۆر لەم کۆمپانیایانە زیاتر دەست بهێنێ کە خاوەنی بیرۆکە ڕەسەنەکەن. ئەوەی کێشەکەی ئاڵۆزتر کرد ئەوەبوو کە پەکین پشتگیریی کۆمپانیاکانی کرد تاوەکو نرخەکانیان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دابەزێنن. ئەمەش بووە هۆی دابەزینی گەورە لە دروستکراوەکانی ئەمریکا و وای کرد کە ئەم شتانە بە تێچووی کەمتر لە چین و وڵاتانی تری تازە پێگەیشتوو بەرهەم بهێنرێت. بۆیە کەمهێنانی بازرگانی بووە هۆی کێشەی تر، نەوەك هەر کێشە لە خودی خۆی، بۆیە ئەمەش پێویستە زیاتر گرنگی پێ بدرێت، ئینجا ئاخۆ ترەمپ بەتەواوی لەمە دەگات یان نا.

لەمیانەی ئەو وەفدە بازرگانییانەی کە دەچوون بۆ پەکین و هەروەها ئەوانەی لە چینەوە دەهاتن بۆ واشتن، ئەوەبوو ڕۆژ لە ناوەڕاستی مانگی نیسان پەیوەندی پێوە کردم، کە ئەوکات دووەم هەفتەم بوو لەوەتەی چووبوومە نێو ئیدارەکەی ترەمپەوە، ئەم پەیوەندییەش بۆ قسەکردن بوو سەبارەت بە ZTE کە کۆمپانیای مۆبایل بوو لە چین. ZTE پێشێلی سزاکانی ئێمەی کردبوو بۆ هەردوو وڵاتی ئێران و کۆریای باکوور،

ئەوەبوو بە سەرکەوتوویی درایە دادگا و بەپێی یاسا دەبوو بەڕێوەبردن و مامەڵەی خۆی چاك بکات. یەکێك لە سەرپەرشتیارانی دۆسیەکە لە دادگا ڕایگەیاند کە پێشێلکارییەکان لەسەر ئاستێکی فراواندان، ئەمەش وا دەکات سزای زیاتریش بەسەر کۆمپانیاکە بسەپێنرێت و ئەمە جگەلەوەی کە دەکرێت ZTE لە نێو ئەمریکادا قەدەغە بکرێت، ئەمەش ڕێك ئەو شتە بوو کە ڕۆز دەیویست بیکات. من وەك کاری بازرگانی لەم دۆسیەیەم نەدەڕوانی، بەڵکو زیاتر وەکو سەپاندنی یاسا سەیرم دەکرد. چوون ئەگەر ZTE کۆمپانیایەکی ئەمریکی بوایە، ئەوا زیاتر پێداگریمان لەسەر دەکرد. بۆیە هیچ هۆیەکم نەدەبینی لەوەی کە پاشەکشە بکەین لە بڕیارەکە هەر تەنها لەبەرەئەوەی کە ZTE چینییە. لەگەڵ ئەوەشدا، وەزارەتی دەرەوە زۆر نیگەران بوو لە هەمبەر مامەڵەی خراپ بەرامبەر چین، هەربۆیە ڕۆز پەیوەندی کردبوو بۆ ئەوەی بزانرێت چ هەنگاوێك بنرێت باشە، بۆ ڕۆژی دواتر لە ڕاگەیەنراو و ڕوونکردنەوەی وەزارەتی دەرەوە. منیش پێم گوت کە بەردەوام بە، ئەویش هەر ئەوەی کرد.

هەر چۆنێك بێت، دوای چەند هەفتەیەك ترەمپ ڕەزامەند نەبوو بەرامبەر ئەو سزا گەورانەی کە ڕۆز پێشنیاری کردبوو، بەڵکو دەیویست دەستکاری بکرێن، بەڵام منوشن هەر زوو لەسەری ڕازی بوو. من هەستم بە مەترسییەکی گەورە کرد، لەوەی کە ئەم شتەی ڕۆز بە چینی گوتبوو هەڵبوەشێتەوە، چونکە ترەمپ داوای نرخێکی کەمتری دەکرد (کە دواتر هەر زوو زانیم، ئەمە پرۆسیجەرێکی ستانداردی ترەمپ بوو) هەروەها ئەمە لێخۆشبوون بوو بەرامبەر بە مامەڵە تاوانکارییەکانی ZTE .

لەگەڵ ئەوەشدا، ترەمپ بەر لە چەند کاتژمێرێك لە بڕیاری پاشەکشەی ڕێککەوتنی ئەتۆمی لەگەڵ ئێران بڕیاری دا کە پەیوەندی بە شیی جینگ پینگ بکات. ترەمپ بە سکاڵای لە مامەڵە بازرگانییەکانی چینەوە دەستی پێ کرد بەوەی نادادپەروەرانەیە و گوتی کە چین پێویستە کەلوپەلی

زیاتری کشتوکاڵی لە ئەمریکا بکڕێت. شیی جینگ پینگ سەرەتا باسی دۆسیەی ZTE ی کرد و ترەمپیش گوتی کە کاردانەوەکانمان زۆر گەورە و قورس دەبێت. بەڵام گوتیشی کە ئەو داوای لە ڕۆز کردووە شتێك بۆ چین بکات. ئەوەبوو شیی جینگ پینگ گوتی ئەگەر شتێکی وا بکەن، ئەوا ئەو چاکەیەك قەرزاری ترەمپ دەبێت و ترەمپیش گوتی کە لەبەر خاتری ئەو ئەم شتە دەکات. بەڕاستی من لە سروشتی ئەم قسانەی هەردوولا سەرم سوڕما، دواتر ڕۆز پێی گوتم کە خەریك بوو بەتەواوەتی ZTE خاپوور بکەن بەم سزایانەوە. بەڵام پێچەوانەکردنەوەی بڕیارەکە شتێك بوو لێکدانەوەی بۆ ناکرێت. ئەمە سیاسەتێك بوو کە بە هەواوهەوەس بوو. ئەم سیاسەتی هەواوهەوەسەش بەردەوام بوو تاوەکو ڕۆژی یەکشەممە ١٣ی مانگی ئایار، کاتێك ترەمپ تویتی کرد:

من و سەرۆکی چین بەیەکەوە کار دەکەین، تاوەکو دەرچەیەك بدۆزینەوە بۆئەوەی کۆمپانیای گەورەی مۆبایلZTE بە خێرایی بگەڕێتەوە بۆ سەر بازرگانی. زۆرێك کارەکانیان لە چین لەدەست داوە. وەزارەتی بازرگانی ڕاسپێردراوە ئەم کارە بکات!

باشە، ئێمە لە کەیەوە خەمی ئەو خەڵکانەمانە کە لە چین کاریان لەدەست داوە؟!

ڕۆژی دووشەممە، بیستم کە ناڤارۆ دەیەوێت خەڵکانێکی جۆراوجۆر ببات بۆ ئۆڤاڵ تاوەکو بە ترەمپ بڵێن کە چەندە بیرۆکەیەکی خراپە گەر بیەوێت لە سزادانی ZTE پەشیمان بێتەوە. لەلایەنی جەوهەریدا من بەشێوەیەکی ڕوون ڕەزامەند بووم، ئەگەرچی ئەمە جۆرێك لە ئاژاوە بوو لەنێو سیاسەتدا. بەڵام ئەفسووس ئەمە ئەو ڕێگایە بوو کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لەنێو کۆشکی سپیدا لە دۆسیەی بازرگانی مامەڵەی پێ دەکرا. من هەوڵم دا لە ڕێگەی ڕێکخستنەوەی لیژنەکان سیستەم بگەڕێنمەوە و لەم

ئاژاوەیە دەربچین. بەڵام دیسانەوە هەستم کرد کە بەڕێوەبەرایەتییەکان و وەکالەکانی ئابووری تووڕەن لەوەی کە لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە بەم جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، بەوەی ئاماژەیان بەوە دەدا کە لەوەو پێش بەدەگمەن شتی لەم جۆرە ڕووی داوە. بێگومان ئەوانە پێیان باشترە چانسی خۆیان لە یاریی ڕۆڵێت تاقی بکەنەوە نەوەك ئەوەی کە بێنە نێو سیستەمێکی ڕێکخراو. هەروەها دەبێ بگوترێ کە ئابووریی نیودەوڵەتیش ڕێکخراو و بەسیستەمکراو نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئەستەم بوو بەبێ ڕەنجێکی زۆر بتوانن ئەم شتە بکەن، تەنها سەرۆك نەبێت کە ڕەزامەند بوو لەسەر کردنی ئەمە.

لە ڕاستیدا، ئەو هەنگاوەی کە ترەمپ لای دروست بوو، ئەوەبوو کە دەستەی بچووك بچووك لە خەڵکی بەیەکەوە کۆبکرێنەوە، ئینجا لە ئۆڤاڵ بێت یان لە ژووری ڕووزڤێلت، تاوەکو ئەم باسە پڕمشتومڕانە تاوتوێ بکەن. ئینجا دووبارە و چەندبارە، هەمان ئەو کێشانە بۆ چەندین جار هەر بەبێ چارەسەر دەمانەوە و هەندێك جاریش خراپتر لە چارەسەر. لە ڕۆژێکدا تەنها یەك ئەنجام وەدەست دەهات و دوای چەند ڕۆژێکیش ئەنجامی پێچەوانە. هەموو ئەو شتانە مایەی سەرئێشە بوون. تەنانەت ئەو کاتانەش کە ڕەزامەندییەك لەبارەی شتێکەوە لەئارادا بوو، نەدەبووە بنەمایەك بۆئەوەی لەمیانەیدا بتوانین سیاسەتێکی فراوانتر دابڕێژین. بۆ نموونە ئابوورییەکانی هاسیت چەند مۆدێلێکیان داهێنا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ باجی گومرك ئەگەر هاتوو بازرگانیی ئازاد نەما. زانیارییەکانی ئەو وایان نیشان دەدا باجی گومرگ کە نزیکەی ٥٠ ملیار دۆلار بوو لە کەلوپەلی هاتوو لە چینەوە بۆ ئەمریکا و لایتهایزر خەریکی بوو، ئەوا سوودی بۆ ئەمریکا هەبوو. ترەمپ گوێبیستی ئەوەبوو و گوتی: "لەبەر ئەوەیە کە دەیانەوێت دانوستان بکرێت". ئینجا مەسەلەی ئەوەی ئاخۆ چین لە مامەڵەکەدا فێڵی دەکرد، ئەوا باسێکی تر بوو بۆ قسە لەسەرکردن، چوون ناڤارۆ جەختی لەسەر ئەوە کردبوویەوە کە پەکین وا دەکات و

لەلایەکی تریش منوشن پێچەوانەکەی لا ڕاست بوو. من هەوڵم دا سیستەمێکی ڕێك لەم بوارەشدا دابڕێژم، ئەمەش بە هەماهەنگی لەگەڵ ئەنجوومەنی ئابووریی نیشتمانی، بەڵام هەمدیسان ئەوەش شکستی هێنا. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، ترەمپ ڕاوبۆچوونی خۆی نەشاردەوە (کە لەلایەن چاك شومرەوە هاوبەشیی کرابوو) بەوەی کە چین فێڵ لەم مامەڵانەدا دەکات، ئەوەبوو لە ناوەندی مانگی تشرینی دووەم منوشن گوتی کە "من بەر لە دوو مانگ لەگەڵ تۆدا بووم و لە شرۆڤەکانت زۆر ڕەزامەند بووم، بەڵام ئێستا لەگەڵ ڕاوبۆچوونی تۆدا نیم"، بەم جۆرە چەندین جار ئەمەی دووپاتی کردەوە.

ئیدی لە سەرەتای چوونم بۆ نێو ئیدارەکە جۆرێك لە ناکۆکی دروست بوو، چوون منوشن خۆی خزاندبووە نێو دانوستانەکان سەبارەت بە بازرگانی، ئەگەرچیش کە ڕۆڵی بەرپرسی گەنجینە لە پێشوو بچووکتر بوو لەوەی کە ببێت بە نوێنەری بازرگانیی ئەمریکا یان وەزیری بازرگانی. ئەمەش نەك هەر تەنها لەبەر ئەوەی کە ڕۆڵی منوشن لە بنەڕەتدا ئەوەنەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە بەرنامەی ئەو بۆ پشتگیری لە چین لە بەرامبەر ڕێککەوتنێك زۆر مەترسیدار بوو. بەدرێژایی کات تەنانەت ترەمپیش هەستی بەمە کرد، لە یەکێك لە دانیشتنەکانمان لە ژووری ڕووزڤێڵت لە ٢٢ی مانگی ئایار، ترەمپ بەسەر منوشندا هاواری کرد "مەبە بە دانوستکاری بازرگانی، هەر تەنها دوای دراوی بیتکۆین بکەوە (بۆ فێڵکردن)" منوشن گوتی: "ئەگەر منت وەکو دانوستکارێکی بازرگانی ناوێت، ئەوا ئاساییە، تیمەکەت چیت بوێت ئەوەت بۆ دەکەن". ئەمە مانای ئەوە نادات کە پێویستە نوێنەری بازرگانی ئەمریکا دەبێت دەست بە مامەڵە ئاساییەکانی خۆی بکاتەوە، چوون ترەمپ بە هەمان شێوە ڕەخنەی لە لایتهایزریش گرتبوو بەوەی کە "تا ئێستا تەنانەت یەك ڕێککەوتنیشت ئەنجام نەداوە!".

بەڵام ئەم پرۆسەیە مانای چی دەگەیەنێت، لە کاتێکدا ترەمپ بە دڵی

خۆی لە ١٤ی مانگی ئایار تویتێکی کرد:

ZTEی گەورە کۆمپانیای مۆبایلی چین، بەشێکی زۆری بەشە تاکەکانی کۆمپانیا ئەمریکییەکان دەکڕێت، ئەمەش ئەم ڕێککەوتنە پێچەوانە دەکاتەوە کە خەریککە لەگەڵ چین دانوستانی لەبارەیەوە دەکەین، هەروەك کاریگەریشی لەسەر پەیوەندییە کەسێتییەکانی نێوان من و سەرۆك "شی دەبێت.

ئەم هەموو شتە چی بوو؟ لەوەش خراپتر ئەوەبوو کە بەستنەوەی ئەم ڕێککەوتنە بوو بە مەسەلەی جێبەجێکردنی یاسا بەناوی ڕێککەوتنی بازرگانی، ئەمە جگە لە پەیوەندییە کەسێتییەکانی نێوان ترەمپ و شی. سەبارەت بە شی، ئەوا هیچ پەیوەندییەکی کەسێتی نابێت ببێت بە ڕێگر لەبەردەم بەرژەوەندییەکانی چین، هەروەك چۆن پەیوەندییە کەسێتییەکانیش بۆ پوتین نەبوونەتە ڕێگر لەبەردەم بەرژەوەندییەکانی ڕووسیا. باوەڕ ناکەم ترەمپ زۆر بەباشی لەم خاڵە گەیشتبێت. لێرەدا وەك دەبینین هەموو شتەکان سەبارەت بە ترەمپ و شی بوون، بۆیە لە چەندین کۆبوونەوەی تردا ئەو شکستی هێنا لەوەی کە پەیوەندییەکان لە کاری فەرمی جیابکاتەوە.

لە ١٦ی مانگی ئایاردا، جارێکی تر ترەمپ گوتی کە "واشنتۆن پۆست و سی ئێن ئێن هەواڵی ساختە لەبارەی ڕێککەوتنەکانمان لە بەرامبەر چین بڵاودەکەنەوە. هیچ شتێك جگە لە ڕێککەوتنی زۆر گەورەتر لەگەڵ ZTEدا نەکراوە. پێشتر وڵاتەکەمان ساڵانە چەندین ملیار دۆلاری زیانی پێدەگەیشت بەرامبەر چین ...". جێگەی ئاماژەیە کە ئەم بەیەکبەستنەوە بەردەوامەی نێوان ZTE و مەسەلەی بازرگانییەکان بەگشتی زۆر شتێکی بێزارکەر بوو، نەوەك هەر تەنها بۆ بازرگانی، بەڵکو بۆ دادگاش، چوون دادگا تاوەکو ئەوکاتەش هەر چاودێری ZTEی دەکرد. بێگومان ئەوکاتە

ترەمپ بەدەگمەن قسەی بۆ دانیشتنەکانی داواکاری گشتی دەکرد، ئەوە باسی ئامۆژگارییەکانی هەر مەکە. ئەوەی ترەمپ دەیوست یەك ملیار دۆلار بوو لە کۆمپانیای ZTE، ئەگەرچی ئەمە بڕێکی زۆر بوو، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ داخستنی تەواوەتی ZTE گۆڕانێکی زۆر گەورە بوو. هەروەها ئەم بڕەی کە ZTEی وەکو پێبژاردنی سەرپێچی دای زۆر لەوە کەمتر بوو. ئەم ڕێککەوتنەی کە ڕۆژ ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی لەژێر گوشاری ئۆڤاڵ، دواجار لە مانگی حوزەیران ڕاگەیەندرا. لەلایەنی تیۆرییەوە ئەمە وا دەکات کە ZTE خاوەن ئەنجوومەنێکی بەڕێوەبردنی سەربەخۆ بێت و هەروەها بە بەردەوامیش چاودێری بکرێت. بە گوتەی چاودێران بێت، ترەمپ نەك هەر تەنها چانسێکی تری بەخشی بە ZTE، بەڵکو وەك ئەوە وابوو کە بۆندێکی بەدرێژایی ژیان پێشکەشی کردبێت. ئەی لە بەرامبەر ئەوەدا چی ڕووی دا؟! ئەمە پرسیارێکی زۆر باشە.

---

لەلایەکی تر، ترەمپ پێی وابوو کە ڕوانگەی ئەو بەرامبەر چین دەبێتە هۆی کاریگەریی لەسەر هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس بۆساڵی ۲۰۱۸، لەوەش گرنگتر (بەلای ئەوەوە)، کە کار لەسەر دۆڕاندنی ئەو دەکات لە ساڵی ۲۰۲۰. ژیرییەکی زۆر لە هەر دوو پێشنیاردا هەبوو، لەبەر هۆکارێکی دیار ئەویش ئەگەر هاتوو سەیری ئەو زیادەیە بکەیت کە لە سەردەمی دەسەڵاتی ترەمپدا لە بواری سەربازیدا خەرج دەکرێت و هەروەها شەڕی بازرگانییش، لە گوتارەکانماندا باسی دەستتێوەردانی دەرەکیمان کردبوو لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا، بەشێوەیەکی دروست ئاماژەمان بۆ هەریەك لە ڕووسیا و چین کرد. چین دەیویست سوود لە بۆچوونەکانی ترەمپ ببینێت بۆ سوود و بەرژەوەندیی ئابووری، بە هیوای ئەوەی ئێمە بخاتە نێو "ڕێککەوتنگەلێکی ئابووری" کە کێشە و مەسەلە هەیکەلییەکانی نێوانمان چارەسەر نەکات، کە لە ڕاستیدا ئەمە کێشە سەرەکییەکە بوو بۆ ناکۆکییە

ئابووری و سیاسییەکانی نێوانمان. پەکین دەیویست بزانێت کە ڕادەی ناکۆکییەکانی ڕاوێژکارانی ترەمپ چەندێکە لە چین، چوون ئەوان دەیانتوانی هەر لە میدیای گشتیدا ئەمە بزانن.

ئێمە چاودێریی ئەو هەوڵ و ماندوبوونانەمان کرد کە پەیوەست بوون بە هەڵبژاردنەکان لە چین، وەك بەشێك لە یەکێك لە گەورەترین پرۆسە کاریگەرەکان کە تائێستا ئەنجام درابێت، ئەمەش زۆر لەوە گەورەتر بوو کە دیموکراتەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ساڵی ٢٠١٦ بانگەشەیان بۆ دەکرد. ئەگەر هاتوو لە ڕوانگەیەکی نا-حیزبییەوە سەیری ئەم باسە بکەین. دەبینین کە چین دەتوانێت سەرچاوەی زیاتر دەستەبەر بکات تاوەکو لە ڕووسیاش زیاتر کاریگەری هەبێت. ئەمەش کارێکی ڕژد بوو، هەروەها پێویستی بە وەڵامێکی ڕژدیش هەبوو. یەکێك لە وەڵامەکان بریتی بوو لە لابردنی قەدەغەی ڕاپۆرت و بەڵگەنامەی نهێنیی فەرمانڕەوایی و ڕێگەدان بە گەل بۆ بینینیان، ئەمەش بەشێوەیەکی وریا و ئاگادار جێبەجێ کرا. بەتایبەتیش بۆ هەڕەشەنەکردن لە سەرچاوەی هەواڵگرییەکە، بەڵام بەهۆی ئەوەوە دەمانتوانی لەبەردەم گەلی ئەمریکی بوەستین سەبارەت بەوەی کە تاوانباریان دەکردین. ترەمپ کاتێك لە مانگی ئەیلوولی ٢٠١٨ لەبەردەم ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی گوتاری دا، ئاماژەی بە هەوڵەکانی چین دا، بەڵام ئەمە زۆر کەم بایەخی پێ درا. پێنس لە پەیمانگای هەدسۆن گوتارێکی دا سەبارەت بە سروشتی کاری جێبەجێکردن لە چین، لە گوتارەکەیدا هەموو ئەو زانیارییانەی بەکار برد کە بەشێوەیەکی نهێنی بەرزکرابوونەوە و هەروەها ژمارەیەکی تریش لە زانیاریی گشتی. ئەم دارشتەیە بژاردەی قورسی لەخۆ گرتبوو، چونکە ئەمە ڕوون بوو کە ترەمپ نەیدەویست جێگری سەرۆك هیچ شتێك بڵێت کە ببێتە هۆی تێکدانی پەیوەندییە بەنرخەکانی لەگەڵ سەرۆك شی. بەپێچەوانەوە ئەو ئامادەبوو کە پەکین بەکار بهێنێت، چونکە وای دەبینی کە هەوڵەکانی ئەو

دەکەنە ئامانج. لە دانیشتنێکی تایبەتدا، ترەمپ گوتی کە چین و ڕووسیا هەڕەشەن، من خۆزگەم دەخواست کە ڕاگەیاندنەکان گوێبیستی ئەمە بوان. ئەو زۆر لای گرنگ بوو کە بەر لە ڕۆژێك لە ڕادەستکردنی ڕاگەیەنراوەکە، توانیمان تەواوی بکەین، ئەوەبوو من و پێنس و ئایەرز لە ژوورە بچووکەکەی خواردن لەگەڵ ترەمپ دانیشتبووین، دێڕ بە دێڕ بۆمان خوێندەوە. بە کورتی ترەمپ هەر شتێك کە پێنس گوتبای و ڕەزامەند بووا لەسەری، ئەویش ڕەزامەند دەبوو. ڕۆژی دواتر، ئێمە هەموو دڵخۆش بووین لە بەرامبەر ڕاگەیاندنەکاندا. پێنس بە من و ئایەرزی گوت کە "ئەمە دیارترین و ئازایەنەترین گوتارە تا ئێستا درابێت"، منیش پێم وابوو کە ڕاست دەکات. دواتر کاتێك باسی پرێسکۆنفرانسەکەمان دەکرد لەگەڵ ترەمپ، ئەو بە ئاشکرا گوتی کە "سەرۆکەکانی تر لایان گونجاو نەبوو باسی پارە بکەن، بەڵام من دەزانم کە چۆن باسی بکەم".

لەگەڵ نزیکبوونەوەی هەڵبژاردنەکانی تشرینی دووەم، لەلایەنی بازرگانییەوە تەنها چەند پێشڤەچوونێکی بچووك هەبوو، ئەوەبوو سەرنجەکان هەمووی لەسەر لووتکەی (کۆمەڵەی بیست) G20 بوون لە بۆینس ئایرێس کە لە کۆتایی مانگ دەبەسترا، لەوێدا ترەمپ و شیی دەیانتوانی کۆببنەوە. ترەمپ ئەم کۆبوونەوە و یەکدیتنەی وەکو کۆبوونەوەی خەونەکانی دانابوو، کە تیایدا دوو کەسایەتی زۆر گەورە کۆدەبنەوە و ئەوروپا وەلادەنێن و ڕێککەوتنی گەورە دەکەن. بەڵام ئایا لێرەدا چ هەڵەیەك ڕوودەدات؟! لە ڕوانگەی لایتهایزرەوە، هەڵەیەکی زۆر ڕوودەدات. ئەو زۆر نیگەرانی ئەم برە بوو کە ترەمپ بەبێ هیچ مەرجێك دەیدرکێنی. بۆ ڕۆژی دوای هەڵبژاردنەکان، لە واشنتۆن چاوم بە یانگ جیتش، ئەندامی ئەنجوومەنی دەوڵەتی چین کەوت، تاوەکو بەر لە گرێدانی لووتکەی کۆمەڵەی بیست زنجیرەیەك دانیشتن بکەین. لە ژووی پاسەوانەکان کۆبووینەوە کە جمە دەهات لە بەشداربووان، کۆشنەریشی تێدابوو، کە لەڕۆژی هەڵبژاردنەکان

پێی گوتم: "سەرۆك داوای لێ کردووم بەشداریی زیاترم هەبێت لە مەسەلە بازرگانییەکان لەگەڵ چیندا"، من دڵنیام بەم جۆرە چەندین خەڵکی پایەبەرز لە کێبڕکێدان بۆ ئەوەی بەشدار بن لە بازرگانی لەگەڵ چین.

هەروەك چۆن من ئەم جۆرە دانیشتنانەم لەگەڵ چەندین کەسی گرنگ لە چین کردووە، بەم جۆرەش سەرەتا یانگ بە وریاییەوە پەڕاوەکەی خوێندەوە، ئەو گوتی کە لووتکەی کۆمەڵەی بیست لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە لە پەیوەندییەکان. ئەوەبوو باسی ئەوەمان کرد کە چۆن کۆبوونەوەکە ڕێك بخرێت و بەشداری منیش سەبارەت بە ئاشتیی جیهانی پێشنیارێك بوو کە ترەمپ و شیی، دەبێت حەوت هاریکار یاوەریان بێت. هەروەها لە ١ی مانگی کانوونی یەکەم نانی ئێوارە بخۆن، لە کۆتاییشدا پاش چەندین قسە و گفتوگۆ هەر ئەوە ڕووی دا. مەسەلەی بازرگانی لە سەرووی هەموو شتێکەوە بوو، یانگ جەختی کردەوە کە چین ستراتیژیەتێکی پڕ متمانەی دەوێت، هەروەها هیچ نیازێکی ئەوەی نییە کە کێبڕکێی ئێمە بکات یان ببێتە جێگرەوەی ئەمریکا. ئەوان هیچ کێشە و بەرەنگارییەکیان نەدەویست، بەڵام قازانجی بردنەوە بەرامبەر بردنەوەیان دەویست. ئەم باسە هەر بەردەوام بوو، تاکە کێشە کە چارەمان کرد. مەسەلەی نان خواردنی ئێوارە بوو. ئەمەش شتێکە زۆر قورس بوو، لە بەرامبەر ئەو هەموو لایەنە ئەمریکییەی کە دەیانویست بیر لەم پرسیارە گەورە بکەنەوە.

ڕۆژی شەممەی ١ی مانگی کانوونی یەکەم بەخێرایی هات. لە بۆینس ئایرێس خواردنی ئێوارەی ترەمپ لەگەڵ شیی دوا شت بوو کە ترەمپ بیکات بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. لە کاتێکی درەنگی دوای نیوەڕۆ. ترەمپمان بینی تاوەکو بۆ دواجار پوختەی باسەکانی بۆ بەیان بکەین. منوشن بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵ لیو هیی بوو، لیو بەرپرسی گەورە سیاسەت و ئابووریی چین بوو، هەروەها گەورە دانوستکاری بازرگانیش بوو، کە

بەشێوەیەکی گشتی وەکو کەسی سێیەم لە سیستەمەکەی شیی هەژمار دەکرێت. لیو ئەو شتانەی خستە ڕوو کە چاوەڕوان دەکرا شیی لە کاتی خوانی ئێوارەدا بیخاتە بەرباس، لەوەی کە چۆن ڕێککەوتنی بازرگانی ڕێکبخرێت. منوشن بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوان گوتی دەبێت ترەمپ ئەمە قبووڵ بکات. ئەمە سەودایەکی سەخت و دژوارە. هەروەها بەڕوونی دیارنەبوو کە لایتهایزر چەندە بەشداری قسەکانی کرد، بەڵام دیاربوو کە ناڤارۆ بە هیچ شێوەیەك هیچی نەگوت، ئیتر لێرەوە یارییەکە دەستی پێ کرد. (ڕووسیا و کۆریای باکووریش بە هەمان شێوە لە خشتەی چاوپێکەوتنەکان بوو لە کاتی خوانی ئێوارە؛ ئەوەبوو بە هیچ شێوەیەك نەگەیشتینە سەر باسی ڕووسیا، هەروەها هەر تەنها دوو خولەك باسی کۆریای باکوور کرا. من لە زۆر لایەنەوە هەستم بە ئاسوودەگی کرد).

لایتهایزر گوتی کە پێی وایە "ڕێککەوتنی بازرگانی ئازاد" لەگەڵ چین وەکو خۆکوشتن وایە، بەڵام منوشن زۆر بەکەیف بوو بەهۆی ئەوەی سەرکەوتوو ببوو لەوەی بگاتە ڕێککەوتن لەگەڵ چین، تاوەکو زیاتر بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و کانزاییەکان ڕەوانە بکات، وەکو ئەوەی کە ئێمە سێیەم وڵات بین لە ئاستی جیهان لە هەناردەکردنی کەلوپەل بۆ ناوچەی فەرمانڕەوایی ناوەڕاست.

من گوتم لام وانییە کە هیچ کامێك لەم ژمارانەی خراونەتەڕوو کێشە ڕاستەقینەکە بن. ئەمە لە ڕاستیدا گفتوگۆی بازرگانی نەبوو، بەڵکو کێشەی نێو سیستەمەکان بوو. "باسە پێکهاتەییەکان" کە لەگەڵ چیندا خستمانە بەرباس لە بنەڕەتدا تەکنیککیی بازرگانی نەبوو، بەڵکو بەرنامەیەکی تەواو جیاواز بوو بۆ ڕێکخستنی ژیانی بازرگانی. دەبوو دانوستان لەبارەی ئەم باسەوە کرابووایە، تاوەکو بزانین ئاخۆ هیچ چانسێك هەیە بۆ ئەوەی حەقیقەتی ئەوەمان بۆ دەرکەوێت کە چین ڕژدە لەسەر گۆڕانکاری لە ڕێگاکانی (بەدڵنیاییەوە من پێم وانەبوو کە وابێت). ئەوەبوو کودلۆ

ڕەزامەند بوو، ئەو چوو لە شوێنێك لە دووری منوشنەوە دانیشت و منوشنیش کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو. لەمیانەی هەموو ئەو گفتوگۆیانەی باسی ئەم شتانە دەکرا، من پێشنیاری ئەوەم کرد کە هەموو ئەو کەلوپەلە چینییانە ڕێگری لێ بکرێت بهێنرێتە ئەمریکا، کە بیرۆکەکانیان دزراوە. ترەمپ گوتی: "من ئەو بیرۆکەیەم بە دڵە"، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەم بیرۆکەیە بە دڵی منوشن نەبوو. من گوتم کە ئێمە پێویستمان بە دەسەڵاتێکی تری جێبەجێکردن دەبێت، بەڵام ئەوەش بۆ خۆی شەڕێکی دەویست تا وەدەست دەهات، لە ئەسڵیشدا شایانی ئەم شەڕە بوو. ترەمپ جارێکی تر (لە ڕاستیدا چەندین جاری تریش) گوتی کە ئەو بیرۆکەکەی بە دڵە، هەر بۆیە من وام دانا کە بەرەوپێشچوونێك هەیە. دواتر کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسییەکە دوای چەند خولەکێك لە کاتژمێر چوار و چل و پێنج خولەك کۆتایی هات.

خوانی ئێوارە لە کاتژمێر پێنج و چل و پێنج خولەك دەستی پێ کرد. ئەمەش دوای وەستانە زۆرەملێکە بۆ وێنەگرتن بە مۆبایل، تاوەکو کاتژمێر هەشت کۆبوونەوەکە بەردەوام بوو. ئەوەبوو شیی دەستی بە پیاهەڵدانی ترەمپ کرد، جار جارە لە پەڕاوی تێبینییەکان شتی دەخوێندەوە، وەکو ئەوە دەهاتە بەرچاو کە بەر لە لووتکەکە بەتەواوی ئامادەکاری کراوە. سەبارەت بە ئێمەیش، سەرۆك وەك ئەوە وابوو هەر سەرپێیی شت بڵێت. چوون هیچ کەسێك لەلایەنی ئەمریکییەوە تێنەدەگەیشت کە ئەو ئەم خولەکە چی دەڵێت و خولەکەکەی تر چیتر دەڵێت. شتێکی تری زۆر دیار ئەوەبوو کاتێك شیی گوتی کە ئەو دەیەوێت بۆ شەشساڵی تر لەگەڵ ترەمپدا ڕێکبکەوێت، ترەمپیش گوتی کە خەڵکانێك دەڵێن دەبێت ئەو مافە دەستوورییەی هەیە سەبارەت بە سەرۆك بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەکی تری سەرۆکایەتی خۆی کاندید بکات، دەبێت پووچەڵ بکرێتەوە. بەڕاستی من لە هیچ شتێکی لەم جۆرە ئاگادار نەبووم، چوون ئێمە دەمانزانی کە

شیی ئیتر بۆ هەتاهەتایەی ژیانی هەر سەرۆکە و ترەمپیش دەیەوێت کێبڕکێ لەگەڵ ئەودا بکات. لە کاتێکی تری خوانی ئێوارە شیی گوتی کە ئەمریکا هەڵبژاردنی زۆری کردووە و ئەویش نایەوێت کە ترەمپ دووربکەوێتەوە، ترەمپیش سەری ئەرێتی بۆی لەقاند. (لە ڕاستیدا، لە گفتوگۆیەکی تری تەلەفۆنی لە ٢٩ی کانوونی یەکەم، شیی بە ڕەوانی گوتی کە چین هیواخوازە ترەمپ بۆ جاری دووەم لە دەسەلات بمێنێتەوە و تاوەکو دەستکاریی دەستوور بکرێت، بەمەش بتوانێت زیاتر لە دەسەڵات بمێنێتەوە)، ئەوەبوو شیی بیرۆکەی "١٠٠ ساڵ ماراسۆن"ی ڕەتکردەوە[1]، تاوەکو لەڕێی ئەوەوە هەیمەنەی بەسەر هەموو جیهاندا هەبێت یان جێگەی ئەمریکا بگرێتەوە، ئەو گوتی کە ئەمە لە سروشتی ستراتیژییەتی چین نییە. ئەوان ڕێزیان لە سەروەری و بەرژەوەندییەکانی ئێمە نا لە ئاسیا و تەنها دەیانویست کە ١,٤ ملیار چینی چێژ لە ژیانێکی باشتر وەربگرن.

سەرنجی ئەوە بدەن کە شیی چەندە ڕووخۆش بووە، لە کۆتاییدا چووە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکە، ئەو گوتی کە لەوەتەی لە ١ی تشرینی دووەم بە تەلەفۆن قسەیان کردووە، ئەوە کارمەندەکان بە ڕژدی کاریان بۆ ئەوە کردووە و گەیشتوونەتە ڕێککەوتنێك لەبارەی باسە ئابوورییە سەرەکییەکان. دواتر ئەوەبوو قسەی لەسەر هەڵوێستی چین کرد و گوتی ئەوەی کە لە ڕابردوو منوشن گوتوویەتی ئەوان ڕەزامەندنن، بەوەی کە: ئەمریکا ئەو باجەی کە لەلایەن ترەمپەوە پێشنیار کرابوو دەگەڕێنێتەوە؛ نابێت هیچ لایەنێك فێڵ لە دراو و مامەڵەدا بکات؛ هەروەها لەسەر ئەوە ڕێك دەکەوین کە هیچ لایەنێك هێرشی ئەلیکترۆنی نەکاتە سەر ئەوی تر. شیی گوتی کە لە شەڕی بازرگانیدا هیچ کەس براوە نابێت، بۆیە پێویستە

(١) ئەم دەستەواژەیە لە کتێبەکەی مایکڵ بیلسبری وەرگیراوە بەناوی "سەد ساڵ ماراسۆن: ستراتیژیەتی چین بۆ گۆڕینی ئەمریکا وەکو گەورەترین هێزی جیهان. گریفین، چاپی نوێ ٢٠١٦ (ئەمە پەراوێزی نووسەر -بۆلتن- خۆیەتی)

لەسەر ئێمە کە ئەو باجانەی هەن ڕەت بکرێنەوە، یان هیچ نەبێت ڕێککەوتن لەسەر ئەوە بکرێت کە ئیتر باجی تری نوێ دانانرێت. هەروەها شیی گوتی کە "خەڵکی چاوەڕوانی ئەوە دەکەن"، من لەوە دەترسام کە لەم کاتەدا ترەمپ بڵێت بەڵێ بۆ هەموو شتێك. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم ئەگەرە نزیك بووەوە، بەوەی گوتی کە باجی گومرك لەلایەن ئەمریکاوە دەکرێتە لە سەدا ١٠ لەجیاتی ئەوەی بکرێتە سەدا ٢٥ هەروەك هەڕەشەی کردبوو. لە بەرامبەردایشدا، ترەمپ داوای کرد کە بەرهەمی تری زیاتری کشتوکاڵ هاوردە بکرێت (ئەمەش بۆ یارمەتیدانی لە دەنگدان کە وەکو وڵاتێکی کشتوکاڵی ئەژمار بکرێت). ئەگەر ڕێککەوتن لەسەر ئەمە بکرێت، ئەوا دەبێت سەرجەم باجەکان کەم بکرێنەوە، مەسەلەی "دزینی بیرۆکەکان" لێگەڕاین بۆ کاتێکی تری دیارینەکراو. بۆ دانوستانەکان ماوەی نەوەد ڕۆژ دیاری کرابوو بۆ ئەوەی هەموو شتێك جێبەجێ بکرێت. ئەمە بەڕاستی شتێکی باش بوو، ئەوەبوو دواتر لایتهایزر پرسی کە ئاخۆ هیچ شتێکی لەبیر کردووە، هەروەها لایتهایزر هەموو هەوڵێکی دا تاوەکو گفتوگۆکان بگەڕێنێتەوە بۆ ئاستی ڕاستەقینەی خۆی و لەگەڵ جەختکردنە سەر بابەتە پێکهاتەییەکان و وەلانانی پێشنیارەکەی چین کە لای منوشن زۆر گرنگ بوو.

هەروەها ترەمپ داوای لە شیی کرد کە هەناردەکردنی فێنتنیڵ کەم بکەنەوە، کە ماددەیەکی بکوژە و بووەتە وێرانی بۆ هەموو ئەمریکا و هەروەها باسێکی سیاسی گەرمە، ئەوەبوو شیی لەسەری ڕەزامەند بوو (بەڵام دواتر هیچ شتێکی نەکرد). هەروەها ترەمپ داوای لێ کرد کە هەریەك لە ڤیکتۆر و سینثیا لو ئازاد بکات، کە چین وەك بارمتە گرتبوونی بەهۆی داواکاریی دژی لیو چانگ مینگی باوکیان، کە لە ئەمریکا بوو. شیی هەروەك کە وەڵامی داواکەی دابێتەوە گوتی کە لیو هاووڵاتی چینی-ئەمریکییە. بەم جۆرەش ترەمپ بابەتەکەی لەدەست دەرهات. لەوە

دەچوو کە چینییەکان هیوابخوازن خوانی ئێوارە بەدرێژایی شەو درێژتر ببێتەوە. ترەمپ کۆتایی بە قسەکانی هێنا بەوەی کە لایتهایزر بەرپرسی دەبێت لە ڕێککەوتنەکان، هەروەها کۆشنەریش بەشدار دەبێت، لێرەدا هەموو چینەکان زەردەخەنەیان کرد. گرەو دەکەن، ترەمپ ئاماژەی بە لایتهایزر و ناڤارۆ کرد (کە بوونیان لەوێ چینییەکانی توورە کردبوو) هەروەکو هەڵۆکان، هەروەها منوشن و کودلۆ هەروەك کۆترەکان، هەروەها بە من و پۆمپەیۆی گوت کە "ئەوانە گرنگی بە پارە نادەن" . قورس بوو کە بگوترێ چینییەکان هەموو ئەو شتانەیان کردووە، بەڵام بێگومان کە شیی کارتی تەواوی بەکارنەهێنابوو. هەروەها بچووککردنەوەی ڕۆڵی منوشن باشترین هەواڵی ئەم ڕۆژە بوو. لە کۆتاییشدا، دوای قسەکردن لەسەر ڕاگەیەنراوێك بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ئەوەبوو ئێمە هەموو بەرەو فڕۆکەخانە بەڕێ کەوتین. بە جۆرێکی تر، خوانی ئێوارە زۆر زیاتری خایاند، سێ کاتژمێر، سێ کاتژمێر و نیو، لە کۆتاییشدا گەیشتە زیاتر لە چوار کاتژمێر، ئەوەبوو دواجار ترەمپ بە کۆمەڵێك قسە گەڕایەوە کە باسی لە سەرکەوتنەکانی دەکرد بۆ گوێگرەکانی.

ڕۆژی دووشەممە ٣ی کانوونی یەکەم گەڕاینەوە بۆ واشنتۆن، لە ئۆڤاڵ کۆبووینەوە تاوەکو ئەنجامەکان هەڵبسەنگێنین. ترەمپ زۆر دڵخۆش بوو، دڵخۆش بوو بە کاردانەوەی بۆرسەی جیهانی، تا ئەوکاتیش هەر بیرۆکەکەی منی بە دڵ بوو بەوەی کە ئەو کەلوپەلە چینییانە قەدەغە بکرێن لە ئەمریکا کە بیرۆکەکانیان دزراوە یان هی ئەمریکایە. لەگەڵ ئەوەشدا، منوشن کەوتە جەنگ بە ڕۆڵە نوێیەکەی و پرسی کە "کێ بەرپرسیارە؟" لەبارەی ڕێککەوتنی داهاتوو. ئەوەبوو ترەمپ قۆڵی لایتهایزری گرت و گوتی: "من نازانم چ هەڵەیەك لێرەدا هەیە، دونیای گەنجینە، دونیایەکی تەواو جیاوازە". ئەو بەڕاستی لایتهایزری دەویست و بە دڵی بوو "منوشن جۆرێکی جیاوازی ئاماژە دادەنێت، من نازانم کە

بۆچی (منوشن) دەیەوێت بەشداری بکات. ئایا دەزانیت کە چۆن یارمەتی (لایتهایزر) دەدەیت؟ باشتر وایە نرخی دۆلار چاك بکەیت". پاشان ترەمپ لەم باسە دوورکەوتەوە و ئەم جارە هێرشی کردە سەر سەرۆکی بانکی فیدرالی، پۆول، کە ئەو وەك دڵخوازترین کەس وابوو بەوەی کە نرخی بەرژەوەندییەکانی هەمیشە بە بەرزی دەهێشتەوە. پاشان چوویە سەر لایتهایزر و ترەمپ گوتی: "لەمەدا من هەڵوێستی تۆم دەوێت، تۆ نەوەك ستیڤ. دەمەوێت دوو هێندە و سێ هێندەی کەلوپەلەکان بەدەست بخەین. ئەگەر وا نەبێت ئەوا لەبیری بکە و دەبێت بگەڕێینەوە سەر خاڵی سەرەتا (واتە بەرزکردنەوەی باج). شومریش ئەوەی بە دڵە. چوون باجەکان لە ماوەی ۹۰ ڕۆژدا باشتر وەردەگیرێن و دیار دەبن". ئەوەبوو گەڕی دانوستانەکان دەستیان پێ کرد و ترەمپیش زیاد لە چەند جار بەوە وەسفی کرد کە "گەورەترین ڕێککەوتنی مێژووە، ئەوە هەر تەنها گەورەترین ڕێککەوتنی بازرگانی نییە، بەڵکو گەورەترین ڕێککەوتنە تاوەکو ئێستا کرابێت".

ئەوەبوو دواجار دانوستانەکان و شانۆگەرییەکە لە ئۆڤاڵ بە پاڵەوانییەتی ترەمپ و لییو هیی دەستی پێ کرد، لە پەخشی ڕاستەوخۆدا نیشان درا. کات تێپەڕی و ئەوە ڕوون بوویەوە کە لە وادەی ۱ی ئازار شتەکان نایەنەدی، بۆیە ترەمپ بەسەریدا ڕابوورد و گوتی کە "شتی گەورە" بەدی هاتوون. من لام وابوو کە ئەمە ئاماژەیە بۆ لاوازی و ئەوەش نیشان دەدات کە ئەوەی ئەو دەیەوێت تەنها ڕێککەوتنە. لە ڕاستیدا و بێگومان کە ماوەی نەوەد ڕۆژ کاتێکی وەهمی بوو، چوون ئەمە شتێکی تەواو مەحاڵ بوو کە چین لە ماوەی سێ مانگدا دەستبەرداری "باسە پێکهاتەییەکان" بێت، دوای ئەوەی بە درێژایی چەند دەیەیە کە لەسەرکردنی ڕاهاتووە. بەڵام شانۆگەرییە یەکلاکەرەوەکە کەوتە مانگی ئایار، کاتێك چینییەکان خاڵە سەرەکییەکانی پەیمانەکەیان شکاند، لەگەڵ تەواوی "باسە

پێکهاتەییەکان" کە بنەمای سەرەکیی ڕێککەوتنەکە بوون. لەم کاتەشدا من بە هەڕەشەی ئێرانەوە بۆ سەر ناوچەی کەنداوی فارسی گرفتاربووم، بەڵام لایتهایزر خێرا سەرنجی منی بۆ ئەم باسە ڕاکێشا. ئەمە شکستێکی گەورە بوو بۆ سەرخەرانی ڕێککەوتنەکە، ئەوەبوو لایتهایزر گوتی ئەو و منوشن لایان وایە کە لییو هیی و هاوپەیمانەکانی لە پەکین دەسەڵاتیان لەدەست داوە.

لایتهایزر بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر لە ٦ی مانگی ئایار هاتە ئۆفیسەکەم لە کاتژمێر ٨ی بەیانی بۆ تاوتوێکردنی ئەم بابەتە. ئەو گوتی کە هەفتەی ڕابردوو لە پەکین، چینییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو پاشەکشەیان کردووە لەم پەیمانانەی کە دابوویان، بۆ نموونە وازهێنان لە یاسا کۆنەکان و هێنانە گۆڕێی یاسا نوێیەکان (هەر بۆ نموونە بۆ پاراستنی خاوەنی بیرۆکەکان)، هەروەها هەموو هەنگاوە ڕژدەکانی تر کە بیسەلمێنێت ئەوان سوورن لەسەر مەسەلە پێکهاتەییەکان. ئینجا بەبێ ئەم پابەندبوونانەش تەنها جەختکردنەوەیەکی لێڵ هەیە لەسەر جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکە، کە ئەویش چەندین ساڵە لەگەڵ چین دا هەمیشە شکستی هێناوە لە وەدەستهێنانی ئامانجەکانی. لییو گوتی کە ئەو پێشنیاری ئەوەی کردووە "سەرلەنوێ هاوسەنگی" بۆ دەقی ڕێککەوتنەکە دروست بکرێتەوە، چوون ئەم ڕێککەوتنە داواکاری هەنگاوگەلێکی زۆری تێدایە کە دەبێت چین بیگرێتە بەر، بەڵام هەر تەنها چەند هەنگاوێکی کەم داوای لە ئەمریکا کردووە (ئەمەش لەبەر هۆکارێکی دیار!). کاریگەرییە گشتییەکە ئەوەبوو کە بەڕاستی ئەم هەنگاوانە هێمن بکرێنەوە، ئەوانەی چین پێویستە بیانگرێتە بەر، هەر بۆیە ئێستا چین داواکار بوو لە چاوخشاندنەوە بە پێداچوونەوەی ناپێویست. لایتهایزر گوتی کە ئەو و منوشن گەیشتوونەتە ئەو خاڵە کە لییو کۆنترۆڵی جێبەجێکردنی دانوستانەکانی لەدەست داوە. لاشیان وابوو کە بە ڕاستی لییو لە پەکین دانی بەم ڕاستییەدا ناوە. لەگەڵ ئەوەشدا لییو

پلانی بۆ ئەوە دادەنا کە لە کۆتایی ئەم هەفتەیە بگاتە واشنتۆن و لە چوارچێوەیەکی تری نوێدا کۆببنەوە، بەڵام ئەوە ڕوون نەبوو کە ئاخۆ لیو شتی نوێ و جیاوازی پێیە بۆ ئەم جارە یان نا.

هیچ ئەگەرێك نەبوو بۆ ئەوەی ئێستا بگەنە ڕێککەوتن و منوشن بەوە وەسفی ئەم حاڵەی کرد کە ئەمە "دواهەمین گەڕی دانیشتنەکانە". بەتایبەتیش چونکە زۆرێك لە بابەتە ترسناکەکان بەبێ چارەسەر مابوونەوە. ترەمپیش لەولاوە دەستی کردبوو بە تویتکردن بەوەی هەڕەشەی دەکرد کە باجی نوێ دەسەپێنێت، بۆیە ئەگەری ئەوەش هەبوو کە ڕەنگە لیو هەر نەیەت. لە کاتێکی تری هەمان ڕۆژ، لایتهایزر ڕایگەیاند کە ئامادەکاری دەکات بۆ وەجبەی دووەمی سەپاندنی باجەکان بۆ ڕۆژی هەینی، کە ترەمپ ئامادەبوو لە سەپاندنی. ئەوەبوو دواجار لیو گەیشتە واشنتۆن بەڵام بێ ئەوەی هیچ شتێکی نوێی پێ بێت و گفتوگۆکانیش لە کاتێکی زوو تەواو بوون. هیچ چاوپێکەوتنێکی نێوان لیو و ترەمپ لەئارادا نەبوو. هەروەها شەڕی بازرگانی بەردەوامی نەبوو.

ترەمپ لە ١٨ی مانگی حوزەیران بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ شی جینگ پینگدا کرد، ئەمە بەر لە لوتکەی ٢٠١٩ی کۆمەڵەی بیستی ئۆساکا، کە بۆ جارێکی تر کۆدەبوونەوە. ترەمپ بەوە دەستی پێ کرد کە ئەو بیری دەکات و هەروەها گوتی گەورەترین شت کە کردبێتی لە ژیانیدا ڕێککەوتنی بازرگانی بوو لەگەڵ چین، کە ئەمە لەلایەنی سیاسیش زۆر گەورە بوو. ئەوەبوو لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە تیمە ئابوورییەکانیان لەم لوتکەیەی داهاتوودا کۆببنەوە. دواجار کە لووتکەی کۆمەڵەی بیست دەستی پێ کرد و لەمیانەی ئەو ئاژاوەیەی ڕاگەیاندنەکان لە سەرەتادادروستیان کردبوو، ئەوەبوو ترەمپ گوتی: "ئێمە ئیتر بووینە دۆست، گەشتەکەم لەگەڵ ئەندامانی خێزانم بۆ پەکین یەکێك بوو لە گەشتە گرنگەکانی ژیانم".

کاتێك ڕاگەیاندنەکان چۆڵیان کرد، شیی گوتی کە ئەمە گەورەترین پەیوەندیی دوولایەنەیە لە جیهاندا. هەروەها گوتی کە هەندێك لە کەسایەتی (بەبێ ناوهێنان) لە ئەمریکا کۆمەڵێك بڕیار دەردەکەن کە ڕێخۆشکەرن بۆ بەرپابوونی سەرلەنوێی جەنگی سارد، لەنێوان چین و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. من دڵنیا نەبووم کە ئاخۆ شیی پەنجەی تۆمەت ئاڕاستەی دیموکراتەکان دەکات، یان بۆ ئێمە کە لەسەر لایەکی مێزی دانوستان دانیشتبووین، بەڵام ترەمپ هەر زوو وای دانا کە شیی مەبەستی دیموکراتەکانە. هەروەها ترەمپ گوتی کە دیموکراتەکان لەنێو خۆشیاندا کێشەیان هەیە. پاشان بەشیوەیەکی سەیر گفتوگۆکان چوونە سەر باسی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە ئەمریکا و ئاماژەی بەوەدا کە دەشێت چین بەهۆی هێزی ئابوورییەوە کاریگەری هەبێت لەسەر هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن، پاشان داوای لە شیی کرد کە گرەنتی دەرچوونی بکات لە هەڵبژاردنەکانی. ئینجا جەختی لەسەر گرنگیی جووتیاران کرد، هەروەها باسی لە زیادبوونی کڕیاری دانەوێڵە و شتی تر کرد. من خەریك بوو قسەکانی ترەمپم دەنووسییەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت ڕاگەیاندنی حکوومی بڕیاری لەسەر شتێکی تر دابوو.

دواتر ترەمپ باسی شکستهێنانی ڕێککەوتنەکانی مانگی ئایاری کرد، هانی چینی دا تاوەکو بگەڕێتەوە سەر ئەو خاڵانەی کە پاشەکشەیان تێدا کردووە. ئاماژەی بەوەی دا کە چین شکستی هێناوە لە کەمکردنەوەی ناردنی ماددەی فێنتنیڵ و هەروەها هەنگاونان سەبارەت بە گیراوانی کەنەدی (ئەوە باسی گیراوانی ئەمریکی هەر مەکەن)، کە لە بۆینس ئایرێسدا گفتوگۆی لەسەر کرابوو، ترەمپ جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە لە کوێ وەستابوون لەوێوە دەست پێ بکەنەوە تاوەکو گەورەترین ڕێککەوتنی مێژوویی تۆمار بکەن. شیی بەجۆرێك وەڵامی دایەوە کە ئەم ڕێککەوتنە هیچ یەکسانییەکی تێدا نییە و وەکو "گاڵتەکردن" وایە بە

ڕێککەوتنی ڤێرسالێس، کە دەبوو شانگ دۆنگ لە ئەڵمانیا وەربگریتەوە. بەڵام ئەوەبوو دای بە ژاپۆن. هەروەها شیی ئاماژەی بەوەدا کە ئەگەر هاتوو چین هەستی بە هەمان گاڵتەجاری کرد، ئەوا گوشار و نارەزایی زۆر لەنێو میللەتدا دەکەویتەوە و ئەم نارەزاییەش بەرامبەر ئەمریکا دەبێت. ئەمە ڕوون و ئاشکرا بوو کە ترەمپ نەیدەزانی شیی باسی چی دەکات. بەڵام گوتی کە ئەو لەگەڵ ڕێککەوتنی نایەکساندا نییە. ئاماژەدان بە مێژوو بۆ ترەمپ شتێکی زۆر ئاسان بوو، چوون ئەو گوتی کە چین چاکەیەك قەرزاری ئەمریکایە بەوەی کە ژاپۆنی لە جەنگی جیهانی دووەم کردە دەرەوە و ئەمەش لە بەرژەوندیی چین بوو. پاشان دەستی کرد بە قسەکردن سەبارەت بە ئەوەی کە چۆن چین بۆ ماوەی نەوەد ساڵ جەنگاوە و بەشێوەیەکی سەرەکی پشتیان بە خۆیان بەستبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ژاپۆنییەکان. بێگومان ئەم قسانە هەموو قسەی بێمانا بوون، چوون چینییە شیوعییەکان زۆرینەی لە بەدوورگرتنی ژاپۆن نە جەنگ کاتیان بەسەر برد و هەروەها کەمترین حەقیان دەدا بە چینییە ناسیۆنالیستەکان. دواجار جەنگ کۆتایی هات چونکە ئێمە چەکی ئەتۆمیمان بەکارهێنا، بەڵام شیی مێژووی لە ڕوانگەیەکی مەسیحی-شیوعی دەخوێندەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت ترەمپ لەمەش نەدەگەیشت.

لە کۆتایی پرسی بازرگانیدا، ترەمپ پێشنیاری ئەوەی کرد کە سەبارەت بەو بوودجەیەی ماوەتەوە و دەگاتە ٣٥٠ ملیار دۆلار (بەپێی حیسابی ترەمپ بێت)، ئەوا ئەمریکا چیتر باجی زیاتر ناسەپێنێت، بەڵام ترەمپ جارێکی تر گەڕایەوە سەر ئەوەی کە چین دەبێت هەوڵ بدات بەرهەمی زیاتری کشتوکاڵی لە ئەمریکا بکڕێت. پاشان سەیر دەکەن ئاخۆ بزانن ڕێککەوتنەکە چەندێك گونجاوە. ترەمپ داوای لە لیو هیی کرد کە ئاخۆ دەتوانن لەم شوێنە دەست پێ بکەنەوە کە چین بەرلەوەی پاشەکشە بکات لە مانگی ئایار. لیو وەکو ئاسك دەرکەوت کە لەسەر شارێگەیەك بێت و لایتی ئۆتۆمبێل لە چاوی بدات و نەتوانێت قسە بکات و بجووڵێت.

دیاربوو کە نەیدەویست وەڵام بداتەوە. دوای بێدەنگییەکی تەواو، ئەوەبوو ترەمپ گوتی کە هەرگیز لیبوی بەم جۆرە و ئاوا بە بێدەنگی نەبینیوە. ترەمپ ڕووی کردە شیی و داوای وەڵامی لێ کرد، چونکە ئەو تاکە کەس بوو کە ئازایەتی ئەوەی تێدا بێت وەڵام بداتەوە. شیی ڕەزامەندبوو لەسەر ئەوەی کە گفتوگۆ بازرگانییەکان سەرلەنوێ دەست پێ بکەنەوە، هەروەها پێشوازی لەو پێشنیارەی ترەمپ کرد بەوەی باجی تری زیادە ناسەپێنن، ڕەزامەندیش بوو لەسەر ئەوەی کە تیمەکانی دانوستکار دەبێت لەسەر بنەمای ئەولەویەت کەلوپەلی کشتوکاڵی دیار بکەن. ترەمپ بە شیی گوت کە "تۆ گەورترین سەرکردەی چینیی لە ماوەی سێ سەد ساڵی ڕابردوودا!"، پاشان گۆڕانکاری لە قسەکانی خۆیدا کرد و گوتی کە "تۆ گەورەترین سەرکردەی لە مێژووی چیندا". دواتر لەنێو ئۆتۆمبێل باس لە کۆریای باکوور کرا، چوون ترەمپ لە ڕێگەدا بوو بەرەو سیئۆل تاوەکو لەم ئێوارەیەدا بگات، ئەم سەردانەش بەمەبەستی بازرگانی بوو.

شیی گەڕایەوە سەر باسی منداڵەکانی لیبو، ئاماژەی بەوە دا کە لە بۆینس ئایرێس لە ١ی مانگی کانوونی یەکەمدا قسەی لەسەر کراوە، ئەو بە جۆرێك وەسفی ئەوانی کرد کە ئەوان هاونیشتمانیی چینین (لە ڕاستیدا هاووڵاتی ئەمریکی-چینی بوون). شیی باسی ئەوەی کرد کە منداڵەکانی لیبو لە چوونەدەرەوە لە چین قەدەغەکراون، چوون تۆمەتبارن بە سپیکردنەوەی پارە بۆ باوکیان، بەم جۆرەش ئەمە بووەتە هەڕەشە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی چین. ئاماژەشی بەوەدا کە کە شەوی ١ی مانگی کانوونی دووەم، مینگ وانز هوی بەڕێوەبەری دارایی کۆمپانیای هواویی دەستگیر کراوە. شیی کۆتایی قسەکانی خۆی بەوە هێنا کە پێویستە هەر دوولا لەپەیوەندیدا بن. بێگومان ئەو لەوە دەچوو زۆر ئاسوودە بێت لەوەی کە ڤیزای پێویست دەستەبەر نەکراوە بۆ هەموو ئەو قوتابییانەی کە دەیانەوێت بێنە ئەمریکا!

گفتوگۆ بازرگانییەکان لە دوای ئۆساکا بەردەوام بوون، بەڵام

پێشوەچوونەکان کەمتەرخەمییان پێوە دیاربوو. ئیدی ترەمپ کەوتە جۆرێك لە پارێزگاری، کاتێك کە لە ۳۰ی تەمموز تویتی کرد، دژ بە ئامۆژگاریی منوشن و لایتهایزر:

ئەدای چین زۆر خراپە، دەبوو ئێستا دەستی کردبا بە کڕینی کەلوپەلە کشتوکاڵییەکانمان، بەڵام تا ئێستا هیچ ئاماژەیەك نییە کە ئەم شتە بکەن، ئەمەیە کێشەی ئێمە لەگەڵ چین، ئەوان لەم ئامانجە نزیك نابنەوە. لە ماوەی ئەم ۳ ساڵەی دواییدا ئابووری ئێمە زۆر لە ئابووریی چین گەورەترە...

تیمەکەی من ئێستا لەگەڵیاندا دانوستان دەکەن، بەڵام لە کۆتاییدا هەمیشە لە بەرژەوەندیی ئەواندا ڕێککەوتن دەکەن. ڕەنگە بیانەوێت کە بوەستن تاوەکو هەڵبژاردنەکان بۆئەوەی ئاخۆ کەسێکی دیموکراتی وەکو جۆی خەواڵومان[1] دەستگیر بێت. ئەوکات دەتوانن کە ڕێککەوتنێکی جوان مۆر بکەن، هەروەك لە ۳۰ ساڵی ڕابردوو بینیمان و بەردەوام دەبن لە...

خاپوورکردنی ئەمریکا، بگرە زیاتر و گەورەتریش لە جاران. بەڵام کێشەی ئەوان ئەوەیە دەبێت لە چاوەڕوانیدا بمێننەوە، چوون ئەگەر من سەربکەوم لە هەڵبژاردنەکان و کە هەر سەریش دەکەوم، ئەوا ئەوکات ئەو ڕێککەوتنەی دەکرێت، زۆر لەوە قورستر دەبێت کە ئێستا ئێمە دەیکەین... یان ئەسڵەن هیچ ڕێککەوتنێك هەر ناکەن. ئێمە هەموو کارتەکانمان لایە و سەرکردەکانی پێشوومان ئەم کارتانەیان بەکارنەبردووە!

لەگەڵ بەردەوامبوونی دانوستانەکان، هیچ ئاماژەیەکی ڕاستەقینە لەلایەن

---

(۱) ترەمپ لێرەدا مەبەستی لە جۆی بایدنە، لەزۆربەی شوێنەکان بەم نازناوە ناوی دەبات.

چینەوە نەبوو. ئەمەش دوای سەردانکردنی منوشن-لایتهایزر بۆ پەکین، ئەوەبوو بەم ڕاپۆرتەی لە ١ی مانگی ئابدا بۆ ترەمپیان بەرزکردەوە. لە ئۆڤاڵ ترەمپ هیچ شتێکی باشی لانەبوو بیڵێت، ئەوەبوو بەوە دەستی بە قسەکانی کرد کە "نەدەبوو ئێوە بۆ ئەوە چووبان، چونکە ئەمە وا دەکات کە ئێوە لاواز دەربکەون". ڕۆژی بەر لەمە هیوای ئەوەی دەخواست کە بتوانێت باجی زیاتر بسەپێنێت، ترەمپ بە چاوداگرتن و زەردەخەنەوە پێی گوتم کە "من زۆر لە تۆ دەچم، زیاتر لەوەی کە تۆ دەیزانیت". ئێستا ترەمپ لەوە دڵنیابوویەوە کە چین لەسەر ئەوە دەوەستێت کە ئاخۆ کێ لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٢٠ براوە دەبێت، ئەو باوەڕی وابوو کە "ئەوان دەیانەوێت سەرۆك بدۆڕێنێت"، بۆیە ترەمپ لە کۆتاییدا گوتی کە "من دەمەوێت باجەکان بەردەوام بن"، دواتر چووینە سەر باسی ئەوەی کە چی ئەگەر ٣٥٠ ملیار دۆلار باجی تر بسەپێنین بەسەر کەلوپەلی هەناردەی چین بۆ ئەمریکا؟! ترەمپ بە منوشنی گوت: "تۆ زۆر قسە دەکەیت، ستیڤ پێویستە نەترسیت"، لایتهایزر لەبەر چەند هۆکارێك نیگەرانی ئەوە بوو کە جەنگی ئابووری ئێمە لەگەڵ چین زیانی بۆ ئەورووپا دەبێت و سووتەمەنی زیاتر دەکات بەسەر ئاگرەکە و ئەمەش لەلایەن ترەمپ ڕەتکرایەوە بەوەی گوتی: "ئەورووپا زۆر لە چین خراپترە، هەر تەنێ جیاوازی ئەوەیە کە بچووکترە"، ئەوەبوو بڕیاری دا گەڕێکی تری باجەکان بخاتە سەر پەکین، بێگومان ئەمەش لە ڕێگەی تویتەرەوە:

نوێنەرەکانمان ئێستا لە چین گەڕاونەتەوە کە لە سەردانەکەیان باسیان لە ڕێککەوتنی بازرگانی کردبوو. من بەر لە سێ مانگ پێم وابوو کە ئێمە لەگەڵ چین گەیشتووینەتە ڕێککەوتن، بەڵام بەداخەوە، چین بڕیاری دابوو کە بگەڕێتەوە سەر خاڵی بەر لە دانوستان، لەم دواییەش چین بڕیاری دا کە...کەلوپەلی زیاتری کشتوکاڵی لە ئەمریکا بکڕێت، بەڵام ئەوەیشی نەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە هاوڕێکەم سەرۆك شیی بڕیاری دابوو بوەستێ

لە فرۆشتنی ماددەی فێنتنیل بە ئەمریکا، بەڵام ئەمەش هەرگیز جێبەجێ نەکرا و ئێستاشی لەگەڵدا بێت هاووڵاتییەکی زۆریی ئەمریکی بەم هۆیەوە دەمرێت! گفتوگۆ بازرگانییەکان بەردەوامن و ...

🐦 لەمیانەی ئەم گفتوگۆیانەش ئەمریکا دەست دەکات بە سەپاندنی بڕێکی کەمی باج لە ١ی مانگی ئەیلوولەوە بە ڕێژەی لە سەدا ١٠ و بە بەهای ٣٠٠ بلیۆن دۆلار لەسەر کەلوپەلی هاوردەکراو لە چینەوە بۆ وڵاتەکەمان. ئەمەش ئەو ٢٥٠ ملیار دۆلارە ناگرێتەوە کە بە ڕێژەی لە سەدا ٢٥ دانراوە و ...

🐦 ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر کۆبوونەوەکان و ڕێککەوتنی ئەرێنیی بازرگانی لەگەڵ چین و پێمان وایە کە ئاسۆی هەردوو وڵات زۆر ڕوونە!

ئەمە بڕیارێکی گەورە بوو، بووە هۆی نیگەرانیی تیمە ئابوورییەکەی ترەمپ، بە جۆرێك شتەکان بەم جۆرە بەردەوام بوون تاوەکو من لە ١٠ی ئەیلوول دەستم لە کار کێشایەوە. دانوستانەکانی دواتر بوونە هۆی "ڕێککەوتنێك" کە دواتر لە کانوونی دووەم ڕاگەیاندرا و لە ناوەڕۆکدا پێچەوانەی ئەوە بوو کە چاوەڕوان دەکرا.

---

لە ١ی کانوونی دووەمی ٢٠١٨، لە هەمان ئەو ڕۆژەی کە ترەمپ و شی خوانە دووروودرێژەکەی ئێوارەیان هەبوو لە بوینس ئایرێس، هەروەها وەك چۆن لە کۆبوونەوەکەی ئۆساکا گفتوگۆیان لەسەر کرد، ئەوەبوو هێزەکانی کەنەدا لە ڤانکۆڤەر هەڵسان بە دەستگیرکردنی مینگ وانز هو، بەڕێوەبەری دارایی کۆمپانیای هواوی کە ئەویش کۆمپانیاییەکی تری گەورەی مۆبایلی چینییە. (ڕۆژی هەینی ئێمە وامان بیست کە ڕەنگە دەستگیرکردنەکە بکەوێتە ڕۆژی شەممە کاتێك مینگ، کە دەکاتە کچی دامەزرێنەری کۆمپانیای هواوی گەیشتە کەنەدا). ئەم دەستگیرکردنە

پەیوەندی هەبوو بە دۆسیەی تایبەتی ئێمە سەبارەت بە گزیی و فێڵەکانی کۆمپانیای هواوی و چەند پرسێکی تری وەکو پێشێلکردنی سزاکانی ئێمە بۆ سەر ئێران، کە بەشێوەیەك ڕوون دیاربوو. شتەکان لە بۆینس ئایرێس زۆر قاڵ دیاربوون، لە بینینی ترەمپ و ئەردۆگان ئەوەم بۆ دەرکەوت کە دەبێت هەموو حەقیقەتەکان دەست بخەم بەر لەوەی پوختەکەی بۆ ترەمپ بەیان بکەم.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی فراوانی باسی دەستگیرکردنەکە لە ڕاگەیاندنەکان، دۆستە چینییەکانی ئەمریکا تووڕە بوون، لە ئێوارەخوانێکی سەری ساڵدا لەنێو کۆشکی سپی لە ٧ی کانوونی دووەم، ترەمپ باسی ئەم دەستگیرکردنەی کرد و ئاماژەی بەوەدا کە ئەمە چەند گوشار دەخاتە سەر چین. ترەمپ لەسەر مێزەکە بە منی گوت: "تازە ئێمە ئیڤانکا ترەمپی چینمان دەستگیر کرد". من خەریك بوو بڵێم: "هەرگیز نەمزانیبوو کە ئیڤانکا سیخوڕ و تەڵەکەبازە!" بەڵام زمانی خۆم گەست و قسەم نەکرد. ئایا چ پسپۆڕیکی دارایی لە وۆڵ ستریت ئەمەی داوەتە دەست ترەمپ؟ یان ئەوە کۆشنەر بوو، دەستی کەوتبووە نێو ڕێککەوتن و ئاڵوگۆڕییەکانی چین لەگەڵ هێنری کیسنجەر لە ماوەی ڕاگواستنی دەسەڵاتدا؟ ترەمپ سکاڵای لەوە هەبوو کە هواوی گەورەترین کۆمپانیای مۆبایلی چینە. من گوتم کە هواوی لە بنەڕەتدا کۆمپانیا نییە، بەڵکو دەستێکی باڵای هەواڵگریی چینییە. بەوەی کە دواتر لە هەمان خوانی ئێوارەدا ترەمپ سەبارەت بە ئویگۆرەکان گوتبووی، ئەوا دەتوانم بڵێم کە ئێمە لە هێڵێکی دوور لە ترەمپ بووین سەبارەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ چیندا. من دەمپرسی ئاخۆ چی تێدەچێت کە ئەگەر ترەمپ بگەڕێتەوە سەر بەرنامەی پێشووی و لەگەڵ چین توند بێت، هەروەك ئەوکاتە وابوو کە ڕابەرایەتیی کۆبوونەوە بازرگانییەکانی دایە دەست لایتهایزر.

ترەمپ باسەکەی زۆر خراپتر کرد کاتێك لە زۆر بۆنەی تر باسی ئەوەی

کرد کە هواوی وەك کارتێك وایە لەدەست ئەمریکا بەرامبەر دانوستانە بازرگانییەکانی ئەم دواییەی لەگەڵ چین، لەگەڵ فەرامۆشکردنی باسی دۆسیەی تاوانکاریی هواوی و هەروەها ئەم هەڕەشە گەورەیەی کە هواوی هەیەتی بەرامبەر ئینتەرنێتی نەوەی پێنجەم G5. هەر ئەمەش بوو کە دیاردەی کونی ڕەش هەموو باسەکانی تری هەڵدەلووشی سەبارەت بە دانوستانی بازرگانی. هواوی ببووە کێشە بۆ زۆرێك لەو پرسانەی کە پەیوەست بوون بە ئاسایشی نەتەوەیی و ئێمەش تەنها لە ڕاگەیەنراوە گشتییەکان بۆمان دەکرا ئاماژەی پێ بدەین. ئەم بیرۆکەیەی کە پێی وابوو ئەمە هەرتەنها بازرگانییە بیرۆکەیەکی نائومێدکەر بوو بۆ دۆستانمان. منوشن نیگەرانی ئەوە بوو کە چۆن ئەم باسە و باسەکانی تری وەکو هاککردن و هێرشی ئەلیکترۆنی کاریگەریی نەرێنیان دەبێت لەسەر دانوستانە بازرگانییەکان. جارێکیان بە منوشنی گوت: "ستیڤ، چینییەکان لە چاوەکانتدا ترس دایاندەگرێت، هەر بۆیە من نامەوێت تۆ دانوستانیان لەگەڵدا بکەیت"، ئەوکات ڕۆژە باشەکان بوون، کە لەوەش زیاتر لەبەردەستدا بوون.

لەگەڵ بەردەوامبوونی دانوستانە بازرگانییەکان، ئێمەش دەستمان بە نووسینی کۆمەڵێك فەرمان کرد بۆ ئەوەی گرەنتیی سیستەمی پەیوەندیی ئەمریکی بکات لەگەڵ بنەماکانی تەکنۆلۆژیای زانیاری، بەشێوەیەکی گشتی. بۆ هەموو هەنگاوێك دەبوو لەگەڵ ئەم کاریگەرییە جەنگابایین کە لەسەر دانوستانە بازرگانییەکان لەگەڵ چیندا هەیبوو. هەندێك جار، کۆمەڵێك لە بەرپرسانی سیاسیی ئابووری لەو باوەڕەدا نەبوون کە هواوی هەڕەشە بێت، بەڵکو لایان وابوو کە هەر تەنها کێبڕکێکارێکی ترە و وەکو جێگرەوەیەك دادەنرا کە یارمەتیی بەرهەمی خۆماڵی بدات. ئەوەبوو سەنگەر دوای سەنگەر لەم جەنگەدا سەرکەوتین. من لە زۆربەی کۆبوونەوەکاندا لە ئۆڤاڵ جەختم لەوە کردەوە کە پێویستە پەیڕەوی

تەمێکردنەکانی ژۆو ئینلای بکەین، لە جەنگی جیهانی دووەمدا. سەبارەت بە دانیشتنەکانمان لەگەڵ شیانگ کای شیك تەنانەت ئەوکاتانەش کە هێزی کۆمۆنیستی و هێزیی کۆومینتانگ لە جەنگێکی دەستەوەستاندا گەمارۆ درابن، هێشتاش سیاسەتمان دەبێ "جەنگ لە کاتی دانوستان" بێت. شیی جینگ پینگ چۆن دەیتوانی بەرپەرچی ئەمە بداتەوە لەوەی کە پەیڕەوی ژۆو-مان کردووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا، ترەمپ گوتی: "من دژی ڕایەکەی جۆن نیم"، بەڵام بە نارێکی و جۆرێك لە ڕقەوە بەردەوام بوو. ئێمە بەردەوام بووین لە دانانی بەرگرییەکان، بەڵام بەشێوەیەکی هێواشتر. بێگومان ترەمپیش بەردەوام بوو لەوەی ببێت بە بەشێك لە کێشەکە. لە کاتێکی تر لە مانگی نیسان بە لایتهایزری گوت کە ئاخۆ دەتوانین هیچ شتێك بڵێین لەبارەی هێرشی ئەلیکترۆنییەوە لەنێو ڕێککەوتنە بازرگانییەکانماندا. ئەم بیرۆکەیە زۆر ناماقووڵ بوو، یان خراپتریش، هەرزووش لەنێو بازنەی فەرمیی ئەمریکی ون بوو، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەبوو لە شوێنێکی تری ئەم ڕێگە درێژەوە هەربوونی هەبێت، ئەمەش وا دەکات کە زیانی بێشومار بخاتە نێوان کۆبوونەوەی داهاتووی شیی – ترەمپ!

ئێمە دووچاری هەمان کێشە بووینەوە کاتێك ویستمان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی هاوپەیمانەکانمان لە مەترسییەکانی هواوی و کۆمپانیاکانی تری چین ئاگادار بکەینەوە. هەروەها هۆشداریشمان دا لەم ڕێگەیەی کە چین ناوی ناوە "دەستپێشخەریی پشتێنە و ڕێگا" لەگەڵ ئاگادارکردنەوەش سەبارەت بە "قەرزی دیبلۆماسی"، لەوە دەچوو زۆربەی وڵاتانییان فریودابێت بەوەی کە سوودیان پێ دەگەیەنێت و دواتریش لەپڕ لە ڕووی داراییەوەی هەڵیان دەلوشێت، کە ئەمەش وڵاتانی جیهانی سێیەم نەیانتوانیوە خۆیانی لێ دەرباز بکەن. لە کانوونی یەکەمی ٢٠١٨دا، لە دامەزراوەی کولتووردا من باسی ستراتیژییەتی بەڕێوەبردنی ئەفریقیام کرد، باسی ئەو

نیگەرانییەی خۆمانم کرد سەبارەت بەو نادادپەروەرییەی کە چین لە زۆرێك لە وڵاتانی ئەفریقی وەدەستی خستووە. هەروەها زۆرێك لە وڵاتانی ئەورووپی بازرگانییان لەگەڵ هواویدا کردبوو، ئێستاش بۆیان دەرکەوتووە کە دەربازبوونیان لێی زۆر قورسە. بۆ نموونە بەریتانیا، گفتوگۆکان زۆر قورس بوون، ئەگەرچی هەڵوێستەکان بە شێوەیەکی زۆر گەورە گۆڕانکارییان بەسەردا هات کاتێك کە جۆنسن بوو بە سەرۆك وەزیران و حکوومەتی نوێی پێکهێنا. بەڵام تاکو ئەوکاتەش زۆر زەحمەت بوو. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بەریتانیا لە ئاستێکی زۆر بەرز و بۆ ماوەیەکی درێژ پشتی بە هواوی بەستبوو، ئەم نیگەرانییە ڕەوایەش دەبوو سەرنجی تەواومان بخاتە سەر هێنانە ناوەوەی ئینتەرنێتی نەوەی پێنجەم بۆ نێو بازاڕ. نەوەك هەر تەنها ئەو ڕێگەیەی کە سزاکان کەم بکەینەوە نە چاودێریکردنی هواوی.

ژاپۆن هەڵوێستێکی زۆر توندی نواند، کاتێك ترەمپ سەردانی ئەو وڵاتەی کرد لە مانگی ئایار، ئابێ گوتی کە چین گەورەترین ئاڵنگاریی ستراتیژییە لەسەر ئاستی مەودای ناوەند بۆ درێژمەودا. ئەوان بەتەواوەتی سیستەم و یاساکان فەرامۆش دەکەن. هەوڵەکانیان بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخەی ئێستای خۆرهەڵات و باشووری دەریای چین جێگای قبوولکردن نییە. ئابێ هانی ترەمپی دا کە هەماهەنگیی ئەمریکا و ژاپۆن بپارێزێت لە دژی چین و بگرە زیاتریش. ئەمە شێوازی ستراتیژیەتی گفتوگۆکە بوو لەگەڵ هاوپەیمانێکی نزیك. هەروەها سەرۆك وەزیرانی ئوستوراڵیا، سکوت مۆریسۆن بە هەمان شێوە زۆر ڕاشکاوانە بوو، چوون بە جۆرێك لە هواوی دەڕوانی هەروەك لە ڕوانگەی منەوە بێت وابوو، هەروەها نیوزلەنداش هەنگاوێکی کتوپڕی گرتەبەر، بەڵام دڵخۆشکەر بوو.

ئێمە دەبوو دان بەوەدا بنێین کە زۆر درەنگ کەوتووین لە درککردن بە تەواوی ستراتیژییەتی هواوی، بەڵام ئەمەش نەدەبوو بە بیانووی ئەوەی کە

هەڵەکانی پێشومان ڕاست نەکەینەوە. تەنانەت کاتێك ئێمە کە ئەم گفتوگۆیانەشمان دەکرد، چین خەریك بوو ددانەکانی نیشانمان دەدا و بەشێوەیەکی نا-یاسایی هاووڵاتیانی کەنەدی دەستگیر دەکرد، هەر تەنها بۆئەوەی بڵێت کە دەتوانێت هەر شتێك بیەوێت بیکات. کەنەدا لەژێر گوشارێکی گەورەی ناوخۆییدا بوو، کە ترۆدۆ لای قورس بوو ڕووبەڕووی ببێتەوە. سەرۆك وەزیرانی پێشوو جان کریتیان کە هەرگیز دۆستی ئەمریکا نەبوو، دەیگوت نابێت کەنەدا بچێتە ژێر باری پەیمانی ڕادەستکردنەوەی تاوانباران بە ئەمریکا. پێنس و پۆمپەیۆ و من، هەموومان هانی کەنەدامان دا کە بە توندوتۆڵی لەسەر پێیەکانی بوەستێت و ئەوەشمان دووپات کردەوە کە بە هەموو شێوەیەك یارمەتییان دەدەین، تەنانەت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پرسی دەستگیرکراوانی کەنەدی لەگەڵ چین دەوروژێنین. هەروەها ئاماژەمان بەوەدا کە ئەمە ئەو ڕێگەیەیە کە چین گرتوویەتییە بەر، ئەگەرچی هەندێك لە خەڵکی بە "هەڵکشان لە ئاشتی" وەسفی دەکەن بەوەی کە "بەرپرسیارە لە گشت بەرژەوەندییەکان". باشە چین چۆن مامەڵە دەکات ئەگەر هاتوو ڕێگەمان دا کە هەیمەنە و دەسەڵاتی زیاتر بێت؟ ئەم مشتومڕە سەبارەت بە ئاسایشی نەتەوەیی لە داهاتوودا بەردەوام دەبێت. لکاندنی ئەم بابەتە بە بازرگانییەوە دەبێتە هۆی لاوازبوونی هەڵوێستمان هەم لە بازرگانی و هەمیش لە ئاسایشی نەتەوەیی.

لە سەرەتای مانگی ئایاردا، ڕۆز ئامادەکاری کرد بۆئەوەی کە هواوی بخاتە نێو "لیستی قەوارەکان"ی وەزارەتی بازرگانی، هەروەك پێشتریش هەمان شتی لەگەڵ ZTE کرد، کە ئەمەش قەدەغەی کۆمپانیا ئەمریکییەکان دەکات بەوەی کە هەر شتێك بفرۆشن بە هواوی بەبێ هەبوونی ڕووخسەتی تایبەت، ئەمەش دەبێتە هۆی زیانگەیاندنی گەورە بە هواوی. من زۆر بە توندی پشتگیری ئەمەم کرد، ئەمەش لەبەر هەمان ئەو هۆکارانەی کە وای دەکرد قەدەغەی هواوی و خزمەتگوزارییەکانی

بکەین. هواوی کۆمپانیایەکی بازرگانی نەبوو، هەروەها نەدەبوو وەکو کۆمپانیاش مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لە کۆبوونەوەیەکی تر لە ئۆڤاڵ نە ١٥ی ئایار، منوشن گوتی کە ئەگەر هواوی بخەنە نێو ئەم لیستە، ڕەنگە هەر بەیەکجاریی ببێتە هۆی داخستنی، ئەگەرچی ئەمە ڕاست نەبوو، بەڵام ئەگەر ڕووی دابوایە، ئەوا شتێکی گرنگ بوو بۆ من. بۆئەوەی ڕاستگۆ بین، دەبێت بڵێین کە لەوەدەچوو منوشن نیگەران بێت لەوەی کە هواوی هەرەس بێنێت، ئەمە بەر لە هەفتەیەك لەو پێنج مانگەی کە زۆر بەتینەوە دانوستانی بازرگانی لەگەڵ چین بەردەوام بوو، کە ئێستا وادەردەکەوت بیەوێت ئەم هەرەسە چاك بکاتەوە. منوشن گوتی کە ڕەشنووسەکەی ڕۆز لەبارەی هواوییەوە زۆر پەرگیرانە بوو، ڕۆزیش داوای لێ کرد ئەگەر وایە فەرموو بە دەنگی بەرز بیخوێنەوە تاوەکو ئەوانی تر بڕیار بدەن و ئەوەبوو منوشن وای کرد. ترەمپ گوتی: "بەڕاستی ڕەشنووسێکی زۆر باش و جوانە، لەگەڵ ئەم دێڕەی کە باسی ئەوە دەکات هواوی بخرێتە "لیستی قەوارەکان" ئەمەش زیاد بکە (بە ڕەزامەندیی سەرۆك)". منوشن دەستبەردار نەبوو، بەڵام لەوە زیاتر بەرگەی نەگرت بۆیە بەشێوەیکی پچڕ پچڕ بە ترەمپی گوت "من ئامۆژگاریی خۆمم پێ گوتی، بەڵام تۆ پەیڕەوی کەسێکی هەڵەت کردا".

لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لە ڕێککەوتی ١٨ی حوزەیران لەنێوان ترەمپ و شیی دا (پێشتر باسکرا)، شیی زۆر جەختی لەسەر هواویی کردەوە. ترەمپیش ڕای خۆی دووبارە کردەوە بەوەی کە دەکرێت هواوی بکرێتە بەشێك لە ڕێککەوتنی بازرگانیی دوو لایەنە، لەگەڵ هەموو لایەنەکانی تر کە قسەیان لەسەر دەکرێت. ئەوەبوو شیی هۆشداریدا لەوەی ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی تایبەت مامەڵە لەگەڵ هواویدا نەکرێت، ئەوا زیان بە پەیوەندیی هەردوولا دەگەیەنێت. لە دەرخستنێکی سەیردا، شیی بە جۆرێك وەسفی هواوی کرد کە کۆمپانیایەکی چینیی دیار و ناسراوە و

پەیوەندیی گرنگی بە هەردوو کۆمپانیای Qualcomm و Intel. هەیە، شیی دەیویست قەدەغە لەسەر هواوی هەڵگرێت و گوتی کە ئەو دەیەوێت بەتایبەت لەگەڵ ترەمپ لەسەر ئەم پرسە بدوێن. لەوەدەچوو کە ترەمپیش گوێڕایەڵ بێت. بەماوەیەکی کەم دوای تەواوبوونی تویتی کرد و هەستی بە خۆشحاڵی کرد. شیی وەکو ئەوەی کە هەستی بە لاوازی کردبێت و کۆمەڵەی بیست هان بدات بەوەی کە پرسی هواوی دەبێت وەکو بەشێك لە گفتوگۆ بازرگانییەکان دەبێت چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام ترەمپ بە پێچەوانەی هەڵوێستی پێشووی گوتی کە ئێستا ڕێگە دەدات بە کۆمپانیا ئەمریکییەکان بەوەی شت بە هواوی بفرۆشن، بەم جۆرە کاریگەرانە ڕۆزیی پێچەوانە کردەوە، هەروەك لە پێشووتریش ترەمپ لە پرسی ZTE پێچەوانەی کردبوویەوە. خۆشبەختانە، دوای ئەم کۆبوونەوەیە هەموو ئەو شتانەشمان پێچەوانە کردەوە، قسەکەی ترەمپیش هیچ گرنگییەکی نەبوو لە جیهانی ڕاستەقینەدا، بەڵام تۆ بڵێی کاریگەریی ئەم مامەڵە و هەڵسوکەوتەی ترەمپ لە دیدی چینییەکان چۆن بێت؟! ئێمە بەخت یاوەرمان بوو بەوەی کە چین هێندە بەخێرایی هەنگاوی نەنا بەرلەوەی ڕێگر بین لە هەر زیانێك.

دوای چەند کاتژمێرێك من پوختەی ئەمانەم بە منوشن گوت، ئەو وا دەردەکەوت کە نیگەرانە. منوشن گوتی: "دەبێ ئێمە سەرۆك بپارێزین سەبارەت بە هواوی، خەڵك وایان دانا کە ئەو خەریکە ئاسایشی نەتەوەیی لە بەرامبەر بە ZTE دەفرۆشێت، ئەگەریش ڕێگەمان دا هەمان شت بکات بەرامبەر بە هواوی، ئەوا هەمان جۆری کاردانەوەمان بەرامبەر دەکرێت و بگرە خراپتریش". ئەم قسەیە بۆ ئەوکات تەواو ڕاست بوو، تەنانەت بۆ ئێستاش هەر ڕاستە.

دان کوایل، جێگری سەرۆکی پێشوو، پێی گوتم کە لە مانگی تشرینی یەکەمی ٢٠١٨، دوای گەشتی هۆنگ کۆنگ، چین خراپتر و خراپتر بووە، لە هۆنگ کۆنگ چەندین بازرگانیان ڕفاندووە کە هاتبوونە نێو پەکین،

زۆرێکیش لەوانە هیچ شتێکیان لەبارەیەوە نەبیستراویەوە. کۆمەڵەی بازرگانی زۆر زۆر خراپ بوو، هەروەك باسیان کرد و لە ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی بڵاوکرایەوە. کوایل پێی وابوو کە یەکێك لەو هۆکارانەی وای کردووە چین بەم جۆرە مامەڵە بکات ئەوەیە کە ئابووریی هۆنگ کۆنگ لە ئێستادا بە ڕێژەی لە سەدا ٢ی تەواوی ئابووریی چینە، بە بەراورد لەگەڵ ئەوکاتە کە بەریتانیای مەزن ڕادەستی کردەوە لە ساڵی ١٩٩٧ دەگەیشتە لە سەدا ٢٠.

خەریك بوو ناڕازیەتییەکان لە هۆنك کۆنگ پەرەی دەسەند، ئەگەرچی دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش گرنگیان پێ نەدەدا. ئەو هەستەی کە زۆر بڵاوبوو ئەوەبوو کە پەکین خەریکە دەبێتە "وڵاتێك و دوو سیستەم". هەروەها کاتیش خەریك بوو تێدەپەڕی بەرلەوەی کە هۆنك کۆنگ ببێتە شارێکی تری چین. یاسای ڕادەستکردنەوەی تاوانباران حکوومەتی هۆنك کۆنگ پێشکەشی کردبوو، هەروەها لە سەرەتای مانگی حوزەیران ناڕەزایی و خۆپیشاندانی گەورە دەستی پێ کرد. بۆ یەکەم جار لە ١٢ی حوزەیران گوێبیست بووم کە ترەمپ کاردانەوەی هەبێت، کاتێك گوێبستی ئەوەبوو کە ژمارەی خۆپیشاندەران گەیشتووەتە نزیکەی ١,٥ ملیۆن: "ئەمە شتێکی گرنگە" هەر ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی گوتی کە "نامەوێت ئێمە بەشداربین" هەروەها "ئێمەش بە هەمان شێوە کێشەمان هەیە لە مافەکانی مرۆڤ". ئەمە بەشێوەیەکی زۆر هەڵمەتی منی ڕاگرت لەسەر تویتەر کە گوشاری دەخستە سەر چین تاوەکو ڕێز لەو ڕێککەوتنە بگرێت لە بەریتانیای مەزن، هەروەها تیشکم دەخستە سەر ئەوەی کە پێویستە چین ڕێز لە ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییەکان بگرێت، هەروەها بۆ هەموو ئەوانەش کە بە پەرۆشەوەن بۆ ئەگەری ڕێککەوتنی بازرگانی.

من هیواخواز بووم کە ترەمپ ئەم پێشوەچوونانەی هۆنك کۆنگ بە جۆرێك ببینێت کە بەسەر چیندا بەرزی بکاتەوە، ئەگەرچی پێویستیش

نەبوو، چونکە ئەو پشتیوانی لە خۆپیشاندەران کرد بەوەی کە بێهاوتابوونی هۆنك کۆنگ بپارێزن. من دەبوو باشتر ئەوە بزانم. لەمیانەی سەردانەکەی بۆ بەریتانیا لە ٤ی حوزەیران، لە یادی سی ساڵەی کوشتارگەی گۆڕەپانی تیانانمن، ترەمپ ڕەتی کردەوە کە کۆشکی سپی بەیان دەربکات. منوشن بە ترەمپی گوت کە ئەو نیگەرانی ئەوەیە ئەم ڕەشنووسانە کاریگەریان هەبێت لەسەر دانوستانە بازرگانییەکان و بۆیە دەیەوێت کەمی بکاتەوە. ئەمە بەراستی تا بڵێی شتێکی خراپ بوو، بەڵام ترەمپ گوتی کە ئەو بە هیچ شێوەیەك نایەوێت هیچ بەیانامەیەك دەربکرێت. گوتی "ئەم شتە بەر لە پەنجا ساڵ ڕوویداوە". "کێ گرنگی بە شتێکی لەم جۆرە دەدات؟ من دەمەوێ ڕێککەوتن ئەنجام بدەم، بۆیە هیچ کێشەیەکم ناوێت". هەرواش بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، خۆپیشاندەران سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا کاتێك کاری لامیی سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن پاشەکشەی بە پرۆژە یاسای ڕادەستکردنەوەکە کرد. ئەوەبوو خۆپیشاندانەکان بەردەوام بوون، دوای ئەوە خۆپیشاندانی دوو ملیۆنی لە هۆنك کۆنگ بەڕێوەچوو کە هەموو بەیەکەوە و بە یەك دەنگ هاواریان دەکرد دەبێت کاری لام دەست لە کار بکێشێتەوە.

لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لە ١٨ی حوزەیران، لەگەڵ ئەوەی باسی بازرگانی و مەسەلەی هواوییش کرا، ترەمپ گوتی کە ئەو چاودێریی ڕەوشی هۆنك کۆنگی دەکرد و دەزانێت لەوێدا چی ڕووی دەدا، بەڵام ئەمە کێشەیەکی ناوخۆی چینە و هەروەها ترەمپ بە ڕاوێژکارانیشی گوتبوو کە بەشێوەی ئاشکرا و بە هیچ جۆرێك باسی کێشەی هۆنك کۆنگ نەکەن. شیی زۆر سوپاسگوزار بوو، گوتی کە ئەوەی لە هۆنك کۆنگ ڕووی دا هەر بەڕاستی کێشەیەکی ناوخۆی چین بوو. هەروەها گوتی کە ئەو دۆسیەی یاسای ڕادەستکردنەوەیە کە بووە هۆی

خۆپیشاندانەکان لە هۆنك کۆنگ بۆ دەرچوونی کونە بچووکەکان بوون لە یاسادا و هەروەها پەیوەستیش بوو بە چەندین مەسەلەی تاوانکاریی مەترسی. شیی جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە هێمنی و پێشڤەچوونەکان بۆ هەریەك لە چین و ئەمریکا گرنگە، پێویستیشە لەسەر وڵاتانی تر کە چیتر دەستتێوەردان نەکەن لە کاروباری هۆنك کۆنگ. ترەمپ ڕەزامەند بوو. بەم جۆرەش هۆنك کۆنگ لەنێو خشتەی کارەکانمان هاتە دەرەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەك پۆمپەیۆ لە هەمان ڕۆژدا ئاماژەی پێدا کە زۆربەی ڕاپۆرتەکان، وەزارەتی دەرەوە ناچار دەکەن باس لە بارودۆخی هۆنك کۆنگ بکرێت بەبێ ئەوەی هیچ ڕێگە و دەرچەیەك بهێڵێتەوە بۆ ڕاکردن لێی. بەشێوەیەکی ڕەوانبێژی پرسیاری کرد: "لەچاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیی ڕۆژی یەکشەممە چی دەڵێیت؟"، "یان من یان هەر کەسێك لە ئێمە؟" تاوەکو نیوەی مانگی ئاب، چەندین ڕاپۆرتی میدیایی باسیان لە توندوتیژییەکانی چین دەکرد بەرامبەر بە خۆپیشاندەرانی هۆنك کۆنگ. من پوختەی ئەوەی دەمزانی بە ترەمپم گوت، ئەویش گوتی ڕەنگە تویتێك لەم بارەیەوە بکات. من هانم دا کە ئەگەر هات و تویتی کرد ئەوا هەر تەنها پشت بە سەرچاوە گشتییەکان ببەستێت، بەڵام هەروەك جارانی پێشوو ئەوەبوو ئەم ئاگادارکردنەوەی منی فەرامۆش کرد، ئەوەبوو لەجیاتی ئەوە بەم جۆرە تویتی کرد:

دەزگای هەواڵگریمان پێی ڕاگەیاندووم کە حکوومەتی چین زۆربەی هێزەکانی گواستووەتەوە بۆ سەر سنوور لەگەڵ هۆنك کۆنگ. لەسەر هەمووان پێویستە کە هێمن و لەسەرخۆ بن! زۆرێك لۆمەی من دەکەن، تەنانەت ئەمریکاش لۆمەی من دەکات سەبارەت بەو کێشانەی کە لە هۆنك کۆنگ ڕوودەدەن. بەڕاستی من نازانم کە چۆن وێنای ئەمە بکەم؟

دەبوو شتانێکی زۆر بوەستێنرێن لە دزەکردن لە نێو جەرگەی حکوومەتەوە.

لە ١٣ی ئابدا، دوای ئەوەی کە باسی فرۆشتنی ئێف-شازدە F-16 مان کرد بە تایوان (لە خوارەوە باس کراوە)، ترەمپ جارێکی تر تویتی کرد:

مـن زۆربـاش شـیی، سـەرۆکی چـین دەناسـم. ئەو سـەرکردەیەکی گەورەیە و ڕێزی گەلەکەی خـۆی دەگرێـت. ئەو کەسـێکی زۆر باشـە و "کاری قورسی" بەدەستەوەیە. من هـیچ گومـانێکم نییە کە ئەگەر سـەرۆك شیی بیەوێت کێشە هۆنك کۆنگ چارەسەر بکات بە خێرایی و بەشێوەیەی مرۆڤایەتی ئەوا دەتوانێت. ئایا پێویستی بە کۆبوونەوەی تایبەت دەبێت؟

بێگومان، لەگەڵ زۆربوونی قسەکردن لەبارەی هۆنك کۆنگەوە، هیچ گومانێك نەبوو کە شیی پەیوەندی دەکات. لەگەڵ نزیکبوونەوەی یادی حەفتا ساڵەی دامەزراندنی کۆماری گەلی چین لە ١ی تشرینی یەکەم، پەشۆکییەکان لەزیادبووندا بوون. کەس پێی وانەبوو کە پەکین قبووڵی خۆپیشاندانی فراوان بکات لە هۆنك کۆنگ، بەتایبەتی ئەگەر خۆپیشاندانەکان بەرەو پشێوی و ئاڵۆزی گۆڕان، ئەوا شیی تەواو نائومێد دەبێت. ئاژانسی شینوایی نوێی چینی هۆشداریی دا لەوەی کە "کۆتایی بەڕێوەیە".

لەگەڵ ئەوەشدا لە مانگی تشرینی دووەم، پاڵپشتانی دیموکراسی هەڵبژاردنە نێوخۆییەکانی ئەنجوومەنیان گۆڕی بۆ ڕیفراندۆم لەبارەی داهاتووی شارەکە. بەشێوەیەکی زۆر سەیر، هۆنك کۆنگ بە ژمارەیەکی زۆر بەشداربوو دەنگی دا و زاڵ بوو بەسەر ئەو کاندیدانەی کە پشتگیری لە پەکین دەکەن و بەتەواوی ئەنجوومەنی سیاسی ناوخۆی پێچەوانە کردووە. ئەم جەنگە بەردەوامی هەبوو.

---

چین بۆ ماوەی چەندین دەیەیە کە کەمینەکانی خستووەتە ژێر مەترسی بۆ نموونە تبتییەکان، هەروەها ئویگۆرەکان. ترەمپ لە ئێوارەخوانی سەری

ساڵی ٢٠١٨ پێی گوتم کە بۆچی بیر لە سزادانی چین نەکەینەوە بەهۆی ئەوەی کە خراپ مامەڵە لەگەڵ ئویگۆرەکان دەکات کە زۆرینەیان موسڵمانن و لە ناوچەی شینجیانگی باکووری خۆرئاوای چین نیشتەجێن. ڕۆز هەر ئەو بەیانییە ئاگاداری کردمەوە کە ترەمپ نایەوێت سزای چین بدات بەهۆی ئەوەی کە ڕێککەوتنی بازرگانی لە ئارادا هەیە. دۆسیەی ئویگۆرەکان لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا جێگای خۆی کردبوویەوە، بەڵام هێشتا بەتەواوی ئامادە نەبوو کە بڕیاری لێوە بدرێت. کارەکە بەرەو خراپتر چوو. لە ئێوارەخوانی کردنەوەی کۆمەڵەی بیست لە ئۆساکا، کە تەنها وەرگێڕەکان لەوێ بوون، شی بۆ ترەمپی ڕوونکردەوە کە بۆچی ئەو کەمپی دەستگیرکردن و گیراوانی لە شنجیانگ دروستکردووە. بەگوێرەی قسەی وەرگێڕەکەمان بێت، ئەوا ترەمپ بە شی گوتبوو پێویستە ئەو بەردەوام بێت لە دروستکردنی ئەم کەمپانە و ئەمە شتێکی تەواو دروستە کە ئەو دەیکات. پوتینگەر پێی گوتم کە ترەمپ لەمیانەی گەشتەکەی بۆ چین لە ٢٠١٧ شتێکی لەم جۆرەی گوتبوو، ئەمەش مانای ئەوەیە کە چین دەکرێت بەردەوام بێت لە سەرکوتکردنی ئویگۆرەکان و ئێمەش ئەم شتە فەرامۆش بکەین و بەهۆیەوە چین سزا نەدرێت، یان هیچ نەبێت تا ئەوکاتەی کە دانوستانە بازرگانییەکان بەردەوام دەبن.

سەرکوتکردنی ئایینی لە چین لەنێو کارنامەی ترەمپ نەبوو، ئینجا ئەم سەرکوتکردنەی کاسۆلیکەکان بن یان فالۆن گۆنگ بن. ئەوا هیچ کامێکیان تۆمار ناکرێن. ئەمە ئەو کاتە نەبوو کە پێنس و پۆمپەیۆ و من لەوێ بووین، بەڵکو هەر داواکاری ترەمپ بوو. لەلایەکی تر باڵیۆزی ئەمریکی - نێودەوڵەتی بۆ ئازادیی ئایینی، سام براون باك، گوشاری دەست پێ کردبوو تاوەکو ترەمپ چالاکییەکی ئازادیی ئایینی ئەنجام بدات لە مانگی ئەیلوول لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان، کە ئەو پێی وابوو

"چین لە زۆربەی ئەم بوارانەدا زۆر خراپە" ئەمەش حەقیقەتەکە بوو.

---

ترەمپ بەرامبەر تایوان ڕەشبین بوو، دوای ئەوەی کە گوێبیستی پسپۆڕانی دارایی وۆڵ ستریت بوو کە چەندە قازانجیان لە وەبەرهێنانەکانیان کردووە لە بەشی کیشوەریی چین. ئەگەرچی بە چەندین جۆر ئەمە هاتووەتە پێش، بەڵام یەکێك لە بەراوردە هەرە دڵخوازەکانی ترەمپ ئەوەبوو کە ئاماژەی بە قەڵەمەکەی دەکرد و دەیگوت: "ئا ئەمەیە تایوان"، پاشان ئاماژەی بە مێزی ڕیزوڵوت دەکرد و دەیگوت: "ئا ئەمەشە چین". ئەمە زۆربوو بۆ ڕاسپاردە و ناچارکردنی هاوپەیمانێکی تری دیموکراتی. تایوان زۆر بە جددی دەیویست مامەڵەی بازرگانیی ئازاد لەگەڵ ئەمریکا بنیات بنێت، کە ئەمە هیچ جۆرە بایەخ و گرنگییەکی لێ نەکەوتەوە. بەدرێژایی ئەوەی کە من لەوێ بووم، چین پاشەکشەی کردبوو، وەك ئەوەی لە لووتکەدا هەست بە لاوازی بکات، بێگومان لەبارەی ئەو هەموو پارەیەش کە قسەی لەسەر دەکرا لە وۆڵ ستریت شتی بیستبوو. یانگ جیتشی لە کۆبوونەوەی ٨ی مانگی تشرینی دووەم پوختەی باسێکی پێدام سەبارەت بەوەی کە تایوان هەستیارترین و گرنگترین دۆسیەیە لە نێوان پەیوەندییەکانی ئەمریکا و چین. ئەو ئاماژەی بەوە دابوو کە ئێمە پێشتر بەرژەوەندیی هاوبەشمان هەبوو لەوەی کە دان نەنێین بە سەربەخۆیی تایوان وەکو ئەوەی کە ئێمە هاوبەشی ئەو پیلانە بووبین، بێگومان من باوەڕم بەوە نەبوو. ئەو بەبێ کۆتا باسی سیاسەتی "وڵاتی چین وەك یەك وڵات" کرد، کە لە بەرژەوەندیی پەکین بە هەڵە بەکاری دەبرد. لە خوانی ئێوارەی بۆینس ئایرێسدا، شیی ئاگاداری کردینەوە کە وردبین بین سەبارەت بە تایوان، ترەمپیش ڕەزامەند بوو بەوەی کە گوتی ئەو ئاگادارە، ئەمەش مانای وابوو کە ئێمە لە مردن ڕزگارمان بوو. بەڕاستی من زۆر دڵخۆش بووم کە ئەم باسە کورت بوو و زوو بڕایەوە.

شیی لە ئۆساکا هاتەوە سەر باسی تایوان، بەوەی گوتی ئەم باسە پەیوەستە بە سەروەریی چین و نەزاهەی نیشتمانی، هۆشداری دا لەوەی کە ڕەنگە ببێتە هۆی لەگرێژنەبردنی پەیوندیی دوولایەنەمان. ئەو داوای لە ترەمپ کرد کە سەرنجی تایبەتی خۆی لەبارەی ئەم باسەوە بلێ. شیی هەمیشە منی پەست دەکرد، ئەو هانی ئیمەی دەدا کە ڕێگە نەدەین بە تسای ئینگ ونیی سەرۆکی تایوان تاوەکو گەشت بۆ ئەمریکا بکات، هەروەها چەکیشیان پێ نەفرۆشین، کە ئەو ئەم باسەی وەك ئاشتی و هێمنی گەروویی تایوان سەیر دەکرد. زۆربەی قسەکانی شیی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پێچەوانی یاسای ڕێککەوتنی پەیوەندییەکانی بوو لەگەڵ تایوان لە ساڵی ١٩٧٩ کە ڕێگە دەدات بە ئەمریکا چەك بە تایوان بفرۆشێت بەمەبەستی بەرگریکردن لە خۆی، لەنێویشیاندا فرۆشتنی فڕۆکەی ئێف - شازدە بۆ ئەوەی توانستی بەرگریی تایوان بەهێزتر بێت. لە ڕاستیدا تایوان دوور بوو لە هەموو باسێکی شەڕکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە. دان کوایل لە مانگی تشرینی یەکەم پێی گوتم کە تایوان سوپاکەی بۆ نیوە کەم کردووەتەوە لەم ساڵانەی دواییدا، ئەمەش شتێك بوو وای لێ کردم کە وەك هەڵەیەکی گەورە لێکی بدەمەوە. پۆمپەیۆ مەترسییەکانی کۆنگرێسی وەلاوە نابوو لە فرۆشتنی ئێف - شازدە، نیگەرانی ئەوە بوو کە جگە لە بۆڵەبۆڵ، کە ترەمپ سەبارەت بە تایوان دەیکرد، ئەمجارە هەر ڕێگە بگرێت لە هەنگاونان. بەڕەچاوکردنی ئەو بارودۆخەی کە ئێمە خەریك بوو چەك بە ئۆکرانیا بفرۆشین، ئەوا ئەم باسە خەیاڵی نەبوو. ستراتیژیەتێکمان دانا بۆئەوەی قەناعەت بە ترەمپ بکەین و ئەوەبوو مایك مولڤانیشمان خستە نێو خشتەکە، چوون ئەو ئەندامی پێشووی کۆنگرێس بوو لە کارۆلینای باشوور، ئەوێ ویلایەتێك بوو کە زۆربەی پارچەکانی بۆینگی سەرەکی تێدا دروست دەکرا. لە ١٣ی مانگی ئابدا، لە ڤیدیۆ کۆنفرانسێك لەدوای نیوەڕۆ ئەوەمان بۆ ترەمپ ڕوون کردەوە لە بێدمینستەر، کە کاردانەوەیکی سیاسی زۆر گەورە دروست دەبێت ئەگەر بێت و ئەم فرۆشتنە ڕوونەدات. هیچ هاریکارییەکی دارایی ئەمریکی یان

هاریکارییەکی بیانی لە ئارادا نەبوو، تایوان ئامادەبوو تێچووی تەواوی فڕۆکەکانی ئێف - شازدە بدات، بە نرخی تەواوی کە دەگەیشتە ٨ ملیار دۆلار و هەروەها بووژانەوەی چەندین کار لە کارۆلینای باشوور. هەروەها گوتمان کە باشتر وایە ئێستا هەنگاو بنێین بەر لە ئەوەی کە لە هۆنك کۆنگ هیچ شتێك ڕووبدات. ترەمپ پرسی: "ئایا هیچ بیرت لە نەفرۆشتنی کردووەتەوە؟" بێگومان وەڵامەکە نەخێر بوو. ئەوەبوو ترەمپ دواجار گوتی: "باشە، بەڵام بە بێدەنگی ئەمە بکە، بەڵام جۆن تۆ هیچ شتێك لەمبارەیەوە ئاشکرا ناکەیت، وایە؟"، لە ڕاستیدا من بیرم لەوە نەکردبوویەوە، بەڵام دەبوو بیری لێ بکەمەوە.

دوای ئەوەی کە کۆشکی سپیم جێ هێشت و کاتێك کە ترەمپ کوردەکانی بێئومێد کرد و لە سوریا بە تەنیا جێی هێشتن، ئیدی تێڕوانینی تر لە ئارادا بوو بەوەی ئاخۆ ئەم جارە کێی تر نائومێد دەکات. تایوان لە سەرووی ئەم لیستەوە بوو، ڕەنگە هەر لە سەرووی ئەم لیستەش بمێنێتەوە هەتاوەکو ترەمپ سەرۆك بێت، کە ئەمەش ئەگەرێکی دڵخۆشکەر نییە.

---

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٢٠، هەورە تریشقەی زیاتر لە چینەوە هات، لەوانەش "ڤایرۆسی کۆرۆنا". ئەگەرچی زانایانی نەخۆشییە درمەکان (جگە لە شارەزایانی چەکی بایۆلۆژی) لە داهاتوودا بۆ ماوەیەکی درێژ لەم کارەساتە دەکۆڵنەوە، بەڵام ئاماژەکانی حکوومەتی زۆردار و ستەمکار و سیستەمی سانسۆری کۆمەڵایەتی لە چین لە هەموو ئەم شتانەدا هەیە. هیچ گومان لەوە دانییە کە چین ئاشکراکردنی زانیارییەکانی درەنگ خست و شاردنییەوە، بەتایبەت سەبارەت بە سەرچاوەی نەخۆشییەکە و دەرکەوتن و بڵاوبوونەوە و ڕێژەی بڵاوبوونەوەی، کاتەکەی، بواری بڵاوبوونەوەی؛ ئەوەبوو پزیشکەکان و ئەوانی تری سەرکوت کرد، هەروەها تەواوی ئەو هەوڵانەی ئیفلیج کرد کە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی و ئەوانی تر دەیاندا بۆ ئەوەی زانیاری وردیان لەمبارەیەوە دەست بکەوێت؛ هەروەها

بەشداربوون لە بەلاڕێدابردنی زانیارییەکان بەوەی کە هەوڵیان دا و گوتیان ڤایرۆسەکانی (سارس، کۆڤید-٢) و تەنانەت ئەم ڤایرۆسەش (کۆڤید - ١٩) لە چین سەری هەڵ نەداوە. بەڵام بە پێچەوانەوە، کاریگەریی ئەم شاردنەوەی زانیارییانە زیاتر لەسەر هاوپەیمانە نزیکەکانی چین دەرکەوت. بۆ نموونە ئێران، یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە زۆر زیانی لێ کەوت، مانگە دەستکردەکان وێنەی چاڵی زۆریان گرتبوو کە وا دەردەکەوت بۆ قوربانیانی کۆڤید -١٩ یە.

لەبەرئەوەی کە ساڵی ٢٠٢٠ ساڵی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتییە، دەبوو ترەمپ ئەم کێشە تەندروستییە جیهانییەی کردبا بە بابەتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن، بەنزیکەیی و ڕاستەوخۆ هەر ئەوەیشی کرد. ڕەخنەیەکی زۆر لەمبارەیەوە گیرا، بە دڵنیاییشەوە سەرەتا ئاڕاستەی ئیدارەی پێشوو کرا بەوەی کە ئەم نەخۆشییە کاریگەری زۆری نابێت لەسەر ئابووری یان ئەسڵەن هەر کاریگەری نابێت. لاری کودلۆی سەرۆکی ئەنجوومەنی ئابووریی نیشتمانی لە ٢٥ی شوباتدا گوتی کە "ئێستا ڤایرۆسەکە بوونی هەیە، بەم نزیکانە زیاتر تەشەنە دەسێنێت". کاردانەوەی بازاڕ بەرامبەر ئەو جۆرە لێدوانە زۆر نەرێنی بوو، چوون ئەمە شتێك بوو کە ڕەنگە بووبێتە هۆی خەبەرکردنەوەی کۆشکی سپی سەبارەت بە مەترسییەکانی ئەم کێشەیە. ڕوون و ئاشکرایە کە کاریگەرییەکانی ئەم پەتایە جگە لە لایەنی مرۆیی، کاریگەرییە ئابوورییەکانیشی بێگومان تاوەکو هەڵبژاردنەکانی مانگی تشرینی دووەم و زیاتریش دەمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەوڵەکانی ترەمپ بۆ دەرچوون لە هەر تەنگوچەڵەمەیەك دەبێتە هۆی کەمباوەڕکردنی لەلایەن گەلەوە، چوون قسەکانی وا دەردەکەوتن کە زیاتر باس لە زیانە سیاسییەکان دەکات نەوەك باس لە بەرپرسیارەتی لە تەندروستیی گشتی بکات. یەکێك لە نموونەکان ئەو هەوڵە ناشیرن و خراپە بوو کە لە ڕاپۆرتێکی هەواڵ وەرگیرابوو بەوەی کە ئیدارەکەی هەوڵی داوە پۆلێنی ئەو زانیارییانە بکات، کە دەرخەری ساختەیی وڵاتی چینە لەم باسە.

بێگومان کە چین لەمە تێوەگلابوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە زانیاریی بەشێوەیەکی فراوان و ناڕاست بڵاوکردبوویەوە نەوەك گڵدانەوە. هەر ئەوەش بوو کە ترەمپ بە بەردەوامی دەیگوتەوە بەدرێژایی ئاریشەکە، ئەمەش لە ترسی ئەوەی کە کار بکاتە سەر ڕێککەوتنی بازرگانی لەگەڵ چین، یان کار لە شیی جینگ پینگی هەستیار بکات. هەر چۆنێك بێت ڕەخنەکانی تر بێبایەخ بوون. بۆ نموونە یەکێك لەو سکاڵایانە ئاڕاستەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کرابوو کە من هەر لە مانگەکانی سەرەتای کارکردنم بە جوانی بە ئەنجامم گەیاندبوو لە کۆشکی سپی. ئەمیش بۆ بەرگرتن لە دووفاقی و دەستتێوەردان و بوونی هاریکاری و چالاکی. ئەمە شتێکی زۆرباش بوو کە بەرپرسیارێتییەکە لەو بەڕێوەبەرایەتییەوە بگۆڕێت کە ئیدارەی تەندروستیی جیهانی دەکات بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئێستا کە مامەڵە لەگەڵ چەکی کۆکوژ دەکات (بایۆلۆژی و کیمیایی و ئەتۆمی). دەشێت نیشانەکانی چەکی بایەلۆژی و نەخۆشییە درمەکان هاوبەش بن، بۆیە شارەزایی پزیشکی و تەندروستیی گشتی بەیەکەوە دەبێت هەوڵ بدەن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا. جگە لەوەش بەیەکەوە لکاندنی ئەم دوو بەڕێوەبەرایەتییە دەبوو هۆی پەیدابوونی هەلی کاری زیاتر بەشێوەیەکی زۆر، ئەمە جگە لە بەرزکردنەوەی ئەولەویەتی ئاسایشی بایەلۆژی، بەوەی لە ڕووی پێکهاتەییەوە دەزانرێت کە ڕەنگە هەڕەشەکان لە هەر دوو لاوە بێن، ئینجا ئەم ڤایرۆسانە سروشتی بن یان دەستکردی مرۆڤ بن.

زۆربەی کارمەندان کە لە بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی جیهانی پێشوو کاریان دەکرد، گواسترانەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی هاوبەش و بەردەوام بوون لەسەر هەمان کاری پێشوویان. کەسێك گواسترایەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و لەوێدا لە کارەکانی بەردەوام بوو سەبارەت بە دۆسیەی تەندروستی لە نەتەوە یەکگرتووەکان و دەستەکانی تر. وەکو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، زۆربەی کارمەندەکان لە بەڕێوەبەرایەتی و ئاژانسەکانی تر دێن، دواتر بۆ ماوەی یەك بۆ دوو ساڵ وەکو کارمەند لەوێ کار دەکەن. ئەم کردارە بەم جۆرە بەردەوامی دەبێت. تیم مۆریسۆن،

بەڕێوەبەری یەکەم کە من بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم بابەتە هێنام، هەروەها جێگرەکەی ئانتۆنی ڕۆجێرۆ، هەردووکیان سەرکەوتن لە تەرکیز خستنە سەر تەندروستیی جیهانی. من وەکو خۆم ئەوەم ڕوونکردەوە کە تەندروستیی جیهانی لە ئەولەویاتەکانمانە، هەروەها ڕۆڵی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی نەگۆڕاوە. ئەم جۆرە ڕەخنانەش لە ئیدارەی پێشووترەوە سەرچاوەی گرت، کاتێك دەرچووانی ئیدارەکەی ئۆباما لە سەرەتادا ئۆفیسێکی تەندروستیی جیهانیی سەربەخۆیان کردەوە بە پشتبەستن بە چالاکییە سیاسییە بنەڕەتییەکانیان. کارمەندانی ئۆباما پێچەوانەی ئەم ڕوانگەیە بوون کە دەبێت کۆشکی سپی لە تەواوی وردەکاریی کردارەکان بەشداریی وردی پێ بکرێت، کە ئەمەش لەگەڵ بیرۆکەکەی سکوکروفت پێچەوانەیە بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، هەروەها لەگەڵ فەلسەفەی بەڕێوەبردنیش کە بەشێوەیەکی گونجاو دەسەڵات دابەش دەکات ئەمەش ڕێگەیەکی ڕاست و زۆر چالاکە بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەی سیاسەتەکان.

ئەدای بەڕێوەبەرایەتییەکان کە ڕێکخرابوون هەروەك من پێشبینیم کردبوو زۆر باش بوون. لە ڕاستیدا، بەشێوەیەکی زۆر سەرکەوتوو مامەڵە لەگەڵ پەتای ئیبۆلا کرا کە لە خۆرهەڵاتی کۆنگۆ و ناوچەکانی دەوروبەری بڵاوببوویەوە، لە ڕێگەی ئاژانسە هاوبەشەکان لە ساڵی ٢٠١٨-٢٠١٩. جگە لە بەردەوامیی چاودێرییەکان، من یارمەتییەکانم لەوەدا کورت کردەوە کە گرەنتیی ئاسایش و پاراستنی سەنتەری کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکان بکەم، تاوەکو بگەنە ئەو ناوچانەی کۆنگۆ کە زیانیان پێ گەیشتووە. کاتێك ئۆفیسی بەرپرس لە بوودجە داوای کردبوو کە پارەی تەواو خەرج بکرێت، ئەوکات خودی ترەمپ بە کوپەرمانی گوتبوو کە چەندە پارە پێویستە با دابنرێت تاوەکو "ئیبۆلا لە دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بمێنێتەوە". جگەلەوەش، بەڕێوەبەرایەتییەکە سەرپەرشتیی ستراتیژیەتێکی نیشتمانی کرد بۆ بەرگریکردن لە بایەلۆژیی لە ٢٠١٨،٣٧ و هەروەها دوو بڕیاری سەرەکی گرنگی دەرکرد، یەکێکیان (پێڕەوی

ستراتیژیەتێکی نوێی دەکرد) سەبارەت بە پشتگیریکردنی پاراستنی بایەلۆژی لە مانگی ئەیلول ٣٨،٢٠١٨ هەروەها یەکێکیش سەبارەت بە نوێکردنەوەی ڤاکسینی ئەنفلەوەنزا بوو لە ئەیلوولی ٣٩،٢٠١٩، ئەم دەستکەوتانە و ئەوانی تریش بەشێوەیەکی چالاك لە دەستکەوتەکانی کاری هاوبەشی نێوان ئاژانسەکان بوون.

هەیکەلی ناوەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی زیاتر نەبوو لە باڵی لەرزیوی پەپوولەیەك لەنێو تسونامیی ئاژاوەی ترەمپ. ئەمە سەرەڕای ئەو بێ موبالاتییەی چینی دەسەڵاتداری کۆشکی سپی، هێشتا کارمەندانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی هەڵسان بە ئەرکی سەرشانیان لە کاتی پەتای ڤایرۆسی کۆرۆنادا. هەروەك چۆن ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز لە ناوەڕاستی مانگی نیساندا لە ڕاپۆرتێکی گرنگ ئاماژەی پێدابوو:

> ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بەرپرس لە بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشییە درمەکان، لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەم کۆمەڵێك ڕاپۆرتی دەستکەوتبوو کە پێشبینی هاتن و بڵاوبوونەوەی ئەم ڤایرۆسەی کردبوو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا چەند بژاردەیەکی پێشکەش کرد، لەوانە مانەوەی ئەمریکییەکان لەماڵەوە، هەروەها داخستنی شارەکان بە ڕووی یەکتریدا. بەڵام ترەمپ تاوەکو مانگی ئازار نەیهێشت ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکرێت.

بەم شێوەیە، کاردانەوەکان بەرامبەر ڤایرۆسی کۆرۆنا لەلایەن تیمی بایەلۆژیی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بەم جۆرە بەڕێوەچوو کە پێشبینی کرابوو. بەڵام ئەم کورسییە[1] بەتاڵ بوو کە لە پشت مێزی ڕیزوڵوتەوە بوو.

(١) مەبەست کورسییەکی ترەمپە لە ئۆفیسی ئۆڤاڵ.

بەشێوەیەکی سەرەکی، پاش هەژمارکردنی هەموو تێچووە گیانی و ئابوورییەکانی ڤایرۆسی کۆرۆنا، دوو دەرەنجامی دژوار هەبوون. یەکەم: دەبێت هەموو هەوڵ و ڕەنجی خۆمان بدەین تاوەکو گرەنتی ئەوە بکەین کە چین سەرکەوتوو نەبێت لە هەڵمەتە چەواشەکارەکەی سەبارەت بە ئەسڵی ڤایرۆسەکە، بەوەی کە تواناى ئەوەی هەبێت لە سەدەی بیست و یەکدا هێشتا تەکنیککی درۆکردن هەر زیندووە و باشە. دەبێت حەقیقەت بڵێین سەبارەت بە هەڵسوکەوتی چین، کە ترەمپ هەمیشە ڕقی لە کردنی دەبوویەوە، چوون وای دادەنا کە لە داهاتوودا دەبێت بەدەست ترس و سزاوە بناڵێنین.

دووەم: دوای ئەوەی کە بۆ ماوەی چەند دەیەیەك جەنگی بایەلۆژی (هەروەها کیمیایی) کەم بوویەوە و وەکو "چەکی پیاوی داماو" هەژمارکرا، بۆ نموونە وەکو کۆریای باکوور و ئێران و ئەوانی تر لە سەرانسەری جیهاندا -پێویستە بە جۆرێك لەگەڵ ئەم دوو چەکە مامەڵە بکەین بە هۆشیاری وەك ئەوەی کە چەکی ئەتۆمی بێت. لە ڕاستیشدا، من لەمیانەی هاوبەشپێکردنی بەڕێوەبەرێتیی ئاسایشی بایەلۆژی و بەڕێوەبەرێتیی چەکی کۆکوژ خەریك بوو ئەم شتە بکەم. ئەم سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەیە. لە ڕاستیدا دابەزاندنی ئاستی ئاسایشی نەتەوەیی نەبوو، بەڵکو هەوڵێك بوو بۆ دەرکەوتنی زیاتری هەڕەشەی بایەلۆژی دژ بە ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا[1].

(١) بیرمەند و سیاسەتوانی ئەمریکی، نوام چۆمسکی لەم چاوپێکەوتنانەی ئەم دواییەدا چەندین جار ئەوەی دووبارە کردەوە کە ترەمپ تاوانبارە بە کەمکردنەوەی بوودجەی سەنتەری نەخۆشییە درمەکان و پاشان هەڵوەشاندنەوەی سەنتەرەکە، کە لەوەو پێش توانیبووی ئەمریکا لەم پەتایانە بپارێزیت و کەچی کۆڤید-١٩ ئەمریکای بەرەو وێرانی برد و ڕێکۆردی تووشبوون و مردووانی شکاند.

## بەشی یازدە

## چوون بۆ هانۆی هیلتن و دەرچوون لێی، هەروەها پانموجۆم

پاش ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کۆنگرەی ٢٠١٨، چاوەڕێی دیدارێکی تری نێوان ترەمپ و کیم جۆن ئون دەکرا. ئارەزوومەندیی ترەمپ بۆ واژووکردنی ڕێککەوتنێک لەگەڵ کۆریای باکوور لە هەڵکشان و داکشاندا بوو، بەڵام پاش تێپەڕینی شەش مانگ بەسەر ڕێککەوتنەکەی سەنگافورە و ڕوونەدانی شتێکی وا، ئارەزوومەندییەکەی زیادی کرد. بڕیار بوو پەمپەیۆ لە ڕۆژی پێنجشەممەی هەشتی تشرینی دووەم، لە نیویۆرک کیم یۆنگ چۆلی کۆریای باکوور ببینێت، کیمیش دەیوست لە هەمان ڕۆژ یان ڕۆژی دواتر لە کۆشکی سپی دیدارێکی تریان هەبێت. خۆشبەختانە من بە مەبەستی ئامادەکاری بۆ دیدارێکی ترەمپ لە پاریس دەبووم، بۆیە دیمەنەکەی بەهاری ٢٠١٨ دووبارە نەدەبوویەوە. وێناکردنی ئەوەی کیم یۆنگ چۆل دێتەوە بۆ نووسینگەی هێلکەیی و بێزاری دەکردم. خۆشبەختانە کیم جۆنگ ئون گەشتەکەی هەڵوەشاندەوە. دەرفەتی دیداری موون جای ئین و کیمیش دیار نەبوو، لە باشترین حاڵەتیدا دەکەوتە ٢٠١٩ەوە.

هەر چۆنێک بێت، لە پاش سەری ساڵ خێراییەکە زیادی کرد و گەرمبوونی ترەمپیش زۆری نەدەویست. کیم جۆنگ ئون بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا سەردانی "پەکین"ی کرد، کە دەکاتە هەشتی کانوونی دووەم، پێشدەچوو مەبەستی سەردانەکەی ئامادەکاری بێت بۆ دیدارێکی تر لەگەڵ ترەمپ. پاش ئەوە کیم یۆنگ

چۆل لە ١٧ی کانوونی دووەمدا سەردانی واشنتۆنی کرد و ڕۆژی دواتریش ترەمپی دی. نەمدەتوانی چاوەڕێ بکەم. بە پەمپەیۆم گوت نەشتەرگەرییەکی بچووکم هەیە و بەروارەکەی ئەو ڕۆژەیە؛ پێی گوتم ئەگەر یارمەتیم ویست پێی بڵێم. کیم یۆنگ چۆل نامەیەکی تری کیم جۆنگ ئونی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، هەروەها دیدارەکەی نووسینگەی هێلکەییش ٩٠ خولەکی پێ چووبوو، خەنی لە خۆم کە لە نەشتەرگەرید بووم. چارلس کووپەرمان (کە تازە جێی ڕیکاردیڵی گرتبوویەوە) لە دیدارەکەدا ئامادە بووە و دەڵێت گفتوگۆکە بێ ئەنجام بووە. کووپەرمان هیچ پابەندییەکی ڕاستەقینەی لە ترەمپ نەبینیوە، لە کۆتاییشدا ترەمپ گوتوویەتی هەتا کۆریای باکوور دەست لە چەکی ناوەکی هەڵنەگرێت ناتوانێت سزاکانی لەسەر لابدات، چونکە ئەگەر وابکات کارێکی گێلانەی کردووە، لەوەشدا ڕاستی کردووە و شتێکی باشیشە ترەمپ هێشتا ئەوەی لەبیر بووە. لەوانەیە ئەوە بنچینەی ستراتیژییەکی مەزن نەبێت، بەڵام ئێمە ئەوەمان هەبوو کاری لەسەر بکەین. دانوستانەکانی ئاستی ستافیش خرابوونە کۆتایی هەفتەوە لە سوید، ترسی منیش لەوە بوو لەوێوە شتەکان لە دەست دەربچن. بەپێی ڕاپۆرتی ڕاگەیاندنەکان وا دەردەکەوت، بە تایبەتی کە کۆریای باکووریش نوێنەری تایبەتی خۆی دیاری کرد، کە کیم هیۆک چۆل بوو و شارەزایی لە گفتوگۆکانی شەش لایەنەکەی سەردەمی بوشدا هەبوو. ئەوە نیشانەیەکی باش نەبوو.

کاتێک شوێن و کاتی دیدارەکە دیاری کرا و خرایە ٢٧ و ٢٨ی شوباتەوە لە هانۆی، زۆر بیرم کردەوە لەوەی چۆن ڕێگری لە کارەساتێک بکەم. لێدوانەکانی بایگن لە ستانفۆرد ئاماژەیان بەوە دەکرد بەڕێوبەرایەتی ئامادەیە بۆ شوێنکەوتنی هاوکێشەی "کردار بە کردار" کە کۆریای باکوور داوای کردووە، ئەوەش نیگەرانییەکانی منیان زیاد دەکرد، گەڕانەوەی وەزارەتی دەرەوەش بۆ دۆخی ئاسایش لە لایەکی ترەوە بوەستێت:

هاوکارینەکردن و گفتوگۆنەکردن لەسەر ئەوەی بە کۆرییەکانیان دەگوت. وەزارەتی دەرەوە لە گفتوگۆ شەش لایەنییەکانیشدا هەمان کاری لەگەڵ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کرد. ڕێی تێدەچوو پەمپەیۆ ئاگادار نەبێت لەوەی بایگن سوورە لەسەر ڕێککەوتن. بەڵام ئەگەر پەمپەیۆش فەرمانی بە بایگن دابێت ئەوەندە سوور بێت لەسەر ڕێککەوتن، یاخود ڕێگای پێدابێت، یاخود هەر ئاگاشی لێ نەبووبێت، دەرئەنجامە مەترسیدارەکان هەمان شت بوون.

تا ئەو جێیەی وا دەردەکەوت دانوستانکارانی وەزارەت خۆیان پێ جڵەو نەکرێت و مەستی ڕێککەوتن و سەرنجی ڕاگەیاندن بن، بیرم لەوە کردەوە بۆ ئەوەی ڕێگری لە هەڵە بکەین لە دیدارەکەی هانۆی، پێویستە لەگەڵ خودی ترەمپدا دابنیشین. پێم وابوو دەبێت چاوپێکەوتنەکانی ترەمپ لەپێش دیداری هانۆی جیاوازتر بن لەوانەی پێش دیداری سەنگافورە، چونکە کاریگەرییەکی وایان نەبوو. یەکەم دانیشتنی خۆئامادەکردن بۆ هانۆی لە ١٢ی شوباتدا بوو لە ژووری کۆبوونەوە، هەروەها کاتژمێر چوار و چلوپێنج خولەک دەستی پێ کرد و چلوپێنج خولەکیشی خایاند. فیلمێکمان پەخش کرد، لە سەرەتادا چەند گرتەیەکی کارتەر، کلینتن، بوش، ئۆباما بوو کە هەموویان دەیانگوت ڕێککەوتنی گرنگیان لەگەڵ کۆریای باکووردا کردووە، پاشان چووە سەر مامەڵەی کۆریای باکوور لەپاش دیداری سەنگافورەوە و پیشانی دەدا چۆن فریویان داوین. کۆتایی فیلمەکە دیمەنێکی ڕەیگان بوو باسی دیدارەکەی خۆی و گۆرباشۆڤی دەکرد لە ساڵی ١٩٨٦. ڕەیگان دەیگوت لە مامەڵەدا باشترە پابەند بیت وەک لەوەی قایل بیت. گفتوگۆیەکی نەرم هەبوو و ترەمپیش پرسیاری باشی کرد، دانیشتنەکەش زۆر ورد بوو، لە ڕێی خۆی لای نەدا. کاتێک تەواو بووین، ترەمپ قسە گرنگەکانی کرد: "هێزی گفتوگۆکە لای من دەبێت؛ پێویست ناکات پەلەم لێ بکرێت؛ بۆم هەیە ڕێککەوتن نەکەم."

ئەو چاوپێکەوتنە ترەمپی گەیاند بەو ڕاستییەی کە دیداری هانۆی یەکسان نییە بە سەرکەوتن و شکست؛ ئەگەر بیزانیبایە بەرەوپێشچوونێکی وا لە ئارادا نابێت، دەیتوانی وەک دۆخی پێشوو درێژە بە شتەکان بدات. لەوە باشتر نەدەگوترا.

پەستانی ئابووریی ئێمە لەسەر کۆریای باکوور بەهێزتر بووبوو، بەڵام تەنها لە ڕووی ڕێژەوە. لەگەڵ ئەوەشدا سزاکان خاڵێکی بەهێزی نزیکمەودایان بە ئێمە دا. کیم جۆنگ ئون زیاتر شەیدای ڕێککەوتن بوو، چونکە فشارەکە بەربەستێکی بەهێز بوو لە بەردەم هەوڵەکانی ئەودا بۆ بەرەوپێشبردنی ئابووریی ناوەوەی کۆریای باکوور. لەسەر ئاستی دوورمەوداش، کات هەمیشە لە بەرژەوەندیی ئەوەدایە کە گەشە دەکات، بەڵام پێناسەی من لێرەدا بۆ دوورمەودا دوو هەفتەیە: تێپەڕاندنی دیداری هانۆی بەبێ پاشەکشە و ڕەزامەندیی کارەساتبار. ئەگەر هەموو جۆرە پەلەکردنێمان ڕابگرتایە لە هەمبەر ئەو ڕێککەوتنەی وەزارەتی دەرەوە زۆر مەیلی لێی بوو، من زۆر ئاسوودە دەبووم. پێشبینیم کردبوو هەرپاش دیداری دووەمی ترەمپ و کیم فشاری زیاترمان بکەوێتە سەر و بەشێوەیەکی لاواز مامەڵە بکەین. دەمانتوانی سەرنج بخەینە سەر ئەو هەڕەشە کوشندەیەی لە کۆریای باکوورەوە دەهات، کە بریتی بوو لەوەی ئایا ئەوان چەکی ناوەکی و مووشەکی بالیستیکی تاقی دەکەنەوە یان نا. زۆر خەنی بووم بەوەی چاوپێکەوتنەکەمان بێکەڵک نەبووە و بۆی هەیە کاریگەری باشمان لەسەر ترەمپ دانابێت.

دووەم چاوپێکەوتن لە ١٥ی شوبات بوو، کەمێک پاش کاتژمێر دوو، دیسانەوە چلوپێنج خولەکی خایاند. کورتەی فیلمێکی پروپاگەندەی کۆریمان نمایش کرد کە پیشانی دەدا ئەوان هێشتا تێکەڵی یاریی جەنگن، لە کاتێکدا ئێمە بە فەرمانی ترەمپ تێکەڵی نین. ڤیدیۆکە سەرنجی ڕاکێشا و داوای کرد کۆپییەکی فیلمەکەی بدەینێ. سەرنجمان لەسەر گرنگترین

خاڵ بوو: دەستهەڵگرتنی تەواو لە چەکی ناوەکی. ترەمپ داوای دەرئەنجامەکانی چاوپێکەوتنەکەی کرد لەسەر پەڕەیەک، ئێمەش لەوەوپێش ئەوەمان ئامادە کردبوو و دامان پێی. پاش گفتوگۆیەکی باش ترەمپ گوتی، "ئەمە ڕێک بخەن و بیهێننەوە بۆم،" ئەوە ئاماژە بوو بۆ ئەوەی بۆی هەیە بیدات بە کیم جۆنگ ئون. من جەختم لە گرنگیی ڕاگەیاندنێکی بنچینەیی کردەوە بۆ دیدارەکە، نەک ئەو ڕێبازە هەنگاوبەهەنگاوەی وەزارەتی دەرەوە دەیویست. پێم وابوو دووەم چاوپێکەوتنیش باش بوو، توانیمان هەموو ئامانجەکان بپێکین بێجگە لەوەی ترەمپ بخەینە ئەقڵییەتێکی ڕاستەوە بۆ ئەوەی لە هانۆی پێگەی خۆی نەدۆڕێنێت و نەبێتە لایەنی لاوازی ڕێککەوتنەکە.

تەنانەت پەیوەندییەکی تەلەفونیی موون جای ئینی کۆریای باشووریش لە ١٠ شوباتدا زیانێکی وای نەبوو، کە دەیویست جەخت لە بەرنامەی کۆریای باشوور بکاتەوە. ترەمپ ڕایگەیاند ئەو تەنها کەسە دەتوانێت ڕێککەوتنێکی ناوکی لەگەڵ کیم جۆنگ ئوندا بکات. ئەو جەختی لە موون جای ئین کردەوە بە ڕاگەیاندن بڵێت بەرەوپێشچوون هەبووە، چونکە بەگشتی ڕاگەیاندنەکان هەموو کارەکانی ئەویان بە نەرێنی دەزانی. ترەمپ پەیمانی دا بەرژەوەندیی کۆریای باشووریش ڕەچاو بکات، بەڵام جەختیشی کردەوە لەوەی کیم جۆنگ ئون ڕێککەوتنی دەوێت. هەمووان ڕێککەوتنیان دەویست. لە هەمان ڕۆژدا من و پەمپەیۆ و بایگن و ئەلیسن هۆکەر لەگەڵ ترەمپدا کۆبووینەوە. ترەمپ گوتی، "بۆمان هەیە ڕێککەوتن ڕەت بکەینەوە،" ئەوەش خاڵی سەرەکی چاوپێکەوتنەکان بوو. ترەمپ بە بایگنی گوت، "بە کۆرییەکان بڵێ کیمم زۆر خۆش دەوێت، بەڵام ئەوەشیان پێ بڵێ کە دەمەوێت."

لەپاش گفتوگۆکە، من و پەمپەیۆ چووین بۆ ئۆفیسەکەی من تا قسە لەسەر هانۆی بکەین. دیسانەوە جەختم کردەوە لەوەی ڕاگەیاندنێکی بنچینەیی لە

لایەن کۆریای باکوورەوە خاڵی سەرەتای دانوستانێکی زیرەکانە دەبێت. ڕوونیشم کردەوە بۆچی نابێت دەست لە سزا ئابوورییەکان هەڵبگرین و بۆچیش دەبێت فشاری زیاتر بکەین. پەمپەیۆ بە بیستنی بۆچوونەکەم مووی گرژ بوو، بەڵام دژی ناوەڕۆکەکەی نەبوو. هەر لەو ڕۆژەدا لە دانیشتنێکدا لەسەر کۆریای باکوور، بایگن لاوازییەکی ئاشکرای نواند کە زۆرێک لە ئامادەبوانی بێزار کرد، لە ناویشیاندا شاناهان و دەنفۆرد و تەنانەت پەمپەیۆش. ئەو بەڕێوبەری بایگن بوو یان نا؟ دەنفۆرد ویستی دڵنیا بێتەوەوە لەوەی هەر "ڕاگەیاندنێکی کۆتایی-جەنگ" هیچ کاریگەرییەکی پابەندکەری یاسایی نابێت، ئەوەش بێگومان ئەو پرسیارەی دروست کرد کە بۆچی ئێمە گوێ بەو باسە دەدەین. کۆریای باکوور پێیان گوتبووین گرنگی بەو بابەتە نادەن و ئەوە شتێکە کە مون دەیەوێت. کەوایە بۆچی ئێمە هەوڵی بەدەستهێنانی بدەین؟!

سێیەم و کۆتا چاوپێکەوتنی ئامادەکاری بۆ دیدارەکە لە ٢١ی شوباتدا بوو. ڕۆژێک پێش دیدارەکە ئابێ شینزۆی سەرۆک وەزیرانی ژاپۆن پەیوەندییەکی وردودرشتی کردبوو. کۆمەڵێک کاردی چاوەڕواننەکراو و زۆرزانانەمان ئامادە کردبوو کە بۆی هەبوو کیم جۆنگ ئون لە هانۆی بەکاریان بهێنێت و پاشەکشەی ناپێویست بە ترەمپ بکات. ئەو چاوپێکەوتنەش چلوپێنج خولەکی خایاند و دەرئەنجامێکی سەرکەوتووی کۆششەکانمان بوو. ئەوەی ئایا چاوپێکەوتنەکان ئەوەندە بەهێز بوون ڕێگری لە پاشەکشەی کارەساتبار بگرن بەرامبەر بە کیم، لە داهاتوودا دەردەکەوت.

٢٤ی شوبات بەڕێ کەوتم بۆ هانۆی. کاتێک بەڕێوە بووین بەرەو وێستگەی پڕکردنەوەی سووتەمەنی لە ئانکۆراج، نووسراوێکمان پێگەیشت لەسەر ئەمریکا و کۆریای باکوور. ئەلیسن هوکەر گوتی نووسراوەکە هی بایگنە و سەرچاوەکەی دیدارێکە لەگەڵ کۆریای باکووردا. وا

دەردەکەوت کۆرییەکان ئامادەکارییان کردبێت و هەموو ئەو پاشەکشانەی دەژمارد کە ترەمپ لە نووسینگەی هێلکەیی بۆ کیم یۆنگ چۆلی کردبوو لە بەرامبەر ئەوەی کۆریای باکوور قایل بێت بە پێناسەکردنی ناڕوونی "دەستهەڵگرتنی تەواو لە چەکی ناوکی." بەلامەوە سەیر بوو بۆچی پەمپەیۆ ڕێگای بە نووسینێکی وا داوە. چی ئەگەر کۆرییەکان وشە بە وشە قبووڵیان کردبێت؟ ئەوە هەڵەیەکی گەورەی تری پرۆسەکە بوو، هەروەها بۆمبێکی سیاسیش بوو. کووپەرمانم ڕاسپارد بەوەی نووسینەکە پیشانی مولڤانی و ستیڤن میلەر بدات لە واشنتۆن، مولڤانیش هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی ئەو نووسینە هەڵەیەکی گەورەی سیاسییە و دەستدرێژیشە بۆ سەر پرۆسەی ڕێکخراوی نێودەزگایی. ئەوان لەگەڵ ترەمپدا لە ئەیرفۆرس وەندا بوون و بەرەو هانۆی دەچوون، هەر لەوێشدا کێشەکانیان بۆ ڕوون کردبوویەوە. ترەمپ بە تەواوەتی بێئاگا بوو لەو نووسینە، کەوایە بایگن فەرمانی سەرەوەی خۆی پێ نەبووە. پەیوەندیم بە پێنسیشەوە کرد لە ئەیرفۆرس تو لە کاتێکدا ئەو لە دیداری کۆمەڵەی لیماوە لە باگۆتاوە دەگەڕایەوە بۆ واشنتۆن، ئەویش هەمان کاردانەوەی منی هەبوو بۆ نووسینەکەی بایگن.

هەرئەوەندەی گەیشتینە هوتێلی شاندی ئەمریکا کە هوتێلی جەی دەبلیو ماریۆت بوو، هەوڵم دا بزانم بابەتەکە چییە. تۆمارەکە زۆر تێکەڵاو بوو، بەڵام لە وەزارەتی دەرەوە بە سەختی کاریان دەکرد بۆ ئەوەی پێش گەیشتنی ترەمپ هەموو شتێک دەربارەی نووسینەکەی بایگن بزانن.

بەرەبەیانی داهاتوو کە دەیکردە چوارشەممە و ٢٧ی شوبات بوو، مولڤانی بە پەمپەیۆ و منی گوت ترەمپ زۆر خەمبارە لە هەواڵێکی گۆڤاری تایم لەسەر بابەتی چاوپێکەوتنەکانی و ئەوەی گوایە سەرنجی نەداون و لێیان تێنەگەیشتووە. من دەربارەی هەواڵەکەی تایم هیچم نەبیستبوو، بەڵام پەمپەیۆ بیستبووی و دەیگوت تایم کورتەیەک لەسەر ژیانی دەنووسن،

لەوانەشە بابەتەکە لەوێوە سەری هەڵدابێت. پەمپەیۆ دەیویست لێدوانێکی هاوشێوەی ئەوەی چەند مانگ لەوەوبەری بدات، کە گوتبووی ترەمپ بە باشی بەشداری چاوپێکەوتنەکانە. من پێشتر لێدوانی وام نەدابوو. ئەوکاتیش بۆ دەرگای دەرچوون دەگەڕام لەو ژوورە بۆ ئەوەی ناچار نەبم لێدوان بدەم. وتارەکەی تایم خوێی کرد بە برینی ئەو پەیوەندییە گرژەی لەگەڵ کۆمەڵگای هەواڵگریدا هەبوو. ترەمپ بە دان کۆتسی بەڕێوبەری دەزگای هەواڵگری نەتەوەیی گوت "گێل،" پاشانیش لە بەرزکەرەوەکەدا لە من و پەمپەیۆی پرسی: "ئایا لەگەڵ جینا هاسپێلی سی ئای ئەیدا هەڵەمان کردووە؟"

دواتر چووینە ژوورێکی تر تا ڕاوێژی ترەمپ بکەین لەسەر ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە. ترەمپ هێشتا بێزاری وتارەکەی تایم بوو، بەڵام بەوە دەستی پێ کرد کە قسەکانی بایگنی بەدڵ نەبووە و زیادەڕەوی تێدا بووە؛ بێگومان مەبەستی لەو نووسینە بوو کە کووپەرمان و مولڤانی لە ئەیرفۆرس وەندا پیشانیان دابوو. کاریگەریی نووسینەکە بەسەر هەموانەوە دیار بوو. پاش برێک قسە لەسەر وتارەکەی تایم، ترەمپ دیسانەوە ڕەخنەی لە بایگن گرتەوە و قسەکانی پێشتری دووبارە کردەوە. (شایەنی باسە کە بەرەبەیانی ڕۆژی داهاتوو بایگنی بینی نەیناسییەوە.) ترەمپ گوتی بە بۆچوونی ئەو ئەگەری سێ دەرئەنجام هەیە: ڕێککەوتنێکی گەورە، ڕێککەوتنێکی بچووک، یاخود "ڕێککەوتن ناکەم." یەکسەر ئەگەری ڕێککەوتنی بچووکی ڕەت کردەوە، چونکە ڕێککەوتنی بچووک کەمکردنەوەی سزاکان بوو. ڕێککەوتنی گەورە ڕووی نەدەدا چونکە کیم جۆنگ ئون ڕەتی دەکردەوە بڕیارێکی ستراتیژی بدات لەسەر وازهێنان لە هەموو چەکە ناوەکییەکانی. بیرۆکەی "ڕێککەوتن ناکەم" هاتەوە کایە، کە نیشانە بوو بۆ ئەوەی ترەمپ ئاگاداری ئەو هەڵبژاردنەیە و بۆشی هەیە بە دڵی بێت. ترەمپ بە شانهەڵتەکاندنێکەوە گوتی هەرچی بکات هەر ڕەخنەی لێ

دەگیرێت، بۆیە باسی ڕێکنەکەوتنەکەی ڕەیگانم بۆ کرد لە ڕیکاڤیک و پێیم گوت کاریگەریی زۆر باشی لەسەر دانوستانەکانی داهاتووتر هەبووە. ترەمپ بیری لەوە دەکردەوە لە کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکەدا چی بڵێت ("هێشتا کەیفمان بە یەکتری دێت؛ بەردەوام دەبین لە قسەکردن") پاشان ڕووی کردە من و گوتی، "دەبێت بڕۆیت و بەرگری لەو قسانە بکەی".

وا دەردەکەوت ترەمپ نوقمی ئەو شایەتییە بوو کە بڕیار بوو مایکڵ کۆهینی پارێزەری پێشووی بیدات؛ ئەوە یەکێک بوو لەو حاڵەتە دەگمەنانەی کێشە کەسییەکانی ترەمپ تێکەڵ بووبوو بە ئاسایشی نەتەوەیی. دڵخۆش بووم بەوەی چاوپێکەوتنەکانی پێشتری لەیاد مابوو و هێشتا بژاردەی ڕێکنەکەوتن زیندوو بوو. پاشان تەواوی ڕۆژەکە تا کاتی خوانی ئێوارەی ترەمپ و کیم جۆنگ ئون لە گفتوگۆدا بووین لەگەڵ سەرکردە باڵاکانی ڤێتنام. لەوکاتەدا کە لە واشنتۆن بەیانی بوو، هەموو هەواڵەکان لەسەر مایکڵ کۆهین بوون. کۆرییەکان نەیانهێڵا من بەشداری خوانەکە بکەم و ترەمپ تەنها پەمپەیۆ و مولیڤانیی لەگەڵدا بوو، پاشتریش دوو سەرۆکەکە دووبەدوو هەندێک قسەیان کرد. ئەو بێبەشکردنەم پێ ناخۆش بوو، بەڵام ئەوەش باجێك بوو کە دەبوو بمدایە.

پاش کۆتاییهاتنی خوانەکە لە کاتژمێر نۆ، مولیڤانی بانگی کردم بۆ ژوورەکەی خۆی تا ڕاوێژێکی کورت لەگەڵ پەمپەیۆ و ئەوانی تردا بکەین. ترەمپ ویستبووی تا بەیانیی ڕۆژی داهاتوو هیچ قسەیەک لەسەر ناوەڕۆکی دیدارەکە نەکات، بەڵام پەمپەیۆ گوتی لە کۆتایی خوانەکەدا کیم لە بەرامبەر لابردنی هەموو سزاکانی پاش ٢٠١٦ی یوئێن لەسەر کۆریا، پێشنیاری دەستهەڵگرتنی کردووە لە هەموو کەرەستە ناوکییەکانی یۆنگبیۆن. ئەوە فێڵێکی نموونەیی "کردار بە کردار" بوو، چونکە ئەوە ئەو بووژانەوە ئابوورییەی بە کۆریا دەدا کە دەیانویست، لە بەرامبەریشدا شتێکی وای بە ئێمە نەدەدا، چونکە لای هەمووان ڕوون بوو کۆریای

باکوور جێی تری هەبوو بۆ بەردەوامیدان بە بەرنامە ناوکییەکەی. گوتم ئایا کیم جۆنگ ئون مەرامی شاراوەی تری هەبووە، پەمپەیۆ گوتی پێم وا نییە. پرسیاریشم کرد لەسەر ئەوەی ئایا ترەمپ باسی کێشەی فڕاندنی هاوڵاتییە ژاپۆنییەکانی کردووە، پەمپەیۆ گوتی کردوویەتی، ئەوەش واتای ئەوە بوو ترەمپ پابەندیی خۆی بەرامبەر بە ژاپۆن جێبەجێ کردبوو.

وامزانی کاری ئەو شەوەمان کۆتایی هاتووە، بەڵام هەر زوو باسی ئەوە هات کە گوایا دەنفۆرد و شاناهان دەیانەوێت لەسەر کێشەیەکی هیندستان و پاکستان لەسەر باڵۆنێک قسە لەگەڵ من و پەمپەیۆ بکەن. پاش چەند کاتژمێرێک لە پەیوەندیی تەلەفونی کێشەکە چارە کرا، پێم وابێت هۆکاری ئەو چارەسەرە خێرایەش ئەوە بوو کە کێشەکە لە بنەڕەتدا بوونی نەبوو. بەڵام کاتێک دوو هێزی ناوەکی توانا چەکدارییەکانیان بەگەڕ دەخەن، پشتگوێنەخستنی دۆخەکە باشترین بژاردەیە. لەو کاتەدا کەس گرنگی پێ نەدەدا، بەڵام بەلای منەوە بابەتەکە ڕوون بوو: کاتێک گرنگییەکی زۆر بە بابەتی پەرەپێدانی چەکی ناوەکی لە لایەن وڵاتانی هاوشێوەی ئێران و کۆریای باکوورەوە نادرێت، ئەنجامەکەی هەر ئەمە دەبێت.

بەیانیی دواتر، ٢٨ی شوبات، ڕۆژە گەورەکە بوو. ترەمپ شەوی بە تەماشاکردنی شایەتییەکەی کۆهینەوە بەسەر بردبوو، بۆیە چاوپێکەوتنە ئامادەکارییەکانی هەڵوەشاندنەوە. نیگەرانی ئەوە بووم ترەمپ بیەوێت چاوی ڕاگەیاندن لەسەر شایەتییەکەی کۆهین لابدات، تەنها بە کردنی کارێکی دراماتیک و چاوەڕواننەکراویش دەیتوانی ئەوە بکات. ڕێکنەکەوتن و جێهێشتنی دیدارەکە ئەو ئامانجەی دەپێکا. لە لایەکی تریشەوە، ڕێککەوتنێکی گەورەی پڕ لە کەموکورتییش هەر ئەو ئامانجەکەی دەپێکا. هەرچۆنێک بێت کەموکورتییەکان یەکسەر دەرنەدەکەوتن. من و پەمپەیۆ و مولڤانی لەگەڵ ترەمپدا بەڕێ کەوتین بۆ

هۆتێلی میترۆپۆل. ئەو لە کەسێکی بیستبوو دەبێت داوا لە کۆریای باکوور بکەین واز لە مووشەکە بالیستیکییە کیشوەربڕەکان بهێنێت، بەڵام من پێم وابوو دەستبەرداربوونی هەموو گوللەتۆپە ناوەکییەکان گرنگتر بوو. دەستبەرداربوونی کۆریای باکوور لە مووشەکە کیشوەربڕەکان، مەترسییەکانی سەر ژاپۆن و کۆریای باشوور و هێزە سەربازییە بڵاوەبووەکانی ئێمەی کەم نەدەکردەوە، هەروەها چارەسەری ئەو مووشەکە کەممەوداترە دەریاییانەشی نەدەکرت کە کۆریای باکوور هەوڵی بۆیان دەدا. ترەمپ بە بێزاری و نائومێدییەوە پرسیاری کرد ئایا ڕێککەوتنێکی بچووک هەرای زیاتر دەنێتەوە یان ڕێکنەکەوتن. بە بۆچوونی من ڕێکنەکەوتن بابەتێکی زۆر گەورەتر بوو. ترەمپ بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر ڕێنەکەوێت چۆن ڕوونی بکاتەوە، پەمپەیۆ گوتی دەتوانێت ئەمە بڵێت، "لایەنەکان یەکیان بینی و بەرەوپێشچوون هەبوو، هێشتاکە ڕێککەوتن ئەنجام نەدراوە. سەرەڕای شکستی ئەم دیدارەش، لە داهاتوودا لایەنەکان یەکتری دەبیننەوە و قسەی دیکە دەکەن." ترەمپ بەدڵی بوو. ئەو دێڕە هەناسەی توند کردم، بەڵام مادام ترەمپ ڕێککەوتنی نەدەکرد و ڕوونکردنەوەکەی بەدڵ دەبوو، گلەییم نەدەکرد. ترەمپ بە ئاڕاستە ڕاستەکەدا دەڕۆیشت، بەڵام بچووکترین شت، دەیتوانی ١٨٠ پلە ڕووداوەکان پێچەوانە بکاتەوە. کاتێک گەیشتینە میترۆپۆل، بە هیچ جۆرێک نەمدەزانی کۆتایی ڕۆژەکە چۆن دەبێت.

ترەمپ و کیم لە نۆی بەیانیدا دیداری دووبەدوویان هەبوو، دیدارەکە چل خولەکێکی پێچوو. پاشان چوونە ناو حەوشەیەکەوە و پەمپەیۆ و کیم یۆنگ چۆلیش چوونە لایان تا پشوویەکی دە خولەکی بدەن. کیم جۆن ئون گەرما و ڕادەی شێی کەشەکەی بەدڵ نەبوو، بۆیە چوونەماڵێکی شووشەییەوە کە وەک قاوەخانە بەکار دەهات و بێگومان فێنککەرەوەی تێدا بوو. گفتوگۆکەیان بەردەوام بوو، ئێمەش لە پەنجەرەی ماڵە

شووشەیەکەوە چاومان لێیان بوو. ناخۆشحاڵیم لە ڕووخساری کیمدا دەخوێندەوە. خوشکەکەی کیم خۆڕاگرانە لە دەرەوە وەستابوو، گوێی بە گەرما و ڕادەی شێیەکە نەدەدا، لە کاتێکدا ئەمریکییەکان بەرگەیان نەگرت و چوونە ژوورەوە و نزیکی فێنککەرەوەکە کەوتنەوە. دوای یەک کاتژمێر دیدارەکە کۆتایی هات و ترەمپ هاتە بەشی سەرەکیی هۆتێلەکە تاکو پشوویەکی سی خولەکی بدات.

کاتێک گەیشتینە ئەو ژوورانەی بۆ ئێمە تەرخان کرابوون، ترەمپ یەکسەر تەلەڤیزیۆنەکەی خستە سەر فۆکس نیوز تا بزانێت شەوی پێشوو چۆن هەواڵی شایەتییەکەی کۆهین و ڕووداوەکانی هانۆیان گواستووەتەوە. پەمپەیۆ گوتی گفتوگۆکە هەروەک ئەوەی دوێنێ شەو بووە، کیم دەڵێت لە بەرامبەر هەڵگرتنی هەموو سزاکاندا واز لە یۆنگبیۆن دەهێنێت، ئەوەش بە هیچ جێیەک نەگەیشتووە. پەمپەیۆ گوتی کیم جۆنگ ئون زۆر نائومێد و تووڕەیە لەوەی ترەمپ خواستەکانی بەدی ناهێنێت. هیچ قسەیەک لەسەر مووشەکە بالیستیکییەکان، بەرنامە چەکدارییەکانی کۆریای باکوور بۆ پەرەپێدانی چەکی ناوکی و کیمیایی و زیندەیی نەکرابوو؛ هەمووی هەر باسی یۆنگبیۆن بووبوو. ماندوویی و نائومێدی بە ڕووخساری ترەمپیشەوە دیار بوو. دیار بوو نائومێد بووبوو لەوەی ڕێککەوتنێکی قایلکەر لە بەردەستدا نییە. لەوەوە زانیم هێشتا هەر لە قۆناغە مەترسیدارەکەداین. هەتاکو ترەمپ لە ڕاگەیاندنەکانەوە ئەنجامەکەی باس نەکردایە بابەتەکە بۆ ئەو کۆتایی نەدەهات، هەندێ جار ئەوکاتیش هەر کۆتایی نەدەهات. هێشتا هەر بیرۆکەی ڕێکنەکەوتنی لا پەسەند بوو: ڕێککەوتنی گەورە دیار نەبوو، بە ڕێککەوتنی بچووکیش قایل نەدەبوو. باوەڕم وابوو خەریکە غەریزە هەڵەشەکانی ترەمپ دەردەکەون؛ ئەو دەیویست بابەتەکە یەکلایی بکاتەوە و بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا (بێگومان پاش کۆنفرانسە گەورەکە).

دیدارە گەورەکە (ترەمپ، پەمپەیۆ، مولیڤانی، هەروەها منیش لەم لای مێزەکەوە؛ کیم جۆنگ ئون، کیم یۆنگ چۆل، ڕی یۆنگ هۆ لەو لای مێزەکەوە؛ بێگومان وەرگێڕەکانیش) خرایە یازدەی بەیانییەوە. سەرەتا ئێمە گەیشتین، پاشانیش کۆرییەکان هاتن و تەوقەمان لەگەڵ یەکدی کرد. بە کیم جۆنگ ئونم گوت، "جەنابی سەرۆک، خۆشحاڵم بەوەی دەتبینمەوە،" کە ئومێدەوار بووم ئەو قسەیەم بە ڕاستی بێت. بابەتی ڕاگەیاندن هاتە ئاراوە و ترەمپ لە کیمی پرسی، "ڕاگەیاندنەکان بێزارت ناکەن؟" کیم کەمێک سەرسام بوو و گوتی، "پرسیارێکی ڕوونە. ئەو بارە لەسەر شانی من نییە،" پاشان پێکەنی. ترەمپ گوتی دەتوانین بڵێین خۆشحاڵانە قسەمان لەسەر مافەکانی مرۆڤ کردووە، چونکە ڕاگەیاندنەکان یەک پرسیاریان لە کیم کردووە. (پێکەنینێکی تر). ترەمپ بابەتەکەی بەرەو جدیبوون برد و لە کیمی پرسی کە لە پشووەکەدا گەیشتووەتە چ شتێکی نوێ؟! کیم خۆشحاڵ نەبوو بەوەی ئەو هەموو ڕێیەی بەرەو هانۆی بڕیوە و بە قسەی خۆی شتێکی هێندە گەورەی خستووەتە سەر مێزی گفتوگۆ، کە ئەوانەی پێش خۆی هەرگیز نەیانخستووە، تەنانەت ترەمپیش قایل نەبوو. ئەمە هەندێک کاتی برد.

لە کاتێکدا کیم قسەی دەکرد، ترەمپ داوای لە من کرد ئەو پێناسەی "دەستهەڵگرتنی تەواو لە چەکی ناوەکی"یەی بدەمێ کە لە چاوپێکەوتنەکانی واشنتۆن باسمان لێوە کردبوو، هەروەها داوای ئەوەشی کرد خۆی پێی دەگوت لاپەڕەی "داهاتووی ڕۆشن،" منیش پەڕەکانم پێی دا. ترەمپ پەڕەکانی دایە دەستی کیم و پێشنیاری بۆ کرد بگەڕێتەوە بۆ کۆریای باکوور و ئێوارەکانی داهاتووی لە هانۆی هەڵبوەشێنێتەوە. کیم پێکەنی و گوتی ناتوانێت ئەوە بکات، بەڵام ترەمپ بە خۆشحاڵییەوە وردبوویەوە لەوەی کە ئەوەش بۆ خۆی دیمەنێکی گەورەی لێ دەردەچێت. ترەمپ بە کیمی گوت چی ترت پێیە بیخەیتە سەر مێزی

گفتوگۆ؛ ئەو دەیزانی کیم نایەوێت ئەو خراپ دەرکەوێت، چونکە تاکەکەسە لایەنی کیم بگرێت. کیم یەکسەر ستایشەکەی بۆ ترەمپ سەندەوە، چونکە هەر ئەو لایەنی ترەمپی دەگرت. ترەمپ وا تێگەیشت کیم قسەکەری کۆتایی کۆریا بێت و قسە لە قسەیدا نەکرێت. کیم بەلایەوە سەیر بوو کە ترەمپ ئاوا شتەکان دەبینێت، هەروەها گوتی تەنانەت ئەو سەرۆکەشی کە جڵەوی هەموو شتێکی لایە هەر پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە دەبێت بۆ ئەوانی تر. ترەمپ گوتی تێدەگات لەوەی کیم ویستویەتی کۆڕایی بەدەست بهێنێت.

کیم جەختی لە کاریگەریی "پاشەکشەی" یۆنگبیۆن کردەوە بۆ کۆریا و باسی ئەوەی کرد لە ڕاگەیاندنەکانی ئەمریکادا چەندێک باس لەو بیرۆکەیە دەکرێت. ترەمپ دیسانەوە داوای لە کیم کرد شتێکی زیاتر بخاتە سەر مێزەکە، وەک لابردنی ڕێژەیەکی دیاریکراوی سزاکان نەک لابردنی تەواوەتی.

گومانی تێدا نییە ئەوە خراپترین ساتی کۆبوونەوەکە بوو. ئەگەر کیم جۆنگ ئون لەوێدا بیگوتایە بەڵێ، بۆی هەبوو ڕێککەوتنێکی کارەساتبار یەخەی ئەمریکا بگرێت. خۆشبەختانە کیم نەیگوت بەڵێ و پێی وابوو لە حاڵەتێکی وادا هیچی دەست ناکەوێت، بۆیە چیتر باسی سزاکان نەکرا.

ترەمپ ویستی بابەتەکە بگۆڕێت، بۆیە باسی یەکگرتنەوەی کۆریای باشوور و باکووری کرد لەگەڵ بۆچوونی چین لەو بارەیەوە. کیم ماندوو بوو لە بابەتە لاوەکییەکان و داوای گەڕانەوەی کرد بۆ سەر بابەتە سەرەکییەکە.

ترەمپ هێشتا دەیویست پەرە بە پاکێجەکەی کیم بدات، بۆیە پێشنیاری لەناوبردنی مووشەکە دوورمەوداکانی کرد، ئەوانەی دەیانتوانی لە ئەمریکا بدەن. من ئەوەم بە لەبەرچاونەگرتنێکی ڕوون زانی بۆ ئەوەی پێشتر دەربارەی نیگەرانییەکانی کۆریای باشوور و ژاپۆن گوتم لەسەر ئەو

مووشەکە کورتمەودایانەی دەتوانێت لەوان بدات. پاشان ترەمپ بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گوتی، "جۆن، بۆچوونی تۆ چییە؟"

من ئەو دەرفەتەم لەدەست نەدەدا. گوتم پێویستمان بە هەڵوەشاندنەوەی تەواوی بەرنامەکانی کۆریای باکوورە بۆ چەکی ناوەکی و کیمیایی و زیندەیی و مووشەکی بالیستیکی. ئەوە هەنگاوێکی باو بوو لە دانوستانەکانی جڵەوکردنی چەکدا و دانوستانەکان بەبێ ئەو هەنگاوە شکستیان دەهێنا.

ترەمپ پێی گوتم کە قسەکانم کەمێک ئاڵۆزن، بەڵام لە هەمان کاتدا سەیرێکی کیمیشی کرد تا بزانێت کاردانەوەی ئەو چییە.

کیم ئەوەی بەدڵ نەبوو، دەیگوت ئەگەر هەنگاوبەهەنگاو بڕۆین بە وێنەیەکی فراوانتر دەگەین. کیم دیسانەوە وەک دیدارەکەی سەنگافورە گلەیی لەوە کرد کە کۆریای باکوور هیچ گەرەنتییەکی یاسایی نییە بۆ پاراستنی ئاسایشەکەی، ترەمپیش لێی پرسی کۆریای باکوور چ جۆرە گەرەنتییەکی دەوێت. کیم وەڵامی دایەوە و گوتی هیچ پەیوەندییەکی دیپلۆماتییان نەبووە، حەفتا ساڵ لە دوژمنایەتی و هەشت مانگ لە پەیوەندیی کەسی؛ لە وەڵامەکەوە ڕوون بوو کیم بەنیاز نییە وردەکاری بدات. ئەو پرسیاری کرد چی دەبێت ئەگەر کەشتییەکی جەنگیی ئەمریکا بچێتە ناوچە دەریاییەکانی کۆریای باکوورەوە؟ ترەمپ گوتی ئەگەر شتێکی وابوو پەیوەندیی پێوە بکات.

لەدوای هێنان و بردنێکی زۆر، ترەمپ تێگەیشت لەوەی بە بنبەست گەیشتوون و لە ڕووی سیاسییەوە ناکرێت لەو دانیشتنەدا بگەنە هیچ ئەنجامێک.

نائومێدی بە ڕووخساری کیمەوە دیار بوو، بەڵام من نیگەران بووم. پاش کۆششێکی زۆر بۆ ڕوونکردنەوەی گەورەیی مەترسیی هەڕەشەی ناوەکیی کۆریای باکوور بۆ ترەمپ، گەیشتبووین بەوەی ئومێدمان وابێت سیاسەتی

خۆلادان لە یاخیبوونێکی بەکۆمەڵی حیزبی کۆماری بەس بێت بۆ وەستاندنی ڕێککەوتنێکی خراپ. ترەمپ ڕووی کردە پەمپەیۆ و داوای لێ کرد ئەوەی بۆ دووبارە بکاتەوە کە لە ڕێگای بەرەو میترۆپۆل گوتی. پەمپەیۆ بەم جۆرە قسەکەی ڕێکخستەوە، "بەرەوپێشچوون هەبووە؛ بە باشی لە یەکتری تێدەگەین؛ دەتوانین سەرمان بەرز ڕابگرین." خۆشحاڵ بووم کە من ناچار نەبووم ئەوە بڵێم.

پاشان ویستمان ڕاگەیاندنی کۆتایی دیاری بکەین. کیم ویستی ڕاگەیاندنی هەردوو لا هاوبەش بێت. ترەمپ لە سەرەتادا پێی باش بوو ڕاگەیاندنەکان بەجیا بن، پاشان ڕای گۆڕی. ئەو بابەتە هەندێکی پێ چوو هەتا گەیشتە ئەوەی ترەمپ دیسانەوە گوتی ڕێککەوتنێکی تەواوی دەوێت. کیم گوتی ناتوانێت زیاتر لەوە پێشنیار بکات کە پێشنیاری کردووە، ڕوونیش بوو ئەو ڕێککەوتن ڕووی نەدەدا. ئەو داوای "ڕاگەیاندنێکی هانۆی"ی کرد کە تیایدا ئاماژە بە بەرەوپێشچوونەکان کرابێت و گەر گونجاش باسی یۆنگبیۆنی تێدا بکرێت. دیسانەوە گفتوگۆکە کەوتبوویەوە سەر ئاراستەیەکی هەڵە، بەڵام ترەمپ پێشتر قسەی منی ڕەتکردەوە کاتێک گوتم ڕاگەیاندنی هاوبەش مەترسیدارە و بۆی هەیە ببێتە بەڵگەی ئەوەی هیچمان بەدەست نەهێناوە. ترەمپ لە وەڵامی ئەو قسەیەدا گوتی، "مەترسی ناوێت، ئەرێنیم دەوێت." پەمپەیۆ ویستی باسی بەرەوپێشچوون بکات: "ماوەی هەشت مانگدا بەرەوپێشچوونمان هەبووە و دەتوانین شتەکە لەسەر ئەوە بونیاد بنێین." تەنانەت کیمیش لەگەڵ ئەوەدا هاوڕا نەبوو و ئاماژەی بەوەدا نەگەیشتوونەتە خاڵێکی باش. ترەمپ پێداگری کرد لەوەی ئەگەر داواکانی کیم قبووڵ بکەین، کاریگەرییە سیاسییەکانی ئەمریکا گەورە دەبن و بۆشی هەیە هەڵبژاردنی داهاتوو بدۆڕێنێت. کیمیش بەخێرایی کاردانەوەی نواند و گوتی نایەوێت هیچ شتێک بکات لە ڕووی سیاسییەوە زیان بە ترەمپ بگەیەنێت. ئۆهـ، چەندە مەزنە. کیم جەختی ن

ڕاگەیاندنێکی هاوبەش دەکردەوە و لە هەمان کاتیشدا دەکرۆزایەوە، چونکە گوایە هەستی بە بەربەستێک دەکرد لە نێوان خۆی و ترەمپدا و گوتی کە هەست بە نائومێدی دەکات. کیم زیرەکانە یاریی بە هەستەکانی ترەمپ دەکرد، منیش نیگەرانی ئەوە بووم ئەوە سەر بگرێت. ترەمپ گوتی پێویست ناکات کیم ئەو هەستەی هەبێت، خۆشبەختانە پاش ئەو قسەیە هەموومان پێکەنین. کیم دیسانەوە جەختی لە گرنگیی پاکێجی یۆنگبیۆن کردەوە. من گوتم کۆریای باکوور پێشتریش پەیمانی دەستهەڵگرتنی داوە لە چەکە ناوەکییەکان و سەرەتا بە ڕاگەیاندنەکەی ١٩٩٤ی باشوور و باکوور دەستم پێ کرد، بۆیە کۆرییە باکوورییەکان باش دەیانزانی چی لەوان داواکراوە. ترەمپ پرسیاری کرد چی بەسەر ئەو ڕاگەیاندنە هاوبەشەدا هاتووە، منیش ڕوونم کردەوە کە کلینتن لە ساڵی ١٩٩٤دا ڕێککەوتنی لەگەڵ کۆریای باکوور واژوو کردووە. ترەمپ بەداخەوە بوو بۆ ئەوەی ئەوەی ڕێککەوتنی دەشکاند پێشنیارەکەی کیم بوو. کیم هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی ئەوە جێی داخە، چونکە پێی وابوو ئەگەر ڕێبکەوتنایە ستایشی زۆر دەکران.

بێدەنگییەکی تەواو دەستی بەسەر ژوورەکەدا گرت و وامان زانی ئەوە کۆتایی بە دانیشتنەکە دەهێنێت. بەڵام دانیشتنەکە کۆتایی نەهاتبوو، چونکە کیم دیسانەوە ئاماژەگەلێکی بۆ یۆنگبیۆن کرد کە دەریان دەخست ئەو و ترەمپ زیاتر لەوانەی پێش خۆیان بەرەوپێش چوون. دیسانەوە قسەم کرد و پێداگریم لەسەر ڕاگەیاندنی جیا کردەوە. گوتم ئەگەر ئەوان کۆتاییەکی ئەرێنییان دەوێت، ئەوا دەکرێت هەریەکێکمان بە جۆری خۆی ئەرێنی بێت. کیم گوتی ڕاگەیاندنی تاکی بۆ خۆی ناوێت، ئەوەش بووە هۆی چەند چرکەیەک لە بێدەنگی. ترەمپ گوتی ئەو دەیەوێت کیم خۆشحاڵ بێت. قسە لەوەدا نەبوو. ترەمپ یەکلایی کردەوە کە ڕاگەیاندنی هاوبەشی دەوێت، بۆ ئەو مەبەستەش پەمپەیۆ و کیم یۆنگ چۆلی ڕاسپارد.

پاش ئەوە شاندی کۆریای باکوور چوونە دەرەوە و شاندی ئەمریکا لە ژوورەکەدا مانەوە. لە کاتێکدا دەهاتین و دەچووین، ترەمپ لێی پرسیم، "چۆنە ئێمە سزای ئابووری لەسەر وڵاتێک دادەنێین کە حەوت هەزار میلێک لێمانەوە دوورە؟" وەڵامم دایەوە، "لەبەرئەوەی ئەو وڵاتە چەکگەلێکی ناوەکی و مووشەکگەلێک دروست دەکات کە توانای کوشتنی ئەمریکییەکانیان هەیە!".

هاوڕا بوو و گوتی، "ئاماژەت بە خاڵێکی باش دا." بەرەو لای پەمپەیۆ چووین و ترەمپ گوتی، "هەرئێستا لە جۆنم پرسی بۆچی سزای ئابووری دەخەینە سەر وڵاتێک کە حەوت هەزار میل لێمانەوە دوورە، ئەویش وەڵامێکی زۆر باشی دایەوە: لەبەرئەوەی ئەو وڵاتە دەتوانێت جیهان وێران بکات."

پەمپەیۆ گوتی، "ڕاستە، بەڕێز." ڕۆژێکی تر لە ئۆفیس. ترەمپ گەڕایەوە بۆ ژووری چاوەڕوانییەکەی و پەمپەیۆ بە منی گوت ئەم دانیشتنە گەورەترە هەر پیشاندانەوەی دانیشتنەکەی پێشتر بووە، کە تیایدا کیم بەردەوام جەختی لە مامەڵەکەی یۆنگبیۆن کردووەتەوە و بە هیوا بووە ترەمپ خۆی بەدەستەوە بدات.

کە چووینە ژووری چاوەڕوانییەوە دیتمان ترەمپ ماندووە، بەڵام ئەو بۆچوونە ڕاستەی دەربڕی کە ڕێکنەکەوتن لە هانۆی بۆ جیهانی دەسەلمێنێت دەتوانێت لە جێی تر ڕێککەوتنی گرنگ بکات، بۆ نموونە لەگەڵ چین لەسەر دانوستانە بازرگانییەکان ڕێکبکەوێت. ئارەزووی هیچ شتێکی نەبوو بە خوانی نیوەڕۆشەوە، کە لەگەڵ ڕێوڕەسمی واژووکردنی هاوبەشدا هەڵوەشێنرانەوە. ترەمپ گوتی دەیەوێت من و پەمپەیۆی لەگەڵدا بێت لەسەر ستەیجی کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکە، بەڵام من پێم گوت پێویستە بچم بۆ فڕۆکەخانە تاکو لە ئالاسکا تووشی ڕاوەستانێکی درێژخایەن نەبم، ترەمپ ئەمەی پێ خۆش نەبوو. پاش چەند خولەکێک

پەمپەیۆ پێی گوتم، "بەختت هەیە." کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بەرێ کەوتم بۆ فرۆکەخانە و پاشتر زانیم دانوستانەکان لەگەڵ کۆریای باکووردا لەسەر ڕاگەیاندنە هاوبەشەکە شکستی هێناوە (جێی سەرسوڕمان نییە). ترەمپ بە ساندلەری گوتبوو ڕاگەیاندنێکی کۆشکی سپی بنووسێت. پەمپەیۆ و بایگن چاوپێکەوتنی خۆیانیان کردبوو و هەوڵیان دەدا دیدارەکە وەک سەرکەوتوو پیشان بدەین، بۆ ئەوەی بایگن بتوانێت درێژە بە دانوستانەکانی خۆی بدات. لە ڕاستیدا، ئەو هەمان شێوازی شکستخواردووی سێ بەڕێوەبردنی پێش خۆی بەکار دەهێنا و هەر دەبوو شکستیش بهێنێت.

لە فرۆکەدا بەرەو واشنتۆن، گەیشتم بەو ئەنجامەی ئەمریکا هێشتا نازانێت چۆن لەگەڵ کۆریای باکووردا مامەڵە بکات. کاتژمێرگەلێکی زۆرمان لە دانوستان لەگەڵ خۆماندا بەسەر برد، پێگەی خۆمانمان لاواز دەکرد پێش ئەوەی بەرامبەرەکانمان ئەوە بکەن، ئەوە هونەرێک بوو وەزارەتی دەرەوە تیایدا شارەزا بوو. کۆریای باکوور و ئەوانی تریش کەڵکی تەواویان لەوانە وەردەگرت کە ڕێککەوتنیان وەک بەڵگەی سەرکەوتن دەویست. ئێمە ئامانجێکی بێوێنە بووین. ئەوەی جێی پێکەنین بوو ئەوە بوو ترەمپ لە دەزگای خزمەتی دەرەکی دەچوو. هەڵەیەکی تریش ئەوە بوو بەردەوام باسی سەرکەوتنی دانوستانەکان بۆ ڕاگەیاندن دەکرا، ئەوەش چاوەڕوانیی ڕاگەیاندنەکانی بەرز دەکردەوە بۆ ڕێککەوتن و کاریگەرییەکانی ڕێکنەوەکەوتنیان زیاتر دەکرد. لەوانەشە لە هەمووی گرنگتر ئەوە بووبێت کە ترەمپمان گەیاندە ئەو باوەڕەی ڕێکنەکەوتن شکست نییە، بەوەش ئەو ڕێگا ناتەندروستەی دانوستانمان شێواند کە بایگنی لەسەر بوو. بەڵام وەک هەموو سەرکەوتنێکی تری حکوومەت، ئەمەش سەرکەوتنێکی کاتی بوو و دەمزانی درێژە ناکێشێت. پاڵنەری کەللەڕەقیی بیروکراسی بۆ بەردەوامیدان بە پرۆسەکە دیسان دەهاتەوە، هەروەها باوەڕە نەمرەکەی ترەمپیش لەسەر ئەوەی هەمووان دەیانەوێت قسەی لەگەڵ بکەن و ڕێککەوتنیان دەوێت بە ئاسانی دانەدەمرکا.

پاش هانۆی، لە سەرچاوە هەواڵییەکانی وەک چۆسون ئیبۆی کۆریای باشوورەوە زۆر شتمان بۆ دەرکەوت: بۆمان دەرکەوت کیم یۆنگ چۆل بەزۆر کاری پێ کراوە و دواتر پێگەکەی وەرگرتووەتەوە، کیم هیۆک چۆل کە بەرامبەری بایگن بوو لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا لە سێدارە دراون: خوشکەکەی کیم جۆنگ ئون بەهۆی هەستی پەشیمانییەوە بۆ ماوەیەک خۆی لە چاوی خەڵک بەدوور گرتووە؛ هەروەها شێن های یۆنگی وەرگێڕی کیمیش لەسەر هەڵەیەکی وەرگێڕان خراوەتە زیندانێکی سیاسییەوە. هیچ نەبێت ئەوە لەو هەواڵەی پێشتر باشتر بوو کە گوایە لەسەر ئەوەی ترەمپ لێکدانەوەی بۆ قسە درەوشاوەکانی کیم کردووە و ئەویش نەیتوانیوە ڕێگری لێ بکات، لەسێدارە دراوە. ئەو هەواڵانە پشتڕاست نەدەکرانەوە، بەڵام هەمووان دەزانن سەرۆکی کۆریای باکوور دەستی دەچێتە سزاگەلی ئاوا. پەیامنێرێکی واشنتۆن پۆست جارێکی تر بەرپرسیارییەتی خۆی نواندەوە و لە تویتەر ئەمەی پۆست کرد "وا دیارە دیپلۆماسییەتە سەیرەکەی ترەمپ و قسە توندەکانی بۆلتن لە هانۆی بوونەتە هۆی کوژرانی کۆمەڵێک کەس."

هەموو کاردانەوەکان بۆ دیدارەکەی هانۆی سەرسامی بوون. کۆندی ڕایس و ستیڤ هادلی پەیوەندییان کرد و پاڵپشتی خۆیانیان بۆ ڕێکنەکەوتنەکەی ترەمپ دەربڕی، هەروەها ڕایس پێی گوتم یەکێک لەو لێکچواندنانەی بوشی بۆ پێنس گێڕاوەتەوە کە دڵخوازی منە؛ بوش، کیم جۆنگ ئیلی بە منداڵێک چوواندبوو کە لەسەر کورسییەکی بەرزە و بەردەوام خواردنەکەی هەڵدەداتە سەر زەوییەکە، ئەمریکا و ئەوانی تریش بەردەوام خواردنەکەی دەدەنەوە دەست. شتەکان زۆر نەگۆڕابوون. هەتا خواردنەکە لەسەر زەوییەکە نەمایەتەوە کۆمەنیستەکان فێر نەدەبوون. پاش چەند ڕۆژێک قسەم لەگەڵ چونگ ئوی یۆنگی کۆریای باشوور کرد. ئەویش قسەی باشی کرد. ئەو گوتی ئەوان سەرسام بوون بەوەی کیم

جۆنگ ئون بە یەک ستراتیژییەتەوە هاتووە بۆ هانۆی و نەخشەی دووەمی نەبووە. چونگ قسەشی لەسەر بیرۆکە شیزۆفرینییەکەی موون جای ئینیش کرد کە گوایە سەرەڕای ئەوەی ئێمە لە ڕەتکردنەوەی ڕێککەوتنە کردار بە کردارەکەی کۆریادا ڕاستمان کردووە، دەستبەرداربوونی کیم لە یۆنگبیۆن هەنگاوێکی واتادار بووە و بەڵگە بووە لەسەر ئەوەی کۆریای باکوور چووەتە قۆناغی نەگەڕاوەی پووچەڵکردنەوەی چەکە ئەتۆمییەکانی. ئەو گوفتارەی کۆتایی هیچ واتای نەبوو، هەروەک پشتڕاستکردنەوەکەی مون بۆ ڕوانینە "تەریبی و هاوکاتییەکەی" چین کە بەلای منەوە هەر "کردار بە کردار" بوو. چونگ یەکەم کەس بوو پێشبینی لابردنی هەندێک کاربەدەستی کۆریای باکوور بکات و پێشبینییەکەشی لەسەر بنەمای گواستنەوەی دیدارەکە کردبوو لە لایەن ڕۆژنامەی ڕۆدۆنگ سینمەنی کۆریای باکوورەوە. هەڵەکردن لە ئاسایشی دەرەکیی کۆریای باکووردا تەنها بۆ پیشەکەت کوشندە نەبوو، بەڵکو بۆ خۆشت وابوو.

ئەو سەرسامییەی کە زۆرێک لە خەڵک هەستیان پێ کرد، بۆ کۆششە زۆرەکانی پێش-هانۆی دەگەڕایەوە، کە وەزارەتی دەرەوە بڵاوی کردووەوە گوایە ئێمە ڕێککەوتنێکی "کردار بە کردار" قبووڵ دەکەین. گوفتار و دیمانەی پەیامنێر و شارەزاکان، سیمینارەکان هەموو بانگەشەیان بۆ ئەوە دەکرد ئێمە دەگەینە شوێنە بەرز و دڵفرێنەکان، کە تیایدا یەک لە دوای یەک پاشەکشە دەکەین. دانوستانکارانی وەزارەتی دەرەوە بۆ چەندین ساڵ ئەوەیان بە هونەری مامەڵە و ڕێککەوتن زانیبوو. ئەو کەسانەی پاش هانۆی نەخشەی دووەمیان نەبوو، شارەزاکانی ئەمریکا بوون، ئەوانەی هەموو ئاواتیان گەڕانەوە بوو بۆ ڕێککەوتنەکەی کلینتن لە ٩٤، یان بۆ ئەوەی بوش لە گفتوگۆ شەش لایەنییەکان، یانیش بەڕێوەبردنی خۆڕاگریی ستراتیژیی ئۆباما. لە ڕێگای پانمونجۆم دەرکەوت ئەوان خۆڕاگرترن لەوەی چاوەڕێم دەکرد.

بە تێپەڕینی کات سەرسوڕمانەکەی کۆریای باکوور بوو بە تووڕەیی. لە ١٥ی ئازاردا، چۆی سۆن هویی جێگری وەزیری دەرەوەی کۆریا بە من و بە پەمپەیۆدا تەقییەوە و بەوە تاوانباری کردین کە لە ڕێگای داواکارییە ناهاوکارەکانمانەوە کەشێکی دوژمنایەتی و بێمتمانەییمان لە هانۆی دروست کردووە. دەبوو سوپاسی خۆمم بۆ قسەکانی دەربڕیایە. ئەو گوتبووی پەیوەندیی نێوان ترەمپ و کیم هێشتا باش و سەرسوڕهێنەرە. ڕاستە. ئەوجا نۆرەی هەڕەشەکەیە. چۆی لە لێدوانەکەیدا گوتی کیم جۆنگ ئون بەزوویی بڕیار دەدات، ئایا بەردەوامی بە تاقیکردنەوە ناوەکی و بالیستیکییەکانی بدات یان نا، ئەوەش کۆریای باشووری زۆر نیگەران کردبوو. لە هەمان ڕۆژدا قسەم لەگەڵ چونگدا کرد، ئەو گوتی لێدوانەکەی چۆی کۆریای باشووری تووشی سەرسوڕمان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئومێدەوار بوون قسەکانی چۆی هەر دووبارەکردنەوەیەکی ئەو لێدوانانە بێت کە شەوی ڕێکنەکەوتنی ترەمپ دای. سەرنجمان دا موون جای ئین کۆششی زیاتر دەکات بۆ دیدارێکی تری مون و کیم کە تیایدا تەنها قسە لەسەر کێشەکانی چەکی ناوەکی بکەن، دیارە ئەو بابەتەی بە کاریگەر زانیوە لەسەر پەیوەندیی نیوان دوو کۆریاکە.

هەستم کرد ترەمپ نیگەرانی ئەوەیە لە هانۆی زۆر توند بووبێت و نیگەرانییەکەشی بە چەند شێوەیەک دەردەکەوت. سەرەتا گوتی، "نابێت دە سەنتیش لە یارییە جەنگییەکاندا بەفیڕۆ بدەین،" مەبەستی لە چالاکییەکانمان بوو لەگەڵ کۆریای باشوور. لە لایەکی تریشەوە سوور بوو لەسەر پاڵپشتیکردنی "ئەوپەڕی فشار"ی ئابووری لەسەر کۆریای باکوور. لە ٢١ی ئازاردا کۆبوونەوەیەکم ڕێک خست تا بزانین ئایا فشارەکە هەر بەڕاست لە ئەوپەڕیدایە و ئایا دەکرێت توندتر بکرێت. بابەتی سەرەکیی گفتوگۆکە ئەوە بوو ئایا پێویست دەکات ئەمەریکا هەوڵی زیاتر بدات بۆ ڕێگری لە گواستنەوەی کەشتی بە کەشتی، کە

تیایدا خەڵوز لە کۆریای باکوورەوە هاوردە دەکرا و نەوت دەبرایە ناوەوە. کۆریای باکوور دەیویست لە ڕێگای گواستنەوەی کەشتی بە کەشتییەوە خۆی لە چاودێرییەکان ڕزگار بکات، منیش دەمویست بزانم ئایا هیچ ڕێگاگەلێک هەیە تیایدا بەبێ بەکارهێنانی هێز ئەو ئاڵوگۆڕانەیان لێ قورس بکەین. هیچ قسەیەک لەسەر سزای زیاتر نەکرا دژی کۆریای باکوور، تەنها باسی ئەوەمان کرد چۆن سزاکانی ئێستایان لێ قورستر بکەین.

ڕۆژی داهاتوو کە هەینی بوو، لە مارالاگۆ بووین بۆ دیدارێکی ترەمپ لەگەڵ سەرکردەکانی هەرێمەکانی دوورگەی کاریبیان (هایتی، باهاماس، کۆماری دۆمینیک، جامایکا،ساینت لوسیا)، ئەوەش دیدارێک بوو کە چەند جارێک داوام لێی کردبوو ڕێکی بخات، بەڵام پەسەندی نەدەکرد، لە کۆتاییشدا گوتی بیرۆکەی خۆم بووە. ترەمپ من و کۆمەڵێکی تری ڕاکێشایە کتێبخانەکەوە (لە ڕاستیدا بار بوو) و گوتی دەیەوێت ئەو داوای جێبەجێکردنی سزایە هەڵبوەشێنێتەوە کە دژی دوو کۆمپانیای چینی داوای کردبوو، لەسەر ئەوەی ڕێککەوتنی سزاکانی کۆریای باکووریان پێشێل کردبوو. ئەو بڕیارانەمان قبووڵ کردبوو —من و پەمپەیۆ و منوشن واژوومان کردبوو-، هەمووشیان لەسەر بنەمای سزاکانی ئێستا دانرابوون و زیادکردن و گەورەکردنیان تێدا نەبوو. ئەو قایل بوو بە جێبەجێکردنی تەواوی سزاکان، بەگوێرەی ئەو تێگەیشتنەش لە ماوەی نۆ مانگی پاش سەنگافورەوە ژمارەیەکی زۆر کۆمپانیا و کەسمان لەسەر پێشێلکردن سزا دابوو.

ئەوەی بۆچی ترەمپ دەیویست چاوپۆشی لەو جێبەجێکردنانەی دوایی بکات، ڕوون نەبوو، دەکرێت بەهۆی هاوسۆزییەوە بووبێت بۆ کیم جۆنگ ئون. ترەمپ فەرمانی بە کردنی تویتێک کرد کە پێچەوانەی ڕاگەیاندنێکی تازەی وەزارەتی گەنجینەکان بوو. هەوڵم دا وا لە تویتەکەی تێنەگەم،

بەڵام نەمتوانی و مولڤانیش هەروابوو. کاریگەریمان نەبوو. ترەمپ گوتی تویتەکە ڕووی لە یەک کەسە کە دەیەوێت ڕێککەوتنی لەگەڵدا بکات. زۆر هەوڵم دا بۆی ڕوون بکەمەوە خەڵکی تریش ئەو تویتە دەبینن و وەک لاوازکەری سزاکان لێکی دەدەنەوە و دەشبێتە هۆی شکاندنەوەی ڕاوێژکارەکانی، بە تایبەتیش منوشن، بەڵام قسەکانی بە هەند وەرنەگرتم و گوتی، "ئەو تویتە کاریگەری لەسەر کەسی تر نابێت." زۆر بەسادەیی ترەمپ گوێی پێ نەدەدا. دەیویست نامەیەک بۆ کیم جۆنگ ئون بنێرێت، هەروەک چۆن دەیویست نامەیەک بۆ شیی جینگ پینگ بنێرێت کاتێک پاشەکشەی لە سزاکانی ZTE کرد لە کاتێکدا کە ڕاشگەیەندرابوون. ساندەرس پرسی: ئێمە چی بڵێین ئەگەر یەکێک گوتی بۆچی ترەمپ ئەو تویتەی کردووە؟! ترەمپ گوتی، "کەیفم بە کیم جۆنگ ئون دێت و ئەو سزایانە پێویست نین." تویتەکە کرا.

پاش تەواوبوونمان لەگەڵ سەرکردەکانی کاریبیان و باسکردنی ئاڵنگارییە هەرێمییەکان و بە ڕێ کەوتنمان بۆ فڕۆکەخانە، بینیمان ڕاگەیاندنەکان تویتەکەی ترەمپ وەك ئاماژەیەک بۆ ڕاگەیاندنەکەی وەزارەتی گەنجینەکان لێک نادەنەوە، بەڵکو بە ئاماژەی دەزانن بۆ سزایەکی دیارینەکراو کە لە داهاتوودا دەردەچێت. کاتژمێر شەشی بەیانی پەمپەیۆ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە پەیوەندیی پێوە کردم و منیش ویستم دۆخەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە، بەڵام شتەکان هێشتا زۆر ناڕوون بوون. هەرچۆنێک بێت، هەردووکمان زۆر خەمبار بووین بەوەی تویتەکەی ترەمپ کردبووی. ئەو ڕۆژەش کە دەیکردە ٢٢ی ئازار،ساڵیادی پێشکەشکردنی پێگەکەم بوو لە ئەنجوومەنی ئاسایش لە لایەن ترەمپەوە. لە ساڵێک نەدەچوو، دەتگوت دە ساڵە.

بەرەبەیانی یەکشەممە نزیک کاتژمێر حەوت و نیو، پەیوەندیم بە مولڤانییەوە کرد کە لە مارالاگۆ مابوویەوە. منوشن نیوەڕۆی هەینی

پەیوەندیی پێوە کردبوو تا قسە لەگەڵ ترەمپدا بکات، تاکو بڵێت لابردنی ئەو سزا تازانەی وەزارەتی گەنجینەکان شەرمەزارکەر دەبێت بۆی. مولڤانی پەیوەندییەکەی بۆ ترەمپ گواستەوە و منوشنیش هەندێک لێکدانەوەی بە ترەمپ دا کە منیش لام بوو. پاش چەندین کاتژمێر لە قایلنەبوون لەسەر نەگۆڕینی بڕیارەکان، ترەمپ قایل بوو. کاتێک ئەوەم بیست، بە مولڤانیم گوت، "مەگەر منیش دوێنێ بە ڕوونی ئەوانەم پێ نەگوت؟" مولڤانی گوتی، "بە ڕوونی پێت گوت، بەڵام جاری وا هەیە گەیاندنی بابەتەکە دوو سێ هەوڵدانی دەوێت." مولڤانی گوتی ئەوە تەنها "شێوازێکی ئاسایی ڕوونکردنەوەی شتەکان بووە لە لایەن وەزارەتەوە." من و ئەو بڕیارمان دا منوشن بهێنینە ناو گفتوگۆکەوە. منوشن گوتی ئەو هەوڵی داوە ترەمپ لە شەرمەزاربوون بپارێزێت، ئەویش بە گوتنی ئەوەی سزای زیاتر دانانێین، هەرچەندە ئەویش هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی بۆی هەیە هەموو لایەنەکانی تری جیهان وا تێبگەن ئێمە "ئەوپەڕی فشار" کەم دەکەینەوە. هەموومان هاوڕا بووین، هەرچۆنێک بێت ڕاستکردنەوەی ڕاستکردنەوەکە شتەکانی خراپتر دەکرد.

هەرچەندە گێڕانەوەکەی منوشنم زۆر بەدڵ نەبوو، بەڵام نەمدەتوانی بیر لە شتێکی باشتر بکەمەوە. لەوانەیە بڕێک شێواویمان پێوە دیار بووبێت، بەڵام هەرچۆنێک بێت زۆر لاواز دەرنەکەوتین. دواتر قسەم لەگەڵ پەمپەیۆ کرد و ئەویش هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی بە تەواوی واز لەو بابەتە بێنین. لە کۆبوونەیەکی تردا ئەوە بابەتی سەرەکی دەبوو، بەڵام لای ئێمە هەر تێبینیشی نەدەکرا. بڵاوبوونەوەی ڕاپۆرتەکەی میولەر هەواڵەکانی داگیر کرد و بووە هۆی کۆتاییهانی "پیلانگێڕیی ڕوسیا"ش. لە ڕۆژی دووشەممەدا، کە ترەمپ و پەمپەیۆ و من لە ئۆفیسی هێلکەیی بووین و منوشنیش بە تەلەفون لەگەڵماندا بوو، هەستاین بە پشتڕاستکردنەوەی ئەوەی پاش دیداری سەنگافورە بڕیارمان لەسەری دابوو، کە بریتی بوو لە

درێژەدان بە جێبەجێکردنی سزاکان، بەڵام بەبێ ڕەزامەندی ترەمپ هیچ زیادەیەک ناخرێتە سەر سزاکانی سەر کۆریای باکوور. ئەگەر ترەمپ ڕۆژی هەینی گوێی لەم قسانە بگرتایە، ئەوا ئەو هەموو دراما و هەرایە دروست نەدەبوو.



کێشەیەک کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆریای باشوور (هەروەها ژاپۆن و تا ڕادەیەکی کەمیش هاوپەیمانە ئەورووپییەکان) تێک دەدا، ئەوە بوو ئایە چەندێک تێچووی یەکە سەربازییەکانی ئەمریکا لەو وڵاتانە لەسەر شانی وڵاتی خانەخوێ بێت؟! لە هەموو جێیەک یەکەی سەربازیمان هەبوو. هەموو وڵاتێکیش بەشێکی تێچووەکەی دەدا، بەڵام هەر وڵاتە بە ڕێژەیەکی جیاواز بەشی خۆی دەدا و بڕێکی دیاریکراو دیاری نەکرابوو. لەژێر تەکنیکە ژمێریارییە نایابەکانی وەزارەتی بەرگریدا، پاساو بۆ هەموو تێچوویەک دەهێنرایەوە، چ بەرز بوایە چ نزم. هەروەک کێشە داراییە سەربازییەکانی تر، لەمەشدا ترەمپ پێی وابوو هاوپەیمانەکانمان بەشی پێویست پارەمان نادەنێ. ئەمە لەگەڵ باوەڕی ئەودا دەگونجا و پاش چەندین دانیشتنیش لە کۆریای باشوور بۆچوونی نەدەگۆڕی. ئێمە بۆ بەرگری گشتی و ئاسایشی هاوبەش و ئەو کێشە نێودەوڵەتییە ئاڵۆزانە لەو وڵاتانە نەبووین. بەرگریمان لە ئەڵمانیا دەکرد، یان لە ژاپۆن، یان لە ئیستۆنیا، ئەوانیش دەبوو پارەمان بدەنێ. لەوەش زیاتر، وەک قسەی هەر بازرگانێکی تر، دەیگوت دەبێت سوودی ئابووری لە بەرگریکردن لەو وڵاتانە ببینین، کە لە ڕاستیدا ئەمریکا هیچ بەرژەوەندییەکی تایبەتی تیایاند نییە (ترەمپ دەیگوت، "ئێمە بۆچی لەو هەموو وڵاتەین؟")، یان لانی کەم دەبێت ستراتیژیی مامەڵەکانمان باشتر بکەین و هەرکاتێک کاتی نوێکردنەوەی ڕێککەوتنەکە هات دانوستانیان لەگەڵ بکەین.

ترەمپ بیرۆکەیەکی لەمێژینەی هەبوو لەسەر ئەوەی دەبێت وڵاتانی

خانەخوێ "تێچووەکە + سەدا ئەوەندە"ی تێچووی ئەمریکا بدەن، هەروەک لە نیسانی ٢٠١٨ گوتی و فشاری دەخستە سەر هێزە عەرەبییەکان بۆ جێگرتنەوەمان لە سوریا. لەوکاتەدا باوەڕی وابوو "تێچوو + سەدا ٥٠" زۆر قورس دیارە، بۆیە بەناوی ترەوە داوای دەکرد وەک: "بەشێکی دادوەرانە" یان "قەرەبووکردنەوەیەکی تەواو و دادگەرانەی تێچووەکانمان." هەرچۆنێک بێت ئەو بڕەی ئەو دەیویست نەگۆڕا، یان هیچ نەبێت ئەو بڕەی دەیویست بنچینەی دانوستانەکان بێت هەر بە "تێچوو + سەدا ٥٠"یی مایەوە. لە دۆسییەکەی کۆریای باشووردا، بەپێی ڕێککەوتنەکە بڕەکە دەگەیشتە پێنج ملیار دۆلاری سالانە، ئەوەش زیادکردنێکی زۆر گەورە بوو و بڕەکەی پێشتر کەمتر بوو لە ملیارێک. ڕێککەوتنەکەی ئەوکات لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٨دا کۆتایی دەهات، ئەوەش نیگەرانییەکی گەورەی لای وەزارەتی دەرەوەی هەردوو لا و پنتاگۆنیش دروست کردبوو. لە پنتاگۆن نەیاندەویست وا دەربکەوێت ئامانجی یەکەممان پارە بێت، هەروەها دەشیانزانی دەستخستنی ئەو زیادکردنە زۆر گەورانە زۆر قورس دەبێت. کۆریای باشوور یەکەم وڵات بوو لەبەرئەوەی بەرواری بەسەرچوونی ڕێککەوتنەکەی لەپێشەوە بوو، ژاپۆنیش دووەم بوو، بەڵام ئەوانی تریش لە سەرەدا بوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکە.

لەبەرئەوەی دەترسام هەڕەشە گەورەکەی ترەمپ—کشاندنەوەی هێزەکانمان لەو وڵاتانەی پارە داواکراوەکەی ئەو نادەن- لە دۆسییەکەی کۆریای باشووردا ڕاست بێت، هەوڵم دا جیا لە ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی ترەمپ ستراتیژییەتێکی تریشم هەبێت. ستراتیژەکە هی جەیمس ماتیس، کە تا هاتنی ترەمپ و کردنی ئەوەی خۆی دەیەوێت بە باشی کاری کردبوو. بەلای وەزارەتی دەرەوە و بەرگرییەوە کشاندنەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆریای باشوور باوەڕپێنەکراو بوو، بۆیە بەرەنگارییەکەی ئەوان دژی بەرزکردنەوەی ئەو تێچووەی وڵاتی خانەخوێ دەیدات

مەترسییەکەی زیاتر دەکرد. بەداخەوە، من دەمزانی شوێنە مەترسیدارەکە کوێیە. لە کۆتایی ٢٠١٨دا، پاش دانوستانگەلێکی کۆتاییهاتوو کۆریای باشوور بە زیادکردن قایل بوو، بەڵام بڕەکە هەر کەمتر بوو لە یەک ملیاری ساڵانە. ئەوە واتای ئەوە بوو ساڵێکی ترمان لە بەردەستدا بوو بۆ دیاریکردنی بڕێک کە ترەمپیش و کۆریای باشووریش پێی قایل بن، هەروەها خۆشحاڵانە پاشەکشە بە هێزەکانی ئەمریکا نەکرا. چەند مانگی پێش ٢٠١٩ شتەکان ئاوا بوون.

دیار بوو موون جای ئین هێشتا نیگەرانی ڕێتەکەوتنەکەی هانۆی بوو، بۆیە لە ١١ی نیسان هات بۆ واشنتۆن. من و پەمپەیۆ سەرەتا لە ماڵی بلەیر لە کاتژمێر ١١ی بەیانی مونمان بینی، کانگ کیونگ وای، وەزیری کاروباری دەرەوە و چونگ ئوی یۆنگیشی لەگەڵدا بوو. پاش سڵاو و هەواڵپرسین، بۆمان دەرکەوت لە پاش دیداری هانۆیەوە کۆریای باشوور هیچ پەیوەندییەکی تێروتەسەلیان لەگەڵ کۆریای باکووردا نەبووە؛ کۆریای باکوور کاتی زیاتری پێویست بووە بۆ لەبیرکردنی هانۆی. مون نیگەرانی ئەوە بوو شانی ساردی پیۆنگ یانگ لەسەر کێشەی ناوکیی و کێشەکانی دوو کۆریاکە هەواڵێکی خراپی سیاسی بێت بۆ ئەو، چونکە ئەو وای دانابوو سیاسەتی دەرەوەی کۆریای باشوور لەسەر باکوور ئەنجامی هەستپێکراوی هەبێت، بەڵام نەیبووبوو. هەوڵم دا لەو دیدارە و دیدارەکەی مون و ترەمپیشدا کەمترین قسە بکەم، چونکە دەمزانی حکومەتەکەی مون بەدوای کەسێکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی گلەیی لێ بکات، لە تیمی ئەمریکاشدا من لۆجیکیترین ئامانج بووم وەک ڕێگرێک لە ڕێککەوتنەکە. ئەی بۆ نا؟ بە ڕەچاوکردنی سەرکەوتنی ستراتیژییە هاوشێوەکەی کیم لەسەر ترەمپ، ڕێگرییەکەم سەرکەوتوو بووە.

مون نیوەڕۆ گەیشتە کۆشکی سپی، پاش تەواوبوونی گواستنەوەی ڕاگەیاندنەکان لە نووسینگەی هێلکەیی، پەمپەیۆ و من لە ژوورێکی

بچووکتردا لەگەڵ ترەمپداماینەوە تا لەگەڵ مون و کانگ و چونگدا کۆببینەوە. ترەمپ گوتی دەستخۆشی زۆری لێ کراوە لەسەر ئەنجامی دیدارەکەی هانۆی، چونکە ڕێکنەکەوتن باشترە لە ڕێککەوتنێکی خراپ. مون گوتی ئەوە ئاساییە، بەڵام گوتی شتێکی دراماتیکی تری ویستووە بۆ بەرێ خستنی ئەو دیدارەی کە چاوەڕێ بووە ببێت بە دیداری سەدە. مون جەختی لە کات و شوێن و فۆرمی گونجاو کردەوە و گوتی ئەگەر ئەوانە لەبەرچاو بگیرێن دەکرێت ئەنجامی دراماتیکیتر بەدەست بهێنرێت؛ بەو هۆیەوە پێشنیاری کرد دیداری داهاتوو لە پانمونجۆم یان لەسەر کەشتییەکی ئەمریکی بێت. ترەمپ مۆنۆلۆگەکەی بە مون بڕی، ئەوەش شتێکی باش بوو چونکە هەستم دەکرد خەریکە خەوی لێ دەکەوێت، پاشان بیرۆکەکانی مونی بەرز نرخاند، بەڵام گوتیشی کاتێک بیر لە دیداری داهاتوو دەکاتەوە کە بزانێت ڕێککەوتنێکی تەواوی تێدا دەبێت. یەک دیدار بەبێ ڕێککەوتن کێشە نەبوو، بەڵام کەس حەز ناکات دووجار لەسەر یەک ڕێکنەکەوتن هەڵبژێرێت. مون هێشتا هەر نیگەرانی فۆرم بوو نەک ناوەڕۆک، بەڵام گرنگترین خاڵ لای ئەو ئەوە بوو ئەویش دەتوانێت ئامادەی دانیشتنی کیم و ترەمپ بێت. ترەمپ پاشەکشەی نەدەکرد و جەختی دەکردەوە هەتا کۆریای باکوور مل بۆ ڕێککەوتنی وازهێنان لە هەموو چەکە ناوکییەکان نەدات، دەنگوباسی دیداری تر نابێت.

بەرێ کەوتین تا لە ژووری وەزارەت نانی نیوەڕۆ بخۆین و پاش تاوتوێکردنی بەرەوپێشچوونەکانی کۆریای باکوور و کێشە دوولایەنەکانی دوو کۆریاکە، ترەمپ باسی تێچووی بنکە سەربازییەکانمانی کرد لە کۆریای باشوور. ترەمپ ڕوونی کردەوە تێچووی بنکە سەربازییەکانمان لە کۆریای باشوور ٥ ملیارە، ئەوەش واتای ئەوەیە ئەمریکا بەو هۆیەوە ساڵانە ٤ ملیار دۆلار لەدەست دەدات. ترەمپ گوتی وڵاتانی تر پێشنیاری زۆر

زیاتریان کردووە و لە دانوستانەکانی داهاتووشدا دەبێت کۆریای باشووریش ژمارەکە بەرز بکاتەوە. ترەمپ گوتی هەست دەکات زۆر پارێزگاری لە مون کردووە و ڕێژێکی زۆری بۆی هەبووە. مون وەڵامی دایەوە و گوتی زۆرێک لە کۆمپانیا کۆرییەکانیش لە ئەمریکا وەبەرهێنانیان کردووە و بەرگری لەو بۆچوونە کرد، دەربارەی تێچووی بنکەکانیش پێی وابوو چاوەڕوانییەکانی ترەمپ زۆر بەرزن. ترەمپ پرسی ئایا ئەمریکا ناوچەی بنکەکانی بەکرێ گرتووە یاخود بەلاشن، بەڵام مون وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدایەوە. لەجیاتی ئەوە بە گوتنی ئەوەی کۆریای باشوور سەد ٤،٢ بودجەی گشتی لە بەرگریدا خەرج دەکات، خۆی پەڕاندەوە. ترەمپیش پاش بیستنی ئەوە ڕەخنەی لە ئەڵمانیا گرت لەسەر ئەوەی بڕێکی کەمی بۆ بەرگری داناوە. بە پێچەوانەوە ئەمریکا ٥ تریلیۆنی سەرف کردبوو لەپێناوی ئەوەی ئەرکی بەرزی بەرگریکردنی کۆریای باشوور وەربگرێت، لەبەرئەوەی ئەوان لە توندترین دانوستانکارەکان بوون. ترەمپ بڕێکی گونجاوی دەویست بۆ ئەمریکا.

پاش هەندێک تاوتوێی تر لەسەر کۆریای باکوور، ترەمپ هەواڵی پەیوەندییەکانی کۆریای باشووری پرسی لەگەڵ ژاپۆندا. هەموومان گرژییەکانی نێوان تۆکیۆ و سیئۆلمان دەبینی، کە لە مانگەکانی داهاتوودا خراپتریش دەبوون. مون هەوڵی دەدا پەیمانێکی ساڵی ١٩٦٩ی نێوان دوو وڵاتەکە بشکێنێت. لە ڕوانگەی ژاپۆنەوە مەبەست لەو پەیمانە کۆتاییهێنان بوو بەو دوژمنایەتییەی کە هۆکارەکەی بەگشتی حوکمی داگیرکاریی ژاپۆن بوو لەسەر کۆریا لە ١٩٠٥ەوە تاکو ١٩٤٥، بە تایبەتیش سەختییەکانی جەنگی دووەمی جیهانی بوو، لەگەڵ ئەو کێشە ناسراوەی بە "ژنانی چێژ" ناسرابوو.

مون گوتی نابێت مێژوو دەست بخاتە داهاتووی پەیوەندییەکانەوە، بەڵام ژاپۆن جاروبار دەیکردە کێشە. بێگومان ئەوەی مێژووی زیندوو دەکردەوە

ژاپۆن نەبوو، بەڵکو مون خۆی لەپێناوی مەرامەکانی خۆیدا ئەوەی دەکرد. بە بۆچوونی من، مونیش وەک سەرکردە سیاسییەکانی تری کۆریای باشوور وابوو، کاتێک بارودۆخی ناوخۆ خراپ دەبوو ژاپۆنی دەکرد بە کێشە.

ترەمپ پرسی: ئایا کۆریای باشوور دەتوانێت ژاپۆن وەک هاوپەیمانی جەنگ قبووڵ بکات، بەبێ ئەوەی چالاکیی هاوبەشی ڕاستەوخۆیان هەبێت؟! مون ڕاستگۆیانە گوتی ژاپۆن و کۆریا دەتوانن چالاکیی سەربازیی هاوبەشیان هەبێت، بەڵام هەبوونی سوپا و سەربازی ژاپۆن لە کۆریا یادەوەری باش ناهێنێتەوە یادی خەڵک. ترەمپ دیسانەوە پێداگری کرد و پرسی چی دەبێت ئەگەر پێویست بکات دژی کۆریای باکوور بجەنگین، هەروەها ئایا کۆریای باشوور بەشداریکردنی ژاپۆن قبووڵ دەکات یان نا. مون هەوڵی دا وەڵام نەداتەوە و گوتی پێویست ناکات نیگەرانی ئەوە بین، هەروەها گوتیشی کۆریای باشوور و ژاپۆن ئامادەن وەک یەک هێز بجەنگن، بەڵام تا کاتێک کە سوپای ژاپۆن نەیەتەوە ناو خاکی کۆریای باشوورەوە.

لە کۆتاییدا مون گوتی لەگەڵ گەڕانەوەیدا بۆ خاکی سیئۆل، پێشنیاری سێیەم دیداری ئەمریکا و کۆریای باکوور بۆ کۆریای باکوور دەکات، بۆ بەروارەکەش ڕۆژێکی پێ باش بوو لە نێوان ١٢ حوزەیران و ٢٧ی تەمووزدا. ترەمپ گوتی بەروارەکە کێشەی نییە، بەڵام دەبێت ڕێککەوتنێکی پێشوەختە هەبێت. مون بەردەوام بوو لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی هەموومان دەمانزانی، کە بریتی بوو لەوەی قسەی دیپلۆماتەکانی کۆریای باکوور لە بابەتی چەکی ناوکیدا هیچ گرنگییەکی نییە، بۆیە دەبێت گفتوگۆ لەسەر ئاستی باڵاتر بکرێت. ترەمپ گوتی، "پەمپەیۆ و بۆڵتن کار لەسەر ئەوە دەکەن."

لە ٢٦ی نیساندا ئابێ شینزۆی سەرۆک وەزیرانی ژاپۆن گەیشتە واشنتۆن و

پێشنیارەکەی بەنزیکەیی ڕێک پێچەوانەی ئەوەی مون بوو. ترەمپ بە ئابێی گوت هەڵسەنگاندن و دەستخۆشی باشی بۆ هاتووە لەسەر ئەوەی لە هانۆی ڕێککەوتنی نەکردووە. ئابێ هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی دەرئەنجامەکان زۆر ئەرێنی بوون، هەروەها لەسەر ئەوەی ترەمپ تاکەکەس بووە بتوانێت ڕێککەوتن ئەنجام نەدات. ئەو چەند جارێک پێداگری لەسەر گرنگی هێشتنەوەی سزاکان و پاشەکشەنەکردن کردەوە. ئابێ پێی وابوو کات لە بەرژەوەندیی ئێمەیە و ترەمپیش هاوڕا بوو.

بەداخەوە کۆریای باکوور بەردەوام بوو لەسەر تاقیکردنەوەی مووشەکەکانی، بێگومان ئەو مووشەکە کیشوەربڕانە نا کە پەیمانی بە ترەمپ دابوو تاقییان نەکاتەوە، بەڵکو ئەو مووشەکە مام ناوەند و کورتمەودایانەی دەیانتوانی هەڕەشە بخەنە سەر کۆریای باشوور و ژاپۆن. هەندێک لەو مووشەکانە لە شێوەی تۆپدا دەتەقێنران و دۆخەکەیان وەک دۆخی جەنگ لێ دەکرد. یەکەم مووشەك کە من هەواڵەکەیم بیست لە ٣ی ئایاردا هەڵدرا کە دەیکردە هەینی (بە کاتی کۆریا بەرەبەیانی یەکشەممە بوو). یەکسەر پەیوەندیم بە پەمپەیۆ و شاناهانەوە کرد تا ئاگادارییان بکەمەوە. پاش کەمێک هەواڵی هەڵدانی مووشەکی تر ڕاگەیەندرا. پاش قسەکردن لەگەڵ دەنفۆرد، بڕیارم دا پەیوەندیی بە ترەمپەوە بکەم و زانیارییەکانی بدەمێ. مووشەکەکان کورتمەودا بوون، بۆیە هەڕەشەیەکی یەکسەری لە ئارادا نەبوو، بەڵام کۆریای باکوور جێی دڵنیایی نەبوو.

پاش کەمێک لە پەیوەندیی یەکەم و هەڵدانی چەند مووشەکێکی تر، پەیوەندیم بە ترەمپەوە کردەوە و گوتم وادیارە ئەمشەو هی تر هەڵنادەن. ترەمپ بە دەنگێکی کەمێک شڵەژاوەوە گوتی، "بابەتەکە هێواش بکەرەوە، بچووکی بکەرەوە بچووک." دیار بوو نیگەرانی ئەوە بوو خەڵکی کیم جۆنگ ئونی هاوڕێی بە ترسناک بزانن. لەو کاتەدا بەپێی لێدوانەکانی

وەزیری بەرگریی کۆریای باکوور، کە دەبوو نیگەرانی مووشەکە کورتمەوداکان بێت، بابەتەکە بووبوو بە باسی هەواڵ و ڕاگەیاندنەکان. تا ئەو جێیەی دڵنیا بووم وەزارەتی دەرەوە دەربارەی کاردانەوەی ئێمە دەپرسێت، پێم باش بوو سەرەتا بۆچوونی ترەمپ وەربگرم. بۆ جاری سێیەم و دواجار لە شەوەکەدا و پاش کاتژمێرێک پەیوەندیم پێوە کردەوە، هەروەک گومانیشم کردبوو نەیدەویست هیچ لێدوانێکی هەبێت. لە کۆتایی پەیوەندییەکەدا گوتی، "باشە پیاو،" ئەوەش یەکێک بوو لە ڕێگا باوەکانی ئەو بۆ گوتنی ئەوەی ئارام بووینەتەوە و کێشەکەمان چارەسەر کردووە. لێدوانی بدایە یان نا، تاقیکردنەوەی ئەو مووشەکانە جا مەوداکانیان هەرچەندێک بێت، سەرپێچی بوون بەرامبەر بە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش کە بنچینەی سزا نێودەوڵەتییەکانی سەر کۆریای باکوور بوون. من نیگەرانی سەرپێچیکردن نەبووم لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، نیگەرانی من بۆ ئەوە بوو ئەگەر ئێمە بە شێوەیەکی کردارەکی ئەو سەرپێچییە ڕوونانە لەبەرچاو نەگرین و بە نەکردەی بزانین، ئەوا وڵاتەکانی تریش فێری وانەیەکی هەڵە دەبن و سەرپێچیکردنی گەورەی سزاکان بە شتێکی بچووک دەزانن. ئەوە مەترسیدار بوو.

هەر بۆ پشتڕاستکردنەوەی ترسەکانم، کاتێک بەیانیی دواتر زانیارییەکانم بۆ ترەمپ گواستەوە پێی گوتم، "بە تۆپهاوێژی ناوزەندیان بکە،" وەک ئەوەی ناوزەندکردنی مووشەکهەڵدانەکان بە تۆپهاوێژی کێشەکە ون بکات. ترەمپ لە تویتەریش ئەوەی گوتبوو، گوتبووی: "کیم دەزانێت من لەگەڵ ئەوم & ئەو پەیمانە ناشکێنێت کە بە منی داوە. لە داهاتوودا ڕێك دەکەوین!" دیارە ترەمپ وای بیر کردووەتەوە ئەو تویتانە دۆخەکە لەگەڵ کیمدا باشتر دەکەن، بەڵام من نیگەرانی ئەوە بووم ئەو تویتانە پشتڕاستکەرەوە بن بۆ ئەوەی ترەمپ شەیدای ڕێککەوتنێکە و ئامۆژگاریکەرە وێرانکەرەکانی ڕێگای نادەن. ئێمە خۆمان بەدەستەوە دابوو

لەوەی ڕێگری لە تویتەکانی بکەین؛ دەبوو لەگەڵیدا ڕابێین. شایەنی باسە کۆریای باشووریش بۆ بچووککردنەوەی بابەتەکە بە مووشەکەکانی دەگوت "هاوەن"، هەموو ئەمە بەهۆی ڕژێمێکەوە بوو لە پیۆنگ یانگ کە لە پێناوی خواردن بۆ خەڵکە بە حیساب برسییەکەی لە جیهان دەپاڕایەوە، کەچی لە لایەکی تریشەوە بەشی ئەوە پارەی هەبوو بیخاتە خزمەتی پەرەپێدانی مووشەك و چەکی ناوکییەوە.

هەڵوێستی وڵاتەکانی تر وا نەبوو. ئابێ لە ڕۆژی هەینی لە بەرواری یەکی ئایار پەیوەندیی کرد تا بڵێت کیم جۆنگ ئون تەواو بێزار بووە لە کاریگەریی سزاکان لەسەر کۆریای باکوور، لەبەرئەوەی سزاکان کاریگەرن، هەروەها ئەو مووشەکانەش بۆ ئەوە بوون لە ڕێگای تێکدانی هاوسەنگیی نێودەوڵەتییەوە لەسەر سزاکان دۆخەکە بەلای خۆیدا بخات. ئابێ گوتی بە تەواوەتی پاڵپشتی سیاسەتی چاکی ترەمپ دەکات، مەبەستی لەوەش هەوڵی بەردەوامی ترەمپ بوو بۆ ڕێککەوتن و بەردەوامیدان بە سزاکان، هەروەها ئەو پێگە سەربازییە بەهێزەی ترەمپ هەیبوو کە تا ئێستاش لەبەر چاوی زۆرینەدا هەیەتی. لە نیازی ئابێ تێدەگەیشتم، بەڵام دڵنیا نەبووم لەوەی ئابێ بە بەردەوام ستایشکردنی ستراتیژییەکەی ترەمپ بتوانێت شەمەندەفەرەکەی ترەمپ لەسەر هێڵەکە بهێڵێتەوە. لە ڕاستیدا ترەمپ پێشنیاری کرد ئابێ لێدوان بدات و بڵێت ژاپۆن و ئەمریکا هاوپەیمانی تەواون، تاکو کۆریای باکوور بزانێت ژاپۆنیش لەگەڵمانە. لە کۆتاییدا پەیمانی بە ئابێی دا بێهەواڵی نەکات و پێشی گوت نیگەران نەبێت، چونکە هەڵدانەکان کورتمەودا بوون و مووشەك نەبوون. ئەگەر لەوە زیاتر ئەو قسەیەی دووبارە بکردایەتەوە، بۆی هەبوو ببێت بە ڕاست!

ڕۆژی داهاتوو مون پەیوەندیی بە ترەمپەوە کرد تا دەربارەی هەڵدانەکانی کۆتایی هەفتە قسە بکەن. هەروەک چاوەڕوانکراو بوو، مون هەوڵی دەدا گرنگیی کێشەکە کەم بکاتەوە و ترەمپیش هەر ئەوەی لەگەڵ خۆیدا

کردبوو. کاتێک مون باسی بێزاریی کیم جۆنگ ئونی کرد لەسەر چالاکییە هاوبەشە سەربازییەکانی ئەمریکا و کۆریای باشوور، ترەمپ تێگەیشت لەوەی بۆی هەیە مون پەیوەندیی لەگەڵ کیمدا نەمابێت. ترەمپ ئەوەی بە هەڵەی مون نەزانی، بەڵام ڕوون بوو شتێک ڕووی دابوو. مون دانی بەوەدا نا لە پاش هانۆیەوە چەند گفتوگۆیەکی کەمیان لەگەڵ کۆریای باکووردا کردووە. بە جۆرێک لە جۆرەکان مون توانی ئەو باسە بکات بە باسی ئەوەی ئەمریکا دەبێت یارمەتیی خۆراکی بۆ کۆریای باکوور بنێرێت، لە جیاتی ئەوەی ڕێگا بە کۆریای باشوور بدات لە ڕێگای یونیسێف و دەبلیو ئێچ ئۆوە[1] ئەوە بکات. لە وەڵامدا ترەمپ گوتی مون سەرسام دەکات و ڕێگای پێ دەدات لە ڕێگای دەزگاکانی یو ئێنەوە یارمەتیی کۆریای باکوور بدات، بە مونیشی گوت بە کۆریای باکوور بڵێت پێشنیارەکە هی ترەمپە. ترەمپ گوتی سەرەڕای هەبوونی نارەزاییەکانی دەوروبەریشی ئەو کارە دەکات، چونکە پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کیمدا هەیە و کاتەکەشی باشە.

ناجێگیرییەکی زۆر! بەرپرسانی کۆریای باکوور دەیانتوانی بەم شێوەیە تێبگەن: "مووشەك دەهاوێین و خواردنی بەلاشیشمان بۆ دێت." ئەوە ئاماژەیەکی خراپ بوو، پیشانی دەدا ترەمپ بە تەواوەتی شەیدای ڕێککەوتنە. جەختم لە پوتینگەر و هۆکەر کردەوە بۆ کۆریای باشووری ڕوون بکەنەوە ئێمە هیچ برە خۆراکێک دابین ناکەین. ئێمە تەنها تانەمان لە سەرچاوە دابینکەرەکان نەدەدا، بەڵکو جەختیشمان دەکردەوە لەوەی دابەشکردنی خۆراک لە کۆریای باکوور پێویستی بە چاودێرییەکی وریایانە هەیە. کۆریای باکوور لە بەهار و هاویندا مووشەکی زیاتری هەڵدا، ئەوەش بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کیم دڵنیایە لەوەی تۆڵەی لێ

---

(١) ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی

ناکرێتەوە، بەڵکو لەوانەیە کەمێک برنجی تری بۆ بچێت! ترەمپ لە بەرواری ٩ی ئایاردا پاش هەڵدانی دواتر پێی گوتم: "سزا قورسەکان بخەرە کار،" بەڵام هیچ شتێک ڕامەگەیەنە. شتێکی زۆر بچووکمان زۆر گەورە دەکرد.

لە کۆتاییەکانی ئایاردا، ترەمپ سەردانی ژاپۆنی کرد، بەوەش بووە یەکەم سەردانکەری دەوڵەت بۆ ژاپۆن لە سەردەمی ڕیوادا، کە لە یەکی ئایارەوە دەستی پێ کرد و ناوەکەی هەڵبژێردراوی ئیمپراتۆر ناروهیتۆیە. ئەوە ڕێزلێنانێکی گەورە بوو بۆ ترەمپ، ئابێش لەوەوە دەیسەلماند کارە لەپێشینەکانی هاوپەمانییەتیکردنی ژاپۆن چین. من چەند ڕۆژێک پێشتر چووم بۆ خۆئامادەکردنی کۆتایی بۆ گفتوگۆکان و ئابێم دەبینی، کە ئامانجەکانی خۆی لەگەڵ ترەمپدا ڕوون دەکردەوە. پێم وابوو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی ٢٥ی ئایار ڕووداوێکی وای تێدا نابێت، کەچی منی خستە دۆخێکی قورسەوە. پەیامنێرێک لێی پرسیم ئایا مووشەکهەڵدانەکانی کۆریای باکوور بەندەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشیان شکاندووە، منیش کە خۆم کاتی خۆی کاتێک باڵوێزی ئەمریکا بووم لە یوئێن بەشداریم لە نووسینی دوو بەندی سەرەتادا کردبوو، چاک دەمزانی بەندەکانیان شکاندووە. بەنیاز نەبووم ئەوە پشتگوێ بخەم کە زۆر جەختم لێ کردبوویەوە. لە ڕوانگەی لۆژیک و ڕوانینیشەوە، بە تەواوەتی ڕێی تێدەچوو هەڵدانی مووشەکەکان بەندەکانیان شکاندبێت، بەڵام بەڵێنەکەی کیمیان نەشکاندبێت بۆ ترەمپ، کە بریتی بوو لە هەڵدانی مووشەکە کیشوەربڕەکان. بە هەمان شێوەش هەڵە نییە ئەگەر بڵێین ترەمپ گێل دیار بوو لەوەدا کە تێنەدەگەیشت کیم لە ڕێگای ئەو بەڵێنەوە فریوی داوە. بەڵام ترەمپ باوەڕی وابوو وەرگرتنی ئەو بەڵێنە کارێکی زۆر باش بووە و نەشماندەتوانی ئەو باوەڕەی پێ بگۆڕین. پاش کەمێک لە گەیشتنی ئەیرفۆرس وەن بە ژاپۆن، ترەمپ تویتی کرد: "کۆریای باکوور چەند

چەکێکی بچووکی بەکار هێناوە، ئەوەش هەندێک لە نزیکەکانی من و خەڵکی تری بێزار کردووە، بەڵام من نا. من متمانەی تەواوم هەیە بەوەی سەرۆک کیم ئەو پەیمانە ناشکێنێت کە بە منی داوە، & کاتێک کیم گوتی هیچ زیرەکییەک لە جۆ بایدندا نابینم بزەم کرد، & خراپتر، لەوانەیە ئەوە ناردنی پەیامێک بێت بۆ من". هەر لەوکاتەوە دیار بوو گەشتێکی خۆش دەبێت.

لە ڕۆژی دووشەممە، ٢٧ی ئایار، شاندەکەی ئەمریکا ئامادەی ڕێوڕەسمێکی ڕێزلێنان بوو. لەگەڵ ئیمپراتۆردا لەسەر خاکی کۆشکی ئیمپراتۆری بوون، ئەوەش شتێکی سەرنجڕاکێش بوو. پاش دیدارێکی تایبەت لە نێوان ترەمپ و خاتوونی یەکەم و دوو هاوسەری ئیمپراتۆری، بە چەند ئۆتۆمبێلێک چووین بۆ کۆشکی ئاکاساکا. ئەو کۆشکە کە بینایەکی زەبەلاح بوو و لەوە دەچوو لە فەرەنساوە هەڵگیرابێت و لە تۆکیۆدا دانرابێتەوە، ڕاستەوخۆ پاش جەنگی یەکەمی جیهانی دروست کرابوو بۆ ئەوەی ئەندازیارییەکەی ستایلی فەرەنسی بێت. چەند ژاپۆنییەک پێیان گوتین ئەو کۆشکە ئێستاکە ناوبانگێکی وای نەماوە، چونکە کەس حەز بە دیتنی قەڵایەکی فەرەنسی ناکات لە ناو جەرگەی تۆکیۆدا.

ویستم سەرنجی ترەمپ بۆ تاقیکردنەوەی مووشەکەکانی کۆریای باکوور ڕابکێشم. لەوانە بوو ترەمپ ئەو تاقیکردنەوانەی بە شتێکی ئاسایی و بچووک زانیبێت، بەڵام ئەو ژاپۆنییانەی لە نزیکی کۆریای باکوور دەژیان بۆچوونێکی جیاوازتریان هەبوو. ترەمپ گوتی، "بەلامەوە ئاساییە خەڵکی لەگەڵمدا هاوڕا نەبن،" لە کاتێکدا مەبەستی من ئەوە نەبوو. پێش ئەوەی هەوڵێکی تری لەگەڵدا بدەمەوە، چووینە ژوورێکی گەورەوە کە ڕازێندرابوویەوە بۆ دیداری یەکەم. لەو دیدارەدا تەنها دوو سەرۆکەکە و من و یاشی و وەرگێڕەکان ئامادە دەبووین. ئابێ بە سوپاسکردنی ترەمپ دەستی پێ کرد لەسەر ئەوەی قایل بووبوو دواتر خانەوادەی ئەو کەسانە

ببینێت کە کۆریای باکوور لە ماوەی چەند ساڵدا فڕاندبوونی. کۆریای باکوور بەردەوام ئەو فڕاندنانەی ڕەت دەکردەوە، بەڵام بەڵگە پێچەوانەکان زیاتر بوون. ئابێ لە سەرەتای ژیانی سیاسیی خۆیدا پاڵپشتی زۆری لە خێزانی فڕێندراوەکان کردبوو، بۆیە هەڵوێستەکەی ترەمپی بەرز دەنرخاند. (دواتر ئەو خانەوادانەی کە پێشتریش لە واشنتۆن بینیبوومن هاتن و بێ پێچوپەنا قسەیان لەگەڵ ترەمپدا کرد. یەکێکیان گوتی، "کۆریای باکوور درۆی لەگەڵ کردوویت و فریوی داویت،" یەکێکی تر گوتی، "ئەوە بۆ ماوەی سێ نەوەیە کۆریای باکوور ڕۆڵی وڵاتێکی تیرۆرست دەگێڕێت. ترەمپ بە گەرموگوڕییەوە وەڵامی یەکێکیان دایەوە، "هەرگیز لە گەڕان مەوەستە ، هەرگیز مەوەستە." بە دایکی فڕێندراوێکی تری گوت، "دڵنیابە دەیبینیتەوە." لەپاش دیدارەکە ترەمپ و ئابێ گوتارێکی هاوبەشیان دا. ئەوەش بەرزبوونەیەکی کەم نەبوو بۆ ئابێ و لەو گوتارەدا ترەمپ گوتی: "پێکەوە کار لەسەر بابەتەکە دەکەین و ڕفێندراوەکان دەگەڕێنینەوە ماڵەوە.

پاش گفتوگۆی زیاتر لەگەڵ ئابێدا، کە بەشێکی زۆری لەسەر چین بوو. کاتێک چووینە ژووری چاوەڕوانیی تایبەت بە ئەمریکاوە، ترەمپ پرسیاری کرد بۆچی بۆب لایتهایزەری نوێنەری بازرگانیی ئەمریک ئامادەی دیدارەکان نەبووە. بۆم ڕوون کردەوە کاری تری هەبووە، بەڵام ترەمپ ئەوەی پشتگوێ خست. ئەو گوتی، "لایتهایزەر دەبوو گوێی لەو گوفتارە بوایە کە دەربارەی چین درا،" پاشان ڕووی کردە من و گوتی. "کاتێک کتێبەکەت نووسی، بە باشی بینووسە." پێکەنیم و گوتم و دەکەم، لەو ساتەدا ترەمپیش پێکەنی. داواکارییەکەت جێبەجێ کرا.

کاتژمێر سێی نیوەشەو ئابێ و ترەمپ کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیی هاوبەشیان هەبوو. ترەمپ دیسانەوە ئاماژەی بەوە دا نیگەرانی مووشەکهەڵدانەکانی کۆریای باکوور نییە و ئابێش بە ئاشکرا و لە کاتێکدا کە ترەمپ لە تەنیشتیدا دانیشتبوو گوتی، "باوەڕم وایە کۆریای باکوور

بەندەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشیان شکاندووە." ڕاگەیاندنەکان هەتابلێی بەو ڕاجیاییە خەنی بوون، بەڵام لەوەش گرنگتر، ئەو ڕاجیاییە پیشانی کۆریای باکووری دا، سەرەڕای کۆششێکی زۆر بۆ پیشاندانی یەکگرتوویی ئەمریکا و ژاپۆن، ئەوە نەدەشاردرایەوە کە ترەمپ و ئابێ ڕای جیاوازیان لەسەر کۆریای باکوور هەبوو.

لە ٢٨ی حوزەیراندا ترەمپ گەڕایەوە بۆ دیداری ئۆساکا G20 و کاتژمێر هەشتی بەیانیی ڕۆژی هەینی ئابێی بینی. بە بۆچوونی من، باشترین پەیوەندیی ترەمپ لەگەڵ سەرۆکەکانی جیهاندا لەگەڵ ئابێدا بوو (لەگەڵ ئەوەی هاوکار بوون یاری گۆڵفیشیان پێکەوە دەکرد)، هەرچەندە کاتێک بۆریس جۆنسن بوو بە سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا، ئەو پەیوەندییەش گەیشتە ئاستی پەیوەندییەکەی ئابێ. ترەمپ زۆر حەزی دەکرد باسی ئەوە بکات باوکی ئابێ لە جەنگی دووەمی جیهانیدا فڕۆکەوانی کامیکازە بووە. ترەمپ مەبەستی لەوە بوو ژاپۆنییەکان بەگشتی زۆر بەهێز بوون و بە تایبەتیش باوکی ئابێ. لە گێڕانەوەیەکدا ترەمپ گوتی باوکی ئابێ نائومێد بووە لەوەی نەیتوانیوە ئەرکەکەی خۆی بۆ ئیمپراتۆر جێبەجێ بکات، پێ نەدەچوو هەست بەوە بکات ئەگەر باوکەکە وەک کامیکازەیەک سەرکەوتوو بوایە، شینزۆ ئابێ نەدەهاتە دونیاوە (ئابێ لەدایکبووی ١٩٥٤ە). تەنها چەند وردەکارییەکی مێژوویە و هیچی تر.

ئابێ، دیسانەوە لەبەر دیداری کەسوکاری فڕێندراوەکان سوپاسی ترەمپی کردەوە. ئابێ گوتی کۆریای باکوور ڕێککەوتنی ویستووە، ئەوەش بۆ دوو سەرکردەکە هەمان واتای نەبوو. بەلای ئابێوە ئەوە واتای ئەوە بوو کۆریای باکوور دەبێت هەنگاوی ڕاستەقینە بەرەو دەستهەڵگرتن لە چەکی ناوکی بنێت و کەمکردنەوەی سزاکانیش پێویست نییە. هەرچی ترەمپە گوتی کیم نامەی جوان و کارتی ڕۆژی لەدایکبوونی بۆ نووسیوە، هەروەها گوتی کۆریای باکوور دەیەوێت شتێک بکات چونکە سزاکان

کاریگەریی زۆر خراپی لەسەریان هەیە. ترەمپ پرسی ئایا ژاپۆنیش هەمان سزاکانی ئەمریکای سەپاندووە یان نا، ئەوەش هەروەک یەکەم دیداری ئەو و ئابێ و مون بوو، کە تیایدا پرسی ئایا ئەوانیش سزایان خستووەتە سەر باکوور یان نا؟! ئەوان ئەوکات بە نەخێر وەڵامیان دابوویەوە و گوتبوویان سزاکان زۆر گرانن. (لە کۆرییە باشووری و ژاپۆنییەکانم پرسیبوو ئایا ئەوەیان بیستووە، هەموویان وەڵامیان نەخێر بوو و دەیانگوت بێگومان ژاپۆن و کۆریای باشوور سزاکانی یوئێن جێبەجێ دەکەن. ترەمپ ئەوەندە قەناعەتی بە بابەتەکە بەهێز بوو، کە قسەکردن لەوبارەیەوە لەگەڵ ئەودا سوودی نەبوو.) ترەمپ پێداگری کرد لەوەی سزاکان تێچووی زۆریان دەوێت، بەڵام ئەگەر لە ئێستادا جێبەجێیان نەکەیت لە دواییدا باجەکەی دەدەیت. ئەو پێی وابوو کۆریای باکوور ئاماژەی ئەوە دەنێرێت گوایە دەیانەوێت زیاد لە پێگەیەکی ناوکی دابخەن، هەروەک چۆن لە هانۆی پێشنیاریان کردبوو، هەروەها پێی وابوو دیداری تریشیان دەوێت. بە دەم پێکەنینەوە گوتی: "باکوور ڕقیان لە بۆڵتن و پێنس و پەمپەیۆ بوو، بەڵام منیان خۆش ویستووە." ئابێ و ژاپۆنییەکان پێکەنینێکی وشکیان کرد و لەوە دەچوو سەرچاوەی پێکەنینەکەیان نائاسوودەیی بووبێت. ترەمپ گوتی لای گرنگ نەبووە چونکە هەڵدانەکانی کۆریای باکوور تاقیکردنەوەی ناوکی و ڕۆکێت نەبوون.

ترەمپ لە هەمان ڕۆژدا دیداری تری دوو لایەنەی هەبوو و ڕاشهاتبوو بەوە. لە گفتوگۆیەکی کورتدا لەگەڵ مێرکڵ باسی کۆریای باکوور و گەشتەکەی پاش G20ی کرد بۆ کۆریای باشوور. ترەمپ گلەیی لەوە کرد کە ئەمریکا لە هەموو جێیەک سەربازی هەیە بەبێ ئەوەی سوودی لێ ببینێت. گوتی لەوانەیە لە ناوچەی بێ سوپای کۆریا کیم جۆنگ ئون ببینێت، چونکە کیم دەیویست شتێک بکات بەڵام نەیدەزانی چۆن دەست پێ بکات. پێم وابوو ئەوە یەکەمجار بوو کەسێکی ناو شاندی ئەمریکی

گوێی لێ ببێت ترەمپ باسی دیداری کیم بکات لە ناوچەی بێ سوپا.

کاتێک بەرەبەیانی ڕۆژی شەممەش چاوەڕێی ترەمپمان دەکرد بۆ ئەوەی دەربارەی ڕۆژەکە قسەی لەگەڵ بکەین، هەمان شتمان بیستەوە. مولڤانی تویتێکی پیشان دام و گوتی ئاگات لەوە هەیە، ئاگام لێی نەبوو:

پاش چەند دیدارێکی گرنگ، لە نێویشیاندا دیتنی سەرۆک شی جینگ پینگی چین، لەگەڵ سەرۆک موندا ژاپۆن جێ دەهێڵم و دەچم بۆ کۆریای باشوور. تا کاتێک لەوێم، ئەگەر سەرۆک کیمی کۆریای باکوور ئەمە دەبینێت، خۆشحاڵ دەبم بەوەی لەسەر سنوور/ ناوچەی بێسوپا چاوم پێی بکەوێت و سڵاوێکی لێ بکەم!

مولڤانیش وەک من حەپەسا بوو. پێم وابوو ئەو تویتە بەبێ بیرکردنەوە پۆست کراوە. لە نیوەڕۆیەکی زوودا، لە نێوانی دیدارە دوولایەنەکاندا، مولڤانی پەمپەیۆ و منی ڕاکێشایە لایەکەوە تا بڵێت کۆرییە باکوورییەکان گوتوویانە تویتەکە ئەو بانگێشتە فەرمییەی تێدا نییە کە ئەوان دەیانەوێت و ئەویش خەریکی ئامادەکردنییەتی. پەمپەیۆ بە منی گوت، "ئەمە هیچ بەهایەکی نییە. شپرزەییەکی تەواوە" ئەو قسەیەش بۆ هەردووکمان ڕاست بوو. ئەوەندەشم زانی ترەمپ ئەو بانگێشتەی واژوو کرد کە کۆریای باکوور داوای کردبوو. پەمپەیۆ ئەو جارەش خۆی بە دەستەوە دا.

ئەو هەوڵیشی دەدا هەوڵەکانی مون جڵەو بکات بۆ ئامادەبوون لە دیدارەکەی ترەمپ و کیمدا. ترەمپ نەیدەویست مون ئامادە بێت، بەڵام مون پێداگر بوو لەسەر ئامادەبوون و دەیویست دیدارەکە بکات بە سیانی. ئومێدێکی کەمم هەبوو بەوەی ئەو ناکۆکییە لەگەڵ موندا ببێتە هۆی سەرنەگرتنی دیدارەکە، چونکە ڕوون بوو کیم بە هیچ جۆرێک نەیدەویست مون ئامادە بێت.

لەبەرئەوەی لە فڕۆکەی جیادا بووین، بە جیا لە ئۆساکاوە بەرەو سیئۆڵ

گەشتمان کرد، ئەوەش واتای ئەوە بوو نەمدەتوانی بەشداری ئەو خوانە بکەم کە مون ڕێکی خستبوو. کاتێک گەیشتمە هۆتێلەکەمان لە سیئۆڵ، دیتم ئامادەکاریی تەواو بۆ دیداری ناوچەی بێسوپا کراوە. تا ئەو جێیەی ئاگادار بووم دەبوو دیداری ترەمپ و کیم بە تەوقەیەک و وێنەگرتنێک کۆتایی بێت، بەڵام گومانم نەبوو ترەمپ لە چاوەڕوانیی ئەوەی دیدارەکەی سبەینێ چ ئەنجامێکی دەبێت، تەواو وروژاوە. ئەوکات بڕیارم نەدابوو ئایا سەرەتا بچم بۆ ناوچەی بێسوپا پاشان بچم بۆ مۆنگۆلیا کە دەمێکە بڕیارم داوە بچم، یاخود ڕاستەوخۆ بچم بۆ ئولان باتۆری پایتەختی مۆنگۆلیا. لە سەرەتا بڕیاری ئەوەم نەبوو لەگەڵ ترەمپدا بچم بۆ دیدارەکەی ناوچەی بێسوپا (کاتەکەی گۆڕدرا چونکە کەشی خراپ بووە هۆی ئەوەی لە گەشتی یەکەمیدا بۆ کۆریا نەتوانێت سەردانێکی ئەو ناوچەیە بکات).

هەستم بە ناخۆشی دەکرد کە دەمبینی تویتێکی ڕێونکەر بووەتە هۆی دیدارێک، لەگەڵ ئەوەشدا وام دادەنا کە ترەمپ لەو سەردانەدا تەنیا مەبەستی وێنەگرتنێکە نەک شتی تر، بەمەش کەمێک ئاسوودەییم بە خۆم دەبەخشی. ترەمپ ویستبووی یەکێک لە دیدارەکانی پێشتر لە ناوچەی بێسوپا بێت، بەڵام بیرۆکەکە سەری نەگرتبوو لەبەرئەوەی ئەوە دەبووە خاڵێکی بەهێز بۆ کیم جۆنگ ئون، چونکە نزیک بوو لەوەوە، لە کاتێکدا ئێمە دەبوو نیوەی جیهان ببڕین بۆ گەیشتن پێی، هەروەها لەبەر ئەوەشی هێشتا نەمانزانیبوو چۆن دڵنیا بینەوە دیدارەکە دووانی دەبێت. ئێستا وا دیدارێک لە ناوچەی بێسوپا ڕووی دەدا. کۆریای باکوور ئەوەی پێبوو کە لە ئەمریکای دەویست و ترەمپیش ئەوەی پێبوو کە بۆ خۆی دەویست، ئەمە دۆخی ناهاوسەنگی ترەمپی پیشان دا کە لە کاروبارە دەرەکییەکاندا، نەیدەتوانی بەرژەوەندییە کەسییەکانی و بەرژەوەندییە دەوڵەتییەکان لە یەکتری جیا بکاتەوە.

لە یەکشەممەی ٣٠ی حوزەیراندا لەگەڵ بێداربوونەوەمدا هەواڵێک سەرسامی کردم: پەمپەیۆ ناونووس کرابوو بۆ بەشداریکردن لە دیدارەکەی ناوچەی بێسوپا. ئیمەیڵێکم بۆ نارد و پرسیم بەتەمایە بچێت؟! وەڵامی دایەوە: "هەست دەکەم دەبێت لەوێ بم." پێم وانەبوو پێویست بێت کەس لەوێ بێت، بەڵام گوتم مادام ئەو دەچێت منیش دەچم. پاش خوانی بەیانی لەگەڵ سەرکردە بازرگانییەکانی کۆریای باشوور و ئەمریکا لە هۆتێلەکە، بەڕێ کەوتین بۆ کۆشکی شینی کۆریای باشوور بۆ دیتنی مون و تیمەکەی. لە ڕێگا تێگەیشتم لەوەی کۆریای باکوور دیدارێکی گەورەی دوولایەنەی ناوێت، بەڵکو دیدارێکی چل خولەکیی دووبەدووی سەکردەکانیان دەوێت، بە ئامادەبوونی یەک نەفەری تر لە هەر لایەک. پاش کەمێک پێیان گوتم کۆریای باکوور ڕی یۆنگی وەزیری کاروباری دەرەوەیان وەک ئەو یەک نەفەرە دیاری کردووە، ئەوەش واتای ئەوە بوو پەمپەیۆ یەک نەفەرەکەی ئێمە دەبێت. کاتێک زانیم لە دیدارە سەرەکییەکە نابم، بڕیارم دا بچم بۆ ئولان باتۆر. هیچ مەیلم لەوە نەبوو کاتێک ترەمپ و کیم یەک دەبینن لەو ناوەدا بوەستم، هیچ ئومێدێکیشم نەبوو بەوەی ئەگەر پێش دیدارەکە ئامۆژگاریی ترەمپ بکەم، دوایی بەگوێم بکات. قسەم لەگەڵ مولڤانی کرد و پێی گوتم ئامادەبوونت بەدڵی خۆتە.

لە هەمان کاتدا لە کۆشکی شین، لە دیدارێکی زۆر سنووورداری دووانیدا مون داوای نەخشەی ترەمپی کرد بۆ دیدارەکەی ناوچەی بێسوپا. ترەمپ گوتی کە نازانن نەخشەکە چییە. بە پێچەوانەی ڕاستییەکە، ترەمپ گوتی کیم داوای دیداری لەو کردووە، بەڵام ئەو پێشنیاری کردووە ئەو و مون لە ناوچەی بێسوپا ئەو ببینن تاکو مون باش دەربکەوێت. بێگومان ئەوە پێچەوانەی ئەوە بوو کە ترەمپ لە پێشوودا بە ئێمەی گوتبوو، بۆیە پەمپەیۆ دەستی بە قسەکردن کرد تاکو باسی دواهەمین ڕێکخستنەکان بکات

لەگەڵ کۆریای باکووردا، بە شێوازی دیدارەکەی ترەمپ و کیمیشەوە. لە وەلامی پرسیارێکی ترەمپدا، پاڵپشتیم لە پەمپەیۆ کرد. ترەمپ گوتی بەزوویی بۆمان دەردەکەوێت لەگەڵ کیمدا یەک دەبینین یان نا. مون گوتی کێشە گەورەترەکە بۆ ترەمپ خودی دیدارەکەیە. هەرچۆنێک بێت، کاتێک کیم پێی دەخستە خاکی کۆریای باشوورەوە، ئیتر نەدەکرا مون ئامادە نەبێت، بۆیە مون پێشنیاری کرد سڵاوێک لە کیم بکات و دوایی دوو سەرکردەکە جێ بهێڵێت. پەمپەیۆ قسەی کردەوە و گوتی شەوی پێشتر ئەو پێشنیارەیان کردووە، بەڵام کۆریای باکوور ڕەتی کردووەتەوە. ترەمپ گوتی دەیەوێت مون ئامادە بێت، بەڵام ناچاریشە لەو بابەتەدا بە گوێی کۆریای باکوور بکات. مون پێداگریی کرد، هەروەها ئاماژەی بەوە کرد پێشتریش سەرکردەی دیکە سەردانی ناوچەی بێسوپایان کردووە، بەڵام ئەوە دەبووە جاری یەکەم سەرکردەی ئەمریکا و کۆریای باشوور پێکەوە لەوێ بن. ترەمپ گوتی نایەوێت ئەو دەرفەتە مەزنە لەدەست بدات، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی سروشتی هەندێک شتی هەبووە بە کیمی بڵێت، بەڵام ناچارە بەگوێی خزمەتگوزاریی نهێنی بکات، چونکە ئەوان ڕێکخەری گەشتەکە بوون (ئەوەش فەنتازیایەکی دی بوو).

مون بابەتەکەی گۆڕی، گوتی دانوستان لەسەر ئاستی باڵا هەمیشە لەگەڵ کۆریای باکوور قورس بووە، بەڵام ئەگەر خۆڕاگری هەبێت ئەگەری ئەنجامی باشیش دەبێت. لە وەڵامدا ترەمپ گوتی بە هیچ جۆرێک ناخوازێت دیداری داهاتووی کۆریای باکوور و ئەمریکا پاش هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا بێت. لەو ساتەدا، ترەمپ تۆنی ئۆرناتۆی بەڕێوبەری خزمەتگوزاریی نهێنیی جووڵاند، کە من پێم وابوو مەبەستی لەو کارە پرسیارکردنە دەربارەی یەکتربینینەکەی ناوچەی بێسوپا. بەڵام دەرکەوت بۆ ئەوەی بوو بپرسێت بۆچی ئیڤانکای کچی و جاریدی هاوسەری لە دیدارەکەدا نین (هۆکارێکی تەواو شیاو بۆ ئەو ئامادەنەبوونە

هەبوو)، هەروەها گوتی با ئۆرناتۆ بچێت بەدوایاندا و بیانهێنێت (هیچ هۆکارێک نەبوو بۆ ئەوە). تەنانەت شاندەکەی کۆریای باشووریش تەریق بوونەوە. ترەمپ درێژەی دایە و گوتی پێی وابوو هیچ نەبێت تا ڕادەیەک لە شێوازی بیرکردنەوەی کیم جۆنگ ئون تێگەیشتووە و دەیزانی دیداری دەوێت. ترەمپ پێشنیاری کرد مون ئەو لە سیئۆلەوە بۆ ناوچەی بێسوپا ڕەوانە بکات و دواتریش دەکرێت لە بنکەی ئاسمانیی ئۆسان لە کاتی دیتن و سڵاوکردن لە سەربازە ئەمریکییەکاندا یەک ببیننەوە. مون دڵی بەوانە خۆش نەبوو و پێداگر بوو لەسەر ئەوەی وا باشترە تا لای ئۆپێ ئۆلێت (خاڵێکی چاودێریی نزیک ناوچەی بێسوپایە و بەناوی سەربازێکی ئەمریکییەوە ناو نراوە کە لە جەنگی کۆریادا مردووە) لەگەڵیدا بێت، پاش ئەوەش دەیانتوانی بڕیاری هەنگاوی داهاتوو بدەن. ترەمپ گوتی هەموو قسەکانی مونی لا پەسەندە و دەتوانن پێکەوە تا لای ئۆپی ئۆلێت بچن. لە وەڵامی پرسیارێکی دیکەی ترەمپدا، دڵنیام کردەوە نەخشەکە بەوجۆرە دەبێت.

ترەمپ بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بابەتی تێچووی بنکە سەربازییەکانی هێنایەوە پێشەوە، باسی ئەوەی کرد من و پەمپەیۆ پێشتر بابەتەکەمان لەگەڵ مونددا باس کردووە. ترەمپ کۆریای باشووری خۆش دەویست، بەڵام ئەمریکا بەهۆی بازرگانیکردنەوە لەگەڵ ئەواندا ساڵانە ٢٠ ملیار دۆلاری لەدەست دەدا. هەندێک خەڵک ویستیان گومرگ بخەنە سەر کۆریای باشوور بۆ ئەوەی لەباتی لەدەستدانی ٣٨ ملیار دۆلار (ئەو ژمارانە دەهاتن و دەچوون)، ئەمریکا ٣٠ ملیار قازانج بکات، بەڵام ترەمپ لەبەر خاتری پەیوەندییەکەی لەگەڵ مونددا ئەو بیرۆکەیەی ڕەت کردەوە. ساڵی پێشتر، داوای لە من کردبوو تێچووی بنکە سەربازییەکانی بۆ هەژمار بکەم، هەروەها لەگەڵ کۆریای باشووردا کار بکەم بۆ دەستخستنی بڕێکی گونجاو، لە ئەنجامدا هەژمارکردنەکە کردیە ٥ ملیار دۆلاری ساڵانە.

ترەمپ گوتی وڵاتەکانی تر قایل بوون زیاتر بدەن (ئەوەش ڕاست نەبوو، هیچ نەبێت تا ئەوکاتە). شایەنی باسە لە کۆتایی ۲۰۱۸دا کۆریای باشوور بڕەکەی بەرز کردبووەوە و لە ملیارێک نزیکی کردبووەوە، تا دەرفەتی ساڵێکی ترمان هەبێت. ئێستا دەبوو بڕێکی گونجاو بۆ ئەمریکا دەست بخەین، چونکە ئێمە ساڵانە ٤ ملیار دۆلارمان لەدەست دەدا لە پاراستنی کۆریای باشوور لە دەستی کۆریای باکوور. کۆریای باکوور بەهێز دەبوو و ئامادەنەبوونی ئەمریکاش لە پێنینسولا دەرئەنجامی جددیی لێ دەکەوتەوە. ترەمپ جەختی لە توندوتیژبوونی دراوسێکەی کۆریای باشوور کردەوە و داوای لە مون کرد کەسێک دیاری بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ پەمپەیۆ و مندا ڕێکبکەوێت. ترەمپ گوتی خەڵکی قسە لەسەر ئەو بابەتە دەکەن و ئەویش بەهۆی ئەوەوە هەڵبژێردراوە.

مون، کە لەوانەیە لەبیری کردبێت لە مانگی ئایاردا ترەمپ باسی ٥ ملیار دۆلاری کردووە، گوتی لە ڕوانگەی ئابوورییەوە لە ڕۆژی دەستبەکاربوونی ترەمپەوە قازانجەکان کەمیان کردووە، هەروەها کۆریای باشوور گەورەترین هەناردەکاری گازی شلکراوەیە بۆ ئەمریکا، هەروەها وەبەرهێنانی کۆریای باشوور لە ئەمریکا زیادی کردووە و دەرفەتی مامەڵەی هاوسەنگی دوولایەنەش بۆ ئەمریکا ڕەخساوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کۆریای باشوور بەشداریی ڕاوێژەکانی دەکرد، ١ ملیار دۆلاریشی دەدا و خاکی بەلاشیشی دابین کردبوو، هەروەها لە کڕینی چەکیشدا یارمەتیدەر بوو، هەموو ئەوانەش یارمەتیی گرنگ بوون بۆ بەرگرییە هاوبەشەکەمان. وردەوردە ترەمپ ماندوو دەبوو و بە ئاماژە بە مونی دەگوت خێرا بێت و بە بێتاقەتییەوە سەیری ئێمە و کۆرییەکانی تری دەکرد. تەریقبوونەوەیەکی تر. ترەمپ گوتی، "نابێت ئەمریکا باجی زەمین بدات، چونکە خاوەنی زەمینەکە نییە، هەروەها بۆی هەیە لە کاتی هێمنبوونەوەی شتەکاندا ناوچەکە جێ بهێڵین." ترەمپ گوتی کە پاراستنی کۆریای باشوور بە

ئەرک دەزانێـــت؛ ئـــێمە قازانجمـــان نەدەویســـت، تەنهـــا داوای قەرەبووکردنەوەمان لە وڵاتێکی دەوڵەمەند دەکرد لەپێناوی پاراستنیدا لە دراوسێیەکی باکووری.

ترەمــپ مانــدوو بووبــوو لە گــوێگرتن و دەســتی ڕادەوەشــاند و ئــاهی هەڵدەکێشا، ڕوون بوو دەیویست بابەتەکە جێ بهێڵێت، بەڵام مون وا نەبوو. مــون ئامــاژەی بەوە دا کۆریــای باشــوور ســەدا ٢،٤ی بــودجەی گشــتی خستووەتە خزمەتی بەرگــرییەوە، ئەوەش لەنــاو هاوپەیمانەکــانی ئەمریکــادا بەرزترین ڕێژە بوو. ترەمپ هاوڕایەتی خۆی دەربــڕی و گــوتی ژاپــۆن و ئەڵمانیشــان لە هەمــان بەلەمــدان و لە مەترســیدا نــین. ترەمــپ ٥ ملیــاری دەویست و بە منی گوت ڕێبەرایەتی دانوستانەکان بکەم. ســوپای ئەمریکــا بۆ ماوەی ٧٠ ساڵ لە کۆریــای باشــوور بووبــوو، ئێســتاش ئەو دەچــوو بــۆ بینینی کیم جۆنگ ئون تا ئێمە بتوانین باشوور بپارێزین. مــون بەرهەڵســتیی کــرد، لە کاتێکــدا ئامــاژەی بە هاوکــاریی زۆری ئەمریکــا دا، گــوتی ئەوە ڕاست نییە گوایە سیئۆل یارمەتیدەرێکی لاوەکی بــووە. بــۆ نمــوونە کــاتی خۆی کۆریای باشوور سوپای بۆ ئەفغانستان و ڤێتنام ڕەوانە کردبــوو. بەڵام گفتوگۆکە بۆ ترەمپ کۆتایی هاتبوو، بــۆیە داوای لە مــن کــرد کەســێک بانگ بکەم تا ڕێککەوتن دەست پێ بکات.

کاتی خــوانی نیــوەڕۆ پــاش ڕۆیشــتنی ڕاگەیانــدنەکان، ترەمــپ دووبــارەی کردەوە کیم شەیدای بینینــی ئەوە. ترەمــپ دیســانەوە پرســیاری لە شــاندی ئەمریکا کرد ڕێکخستنەکانی ئامادەبوونی مون بە چی گەیشتووە، هەروەها پرسی بۆچی کیم نایەوێت کۆریای باشوور ئامــادە بێــت، کە بە بۆچــوونی من ئەو پرسیارەی ڕووڕاستانە نەبوو. مون گــوتی قســەگەلی باشــیان لەگەڵ کۆریای باکووردا لەسەر توندبوونی کۆریای باکوور نەکــردووە، هەروەهــا بەوپێیەشی باشوور لای ئەمریکایە، پێگەی بــاکوور لە دیــدارەکەدا بڕێــک دادەبەزێــت. ترەمــپ گــوتی لە دیــدارە دووبەدووەکەیــدا جەخــت لەو

یارمەتییانە دەکاتەوە کە باشوور دابینی کردوون، هەروەها بە مونیشی گوت هەموو شتەکانی نێوان خۆی و کیمی بۆ دەگێڕێتەوە. ترەمپ خۆشحاڵ بوو بەوەی سەرنجی جیهان لەسەر دیدارەکەیە و شاد بوو بەوەی ئەو دیدارە G20ی داپۆشیوە (لە خەیاڵی خۆیدا). کیم قایل بووبوو بەوەی سنوور تێپەڕێنێت و پاشتر دانوستانی ئاستی کردارەکی بکات، بۆیە ترەمپ دەیویست زووتر خوانەکە جێ بهێڵێت. هەموو ئەوانە بێواتا بوون. ڕوون بوو کێ شەیدای دیدارە: ئەوەی کە قسەی دەکرد.

ترەمپ ئاماژەی کردەوە بەوەی گفتوگۆ لەسەر تێچووی بنکە سەربازییەکان زۆر گرنگە و ئەو ئەرکەی بە من سپارد و پێشنیاریشی کرد کەسێکی تریشم لەگەڵ بێت، ئەوەش چونکی زۆر خۆشحاڵ نەدەکرد. پاشان قسەی لەسەر زاڵبوونی دراوی چینی کرد. مون هەوڵی دا گفتوگۆکە بگەڕێنێتەوە سەر باسی ئەوەی کیم گەرەنتیی ئاسایشی بۆ ڕژێمەکەی دەوێت. ترەمپ هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی کیم تەنها بە گەرەنتیی ئەمریکا قایل دەبێت، نەک هی چین یاخود ڕووسیا. ترەمپ گوتی ئێمە گەرەنتیی سەلامەتیی کۆریای باشوورمان کردووە و هیچ سوودێکی تایبەتیشمان لێ وەرنەگرتووە. پێی وابوو دیدارەکەی لەگەڵ کیمدا کورت دەبێت بەڵام سەرکەوتوو دەبێت، ئەوەش زۆر بۆ مون باش دەبێت. مون گوتی خەڵکی کۆریا ڕێزی ترەمپ دەگرن و خۆشیان دەوێت، ئەویش گوتی پێی دەزانێت و ئاگاداری ناوبانگەکەیەتی لەوێ. ترەمپ باسی ئەوەی کرد کە چۆن کاتێ ژنانی کۆری لە یانەکانیدا هاتوون بۆ لای و باوەشیان پێدا کردووە، پاشان باسی ئەوەی کرد لەو کاتەوەی بووە بە سەرۆک شتەکان لە کۆریا زۆر گۆڕاون. ئەو پێی وابوو ئامادەیی کۆریای باکوور بۆ دیدار لەسەر بنەمای تویتێک ئاماژەیەکی گەورەیە. کەسی تر نەیدەزانی چۆن بەو بگات. مون دانی پێدا نا باشوور پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی ڕێک خستووە بۆ سەرۆک کیم، بەڵام

شوێنەکە پارتی کرێکارانی کۆریا بووە و کیم نەچووە. پەیوەندییەکانی کۆتایی هەفتەش سەریان نەگرتبوو.

هەرچەندە خوانی نیوەڕۆ پاش بیست خولەک لە کاتی خۆی دەستی پێ کردبوو، ترەمپ پێنج خولەک پێش تەواوبوونی کاتی خۆی کە دەیکردە ۱ی پاشنیوەڕۆ گوتی دەیەوێت بڕوات.

لەو ساتەدا ئیتر بڕیارم دابوو ڕاستەوخۆ بچم بۆ مۆنگۆلیا و نەچمە ناوچەی بێسوپا، هەرچەندە ئەوەم تەنها بە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش گوتبوو. لە نزیک ناوچەی بێست چاوەڕێم دەکرد تا ئەوە بە ترەمپ بڵێم. دەمزانی دەکرێت چ دەرئەنجامگەلێک لە ئامادەنەبوونم بخوێنرێتەوە، بەڵام لام گرنگ نەبوو.

لە نیوەڕۆیەکی زوودا کۆریای باشوورم جێ هێشت بۆ ئولان باتۆر، لە فڕۆکەکەشدا سەیری هەواڵەکانی ناوچەی بێسوپام دەکرد. ترەمپ لەگەڵ کوشنەر و ئیڤانکا چووە ناو کۆریای باکوورەوە. کیم لە وێنەکاندا دڵخۆش دیار بوو، هەر دەبوو واش بێت. ترەمپ بە هاتنی بۆ ناوچەی بێسوپا چی دیارییەکی پێی دابوو. دۆخەکە مەزاجی تێک دام. باشتریش نەبووم کاتێک ڕاگەیاندنەکان گوتیان ترەمپ کیمی بۆ کۆشکی سپی بانگێشت کردووە. دیدارەکەی ترەمپ و کیم پەنجا خولەکی پێچووبوو و هەردووکیشیان هاوڕا بووبوون لەسەر ئەوەی دەبێت گفتوگۆکان لە ئاستی باڵا بەردەوام بن. بێگومان کەسی هاوپیشەی بایگن لە کۆریای باکوور دیار نەبوو؛ هاوپیشە کۆنەکەی ئەو لە کۆریای باکوور لە گۆڕدا بوو، بەڵام گرنگ نییە.

پاش ڕۆژێکی پڕ لە دیدار لە ۱ی تەمموز لە ئولان باتۆر، بەرەو واشنتۆن کەوتمە ڕێ و چاوم بە هەواڵەکانی دیدارەکەی ناوچەی بێسوپادا دەخشاندەوە. بەشێکی زۆری هەر ئەوە بوو کە چاوەڕێم دەکرد، بەڵام هەواڵێکی نیویۆرک تایمز بە شێوەیەکی تایبەت خراپ بوو. سیاسەتی ئێمە

نەگۆڕابوو لە ناوچەی بێسوپا، بەڵام بەپێی هەواڵەکەی نیویۆرک تایمز لە چاوپێکەوتنەکەدا باس لە "هەڵپەساردنی ناوکی" کرابوو، ئەوەش ڕێك لەو ڕێگا پڕکێشەیە دەچوو کە بایگن پێش هانۆی لەسەری بوو. پێم وابوو لەگەڵ ڕێکنەکەوتنی ترەمپدا لە هانۆی ئیتر ئەو شێوازە مامەڵەیەمان لەناو بردووە، بەڵام دیتمان هەروەک پێشوو بوونی هەیە و خراپتریشە. لە هەندێک هەواڵی تردا هەستم دەکرد شوێنپەنجەی بایگن دەناسمەوە، بەڵام بە بۆچوونی من، ئەو دانەیەیان لە لایەنی ناوەڕۆک و پرۆسەوە لەڕادەبەدەر خراپ بوو. لە مات پوتینگەرم پرسی دەبێت بەهانەی ئەو هەواڵە توندە چی بێت، چونکە سەرەڕای ئەوەی ترەمپ تامەزرۆی دانوستانی تر بوو. بەڵام ڕێگەی بە "هەڵپەساردنی ناوکی" نەدابوو. ترەمپ نامەیەکی تری بۆ کیم نووسی، کە لە بنەڕەتدا نامەیەکی باش نەبوو، بەڵام هیچ کام لەو قسانەی پشتڕاست نەکردەوە کە پەیامنێرەکان گواستبویانەوە. بایگن شەیدابیەکەی ترەمپی کردبوو بە مۆڵەتێک بۆ بەڕێوەبردنی گفتوگۆکانی داهاتوو لەگەڵ کۆریای باکووردا بە شێوازێک کە بە درێژایی سی ساڵ شکستی هێنابوو.

بایگن لای هوکەر و پوتینگەر ڕەتی کردەوە ئەو سەرچاوەی بابەتەکەی نیویۆرک تایمز بێت، ڕەتکردنەوەکەی بەجوانی داڕێژرابوو، کاتێکیش لە ڕۆژنامەنووسێکەوە دەستنووسی چاوپێکەوتنەکەیمان پێگەیشت پووچەڵ بوویەوە. بایگن سنووری بەزاندبوو، جا بە مۆڵەتی پەمپەیۆ بووبێت یان بێ مۆڵەتی ئەو. پێم وابوو پێویست بوو پێش لەدەستدەرچوونی شتەکان ئەو بۆچوونە ڕاست بکەینەوە کە گوایا کەوتووینەتەوە سەر ڕێگا کۆنە خراپەکە. دەمزانی قسەکردن بۆ ڕای گشتی مەترسیدار بوو، بەڵام کاتی کردنی مەترسی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر پێویست بوایە دەست لەکار بکێشمەوە، دونیا کۆتایی نەدەهات. پاش ئامادەکردنێکی ورد و پێش جێهێشتنی تۆکیۆ ئەم تویتەم کرد:

ئەم هەواڵەی نیویۆرک تایمزم بە کونجکۆڵییەوە خوێندەوە. نە شاندی ئەنجوومەنی ئاسایش و نە منیش، نە قسەمان لەسەر بابەتی "هەڵپەساردنی ناوکی لە لایەن کۆریای باکوور"ەوە کردووە، نە کەسیشمان بیستوومانە. ئەوە هەوڵێکی بێزراو بوو بۆ گەمارۆدانی سەرۆک. دەبێت لێپێچینەوەی لە خاوەنی ئەو هەواڵە بکرێت.

هەرگیز دەربارەی ئەو تویتەم هیچم لە ترەمپ نەبیست. هەروەها خۆشحاڵیش بووم بەوەی لیندسی گراهام پاش کەمێک وەڵامی تویتەکەیت دامەوە:

خۆشحاڵم بەوەی جۆن بۆڵتن بە توندی ئەو هەواڵەی نیویۆرک تایمزی ڕەت کردووەتەوە کە گوایە ئەمریکا هەڵپەساردنێکی ناوکی لە کۆریای باکوور قبووڵ دەکات.

لە ٣ی تەممووزدا لەسەر کۆمەڵێک بابەت قسەم لەگەڵ پەمپەیۆدا کرد و باسی بابەتەکەی نیویۆرک تایمزی کرد. ئەو بە تاڵییەکەوە گلەیی کرد، "بۆچی پەیوەندیت بە منەوە نەکرد؟" لە وەڵامدا گوتم منیش دەمتوانی هەمان پرسیار لەو و بایگن بکەم: بۆچی پەیوەندییان بە منەوە نەکردووە؟ ئەو گوتی، "قسەکەی بایگن زیاتر لە سەرۆکەوە نزیکە تا ئەوەی تۆ." ئەوەش ئەگەر ڕاست بوایە شتێکی ترسناک دەبوو. تویتەکەی من هێشتا نمایشکەری سیاسەتیی فەرمی حکوومەت بوو، لەکاتێکدا چاوپێکەوتنەکانی بایگن بەوجۆرە نەبوون، پەمپەیۆش دژەڕا نەبوو. من گوتم ئامانجی من ئەو نییە و هەردووکیشمان کاریگەرتر دەبین ئەگەر پێکەوە کار لەسەر ناوەڕۆک بکەین، هاوڕایی خۆی دەربڕی. ئەو بە پێکەنینەوە گوتی: "تیمەکانمان ئەمەیان پێ خۆشە، بەڵام پێویستە ئێمە گەورە بین، منیش لەوەدا زۆر باش نیم."

پەیوەندیی نێوانمان پاک بوویەوە، بەڵام پێم وابوو پەمپەیۆ زیاتر نیگەرانی

ئەوە بوو من بە ئاشکرا ڕەخنەم لـێ گرتبێـت، کە تـویتەکەی گراهـامیش ئەوەی پشتڕاست دەکردەوە. لە هەمووی گرنگتر، پەمپەیـۆ گـوتی ترسـاوە لەوەی ترەمپ گەڕابێتەوە سەر جێهێشتنی پێنینسولا، ئەوەش ڕێک ئەوە بوو کە منـی دەربـارەی تێچـووی بنکەکـان نـیگەران کردبـوو، هەروەهـا دەنگدانەوەی ئەوەش بوو کە ترەمپ هەڕەمەکییانە دەربارەی ئەفغانسـتان و سوریا و ئەفریقا و کۆمەڵێک وڵاتی تر گوتبووی. لەگەڵ ئەوەشدا پەمپەیۆ باوەڕی وابـوو نەمانهێشـتووە هـیچ شـتێکمان لەگەڵ کیمـدا ئاشـکرا ببێـت، ئەوەش واتای ئەوە بوو هیچ هەواڵێکی ئاشکرا نابێت لەسەر پێگەی ئێمە. لەلایەکی تریشەوە، پەمپەیـۆ گـوتی پـاش دیـدارەکە هەوڵـی داوە ترەمـپ بگەڕێنێتەوە و پێی گوتووە، "نامانەوێت ئەو کارە بکەیـن کە ئەگەر جـۆن کێری بوایە دەیکـرد." لە وەڵامـدا ترەمـپ گوتـوویەتی، "بەلامەوە گرنـگ نیـیە، لەمەدا پێویسـتمان بە سـەرکەوتنێکە،" بەڵام گوتبووشـی پەلەی ئەو سەرکەوتنەی نییە. سەرەڕای گفتوگۆکەشمان، پاش چەند ڕۆژێک پەمپەیۆ بە بایگنی گوتبـوو بەشـداریی دیـدارەکانی ئەنجـوومەنی ئاسـایش نەکـات لەسـەر کۆریـای بـاکوور، ئەویـش هەمـان ڕەفتـاری سـامانداراانەی لەسـەر کۆریای باکوور دەکرد کە پێشـتر لەسـەر ئەفغانسـتان کردبـووی. لە کـارە لەپێشینەکانی کاروباری دەوڵەتی تێگەیشتبووم، بەڵام هەرگیـز تێنەگەیشتم بـۆچی پەمپەیـۆ لەو بابەتـانەدا بەدوای هاوپەیمانـدا ناگەڕێـت. ئەگەر سیاسـەتەکانی بە هەڵەدا بڕۆیشـتنایە، نەک هەر زیانیـان بـۆ وڵات دەبـوو، بەڵکو تەنها ئەو و ترەمپ بەرپرسیار دەبوون. بەڵام مـن تێگەیشـتم لەوەی ئەوە کێشەی پەمپەیۆ بوو.

لە ڕوانگەی ترەمپەوە دیدارەکەی نـاوچەی بێسـوپا چـۆن بـوو؟ ئەو ڕۆژی دواتر گوتی: "کەس نەیدەتوانی ئەوە بکـات کە مـن کـردم، ئۆبامـا یـازدە جار پەیوەندیی کرد و وەڵامیان نەدایەوە."

***

لەو ڕۆژانەی لە کۆشکی سپی مابوومن، نیگەرانی پاشەکشە زۆرلێنەکراوەکانم دەکرد بەرامبەر بە کۆریای باکوور. هەرچۆنێک بێت شایەنی پێکەنینە، کۆریای باکوور بەگشتی لە دەرەوەی بازنەی گفتوگۆ و پەیوەندی بوو، بێجگە لەو کاتانەی مووشەکی بالیستیکی هەڵدەدا یاخود هێرشی دەکردە سەر بەرپرسەکانی حکوومەت (ترەمپی لێ دەربچێت). نیگەرانی ئەگەرە زیانبەخشەکانی کێشەی تێچووی بنکەکانیش بووم لە کۆریای باشوور و ژاپۆن، هەروەها ئەو درزەش کە کەوتبوویە نێوان دوو وڵاتەکەوە و گەورەش دەبوو و هەڕەشەی لە پێگەی ستراتیژیی ئەمریکا دەکرد لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

لە واشنتۆن لە ١٦ تەمموزدا من و پەمپەیۆ باسی داواکارییەکی تری ترەمپمان کرد بۆ چالاکییەکی هاوبەشی ئەمریکا و کۆریای باشوور کرد کە کیم جۆنگ ئونی بێتاقەت دەکرد. ئەو چالاکییە بەگشتی چالاکییەکی "سەرمێزی"ی بوو، کە پێشتر لە سندوقی لمیندا جێبەجێ دەکرا و پەڕە و نیشانە سەربازییەکانی تێدا دەجووڵێندران. بەڵام ئێستا کۆمپیوتەر زۆربەی کارەکانی دەکرد. سەرەڕای ئەوەی گەرەنتی هەبوو هیچ B52یەک بەر کەنار دەریاکان ناکەوێت، ترەمپ ویستی هەڵی بوەشێنێتەوە. بە ترەمپم گوت پێش ئەوەی بڕیار بدات ڕێگام بدات بچم بۆ ژاپۆن و کۆریای باشوور بۆ ئەوەی لەسەر تێچووی بنکە سەربازییەکان قسەیان لەگەڵدا بکەم، ئەویش ڕازی بوو. بەڵگەهێنانەوە لۆژیکیترەکانی وەک ئەوەی چالاکیی لەم جۆرانە پێویستە بۆ ئەوەی دڵنیا بین هێزەکانمان لە ئامادەباشیدان، لەمێژەوە لای ترەمپ نرخیان نەمابوو. پەمپەیۆ پێی گوتم کۆریای باکوور هیچ گفتوگۆیەکی ئاستی باڵا ناکات تا ناوەڕاستەکان و کۆتایی ئاب، ئەوەش زۆر دووتر بوو لە پێشبینییەکانی بایگن و ئەوانی تر پاش دیداری ناوچەی بێسوپا، کە دەیانگوت لە ناوەڕاستی تەمموزدا دیدار دەبێت.

پاش چەند ڕۆژێک، بەرێ کەوتم بۆ ژاپۆن و کۆریای باشوور بۆ ئەوەی کار لەسەر بابەتی تێچووی بنکەکان بکەم. سەرەتا لە تۆکیۆ دابەزیم، هەرچەندە ڕێککەوتنەکەی ئەوان پاش هی کۆریای باشوور بەسەر دەچوو. وەزارەتی بەرگری هەر وەک وەزارەتی دەرەوە وابوو و نەیدەتوانی داوای پارەی زیاتر لە وڵاتی خانەخوێ بکات، هەروەها کەسێکیش کە پلەکەی بەرز نەبوو لە بەشی مەدەنیی پنتاگۆن بە ژەنەڕاڵ کیڤن شنایدەری سەرۆکی هێزەکانی ئەمریکای گوتبوو ناتوانێت بەشداریی دیدارەکانی من بکات، ئەوەش بۆ ئەوە بوو ژێر نینۆکەکانی وەزارەتی بەرگری بە پاکی بمێننەوە. من دەمویست نوێنەری وەزارەتی بەرگری و دەرەوە ئامادە بن تا پیشانی بدەم بڕیاری حکوومەتی ئەمریکا یەک بڕیارە. هەر کە بۆم دەرکەوت چ پلەنزمێکی مەدەنی بووەتە هۆی کێشەکە، پەیوەندیم بە دەنفۆردەوە کرد و هەواڵەکەم پێی گوت. دەنفۆردی ئۆفیسەری باڵای وڵات هەر ئاگاداری ئەوەش نەبوو کە مەدەنییەکان بە ژەنەڕاڵەکانی ئەو دەڵێن لە چ دیدارێکدا بەشدار بن و لە چیدا بەشدار نەبن. دەنفۆرد پێویستی بە قایلبوون نەبوو و گوتی ئەو بەشداری دیداری لەو جۆرەی کردووە کاتێک لە ئەفغانستان فەرمانداری ئەمریکا بووە. ئەو بابەتە وزەیەک و کاتێکی زۆری بەفیڕۆ دا. ئەمە حکوومەتەکەتانە لە کاتی کاردا.

سەرەتا یاچیم بینی و بۆم ڕوون کردەوە بۆچی ترەمپ داوای ٨ ملیاری ساڵانە دەکات و دەیەوێت لە ساڵی داهاتووەوە دەست پێ بکات، لە کاتێکدا ئەوکات ژاپۆن ٢،٥ ملیاری دەدا. چاوەڕێم نەدەکرد دڵخۆش بێت، دڵخۆشیش نەبوو، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دانوستانێکدا بووین؛ دەیانتوانی خۆیان ئامادە بکەن و ئەوەش ئاماژەیەکی پێشکەوتووتر بوو لەوەی کۆریای باشوور پێی گەیشتبوو. خۆی تەنها ترەمپ دەیزانی چ بڕێک قایلی دەکات، بۆیە هەوڵدان بۆ هەڵهێنانی ژمارە ڕاستییەکە بێهودە

بــوو. خــودی تــرەمپیش هێشــتا نەیــدەزانی. بەڵام هــیچ نەبێــت بە ئاگادارکردنەوەی ژاپۆن و کۆریای باشوور لەوەی کێشەیەکی ڕاستەقینەیان هەیە، هەڵێکم پێ بەخشین تا وەڵامێک بدۆزنەوە.

بەشی زۆرینەی دیدارەکەم لەگەڵ یاچیدا ڕوونکردنەوەی ژاپۆنییەکان بـوو لەسەر ئەوەی گەورەبوونی ناکۆکییەکانی نێوان ئەوان و کۆریای باشوور تا چ ڕادەیەک خەتــای ئەمــانە. ئەوان باوەڕیــان وابــوو مــون لە گرنگــی ڕێککەوتنێکی چارەنووسازی (١٩٦٥) نێـوان دوو وڵاتەکە کەم دەکـاتەوە، کە لە ڕوانـگەی ژاپـۆنەوە دوو ئامـانجی هەبـوو. یەکەمیـان بریتـی بـوو لە ئاسـاییکردنەوەی پەیوەنـدییە دوولایەنەکـان لە مـاوەی جەنگـی سـارددا. دووەمیـان بـۆ دابینکردنـی قەرەبـوویەکی کۆتـایی بـوو بـۆ گوفتارەکـانی کۆریای باشوور لەسەر کارکردنی بەزۆر و ژنانی چێژ لە ماوەی حـوکمی داگیرکاریی ژاپۆندا. ئەو ڕێککەوتنە کە چوارده سـاڵی پێچووبـوو، بە لای ژاپـۆنەوە قوفڵێـدانی کۆتـایی بـوو لە تۆمـاری ڕابـردوو. لە ڕوانــگەی ئەمریکــاوە ئاســاییکردنەوەی پەیوەنــدییەکانی نێــوان تۆکیــۆ و ســیئۆل چارەنووساز بوو بۆ بەفیڕۆنەچوونی هەوڵەکانی ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ دانانی سنوورێک بۆ دەستدرێژییەکانی ڕووسیا و کۆریای باکوور و چـین. لە ناوچەی ئاسیا-زەریای ئارام هاوشانی ناتۆییمـان نەبـوو، تەنهـا هەنـدێک هاوپەیمـانی دوولایەنەمـان هەبـوو، بـۆیە هەمیشـە کارمـان بـۆ هاوکـاریی کۆریای باشوور و ژاپۆن دەکرد، هەروەها دەشمانویست پەرە بە هاوکاریی هاوشێوەش لەگەڵ سەنگافورە و ئوستراڵیا و نیوزیلاندیشدا بدەین. تەنـانەت لە بەڕێوبەرایەتی ئێمەشدا چەمکی "هندۆ-ئارامی ئازاد و کراوە" ڕێگایەک بوو بـۆ باشـکردنی پەیوەنـدیی نێـوان وڵاتە هاوبیرەکـان. لەوەش زیـاتر، لە لیستی کارە لەپێشینەکانی ترەمپدا یەکێـک لە گرنگترینەکـان ئەوە بـوو بـۆ سەرکەوتنی ڕێککەوتنی ناوکی لەگەڵ کۆریای باکووردا، دەبێت ژاپۆن و کۆریای باشوور بڕێکی گەورەی تێچووە ئابوورییەکان بدەن؛ ترەمپ هـیچ

یارمەتییەکی بێگانەی بە باکوور نەدەدا، تەنها دەرفەتی وەبەرهێنانی گەورە و سوودبەخشی دەدایە. لەو حاڵەدا، ژاپۆن ئامادە بوو چەکێکی گەورە بنووسێت، بەڵام بەو مەرجەی کۆریای باکوور واژوو لەسەر ڕێککەوتنێکی هاوشێوەی ئەوەی ژاپۆن و کۆریای باشوور (١٩٦٥) بکات و هەموو گوفتارە ڕێتێچووەکان چارە بکات. ئەگەر ڕێککەوتنەکەی ١٩٦٥ سەرەتایەکی نوێی نەخستبایەتە بەردەستی سیئۆڵەوە، چۆن تۆکیۆ چاوەڕێی ڕێککەوتنێکی هاوشێوەی لە پیۆنگ یانگ دەکرد؟

ژاپۆن پێشنیاری بەکارهێنانی مەرجی داوەریی ڕێککەوتنەکەی دەکرد، کۆریای باشووریش ڕەتی دەکردەوە. لایەنەکان گیریان خواردبوو، بەڵام ئابێ هەروا دانەدەنیشت. پێگە توند و ڕەقەکەی کۆریای باشوور بووبوو بەهۆی وروژاندنی ڕای گشتیی ژاپۆن، بۆیە ئابێ پەنای دەبردە بەر یاساکانی جڵەوکردنی هەناردەکردن، کە لەسەر بنەمای چوار ڕێککەوتنی نێودەوڵەتی کاریان دەکرد و بۆ ڕێگریکردن بوون لە پەرەپێدانی چەک و کەرەستەی ناوکی و کیمیایی و زیندەیی، هەروەها هەندێک چەکی باوی تریش. سیئۆڵ لە لیستی سپیی تۆکیۆدا بوو بۆ ئەم مەبەستانە، ئەوەش ڕەوایی بە مامەڵەکردنی کاڵاگەلێک دەدا کە بەبێ ئەوە ئەو ڕەوایەتییە چوار ڕێکخستنەکە ڕێگری دەکرد؛ هەرچۆنێک بێت ئەو دوو لایەنە لایەنی بەرامبەریان بە پەرەپێدەرێکی مەترسیدار نەدەزانی. ئەمریکا بەشێوەیەکی چالاکانە بەشداریی لەو ڕێکخستنانەدا دەکرد و شوێنپەنجەی هەبوو لە پەیوەندییە بازرگانییەکانی هاوشێوەی ئەوەی کۆریای باشوور و ژاپۆن. هەرچۆنێک بێت، لەبەرئەوەی سیئۆڵ و کۆریای باشوور پەیوەندییە دوولایەنەکانیان نەخستبووە ژێر ڕێککەوتنی واسێنارەوە و بەڵام لەبەرئەوەی گواستنەوەی نایاسایی ڕووی دەدا و بۆشیی هەبوو هەندێک لە گواستنەوەکان بەرەو کۆریای باکوور بووبێت، ژاپۆن هەڕەشەی سڕینەوەی کۆریای باشووری لە لیستی سپی دەکرد.

وەک ئەوەی ئەمانە بەشی پێویست خراپ نەبووبن، لە وەڵامدا کۆریای باشوور هەڕەشەیەی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنی ژاپۆنی دەکرد بە ناوی "ڕێککەوتنی ئاسایشی گشتیی زانیاریی سوپا". لەژێر سایەی ئەو ڕێککەوتنەدا، دوو وڵاتەکە هەواڵگرییەکی هاوبەشیان هەبوو و زانیاریی هەستیاریان پێکەوە بەش دەکرد، لەو ڕێگایەشەوە ڕێگایان بۆ هاوکارییەکی سوپا بۆ سوپا خۆش دەکرد. وەک چۆن دواتر مارك ئێسپەری سکرتێری وەزارەتی بەرگری گوتی، "ئەو ڕێککەوتنە زۆر گرنگ بوو بۆ هاوبەشیکردنی زانیاری لەسەر کردارەکانی کۆریای باکوور. ئەگەر سیئۆڵ وازی لە ڕێککەوتنەکە بهێنایە و ڕێککەوتنەکە هەڵبوەشایەتەوە، زیانێکی گەورەی ماددی بەر بەرگریی سیانیی ناوچەکە دەکەوت و کاتەکەشی هیچ باش نەبوو. کاتگیرییەکە چارەنووساز بوو. ڕێککەوتنەکە بە شێوەیەکی خۆکارانە هەموو ساڵێک نوێ دەبووەوە، مەگەر ئەوەی یەکێک لە لایەنەکان پێش ٩٠ ڕۆژ داوای هەڵوەشاندنەوەی بکردایە.

ترەمپ بە مونی گوتبوو نایەوێت تێکەڵی ناکۆکییەکە ببێت، منیش پێم وانەبوو شتێکی وامان پێ بکرێت. بەڵام ئەو کێشە بێگرە دوکەڵدارە کە لە گەورەبووندا بوو، هەواڵێکی باش نەبوو. ڕۆژی داهاتوو ٢٤ی تەمموز لە کۆریای باشوور، هاریسی باڵوێز لە بارەگاکەی خۆی خوانێکی بەیانی ڕێک خست کە من و ڕۆبەرت ئەبرامس (فەرماندەی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆریا) تیایدا بەشدار بووین و باسی تێچووی بنکەکانمان کرد. هاریس، فەرماندەی پێشووی ئەمریکا لە ناوچەی ئارام پێش خانەنشینبوونی، دەیزانی کێشەکە چەندێک بۆ ترەمپ هەستیارە، چونکە لە دانیشتنەکانی ٣٠ی حوزەیراندا ئامادەیی هەبووبوو دیتبووی ترەمپ چۆن لەسەر ئەو بابەتە هێرشی کردبوویە سەر مون. ویستم خوانەکە جێ نەهێڵم هەتا دڵنیا نەبم لەوەی هەردووکیان تێگەیشتوون لەوەی داڵقوتکردنی کێشەکە و لەبەرچاونەگرتنی هەڵەیە، بە تایبەتیش لەکاتێکدا کە کۆتایی ساڵ نزیک

بوو. دەشمویست نیگەرانیی ترەمپ لە هەمبەر تاقیکردنەوە سەرمێزییەکەی داهاتوو بخەمە ڕوو، بۆ ئەوەی ئەوان پەیوەندیی بە واشنتۆنەوە بکەن و لەجیاتی شەڕکردن لەگەڵ کێشەکەدا چارەسەری بکەن. ئەبرامس و هاریس باوەڕیان بەوە نەدەکرد کە دەیانبیست، ئەوەش دەری دەخست قسەکردن بوو لەگەڵ ترەمپ لە نووسینگەی هێلکەیی، کە زۆر دوور بوو لەو جیهانە ڕاستی و ترسناکەی ئەم پیاوانە تیایدا دەژیان.

پاشان بەڕێ کەوتین بۆ کۆشکی شین بۆ دیتنی چونگ و تیمێکی نێودەزگایی بۆ ئەوەی باسی کێشەی بنکەکان بکەین. هەر بە ئەندازەی دیدارەکەی ژاپۆن خۆش بوو، لەوانەیە کەمێک زیاتریش، چونکە یەکی کانوونی یەکەم کە دوابەروار بوو بۆ نوێکردنەوەی گرێبەستەکەی کۆریای باشوور و ئەمریکا فشاری خستبووە سەر هەمووومان. پاش گفتوگۆی درێژخایەن لەسەر تێچووی بنکەکان، دەستمان کرد بە باسکردنی ناکۆکییە دەرکەوتووەکەی نێوان کۆریا و ژاپۆن. پێویست بە گوتن ناکات کە کۆرییەکان پێیان وا نەبوو پەیمانەکەی ١٩٦٥ پێشێل بکەن و گوتیان هۆی ڕەفتارەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارەکانی دادگای باڵای کۆریای باشوور. کۆریای باشوور پێی وابوو هەڕەشەکەی ژاپۆن بۆ سڕینەوەی باشوور لە لیستی سپی بریتی بوو لە "شکاندنی پەیوەندیی متمانەی" نێوان دوو وڵاتەکە. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ژاپۆن لە ماڵپەڕی فەرمیی وەزارەتدا کۆریای باشووری لە لیستی "هاوپەیمانی ستراتیژی" سڕیبوویەوە. ئەوەش قایلبوونی زۆری بەدوای خۆیدا نەهێنابوو. لەبەر ئەوە بوو هاوبەشیکردنی زانیاری لە مەترسیدا بوو. چونگ گوتیشی دەبێت ژاپۆن باش بزانێت بەبێ هاوکاریی کۆریای باشوور، ژاپۆن ناتوانێت ئامانجە دیپلۆماتییەکانی بەدەست بهێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا کۆریای باشوور خەریک بوو بە ژاپۆندا دەگەیشتەوە؛ لەکاتێکدا تەنها چەند ساڵێک لەوەوبەر، ئابووریی ژاپۆن پێنج هێندەی هی ژاپۆن بوو، کەچی ئێستا تەنها ٢.٧

ئەوەندە گەورەتر بوو، هەروەها ئابووریشیان بەپێی دانیشتوان بەنزیکەیی یەکسان بوو.

کاتێک گەڕامەوە بۆ واشنتۆن، باسی ئەو چاوپێکەوتنانەم بۆ ترەمپ کرد (پەمپەیۆ و منوشن لەگەڵمدا بوون کاتێک لە نووسینگەی هێلکەیی قسەمان لەسەر بابەتەکانی تر دەکرد)، ئەویش لە وەڵامدا گوتی هەرچەندێک بیری لێ کردووەتەوە بڕی ٨ ملیار و ١٠ ملیاری ساڵانە هەڕەشە بوون بۆ سەر کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا. ترەمپ گوتی، "ئەوە تۆ دەخاتە پێگەیەکی قورسی مامەڵەکردنەوە." خۆشحاڵانە ئەوەندە قایل بوو بە هەواڵەکانی من کە ڕێگای دا چالاکییە سەرمێزییە هاوبەشەکان لەگەڵ کۆریای باشووردا بەردەوام بێت، هەرچەندە هێشتاش هەر دڵی بەوە خۆش نەبوو. ڕۆژی دواتر پاش بیستنی ئەوەی کۆریای باکوور مووشەکی هەڵداوە، بۆچوونەکانی پێشتری دووبارە کردەوە و گوتی: "ئێستا کاتێکی باشە بۆ داواکردنی پارەی زیاتر،" مەبەستی لە پارەی بنکەکان بوو. ترەمپ بەوانی تری ناو نووسینگەی هێلکەییشی گوت: "جۆن ئەمساڵ گەیاندییە یەک ملیۆن دۆلار. ئێوە بەهۆی مووشەکەکانەوە دەیگەیەنن بە پێنج ملیۆن دۆلار." چەندێک هاندەرانە بوو ئەو قسەیە!

هەر شتێک ئاماژەی بۆ ناکۆکییەکەی ژاپۆن و کۆریای باشوور دەکرد، لایەنی بەرامبەر بێ بیرکردنەوە گەورەتری دەکرد. سەرەڕای بێمەیلیی ترەمپ بۆ بابەتەکە، پێشنیارم بۆ چونگ کرد بۆ یەک مانگ "ڕێککەوتنێکی وەستێنەر" بکەن و لەو ماوەدا هیچ کام لە وڵاتەکان هەنگاو بەرەو خراپترکردنی شتەکان نەنێت. ئەوە هیچی نەکردایە دەیتوانی کاتێک بۆ بیرکردنەوەی داهێنەرانە تەرخان بکات و ئەو بازنەیە بشکێنێت کە دوو وڵاتەکەی تێدا بوو. چونگ پێشنیارەکەی بەدڵ بوو، منیش گوتم بۆ ژاپۆنییەکانیشی پێشنیار دەکەم. ژاپۆنییەکان ڕەشبین بوون، بەڵام ئامادە بوون هەر شتێک تاقی بکەنەوە بۆی هەبێت لەو چاڵە دەریانبهێنێت کە خۆیان و

کۆریای باشوور سەرقاڵی هەڵکەندنی بوون. پاش چەند ڕۆژێک لە هاتن و چوونی زۆر، نزیک بوونەوە لە ڕێککەوتنێکی وەستێنەر. لە هەمان کاتدا کۆریای باکوور بەردەوام بوو لە هەڵدانی مووشەکی کورتمەودا و ڕۆژی ۳۰ی تەمموز دوو مووشەکی بالیستیکیی هەڵدایە دەریای ژاپۆنەوە. هێشتا وەڵاممان نەبوو. قسەم لەگەڵ ترەمپ کرد، بەڵام ئەو گوتی: "پێش هەموو شتێک، ئێمە چی دەکەین لەوێ؟" چاوەڕێی یارمەتیی زۆر لەوە نەدەکرا ئەگەر مون یان ئابێ بڕیاری بدایە پەیوەندیی بە ترەمپەوە بکاتەوە. ژاپۆن و کۆریای باشوور هیچ بەرەوپێشچوونێکیان نەبوو، هەروەها کابینەکەی ژاپۆنیش بە فەرمی بڕیاری دەرهێنانی کۆریای باشووری دابوو لە لیستی سپی. لە وەڵامدا، کۆریای باشوور ئاماژەی بەوە دا ئەو کارەی ژاپۆن هاوبەشیکردنی زانیاریی سەربازی دەوەستێنێت و پاشانیش ژاپۆنی لە لیستی سپیی خۆی دەرکرد. لەو خاڵەدا کە مووشەکەکانی کۆریای باکوور بەر ڕووی زەریا کەوتن، کێشەکەی ژاپۆن و کۆریای باشوور دامرکایەوە.

لە ماوەی هەموو ئەمانەدا، ترەمپ دیدارێکی زۆر باشی لەگەڵ کالتاماگین بوتولگای سەرۆکی مۆنگۆلیادا هەبوو، کە سەردانی واشنتۆنی دەکرد. کوڕەکەی بوتولگا شانبەشانی هێزەکانی ئەمریکا لە ئەفغانستان دەجەنگا و ترەمپیش واژووی لەسەر وێنەیەکی ئەو کوڕە لاوە کرد کە بوتولگای باوکی هێنابووی. کاتێک ترەمپ دەربارەی خواستەکانی کیم جۆنگ ئون پرسیاری کرد، بوتولگا دەستی نەپاراست. بوتولگا گوتی: "زیاد لە هەموو شتێك کیم لە یاخیبوون دەترسێت، چونکە ڕژێمەکەی دیکتاتۆرە و ژیانی خەڵکەکەشی زۆر خراپە، بە تایبەتیش پاش سزاکان."

تەنانەت پاش ئەوەی کۆریای باکوور دیسانەوە مووشەکی هەڵدا و لە لایەکی تریشەوە ناکۆکیی گەورە لە نێوان دوو هاوپەیمانە سەرەکییەکەماندا هەبوو لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، سەرنجی ترەمپ هەر لەسەر کیم جۆنگ ئون مایەوە. لە ١ی ئابدا ئەم سێ تویتەی کرد:

🐦 کیم جۆنگ ئون لە چەند ڕۆژی ڕابردوودا سێ مووشەکی کورتمەودای تاقی کردووەتەوە. ئەو تاقیکردنەوانە ڕێککەوتنەکەی سەنگافورە پێشێل ناکەن و ئەو کاتەی ڕێک کەوتین باسی مووشەکی کورتمەودامان نەکرد. لەوانەیە پێشێلکردنی یوئێن هەبێت، بەڵام...

🐦 سەرۆک کیم نایەوێت بەهۆی خراپبەکارهێنانی متمانەوە من نائومێد بکات. کۆریای باکوور دەتوانێت قازانجی زۆر بکات، هەروەها لەژێر سەرۆکایەتیی سەرۆک کیمیشدا توانای کۆریای باکوور بێسنوورە. هەروەها، زۆریش هەیە بۆ لەدەستدان، بەڵام من باوەڕم هەیە بەوەی...

... سەرۆک کیم داهاتوویەکی مەزن و جوان بۆ وڵاتەکەی دەبینێت، هەروەها تەنها ئەمریکاش بە سەرۆکایەتیی من دەتوانێت ئەو داهاتووە بکات بە ڕاستی. سەرۆک کیم شتە ڕاستەکە دەکات چونکە زۆر زیرەکترە لەوەی وا نەکات، هەروەها ناشیەوێت سەرۆک ترەمپی هاوڕێی نائومێد بکات.

ئەوە سیاسەتی ئێمە بوو بەرامبەر بە کۆریای باکوور.

❊❊❊

بێگومان لە ماوەی کەمپینەکەی ٢٠٢٠دا کۆریای باکوور وەک سەرنجێکی سەرەکیی کۆشکی سپی دەمێنێتەوە. ئەوەی پێشبینی ناکرێت ئەوەیە ئایا کیم جۆنگ ئون چۆن پێگەی خۆی دیاری دەکات؟! ئایا کەڵکی لە سیاسەتی ساڵی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا وەردەگرت و هەروەک سەرۆکەکانی پێشوو ترەمپی ناچار بە هەڵەی گەورە دەکرد؟ یان پێی وا دەبوو ڕێککەوتنی لەگەڵ ترەمپ پێ ناکرێت و باشتر دەبێت چاوەڕێی بەسەرۆکبوونی دیموکراتە نەرمونیانترەکان بکات کە ئەزموونی سیاسەتی دەرەوەیان لە هی ترەمپیش کەمترە؟! وەڵامەکە هەر کامێکیان بوایە، کۆریای باکوور بەردەوام دەبوو لە هەنگاونان بەرەو بوون بە وڵاتێکی

تەواو ناوکی. هەروەها بۆ چوارەمین حکوومەتی یەک لەدوای یەک بۆ ماوەی سێ دەیە، ئەمریکا شکستی هێنابوو لە وەستاندنی مەترسیداترین پەرەپێدەری چەکی ناوکی.

ئەوە واتای ئەوەیە دەبێت هەندێک لە حکوومەتەکانی داهاتوو ڕووبەڕووی ڕژێمێک ببنەوە لە پیۆنگ یانگ کە توانای زیانگەیاندنی دەبێت بە وڵاتەکەمان. ئەگەر زووتر خۆمان بۆ نواندنی هەڵوێست ئامادە بکردایە، دەمانتوانی خۆمان لەو مەترسییانە لابدەین. بۆ ماوەی سێ ساڵ، کۆریای باکوور زیاتر لە چەکی ناوکی نزیک بووەتەوە و ئەوەش هەڕەشەکەی زیاتر کردووە. تەنها دەتوانین ئومێدوار بین بەوەی پێش گەیشتنی مەترسییەکە دەرفەتێکی ترمان هەبێت بۆ وەستاندنی.

## بەشی دوازدە

## ترەمپ، ڕێگاکەی ون دەکات و دواتریش کۆنترۆڵی لەدەست دەدات

هەرکاتێک سەرنجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر ئێران پەرتەوازە دەبوو، بەتایبەتی سەبارەت بە ترەمپ، دەمزانی تاران یارمەتیمان دەدات بۆ گێڕانەوەی خودی خۆی بۆ لووتکەی خشتەی ئەجێنداکانی. لەبەرئەمە بابەتێکی وا بچووك نەبوو کاتێک ڕابەری باڵای ئێران ئایەتوڵڵا خامنەیی ڕوونکردنەوەی پێویستی سەبارەت بە هوتافە هەرە گرنگەکانی خۆپیشاندەرە ڕێکخراوە ئێرانییەکان: "مردن بۆ ئەمریکا" و "مردن بۆ ئیسرائیل"ی خستەڕوو. خامنەیی گوتی: "مردن بۆ ئەمریکا"، واتە مردن بۆ ترەمپ و جۆن بۆڵتن و پۆمپەیۆ"[1]. تەقینەوەی ئەم جۆرە ڕاستییە نەخوازراوانەی وەکو کامە سەرکردەی ئێران کراوەتە ئامانجی مردن، ئەوەی بەبیر دەهێنایەنەوە کەوا پێویستە لە خستنەسەری زۆرترین فشار بۆ سەر ئێران بەردەوام بین. ئەمەش تەنها لەبەر چەکی ئەتۆمیی ئێران و بەرنامەی مووشەکە بالیستییەکانی[2] نەبوو، بەڵکو لەبەر ڕۆڵی بەردەوامی

[1] مایک پۆمپەیۆ: سەرمایەدار و سیاسی ئەمەریکی و وەزیری دەرەوەی ئێستای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

[2] مووشەکی بالیستی: یان مووشەکی کەوانەیی، جۆرە مووشەکێکە ڕێڕەوێکی ←

وەکو بانکی ناوەندیی بەرهەمهێنانی تیرۆر و هەژموونە دوژمنکارانە سەربازییەکەی لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو.

یەکێک لە بابەتە هەرە ناکۆکی لەسەرەکان بریتی بوو لە دیاریکردنی فەیلەقی گاردی شۆڕش (حرس ثوری) وەکو ڕێکخراوێکی بێگانەی تیرۆریستی، زاراوەکە لە ڕووی یاساییەوە دەرەنجامی دیاریکراو بۆ ڕێکخراوێکی لەم شێوەیە لەخۆ دەگرێت. ترەمپ ئەم دەستنیشانکردنەی دەویست، هەروەکو من و پۆمپەیۆش کردمان، چونکە هەڵسوکەوتمان لەگەڵ گرووپێک دەکرد کە لە لیستەکە ئاماژەی پێ کرابوو و ئەندامەکانی بە چەندین تاوان تۆمەتبار کرابوون. منوشن[1] دوودڵ بوو لەوەی کە دەستبەسەرداگرتنی باڵی لێهاتووی سوپای ئێرانی و هەتا سوپای قودسیش بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری ئێستای وەکو عێراق و سووریا و لوبنان و یەمەن، لێکەوتە و دەرەنجامی خراپ و بەرفراوانی لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش سەرچاوەی دڵەڕاوکێیەک بوو کە من تێی نەگەیشتم. پێم وایە ئامانجی سەرەکی گەیاندنی زۆرترین ئێش و ئازارە بەو تیرۆرستانە. ئاژانسەکانی تر بیروڕای جیاوازیان هەبوو، بەڵام ئاراستەی گشتی پێی وابوو، ئایا دەتوانین بێ ئەوەی هەوڵی زیاتر بۆ خۆمان بدەین، بە تەنیا ڕێك بکەین؟

ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە لەلایەن بیرۆکراسییە[2] هەمیشەییەکانی

کەوانەیی دەگرێتەبەر، کە ڕێڕەوەکەش بە هێزی کێشکردنی زەوی و لێکخشانی هەوایی کاریگەر دەبێت.

[1] ستیڤن منوشن: ژمێریار و سیاسی ئەمەریکی و وەزیری ئێستای گەنجینەی ئەمەریکا، هاوبەشی پێشووتری دامەزرێنەری بانکی گۆڵدمان ساکس بووە.

[2] بیرۆکراسی: زاراوەیەکە لە زانستی کۆمەڵایەتی و زانستی سیاسی بەکاردێت، ئاماژەیە بۆ سەپاندنی یاسا لەڕێگەی هێزەوە لە کۆمەڵگە ڕێکخراوەکان، ئەم ڕێکخراوانەش پشت دەبەستن بە ڕێکارە یەکگرتووەکان و دابەشکردنی

←

حکوومەت هاتەکایەوە. پاریزەرەکانی نووسینگەی ڕاوێژکاریی وەزارەتی دەرەوە کێشەکەیان بۆ ماوەی چەند مانگێک هەڵپەسارد، بێ ئەوەی بە خودی ڕاوێژکاری یاسایی ڕابگەیەنن. پاریزەرەکانی ئاسایشی ناوەخۆ لە بنەڕەتدا هەمان شتیان ئەنجام دا، بە هیوای ئەوەی کێشەکەیان لەکۆڵ بێتەوە. هەروەها لەمیانەی هەوڵەکانمان لە مانگی ئازاری ۲۰۱۹ بۆ جووڵاندنی ئاریشەکە بەو ئاراستەیەدا، لە زۆربەی ئاژانسە سەرەکییەکان ناکۆکی هەبوو لەسەر ماوەی خایاندنی پاریزەر لەسەر چۆنییەتی پاڵپشتیکردنی دارایی دیوارە سنوورییەکەی ترەمپ لەگەڵ مەکسیک، کە بۆ ماوەیەکی زۆر بووە چاڵە ڕەشە هەرە تایبەتەکەی حکوومەتەکە. هەندێک کەیسی یاسایی هەبوون، وەکو ئەوەی ئایا یاسا ڕێگا دەدات بەشێک یان سەرلەبەری حکوومەتێک وەکو ڕێکخراوێکی تیرۆریستی بێگانە هەژمار بکات، یان سیستەمە بنەڕەتییەکە تەنها لەسەر "لایەنە بکەرە ناحکوومییەکانی" وەکو قاعیدە جێبەجێ دەکرێت. نووسینگەی بەشی داد لە ڕاوێژکاری یاسایی لە مانگی ئازاری ۲۰۱۹ هەڵسا بە پارچەکردنی ئەم مندالە، کە توانی بگاتە ئەو دەرەنجامەی دەکرێت کیانێکی حکوومی وەکو گاردی شۆڕش (حرس ثوری) دەستنیشان بکرێت نەوەک گشت حکوومەتەکە.

ئەم دەرەنجامە ئاشتیانەیە تینی کاریگەری بڕیاردانەکەی کەم کردەوە، کە من وەکو کارێکی زیادەڕۆی نایبینم، بەلام لە سەرەتادا هەنگاوێک لێیەوە دوور بووین، چەندین گفتوگۆی لێکتێگەیشتنی تر بێ دەرەنجام مانەوە.

دوودڵییەکی زۆر هەبوو لەسەر دژایەتیکردنی ئێران کە دەبێتە هۆی زیادکردنی مەترسی لەسەر هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق و گشت ناوچەکە.

---

بەرپرسیارێتییەکان بە شێوازێکی هەرەمەکی و لە ڕێگەی پەیوەندییە کەسییەکان.

بەڵام ئەم بیانووە زۆر شتی سەلماند. وەک هەموو جارەکانی تر، وەزارەتی بەرگری ئەم پەڵپەی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بەشێوەی چەندین بیرۆکەی جیاواز بڵاو کردەوە، بۆ زیادکردنی فشار لەسەر ئێران. وەڵامدانەوەی مەترسییەکانی پنتاگۆن سەبارەت بە فشارکردنە سەر ئێران بووە هۆی زیادکردنی تواناکانمان بۆ پاراستنی هێزەکانمان لە عێراق، بەهۆی گریمانەی ئەوەی کەوا پێویستە هێزەکانی ئەمریکا لەوێ بمێننەوە. ناکرا چیتر هەڕەشە ستراتیژییەکان و هێزە ئەتۆمییە تەماعکارییەکانی ئێران پشتگوێ بخرێن، لە ڕێگەی هەڵگەڕانەوەی سیاسەتی ئەمریکی کە کاری لەپێشینەی بریتی بوو لە هەڵگرتنی هەڕەشەکانی ئێران لە ناوەوەی عێراق، وەک لە بەرنامە ئەتۆمییەکەی و هەڕەشە تیرۆریستییەکانی بە سەرتاسەری جیهاندا. ئەم هەڵگەڕانەوەی سیاسەتەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوونتر دەبوو، بەتایبەت دوای زیادبوونی هەژموونی ئێران لەنێو حکوومەتی بەغدا لە ڕێگەی ڕێکخراوە شیعییەکان و هەڵکشانی هێزی قودس. دوودڵ بووم، هەروەکو سەرزەنشتکارە کۆنەکان دەڵێن، ژەنەراڵەکان هەمیشە لەجیاتی هەڕەشەکانی ئێستا، شەڕی کۆتایی هەڵدەگیرسێنن. تاکە ئامانج لە پشتگیریکردنی حکوومەتی بەغدا هەروەکو لە شەڕی دووەمی کەنداو ئەنجامم دا، بریتی بوو لەوەی کە ببێتە تاکە نوێنەری کارا لەسەرتاسەری عێراق. بەڵام پشتگیریکردنی ڕژێمێک کە توانای کۆنترۆڵکردنی ناوچە کوردییەکانی نەبێت و کەمترین پشتگیری لەنێو عەرەبە سوننییەکان نەبێت، هەروەها لە پرسە چارەنووسسازەکان پرسوڕای تاران بکات، بابەتێکی تەواو جیاوازە.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاماژە شەڕانگێزەکانی بیرۆکراسییەکان بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی مانگی ئازار بەدوای یەکدا دەهاتن، بەڵام هەر لەو کاتەدا دڵنیا بووم کە هیچ ئەنجامێکی نابێت، سەرەڕای دزەکردنە کەمەرشکێنەکان لەلایەن ئۆپۆزسیۆنەوە، پێشبینی خراپترین لێکەوتەی پۆلێنە تیرۆستییەکان

دەکرێت. لە کۆتاییدا، لە ٨ ی مانگی نیسان، ترەمپ ڕاگەیاندنەکەی خستەڕوو، کە کەرەستەیەکی بەهێزی خستبووەسەر، ئەویش "بەرزترین توانای فشارمان" لەبەردەستە. ئەگەر هاتبا و پێش شەش مانگ یان زیاتر ئەم فشارە جێبەجێ کرابا، ئەوا ئەنجامەکەی "کاریگەرتر" دەبوو، بەڵام وا دەرکەوت کە دروستکردنی ئەم فشارە لەسەر ئێران، لێکەوتەی خراپی لایەنی ئابووری لەسەر ئەو لایەنانە لێ دەکەوێتەوە کە سزای ئێران دەدەن. فشارەکە بەرەبەرە نەشونمای دەکرد.

ڕەخنەگران بەشێوەیەکی خولی ڕا و سەرنجیان لەسەر ئەوە هەبوو کە ئایا حکوومەتەکە چەند جار پەنایان بۆ سزا و پێبژاردن بردووە وەک کەرەستەیەکی دەسەڵاتی نیشتیمانی. دەکرێت بە بەراورد بە سەرۆکەکانی پێشووتر ئەمە ڕاست بێت، بەڵام هیچ بەڵگەیەک لەسەر ئەوە نییە کە ئەم جۆرە ڕێکارانە کارا و ئەزموونی و جێبەجێکردنیان باش بێت. چیرۆکە ڕاستەقینەکە زیاتر ئاڵۆز بوو، چونکە بە پلەی یەکەم نە ترەمپ و نە وەزیری گەنجینەی ئەمریکی ستیڤن منوشن گرنگییان بە سیاسەتی دووبارە چارەسەرکردن و ئارامگری نەدەدا.

بە پێچەوانەی ئەمە، منوشن مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد کە پەیڕەوکردنی بەردەوامی سزاکان و خستنەسەری فشاری بەردەوام بۆ سەر سیستەمی دارایی نێودەوڵەتی، وەکو ئامراز دەبێتەهۆی کات لەدەستدان، ئەمیش هۆکارە بۆ کاریگەربوونی وڵاتان بەم سزایانە و هەوڵی ڕزگاربوونی لێ دەدەن. هەروەها مشتومڕی ئەوەشی دەکرد کە گەیشتن بە بەکارهێنانی سیستەمی دارایی ئەمریکا وەک یەکێک لە کەرەستە هەرە گرنگەکانمان، لەوانەیە ببێتە هۆی دارمانی دۆلار وەک دراوی یەدەگی جیهانی و ڕێخۆشکردن بۆ وڵاتانی وەکو ڕووسیا و چین، بۆ مامەڵەکردن بە یۆرۆ، یان لە ڕێگەی هاوتاکردنی بازرگانی و چەندین تەکنیکی تر. شتێکی چاوەڕوانکراو بوو کە وڵاتان هەوڵی هەڵهاتن لە سزاکان بدەن. لە

هەریەک لە حکوومەتەکانی ئۆباما و ترەمپ، هۆکاری سەرەکیی شکستی سزادانەکان بەکارهێنانی چەندجارەی نەبوو، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوە بوو کە بەشێوەیەکی کارا جێبەجێ نەدەکرا. لەبەرئەوەی دۆلار بەشێوەیەکی جێگیر لە پرۆژەی دراوی یەدەگی جیهانی پشتی پێ دەبەسترێت، بۆیە هیچ جێگرەوەیەکی ڕاستەقینە لەجیاتی دۆلار نییە، کە لە داهاتوودا وەکو دراوی یەدەگ بەکار بێت. سەرباری ئەمەش، گشت بیانووەکانی منوشن گەیشتنە دەربڕینی ئەوەی کە هەڕەشەی سزادان کاریگەری زۆر زیاترە وەک لە جێبەجێکردنی خودی سزاکە، ئەمەش بەشێوەیەکی زۆر ڕوون و ڕاشکاوانە شتێکی ناڕاستە.

ڕێگای دروستی سەپاندنی سزاکان ئەنجامدانییەتی بەشێوەیەکی خێرا و چاوەڕوانەکراو. پێویستە فراوان و گشتگیر بێت نەوەک پچڕ پچڕ؛ سەپاندنێکی توند بێت و ئەگەر پێویست بکات دەبێت شێوازی سەربازییش بۆ ڕێگریکردن لە بازرگانیی ڕێگەپێنەدراو بگیرێتەبەر. ئەمە ئەو شێوازە بوو کە حکوومەت یان بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش[1]- ٤١ زۆر بەخێرایی بەسەر ڕژێمی سەدام حوسێنیدا سەپاند، دوای داگیرکردنی کوێت لە مانگی ئۆگەستی ١٩٩٠، کە کاریگەرییەکی وێرانکەرانەی لەگەڵ بوو.

دوای ئەم هەموو وێرانکارییەش، ئەمە بەس نەبوو. سەرەڕای لاوازیی لەڕادەبەدەری، عێراق بەشێکی زۆری نەوتەکەی تاڵان کرا لەپێناو مانەوەی، لە کۆتاییشدا تەنیا بژاردەی سەربازی بەردەست بوو بۆ وەدەرنانی ڕژێمی سەدام لە کوێت. بەڵام نەخشەڕێگەی تایبەت بە سزاکانی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیی ژمارە ٦٦١ی سەپێنراو بەسەر عێراق بەخێرایی و بەشێوەیەکی گشتگیر، کە چەندین سزای جۆراوجۆری لەخۆ

---

[1] جۆرج بوشی باوک، سەرۆکی پێشووتری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

گرتبــوو، وەک بڕیــاری ژمــارە ٦٦٥، کە ڕێــگە بە ســوپا دەدات بــۆ جێبەجێکردنــی، ئەم بڕیـارانە بەشـێوەی دۆکیـومێنتی سـەرەکی دەمێنـنەوە. لەجیـاتی ئەمە، بەتـایبەتی لە کـاتی دەسـەڵاتی ئۆبامـا، سـەپاندنی سـزاکان بەشێوەی دادگای تاکەکەسی لەجیاتی دەرکردنی بڕیار دژ بە گرووپ یان کۆمەڵەیەکی دیاریکراو جێبەجێ دەکرا. ئەم شـێوازە بە کردەیـی لە چەنـد دەسەڵاتێکی دیاریکراوی سزادانی ئەمریکی بـوونی هەیە، کە کـار لەسـەر کەیسـی سـنووورداری وەکـو هەڕەشـە مەترسـیدارەکانی عێـراق لە ساڵانی ١٩٩٠-١٩٩١ دەکـات، بەڵام ئەمە هەڵەیەکـی گەورە بـوو کە بووەهـۆی ئەنجامدانی بەشێوەیەکی بەرفراوان. لەجیاتی ئەمە، پێویست بوو یاساکە بەو ئاراسـتەیە گۆڕانکـاری تێـدا کرابـا کە تەنیـا لە بـارودۆخی زۆر گرنـگ سـزاکان بەشـێوەیەکی گشـتگیر و نـیمچە جێبەجێکـردن و بڕیـاری نـیمچە دادوەری لە بەشی گەنجینە، جێبەجێ کرابا. ترەمـپ و منوشـن پـێچەوانەی سیاسەتەکەی سەردەمی ئۆباما کاریان نەدەکرد؛ بەشـێوەیەکی گاڵتەجـاری، سیاســەتەکەیان فــراوان کــرد و ســیمایەکی دامەزراوەیــان پــێ بەخشــی. دەرکردنی بڕیاری سزاکان لە پرۆسەی گومانلێکردن لە دژی جارندیز ف. جارندیز[1] لە ماڵی چارلس دیکینزی[2] شوومەوە هات. سـەرباری ئەمەش، منوشن خۆی ڕەخنەی لە ڕووماڵە ڕۆژنامەوانییە نەرێنییەکان هەبوو، زۆربەی جار بە تووڕەیی ناکۆکییەکانی لەسەر چەندین بابەت کە مشتومڕی زۆریان

---

[1] جارندیز ف. جارندیز: کەیسێکی دادگـایی خەیـاڵییە بەنـاوی ( مـاڵی شـوم١٨٥٣ – ١٨٥٢ ) نوسەری بەناوبانگ (چارلز دیکێنز) نوسـیویەتی، لە دادگای چانسێری ئینگلیزی پێشکەشـکرا. کەیسـەکە بـریتییە لە دەزگـایەکی ناوەنـدی پیلانگێـڕی لە ڕۆمانێـک، کە دواتر بو بە وشەیەکی سەرەکی لە کاروبارە یاساییەکان کە وا دەردەکەوێت کەیسـێکە کۆتایی نایەت.

[2] چارلز دیکنـز: نووسـەر و ڕەخنەگـری کـۆمەڵایەتی ئینگلیـزی، چەنـدین کەسـایەتی خەیاڵی بەناوبـانگی لە ڕۆمانەکـانی بەرجەسـتە کـردوە، بە یەکێـک لە ڕۆمانووسـە هەرە بەناوبانگەکانی سەردەمی ڤیکتۆری دادەنرێت.

لەسەر بوو، تاوتوێ دەکرد. لە ڕۆژەکانی سەرەتای حکوومەتەکە، منوشن چێژی لەو پڕوپاگەندە نوێیانە دەبینی کە لە کاتی سەپاندنی سزاکان پێی دەگەیشت، بەڵام کاتێک بابەتەکان زیاتر و زیاتر ئاڵۆز بوون، ئەو زیاتر شوێنپێی خۆی جێگیرتر دەکرد. بە گەڕانەوەم بۆ ناو حکوومەت دوای دوازدە ساڵ، سەرم لە بینینی چۆنییەتی گێڕانی ئەو ڕۆڵە گەورە و کاریگەرەی سوڕما کە وەزارەتی گەنجینە لە دەرکردنی بڕیاری سزادانەکان دەیگێڕا. لەجیاتی ئەوەی تەنیا میکانزمێکی کارپێکردن بێت، وەزارەتی دارایی ئێستا هەوڵ دەدات سیاسەتی دەرەوە جێبەجێ بکات کە سەبارەت بە خۆم ڕێگر بووم و بە شتێکی نەگونجاوم دەزانی. دەربارەی ئەوانی تریش، ئەرکی دەرکردنی یاسا لە پێشوتردا لە گەنجینە بۆ ئاسایشی ناوخۆ گوێزرایەوە، پێویستە پرۆسەی جێبەجێکردنی سزاکان لە شوێنی تر بەڕێوە بچێت: وەکو دادوەری، بازرگانی و هەتا بەرگریش. مەترسی شکانی دۆلاری ئەمریکی وەکو دراوێکی یەدەگی جیهانی لە لایەنە تیۆرییەکەی گرنگە، بەڵام ئەم مەترسییە بە شێوەیەکی پڕاکتیکیش بەهۆی کاریگەرییەکانی سزا سەپێنراوەکانی ئەمریکا بوونی هەیە. دراوەکانی تریش ڕۆڵی سەرەکییان هەیە لە کاروبارە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان و هاتنەکایەوەی یۆرۆش[1] دەبێتەهۆی دروستبوونی ڕکابەرێکی بەهێز، لەلایەکی تریش، هەندێک لە وڵاتان دراوەکەیان بەرامبەر بە دۆلار بەستراوەتەوە و هەندێک لە ئابووریناسان باس لە وابەستەبوونی هەندێک لە ئابوورییە نیشتیمانییەکان دەکەن بە "دۆلار"، کە هەندێک جار ئەمەش بە بڕیارێکی فەرمی یان لەڕێی پڕاکتیزەکردنی لە جیهانی واقیعی دێتە کایەوە. خەریک بوو گشت ئاراستەکان هەنگاویان بۆ تاکە ئاراستەیەک

---

[1] یۆرۆ: یان ئۆرۆ یان ئیۆرۆ کە نیشانەکەی €، دراوی یەکگرتووی وڵاتەکانی یەکێتیی ئەوروپایە، لە دوای دۆلاری ئەمریکی بە دووەم گرنگترین دراو لە جیهان دادەنرێت.

دەهاویشت. لە ڕاستیدا، گۆڕانی "هەڕەشە" لە بارودۆخی دۆلار، بیانووی دایە دەست منوشن کە پاشەکشە بکات کاتێک سوور بوو لەسەر سەپاندنی سزاکان و سەرکەشیکردن بە ڕەخنەگرتنی زۆر لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن. هەروەکو ویلبەر ڕۆس[1] لە میانەی کەیسی ڤەنزویلا گوتی: لە زۆربەی کاتەکان منوشن هەوڵی زیاتری پاراستنی کۆمپانیا ئەمریکییەکانی دەدا، لەکاتێکدا دەستی لەگەڵ دوژمن تێکەڵ کردبوو بۆ دەستخستنی ئەو ئامانجانەی هەوڵی بەدەستهێنانمان دەدا. بە دەگمەن لە واقیعدا لە جیهانێکی دڵڕەق و هەڕەمەکی لە کاروبارە نێودەوڵەتییەکان مەترسیی لەسەر ئەنجامنەدانی کارێک زیاتر بێت لەسەر ئەنجامدانی خودی کارەکە. ئەگەر بێتوو شمشێری ئابووریی ئەمریکا لە میانەی حکوومەتی ترەمپ تیژتر بێت، ئێمە هەوڵی زۆر زیاتر دەدەین بۆ بەدەستخستنی ئەم ئامانجە ئابوورییانە، زۆر زیاتر لە جاران.

---

یەکێک لەو بابەتانەی کە پێویست بوو ئاسانترینیان بێت بۆ چارەسەرکردن، لە ڕاستیدا یەکێک بوو لە سەختترینیان، ئەویش مەودای ئەو فشارە بوو کە دەبوو بخرێتە سەر ئێران دەربارەی بەرهەمهێنانی نەوتەکەی. هەر کاردانەوەیەکی هاوبەشی ئێران یان (ڤەنزویلا) دژی توندترکردنی سزا نەوتییەکان، دەبووە هۆی زیادبوونێکی زۆری نرخی جیهانیی نەوت. زۆربەی هەرە زۆری ئەم مشتومڕە لەلایەن منوشن و گەنجینەی ئەمریکییەوە دەهات، کە سەرچاوەکەی ئەزموونی چاوەڕوانەکراوی بازاڕی نەوتی جیهانی بوو. سەرۆکی ئەنجوومەنی ئابووریی نیشتیمانی لاری کودلۆ و سکرتێری وەزارەتی وزە ڕیک پێری و

---

[1] ویلبەر ڕۆس: خاوەنکار و وەزیری بازرگانی ئێستای ئەمەریکا.

سەرۆکی ڕاوێژکارانی ئابووری کیڤن هاسێت، چەندین جار گفتوگۆی ئەوەیان دەکرد کە ئاستەکانی خستنەڕوو و توانا جیهانییەکانی نەوت، کاریگەرییە نرخییەکان کە لە ئەنجامی سزای توندتر بەرهەم دێن، سووکتر دەکات. هاسێت جەختی لەسەر ئەو ئامارە دەکردەوە کە هەر لە کاتی هەڵبژاردنی ترەمپ بوو بە هۆکاری زیادبوونی بەرهەمهێنانی ناوەخۆی نەوتی ئەمریکی، فرۆشی نەوتی ئێران بەشێوەیەکی بابەتی بچووک بوویەوە بەهۆی ئەو لێبوردنانەی کە بۆ کڕینی نەوتی ئێران بە هەندێک وڵات درابوو.

لەلایەکی تریشەوە، سزاکان لە مانگی نۆڤەمبەری ٢٠١٨ چوونە بواری جێبەجێکردنەوە. سەرەڕای ئەمەش، بە لەبەرچاوگرتنی ڕۆڵی کارای ئەمریکا وەکو بەرهەمهێنێکی نەوت، بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە واقیعدا دەبێتەهۆی زیادبوونی بەرهەمی گشتی ناوەخۆی ئەمریکا، هەتا ئەگەر نرخەکانی بەکاربەر بەرز بێت کە شوێنەواری خراپ بەجێ دێڵێت. بەشێوەیەکی گشتی، سەبارەت بە ئێمە، لە بنەڕەتدا شوشتنەوەیەکی ئابوورییانە بوو.

بەڵام بیانووەکانی منوشن بارگرانیی زۆری دروست کرد، چونکە ترەمپ هەمیشە پێی وابوو کە هاوپەیمانەکانمان بەپێی پێویست کاریان نەکردووە. بە دڵنیاییەوە ئەمە سەبارەت بە ئێران ڕاست بوو. هەریەک لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا و بەریتانیا ئەوکات لێکتێگەیشتنێکیان بۆ ڕزگارکردنی ڕێککەوتنی ئەتۆمی لەگەڵ ئێران واژۆ کرد، لەجیاتی فشار خستنەسەر ئایەتوڵڵا خامنەیی. نە ئەوان و نە ئەمریکییەکانیش کە پاڵپشتی ڕێککەوتنەکەی ئۆبامایان دەکرد پێیان وانەبوو کە ئەمریکا تاکلایانانە دەتوانێت بە سزاکانی ئابووری، ئێران وێران بکات، کەچی سەرەڕای ئەمەش کاریگەریی هەبوو. بە ڕێگەیەکی داتایی دژایەتی سەلماندنی ئەم خاڵەیان دەکرد لە ڕێگەی توندترکردنی سزاکان لە هەرکاتێکی تر. بەپێی

ئەمەش، سەرکەوتن سەبارەت بە توندکردنی سزاکان جۆراوجۆر بوو، ئەگەر لە ڕازیکردنی توندڕەوەکانی ترەمپ بە دروستکردنی کاریگەرییان بۆ سەر منوشن سەرکەوتوو باین، دەکرا شلەژانی زیاترمان لە ئابووریی بینیبا، بەڵام ئەمە ڕوونادات، ترەمپ دەکرێت دەست بکات بە سیاسەتکردن، بەڵام لاوازییەکەی لە ڕووی دەربڕینی قسەکانی و خۆڕاگرییەکەی ڕێگر بوون، بۆیە پێویست بوو ئێران سزاکانی بەسەردا بسەپێنرێت. یەکێک لە شلەژانە گرنگ و کاریگەرەکانی ئێران کە دوای دەستپێکردنی سزا نوێیەکان لە مانگی نۆڤەمبەری ٢٠١٨، بریتی بوو لە لێبوردنە نەوتییەکانی بەخشراو بە هەشت وڵات، ئەوانیش (تایوان و چین و هیند و ژاپۆن و کۆریای باشوور و ئیتاڵیا و یۆنان و تورکیا) بوون، ئەمەش شەش مانگ دوای کشانەوەی ئەمریکا لە ڕێککەوتنە ئەتۆمییەکە ڕووی دا، تایوان و یۆنان، دواتر ئیتاڵیاش بەخێرایی لە کڕینی نەوتی ئێران وەستان، بۆیە ئێران وەکو پێشتر کڕیاری نەوتی بۆ پەیدا نەدەبوو. بیرۆکراسییەکانی وڵات چەندین هۆکارییان دۆزییەوە بۆ ئەوەی چیتر کارئاسانی بۆ ئێران نەکرێت، وەکو "هەوکردن (قەتیسکردن)ی کڕیار". "بەڵام هیند زۆر گرنگە" یان هەروەکو بەرپرسەکان گوتیان: "ژاپۆنیش زۆر گرنگە"، بە بیانووی ئەوەی بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتانە (هیند و ژاپۆن) لەجیاتی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لەمەترسیدایە. یەکێک لە بارودۆخە هەرە خراپەکان بەشداریکردنی هیند بوو، کە وەکو ئەوانی تر نەوتی ئێرانی بە نرخێکی باشی کەمتر لە نرخی بازاڕی جیهانی دەکڕی، چونکە ئێران زۆر پێویستی بە فرۆشتنی نەوتەکەی بوو. هیند گلەیی ئەوەی هەبوو کە نەک تەنها بێبەش دەبێت لە دۆزینەوەی فرۆشیارێکی نوێی نەوت، بەڵکو سەرچاوە نوێیەکان (فرۆشیارە نوێیەکانی نەوت) پێداگریی دەکەن لەسەر دەستبەسەرداگرتنی سەروەری نرخی بازاڕ! خستنەڕووی ئەم بیانووە لەلایەن هیندەوە ڕوون بوو، بەڵام ئەوەی ناڕوون بوو بیرۆکراسییە

ئەمریکییەکان بوون کە ئایا بە سۆزەوە وەڵامیان دەدەنەوە؟

پۆمپەیۆ دوودڵ بوو، لەنێوان فشارە یەک لە دوای یەکەکان دۆشدامابوو. هەروەها ئەو گومانی هەبوو لەوەی کە وڵاتە عەرەبییە بەرهەمهێنەرەکانی نەوت بەڵێنەکانیان بەنەسەر سەبارەت بە زیادکردنی بەرهەمهێنانی نەوت بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو "زیانەی" کە نەوتی ئێرانی لە ئەنجامی لێبوردنەکان دروستی کردبوو. بێگومان نرخی جیهانیی نەوت بەرز دەبێتەوە. ترەمپ هەر ڕۆژێک و لە کاتی شکانەوەی بەلای هەر کەسێک، هەموو جارێک بە شێوەیەکی زیادەڕەۆیی چوون بەلای "کۆتاییپێهێنانی ئەو وڵاتانەی لێبوردرابوون" لە کڕینی نەوت دەکردە پێوەر. زۆر بە ڕاشکاوی لە ئۆڤاڵ لە ٢٥ مانگی ئازار گوتی: "من ئامادەم بۆ بڕینی" و لە ١٢ی مانگی نیسانیش گوتی: "زیادکردنی سزاکان دەربخە، هەر ئێستا ئەنجامی بدە، لەنێویشیاندا لەسەر نەوت". هەروەها لە ١٨ی نیسان گوتی: "بڕۆ بۆ سفر". لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ پۆمپەیۆ، ترەمپ هیچ هاوسۆز نەبوو لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی هیندی نارینـدرا مۆدی، کاتێک گوتی: "ئەو باش دەبیت". گفتوگۆیەکی هەمان شێوەم بیردێت کە گرنگیپێنەدانی ترەمپ لە پێڕانەگەیاندنی هاوپەیمانان لە بڕیارەکانی سازشکردنەکانی پیشان دەدا. بە لەبەرچاوگرتنی گەشتکردنی یەکێک لە سەرکردە بیانییەکان بۆ واشنتۆن، هەروەها کۆتایی بە سازشکردنەکە هێنا، ترەمپ پێشنیارێکی ئامادەی بەردەست بوو: "ئەمە ئەنجام بدە بەر لەوەی بگاتە ئێرە، دواتر دەڵێم من هیچ شتێکم دەربارەی ئەمە نەدەزانی، هەروەها " ئەم کارە لە زووترین کاتی سەرەتای هەفتە ئەنجام بدە. نامەوێت لە هیچ شوێنێکی نزیک لەو بم. لە ٢٢ی نیسان، دوای شەش مانگ لە کاتی بێکۆتا، ناپێویست، بەفیڕۆچوو و بوونی ناڕەزایی لەلایەن چەندین کەسی ناو حکوومەت، بەڵام بە بڵاوبوونەوەی بەشێوەیەکی بەرفراوان، کۆشکی سپی ڕایگەیاند کە پشتگیری کۆمارییەکان دەکات لە کۆنگرێس بۆ

کۆتاییهێنــان بە سازشــکردنەکان. زۆرێــک لە دەزگاکــانی ڕاگەیانــدن، کە گوێیان گرتبوو لە دزەکردنەکانی بیرۆکراسییەکان، پێچەوانەکەی ڕاستبوو، سوپای ئەمریکــی و لایەنە مەدەنییەکــان لە نــاوچەکە لە بــارێکی وروژانــدا بوون و ڕوونمان کردەوە کەوا ئێــران بەرپرســە لە هەر تۆڵەســەندنەوەیەک لێی. ئەمە هەنگاوانێکی گرنگ بوو بۆ پێشەوە، ســەرەڕای ئەوەی نەدەبــوو سازشــەکان هەر لە ســەرەتاوە ببەخشــرابان. ســزا ڕاســتەقینەکان لە مــانگی پێنجی ٢٠١٨ ڕاگەیەنران، دوای شەش مانــگ کــارا دەبــوون. ئەم کــاتەش بەس بوو بۆ گشت لایەنە پەیوەندیدارەکان بۆ ئەوەی کاروبارە یەدەگەکان ڕێــک بــخەن. دەرەنجــامی ڕاســتەقینە لەم ســـزادانە ئەوەبـــوو کە هەر هەڵســوکەوتێکی نــوێ پێویســتە کــاریگەرییەکی خێــرای هەبێــت لەســەر کۆتاییپێهێنانی ڕێککەوتنی ئەتۆمیی ئێرانی. شەش مانگ بۆ کۆتاییهێنان بەم ڕێککەوتنــانە نەرمینوانــدنێکی زۆر بــوو. نەوەت ڕۆژ گەلێــک زۆر بــوو. پێدانی شەش مانگی تەواو بە ئێران کە پێشتر چاوەڕوانی نەدەکــرد ئەمەی پێ ببەخشرێ، دیارییەک بوو لەلایەن خوداوە کە هەرگیــز شــایەنی تــاران نەبوو. لەسەر حکوومەتی داهاتوو پێویستە بەزووترین کات شێوازی منوشن بگۆڕێت بۆ ئەوەی هەموو جیهان ئەوەیان لەپــێش چــاو بێــت کە ســزادانی ئابووری چەکێکە دەتوانین لە هەر کاتێکــدا بە کردەیــی بەکــاری بهێنــین، نەوەک ئەو شتە بێت کە لە کاتی پەیڕەوکردنیدا هەست بە تاوان بکەین.

---

کــۆمەڵێکی تــر لە سازشــکردنەکان کە بوونەهــۆی مشــتومڕێکی بێکۆتــا بریتی بوون لە سازشکردن لەسەر چەکە ئەتۆمییەکەی ئێران، کە ڕێگــا بــۆ گەیشتنی یارمەتییەکانی ڕۆژئاوا سەبارەت بە بەرنامە ئەتۆمییە مەدەنییــەکەی ئێــران خــۆش دەکــات. مێــژووی دووبــارە دەســتپێکردنەوەی ســـزاکان دەگەڕێتەوە بۆ مانگی یازدەی ٢٠١٨، وەزارەتی دەرەوە، بە لەبەرچاوگرتنی ڕەخنەکانی ئەنجــوومەنی ئاسایشــی نیشــتیمانی، حەوت لەم سازشــکردنانەی

ڕاگەیاند. کە هەموویان وەکو یەک کاریگەر نەبوون بۆ باشترکردنی کێشە ئەتۆمییەکەی ئێران، بەڵام ئاماژە سیاسییەکان خراپ بوون. بە ئاوابوونی خۆری لێبوردنەکان لە مانگی پێنجی ٢٠١٩، لە ناوەخۆ هەوڵی ئەوەمان دەدا کە ڕێککەوتنێکی کارگێڕی بکەین بۆ کۆتاییهێنان بە هەندێکیان و کەمکردنەوەی ماوەی هەندێکی تریان بۆ نەوەت ڕۆژ. هەوڵەکانمان بەرهەمێکی وای نەبوو کە هیوامان دەخواست، لە ئاستێکی زۆر بەرز وەزارەتی دەرەوە جەنگێکی چڕی چاڵهەڵکەندنی بەرپا کرد بۆ ڕزگارکردنی زۆرترین ژمارەی سازشکردنەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، لە سەرەتاکانی مانگی پێنج، توانیمان دوو لە سازشکردنەکان کۆتایی پێ بێنین، کە بووەهۆی مانەوەی پێنجیان، ئەوەی لەم دوو سازشکردنەوە مابوویەوە تەنها بریتی بوو لە ماوەی کۆتاییپێهێنانەکە و چوارچێوەی جێبەجێنەکردنەکەی. بەرلەوەی ئەوێ جێ بهێڵم، ناوەندی بەرگریکردن لە کوشتن، ببوو بە شوێنی لێبوردن و سازشکردنەکانی منوشن و وەزارەتی گەنجینە. مشتومڕی ئەوەیان بوو کە لێبوردنەکان زیان لە بەرژەوەندییەکانی چین و ڕووسیا دەگەیەنن، بۆیە پێویستە لەسەرمان ماوەکەی درێژ بکەینەوە. من و پۆمپەیۆ و منوشن لە ٢٥ی مانگی تەمموز لە ئۆڤاڵ لەم بارەیەوە گفتوگۆمان لەگەڵ ترەمپ ئەنجام دا، ترس و دڵەڕاوکێکەی منوشن دەربارەی چین و ڕووسیا بەسەر هەوڵەکانم بۆ زیادکردنی فشارەکان بۆ سەر ئێران سەرکەوت. بەڵام پۆمپەیۆ تا ڕادەیەکی زۆر بێدەنگ بوو.

---

هەمیشە ترەمپ گلەیی ئەوەی دەکرد کە هەموو خەڵکی جیهان دەیانەوێ لەگەڵ ئەودا قسە بکەن، بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکان دەرفەتیان پێ نەدراوە. لەبەرئەمە شتێکی سەیر نەبوو کاتێک لە کۆتاییدا هیوای کردنەوەی دەرگای گفتوگۆی بە ڕووی ئێراندا دەخواست.

لەبەرئەمە وەزیـــری دەرەوەی ئێـــران جەواد زەریـــف زنجیـــرەیەک چاوپێکەوتنی لە نیویۆرک ئەنجام دا کە ترەمپیش ویستی قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لەجیاتی ئەمە مـن و ناتەنیاهۆ و جێنشـینی سعودیە محەمەد بن سەلمان هەوڵی ڕووخاندنی ڕژێمی ئایەتوڵڵامـان دەدا. جـگە لەوەی دوای ئەمە، سـەرۆکی ئێـران حەسـەن ڕووحـانی ویسـتی قسەکردنی هەبوو و پوتینیش بە هەمـان شـێوە، هەمـوان دەیانەویسـت قسـە لەگەڵ ترەمپ بکەن، بەڵام هەمیشە یەکێک دایدەبڕی. بێگومان، نە پـوتین و نە ڕووحانیش هیچ هەوڵێکیان نەدەدا تاکو پەیوەنـدیمان پێـوە بـکەن، تـا ئەوکـاتەی جەواد زەریـف بـۆ دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن دوا، یارییـان بە شکستەکانی ترەمپ دەکرد، نوێترین جیاوازی کە لەم سـەروبەندەدا ڕووی دا، بابەتی دەرککردنی ڕەخنەگرتن بوو لە یاریدەدەرەکانی ترەمپ لەلایەن کیم جۆنگ ئوونەوە، پێوست بوو ئەو (کیم جۆنگ ئوون) هەوڵـی ئەوەی دابا کە تەنها ترەمپە دەتوانێت جیـاوازییەک دروسـت بکـات. هەریەک لە ئێران و کوبا و کۆریای باکوور لە کۆتاییەکانی مانگی نیسان جارێکی تـر هەوڵیان دایەوە، ئەمەش هەمووی لەبەر هۆکاری ئەوە بوو کە وایان دەزانی ئەم تاکتیکە بڵاو دەبێتەوە. لەم شێوازەدا زیرەک بوون، چونکە ئەمە ڕێک ئەوەبوو کە ترەمپ دەیویست. ئەو شـتەی کە قبـووڵی نەدەکـرد ئەوە بـوو کە ڕکابەرەکـانی لەجیـاتی دانوسـتان لەگەڵ ڕاوێژکـارە بێزارکەرەکـانی، ویسـتی گفتوگۆیـان هەبـوو لەگەڵ خـودی خۆیـدا (ترەمـپ)، بـۆ ئەوەی ڕێککەوتنێکی زۆر باشـتر بەدەسـت بێـنن. پـێم وابـوو کە هەواڵـی چـوونە دەرەوەم لە دەرگـاکەیەوە بە ترەمـپ دەڵـێم، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ نزیکتـر دەبوویەوە.

لەمیانەی کۆبوونەوەکەی کە لە کۆشکی سپی لە مانگی نیسـاندا لەگەڵ

ئابێ[1] بەڕێوەچوو، ترەمپ گوتی نە من نە پۆمپەیۆ پەیوەندی زۆرمان نییە لەگەڵ ئێران، لە ڕاستیشدا هیچ پیوەندییەکی لەگەڵ ئێراندا نەبوو، بەڵام ئابێ توانی ئەمە ئەنجام بدات. ترەمپ پێی وابوو کە جوگرافیای سیاسی نێودەوڵەتی هەموو شتێکە. لەوانەیە ئەمە هەمان بارودۆخی بواری کڕین و فرۆشتنی خانووبەرە بێت لە نیویۆرك. لە پاشاندا، ئەم لێدوانانە یەکەمین ئاماژە بوون کە ترەمپ بیر لە کارێک دەکاتەوە بۆ ئابێ، کە ئەمەش کۆتاییەکی باشی نەدەبوو، بەر لە ترەمپ، ئەم گفتوگۆیە زۆر درێژەی نەدەکێشا، هەتا لە هەواڵە نایابەکەی بەیانیانی ئابووریی ستراتۆسفێریش، بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخەکانی سوو، لەلایەنی سەرۆکی ئەنجوومەنی یەدەگی فیدڕاڵی جیرۆم پاوڵدا کشامەوە کە " گەمژەیەک بوو بۆ خۆی لە بانکی یەدەگی فیدڕاڵی". سەرەڕای ئەمەش، لە ٣٠ی ئەپریل، لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ سەرۆکی فەرەنسا ئیمانوئێل ماکرۆن، دووبارە ترەمپ بیرۆکەکەی ورووژاندەوە، هاندانی ماکرۆن، کە لە پێناوی ڕێککەوتنی ئەتۆمی لەگەڵ ئێراندا دەژیا، بە ئامانجی گرتنی ئەو دەرچە دیار و ڕوونەی کە لە هەڵوێستی ئەمریکیدا ببوو. ترەمپ بە تەنیا لەنێو هەموو سەرکردەکانی جیهان، وای نابینی کە ئەم جۆرە بەخشینانە لە گفتوگۆکاندا دەبێتەهۆی لاوازکردنی ڕای گشتی، سەرەڕای ئەوەی ئەوانی تر چ دوژمن و چ دۆست ئەمەیان زۆر بە ڕوونی دەبینی، ترەمپ نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت: "من وتەبێژم، قسەکردنم خۆش دەوێ". ستراتیژێکی مەزنە لە حکوومەتەکەی ترەمپ.

---

لە هەمان کاتدا، ئێران لە خۆئامادەکردندا بوو لە دژی

---

[1] شینزو ئابێ: سەرۆک وەزیرانی ئێستای ژاپۆن.

بەرژەوەنــدییەکانی ئەمریکــا لە ڕۆژهەڵاتــی ناوەڕاســت. ئێـران هەڵسـا بە پڕچەککردنی توندڕەوە حوسییە یەمەنییەکان و میلیشـیا شـیعییەکانی عێـراق لە ڕێگەی پێدانی کۆمەڵێک لە مووشەکی پێشکەوتوو و چەنـدین چەکـی بێفـڕۆکەوان. هێزەکـانی قـودس کە حیزبـوڵڵای لوبنـانی دروسـتی کـردن، کۆڵەگەیەکی یەکلاکەرەوەی ڕژێمی ئەسەد بوون لە سووریا، هەریەکە لە سـووریا و لوبنـان سـوودیان لەو کـۆمەکە سـەربازییانەی ئێـران بینـی کە پێشکەشی کردبوون (بەلایەنی کەم لەو کاتەی هێشتا ئیسرائیل هەڵنەسـتابوو بە وێرانکردنی بارهەڵگرە ئێرانییەکان بەهۆی هێرشی ئاسمانی کە دواتـر لە سووریا و عێراق بەئەنجامی گەیاندن). هەروەها ئێران هەڵسا بە فراوانکردنی یارمەتییەکانی بۆ بـزووتنەوەی تاڵیبـان، بەمەش ئەوەی سـەلماند کە وڵاتـی هاوسەنگکردن و لەخۆگرتنی تیرۆر و گـرووپە تیرۆریسـتییەکانە، چ سـونە بێت یان شـیعە، گرنـگ ئەوەیە خـزمەت بە بەرژەوەنـدییە نیشـتیمانییەکانی ئێران بکەن. وەکو وەڵامێکی بەرگریکارانە، هەڵسا بە زیادکردنی هەژموونە ســەبازییەکانی لە نــاوچەکە، لەنێوانیانــدا خێــرا بڵاوکــردنەوەی فــڕۆکە هەڵگرەکـانی ئەبراهـام لینکـۆڵن و هێـزە کاولکـارییەکەی. لە ٥ی مـانگی مایس، وتارێکی ڕوونکردنەوەی گشتیمان دەرکرد، کە لە زاری خۆم بڵاو بوویەوە، ئەمەش بووە هۆی دروستکردنی مشتومڕێکی زۆری ڕۆژنامەوانی، کە پرسیاری ئەوەیان دەوروژاند، بـۆچی ئەم جـۆرە وتـارانە لە پنتـاگۆنەوە دەرناکرێن. وەڵامەکەی؟ دەنفۆرد پەیوەندی کرد و گوتی: "سڵاو، بـاڵیۆز، من پێوستم بە هەنـدێک یـارمەتی هەیە"، هەوڵـی دەسـتکەوتنی لێـدوانێک دەدەم لە کۆشــکی ســپیی بیرۆکراســی، کە وا هەســت دەکەم کــارێکی زەحمەتە. دوای چەند ڕۆژێک دەنفۆرد پێی گوتم: "قسەکەمان لەدەستە، لە جەنگدا، هەندێکجار شتە سادەکان گران و ئاڵۆز دەبـن". مـن دڵخۆشـم بە یارمەتیدانەکە، مەتەڵەکە شیکار کرا.

هەڕەشەکانی ئێران تەنها هەنگـاوێکی تایبەتمەنـد نەبـوون بە سـەرکردە

مەیدانییەکانی هێزی قودس، بەڵکو هەڵچوون و هەڕەشەیەکی پلان بۆ داڕێژراو بوو کە ئێران بە "بەرگریی هەرە بەرزی" فشارەکانی ئەمریکای ناوزەرد دەکرد. ئەم گۆڕانە لە ستراتیژییەتی ئێران و یارمەتییە بەردەوامەکانی بۆ گرووپە تیرۆریستییەکان و هێزە یەدەگەکانی تر، جەختی لەسەر مەترسییەکانی بچووکترین لاوازی لە ویستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکردەوە، ئەوە ئەو هۆکارە بوو کە تاران وای دەبینی دەستێکی باڵای هەبێت لە ڕزگاربوون لێی، بە درێژایی چوار مانگی داهاتووی دوای ئەمە، هەڵسوکەوتی هەڕەمەکی و نادیاری ترەمپ، وای کرد ئەم مەترسییە زۆر بە ڕوونی دەربکەوێت. لە سەروبەندی ئەمە، ڕووحانی لە ٨ی مانگی مایس، کە شەست ڕۆژ دوای ڕووداوەکان دەهات گوتی: ئێران ئامادەیە بۆ یاساشکێنی لە چوار تووخمی سەرەکی لە ڕێککەوتنی ئەتۆمی، لەوانەش: (١) سنووردارکردنی ئاستی نزمی پوختەکردنی یۆرانیۆم (پلەی کارخانە) بۆ ٣٠٠ کیلۆگرام؛ (٢) هێشتنەوەی یەدەگی ئاوی قورس لە ئاستی ١٣٠ تەنی مەتری (لەگەڵ ئامادەبوونی ئێران بۆ فرۆشتنی هەر ڕێژەیەکی زیاد کە لە بەرهەمهێنانەکەی بێتەکایەوە)؛ (٣) سنووردارکردنی پوختەکردنی یۆرانیۆم بۆ ٣,٦٧ لە سەدا کە لە زرتووخمی یۆرانیۆم-٢٣٥ بەرهەم دێت (هەر زیادەیەک لەم ڕێژەی پوختەکردنە ڕوویدات، دەگاتە ئاستی بەرهەمهێنان و دروستکردنی چەکی ئەتۆمی) و (٤) ڕێگەگرتن لە کارگەی ئاراک بۆ بەرهەمهێنانی ئاوی قورس کە ببێت بە کارگەیەکی بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆم، کە مادەیەکە لەجیاتی یۆرانیۆمی پوختەکراو بەکاردێت لە پرۆسەی کەرتبوونی ناوکی، بۆ بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی. لە نامەیەکیدا بۆ پوتین، ڕووحانی هەڕەشەی کشانەوەی لە پەیماننامەی ڕێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی کرد، ئەمەش پێشکەوتنێکی ترسناک و جێی تێڕامان بوو بۆ وڵاتێک کە پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات نایەوێ ببێت بە خاوەنی چەکی ئەتۆمی. ئەم چوار سنووردارکردنەی ئێران لە بنەڕەتدا ڕێککەوتنە ئەتۆمییەکەی ڕەت دەکردەوە. ئەگەر بێتوو

پرۆگرامە ئەتۆمییەکە لە سنوور و سروشتی خۆی بێت، چ پێویستی دەکرد تاران هیچ کام لەم بەندانە پێشێل بکات. تاکە لێکدانەوەی لۆژیکی بۆ ئەم هەنگاوە هەڕەشەئامێزەی ڕووحانی بریتییە لە قەتیسکردن و کەمکردنەوەی "کاتی پێویست" بۆ تێپەڕاندنی "ئەو تەگەرەیەی کە ڕێگرە لە بەردەم بەرهەمهێنانی پلەیەکی بەرزی پوختەکردنی یۆرانیۆم بۆ مەبەستی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی. داواکارییەکانی ڕووحانی و گرتنەبەری ڕێچکەی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی، سەرنجی ئەورووپییەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. ئەمە دەکرێت ساتێکی نموونەیی بێت بۆ هەریەکە لە بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا، بەڵام وا نەبوو. "ئاگادارییەکەی" ڕووحانییان ڕەت کردەوە، بەڵام ناوەڕۆکی قسەکانیان پشتگوێ خست. لە پنتاگۆن، دەنفۆرد گوتی کە ئەو ئامانجی ڕوون و فەرمانی دیاریکراوی دەوێ، ئەگەر لێپێچینەوەی جددی لەگەڵ ئێراندا ببێتە ئەگەرێکی بەهێز. ئەمەش کاردانەوەی ماتیسی نیشان دەدا کە گوتی: ستراتیژییەتی ئاسایشی نەتەوەیی هەریەک لە چین و ڕووسیا و کۆریای باکوور و ئێرانی لە لیستی ئەو وڵاتانە داناوە کە مەترسین بۆ سەرمان، قسەکانی ماتیس ئەوەی لێ هەڵهێنجرا کە هەڕەشەکانی ئێران لە "ئاستی چوارەمدا" بوون، کە لە شێوەدا شایەنی گرنگیپێدانێکی زۆر نییە. سەرەڕای ئەوەی ئەمە پێش گەیشتنی من داڕیژرابوو، هەمیشە گریمانەی ئەوەم دەکرد کە گشت لەو چوار وڵاتانە لە "ئاستی یەکەمی" هەڕەشەکان دان. لە ئاستی یەکەم، لەوانەیە ئێران لە نێویدا لە ئاستی چوارەمدا بێت، لەبەرئەوەی ئێمە هێشتا پێمان وانییە کە وڵاتێکە خاوەن چەکی ئەتۆمی بێت. مشتومڕی ئەوەم دەکرد کە ئەگەر سیاسەتەکە بریتییە لە ڕێگریکردن لە ئێران بۆ بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی، پێویستە لەسەرمان ئامادە بین بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی. بە درێژایی بیست و پێنج ساڵ، وڵاتان هەرگیز ئامادە نەبوون بۆ ئەوەی کاری پێویست ئەنجام بدەن بۆ ڕێگریکردن لە بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن کۆریای باکوور، ئەمەش بە هۆکاری ئەوە بوو کەوا پێیان وابوو کۆریای باکوور

نییەتی بەدەستهێنانی ئەم چەکەی نییە. باسی ئەوەم کرد کە ئایا چۆن بوش[1]-٤٣ گوتی: "ڕێگەپێدراو نییە" ئێران چەکی ئەتۆمی هەبێت، هەمیشە دەمگوت، کاتێک سەرۆکێک دەڵێت: "ڕێگە پێدراو نییە" واتە "ڕێگەپێدراو نییە". دواتر دەرکم بەوە کرد کە هەڵە بووم. بوش یان (باوک و ئەوانی پێش باوکیشی) بەڕاستی مەبەستیان ئەمە نەبوو. قبووڵمان کرد کۆریای باکوور چەکی ئەتۆمی بەدەست بێنێت، بۆ دوورکەوتنەوە لە هەمان ئەنجام لەگەڵ ئێران، پێویست بوو بەردەوام بین لە زیادکردنی فشاری ئابووری و سیاسی و سەربازی. دەنفۆرد[2] پرسیاری ئەوەی لێ کردم کە ئایا بەڕاستی پێم وایە سیاسەتی ڕاگەیەنراو لەلایەن حکوومەتەوە کە "فشاری لەرادەبەدەر" بوو هەڵسوکەوتی ئێران دەگۆڕێت. پێم گوت دەکرێت بڵێم نزیکە لەوەی مەحاڵ بێت وا بیر بەکەینەوە کە حکوومەتی ئێستا بەم کارە هەڵسێت، نزیک بووین لە بەدەستهێنانی دوا هەلمان. دەنفۆرد گوتی کە ئەویش بە هەمان شێوە هەڵسەنگاندن بۆ بارودۆخەکان دەکات. ئەو بڕوای وابوو کە ئێران بڕوای وا نییە کە ئێمە مکوڕین لەسەر بەکارهێنانی هێز چ لە کەیسی چەکە ئەتۆمییەکەی یان لە حاڵەتی بەرگریکردن لە خۆمان دژی ئەو هێرشانەی کە تووشی دڵەڕاوکێی کردبووین لەلایەن فەیلەقی قودس لە کەنداوی فارسی (یان عەرەبی، بەپێی ئەو شوێنەی کە لێی دەژی) و دەریای سوور و عێراق و ئەفغانستان. ئەمە ئەو شتە بوو کە دەنفۆرد لەبارەیەوە دوودڵ بوو کە دەیگوت ئێران "هەڵەی کرد". پێم وابوو کە تاران بێ ئەوەی ترسی لە تۆڵەسەندنەوە یان هێرشی ئێمە بۆ سەری هەبێت دەتوانێت پەرە بە چەکە ئەتۆمییەکەی بدات.

---

(1) جۆرج بوشی کوڕ، سەرۆکی پێشووتری ئەمەریکا.

(2) جۆزێف دەنفۆرد، سەرۆکی گشتی هێزە چەکدارەکانی پیادەی دەریایی و سەرۆکی ئێستای دەستەی گشتی ئەرکانی هاوبەشی ئەمەریکایە.

لەوانەیە دەنفۆرد و شەنەهان[1] سەریان سوڕمابێت بە بیستنی هەموو ئەمانە، بۆیە گوتم: "شتەکە بەو شێوەیە نییە کە من بە درێژایی ئەو چەندین ساڵە بیروڕاکانم سەبارەت بەم بابەتە بشارمەوە"، کاتێک دانم بەو قسانە نا، ئەوان پێکەنین. ئەم گفتوگۆیە زۆر سوودبەخش بوو. بە پێچەوانەی ماتیس، من پێم وابوو کە دەنفۆرد شەڕ لەسەر ئەنجامەکە ناکات؛ تەنها دەیویست جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە ئێمە لە کاریگەرییەکانی گەیشتووین. ئەمە زیاتر بۆ ئەو ڕوون بوویەوە کاتێک من لەمە بوومەوە. ئەمەش بەلایەنی کەمی بەشێک بوو لەو "گفتوگۆ مەزنانەی" کە دەنفۆرد سەبارەت بە ئێران دەیویست. لەم ڕۆژانەدا، بە شێوەیەکی بەردەوام دەچووم بۆ لووتکە بۆ چاوپێکەوتنی ماڵی سەرەکی و ئەندامەکانی ئەنجوومەنی پیران، لەنێویشیاندا میک ماککۆنێل کە دواتر و لە ڕۆژی ٩ی مانگی مەی بوو، بۆیە بە تەواوی دەیانزانی کە چ شتێک ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. ماککۆنێل گوتی: "هەرگیز ئیرەییم بە کارەکەت نەبردووە"، منیش گوتم: "دەکرێت منیش هەمان شت بڵێم دەربارەی کارەکەت." ماککۆنێل پێکەنی و دواتر وەڵامی دایەوە: "کارەکەی تۆ زۆر گرانترە لە کارەکەی من". مێژووی وەڵامدانەوەکانمان دژی هێرشەکانی ئێران کە دەیکردنە سەر ئامانجی مەدەنی و سەربازی ئەمریکی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی ئاشکرا هەمیشە بەپێی پێویست نەبوون، سەرەتای ئەمەش دەستبەسەرداگرتنی باڵیۆزخانەکەمان بوو لە تاران لە ساڵی ١٩٧٩ و هێرشی ساڵی ١٩٨٣ بۆ سەر هێزە دەریاییەکانمان لە بەیرووت (کە بووە هۆی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکی و فەڕەنسی و ئیتاڵی لە لوبنان)، لە ئەنجامی بەردەوامی نەبوونی تۆڵەی ئەمریکا، کۆمەڵێک لە میلیشیا شیعەکان لە مانگی ئەیلوولی ٢٠١٨

---

[1] پاتریک شەنەهان، کەسایەتییەکی سەربازی ئەمەریکییە، جێگری وەزیری بەرگری بوو لەو کاتەی جێمس ماتیس وەزیری بەرگری بوو.

هێرشیان کردە سەر کونسوولخانەکەمان لە بەسرە. ئەم زنجیرە دووروودرێژە نەرێنییە، کە تا ئەمڕۆش درێژ دەبێتەوە، وای لە ئێران کردووە باوەڕی وابێت بە دڵی خۆی دەتوانێت لە ناوچەکە هەڵسوکەوت بکات. ئەمە دو گفتوگۆی ناو حکوومەت بوو سەبارەت بە ئێران، بە بۆچوونی من شتێکی ڕوون بوو کە پنتاگۆن زۆری لە هەگبەدا بوو بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو گرنگیپێنەدانەی ماتیس بکاتەوە، کە لە دژی بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران زۆر شتی ئەنجام دابوو. لە ماوەی ئەو گفتوگۆ ناوەخۆییانەی دەربارەی ئێران لەگۆڕێ بوون، کاتێک ترەمپ لەلایەن پەیامنێرێکەوە پرسیاری ئەوەی لێ کرا، "ئایا تۆ ڕازی لەو ئامۆژگارییەی لەلایەن جۆن بۆڵتنەوە پێت گەیشتووە؟" ترەمپ ئاوا وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، جۆن زۆر باشە. جۆن ئەو کەسەیە- کە بیروبۆچوونی توندی هەیە دەربارەی شتەکان، بەڵام ئەوە شتێکی خراپ نییە. من بە ڕاستی جۆن هێور دەکەمەوە و ئەو زۆر نایابە. ئەی وا نییە؟ هیچ کەس پێی وانەبوو ئەمە ڕوودەدات. من تاکە کەسم کە بووم بە هۆکاری بێزارکردنی ئەو. بەڵام کێشە نییە. من لایەنی جیاوازم هەیە. واتە من جۆن پۆڵتنم هەیە و خەڵکانی لەو ڕەشبینتریشم هەیە. لە کۆتاییدا، بڕیارەکە درا. نەخێر، تێگەیشتم- من جۆنم خۆش دەوێت. ئامۆژگاری زۆر باشم لە جۆن پێگەیشتووە.... ئایا دەتوانیت بیر لەو وشانە بکەیتەوە کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بڵاوی دەکەنەوە؟ بەڕێوەبەری پەیوەندییەکانی کۆشکی سپی مێرسی شلاب دەنگی ترەمپی بە " ناسک وەسف کرد، پێم ڕاگەیاندکە تووشی شۆک بووم لەوەی گەشبینە.

لە ٩ی مانگی مایس، پوختەی گفتوگۆ سیخوڕییە ڕێکخراوەکەی ترەمپمان سەبارەت بە گفتوگۆ مەزنەکەی ئێران نارد، لەگەڵ شەنەهان و دەنفۆرد و پۆمپەیۆ و هەروەها تیمێکی ئاسایی. کاتێک لە ڕیزی پێشەوەی مێزی نووسینگەکە دانیشتبووین، ترەمپ گوتی: "پیرۆزە" لە شەنەهان، ئەو تۆزێک شلەژانی پێوە دیاربوو، تاکو ترەمپ گوتی: " من وەکو وەزیری

بەرگری هەڵت دەبژێرم" کە ڕێپێدانی گشتیم وەرگرتووە هەرچەندە دەرچوونی بڕیارەکە زۆری خایاند. پۆمپەیۆ ترەمپی لە دوایین سەردانی بۆ عێراق ئاگادارکردەوە، کە ترەمپ بێ دوودڵی ناوی بوش ٤٣-ی هێنا و گوتی: "هەڵەکانی حکوومەت". خراپترین سەرۆکە کە ڕووبەڕووی بووینەتەوە. هەروەکو هەموو جارەکانی تر لە گفتوگۆکان سەبارەت بە ئێران، ترەمپ جۆن کێری تووڕە کرد. ئەمەش کارتێکی زۆر باش بوو بۆ ئەوەی بەکاری بهێنێت لە دژی کێری بۆ ئەوەی دادگایی بکات بە بیانووی ئەوەی یاسای لۆگانی پێشێل کردووە، زۆر بە دەگمەن پەنا بۆ یاسای (یاسای لۆگان)١٧٩٩ دەبرێت کە دانوستان لەگەڵ حکوومەتە بیانییەکان لە هاووڵاتیان قەدەغە دەکات. بێگومان، کێری هەوڵی مانەوەی ئێران دەدات لە ڕێککەوتنە ئەتۆمییەکەی و تا ساڵی ٢٠٢٠ چاوەڕێی ترەمپ دەکات، ئەو کات بەدڵنیاییەوە دیموکراتییەک لە هەڵبژاردنەکان دەباتەوە و سەرۆکایەتی بەدەست دێنێت. ئەوکاتە دادگاییکردنەکە بوونی نابێت. یاسای لۆگان پێشێلی گۆڕانکارییەکانی یەکەم دەکات و یاسای سزادان، بە نادیاری و بەشێوەیەکی نادەستووری بەتاڵ بووەتەوە، کەچی تائێستاشی لەگەڵدا بێت بۆ ترساندنی کەسانی بێئاگا بەکاردێت. لە بیروهۆشی ترەمپ، مایک فلین، ڕاوێژکاری یەکەمی ئاسایشی نەتەوەیی، بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە هەڕەشەی دادگاییکردنی لێ کرا، کە خاڵێکی دادپەروەرانە بوو کاتێک ویستی لە دژی کێری بەکاری بهێنێت. دوای کۆبوونەوەکەی ئۆڤاڵ، ترەمپ داوا لە جێگری گشتی ولیام بار یان هەر کەسێک گوێ لە دەستپێکردنی بانگکردنەکە بگرێت، دەکات. من دڵنیام هیچ کەسێک شتێکی لەو شێوەیەی ئەنجام نەدا. هەر لە زووەوە هەوڵم دا ئەوە بۆ ترەمپ ڕوون بکەمەوە کە ئەگەری ڕاگەیاندنی یاسای لۆگان هەیە، وەکو یاسایەکی نادەستووری ئەگەر بێتوو لە دادگا تاقی بکرێتەوە، بەڵام لەمەدا بە تەواوی شکستم هێنا. تا ترەمپ سەرۆک بێت و لەوانەیە

دواتریش هەر خۆی بێت، هەردەم بەدوای پارێزەرێک دەگەڕێت بۆ دادگاییکردنی کێری. ئەگەر لەجیاتی کێری بام، هیچ نووستنێکم لەسەر ئەم جێیە نەدەفەوتاند.

بە گەڕانەوە بۆ واقیع، دەنفۆرد پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە ئێران باوەڕ بەوە ناکات ئێمە وەڵاممان بۆ ئەو هەڕەشانە دەبێت کە بیریان لێ دەکردەوە ئەنجامی بدەن. یەکسەر ترەمپ وەڵامی دایەوە: "ئەوان باش لە ئێمە ناگەن". دەربارەی چەندین بژاردەی سەربازی و شتی تر قسەمان کرد، بە دڵنیاییەوە ترەمپ دووبارە هاتەوە سەر کێری: "من سەرم سوڕماوە کە ئەوان پەیوەندی ناکەن. ئەوە هەمووی بەهۆی کێرییە". وام لێ دەکات خراپ دەربکەوم. " ئێمە دەیبەینەوە". دەنفۆرد و ئەوانی تر سەریان سوڕما و منیش یەکێک بووم لەوان، بەهۆی ئەو گەشبینییەی هەیانبوو، ترەمپ لە سەروبەندی لێدانی چەند ئامانجێک بوو کە پێشتر لەگەڵ دەنفۆرد پێشنیارم کردبوو، بە ڕاستوڕەوانی دەنفۆرد بە ترەمپی گوت: "پێویستە بۆ هەنگاوی دواتر ئامادەبیت". ترەمپ وەڵامی دایەوە: "من ئامادەم". "سەرۆک کیم چاودێری دەکات. ئێوە [شەنەهان و دەنفۆرد] بیر لە بونیاتنانی بکەنەوە". دەنفۆردیش وەڵامی دایەوە: "لەبەر ئەم هۆکارە ئێمە لێرەین ئەی سەرۆک"، وردەکارییەکانمان پێ بدە، تا بزانین چی پێویستە.

ترەمپ لەسەر خەرجییەکان بەشێوەیەکی ڕەها ڕازی نەبوو، بەڵام گوتی کە دەیەوێ عەرەبێکی هاوپەیمان ئەو باجە بدات، دوای ئەوەی گفتوگۆمان کرد سەبارەت بە کۆریای باکوور و ڤەنزوێلا و ئیسرائیل و سووریا و هەندێک وڵاتی تر و هەندێک بابەتی تر، کۆبوونەوەکە بەکۆتا هات. گەڕامەوە بۆ نووسینگەکەم، چەندین کەس لەوانەی بەشداری کۆبوونەوەوەکەیان کردبوو لە دەرەوە درێژەیان بە بابەتەکان دابوو. لە شەنەهان و دەنفۆردم پرسی کە ئایا ئەوان چییان پێویستە کە لە ترەمپدا هەبێت، زۆر بەڕوونی دیاربوو کە ئەوان دەیانزانی ترەمپ چی دەوێت،

ئەویش ئەو شتە بوو کە من بینیم، هەوڵدانێکی کارای پێچەوانەی ئەو هەوڵەی کە ماتیس دەیدا.

لە کاتێکی زووی ١٢ی مانگی مایس لە ڕۆژی یەکشەممە، ژووری دانیشتنەکان پەیوەندییان پێوە کردم بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو بارهەڵگرە نەوتەم پێ ڕابگەیەنن کە لە گەرووی هورمز تووشی جۆرێک لە هێرش بووەتەوە و ناتوانرێت بوەستێنرێت. نزیکەی چوار کەشتی هێرشیان کرابووە سەر. بە ژووری دانیشتنەکانم ڕاگەیاند کە ئاگاداری کووپەرمان و ئەوانی تر بکەنەوە ئەگەر هیچ شتێکتان ئەنجام نەدا.

گەرماوێکم کرد و جلی خۆم گۆڕی، وردەکارییەکانی خزمەتگوزارییە نهێنییەکانی کۆشکی سپیم لابوو. کەمێک دوای کاتژمێر پێنج لەناو ئۆتۆمبێل پەیوەندیم بە دەنفۆردەوە کرد، گەیشتم بەوەی کە ئەویش گەیشتووە بە هەمان ئەو زانیارییانەی کە من پێی گەیشتبووم. دەوروبەری کاتژمێر پێنج و بیست خولەک گەیشتمە باڵی ڕۆژئاوای کۆشکی سپی، دان کۆوتس یەکسەر پەیوەندی کرد بۆ ئەوەی دڵنیام بکاتەوە کە ئەویش لە هەواڵەکە ئاگادارە. لەو کاتەی باوەشم بە دەنفۆرددا کرد، گوتی تەنها یەک بارهەڵگر گڕی گرتووە و هیچ کامیشیان پێ ناچن موڵکی ئەمریکا بن یان بەناوی ئەوەوە تۆمار کرابن. بە دەنگێکی بەرز پرسیارم کرد، ئایا ئێران دەیەوێت بە ئەنقەست ئەمریکا تاقی بکاتەوە لە ڕێگەی هێرشکردنە سەر شتگەلێک کە لە بنەڕەتدا ئەمریکی نین. دەنفۆرد گوتی کە ئەو پێی وایە بەدڵنیاییەوە هاندانەکەمان بەشێکە لە ستراتیژییەتی ئێران. کات هێشتا زوو بوو و زانیارییەکان ناتەواو بوون، بەڵام ڕووداوێکی گەورە بێ شک ئاشکرا دەبوو. دوای چەندین پەیوەندیی تەلەفۆنی تر، بۆ ژووری دانیشتنەکان دابەزیم، کە فەرمانبەرەکان سات دوای سات گشت داتا بەردەستەکانیان کۆدەکردەوە، هەروەها ئایا کووپەرمان لە کوێ بوو پێش گەیشتنی. ئێستا زانیمان کە ئەو کەشتییەی ڕووبەڕووی هێرش بوویەوە

دەکەوتە کەنداوی عومان نزیک بەندەری فوجەیرەی ئیماراتی. هەتا ئەو کاتیش زانیارییەکان پچڕ پچڕ و پڕ لە کەموکووڕی بوون، وەکو هەواڵی ئەو تەقینەوانەی لە خودی بەندەری فوجەیرە ڕووی دابێت، کە هەر ئەو کات حکوومەتی خۆجێیی شارەکە یەکسەر ڕوونکردنەوەی دا و گوتی کە ئەم هەواڵە ڕاست نییە. ئەگەر هەبوو یەکێک لە بارهەڵگرەکان نەرویجی و دوویان سعودی و یەکێکی تریشیان ئیماراتی بێت، هێرشەکان یان لەلایەن ئەو چەتانە بوو کە لە ڕێی لوغمی بچووك کە بە بەختەکانیانەوە بەستبوو، یانیش لە ڕێگەی ئەو مووشەکە کورتمەودایانەی کە لەلایەن بەلەمە ئاوییە بچووکەکان هاوێژرابوون ئەنجام درابوو. لە کۆتایی ڕۆژی یەکشەممە، لەلایەن هێزە تایبەتە ئەمریکییەکان، ئەوە پشتڕاست کرایەوە کە ئەم هێرشە کاری چەتەکان بووە.

لە دەوروبەری کاتژمێر ٦:١٥ بەیانی، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە کاتی پەیوەندیکردنە بە ترەمپ. هەرچەندە ئەمە دووەم جار بوو لە ماوەی دوو هەفتەدا کە بە ئاگای بێنم (جاری یەکەم ئەو کاتە بوو کە ڕاپەڕینەکەی ڤەنزوێلا لە ٣٠ مانگی ئەپریل ڕووی دا)، بۆیە بڕیام دا بۆ پێشەوە هەنگاو بنێم، ئەوەی بەدەستمان هێنابوو لە زانیاری پێم ڕاگەیاند، پرسیاری لێ کردم: "چی پێویستە لەسەرمان تاکو ئەنجامی بدەین؟"، گوتم ئێمە بەردەوام دەبین لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان و بە ئاگا دەبین بۆ هەر هێرشێکی چاوەڕوانکراو کە لەلایەن دوژمنەکانمانەوە بێت، هەروەها بیرکردنەوە لەوەی کامە هێرش پێویستی بە وەڵامدانەوەی سەربازی هەیە. دووبارە پرسیاری کرد: "ئەی بۆچی دەربارەی ئەمەوە نازانین؟"، وا دەردەکەوت کە ئەو بڕوای وابوو ئێمە هەموو شتێک دەزانین. ئەمەم بۆ ڕوون کردەوە کە ئێمە چەندین جار ئەم کارەمان ئەنجام داوە و هیچ شتێکمان دەربارەیەوە نەزانیوە، بۆیە بەردەوام دەبم لە چاودێریکردنی بابەتەکە. (لە کاتێکی تری هەمان ڕۆژ، بە گفتوگۆکردنی لەگەڵ پۆمپەیۆ،

ترەمپ جارێکی تر دەپرسێت بۆچی ئێمە لەپێشدا ئەم هێرشکردنەمان نەدەزانی).

چەند نامەیەکم بۆ مولفانێ کە لە کامپ دەیفید لەگەڵ ماڵ و ئەندامەکانی ئەنجوومەنی پیران بەشێوەی جۆرێک لە کشانەوە پێشکەش کرد، هەروەها هەلم بۆ ڕەخسا بۆ ژووری دانیشتنەکانی باڵیۆزخانەی ئۆسلۆ و باڵیۆزخانەی ئەبوزەبی و ڕیاز بۆ ئەوەی هانیان بدەین و ئەو بابەتانەش بدرکێنن کە دەیزانن. بیرکردنەوە کاتییەکەم ئەوەبوو کە ئەم سێ حکوومەتە کۆبوونەوەیەکی ئاسایشی بەپەلە ڕێک بخەن بۆ ئەوەی تیشک بخەنە سەر ئێران.

لە دەوروبەری کاتژمێر ٦:٢٥ قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد و لەسەر چۆنییەتی کارکردنەکە ڕازی بوو. لە کاتژمێر حەوت و نیو پێنس پەیوەندی کرد و پێم ڕاگەیاند، دوای ئەوەی داوام لە کووپەرمان کرد کۆبوونەوەیەکی لێژنەی نوێنەرەکان ڕێک بخات لە کاتژمێر ٨:٠٠ بەیانی بۆ دیاریکردنی چۆنییەتی کارکردن لەسەر یەکەم وەڵامدانەوەمان لە ڕۆژی یەکەم لەو سێ ڕۆژانە. چەندین ئاژانس پێیان وابوو کە ئەمە ڕۆژی یەکشەممە ئەنجام دەدرێت. لە دەوروبەری کاتژمێر ٨:٠٠، زانیارییەکان هێشتا پچڕ پچڕ بوون. سعودییەکان بەهۆی چەند هۆکارێکی خۆیان، لە سەرەتادا نکۆڵییان لە ڕوودانی هیچ هێرشێک کرد، بەڵام لە دواتردا پێچەوانەکەیان گوت. لە کاتێکدا لەنزیکەوە سەیری زیانەکانی هاوپەیمانەکانمان دەکرد، چەند ئۆپەراسیۆنێکی چەواشەکارانەی ئێرانی کە دژی ئێمە ڕێکخرابوون، زۆر بە وردی چاودێرییان دەکردین. لە ٨:٤٠، بەخێرایی لە سێ کاتی جیا قسەم لەگەڵ دەنفۆرد کرد. تا ئەم کاتە، وێنەی کونی لایەکی یەکێک لە کەشتییە بارهەڵگرەکانمان دەستکەوتبوو کە دەستەی ناو کەشتییەکە وێنەیان گرتبوو، کە زۆر بەڕوونی گوتیان کەوا ئەم هێرشە هۆکارەکەی فرۆکەی بێفرۆکەوان نەبوو. دووبارە لە کاتژمێر

٨:٥٠ دەنفۆرد پەیوەندی کردەوە و گوتی: هاوپەیمانەکانمان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە گوێمان لێ بووە، بەڵام هەوڵە چەواشەکارییەکانی ئێران هەر لە زیادبووندا بوو، پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە حەوت بۆ دە کەشتی گریان گرتووە و چەند فڕۆکەیەکی ئەمریکی و فەڕەنسیش لەو ناوە هەڵفڕیبوون. ئێران لە بەرامبەر ئەو یارییە شەترەنجەی ئەنجامیان دابوو چاوەڕێی خەڵات بوون، بەڵام هەر خۆشیان ئەوەیان دەزانی کە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی جیهان باوەڕیان پێ ناکەن. من و دەنفۆرد گفتوگۆی ئەوەمان دەکرد کە چی پێویستە بکرێت ئەگەر بێتوو بابەتەکە سەرلەبەری تەنیا بریتی بێت لە پرۆسەی هەژموونی ئێرانی. یەکێک لە هۆکارەکان بریتی بوو لەوەی کە بەدرێژایی ئەو ڕۆژە حکوومەتی ئەمریکی هیچ لێدوانێکی فەرمی نەبوو. زۆر دوودڵ بووین لەو ئۆپەڕاسیۆنەی کە ئێران ئەنجامی دابوو، چونکە دەبووە هۆکاری بەرزبوونەوەی نرخی نەوت بەبێ مەبەست. کاتژمێر ٨:٥٧، جارێکی تر دەنفۆرد پەیوەندی کردەوە بۆ ئەوەی پێم بڵێ کە بەرپرسەکانی پنتاگۆن ئەو ڕووداوەیان لەبیرە کە پێش دە ساڵ ڕووی دابوو کاتێک ئێران هەوڵی دابوو بمانخاتە نێو ململانێی خۆی لە ڕێگەی خستنەڕووی کانیی وەهمی لە بەردەم گریس هوپەر لە تێکشکێنەری کەشتییە ئاراستەکراوەکە، هوپەر زانای کۆمپیوتەر و ئەفسەر بوو لە هێزی دەریایی، ئەرکەکەی بریتی بوو لە شیکردنەوە و شکاندنی هێماکانی دوژمن لە جەنگی جیهانی دووەم و دواتر بۆ پلەی ئەمیرال لە هێزی پاڵپشتی بەرزکرایەوە. بە دەنفۆردم ڕاگەیاند کە چۆن زانکۆی یەیل دووبارە مێژووی نووسییەوە لە ساڵی ٢٠١٧، دووبارە ناونانی کۆلێژەکەم، کالهۆن، یەکەم بڕوانامەی دکتۆرا لە ڕەگەزی مێ هوپەر بەدەستی هێنا لە بواری ماتماتیک. دەربارەی وێنەی تێکشکێنەرەکە پرسیارم لێ کرد کە لە ژووری هاوبەشی کۆلێژ هەڵواسیبوو، گوتی بزانم ئەمە بەدڵی ئەندامە چەپەکانی دەستەی وانەگوتنەوە و قوتابییەکان دەبێت. بەلایەنی کەم شتێک هەیە کە بمانخاتە پێکەنین لە ڕۆژێکی وا خەمباردا.

سەبارەت بە هێرشی زیاتر لە دڵەڕاوکێدا بووین، بەتایبەتی بۆ سەر باڵیۆزخانە و کونسوولخانەکانمان. کەمێک دوای نیوەڕۆ، دووبارە پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد، تەنیا بۆ ئەوەی بزانێت کە پەیوەندیم کردووە، دواتر بۆم دەرکەوت کە ترەمپ بۆ ئەو ئاراستەیە هەنگاو دەنێت کە بڕوا وابێت بە هیچ شێوەیەک هیچ هێرشێک ڕووی نەداوە، بۆیە هەوڵم دا بە وردی ئەوەی بۆ ڕوون بکەمەوە کە گوێمان لێی بووە، پێشی ڕابگەیەنم سەرەڕای ئەوەش گەڕانمان بۆ ڕاستییەکان و لێکۆڵینەوەکان هەر بەردەوامە. بە تێپەڕبوونی کات، زانیارییە بەدەستهاتووەکان زۆر کەم بوون، لە دەوروبەری کاتژمێر ٤:٤٥ ئێوارە، دەنفۆرد بە پنتاگۆنی ڕاگەیاند کە ئەو زیانانەی بەر چوار کەشتییە بارهەڵگرەکان کەوتوون زۆر کەمن و لەسەر داوای وڵاتی ئیمارات، ڕۆژێکی تر تیمێک بۆ فوجەیرە دەنێرین و لە شوێنی ڕووداوەکە و لەناو دەریادا زیانەکان هەڵدەسەنگێنن. دوایین جار لە کاتژمێر ٥:١٥ پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد، بۆ ئەوەی ئەو شتانەی پێ ڕابگەیەنم کە دەیزانین و بەرچاومان دەکەوێت، هەروەها بینیمان کە پێویست ناکات هەموو شتێکیش بە ئاشکرا بڵێین تاوەکو بەتەواوی بابەتەکە دەزانین. یەکسەر گوتی "بەڵێ"، "کلیلی بدە، هیچ شتێک مەدرکێنە"، دەیویست باجی هەر ئۆپەراسیۆنێک بە عەرەبەکانی کەنداو کە ئەنجاممان دەدا سەرلەنوێ بدات، هەروەکو بەشی خۆمان لە نەوتی عێراق بڕد دوای ڕزگارکردنی لە ساڵی ٢٠٠٣. لە کۆتایی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەدا ترەمپ گوتی: "سوپاس جۆن، خوات لەگەڵ"، کە ئەمە ئاماژەی بە ڕازیبوونمان دەدا لە پێگەکەمان. دەوروبەری ٥:٣٠ ئەوێم جێ هێشت و بۆ ماڵەوە گەڕامەوە. لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییە کورتەکەی ترەمپ کە نیوەڕۆ ڕێکخرابوو، یەکسەر پرسیاری کرد: "بۆچی قسە ناکەن [ئێرانییەکان]؟"، ئەو هەرگیز باوەڕی بەوە نەدەکرد کە ئێرانییەکان نایانەوێ قسە بکەن، ئێستاشی لەگەڵ بێت من باوەڕم وایە کە من و پۆمپەیۆ

هەوڵەکانی ئەوانمان بۆ قسەکردن لەگەڵ ترەمپ لەبار برد. بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی کە دەمانزانی، زۆر بەسادەیی هیچ شتێک نەبوو کە ئاماژە بەوە بکات کە ئێران گرنگیی بە قسەکردن لەگەڵمان دەدات. ترەمپ لە جاران زۆر بەهێزتر بوو، چونکە دەیویست وڵاتە عەرەبییە بەرهەمهێنەکانی نەوت هەموو ئەو باجانە بدەن بۆ هەر شتێک کە ئەنجامی دەدەین. دوای تاوتوێ کردنی ئەو مەترسییانەی کە فەرمانبەرەکانمان لە عێراق ڕووبەڕووی دەبوونەوە، ترەمپ لە شکستەکەی لە سووریا زۆر ناڵاندی، ئەوە لە ئەفغانستان و پاشان عێراقیش گەڕێ کە خۆمان لەوێش بووین. "پۆمپەیۆ پەیوەندی بە ترەمپ کرد و پێی گوت کە بەنغازی لەبیربێت"، لەلایەکی تر، ترەمپ زۆر ڕاشکاو بوو، هەروەک من دواتر لەگەڵ شەنەهان ڕاشکاو بووم کە ئەو (ترەمپ) دەیەوێت وەڵامێکی زۆر توندمان هەبێت ئەگەر هاتوو لە هەر شوێنێک ئەمریکییەک کوژرا، ئەمەش شتێکی زۆر باشتر بوو لە "ڕەخنەگرتنی یەکتر".

یەکێک لە بابەتە گرنگ و پەیوەندیدارەکان بە تواناکانی ئێران، بریتی بوو لە بەرنامەی مووشەکە بالیستییەکان. تاقیکردنەوەکان لە ۲۰۱۸ و ۲۰۱۹ بەردەوام بوون، سەرەڕای هەبوونی چەندین شکست لە تاقیکردنەوەیان، لە کاتی هاوێشتنەکان یان کەمێک دوای ئەوە. سەرەڕای ئەوەی ئێمە پشووێکمان وەرگرت بەهۆی شکستەکەیان، بەبیرم دێت، لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، زانا ئەمریکییەکان وایان خستەڕوو کە هەریەکە لە مووشەکەکانی ڤانگارد و جوپیتێر-سی بە ڕێژەی "٩٠%بە سەرکەویی دەتەقنەوە". لەم شکستانە فێربوون و ئەزموونیان لە تەقاندنەکان وەرگرت. بە دڵنیاییەوە لە ئەنجامی بەردەوامی تاقیکردنەوەکانی ئێران و پێشکەوتنەکانی، هەڕەشەکان لە ناوچەکە بەرەوپێش دەچن و لەکۆتاییشدا هەڕەشەکە بۆ سەر هەموو جیهان گەورەتر دەبێت. بەڵام بابەتەکە بە سادەیی وەرگیرابوو، سەرەڕای هەوڵە یەک لە دوای یەکەکان، دەتوانم وا

لە ترەمپ بکەم بەشێوەیەکی ستراتیژی سەیری بکات. سەرەڕای شکستی تاقیکردنەوەی ئێران لە هەڵدانی مووشەکی سەفیر، لە ٣٠ مانگی ئۆگەست، ئەم تویتەی بڵاوکردەوە:

ئەمریکا بەشداری لە ڕووداوی کارەساتباری خۆئامادەکردنی کۆتایی بۆ مەبەستی هەڵدانی مووشەکی Safir SLV لە یەکەم شوێنگەی هەڵدانی لە ئێران نەکردووە. هیوای بەختێکی باش بۆ ئێران دەخوازم، بە تایبەتی لەوەی کە لە شوێنگەی یەکەمدا ڕووی دا.

ئەمە حاڵی تەتەڵەکردنی زمانە لە هەندێک کاتدا، چونکە لە ناوەڕۆکدا ئاماژەی بە پێچەوانەی ئەو شتە دەکرد کە لە تویتەکەدا باسی کردبوو. هەروەک دواتر ترەمپ گوتی: "دەمەوێ سێکسیان لەگەڵ بکەم". ستراتیژیەتێکی گەورەتر.

لە کاتێکی زووی ڕۆژی سێشەممەی ١٤ی مانگی مایس، زانیمان ئێران لە شەو و ڕۆژێکدا دووبارە هێرشی کردووەتەوە، لە دوو وێستگەی دەرکێشانی نەوتی هێڵی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای شانشینی عەرەبی سعودی دابوو، سەرەڕای ئەوەی پێ دەچوو حوسییەکانی یەمەن ئەمەیان ئەنجام دابێت، هەندێک بڕوایان بوو کە هێرشەکە لەلایەن میلیشیا شیعییەکانی عێراقەوە کراوە، لە هەردوو بارەکەدا هێرشەکە بە فیتی ئێران و لەژێر کۆنترۆڵی ئەو ئەنجام دراوە. ئەم جارە، سعودییەکان زۆر بە خێرایی و بە ئاشکرا هێرشەکەیان ڕاگەیاند، بۆیە دەوروبەری کاتژمێر هەشت و نیو پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد. بە لەسەرخۆیی کاردانەوەی هەبوو، بەڵام سەبارەت بە ئێران گوتی: "ئەگەر ئەوان لە ئێمەیان دا، ئێمەش توندتر لێیان دەدەین، دەتوانم ئەوەتان پێ بڵێم."

لەوکاتەی ترەمپ کۆشکی سپی جێ هێشت و چوو بۆ لویزیانا بۆ کردنەوەی کارگەی هەناردنە دەرەوەی گازی سروشتی (گۆردۆن

سۆندلاند و بە هەڕەمەکی بەشێک لە ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا یاوەرییان دەکرد، سۆندلاند مولڤانیژ ڕازی کردبوو کە ئەو لە هێزی ئاسمانی یەک بێت)، بەشێک لە ڕۆژنامەوانان پرسیاری ئەو ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەیان کرد کە باس لەوە دەکات پێویستە ئەو (ترەمپ) پلان دابڕێژێت بۆ ناردنی ۱۲۰۰۰۰ سەربازی نوێ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ترەمپ وەڵامی ئەمەی دایەوە و گوتی: ئەمانە "هەواڵی ناڕاست بوون"، پاشان گوتی: "ئەگەر ئەوەمان ئەنجام دا، خەڵکی زیاتر دەنێرین بۆ دۆزەخ، هێزی زیاتر دەنێرین. لەو کاتەدا، هەتا دیموکراتەکانیش خەریک بوو دوودڵ دەبوون لە قەبارە و چۆنییەتی هەڕەشەکانی ئێران کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوون. ڕای گشتی دوای "ڕۆیشتنی ڕێکخراوەکە"، بوو بەهۆی زیادکردنی زیاتر لە سەت فەرمانبەری ناسەرەکی لە باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە بەغدا.

ڕۆژی دواتر، لە کاتژمێر نۆ و نیوی بەیانی، ترەمپ سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی ئاسایشی نەتەوەیی کرد بۆ ئەوەی هەستێکی باشتری هەبێت بۆ بیرکردنەوە. چەند جارێک دەنفۆرد و شەنەهان هەستیان بەوە کرد کە ترەمپ لە دەرکردنی بڕیارێکی ڕاستەوخۆ و بەپەلە دوورتر دەڕوانێت و دەیەوێت زیاتر لەو ڕێگایەی لەبەردەمی دایە ببڕێت. شەنەهان گوتی ئەوان دەیانەوێ هەڵسەنگاندن بۆ بەرگەگرتنی مەترسییەکان بکەن لەلایەن ئەوەوە، ترەمپ وەڵامی دایەوە: "توانایەکی ڕادەبەدەرم لە مامەڵەکردن لەگەڵ مەترسییەکان هەیە کە باوەڕ ناکەن. سەرکەشی شتێکی خۆشە". دواتر وتارێکی سەبارەت بە بیروڕاکانی لە ڕەوشی عێراق خستەڕوو؛ بۆچی ویستی لە سووریا بێتە دەرەوە؟ بۆچی، هەروەکو لە شوێنێکی تریش گوتی: هەروەکو لە حاڵەتی عێراق، پێویستە نەوتی ڤەنزوێلا بۆ خۆمان ببەین دوای ئەوەی مادۆرۆمان لەسەر حوکم لادا؛ بۆچیش پێی وایە کە چین "فێڵبازی هەرە گەورەی جیهانە؟" هەروەکو چۆن لەو کۆتاییانە لەڕێی دانوستانە بازرگانییەکاندا دەرکەوت، هەروەها

خێراکردنی پرۆسەی خنکاندنی بازرگانی وەکو بنەمایەک بۆ هێزی سەربازی. ئەمە بووەهۆی وروژاندنی بابەتی کەشتییە بارهەڵگرەکان، هەروەها وتارێکی تر دەربارەی ئەوەی کە چۆن سیستەمە هەڵمییەکان بۆ بەرزکردنەوەی فڕۆکەکان و هاتن و چوونیان لەسەر گۆڕەپانی کەشتییە فڕۆکە هەڵگرەکە زۆر پێشکەوتووتر و سەرکەوتووترە بەسەر ئەو سیستەمە ئەلیکترۆنییانەی کە بەشێوەیەکی باوەڕپێنەکراو بەکاردەهاتن، ترەمپ گوتی: (خوێندنەوەی شکستخواردووەکان) کە خەرجییەکەی زۆر گران بوو (جێرالد فۆرد-١٦ ملیار دۆلار)، تا ئێستاشی لەگەڵ بێ بە تەنیا خەریکی هەڵسەنگاندنی تێچووی ڕاستەقینەن؛ نامەوێ ڕاستییەکانی تێچوونی دەرچەکە، بشارمەوە، سەرەڕای ئەوەی دەریاوانەکان خۆیان دەڵێن دەتوانن سیستەمی هەڵمەکە چاک بکەنەوە بە تەنها لێدانی دارێک، بەڵام ناتوانم لە چۆنییەتی چاککردنەوەی ئەلیکترۆنی بگەم. هەمان لۆجیک بەسەر بەرزکەرەوە هەڵمییەکانی یارمەتیدەر بۆ بەرزکردنەوەی فڕۆکەکان جێبەجێ دەبێت، کە ترەمپ ویستی دووبارە لەسەر هەموو ئەو کۆمپانیای گواستنەوانە بسەپێنێت کە بۆ سیستەمی پێشکەوتووتر هەنگاویان هاوێشتبوو. لەناکاو هاسپێل لە ئاژانسی سیخوڕیی ناوەندی هاتە ژوورەوە و دەستی کرد بە قسەکانی و شەمەندەفەری ترەمپی لە ڕێرەوەکەی وەستاند. بێگومان ناتوانم وەسفی ئەوە بکەم کە چی گوت، بەڵام هەر یەکێک لە ئێمە ئەو بابەتانەی هەژمار کرد کە ئەو ئاڕستەی کردین. جۆن سۆلیڤان، لە غیابی پۆمپەیۆ، کشانەوەی فەرمانبەرانی باڵیۆزخانەی بەغدای باس کرد، کە بووەهۆی تەقینەوەی ترەمپ بەسەر عێراق و ئەفغانستان. ترەمپ گوتی: "لە بابەتە نەفرەتییەکە دەربچن"، کە من وام دەبینی مەبەستی هەردووکیان بێت، عێراق و ئەفغانستان، سەرەڕای ئەوەی بەرلەوەی بزانین لە چ کاتێک ترەمپ پرسیار دەکات، " تاکەی لە سووریا دەرنەچین جگەلە چوارسەت [سەتیان لە تەنف و "چەند سەتێکیشیان لەگەڵ هێزی جۆراوجۆر بۆ چاودێریکردن]؟"

"چەند مانگێک دواتر" دەنفۆرد وەڵامی دایەوە.

ترەمپ بەردەوام بوو و ئاماژەی بەوەکرد کە "عێراق گرنگی بە ئێمە نادات"، ترەمپ بەردەوام بوو، بە کونسوولی هەولێری گوت: "دەرگا دابخە و دواتر بڕۆ"، پاشان گوتی: "ئەو کەشتی فڕۆکە هەڵگرانە (لینکۆڵن) دیمەنێکی جوان بوون". لەوانەیە بیری لە دەریاوانەکەی ترەمپ لە سوپا و ژەنەراڵ مارك مەیلی کردبێتەوە کە لە یەکی ئۆکتۆبەر بڕیار وایە جێگای دەنفۆرد بگرێتەوە. ترەمپ پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا پێویست دەکات مەیلی بانگ بکەین بۆ کۆبوونەوەکانی ئاسایشی نیشتیمانی و دواتر گوتی بڕیارەکە دەخاتە دەست دەنفۆرد، بیرۆکەکە زۆر هەڵە بوو. دانیشتنی هەر یەکێکمان لەسەر کورسییەک و لە خاڵێکی دیاریکراو، کە هەر یەکێکمان خاڵی دەستپێکردن و خاڵی کۆتایی هەیە لە ئەرکەکەی. هیچ کەسێک بە مەیلیشەوە، کە دواتر ئەم بابەتەم لەگەڵی گفتوگۆ کرد، پێم وابوو ئامادەبوونی هەردووکیان تاکو قۆناغی گواستنەوە بیرۆکەیەکی باشە. دەنفۆرد بە هاوسەنگی وەڵامی دایەوە، "هەر کاتێک تۆ حەز بکەیت دەرۆم ئەی سەرۆک، کە لە چانسی ئەو ترەمپ پشتگیریی قسەکەی کرد. ( بەشێوەیەکی تایبەت دوای کۆبوونەوەکە بە دەنفۆردم گوت، هیچ پێویست ناکات کۆبوونەوەکان جێ بێڵیت تا کاتی تەواوبوونی ماوەکەت، یان مەیلی ئامادەی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بێت تا کاتی گونجاو. دەنفۆرد بێ دەنگ بوو، بەڵام جێگای سەرسوڕمانم نابوو ئەگەر هاتبا و ئینجێک دووربا لە بەئاگاهاتنی و دەرچوونی لە ژووری دانیشتن بۆ هەتا هەتایە).

دوای خەیاڵییەکەی لینکۆڵن، ترەمپ بۆ کۆپییە کورتەکەی جۆن کێری و یاسای لۆگان چوو: "ئێرانییەکان تەنها لەبەر هۆکاری جۆن کێری قسە ناکەن" هیوای دەخواست، بەڵام شەنەهان کە دەیدی چۆن هاسێل سەرکەوتوو بووە لە فەرامۆشکردن و خۆ دوورخستنەوە لە ترەمپ، باسی

لە شتی بێزارکەری وەکو سەرکەشیکردن و زۆری خەرجی و کاتی ئەنجامدانەکە کە پەیوەندی بە هەموو ئەو بژاردە جیاوازانەی بیرمان لێیان دەکردەوە هەبوو، لەنێویشیاندا بەکارهێنانی هێز. ترەمپ دەستی پێ کرد: "باوەڕم وانییە کە لەسەریان پێویست بێت دەست بە بنیاتنانی چەکی ئەتۆمی بکەنەوە". کاتێک دەنفۆرد هەوڵی دا کە ئەو کاردانەوەیە دیاری بکات کە پێویست بوو دژی هێرشەکەی ئێران ئەنجام بدرێت، ترەمپ گوتی کەوا عەرەبەکانی کەنداو دەتوانن خەرجییەکە بدەن. دەنفۆرد هەر بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە ترەمپ ڕازی بکات تیشک بخاتەسەر ئەو بژاردە دیاریکراوانەی بە درێژایی پێپلیکانەی وەڵامە ئەگەرییەکان لەبەردەست بوون، بەڵام بە ڕێگایەک لە ڕێگاکان، بەلای باشووری ئەفریقیا شکاینەوە کە ترەمپ دربارەی چارەسەری سپی پێستەکانی ئەوێ گوێی لێبوو، پشتڕاستی کردەوە کە ئەو دەیەوێ مافی پەنابەریتی و هاوولاتیبوونیان پێ ببەخشێ، دواتر گفتوگۆکە لەسەر ئامانجەکان وەستا، کە زۆربەیان ڕازیکەر بوون. لە بەدبەختی، بابەتی پرسیارکردنی دەربارەی ئەو هێزە ئەمریکییانەی لە عێراق ماونەتەوە هاتەوەبیر: "بۆچی دەریاننەهێنین؟ لە سووریا لە کێشەکان ڕزگارمان بوو". ئەو قسانەی کە دواتر گوێم لێ بوون تووشی شۆکی کردم، بەڵام زۆر بەڕوونی بیرمە کە پێی گوت: "گرنگی بەوە نادەم کە داعش بۆ عێراق بگەڕێتەوە". دەربارەی ئێران، گفتوگۆ سەبارەت بە ئەگەری ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەگیرێتەبەر تاوتوێ کرا، بەڵام دوای ئەوە گەڕاینەوە بۆ سەر بابەتی ئەفغانستان، ترەمپ گلەیی لەو بڕە پارەیە کرد کە بە سەربازەکانی سوپای حکوومی ئەفغانستان دەدرێت، هیچ گرنگی پێ نەدا کاتێک شەنەهان گوتی کە تێکڕای تێچووی ڕۆژانەیان نزیکەی ١٠دۆلارە.

هەفتەیەک دوای هێرشی سەر چوار کەشتییە بارهەڵگرەکە، لە ١٩ی مانگی مایس، ژووری دانیشتنەکان لە کاتێکی زووی دوای نیوەڕۆ

پەیوەندییان پێوە کردم بۆ ئەوەی ڕاپۆرتی تەقینەوەکەیان بۆ بگوازمەوە، لەوانەیە پەیوەندیکردنەکە بۆ بابەتی کەوتنەخوارەوەی ئەو مووشەکە کاتیوشایە بێت، کە لە باخچەی زەوری لە بەغدا بێت و تەنیا کیلۆمەترێک لە باڵیۆزخانەکەمان دوور بوو، پەیوەندیم بە دەنفۆرد، دواتر بە پۆمپەیۆوە کرد، هیچ ستێکم لێیان گوێ لێ نەبوو، بەڵام هەموومان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە هاوێشتنی کاتیوشا لە بەغدا بۆ خۆی هەواڵێکە. دەوروبەری پێنجی ئێوارە، ترەمپ تویتێکی کرد:

ئەگەر ئێران دەیەوێ شەڕ بکات، ئەمە بە فەرمی کۆتاییەکەیەتی. بە هیچ شێوەیەک جارێکی تر هەڕەشە لە ئەمریکا نەکەیت!

لە ڕۆژی دواتر، ترەمپ لە کۆنگرەیەکی سیخوڕی دەربارەی ئەو چیرۆکە "هەواڵانەی" کە داوامان دەکرد گفتوگۆ بکەین لەگەڵ سەرکردەکانی ئێران. پاشان تویتێکی تری کرد:

هەواڵێکی ناڕاست ڕاگەیەنراوێکی نموونەیی بڵاو کردەوە، بێ ئەوەی هیچ زانیاری هەبێت، کە دەڵێت ئەمریکا هەوڵی دانوستان دەدات لەگەڵ ئێران. ئەم ڕاپۆرتە درۆیە... کەوایە ئێران پەیوەندیمان پێوە دەکات کاتێک تەواو ئامادەبوو. لەم نێوەشدا ئابوورییەکەیان بەردەوام دەبێت لە داڕووخان -ئەمە زۆر جێگای داخە بۆ خەڵکی ئێران!-

ڕووحانی خۆی زۆر بە ئاشکرا گوتی: " بارودۆخی ئێستا گونجاو نییە بۆ دانوستان".

پێم وابوو ئێران کارێکی باشتر دەکات کاتێک ترەمپ کەوتە تەڵەی سازشکردن. زۆر بەڕاشکاوی گوتیان کە ترەمپ دەیەوێ گفتوگۆ بکات، بەڵام بە هەبوونی ڕاوێژکارێکی وەکو من تووشی بێهیوایی بوون، یان ترەمپ ئاشتی دەوێت، کەچی ڕاوێژکارەکانی شەڕ، وەکو هەوڵەکەی کیم

جۆنگ ئوون بە جیاکردنەوەی ترەمپ لەوانی تر و مامەڵەکردن لەگەڵی بە تەنیا، ئەمە هەمووی یاری مێشک بوو. دەزگا ڕاگەیاندنە ئەمریکییەکان زۆر بێزارییان کردم کاتێک زۆر بە متمانەوە ئەم دڵنیاییانەی بێگانەکانی دەگواستەوە کە پێیان وابوو شتێکی لۆژیکییە، هەروەها گەورەکردنی پروپاگەندەی هەوڵەکانی پیۆنگ یانگ و تاران. خراپتر لەمەش ترەمپ وا دەردەکەوت کە چیرۆکەکان زۆر بە گرنگییەوە وەردەگرێت. سەرۆکەکانی پێشووتر ئامۆژگارییەکانی ڕاوێژکارەکانیان دەربارەی بابەتی بێگانەکان ڕەت دەکردەوە، بەڵام وا دیارە ترەمپ کاردانەوەیەکی پێچەوانەی ئەوانی هەیە. کارێکی گران بوو کە ئەمە بۆ کەسانی نەناسراو ڕوون بکەیتەوە، بەڵام بۆ کۆشکی سپی ترەمپ زۆر ئاسایی بوو. بۆ نموونە لە ڕۆژی دواتر، بە زمانێکی تاوانبارکردن پێی گوتم: "نامەوێ خەڵک بە ئێران بڵێت کە قسەمان لەگەڵ بکات". وەڵامم دایەوە: "باشە، دڵنیام کە من وا نیم!" ترەمپ دانی پێ دانا: "نەخێر، تۆ وانیت".

لەوکاتەی کە گەشتم کرد بۆ ژاپۆن بۆ یارمەتیدان لە ئامادەکاریی چاوپێکەوتنی ترەمپ لەگەڵ ئیمپراتۆر، شەنەهان و دەنفۆرد چاویان بە ئەوکەوت بۆ ئەوەی گفتوگۆی ئامادەکارییە بەرگرییەکانی هێزەکانمان بکەن لە کەنداو، دواتر پۆمپەیۆ و کووپەرمانیش ئامادە بوون. بەرلەوەی گفتوگۆکە درێژە بکێشێت، ترەمپ پرسی: "کەی لە ئەفغانستانی نەفرەتی دەردەچین؟ کە بتوانرێت هەندێکیان لێرە بەکاربێن [واتە ڕۆژهەڵاتی ناوین]؟" دەنفۆرد ئەوەی ڕوون کردەوە کە هێزەکان لە ئەفغانستان بەهرەی جیاوازیان هەیە. ترەمپ گوتی: "ماتیسی نەفرەتی"، سەرکۆنەی ئەوەی دەکرد کە چۆن یاساکانی بەشداریکردنی داوەتە ماتیس لە ئفغانستان، تا ئێستاشی لەگەڵ بێت شەڕەکەم نەبردووەتەوە. "چ کاتێک لە سووریا دەردەچین؟" ترەمپ بەردەوام بوو. "هەموو ئەوەی ئەنجاممان داوە بۆ پاراستنی ئەسەد بووە". دەنفۆرد هەوڵی دەدا ڕوونی بکاتەوە کە ئێستاشی

لەگەڵ بێت ئەوەی لە سووریا ئەنجامی دەدەین، ئەوانەن کە ترەمپ پێش چەند مانگێک لەسەری ڕازی بووە، کە بووەهۆی ئەوەی ترەمپ پرسیاری ئەوە بکات، کامە لەم دوو هاوڕێ عەرەبانەمان سەربازی باشتری بەرهەمهێناوە. کەمێک سەرسوڕمانی پێوە دیاربوو، دەنفۆرد ویستی بڵێ کامە سەرباز باشترن، بەڵام ترەمپ دوای ئەمە پرسیاری کرد: "ئایا هەموویان بە یەک قەبارە نین؟" بێدەنگی، دواتر دەنفۆرد گوتی جیاوازیی لە کولتووردا هەیە. بەشێوەیەکی تر، گفتوگۆکە دووبارە بۆ ئەو بابەتە گەڕایەوە کە خرابووەڕوو، دواتر ترەمپ لەسەر پێشنیارەکانی پنتاگۆن ڕازی بوو و یەکسەر ڕایگەیاند. سەرەڕای ئەوەی ترەمپ ئەوکاتە پێی نەگوتبووم، داوای لە ئابێ کرد کە پەیوەندییەک لەنێوان ئەمریکا و ئێران پێک بێنێت، ئابێش داواکارییەکەی زۆر بە گرنگی وەرگرت.

بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە کەنداوی عەرەبی، ئەمە کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ ئەو ئاراستەکردنە هەڵەیە، بەتایبەتی کە بۆم ڕوون بوویەوە کە ترەمپ هەوڵی هاندانی ئابێ دەدات بۆ ئەوەی ڕۆڵی گشتی ببینێت کە لەوانەیە کۆتاییەکەی شکست بێت (ئەمە ئەو شتە بوو کە لە کۆتاییدا ئەنجامی دا). ئابێ بیری لەوە دەکردەوە لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیران سەردانی ئێران بکات پێش کۆبوونەوەی ئۆساکا G20، کە وای کرد زیاتر ناوبانگ دەربکات. کاتێک ڕووبەڕووی ئابێ خۆی بوومەوە لە ژاپۆن پێش سەردانی ترەمپ بۆ لای ئیمپراتۆر، ئابێ جەختی لەوە دەکردەوە کە ئەوکاتە سەردانی ئێران دەکات کە ترەمپ خۆی داوای لێ بکات و ئەمەش سوودبەخش دەبێت. ڕوون و ئاشکرایە کە ناتوانم بڵێم وا بیرم نەدەکردەوە کە دەستپێشخەرییەکە بیرۆکەیەکی ترسناک بوو، بەڵام پێشنیاری ئەوەم کرد کە ئابێ بە تەنیا قسە لەگەڵ ترەمپدا بکات و بڕیاری تایبەت بەو بابەتە بدرێت و هەنگاوێک بەرەوپێش بچین.

لەمیانەی سەردانی دەوڵەتمەدار ترەمپ، ئابێ و ترەمپ دەستیان کرد بە کارکردن لەسەری لە ڕۆژی دووشەممە ۲۷ی مانگی مایس، لە کاتژمێر ۱۱ی سەرلەبەیانی لە کۆشکی ئاکاساکا- ژووری ئاساهی نۆ ما، لەگەڵ تەنیا دوو سەرکردە، من و یاچی و وەرگێڕە خێراکان. ئابێ لە ئێوارەی ئەو ڕۆژە پوختەی بابەتەکەی لەگەڵ ترەمپ تاوتوێ کرد، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە لە ۱۲ و ۱۳ی مانگی یۆنیۆ سەردانی ئێران دەکات. لەم خاڵەدا، ترەمپ بەڕاستی خەو بردبوویەوە. لەسەر کورسییەکەی هەرگیز نەکەوت و وا دیاریش نەبوو کە هیچ قسەیەکی لەدەست چووبێت، بەڵام هەروەکو یەکێک لە وتە نەمرەکانم کە لە یەکێک لە مەشقەکانم لە فۆرت بۆلک، بە ئەفسەرێکم گوت: "پێڵوەکانی بپشکنە بزانە کونی تێدا نییە". جەواد زەریف پێش هەفتەیەک لە تۆکیۆ بوو، ئابێ گوتی ئەو بۆی دەرکەوتووە کە ئێران دەناڵێنێ، بەدەست هەستکردن بە قەیرانەکە دەناڵێنێ. هەروەها گوتی کە بڕیاری ترەمپ بۆ ناردنی کەشتی فڕۆکەهەڵگری ئەبراهام لینکۆڵن زۆر کاریگەر بوو. لە سەروبەندی بڕیاردان دابوو بۆ سەردانکردنی ئێران، بەڵام دواتر لەگەڵ هەندێک لە دۆستە عەرەبەکان قسەیان کردبوو زۆر بەتوندی ڕەخنەیان لە بیرۆکەکە گرتبوو. ترەمپ هاتە ناو بابەتەکە بەوەی گوتی پێویست ناکات ئابێ بێزار بێت، چونکە ئەمریکا بەرگری لەوان دەکات، خەریک بوو گوللە بە خۆمانەوە بنێین، کەسیش پێی نەدەگوتین کە چی بکەین. دوای چەندین ڕاگۆڕینەوە، ترەمپ گوتی کە هەڵئاوسان بە ڕێژەی یەک لە ملیۆنە لە ئێران، بەرهەمی گشتیی ناوەخۆ سالب ۱۰ لە سەدایە، وڵاتەکە بەشێوەیەکی زۆر خێرا زیانی بەردەکەوێت. پاشان، بەشێوەیەک لە شێوەکان، ئاماژەی بەوەکرد کە (موون) داوای لێ کردووە لەم گەشتەی سەردانی کۆریای باشووریش بکات، بەڵام ئەو ڕەتی کردووەتەوە.

ترەمپ بڕوای وابوو کە ئێران لە سەرەمەرگدایە و پێویستە لەسەری کە

ڕێککەوتن بکات. دەیویست زۆر بەخێرایی لە ناوەڕاستی ڕێگاکە (پێم وایە مەبەستی لە ڕووی جوگرافییەوە بوو) کۆیان بکاتەوە. سەرەڕای ئەوەی نەیدەویست ئێران ڕیسوا بکات، هیوای دەخواست کە سەرکەوتوو بێت تیایدا، ئەمە ڕوونە کە ناتوانن چەکی ئەتۆمی بەدەست بێنن، کە بە هەموو جیهاندا بڵاوبووەتەوە، ئەمەش ئەو خاڵە بوو کە دوو جار دووبارەی کردەوە، بە ناڕاستەوخۆ بە ئابێ ڕاگەیاند کە پەیوەندی بە ئێرانییەکانەوە بکات و پێیان بڵێت کە دوای ئەوەی ژاپۆن جێ دێڵێت، ترەمپ بەتایبەتی دەیەوێت ئێرانییەکان بزانن کە چیتر نابێت گوێ لە جۆن کێری بگرن.

ئەو پێی وابوو کە دەتوانێت تەنها لە ڕۆژێکدا دانوستانەکان تەواو بکات، کەچی بۆ نۆ تا دوازدە مانگ درێژەی کێشا. بەدڵنیاییەوە، ترەمپ ئامادەبوو بچێت بۆ شەڕ ئەگەر لەسەری پێویست بێت و لەسەر ئێرانیش پێویست بوو کە ئەمە تێبگات؛ ئەگەر ئەمەیان نەزانیبا، هەرگیز بیریان لە ئەنجامدانی ڕێککەوتن نەدەکردەوە. لە دەوروبەری ترەمپ زۆر کەس هەبوون کە دەیانەویست ترەمپ لە شەڕدا تێوەگلێت، بەڵام ئەمە بە هۆکاری خودی خۆی هەرگیز ڕووی نەدا.

بەرهەمەکەی ترەمپ، لە چەند چرکەیەکدا لە دانوستانی ڕۆژێک بۆ شەڕێکی گشتگیر گۆڕا. ئابێ گوتی کە ئەو نامەکەی ترەمپ دەگوازێتەوە، لە کۆتاییدا ئاماژەی بەوەکرد لە کاتی خۆئامادەکردنی بۆ سەردانەکەی ئێران، من و یاشی لەسەرمان پێویستە کە کۆتایی بە پێشنیارەکامان بێنین و ئامادەی بکەین بۆ ئەوەی بە ئێرانی بدەین. ئەمە باشترین هەواڵی ئەو بەیانییە بوو. کارتێکی براوە بوو و پێویست بوو ئابێ بە خێراترین کات واژووی بکات. لەم خاڵەدا، کەمێک پێش نیوەڕۆ، بەشداربووەکانی کۆبوونەوە گەورەکە هاتن، ئابێ دەستی کرد بە کردنەوەی کۆبوونەوەی دووەم بە گوتنی ئەوەی کە کۆبوونەوەکەی ئەو و ترەمپ لەگەڵ ڕاوێژکارەکانی ئاسایشی نەتەوەیی زۆر بەرهەمدار بوو، کە ئەمیش یەکێک لەو ڕێگایانە بوو کە پێویست بوو لێ بڕوانرێت.

لەمیانەی گەشتەکەم لە تۆکیۆ بۆ لەندەن بە مەبەستی سەردانکردنی وڵاتی بەریتانیا، لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا بە مەبەستی پشوودانێک بە تیمەکەم لە ئەبوزەبی دابەزین، کە لە ٢٩ی مانگی مایس، هەلم بۆ ڕەخسا چاوم بە جێنشینی ئیمارات شازادە محەمەد بن زاید بکەوێت، کەوا چەندین ساڵە دەیناسم، لە پاڵیدا شێخ تەنوون بن زاید و کەسانی تریش هەبوون. شازادە چەندین جار دووپاتی کردەوە کە ناتوانێت ئاستی ئەو دڵخۆشییەی دەربڕێت بە سەردانکردنەکەی، ئەوە ئاماژەیەک بوو کە بە هەموو ناوچەی کەنداو بڵاوم کردەوە، ئەو و ئیماراتییەکانیش زۆر دوودڵ بوون لە وەڵامنەدانەوەی بەهانە و شەڕفرۆشتنەکانی ئەم دواییانەی ئێران و خێرا کەڵەکەبوونی مووشەك و فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکانی بەردەستی حوسییەکان و میلیشیا شیعییەکانی عێراق و یارمەتییەکانی ئێران بۆ گرووپی داعش و تاڵیبان لە ئەفغانستان. ئەوانیش بە هەمان شێوە ناتوانن تێبگەن، لە ئابێیان گوێ لێ ببوو کە بۆچی ترەمپ دەیویست گفتوگۆ لەگەڵ ئێران ئەنجام بدات؛ بێهودە بووم کاتێک هەوڵم دا پێیان بڵێم کە بیرۆکەی قسەکردنی ترەمپ لەگەڵ ئێران جگەلە قسەکردنێکی ئاسایی چیتر نەبوو. شازادە و عەرەبەکانی کەنداو بەمە ڕازی نەبوون، لەوەش گرنگتر ئێرانیش بە هەمان شێوە ڕازی نەبوو، هەموو لایەک بە خاڵی لاوازیان دەزانی. (لە ڕاستیدا، دوای گەیشتنم بۆ لەندەن، لەگەڵ ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانی سعودی موساعید بن محەمەد عێبان کە پێشتر یەکتریمان نەبینیبوو، چاومان بەیەکتری کەوت، گوتی دەمەوێ پێت ڕابگەیەنم کە شازادەی جێنشینی وڵاتەکەی محەمەد بن سەلمان چەندە ناڕازی بوو بە ڕۆیشتنی ئابێ بۆ ئێران. هەستم بەوەکرد کە شازادەی جێنشین ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ترەمپەوە کرد، چونکە پێی وابوو کە ئەو بەختی لە من زیاترە)، لەندەنم جێ هێشت هەروەکو ساڵەکانی حووکمی ئۆباما کاتێک سەرکردەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدوای یەکتر پرسیاری ئەوەیان دەکرد کە بۆچی

ئۆباما بیری لەوە دەکردەوە واز لە ئایەتوڵڵا خامنەیی بێنێت، کە داڵدەی تیرۆرستان دەدات و چەکی ئەتۆمی دروست دەکات. دوای سەردانم بۆ بەریتانیا، بەریتانییەکان و دواتر فەڕەنسییەکانیش بەبۆنەی یادی حەفتا و پێنج ساڵەی سەرکەوتن، کە جاری یەکەم لە ٥ی مانگی مەی لە پۆرتسمۆث بوو کاتێک ژمارەیەکی زۆری سوپا لێی دابەزین، دواتر لە نۆرماندی لە ڕۆژی ٦ی مانگی یۆنیۆ بوو ئاهەنگیان گێڕا. دوای ئاهەنگ گێڕانەکانی نۆرماندی، ماکرۆن ترەمپی بۆ خوانیکی نانخواردن داوەت کرد، کە بابەتی ئێران گفتوگۆی سەرەکی بوو. ماکرۆن کاتی دوامۆڵەتی دەستکاری کرد کە ٨ی تەمووز بوو ئەویش "ئاگادارکردنەوەی ئێران بوو بە دانەوەی سوودە ئابوورییەکانی ئەورووپا، ئێران پێی وابوو کە ئەم سوودانە مافی خۆیەتی بەپێی ڕێککەوتنی ئەتۆمی، یان ئەوەتا ئێران لایەنە سەرەکییەکانی ڕێککەوتنەکە پێشێل دەکات. لە بنەماکانی یەکێتی ئەورووپی ئەمە ئاماژەیە بۆ مردنی ڕێککەوتنەکە. سەرەڕای ئەوەش، بە بیروڕای من، ماکرۆن دەیویست خۆی لە کاری ئابێ هەڵقورتێنێ. دەزانم، ماکرۆن دەیویست دەستبەرداری ئەمە بین. ئایا ئامادەین بۆ سووککردنی سزاکان؟ چیمان دەوێ لە ئێران؟ دانانی سنوورێک بۆ چالاکیە سەربازییەکانی لە سووریا و یەمەن؟ دوای تاوتوێکردنی کاریگەریی دووبارە سەپاندنەوەی سزا ئەمریکییەکان بەسەر ئێران، ترەمپ دوای کێری هەڵسا بە پێشێلکردنی یاسای لۆگان و ڕازیکردنی ئێران بۆ ئەوەی دانوستان بکەن. منوشن گوتی دەتوانین زۆر بە ئاسانی سزاکانی سەر ئێران بوەستێنین یان بەکاری بخەینەوە، کە ترەمپ لەو حاڵەی کە باسی کارایی سزاکان و جێبەجێ کردنیانی کرد تەواو هەڵە بوو. لەوانەیە بەو ئاراستەیە جوڵابێت، بەڵام منوشن ڕێ نیشاندەرێکی خراپ بوو، وە هەروەها تەسلیم بوون بێ ئەوەی بیر لەو ئامازانە بکرێتەوە کە بەهۆی سووککردنی سزاکان جیهان بە ڕووماندا دەتەقێتەوە، یان لە خۆمان بپرسین، ئایا چی بکەین لە بەرامبەردا.

ماکرۆن زۆر بەڕاشکاوی گوتی کە ئەو هەست بە دوودڵی دەکات لەوەی کە ئێران دانوستانەکان ڕەت بکاتەوە، کە من پێم وابوو تەواو دڵنیانین، دواتر دەبێت خۆمان ڕزگار بکەین. ئەم گفتوگۆیە وەکو کارەساتێک وابوو. سەردانی ئابێ بۆ ئێران زۆر خراپ بوو، بەڵام هاتنە ناوەوەی ئەوروپییەکان کارەکە خراپتر دەکات. چونکە ئەوان کارنامەیەکی تەواو جیاوازیان هەبوو، ئەویش بریتی بوو لە ڕزگارکردنی ڕێککەوتنی ئەتۆمی بە هەر نرخێک بێت، لەجیاتی ئەوەی کە بە شێوەیەکی جددی دژی کێشە سەرەکییەکە بجەنگن. بەدڵنیاییەوە ئەگەر ئێران بەردەوام بێت لە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی و لێدانی ئامانجە ئەمریکییەکان یان هاوپەیمانەکانی، هەر هەوڵێکی دیبلۆماسی ژاپۆنی یان ئەوروپی دەوەستێنێت. ئەمە تەنها ئەو شتە بوو دەربارەی دەستلەکارکێشانەوەکەم کە لەژێر کۆنترۆڵدا بێت.

لە کاتی گەڕانەوەم بۆ ئاندرۆز، دوای کاتژمێر شەشی ئێوارە بە کاتی واشنتۆن پەیوەندی پێوە کردم. چەند کاتژمێرێک پێش ئەوە، فڕۆکەیەکی بێفڕۆکەوانی ئەمریکی MQ-9 Reaper (کۆپییەکی جۆری ڕاوکەر) لە نزیک ناوچەی حەدیدەی یەمەن خرایە خوارەوە، کە ئەگەر هەبوو لەلایەن حوسییەکان بەهۆی هاوێشتنی مووشەکی زەمینی- ئاسمانی (یان ئێرانییەکانی ناو حوسییەکانەوە) بێت. حوسییەکان داوای دڵنیاییان دەکرد، بۆیە کووپەرمان چەند نوێنەرێکی بۆ لێژنەیەک ئامادەکرد لە بەیانیی ڕۆژی هەینی بۆ ڕوانین لە چۆنیەتی وەڵامدانەوەکە. هەروەکو بەدیارکەوت، ئێمە هیچ شتێکمان ئەنجام نەدا، چونکە کەسێک کە جێگری سەرۆکی دەستەی ئەرکانی هاوبەش بوو بەناوی پۆل سیلڤا لە سوپا بەڕادەیەکی زۆر پێداگری کرد، ئێمە زۆر دڵنیا نەبووین کە کێ بووە هۆکاری خستنەخوارەوەی فڕۆکەی ڕیپەر و هێرشەکانی ئەم دواییانە. هەڵسەنگاندنی من ناکرێت پێچەوانەی ئەمە بێت. سیلڤا وەکو لێپێچینەوە داوای دەرخستنی

ئەو گومانەی لێ دەکردین. کێ ئەم شتە ئەنجام دەدات کە بەلایەنی ئێراندا بشکێتەوە؟ بەڵام لەمە گرنگتر ئێمە هیچ کەیسێکی تاوانکاریمان لە دادگا نەجووڵاند. لە جیهانێکی ڕاستەقینەی هەڕەمەکیدا بووین کە هەمیشە زانیاریی تەواو لەبەردەستدا نییە. بێگومان ئەم جیهانە ڕاستەقینەیەش پسپۆرە بیرۆکراسییەکانیش دەگرێتەوە، بۆیە هیچ شتێک مەکە کە ناتەوێت ئەنجامی بدەیت، ئەمەش شتەکە ئاڵۆزتر دەکات کاتێک کێشەکە لەگەڵ سەرۆکێک بێت، بیروڕاکانی ناجێگیرن و هەموو کاتژمێرێک بیروڕاکانی لە گۆڕاندایە. کەسە سڤیلەکانی وەزارەتی بەرگریش هەوڵیان دەدا فشار بخەنەسەر ئیسرائیل بۆ ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێت و پلان بۆ بەرگریکردن لەخۆی ڕێک نەخات، پۆمپەیۆ ئەمەی پێ گوتم کە بە شێوەیەکی تایبەت چووەتە ناو بابەتەکە، لەوەی کە دۆخەکە پێچەوانە بێتەوە، پۆمپەیۆ لەسەر حەق بوو، ڕۆحی ماتیس ژیایەوە. کاتژمێر هەشت و نیوی ئێوارەی ڕۆژی هەینی ٧ی تەممووز، یاچی پەیوەندی پێوە کردم، بۆ پێداچوونەوە بە خاڵەکانی سەردانەکەی ئابێ بۆ ئێران، کە باسی ئەو پێشنیارەی دەکرد کە لەوانەیە لەلایەن ماکرۆن یان مێرکلەوە بخرێتەڕوو، ئەمە شتێکی زۆر نایاب بوو بۆ ئێران. ژاپۆن دۆشدامابوو دەربارەی ئێران و کۆریای باکوور، نەرمی دەنواند بەرامبەر بە ئێران بەهۆی نەوتەکەی و ڕەقیش بوو بەرامبەر کۆریای باکوور بەهۆی واقعێکی تاڵ، چەندین جار هەوڵی سەرکەوتنێکی تێکەڵم دەدا، بۆ ئەوەی وا لە ژاپۆنییەکان بکەم ئەوە ببینن کە ئەم دوو هەڕەشەیە چەند بەیەک دەچن. وا لە ژاپۆن گەیشتم کە ڕاسترین ستراتیژی بریتییە لە بەکارهێنانی "توندترین فشار" دژی کۆریای باکوور و ئەگەر هەر وڵاتێکی یەکێتی ئەوروپا ئەمەی بۆ پیۆنگ یانگ پێشنیار کردبا، ئابێ ئەمەی بۆ تاران پێشنیاری نەدەکرد، کە بێگومان و بێ دوودڵی پێشنیارەکە ڕەت دەکرایەوە. دەمەویست بە هەمان مەودا خۆم بەدوور بگرم لە هەریەکە لە ژاپۆنی و ئەوروپییەکان، چونکە پێم وابوو کە ئامانجەکانیان

زۆر جیاوازن و لە واقیعدا لەگەڵ یەکتر ناگونجێن. دووهێندەکردنی سزاکان بۆ سەر کیم جۆنگ ئوون هانی دەدا کە تەنها لەلایەنە ئەتۆمییەکەی دەست بە مەرجەکانییەوە بگرێت، ڕێک وەکو سووککردنی فشار لەسەر ئێران کە هەمان شت ئەنجام دەدەن لە تاران، کە ئەمەم بە درێژی بۆ یاچی ڕوون کردەوە. ئەو هەڕەشانەم بە یاچی ڕاگەیاند کە لەلایەن ئێرانەوە ڕووبەڕوومان ببوونەوە، بۆ ئەوەی بزانێت چەندە ترسناک بوون، هەروەها خستنەخوارەوەی فڕۆکەی بێفڕۆکەوانی ڕیپەر و هێرشەکانی تر کە لەسەرەوە ئاماژەم پێ کردووە، بۆ ئەوەی بابەتەکەی لا ڕوون بێت. دواتر بە یاچیم گوت کە ترەمپ چۆن لە سەردانەکەی ئابێی ڕووانی و چەندە ئەستەم بوو و چەندە گرنگە کە بەشێوەیەکی دروست بەدەستی بێنیت. خەریک بوو لە ئەرکەکەی ئابێ بدەم، بەڵام سوور بووم لەسەر ئەوەی لێدانەکەم بە ڕەهایی نەبێت، بەتایبەتی لەگەڵ فەڕەنسا کە منوشن لە هەوڵی ڕزگارکردنی پلانێکی هاوبەشی گشتگیر لە دارمان دابوو.

ڕۆژی دووشەممە ١٠ی تەمموز، لەگەڵ ترەمپ دەربارەی بەرەوپێشچوونی پلانەکەی ئابێ قسەم کرد. لەمیانەی گفتوگۆکەماندا، ترەمپ ئەوەی ڕوون کردەوە کە بیرۆکەکەی ئابێ ئەوکاتە جێی ڕەزامەندییە کە "ئێران ڕێککەوتن بکات"، واتە ئێستا سازشکردن نییە، بەڵکو تەنها دوای دەستبەرداربوونی ئێران لە بەرنامە ئەتۆمییەکەی بە ڕەزامەندیی خۆی شتێکی نایابە. ئەمە جیاکارییەکی یەکلاکەرەوە بوو، بەڵام ترەمپ خۆی تووشی تەنگوچەڵمە بوو لە پارێزگاری لێ کردنی بەدوای یەکدا، سەبارەت بەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە ئێران و کۆریای باکوور هەبوو. پەیوەندیم بە پۆمپەیۆوە کرد بۆ ئەوەی هەندێک هەواڵی خۆشی پێ ڕابگەیەنم، گوتی: "پێم وایە کە ئەمە هەموو شتێکە"، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە لە مەترسیداین، بەلایەنی کەم لە کاتی ئێستادا.

سەرەڕای ئەوەش، دەربارەی ئەوەی کە حکوومەتی ترەمپ بووە بە کۆپییەک لە "ڕەخنەگرتن لەسەر مێز" کە لە بەڕێوەبردنەکەی ئۆباما ڕادەستی ئێران کرا، گەشبینییەکەی لە من کەمتر بوو. بە وردبوونەوە لەو گفتوگۆیانەی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ژاپۆنی ئەنجامی دابوون، دوودڵ بووم لەوەی کە وەکو خۆی قبووڵی نەکات، هەروەکو ترەمپ پێشووتر بۆی گواستبوومەوە. بۆ هەردووکمان، بە لێکنزیکبوونەوەی پێشکەوتنەکانی نێوان ئێران و کۆریای باکوور لە مانگی حوزەیران و تەممووز، مەترسییەکان جددیتر بوون. سەبارەت بە ئێران، پۆمپەیۆ پێی ڕاگەیاندم کە تەنها بە دەستپێکردنی ئابێ بە چەند وشەیەکی گرنگ بۆ مەبەستی پێچوپەناکردن لەگەڵ ئێران، دەیان وەزیری دەرەوە پەیوەندییان پێوە کردووم، چونکە پێیان وابوو کە ئۆپەراسیۆنی "توندترین فشار" وەستاوە و یارمەتی خراوەتەڕوو بۆ ئەوەی نێوەندگیری بکرێت. ئەمە بەڵگەی تر بوو لەسەر ئەوەی کە لەنێو هەموو سەرکردەکانی جیهان تەنها ترەمپ پێی وایە گفتوگۆکردن لەگەڵ دوژمنەکان بەتەواوی بە هاوتایی بەڕێوە دەچێت. هەروەک پۆمپەیۆ گوتی: ئەگەر دەتەوێ تەنها ڕێککەوتن لەسەر چەکی ئەتۆمی ئێران بکەیت، گرنگی بە جوانییەکەی مەدە، هەروەها گرنگی بە مووشەکە بالیستییەکانیش مەدە، پشتگیریکردنی تیرۆر، یان چەندین شتی تر، کە بەشێوەی: ڕێککەوتنی ئەتۆمی ئێرانی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت! کۆریای باکووریش بە هەمان ڕێژە خراپ بوو. دەربارەی قسەکانی پۆمپەیۆ، "لە ناوچەی مەترسی" کە سەبارەت بە دژیەکی هەڵسوکەوتەکانی ترەمپ بوو لە سیاسەتە تایبەتەکانی. کە وای لە جیهان کردبوو پشێوی زیاتر بەخۆیەوە ببینێت، ڕۆژنامەی وەکو نیویۆرك تایمز و ئەوانی تر کار لەسەر دروست کردنی دووبەرەکی و دابەشکردن لەنێوان من و ترەمپ دەکەن لەسەر بابەتەکانی ئێران و کۆریای باکوور. دیمەنی هەرە گەورە بریتی بوو لە دابەشکردنی نێوان ترەمپ و ترەمپ.

لەو ئێوارەیەدا، ئابێ پەیوەندی بە ترەمپ کرد بۆ پێداچوونەوە بە دەقی کۆتایی سەبارەت بە ئێران، کە بەپێی پێویست زیانبەخش بوو. سەرەڕای ئەوەش، ئابێ دەربارەی ئەو بەرنامەیە پرسیاری لێ کرد کە پێشنیار دەکات، ئەو گوتی کە لەوە تێدەگات کە ئەمریکا دوودڵ بوو لە پێشکەشکردنی ئەم بیرۆکەیە بۆ ئێران لە قۆناغی ئێستادا. ترەمپ، زۆر بەسادەیی، وەڵامی کۆمێنتەکەی ئابێ دایەوە، کە ئاماژەی بە هەموان کرد ئەگەر بێتوو ئابێ هیچ ئەنجامێکی نەچنییەوە ئەو دڵخۆش دەبێت. دەتوانین بەزەحمەت بڕوا بە بەختێکی باش بۆ خۆمان بکەین. ئەمە تەنها هەڵاتن نەبوو لە گوللەی هاویشتراو، بەڵکو خۆلادان بوو لە MIRV'ed ICBM.

ڕۆژی پێنجشەممە ١٣ی حوزەیران، لە نیوەشەودا، ژووری دانیشتنەکان پەیوەندی کرد بۆ مەبەستی گواستنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو هێرشەی کرابووە سەر دوو لە بارهەڵگرەکانمان لە کەنداوی عوممان. بەرەی Altair و Kokukaی ئازا (دووەمیان بەرەیەکی ژاپۆنییە)، هەواڵی ئەگەری هاتنی زریان و ئاگریان بڵاوکردەوە، کەشتییەکی دەریایی ئەمریکی لە ڕێگادا بوو بۆ پێشکەشکردنی هاوکاری. هیچ بەڵگەیەک لەبەردەست نەبوو کە کێ لێیداوە، بەڵام هیچ گومانێک لە مێشکمدا نەبوو. پێش سێ کاتژمێر، ئاگرەکە زۆر مەترسیدارتر بوو و کەشتییە بازرگانییەکانیش نزیک بوون، بڕیاردرا یەکێک لەوانە هیوندای دوبەی بێت، کە هەڵسا بە ڕزگارکردنی تیمەکانی کەشتییەکان. هێزی دەریایی ئێرانی لە کەشتییەکانی هیوندای دوبەی نزیك کەوتنەوە و داوایان کرد ئەوانەی لەناویدان، وەکو خۆی ڕادەستیان بکەن. (سەرکردایەتی ناوەندی ئەمریکی دوای ماوەیەک لە ماڵپەرەکەیان لە تۆڕی ئینتەرنێت، پڕوپاگەندەی ئابڕووبەری ئێران سەرکۆنە دەکەین و هێزی دەریاییش یەکێک لە ئەندامانی تیمەکەی ڕزگارکرد). لە کاتژمێر پێنج و چل خولەک گەیشتمە کۆشکی سپی، کووپەرمانیش پێشتر گەیشتبوو، یەکسەر بۆ ژووری دانیشتنەکان چوو. ئەوکات ڕۆیتەرز

دەینووسی، کەناڵی جەزیرەش دەیگواستەوە، بۆیە هەواڵەکە بە خێرایی بە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بڵاوبووبوویەوە.

ئەوێم جێ هێشت بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەیەک کە پێشتر پلانی بۆ داڕێژرابوو، شەنەهان و دەنفۆرد ویستیان گفتوگۆ دەربارەی ستراتیژییەتێک بۆ ئێران بکەین، کە پێم گوتن ئەوە شتێکی باشە، بەڵام ئێستا ئێمە دەبێت سەیری "هێرش بۆ سەر بازاڕی نەوتی جیهانی بکەین"، زۆر بەسادەیی ئێمە ناتوانین ئەمە پشتگوێ بخەین. فەیلەقی قودس بەردەوام بوو لە سەرکەوتن بە پەیڕەودا، بۆچی نا؟ ئەوان هیچ شتێک لە ئەمریکاوە نابینن وەکو وەڵامدانەوەیان. سەرەڕای ئەمەش، بەسەر کۆمەڵە وێنەی بەیانیی پنتاگۆن تێپەڕین کە ئەوان (پنتاگۆن) پشتیان پێ دەبەست، (بە "بچووککراوەی شوێن" ناودەبرا بەهۆی قەبارەی ئەو کاغەزەی کە بەکاردەهات). هێڵی ستوون و تیری لێ نەخشێنرابوو، زۆر هونەری بوو. لە کۆتاییدا گوتم جۆرەها پێشینەی سیاسیمان هەیە لەگەڵ ئێران (ئەتۆمی و تیرۆر و شەڕانگێزی سەربازی)، ناکرێت لەیەکتریان جیابکەینەوە و ناکرێت هیچ کامیان بە تایبەتی بەرنامە ئەتۆمییەکەی لە گشت هەڵسوکەوتە چەپەڵەکانی جیابکەینەوە. ئەمە ئەو هەڵەیە بوو کە ئۆباما کردی لە کاتی ئەنجامدانی ڕێککەوتنی ئەتۆمی. بۆچی بۆ هەمان شکستی جاران بگەڕێینەوە؟ جارێکی تر گفتوگۆی کردەوە سەبارەت بەوەی ئایا "باری کۆتاییمان" لەبەردەست (زاراوەی لەپێشینەی بیرۆکراسی)، هیچ شتێکی "نوێ" نابێت ـ ڕێککەوتنەکەی ئێران و هیچ "ڕەتدانەوەیەکیش" نابێت تاکو ئەم ڕژێمەی ئێران مابێت. لەوانەیە حەز بەمە بکەیت یان نا، بەڵام بنیاتنانی سیاسەت لەسەر واقعێکی تر بە هیچ "بارێکی کۆتاییامان" ناگەیەنێ. ئەگەر بێتوو ئەم گفتوگۆیە ئەنجامی هەبێت یان نا، یان تەنها بۆ کۆمەڵەیەکی تر ـ وردەکاریی "بچووککراوەی شوێن"مان ببات، هێشتا هەر پێویستە بە هەند وەربگیرێ.

بە گەڕانەوە بۆ کۆشکی سپی، پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد. باسی کۆبوونەوەکە و ئەو شتەی لە کەنداوی عوممان ڕوودەدات بۆ کرد، هەندێکیان کەناڵی فۆکس بڵاوی کردەوە. ترەمپ گوتی: جارێکی تر هەڵسوکەوتی هەڵە، بەڵام بیروڕای خۆی پێچەوانە دەکردەوە ئەگەر هاتبا و وام پیشان دابا کە شتی خراپ ڕووی نەداوە، لەوانەیە کەسێکی تر ئەمەی نەکردبا. کاتێک گەیشتمە لای ڕۆژئاوای کۆشکی سپی، زانیارییەکانمان ئەوەیان پشتڕاست دەکردەوە کە بێگومان هێرشەکە لەلایەن ئێرانەوە بووە. هەموومان تووشی سەرسوڕمان بووین کاتێک دیمەنی تەلەفزیۆنی نزیکبوونەوەی دەریاوانە ئێرانییەکانمان لە کۆکۆکای ئازا و لابردنی لوغمەکان بینی، کە لە نزیک لاشەی کەشتییەکە نەتەقینەوە. چۆن دەکرێت ئەمە ئەوەندە ناشیرین بێت؟ من پێنسم ئاگادار کردەوە بۆ ئەوەی لە کاتێکی تری هەمان ئەو ڕۆژە بگەڕێتەوە کە لە مۆنتانا بوو.

گوێگرتن لە چاوپێکەوتنی ئابێ لەگەڵ خامنەیی لە کاتێکی تری هەمان ڕۆژ سەردێڕی گفتوگۆکانی دانیشتنەکە بوو. خامنەیی چەند تێبینییەکی لە قسەکانی ئابێ وەرگرت، بەڵام لە کۆتاییدا گوتی کە هیچ وەڵامێکی نییە، هەموو شتێک سووکایەتیپێکردن بوو. سەرباری ئەمەش، خامنەیی زۆر دژوارتر بوو هەروەک لە ڕووحانی لە ڕۆژی پێشتر. ئەمە گەمژەیی ماکرۆن و ئەوانی تری دەردەخست (لەنێویشیاندا ترەمپ)، کە قسە لەگەڵ ڕووحانی دەکەن لەجیاتی "ڕابەری باڵا". ئایا شتێکی ناڕوون لەم ناونیشانە هەبوو؟ سەرەڕای ئەمەش، هەتا پێش ئەوەی ئابێ بە فڕۆکەکەی بگات کە بۆ ژاپۆن دەگەڕایەوە و داواکردنی ئەوەی کە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵی ڕانەگەیەنێت، خامنەیی زنجیرەیەک تویتی خستەڕوو. گرنگترینیان بەپێی بیروڕای ئێمە ئەمانە بوون:

☑ هیچ گومانێکمان لە نیازپاکیی ئەبێژینزۆ ئابێ نییە. بەڵام سەبارەت بەوەی کە دەربارەی سەرۆکی ئەمریکا ئاماژەم پێ کرد، وای دانانێم کە

ترەمپ کەسێک بێت شایەنی ئەوەبێت نامەی لەگەڵ بگۆڕێتەوە؛ هیچ ڕەتدانەوەیەکم بۆی نییە و وەڵامیشی نادەمەوە.

به هیچ شێوەیەک بڕوامان وانییە کە ئەمریکا هەوڵی دانوستانی ڕاستەقینە دەدات لەگەڵ ئێران؛ چونکە دانوستان هەرگیز لەلایەن کەسێکی وەکو ترەمپ بەدی نایەت. ڕەسەنایەتی زۆر دەگمەنە لەنێو بەرپرسە ئەمریکییەکان.

دەرەنجامەکە ڕوون بوو: ئەرکەکەی ئابێ شکستی هێنا. ئێران زللەیەکی زۆر کاریگەری لە ڕووخساری ئابێ دا، هێرشکردنە سەر کەشتییەکی سڤیل لە نزیک ئێران، کە یەکێکیان موڵکی ژاپۆن بوو، هەتا لەو کاتەی ئابێ بە تەنها لەگەڵ خامنەیی بوو. لەگەڵ ئەمەش، ژاپۆنییەکان لە بارێکی نکۆڵیکردندابوون، لەوانەیە هەوڵی پاراستنی ئابێیان دابێ لەو بارە ڕیسواییەی کە ترەمپ بەسەری دێنێت. من و پۆمپەیۆ لە کاتژمێر دوازدە و چارەگ لەگەڵ ترەمپ یەکتریمان بینی، تویتەکانی خامنەییم نیشاندان. گوتی: "دڕندە"، زۆر خراپ"، پێش ئەوەی دەست پێ بکات بەوەی کە چۆن کێری ڕێگری لە دانوستان لەگەڵ ئێران دەکرد.

ترەمپ ویستی وەڵامی تویتەکانی خامنەیی بداتەوە، کە لە کۆتاییدا دەرکەوت، وەکو:

لەو کاتەی من زۆر لام گرنگە، ئابێ دەچێت بۆ ئێران بۆ چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئایەتوڵڵا خامنەیی، من لە لای خۆمەوە وا هەست دەکەم هێشتا زووە بیر لە دروستکردنی ڕێککەوتنێک بکەینەوە. ئەوان ئامادە نین، ئێمەش بە هەمان شێوە! ئەوە هەڵسەنگاندنی حکوومەتی ئەمریکایە کە ئێران بە بەرپرس دەزانێت لە هێرشەکانی ئەمڕۆ لە کەنداوی میرنشینی عوممان....

لە بەیانیی ڕۆژی هەینی، ئابێ خوێندنەوەیەکی کەسیی گەشتەکەی دا بە ترەمپ، گوتی کە هیچ ئامادەییەک لە ڕووحانی و خامنەیی نابینێت کە دانوستان لەگەڵ ئێران بکەن، تاکو سزا ئابوورییەکان وەکو خۆیان بمێننەوە. بەلایەنی کەمی ئابێ ئاماژەی بەوەکرد کە ئێران ئێستا کۆبوونەوەی جەماوەری ڕێک دەخەن، بەڵام سەرەڕای ئەمەش وای دەبینێت کە ڕووحانی بەڕاستی دەیەوێ گفتوگۆ لەگەڵ ئەمریکا بکات، ئابێ ئاماژەیەکی بچووکی بەوەدا کە دوای کۆبوونەوەکەی لەگەڵ خامنەیی، چۆن ڕووحانی دوایکەوتبوو و هەوڵی قسەکردنی دەدا لەگەڵی، کە گوتبووی هەڵگرتنی سزا ئابوورییەکان لەوانەیە ببێتەهۆی کردنەوەی زیاتری گفتوگۆی لەم شێوەیە. لە هەموو ئەمانە خراپتر، ئابێ پێداگریی لەو بیروڕایە دەکرد کە پێی وابوو کێشەی هەریەکە لە کۆریای باکوور و ئێران دوو شتی زۆر لێک جیاوازن، پێمان گوت کە ئێمە پێویستمان بە میکانزمێکی جیاواز هەیە دژ بە ئێران. بە دڵنیاییەوە چاویان بەسترابوو. ترەمپ گوتی کە پێویست ناکات ئابێ هەست بە تاوان بکات، چونکە بە ڕەهایی شکستی هێنا، بەڵام دواتر پاشگەزبوویەوە، لەوانەیە وا هەستی کردبێت کە توند بوو لەگەڵیدا، کاتێک گوتی کە ئەو تەنها دەیەوێ هەندێک گاڵتە بکات. ئابێ پێی وانەبوو کە سەرکەوتوو دەبێت و هەرگیز لە ئەنجامەکەشی سەری سوڕنەما. بە دڵنیاییەوە لە مێشکیدا وا بیری کردبێتەوە، گوتی کە ئەو هەوڵەکەی بە هەند وەردەگرێت. بەڵام ئەمە سەبارەت بە خۆی زۆر زۆر گرنگ بوو، بەوەی کە ژاپۆن بەرهەمی زیاتری کشتوکاڵی لە ئەمریکا دەکڕێت. ئەمریکا زۆری بۆ ژاپۆن دەکرد، بەرگری لێ کرد و پارەیەکی زۆری لە بازرگانی لەدەست دا. ئابێ دانی بەوەدا نا کە بیری لەوە دەکردەوە چی بکات، ترەمپ گوتی: هەرچەند کارەکە خێرات بێت باشتر. دوای ئەوە، بە گەڕانەوە بۆ بابەتی ئێران، ترەمپ گوتی کە چیتر ئابێ پێوست نییە بۆ ئەنجامدانی دانوستاندن

لەگەڵیان، لەژێر ڕۆشنایی ئەو لێدوانە خراپانەی کە ئێران دەریکرد دوای کۆبوونەوەکانی ئابێ. ترەمپ خۆی هەڵدەستێت بە دانوستان کردن، بە کاتێکی کەم دوای پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە، تویتێکی کرد.

کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییمان هەبوو کە بڕیار وابوو دوای پەیوەندییەکەی ئابێ ڕاستەوخۆ ئەنجام بدرێت، بەڵام زۆر درەنگ بوو بۆ دەستپێکردنی. ترەمپ دەستی کرد بە پوختکردنەوەی گفتوگۆکەی لەگەڵ ئابێ، دوای هەرا و مشتومڕێکی زۆر لەسەر شکاندنی یاسای لۆگان لەلایەن جۆن کێری، ترەمپ سەیری سیپۆلۆن و ئایزنبێرگی کرد و گوتی: "پارێزەرەکان ڕەتی دەکەنەوە کە ئەم کارە ئەنجام بدەن. ناتوانم تێبگەم. کارێکی گەمژانەیە کە ئەمە ئەنجام نەدەیت". شەنەهان و دەنفۆرد ویستییان بیرۆکەیەکی باشتر لەسەر نییەتی ترەمپ بەدەست بێنن، لەمیانەی ئەمەش، کۆمەڵێک لە "بچووککراوەی شوێنیان" نیشاندا لەگەڵ هەندێک چرپی دانیشتوان، ئاماری کڕیارەکانی نەوت لە وڵاتە جیاجیاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست داهاتێکی زۆر بەرز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چین و کۆریای باشوور و ژاپۆن و هیند و ئەندەنووسیا نیشان دەدەن. دەمزانی ئەوەی دێت چییە: بۆچی ئەوان وا ناکەن، لەکاتێکدا وڵاتانی هاوردەکەر زیاتر ئەنجام دەدەن، بۆچی ئەمە ناکەن لەکاتێکدا بەرهەمهێنەرانی نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خەرجیی زیاتر دەدەن بۆ پاراستنی بارهەڵگرە نەوتییەکانی تایبەت بە خۆیان؟ بە تێپەڕبوونی هەندێک کات، شەنەهان و دەنفۆرد گەیشتن بە نەخشەی چوارەم یان پێنجەم، ترەمپ بەرەبەرە پێیەوە دیار بوو کە گرنگیپێدانەکەی بە بابەتەکە کەمتر دەبێت، گوتی "با بچین بۆ لاپەڕەکە" دەتەوێ چی بکەین؟ چەندین بژاردەی جیاواز گفتوگۆ کران، بەڵام نەگەیشتینە هیچ دەرەنجامێک. دواتر ترەمپ هاتەوە سەر بابەتی دەرچوون لە سووریا و ئەفغانستان، وای لە وڵاتەکانی کەنداو کردووە کە دەبێت خەرجی ئەو کارە بگرنە ئەستۆ کە بڕیارمان لەسەری

داوە. ڕوونم کردەوە هەروەکو پێشوتر، کە بۆش-٤١ پاڵپشتییەکی زۆری خەرجییەکانی شەڕی کەنداوی ساڵی ١٩٩١ کرد. پۆمپەیۆ ترەمپی دڵنیا کردەوە کە پەیوەندی بە شوێنە گونجاوەکانی وڵاتان دەکات.

ترەمپ ڕۆیشت، سەرەڕای ئەوەش من و پێنس و پۆمپەیۆ و دەنفۆرد و شەنەهان درێژەمان بە گفتوگۆکان دا. دەنفۆرد دەیویست لەوەی کە ئایا ترەمپ لەوە گەیشتووە کە ئەگەر زیانمان بە ئێران گەیاند، ئەوا ئێران لە کوشتنی ئەمریکییەکان دەوەستێت. پرسیارم کرد: "وەستان چییە؟" بە لەبەرچاوگرتنی ژمارەی ئەو ئەمریکییانەی لەلایەن ئێرانەوە کوژروان، سەرەتاکەی شکستەکانی مارینز لە لوبنان لە ساڵی ١٩٨٣، بابەتی قوربانییەکان هەمیشە لە خەیاڵی هەمووان دابوو لە گشت کۆبوونەوەکانی دیکەمان لەگەڵ ترەمپ. پێنس گوتی کە ئەو پێی وایە زۆر ڕوونە کە ترەمپ " بژاردەی جوڵەیی دەوێت"، منیش بەهەمان شێوە وای بۆ دەچووم. ئەمە یەکێک بوو لەو لیستی گفتوگۆ دوورودرێژ و چڕوپڕانەی کە هیچ گومانێک نەبوو ترەمپ ویستی ئەوەی هەبوو، چاو بە بژاردەکاندا بخشێنێتەوە- هیچ بڕیارێکیشی نەدا- هەستی بە بێزاری دەکرد بەوەی کە هیچ بژاردەی تری لەبەردەم نییە. هێشتا کاری زۆر ماوە بکرێت بەر لە کۆبوونەوەی تری ڕۆژی دووشەممە، بەڵام بڕوام وابوو بەلایەنی کەمی کەس ناتوانێت بە هەڵەماندا بیات بەهۆی ئەوەی بەشێوەیەکی گشتگیر سەیری کاریگەرییەکانی بەکارهێنانی هێزی سەربازیمان نەکردووەتەوە.

بەڵام لە ڕۆژی دووشەممە ١٧ی حوزەیران، هێشتا نەگەیشتبووینە هیچ بڕیارێک. بیرۆکراسییەکان و بەرپرسە سەرەکییەکان سوودیان لە نەمانی ئارامیی ترەمپ و ماوەی کورتی گرنگیپێدانی دواخستنی وەڵامدانەوە دژی هێرشەکان بۆ سەر بارهەڵگرەکان وەرگرت. ئەمە پاڵی بە بابەتەکانەوە نا بۆ دوورترین خاڵ کە بژاردەی سەربازی شتێکی گونجاو بوو. کەمئەندامەکان پلانی تایبەتیان نەبوو، بەڵام وایان دانابوو کە سەرکەوتوو دەبێت، بە

دواخستنی شکستی هەر بژاردەیەک. گرنگترینی، ئەوەبوو کە شکست لە هەڵسوکەوتدا نابێتەهۆی ئەوەی ئێران پێشکەوتنی زیاتر لە باڵادەستییەکەی لە کەنداو بەخۆیەوە ببینێت، بەڵکو وانەی هەڵەمان دەربارەی وەڵامدانەوە فێر کردن. ئەمریکییەکان دانبەخۆداگرتنیان لا پەسەند نەبوو، بەڵام زیاد لە پێویست بڕوایان وابوو کە ئێمە شکستمان نەهێناوە. ئێمە بەشێوازی خۆمان ئەنجاممان داوە.

خاڵەکە تا پێش کاتژمێر دەی بەیانی لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ڕوون بوویەوە، گوتەبێژی ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمی ئێران ڕایگەیاند کە ئەو ناتوانێت تا ٨ی تەمموز چاوەڕێ بکات بۆ پێشێلکردنی ڕێککەوتنە سەرەکییەکەی ئەتۆمی، بەڵام بە کردەیی خەریک بوو ئەنجامی دەدا. ئێران ئاستی ئەمبارکردنی یۆرانیۆمی پوختەکراوی نزم بۆ (٣٠٠ کگم) لە ماوەی دە ڕۆژدا پێشێل دەکات، هەروەها نزمترین ئاستی ئاوی قورسی ئەمبارکراو (١٣٠ تۆن) لە ماوەی دوو بۆ سێ مانگ. پوختەکردنی U-235 لە سەرووی ٣,٦٧ی ڕێککەوتنەکە، دەکرێت ڕێژە سەدییەکە سنووردار بکرێت لە ماوەی چەند ڕۆژێک یان چەند کاتژمێرێک، چونکە تەنها گۆڕانکارییە میکانیکییەکانی سیستەمی زنجیرەی چەقە خوولانەوە ئەم جۆرە پوختەکردنە ئەنجام دەدات. ڕوون و ئاشکرا بوو کە ئێران دەیویست فشاری زیاتر بخاتەسەر ئەوروپییەکان، ئەوانەی کە زۆر بەبێ هیوایی هەوڵی ڕزگارکردنی ڕێککەوتنە ئەتۆمییەکەیان دەدا. بەڵام لەوە گرنگتر، ئێران ئەوەی سەلماندبوو کە ئامانجی سەرەکی بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمییە. لە پرسیارێک دەربارەی ئەوەی کە ئایا ئێران لە ڕێککەوتنە ئەتۆمییەکە دەکشێتەوە، گوتەبێژەکە گوتی "ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بین، ئەمە بەشێوەیەکی زۆر کارا ڕوودەدات".

لە ئۆفیسەکەم چاوم بە شەنەهان و دەنفۆرد و پۆمپەیۆ کەوت پێش کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەو

بژاردانەی کە پنتاگۆن ئامادەی کردبوون. بەداخەوە، هەمان ئەو کۆمەڵە بژاردنەیان خستبووەڕوو کە هەینیی ڕابردوو گفتوگۆمان لەسەریان کرد، سەبارەت بەوەی کە ترەمپ ئەو کاتە گوتی: " لەسەرمان پێویستە زۆر بەخێرایی شتێک بپێکین دوای بەرکەوتنی ئەمبارەکان. سوپا هیچ بژاردەیەکی پێ نەدام". پۆمپەیۆ کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کردەوە و گوتی کە ئەو پێشکەوتنی بەدەست هێناوە لەگەڵ وڵاتەکانی کەنداوی عەرەبی، دەربارەی دابینکردنی خەرجی ئۆپەراسینەکان لە داهاتوودا: "من دڵنیام کە چەکی پارەی زۆر گرنگ دەنووسین". ترەمپ گوتی: "لەسەریان پێویستە". لێرە بەدواوە پێویستمان بە نەوتی ئەوان نییە، نامەوێ ئێران چەکی ئەتۆمی هەبێت". ئێستا، هەندێک بیرۆکەی تایبەتی هەبوو دەربارەی ئەو خاڵانەی کە پێویستە بکرێنە ئامانج، کە زۆر لەو بیرۆکانە دووربوو لەوەی کە وەزارەتی بەرگری پێشنیاری کردبوون. لەوانەیە ترەمپ ئەمەی زانیبێت، بەڵام خاڵێکی گرنگ هەبوو سەبارەت بە "دووبارە بنیاتنانی بەرپەرچدانەوە، دەربڕینی لەپێشینەی پنتاگۆن. سەرکردە هاوبەشەکان وەڵامێکی گونجاویان بە باشتر دەزانی. بەڵام بە ڕای من، کاردانەوەی نەگونجاو زۆر لە -بۆ نموونە هێرشکردنە سەر پاڵاوگەکانی نەوت یان لایەنەکانی بەرنامەی چەکی ئەتۆمی ئێران- گرنگتر بوو بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی بەرپەرچدانەوە. خاڵی ڕازیکردنی ئێران بەوەی کە ڕووبەڕووی خەرجی زۆر زیاتر دەبێتەوە کە بەسەر ئێمە یان هاوپەیمانەکانمان دەسەپێنرێت ئەگەر هاتوو هێز بەکار هات گرنگ بوو. تا ئێستا، ئێران بە هیچ شێوەیەک هیچ جۆرە خەرجییەکی نەداوە.

هەتا لە کاتی ئۆباما بەلایەنی کەمی هەڕەشەی هێرشکردنە سەر ئێرانی کرد و سەرەڕای جددیبوونی، لێدوانەکانی کراوە بوون، بەداخەوە، ئەوەی ئێستا تێی کەوتووین هێستا کار دەکات: بەدوادانەچوونی بژاردەکان. تەنها لەسەر زیادکردنی ژمارەی ئەو فەرمانبەرانە ڕێککەوتووین کە لە

ئامادەباشیدان بۆ بەرگریکردن لە هێزە ئەمریکییەکان لە ناوچەکە، هەتا لە دەرکردنی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەوانیش لە کۆتایی ڕۆژدا ئەنجاممان دا. سەرباری ئەمە، ئەم هەواڵە سادانە لە ڕابردوودا وای لە ئێران کردووە پێداگیرتر بێت لەسەر برەودان بە چەکە ئەتۆمییەکەی، لەکاتێکدا ئێمەش سەیری گەشەکردنی گژوگیامان دەکرد.

ڕۆژی دواتر، لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ گۆڤاری تایم، ترەمپ هێرشە سەرەتاکان و نوێترینیان بە "زۆر بچووك" پێناسە کرد. پاشان لە پرسیاری ئەوەی کە بۆچی بێزار دەبێت هەر کاتێک من لە لایەنی ڕۆژئاوای کۆشکی سپی دەردەکەوم، گوتی کە ئەمە شتێکی پراکتیکییە زیاتر لەوەی کە جدی بێت. لە سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە، چەند مووشەکێک لە بەسرە هاوێژران، کە لەلایەن میلیشیا شیعییەکانەوە ئەنجام درابوو و بارەگای سەرەکی سێ کۆمپانیای نەوتی بێگانەی (ئێکسۆن، شێل، ئێنی) کردبووە ئامانج، چەندین بریندار لێ کەوتەوە، بەڵام هیچ کوژراوێک نەبوو، وەڵامی حکوومەتی عێراقی بریتی بوو لە قەدەغەکردنی هێرشکردنە سەر هێزی بێگانە لەسەر خاکی عێراق، ئەگەر بێتوو عێراق چارەسەری هێزە سەربازییەکانی ئێران و هێزە شیعییەکان بە هەماهەنگی لەگەڵ ئەمریکا کردبا، ئەمە ڕووی نەدەدا، بەڵام ئەمە ئەستەمە بەهۆی هەژموونی ئێران لە بەغدا. ڕەتمان کردەوە دان بەم واقیعەدا بنێین، هەتا لە کاتی فراوان بوونیشی، کە بە درێژایی چەندین ساڵە هەمان شت دەکات. ئەو بەیانییە واشنتۆن هیچ گرنگی بە وەڵامدانەوەی هێرشی مووشەکەکان نەدا. سەرکردەی نوێی گاردی شۆڕشی ئێرانی حوسێن سەلامی و سەرکردەی فەیلەقی قودس قاسم سلێمانی، پێویست بوو زۆر بە ئارامی زەردەخەنە بکەن.

هەواڵی گرنگی ئەو ڕۆژە بریتیبوو لەوەی شەنەهان پاشەکشەی خۆی ڕاگەیاندووە لە بوونی بە وەزیری بەرگری ئەمریکا. ڕاپۆرتەکان لەسەر هەبوونی کێشەی خێزانی لە ڕابردوودا جارێکی دیکە لەلایەن ژنەکەیەوە سەری هەڵدایەوە، ئەویش لەلای خۆیەوە نەیدەویست لەمە زیاتر درێژە بکێشێ و لە گفتۆگاکانی دووپاتی کردەوە ئەم بابەتە بێتەوە بەرباس و قسەی زۆری لەسەر بکرێ. ئەمەیان تراژیدیایەکی گەورە بوو، بەڵام ناوبراو نەیدەتوانی دژی خواستی بوەستێتەوە و نەیدەویست دڵتەنگیی زیاتر ڕووبەرووی خێزانەکەی بێتەوە. ترەمپ نزیکەی ڕاستەوخۆ بڕیاری دا بە دەستنیشانکردنی بەرپرسی باڵای سوپا مارك ئێسپەر (ناوبراو لەگەڵ پۆمپەیۆ لە ئەکادیمیای سەربازی وێست پۆینت بەیەکەوە بوونە) بۆ ئەم کارە، ڕاستەوخۆ لە کۆشکی سپییەوەش پەیوەندی پێوەکرا. دواتر لە نووسینگەکەی خۆم، تەلەفۆنم بۆ ئیسپەر کرد تا پیرۆزبایی لێ بکەم و باسی ئەو دەستبکاربوونە فەرمییەی لەگەڵ بکەم. ڕۆژی دواتر، لە درەنگانێکی نیوەڕۆ ئیسپەر هاتە کۆشکی سپی بەمەبەستی گرتنی وێنە لەگەڵ ترەمپ، بەرلەمەش بەیەکەوە باسمان لە قەیرانی ئێران دەکرد لەکاتێکدا کە چاوەڕوانی کۆبوونەوە و وێنەگرتنمان دەکرد.

دوای ئەمە، من و ئێسپەر گەراینەوە نووسینگەکەی خۆم، لەوێدا ئێسپەر تەلەفۆنێکی بۆ هات و ئاگادارکرایەوە کە وێستگەی ئاوی وەبەرهێنانی کارەبای سعودیی لەلایەن حوسییەکانەوە بە مووشەك هێرشی کراوەتەسەر. ئێسپەر بەخێرایی بەرەو پنتاگۆن ڕۆیشت، منیش تەلەفۆنم بۆ دەنفۆرد کرد کە تا ئێستا گوێبستی ئەو هێرشە نەببوو. دواتر لەدەوروبەری کاتژمێر ٦:٢٠ ئێوارە چوومە کۆشکی سپی تا ترەمپ ئاگادار بکەمەوە، ئەویش پرسیاری کرد چۆن دەبێ گەر ڕاستەوخۆ کۆببینەوە و دەربارەی ئەوەی پێویستە چی بکەین، گفتوگۆ بکەین. من نیگەرانی ئەوەبووم لەوانەیە ئەو ڕاپۆرتە هەڵەبێ یان زیادەڕۆیی تێداکرابێ، بۆیە گوتم پێویستە تا بەیانی ڕۆژی

پێنجشەممە بووەستن لەوەی بزانین پێویستە چی بکەین. تەلەفۆنم بۆ دەنفۆرد و پۆمپەیۆ کرد، پێمگوتن کە سبەینێ بەیانییەکەی کۆدەبینەوە.

لەکاتێکدا ئەو هێرشە بۆ سەر وێستگەی کارەبای(شوقەیق)ی سعودیی وەك بابەتێکی گەورەوابوو بۆ ئەو کاتە، بەڵام بابەتی لەمە گرنگتر ئەوەبوو کە گەیشتە ژووری بارودۆخەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوەیی، تیایدا هەواڵ هات کە ئێران فڕۆکەیەکی دیکەی بێفڕۆکەوانی ئەمریکای خستۆتە خوارەوە، ئەمەیان دووەم دانەبوو لە ماوەی کەمتر لە دوو هەفتەدا. ئەمەیان لەجۆری(RQ-4A Global Hawk) بوو کە لەسەر گەرووی هورمز خستبوویانە خوارەوە. ئەم نانخواردنە بەیانییەی ئەمجارەم لەگەڵ شەنەهان و پۆمپەیۆ هەر پێشتر خرابووە ڕۆژی پێنجشەممە، ئەمجارەیان دوای هێرشەکەی سەر وێستگە کارەباییەکەی سعودیە هەریەك لە ئێسپەر و دەنفۆردیشی بۆ زیادببوو، بۆیە ئێمە ئامادەی ڕاوێژکردن بووین. بەیانی ڕۆژی دواتر کە ٢٠ی حوزەیران بوو لە کاتژمێر حەوتی بەیانییدا لە (وارد ڕووم) کۆبووینەوە. دەنفۆرد سەرەتا قسەی کرد و گوتی لەسەر خواستی سعودییەکان فەرمانداری فەرماندەی مەرکەزی فرانك ماککەینزی تیمێکی ئامادەکردووە کە سەردانی وێستگەی کارەبای (شوقەیق) دەکەن تا بزانن ڕێژەی زیانەکە چەندە و دیاریشی بکەن ئاخۆ چ جۆرە چەکێك بۆ هێرشکردنەسەر ئەم وێستگەیە بەکارهاتووە (ئەم وێستگەیە هاوشێوەی چەندان وێستگەی دیکەی سعودیە بۆ وەبەرهێنانی کارەبا خزمەتی دەکرد). ئێمە ڕازی بووین لەوەی ئەو بەرپرسەی فەرماندەی ناوەندی هەرچی زووە بۆ ڕای گشتی کۆنگرەیەك بکات و کورتەیەك پێشکەش بکات تا خەڵك لەمبارەیەوە زانیارییان پێ بگات.

کاردانەوەی زیاتری دەنفۆرد بۆ کەوتنی فڕۆکە بێفڕۆکەوانە ئەمریکیە بوو. دەنفۆرد پێیوابوو ئەمە ڕووداوێك بووە، کە لەدەرئەنجامدا بووەهۆی بەفیڕۆچوونی سامانێکی زۆری ئەمریکا و هەروەك لە میدیاکاندا پێشبینی

کرابــوو نــزیکەی ١٢٠ بــۆ ١٥٠ ملیــۆن دۆلار بــووە، بێگومــان ئەمەش جیاوازبوو لە لیستی ئەو هێـرش و بێزارکردنـانەی لەمیـانەی چەنـد مـانگی ڕابردوودا لە دژی ئەمریکا ئەنجام درابوون، لە بەرانبەر ئەمەشدا ئێمە هیچ کارێکی ئەوتۆمان بەرپانەکردبوو. دەنفۆرد قەناعەتی تەواوی هەبوو فـڕۆکە چاودێرییەکان کە لە دوورەوە کـۆنترۆڵ دەکـرێن هەردەم لەسـەر بۆشـایی ئاسمانە نێودەوڵەتییەکان دەفڕن، لەوانەشە لەسەر هەرێمێك فڕیبن کە ئێـران بە تەنیا وەك بەشێك لەسەر ئاوی وڵاتەکەی دیزاینـی کـردووە، هەر ئێـران خۆیشـی بە تەنیـا دانـی پیانـاوە. دەنفـۆرد پێشـنیاری کـرد پێویسـتە لە کەناراوەکانی ئێران هێرش بکەینەسەر سەر سێ ئامـانج (شـوێن). ئەو سـێ شوێنە لەگەڵ ئەوەی وەبزانم پەیوەندی بەو شوێنە نەبوو کە فڕۆکەکەی لێ خرابووە خوارەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش جیاوازییەکی ئەوتـۆی نەبـوو. یەك لە خاڵە سەرەکییەکان کە دەنفۆرد ئاماژەی پێدا بریتبوو لەوەی ئەم هێرشـە "پەیوەندیدار"ە بەڵام نـابێتەهۆی "خێراکـردن"ی هێرشـەکان. بەدیـاریکراوی پێم وابـوو کە پێویسـتە کـاردانەوەکی گەورەترمـان هەبـێ بەو مەبەسـتەی ڕێگــری لەبەردەمیــان دروســتبکەین، منــیش پێشــنیاری زیــادکردنی ئەو بـژاردانەم کـرد کە دوای ئەو هێرشـانەی کرایەســەر تانکەرەکـانی نەوت لەگەڵ ترەمپ باسمان لێوەکردبـوو. گفتوگـۆی زۆرمـان کـرد، هەموومـان ڕازیبــوون لەســەر ئەوەی پێویســتە تـۆڵەی ئەو هێرشــە بکەیــنەوە، لەگەڵ ئەوەش من و پۆمپەیۆ لەگەڵ ئەوەبووین کاردانەوەیەکی بەهێزترمان هەبـێ لەوەی شـەنەهان و دەنفـۆرد. ئێسـپەر کە تـازە ئاشـنای ئەم کێشـەیە ببـوو، زۆربەی کاتەکە بێدەنگ لێی دانیشتبوو. دواجار، ڕێکەوتـین لەسـەر ئەوەی ئەو سێ شوێنەی دیاریمان کردبـوو، تێکیـان بشـکێنین و چەنـدان پێـوەری دیکەش بگرینەبەر. من گوتم پێویستە دڵنیـابین کە هەموومـان لەسـەر ئەمە کــۆکین، بــۆیە بەم شــێوەیەبێ دەتــوانم بە ترەمــپ بڵــێم کە ئــێمەی ڕاوێژکارەکـانی لەسـەر بـژاردەیەك ڕازیـن و پێشـنیاریمان کـردووە بـۆی.

ئەمەیان شتێکی باش بوو بۆ سەرۆك. لەکاتێکدا دوا بڕیار لەلای ئەو بوو، بەڵام ئەگەر ئەو پاکێچەی ئێمەی هەڵبژاردبایە، ئەوا هیچ کەسێك نەیدەتوانی بڵێ ترەمپ زۆر توندە، یان زۆر نەرمە بەرانبەر ئێران. هاوکات، دەرفەتێکیش بە میدیاکاران نادات تا ململانێ لەنێوان ڕاوێژکارەکانی ترەمپ دروستبکەن. دوای ئەمە ڕاپۆرتە هەواڵییەکان تەنیا باسیان لە چەند هەواڵێکی سەرچاوە نادیار کردبوو، تیایدا ئاماژەیان کردبوو کە دەنفۆرد ڕازی نییە بە بڕیارەکەی ترەمپ. ئەمەیان هەر ئاوا بەسانایی قسەیەکی ڕاست نەبوو. چونکە ئەو بەیانییە دەنفۆرد و تەواوی کەسانی دیکەی بەشدار، ڕازیبوونی خۆیان نیشاندا.

هەروەك لەوکاتەی قسەمان دەکرد، ترەمپ بڕیاری دا بەوەی دەیەوێ سەرکردەکانی کۆنگرێس ببینێ- بەرنامەی کۆبوونەوەیەك دانرا لەگەڵیان کە هەر ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆکە بڕیاربوو بکرێ- بەرلەوەی دوابڕیار بدرێ. دوای جێهێشتنی نان بەیانی یەکسەر تەلەفۆنی بۆ ترەمپ کرد و بۆم ڕوون کردەوە کە ڕاوێژکارە باڵاکانت لەسەر ئەوە ڕێکە وتووین کە کاردانەوەیەکمان هەبێ، پێشمان وایە ڕێککەوتنمان لەمبارەیەوە دەتوانێ یارمەتیت بدات. ترەمپ ئەویش ڕاستەوخۆ ڕازیبوونی خۆی نیشاندا، من لەوکاتەدا هەستێکی جیاوازم هەبوو لەوەی ترەمپ دەیزانی کە دەبێ شتێك بکات ئەمەش وەك کاردانەوەیەك بەرانبەر خستەخوارەوەی فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکە. قبوولکردنی ئەمە مانایەکی زۆری دەگەیاند بەتایبەتی بەبێ هەبوونی کاردانەوەی سەربازی. تویتەکەی ترەمپ بەر لە کۆبوونەوەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوەیی ڕوون و ئاشکرابوو. "ئێران هەڵەیەکی گەورەی کردا" مولڤانێی دواتر بە منی گوت، ئەویش لای خۆی پێیوایە کە ترەمپ بە جۆرێك ڕەفتار دەکات و دەیەوێ کۆشکی سپی ڕووماڵێکی سیاسیی دابین بکات دەربارەی هەموو ئەو شتانەی خۆی بڕیاری لەسەرداوە و دەیەوێ ئەنجامیان بدات.

لە ڕاستیدا کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە کاتی خۆیدا لە کاتژمێر ١١ی بەیانی دەستی پێ کرد، وا دەرکەوت کە تەنانەت ترەمپیش ئەمەی بەجددی وەرگرتووە. پێنس، ئێسپەر، شەنەهان، دەنفۆرد، پۆمپەیۆ، هاسپێل، مۆڵڤانێی، سیپۆلۆن، ئایزنبێرگ و من بەشداربووین. لەگەڵ ئەو هەموو کۆبوونەوانەی ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوەیی و گفتوگۆکان لەنێوان ئەو کەسە سەرەکیانە لە هەفتەکانی پێشتردا، کێشەکان هەموو نوێ بوون و لە ڕووی نەبوونی بنەمایەکی سەرەکی بۆ جەختکردنەوە و گفتوگۆکانی پێشترەوە کێماسی هەبوو. من باسی ئەو کێشانەم کرد کە ڕووبەڕوومان بوویەوە، دواتر داوام لە دەنفۆرد کرد لەوەی چی بەسەر فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکە داهاتووە. دەنفۆرد گوتی کە تێچووی ئەو فڕۆکە بێفڕۆکەوانە ١٤٦ ملیۆن دۆلارە و لە کاتی بەجێگەیاندنی ئەرکی خۆی لەنێو ئاسمانی نێودەڵەوتییدا بووە، تەنانەت دەزانین چ کاتێك لێی دراوە، هاوکات شوێنی ئەو پاترییە دەزانین کە مووشەکەکەی پێ تەقێندراوە و فڕۆکەکەی تێکشکاندووە، ئەمەش بەپشت بەستنە بە حیسابات و ئەزموونی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە بۆ تێکشکانی فڕۆکەکە کراوە. دواتر دەنفۆرد پێشنیارێکی پێشکەشکردین کە لەسەری ڕازیبوون، خودی پێشنیارەکە بریتبوو لە لێدانی سێ شوێن و گرتنەبەری چەند پێوەرێکی دیکە. تەواوی کەسانی دیکە لە ئێمە کە بەشداری ئەو خوانەی بەیانی بووین، ڕازیبووین لەسەر پێشنیارەکەی دەنفۆرد. ئایزنبێرگ گوتی دەمەوێ "سەیرێکی ئەم پێشنیارە بکەم"، بەڵام هیچ گومانێکی نیشان نەدا لەوەی ئاخۆ ئەم کردەیە هیچ کێشەیەکی یاسایی دروستدەکات. ئایزنبێرگ پرسیاری کرد لەوەی شێوە و قەبارەی زیانەکانی ئەم شوێنانە چۆن دەبێ. ترەمپیش پرسیاری کرد ئایا ئەو ئامانجانە سەر بە ڕووسیان، تێچووی ئەو شوێنانە چەندن، دەنفۆردیش ترەمپی دڵنیاکردەوە کە ئەو شوێنانە ڕووسیایین، بەڵام بەقەد فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکەی ئێمە ئاوا بەنرخ

نین. گفتوگۆ کرا لەوەی ئاخۆ ئەمە قوربانی ڕووسی لێدەکەویتەوە، تیایدا بڕوا وابوو مەحاڵ نییە=، بەڵام لەوانەیە کەسی ڕووسی ببێتە قوربانی. دەنفۆرد گوتی هێرشەکە لە کۆتایی شەو دەبێ، بۆیە ڕێژەی کوژراوەکان کەم دەبێ، لەگەڵ ئەوەش ژمارەیەکی دیاریکراوی نەگوت. هیچ کەسێکیش لەوانەی ئامادەبوون لەمبارەیەوە پرسیاریان لێنەکرد.

لە هەڵسوکەوتی ترەمپ بۆم دەرکەوت کە دەیەوێ زیاتر لەوەی ئێمە پێشنیارمان کردبوو ئامانج و شوێنی دیکەش بکەینە ئامانج. کاتێ بەچەند ڕێگەی جیاواز لەمبارەیەوە پرسیاری لێکردم، من گوتم" ئێمە دە توانین هەموو ئەمانە بەیەکەوە بکەین، دەتوانین بەشێوەی جیاجیا ئەنجام بدەین، یان دەتوانین بەو شێوەی بیکەین کە تۆ حەزت لێیە"، ئیدی تێگەیشت بەهۆی ئەو پێشنیارەی پێشتر ڕازیبوونمان لەسەر نیشاندابوو ناتوانین بژاردەکانی دیکە پشتگوێ بخەین. گەڕاندنەوەی متمانە و دەسەڵات بۆ ئەمریکا، بێباکیی تەواوی ئێمە بۆ دانانی ڕێگرییەك بەرانبەر کاریگەرییەکانی چەکی ناوکی، هەبوونی وڵاتێکی تاکڕەوی، ئاینی و توندگیر، هەموو ئەمانە پاساوی زۆرمان بۆ فەراهەم دەکەن، بەڵام هەستم نەکرد ئەمە پێویستی بەوەبێ تا گفتوگۆی لەبارەوە بکەین. دڵنیابووم کە ترەمپ بەلایەنی کەم ئەو پاکێجەی ئەو بەیانییە لەسەری ڕازیبوون، قبوڵی دەکات. دەنفۆرد هەمووشتێکی ڕەتدەکردەوە تەنیا ئەو بیرۆکەیەی بەیانی نەبێت، لەگەڵ ئەوەش تەواو دڵنیابوو کە ئەو بیرۆکەیە سەرکەوتوو دەبێت، هەروەك ئێمەش هەموومان هەمان باوەڕمان هەبوو. گفتوگۆکان بەردەوامبوون، پۆمپەیۆش زۆربەی کاتەکە بەبێدەنگی دانیشتبوو. لە یەکێك لە قسەکانییدا ترەمپ گوتی" جۆن بۆڵتن کەسێکی میانڕەوە"، بۆیە منیش ئەو پێشنیارەی بەیانیتان قبوڵدەکەم و پشتیگریی لێدەکەم، ئیدی هەموومان پێکەنین. دواتر پرسیار لەلایەنی ماددی ئەو پێشنیارە کرا، منیش گوتم ئەمەیان پرۆسەیە سوودی بۆ ئێمە دەبێ"، پۆمپەیۆ دیسان باسی لە هەوڵێکی

خۆی کرد بۆ زیادکردنی لایەنی ماددی ئەو پرۆسەیە، تیایدا داوای بەشداری ڕاستەقینەی هێزە هاوبەشە دەریاییەکان دەکرد کە کاری چاودێرییان دەکرد. پۆمپەیۆ لە کۆتایی هەفتەکەدا وڵاتی جێهێشت تا ڕاوێژی زیاتر لەبارەی ئەو ناوچەیە بکات. ترەمپ گوتی: "دەربارەی گفتوگۆکان قسە مەکە، تەنیا داوای پارە و کەسانی چاوێر بکە." ترەمپ دواتر چووە سەر بابەتی جۆن کێری و چۆنییەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ یاسای لۆگان[1]، بەوەی پێیوابوو هیچ کۆبوونەوەیەك لەسەر ئێران فەرمی نەبوون. من دواتر کۆتاییم بە گفتوگۆکە هێنا بە جەختکردنەوە لەسەر بڕیاری کۆتایی، خودی بڕیارەکەش بریتبوو لەوەی پێویستە پاکێجەکەی بەیانی پیادە بکرێت. ترەمپیش لەسەر ئەمە ڕازیبوو و دەیویست لەمبارەیەوە لێدوانێك بدات، تیایدا بڵێت کە ئێمە "کاردانەوەیەکی لاوەکیمان دەبێ بەرانبەر ئەو هەڵەی ئێرانییەکان کە بەئەنقەست کردوویانە."

لەکاتێکدا تۆڵەسەندنەوە دەبوو وەك سوپرایزێك بێت بۆ ئێران، هیچ کەسێکی دیکە لەسەر ئەمە ڕازی نەبوو، ئەم بیرۆکەیەش لەو نێوەندەدا ون بوو. ترەمپ پرسیاری کرد کەی ئەو هێرشە دەستپێدەکەن، دەنفۆردیش پێشبینی کرد کە لەوانەیە کاتژمێر ۹ی ئێوارە بەکاتی واشنتن ئەنجامی بدەین(لەمەدا مەبەستی کاتی لێدانی ئامانجەکە بوو). دەنفۆرد هەروەها گوتی" ئەگەر ئەوان ویستیان خەڵکی ئەمریکی بکوژن، ئەوا ئەوکاتە دیسانەوە دەگەڕێینەوە لای تۆ"، ترەمپیش گوتی" من پێموانییە ئەو کارە بکەن. من نیگەرانی سەربازەکانمان لە سووریا. ئەوان لەوێ دووربخەنەوە." دەنفۆرد لەوەڵامدا گوتی" ئێمەش دەمانەویست لەسەر ئەو خاڵە قسە بکەین"، ترەمپ گوتی: "سووریا دۆستی ئێمە نییە."

---

[1] بەگوێرەی ئەم یاسای (لۆگان)ە بێ، تیایدا بە کارێکی تاوانکاری دادەنرێت بۆ هەر هاووڵاتییەکی ئەمریکی بەبێ ڕەزامەندی گفتوگۆ لەگەڵ وڵاتێك بکات کە کێشەی لەگەڵ ئەمریکادا هەیە.

سێ لایەنی گرنگ هەبوو دەربارەی ئەو بڕیارەی درابوو: ١- ئێمە لە ئامانجە سەربازییەکان دەدەین کە خزمەت دەکەن و لەسەرەوە باسیان لێوەکرا، نەوەك شوێن و ئامانجە سیمبۆلییەکان. ٢- ئێمە لە ئامانجگەلێك دەدەین کە لەنێوخۆی ئێراندایە و هێڵی سوور دەبەزێنین، بێگومان بەم کارەش ئەو کارادنەوە فراوانە تاقی دەکەینەوە کە ئێران بەرانبەر هێرشی ئاوایی دەیگرێتەبەر. ٣- ئێمە هێرشدەکەینەسەر ئەو ئامانجانە و قوربانی لێدەکەوێتەوە، ئەم پرسەش پێشتر قسەمان لەسەر کرد، ترەمپ وا گوێبیست ببوو کە ئەو هێرشانە دەبێتەهۆی کوشتنی ئێرانییەکان( ڕەنگە کەسانی ڕووسیش بگرێتەوە). دوای ئەم ڕاستییە، هەندێ بیرۆکەی بەدیل هەبوون بەوەی ئەم بریارە سەرنجراکێشەی ترەمپ بۆ هێرشکردن ڕەتبکرێتەوە، بەڵام بڕوای بەهێزم هەبوو کە دەمزانی ترەمپ چی دەکرد کاتێ ئەو بڕیارەی دا.

وا بەرنامە دانرابوو کە کورتەیەك لەبارەی ئەم بڕیارەوە پێشکەش بە کۆنگرێس بکرێت، نانسی پیلۆسی بیست خولەك دواکەوت. ترەمپ لەگەڵ تەواوی ئێمەدا لەنێو ژووری کۆبوونەوەکان چاوەڕوانبوو، هیچ گفتوگۆیەکی ئەوتۆش نەکرا. بابەتی (هواوی) هاتە بەرباس، (چەك شومەر)ی سیناتۆریش گوتی" دیموکراتەکان پشتگیری ئێوە دەکەن" و لەسەر بابەتی (هواوی) زۆر توندگیرن. سیناتۆر مارك وارنەر، وەك سیناتۆرێکی دیموکراتی نێو کۆمیتەی هەواڵگری گوتی " هیچ پارێزراوییەك لەگەڵ تۆری کارکردنی(نێتوێرك) هواوی دا نییە. ئەگەر ئەمە بۆ بازرگانی بەکاربێنین، ئەوا هاوپەیمانەکانمان هیچ متمانەیەکیان پێمان نامێنێ ( بەو مانایەی پێویستە پەکین دەستبەرداری هەندێ ڕەوایەتی بازرگانی بێ بەرانبەر ڕەتکردنەوەی ئەو سزایانەی لەسەر هواوی دانراوە). قسەکانی وارنەر لەمبارەیەوە ڕاست بوو، بەڵام ترەمپ بڕوای وابوو هەموو شتێك لەنێو گفتوگۆی بازرگانییدا کراوەیە. گاتێ دواجار نانسی پیلۆسی

گەیشتەجێ، ئیدی ترەمپیش ڕەوشەکەی بۆ ڕوونکردنەوە. ئادەم سیف (سەر بە دیموکراتەکانە) وەك سەرۆکی دەستەی هەمیشەیی هەلێژێردراوی بواری هەواڵگری پرسیاری کرد دەربارەی ئەوەی پلانەکانمان چۆنن. ترەمپیش خۆی چەماندەوە و گوتی" ئێرانییەکان دەیانەوێ گفتوگۆ بکەین"، هاوکات لۆمەی جۆن کێری کرد لەوەی یاسای لۆگانی بەزاندووە و گفتوگۆی لەگەڵ ئێرانییەکان کردووە. دیموکراتەکان نیگەرانی بەکارهێنانی بژاردەی سەربازی بوون، بەلام دووپاتی بیرۆکەی "لێدان"ی کردەوە و گوتی لێدان بە مانای ئەوە نییە کە زۆر بەخراپی وێرانیان بکەین". ترەمپ دواتر گوتی" ئەوها دەستەوەستان گەورەترین هەڵەیە"، لە وەلامی قسەکانی جیم ڕیچ کە دەیویست قسەکانی پێ ببڕێت، ترەمپ گوتی " من ڕازیم" و هەموو کۆمارییەکانیش ڕازیبوونی خۆیان نیشاندا. مایك ماککەول (وەك نوێنەری تێکساس) پرسی کاتێ هێرش دەکرێتەسەر ئەو پێگانە لە ئێران هێرشی پێچەوانە ئەنجام نادرێ بۆ سەر ئەمریکا. من هیوادارم هەموومان چاومان لەسەر ترەمپ بێ کاتی وەلامی دایەوە، بۆیە ترەمپ گوتی " ناتوانم لەمبارەیەوە لێدوان بدەم، بەلام پێم وایە بەو کارەی دەیکەین دلخۆش دەبێ". میتچ ماککۆنیل پرسیاری کرد " تا چەند ئەمە لەگەڵ ئەو تەقینەوە کاتییانەی لەو چەند ساڵەی ڕابردوودا ڕوویانداوە، جیاوازە؟" ترەمپ بەتەواوی وەلامی دایەوە و گوتی" ئەمەیان ڕووداوێك نابێ. ئەمە ئەو شوێنانەن کە خۆیان دەیەوێ بەرەو ڕووی بچن. ئێمە ڕێگەنادەین ببنە خاوەن چەکی ناوکی." دەنفۆردیش گوتی " جیاوازی چۆنایەتی ئەم هێرشە لەوەدایە کە سەرەتا ئێران هێرشەکەیان دەستپێکردووە. ئەمە وەك تاوانێکە دەخرێتەپاڵیان."

ئەو کۆبوونەوەیە لە کاتژمێر ٤:٢٠ خولەك کۆتایی هات، ئامادەکارییەکانیش بۆ هێرشەکە خێراتر کرا. پێشبینیم دەکرد تەواوی شەوەکە لە کۆشکی سپی بم، دەوروبەری کاتژمێر ٥:٣٠ چوومەوە ماڵ بۆ

ئەوەی جلەکانم بگۆرم و بگەڕێمەوە. دەنفۆرد دڵنیایی دا کە کاتژمێر ٧ی ئێوارە کاتی ئەنجامدان یان ئەنجامدام نەدانی هێرشەکەیە بۆ سەر سێ پێگە ئێرانییەکەیە، بیرم کردەوە کە کاتی زۆرم لەبەردەستە بەرلەوەی لە لە کاتژمێر ٩ هێرشەکە دەستپێبکات. لەنێو ئۆتۆمۆبیلێکی بەرزی هێزە هەواڵگرییە نهێنییەکان تەلەفۆنم بۆ ترەمپ کرد لەکاتژمێر ٥:٣٥ خولەکدا و پێمگوت هەموو شتێك ئامادەیە. ئەویش گوتی" باشە، با دەست پێبکەین". لەکاتژمێر ٥:٤٠ خولەك قسەم لەگەڵ شەنەهان کرد دەربارەی ئەوەی چ جۆرە ڕاگەیاندراوێك خۆی و دەنفۆرد دەیخوێننەوە لەنێو پنتاگۆندا کاتێ هێرشەکە کۆتایی دێت، هاوکات پرسیاری ڕۆژنامەنووسان وەڵامدەدەنەوە یان تەنیا ڕاگەیاندراوەکە دەخوێننەوە. گەیشتمەوە ماڵ، جلەکانم گۆڕی، یەکسەریش گەڕامەوە، و کەوتمەنێو ئەو جەنجاڵەی هاتوچۆ کە لەسەر ڕێگەی پارکی یادەوەری جۆرج واشنتن دروستببوو. هەروەك لەوکاتەی بەرێگاوەبووم، شەنەهان پەیوەندی کرد و باسی ڕاپۆرتێکی هەواڵی هەڵەی کرد کە گوایە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئێران هێرشی کراوەتەسەر، هەر بۆیەش خۆی و دەنفۆرد بڕیاریانداوە کاتی هێرشەکە دوابخەن بۆ کاتژمێر ١٠ی شەو. سەرچاوەی ئەو زانیارییە ئەفسەرێکی پەیوەندی بەریتانی بوو کە لەنێو ستافە هاوبەشە سەرەکییەکان کاریدەکرد، بەڵام شەنەهان گوتی پۆمپەیۆ خەریکە یەکلاییدەکاتەوە (دواتر دەرکەوت کە ڕووداوێکی لاوەکی هاتوچۆ بووە). نەمدەتوانی بڕوابکەم کە پنتاگۆن لەخۆیەوە کاتی هێرشەکەی گۆڕیوە، بەتایبەتی بە پشت بەستن بەو زانیارییە ناتەواوە. تەلەفۆنی بۆ ترەمپ کرد و پێمگوت لەوانەیە هێرشەکە بۆ کاتژمێر دوابخەین، لەگەڵ ئەوەش هێشتا بەدواداچوون بۆ شتەکان دەکەین. ترەمپیش نەیدەزانی بۆچی دەبێ هێرشەکە دوابخەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هیچ بەرهەڵستییەکی نیشان نەدا.

دوای کۆتایهاتنی تەلەفۆنەکەی ترەمپ، تەلەفۆنم بۆ دەنفۆردیش کرد و

لەبارەی ئەو تەلەفۆنانە هەردووکیان ئاگادارکردەوە. نیگەرانی ئەوەبوو کە لەوانەیە ئێستا دەنفۆرد و شەنەهان هەندێ ترسابن و جۆرێك لە پاشەکشەیان کردبێ، تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆش کرد (کە ئەوکاتە لە ماڵەکەی خۆی بوو) تا بەراوردێك لەسەر تێبینییەکان بکەین. پۆمپەیۆ پێیوابوو هەریەك لە دەنفۆرد و شەنەهان ترساون، بەتەواویش ڕەفتار ناکەن، ئەو دووانە قسەیان لەگەڵ پۆمپەیۆ کردبوو بەوەی پێویستە دوو ڕۆژ چاوەڕێ بکەین، لەژێر ڕۆشنایی ئەو "هێرشە"ی کرابووەسەر باڵیۆزخانەی بەریتانی، بەو هیوایەش بوون هەوڵێك بدەن تا وابکەین بەریتانییەکانیش لەو پرۆسەی هێرشی تۆڵەسەندنەوەیەدا بێنەپاڵمان (هەروەها هەر لەژێر ڕۆشنایی ڕووداوەکان، ئەو بیرۆکەیەیان هیچ هەنگاوێکی دیکە بەرەوپێش نەچوو). ڕەوشەکە خراپتربوو. هەروەك لەوکاتەی من و پۆمپەیۆ قسەمان دەکرد، ژووری تایبەت بە بارودۆخەکان ڕاپانگەیاند کە ترەمپ دەیەوێ پەیوەندییەکی کۆنفرانسی لەگەڵ من، پۆمپەیۆ و شەنەهان و دەنفۆرد بکات. ترەمپ دەروبەری کاتژمێر ٧:٢٠ هاتە سەرهێڵ( من لەوکاتەدا بەهێواشی خەریکبوو بەسەر پردی ڕۆزفێڵت تێپەردەبووم کە دەکەوێتەسەر ڕووباری پۆتۆماك)، ترەمپ گوتی کە داوامکردووە هێرشەکان بەوپێیەی "هاوسەنگ" نییە بۆیە هەڵبووەشێتەوە. ترەمپ گوتی "سەد و پەنجاو یەك"، من پێم وابوو ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەو مووشەکانەی بڕیاربوو بتەقێندرێن بەبەراورد بەو تەنیا مووشەکەی ئێران کە ببووەهۆی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکەمان. بەڵام لەجیاتی ئەمە، ترەمپ گوتی کە کەسێك پێی گوتم (بەڵام ناوەکەی نەهێنا) کە سەد و پەنجاو یەك قوربانی ئێرانی لێدەکەوێتەوە. ترەمپ گوتی "ئەو هەموو تەرمە لەنێو کیس بێ زۆرە"، بۆیە ترەمپ ئامادەگی نەبوو لەپێناو فڕۆکەیەکی بێفڕۆکەوانددا ئەو مەترسییە دروستبکات- ترەمپ دیسانەوە گوتی "ئەمە کارێکی ناهاوسەنگە". پۆمپەیۆ هەوڵیدا هۆکارێکی لۆژیکی بۆ ئەمە بدۆزێتەوە، بەڵام نەیتوانی. پۆمپەیۆ

گوتی دەتوانین دواتر هێرشیان بکەینەسەر، ترەمپ قسەکانی بڕی و دیسانەوە دووبارەی کردەوە کە نامەویێ ئەو هەموو تەرمە ببینم لەسەر تەلەفزیۆن کە لەنێو کیس دانراون. هەوڵمدا بیرۆکەی ئاوەزی بگۆڕم، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. من گوتم وا لەنزیك کۆشکی سپیم، کاتێ گەیشتم، ئەوا دێمە لات لە نووسینگەی سەرۆکایەتی.

لە ئەزموونی نێو حکومەتمدا، ئەمە ناقلانەترین شت بوو کە هەر سەکردەیەك کردبێتی و منیش وەك شایەتحاڵێك بینیێتم. پرسیارەکەی (کێلّلی) هاتەوە ئاوەزم کاتێ لێی پرسیم: چی دەبێ گەر بکەوینە نێو قەیرانێکی ڕاستەقینە لەگەڵ ترەمپ کە سەرۆکی ئەمریکایە؟ باشە، ئێستا وا کەوتووینەتەنێو ئەو قەیرانە، ترەمپیش بەشێوەیەکی سەیر ڕەفتار دەکات، هاوشێوەی ئەوەی کێلّلی لێی دەترسا. کەمێك دوای کاتژمێر حەوت ونیوی ئێوارە گەیشتمە دەروازەی ڕۆژئاوای کۆشکی سپی و ئەو شەقامەی داروبارەکانی بەسەرەوەیە، چارڵس کوپەرمان لەدەرەوە وەستابوو تا سڵاوم لێبکات و پێم بڵێت کە هێرشەکان پووچەڵ کرانەوە. بەرەو نووسینگەکەم چووم تا جانتاکەم دانێم و ڕاستەوخۆ بچمە نووسینگەی سەرۆك، لەوێدا بینیم کە سیپۆلۆن، ئایزنبێرگ و کارمەندێکی مولڤانیی لێبوو. گفتوگۆیەکی نامۆ و سەیرم لەگەڵ ترەمپ کرد، لەو نێوەندەدا تێگەیشتم کە ئایزنبێرگ هەر بە ئاوەزی خۆی چۆتە لای سەرۆك و باسی ئەو "سەد و پەنجاو یەك" قوربانییەکەی کردووە، ئەو ژمارەیە پێشتر لەنێو وەزارەتی بەرگرییدا خەملاندنی بۆ کرابوو (ڕۆژی دواتر شتی زیاترم لەمبارەیەوە زانی)، گوتیشیان کە تۆڵەسەندنەوە بەو شێوە ناهاوسەنگە کارێکی ناشەرعییە. هەموو ئەوەی گوتیان بێمانابوو، هەم ئەو ژمارە قوربانییەی باسیان کرد کە هیچ بەرپرسێکی باڵا بەتەواوی ئەمەی یەکلاییەکردبۆوە، هەم ئەوەی پێیانوابوو ناشەرعییە، هەموو ئەوەی دەگوترا نیشاندەری ئەو لێدوانە هەڵە و ناهاوسەنگانەی خۆیانە. (دوای ئەم ڕووداوە، چاودێران باسیان لە قسەیەکی

ستیفن شوبێل دەکرد، ناوبراو پێشتر سەرۆکی پارێزەرانی ئەمریکی بوو لەنێو دادگای جیهانیی تاواندا، کە گوتبووی " لەحاڵەتی ئەنجامدانی کردەیەکی سەربازی لەپێناو وەستاندن یان ڕێگریکردن لە هێرشێکی سەربازییدا، ئەمە مانای ئەوەنییە کە ئەو کردەیە کەم تا زۆر یەکسان بێت بە هێرشەکە و لە هەمانی ئاستی ئەودا بێت." ترەمپ گوتی تەلەفۆنم بۆ دەنفۆرد کردووە (تەقریبەن هەمان ئەو خاڵە بوو کە دەمویست بیزانم) دوای ئەوەی ئایزنبێرگ قسەی لەگەڵ ترەمپ کردبوو، دەنفۆردیش هیچ بەرهەڵستییەکی بەرانبەر ئەو بڕیارەی ترەمپ نیشان نەدابوو. ڕۆژی دواتر دەنفۆرد پێی گوتم ئەمە ڕاست نییە، بەڵام خودی ئەو وێرانکارییە هەر لەمەوپێش کۆتایی پێهات. من خەریکبوو هیچ قسەیەکم نەمێنێ، بەڵام ئەم بابەتە دەبوو بۆ هەموو کەسێکی نێو کۆشکی سپی ڕوون و ئاشکرا بێت. من هەوڵمدا بۆ ترەمپی ڕوون بکەمەوە کە ئەو ژمارە قوربانییەی باسی لێوەکراوە تەقریبەن بەتەواوی گریمانەییە، بەڵام ترەمپ گوێی نەگرت. لە ئاوەزی ترەمپدا وێنەی ئەو سەد و پەنجاو یەك قوربانییە کە چۆن لە کیس نراون هەبوو، هیچ قسەیەکیش نەبوو تا لەمبارەیەوە ڕوون بکرێتەوە. ترەمپ هیچ پاساوێکی دیکەی بەدەستەوە نەدا، هەر قسەکانی خۆی دووبارە دەکردەوە لەوەی نایەوێ وێنەی کەسانی قوربانی ئێرانی لەسەر تەلەفزیۆن بەدەربکەوێت. دواجار ترەمپ گوتی" نیگەران مەبە، ئێمە دواتر دەتوانین هێرشیان بکەینەسەر، ئەگەر ئەمەش بکەین، ئەوا زۆر بەتوندتر هێرش دەکەین"، ئەمەیان بەڵێنێك بوو کە من بەتەواوی لەپێناودا قوربانییم دا.

لەکاتژمێر ٧:٣٥خولەکی ئێوارە گەڕامەوە نووسینگەکەم و تەلەفۆنم بۆ پۆمپەیۆ کرد کە ئەویش لە ماڵەکەی خۆیدا بوو. ئێمە هەردووکمان لەسەر هەمان میراژ بووین. وەسفی ئەو شتانەم کرد بۆی کە لە نووسینگەی سەرۆك ترەمپ بینیبووم، پۆمپەیۆ جارێکیان ڕقی لە ئایزنبێرگ هەڵگرتبوو، بەدیاریکراوی کاتێ پۆمپەیۆ سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی

(CIA) بوو، ئایزنبێرگ بەشێوەیەکی ناپەرپرسانە و نیمچەدەستوەردانەوە، هەندێ کاری دەزگاکەی ڕاگرتبوو. پۆمپەیۆ هەرگیز لێی خۆش نەبوو. کوپەرمان کە لەتەواوی ئەو کاتە نووسینگەکەی لەتەك من بوو، دووپاتی کردەوە کە ئایزنبێرگ هەوڵینەداوە قسەی لەگەڵ بکات، هەوڵینەداوە قسە لەگەڵ منیش (وەك جۆن بۆڵتن) بکات، تەنانەت هەوڵینەداوە سیپۆلۆن یان مولڤانێی بدۆزێتەوە لەبارەی هێرشەکەوە ڕاوێژێك بکات. بەڵکو هەر ئاوا بەسانایی و بەخێرایی بەرەو نووسینگەی سەرۆك چووە و تا پێی بڵێت کە ئەو هێرشە دەبێتەهۆی مردنی ۱۵۱ کەسی ئێرانی. ئەم قسەیەی نە وردو دەقیق بوو، نە بەفلتەردا تێپەڕیبوو، نە ڕەچاوێکی تەواویشی کردبوو، بەڵکو تەنیا جۆرێك بوو لە "فاکت"ێك کە ببووەهۆی وروژانی تەرکیزی ترەمپ، هەر ئەمەش وایکرد بگەینە ئەم ساتەوەختە. ئەم کاتێك بوو کە هیچ بەرەوپێشچوونێکی پێوەدیار نەبوو. هەروەك لەگەڵ پۆمپەیۆ باسمان لە هەڵەکانی ئەو ڕۆژە دەکرد، پۆمپەیۆ گوتیشی کە "ئەمە بەراستی مەترسیدارە"، بەتایبەتی کاتێك بڕیارێك پشتگوێدەخەی کە پێشتر بۆ بڕیارەکە پشتت بە شیکردنەوەی و هەڵسەنگاندنی دەستەیەك لە خەڵك بەستووە، کەچی تەنیا بەهۆی داتایەکی ئایزنبێرگ و لەدوا خولەکدا بەبێ ئەوەی ڕاوێژ بە هیچ کەسێك بکەی، بڕیارەکە پشتگوێ بخەی. بۆیە، ترەمپ پێویست ناکا گوێ لە ڕاستییەك(فاکت) بگرێ کە بەتەواوی هەڵەیە و هیچ ڕاستییەکی تێدانییە. دواجار پۆمپەیۆ گوتیشی کە "چەندان جار هەبووە ویستووتە قسەیەك بکەی، کەچی خەڵکەکە یەکسەر پێی دەزانن و هەستی پێدەکەن."

دوای ئەوەی تەلەفۆنەکەم کۆتایی پێهێنا، کوپەرمان پێی گوتم کە مایك پێنس گەڕاوەتە کۆشکی سپی و هێشتا چاوەڕوانی ئەوەیە لەکاتژمێر ۹دا هێرشەکە دەستپێبکات، و دەیەوێ بزانێ چی ڕوویداوە. دەورووبەری کاتژمێر ۸ی چووە نووسینگەی جێگری سەرۆك، و بۆ نزیکەی ۲۰ خولەك

قسەمان کرد. پێنس هاوشێوەی من سەرسام بوو بەو بڕیارە. پێنس ڕازیبوو لەوەی بچینە خوارەوە بۆ لای ترەمپ تا بزانین هیچ ڕێگەیەك هەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارەی درابوو، بەڵام وادیاربوو هیچ ڕێگەیەك نەبوو. بۆیە دەوروبەری کاتژمێر ٨:٤٠ خولەك ئیدی منیش بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

من چەندان جار لەمەوپێش بیرم لە دەستلەکارکێشانەوە کردبووەوە، بەڵام ئەمجارەیان بۆ من وەك خاڵی وەچەرخان وابوو. ئەگەر ئێمە بەو شێوەیە بڕیارگەلێك بدەین و بێتەهۆی دروستبوونی قەیران، ئەگەر بڕیارەکانیش ئاوا بەو شێوەیە بدرێ، کەوابێ ئێمە چیمان کرد؟ من ئەوە نزیکەی ١٤ مانگ بوو لەنێو کۆشکی سپیدا کارم دەکرد. بۆیە، چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد چیتر لەوێ بەردەوامبم.

لە ڕۆژی هەینی ٢١ی حوزەیران، لەگەڵ هەبوونی سەرلێشێواوییەکی زۆری میدیایی، مولڤانێی گوتی کە شەوی ڕابردوو قسەم لەگەڵ سیپۆلۆن و ئایزنبێرگ کردووە، ئایزنبێرگیش وای نیشانداوە کە بەرلەوەی بەخێرایی بێتەنێو کۆشکی سپی قسەی لەگەڵ هیچ کەسێك نەکردبوو، دڵنیایشی دابوو کە بەر لەدیاریکردنی کاتی لێدانی ئامانجەکە هیچ کاتێکی فەراغی لەبەردەست نەبووە. ئایزنبێرگ هیچ ڕوونکردنەوەیەکیشی نەبووە لەوەی بۆچی (فاکت)ەکەی وەزارەتی بەرگری تا دواخولەك باسی لێوەنەکراوە، سەلماندیشی کە ئایزنبێرگ چەندە دووربووە لەو بازنەیە، تەنانەت نەیزانیووە هەر خودی هێرشەکە بۆ ماوەی کاتژمێرێك دواخرابوو. چەندان جاری دیکە هەبووە کە پێویستی کردووە هەڵسەنگاندنی باشتر بۆ قسەکانی بکرێ. مولڤانێی دواجار لەسەر وەڵامە تێکەڵوپێکەڵەکانی ئایزنبێرگ و بیناگایی سیپۆلۆن پێیوابوو کە خودی هەڵسوکەوتەکانی ئایزنبێرگ "جێگەی قبووڵ نییە". لە ڕۆژی پێنجشەممەدا چەندان هەڵە کرا کە "جێگەی قبووڵ نەبوون"، بەڵام ئەوەی ئایزنبێرگ خراپترینیان بوو.

دوای ئەمە قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد، دیسانەوە باسمان لە خراپترین ساتەکانی ڕۆژی پێشتر کرد. وەك یەکێك لە بیرۆکە خەیاڵییەکان دەربارەی ئەو هێرش کرابۆوەسەر باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە تەهراندا، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جێرمی هەنت (پۆمپەیۆ خۆی لەمبارەوە لە خەوی هەڵساندبوو تا ڕاستی ڕووداوەکە بزانێ)، ئیمێلێکی بۆ پۆمپەیۆ نووسیبوو، هەروەك پۆمپەیۆ بە قسەکانی خۆی دایرشتبۆوە، تیایدا هەنت نووسیبووی "قسەکردن لەگەڵ تۆ هەردەم جێگەی خۆشحاڵیمە، بەڵام بۆچی لەو نیوەشەوەدا بەئاگات هێناوم؟ هەندێ کەسی گوێدرێژ ئۆتۆمۆبێلیان بەئاراستەی دەرگای باڵیۆزخانەی ئێمە لێخوڕیووە؟ هیچ شتێك لەو جیهانەی ئێمەدا نوێ نییە!" ئەمەیان زیاتر لە خەیاڵێك دەچێ. بەیانی زیاتر قسەدەکەینەوە، پۆمپەیۆش گوتی هەر دەربارەی ڕووداوەکانی ڕۆژی پێنجشەممە، "من ناتوانم هەموو ئەو شتانە بکەم کە ترەمپ داوام لێدەکات. ئەم نادادپەروەرییە زۆر گەورەیە. ناتوانم ئەمە بکەم. ئێمە خەڵکی خۆمان دەخەینەژێر مەترسییەوە. تۆش دەزانی کاتێ بەیانی بۆ نانی نیوەڕۆ دەیبینم چی ڕوودەدات، دەزانم دەمخولێنێتەوە. دەزانم ترەمپ پێمدەڵێ "مایك، دەزانی ئەمە کارێکی باشە تا ئەنجامی بدەی، باشە؟" منیش (وەك جۆن بۆڵتن) پرسیارم لە پۆمپەیۆ کرد چۆن خۆت ئامادەکردووە بۆ ئەو خولانەوەیە لەلایەن ترەمپەوە، دەزانم نابێ، ترەمپ گومانی لەسەر ئەو بڕیارەی هەیە، بەڵام دەیەوێ وا بکات پۆمپەیۆش ئەو ڕێگەیەی قبوول بکات. پۆمپەیۆ گوتی بە ترەمپ دەڵێم "جەنابی سەرۆك، ئەمەیان ڕوانینێکی نوێیە"، با منیش بیرۆکەی خۆمت پێ بڵێم. ئەگەر من دایك و باوکی منداڵێك بم کە لە بنکەیەکی ئاسمانی ئەسەد بێ، ئەوا زیاتر هەست بە مەترسی دەکەم"، هەوڵدەدەم ئەمە زیاتر بە شەخسەنە بکەم. هەروەها بە سەرۆك دەڵێم "ئەگەر ئەم کارەی ئێران ئاوا بێ وەڵام بهێڵینەوە، ئەوا مەترسی چەکی ناوکی ئێران زیاتر دەبێ". هەموو ئەو قسانەی پۆمپەیۆ

ڕاستبوو، بەڵام هەردووکمان بڕوامان وابوو کە ئەمە ناتوانێ کاریگەری لەسەر ترەمپ دروستبکات. ترەمپ هەرگیز هەوڵی نەداوە شوێنی ئەو ڕێگەیەی من بکەوێ، چونکە لەوانەیە بەهۆی ئەوەبێ چیتر گرنگی پێنادات، یان لەوانەیە هەرگیز هەر گرنگی پێنەدابووبێ.

پۆمپەیۆ گوتی کە تا کاتژمێر ٢ی بەیانی هەر بەئاگا بووە، ئەو هەموو کاتەش زۆر نیگەران بووە. ئەو بڕوای وابوو ئەو پێشنیارەی بەیانی ڕۆژی سێشەممە بەکۆڕایی بڕیارمان لەسەر دا، بنەمایەکی گونجاو بوو بۆ بڕیاری هێرشکردن. پێچەوانەکردنەوەی ئەم بڕیارە مانای وایە کە هەرچی قسەبوو کە لەسەر ئێران کردبوومان، لە نرخی کەمدەکرێتەوە و ئاڵنگاری لەدژدا دەکرێت. پۆمپەیۆ گوتی" دەتوانم مەودای کار و سەربەستی ئەو بڕیارە دابین بکەم کە ترەمپ دەیەوێ، بەڵام ناتوانم تێبگەم لەوەی چۆن ئەو کارانە بکەم کە ئەو دەیەوێ. ئێمە بەردەوام دەتوانین بە خەڵك بڵێین کە ئێمە نیگەرانی پرۆگرامی مووشەکی ئێرانین، بەڵام کێ بڕوامان پێدەکات؟" قسەی زیاتریش هەبوو، بەڵام قسەکانی پۆمپەیۆ نیشانی دەدا کە جیاوازییەکی بەرچاو لەنێوان ئێمەدا هەیە. من تەواو ئامادەنەبووم تا مەودای کار و سەربەستی بدەم بەو بڕیارەی کە ترەمپ دایبووی، بەوپێیەی ئەو بڕیارەی هەڵەی زۆری لەخۆگرتبوو. بۆیە گوتم ئێمە "بەردەوام دەبین لە گوتنی ئەوەی چەندە لەمێژە خەریکە دەیڵێینەوە" و ئێستا دووچاری ئەو قەیرانە بووین کە کێلّلی پێشبینی کردبوو، ترەمپیش بەشێوەیەکی نائەقلانی ڕەفتاری دەکرد هاوشێوەی ئەوەی کە کێلّلی لێی دەترسا. ئێمە ڕازیبوون لەوەی سەرەتا بەبێ ئاگادارکردنی یەکتری دەستلەکارنەکێشینەوە، ئەمەش یەکەمجاربوو ئەو بابەتە هاتەنێو باسەکانمانەوە. من هەرگیز ئەمە وەك بیرکردنەوەیەکی قووڵ دەربارەی سوود و زیانەکانی دەستلەکارکێشانەوە هەژمار ناکەم، بەڵام خودی ئەم بابەتە هەروا هەر بە هەڵپەسێردراوی مابوویەوە.

وا بڕیاربوو ترەمپ پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ محەممەد بن سەلمان هەبێ، بەرلەوەی ئەو پەیوەندییە بکات، ترەمپ پرسیاری ڕەئی من کرد دەربارەی یەك لە لێدوانەکانی کە بڕیاربوو وەك تویت بڵاوبکاتەوە. من هیچ بەرهەڵستییەکم نیشان نەدا، لەگەڵ خۆم بیرم دەکردەوە، بۆچی نا؟ شتەکان لە ڕۆژی پێشتردا بەئاراستەیەکی زۆر خراپ چووبوون، چۆن هەندێ تویتی دیکە دەتوانن ڕەوشەکە خراپتر بکەن؟ ئەمە خوارەوە تویتەکانن:

سەرۆك ئۆباما ڕێککەوتنێکی خراپ و ترسناکی لەگەڵ ئێران کردووە- ١٥٠ ملیار دۆلار و ١،٨ ملیار دۆلاری دیکەیان بە کاش پێبدەن! ئێران لەنێو کێشەیەکی گەورەدایە و ئۆباماش لە ڕووی دارایییەوە یارمەتییان دەدات. هەرچی زووە ڕێگەیەکی ئازادیان بۆ دابین بکەن تا ببنە خاوەن چەکی ناوکی. لەبری ئەوەی بڵێن سوپاس، ئێران هاواردەکات و....

مەرگ بۆ ئەمریکا. کۆتاییم بەو ڕێککەوتنە هێنا کە تەنانەت لەلایەن کۆنگرێسیشەوە پەسەند نەکرابوو، و ئابلووقەی بەهێزمان بەسەریان سەپاند. ئەوان ئێستا وڵاتێکی زۆر لاوازترن زیاتر لەوکاتەی کە سەرۆکایەتیم گرتبووەدەست. ئێران هۆکارە بۆ کێشە سەرەکییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین. ئێستا ئەوان وێران بوونە!...

لە ڕۆژی دووشەممەدا فڕۆکەیەکی بێفڕۆکەوانی ئێمەیان خستە خوارەوە کە بەسەر ڕووبەرێکی ئاوی نێودەوڵەتییدا دەفڕی. ئێمە شەوی ڕابردوو ئامادەکاری تۆڵەسەندنەوەمان کرد تا هێرش بکەینەسەر سێ پێگەی جیاوازی ئێران، من وەك ترەمپ پرسیارم کرد چەندە قوربانی لێدەکەوێتەوە، ژەنەڕاڵەکەمان گوتی جەنابی سەرۆك ١٥٠ کەس. ١٠ خولەك بەر لەو هێرشە ئیدی وەستاندم...

خستنەخوارەوەی ئەو فڕۆکە بێفڕۆکەوانە کارێکی ناتەواو و ناهاوسەنگ بوو. من پەلەم نییە. سوپای ئێمە دامەزراو، تازە و ئامادەیە بۆ

هەر کاردانەوەیەك، تا ئێستاش باشترینی جیهانە. چەندان ئابلووقەی توند شەوی ڕابردوو لەسەر ئێران زیادکراون. ئێران هەرگیز ناتوانن ببنە خاوەن چەکی ناوکی، ناتوانن لەدژی ئەمریکا و جیهان بووەستنەوە.

پێم وابوو و لە ڕاستیدا وا بیرم دەکردەوە، "ئەگەر بیەوێ ئەو بڕیارە گەمژانە بدات، کەوایە من چیم تا بەرهەڵستی نیشان بدەم و ڕەتی بکەمەوە؟" بڕوام وابوو خۆی خاوەنی ئەو بابەتەیە و ئیدی دوای ئەم تویتانەش خەڵکیش تێدەگات لەوەی تەواوی ئەم بابەتە چەند کەسیی (شخصی) بووە. جێگەی سەرسامی بوو لەوەی چۆن ئەوە بۆ خەڵکی عەوام ڕوون بکەینەوە، بەڵام هیچ ڕێگەیەك نەبوو لەوەی بتوانین ترەمپ بووەستێنین لەوەی چیدیکە ئاوایی خۆی دەرنەخا.

لەکاتژمێر ٨:٤٥ خولەك پەیوەندیم بە دەنفۆرد کرد تا ئاگاداری دوایین گۆڕانکارییەکان بم. ئەویش گوتی تا کاتژمێر یەکی بەیانی بەئاگابوومە تا لەسەر بابەتی "قوربانییەکان" گەڕأن و پشکنین بکەم. ترەمپ بەیانی ڕۆژی هەینی دیسانەوە ڕەئی گۆڕی. دەنفۆرد دڵخۆش نەبوو، گوتیشی کە ترەمپ بە کەسێکی "لاواز" بانگی کردووە لە کاتی ئەو کۆبوونەوەیەی لە کۆشکی سپی کرا، بەوپێیەی ترەمپ پێیوابووە کە بژاردەی ئامانجەکەی دەنفۆرد "زۆر بچووك" بووە و دواتریش هەر خۆی بابەتی هێرشەکەی پووچەڵ کردۆتەوە چونکە پێیوابوو "قوربانی زۆری لێدەکەوێتەوە". ئەمە خاڵێکی باشە. هەر لەسەر بابەتی قوربانییەکان، دەنفۆرد گوتی: باشە، دوای کۆبوونەوەگەی کۆشکی سپی، پارێزەرانی پنتاگۆن پرسیاریان کرد کە چاوەڕواندەکرێ ژمارەی قوربانییەکان چەند بێ. دەنفۆردیش گوتبووی "ئێمە نازانین"، ئەمە هەر هەمان ئەو قسەیەش بوو کە لە کاتی کۆبوونەوەکە گوتبووی. پارێزەرەکان دواتر بەدوای ئەوەبوون کە ئاخۆ ئەو ئامانجانەی هەڵمانبژاردووە و چەندە قوربانی لێدەکەوێتەوە، ئەوانیش گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە بەگوێرەی هەر زنجیرە هێرشێك لەوانەیە ٥٠

کەس بکوژرێ. دەنفۆرد گوتی "ئەمە قسەی پارێزەران بوو"، مانای وایە هەر کەسێك کە فەرمان دەکات یان بەرپرسیارە لەو هێرشە ئەوا تەنیا بە "خەملاندن" ژمارەکە دەڵێن. هەروەها دەنفۆرد بەباشترین شێوە دەیزانی کە ئەو هێرشەی خەریکبوو ئەنجامبدرێ، ئەوا هیچ کێشەیەکی یاسایی نەبوو. هیچ کەسێك گلوپی زەردی هەڵنەکردووە. دەنفۆرد گوتیشی کە لە کاتژمێر ٧:١٣ ئێوارە ترەمپ تەلەفۆنی بۆ کردووە تا پێی بڵێت کە دەکرێ ١٥٠ کەسی ئێرانی نەبنە قوربانی لەو هێرشانەدا. دەنفۆرد گوتی کە ترەمپ هەر خۆی وەڵامی خۆی داوە و گوتی" نەخێر ١٥٠ کەس ناکوژرێ". دەنفۆرد گوتی: یەکەم: ئێمە جارێ پێش هەموو شتێك لە سێ پێگەوە کردمان بە دوو پێگە چونکە یەك لەوانە کۆکراوەتەوە و گوازراوەتەوە، و دڵنیاش نین ئاخۆ ئەو پێگەیە هەر لەو شوێنە ماوە یان نا. ئەمەش مانای وایە کە گریمانەی ژمارەی کوژراوەکان لە زۆرترینیدا ناگاتە سەد، تەنانەت گەر بە گریمانەی پارێزەرەکانیش بێ. دەنفۆرد گوتیشی تەنانەت بۆ دوو شوێنەکەی دیکەش، ئێمە هەڵسەنگاندمان کردووە کە لە بەرزترین حاڵدا دەگاتە ٥٠ کەس، و هەوڵمدا ئەمە بۆ ترەمپ ڕوون بکەمەوە کە بۆچی ئاوایی دەبێ، چونکە لە نیوەی شەودا بەکاتی ئێران، ئەوا ژمارەیەکی زۆر کەمتری کەسەکان لەو شوێنانە دەبن. دەنفۆرد چیدیکە نەیتوانیبوو ڕوونکردنەوەی زیاتر بدات بەتایبەتی کاتێ ترەمپ گوتبووی" من حەزم بەو کارە نییە. ئەوان هیچ کەسێکی ئێمەیان نەکوشتووە. من دەمەوێ ئەو هێرشە ڕابگرم. نامەوێ ١٥٠ کەس بکوژرێ."

دواتر منیش باسی ئەوەم کرد کە لەڕوانگەی منیشەوە چی ڕوویداوە، بەتایبەتی ئەو چوونەی ئایزنبێرگ بەخێرایی بۆ کۆشکی سپی و شوێنی ئەو "خەملاندن"ە کەوتبوو کە پارێزەرەکان کردبوویان. دەمتوانی هەست بکەم کە دەنفۆرد بەهۆی ئەمەوە لە تەلەفۆنەوە ئەوەندە سەرسامە سەری بادەدات. دەنفۆرد گوتی" من تەنیا دەمویست سەرۆك ئەو بڕیارە بدات، بەڵام شەوی

ڕابردوو ئەو بڕیارەی نەدا". کاتێ ئەمە ڕوودەدا، ئیدی چەندان دەرئەنجامی دەبێ. دەنفۆرد دواتر دەنگی نزم بوویەوە. دواتر دەنفۆرد گوتیشی" ئەدی تویتەکانی ئەم بەیانییەی. ئەو بە ئێرانییەکان دەڵێت هەرچەند بۆتان دەکرێ ئەو کارانە بکەن کە ویستان لەسەرە و بەردەوامبن لە ئازاردانی ئەمریکییەکان. ئەمە مانای وایە هەر کارێکی دیکە کە ویستیان لەسەربێ دەتوانن ئەنجامی بدەن." ئەو قسەیەی دەنفۆرد زۆر تەواو بوو.

لەکاتێکی دواتری ئەو بەیانییە ترەمپ گوتی کە تویتەکانی "تەواو"ن و هەروەك گوتیشی " تەهران هاوشێوەی ئێرەیە. خەڵك لە ژوورەکان کۆبوونەتەوە و باسی ئەم بابەتە دەکەن."- ئەمەیان نموونەیەکی دیکەی کارە سەراوژێرەکانی ترەمپ بوو- "ئێرانییەکان دەمرن لەپێناو ئەوەی گفتوگۆمان لەگەڵ بکەن." دواتر زانیمان کە ترەمپ (ڕاند پۆڵ)ی دەستنیشانکردووە تا گفتوگۆ لەگەڵ ئێرانییەکان بکات. کاتێ ئەو هەواڵەم لە ڕۆژی شەممە گەیاندە پۆمپەیۆ، ئەوا هیچ قسەیەکی پێ نەما، ئەویش هەمان کاردانەوەی منی هەبوو: ئەم بابەتە کاریگەری لەسەر ئاوەزی ترەمپ دانابوو، هەر شتێکیش هەستیاربووایە و پەیوەندی بە ڕاند پۆڵ هەبووایە، ئەوا ترەمپ متمانەی پێدەکرد، بۆیە پێشمان وابوو هەر ئەم بابەتە چارەنووسی سەرۆکایەتیەکەیشی یەکلایی دەکاتەوە. بە پۆمپەیۆم گوت کە من وەك چۆن بۆڵتن ڕۆژی یەکشەممە لە ئۆرشەلیم چاوم بە نەتەنیاهۆ دەکەوێ، ئەم کۆبوونەوەیەش بۆ من چارەنووساز دەبێت بەتایبەتی ئەوەی کە من بیری لێدەکەمەوە گەر وابێ، ئەوا کارکردنی من وەك ڕاوێژکاری ئاسایشیی نەتەوەیی کۆتایی پێدێت. پۆمپەیۆ گاڵتەی کرد و گوتی " گەر وابێ ئەوا هەردووکمان دەست لەکاردەکێشینەوە". دوای هەموو گفتوگۆیەی نێوانمان لەڕۆژی هەینییدا، پێم وابوو پۆمپەیۆش لەمبارەیەوە زۆر جددییە. ئەگەر ئاواش بێ، و هەردووکمان لەیەك کاتدا دەستلەکاربکێشینەوە، ئەوا چارەنووسێکی نادیار چاوەڕوانی هەردووکمان

دەکات. لەکاتێکدا هەموو ئەمانە پێنەدەچوو ڕووبدات، کەچی لەئێستادا لەهەموو کاتێك زیاتر لەیەکترییەوە نزیك بووین. ڕۆژنامەنووسان دەربارى من پرسیاریان لە ترەمپ کردبوو، ئەویش لەوکاتەدا کە خەریکبوو لەرۆژی شەممە بەرەو کامپ دەیڤد دەچووم، گوتبووی کە "لەگەڵ جۆن بۆلتن خاڵی ناکۆکمان زۆرە... جۆن کارێکی زۆر باش دەکات بەڵام بەشێوەیەکی گشتی جۆن بڕاردە و هەڵوێستی توند هەڵدەبژێرێت...خەڵکی دیکەم هەیە کە ئاوا بەتوندی مامەڵە ناکەن، بەڵام ئەوەی کێشەی بێ ئەوا منم." کەوابێ، ڕەنگە بپرسن چەندی دیکە پێویستە بەرگە بگرم و بمێنمەوە.

هەر چۆنێك بێت، چەند کاتژمێرێك دواتر من بەرەو ئیسرائیل چووم، هیچ هۆکارێك نەبوو تا ئەو گەشتە نەکەم بەتایبەتی لەوکاتەوەی کە هێرشەکەی سەر ئێران پووچەڵ کرابوویەوە. لە ئیسرائیل، پیاچوونەوەیەکم بۆ ئەو شتانە کرد کە لەسەر ئێران بوون. نەتەنیاهۆ و تیمەکەی جەختیان لەسەر دواهەمین زانیاری دەکردەوە کە خۆیان لە هەڵمەتێکی ئازایانەدا توانیبوویان بچنەنێو ئەرشیفی سیستەمی ناوکی ئێرانی، هەروەها پشکنینەیەك بەدوا یەکەکانی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی بۆ ناوچەی تورکوزئاباد ئەنجامیدابوو، تیایدا دەرکەوت کە یۆرانیۆمیش بەرەوپێش دەبەن. ئەمەیان شوێنێك نەبوو بۆ زیادکردنی یۆرانیۆم، بەڵکو تەقریبەن کێکی زەرد بوو( کێکی زەرد بریتییە لە ئۆکسیدی یۆرانیۆم بوو لە شێوەیەکی ڕەقدا)، بێگومان ئەم بەڵگەیە پێچەوانەی ئەو قسانەی تەهران بوو کە بەردەوام دووپاتیان دەکردەوە کە ئێمە هەرگیز پرۆگرامی چەکی ناوکییان نییە. ئێران دەیویست تورکوزئاباد پاك بکاتەوە هەروەك چۆن لە ساڵی ٢٠٠٤ هەوڵیدا وێستگەی لاڤیزان پاك بکاتەوە، هەروەها ئەو تەقینەوانەی وەك تاقیکردنەوە لە ناوچەی پارچین لەنێوان ساڵی ٢٠١٢ و ٢٠١٥دا ئەنجامیاندابوو، بەڵام لەهەموو ئەمانە دیسانە شکستیان هێنا. ئەمەیان

دەکرێ ببێتە بەڵگەیەك بەوەی ئێران هێشتا "پرۆژەی ئەماد"ی بۆ دروستکردنی چەکی ناوکی بەزیندوویی هێشتۆتەوە کە بڕیاربوو لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە کۆتایی بهاتبایە، هەر بۆیە ئەمە وادەکات تەهران لەمەیدانی نێودەوڵەتییدا بخاتە ڕەوشێك و پێویست بکا بەرگری لەخۆی بکات.

ئەمجارەیان لە واشنتن، وادیاربوو پنتاگۆن وەك خەسڵەتی خۆی، لەدژی ئەو ئابلووقانەبوو کە ترەمپ دواجار بڕیاری لەسەردابوو تا بخرێتەسەر نووسینگەی ڕابەڕی باڵای ڕژێمی ئێران. لەکاتێکدا من و پۆمپەیۆ لەدەرەوەی ئەمریکا بووین، بەڵام لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاشایشی نەتەوەییدا بەرلەوەی ئەم بابەتە بچێتە بەردەستی ترەمپ، گفتوگۆی لەبارەوە کرابوو و پێیانوابوو کاتەکەی گونجاو نییە. لەگەڵ ئەمانەش، کۆبوونەوەیەکی دیکە ڕێکخرا، منیش لەڕێگەی ڤیدیۆی سەتەلایتییەوە لەنێو باڵەخانەی پێشتری کونسوڵخانەی ئەمریکی و باڵیۆزخانەی ئێستا (بەشێوەی کاتی) لە ئۆرشەلیمدا بەشدارییم کرد. ئێسپەر و دەنفۆرد نیگەرانی ئەوەبوون کە ئەو ئابلووقە پێشنیارکراوانە ڕێگری دەکات لەوەی نەتوانین دانوسان لەگەڵ ئێران بکەین. (پۆمپەیۆ بەهۆی گەشتکردنەوە نەیتوانی بەشداری بکات، بەڵام دواتر بە "ئێسپەر"ی گوتبوو کە بیرۆکەکەی هەردووکتان گوێ لێبووە، بۆیە پێشیوابوو کە دەتوانێ چارەسەری ئەم کێشەیە بکات).

ترەمپ هاتەنێو بابەتەکە و گوتی"تەنانەت دوژمنەکانمان حەزیان لەوەبووە کە هێرشمان نەکردووە". (ئەوە بەجددیتە و گاڵتە ناکەی!) "ئێمە سەرمایەی کەڵەکەبوومان هەیە. ئەوەی کردمان لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی دواییدا باشترین کاری سەرۆکایەتی بوو. ئەم بڕیارە زۆر بەباشی کاری خۆی کرد." منوشن وەك وەزیری خەزنەی ئەمریکا گوتی پێویستە پەنا بۆ فەرمانی جێبەجێکردن(executive order) ببەین کە خۆی ڕەشنووسەکەی نووسیبوو، تیایدا ئابلووقە نەخرێتەسەر خامەنایی، تەنیا بخرێتەسەر

نووسینگەکەی، منیش پێم وابوو ئەمە هەڵەیە. ترەمپ لەوەڵامدا گوتی "ئەگەر ئابلووقەکە بخەینەسەر ڕابەری باڵا، ئەوا زۆر کاریگەرتر دەبێت"، بێگومان ئەم قسەیەی ترەمپ زۆر تەواو بوو. چەندان گفتوگۆی دیکەی سەرلێشێواو بەدوای داهات، ترەمپیش گوتی" ئێمە بەراستی نازانین کاریگەری ئابلووقەکان چۆن دەبێ". لە ڕاستیدا، پێم وایە ئەمە لە کاتی گفتوگۆکاندا یارمەتیدەر دەبێ. زۆربەیان گوتیان لە کاتی گفتوگۆکان لەگەڵ ئێران ئەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە. دواتر گوترا بۆچی ئابلووقە نەخەینەسەر فەرماندەی هێزەکانی قودس قاسم سولەیمانی؟، ناوی ئەویش بخەنە نێو ئەو لیستە". کاتێ یەکێك گوتی کە قاسم سولەیمانی لەوانەیە پێشتر ئابلووقەی دیکەی خرابێتەسەر، ترەمپ گوتی "هەر چۆنێك بێ، ناوی ئەویش زیاد بکەن. جۆن دەکرێ ناوی ئەویش زیادبکەی؟"

منیش گوتم: "بەڵێ، دەتوانم جەنابی سەرۆك".

ئەوجارە گوتی "دەتوانی ناوی ڕابەری باڵاش زیادبکەی؟"

منیش دیسانەوە گوتم: "بەڵێ، جەنابی سەرۆك".

ترەمپ گوتی "نازانم ئەوە باشە یان خراپ، بەڵام دەمەوێ ئەمە بکەم. ئەوان پێویستە هۆکارێکیان هەبێ تا دانوسانی پێوەبکەن. " ترەمپ گوتی" جەواد زەریفیش زیاد بکەن، وابکەن ئابلووقەکان بەهێزبێت، زۆر زۆر بەهێزبن". ئیدی ترەمپیش کۆتایی بە قسەکانی هێنا.

بە باسکردنی ئەو بابەتانە و هەوڵدان بۆ بلۆکردنی ئەو ڕەشنووسەی تایبەت بە (فەرمانی جێبەجێکردن) نووسرابوو، دەنفۆرد و ئێسپەر لەپێناو پێگەی خۆیان شتەکانیان خراپتر کرد. ئەم باسانە بەشێوەیەکی باش خزمەتی کردن. من هەروەها وابیرم کردەوە کە ترەمپ سەرەڕای ئەو بڕیارەی خراپەی لە کۆبوونەوەی ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممە دایبوو، سەرەڕای بەرهەڵستییەکانم، کەچی دەیەوێ بە ئەوانی دیکەی نیشان بدات

کە هەروەك هەمـوو کەسـێك دەیزانـی، هێشـتا نـایەوێ مـن لە کـارەکەم دووربخاتەوە. من پێم وابوو دەرئەنجامی ئەو کۆبـوونەوەیەی ئەنجـوومەنی ئاسایشیی نەتەوەیی تەقریبەن وەك سەرکەوتنێکی تەواو وابـوو. (سـکرتێری دەوڵەت پۆڵ پاتێ (Paul Pate) دواتـر قەنـاعەتی بە ترەمـپ هێنـابوو تـا ئابلووقەی سەر جەواد زەریف بۆ ٣٠ ڕۆژ دوابخرێ. من دەمویسـت بـزانم ئـاخۆ ئەمەی لەگەڵ سـکرتێری دەوڵەت ڕودی گویلیـانی باسـکردووە؟ بەهەرحاڵ، تا کۆتایی تەمموز، ترەمـپ دیسـانەوە پیـاچوونەوەی بەم پرسـە کـرد، بـۆیە ئامـادەبوو ئـابلووقە بخاتەسـەر زەریـف، ئـێمەش ئەو کارەمـان جێبەجێکرد). دواتر ترەمپ لە واشنتن چەند تویتێکی بڵاوکردەوە:

سەرکردایەتی ئێران لە وشەکانی (جـوان) و (بەزەیـی) تێنـاگەن، ئەوانە هەرگیز نابنە خاوەنی مامەڵەیەکی ئاوایی. بەداخەوە، ئەو شـتەی ئەوان لێـی تێدەگەن بریتین لە هێز و دەسەڵات، ئەمریکاش تا ئێستا خاوەن بەهێزتـرین هێزی سەربازییە لەجیهاندا، هاوکات تەنیا لە مـاوەی دوو سـاڵی ڕابـردوودا بای ١,٥ ترلیۆن دۆلار وەبەرهێنانمان کردووە...

خەڵکی باشی ئێران نارەحەتی دەچێژن، هیچ هۆکارێکیش نییە تـا ئەو خەڵـکە ئاوایـان بەسـەربێ. سـەرکردایەتی ئەو وڵاتە هەمـوو ئەو پـارەیەی هەیانە لەپێناو تیرۆردا خەرجـی دەکەن، کەمێکـی بـۆ بوارەکـانی دیـکەیە. ئەمریکـا بەکارهێنـانی بۆمبەکـانی جـۆری EFP و IED لەبیرنەکـردووە، کە بووەهۆی کوشتنی ٢٠٠٠ ئەمریکی و چەندانی دیکەشی بریندار کرد.

ئەمرۆ نەزانتـرین و چەواشـەکارترین لێـدوانمان لە ئێـرانەوە بینـی، ئەمە تەنیـا دیـارخەری ئەوەیە کە ئەوان لە ڕاسـتییەکە تێنـاگەن. هەر هێرشـێك لەلایەن ئێـــرانەوە بکرێتەســـەر ئەمریکـــا ئەوا کـــاردانەوەیەکی گەورە و ســەرکوتکەری بەدوادێــت. لەهەنــدێ لایەنــدا، ســەرکوتکردن بەمانــای کۆتایهێنـانی یەکجـاری دێـت. چیـدیکە جـۆن کێـری و ئۆبامـا مامەڵەتـان لەگەڵ ناکەن!

هەروەك بڵێـی ئەو کارەسـاتەی لە دوای کەوتنەخـوارەوەی فـڕۆکە بێفڕۆکەوانەکە بەس نەبووبێ، کەچـی ڕاسـتەوخۆ کەوتیـنە ژێـر هێرشـێکی دیپلۆمـاتیکی مـاکرۆنی سـەرۆکی فەرەنسـا. مـاکرۆن لەرێـگەی ئەو دەستپێشـخەرییە خـراپەی هەیبـوو بەجـددی لەگەڵ سـەرۆك ڕووحـانی کـاریکردبوو و پێشـیوابوو ئێـران لەرێـگەی چـالاکییە ناوکییەکـانی سنوورەکانی ڕێککەوتنامەی پرۆگرامـی نـاوکی نابەزێنێـت. مـاکرۆن بەبێ هیچ گومانێك پێی وابوو هێورکردنەوەی ئابلووقەکانی سەر ئێران هۆکاری سەرەکییە بۆ دەستپێکردنی دانووسانەکان، یان ڕێککەوتنی ناوکیی بەنرخی یەکێتیی ئەورووپـا دەکـرێ ببێـتە هۆکارێـك بـۆ کـۆکردنەوەی لایەنەکـان. ماکرۆن پێیوابوو بەبێ تەنازولاتی ئەمریکا، ئێران هەرگیز نایەتەسـەر مێـزی گفتوگـۆ، ئەمەش بەلای مـنەوە شـتێکی ئاسـایی بـوو. دەربـارەی ئەو تەلەفۆنەی بڕیاربوو ترەمپ لە ڕۆژی دووشەممە بەرواری ٨ی تەممـوز بـۆ ماکرۆن بیکات، من و پۆمپەیۆ کورتەیەکمان بە ترەمـپ دا لەسـەر ئەوەی دەکرێ پێشبینی چی بکات، هاوکات پۆمپەیۆ گوتی ئێمە پێمانوایە ماکرۆن پێشنیاری تەنازولێکی لەناکـاو دەکـات تەنیـا بەو مەبەسـتەی دانووسـانەکان دەستپێبکات"، ئەمەش کتومـت ئەوەیە کە جـۆن کێـری و ئۆبامـا کردیـان. بێگومان ئەمە بیرۆکەیەکی خراپە." ترەمپ لەوەڵامدا گوتی" ئـێمە ڕۆژێـك دادێ ڕێککەوتنێك بکەین. هیچ هۆکارێکی ڕاستەقینە نییە تـا ئابلووقەکـان کەم بکەینەوە. کاتێ ئەمە دەکەیـن، ئەوا زەحـمەتە بتـوانین بیـانهێنینە سـەر ڕێگەکە"، ئەو قسەیەی ترەمپ زۆر ڕاسـت بـوو. ئەم گفتوگـۆیە هەنـدێك درێژەی کێشا، دواتریش بابەتی پەرەسەندنی چالاکییەکانی ئێـران لەبـواری یۆرانیۆمدا کەوتە بەرباس. ترەمـپ گـوتی "لەوانەیە پێویسـت بکـات زەربە لەوەش بدەین"، دواتریش گەڕایەوە سەر بابەتی ئەوەی ئاخۆ کەی (میللی) شوێنی دەنفۆرد دەگرێتەوە: " ئایـا پێویسـتە (میللـی)یش تـێکەڵ بەو بـابەتە بکەین؟ ڕەنگە پێویسـت بـێ ئەمە لە مـاوەی دوو هەفـتەدا ئەنجام بـدەین.

ئەگەر مووشەکی تۆماهۆك لەبەردەم دەروازە دابنێی، ئەوا هیچ بایەخێك نادەم بەوەی ئەو خەڵکە چی دەڵێن، ئەمەیان شتێکی خراپە." ئەو قسەیەی ترەمپیش هەر ڕاست بوو، لەگەڵ ئەوەش نەمدەزانی ترەمپ لەگەڵ کام دەروازەیەتی، یان لەکوێ ئەو ژمارە بیستەی وەرگرتووە."

ئەوەی من و پۆمپەیۆ نەماندەزانی (تەنانەت هیچ کەسێکیش لەنێو وەزارەتی دەرەوە و ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوەیی نەیدەزانی)، بێگومانیش بە هیچ شێوەیەك قبووڵ نەکرابوو، ئەویش بریتیبوو لەو گفتوگۆیە بێدەنگەی منوشن لەگەڵ وەزیری دارایی فەرەنسا برۆنۆ لی مایەر دەیکرد، منوشن خەریکی کارێك بوو کە ترەمپ گوتبووی من نایکەم. دواتر لە (مولڤانێی)یەوە زانیم کە گوتی منوشن تەلەفۆنی بۆ کردووە تا ڕایبگەنێت کە ئێمە ڕێککەوتنێکمان لەگەڵ ئێران هەیە، دواتر منوشن هەمان شتی بۆ منیش (جۆن بۆڵتن) دووبارە کردەوە. نە پۆمپەیۆ، نە من هیچ شتێکمان نەدەزانی دەربارەی ئەو گفتوگۆیەی منوشن لەگەڵ لی مایەر کردبووی (منوشن دەیگوت ئەمە شتێك بووە کە ترەمپ و ماکرۆن لە کۆبوونەوە و کاتی نانخواردنی ڕۆژی " D- Day[1]"دا لەسەری ڕازیبوونە). لەگەڵ ئەمانەش، ئەمە گفتوگۆیە دەنگۆی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، هاوشێوەی ئەو گفتوگۆیە بازرگانییەی منوشن لەگەڵ چینییەکان هەیبوو، ڕێککەوتنێك کە خەریکبوو تەواودەبێ، یان هەر پێشتر هەمووشتێکی تەواوکردبوو. منوشن هەرگیز لە گفتوگۆیەك نەدەبینرا کە تیایدا نەیتوانیبا تەنازولاتی زۆر بکات و دواجار نەتوانێ بریاری ڕێککەوتنێك بدات. کاتێ ترەمپ قسەی لەگەڵ ماکرۆن کرد، ئەوەی

---

[1] دابەزینی نۆرماندییەکان، ئەمەیان نۆپەراسیۆنی دابەزینی هێزە هاوپەیمانەکان بوو لە ڕۆژی ٦ی حوزەیرانی ١٩٤٤ لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانییدا. ئەم نۆپەراسیۆنە پێی دەڵێن (دی دەی)، هاوکات گەورەترین هێرشی داگیرکاریی دەریاییە لە مێژوودا.

جێگەی نیگەرانی من بوو ئەوەبوو کە تەنانەت ترەمپیش نەیدەزانی کە منوشن خەریکی ئەنجامدانی گفتوگۆیەکی خراپ و پڕە لە تەنازولاتە کە هەر ئەوکاتەش ماکرۆن باسی لە گفتوگۆی نێوان منوشن و لی مایەری کرد. دوای ئەوەی ترەمپ باسی لە مامەڵەی جۆن کێری کرد کەوا چۆن لەبەرانبەر یاسای لۆگان یاساشکێنی کردووە، ماکرۆن ڕاستەوخۆ پرسیارکرد لەوەی ترەمپ ئامادەیی تێدایە دەستبەرداری چی ببێت، لێرەدا بەپوختی مەبەستی خوێندنەوەی ئاوەزی ترەمپ بوو بەوەی دەکرێ چ تەنازولاتێك بۆ ئێران بکات بەبێ ئەوەی لەبەرانبەردا هیچ شتێکی دەستکەوێ. لەگەڵ ئەوەی ترەمپ سەرەتا قسەی کرد، بەرلەوەی تەلەفۆنەکە کۆتایی بێت باسیان لە کەمکردنەوەیەکی بەرچاوی ئابلووقەکانی سەر نەوت و لایەنی دارایی ئێران کرد بۆ ماوەیەکی کورتی دیاریکراو، وادیاریشبوو کە ترەمپ ڕازیبوونی خۆی نیشاندابوو. ئەمە ئەو شتەبوو کە من و پۆمپەیۆ ململانێمان لەسەری دەکرد و دەمانویست ڕێگریی لێبکەین.

کارەساتێکی دیکە. دوای ئاهەنگێکی ئاسایی تایبەت بە پێشکەشکردنی دۆکیۆمێنتی باڵیۆزە نوێیەکان لەنێو کۆشکی سپیدا، من لەدواوە مامەوە تا پرسیار لە ترەمپ بکەم تا بۆم ڕوونبکاتەوە لەوەی چ دەستەوارەیەکی پێشکەش بە ماکرۆن کردووە. ترەمپ لە توانای ماکرۆنی کەمکردەوە و بەڵام گوتیشی ماکرۆن یەکێك لەو جۆرە کەسانەی کە دەتوانێ ڕێککەوتنەکە بکات. ترەمپ گوتی ئەوە تەنیا کەمکردنەوەی هەندێ لە ئابلووقەکانی سەر نەوتی ئێرانە بۆ ماوەیەکی کەم، ئەمەش لە پێشنیارەکانی دیکە باشتربوو کە لەگەڵ ماکرۆن قسەیان لەسەر کردبوو، بۆیە منیش ئەمە ڕاستەوخۆ بە هاوشەنە فەرەنسییە نوێیەکەم ئیمانوئێل بۆن گەیاند. ترەمپ گوتی" گرنگی بە نەوت نادەم، هەرکاتێ بمانەوێ دەتوانین ئابلووقەکان بەگەڕ بخەینەوە." بێگومان، ئەمە تەواو پێچەوانەی ئەوەبوو کە کەمێك

پێشتر بە من و پۆمپەیۆی گوتبوو، ئاگاداری پۆمپەیۆشی کردبوو کە دەیەوێ تەلەفۆن بۆ گراهام، کروز و تۆم کۆتن بکات تا کۆمارییە ئۆپۆزسیۆنەکان بوروژێنێت لەوەی خۆی بەتەمایە دانوسان لەگەڵ ئێران بکات. تۆماری ئەو تەلەفۆنەم بۆ پۆمپەیۆ نارد و کاتێکی دواتری ئەو ڕۆژە قسەشم لەگەڵی کرد. تەنازول بۆ کەمکردنەوەی ئابلووقە لەسەر نەوتی ئێران "جێگەی باوەڕ"ی پۆمپەیۆ نەبوو، هەروەك جێگەی باوەڕی منیش نەبوو، چونکە ئەمە دەریخست کە ترەمپ تێناگات لەو زیانەی بەسەر هەوڵی "بەرزترین فشار"ی ئێمەدا دێت، بەوپێیەی وەك ئەوەی کۆنترۆڵی لەدەستبێ، بەدڵی خۆی کەم و زیادیان بکات. جارێکی دیکە، پۆمپەیۆ ئامادەبوو دەستلەکاربکێشێتەوە، گوتیشی مەسەلەکە تەنیا کاتە ئەگەر نا هەردووکمان ئەو کارە هەر دەکەین. پۆمپەیۆ گوتیشی "ئێمە لەوانەیە ئەو بۆمبە بتەقێنینەوە، بەڵام ئەوەی دواتر خراپتر دەبێت..." و دواتریش پەیوەندییەکەمان کۆتایی هات. هەموو ئەو هیوایەی هەمانبوو ئەوەبوو کە ئێران جارێکی دیکە بکەوێتەژێر ڕزگاری ئێمەوە.

من بەتەواوی لەو بابەتە ناچالاك و نادیار نەبووم، هانی نەتەنیاهۆ دا تا تەلەفۆن بۆ ترەمپ بکات لە ١٠ی تەممووزدا تا وایلێبکات ئەو سزایەی سەر ئێرانی توندتر بکات. لەمیانەی دوو کاتژمێردا ترەمپ تویتێکی بڵاوکردەوە:

ئێران ماوەیەکی درێژە بەنهێنی خەریکی بەهێزکردنی پرۆگرامەکانیەتی، ئەمەیان پێشێلکردنێکی تەواوی ئەو ڕێککەوتنە ١٥٠ ملیار دۆلارەیە کە جۆن کێری و ئیدارەی ئۆباما ئەنجامیاندا. لەبیرتان بێت، ئەو ڕێککەوتنە لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا بەسەردەچێت. لە ماوەیەکی کەمدا ئابلووقەکان بەشێوەیەکی بنەڕەتی زیاتردەکرێن!،

ئێمە خەریکی بەرەوپێشبردنی پرۆگرامێکی یاوەر(بەدیل) بووین بۆ ئەو

کەشتییە بارهەڵگرانەی لە کەنداو بوون، ئەو پلانە پێیدەگوترا (ئۆپەراسیۆنی پاسەوانیکردن)، تیایدا سعودیە و ئیمارات و بەریتانیا و وڵاتانی ئەورووپی دیکەش بەشداریان دەکرد، ئەمە بەلایەنی کەم دەبووەهۆی ئەوە ڕێگری لە ئێران بکەن ئەوەندە دەستوەردان لە بازارەکانی نەوت لەجیهاندا نەکات. پێش ئەمە لە ٤ی تەمموزدا، مارینزەکانی سەر بە سوپای شانشینی بەریتانی کە بۆحکومەتی (جەبەل تارق) کاریان دەکرد، دەستیان گرت بەسەر کەشتییەکی بارهەڵگری ئێرانی بەناوی (گرەیس ١) بەوپێیەی پێشێلی ئابلووقەکانی یەکێتیی ئەورووپای کردبوو بۆ سەر سووریا. لە وەڵامی ئەمەدا و لە ١٠ی تەممووزدا، ئێران هەوڵیدا دەستبگرێ بەسەر کەشتییەکی بارهەڵگری بەریتانی بەناوی (هێرتەج) لە گەرووی هورمزدا، لە ١٣ی تەمموزدا دەستیانگرت بەسەر کەشتییەکی ئیماراتی، کەشتییەکی پەنەمایی بەناوی (ریاه)، دواتر لە ١٩ی تەمموزدا دەستیانگرت بەسەر ئەوەی کە خۆیان دەیانویست، ئەویش دەستگرتن بوو بەسەر کەشتییەکی بەریتانی، و کەشتییەکی بارهەڵگری سویدی بەناوی (ستێنا ئیمپیرۆ). بەڕوونی، ئێران دەیویست ئاڵوگۆری بەم کەشتییە سویدیە بکا لەگەڵ ئەو کەشتییەی خۆی کە دەستی بەسەرداگیرابوو کە ناوی (گرەیس ١ بوو ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە بۆ ئەدریان دیریا ١)، لەگەڵ ئەوەش ئەو دوو وڵاتە تەواو لێك جیاوازبوون. بەداخەوە، ئەو ئاڵوگۆرە تەنیا بەو شێوەیەبوو کە بەریتانییەکان دەیانویست.

بەئاشکرایی، ئەو یارییە هێشتا بەردەوامی هەیە و بەردەوام دەبێ تا ئەوکاتەی ئۆپەراسیۆنی پارێزگاریکردن دەخەینەگەڕ، وا دەرکەوت کە پیادەکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنە زۆر زەحمەترە لەوەی پێشبینی دەکرا، چونکە زۆرێك لە وڵاتان دوودڵ بوون لەوەی بێنە نێو ئەو ئۆپەراسیۆنەوە. بەشێکی ئەم دوودڵیەیان پەیوەست بوو بە سروشتی هێورکردنەوەکە، بەڵام بەشێکی پەیوەندی بە نادڵنیایی ئەو وڵاتانەوە هەبوو بەرانبەر چارەسەرەکانی ئەمریکا

و مانەوەی خودی دەسەڵاتی ئەمریکا، چونکە هەندێکیان لە جوولە نارێك و هەڵەکانی ترەمپ دەترسان. بەهۆی خۆتەرخانکردنیان بۆ پاراستنی ڕێککەوتنامەی چەکی ناوکی لەگەڵ ئێران و خواستی ئەوەی خۆیان لە کارە حەتمییەکانی پێشتر بەدوورنەگرن تا هیچ بەربەستێك لە چوونە دەرەوەیان لە یەکێتیی ئەوروپا (بریگزت) نەیەتەپێش، تەنانەت حکومەتە نوێیەکەی (بۆریس جۆنسن)یش ئەوەندە ڕژد نەبوون لەسەر ئەم بابەتە، بۆیە کەشتی بارهەڵگری (گرەیس ١)یان ئازادکرد بەو مەرجەی نەوتەکەی لە سووریا بەتاڵ نەکات، ئەمەیان بەڵێنێك بوو کە بەراستی شیاوی ئەوەبوو کە لەندەن لەبەرانبەردا وەریگرت. بەریتانییەکان هەر بەسانایی نەیاندەویست لەگەڵ ئێران ململانێیان بۆ دروستبێ. ئەمەشیان وانەیەکی دیکەی خراپ بوو، کە بێگومان تەهرانیش بەتەواوی تێبینی ئەمەی کردبوو.

ڕۆژی دواتر کە ١١ی تەممووز بوو، هاوشانە نوێیە فەرەنسییەکەم ئیمانوئێل بۆن لە پاریسەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، کە تازە لە ئێرانەوە گەڕابۆوە. ناوبراو گوتی خامەنایی بەتەواوی هەموو هەوڵەکانی ڕەتکردەوە. فۆرمیولەی ئێران کە بریتییە لە "بەرزترین بەرهەڵستی لەپێناو بەرزترین فشار"دا، لەمەودوا ئیدی ئەو ڕێگەیە بوو کە ئێران دەیویست بەئاشکرایی بیخاتەگەڕ. لەکاتێکدا کەمکردنەوەی هەندێ ئابلووقە لەوانەیە وابکات هەندێ دانووسان بکرێ، بەڵام پرۆگرامی مووشەکی بالیستیکی بەتەواوی لە دەرەوەی گفتوگۆکان بوو، هەر خودی جەواد زەریفیش ئەمەی بەڕوونی گوت. ڕووحانی ئەویش بەهەمان شێوە ڕژد بوو: ئێران بڕوای وابوو ئەمە لەکۆتاییدا بەسەرکەوتنی خۆیان کۆتایی دێت، ئامادەشن ڕووبەرووی بەرزبوونەوەی توانای ئەمریکا ببنەوە بەهەر ڕێگەیەك کە لەبەردەستیاندایە. کانێ بۆن گوتی ماکرۆن داوای ئەنجامدانی ڕێککەوتنێکی ئابووری کرد، ڕووحانی گوتوویەتی ئێمەش ئەو ڕێککەوتنەمان دەوێ بەڵام ئێران تەنیا ئەوکاتەی کە ئابلووقەکانی

ئەمریکای لەسەر هەڵدەگیرێ، ئەوکاتە جارێکی دیکە پابەندی خۆی بە ڕێککەوتنامەی پرۆگرامی ناوکی دووپات دەکاتەوە، کە ئەمەش بەراستی مایەی گاڵتەجارییە. تەنیا بۆ ئەوەی ڕوون بێ، ڕووحانی تەئکیدی کردەوە لەوەی ڕابەری باڵای ئێران تەنیا بەو مەرجە ئەمەی قبووڵ کردووە. من بەڵێنم بە بۆن دا کە دەربارەی ئەو قسانەی ترەمپ ئاگاداردەکەمەوە و دەوروبەری کاتژمێر ۳:۳۰ ئێوارە دەیبینم. ترەمپ گوتی "هەر ئەوەیە. ئەو دەستەوارەیە بکشێننەوە. بەو ئابلووقەیە لێیان بدەن. ئامادەبن بۆ لێدانی پێگەکانی (....) هێشتنەوەی ناوی ئەم پێگانە بەنهێنی پێویستە، ئەمیش بەهۆی نەبوونی ڕازامەندی پێشوەختە"، هەر خۆیشی ئێمە لەمبارەیەوە گفتوگۆمان کردووە. ترەمپ دواتر هاتەوە سەرباسی کشانەوە لە سووریا. ئەوکاتەی کە لە نووسینگەی سەرۆکایەتی چوومەدەرێ، منوشن لە دەرەوە چاوەڕوانی دەکرد، بۆیە ئەو دەرفەتەم بەباش زانی تا ئەو هەواڵە خۆشە بە منوشن بڵێم، بۆیە پێمگوت کە هەوڵەکانی فەرەنسا لەگەڵ ئێران شکستی هێنا.

ڕاند پۆڵ، تا ئەوکاتە، کاریدەکرد تا وابکات جەواد زەریف لە نیویۆرکەوە بێتە واشنتن تا چاوی بە ترەمپ بکەوێ، هاوشێوەی ئەوەی (کیم یۆنگ چۆڵ)ی کۆریای باکوور ساڵی ڕابردوو کردی. هەر بۆ پێویستی، لەماڵەوە ئامادەکاری نووسینی نامەی دەستلەکارکێشانەوەم کرد کە بەکۆمپیوتەر لەتەنیا دوو خەت نووسیبووم، لەوەتەی حوزەیرانەوە بەدەست نووسیبووم، بۆیە من ئامادەبووم تا بۆ کاتی خۆی پێشکەشی بکەم.

سەرەڕای ئەو ڕەتکردنەوەی ئێران، هەوڵی ماکرۆن بۆ تەنازولەکان و هێشتنەوەی ڕێککەوتنی ناوکی لەگەڵ ئێران هەر بە بەردەوامی مایەوە و ڕژدبوونی خۆی نیشاندا. ئەمەیان نەدەبووەهۆی باشکردنی ڕێککەوتنەکە، بەڵکو بەرێگەی جیاواز و مەترسیدارەوە زیاتر لە ئاستی ئەم ڕێککەوتنەی

کەم دەکردەوە، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەبوو تا پارێزبەندی ئەو ڕێککەوتنە هەر بەزیندوویی بهێڵێتەوە. ئەمە مایەی پێکەنینە کە ترەمپ هێشتا ئامادەنییە یاخی بێت بەرانبەر ئەو سیاسەتە ئاشکرایەی هەیبوو. هەندێ کات هەبوو کە ترەمپ دەگەڕایەوە سەر ڕێچکەی خۆی، نموونەش ئەوکاتەی بەئاشکرایی پلانەکەی ڕۆژی ١٩ی تەمموزی (ڕاند پۆڵ)ی ڕەتکردەوە. ترەمپ ڕۆژی دواتر پێی گوتم "ڕاند پۆڵ کەسێکی گونجاو نییە تا ئەو دانووسانە بکات. ڕاند کەسێکە دژی بژاردەی توندە. من دوێنێ لەوە ڕزگارم بوو، نەتبینی؟" من نەمهێشت ئەو دەرفەتە بەفیڕۆ بچێ تا تێبینی بکەم، هەر بۆیە مارك لێڤین شەوی پێشتر لە بەرنامەیەکی ڕادیۆی گوتبووی کە سیاسەتی دەرەکی ڕاند پۆڵ لەبنەڕەتدا هاوشێوەی ئەوەی ئیلهان عومەرە- کە ئەندامێکی توندڕەوی دیموکراتەکانی ویلایەتی مینۆسۆتایە و ئەندامی پیرانی ئەمریکاشە. لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی دوای ئەمەدا، ترەمپ باسی لەو هەوڵە بەرگرییەی کەشتی بارهەڵگری-هێرشبەری ئەمریکی (بۆکسەر)ی بۆ کرد، ئەو کەشتییە فڕۆکەیەکی بێفڕۆکەوانی خستبۆوەخوارەوە چونکە بەشێوەیەك کە جێگەی قبووڵ نییە، نزیك بەو کەشتییە ببۆوە. بەلایەنی کەم ئێستا خەریکە بەرگری لەخۆمان دەکەین، هەرچەندە گەر بەراوردێك بکەین، ئەوا زیانی ئەوەی ئێران لەچاو فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکەی ئێمە هەر زۆر لاوەکی بوو. ماکرۆن هیچی نوێی نەبوو تا پێشکەشی بکات، ترەمپیش بەردەوامبوو لەوەی کە بە ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ ئێرانییەکان دەکات. فەرمانەکانی ماکرۆنیش هەروا بەبێ گۆڕانکاریی مایەوە.

وادیاربوو جار دوای جار ترەمپ لەو شێوەیە تێدەگات، هەروەك لە ٨ی ئابدا کاتێ دەربارەی ماکرۆن پێی گوتم" ئەوەی ماکرۆن دەستی لێدەدات، ڕاست دەبێت بە نەفرەتییەك." ئەو قسەیەی ڕاست بوو. من و پۆمپەیۆ بەردەوام دەربارەی سەرقاڵی ماکرۆن بەو بابەتەوە قسەمان دەکرد،

لەکاتێکی دواتری ئەو ڕۆژەش و دوای کۆبوونەوەی لەگەڵ ترەمپ. پۆمپەیۆ هاتەنێو نووسینگەکەم و بەپێکەنینەوە گوتی" کێشەکەم بۆ چارەسەرکردی. دەبێ تا ئێستا بەدڵنیاییەوە لەسەر ماکرۆن تویتی کردبێ. سەیرێکی بکە"، منیش بەخێرایی سەیری تویتەرم کرد، بینیم کە چەند خولەکێك پێشتر ترەمپ تویتی کردبوو، تیایدا نووسیبووی:

ئێران لەنێو کێشەیەکی دارایی ڕاستەقینەدایە. ئەوان دەیانەوێ بە تەنیا لەگەڵ ئەمریکا قسە بکەن، بەڵام ئاماژەی تێکەڵیان داوە بەهەموو ئەوانەی وا نیشاندراوە کە نوێنەرایەتی ئێمە دەکەن، یەك لەوانەش سەرۆکی ماکرۆنی فەرەنسا... من دەزانم ماکرۆن مەبەستی باشی هەیە، هەروەك هەموو ئەوانەی دیکەش هەمان کاری باش دەکەن، بەڵام هیچ کەسێك لەجیات ئەمریکا قسەی نەکردووە خودی ئەمریکا خۆی نەبێ. هیچ کەسێك ڕێگەی پێ نەدراوە بە هیچ شێوە و فۆرمێك نوێنەرایەتی ئێمە بکات!

من و پۆمپەیۆ ئێستا قاقای پێکەنینمان دەهات، بڕوایەکی هەڵەمان هەبوو کە هەوڵەکەی ماکرۆن ئیدی کۆتایی هاتووە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە کۆتایی نەهاتبوو.

ئەمەیان ئاشکرابوو بەوپێیەی ئامادەکارییەکان بۆ لوتکەی G7ی لەشاری (بیارتیز) لە کۆتایی مانگی ئابدا بەخێرایی ئەنجامدران. سەرەڕای دەنگۆکان کە فەرەنسا ڕێگەدەدا ڕووحانی وەك میوان بەشداربێت، بەڵام ڕاوێژکاری ئاسایشی فەرەنسا ئیمانوئێل بۆن بەردەوام دووپاتی دەکردەوە بۆم کە ئەمە ڕاست نییە. بەڵێ ئەمە ڕاست نەبوو- چونکە لەجێگەی ڕووحانی، جواد زەریفیان داوەت کرد. ترەمپ دوای ئەو خۆشییەی لە لوتکەی چارلفۆکس ٢٠١٨ بینیبووی، تا ڕادەیەکی زۆر پەرۆشی بەشداریکردنی نەبوو، تەنانەت چەندان جار بە من و ئەوانی دیکەشی گوتبوو کە تاخیر دێتە لوتکەکە و زووش ئەوێ جێدەهێڵێ. فەرەنسییەکان

دەیانویست ئەوەی لە لوتکەی G7 دەکرا بەدەستبێت، ئێمە دەستمان پێی نەگات و شکست بێنن، بەشێوەیەکی گشتیش لە مەسەلەی لۆجستیك و ئاسایشدا یارمەتیدەر نەبوون، کە ئەمەش وایکرد کارمەندانی هەواڵگری نهێنی و تیمی کۆشکی سپی دەستوەردان بکەنن. دوای ئەمەش، ئیمانوئێل بۆن و کەسانی دیکەش لە حکومەتی فەرەنسی ڕوونیان کردبۆوە کە ئێران وەك بابەتێکی لەپێشنەیە بۆ سەرۆك ماکرۆن، کە ئەمەش بەراستی جێگەی نیگەرانی بوو. ماکرۆن هیچ وەڵامێکی نەبوو، ئەمەش بەشێکی پەیوەندی بەوەهەبوو کە هێشتا منوشن لەگەڵ لی مایەر خەریکی کارکردنن لەسەر ئەوەی کە پێویستە ڕێککەوتنێك بکرێت.

ترەمپ هیچ خواستێکی بەشداریکردنی نەبوو لە G7دا، هەربۆیە بۆ من و (کودلۆ)ش زەحمەتبوو تا کورتەیەکی لەمبارەیەوە پێبدەین، بەڵام دواجار لە ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ٢٠ی ئاب ئەو کارەمان کرد کە ٤ ڕۆژ مابوو ئەو لوتکەیە دەست پێبکات. ترەمپ گوێبیستی لیستێك لەو سکاڵایانە بوو کە هەریەك لە کودلۆ، کارمەندانی هەواڵگری نهێنی، و کارمەندانی کۆشکی سپی هەیانبوو، بۆیە بڕیاریدا لەگەڵ ئێمە لەنێو کۆشکی سپیدا تەلەفۆن بۆ ماکرۆن بکات، بۆیە لەدەوروبەری کاتژمێر ٥ ئێوارە بەکاتی واشنتن توانی قسە لەگەڵ ماکرۆن بکات. ترەمپ باسی لەکۆمەڵێ بابەت کرد و دواتریش هاتەسەر ئەوەی کە چۆن ماکرۆن لە سەردانەکانی پێشتردا بەخراپی مامەڵەی لەگەڵ کردووە (نموونەش وەك ئەو سوکایەتیکردنە بەناوبانگەی لە ئاهەنگیساڵرۆژی ئاگربەستی تشرینی یەکەمی جەنگی جیهانی دووەمدا ماکرۆن کردبوویەسەر ترەمپ، بابەتەکەش بریتبوو لەوەی ترەمپ نەتەوەپەروەریی"ناشنالیزم"ی تێکەڵ بە نەتەوەپەروەریی"پاتریۆتیزم" کردبوو). ماکرۆن قسەکانی پێ بڕی و گوتی ئێستا کاتژمێر ١١ی شەوە لە فەرەنسادا، دوو ڕۆژیش لەمەوپێش داوای ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنەی کردبوو. ترەمپ تەقیەوە، لە قسەکردن وەستا تا ڕوو

لە من بکات و گوتی "کەس لەمبارەیەوە هیچی بەمن نەگوتووە، بەنەفرەت بێ، بۆڵتن تۆ دەبووایە ئەمەت پێگوتبام. ئەمەم لەهەموو کەسێك گوێ لێبووە. لەمەودوا دەربارەی ئەو تەلەفۆنانە ئاگادارم بکەوە. " منیش گوتم لە ڕاستیدا ماکرۆن داوای ئەمەی نەکردووە، بەڵام ترەمپ وازی نەهێنا. دەگوترا ترەمپ پێشتر (میکائیل فلین)یشی تۆمەتبارکردبوو بەوەی ڕێگری کردووە لەوەی تەلەفۆنێکی (پوتین)ی بۆ بێت. تەقریبەن، ترەمپ هێشتا وا بیری دەکردەوە کە وەك قوربانییەکە لەنێو ئەو پیلانگێڕییەکی بەردەوامدا.

من خەریکبوو لە کۆشکی سپی دووردەکەوتمەوە، بەڵام ئەمەش پێویستی بە دەستلەکارکێشانەوە بوو، کە بەدڵنیاییەوە زۆر نزیکبووم لەوەی ئەو کارە بکەم. بەهەرحاڵ، من نەمدەویست لەسەر ئەو بابەتە دەستلەکاربکێشمەوە، بەڵام هەریەك لە ترەمپ و ماکرۆن هەڵە بوون. ئیمانوئێل بۆن چەندان ڕۆژ بوو ئیمەیلی بۆ ناردبووم و داوای ئەوەی دەکرد ئاخۆ ترەمپ کەی دەگاتەجێ بۆ لوتکەی (بیاریتز)، منیش ئیمێلم بۆ ناردەوە کە هێشتا کار لەسەر ئەمە دەکەین، چاوەڕێی ئەوەین گوێمان لە ترەمپ بێ کە چ کاتێك هەڵدەبژێرێ. ڕۆژی پێشتر، ئیمانوئێل بۆن پرسیاری ئەوەی کرد کە ماکرۆن لەبارەی ئەو کۆبوونەوەیەی لەگەڵ پوتین هەیبووە لە موسکۆ کورتەیەك بە ترەمپ دەدا. منیش پێشنیارم کرد کاتێ خشتەی کارەکانی ترەمپمان دانا لە G7دا ئەوا باشترە ئەوکاتە ئەمە بکرێ، بۆیە هەردوو سەرۆکەکە دەکرێ گفتوگۆ لەسەر هەردوو بابەت بکەن. بۆن ڕازیبوو بەمە، پێشیوابوو ئەمە بۆ هەردوولا مانادار و کاریگەرترە. بێگومان، تا ئەوکاتە بە ئیمانوئێل بۆنم نەگوتبوو، بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی خۆم، کە ترەمپ هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نییە بۆ لوتکەی G7.

ئەو گفتوگۆیەی ترەمپ لەگەڵ ماکرۆن تا کاتژمێر ٦ی درێژەی کێشا، کاتێ کۆتایی هات، من لەدواوە وەستابووم تا فشار بخەمەسەر ترەمپ و

بڕیارێك بدات بەوەی ئاخۆ دوای کۆتاییهاتنی لوتکەکە پێویستە بچێ بۆ دانیمارك یان نا. ترەمپ دواتر هەندێ هێوربوویەوە، ئینجا دەستیکرد بە نووسینی تویتێك تا ڕوونیبکاتەوە بۆچی ناچێ بۆ دانیمارك، بەڵام لەداهاتوودا دەچێ. هەر لەوکاتەدا و هاوکات کە خەریکبوو لە کۆشکی سپی دەچوومەدەر، کوپەرمان تێبینییەکی پێدام و گوتی کە فڕۆکەیەکی دیکەی بێفڕۆکەوانی ئەمریکی لەجۆری (ئێم کیو-٩) خراوەتەخوارەوە، ئەمەیان بەئاشکرایی لەلایەن حوسییەکانی یەمەن ئەنجامدرابوو. لەگەڵ ئەوەی ئێمە هێشتا خەریکی وەرگرتنی زانیاری بووین، حوسییەکان پێشتر لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەو کارەی خۆیان بەرز نرخاندبوو، بۆیە گەڕامەوە نێو کۆشکی سپی تا ئەمە بە ترەمپ ڕابگەیەنم. ترەمپ ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە " من دەمەوێ تۆڵە بکەینەوە. دواتر هەندێ بژاردەی دیکەم بۆ ئامادەبکەن"، منیش گوتم باشە ئەو کارە دەکەین.

گەڕامەوە نێو نووسینگەکەم، بە کوپەرمانم گوت کە ترەمپ لەبارەی تەلەفۆنەکەی ماکرۆنەوە چی پێگوتم: کوپەرمانیش گوتی" ترەمپ پێویستە داوای لێبوردن لەتۆ بکات." منیش گوتم" ئەمە هەرگیز ڕوونادات."

بەهەرحاڵ، ڕۆژی دواتر، دوای پێدانی هەندێ زانیاری، من لەدواوە وەستام تا ئەو ئیمێلەی لەنێوان من و ئیمانوئێل بۆن ئاڵوگۆڕکرابوو، چاپم کردبوو و دەمویست بە ترەمپی نیشانبدەم، ئەمەش نیشانی دا کە تەلەفۆنەکەی نێوان ترەمپ و ماکرۆن بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵ بووە و هیچ بەربەستێك لەلایەن ماکرۆنەوە نەبووە. من پێشبینیم نەدەکرد ترەمپ ئیمێلەکان بخوێنێتەوە، زۆر جەخت لەسەر خوێندنەوەی شتی دیکە دەکات، بەڵام نەمدەویست بزانێ کە بەڕاستگۆیانە قسەم کردووە بەتایبەتی کاتێ پێمگوتبوو کە من هۆکار نەبوومە لەوەی ماکرۆن نەتوانێ قسەت لەگەڵبکات. ترەمپ گوتی" نەدەبوو هاوارت بەسەر بکەم. من داوای لێبوردنت لێدەکەم. من ڕێزێکی زۆرم بۆت هەیە. بەڵام خەڵك هاوکاریم

ناکەن." ئەو ڕستەی کۆتایی ناراست بوو هاوشێوەی ئەوەی ئێوارەی ڕۆژی پێشتر، بەڵام ئەمە بەزەحمەت شیاوی ئەوەبوو مشتومڕی لەسەر بکرێ.

ڕۆژی هەینی ٢٣ی ئاب هەر بەزووی بەرەو شاری (بیاریتز)ی فەرەنسا چووم، بە ڕۆژەکەی گەشتم کرد و سەرەتای ئێوارە گەیشتمەجێ بەو مەبەستەی ئامادەکارییەکان بۆ گەشتنی ترەمپ بکەم کە بڕیاربوو نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە بگاتەجێ. ترەمپ لەکاتژمێر ١:٣٠ خولەك گەیشتە هوتێل، بەشێوەیەکی چاوەڕنەکراویش گوێبیست بووین کە کاتژمێر دوو نانی نیوەڕۆ لەگەڵ ماکرۆن دەخوا، و ئەمەش پێشتر لەنێو خشتەی کارەکان دانەبوو. من پابەندبووم بەوەی کۆبوونەوەکانی دیکە ڕێك بخەم، بۆیە بەخێرایی ڕەتمکردەوە بچمە هۆتێلی (دۆ پالاس) کە سەرکردەی ولاتانی G7 لەوێدا دەمانەوە. کاتێ گەیشتمە ئەوێ، بینیم کە ترەمپ و ماکرۆن وا لەسەر مێزێك دانیشتوون و خەریکی کۆنگرەی ڕۆژنامەوانین. کەسانی دیکەی شاندی فەرەنسی و ئەمریکی لە مێزەکانی دیکەی نزیك لەوان کۆبیوونەوە. ئەوەی تا ڕۆژی دواتر (واتە یەکشەممە) نەمزانی، ئەوەبوو کە ئێران تاکە بابەتی گفتوگۆی نێوان ماکرۆن و ترەمپ بووە، بەتایبەتی ئایا ترەمپ چاوی بە جەواد زەریفی وەزیری دەرەوەی ئێران دەکەوێ کە ئەویش لەلای خۆیەوە بەرێگاوە بوو بەرەو ( بیاریتز)، پێشبینی دەکرا لە پاریس چاویان بەیەکتری بکەوێ، چونکە لەوەتەی کۆبوونەوەکەی ماکرۆن لەرۆژی پێشترەوە هەر لەوێ مابوویەوە. ترەمپ دواتر بە شینزۆ ئابێی سەرۆك وەزیرانی ژاپۆنی گوتبوو کە ئەو دانیشتنە دووبەدووەی لەگەڵ ماکرۆن تا ئێستا خۆشترین کاتژمێری ژیانم بووە.

لە بەیانی ڕۆژی یەکشەممەدا، ترەمپ و بۆریس جۆنسن نانی بەیانیان بەیەکەوە خوارد، ئەمە یەکەم کۆبوونەوەی نێوانیان بوو لەوەتەی کە بۆریس ببووە سەرۆك وەزیران. بێگومان، بابەتی ئێران هاتەگۆڕێ، جۆنسن خەریکی هەندێ گاڵتەی دۆستانەبوو و گوتیشی" من ڕازیم لەگەڵ قسەی

سەرۆك بەوەی کە بنیاتنانی دیموکراسی هەڵەیەك بوو. ئایا ئێمە چیتر مامەڵە لەگەڵ بابەتی گۆڕینی ڕژێمی ئێران ناکەینەوە، جۆن بۆڵتن؟" منیش پێکەنیم و گوتم" ڕاستە، ئەمەیان بابەتێکی هەستیارە"، بەڵام گوتیشم کە "گۆڕینی ڕژێم" لەهەندێ بارودۆخی دیاریکراودا وەك بابەتی "بەرەوپێشبردنی دیموکراسی" یان "بنیاتنانی نەتەوە" نییە. ترەمپ دواتر گوتی" جۆن بۆڵتن کارێکی باشی کردووە. کاتێك ئەو قسەی دەکرد لەنێو ژوورەکەدا، ئەوا خی جین پینگ و ئەوانی دیکەش تێبینی خۆیان دەنووسی"، ئەمەش وایکرد هەموولایەك دڵخۆشبن. دواتر ترەمپ کە ڕووی لەمن کرد، ئینجا زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی" ئەوەی گوتت ڕاستە". ئەم قسەیەی ترەمپ جوان بوو. لەکاتێکدا ئەم گفتوگۆیەش درێژەی کێشا.

کۆبوونەوەکانی G7 تا نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممە درێژەی کێشا تا ئەوکاتەی هەواڵێك گەیشت و وەك بۆمبێك تەقیەوە، هەروەك دەنگۆکان لە سەنتەری کۆنفرانسی بیلوفی ڕایانگەیاند کە جەواد زەریف لەنێو فڕۆکەیەکدایە و هاکا لە شاری (بیاریتز) دابەزی. هەروەك هەوڵماندا ڕاستییەکان بزانین، ئیمێڵێکم لە پۆمپەیۆوە بۆ هاتبوو، داوای دەکرد هەرچی زووە پەیوەندی پێوەبکەم، منیش لە کاتژمێر ٣:٤٠ ئێوارە تەلەفۆنم بۆ کرد. ئەو باسی ئەو تەلەفۆنەی خۆی کرد کە تازە لەگەڵ نەتەنیاهۆ کردبووی دەربارەی ئەو هێرشە ئاسمانییەی ئیسرائیل بۆ سەر سووریا لەشەوی ڕابردوودا، ئەمەیان لەدژی هەرەشەکانی ئێران بووە بۆ سەر ئیسرائیل، ئەمەیان ڕووداوێکی نامۆ نەبوو، چونکە پێچەوانەی ئیدارەی ترەمپ، ئیسرائیل هیچ دوودڵییەکی نییە تا بەزوویی مەترسییەکان لەناوببات. ئێمە گفتوگۆمان کرد لەوەی لەژێر ڕۆشنایی ئەو هێرشەی ئیسرائیل دەتوانین بەرەوپێش بچین، دواتریش منیش پێمگوت کە گوێم لێبووە جەواد زەریف لە شاری (بیارتیز)ە، تیایدا پۆمپەیۆ هیچ شتێکی دەربارەی ئەمە

نەدەزانی. دواتر بۆم ڕوونکردەوە کە پێویستە بگەڕێمەوە بۆ سەنتەری کۆنفرانسەکانی بیلۆڤی و بەردەوام هەواڵیشت پێدەدەم. لەوێدا بەدوای مۆلڤانێی چووم، ئەویش لای خۆیەوە گوتی کە ئاگاداری هیچ پەیوەندییەك نیم لەگەڵ جەواد زەریفدا، هاوکات ئەویش هەمان ئەو دەنگۆیانەی گوێ لێبوو کە من گوێبیستیان بووم. من تێبینییەکم نارد بۆ شوێنی کۆبوونەوەی سەرکردەکانی G7، بەدیاریکراوی بۆ کێلّلی ئان شۆ کە پاریزەرێکی ئەمریکییە و ئەویش بیدات بە ترەمپ، لەنێویدا نووسیبووم کە شوێنی زەریف دەزانین. کێلّلی تێبینییەکی ناردبۆوە و تیایدا نووسرابوو کە ترەمپ تێبینییەکەی منی خوێندۆتەوە و ماکرۆنیش جەواد زەریفی داوەتکردووە تا ئەمرۆ چاوی بە من (ترەمپ) بکەوێ. ئەو خانمە پارێزەرە نووسیووی "سەرۆك ترەمپ بەدڵنیاییەوە دەیەوێ چاوی بە زەریف بکەوێت."

من بە تەنیا لەژوورێکی بەکارنەهاتووی کۆبوونەوەی دووقۆڵی دانیشتبووم تا بیرۆکەکان کۆبکەمەوە. بە ستافی ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوەییم گوت کە لە پەیوەندیدابن لەگەڵ فڕۆکەوانەکانمان تا گەشتێکی بەدیل بۆ کۆتایی ئەو ڕۆژە یان دووشەممە ئامادەبکەن. لەبڕی ئەوەی بچم بۆ کێیڤ و دووچاری وەستانەکانی دیکە بم بەر لەگەیشتن بە وارشۆ، ویستم بگەڕێمەوە بنکەی هاوبەشی ئەندریۆس. من نەمگووت بۆچی دەمەوێ بگەڕێمەوە، بەڵام ئەگەر ترەمپ لەگەڵ زەریف کۆبێتەوە، ئەوا نیازی من بریتی دەبوو لەوەی بگەڕێمەوە وڵات و دەستلەکاربکێشمەوە. من هیچ مەبەستێکم نەدەبینی لەوەی بەردەوامی بەو گەشتە بدەم لەکاتێکدا گەر بزانم ئەوکاتەی دەگەڕێمەوە کۆشکی سپیی ئەوا دەستلەکاردەکێشمەوە. بۆیە بڕیارمدا واباشترە ئێستا ئەو کارە بکەم و لەگەڵ ئەو ڕەوشە بەردەوامبم.

بەشێوەیەکی نامۆ، دواتر شایەتحاڵی کۆبوونەوەی دووقۆڵی نێوان

ترەمپ و سەرۆك وەزیران ئوستراڵیا- سکۆت مۆریسن- بووین، تیایدا بەدەگمەن باس لە ئێران کرا، دواتریش بە کاروانی ئۆتۆمۆبێلەکانی ترەمپ گەرامەوە هۆتێل دۆ پالاس، تا بە تەنیایی لەبارەی کۆبوونەوەکەی لەگەڵ زەریف قسەی لەگەڵ بکەم. تا ئەوکاتە جارێکی دیکە ئیمێلێکم لە پۆمپەیۆوە بۆ هاتبوو، کە ئەویش دووبارە قسەی لەگەڵ نەتەنیاهۆ کردبوو. نەتەنیاهۆ گوێبیستی ئەگەری کۆبوونەوەی نێوان ترەمپ و زەریف ببوو، سووریش بوو لەوەی لەکاتژمێر ٥:٣٠ ئێوارە بەکاتی شاری بیاریتز تەلەفۆن بۆ ترەمپ بکات، ئەمەش وادیاربوو زۆر بەخێرایی بەرەو ئەوکاتە دەچین. دوای گەیشتن بە هۆتێل، دیسانەوە قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد لەکاتێکدا چاوەڕوانبوونم لە ژوورەکەی چاوم بە ترەمپ بکەوێ. بە پۆمپەیۆم گوت ئەوەی لەتوانامدابێ دەیکەم تا نەتەنیاهۆ تەلەفۆن بۆ ترەمپ بکات، بەڵام من سووربووم لەوەی هەوڵێکی دیکە بدەم تا بزانم ترەمپ لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ زەریف باسی چی دەکات. نەتەنیاهۆ و باڵیۆزی ئیسرائیل ڕۆن دێرمەر تەلەفۆنیان بۆ کردم، بۆیە داوام لە پۆمپەیۆ کرد تا پێیان بڵێت کە وا هەستدەکەم وەك سوارچاکێکم کە لە جەنگدا شکستی هێناوە. لە نهۆمەکەی ترەمپ دا، (مولڤانێی و کۆشنەر)م بینی.کۆشنەر خەریکی تەلەفۆن بوو لەگەڵ داڤید فریدمان- باڵیۆزی ئەمریکا بۆ ئیسرائیل- پێشیگوت کە ڕێگەنادەم نەتەنیاهۆ تەلەفۆن بۆ ترەمپ بکات. (ئێستا زانیمان کێ لەپشت وەستاندنی هەموو ئەو تەلەفۆنانەیە بۆ ترەمپ!). کاتێ تەلەفۆنەکەی کۆتایی هات، کۆشنەر ڕوونیکردەوە کە ئەو هەوڵە و ئەوانی دیکەی نەتەنیاهۆی وەستاندووە، چونکە پێیوابوو گونجاو نییە بۆ سەرکردەیەکی بیانی قسە لەگەڵ ترەمپ بکات دەربارەی سەرکردەیەك کە خۆی پێویستە قسەی لەگەڵ بکات.

بە (مولڤانێی)م گوت کە پێویستە دەربارەی چالاکیە سەربازییەکەی دوێنێ شەوی ئیسرائیل لە سووریا زانیاری بە ترەمپ بدەم، هەروەها لەسەر

ئێرانیش. مولڤانێی گوتی کە ترەمپ لەنێو ئۆتۆمۆبێل لە کاتی گەڕانەوە بۆ هۆتێل پێیگوتووە نانخواردنەکەی نیوەڕۆی ڕۆژی شەممەی لەگەڵ ترەمپی بەکارهێناوە تا لەوێوە میوانداری بۆ دیتنی زەریف باس بکەن. ترەمپ دواتر داوەتی منوشنی کردبوو بۆ سەر مێزەکەیان، تا باسی کۆبوونەوە لەکەڵ زەریفی لەگەڵ بکەن و منوشنیش لەجیاتی ترەمپ لەگەڵی کۆبێتەوە. مولڤانێی گوتیشی کە ترەمپ پێشیگوتووە (کۆشنەر)یش ئاگاداری ئەو کۆبوونەوەیە کە ڕەنگە لەکەڵ زەریف بکرێ. لە کاتژمێر ٥:٢٥ خولەکدا چوومە ژوورەکەی ترەمپ، هاوکات هەریەك لە مولڤانێی و کۆشنەریشم لەگەڵبوو. ترەمپ دەستیکرد بە قسەکردن و پرسیاریکرد لەوەی بۆچی نەمویستووە گفتوگۆیەکی ڕۆژی یەکشەممە بکەم(!). منیش ڕوونمکردەوە کە منوشن، کودلۆ و لایتزێر ئەو ڕۆژە بەتەواوی هەمووشتێکیان کرد، چونکە هەوڵەکانی ئێمە لە لوتکەی G7دا بۆ دووبارە جەختکردنەوە بوو لەسەر لایەنی ئابووریی نەوەك کێشە سیاسییەکان. ترەمپ ئەو ڕوونکردنەوەیەی قبوولکرد، کە بەلایەنی کەم هەندێ لایەنی ڕاستی لەخۆگرتبوو.

دواتر باسی ئۆپەراسیۆنی سەربازی ئیسرائیلم بۆ ترەمپ کرد. ترەمپ بابەتی زەریفی هێنایە بەرباس، و گوتی کە ویستوومە چاوم بە زەریف بکەوێ، بۆیە پرسیاری کردم لێم" تۆ پێتوایە ئەو بیرۆکەیەکی باشە؟" منیش گوتم" نەخێر جەنابی سەرۆك، من پێموانییە باش بێ"، دواتریش بۆم ڕوونکردەوە بۆچی لەئێستادا کاتێکی باش نییە زەریف ببینی، لێگەڕێ با ئابلوقە ئابوورییەکان کەمبکەینەوە، لێگەڕێ با ئەو ٥- ١٥ ملیار دۆلارەی فەرەنسا وەك سنووری دڵنیایی پێشنیاری کردووە با فراوانتری بکەین و هەروەك منوشنیش لەگەڵ لای مایەر لەبارەیەوە قسەیان کردووە. من گوتم ئەگەر ئابلووقە لەسەر ئێران لابەرین، ئەوا زەحمەت دەبێ بتوانین جارێکی دیکە بەسەریان بسەپێنینەوە (هاوشێوەی ئەوەی لەگەڵ کۆریای باکوور

دووچاری بووین). تەنانەت کەمکردنەوەیەکی کەمی ئابلووقەی ئابووری وادەکات ئەو وڵاتانەشی کە لەژێر ئابلووقەی توندیشدان، بەهێزبن، بەڵام هیچ ڕێگەیەك نەبوو تا بزانین ئاخۆ چەندە گۆڕانکاری لە هەڵسوکەوتی ئێران دەبینین. ترەمپ پرسیاری لە مولڤانێی و کۆشنەر کرد ئێوە چی دەڵێن. مولڤانێی هەمان ڕەئی منی هەبوو، بەڵام کۆشنەر گوتی ئەو کۆبوونەوەیە دەکرێ، چونکە هیچ شتێك نییە تا لەدەستی بدەین. دواتر، وەك بڵێی ڕوناکی ئاوەزی ترەمپ بکوژێتەوە، ترەمپ گوتی" ئەوانە سنوورێکی دڵنیاییان نابێ تا ئەوکاتەی ڕێککەوتنەکە واژوودەکرێ. من بە هیچ شتێك ڕازی نیم تەنیا ئەوەی بیانووەستێنین لەوەی چیدیکە پێشێلی ڕێککەوتنی ناوکی نەکەن." ئەمە، بێگومان، بەکورتی پێچەوانەی ئەوەبوو کە ماکرۆن پێشنیاری کردبوو. لەگەڵ ئەوەی قسەکانی ترەمپ باشتربوو لەوەی من دەترسام لەکۆتاییدا بیکات، من هێشتا دەمویست فشاری لێبکەم تا چاوی بە زەریف نەکەوێ. دواتر ترەمپ گوتی" من هێشتا بیر لەوە دەکەمەوە کە چاوم بە زەریف دەکەوێ، ئەو دیتنە لەوانەیە تایبەت بێ، لەوانەیە هەر تەنیا تەوقەکردنێك بێ." من دیسانەوە پێمگوت ئەوکارە مەکە، دواتریش کۆبوونەوەکەمان کۆتایی هات.

لە ڕێڕەوەکەدا، مولڤانێی و کۆشنەر و من هەندێ قسەی زیاترمان کرد. من ڕوونمکردەوە کە ماکرۆن لەوانەیە هەندێ شتانەبێ گەر پێیوابێ هەر دامەزراوەیەکی ئابووری بەناوبانگ چاوەڕوانی بکات تا سنووری دڵنیایی لەسەر ئێران درێژتر بکاتەوە. ئێمە بەلایەنی کەم ڕازیبوون لەوەی ماکرۆن کەسێکی تەڵەکەبازە (لە یادەوەریی مندا ئاوهایی بوو)، و هەوڵدەدا ئەو شکۆمەندییە بۆ خۆی ببات جا کۆبوونەوەکە لەپێناو هەرچیەك بێت. من تێگەیشتم کە مولڤانێی هێشتا شتێك دەربارەی ئەو کارە نارێکە نازانێ تا ئەوکاتەی لە سەنتەری بیلۆڤی ئەو نیوەڕۆیە قسەم لەگەڵی کرد. بۆ سێیەمجار و لەکاتژمێر ٦:١٥ ی ئێوارە تەلەفۆنی بۆ پۆمپەیۆ کرد و تا زانیاری پێبدەم. کاتێ ڕاپۆرتی زانیاریەکانی خۆم پێدا، ئەویش گوتی:

"باشە، واتە ئێستا منوشن و جارێد کۆشنەر وەك دوو کەسی دیموکرات خەریکی بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەکی ئێمەن؟" هەروەها گوتی" ئێمە لێرەدا کێشەیەکی بنەڕەتیمان هەیە، کێشەیەکی پرۆسەیەکی فراوانمان هەیە"، هەردوو قسەی ڕاست و دروستبوو. "ئەوە خواستی سەرۆکە کە دەیەوێ ئەو کۆبوونەوەیە بکرێ، ترەمپ گفتوگۆ لەگەڵ جیهان دەکات تا کەسێك بدۆزێتەوە کە هەمان ڕەئیی ئەوی هەیە". (ئەو قسەیەی پۆمپەیۆش ڕاست بوو). منیش وەڵامم داوە و گوتم کە گەر ئەو کۆبوونەوەیە بکرێ، ئەوا بێ هیچ گومانێك دەستلەکاردەکێشمەوە، ئەگەر ئەم کۆبوونەوەیەش نەکرا، لەوانەیە هەرچۆنێك بێت دەستلەکاردەکێشمەوە." پۆمپەیۆ گوتی "من لەگەڵ تۆم". تا ئێوارە چاوەڕوانیم کرد تا بزانم ترەمپ دەڵێ لەگەڵ زەریف کۆدەبمەوە، پێشبینم دەکرد بەو هەواڵە لە هەمان کاتدا بەئاگابێمەوە، بەڵام ئەو هەواڵە هەر نەهات.

ڕۆژی دواتر، دووشەممە ٢٤ی ئاب، بەشێوەیەکی سەرنجراکێش گەیشتینە کۆتایی و هیچ کۆبوونەوەیەکی دیکە ئەنجام نەدەدرا. بەدڵنیاییەوە هیچ ڕوومالێکی میدیایی لەسەر کۆبوونەوەکان نەبوو، لەگەڵ ئەوەی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا جیان یەڤیس لی دریان بۆ زیاتر لە سێ کاتژمێر لەگەڵ زەریف کۆبوویەوە، تەنیا لەیەك لایەنی کۆبوونەوە ماکرۆن بەشداری کردبوو. فەرەنسییەکان بە (کێلێی ئان شاو)یان گوتبوو کە ماکرۆن هەندێ زانیاری لەسەر ئەو کۆبوونەوەیە لەنێو ژووری هۆتێلدا بە ترەمپ داوە، بەڵام ئاگاداری کەسی دیکەیان نەکردبوو. کاتێ قسەم لەگەڵ مولڤانێی کرد ئەو بەیانییە بەرلەوەی ترەمپ یەکەم کۆبوونەوەی دووقۆڵی بکا، ئەو گوتی پێموانییە کۆبوونەوە لەگەڵ زەریف بکرێ. لەدەوروبەری کاتژمێر ١٠:٣٠ی بەیانی ئەوەم بە ئیمێل بۆ پۆمپەیۆ نارد، گوتیشم ناتوانم تەلەفۆنت بۆ بکەم، دڵنیاشم نیم ئاخۆ کۆشنەر یان منوشن لەوانەیە کۆبوونەوە یان قسەیان لەگەڵ زەریف کردبێ بەو مەبەستەی بۆ داهاتوو کەناڵی گفتوگۆکردن دروستبکەن. (ئەو گریمانەیەی دووەم شتێك

بـوو کە بڕوامـوایە دەبووەهـۆی هـۆی ورووژان و نیگەرانبـوونی بەرپرسـە باڵاکانی ئیسرائیل، بێگومان پۆمپەیۆشی قەڵس دەکرد(.

نازانم بە تەنیا لەبارەی ئەو کۆبوونەوەیە لەگەڵ زەریف لەگەڵ ترەمـپ قسە بکەم یان نا، بەڵام تەنیا بڕیارەکە بـۆ مـن بەس بـوو تـا لەبـڕی ئەوەی بگەڕێمەوە وڵات، بەڵکو بەرەو کییـێـف بچـم. هێشـتا، چەنـدە کـاتی دەوێ بەرلەوەی ترەمپ هەڵەیەکی بەراستی خراپ و هەمیشـەیی بکـات؟ لەگەڵ ئەوەش ئـێمە (ڕۆژی تێفکرین)مـان دواخسـت، لەوانەیەشـە بـۆ کـاتێکی درێژخایەن نەبێ.

## بەشی سێزدە

## لە ئەرکی دژەتیرۆریزمی ئەفغانستانەوە بۆ

## نەپێکانەکەی کامپ دەیڤد

دەمزانی دەمەوێت لە ئەفغانستان چی بەدەست بهێنم، ڕاوێژکارەکانی پێشووی ترەمپیش هەمان دوو ئامانجی منیان هەبوو: (١) ڕێگریکردن لە سەرهەڵدانەوەی داعش و ئەلقاعیدە و هەڕەشە تیرۆرستییەکان دژی ئەمریکا؛ (٢) چاودێریکردنی بەرنامە ناوکییەکانی ئێران لە ڕۆژئاوا و پاکستان لە ڕۆژهەڵات. ئەوە یەکەمین پلاتفۆرمی دژەتیرۆریزم بوو کە دەمانویست لە سەرەتای ٢٠١٩دا بیگرین. بەشە قورسەکە قایلکردنی ترەمپ و لەگەڵ هێشتنەوەی لەسەر بڕیارەکەی. ئەگەر ئەم ئامانجانە بە شێوەیەکی خراپ، یاخود لە کاتێکی خراپدا پێشکەش بکرانایە، مەترسیی ئەوە دەبوو ترەمپ داوای پاشەکشەی هەمووان بکات؛ پێشکەشنەکردنیشیان خۆی لە خۆیدا پاشەکشەکردن بوو.

دانوستانە بەردەوامەکانی زاڵمای خەلیلزاد لەگەڵ تاڵیبان، چینێکی تری ئاڵۆزیی تێدابوو. پەمپەیۆ باوەڕی وابوو بە کردنی ڕێککەوتنێک تیایدا هەموو هێزەکانی ئەمریکا بکشێنەوە فەرمانی ترەمپ جێبەجێ دەکا. پێم وابوو ئەوە سیاسەتێکی خراپە. لە ڕووی بیردۆزییەوە، حکوومەتی ئەمریکا بە مەرج نەبوایە هەرگیز بە ڕێککەوتنێکی وا قایل نەدەبوو، واتا هەموو هێزەکانمان دەکشانەوە ئەگەر: (١) هیچ چالاکییەکی تیرۆریستی لە وڵاتەکەدا نەبوایە؛ (٢) ڕێگری لە داعش و ئەلقاعیدە بکرێت تا بنکە

دروست نەکەن، هەروەها (٣) دڵنیاییەکی تەواومان هەبێت. ئەوەم بە ساویلکانە زانی، هەروەک بۆچوونەکانی پنتاگۆن لەسەر جڵەوکردنی چەک: ڕێککەوتنێک لەگەڵ هەندێک لە پاشاشکێنەکاندا دەکەین، ئەوانیش پابەندی دەبن و نایشکێنن. چەندێک جوانە.

لە سەرەتاوە پەمپەیۆ پێداگر بوو لەسەر ئەوەی ڕێککەوتن لەگەڵ تاڵیبان خواستی پنتاگۆن بووە، بۆ ئەوەی هەڕەشەکانی سەر هێزەکانی ئەمریکا کەم بێتەوە و کەمکردنەوەی هێزەکانیش هەر بۆ ئەوە بووە؛ بەبێ ڕێککەوتنێک هەڕەشەی هێزە کەمکراوەکانی ئەمریکا زۆر مەزن بوو. بەڵام دیسانەوە ئەمەم بە ڕوانینێکی منداڵانە زانی. هەرگیز تێنەگەیشتم لەوەی چۆن ڕێککەوتنێکی وا لەگەڵ کۆمەڵەیەکی تیرۆریستیدا دڵنیایی و ئاسایشمان بۆ دابین دەکات، لە کاتێکدا ئێمە هەرگیز متمانەمان بەو تیرۆرستانە نەبووە. ئەگەر تاڵیبان و داعش و ئەلقاعیدە کەمکردنەوەی هێزەکانمانیان بە پاشەکشە زانیبێت، ئەوەش مەترسیی سەر هێزەکانمانی زیادکردبێت، ئەی ئەو تیرۆریستانە چ تێگەیشتنێکیان دەبوو کاتێک واژوویان لەسەر لاپەڕەیەک دەکرد کە لەسەری دەنووسرا هێزەکانمان لە کۆتایی تشرینی یەکەمدا بە تەواوەتی دەکشێنەوە؟!

ڕێککەوتنی مەرجدار لە ئەفغانستان وەک سرکەرێک وابوو. دەبووە هۆی ئەوەی هەندێکمان هەست بە باشی بکەین (من لەوانە نەبووم)، بەڵام لە باشترین حاڵەتیدا ئەزموونێکی بەتاڵ و کاتی بوو. بە لەبەرچاوگرتنی تۆماری کارەکانی تاڵیبان، گومانم هەبوو لەگەڵ ئەواندا هیچ جۆرە ڕێککەوتنێک کەڵکی هەبێت. بە بۆچوونی ترەمپ، ئەگەر پاشەکشەی تەواوەتی ئامانجەکە بووبێت، سەرپێچیکردنی مەرجەکان دەرئەنجامەکەی نەدەگۆڕی. هەرئەوەندەی هێزەکانمان بە تەواوەتی دەکشانەوە، ئیتر ئێمە لەوێ کاریگەریمان نەدەما. بەڵام ئەگەر دانوستانی زیاتر، کاتی زیاتری بۆ دەستەبەر بکردینایە بۆ ئەوەی پەرە بە ئامادەییەکی دژەتیرۆریزمی بدەین، ئەوا بەردەوامیدان باش بوو.

شانەهان، دەنفۆرد، پەمپەیۆ، هەروەها منیش باوەڕمان وابوو باشترە هەتا زووە باسی شێوازی کارکردنی ئەو پرۆسانە بۆ ترەمپ بکەین. چاوپێکەوتنێکمان لە هەینیی ٥ی ئازاردا دانا و ئامادەکارییەکانیش بۆ چاوپێکەوتنەکە دەستیان پێ کرد. لەبەرئەوەی دەمانزانی بابەتە زۆر هەستیارە و ئەوەی دەکرێت لەدەستی بدەین کەم نییە، ڕۆژی هەینیی پێشتر دانیشتنێکی ئامادەکاریمان کرد. ئەوەی سەرسامکەر بوو ئەوە بوو جۆن سولیڤان لەجێی پەمپەیۆ ئامادە بوو؛ لەوانەیە پەمپەیۆ نەیویستبێت پێش دیدارەکەی ترەمپ باس لە دۆخی دیپلۆماسیی دانوستانەکان بکات لەگەڵ تاڵیباندا، ئەوەش ڕێی تێدەچوو چونکە هەتا دەیتوانی هیچی دەربارەی دانوستانەکان نەدەگوت. ئامادەنەبوونەکەی بێزاری نەکردم، چونکە پێم وابوو دیپلۆماسیی ئەفغانستان گرنگییەکی دوورمەودای نییە. ئاسۆی من سنووردارتر بوو: چۆن کارێک بکەین کە پێشکەشکردنەکەی وەزارەتی بەرگری زۆرترین کاریگەری بخاتە سەر ترەمپ، بە کردنی ئەوەش قایلی بکەین بەوەی پێویستە سەرچاوە بنچینەییەکانی دژەتیرۆریزم لە وڵاتەکە بهێڵینەوە. هەروەک هەمیشە، پنتاگۆن هێڵکاری و سلایدگەلێکیان خستبوویە پێشکەشکردنەکەوە کە شتەکانیان لە ڕادەی خۆی ئاڵۆزتر دەکرد، تەنانەت ئەو کاتانەشی کە هەواڵێکی باشیان بە ترەمپ دەگەیاند، بۆ نموونە هەواڵی کەمکردنەوەی هێزەکان و ئەو ئەو قازانجەی سوپا دەستی دەکەوێت. داوام لە شانەهان و دەنفۆرد کرد هەروا هێڵکاری و سلایدەکان نەخوێننەوە، بەڵکو لەگەڵ پێشکەشکردنەکەیاندا سەرنجی کاردانەوەکانی ترەمپیش بدەن. ئەوە ستایلی ماتیس بوو، منیش چیرۆکگەلێکم بیستبوو (ڕاستبن یان نا) لەسەر ئەوەی ترەمپ لە چاوپێکەوتنە ماندووکەرەکانی ماکماستەردا بێزار بووە و سەرنجی نەداوە. پێم وابوو هەمووان هاوڕان، بەڵام تاقیکردنەوە ڕاستییەکە لە حەفتەی داهاتوودا بوو.

بەرەبەیانی ١٥ی ئازار ترەمپ پەیوەندیی بە ئابی ئەحمەد عەلیی سەرۆکی ئەسیوبیا کرد (کە لە تشرینی دووەمدا خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی وەرگرتبوو) تاکو هاوخەمی خۆی بۆ کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە ئەسیوبییەکە دەرببڕێت (بووە هۆی ڕێگریکردنی فڕینی هەموو فڕۆکەکانی بۆینگ ٧٣٧ ماکس). کاتێک لەگەڵ ترەمپدا قسەمان دەکرد و چاوەڕێی بەڕێککەوتن بووین، باسی ئەفغانستانی کرد و گوتی: "دەبێت ئەو وڵاتە جێ بهێڵین." ئەوە شێوازێکی زۆر باش نەبوو بۆ دەستپێکردنی ڕۆژەکە. پاش پەیوەندییەکەی ئابی ئەحمەد عەلی، بانگم کرد تا پێی بڵێم لە بەشێکی زۆر چاوپێکەوتنەکەدا پنتاگۆن ئەوە پیشان دەدات چۆن بەپێی ڕێنماییەکانی خودی ئەو بۆ کەمکردنەوەی هێزەکانمان، ئەرکی ئەفغانستانی ڕێک خستووەتەوە. ئەو پرسی: "ئەوە زیانی بۆ دانوستانەکان نابێت، وایە؟" دیار بوو نیگەرانی ئەوە بوو کەمکردنەوەی هێزەکانمان نیشانەی لاوازی بێت. لە وەڵامدا گوتم نەخێر زیانی نابێت. ئەو داوای لێ کردم من و پێنس و ئەو پێکەوە لە بیستەوە بچین بۆ پنتاگۆن، ئەوەش دەرفەتێکی تری پێی دەدا باسی بابەتەکە بکات و هەر نیگەرانییەکی هەیە بیڵێت، بەڵام بەشی زۆرینەی گفتوگۆی ناو ئۆتۆمبێلەکە لەسەر کۆریای باکوور بوو.

کە گەیشتین شانەهان گوتی چاوپێکەوتنەکە ڕوونی دەکاتەوە چۆن لە ئێستادا کە تاڵیبان ئامادەی دانوستانە، ئێمە درێژە بە دژەتیرۆریزمەکەمان بدەین. ترەمپ یەکسەر پرسی: "ئایا بە گوتنی ئەوەی هێزەکانمان کەم دەکەینەوە پێگەی خۆمان لە دانوستانەکاندا لاواز ناکەین؟" هەرپاش گفتوگۆکەی بەیانیم لەگەڵ ترەمپ پەیوەندیم بە شانەهان و پەمپەیۆوە کردبوو، بۆیە وەڵامەکانیان باش ئامادەکرا بوو. گوتیان کاتەکە نموونەییە. وەک زۆرینەی حاڵەتەکان، وێرانکردنی بەرامبەر دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانەی دەمێننەوە ئامادەیی زیاتریان بۆ دانوستان هەبێت. پاشان ترەمپ باسی خراپیی فەرماندەکانی پێشووی کرد و سەرەڕای ئەوەی داوایەکی

ماتیسیشی قبووڵ کردبوو، هێرشی کردە سەر ئەویش. ترەمپ پرسیاری کرد، "دانوستانەکان چۆن بەڕێوە دەچن؟" پەمپەیۆ وەڵامی دایەوە، بەڵام ترەمپ قسەی پێ بڕی و دەستی کرد بە باسی گەندەڵیی بەرپرسەکانی ئەفغانستان، بە تایبەتیش غەنیی سەرۆک و سامانەکانی، هەرچەندە بەداخەوە وەک هەمیشە غەنی و حامید کارزای سەرۆکی پێشووی لێ تێک چووبوو. خۆشبەختانە کەس تێبینیی ئەوەی نەکرد، بۆیە ئاماژەم بۆ دەنفۆرد کرد تا باسی ئەوە بکات ئەو کەمکردنەوەی توندوتیژییەی ستراتیژییەکەی ئێمە دابینی کردووە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی دەتوانین بە سەرچاوەی کەمکراوەوە هەڵمەتی دژەتیرۆریزم و ئەرکەکانی ترمان جێبەجێ بکەین، تەنانەت ئەگەر تاڵیبانیش قایل نەبێت. دەنفۆرد بە ترەمپی گوت: "گوێمان بۆ تۆ گرت،" ئەوەش لەسەردەمی پاش ماتیسدا دێرێکی باش بوو. دەنفۆرد گوتیشی ئەگەر حکوومەتی ئەفغانستانیش لاواز بێت کێشەمان نابێت و سەرنجمان لەسەر ئەلقاعیدە و داعش دەبێت، چونکە ئەوان هەڕەشە تیرۆریستییە ڕاستییەقینەکانن بۆ سەر ئەمریکا. منیش ئاماژەم بەوە دا بەدرێژایی مێژوو ئەفغانستان خاوەنی حکوومەتی لاواز بووە، بۆیە ئەوە شتێکی نوێ نابێت بۆ نیشتەجێبوانی.

دەنفۆرد باسی گرنگی و پێویستیی درێژەپێدانی دژەتیرۆریزمی لە ڕووبەری بەرفراوانتردا. کاتێک دەنفۆرد هێلکاری و سلایدەکانی پێ کرد بۆ ئەوەی پیشانی بدات، تێچووی چالاکییەکانمان لە ئەفغانستان چەندە و چەند کەسمان هەیە لەوێ، ترەمپ گوتی: "هێشتاکە خەڵکێکی زۆرمان لەوێ هەیە،" بەڵام خۆشبەختانە درێژەی دایە و گوتی: "کشاندنەوەی هەموو سەربازەکانمان مەترسیدارە، چونکە تیرۆریستەکان لەوێ دروست دەبن و بیناکان دەتەقێننەوە". ئەوەش تەواوی مەبەستەکە بوو. ترەمپ نموونەیەکی دڵخوازی خۆی دووبارە کردەوە، کە دەیگوت دروستکردنەوەی بیناکانی سەنتەری بازرگانی ئاسانترە لە شەڕکردن لە ئەفغانستان. لەو نموونەیەدا

نەک هەر تێچووی بونیادنانەوەکەی لەبەرچاو نەدەگرت، بەڵکو بەشێوەیەکی ئازاربەخش ئەو کەسانەشی فەرامۆش دەکرد کە لە هێرشەکەی ١١ی سێپتێمبەردا گیانیان سپاردبوو. ئەو نموونەیە ئەوەشی لەبەرچاو نەدەگرت کە پاشەکشەی ترەمپ لە پاشی هێرشێکی تیرۆریستی لە ڕووی سیاسییەوە وێرانکەر دەبێت. دەنفۆرد جەختی کردەوە و گوتی سوپاکەی ئێمە ڕێگری لە دروستبوونەوەی تیرۆریستەکان کردووە و وەک مسۆگەرییەکی ئاسایش بووە. ئەو هیچ کاتێکی دیاریکراوی لە خەیاڵدا نەبوو، بەڵام پنتاگۆن ڕێگای بە پرۆسەی ئاشتەوایی دیپلۆماسی دەدا کاتەکە دیاری بکات. پێم وابوو لێرەدا بەرەو زەمینەیەکی مەترسیدار دەچووین و دیسانەوە ئەو پرسیارەمان دەهێنایەوە پێش: ئایا پێویستە لە ئەفغانستان بین یان پێویست نییە. گفتوگۆکە بۆ ماوەیەک بێئامانج دەخولایەوە کاتێک ترەمپ لێی پرسیم بۆچی لە عێراق و ئەفغانستان جەنگاوین بەڵام لە ڤەنزوێلا ئەوەمان نەکردووە، ئەوەش هیچ نەبێت بۆ هەموو ئامادەبوانی سەلماند ئەو حەز بە ئەنجامدانی چی دەکات؟!

پاش هەندێک قسەی تر، شانەهان باسی ئەوەی کرد تا چ ڕادەیەک بواری کەمکردنەوەی تێچووەکانی دژەتیرۆریزم هەیە، بەڵام پێش ئەوەی زۆر بڵێت، ترەمپ قسەی پێ بڕی و گلەیی لەوە کرد کە کۆنگرێس ڕەتی کردووەتەوە تێچووی دیوارەکەی سنووری مەکسیک دابین بکات. پاشان گوتی: "هۆکار چییە سووریا و ئەفغانستان جێ ناهێڵین؟ هەرگیز نەدەبوو بەو دووسەدەی تر قایل بم [لە سووریا]، لە ڕاستیشدا چوارسەدە." دەنفۆرد باسی ئەوەی کرد خۆشحاڵانە وڵاتانی ناتۆ یارمەتیی چاودێرییە فرەلایەنەکانی سەر سووریا دەدات، ترەمپ وەڵامی دایەوە. "هەرچۆنێک بێت ئێمە پارە بە ناتۆ دەدەین". ئەو قسەیەش بووە هۆی باسێک لەسەر ئەردۆغان و ئەوەی لە تورکیا دەیکرد. پاشان پاش گەڕانەوە بۆ سەر سووریا بۆ ماوەی چل و پێنج چرکە، ترەمپ پرسی: "کارمان چییە لە

ئەفریقا؟" بەزوویی ڕوونی کردەوە دەیەوێت ئەمریکا ئەفریقا جێ بهێڵێت و ماوەیەک قسەی لەسەر قەرزە ۲۲ تریلیۆنییە نێودەڵەتییەکەمان کرد، ئەوجا باسی کەمبوونەوەی هاوسەنگیی بازرگانی کرد، پاش ئەوەش گلەیی کرد لەوەی نێجیریا ساڵانە ۱،۵ ملیاری وەک یارمەتیی دەرەکی پێ دەگات و گوتی سەرۆکی نێجیریا لە سەردانێکی پێشتریدا ئەوەی بۆ درکاندووە، سەرەڕای ئەوەش بەرهەمە کشتوکاڵییەکانمان لێ ناکڕن. پاش گفتوگۆی زیاتر لەسەر ئەفریقیا، ترەمپ گەڕایەوە سەر ئەفغانستان و گوتی: "تێچووی ساڵانە کەم بکەنەوە بۆ دە ملیار دۆلار [لە بیرکردنەوەی ئێمە مانەوەی ئەمریکا پێویستی بەوەندە بوو]، بەخێراییش کەمی بکەنەوە." ئەوە ڕێی بۆ باسی تێچووی بنکە سەربازییەکانی ئەمریکا خۆش کرد لە کۆریای باشوور لەگەڵ ئەوەی پێویستە سیئۆل چەندێک لەو تێچووە بدات. ترەمپ گوتی خۆشحاڵانە لە دانوستانەکانی کۆتایی ۲۰۱۸دا لەگەڵ کۆریای باشووردا ۵۰۰ ملیۆنمان زیاد کردووە (لە ڕاستیدا ۷۵ ملیار بوو و هەموو ئامادەبوانیش دەیانزانی). هێشتا دەیویست کۆریای باشوور بە ئەندازەی تێچووەکەی ئەمریکا و کۆی سەدا پەنجاش بدات. بیریشی خستینەوە جیاوازییە سیاسییەکانمان لەگەڵ عێراقدا هەرچییەک بێت، لەبەرئەوەی بڕێکی زۆرمان لە بونیادنانی بنکەکانی ئەوێدا خەرج کردووە بەجێی ناهێڵین.

پاش کەمتر لە کاتژمێرێک و لە کاتی خۆکۆکردنەوەماندا ترەمپ لە بەرچاوی هەمووان لە دەنفۆردی پرسی، "سکرتێرەکەی ئێستامان چۆن کاروبارەکانی بەڕێوە دەبات؟" دەنفۆرد سەرسامی پێوە دیار بوو و پاش کەمێک گوتی: "ئا لێرەدا دەڵێم کارەکانی بە شازی جێبەجێ دەکات،" هەموومان پێکەنین. دەمویست بچمە دەرەوە، بۆیە لەگەڵ پەمپەیۆدا هەستاین و پەڕەکانمان کۆکردنەوە. پاشان ئەوانی تریش هەستان و بەرەو دەرگای پنتاگۆن بەڕێ کەوتین کە لەوێ ئۆتۆمبێلەکان چاوەڕێمان بوون.

مـن و پێـنس لەگەڵ ترەمپـدا بـووین و بەشـێکی زۆری گفتوگۆکەمـان دەربارەی ڕاگرتنی ماکس ٧٣٧ بوو. کاتێک گەڕاینەوە بۆ ویست وینـگ، پەیوەنـدیم بە شـانەهانەوە کـرد و پیرۆزبـایی دەرئەنجـامەکەم لـێ کـرد، هەروەها پـێم گـوت پێویسـتە تەواوی ڕۆژەکە پشـوو بـدات. پـاش چەنـد خولەکێکیش بە دەنفـۆردم گـوت کە دۆخەکە زۆر خـۆش نەبـووە، بەڵام بێگومان سەرکەوتن بووە. دەنفۆرد گـوتی: "ترەمـپ ئێسـتاکە بـاوەڕی وایە ئێمە گوێی لێ دەگرین، لە کاتێکدا پێشتر باوەڕی وانەبـوو،" ئەو قسـەیەش سەداسەد ڕاست نەبوو. ڕۆژی دواتر قسەم لەگەڵ پەمپەیۆ کرد و پێی وابوو چاوپێکەوتنەکە سەرکەوتن بووە.

هەرچۆنێـک بێـت، کێشـەکە کە دانوسـتانەکانی تاڵیبـان بـوو هێشـتا چـارە نەکرابـوو. لە خـوانێکی بەیـانیی ٢١ی ئـازاردا، شـانەهان و دەنفـۆرد هێلکارییەکیان هێنـا، هێلکـارییەکە ئەو شـێوازانەی پیشـان دەدا کە تیایانـدا وەزارەتـی دەرەوە لەو ڕێکـارانە لایـدابوو، ئەوانەی پنتـاگۆن بـۆ دانوسـتان دیـاریی کردبـوون. ئەوەی لە هەمـووی بێزارکەتـر بـوو بـۆ مـن ئەوە بـوو ئامانجەکانی وەزارەتی دەرەوە لە دانوستانەکان زۆر جیاوازتر بـوو لەوانەی مـن بە ئامـانجە ڕاسـتییەکانمانم دەزانـین: بە تەواوەتـی ڕێگـری لە دروسـتبوونەوەی کـۆمەڵە تیرۆریسـتییەکان بگـرین و ئاگـاداری مەترسـییە ناوکییەکانی ئێران و پاکستان بین. بە بۆچوونی مـن ئەو بـڕە سـەرچاوەیەی ترەمپ لە چاوپێکەوتنەکەدا قبووڵی کرد زۆر کەمتر بـوو لەوەی لە کـاتی قەیرانی گەورەدا پێویستمان دەبوو، بەڵام لانـی کەم چەنـد بنکەیەکمـان لە ئەفغانستان دەبوو و ئەگەری بەرزبوونەوەی تواناییەکانیشمان هەبوو. پەمپەیۆ و خەلیلزاد هێشـتا وەک ئەوەی ئـێمە بە تەواوەتـی بکشـێینەوە دانوسـتانیان دەکرد. لەوانەیە لە تشرینی دووەمدا دەستمان پێ کردبێـت، بەڵام دەمێـک بوو سەرقاڵی بووین، هەروەها شانەهان و دەنفۆرد و منیش لەوە دەترسـاین ئەو بەرەوپێشـچوونە لەدەسـت بـدەین. لە مـاوەی سـی خـولەکی خـوانی

بەیانیدا، پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد و پێم گوت ئایا ئەوە بڕیاری ئەو بووە ڕێگــا بە خەلیلــزاد و وەزارەتــی دەرەوە بــدات لە دانوســتانەکاندا بە سەربەخۆیی تەواوەوە مامەڵە بکەن، بەڵام پێم وابوو وەڵامەکەی ترەمپ مەترسیدار بوو، چونکە دەربارەی خەلیلزاد گوتی: "هەر ناشزانم ئەو کابرایە کێیە! چی بە باش دەزانیت ئەوە بکە".

هەمان بەیانی خەلیلزادم بینی، کە وەک پێشتریش گوتم لە سێ ساڵ لەوەوبەرەوە ناسیومە. ئەو گوتی پەمپەیۆ فەرمانی پێداوە قسە لەگەڵ مندا نەکات، چونکە من بەهۆی ترەمپەوە پۆمپەیۆ لاواز دەکەم. ئەوە ڕاست نەبوو، واشم دەزانی هاندەری ڕاستەقینەی پەمپەیۆ لەو قسەیەدا ئەوە بووبێت لە ئەگەری ڕێککەوتندا ئازایەتییەکە بۆ ئەو بێت، ئەوەش دیاردەیەکی باوی واشنتۆنە. ئەگەر ئەوە ڕاستیش بوایە هەر بێجێ بوو. پێم وانەبوو دانوستانەکان ئەنجامێکی قبوولکراویان لێ بکەوێتەوە، بۆیە هیچ مەیلم لەوە نەبوو بە کارای ئەو ڕێککەوتنە بزانرێم. خەلیلزاد قایل بوو بەوەی پێش ڕۆیشتنی بەشداری لە دیدارێکی نافەرمیدا بکات بە ئامادەبوونی کەسە فەرمییەکان بۆ قسەکردن لەسەر هەڵەتێگەیشتنەکان، تا کە گەڕایەوە بتوانێت درێژە بە گفتوگۆکانی بدات لەگەڵ تالیبان. پێم وابوو ئەوە بڕیارێکی باشە. پاش چەند ڕۆژێک، پەمپەیۆ پەیوەندی پێوە کردم تا گلەیی لە بەرپرسەکانی پنتاگۆن و لیزا کورتیسی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە باشووری ئاسیا بکات لەسەر ئەوەی قسەیان لەگەڵ خەلیلزاد کردووە و گوتیشی پێویستە وازی لێ بهێنن. بە شێوەیەکی ئاسایی ئەو دیدارانە ڕێکخستنی نێودەزگایی بوون، بەڵام پەمپەیۆ بە دەستتێوەردانی دەزانی. سەیر نەبوو کێشەی ناوخۆیی بەڕێوەبردنمان لەسەر ئەفغانستان هەبوو.

لە ناوەندی ئەو سەختییانەدا هەواڵێکی زۆر خۆشمان پێگەیشت، لە ٢٤ نیساندا ژووری پێشدادگایی دادگای نێودەوڵەتی تاوان بە بۆچوونێکی سێ

و دوو پەڕەیی ڕەتی کردەوە داوای داواکارێکی گشتی قبوولّ بکات بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەک لە ڕەفتاری سوپای ئەمریکا و ئەندامانی هەواڵگری لە ئەفغانستان. کاتێک دادگاییەکە خرایە شاری هاگی هۆڵەندا، چەند جارێک قسەم لەگەڵ پیت هۆکسترای ئەندامی پێشووی کۆنگرێس کرد کە باڵوێزمان بوو لە هۆڵەندا و بۆم دەرکەوت ئەویش وەک من سەری سوڕمابوو لەوەی توانیومانە ڕێگری لەو ستەمە بکەین. من لە زووەوە دژایەتی ئەو دادگاییەم کردبوو، پێشتریش لە کۆمەڵگای فیدراڵی لە واشنتۆن وتارێکم لەسەر ئەوە دابوو بۆچی لە ڕوانگەی بنچینە و بنەماوە ئەوە ڕەت دەکەینەوە و باسی ئەو هەنگاوانەشم کرد کە دەیگرینە بەر ئەگەر دادگا هاولاتییە ئەمریکییەکان بکاتە ئامانج. لە نۆی بەیانیدا پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد بۆ ئەوەی هەواڵەکەی پێ ڕابگەیەنم، ئەو گوتی: "ڕاگەیاندنێکی بەهێزم لێت دەوێ". بێگومان خۆشحاڵ دەبووم بە کردنی ئەوە.

دەربارەی چاوپێکەوتنەکانی ئەمریکا و تالیبانیش، کەمتر لە جاران نیگەرانی کرۆکەکەیان بووم و لەچاو پنتاگۆندا چالاکیم کەم بوو، چونکە پێم وابوو جەنگە چارەنووسسازەکەی هەزری ترەمپمان بردبووەوە. ئەمریکا بە تەواوەتی لە ئەفغانستان نەدەکشایەوە و لە پێناوی دژەتیرۆریزم و ئامانجەکانی تردا سوپایەکی بەهێزی دەهێشتەوە. ئەگەر ترەمپ بۆچوونی بگۆڕیایە و ڕۆژێک لەناکاو بیگوتایە ئەفغانستان چۆڵ کەن (جاروبار لە کاتی پەستیدا ئەوەی دەگوت)، ئەوا هێشتا ئەو بڕیارەش کاریگەری لەسەر دۆخی دانوستانەکان نەدەبوو. بە کورتی، چیتر پێگەی سەربازیی ئەمریکا نەبەسترابوویەوە بە پرۆسەی ئاشتییەوە[1]، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان

(١) پرۆسەی ئاشتی: بەو ڕێککەوتن و کردار و دانوستانە کۆمەڵ-سیاسییانە دەگوترێت کە بۆ چارەسەری کێشەیەکی سەربازی بەکاردەهێنرێن.

وابووبێت. لەو ڕوانگەیەوە بە بۆچوونی من هیچ فشارێک لەسەر خەلیلزاد نەبوو بۆ بەدەستهێنانی ئەنجام و بەروارێکی دیاریکراو نەبوو بۆ تەواوکردنی دانوستانەکان.

سەرەڕای ئەوەش لە ١ی تەمموزدا. وەزارەتی بەرگری لەوە تێگەیشت کە خەلیلزاد بێ ئەوەی هەواڵ بە هیچ کەسێکی واشنتۆن بدات بەنیازە ڕێککەوتنێک ڕابگەیەنێت. ئێسپەر پەیوەندی بە پەمپەیۆوە کرد کە لە ئەکادیمیای وێست پۆینت هاوپۆل بووبوون، بۆ ئەوەی بڵێت ڕێککەوتنەکە دەهێنێتەوە بۆ واشنتۆن تاکو تەماشای بکەن. کووپەرمان لە سەرۆکی ستافەکەی ئێسپەرەوە بیستبووی گوایە پەمپەیۆ لە ئێسپەر و فەرمانبەرەکانی تووڕە بووە لەسەر ئەوەی خۆیان تێکەڵی ڕێککەوتنەکانی ئەفغانستان کردووە. پێمان گوترا پەمپەیۆ هەندێکجار بەدەم هاوارکردنەوە گوتوویەتی خەلیلزاد ڕێنمایی کراوە بۆ ئەوەی سەرپەشتی ڕێککەوتن بکات، بەبێ ئەوەی بڵێت کێ ڕێنمایی کردووە. شانەهان ویستی لۆجیکی بێت و شکستی هێنا، ئێستا سەرەی ئێسپەر بوو. کاتێک ڕۆژی دواتر قسەم لەگەڵ ئێسپەر کرد، دیتم نیگەرانییەکانی ئەو زیاتر تاکتیکین، بۆ نموونە نیگەرانی سەلامەتیی پاشەکشەی هێزەکانی ئەمریکا بوو و ئەوەش نیگەرانییەکی بەجێ بوو، نەک سیاسەتەکەی. ئێسپەر بە ڕێزەوە گوتی: "مایک کەمێک هەڵچوو"، بەڵام لەگەڵ بەردەوامیی گفتوگۆکەماندا ڕوون بوویەوە ترازانێک لە نێوان ئامانجەکەی وەزارەتی دەرەوە (کشانەوەی تەواوی هێزەکانی ئەمریکا) و ئامانجەکەی من و پنتاگۆندا هەیە بۆ بەردەوامیدان بە دژەتیرۆریزم و مەبەستەکانی تر. ئێسپەر نیگەرانی ئەوە بوو چی بەسەر شێوازی کارکردنی چالاکیەکانی سوپادا دێت ئەگەر یەک جێگای ئەفغانستان لەدەست بدەین، لەوەشدا مافی خۆی بوو.

لە گفتوگۆیەکمدا لەگەڵ خەلیلزاد لە بەرواری ١٩ی تەمموز باسی ئەو شیزۆفرینیایەم کرد. ئامانجی من گەیشتن بوو بە ڕێککەوتنێک لەناو

ئەقلّییەتە جیاوازەکانی ناو حکوومەتی ئەمریکا، هەروەها چارەسەرکردنی ئەو پچڕاوییە بوو کە کەوتبوویە نێوان گفتوگۆ ناوخۆییەکانمانەوە. بە دیاریکراوی لە کاتێکدا ئەو لە لایەن ترەمپەوە (یاخود پەمپەیۆ یاخود کەسێکی تر) ڕێنمایی کرابوو ڕێککەوتن لەسەر پاشەکشەی سەرتاسەری هێزەکانی ئەمریکا بکات، بە ڕێنمایی ترەمپ دەبوو پاڵپشتی لە دژەتیرۆریزم بکات بەو سەرچاوانەی کە لە چاوپێکەوتنەکەدا بۆ ترەمپ خرابوونە ڕوو، بێگومان بەبێ بەرواری دیاریکراو. فێڵەکە ئەوە بوو قەناعەت بە تاڵیبان و حکوومەتی ئەفغانستان بهێنین ئەفغانستان جێ دەهێڵین، لە هەمان کاتیشدا ئەرکێکی چاککراو دابنێین بۆ پاڵپشتیکردن لە دژەتیرۆریزم. خەلیلزاد قایل بوو و گوتی تێگەیشتووە لەوەی ترەمپ چاوەڕێی چی بووە، بەو هۆیەوە دیدارەکەم بە پێشکەوتنێکی گرنگ زانی. ئامانجی من لێرەدا ئەوە بوو دڵنیا ببینەوە لەوەی حکوومەتەکەمان لەناو خۆیدا لەسەر پێگەکەمان لە ساتی ئێستادا هاوڕایە. ئەگەر پەمپەیۆ ڕێگای بەو گفتوگۆیانە بدایە لەگەڵ خەلیلزاددا و ناچار نەبووینایە وەک سیخوڕ یەکتر ببینین، ئەوا دەمانتوانی زووتر و ئاسانتر بەو ئامانجە بگەین. لە هەر حاڵەتێکدا، گفتوگۆکانی تاڵیبان لە هاویندا خێراتر بوون.

لە چوارشەممەی ١٤ی ئابدا، کووپەرمان لە سەرۆکی ستافەکەی ئێسپەرەوە هەواڵی دیدرێکی ڕۆژی هەینیی پێگەیشت دەربارەی ئەفغانستان لە یانەی گۆڵفەکەی ترەمپ لە بێدمینستەر، کە بۆ ماوەی هەفتەیەک لەوێ بوو. ئەوە بۆ ئێمەش هەواڵ بوو، بۆیە کاتژمێر ٧:١٠ خولەک پەیوەندیم بە مولڤانییەوە کرد، کە ئەویش لە نیوجێرسی بوو، تا بزانم چ باسە. ئەو گوتی هەواڵی دیدارەکەی هەینی بیستووە و لەو بارەیەوە لە وێستەرهاوتی پرسیوە. وێستەرهاوت گوتبووی دیدارەکە لەگەڵ "پیاوە ئەفغەنییەکە (خەلیلزاد) و پەمپەیۆدایە." مولڤانی گوتی: "ئەگەر بتەوێت دەتوانیت بێیت،" منیش پێم وابێت لە وەڵامدا گوتم، "نوێنەری وەزارەتی بەرگری لەوێ

دەبێت؟" پەیوەندییەکە کۆتایی هات. ئەمە دیسانەوە دەری دەخستەوە وەزارەت چۆن مامەڵە لەگەڵ بەشەکانی تری تیمی ئاسایشی نەتەوەییدا دەکات. گومانم نەبوو لەوەی تاڵیبان خۆشحاڵە بە مەرجەکانی ڕێککەوتنە نزیکەکە، کە بە باوەڕی من بەنیاز نەبوون زۆرینەی جێبەجێ بکەن. گومانم وابوو پەمپەیۆ لە ترەمپی ویستبێت کۆتایی بە دژیەکییە ناوخۆییەکان بهێنێت، بەڵام دانوستانە ناکۆتاکان ئەنجامێکیان دروست کردبوو کە من و زۆری تریش باوەڕمان وابوو زیان بە ئەمریکا دەگەیەنن. کاری ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بریتی بوو لە دروستکردنی هاریکاری لە نێوان حکوومەت و بەرگری و ئەندامەکانی تری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوو. ئەگەر من نەمتوانیبایە ئەو ڕۆڵە بگێڕم، لەوێبوونم هیچ سوودێکی نەدەبوو. لە هەمان کاتیشدا، هیچ نەبێت سەرکەوتوانە توانیم خۆم بانگێشت بکەم.

هەمان بەیانی قسەم لەگەڵ پەمپەیۆش کرد و قسەمان لەسەر زۆر بابەت کرد و کۆبوونەوەکەی بێدمینیستەریش یەکێک بوو لەوان. ئەو گوتی هێشتا دانوستانەکان کۆتاییان نەهاتووە و هەروەک سروشتی ئاگربەستەکە و بابەتەکانی کەمکردنەوەی توندوتیژییەکانی تاڵیبان، ئەرکی دژەتیرۆریزم بە چارەنەکراوی ماونەتەوە. هەواڵم دایە ئامادەی دیدارەکە دەبم و بۆی هەیە لەگەڵ پێنسدا بە فڕۆکەیەکی ئەیرفۆرس تو بچین، ئەوجا لەوم پرسی کەی بەڕێ دەکەوێت. ئەو قسەیەم بێدەنگییەکی تەواوی دروست کرد. ڕوون بوو چاوەڕێی نەدەکرد ئەوەندە خەڵکە بەشداری لە دیدارەکەی بێدمینیستەردا بکەن، لە ناویشیاندا من. دەرکەوت هاسپێل و چیپۆلۆنێ و مارك شۆرت و کێلۆگیش بەشداری دیدارکە بوون، هەروەها مولڤانی و ئێسپەر و دەنفۆردیش.

لیندسی گراهام پاش بیستنی هەواڵی دیدارەکە پەیوەندیی پێوە کردم، ئەو ڕۆژی چوارشەممە لەگەڵ قسەی ترەمپدا کردبوو و جەختی لە مانەوەی

هێزێک کردبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریستەکان و هەندێک مەبەستی تریش. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر نیگەرانی ئەوە بوو کە لە ڕاپۆرتە هەواڵییەکاندا دەربارەی ڕێککەوتنەکە هیچ ئاماژەی بە بەندێکی وا تێدا نەبوو، پاشان داوای لێ کردم لەگەڵ جاک کیندا (جەنەراڵێکی چوارئەستێرەی خانەنشین، کە بەردەوام لە فۆکس لێدوانی هەبوو) بدوێم. کاتێک چاوەڕێی ئەوە بووم بەرێ کەوم پەیوەندیم بە کینەوە کرد و داوام لێی کرد تا ئەو جێیەی ئەو و ترەمپ زوو زوو قسە لەسەر کێشەی لەوجۆرە دەکەن، ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ ترەمپدا بکات. ئەگەر کاتێکی باش هەبوایە بۆ قسەکردنی کین و ترەمپ لەسەر ئەفغانستان، ئەوە ئەو کاتە بوو. پێنس داوای لێ کردم لە فڕۆکەکەدا بچمە کابینەکەی ئەوەوە، منیش تا ئەو جێیەی دەمتوانی مەترسییەکانی ڕێککەوتنە پێشکەشکراوەکەم ڕوون کردەوە، هەروەها باسی ئەو شکستە سیاسییەم کرد کە بۆی هەیە تووشی ترەمپ ببێت و ئاماژەشم کرد بەوەی گراهام و ئەوانی تر قسەی خۆیانیان کردووە. لە فڕۆکەخانەی مۆریستاونی نیوجێرسی دابەزین و بە ئۆتۆمبێل بەرەو بێدمینیستەر بەرێ کەوتین.

دیدارەکە کاتژمێر ٣ی پاشنیوەڕۆ بە قسەکردنی پەمپەیۆ دەستی پێ کرد: "کارمان هێشتا لەگەڵ تاڵیباندا تەواو نەبووە." کەچی پاش ئەو قسەیە باسی ڕێککەوتنێکی کرد کە وا دەردەکەوت تەواوبووبێت. وردەکارییەکانی ڕێککەوتنەکە پێچەوانەی ئەو قسانە بوون کە پەمپەیۆ بەیانییەکەی بە منی گوتبوو. ترەمپ پرسیاری زۆری کرد، بە تایبەتی دەربارەی بەندێک لەسەر گۆڕینەوەی زیندانییەکان و بارمتەکان لە نێوان تاڵیبان و حکوومەتی ئەفغانستاندا، کە لە ڕووی ژمارەوە زیاتر لە بەرژەوەندیی تاڵیبان بوو تاکو ئێمە. ترەمپ ئەوەی هیچ بەدڵ نەبوو. پاشان ترەمپ دەستی کرد بە باسی غەنی و خانووە گەورەکەی لە دوبەی، کە ئێمە بەدواداچوونمان بۆ کردبوو و زانیبوومان غەنی خانوویەکی وای نییە. بەڵام ئەوە گرنگ نەبوو، چونکە پەمپەیۆ ئاماژەی بەو ڕاستییە دابوو کە غەنی ئێستا سەرۆکە و جڵەوی هێزە سەربازییەکانی حکوومەتی کردووە. وەک چاوەڕوانکراو بوو ترەمپ پرسی: "کێ پارەیان دەداتێ؟" ئێسپەر کە ئاگای لەو سیناریۆ دووبارەیە نەبوو وەڵامی دایەوە: "ئێمە پارەیان دەدەینێ،" ئەوەش وای لە ترەمپ کرد باسی ئەوە بکات چۆن ماتیس هەمیشە گوتوویەتی: "ئەو سەربازانە ئازایانە لە پێناوی وڵاتەکانیاندا دەجەنگن،" بەڵام کاتێک بۆی دەرکەوت کۆی تێچووەکان دەگەنە ٦،٥ ملیار دۆلاری ساڵانە، یەکسەر گوتی: "پارەی ئەو سەربازانە لەڕادەبەدەرە و لە هیچ جێیەکی جیهان وانییە." ئەوجا باسی هێرشەکانی "سەوز-لەسەر-شین"ی کرد، کە تیایاندا سەربازەکانی حکوومەتی ئەفغانستان هێرشیان کردە سەر هێزەکانی ئەمریکا: "فێری تەقەکردنیان دەکەین، پاشان چەک هەڵدەگرن و دەڵێن ، 'سوپاس بەڕێز،' پاشان سەربازەکانی ئێمە دەکوژن." ئەوجا باسەکە بووە باسی هەڵبژاردنەکانی ئەفغانستان و ترەمپ دیسانەوە باسی کردەوە کە بۆچی فڵان و فیسارە بەرپرسی ئەفغانستانی بە دڵ نییە. ئەگەر ترەمپ بیتوانیبایە غەنیی سەرۆک و کارزایی سەرۆکی پێشوو لەیەکتری جیا بکاتەوە، کات و وزەیەکی زۆرمان بۆ دەگەڕایەوە.

لەگەڵ بەرەوپێشچوونی گفتوگۆکەماندا ترەمپ لە جێیەکدا گوتی: "ڕێککەوتنێکی خراپ لە ڕێکنەکەوتن خراپترە. پێم باشترە ڕێککەوتن نەکەم." پێم وابوو ئەم گوفتارە ئومێدێکی بەخشی. بەڵام زۆری بەسەردا نەڕۆیشت ترەمپ دیسانەوە بۆچونی گۆڕی و گلەیی لە چوونەدەرەوەی هەواڵەکان کرد و لە ناویشیاندا هەواڵی ئەو دیدارەمان. سەرەتا گوتی: "ئەوانە شایەنی سزادانن و کەسانێکی پیسن،" بەڵام دواتر گوتی: "خراپ نییە کە خەڵک دەزانن ئێمە قسە لەسەر ئەفغانستان دەکەین." ئەوە ڕێی خۆش کرد بۆ باسی یەکێک لە گێڕانەوە یاساییە دڵخوازەکانی ترەمپ، کە بریتی بوو لە دەستگیرکردنی ڕۆژنامەنووسان لە لایەن وەزارەتی دادەوە، پاشان زیندانیکردنیان، پاشانیش داوای سەرچاوەکانیان لێ بکرێت. تەنها بە کردنی ئەوە ڕێگری لە چوونەدەرەوەی هەواڵەکان دەکرێت. ترەمپ داوای لە چیپۆلۆنێ کرد ئەو بابەتە لای ویلیام بار باس بکات، ئەویش گوتی وا دەکات. ترەمپ بەردەوام بوو: "پەیامەکەمم بەدڵە. ئەگەر ڕووبەڕوومان بینەوە تەواوی وڵاتەکەیان وێران دەکەین. بەڵام بە چەکی ناوکی نا. ئەوانیش ڕقیان لە ئێمەیە. تاڵیبان بەدوای خاکەکەیانەوەن، ئێمەش هەر لە پێناو خاکەکەیاندا چووین بۆ ئەوێ، لە ئەنجامدا ئەوان هیچیان بۆ نەمایەوە" لە بەرزترین ئاستی حکوومەتدا.

گفتوگۆکە درێژەی هەبوو و هەستیشم دەکرد هەتا بێت سەرنجی ترەمپ دوورتر دەکەوێتەوە. شتێک ئەوی بێزار دەکرد و نەشمدەزانی چییە؟! لەناکاو، دیسانەوە بابەتەکەی لەسەر ڕێڕەوەکەی خۆی دوورخستەوە و ڕەخنەی لە بەرنامە سەربازییەکانمان گرت لە ئەفریقا، "دەمەوێت ئەو وڵاتانە جێبهێڵین،" ئێسپەر و دەنفۆردیش یەکسەر دڵنیایان کردەوە ژمارەی خۆمانمان لەوێ کەم کردووەتەوە. پاشان گەڕایەوە سەر دیدارەکەی ناتۆ (٢٠١٨) و باسی ئەوەی کرد چۆن هەڕەشەی پاشەکشەی کردووە (ئەوەش ڕاست نەبوو)، هەروەها چەندێک پارەمان لە ئۆکرانیادا سەرف کردووە. ئەوجا دیسانەوە باسی یەکەم دیداری خۆی و مێرکڵی کرد و گوتی

لەگەڵ بەرەوپێشـچوونی گفتوگۆکەمانـدا ترەمـپ لە جێیەکـدا گـوتی: "ڕێککەوتنێکی خراپ لە ڕێکنەکەوتن خراپتـرە. پێم باشترە ڕێککەوتـن نەکەم." پێم وابوو ئەم گوفتـارە ئومێـدێکی بەخشـی. بەڵام زۆری بەسـەردا نەڕۆیشت ترەمپ دیسانەوە بۆچونی گـۆڕی و گلەیـی لە چـوونەدەرەوەی هەواڵەکان کـرد و لە ناویشـیاندا هەواڵـی ئەو دیـدارەمان. سـەرەتا گـوتی: "ئەوانە شایەنی سزادانن و کەسانێکی پیسـن،" بەڵام دواتـر گـوتی: "خـراپ نییە کە خەڵک دەزانن ئێمە قسـە لەسـەر ئەفغانسـتان دەکەیـن." ئەوە ڕێـی خۆش کرد بۆ باسی یەکێک لە گێڕانەوە یاساییە دڵخوازەکانی ترەمپ، کە بریتی بـوو لە دەسـتگیرکردنی ڕۆژنامەنووسـان لە لایەن وەزارەتـی دادەوە، پاشان زیندانیکردنیان، پاشانیش داوای سەرچاوەکانیان لێ بکرێت. تەنها بە کردنـی ئەوە ڕێگـری لە چـوونەدەرەوەی هەواڵەکـان دەکرێـت. ترەمـپ داوای لە چیپۆلۆنێ کرد ئەو بابەتە لای ویلیـام بـاڕ بـاس بکـات، ئەویـش گــوتی وا دەکــات. ترەمــپ بەردەوام بــوو: "پەیــامەکەمم بەدڵە. ئەگەر ڕووبەڕوومان بینەوە تەواوی وڵاتەکەیان ویـران دەکەیـن. بەڵام بە چەکـی ناوکی نا. ئەوانیش ڕقیان لە ئێمەیە. تاڵیبان بەدوای خاکەکەیانەوەن، ئێمەش هەر لە پێناو خاکەکەیاندا چووین بۆ ئەوێ، لە ئەنجامدا ئەوان هیچیـان بـۆ نەمایەوە" لە بەرزترین ئاستی حکوومەتدا.

گفتوگۆکە درێژەی هەبوو و هەستیشم دەکرد هەتا بێت سـەرنجی ترەمـپ دوورتـر دەکەوێـتەوە. شـتێک ئەوی بێـزار دەکـرد و نەشـمدەزانی چیـیە؟! لەناکاو، دیسـانەوە بـابەتەکەی لەسـەر ڕێـڕەوەکەی خـۆی دوورخسـتەوە و ڕەخـنەی لە بەرنـامە سـەربازییەکانمان گـرت لە ئەفریقـا، "دەمەوێـت ئەو وڵاتانە جێبهێڵین،" ئێسپەر و دەنفۆردیش یەکسەر دڵنیایان کردەوە ژمـارەی خۆمانمان لەوێ کەم کردووەتەوە. پاشان گەڕایەوە سەر دیـدارەکەی نـاتۆ (٢٠١٨) و باسی ئەوەی کرد چۆن هەڕەشەی پاشەکشەی کردووە (ئەوەش ڕاست نەبوو)، هەروەها چەندێک پارەمان لە ئۆکرانیـادا سـەرف کـردووە. ئەوجـا دیسـانەوە باسـی یەکەم دیـداری خـۆی و مێرکڵـی کـرد و گـوتی

مێرکڵ پێش ئەوەی پیرۆزبایی سەرکەوتنی لێ بکات لێی پرسیوە بەنیازە دەربارەی ئۆکرانیا چ بڕیارێک بدات. ترەمپ لە وەڵامدا لە مێرکڵی پرسیبوو ئەو چ کارێك لەبارەی ئۆکرانیاوە دەکات. پاشان لە ئێمەی پرسی، "هەر بەڕاست ئێمە بنکەی فۆرت ترەمپمان دەوێت لە پۆڵەندا؟" لە وەڵامدا گوتم پۆڵەندییەکان پارەی دروستکردنی بنکەکە دەدەن، خۆشی (ترەمپ) لە چەند دیمانەیەکدا لەگەڵ سەرۆکی پۆڵەندادا قایلبوونی خۆی دەربڕیوە و بڕیارە لە ١ی ئەیلوولدا بچێت بۆ بۆ پۆڵەندا بۆ یادکردنەوەی داگیرکردنی پۆڵەندا لە لایەن نازییەکانەوە. هەموو ئەمانە ترەمپیان خاو نەکردەوە و گوتی بیری نییە بە دروستکردنی بنکەی فۆرت ترەمپ قایل بووبێت، ئەوەش یان بەڵگە بوو لەسەر خراپیی یادگەی، یانیش لەسەر لێهاتوویی ئەو بۆ نکوڵیکردن لەو شتانەی کە نەیدەویست بیری بێنەوە.

ئێسپەر هەوڵی دا ڕوونی بکاتەوە شێوازی کارکردنی تیپە سەربازییەکانمان لە پۆڵەندا خولی دەبێت نەک هەمیشەیی، بەڵام ترەمپ بازی دا بۆ بابەتێکی تر، ئەویش یارییە جەنگییەکانی کۆریای باشوور بوو. ئەو بە منی گوت: "نەدەبوو ڕێگایان پێ بدەیت بەردەوام بن". لە کاتێکدا خۆی ڕەزامەندی بۆ دەربڕیبووم، ئەویش کاتێک کە زانیبووی ئەوەی کۆریای باشوور دەیکات چالاکی سەرمێزییە نەک مانۆڕی سەربازی. ئەو گوتی: "من هەوڵ دەدەم ئاشتی لەگەڵ شێتێکدا بەرقەرار بکەم". ئەو قسەیەش لانی کەم ئاماژەی ئەوەی تێدابوو کیم جۆنگ ئون بڕێک سەربەکێشەیە. لە کۆتاییدا گوتی: "یارییە جەنگییەکان هەڵەیەکی گەورە بوو و نەدەبوو بەو چالاکیانە قایل ببم. ئەگەر کۆریای باشوور ٥ ملیار دۆلاریان نەداینێ ڕاستەوخۆ بەجێیی بهێڵن. ٣٨ ملیار دۆلارمان لە مامەڵەکردندا لەگەڵ کۆریای باشووردا لەدەست داوە. با بەجێی بهێڵین." چەند جارێک پرسیی کەی چالاکییەکەی ئێستا تەواو دەبێت (٨ی ئاب) و گوتی: "لە دوو ڕۆژدا کۆتاییان پێ بهێنن؛ یەک ڕۆژ درێژیان نەکەنەوە."

هەروەکو ئەوەشی هەر لە سەرەتاوە بڕیاری دابێت ڕێککەوتنەکەی پەمپەیۆ

و خەلیلزاد قبووڵ بکات گوتی: "با بابەتەکە بە کەم نەزانین و گەورەی بکەین، ئەوە ڕێککەوتنێکی نایابە. ئەگەر ئەوان هەر شتێکی خراپ بکەن [بە تێگەیشتنی من واتای ئەوە بوو ئەگەر تالیبان ڕێککەوتنەکە بشکێنن]، ئەوا وڵاتەکەیان دەکەین بە ملیۆنان پارچەی نەفرەتییەوە. [ئەمەم بە ستراتیژییەکی سەربازیی زیرەکانە نەزانی، بەڵکو تەنها لێکدانەوەیەکی نموونەیی ترەمپ بوو!] گلەییش لە سوپا ناکەم چونکە کەرەستەتان پێ نەدرابوو." ئەو خاڵەی کۆتایی ماتیسی سەرسام دەکرد، چونکە ترەمپ بە بەردەوامی پێی گوتبوو ئەوەی کردووە. پاشان بابەتەکەی گۆڕی بۆ گرینلاند، بەڵام بە خێرایی گەڕایەوە سەر ئەفریقا: "دەمەوێت ئەفریقا و جێگاکانی تریش بەجێ بهێڵین. دەمەوێت سەربازەکانمان لەسەر خاکی خۆمان بن. با ئەڵمانیاش چۆڵ بکەین. بە ئەڵمانیا دەڵێم: 'دەبێت یەکسەر پارەکە بدەیت.'" پاشان گەڕایەوە سەر بنکەی فۆرت ترەمپ و ئێسپەر بۆ جاری دووەم هەوڵی دا ڕوونی بکاتەوە تیپە سەربازییەکانمان بە هەمیشەیی لەوێ نابن و دەچن و دێنەوە. پاشان ترەمپ گوتی: "من بەهۆی پەیمانی دەرچوون لە ئەفغانستان و کۆتاییهێنان بە یارییە جەنگییەکان لە هەڵبژاردندا سەرکەوتووم. ٥٢ هەزار تیپی سەربازیمان لە ئەورووپا هەیە... خەڵکی ناتۆیان زۆر خۆش دەوێت." پاشان چووە سەر باسی کشمیر و گوتی: "دەمەوێت دووشەممە پەیوەندی بە مۆدییەوە بکەم. بەهۆی بازرگانییەوە هێزێکی زۆرمان هەیە".

پێنس هەوڵی دا گفتوگۆکە بگەڕێنێتەوە بۆ ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنەکەی ئەفغانستان، بۆیە پرسی ئایا هەفتەی داهاتوو باشە. ترەمپ گوتی: "لە ڕاگەیاندنەکەدا وشەی "پاشەکشە" بەکار مەهێنە، بەڵام بڵێ لە مانگی تشرینی یەکەمدا ڕێک پێش هەڵبژاردن هیچ سەربازێکمان لەوێ نامێنێت. لە ڕووی سیاسییەوە چۆنە؟" دەنفۆرد گوتی دەکرێت ژمارەمان بکەین بەونەی کە لە چاوپێکەوتنەکەدا باسمان کرد و لەوە کەمتری نەکەینەوە.

پەمپەیـۆ دیسـانەوە پێـداگریی لەسـەر پاشەکشەی تەواوەتـی کـرد لە ڕێککەوتنەکەدا، چونکە تاڵیـان ئەوەی دەویسـت. ئەوە کرۆکـی کێشـەکە بـوو. لە نزیکـی کۆتاییەکـانی دیـدارەکەدا گـوتم هێشـتاکە دەقـی ڕێککەوتنەکەم نەبینیوە، پەمپەیۆش گوتی: "ڕاستە ئێمە ئەو بابەتەمان زۆر بە شـاراوەیی هێشـتووەتەوە، بەڵام بەزوویـی لەگەڵ دابەشـکردنی زیـاتری دەقەکەدا هەواڵەکە دەچێتە دەرەوە." ئەوەش کێشـەیەکی تـر بـوو، هەوڵـی پەمپەیۆ بۆ ئەوە بوو تێکڕای بابەتەکە لە نێوان خۆی و ترەمپ و خەلیلـزادادا بهێڵێـتەوە (هەرچەنـدە لە سـەرەتای دیـدارەکە ترەمـپ گـوتی دەمـێکە خەلیلزادی نەبینیوە). پەمپەیۆ بە هێشتنەوەی شتەکە بە شاراوەیی، مسۆگەری دەکرد خۆی وەک خاوەنی تەواوی پرۆسەکە دەردەکەوێت. ئەوا لای من ئاسایی بوو. ئەگەر ئەوە خواستی ئەو و ترەمپ بووبێت، ئەوا بـۆی هەبـوو خۆیـان تووشـی پاشـڤەچوونێکی سیاسـی بـکەن. دیـدارەکە نزیکـی ٤:٥٠ خولەکی پاش نیوەڕۆ کۆتایی هات، بەبێ ئەوەی ئایا هەفتەی داهاتوو هیچ ڕاگەیاندنێک دەبێت یان نا. هـۆی ئەوە تـا ڕادەیەک بـۆ ئەوە دەگەڕایەوە هەنـدێک لە کێشـە بنچینەییەکـان چـارە نەکرابـوون، بێگومـان ئەگەر هەر چارە بکرانایە.

ڕۆژی دووشـەممە، لەسـەر داوای خەلیلـزاد چاومـان بە یەکتـری کەوت. بێگومـان ئەو و خەلیلـزاد دەرئەنجـامی دیـدارەکەی هەینییـان بە مـۆڵەت دەزانی بۆ بۆ درێژەدان بە دانوستانەکانیان، لەبارەی ئەوەشەوە بە خەلیلـزادم گوت پێم وایە لە نووسینەکەدا زیادەڕەوییان کـردووە. هەرچۆنێـک بێـت، گومانێکی کەمم هەبوو کە ترەمپ ماف بە خۆی دەدات هەرشتێکی بەدڵ نەبێت ڕەتی بکـاتەوە، جـا ئەگەر لە دواخـولەکیش و پـاش ئەوەش بێـت. خەلیلـزاد سـەرەتا ویسـتی مـن نووسـراوانە بخـوێنمەوە کە بەنزیکەیـی ڕێککەوتنیان لەسەر کرابوو، بەڵام نەیدەتوانی نووسـراوەکان جێ بهێڵێـت. سوپاسـم کـرد، بەڵام نووسـراوەکانم بە نەخوێنـدراوەیی دایەوە دەسـتی و

گوتم ڕێگا نادەم لەم بابەتانەدا پەلەم لێ بکرێت. کاتم پێویست بوو وردبوونەوە لە نووسراوەکان، ئەو بۆچوونەشم نەگۆڕی کاتێک خەلیلزاد گوتی ئێسپەر و دەنفۆرد و هاسپڵ قایل بوون بەوە. سەرسام دیار بوو بەوەی نایانخوێنمەوە، بەڵام من بە ڕوونی پێم ڕاگەیاند کە نامەوێت بە دە خولەک چاو بەوەدا بخشێنم کە ئەو و پەمپەیۆ بە دە مانگ کاریان لەسەر کردووە. پێیم گوت هەرگیز تێناگەم بۆچی پەمپەیۆ ئەو ڕێککەوتنەی هێندە بە شاراوەیی هێشتووەتەوە و ڕاگەیاندنەکانی کردووە بە بیانووی ئەوەی پیشانی کەسی نەدات. پرسیم مادام هەمووومان دەزانین مەترسییە سیاسییەکانی ئەم ڕێککەوتنە کۆمارییەکانن، واز لە دیموکراتەکان بهێنە، ئیتر بۆچی پەمپەیۆ هیچ هاوپەیمانێکی نەویستووە؟ ئەگەر دەیویست هەموو ستایشەکە بۆ ئەو بێت، ئەوا من لەوە تێدەگەیشتم، لە ئەگەری تێکچوونی ڕێککەوتنەکەدا ستایشێکی پێچەوانەی دەکرێت و خۆشی دانی پێدا نابوو ئەوە ڕوودەدات. لۆژیکی ئەو شاردنەوەیە چی بوو؟ خەلیلزاد وەڵامی نەدایەوە، پێم وابێت وەڵامدانەوەی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە خۆشی نەیدەزانی بۆچی بەو ڕادەیە لەژێر ئەو هەموو سنووردارییەی پەمپەیۆدا کاری کردووە.

پاشان باسی ئەوەمان کرد کە چی لە دانوستانەکاندا ڕوودەدات. ڕوونم کردەوە بۆچی مەرجەکانی پاشەکشەی مەرجداری هێزەکانی ئەمریکا جێبەجێ ناکرێن. دەمانتوانی بەدڵی خۆمان وشەی مەرجدار بەکاربهێنین، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ڕێککەوتنە هەر جێهێشتن بوو (لەوانەیە ترەمپ حەزی بەوە کردبێت، بەڵامی ئەوانی ترمان نا) لەگەڵ ئەو ئاژاوانەی بەدوای خۆیدا دەیهێنا. خەلیلزاد تێگەیشت بەڵام گوتی لەوە باشترمان پێ نەکراوە. بۆچوونی تایبەتی من ئەوە بوو هێزەکان تاڕادەیەکی دیاریکراو کەم بکرێنەوە، بەڵام بەبێ ڕێککەوتن (هەرچەندە ئەو ژمارەیەی پێشتر ترەمپ بڕیاری لەسەر دا زۆرترین بوو بتوانین قەناعەتی پێ بهێنین، بەڵام بە

باوەڕی من زۆر کەم بوون). لەگەڵ ئەوەشدا خەلیلزاد هێشتا پێی وابوو ترەمپ و پەمپەیۆ نووسراوێکی واژووکراویان دەوێت، ئەوەش ڕاست بوو. لەبەرئەوەی هەمیشە ئومێدم بۆ باشترین دەخواست، بە خەلیلزادم گوت کە دەستی کردەوە بە دانوستان بێهەواڵم نەکات.

لە خوانی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا من و ئێسپەر و پەمپەیۆ پێکەوە پێکەوە بووین. پەمپەیۆ لەوێدا گوتی هەست دەکات ترەمپ نائاسوودەیە، منیش هەمان بۆچوونم هەبوو. ترەمپ نەیدەویست ڕێککەوتنەکان بوەستن، بەڵام دەترسا مەترسییە سیاسییەکانی ڕووبەڕووی دەبنەوە گەورەتر بن لەوەی چاوەڕێی دەکرد، لەوانەشە ئەوە هۆیەکی باشی نەبووبێت. پاش چەند ڕۆژێک، لە ٢٧ی ئابدا، پەمپەیۆ پەیوەندی پێوە کردم بۆ ئەوەی بڵێت خەلیلزاد هەموو شتێکی تەواو کردووە و بەزوویی بە ڕێککەوتنەوە دەگەڕێتەوە. ئەو پێی وابوو ترەمپ مەیلی بۆ بۆچوونەکەی من هەیە و بەبێ ڕێککەوتن بڕیاری کەمکردنەوەی هێزەکان دەدات بۆ ئاستی دژەتیرۆریزم (٨٦٠٠، ئەو ژمارەیەشی بە ئاشکرا بەکاردەهێنا). پەمپەیۆ پێی وابوو ترەمپ دەیزانی نووسینی پاشەکشەی تەواوەتی وێرانکەر دەبێت، بە تایبەتیش کاتێک ئەو هەموو مەرجدارییە ئاڵۆزە هەن، ئەوەش هەڵسەنگاندنی من بوو و لە بێدمینیستەر باسم لەوە کردبوو. دەربارەی ئەوەشی ئایا سوپا بەبێ "پاراستنی" پەیمانێک هەڵ دەکات؟! پەمپەیۆ گوتی فەرماندەی ئەمریکا پێی باشترە پەیمانێک هەبێت، بەس ئەگەر نەشبێت کێشەی نابێت. ئەوە شتەکەی بۆ ڕوون کردمەوە. ترەمپ لە دیدارێکی ڕادیۆییشدا لەگەڵ برایان کیلمێدی فۆکسدا گوتی: "لەوێ دەمێنینەوە. ژمارەمان زۆر کەم دەکەینەوە، بەڵام هەر دەمێنینەوە. هەواڵگریی باڵامان دەبێت، بەڵام لە ئەگەری ڕێککەوتندا دەیوەستێنین. نازانم ئەوە ڕوودەدات یان نا. "برایان"، خۆت دەزانی من لەو بابەتانەدا چۆنم." لە ٢٩ی ئابدا، کاتێک لە فڕۆکەدا بووم بەرەو وارشۆ، پەیوەندیم بە پەمپەیۆوە کرد و

گوتی لەو کاتەوەی ترەمپ ئەو لێدوانانەی داوە وەزیرەکانی دەرەوەی ناتۆ و ستۆڵتنبێرگ یەک لەسەر یەک پەیوەندی پێوە دەکەن.

لە هەمان ڕۆژدا، ترەمپ بەهۆی تۆفانی دۆریانەوە[1] گەشتەکەی بەرەو پۆڵەندا هەڵوەشاندەوە و پێنسی وەک نوێنەری شاندی ئەمریکا دیاری کرد. بۆیە دیدارە کلیلییەکە لەسەر ئەفغانستان کەوتە هەینییەوە، ٣٠ی ئاب، کە تیایدا پێنس لە دەرەوەی دیدارەکەوە بەشدار بوو؛ پێم وابێت خەلیلزاد لە دەوحەوە ئامادە بوو؛ منیش لە ڕێگای ڤیدیۆکۆنفرانسەوە لە وارشۆوە ئامادە بووم؛ ئامادەبووەکانی تر لە ژووری دانیشتنەکەدا بووم، بە کووپەرمانیشەوە کە دواتر باسی کەشی ژوورەکەی بۆ کردم. بەرواری دیدارەکەمان بە سەرلەبەر باسکردنی ئەفغانستان نەگۆڕیبوو، بەڵکو دەشمانویست باسی ئۆکرانیا بکەین، بۆیە ئەو دیدارە زۆر مەودایە زۆر گرنگ بوو و کاتژمێر هەشت و چل و پێنج خولەکی ئێوارە دەستی پێ کرد، بێگومان بە کاتی وارشۆ. ئەوە زۆر پێکەنیناوی بوو، چونکە واشنتۆن پۆستی هەمیشە تێکۆشەر دەیویست وتارێک لەسەر ئەوە بڵاو بکاتەوە (بڵاویشی کردەوە) کە گوایە من لە دیدارە گرنگەکانی ئەفغانستان بێبەش کراوم. بەڕاستی ماندوونەناس بوون! گفتوگۆ سەرەتاییەکە هەر لەوەی بێدمینیستەر دەچوو و سەرەتا ترەمپ گوتی: "ئەوەی تاڵیبان دەیەوێت خاکەکەیەتی". هەروەها دیسانەوە سەرۆک غەنیی ئێستا و سەرۆک کارزایی پێشووی تێکەڵ کرد و سەرووەت و سامانی یەکێکیانی دەدایە پاڵ ئەوی تر.

پاش کەمێک ترەمپ لێی پرسیم: "چۆن، تۆش واژووی دەکەیت؟" من گوتم، "نەخێر جەنابی سەرۆک." دیسانەوە بۆم ڕوون کردەوە بۆچی

---

(١) تۆفانی دۆریان: تۆفانێکی زۆر بەهێز و وێرانکەری جۆری ٥ی ئەتلانتیک بوو، کە بووە توندترین زریانی خولگەیی کە بەر وڵاتی بەهاما کەوتبێت و وەک خراپترین کارەساتی سروشتیش دیاری کرا لە مێژووی وڵاتەکەدا.

پێویستە ژمارەکە بۆ ٨٦٠٠ دابەزێنێت لەگەڵ هێزە هاوپەیمانەکاندا، پاشان چاوەڕێی بەرەوپێشچوونی زیاتر بکات، وەک هەڵبژاردنی ئەفغانستان. متمانە بە تاڵیبان و میکانیزمی سەپاندنەکە نەدەکرا. ئەوە ڕێککەوتنێکی عەقاراتی نیویۆرک نەبوو. پاشان خەلیلزاد ڕوونی کردەوە ئەوە ئەو ڕێککەوتنە بووە کە ترەمپ گوتوویەتی دەیەوێت. ئێسپەر گوتی پێی وایە من ئاماژەم بە هەندێک خاڵی گرنگ داوە، بەڵام وەزارەتی بەرگری سوورە لەسەر ڕێککەوتن، چونکە ڕێککەوتنەکە مەرجدارە. ترەمپ پرسیارە هەمیشەییەکەی خۆیی کرد: "ئەم ڕێککەوتنە تا چ ڕادەیەک ناشرینم دەکات؟ دیموکراتەکان ڕێککەوتنی گەورەش ناشرین دەکەن." ئێسپەر پێشنیاری بانگێشتکردنی سەرکردەکانی هیلی کرد بۆ ڕاوێژ. ترەمپ پرسی: "ئایا ئەم ڕێککەوتنە بە ئاسانی لای خەڵک جوان دەکرێت؟" من گوتم پێم وانییە، زیاتر لەبەرئەوەی تاڵیبان پابەندی ڕێککەوتنەکە نابێت و هەمووشمان ئەوە دەزانین.

پاشان ترەمپ تەواوی گفتوگۆکەی بەم قسەیە تەقاندەوە: دەمەوێت لەگەڵ تاڵیباندا بدوێم. با بێن بۆ واشنتۆن". زۆر دڵخۆش بووم بەوەی لە کاتی بیستنی ئەو قسەیەدا لە ژوورێکی پارێزراودا بووم لە ئەورووپا و لە ژووری دانیشتنەکەدا نەبوو، ترەمپ لە پێنسی پرسی بۆچوونی ئەو چییە، پێنسیش بە وریاییەوە وەڵامی دایەوە: "پێویستە پێش بڕیاردان زیاتر ڕابمێنین. ئەو کەسانە دەستدرێژییان کردووەتە سەر خەڵکەکەی خۆیان و ستەمیان لێ کردوون، ئایا بەڕاستی گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە؟" پاشان ترەمپ باسی کوڕەزاکەی بیلی گراهامی کرد، کە ڕائیدێک بوو لە ئەفغانستان خزمەتی دەکرد و گوتبووی: "خاکەکەیانمان داگیر کرد." ترەمپ لە دەنفۆردی پرسی، "بۆچی ئەو هێشتا هەر ڕائیدە؟ خۆ پیاوێکی زۆر قۆزە." پاشان باسی ئەوەمان کرد کاردانەوەی کۆنگرێس چۆن دەبێت لەسەر پابەندبوونی ئەمریکا بە پاشەکشەی تەواوەوە، هەروەها بەنیازین چی بکەین دەربارەی حکوومەتی هەڵبژێردراوی ئەفغانستان.

ترەمپ گوتی: "دەمەوێت غەنیش لێرە بێت، هەروەها تاڵیبانیش. با پێش واژووکردن ئەوە بکەین. دەمەوێت پێش واژووکردن بیانبینم، پەیوەندیی تەلەفونیم ناوێت".

خەلیلزاد گوتی: "ئەوان خۆشحاڵ دەبن".

ترەمپ ڕووی کردە شاشەی ژوورەکە و گوتی: "هێی جۆن، تۆ دەڵێیت چی؟"

هەستم دەکرد ئەو دیدارەی ترەمپ و تاڵیبان و غەنی دەتوانێت ڕێککەوتنە چاوەڕوانکراوەکە تێک بدات کاتێکدا تاڵیبان و ئەفغانستان لەسەر دەرئەنجامەکانی کێشەیان بۆ دروست دەبوو، یانیش هیچ نەبێت بۆ ماوەیەک دوای بخات، چونکە ئەو دوو لایەنە کاتیان پێویست بوو بۆ دیاریکردنی پێگەی خۆیان. ئەوە کاتی بە ئێمە دەدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی تر بۆ تێکدانی ڕێککەوتنەکە. لەبەر ئەوە گوتم: "بەلای منەوە شتێکی خراپ نییە، بەو مەرجەی پێش ئەوەی تۆ ببینن بە بەهێزترین موگناتیسپێوی[1] جیهاندا تێیپەڕن".

ترەمپ گوتی: "هەروەها پێوەرێکی کیمیاییش." ڕاستیشی دەکرد.

تەنها ترەمپ دەیتوانی خەیاڵی سەرۆکێکی ئەمریکا بکات لەگەڵ شەلاتیگەلێکی ئاوادا دابنیشێت، بەڵام بە کردنی ئەوە ئەو ڕێککەوتنەی دەخستە مەترسییەوە کە پەمپەیۆ کۆششی بۆ دەکرد. ترەمپ گوتی: "لەوەیە بێن، لەوەشە نەیەن."

پەمپەیۆ گوتی: "دەبێت جوانتر بیری لێ بکەینەوە."

پێنس پرسیی: "سەرەتا غەنی دەبینیت؟"

---

(١) موگناتیسپێو: ئامێرێکە بواری موگناتیسیی زەوی دەپێوێت و چەک و تەقەمەنیشی پێ ئاشکرا دەکرێت.

ترەمپ گوتی: "تەنها ئەگەر غەنی بزانێت دوای ئەوان لەگەڵ تاڵیبانیشدا دادەنیشم."

بیرکردنەوەی دواتری ترەمپ کەمکردنەوەی ڕاستەوخۆی یەکە سەربازییەکانمان بوو. هیچ کام لە ئامادەبوان پاڵپشتی ئەو بیرۆکەیە نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا بەس خەلیلزاد قسەی لە دژی کرد.

ترەمپ گوتی: "ڕەفتاری ئێمە ئەوەیە هەوڵی دەرچوون نادەم. سەرەتا غەنی دەبینم. دەکرێت ئەمە بوارمان بداتێ دواتر ئەنجامی باشترمان هەبێت. تاڵیبان دەیانەوێت لەگەڵ دۆناڵد ترەمپدا بدوێن بۆ ئەوەی مامەڵەی ئاشتی بکەن. دەبێت بە ڕاگەیاندنەکان بڵێین سەرۆک ترەمپ قایل بووە بە دیدارێک و بە نامەزرۆییەوە چاوەڕێیە." دەمتوانی لەو دوورەوە هەست بە وێرانبوونی پەمپەیۆ و ئەوانی تر بکەم (کووپەرمان دوایی ئەوەی بۆ پشتڕاست کردمەوە). پێنسی گوتی: "دەبێت بشڵێین غەنی و بەرپرسەکانی تری حکوومەتی ئەفغانستان دەبینین". ترەمپ بە دڵی بوو و گوتی: "بەڵێ پێش دیدارەکەی تاڵیبان."

لەگەڵ گوتنی ئەوەدا ترەمپ هەستا و ویستی دانیشتنەکە بەجێ بهێڵێت. لە وارشۆە هاوارم کرد، "ئەی ئۆکرانیا؟" ئەوەش دیدارەکەی بەرەو لای ئەو بابەتە برد و لە بەشی داهاتوودا بە درێژی باسی دەکەم.

لە پاش پەیوەندییەکە وام لێک دایەوە ترەمپ لەبەرئەوەی بەدوای جێگرەوەیەکەوە بووە بۆ ڕێککەوتنەکەی پەمپەیۆ و خەلیلزاد، پێشنیاری ئەو دیدارەی کردووە. ڕوون بوو بە تەواوەتی هاوڕای من نەبوو لەسەر ئەوەی نابێت واژووی بکات، بەڵام لانی کەم دەیزانی واژووکردنی ئەو ڕێککەوتنە مەترسیی سیاسی دەبێت. کاتێک ڕووبەڕووی ئەو هەڵبژاردنە ناخۆشانە بوویەوە، دەستی بۆ شتێک درێژ کرد کە لەو کێشەیە بیپارێزێت و خۆشی بخاتە ڕۆڵی سەرەکییەوە. دەکرا چ شتێکی خراپ ڕووبدات؟ جەنگەکە گەرم بوو.

کە گەڕامەوە، واشنتۆن کووپەرمان گوتی کە لە دان ویڵشی (جێگرێکی مولڤانی) بیستووە، گوایە ترەمپ دەیەوێت دیدارەکەی غەنی لە کامپ دیڤد بێت. دیاریکردنی بەرواری ئەو دیدارەم لە هزری خۆم کردبووە دەر، لەوەشدا هەڵە بووم، چونکە وام دانابوو لە ڕووی لۆژیکییەوە ئەوەندە ئاڵۆز دەبێت کە دواکەوتنی ناچاری دەبێت، واز لەوەش بهێنە بۆی هەبوو سەرکردەکانی تاڵیبان هەست بکەن ئەوە تەڵەیە و بانگێشتەکە ڕەت بکەنەوە. بۆیە بیرۆکەی ئەوەی شتەکان بە ڕادەیەک بەرەوپێش چوون کە ترەمپ کامپ دەیڤد بە جێی دیدارەکە دیاری دەکات شتێکی ئومێدبەخش نەبوو. من نە دیدارم دەویست نە ڕێککەوتن، کەچی ئێستا وا دیار بوو هەردووکیان بێنە دی. ڕۆژی دواتر، ٥ی ئەیلوول، مولڤانی پێش هەشتی بەیانی هاتە نووسینگەکەم تا پێم بڵێت شتەکان بەرەو کوێوە دەڕۆن. وای دانابوو ڕۆژی شەممە لەگەڵ ترەمپدا بچێت بۆ کامپ دەیڤد و منیش ڕۆژی یەکشەممە بێم لەگەڵ ئەوانی تر (پەمپەیۆ، ئێسپەر، دەنفۆرد، خەلیلزاد). پەمپەیۆ سەرقاڵی ئامادەکارییەکانی گەشتەکە بوو بۆ تاڵیبان، هەروەها قەتەرییەکانیش لەگەڵ تاڵیباندا دەهاتن. شتێکی سەرنجڕاکێشی تریش ئەوە بوو هەتا دەهات پەمپەیۆ بێمەیلتر دەبوو بەرامبەر بە ڕێککەوتنەکە، لەوانەیە بۆی دەرکەوتبێت ئەوەی کە بەهێزترین پاڵپشتی ڕێککەوتنەکەیە مەترسییەکی سیاسیی گەورەی تێدایە بۆی.

ویڵش زۆر پەشۆکاو بوو لە مەترسییە جەستەییەکانی ئەو دیدارە و نەبوونی کاتی پێویست بۆ خۆئامادەکردنی تەواو، بەڵام ترەمپ سوور بوو لەسەر دیدارەکە. ترەمپ نیگەرانی ئەوە بوو ئەو هەموو چاودێری و پشکنینە بێزارکەرە ببێتە هۆی ڕوشاندنی شکۆ و ڕێزی تاڵیبانییەکان. ئەوە بووە هۆی دروستبوونی دیدارگەلێکی قەرەباڵغی کاتی بەیانی بۆ تاوتوێکردنی ئەوەی چۆن ترەمپ لە میوانە بەڕێزەکانی بپارێزین. ئەوەی من و مولڤانی و کووپەرمان و واڵش کۆک بووین لەسەری، بەشدارینەکردنی پێنس بوو لە

دیدارەکەدا. زۆر شت هەن ناتوانم لێرەدا باسیان بکەم، بەڵام ئەوەندە بەسە بڵێم هیچ کەسێکی وێست وینگ ئەو چالاکییەی پێ خۆش نەبوو.

لە ناوەنـدی گفتوگۆکانمانـدا، لە ئەفغانسـتانەوە هەواڵـی تەقینەوەیەکـی خۆکوژیمان پێگەیشت کە لە شاری کابووڵ ئەنجام درابوو. تەقینەوەکە دە کـوژراوی لـێ کەوتبـووەوە، یەکێکیـان ئەمریکـی بـوو و ئەنـدامێکی خزمەتگوزاریی ڕۆمانیاشی تێدابوو، هەندێکی تریش برینـدار بووبـوون. تـا ڕادەیەکی زۆر گومانی تێدا نەبوو تاڵیبان هێرشەکەی کـردووە، هەرچەنـدە بە لەبەرچاوگرتنی چالاکییەکـانی ئەو دوایـیەی ئێـران لە ئەفغانسـتان، بـۆی هەبوو تەقیـنەوەکە هەوڵێکـی هاوبەشـی ئێـران و تاڵیـبان بووبێـت. مولڤـانی کەمێک پێش کاتژمێر نـۆی بەیـانی هـاتە نووسـینگەکەم و گـوتی: "ئەگەر خوێندنەوەکەم بۆ ترەمپ ڕاسـت بێـت، ئەوا پـێم وایە لانـی کەم ئەگەری سەدا بیست هەیە دیدارەکەی یەکشـەممە هەڵبوەشـێنێتەوە. ترەمـپ گـوتی: 'دیدارەکە بەڕێوە ناچێت،'" بەلای مـنەوە ئەوە زیـاتر بـوو لە سـەدا بیسـت. ئاماژەم بەوە دا هەر ئەوەندەی ترەمپ غەنی و تاڵیبانی بینی، خۆی دەکـاتە خاوەنی ڕێککەوتنەکە هیچ دەرفەتێک ناهێڵێتەوە بـۆ جیـاکردنەوەی خـۆی لە ڕێککەوتـنەکە، کاتێـک شـتەکان بە ئاڕاسـتەیەکی خراپـدا دەڕۆن. لە ڕاستیدا، هەرچەندە کەس لە دەرەوەی بەڕێوبەرایەتی ئاگاداری دیدارەکەی تاڵیبان نەبوو لە کامپ دەیڤد، شیکردنەوەکان لەسەر خراپیی ڕێککەوتنەکە لە زیادبووندا بوون. بەم شێوەیە هەلێکی تری دواکەوتنی شتەکان دروست بوو، ئەگەرێکی فراوانیش هەبوو ڕێککەوتنەکە بە تەواوەتی تێـک بچێـت. لەوەش زیاتر، ئەگەر دیـدارەکە بەڕێـوە بچـوایە دەکەوتە ٨ی ئەیلـوولەوە، ئەوەش دەیکردە سێ ڕۆژ پێش هێرشـەکانی ١١ی سـێپتێمبەری ئەلقاعیـدە، کە تاڵیبانیش دەستی تیایاندا هەبوو. مەگەر دەکرا تێبینیی ئەوە نەکرێت؟!

من و مولڤانی بڕیارمان دا هەتـا زووە ترەمـپ ببیـنن، ئەو زووەش کـردیە کاتژمێر یازدە و چل و پێنج خولەک. من و مولڤانی و ترەمـپ و پەمپەیـۆ

ئامادە بووین، بە هۆکارێکی ناڕوون منوشنیش لەوێ بوو. پێش ئەوەی لە ژووری هێلکەییدا دابنیشین، ترەمپ گوتی: "دیدارەکە ناکەین. ڕایبگەیەنن 'وادەی دیدارمان دیاری کردبوو، بەڵام ئەوان سەربازێکی ئێمە و دە کەسی تریان کوشت، بۆیە ئێمە دیدارەکەمان هەڵوەشاندەوە.' دەبێت ئاگربەست ڕابگەیەندرێت، ئەگینا دانوستان ناکەم. دەبێت بۆمبێکیان بەسەردا بەر بدەینەوە و خراپیان بەسەردا بهێنین. ئەگەر ئەوان ئاگربەستیان نەوێت، منیش ڕێککەوتنم ناوێت." ئەوە زۆرینەی شتەکانی یەکلایی کردەوە. کاتێ پەمپەیۆ گەڕایەوە بۆ وەزارەت هەندێک قسەمان کرد تا بزانم ئەویش بە هەمان شێوەی من لە قسەکانی ترەمپ گەیشتووە کە نەک هەر دیدارەکەی تاڵیبان، بەڵکو ئەوەی غەنیشی هەڵوەشاوەتەوە، ئەویش هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی ترەمپیش هەر ئەوەی مەبەست بووە. گوتیشمان نابێت هیچ قسەیەک بۆ ڕاگەیاندن بکەین لەسەر دیدارەکەی تاڵیبان، وەک چۆن پێشتر لەگەڵ مولڤانیشدا هەمان قسەمان کرد. باشتر بوو هیچ لەسەر ئەو دیدارە نەڵێین و ئومێدەوار بین هەرگیز ئاشکرا نەبێت. ڕاگەیاندنەکانی ئەفغانستان قسەیان لەسەر سەردانی غەنی کردبوو بۆ واشنتۆن، بەڵام ڕاگەیاندنەکانی ئەمریکا نەیانزانیبوو هۆکاری ڕاستەقینەی سەردانەکە چییە؛ لەوانە بوو شتەکان بەو جۆرە بمانایەتەوە.

بەڵام بێگومان شتەکان وا نەمانەوە. لە ئێوارەی یەکشەممەی ٧ی ئەیلوولدا، ترەمپ بەبێ ئاگادار کردنەوە تویتی کرد:

لای زۆرینەی خەڵک شاراوەیە، بڕیار وابوو سەرکردە باڵاکانی تاڵیبان بە جیا و سەرۆکی ئەفغانستان بەجیا بێن و ڕۆژی یەکشەممە لە کامپ دەیڤد بە نهێنی من ببینن. بڕیار وابوو ئەمشەو بێن بۆ ئەمریکا.

بەداخەوە، بۆ ئەوەی پێگەی خۆیان لە دیدارەکەدا بەهێز بکەن، هەستان بە کردنی هێرشێک لە کابووڵ کە بووە هۆی کوشتنی یەکێک لە

مەزنترین سەربازەکانمان و یازدە کەسی تریش. پاش زانینی ئەو هەواڵە یەکسەر دیدارەکەم هەڵوەشاندەوە و دانوستانەکانی ئاشتیم ڕاگرت. چ کەسێک تەنها لەبەرئەوەی بەهێزتر دەربکەوێت ئەو هەموو مرۆڤە دەکوژێت؟

بەڵام با بزانن بەم کارەیان پێگەی خۆیانیان بەهێزتر نەکردووە، بەڵکو خراپتریان کردووە. ئەگەر لەم کاتە هەستیارانەدا کە دانوستان لەسەر ئاشتی دەکەن، نەتوانن پابەندی ئاگربەست بن و ١٢ کەسی بێتاوان بکوژن، ئەوا دیارە هێزی سازکردنی ڕێککەوتنێکی واتاداریان نییە. بەنیازن تا چەند دەیەی تر بجەنگن؟

ترەمپ خۆی پێ نەدەگیرا. ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژی یەکشەممە پڕ بوون لە هەواڵی ئەو کارەساتەی خەریک بوو لە کامپ دەیڤد ڕوویدات. تاڵیبان بە شێوەیەکی هەڵەشانە ڕایگەیاند لە هەڵوەشاندنەوەی دیدارەکەدا زەرەرمەندی یەکەم ئەمریکایە، کە ئەوە بە تەواوەتی هەڵە بوو، بەڵام ئەو قسەیە ئاماژەش بوو بۆ ئەوەی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیی ئەفغانستان بەرەوپێش دەچن، هەرواش بوو. نە سەرۆک غەنی لاوازبوو زۆرینەی هێنا نە عەبدوڵلا عەبدوڵلای بەڕێوبەری گشتیش زۆرینەی هێنا، ئەوەش بووە هۆی ئەنجامدانی قۆناغی دووەمی هەڵبژاردن کە خرایە ٢٠٢٠ەوە. بڕیاری قۆناغی دووەم نەبووە هۆی بەهێزبوونی دەستی حکوومەت، بەڵکو بووە هۆی دروستبوونی نادڵنیایی سیاسیی زیاتر. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەفغانییەکان سوور بوون لەسەر هەڵبژاردنی سەرۆکێکی هەڵبژێردراو نەک حوکمێکی دیکتاتۆری، ئەوەش هیچ نەبێت بڕێک هاندان بوو بۆ ئەوانەی بەنیازی فرۆشتن بوون بە تاڵیبان.

***

ئەوە دوابەشداریی من بوو لە بابەتی ئەفغانستاندا. لەپاش

دەستلەکارکێشانەوەی منیشەوە، ترەمپ هەر بەردەوام بووە لە گفتوگۆکردن لەگەڵ تاڵیباندا و گفتوگۆکانیش هەروەک پێشوو چارەنووسساز بوون بۆ ئەمریکا. هەرچۆنێک بێت، لەگەڵ پاشەکشەکە کارەساتبارەکەی سووریا لە مانگی تشرینی یەکەمدا، کە هەڵەیەکی ڕوونی زۆرلێنەکراوی ترەمپ بوو، دژایەتییەکان بۆ پاشەکشە لە ئەفغانستان زیادیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، لە شەممەی ٢٩ی شوباتی ٢٠٢٠دا، ئەمریکا و تاڵیبان ڕێککەوتنێکیان کرد کە بە بۆچوونی من هەروەک ڕێککەوتنە نەکراوەکەی ئەیلوول وابوو. ڕۆژی دواتر دژایەتی خۆمم دەربڕی: "واژووکردنی ئەو ڕێککەوتنە لەگەڵ تاڵیبان مەترسییەکی قبووڵنەکراوە بۆ دانیشتوانی مەدەنیی ئەمریکا. ئەو ڕێککەوتنە لەسەر ستایلی ئۆبامایە. ڕەوایەتی دەدات بە تاڵیبان ئاماژەی هەڵە بۆ تیرۆریستەکانی داعش و ئەلقاعیدە و دوژمنەکانی ئەمریکا بنێرێت". پاش چەند کاتژمێرێک ترەمپ بە شێوازی تایبەتی خۆی لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیدا وەڵامی دایەوە و دەربارەی من گوتی: "دەرفەتی خۆی هەبوو، بەڵام بەکاری نەهێنا." ئەم بەشەی پێشوو پێچەوانەکەی ڕوونی دەکاتەوە بە پێچەوانەوە ڕێککەوتنی ئەفغانستان بە تەواوەتی هی ترەمپ بوو. کات دەیسەلمێنێت کێ ڕاستە، هەروەها لەوانەشە کاریگەرییەکانی ڕێککەوتنەکە جارێ دەرنەکەون تا کاتێک ماوەی ترەمپ کۆتایی دێت. بەڵام نابێت گومان لەم ڕاستییە بکرێت: ترەمپ بەرپرسیار دەبێت لە دەرئەنجامە سیاسی و سەربازییەکان.

## بەشی چواردەم

## کۆتایی خۆشییەکە[1]

ئۆکرانیا ئەو شوێنە نییە ببێتە گۆڕەپانی داگیرکاریی سەرۆکایەتییەکی ئەمریکی، بەڵام ئەمە بەتەواوی ئەو شتەیە کە لەساڵی ٢٠١٩ ڕوویدا؛ بابەتەکە چەند ڕۆژێک دوای دەستلەکارکێشانەوەی من تەقییەوە. کاتی بڕیاری دەسلەکارکێشانەوەکە لەوە گونجاوتر نەدەبوو. من نەک تەنیا بەشدار و گەواهیدەرێکی زۆربەی ئەو کارەساتانە بووم کە ڕوویان دا، بەڵکو ئامادەش دەردەکەوتم کە بەشدار بم لە تەنیا چوارەم پرسی لێپرسینەوەی سەرۆکێکی ئەمریکی لە مێژوودا، ئەوە گرنگ نەبوو بۆ چاکە بوویێت یان خراپە. لە تەواوی ماوەی مانەوەم لە "باڵی چەپ"ی کۆشکی سپی، ترەمپ دەیویست ئەو کارە بکات کە دەیەوێ بیکات. ئەمەش بە پشتبەستن بە هەرچییەکی کە دەیزانی و دەیدیت و بە لەبەرچاوگرتنی باشترین بەرژوەندییە کەسییەکانی خۆی. لە ئۆکرانیاش، وا بەدەر دەکەوت کە لە کۆتاییدا هەرچییەکی بیەوێت بە دڵی خۆی دەبێت.

ئۆکرانیا لە ژێر زۆر فشاری سیاسی و ئابووری ڕووسیادایە. لە ساڵی ٢٠١٤، مۆسکۆ دوای دەستێوەردانی سەربازی کرایمیای بەشێوەیەکی نایاسایی خستە ژێر ڕکێفی خۆی، ئەمە یەکەمین گۆڕانکاری بوو لە سنوورەکانی ئەوروپا لەوەتەی ساڵی ١٩٤٥ ڕوو بدات. هێزە ڕووسیەکان لە تێکڕای هەرێمی دۆنباس لە ڕۆژهەڵاتی ئۆکرانیا مانەوە بۆ هاوکاریکردن و

(١) چامەیەك تایبەت بێت بە وەسفی ژیان و خۆشییەکانی سروشت و لادێ

لەڕاستیشدا ئاراستەکردنی هێزە جیاخوازەکانی ئەوێ. جیاوازییە مەزنەکەی نێوان ئەمریکا و ڕووسیاش ئەوەی دەرخست کە شکستی هەوڵەکان بۆ بەئەندامکردنی ئۆکرانیا لە ناتۆ وای کرد وڵاتە مەزن و گرنگ و هەستیارەکە لەرزۆک بێت لە بەرامبەر هەوڵەکانی پوتین بۆ داڕشتنەوەی هەژموونی ڕووسیا لە چوارچێوەی سنوورەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو.

لە لووتکەی بوخارستی ناتۆ لە نیسانی ٢٠٠٨، ئیدارەی بوش هەوڵی دا جۆرجیا و ئۆکرانیا بخاتە سەر ڕێگەی بە ئەندامبوونی ناتۆ، کە وڵاتە ئەورووپییەکان و بە تایبەت ئەڵمانیا و فەڕەنسا دژی بوون. لە ئابی هەمان ساڵدا دەرئەنجامە تراژیدییەکان بەدەر کەوتن، لەو کاتەی هێزە ڕووسییەکان جۆرجیایان داگیر کرد و دوو پارێزگایان خستە ژێر ڕکێفی مۆسکۆ، کە تا ئێستاش بەو شێوەیە ماوەتەوە. مەینەتییەکانی ئۆکرانیا دواتر بەدەرکەوتن، بەڵام بە هەمان شێوازی جۆرجیا. ئەمە سزاکانی ڕۆژئاوای بەدوادا هات، بەڵام لە سەردەمی ئیدارەی باراک ئۆباما ڕووسیا نە کشایەوە و نە ئاکارە شەڕانگێزییەکانی بەشێوەیەک گۆڕی هەستی پێ بکرێت، چونکە هەستی بەو لاوازییە ئاشکرایەی ئۆباما کردبوو کە لەسەر ئاستی جیهانیدا پەیڕەوی دەکرد.

ترەمپ ئەم کارەساتەی بۆ بەجێ مابوو، بەڵام لە دوو ساڵی یەکەم لە نووسینگەی سەرۆکایەتی و بە لایەنی کەم بە فەرمی، کەمتر گرنگی بە بابەتەکە دەدا. لە ٢٠١٧ تیلەرسۆن کێرت ڤۆلکەری وەک نوێنەری تایبەت بۆ دانوستانەکانی ئۆکرانیا دەستنیشان کرد؛ ڤۆلکەر کارمەندێکی کاروباری دەرەوە بوو و دەمناسی. یەکەمین کۆبوونەوەی من لەگەڵ ڤۆلکەر لەو چوارچێوەیەدا لە ١٠ی ئاباری ٢٠١٨ بوو تێیدا ئاماژەی دا بە ڕۆڵ و پێشینەی کارەکانی. ئەو کات ئەو بانگەشە و پاڵپشتی لە "سیاسەتی داننەنان" دەکرد لە لەخۆگرتنی کرایمیا لە لایەن ڕووسیا و بوونی سەربازییان لە هەرێمی دۆنباسی ئۆکرانیا. بە درێژایی مانەوەم لە کۆشکی سپی، ڤۆلکەر

بەردەوام سەردانی دەکردم و زانیاریی نوێی لەبارەی هەوڵەکانی پێ دەدام. بە کەسێکی پیشەییم دادەنا و ئەو کاتەی لەگەڵ هاوتا ئەورووپییەکانم لەسەر کێشەکانی ئۆکرانیا و پرسە پەیوەستەکانی دی لە پەیوەندی و گفتوگۆدا بووم، ئەو هاوکارییەکی باشی دەکردم.

یەکەمین ئەزموونی من لە ئۆکرانیا و لە ئیدارەی ترەمپ لە ساڵی ٢٠١٨ بوو، کاتێک بە گەشتێکی ئاسمانی ڕووم کردە کییڤ بۆ بەشداریکردن لە ٢٤مین ساڵیادی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئۆکرانیا، کە ساڵی ١٩٩١ لە یەکێتیی سۆڤیەت جیا ببووەوە. جیم ماتیس لە ساڵی ٢٠١٧ بەشداریی مەراسیمەکەی کردبوو، وەکو منیش هەستی بە گرنگیی ڕژدیی نیشاندانی پاڵپشتی ئەمریکا بۆ ئۆکرانیا کردبوو لەپێناو بەردەوامیی سەربەخۆیی ئۆکرانیا و مانەوەشی. بە لەبەرچاوگرتنی هەوڵی تاکلایەنەی ڕووسیا بۆ لەخۆگرتنی کرایمیا و هاوکاری ڕوونی ڕووسەکان و دەسەڵاتیان بەسەر هێزە "بەرهەڵستکارەکان" لە ڕۆژهەڵاتی ئۆکرانیا، ئەمە نیگەرانییەك بوو لە نیگەرانییەکی گریمانەیی زیاتر بوو.

شەوی پێشووتر لە ژنێڤ هاتبوومە ئەوێ، دوای کۆبوونەوەم لەگەڵ هاوتا ڕووسییەکەم نیکۆلای پاتروشێڤ لەسەر کێشەکانی نێوان ئەمریکا و ڕووسیا؛ بە خۆشحاڵییەوە پێم ڕاگەیاند لە سویسراوە دەچمە ئۆکرانیا. پێکەنین ئەو ناوەی تەنی. ئەگەر بە خواستی ڕووسەکان بوویێت یاخود نا، ئۆکرانیا لە دوایین بابەتەکانی ئەجێندای گفتوگۆکان بوو، بە دەگمەن کاتیشمان بۆی هەبوو. بەر لەوەی هەردووکمان ئەوێمان بەرەو فرۆکەخانەی ژنێڤ جێ هێشت؛ لە بری گفتوگۆیەکی ڕاستەقینە و بۆ دەرخستنی ئەو هەستەی بۆ ئۆکرانیا هەمان بوو پێم گوت: "لەسەر ئەو مەبەستە سوورین چ ئەوەی لێرە باسمان کردووە و چ ئەوەشی لە پێشووتردا گوتراوە!" پاتروشێڤ هیچێکی وای دەربارەی هیچ شتێک نەگوت.

لە ٢٤ی ئاب، کۆبوونەوەیەکم بە ژەمی بەیانییەوە لەگەڵ سەرۆکوەزیران ڤلۆدیمیر گرۆیسمان هەبوو لەسەر بارودۆخی ئابووریی ئۆکرانیا و هەوڵە زۆرەکانی ڕووسیا بۆ دەستتێوەردان لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٩. گرۆیسمان ئاماژەی بەوەدا ئۆکرانیا هێڵێکە لەبەردەم پوتین و ئەگەر سەرکەوتووانە هێڵەکە ببڕێت، بەوە خۆشی لە بەرپرسیارێتی دەدزێتەوە بۆ درێژەدان بە کارەکانی لە تەواوی ئەورووپا و لە ئاستی جیهانیشدا، کە ئەوەش نیگەرانییەکی ڕەوای بۆ ئەمریکا دروست کردبوو. باڵیۆزەکەمان بۆ ئۆکرانیا، ماری یۆڤانۆڤیچ و چەند کارمەندێکی باڵیۆزخانە بەشداری کۆبوونەوەکە بوون و تاڕادەیەک بە تەواویی لە تێکڕای ڕۆژەکە لەگەڵم بوون.

لە دوای ژەمی بەیانی، چووینە سەر سەکۆ بۆ تەماشاکردنی نمایشێک لە شەقامی خریشچاتیک کە خۆپیشاندانەکانی یورەمەیدانی تێدا ڕوویدا و ئەو کات فشاریان خستە سەر ڕژێمەکەی یانوکۆڤیچی لایەنگری ڕووسیا و کۆتاییان پێ هێنا. لەگەڵ سەرۆک پێترۆ پۆرۆشینکۆ و هەشت یان دە ئەندامی حکوومەتەکەی و لە تەنیشت داواکاری گشتی یوری لوتسێنکۆ وەستام، بە لەبەرچاوگرتنی ڕووداوەکانی دواتر، ئەمە پێکەنیناوییە. هەرچەندە ئەمە یادی ڕۆژی جیهانیی کرێکارانی گۆڕەپانی سووری سەردەمی شەڕی ساردمان بە بیر دەهێنێتەوە، بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە نمایشەکە تەواو پێچەوانە بوو. وتارەکەی پۆرۆشینکۆ تەواو دژی ڕووسیا بوو، ئەو پاڵپشتییەش لە نێو خۆپیشاندەران لەو کاتە هات کاتێک بەڵێنی دا کڵێسەیەکی ئەرتۆدۆکسی ئۆکرانی سەربەخۆ لە دەرەوەی کڵێسەی مۆسکۆ دروست بکات.

لە کاتی نمایشەکە پۆرۆشینکۆ چەند جارێک سوپاسی منی کرد بۆ ئەو چەکانەی ئەمریکا پێی دابوون لە تەک سیستەمی چەک و کەلوپەلی سەربازی، کە لەو کاتە بە شەقامەکەدا تێدەپەڕین و نمایش دەکران، ئەمە

سەرەڕای یەکەی زێرەڤانی نیشتیمانی تێنێسی، کە لەگەڵ هێزەکانی ناتۆ گوێزرابوونەوە ئۆکرانیا بۆ ئەنجامدانی ڕاهێنان بە سەربازانی ئەو وڵاتە. دواتر ڕوومان کردە کۆشکی مارینسکی، کە کاتی خۆی بۆ کاترینی مەزن دروستکرابوو و لە لایەن خێزانەکەی پۆرۆشینکۆ نۆژەن کرابوویەوە و لە ماوەیەکی کەمدا ئامادە دەبوو بۆ میوانداریە مەزنەکانی پۆرۆشینکۆ. نیوەڕۆ لەوێ چاوم بە پۆرپشینکۆ و وەزیری دەرەوە پاڤلۆ کلیمکینی و ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی کۆستیا یێلیسێییڤ و ئەوانی تر کەوت. تاوتوێی ئاسایشی ئۆکرانیامان کرد، نەک تەنیا لە ڕووی سەربازییەوە، بەڵکو باسی هەوڵەکانی مۆسکۆشمان کرد بۆ بەلاڕێدابردنی هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٩ی ئۆکرانیا. پۆرۆشینکۆ دەیویست چەکی ئەمریکی زیاتر بکڕێت، ئێمەش نیگەرانیی خۆمانمان پێی ڕاگەیاند دەربارەی ئەو کۆمپانیایانەی نەخشەکاری بزوویتەری فڕۆکە پێشکەوتووەکان بە چین دەفرۆشن، ئەو نیگەرانیانەی کە ساڵێک بەر لە سەردانەکەم بۆ کێیڤ زەق ببوونەوە.

دوای کۆبوونەوەکە، لەگەڵ پۆرۆشینکۆ چوومە ژوورێکی تر بۆ کۆبوونەوەیەکی دووقۆڵی، کە تێیدا داوای کرد وەک ئەمریکا پاڵپشتی بانگەشەی خۆهەڵبژاردنەوەکەی بکەین. تەنانەت ئەو ئاماژەی بە ژمارەیەک شت کرد کە بەناوی خۆیەوە ناوم هێنا و ئەویش وەستا و ڕێگەی پێدام؛ قسەم کرد و توانیم بابەتی پاڵپشتییەکە بگۆڕم، لەو کاتەش بەڕاشکاوی و بەبێ بێزرێزیکردن گوتم: "نەخێر". ئەوەی پۆرۆپشینکۆ بەڕاستی دەیویست ئەوەبوو ئەمریکا سزای قورس بخاتە سەر سەرمایەدار ئیگۆر کۆلۆمۆیسکی، یەکێک لە کاربەدەستەکانی ئۆکرانیا کە پاڵپشتی لە یولیا تیمۆشێنکۆ دەکرد، کە ئەو بە تایبەت لەو کاتە کێبڕکێکاری سەرەکی پرۆشینکۆ بوو لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٩. هەرچەندە لە گفتوگۆیەکەماندا ئەوە ئاماژەی پێ نەدرا، بەڵام کۆلۆمۆیسکی پاڵپشتی لە ڤۆلۆدیمیر زێلێنسکی-ش دەکرد، کە ئەو کات هەرچەندە لە ڕاپرسییەکاندا

پێشکەوتبوو، بەڵام وەک ڕکابەرێکی ڕژد تەماشا نەدەکرا، چونکە وا لێکدەدرایەوە کە دواجار ئەو تەنیا ئەکتەرێکە.. (بۆ سەرکردە لیبراڵەکان ئەمە تەنیا نوکتەیەکە، چونکە ڕۆناڵد ڕەیگان یەکێک لە سەرۆکە هەر بەناوبانگەکانی ئەمریکا بە هەمان شێوە ئەکتەر بوو). بە پۆرۆشینکۆم گوت ئەگەر بەڵگەی لەسەر کۆلۆمۆیسکی هەیە، پێویستە بینێرێت بۆ وەزارەتی داد.

دوایین کۆبوونەوە لە کاتژمێر ٢,٤٥ خولەکی ئێوارە بوو لە نووسینگەی یۆڤانۆڤیچ، کە لەگەڵ کۆمەڵێک سەرکردەی پەرلەمان قاوەمان خواردەوە، لە نێوانیاندا تیمۆشێنکۆ، کە لە ئیدارەی بوش (٤٣) و دواتر بینی بووم. وەزارەتی دەرەوە نەیدەویست بە تەنیا چاوم بە تیمۆشینکۆ بکەوێت، چونکە پێیان وابوو کە ئەو زۆر لە ڕووسیا نزیک بوو، هەرچەندە ئەوە نەریتێکی وەزارەتی دەرەوە بوو، بەڵام ڕوونکردنەوەشیان نەدەدا بۆچی. ئەو کۆبوونەوە هاوبەشە نزیکترین کۆبوونەوە بوو بۆ گەیشتن بە کۆبوونەوەیەکی تایبەت، نەک لەبەر ئەوەی کە ئەوەندە گرنگ بوویێت، چونکە تیمۆشێنکۆ وەک تاکە پاڵێوراوی سەرۆکایەتی لە نێوان سەرکردە پەرلەمانییەکان گفتوگۆکەی کۆنترۆڵ کردبوو، کە پێشبینینەکراویش نەبوو. ئەو وەبیری هێنامەوە پەرتووکەکەمی "خۆبەدەستەوەدان بژاردەیەک نییە" خوێندووەتەوە و بە دڵی بووە، ئەمە بەردەوام هونەرێکی باشە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی نووسەر، ئاماژەشی بۆ ڕێنماییەکی سیناتۆر کایل کرد کە بەوپەڕی ئامادەییەوە وەک کەشتییەکی جەنگی بۆ پێشەوە بڕۆین و مووشەك بهاوێژین. لەو کاتەدا تەنیا زێلێنسکی لە ڕاپرسیەکاندا لە پێشەوە بوو، تەواوی پاڵێوراوەکانی تر، ڕکابەرییان لەسەر یەکەم و دووەم بوو لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکان بۆ ئەوەی بگەنە قۆناغی کۆتایی. لە دوای ئەو کۆبوونەوەیە ڕوومان کردە فرۆکەخانە و گەڕاینەوە ئەندروز.

تا دوای سێ مانگ هیچ جۆرە بەشدارییەکم لە پرسەکانی ئۆکرانیا نەبوو،

ئەمە بەردەوام بوو تا ئێوارەی یەکشەممە، ٢٥ تشرینی دووەم، کاتێك لەبارەی پرسی ڕووداوێکی دەریایی لە نیوان ڕووسیا و ئۆکرانیام بیست. لەو کاتەدا کەشتییە جەنگییەکانی ئۆکرانیا و بەلەمێک هەوڵیان دابوو بچنە ئاوەکانی دەریای ئازۆڤ لە گەرووی کێرچ، ئەو تەنکاوەی نیمچە دوورگەی کرایمیای لە ڕووسیا جیادەکردەوە، ئەو شوێنەی ڕووسیا لەم دواییە پردێکی لەسەر دروست کردبوو. زانیارییە سەرەتاییەکانمان ئەوە بوون کە کەشتییەکی جەنگیی ڕووسی هێرشی کردبووە سەر کەشتییە ئۆکرانییەکە، بەڵام زانیارییەکانی دواتر ئەوەیان دەردەخست کە ڕەنگە ئەو تەقەیەی کرابێت بۆ هۆشدایی و ئاگادارکردنەوە بووبێت، کە یەک دوو فیشەکیان بەر کەشتییە ئۆکرانییەکە کەوتبوون. هیچ کام لەمە ناشێت ڕووداوێکی ئاسایی بووبن. ڕووسەکان دواتر دەستیان بەسەر هەر سێ کەشتییە ئۆکرانییەکان و تاقمەکانیاندا گرتبوو (زانیاریش لەسەر بریندابوونی هەندێکیان هەبوو)، هەرچەندە ڕوون نەبوو ئاوە سنوورییەکان هی کامیان بوون کە کەشتییەکانی تیدا دەستبەسەرداگیراون. زۆربەی زانیارییەکان لە ڕێگەی باڵیۆزخانەکەمانەوە لە کییڤ بەدەستمان دەگەیشتن، واتە ئێمە چیرۆکەکەمان لە ڕوانگەی ئۆکرانییەکانەوە دەبیست، بە لایەنی کەم لە دەستپێکەوە بەم شێوەیە بوو.

لەبەر ئەوەی پێشبینی تەشەنەکردنی گرژییەکان دەکرا، بڕیارم دا پەیوەندی بە سەرۆک ترەمپەوە بکەم. دەمویست دڵنیا بێت کە ئێمە چاودێری بارودۆخەکە دەکەین، لە بارێکدا ئەگەر ڕۆژنامەنووسان پرسیاریان لەبارەوە کرد. یەکەمین کاردانەوەی ئەوەبوو: "ئەوروپییەکان چی لەبارەی ئەمەوە ئەنجام دەدەن؟" وەلامەکەش بۆ ئەو پرسیارە بە دڵنیاییەوە "هیچ" بوو، هەمان ئەو شتەی ئێمە ئەنجامنمان نەدەدا. (یەکێتیی ئەورووپا دواتر لێدوانێکیان لەسەر پرسەکە بڵاوکردەوە، بەڵام ئەوە هەر بڵاوکراوە نەریتییەکە بوو).

یەکەم بۆچوونی ترەمپ ئەوە بوو کە دەشێت ئۆکرانییەکان هەراسانکار بووبن، کە ئەمەش دەکرا بەلایەنی کەم وابێت، ئەویش بەهۆی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی. بەڵام ئەوەش دەکرا کە ڕووسەکان بەدوای ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا بگەڕێن، لەوانەیە وەک ڕێگەیەک بۆ ڕەوایدان بە لەخۆگرتنی کرایمیا، کە ژمارەیەک وڵاتی زۆر کەم دانیان پێدا دەنا. ترەمپ خواستی لەسەر ئەنجامدانی هیچ شتێکی خیرا نەبوو، تەنانەت ئەگەر ڕووسیا بەتەواویش هەڵەبووایە. لە ئێوارەکەی، پۆرۆشینکۆ وا بەدەر دەکەوت کە ئامادەیی ڕاگەیاندنی باری سەربازیی بێت، کە وەک کاردانەوەیەکی سەیر تەماشا دەکرا بۆ ڕووداوێکی هاوشێوە لە دەریا ڕوو بدات. وەزارەتی دەرەوە دەیویست بەیاننامەیەکی توند لە دژی ڕووسیا دەربکات، بەڵام من ڕێگریم لێ کرد، چونکە ترەمپ چەند کاتژمێرێک پێشووتر ئەوەی گوتبوو. لەوەش زیاتر، دووشەممە هەموو شتێک لەبار بوو بۆ ئەوەی ئەنجوومەنی ئاسایش کۆببێتەوە، سەیر بوو کە کۆبوونەوەکە لە لایەن ڕووسیا داواکرابوو، لەو چوارچێوەیەش وتاری ئەمریکاش دەبوو ئەمەش کاتی زیاتری پێدەبەخشین بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان.

یان هێکەر-ی ئەڵمانی (ڕاوێژکاری کاروباری دەرەوەی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا، ئەنگێلا میرکڵ) لە کاتژمێر ٧,٣٠ پەیوەندی پێوە کردم و یەکەمین کێشەش کە وروژاندی ڕووداوی گەرووی کرێچ بوو. ئەڵمانەکان وریا بوون، بە تێگەیشتنی خۆشم هێکەر باوەڕی وابوو کە پۆرۆشینکۆ ڕووداوەکەی زۆر پێ ناخۆش نەبوو، ئەویش بەهۆی ئەو سوودە سیاسییانەی پێشبینی کردبوو، چونکە ئەو وەک پاڵێوراوێکی دژە-ڕووسیا بانگەشە دەکرد، هێکەر وای بۆ دەچوو، تێبینی ئەوەشی دا کە لە ماوەی دوو کاتژمێر و نیو پەڕلەمانی ئۆکرانیا (ڕادا) لەسەر پرۆژە بڕیارێکی پۆرۆشینکۆ کۆدەبنەوە، کە سەپاندنی باری سەربازی بوو بۆ ماوەی ٦٠ ڕۆژ. ئەو پرۆژە بڕیارە سەد هەزار سەربازی یەدەگی بانگهێشتی خزمەت و

ڕێگری لە بانگەشە و بزاوتی سیاسی لە ماوەی کارایی یاساکە دەکرد. لەبەر ئەوەشی یاسایەکی تری ئۆکرانی هەبوو کە دەبووایە بەپێی یاساکە بانگەشەکان لە چوارچێوەکەیدا ٩٠ ڕۆژ بەر لە هەڵبژاردنەکان ئەنجام بدرێن، ئەوەش ڕاستەوخۆ دەیکردە بەر لە ڕێککەوتی هەڵبژاردنی گشتی. بە پرۆژە بڕیارەکەی پۆرۆشینکۆ دڵنیایی دەبوو کە هەڵبژاردنەکە دوا بخرێت، ئەمەش شتێک بوو کە بێگومان لە بەرژەوەندیی خۆیدا بوو لە کاتێکدا کە ژمارەی ڕاپرسییەکان لاوازیی ئەویان دەردەخست. ئەڵمانیا دواخستنی هەڵبژاردنەکانی ڕەت کردەوە، هێکەر گوتی: تا ئێستا ئۆکرانیا و ڕووسیا تەنیا ئاماژەی کێبڕکێکارییان دەرخستووە و لە ڕوانگەی خۆیان چیرۆکی ڕووداوەکە دەگێڕنەوە و ڕاستییەکانیش ناڕوونن. پلان هەبوو کە مێرکڵ زوو پەیوەندی بە پۆرۆشینکۆوە بکات، لە ڕاستیشدا لەو کاتەی ئێمە قسەمان دەکرد، هێکەر بۆ نووسینگەی مێرکڵ بانگێشت کرا بۆ گوێگرتن لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە و پێی گوتم دوای پەیوەندییەکەی نێوان مێرکڵ و پۆرۆشینکۆ پەیوەندیم پێوە دەکاتەوە.

لەو کاتەدا پۆمپەیۆ پێی گوتم کە کەمێک پێشوتر قسەی لەگەڵ ترەمپ کردووە دەربارەی گەواهیدانی چەند ڕۆژی داهاتووی خۆی و ماتیس لە کۆنگرێس، لەسەر پرۆژە بڕیاری ڕێگریکردن لە هاوکاریی چەک بۆ سعودیە لە شەڕی یەمەن. لەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەدا، ترەمپ کێشەی گەرووی کرێچی ووروژاندبوو و گوتبووی دەکرێت پۆرۆشینکۆ شتێکی هەراسانکاری بە ئامانجی سیاسی ئەنجام دابێت. ترەمپ گوتی: "بهێڵە ئەورووپییەکان ئەو کێشەیە بگرنە ئەستۆ... نامەوێت بیکەمە کێشەی خۆم." پۆمپەیۆ داوای لە ترەمپ نەکرد بەیاننامەیەکی کۆشکی سپی بۆ ڕۆژی یەکشەممە دەربکات، بەڵام پێی گوتبوو کە کارمەندەکانی دەیانەوێت دەقەکەی نیککی هالێی لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەوڵەمەندتر بکەن، کە تێیدا لەسەر ڕووداوەکە بە دژبەری مۆسکۆ دەردەکەوت. (بەهۆی ئەو ماوە

کەمەی لەبەردەمی ماوەتەوە لە کارەکەی لە نیویۆرک، هەوڵی دەدا سوود لەو پرسە وەربگرێت بۆ چەند خولەکێکی زیاتری بەردەم زوومی کامێرەکان).

پۆمپەیۆ بە ترەمپی گوت کە من و ئەو دڵنیا دەبین هێیلی پابەندی ڕێنماییەکان بێت. پێشنیارم کرد کە لەبری فرەبۆچوونی، وەک نیشاندانی بۆچوونی ئەمریکا مامەڵە لەگەڵ قسەکانی نیککی هاڵێیدا بکەین. پۆمپەیۆ ڕەزامەندی نیشاندا. پۆمپەیۆ ڕایگەیاند کە پەیوەندی بە هێیلی دەکات و پێی دەڵێت پابەندی چوارچێوە ڕێگەپێدراوەکان بێت، کە ئەوەش ڕاست دەردەکەوت. دواتر پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد و پێم گوت کە من و پۆمپەیۆ لەسەر وتارەکەی هێیلی بڕیارمان داوە، کە بەدڵی بوو، بە کورتیش لەسەر کاردانەوە و هەڵوێستی ئەڵمانیام لەسەر پرۆژە یاسای سەربازیی ئۆکرانیا پێگوت.

لەو کاتەی چاوەڕاوانی هێکەر بووم کە پەیوەندیم پیوە بکاتەوە، هەوڵم دا پەیوەندی بە سێدوێل لە لەندەن و ئێتیان لە پاریسەوە بکەم تا بزانم چۆن هەڵسەنگاندن بۆ بارودۆخەکە دەکەن. ئێتیان لە پاریس نەبوو، بەڵام سێدوێڵ تارادەیەك بەخێرایی پەیوەندی پێوە کردمەوە، لەسەر ئەو زانیاریانەی لەبەردەستیشمان بوون تێبینییەکانمان بەراورد کرد. سێدوێڵ ئەوەی بیستبوو کە کەنەدا، کە تا ئەو کاتیش سەرۆکایەتی وڵاتانی کۆمەڵەی حەوت (جی حەوت)[1]ی دەکرد، سەرقاڵی ئامادەکردنی دەقێکە، ئێمەش تا ئەو کات نەمانبینیبوو. بە سێدوێڵم گوت، کە ترەمپ لە ماوەی ٢٤ کاتژمێری ڕابردوو جەختی کردووەتەوە لەسەر ئەوەی بەریتانیا

---

(١) وڵاتـانی کـۆمەڵەی حەوت (G7): ڕێکخراوێکـی حکـوومەتی و نێـودەوڵەتیی ئابوورییە، لە حەوت وڵات پێک دێت کە بریتین لە: کەنەدا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیـا، ژاپـۆن، ئەمریکـا و بەریتانیـا. ئەوان لە سـندووقی نەختینەیـی نێوەدەوڵەتیـدا خـاوەن پێشکەوتووترین و بەهێزترین ئابوورین.

زیاتر بێتە ناو بابەتەکە.

لە کاتژمێر ۱۱:۰۵ خولەک، پۆمپەیۆ پەیوەندی پێوە کردم و زۆر تووڕە دیار بوو. گوتی کە پەیوەندی بە هێلییەوە کردووە و هەردووکیان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە هاوڕا بن. بەڵام دواتر زانیویەتی کە هێلی بۆ دەربڕینی ناڕەزایی پەیوەندی بە ترەمپەوە کردووە. هێلی تەواو جیاواز لەو خاڵانە قسەی کردووە کە ترەمپ پێشووتر پەسەندی کردبوون. پۆمپەیۆ دەیویست کۆنگرەیەکی ڤیدیۆیی لەگەڵ هێلی بە بەشداری من ساز بکات، تا دڵنیا بین هەمووومان هاوڕاین، بەڵام بەر لەوەی پەیوەندییەکە ئامادە بێت، ترەمپ پەیوەندی بە پۆمپەیۆ کرد تا پێی بڵێت خاڵەکانی وتارەکەی هێلی باش بوون و نەیدەویست لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکان دووچاری هێرش و ڕەخنە ببێتەوە و زۆر نەرم دەربکەوێت. من و پۆمپەیۆ بە تەواوی قایل بووین کە لێدوانی توندتر بۆ ترەمپ ئامادە بکەین، بەڵام هەردووکمان دەمانزانی کە هێلی سوور بوو لەسەر خواستی خۆی تا لە کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی دووچاری ڕەخنە نەبێتەوە. ماوەیەکی کەم دوای ئەوە و لە ژووری هێلکەیی کۆشک و پەیوەست بە تاوتوێکردنی زانیاریی هەواڵگری، ترەمپ پێی گوتم: "دەزانیت کە دەقەکەی (هێلی) کەمێک بەهێزتر بوو لەوەی من گوتم، بەڵام ئەوە ئاساییە. هەرچۆنێک بێت تۆش دەقێکی توندترت دەویست، وانییە؟" من پێم گوت کە هیچ کێشەیەکم لەگەڵ دەقەکە نییە، ئەوەشی زیاد کرد، کە داوامان لە ڕووسیا کردووە کەشتی و تاقمەکانیان ئازاد بکات، ترەمپ قسەی پی بڕیم: "داوای ئازادکردنی تاقمەکان مەکەن. ئەگەر ئازادیان نەکەن وەک ڕووداوی زیندانییەکانی ژێردەستی ئێران بەدەر دەکەون. من ئەوەم ناوێت." پێم گوت بە هێلی دەڵێم، بەڵام لەو کاتەی لە ژوورە هێلکەییەکە چوومە دەرەوە ئەو لێدوانی لەو بارەیەوە دابوو.

زۆر وڵاتی تر هەمان شتیان گوت، بۆیە من پێم وانەبوو کە ئێمە بە

شێوەیەک بەدەر دەکەوین کە ترەمپ بە دڵی نەبێت. لە هەر بارێک، ڕووداوەکە وای کرد ترەمپ یەکێک لە خۆشترین چیرۆکەکانی خۆی بگێڕێتەوە کە یەکەمین پەیوەندیی تەلەفۆنیی خۆی بووە لەگەڵ ئەنگێلا مێرکڵ، کاتێک مێرکڵ لێی پرسیووە بەنیازە چی لەبارەی ئۆکرانیاوە ئەنجام بدات؟ ئەویش وەڵامی دابوویەوە و لێی پرسیبوو کە ئەی ئەو بەنیازە چی لەبارەی ئۆکرانیاوە ئەنجام بدات؟! جارێکی تر بۆمان ڕوون بووەوە، کە هێیلی چۆن وەک گەردیلەیەکی سەربەخۆ و بە تەنیا لەو کاتەش مامەڵەی کردووە کە ڕێکس تیلەرسۆن وەزیری دەرەوە بووە. ئەمە لە ماوەی مانگێک دوای ڕۆیشتنی ئەو کۆتایی دێت، من و پۆمپەیۆش هەمان تێگەیشتنمان بۆ بابەتەکە هەبوو کە شوێنگرەوەکەی هێیلی نابێت بە هەمان شێواز مامەڵە بکات، پۆمپەیۆش دواتر لە گفتوگۆیەکدا هێیلی بە "سووک وەک پەڕی پەلەوەر" وەسف کردبوو.

هێکەر لە کاتژمێر ١:٣٠ بە نیازی تەواوکردنی گفتوگۆکەمان پەیوەندی پێوە کردم و پێی گوتم کە لە کۆبوونەوەیەک کە تازە کۆتایی هاتووە و نوێنەرانی ئۆکرانیا، ڕووسیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا بەشدار بوون، ڕووسیا ڕایگەیاندووە کەشتییە ئۆکرانییەکان تێبینیان نەداوە کە بەوێدا تێدەپەڕن کە ناوچەیەکی دابڕاوە (ڕێگەپێدراو لە چوارچێوەی یاسا نێودەوڵەتییەکان بۆ ئامانجی وەک ڕاهێنانی سەربازیی)، ئەم پاساوە پێکەنیناوی دەردەکەوت. لە پەیوەندییەکەی مێرکڵیش بە پۆرۆشینکۆ، پۆرۆشینکۆ گوتبووی کە ماوەی پرۆژە یاساکە لە پەرلەمان کاری لەسەر دەکرێت لە ماوەی ٦٠ بۆ ٣٠ ڕۆژ کەم دەکرێتەوە، ئەوەش ڕێگە بە هەڵبژاردنەکانی مانگی ئازار دەدات لە کاتی دیاریکراودا وەک خۆی تێبپەڕێت. ئەمە پێشکەوتنێک بوو لە پرسەکە، چونکە هەرچەندە باری سەربازی لە ڕووی سیاسییەوە بە ئەرێنی بۆی دەشکایەوە بەڵام پێشبینیش دەکرا کە ماوەکە دوای ئەو ٣٠ ڕۆژە درێژ بکرێتەوە (کە ئەوە ڕووی نەدا). مێرکڵ کاتژمێرێک

پێشووتریش قسەی لەگەڵ پوتین کردبوو بە ئامانجی ئەوەی داوای لێ بکات هەردوو لا بارودۆخەکە هێور بکەنەوە، بە وردییش داوای لە پوتین کردبوو کە قسە لەگەڵ پۆرۆشینکۆ بکات.

لە بەیانیی ۲۸ی تشرینی دووەم، بە گەشتێکی ئاسمانی لە ئەندروزەوە بەرەو ڕۆدیۆ جانێرۆ چووم، بەمەبەستی بینینی سەرۆکی تازە هەڵبژێردراوی بەڕازیل جایر بۆلسۆناریۆ و پیرۆزبایی دەستبەکاربوونی، بەر لە بەشداریکردن لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی ۲۰ لە بۆینس ئایریس. لە فڕۆکەوە کاتژمیر ٨:٤٥ خولەکی بەیانی پەیوەندیم بە ترەمپەوە کرد، تا بپرسم ئەگەر هیچ بۆچوونێکی تری لەسەر کۆبوونەوەی پێشبینیکراوی لەگەڵ پوتین هەبێت لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی ۲۰، چونکە ڕووسیا بەردەوام بوو لە دەستبەسەرداگرتن و هشتنەوەی کەشتییە ئۆکرانییەکان و تاقمەکانیان. ترەمپ گوتی کە خراپ دەبێت لە چاوچێوەی ئەو بارودۆخە لەگەڵ پوتین کۆببێتەوە و ڕاگەیاندنەکانیش تەنیا لەسەر کێشەی ئۆکرانیا پرسیار دەکەن. پێی گوتم کە پەیوەندی بە پوتینەوە بکەم و داوای لێ بکەم کە بە تامەزرۆییەوە لە کۆبوونەوەکە دەڕوانێت و پێویستیشە ڕووسیا دەریاوان و کەشتییەکان لە دەستپێکدا ئازاد بکات، تا کۆبوونەوەکە زیاتر تیشک بخاتە سەر بابەتە سەرەکییەکان و لەسەر ئۆکرانیا نەبێت. لە ماوەی دوو کاتژمێردا پەیوەندیم بە پاتروشێڤ لە مۆسکۆ-وە کرد بۆ پێگەیاندنی پەیامەکەی ترەمپ، ئەویش گوتی کە پەیامەکە ڕاستەوخۆ بە سەرۆک پوتین دەگەیەنێت، کە ئەو پێی وابوو بە دڵنیاییەوە بابەتەکە لەبەرچاو دەگرێت.

هەرچەندە ئەو دەیزانی من ئاگاداری هەڵوێستی ڕووسیم لەسەر ئەو بابەتە، بۆیە دواتر کەمێک بە درێژی ئەوەی بۆ باس کردم. کاتژمێر ۱۱:۰۰ شەو لە بەڕازیل نیشتمەوە. ترەمپ پەیوەندی پێوە کردمەوە و گوتی کۆبوونەوە دوولایەنەکە ئەنجام دەدات ئەگەر پوتین ڕایبگەیێنێت، هەر کاتێک

کارەکەی ئەنجام دا و کەشتی و تاقمەکانیان ئازاد بکرێن، کە ئەمەش سوودی بۆ ترەمپ دەبوو. بەهۆی جیاوازیی کاتەکان، پەیوەندیم بە مۆسکۆوە نەکرد. بێجگە لەوەش گۆڕینی هەڵوێستی خۆمان لەو کاتەدا وای دەردەخست ترەمپ زۆر ناچارە و پێویستی بە کۆبوونەوەیە، کە هەرچەندە ئەوەش ڕاست بوو. بەیانیی داهاتوو لەگەڵ جێگری نێردەکەمان بۆ مۆسکۆ، ئەنتۆنی گۆدفرێی، قسەم کرد (هەنتسمان بەردەست نەبوو)، کە ئاماژەی بەوە کرد ڕووسەکان تاقمی کەشتییە ئۆکرانییەکە بە دزەکردن تۆمەتبار دەکەن، ئەمەش بە لایەنی کەم ئاماژەیەکی باش نەبوو. لەو کاتەی لە نێو فڕۆکە بووین بەرەو بۆینس ئایریس، پاترۆشێڤ پەیوەندی پێوە کردم گوتی پەیامێکی لە پوتینەوە بۆ ترەمپ پێیە، بە تایبەت چونکە پێی وابوو "دزەکردنی نایاسایی بووە بۆ سنوورەکانیان" و دۆسیەیەکی تاوانکارییە و پیویستی بە ڕێکاری لێکۆڵینەوە هەیە کە دەستیشیان پێ کردووە. ڕووسەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بەپێی ئەو بەڵگەنامە و زانیارییانەی لە تاقمی کەشتییەکان دەستیان کەوتووە، ئەو دزەکردنە هەراسانکردنێکی سەربازی بووە؛ هەڵمەتێک لە لایەن هەواڵگریی ئۆکرانیاوە سەرپەرشتی و ئاراستە کراوە. بۆیە، لەتەک لێکۆڵینەوە و ڕێکارەکانی ڕووسیا کە دەستیان پێ کردبوو، پاترۆشێڤ گوتی کە ئازادکردنی کەشتی و تاقمەکانیان ئەستەمە. گوتی کە ئەو لەو باوەڕەیە ئێمەش لە بارودۆخێکی لەم جۆرەدا هەمان شتمان ئەنجام دەدا تیشکیشی خستە سەر سیاسەتەکانی ترەمپ لە سەر سنوورەکانی مەکسیك. دواتر گفتوگۆی وانەیی لەسەر ئەو بابەتە و بابەتی تر بەدوادا هات.

بوار بۆ بەهەڵەتێگەیشتن لە پەیامەکەی پاترۆشێڤ نەبوو، بەڵام پرسیم ئایا ڕێکارەکان لە دژی تاقمە ئۆکرانییەکان چەند درێژە دەکێشێت؟ ئەو گوتی کە ناتوانێت وەڵامێکم پێ بدات، بەڵام لەبارەی ئەوە دەپرسێت و پێم دەڵێت. منیش گوتم کە لەگەڵ ترەمپ قسە دەکەم تا ببینم و بزانم هێشتا

گفتوگۆ دوولایەنەکە ئەنجام دەدرێت یان نا؟! وەک دیار بوو، ترەمپ وەک هەر جار لە دواوە بوو، بۆیە لەسەر فڕۆکەی سەرۆکایەتیی ژمارە یەک تا کاتژمێر ١١:٢٠ خولەک بە کاتی واشنتۆن پەیوەندیم پێوە نەکرد. ئەوەشی لەلایەن پاتروشێڤ پێم گوترا، کە لە پوتینەوە بوو، بە "نەخێرێکی ڕەق" لە قەڵەمم دا. ترەمپ پرسی: "بە نیازی چی بکەیت؟" منیش گوتم کۆبوونەوەکە هەڵدەوەشێنمەوە. ترەمپ ڕاستەوخۆ ڕەزامەندی دەربڕی و گوتی: "ناکرێت هیچ شتێک لەخۆڕایی لەدەست بدەین." لە ژێر ئەو کاریگەرییە بە ماوەیەکی کەم تویتێک بڵاو کرایەوە، ئەمە بەر لە پەیوەندیکردنەکەم بوو بە پاتروشێڤ، کە پەیوەندییەکەی ڕەت کردمەوە، بۆ ئەوەی نیشانی بدات ئەو کارە چەندە تووڕەی کردوون.

لە بۆینس ئایریس من و یوری ئوشاکۆڤ ڕاوێژکاری دیپلۆماسی پوتین چەند جارێک چاومان بە یەکتری کەوت تا ببینین و بزانین هیچ ڕێگەیەک بۆ کۆبوونەوەی ترەمپ-پوتین هەیە، کە هەردووکمان بە لەبەرچاوگرتنی ڕوانگەی هەردوولا و هەڵوێستی گشتی لەسەر ڕووداوەکەی گەرووی کرێچ گەیشتینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەوە ناکرێت.

لەبری ئەمە، لە کاتی ژەمی ئێوارەی سەرکردەکانی وڵاتانی کۆمەڵەی ٢٠، کە هیچ ئەمریکییەک بێجگە لە خانمی یەکەم ئامادەی نەبوو، ترەمپ قسەی لەگەڵ پوتین کردبوو. ئەوان سوودیان لە وەرگێڕەکەی پوتین وەرگرتبوو، کەسە ئەمریکییەکەش نەیتوانیبوو گوێبیستی هیچ لە قسەکان بێت. ڕووسەکان هیچیان لەبارەی کۆبووەنەوەکە لە ڕاگەیاندنەکانیان باس نەکرد، بەیانییەکەی دواتریش ترەمپ پێی گوتم کە بە شێوەیەکی بنچینەیی بە پوتینی ڕاگەیاندووە پێشبینی کۆبوونەوەیەکی درێژ لە نێوان هەردوولا نەکات تا کێشەی گەرووی کرێچ چارەسەر نەبێت و کەشتییەکان و تاقمەکانیان نەگەڕێنەوە ئۆکرانیا، کە ئەوەش پێنەدەچوو تا ماوەیەک ڕووبدات. دواتر لە کۆبوونەوەیەکی دوولایەنەی ترەمپ-مێرکڵ،

ترەمپ ئەوەی درکاندبوو کە سەرۆکێکی ئۆکرانیای نزیک لە ڕووسیا دەکرێت هاریکار بێت لە دوورخستنەوەی جەنگی سێیەمی جیهانی. ڕووسییەکان ئەوەیان بە دڵ دەبوو.

بە شێوەیەکی بنەڕەتی بێدەنگییەکەی ئۆکرانیا بەردەوام بوو تا گەڕی یەکەمی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی ٣١ ئازار کۆتایی هات، بەڵام کێشەگەلی تر هاتنە پێشەوە. بۆ ماوەیەک ترەمپ نیگەرانی لەبارەی باڵیۆزەکەمان (لە ئۆکرانیا) یۆڤانۆڤیچ دەربڕی، لە ٢١ی ئازار ترەمپ لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەسەر چەند بابەتێک پێی گوتم کە ئەو باڵیۆزە "وەک شێت قسەی خراپی بە دەمی ئێمە کردووە" و تاکە نیگەرانیی ئەو گرنگیدانە بە پرسی هاوڕەگەزخوازان. ئەوەشی زیاد کرد: "ئەو شتی دزێو و لەبارەی من و تۆوە دەیانڵێت". گوتیشی کە ئەو دەیەوێت ئەو باڵیۆزە هەر "ئیمڕۆ" لە کار لابدرێت. منیش گوتم کە پەیوەندی بە پۆمپەیۆوە دەکەم کە ئەو کات لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو؛ زۆر هەوڵم دا پەیوەندی پێوە بکەم، بەڵام بەهۆی خشتەی کاتی گەشتەکە و جیاوازیی کاتەکان ئەوەم بۆ ڕێکنەکەوت. دواتر و دوای نیوەڕۆ، دوای کۆبوونەوەی بەڕێوەبەرەکانی ئیدارەکە، جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا جۆن سولڤانم جیا کردەوە، تا هەڵوێستی ترەمپی پێ بڵێم بۆ ئەوەی بە پۆمپەیۆی ڕابگەیەنێت. سولڤان دەیزانی ترەمپ دەیەوێت یۆڤانۆڤیچ دەربکرێت، بۆیە لە دووپاتکردنەوەی ڕێنماییەکانی ترەمپەوە بۆی دەرکەوت کە ئەو لەسەر داوکارییەکە ڕژدە.

چەند ڕۆژێک دواتر لە ٢٥ی ئازار، ترەمپ بانگهێشتی ژووری هێلکەیی کردم، بەڵام من ئەوم لە ژوورە بچووکەکەی دانیشتنی خۆی بینی، لەگەڵ ڕوودی جولیانی و جێی سێکولۆو (یەکێکی تر لە پارێزەرە تایبەتەکانی) بە ڕوونی دیار بوو گفتوگۆکەیان چێژبەخش بوو، گفتوگۆکە لەسەر ڕیپۆرتەکەی میولەری تایبەت بە لێکۆڵینەوەکانی خۆی بوو لەسەر ڕووسیا.

لەو کۆبوونەوەیە بۆم دەرکەوت جولیانی سەرچاوەی ئەو چیرۆکانەیە کە لەسەر یۆڤانۆڤیچ بڵاوبوونەوە، ئەو پێی وابوو یۆڤانۆڤیچ لە لایەن "جۆرج کێنت"ەوە داکۆکی لێ دەکرێت، کە یاریدەدەری جێگری وەزیری دەرەوەیە بۆ نووسینگەی ئەورووپی (پێم وانییە جولیانی نازناوی بەرپرسیارێتییەکەی کێنت-ی بەڕاستی زانیبێ؛ پۆمپەیۆ دواتر دەربارەی ئەمە بۆی پشتڕاست کردمەوە). ترەمپ دووپاتی کردەوە کە دەبێت بە خێرایی یۆڤانۆڤیچ لە کار لابدرێت. لە دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ لە ڕێگەی تەلەفۆن پەیوەندیم بە پۆمپەیۆوە کرد بۆ پێدانی تازەترین هەواڵ لەسەر بابەتەکە، کە ئێستا زانیاریی نوێ لە جولیانییەوە سەرچاوەی گرتووە. پۆمپەیۆ ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە پێشووتر قسەی لەگەڵ جولیانی کردووە و هیچ ڕاستی و بەڵگەیەکی وای دەست نەکەوتووە پاڵپشتی لە تۆمەتەکانی جولیانی بکات، هەرچەندە پۆمپەیۆ وەک ٩٠٪ی کەسانی کاروباری دەرەوەی گومانی لەوە نەبوو یۆڤانۆڤیچ دەنگی بە هیلاری کلینتۆن دابێت. ئەو گوتی یۆڤانۆڤیچ هەوڵی کەمکردنەوەی گەندەڵی لە ئۆکرانیا دەدات و ڕەنگە لێکۆڵینەوە لە هەندێک لە بریکارەکانی ڕوودی جولیانی کردبێت.

پۆمپەیۆ گوتی کە دووبارە قسە لەگەڵ جولیانی دەکاتەوە و ئینجا قسە لەگەڵ ترەمپ دەکات. بەیانیی پاشتر، لەبارەی چەند بابەتێکەوە پەیوەندیم بە ترەمپ کرد و پرسیم ئەگەر لەگەڵ پۆمپەیۆ لەسەر یۆڤانۆڤیچ قسەیان کردبێت. دەرکەوت ئەوان قسەیان نەکردبوو، بەڵام دووپاتی کردەوە کە: "بەهۆی بە خراپ باسکردنی ئێمە، بێئۆقرەم". وەک لێپرسینەوەی کۆنگرێس و شتی وەها. ترەمپ گوتی: "زۆر خراپە". دەوروبەری ٩:٤٥ خولەکی بەیانی پەیوەندیم بە پۆمپەیۆوە کرد تا ئەو قسەکردنەی پێ ڕابگەیێنم. ئەویش دووپاتی کردەوە کە تۆمەتەکانی جولیانی ڕاست نین و گوتی پەیوەندی بە ترەمپەوە دەکات. من دواتر و لە هەمان ڕۆژ ئەوەم بە ترەمپ ڕاگەیاند، تەنیا بۆ ئەوەی بزانێت کە ئەو پشتگوێ نەخراوە لەسەر

بابەتەکە.

ئەگەر هەوڵەکانی جولیانی پەیوەندییان بە هەڵبژاردنە نزیکبووەوەکەی ئۆکرانیاوە هەبووبێت یاخود نا، لەگەڵ دەرەنجامی دەنگەکان لە گەڕی یەکەم لە ٣١ی ئازار و هەژماردنی دەنگەکان، زێلێنسکی بە یەکەم پۆریشینکۆش بە دووەم دەرچوون، ئەمەش ئەوانی خستە ڕووبەڕووبوونەوەی کۆتایی ٢١ی نیسان. بە ماوەیەکی کەمیش دواتر لەگەڵ هەر یەکە لە ئیتیانی هاوتا فەرەنسییەکە و هێکەری هاوتا ئەڵمانییەکەم قسەمان لەسەر چۆنییەتی کارکردنمان لەو کاتە بەدواوە کرد. هەرچەندە پێشووتر ئێمە کۆک بووین کە هیچ لەو بارەیەوە ئەنجام نەدەین، بەڵام هێکەر ڕایگەیاند کە ئەڵمانیا بە نیازە لە بەرلین میوانداریی پۆرۆشینکۆ بکات، سەرەڕای کاردانەوەکانی داهاتوو و ئەگەر زێلێنسکی لە کۆتاییدا بیباتەوە. ئیتیانیش پێی ڕاگەیاندم کە فەرەنساش بەر لە دوایین گەڕی هەڵبژاردنەکان میوانداری هەریەکە لە پۆرۆشینکۆ و زێلێنسکی لە پاریس دەکات، کە ئەمەیان بەلایەنی کەم یەکسانییەکی تێدا بوو. هیچ کاممان هیچمان لەبارەی تۆکمەیی و لێهاتوویی زێلێنسکی نەدەزانی بۆ سەرۆکایەتی ئۆکرانیا. نیگەرانییش هەبوو لەبارەی ئەوەی زێلێنسکی تا چەند لە سەرمایەدار کۆلۆمۆیسکی نزیک بوو، کە ڕەنگە کێشەی گەندەڵی بۆ داهاتوو دروست بکات. تۆمەتی هەراسانکار لێرە و لەوێ کەڵەکە دەبوون و لێکدانەوەکانیش ئاماژەی دوورکەوتنەوەیان پێ بەخشین. گۆڕانی خواستی ئەڵمان و فەرەنسییەکان و تامەزرۆییان بۆ نزیکبوونەوە لە پرسەکە، منی وەک کەسێکی بەهەڵەداچوو نیشاندا. ناکۆکییەک لەوەدا نەبوو کە زێلێنسکی لە ڕاپرسییەکان لە پێشەوە بوو، ئەوەش زیاتر پشتی بە دژایەتی ئەو بۆ کێشەی گەندەڵیی ئۆکرانیا دەبەست.

پاڵپشتی لە زێلێنسکی بەردەوام بوو و لە یەکشەممەی جەژنی ئیستەر، ٢١ ی نیسان، بە ٧٣٪ دەنگەکان شکستی بە پۆرۆشینکۆ هێنا. ئێمە زانیاریی

پێویستمان بۆ ترەمپ ئامادە کرد بوو ئەگەر بیخواستایە ئەو ڕۆژە پیرۆزبایی لە زێلێنسکی بکات، کە دواجار لە کاتژمێر ٤:٣٠ خولەک بە کاتی واشنتۆن پەیوەندییەکەی ئەنجام دا. من پێشوەختە بە ترەمپم گوتبوو کە ئەگەر هەیە زێلێنسکی میوانداریی ترەمپ بکات بۆ ڕۆژی سوێندخواردن و دەستپێکردنی سەرۆکایەتییەکەی (ئەو ڕۆژەی کە لەو کات دەستنیشان نەکرابوو)، ترەمپ گوتی کە پێنس لەبری خۆی دەنێرێت. پەیوەندییەکە ماوەیەکی کەمی خایاند، کەمتر لە پێنج خولەک، بەڵام پەیوەندییەکی زۆر گەرموگوڕ بوو، ترەمپ وەها دەستی بە قسە کردن کرد: "دەمەویت پیرۆزباییت لێ بکەم لەو کارەی کە سەرکەوتنت تێیدا بەدەست هێناوە". زێلێنسکی وەڵامی دایەوە: "زۆر زۆر سوپاس،" گوتیشی کە پیرۆزباییەکە بە هەند دەزانێت و زیاتریش گوتی: "تۆ نموونەیەکی مەزن بووی". ترەمپ گوتی زۆر هاوڕێی هەبووە کە زێلێنسکیان ناسیووە و خۆشیان ویستووە، ئاماژەی بەوەش کرد: "گومانم لەوە نییە تۆ سەرۆکێکی ناوازە دەبیت". زێلێنسکیش ترەمپی داوەت کرد بۆ مەراسیمی ڕۆژی دەستبەکاربوونی. ترەمپیش وەڵامی دایەوە کە ئەو: "تەماشای ڕێککەوتەکە دەکات" و گوتی: "نوێنەرایەتییەکی مەزنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لەو ڕۆژە مەزنە بۆ ئامادە دەکەین". هەروەها ترەمپ زێلێنسکیشی بۆ کۆشکی سپی داوەت کرد و گوتی: "ئێمە بە درێژایی ڕێگەکە لەگەڵت دەبین". زێلێنسکی هانی ترەمپی دەدا کە سەردانیان بکات و دەیگوت ئۆکرانیا وڵاتێکی مەزنە و خەڵکەکەی باشن، خوارنەکانیان بەچێژە و بەردەوام بوو. ترەمپیش ئەوەی گوت کە وەک کەسێک کە خاوەنی پرۆژەی شاجوانی جیهانی بووە دەیزانی کە ئۆکرانیا بەردەوام بە شێوەیەک بە باشی نوێنەرایەتی کراوە و دەرکەوتووە. زێلێنسکی کۆتایی پەیوەندییەکەی بە ڕستەیەکی ئینگلیزی هێنا: "ڕاهێنانێکی گەورەی ئینگلیزی ئەنجام دەدەم" (بۆ ئەوەی لەو کاتەی یەکتر دەبینین قسە بکەین). ترەمپ وەڵامی دایەوە: "سەرم سوڕما. من ناتوانم ئەوە بە زمانی تۆ بڵێم کە تۆ گوتت".

دوو ڕۆژ دواتر، لە ٣١ی نیسان، بانگهێشتی ژووری هێلکەیی کرام بۆ سازدانی پەیوەندیی تەلەفۆنی نێوان ترەمپ و مولڤانیی بۆ قسەکردن لەسەر یۆڤانۆڤیچ لەگەڵ جولیانی، کە هێشتاش فشاری لەکارلادانی یۆڤانۆڤیچی دەکرد. ئەویش هەواڵی ئەوەی بە ترەمپ دا کە یۆڤانۆڤیچ لەگەڵ سەرۆکی هەڵبژێردراو "زێلێنسکی" قسەی کردووە تا پێی بڵێت ترەمپ خۆی دەیەوێت چەند لێکۆڵینەوەیەکی دیاریکراو کە لەلایەن داواکارانی گشتیی ئۆکرانیاوە ئەنجام دەدرێن، بوەستێندرێت. بە خەیاڵی جولیانی، یۆڤانۆڤیچ هەوڵی پاراستنی هیلاری کلینتۆنی دەدا، کە بانگەشەکەی ئەوەندەی دەهێنا لە لایەن دادگەی تاوانی ئۆکرانیا لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت و جۆرە پەیوەندییەکیشی هەبوو لەگەڵ هەنتەری کوڕەکەی جۆو بایدن. ئەوەی لەبەردەست جولیانی بوو گومانی پلە سێ و چوار بوون و هیچ بەڵگەیەکیشی بۆ ئەو تۆمەتانە نەخستەڕوو. منیش گوتم کە لەسەر بابەتی یۆڤانۆڤیچ قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کردووە و بەدواداچوونیشی لەسەر دەکەمەوە. ترەمپ باوەڕی نەدەکرد کە تا ئەو کاتەش پۆمپەیۆ یۆڤانۆڤیچی لە کار لانەدابوو، لەکارلادانی یۆڤانۆڤیچ خواستی ترەمپ بوو بەبێ هیچ ئەگەر و بەڵامێک. ترەمپ گوتی دەبێت بەخێرایی لە پۆمپەیۆوە بزانم کە چی ڕوودەدات، پێویستیشە پەیوەندی بە زێلێنسکی بکەم و ڕوونی بکەمەوە کە یۆڤانۆڤیچ لەبری ئیدارەی ترەمپ قسە ناکات. بە دڵنیاییەوە ئێمە نەمانزانی کە یۆڤانۆڤیچ چی گوتبوو، بەرچاومان ڕوون نەبوو کە پێویستە چی بە زێلێنسکی بڵێم تا پشتگوێی بخات.

من گەڕامەوە نووسینگەکەم و توانیم لە کاتژمێر ٤ی ئێوارە پەیوەندی بە پۆمپەیۆ بکەم. ئەو گوتی کە لە کۆتایی تشرینی دووەم و لە دەستپێکی کانوونی یەکەم تا یەکی حوزەیران یۆڤانۆڤیچی لاواز کردووە. گوتیشی کە ماوەیەک پێشووتریش ئەوەی بە ترەمپ گوتووە و ئەویش دژبەر نەبووە. پۆمپەیۆ دەیویست بەو شێوەیە کۆتایی بە بابەتەکە بهێنێت. منیش

دۆخەکەم پێ گوت کە زۆر گرکانیی دەردەکەوێت، چونکە یۆڤانۆڤیچ بە تێکڕایی لانەدراوە، بە خۆپەرستی لێک دەدرایەوە. ئەو دووبارە قسەکانی ڕابردووی لەگەڵ جولیانی بەبیرهێنامەوە، کە نەیتوانیبوو بە پوختی باس ئەوە بکات ئاخۆ بە تەواوی چی ڕوویداوە، کە بەردەوام و بە درێژایی چەند مانگی ڕابردوو لەگەڵ ترەمپ وروژاندوویەتی. بەڵام پۆمپەیۆ ئەوەشی گوت، بە لەبەرچاوگرتنی باڵیۆزخانەکە، ئێستا وەزارەتی دەرەوە چەندین پێداویستی کەڵەکەبووی بەردەست بوو تا بۆ وەزارەتی دادی بنێرێت، کە ئەوەش ئەرکی یۆڤانۆڤیچ و شوێنگرەوەکەی لە بزاوت و چالاکییەک ئەستەم دەکرد و ڕەنگە تۆمەتەکان بە تاوان تەماشا بکرێن. پۆمپەیۆ کۆتایی بە قسەکانی هێنا و گوتی هەر هەمان شەو فەرمانی گەڕانەوەی بۆ واشنتۆن پێ دەدات. بە گەڕانەوەی یۆڤانۆڤیچیش هیچ پێویستی نەدەکرد پەیوەندی بە زێلێنسکی بکەین (کە هەر نەمدەویست ئەوە ڕووبدات)، بۆیە ئەو کارەشم ئەنجام نەدا.

دوایین گۆڕانکارییەکانی پەیوەست بە یۆڤانۆڤیچم بە ئێزنبێرگ گوت. کەمێک دواتر، مولڤانێی لەگەڵ هەریەکە لە سیپۆلۆن و ئێمێت فلەد، کە پارێزەری ئەنجوومەنی کۆشکی سپی بوو و لەسەر لێکۆڵینەوەکانی میولەر کاری دەکرد، هاتنە نووسینگەکەم. شتێکم لەگەڵ باس کردن کە پێشووتر وروژاندبووم لەگەڵ هەر یەکە لە سیپۆلۆن و ئێزنبێرگ؛ ئەویش ئەوە بوو کە ئایا جولیانی کێشەی ڕەوشتیی هەبووە لە ژێر چەتری بەرپرسیارێتیی پیشەیی بۆ بەکارهێنانی پەیوەندیی پارێزەر و بریکار لەپیناو پەرەدان بە بەرژەوەندیی بریکارێکی تر، ئەمە کارێک بوو کە من پێم وابوو لەبری ترەمپ کاری لەسەر دەکرد. باڕ (جارێکی تر) لە ناوەڕاستی شوبات بووەوە بە داواکاری گشتی، لەو کاتەشەوە بەدوای ڕێککەوتێکی گونجاودا دەگەڕاین بۆ باسکردنی ژیانکردن لە ئیدارەی ترەمپ. من دەمویست ڕژدیی خۆم نیشان بدەم بۆ گونجاندی باشتر لە ئەگەری ئەوەی

بەرژەوەندییەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و داواکەریەتی گشتیی بەریەک بکەون. ئێمە پێویستمان بە بڕیاری ژیرانە بوو لەسەر پێشینەی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە ڕووداوی هاوشێوە، نەبادا مامەڵەکردنەکە هاکەزایی بێت. بار بە قووڵی گرنگی بە کێشەی پەیوەست بە ئاسایشی نەتەوەیی دەدا و تەواو ئامادە بوو بۆ باشترکردنی پەیوەندی نێوان بەش و ئاژانسەکان کە دەکەونە ژێر کاریگەریی گۆڕانکارییەکان.

هەرچەندە بە تایبەتیش من دەمویست لەسەر مەیلی ترەمپ بۆ هاوکارییکردن و چاکەکردن لەگەڵ دیکتاتۆرەکان قسەی لەگەڵ بکەم، وەک لە دۆسیەی هاوشیوەی هالک بانک و زی تی ئی و کۆمپانیای هواویش، کێ دەیزانی؟! ڕەنگە دۆسیەی تریش هەبووبن. بار ڕایگەیاند ئەو زۆر نیگەرانە لەبارەی ئەو دەرکەوتنانەی ترەمپ؛ بە تایبەت لێدوانەکانی ترەمپ لەسەر هالك بانك لەگەڵ ئەردۆگان لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی ٢٠ لە بۆینس ئایریس، بێجگە لەسەر ئەوەشی کە بە شیی جینگ پینگی گوتبوو دەربارەی زی تی ئی و قسە و لێدوانەکانی تریش. منیش لە ٢٢ی کانوونی دووەم لەگەڵ سیپۆلۆن و ئێزنبێرگ قسەم لەسەر هەمان شت کردبوو، ئەوە بە ماوەیەکی کەم دوای شوێنگرتنەوەی سیپۆلۆن بوو بۆ مەکگان لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٨. لەو کاتە ئێمە قسەمان لەسەر هالك بانك، زی تی ئی و سیخوڕێکی تورکیا دەکرد کە ئیسرائیل دەستگیری کردبوو (ئەویش ترەمپ لەمیانەی مانەوەی لە تێرنبێری و پەیوەندیکردن بە ناتەنیاهۆ لە مانگی تەمموز، بیوە هۆکاری ئازادکردنی)؛ بێجگە لە پرسیاری ئەوەی ئایا پێویستە ئەمریکا سزاکانی سەر سەرمایەداری ڕووس ئۆلێگ دیریپاسکا هەڵبگرێت یاخود نا (کە لە دەستپێکی نیسان بڕیاریان لێوە درابوو)، یانیش سزاکانی سەر کۆمپانیای هواوی، بێجگە لە کاریگەرییەکانی ئەو بڕیارە لەسەر دانوستانەکانی ڕێککەوتنی بازرگانی لەگەڵ چین، لەتەک کارەکانی ترەمپ خۆی و

کێشەکانی تریش. من هیچ گومانم لە دەسەڵاتە دەستوورییەکانی سەرۆک نەبوو بۆ دیاریکردنی پێشینە لە نێوان بەرپرسیارێتییەکانی و دەسەڵاتە دژیەکەکان لە بڕیاردان لەبارەی جێبەجێکردنی یاساکان، یانیش پەیوەست بە ئاسایشی نەتەوەیی. بێجگە لەمەش، ئەستەم نەبوو ببینیت بارودۆخەکە لە ڕوانگەی سیاسییەوە بە کوێ دەگات، بە تایبەت لەو کەشە پەتاییەی واشنتۆن، کە بەهۆی تۆمەتەکانی پەیوەست بە دەستێوەردانەکانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکان هاتبووە ئاراوە. هیچ کام لە ئێمە نەماندەزانی تەنانەت ئەگەر شتێکی هەراسانکارتری شاراوەش هەبێت. سیپۆڵۆن پێشووتر هیچی لەبارەی ئەو کێشانەوە پێ نەگوترابوو، ئەو بە ئاشکرا سەر سوڕماو بوو لە خۆلەقەرەدانی ترەمپ بۆ جێبەجێکردن و جێبەجێنەکردنی یاسا.

تەنانەت زووتریش، لە ١٠ی کانوونی یەکەم، ئاویتە بە تێبینی و وتارەکەی ترەمپ لە ئاهەنگی سەری ساڵی تایبەت بە پارتیی کۆماری لەسەر کۆمپانیای هواوی و ئویگورەکانی چین، لەسەر ئەو کێشانە قسەم لەگەڵ پۆمپەیۆ کرد؛ هەروەها لەسەر ڕێگەچارەکانیش بۆ کێشە کەسییە یاساییەکانی ترەمپیش قسەمان کرد. ئەمە وای دەردەخست کە ڕێگریکردن لە یاسا لای ترەمپ شێوازێکی ژیان بێت، ئێمەش نەماندەتوانی ئەوە قبووڵ بکەین. لەوەش زیاتر، ئاسانکاریی لەگەڵ ئەو کۆمپانیا چینییانە کە خۆیان لە سزاکانی ئەمریکا دەدزییەوە یان فێڵ لە کۆمپانیاکانمان دەکەن، یاخود ژێرخانی کۆمپانیای پەیوەندییەکان دەخەنە ژێر هەڕەشەوە، وەک قایلکردنی دژەکانمان بەدەردەکەوت، کە تەواو پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانمان بوو. ئەم ڕووداوە لەو کاتە بوو کە من لە دەستلەکارکێشانەوەکەم نزیک دەبوومەوە، پۆمپەیۆش کۆک بوو لەگەڵ ئەو قسانەی من، کە لەسەر بابەتەکەم دەگوت. تا ئەو کاتەش دەقی نامەی دەستلەکارکێشانەوەکەم ئامادە نەبوو، بەڵام ئاماژەکانی ئاگادارکردنەوە زیاتر دەردەکەوتن.

لە ٣ی ئایار ترەمپ پەیوەندی بە پوتینەوە کرد، چونکە وەک خۆی بەبێ بەڵگەش دەیگوت پوتین خەریکە "لە خۆشیان دەمرێت" بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات. لە ڕاستیدا ترەمپ لە تامەزرۆییدا "دەمرد" تا قسە لەگەڵ پوتین بکات، لەبەرئەوەی لەوەتەی کێشەی گەرووی کریچ و هەڵوەشانەوەی کۆبوونەوە دووقۆڵییەکە لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی ٢٠ی بۆینس ئایریس قسەی لەگەڵ نەکردبوو. هەرچەندە ترەمپ ئەو کات ڕایگەیاندبوو کە کۆبوونەوەکان لەگەڵ ڕووسیا ئەنجام نادرێن تا کەشتییە ئۆکرانییەکان و تاقمەکانیان ئازاد نەکرێن، کە هێشتا هێڵدرابوونەوە؛ ئەو داوایەش لە پوتین بە شێوەیەکی نافەرمی بەستەڵەکەکەی شکاندبوو، کە لە کۆتاییەکانی مانگی تشرینی دووەمەوە بەردەوام بوو. بە کورتی تاوتوێی پرسی ئۆکرانیایان کرد، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی وای نەبوو. پوتین لەوەی دەپرسی کە ئیگۆر کۆلۆمۆیسکی بگەڕێتەوە سەر ڕەچەڵەکی خۆی، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پارەدارییەی لە بانگەشە سەرکەتووەکەی زێلێنسکی ئەنجامی دابوو. پوتین گوتی زێلێنسکی بەهۆی پیشە و دەرکەوتنی لە تەلەفزیۆن زۆر لە ڕووسیا ناسراوە و پەیوەندی لەگەڵ زۆر کەس هەیە. سەرەڕای ئەوەش، پوتین پێی وابوو هێشتا زێلێنسکی خۆی نیشان نەداوە، چونکە ئەنجامەکان کۆتایی نین. نەدەزاندرا پوتین مەبەستی لە چارەنووسی پەرلەمانی ئۆکرانیا بوو یاخود ئەو ناڕوونییە بوو کە ئایا زێلێنسکی داوای هەڵبژاردنی پێشوەختە دەکات یان نا.

لە ٨ی ئایار خێرایی ڕێکارەکان لە ئۆکرانیای دوای هەڵبژاردنەکان زیاتر بوون. لە کاتژمێر ٤:٤٥ خولەکی ئێوارە ترەمپ بانگهێشتی ژووری هێلکەیی کردم، کە تێیدا لەگەڵ هەر یەکە لە جویانی، مولڤانێی و سیپۆلۆن و پێشم وابێت چەند کەسێکی تر لە کۆبوونەوەدا بوون. بابەتەکە ئۆکرانیا بوو، جولیانیش خواستی لەوەدا بوو لەگەڵ سەرۆکی هەڵبژێردراوی ئۆکرانیا، زێلێنسکی، کۆببێتەوە بۆ تاوتوێکردنی

لێکۆڵینەوەکانی وڵاتەکە لە هیلاری کلینتۆن یانیش هەوڵەکانی هیلاری بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٦، یانیش بۆ تاوتوێکردنی پرسگەلێکی پەیوەندیدار بە هەنتەر بایدن و هەڵبژاردنی ٢٠٢٠، یانیش هەردوو بابەتەکە. لە بیستنی لێدوانی جیاجیا لەسەر ئەو بابەتانە بۆم دەرکەوتبوو کە مەیل هەیە ئەو دوو بابەتە تێکەڵ بکرێن و بەیەکەوە ببەسترێنەوە، ئەوەش وای کرد من زۆر گرنگییان پێ نەدەم. تەنانەت دوای ئاشکراکردنی بابەتەکانیش، بە ئەستەم ڕەگوڕیشەی پاڵنەری بیردۆزی پیلاگێڕیم لەسەر بابەتەکە بۆ جیا دەکرایەوە. ترەمپ ڕژد بوو لەسەر ئەوەی من پەیوەندی بە زێلێنسکییەوە بکەم و دڵنیا بم بۆ هەفتەی داهاتوو جولیانی کۆبوونەوەکەی لە کییڤ بۆ بڕەخسێت. جولیانی سوێندی خوارد کە هیچ کام لە بریکارەکانی لە بابەتەکەوە نەگلاون، ئەو شتەی باوەڕکردنی بۆ من ئەستەم بوو، بەڵام ئەو کاتیش هیواخواز بووم لەو بەزمە دووربکەومەوە. پرسی دەرکردنی یۆڤانۆڤیچ ڕاگەیاندنەکانی تەنی بوو، دڵنیاش بووم بە گەشتەکەی جولیانی بۆ ئۆکرانیا بابەتەکە خۆی دەخزێتە نێو مقۆمقۆی ڕاگەیاندنەکان. جولیانی ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد کە ئەو بەدوای لێکۆڵینەوەیە لە کەسێکی پایەداری حکوومەت، کەسەکە کێنت بوو، ئەو کەسەی جولیانی پێی وابوو لەگەڵ جۆرج سۆرۆس دژبەری ترەمپن. ئەو ناوەم لە پرسی پەیوەست بە یۆڤانۆڤیچ بیستبوو، بەڵام ئەوەم لە ئادەمەوە نەبیستبوو.

دڵخۆش بووم کە دەتوانم لە کاتژمێر ١:٥٥ خولەک خۆم لەمە ڕزگار بکەم و بگەڕێمەوە نووسینگەکەم و بەخێراییش پەیوەندیم بە زێلێنسکییەوە نەکرد، هیواخوازم ئەو هەموو شتە بە تەواوی ون بن. بە ئەستەم دانیشتبووم کاتێک بینیم هەر یەکە لە جۆن سوڵیڤان و مارك شۆرت خۆیان کردە ژوورەوە، گوتیان ترەمپ ئەوانی لە کۆبوونەوەی هەفتانەی بازرگانی ژوورەکەی ڕووزڤێلت لە کۆشکی سپی دابڕیووە بۆ کارکردن لەسەر

کێنت. (ئەو کۆبوونەوە هەفتەییە بازرگانییانەم زۆر بە بێسەروبەر دەبینی، ئەوە بە ڕادەیەک بوو خۆم دەدزیەوە تا کووپەرمان لە بری من بەشداری بکات، سزایەک ئەو شایانی نەبوو، بەڵام ئیتر ژیانیش سەختە) سولێڤانیش بە دەگمەن دەیزانی کێنت کێیە، بەڵام دیمەنەکانی ژووری ڕووزڤێڵتی بۆ باس کردین، کە ترەمپ قسەی لەگەڵ کردبوو لەو کاتەی بۆب لایتهایزەر بەنێو هێلکارییەکاندا دەگەڕا لەسەر کێشەی بازرگانی جیاجیا قسەی دەکرد، ترەمپیش هیچ گرنگی بەمە نەدابوو. دوای ئەوەش ترەمپ لە قسەکردن لەگەڵ سولێڤان لەسەر پرسی کێنت تەواو ببوو، ترەمپ بۆ چەند چرکەیەک گەڕابوویەوە لای لایتازیزەر، ئینجا بە سولێڤانی گوتبوو: "بڕۆ لەسەر کێنت قسە لەگەڵ بۆڵتن بکە". ئینجا بە شۆرتی گوتبوو: "نیشانی بدە ژوورەکەی بۆڵتۆن لە کوێیە؟" ئا بەم شێوەیە. شۆرت ڕۆیشت و منیش دوایین بابەتەکانم کە کەمێک پێشووتر لە ژووری هێلکەیی باس کرابوو، لەسەر ئۆکرانیا بۆ سولێڤان شی کردەوە و داوام لێ کرد تا زووە قسە لەگەڵ پۆمپەیۆ بکات. پۆمپەیۆ بەیانی داهاتوو کاتژمێر ۹ دەگەڕایەوە و سۆلێڤانییش گوتی ئەو کات قسەی لەگەڵ دەکات.

پرسی گەشتەکەی جولیانی بۆ ئۆکرانیا چەند ڕۆژێکی خایاند بەبێ ئەوەی بڕیارێکی ڕوونی لەبارەوە بدرێت. لە ۱۰ی ئایار سیپۆلۆن و ئێزنبێرگ هاتن تا بمبینن، لەو کاتەی کە بابەتی لەکارلادانی یۆڤانۆڤیچ زیاتر لە میدیاکان ڕوومالّ دەکرا (هەرچەندە ڕاگەیاندنە سەرەکی و فەرمییەکان کەم خۆیان لە قەرەی بابەتەکە دەدا)، لەو کاتەش جولیانی بایی خۆی لە ڕاگەیاندنەکان گرنگیی پێ دەدرا. لە دیمانەیەکی نیویۆرك تایمزدا کە ئەو بەیانییە بڵاو کرابوویەوە، ئاماژە بە ڕستەیەکی ئەو کرابوو کە دەیگوت: "ئێمە دەستێوەردان لە هەڵبژاردنێکی دیاریکراو ناکەین، ئێمە دەستێوەردان لە لێکۆڵینەوەیەک دەکەین، کە ئەو مافەشمان هەیە... ئەمەش کارێکی نایاسایی نییە... ڕەنگە کەسانێک هەبن بڵێن ئەوە شیاو نییە، ئەمە پەیوەست

نییە بە سیاسەتی دەرەوە، من داوایان لێ دەکەم لێکۆڵینەوەیەک ئەنجام بدەن کە ئێستا پێوەی سەرقاڵن و خەڵکانی دیکە پێیان دەڵێن ئەوە ڕابگرن. منیش پێیان دەڵێم کە پێویست ناکات لێکۆڵینەوەکان ڕاگرن، چونکە ئەو زانیارییانە بۆ بریکارەکەم زۆر زۆر بەسوود دەبن، ڕەنگە بۆ حکوومەتەکەشم بە سوود بن". ئێمە هەرسێکمان کۆک بووین کە نابێت جولیانی ڕێگەی پێ بدرێت بچێتە ئۆکرانیا، بەڵام کاردانەوەکان ناڕوونییەکیان دروست کرد، بەوەی ئاخۆ دەبێ کێ لە ئیدارەی ترەمپ ئامادەی مەراسیمی ڕۆژی دەستپێکی سەرۆکایەتی زێلێنسکی بێت، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بانگەشەیەی دروستی دەکات.

بەشداریکردنی پێنس گومانی تێکەوت و ئەمە کارێکی ئاڵۆزیش بوو، لەبەر ئەوەی رۆژی مەراسیمەکە هێشتا دیاری نەکرابوو. باڵیۆزخانەکەمان لە کییێف پێی سەیر بوو کە پەرلەمانی ئۆکرانیا ڕێککەوتی ٢٠ی ئایاریان بۆ سوێندخواردن و مەراسیمەکە دەستنیشان کردبوو، ئەمەش هیچ کاتێکی وەهای بۆ نەهێشتینەوە تەماشای خشتەی کارەکان بکەین و شاندەکە ئامادە بکەین. لەو کاتەش ترەمپ ڕایگەیاند کە نابێت پێنس بچێت و پۆمپەیۆش نەیتوانی و هۆکاری خۆی هەبوو. لە کۆتاییدا و لە ١٦ی ئایار، وا دەردەکەوت وەزیری وزە ڕیک پێری سەرۆکایەتی شاندەکە بکات، ئەوەش شتێکی گونجاو بوو، ئەویش بەهۆی ئەو کێشانەی ئۆکرانیا لە لایەنی وزەوە دووچاری دەبووەوە، ئەمە بێجگە لە گرنگیی پەیوەندی و پێکەوەکارکردنی کییێف-واشنتۆن لە بەرامبەر خراپقۆستنەوەی ژێرخانی وزە لە لایەن مۆسکۆ لە ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئەورووپا. گۆردن سۆندلاند، باڵیۆزی ئەمریکا لە یەکێتیی ئەورووپا زۆر هەوڵی دەدا بخرێتە نێو نێوەکانی شاندی ئەمریکا. بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ پاساوێکی ڕەوای بۆ بەشداریکردن نەبوو، بەردەوام ناوم دەسڕیەوە. سەرەڕای ئەوەش، لە کۆتاییدا ئەو یەکێک بوو لە ئەندامەکانی شاندەکە، وەک پێیان گوتم

مولّڤانێی ڕژد بوو لەسەر بوونی ئەو لە شاندەکە. ڕوون نەبوو بۆچی ڕادا (پەرلەمانی ئۆکرانیا) ئەو ڕێککەوتە زووەی بۆ مەراسیمی سوێندخواردنی سەرۆکی تازە دەستنیشان کردبوو، بەڵام چاودێرانمان لە ئۆکرانیا پێیان وابوو پارتەکەی پۆرۆشینکۆ بڕیاری دابوو ئامادەیە گرەو بە هەڵبژاردنی پێشوەختەی پەرلمانی بکات، باوەڕیان وابووە زێلێنسکی ناتوانێت لە ئاست پێشبینییەکانی دەوروبەری بێت. دواتر دەرکەوت کە ئەوە خراپ هەڵسەنگاندنی ڕاوێژکارەکانی پۆرۆشینکۆ بووە و لە بەرامبەردا وزەیەکی زۆری بە زێلێنسکی بەخشی.

لە ڕاستیدا ڕێوڕەسمەکەی ٢٠ی ئایار شتی پێشبینینەکراوی دیکەی لێهاتە ئارا، کاتێک زێلێنسکی پۆرۆشینکۆی تووشی سەرسوڕمان کرد و داوای هەڵبژاردنی پێشوەختەی کرد. ڕۆژێکی دیاریکراو دەستنیشان نەکرا، بەڵام پێشبینی دەکرا لە مانگی تەمموز بێت. دواتر نەک بۆ من، بۆ ئەوانی تریش ڕوون بوویەوە، لە نێوانیشیان فیۆنا هێل، بەڕێوەبەری سەرەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ کاروباری ئەوروپا و ڕووسیا، کە ترەمپ بە تەواوی بۆچوونەکەی جولیانی پەسەند کردووە کە گوایە "دەستێوەردانەکانی ڕووسیا" لە لایەن دژبەرە سیاسییە خۆجێیە ئەمریکییەکانەوە دروستکراوە و تێکەڵی کێشەکانی ئۆکرانیا کراوە. بەشێوەیەکی تر، ترەمپ باوەڕی بەو بۆچوونە دەکرد ئۆکرانیا بەرپرس بوویێت لە بوونی دەستێوەردانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا. ئەمەش دەرخەری ئەوە بوو کە ئێمە لە ماوەیەکی کەمدا هیچ چاکەیەک لەگەڵ ئۆکرانیا ناکەین، سەرەڕای ئەوەی ئەمە چەندە هاریکارمان دەبوو لە پێشگرتن بە هاتنە ناوەوەی زیاتری ڕووسیا لەو بەرەیە.

لە ٢٢ی ئایار، لە نیولەندەن لە ویلایەتی کۆنێکتیکت، دوای پێشکەشکردنی وتارێك بۆ دەرچووانی ئەکادیمیای پاسەوانانی کەنار دەریا، لە فڕۆکەخانەی ئەندروزەوە بەرەو ژاپۆن بەڕێ کەوتم بە ئامانجی

ئامادەکارییەکان بۆ گەشتی فەرمیی ترەمپ، یەکەمین گەشتی ترەمپ لە سەردەمی ئیمپراتۆری نوێ ئیمپراتۆر نوریهیتۆ. دوای دوو ڕۆژ لە مانەوەم لە تۆکیۆ، قسەم لەگەڵ کووپەرمان کرد، کە ئەو خۆی لە زانیاریپێدانی ترەمپ لە دەسپێکی ئەو ڕۆژە ئامادە بوو (ئەوکاتەی قسەمان کرد، لە واشنتۆن هێشتا ڕۆژەکە ۲۳ی ئایار بوو)، شاندەکەی ئێمە کە بۆ سوێندخواردنەکەی زێلێنسکی ئامادەبوون و پێکهاتبوون لە: پێری، سۆندلاند، ڤۆلکەر و سیناتۆر ڕۆن جۆنسن؛ مێژوویانە دەردەکەوت. ترەمپ بە کووپەرمانی گوت: "نامەوێت هیچ پەیوەندییەکی نەفرەتیم بە ئۆکرانیاوە هەبێت". "ئەوان هێرشیان کردووەتە سەر من. تێناگەم بۆچی؟! لە جۆو دی جێنۆڤا بپرسن، ئەو هەموو شتێک لەو بارەیەوە دەزانێت. ئەوان هەوڵیان دا من لەنێو بەرن. ئەوان گەندەڵن. من نامەوێت زیان بەوان بگەیێنم". ئەو هەموو شتەی گوت، وەک ئاماژەیەک بە بانگەشەکەی هیلاری کە بۆ زیانگەیاندن بە ترەمپ لە ۲۰۱٦ و ۲۰۲۰، لەلایەن هەنتەر بایدنەوە پاڵپشتی کرابوو.

ڤۆلکەر دەیویست شتێکی پەیوەست بە ئۆکرانیا بڵێت، ترەمپ وەڵامی دایەوە و گوتی: "من گرنگی پێ نادەم".

پێری گوتی ناکرێت ڕێگە بە وڵاتێکی شکستخواردوو بدەین. (مەبەستی ئۆکرانیا بوو، لە ئەگەری شکستی وڵاتەکە و حکوومەتەکەی).

ترەمپ گوتی: "قسە لەگەڵ ڕوودی و جۆو بکە".

پێری هەر سوور بوو و گوتی: "نەوەد ڕۆژ ماوەم پێ بدە"، بەڵام ترەمپ قسەی پێ بڕی و گوتی: "ئۆکرانیا هەوڵی شکستپێنهێنانی منی داوە. من حەزم لە هاوکاریکردنیان نییە". هەرچەندە دەشیویست بڵێت پێدەچێت زێلێنسکی سەردانی کۆشکی سپی بکات، بەڵام تەنیا دوای ئەوەی پێی دەگوترێت کە هەستی ترەمپ لەوبارەیەوە چۆنە. ترەمپ گوتی: "نێردەی زانیاری ئەنجوومەنی نیشتیمانی دیموکراتەکانم دەوێت". گەڕایەوە سەر

باسەکە و گوتیشی: "باشە، تۆ نەوەد ڕۆژت هەیە. بەڵام من هیچ خواستێکم بۆ بینینی ئەو نییە." دواتر پێری و کووپەرمان هاوڕا بوون نابێت زێلێنسکی داوەت بکرێت تا ئەو کاتەی کێشەکانی لەگەڵ یەکێتیی ئەورووپا لە برۆکسڵ چارەسەر نەکات، لە هەمان کاتیش بەردەوام بوون لەسەر کارکردن بۆ سەردانی پێشوەختەی زیلێنسکی بۆ واشنتۆن.

بە شیوەیەک لە شێوەکان پۆمپەیۆ ئەوەندە گرنگی بە بابەتەکە نەدەدا. هیچ خواستی لەسەر هێنانەنێوەوەی سۆندلاند نەبوو لەسەر پرسی ئۆکرانیا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی دەیخواست باڵیۆزەکان زانیاری بەخۆی بدەن (کە واشیان دەکرد، بە تایبەت لە ڕێگەی جێگرە یاریدەدەرەکانییەوە)، نەک بەسەر ئەودا باز بدەن و ڕاپۆرتەکانیان بە سەرۆک بدەن. ئەمە بەشیك بوو لە شێوازی کارکردن و بەڕێوەبردن لای پۆمپەیۆ لە وەزارەتی دەرەوە: دوورکەوتنەوە لە بەریەککەوتن.

ترەمپ بەر لە گەشتەکەی کە لە مانگی حوزەیران بوو، کێشەی سەردانی زێلێنسکی بەوە چارەسەر کرد کە گوتی پایز ئەوە ڕوونادات، بە بۆچوونی من ئەوە دەرەنجامێکی ڕاست بوو. لایەنە ئەورووپییە سەرەکییەکانیش بە هۆشیارییەوە مامەڵەیان لەگەڵ زێلێنسکی دەکرد. لە درەنگانی ئایار، هەردوو وەزیرانی دەرەوەی ئەڵمانیا و فەرەنسا هێیکۆ ماس و ژۆن یڤیس لێدریان سەردانی زێلێنسکییان کرد لە کێیڤ، بەڵام هیچ دەرەنجامێکی تەواویان لەسەری وەدەست نەهێنا. کاتێک لە ٦ی حوزەیران ترەمپ چاوی بە سەرۆک ماکرۆن کەوت، وادیار بوو ئەو پەرۆشییەکی بۆ زێلێنسکی هەبوو، بە هەمان شێوەش مێرکڵ کاتێک ترەمپ لە ئۆساکا و لە میانەی لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی ٢٠ لەگەڵی کۆبووەوە. سەرەڕای ئەوەش، بە پشتبەستن بە دوای پەیوەندیی تەلەفۆنی ترەمپ لەگەڵ پوتین لەسەر پرسی کرایمیا، پوتین هیچ ئاماژەیەکی ئەرێنی بەدەستەوە نەدا لەسەر دانوستان لەسەر کرایمیا یان دۆنباس، بە دڵنیاییەوە بەر لە هەڵبژاردنەکانی

ڕادا (پەڕلەمانی ئۆکرانیا) نا.

دانوستانی داهاتووی ترەمپ کە من لە یادم بێت، لەبارەی ئۆکرانیا تا ۲۵ حوزەیران ڕوویندا. من ئەو کات لە ئیسرائیل بووم بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ناتەنیاهۆ و بە مەبەستی کۆبوونەوەی سێقۆڵی لەگەڵ هاوتاکان پاتروشێف و بێن شۆبات، بەڵام لە نزیک شوێنی مانەوەم لە دەیڤد سیتادێل هۆتێل، لە باڵەخانەکەی پێشووی کونسوولخانەکەمان لە ئۆرشەلیم، لە ڕێگەی پەیوەندیی ڤیدیۆییەوە بەشداریم لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کرد. کۆبوونەوەکە بە ئامادەبوونی ئەندامە بەشدارەکان لە واشنتۆن لە ژووری دانیشتن بەڕێوە دەچوو، کە مەبەست لێی تاوتوێکردنی پرسەکانی دیکە بوو، بەڵام لە خاڵێکدا، لە هێڵی دووەم گازاندە و نیگەرانی دەردەبڕی لەسەر: "هاوپەیمانە مەزنە ئەوروپییەکانمان". بێجگە لە خەرجیی سنووردراری ئەڵمانیا لە لایەنی بەرگری (ناتۆ). ترەمپ لە ژووری دانیشتن لەسەر نیشاندەرەکە کە من لەو دیوی و لە ئیسرائیلەوە دیاربووم دەرکەوت و قسەی دەکرد: "ئەنگێلا [مێرکل] دەیگوت ئەو دەگاتە ڕێژەکە [۲٪ لە داهاتی گشتی] لە ساڵی ۲۰۳۰، ئەوەت لەیاد بێت جۆن". ترەمپ پێدەکەنی و گوتی: "من گوێ لە ڕاوێژکارەکانم دەگرم بەبێ گوێدانە ئەوەی چۆن بیر دەکەنەوە". (منیش پێدەکەنیم)، ئینجا بە دەنگێکی بەرزەوە دەیگوت: "هەمووان لە لایەنی بازرگانییەوە فێڵمان لێ دەکەن. ئەمە باشترین مانگی حوزەیران دەبێت لە ماوەی چەندین ساڵدا. باجی گومرگی پارەیەکی زۆر گل دەداتەوە". دواتر هاوکاری ئۆکرانیا بە بڕی ۲۵۰ ملیۆن دۆلار کرا بۆ بەرنامەی کڕینی چەک. ترەمپ گوتی: "جۆن تۆ ڕێگەت پێداوە؟" من گوتم کە ئەوە کاری کۆنگرێس بوو، وەزارەتی بەرگری تەنیا ئەنجامی داوە. ترەمپ پرسی: "ئەمە تا چەند کارێکی گەمژەیە؟!"... "ئەڵمانیا هیچ لە سەر وڵاتە هاوسێکانی خەرج ناکات. ئەنگێلا دەڵێت: "ئێمە لەبەر ئەوە پارەکە خەرج ناکەین کە هاوسێمان بێت". ئینجا

پرسی: "چۆن، تۆ هاوڕای لەسەر بابەتی ئۆکرانیا؟" من هیچ وەڵامێکی ڕاستەوخۆم نەدایەوە، ترسم هەبوو لەوەی دەبێت چی بوویێت، کە خەیاڵی ترەمپی بەلای ئەو هاوکارییە سەربازییەدا بردبێت. لەبری ئەوە پێشنیارم کرد کە مارك ئێسپەر تەواوی ئەو پرسیارانە لەسەر ناتۆ و هاوبەشیی ئەرکەکانی پەیوەست بە ئۆکرانیا لە کۆبوونەوەی وەزیرانی بەرگری وڵاتانی ئەندام لە هاوپەیمانییەتی ناتۆ تاوتوێ بکرێن، کە بڕیار بوو لە کاتی خۆی لە چەند ڕۆژی دواتر کۆبوونەوەکە ئەنجام بدرێت. پێم وابێت ئەمە یەکەمین جار بوو ببیستم هاریکاریی پەیوەست بە ئاسایش بۆ ئۆکرانیا بخرێتە ژێر پرسیار، بەڵام کێشە ڕاستەقینەکە چۆنییەتی زانینی بابەتەکە بوو لە لایەن ترەمپ و دەبێت کێ بوو بێت بیرۆکەی بەکارهێنانی ئەو پرسەی وەک کارتێکی فشار بۆسەر زیلێنسکی و حکوومەتە نوێیەکەی پێ دابێت. هەرگیز وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەست نەکەوت، هەرچەندە دەشێت مولڤانێی وەک بەرپرسی نووسینگەی کارگێڕی و بودجە بەوپەڕی توانای خۆی یەکێک لە سەرچاوەکان بێت. ئەو خاڵە سەرەکییەی من لەو گفتوگۆیە دەستم کەوت ئەوە بوو کە پێشکەشکردنی هاریکاری بۆ ئۆکرانیا لە لایەنی ئاسایشییەوە لە ژێر هەڕەشەدا بوو، ئەویش بەهۆی هەبوونی خەیاڵپلاوانی هەڵگری بیردۆزی پیلانگێڕی لەسەر ئۆکرانیا.

١٠ی تەمموز لە نووسینگەکەم چاوم بە هاوتا ئۆکرانییەکەم ئۆلێکساندەر دانیلیوک کەوت، کە ئەو سکرتێری تازەی ئاسایشی نەتەوەیی و ئەنجوومەنی بەرگری بوو. دانیلیوک چاکسازێکی ڕۆژئاواییخواز بوو. وەزیری پێشووی دارایی پۆرۆشینکۆش بووە، بەڵام دەستی لە کار کێشابوویەوە، چونکە ئەوەی باوەڕ نەکردووە کە کابینەکەی پۆرۆشینکۆ پابەندی چاکسازیی ڕاستەقینە بوو بێت. پێری، سۆدلاند و ڤۆلکەر هەموویان داوایان دەکرد لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بن (ئایا سۆندلاند هیچ کاتی لە بڕۆکسل بەسەر بردووە؟)، هەر زوو بە ڕوونی دیار بوو کە

هەرسێکیان هەوڵیان دەدا هانم بدەن بەر لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی تەمموز، زێلێنسکی داوەتی کۆشکی سپی بکەم. چونکە من دەمزانی و پێویست بوو ئەوانیش لەوە تێبگەن کە دوای کۆبوونەوەکەی ژووری هێلکەیی لە ٢٣ی ئایار، ڕوون بوو ترەمپ نەیدەویست مامەڵە لەگەڵ ئۆکرانییەکان بکات لەسەر یەك هێڵ و لایەنیش بێت (ترەمپ بە هەڵە کەوتبووە ژێر کاریگەریی زانیارییە بێ بنچینەییەکانی جولیانی)، من نەچوومە ژێر کاریگەری ئەوان. ئاشکرا بوو، دانیلیوک پەیوەندییەکی تۆکمەتری لەگەڵ ئێمە دەویست و منیش پاڵپشتییەکی زۆرم لێ دەکرد و بۆ قسەلەگەڵکردنیش ئاسانتر بوو. دانیلیوک سەرسوڕماو و هاوکات نیگەرانیش بوو لەوەی کە من لەم کاتەدا ئامادەیی ئەوەم نەبوو لە داوەتکردنی زێلێنسکی بەشدار بم، کە لە لایەن ئەوانی تر لە کۆبوونەوەکە هەوڵی بۆ دەدرا، بەڵام من ئامادە نەبووم بۆ کەسێکی بیانی ڕوون بکەمەوە کە ئەو سێ کەسە لە دەرەوەی سنووره پیشەییەکانیان دەیانخوڕی و مامەڵەیان دەکرد. تا من زیاتر بەرگریم کردبا، سۆندلاند زیاتر فشاری بەرەو بازنەی جولیانی دەبرد، من ئەوم بە لە دەرەوەی بازنە لەقەڵەم دەدا.

لە گەواهیدانەکانی دواتری کۆنگرێس، فیۆنا هێڵ بە دروستیی گەواهی دا کە دوای کۆبوونەوە لەگەڵ دانیلیوک و گرتنی وێنەیەک لەگەڵی و لەتەک بەرپرسە ئەمریکییە بەشدارەکانی کۆبوونەوەکە، پێم گوتبوو بەشداری کۆبوونەوەیەک بکات کە سۆندلاند لە ژووری باڵی کۆشک لەگەڵ ئەو ئۆکرانیانەی کۆبوونەوەکەی من، ڕێکی خستبوو. من سەرم لەو کاڵفامییە سوڕما بوو کە فشاریان دەکرد بۆ کۆبوونەوەی تایبەتیی ترەمپ-زێلێنسکی تا کێشەکانی جولیانی چارەسەر بکرێن، ئەمە هەوڵێك بوو دەرکەوتبوو کە مولڤانێی لە کۆبوونەوەکانی لەگەڵ سۆندلاند لای گەلاڵە ببوو. من بە فیۆنام گوتبوو کە تەواوی پرسەکەی نووسینگەی ئەنجوومەنی کۆشکی سپی؛ ئەو تەواو قسەی منی گێڕایەوە: "من بەشێک نیم لە

هەرچییەک بێت لە ڕێککەوتنی سۆندلاند و مولڤانێی کە ڕێگەی بۆ خۆش دەکەن." پێم وابوو تەواوی پەیوەندییەکە سیاسەتکردنێکی خراپ بوو و لە ڕووی یاساییشەوە زۆر پرسیاری هەڵدەگرت، وەک ئاکارێکی سەرۆکایەتی قبووڵنەکراویش دەردەکەوت. ئایا ئەمە یەکێک بوو لە هۆکارەکانی دەستلەکارکێشانەوەی من؟! بەڵێ.. بەڵام یەکێک بوو لە زۆر هۆکاری دیکەی جێهێشتنی کارەکە. پێشتر، هیل گەواهی دابوو کە من بە جولیانیم گوتبوو: "نارنجۆکێک کە هەمووان پارچە پارچە دەکات،" کە تا ئێستاش ئەو قسەیە بە ڕاست دەبینم. بە تایبەت پێری و سۆندلاند هەوڵی بەردەوامیان دەدا، ئەمە لەگەڵ هەوڵەکانی دانیلیوک هاوتا بوو بە لایەنی کەم بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی ترەمپ-زێلێنسکی بەر لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئۆکرانیا. منیش بەردەوام دوورم دەخستنەوە، ترسم هەبوو پەیوەندییەکە بە پێچەوانە بشکێتەوە.

لە بەیانیی یەکشەممە، ٢٠ی تەمموز، ڕۆژێک بەر لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی ئۆکرانیا بەرەو ژاپۆن و کۆریای باشوور بەرێ کەوتم، بۆ گفتوگۆ لەسەر کێشەکانی تێچووی بنکەی سەربازی. لە ئاسمانەوە پەیوەندیم بە کووپەرمان کرد، لە کاتێکدا کە ئێستا ڕوون بوو هەر پەیوەندییەکی تەلەفۆنیی ترەمپ لە دوای هەڵبژاردنەکان دەبێت و داوام لێ کرد پەیوەندی بە دانیلیوکەوە بکات و بە ڕێزەوە پێی بڵێت کە گوێ بۆ سۆندلاند نەگرێت. بە ماوەیەکەی کەم کووپەرمان پێی گوتمەوە، کە دانیلیوک سوپاسگوزار بووە بۆ هەواڵپێدانی، بە هەمان شێوەش بیل تێیلەر بەرپرسی کارەکانمان لە کیێڤ، کە بەقەد ئێمە دەیزانی سۆنلاند کاری ئازادی دەکرد. لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر، دانیلیوک گوتی کە کۆبوونەوەی ترەمپ-زێلێنسکی (یان پەیوەندیی تەلەفۆنی) بیرۆکەی ئەو نەبووە، بەڵکو هی سۆندلاند بووە. تەواوی بابەتەکە تەڵەکەبازی بووە. هەوادارانی زێلێنسکی ئەنجامی باشیان لە هەڵبژاردنەکان بەدەستهێنا؛

نزیکەی ٤٣٪ی دەنگەکانیان بەدەست هێنا کە دەنگی پێویست بوون بۆ دروستکردنی زۆرینەیەک لە پارتەکەی و سەربەخۆکان و ئەوانەشی لە بیرکردنەوەدا لەوان نزیک بوون. هیوام دەخواست کە ئەوە هەنگاوێکی گرنگ بێت بە ئاراستەی گەڕاندنەوەی شتەکان بۆ شوێنە ڕاستەقینەکانی خۆیان.

ئێوارەی بەر لە پەیوەندییە تەلەفۆنییە بەنێوبانگەکەی ٢٥ی تەمموزی نێوان ترەمپ-زێلێنسکی لە ئاسیا گەڕامەوە. کەمێک بەر لە پەیوەندییەکە لە کاتژمێر ٩ی بەیانی زانیاریم لەسەر بابەتە پەیوەستەکان پێدا، کە هیوام دەخواست دووبارەی ئەو کەشە ڕواڵەتییەی ترەمپ لە ئێوارەی بردنەوەی زێلێنسکی لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بووایە.

ڕوونم کردەوە کە ئۆکرانیا وەک پەرچەکردار لە بەرامبەر ڕووسیا و ڕووداوەکەی گەرووی کرێچ لە ساڵی ٢٠١٨، دەستی بەسەر کەشتییەکی نەوتهەڵگر و تاقمەکەیدا گرتووە، ئەمەش نرخی ڕاستەقینەی زێلێنسکی و تیمە تازەکەی نیشاندا. سۆندلاندیش کە من لای خۆم لە زانیارییەکان پشتگوێم خستبوو (کە دەبووە یەکەمین جار لە ماوەی کارکردنم هیچ باڵیۆزێک زانیاری پێ بدرێت) لە ڕێگەی مولڤانییەوە لە ٧:٣٠ خولەکی بەیانی قسەی لەگەڵ ترەمپ کرد بوو، خوا دەزانێت قسەیان لەسەر چی کردووە!

وەک نەریتێك، گوێم لە تۆمارکراوی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەی گفتوگۆی ترەمپ-زێلێنسکی گرت، کە لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە بە چەند تێبینییەک پێم گەیێندرابوو و ئێستا بڵاوکراوەتەوە؛ ئەمە وەک دەقێک نەبوو کە لەلایەن پەیامنێرێکی دادگەکانەوە ئامادە کرابێت لەسەر گەواهیدان یان لە دۆسیەیەکی دادگە. لە ١٨ی ئایار و دوای گەیشتنم بە کۆشکی سپی بەخێرایی لەگەڵ ئێزنبێرگ کۆبوومەوە بۆ تاوتوێکردنی پرۆسەی تۆمارکردنی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانیان و چۆنییەتی پێشکەوتنی

پرۆسەکە. بڕیارمان دا شتەکان وەک خۆیان جێ بهێڵن، بۆ دوورکەوتنەوە لە تۆمارکردن بە شێوەیەکی کۆتایی لە چوارچێوەی یاسای تۆماری سەرۆکایەتی و نەهێشتنەوەی بۆ داهاتوو.

تا تەقینەوەی مقۆمقۆی ئۆکرانیا، نەمدەزانی ئێمە لەو سیاسەتە لاماندا بوو، تەنانەت پەیوەست بە "تۆمارکردنی پەیوەندییەکانیش". لەو کاتە پێشم وا نەبوو لێدوانەکانی ترەمپ لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان هیچ گۆڕانکاری و کێشەیەکی وەهایان بێتە بەردەم؛ بەدڵنیاییەوە ئەو پەیوەندییانە لە خەیاڵی جولیانی گرێدراوی هاوکارییە سەربازییەکان بوون. کاریگەریی پەیوەندییەکان لەسەر من تەنیا وەک بەردێکی سەر ڕێگەم نەبوو، بەڵکو وەک کەرپووچێک بوو لە دیوارێکی بەربەستی، کە لەبەردەمم دروست ببوو. ئەوە بیرەوەرییەکانی منە لەسەر ئەوەی لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان گرنگ بوو بێت، مەبەستم لە تۆماری دەنگیی پەیوەندییەکان نییە.

ترەمپ بە هۆی هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکان پیرۆزبایی لە زێلێنسکی کرد، لە وەڵامیشدا، زێلێنسکی سوپاسی ترەمپی کرد و گوتی: "پێویستە لە وڵاتە ئەورووپییەکان زیاتر هەڵبژاردن ئەنجام بدەم، تا من و تۆ زیاتر قسە بکەین. ئێمە هەوڵ دەدەین زۆنگاوی گەندەڵیی ئۆکرانیا وشک بکەین. خەڵکی نوێمان هێناوەتە پێشەوە، نەک سیاسییە کۆنەکان".

ترەمپ گوتی: "ئێمە زۆر کار بۆ ئۆکرانیا ئەنجام دەدەین، زۆر زیاتر لە وڵاتە ئەورووپییەکان، کە پێویستە کاری زیاتر بکەن، لەوانە ئەڵمانیا. ئەوان تەنیا قسە دەکەن. کاتێک قسە لەگەڵ ئەنگێلا مێرکڵ دەکەم، ئەو تەنیا باسی ئۆکرانیا دەکات و هیچ کارێکیش لەوبارەیەوە ئەنجام نادات. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر زۆر باش بووە بۆ ئۆکرانیا، بەڵام لە بەرامبەر دوولایەنە و بەو شێوەیە نییە بەهۆی ئەو شتانەی ڕوویانداوە [بیردۆزە پیلانگێرییەکانی جولیانی]."

زێلێنسکی وەڵامی دایەوە: "بە تەواوی ڕاست دەکەی، لە سەدا هەزار

قسەکانت تەواون. من لەگەڵ مێرکڵ و ماکرۆن کۆبوومەتەوە ئەوان ئەو کارە ئەنجام نادەن کە پێویستە ئەنجامی بدەن. ئەوان سزای تازە ناسەپێنن [لەسەر ڕووسیا]. پێویستە یەکێتیی ئەوروپا هاوەڵە سەرەکییەکەی ئێمە بێت، بەڵام ئەمریکا ئەو هاوەڵەیە، منیش زۆر سوپاسگوزاری تۆم بۆ ئەمە. ئەمریکا زۆر زیاتر لە سزاکان ئەنجام دەدات".

دواتر سوپاسی ئەمریکای کرد بۆ هاریکارییەکانی بواری بەرگری، گوتیشی دەیەوێت جاڤێلین بکڕێت (دژەتانکی ئەمریکی).

ترەمپ چووە سەر کێشە ڕاستەقینەکە: "پێم خۆشە تۆش چاکەیەکمان لەگەڵ بکەیت، چونکە دەزانیت وڵاتەکەمان بە زۆر کێشەدا ڕەت بووە کە ئۆکرانیا زۆری لەبارەوە دەزانێت. زانیاری لەسەر کراود سترایک پەیدا بکە [کۆمپانیایەکی ئینتەرنێت کە لێژنەی نیشتیمانیی دیموکراتەکان بەکاریان هێناوە]، ڕاژە و زانیاریدەر (سێرڤەر)ی ئینتەرنێتییە، باس لەوە دەکەن ئۆکرانیا ئەوەی هەیە. پێم خۆشە داواکاریی گشتیی ئێمە پەیوەندیت پێوە بکات و کێشەکە چارەسەر بکات. دوێنێ هەموو شتێک لەگەڵ میولەر کۆتایی هات [پەخشی تەلەفزیۆنی گەواهیدانەکەی لە کۆنگرێس]: ناپیاو، ناکارامە. هیواخوازم تۆ بگەیتە چارەسەری کێشەکە".

زێلێنسکی وەڵامی دایەوە: "بۆ من وەک سەرۆک ئەوە زۆر گرنگە، ئێمەش ئامادەین بۆ هاریکاریکردنی یەکتر لە داهاتوو، بۆ کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێش لە پەیوەندییەکانمان. تازە پەیوەندیم بە باڵیۆزی ئۆکرانیا لە ئەمریکا کردەوە، ئەو کەسێکی تری لە شوێن دادەندرێت تا دڵنیا بین دوو وڵاتەکەمان لە یەکتری نزیک دەبنەوە. من دەمەوێت پەیوەندییەکی کەسیم لەگەڵ تۆدا هەبێت. پێت دەڵێم کە یەکێک لە یاریدەدەرەکانم تازە قسەی لەگەڵ جولیانی کردووە. ئەو گەشت بۆ ئۆکرانیا دەکات و ئێمە یەکتر دەبینین. باشترین خەڵک لە خۆم کۆدەکەمەوە. هاوەڵییە ستراتیژییەکەمان بەردەوام دەبێت. لێکۆڵینەوەکە بە کراوەیی بە ئاشکرا

ئەنجام دەدرێت. من وەک سەرۆکی ئۆکرانیا بەڵێنت پێ دەدەم".

ترەمپ گوتی: "تۆ داواکارییەکی گشتیی باشت هەبوو. بەڕێز جولیانی کەسێکی زۆر بەڕێزە. ئەگەر ئەو لەگەڵ داواکاریی گشتی پەیوەندیت پێوە بکات یان ئەگەر بتوانیت قسەی لەگەڵ بکەیت، ئەوە نایاب دەبێت. باڵیۆزی پێشووتان لە ئەمریکا ناپەسەند بوو، ئەو کەسانەشی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن بە هەمان شێوە کەسی ناپەسەند بوون. دەنگۆی زۆر هەیە لەسەر هەوڵی کوڕەکەی جۆو بایدن، کە ڕێگری لە لێکۆڵینەوەکان بکات [لە دژی ئەوانەی کار لەسەر دەستێوەردانەکانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا دەکەن]. ئەو لاف بەوە لێ دەدات کە بەدواداچوونەکانی وەستاندووە. ئەمە زۆر خراپە."

زێلێنسکی گوتی: "لەبەر ئەوەی ئێمە لە پەرلەمان زۆرینەی ڕەهامان هەیە، داواکاری گشتیی داهاتوو سەد لە سەد پاڵێوراوی من دەبێت. لە ئەیلوول دەستبەکار دەبێت. لێکۆڵینەوە لەبارەی کۆمپانیاکە دەکات. لێکۆڵینەوەکان ڕاستیی دەگەڕێننەوە. ئەگەر هەر زانیارییەکی زیاترت لەسەر بابەتەکە هەیە پێمانی بدەیت، تکایە بفەرموو. ئەوەشی پەیوەستە بە باڵیۆزی ئەمریکا لە ئۆکرانیا، یۆڤانۆڤیچ، دڵخۆشم کە. پێت ڕاگەیاندم ئەو کەسێکی خراپ بووە. من سەداسەد هاوڕام. هەڵسوکەوتی ئەو بەرامبەر بە من زۆر لە باش دوور بوو. ئەو منی وەک سەرۆک قبووڵ نەبوو".

ترەمپیش وەڵامی دایەوە: "ئەوە بە جولیانی و داواکاری گشتی بار دەڵێم. دڵنیام تۆش پرسەکەت بۆ دەردەکەوێت. بەختێکی باش بۆ هەموو شتێک. ئۆکرانیا وڵاتێکی مەزنە. من زۆر هاوڕێی ئۆکرانیم هەیە".

زێلێنسکیش گوتی ئەو زۆر هاوڕێی ئۆکرانی-ئەمریکیی هەیە، درێژەی بە قسەکانی دا: "سوپاس بۆ میواندارییەکەت لە واشنتۆن. من زۆر ڕژدم لە سەر دۆسیەکە. بواری پێشکەوتنی زۆر هەیە بۆ وڵاتەکانمان. ئێمە دەمانەوێت لە ڕووی وزەوە سەربەخۆ بین".

ترەمپ گوتی: "بە ویستی خۆت پەیوەندیمان پێوە بکە. دەگەینە ڕێککەوتنێکی بازرگانی".

ئینجا زێلێنسکی ترەمپی بۆ ئۆکرانیا داوەت کرد و تێبینیی ئەوەشی دا هەردووکیان لە یەکی ئەیلوول لە وارشۆ یەکتر دەبینن، لەو کاتەی بەشداریی هەشتایەمین ساڵیادی داگیرکردنی پۆڵەندا لەلایەن ئەڵمانیا دەکرێتەوە، کە بووە هۆکاری دەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی؛ زێلێنسکی پێشنیاری کرد کە دەشێ ترەمپ لەو کاتە سەردانی کیێڤ بکات، ترەمپیش بەڕێزەوە بێهیوای کرد لەو پێشنیارە.

بە بۆچوونی من، لێدوانەکانی پەیوەندییەکەی ٢٥ی تەمموز و ئەوانی تریش جێی زۆر تێڕامان بوون، بابەتەکە ئەوەندەی دەهێنا، ئەی چی ئەگەر شایانی لێپرسینەوە بن لە ترەمپ، تاوان بێت یان بە پێچەوانەوەش. کاتێک ساڵی ١٩٩٢ پاڵپشتیکارانی بوش (٤١ ەمین سەرۆک) پێشنیاریان بۆی کرد داوا لە حکوومەتە بیانییەکان بکات هاوکاری بکەن لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لە بانگەشە شکستخواردووەکەی بەرامبەر بە بیل کلێنتۆن، ئەو خۆی لەگەڵ بێیکەر بە تەواویی بیرۆکەکەیان ڕەت کردەوە. ترەمپ تەواو پێچەوانەی ئەمە مامەڵەی کرد.

هەفتەی دواتر وەزارەتەکانی دەرەوە و بەرگری فشاریان کرد بۆ گەیاندنی نزیکەی ٤٠٠ ملیۆن دۆلار وەک هاوکاری ئەمنی بۆ ئۆکرانیا و داوای کۆبوونەوەی ئاستی باڵایان کرد، لەو کاتەی ڕێکارە ڕۆتینییەکان ئەنجام دەدرێن. بەدڵنیاییەوە بیرۆکرات و نەریتییەکان نەیاندەزانی کە من و پۆمپەیۆ و ئێسپەر ماوەیەک بوو بە هێمنی تاوتوێی ئەو بابەتەمان دەکرد، هەوڵمان دەدا پارەکە خەرج بکرێت، بەڵام هەموو هەوڵەکانمان شکستیان هێنا. (لەو کاتەی من دەستم لە کار کێشایەوە، بە تاک و لەگەڵ ئەوانی تریش هەڵسەنگاندمان بۆ بۆ کرد و قسەمان لەگەڵ ترەمپ کرد کە ڕێگە بدات هاوکارییە داراییەکە بە ئۆکرانیا بگات.) ئەگەر بیرۆکراتەکان

بیانزانیایە لیژنەی بەڕێوەبەرەکانی کۆشکی سپی بۆچوونی ترەمپ دەگۆڕن، بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیو ئەوەندە گرنگییان بە بابەتەکە نەدەدا. بە تیم مۆریسۆنی جێگرەوەی فیۆنا هێلم گوت، وەزارەتەکانی دەرەوە و بەرگری کۆتایی بە گرنگیدانیان بە کۆبوونەوەکان بهێنن، بەڵام دەمویست پارەکە ئامادە بێت بۆ هەر کاتێک کە ترەمپ ڕەزامەندی دەربڕێت.

بۆ ئەوەی ئەمە ڕووبدات، پێویستی دەکرد ئێمە دەقەکان ئامادە بکەین تا دڵنیا بین هاریکارییە سەربازییەکان بەر لە کۆتایی مانگی ئەیلوول و کاتی ساڵی دارایی بگەن. بەهۆی تێپەڕینی کاتێکی زۆر و بەهۆی یاسا پەیوەستەکان بە پرۆژە بڕیارەکە کە چەتری ئەو هاریکارییانە بوو، چونکە ئەگەر تا ئەو کاتە نەتواندرایە کارەکە ئەنجام بدرێت، هاریکارییەکان هەڵدەوەشانەوە. بۆیە بیرۆکراسی دەسپێکی دەرکەوتنی ئاماژەی دروستبوونی کێشە بوو. بە دڵنیاییەوە ڕەنگە یەکێک بپرسێت بۆ کاریگەرییەکانی بیرۆکراسی ڕۆتین لە دەستپێکی ساڵی دارایی بە دەرنەکەوتن و چاوەڕێ کرا تا کۆتایی، کە ئەوەش بۆ ئەوە بوو لۆمەی کەسێکی تری پێ بکەن. ڕەنگە یەکێک بپرسێت بۆ بەم شێوەیە بوو؟! بەڵام بۆیە بیرۆکراسی بەو شێوەیەیە، هێواش، تا دواتر ئەگەر هەڵەیەک ڕوویدا لۆمەی ئەوانی تر بکەن.

لە ١ی ئاب قسەم لەگەڵ باڕ کرد و پێشم گوت ترەمپ چی لەبارەی جولیانی بە زێلێنسکی گوتووە، بێجگە لە ئاماژەدانی ترەمپ لەسەر باڕ خۆی. پێشنیاری کرد کەسێکی هەبێت بۆ چاودێری جولیانی بەرلەوەی جولیانی بە تەواوی لە دەسەڵات دەربچێت. ئێمە باسی هالك بانکیشمان کرد بێجگە لە پرسی هەڵپەسێردراوی سزا خستنە سەر تورکیا بە هۆی کڕینی سیستەمی بەرگری مووشەکی ڕووسی ئێس ٤٠٠. باڕ گوتی چاوەڕوان دەکات لە لایەن ئەنجوومەنی هالك بانکەوە پەیوەندیی پێوە بکرێتەوە لە سەر دوایین چارەسەری پێشنیارکراوی وەزارەتی داد. (لە ١٥

ی تشرینی یەکەم، دوای ئەوەی ئیدارەی ترەمپم بەجێ هێشت، وەزارەتی داد لیستێک تۆمەتی توندی تازەی لە دژی هاللك بانك لە نیویۆرك ڕاگەیاند، وەزارەتی داد پێی وابوو دوایین پێشنیارەکانی پارێزەری بنکەکەی بە نەگونجاو لەقەڵەم دابوو).

من و ئێسپەر و پۆمپەیۆ لەسەر ئاڵوگۆڕی بیروڕا بەردەوام بووین تا بزانین چۆن ترەمپ قایل بکەین هاوکارییە ئەمنییەکان بەر لە ٣٠ی ئەیلوول بە ئۆکرانییەکان بگەن. دەمانتوانی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ترەمپ ببینەوە و بیرۆکەکانی جولیانی ڕەت بکەینەوە و پێی بڵێین کە ڕێگەپێدراو نییە بەرژەوەندیی ئەمریکا و دەسەڵاتەکەی بۆ بەرژەوەندیی سیاسیی کەسی خۆی بەکاربێنێ. دەمانتوانی هەوڵ بدەین و دەشکرا بە دڵنیاییەوە لەو هەوڵە شکست بهێنین، یانیش دەکرا بۆشاییەک یان چەند بۆشاییەک لە نێوان گەورە ڕاوێژکارەکانی ترەمپ دروست بکەین. کردارە دروستەکە ئەوە بوو پرسی هاریکاریی سەربازی ئۆکرانیا لە خەیاڵەکان (خەیاڵەکانی جولیانی) جیا بکەینەوە و ئەو هاریکارییە سەربازییانە پەسەند بکەین و دواتر مامەڵە لەگەڵ خەیاڵەکانی جولیانی بکەین. لە ڕاستیدا پێم وابوو بەیەکەوە لەگەڵ نووسینگەی ئەنجوومەنی کۆشکی سپی و بە تایبەتیش لەگەڵ بیل بارِ دووەم ئەگەرم بەکارهێنا. لە هەمان کات هیچ پێویستی نەدەکرد کێشەیەکی بێبەرهەم لە ئاستی خوارەوەی بیرۆکراسییەکە دروست بکەین. هیچ کام لەمانە کاریگەری لەسەر بڕیاردانی ترەمپ نەدەبوو و تەنیا دەبووە هۆکاری چیرۆکی ڕۆژنامەوانی و واشی دەکرد ترەمپ زیاتر لە دژی هاریکارییەکان بوەستێتەوە. ئەمە بە لایەنی کەم هەڵسەنگاندنی من بوو بۆ ئەو کات، باوەڕم. وابوو هەڵسەنگاندنێک بوو هەریەکە لە پۆمپەیۆ و ئێسپەر لەگەڵی کۆک بوون.

کاریگەرییە کەڵەکەبووەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی کاتەکەمان (هاوکارییە سەربازییەکان) بە هەند وەردەگرت، لە هەمان کات لەوەش

تێدەگەیشتین کە توانانی مامەڵەکردنمان سنووردار بوو، بە تایبەتی بەهۆی کێشەی باسنەکراو و ڕەگوڕیشەی بیردۆزە پیلانگێڕییەکانی (جولیانی) پەیوەست بە هەڵبژاردنەکانی ۲۰۱٦ و ۲۰۲۰. ئێمە هەمووومان دەمانزانی بیرکردنەوەی ترەمپ چۆنە، ئەوەش وای کرد بیر بکەینەوە کە پرسەکە تەواو هەستیارە و گرنگە ترەمپ لە کاتی گونجاو بڕیاری لێ بدات. لەبەرچاونەگرتنی گونجاویی کاتەکە وای دەکرد هاریکارییەکان بە تەواوی لەبار بچن. بۆیە، کاتێک لە هەینی ۱٦ی ئاب لە بێدمینستەر، لە گفتوگۆکان لەسەر ئەفغانستان ترەمپ کێشەی ئۆکرانیای وروژاند، دەیپرسی چەند پارە لە ئۆکرانیا خەرج دەکەین؟! ترسم هەبوو کە بەهۆی گەرمیی مشتومڕی پرسی ئەفغانستان، هاریکارییەکانی ئۆکرانیا تاهەتایە لەناو بچن.

ئێسپەر بە وەڵامێک لەسەر دۆسیەکە تووشی سەرسوڕمانی کردم، چونکە پێشبینیم نەدەکرد و پێی گوتم کە ڕەس ڤۆت بەڕێوەبەری نووسینگەی بەڕێوەبردن و بودجە هەوڵەکانی "وەستاندووە"، مەبەستی لەو هەوڵانە بوو کە کە ڕێگرییان لە گەیشتنی هاریکارییەکان دەکرد. ئەمە دەریدەخست کە بڕیاری لەبارەوە دراوە و بڕیاری دیکەی پێویست نەدەکرد، کە بێگومان من باوەڕم نەدەکرد. بە خۆشبەختییەوە، ئۆکرانیا خزایە نێو کفتوگۆ لەگەڵ ترەمپ بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی زیاد ڕوو بدات.

ئەو کات ڕۆڵی نووسینگەی بەڕێوەبردن و بودجە تەواو لە وێنەکە بەدەر کەوت، ئەگەر ئەوە بۆ هۆکاری پەیوەست بە بودجەش بوویێت، بەڵام ئێمە گومانمان لە شتێکی تر دەکرد، ئەگەری زیاتر بوو ترەمپ مولڤانێی بەکارهێنا بێت بۆ دانانی خاڵێک لەبەردەم هەر هەوڵێکی وەزارەتەکانی دەرەوە و بەرگری، بۆ پێدانی ئەو جۆرە هاوکارییانەی ئەوان بە تایبەت چاودێرییان دەکرد. نووسینگەی بەڕێوەبردن و بودجە لە هەمان کاتدا هەوڵی ئەوەشی دەدا بڕی چوار ملیار دۆلار لە هاریکاریی ئابووریی

بیانییەکان پووچەڵ بکاتەوە (کە تەنیا کاریگەری لەسەر وەزارەتی دەرەوە هەبوو، نەک پێنتاگۆن؛ وەزارەتی بەرگری) کە بۆ ڕاهێنانی ساڵانە خەرج دەکرا. لە ٢٠١٨ داڕێژەرانی بودجە پاشەکشەیان لەوە کرد، نەك لەبەر زۆری، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو هەنگاوە کێشە و مقۆمقۆی لە کۆنگرێس لێ دەکەوتەوە، ئەگەر ترەمپ بڕیاری بدابا هاوکارییەکان بوەستێندرێن. دواتر مولڤانێی و ئەوانی تر دەیانگوت ناکۆکی لەسەر هاریکاریی سەربازی بۆ ئۆکرانیا پەیوەست بووە بە هەوڵی ڕاگرتنی هاریکارییە ئابوورییەکان، بەڵام ئەمە تەنیا لەقاڵبدانی لۆژیکێک بوو بۆ ڕووداوەکانی ڕابردوو.

کات بەسەر دەچوو و منیش پێشنیارم بۆ پۆمپەیۆ و ئێسپەر کرد جارێکی تر ترەمپ ببینم تا بزانم مەیلی چۆنە ئینجا ئێمە هەرسێکمان هاریکاریی یەکتر بکەین لە خشتەی کار و ئەجێنداکانمان تا بەیەکەوە قسەی لەگەڵ بکەین، کە لەگەڵم هاوڕا بوون. بەیانیی دواتر، ٢٠ی ئاب، بۆچوونی ترەمپم لەسەر ئاسایشی ئۆکرانیا وەرگرت، ئەویش گوتی کە پاڵپشتی لە ناردنی هاریکارییەکان ناکات تا تەواوی بەڵگەکانی لێکۆڵینەوە پەیوەستەکان بە ڕووسیا و کلینتۆن و بایدنیان پێ نەدرێن. ئەوە چەند ساڵێکی دەخایاند، بەو شێوەیەش نەدەبوو کە هیچ ئاماژەیەکی ئەرێنی ڕووی بدایە لە کاتێکدا ئەو هاریکارییانە هەر دەگەیشتن. سەرەڕای ئەوەش، کات دەڕۆیشت و گوتم من و پۆمپەیۆ و ئێسپەر پێمان باشە بۆ قسەکردن لەسەر کێشەکان لە کۆتایی هەفتە ترەمپ ببینین، ئەویش ڕەزامەندی نیشان دابوو. بەهۆی جیاوازی خشتەی کارەکانمان و لەبەر ئەوەی من هەینی ڕووم کردە بیاریتز بۆ بەشداریکردن لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی حەوت، لە ٢٣ی مانگ کووپەرمان لە شوێنی من لەگەڵ پۆمپەیۆ و ئێسپەر لەگەڵ ترەمپ لەسەر ئۆکرانیا کۆبوونەوە. بەداخەوە، لەو کۆبوونەوەیە بوو کە ترەمپ بڕیاری دا لە بەرامبەر

خستنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی تری ئاراستەکراومان لە لایەن حوسییەکانەوە، هیچ شتێك ئەنجام نەدات، کە ئێران پاڵپشتی دەکردن. ترەمپ گوتبووی: "بهێڵن بۆ دوو ڕۆژ بیرێکی لێ بکەمەوە. من لەگەڵ ئەوانی تر لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی حەوت قسە دەکەم". ئێسپەریش بەشداریی کۆبوونەوەی وەزیرانی بەرگریی وڵاتانی ئەندامی ناتۆ دەبوو، گوتی کە فشار دەخاتە سەر وڵاتانی تر پارەی زیاتر لەپێناو ئۆکرانیا خەرج بکەن کە هاوکار دەبێت بۆ وڵاتەکە. دەکرا بارودۆخەکە خراپتریش بووایە، بەڵام کاتیشمان زیاتر لەدەست دەچوو.

لە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی حەوت دەردەکەوت کە فەڕەنسا و ئەڵمانیا گەشبین بن بەوەی پوتین هەنگاو بەرەو کەمکردنەوەی گرژییەکان لەگەڵ ئۆکرانیا بهاوێژێت، ئەوەش بە گۆڕینەوەیان بە تاقم و کەشتییە نەوتەکەی ڕووسیا کە لە کانوونی یەکەم لە ئۆکرانیا دەستی بەسەردا گیرابوو. لووتکەی بیاریتز پڕ بوو لە دژیەکی و نیمچەشکست لەسەر ئێران، بێجگە لەوەش ڕۆڵی ئۆکرانیاش لەو لووتکەیە زۆر بچووک بوو (زۆربەی وڵاتانی ئەندامی کۆمەڵەی حەوتیش دژی داوەتکردنی ڕووسیا بوون لە لووتکەکەی ٢٠٢٠، کە ئەمریکا میوانداری دەکرد). دوای بیاریتز، لەو کاتەی کە نزیک ببوومەوە لە دەستلەکارکێشانەوە، ڕووم کردە کییڤ بەتایبەت بۆ چاوپێکەوتنی زێلێنسکی و ئینجاش تیمە نزیکەکەی. دەمویست دڵنیابم کۆبوونەوە داهاتووەکەی نێوان ترەمپ-زێلێنسکی، کە لە وارشۆ بەڕێوەدەچوو و نەدەکرا ئەنجام نەدرێت، سەرکەوتوو بێت. گەشتە ئاسمانییەکەم بۆ کییڤ لە ٢٦ی ئاب بوو، دوو ڕۆژ پێشووتر لەگەڵ ڤۆلکەر قسەم لەسەر ڕۆژی سەربەخۆیی ئۆکرانیا کرد، ئەویش پێی گوتم کە زێلێنسکی باش بەڕێوەی بردبوو. ڤۆلکەر جەختی لەوە کردەوە کە زێلێنسکی نایەوێ لە کێشەی سیاسی نێوەخۆی ئەمریکاوە تێوە بگلێت، هەرچەندە دڵخۆش بووە بەرامبەر لێکۆڵینەوە لەسەر هەرچییەك کە لە ساڵی

٢٠١٦ ڕوویدابێت، واتا بەر لە دەستبەکاربوونی خۆی.

لە کیێڤ جارێکی دیکە چاوم بە دانیلیوک کەوت، کە لەگەڵ بەرپرسانی تر بیڵ تێیلەر و چەند بەرپرسێکی دیکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی بوون بۆ قسەکردنی تێروتەسەل لەسەر ئەوەی کە دەبێت ئەنجوومەنی ئاسایشی ئۆکرانیا چۆن کار بکات، ئەمە بێجگە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووسیا لە کرایمیا و دۆنباس. دواتر من و تێیلەر تاجە گوڵینەمان لەسەر یادگاریی ١٣ هەزار کوژراوی ئۆکرانیا دانا، کە لە شەڕی بەردەوام لەگەڵ ڕووسیا کوژرابوون. ڕۆژی دواتر، نانی بەیانیان لەگەڵ ئیڤان ڤاکانۆڤ خوارد، ئەو کات سەرپەرشتیاری کاتیی هەواڵگری ئۆکرانی بوو و چەند ڕۆژێک دواتریش زاراوەی "کاتی" لەبەردەم ناوەکەی سڕایەوە (بەرپرسیارێتییەکەی بە تەواوی پێ درا). ڤاکانۆڤ بەرپرسی چاکسازی بوو لە نێو هەواڵگریی ئۆکرانیا، کارێکی ناوازە، باڵیۆزخانەکەشمان پێی وابوو کە ناوبراو کەسێکی شیاوە بۆ بەرپرسیارێتییەکە. هاوشێوەی کۆبوونەوەم لەگەڵ دانیلیوک، لەگەڵ ئەمیش زۆربەی لەسەر مۆتۆر سیچ و ئەنتۆنۆڤ بوو، کە دوو کۆمپانیای بۆشاییگەری بوون خەریک بوو دەکەوتنە ژێر ڕکێفی کۆمپانیا چینییەکان (یان بیانییەکان)ەوە، ئەمەش ئەستەمی دەکرد ئەمریکا هاوئاهەنگییان لەگەڵدا بکات. ئەو کۆمپانیایانە و چەندانی دیکە میراتی سەردەمی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو بوون، کە لە لایەن پلاندارێژەرە کۆمۆنیستەکان بۆ ئامانجێکی دیاریکراو کرابوونەوە، بەڵام بۆ ئۆکرانیای سەربەخۆ بوونە پاڵپشتییەکی باش کە نەیدەویست لەدەستی دەربچن. ئێستاش بەرژەوەندییەکی ستراتیژی هەبوو دەبووایە لەپێشینەی گرنگیپێدانی داڕێژەرانی بڕیاری ئەمریکا بان.

دواتر کۆبوونەوە لەگەڵ وەزیری دەستنیشانکراوی بەرگری، ئەندری زاگۆرۆدنیوک بوو، کە ئەویش ڕژد بوو لە ئەنجامدانی چاکسازی لە

سوپاسی ئۆکرانیا، لە سەروبەندی کێشە سەربازییە بەردەوامەکانی لەگەڵ ڕووسیا و هێزەکانی تر کە ڕووسیا لە دۆنباس پاڵپشتی دەکردن.

ئەو پێی باش بوو هاریکارییە ئەمریکییەکان، کە بڕیار بوو پێیان بدرێت، تەنیا لەلایەنی کڕینی چەك نەبێت، بەڵکو لە پەرەدان بە توانستە دامەزراوییەکانی کەرتی سەربازیش بێت. بە ئەنجامدانی ئەوەش پێشبینی دەکرد کاریگەریی هاریکارییەکان لە داهاتوودا زیاتر بکات لەوەی هەیە. (لە کۆتایی ڕۆژەکە چاوم بە ژەنەڕاڵ ڕوسلان خۆمچاک کەوت، کە فەرماندەی فەرماندەیی سەربازیی ئۆکرانیا بوو، بە درێژیی تاوتوێی کێشەی دۆنباس و کرایمیامان کرد. خۆمچاک پاڵپشتیکارێکی تامەزرۆی هاریکارییە سەربازییە ئەمریکییەکان بوو: ئەو جەختی لە پێویستی گۆڕانکاری کردەوە لە فەرهەنگی سەربازی وڵاتەکە، لەو نێوانەش پەرەدان بە ڕاهێنانی زمانەوانیی ئینگلیزی و ڕاهێنانەکانی تر تا بە تەواوی لە کاریگەرییەکانی مۆسکۆ داببڕێن، هەروەها ئەو زۆر نیگەرانی هەوڵەکانی ڕووسیا بوو بۆ پەرەدان بە بلۆکێکی سەربازی لە هەرێمەکە، کە مەترسی سەرەکی دەبێت بۆ سەر پۆڵەندا و ئۆکرانیا. ئەمانە بابەتی ڕژد بوون من پێم وابوو هەریەکە لە زاگۆرۆدنیوک و خۆمچاک بە ڕژدی وەریان دەگرت).

دواتر بە ئۆتۆمبێل بەرەو باڵەخانەی بەڕێوەبردنی سەرۆکایەتی بەڕێ کەوتین بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ بەڕێوەبەری کاروباری ئیدارەکەی زێلێنسکی، ئەندرێی بوهدان و یەکێک لە جێگرەکانی ڕوسلان ڕیابۆشاپکا. بوهدان پارێزەری ژیانی تایبەتی زێلێنکسی بووە و نوێنەرایەتی سەرمایەدار "ئیگۆر کۆلۆمۆیسکی"شی دەکرد. درک بە گرژییەکی ڕوون لە نێوان بوهدان و دانیلیوک دەکرا، کە دواتر هاتە نێو کۆبوونەوکە، ئەمە ئاماژەی پێشوەختەی دەستلەکارکێشانەوەی دانیلیوک بوو، کە دواتر لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوول دەستی لە کار کێشایەوە. بەهاتنی دانیلیوک ئەوانی تریشی هاتنە نێو کۆبوونەوەکە، کە پێکهاتبوون لە: ئیڤان باکانۆڤ، ڤادیم

پریستایکۆ (ناوزەدکراوی وەزیری دەرەوە) و ئایڤاراس ئەبراماڤیوس (سەرۆکی کۆمپانیای نیشتیمانی کە کۆمپانیاکانی بازرگانیی کەلوپەلی بەرگری لەژێر دەسەڵات بوو، لەوانەش کۆمپانیاکانی سیچ و ئەنتۆنۆڤ). بوهدان جەختی لەوە کردەوە کە ئۆکرانیا بۆ چاکسازی لە بەرنامەی بەرگری پشت بە ئەمریکا دەبەستێت. هەرچەندە زێلێنسکی زۆرینەی لە ڕادا (پەرلەمان) هەبوو، بەڵام زۆربەی پەرلەمانتاران و بازنە بچووکەکەی دەوروبەری خۆشی و چەندین کەسایەتی سیاسیش لە نێو پارتەکەی، هیچ ئەزموونێکی نێو حکوومەتیان نەبوو. کابینەکە لەسەر بنچینەی شارەزایی هونەریی هەڵبژێردرابوون و لە پارتەکانی تریش، بێجگە لە بوونی ژمارەیەک کەسی سیاسی ئەزمووندار (لە دەرەوەی حکوومەتەکانی ڕابردوو) لەوانەش پریستایکۆ، کە ئەو کات باڵیۆزی ئۆکرانیا بوو لە ناتۆ و دەیویست خۆی بسەلمێنێت.

تاوتوێی پرسگەلێکی زۆرمان کرد و تەنیا لەگەڵ پریستایکۆ بۆ ماوەی ٤٥ خولەک قسەمان کرد. جێی سەرنج بوو، ئۆکرانیا لەتەک نووسینگەی یاسایی دەوڵەت پێیان وابوو کشانەوە لە ڕێککەوتنی نێودەوڵەتی بۆ مووشەکی مەودا مامناوەند، واتای ئەوە دەبەخشێت ڕێککەوتنەکە بە تەواویی بەسەرچووە.

بەو پێیە، ئۆکرانیا وەک میراتگرێکی یەکێتیی سۆڤیەت کە دەکاتە لایەنێکی پەیوەستی ڕێککەوتنە مووشەکییەکە، ئازادە پەرە بە سیستەمە مووشەکییەکانی خۆی بدات. بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی لەخۆگرتنەکەی کرایمیا لە لایەن ڕووسیا و دەستبەسەرداگرتنی دۆنباس، ئەمە بابەتێکی بچووک نەبوو بۆ ئۆکرانیا و ئەورووپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش. ئەگەر وڵاتە ئەورووپییەکانی ڕۆژئاوا هەر چۆنێک لە بابەتەکە گەیشتبن، ئۆکرانیا و وڵاتانی تری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بیرۆکەی خۆیانیان هەبوو لەسەر چۆنییەتی وەڵامدانەوەی هەڕەشەی توانستی مووشەکە مامناوەندییەکانی ڕووسیا.

کاتێك کۆبوونەوە فراوانەکە کۆتایی هات و بەر لە کۆبوونەوەم لەگەڵ پریستایکۆ، ڕیابۆشاپکام جیا کردەوە لایەک بۆ قسەکردنێکی دووقۆڵی. ئەو لە کۆبوونەوەکەدا زۆر قسەی نەکردبوو، هیواخواز بووم ئەمە بەهۆی پابەندی و ڕێزەوە بووبێت. لە ماوەیەکی نزیک ڕیابۆشاپکا دەبووە هاوتای داواکاری گشتیی ئەمریکا لە کابینەکەی زێلێنسکی، ئەو بەهێزترین پاڵێوراو بوو لە کابینەکە مامەڵە لەگەڵ بیردۆزە پیلانگێڕییەکانی جولیانی بکات، لە هەمان کات ئەو هەر هەمان لێپرسراوە ئۆکرانییە دەبوو کە دەبوو بیل بار مامەڵەی لەگەڵ بکات لە پرسی یاسایی حکوومەت-بەرامبەر-حکوومەت. لەم ساتەوەختە یەکەمین قسەی پەیوەست بە جۆلیانم لە ئۆکرانیا کرد، قسەکردنێکی دوولایەنەی کورتخایەن. تکام لە ڕیابۆشاپکا کرد هەر کە دەستبەرکار بوو، ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ "بار" وەزارەتی داد بکات، وەک باشترین ڕێگە بۆ جیاکردنەوەی خەیاڵ لە ڕاستی. من ناوی "ڕودی جولیانی"م نەهێنا، ویستم بە نەدرکاندنی ناوەکە مەبەستەکە زیاتر بگات، کاتیش هەموو شتێک ئاشکرا دەکات.

کۆبوونەوەکە لەگەڵ زێلێنسکی لە کاتژمێر ١٢:٣٠ خولەك دەستی پێ کرد و تا کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆی خایاند. لە لایەنی ئۆکرانیا هەموو ئەوانە بوون کە لە کۆبوونەوەکانی تر بەشدار بوون. لە لایەنی ئەمریکیش، بیل تێیلەر و کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و هەندێک بەرپرسی باڵیۆزخانە بەشدار بوون. زێلێنسکی بە درێژایی کۆبوونەوەکە ناوازە دەردەکەوت، تەواو ئاگادار و باڵادەست بەسەر کێشەکان. سوپاسی ئێمەی کرد بۆ بەردەوامی سزاکانی پەیوەست بە کرایمیا و دانەنانمان بە سەروەریی ڕووسیا بەسەر خاکەکە. بیرم دەکردەوە: ئای ئەگەر دەیزانی خەریکە چەند بە ئاسان ئەمە هەمووی وەلا دەنێین!! تاوتوێی کرایمیا و دۆنباسمان کرد، کە دۆسیەکەی زۆر لە هەوڵە ئاشتییە شکستخواردووەکەی نۆرماندی دەچوو، زێلێنسکی خۆی دەیویست ئەمریکا و بەریتانیا چالاکتر

بن لە چارەسەرکردنی قەیرانی ڕووسی-ئۆکرانی. تایبەت بە کێشە نێوەخۆییەکان، زێلێنسکی گوتی جەنگی دژی گەندەڵی، کە هەڵمەتی بانگەشەی سەرۆکایەتییەکەی بووە، لە پێشینەی کارەکانی دەبێت. لیستەکەی زێلێنسکی، "پارتی خزمەتکارانی خەڵک" کە لە ناونیشانی بەرنامە تەلەڤزیۆنییەکەی وەرگیرابوو، ٢٥٤ ئەندام پەرلەمانی هەبوو، گوتی لە کۆبوونەوەی دەسپێکی تازەی پەرلەمان ٢٥٤ پرۆژە بڕیاری چاکسازی پێشکەش دەکەن، واتا هەر ئەندامێك و پرۆژەیەک لە هەر شوێنێکدا، زێلێنسکی جەختی لەوە کردەوە، کاتی بەڵێنەکان کۆتایی هاتووە و ئێستا کاتی جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی کاتی بانگەشەیە. گوتیشی کە ئەو کێشەیەی هانی دا پەیوەندی بە پوتینەوە بکات ئازادکردنی دەریاوانە ئۆکرانییەکان بوو. ئەو ڕژد بوو لەسەر گەڕاندنەوەی دۆنباس و کۆتاییهێنان بەو گژی و ناکۆکییانەی پەیوەست بە ڕێککەوتنی مینسک. زێلێنسکی بۆچوونێکی زۆر تایبەتی بۆ ئاگر بەست هەبوو، پلانەکە کاراکردنی ئاگربەست بوو لە شارۆچکەیەک ئینجا فراوانکردنی. ئەو مەبەستی هیچ یارییەکی دیپلۆماسی نەبوو، بەڵام دەشیگوت ئۆکرانیا چاوەڕوانی هەنگاوی هاوشێوە و پێویست دەبێت لە ڕووسیا، ئەو دەیویست ئەو کێشەیە چارەسەر بکات و چەند ساڵێکیش درێژە بکێشێت. هەروەها، ئێمە تاوتوێی ئەگەری کێشەی گەڕانەوەی دۆنباسمان کرد بەبێ گەڕانەوەی کرایمیا. هیچ لایەنێک بە ئەمریکاشەوە سەری لەم کێشەیە دەرنەدەکرد، بەڵام زێلێنسکی جەختی لەوە دەکردەوە کە ڕۆژئاوا و تەواوی جیهان سزاکانی پەیوەست بە کرایمیا لەسەر ڕووسیا بهێڵنەوە، نەک تەنیا جەنگی دۆنباس کۆتا پێ بهێنێت. دوای قسەکردن لەسەر بێلاڕووس و مۆلدۆڤیا و کێشە تایبەتەکانی خۆیان لەگەڵ ڕووسیا و کێشەی گەندەڵی، کۆتاییمان بە کۆبوونەوەکە هێنا. هیچ گفتوگۆیەک لەسەر هیلاری، جۆو بایدن و لە بەرژەوەندیی بابەتەکانی جولیانی نەکرا. ئەگەر ئەم بابەتانە نیشانیان نەدابێت کرۆکی

بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بن، یانیش ئەو بابەتانەی لەگەڵ زێلێنسکی لە وارشۆ باسیان دەکات، ترەمپ ڕێگەیەکی بەدەر لەمەی نەدەزانی بۆ قسەکردن لەسەر دانوستانەکان.

بە متمانەوە "کیێف"م جێ هێشت، ئەگەر زێلێنسکی لە بارستایی ئەرکە قورسەکەی گەیشتبێت، چ لە ناوەخۆی یان لە دەرەوە، بە هەمان شێوە تیمەکەشی. ئەوە ئەمان ئەو کەسانە بوون کە ئێمە قسەمان لەگەڵ دەکردن، ئەگەر لە زۆنگاوی کێشەکان نوقم نەبین، ئەمە لە داهاتوودا دەردەکەوێت. تێیلەر کە لە هەموو کۆبوونەوەکانی من بەشدار بوو بێجگە لەو کۆبوونەوە ڕووبەڕووەی لەگەڵ ڕیابۆشاپکا؛ ئەو بەر لە بەڕێ کەوتنم بۆ فڕۆکەخانە قسەی لەگەڵ کردم، تا ڕاوێژم پێ بکات لەسەر چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕودی جولیانی. من لەو مەینەتییە تێدەگەیشتم، بۆیە داوام لێ کرد لە ڕێگەی "پەیوەندیی کەسی یەکەم" پەیامێک بۆ پۆمپەیۆ بنووسێت و ئەوەی دەیزانێت پێی بڵێت. "پەیوەندی کەسی یەکەم" دەگمەنن و پەیوەندی ڕاستەوخۆن لە بەرپرسی ئەرکێکی دیاریکراو بۆ وەزیری دەرەوە دەنێردرێت، ئەم جۆرە پەیوەندییە بۆ بارودۆخی زۆر دەرئاسا بەکاردەهێندرێن، کە ئەم بابەتەیان یەکێک بوو لەمان. بێجگە لەوەش، کاتی هاتبوو کە پۆمپەیۆ کاراتر لە بابەتەکە بەشدار بێت. گەواهییەکەی تێیلەر لە کۆنگرێس ئەوەی کردە یەکێک لە گرنگترین گەواهیدارەکانی کۆشکی سپی لە پرسی لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە لە ترەمپ.

لە ٢٩ی ئاب، لە درێژەی گەشتەکانم بە وڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، لە "کیێف"ەوە ڕووم کردە مۆلدۆڤا و بێلاڕووس. دەمویست نیشانی ڕووسیای بدەم گرنگی و چاودێرییەکی بەردەواممان لەسەر دەوروبەری هەیە و ڕێگەش نادەین ئەو وڵاتانە بە تەنیا ڕووبەڕووی مۆسکۆ ببنەوە. ئەگەر زیاتر لە کۆشکی سپی بمابامەوە پلانی تۆکمەترم هەبوو بۆ پەیوەندییەکانی وڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، بەڵام ئەوە ڕووی نەدا.

هەر لە مینسک، سەرەڕای تۆماری خراپی ئەلیکساندەر لۆکاشێنکۆ بۆ مافەکانی مرۆڤ، دەمویست بۆ ڕووسیای بسەلمێنم کە ئەمریکا ڕێگە نادات ڕووسیا وڵاتەکە قوت بدات، کە شتێک بوو پوتین بە ڕژدی کارەی لەسەر دەکرد. لایەنێکی دیکەی ستراتیژییەتەکەی من، کۆبوونەوە بوو لەگەڵ پۆلەندییەکان، کە لە وارشۆ ٣١ی ئاب بۆ کۆبوونەوەی ڕاوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەیی پۆڵەندا، بێلاڕووسیا، ئۆکرانیا و ئەمریکا ڕێك دەخرا. تا وابکەین کرێملین بۆ ماوەیەک بیر لەمە بکاتەوە.

بە دڵنیاییەوە من بیرم لە زیاتر لە کۆبوونەوەیەك دەکردەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە شتێک بوو ئاماژەی ئەوەی دەدا کە نە ئێمە و نە وڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشووش نابێت لە بەرامبەر دوژمنکارییەکانی ڕووسیا و هەڕەشەکانی بۆ سەر ئاسایشی نێوەخۆیی ئەوان بێدەنگ بین. زۆر شت هەبوو ئێمە لە ئاستی دیپلۆماسی و سەربازیش ئەنجامی بدەین. دوای دەستلەکارکێشانەوەم، وا دەردەکەوت کە ئیدارەکە بەو ئاراستەیە دەڕۆیشت.

لە ئاسمانی نێوان مینسک و وارشۆ، لەنێو فڕۆکە پەیوەندیم بە پۆمپەیۆ کرد تا پوختەی گەشتەکەمی پێ بڵێم بۆ ئۆکرانیا، مۆلدۆڤا و بێلاڕووس. بە تایبەت پشتم بەوە بەست کە تێیلەر بە وردی لە کێیڤ پێی گوتم؛ ئەو کاری تایبەتی جێ هێشتبوو بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کاتی وەک بەرپرس لە وڵاتێک بێتە ڕیزی حکوومەتەوە، کە تێیدا باڵیۆز بووە (ڕووداوێکی دەگمەن بوو، مەگەر لە ڕابردوو ڕوویدابێت)، چونکە بەردەوام و بە ڕژدی پاڵپشتی لە پەیوەندییەکی بەهێزی نێوان ئۆکرانیا و ئەمریکا دەکرد. پێی وانەبوو کە گونجاو بێت مامەڵەیەکی بێباکانە بەرامبەر ئۆکرانیا بگرینەبەر، ئاماژەی بەوەش کرد: "من پیاوی تۆ نیم لێرە". پۆمپەیۆ ئەوەشی پشتڕاست کردەوە، کە تێیلەر بە ڕاشکاوی و بەر لە وەرگرتنی بەرپرسیارێتییەکەی لە مانگی ئازار پێی گوتبوو، دوای ئەوەی یۆڤانۆڤیچ لادرابوو. من و

پۆمپەیۆش هیچ گومانمان نەبوو ئەگەر هاوکارییە سەربازییەکان نەگەن، دەستلەکارکێشانەوەی تێیلەر مسۆگەر بوو.

من پرسیم ئەگەر بکرێت بریارێکمان دەستکەوێت لەبارەی هاریکارییەکان بەر لەوەی ترەمپ ڕوو بکاتە وارشۆ؟! پۆمپەیۆ پێی وابوو ئەوە دەکرێت، گوتیشی کە دەرفەتێکی دیکەی هەیە لەنێو فڕۆکەی سەرۆکایەتی (هێلی ئاسمانیی ژمارە یەک) کە شەوی هەینی سێنت ئەندروزی بەرەو وارشۆ بەجێ دەهێشت و بەیانی شەممە دەگەیشت. کۆبوونەوەکەی زێلێنسکی بۆ بەیانی ڕۆژی یەکشەممە کاتی بۆ دیاریکرابوو، بۆیە بە لایەنی کەم هەندێ کات هەبوو بۆ قسەکردنیان بە تایبەت لە وارشۆ. سەرۆکی لیژنەی هێزە چەکدارەکانی کۆنگرێس، جیم ئینهۆف هەوڵی دەدا پەیوەندیم پێوە بکات، من و پۆمپەیۆش تاوتوێی چەند بژاردەیەکی کۆنگرێسمان دەکرد بەر لە بەسەرچوونی ماوەی پیویست بۆ تێپەڕاندنی هاریکارییەکان لە کۆنگرێس، لە دوامۆڵەتی ٣٠ی ئەیلوول. ڕەنگە دەرفەت هەبووایە بۆ دەستکەوتنی کاتی زیاتر، ئەمە لە کۆتایی ساڵی دارایی ئەستەم بوو، بەڵام بە شێوەیەکی تر ئەوە دەکرا، بەهۆی ئەو پاڵپشتیی دووپارتییەی لە کۆنگرێس بۆ هاریکاری ئاسایشی ئۆکرانیا هەبوو.

ئەو شەوە زانیمان بەهۆی زریانی دۆریان کە لە فلۆریدا هەڵی کردبوو، ترەمپ گەشت بۆ پۆڵەندا ناکات و لەبری ئەو پێنس دەچێت و تا بەیانی یەکشەممەش ناگاتە وارشۆ. پۆمپەیۆ و ئێسپەر هەردووکیان لە شاندی گەشتەکە هاتنە دەرەوە و خشتەی کاریش پەرتوبڵاو بوو و کێشەی تێکەوت، چونکە پێنس ٢٤ کاتژمێر درەنگتر لە کاتی دیاریکراو، کە بڕیار بوو ترەمپ بێت، دەگەیشتە وارشۆ. بە تایبەتیش دەبوایە ئێستا کۆبوونەوەکە لەگەڵ زێلێنسکی ڕاستەوخۆ دوای هەشتایەمین ساڵیادی هێرشی نازییەکان بۆ سەر پۆلەندا بووایە، نەک پێشووتر. ئەمە هەمووی دەکرا ئەنجام بدرێت، بەڵام وەک دیار بوو دیسان بڕیارەکەی ترەمپ

لەسەر هاریکارییە سەربازییەکان دەچنە دواوە. ئێستا کاتمان بەخێرایی لەدەست دەچوو.

٣٠ی ئاب، ئێوارەی هەینی بە کاتی وارشۆ، لە ڕێگەی کۆنگرەی ڤیدیۆیی بە بەشداریی ترەمپ و زۆربەی ئەوانی تر بەشداری کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بووم، لەسەر بارودۆخی ئەفغانستان. وەک وێنام کرد، گفتوگۆکان لەسەر ئەفغانستان زۆر کاتیان دەبرد، ترەمپ ژوورەکەی جێ دەهێشت و بەرلەوەی درکی پێ بکەم کۆبوونەوەکە هەڵدەوەشایەوە. منیش تەنیا بە ڕووی شاشە نیشاندەرەکە هاوارم دەکرد: "بوەستن، ئەی دەربارەی ئۆکرانیا چی؟!" هەموو گەڕانەوە و دانیشتن. ترەمپ گوتی: "من هیچ گرنگییەک بە ناتۆ نادەم. من ئامادەم بڵێم: "ئەگەر پارە نەدەن ئێمە ناتانپارێزین". من دەمەوێت ٣٠٠ ملیۆن دۆلارەکە [ئەو مەبەستی دوو ملیۆن و پێنج سەد هەزار دۆلارەکە بوو، بەشێک لە هاریکارییەکان کە بۆ ئۆکرانیا دیاریکرابوون] لە ڕێگەی ناتۆ بدرێت". بە دڵنیاییەوە هیچ کام لەمە لە ڕووی کردارییەوە نەدەکرا، ئەمە دەرخەری تێنەگەیشتنی ترەمپ بوو لەوەی ئەو هاریکارییانە چی بوون، ئەمەش هیچ شتێکی نوێ نەبوو. ئەو گوتی: "ئۆکرانیا دیوارێکە لە نێوان ئێمە و ڕووسیا". بە بۆچوونی من مەبەستی ئەوە بوو ئۆکرانیا دیوارێک بێت بۆ پەیوەندی نزیکتری واشنتۆن و ڕووسیا. دواتر بە پێنسی گوت: "پەیوەندی بە [سکرتێری گشتیی ناتۆ] "ستۆلتنبێرگ"ەوە بکە تا وابکات ناتۆ پارەکە بدات. بڵێ: "سەرۆکت لەگەڵە بەڵام دەبێت پارەکە لە ناتۆوە بێت". ئەمە دیسان هیچ لۆژیکی نەبوو. ترەمپ گوتی: "بوەستە تا کۆبوونەوەی ناتۆ لە کانوونی یەکەم". بە بۆچوونی من مەبەستی ترەمپ ئەوە بوو بڵێت ئێمە دەکشێینەوە.

ئەمە هەواڵێکی باش نەبوو، هەرچەندە کووپەرمان پیی ڕاگەیاندم کە سیناتۆر (ئەندامی ئەنجوومەنی پیران) ئینهۆف دوای کۆبوونەوەکەی

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەی بۆ ماوەی سی خولەک قسەی لەگەڵ کردووە پەیوەست بە پرسی هاریکارییە ئەمنییەکان. لە کۆتاییدا ترەمپ پێی گوتبوو: "پێنس پەیامەکەی من نەرمتر دەکات". هەرچییەکی مەبەست بوویێت. چەند ڕۆژێک دواتر، سیناتۆر ڕۆن جۆنسن بە منی گوت کە ئەویش قسەی لەگەڵ ترەمپ کردووە و لە ڕووی سیاسییەوە تێی گەیاند کە پاڵپشتی کۆنگرێس بۆ ئۆکرانیا نزیکە لە تێکڕای دەنگەکان. ئەو دڵنیا نەببوو کە "ترەمپ"ی تێگەیاندبێت، بەڵام دەمزانی ژمارەی ئەو ئەندام کۆنگرێس و سیناتۆرانە بەخێرایی لە زیادبوون بوو کە دەیانویست پەیوەندی بە ترەمپەوە بکەن، یان لەگەڵی کۆ ببنەوە. دەکرێت سیاسەتێکی ئاشکرا و زەق بتوانێت کاریگەریی زیاتری لە پاساوە بابەتییەکان لەسەر ترەمپ هەبێت. هەرچۆنێک بێت کۆبوونەوەکان بەبێ بڕیاری کۆتایی بەکۆتا هاتن.

شەوی یەکشەممە، لەو کاتەی دەچووینە وارشۆ، پێنس پەیوەندی پێوە کردم بۆ قسەکردن لەسەر ترەمپ: "پێم وابوو لەوم بیستبوو بڵێت کە دەیزانی کۆتایی ساڵی داراییە و هیچ زانیارییەکی پشێوەختە نەبووە کە ئێمە بمانەوێت پارەکە [لە ئۆکرانیا] ببڕین، بەڵام ئەو نیگەرانی ئەوەیە کە ڕژدی لەو بارەیەوە هەیە. پێم وابێت بایی ئەوەندە سەرۆک دەناسم کە بێت و بڵێت، "با ئەوە ئەنجام بدەین، بەڵام وابکە هاوپەیمانەکانمان لە داهاتوو زیاتر ئەنجام بدەن". هیواخواز بووم ئەمە ئەو پەیامە بێت کە لە وارشۆ هەوڵی گەیاندنی بدات. بەڵام هیچ کام لە ئێمە هێشتاوە لەوبارەیەوە هیچمان نەدەزانی. لە بەیانیی یەکشەممە پێنس گەیشتە وارشۆ، کەمێک پێش کاتی دیاریکراو و تەواو بەر لە کاتژمێر ۱۰:۰۰ی بەیانی بوو. ئەوەی جێی سەرسوڕمانی من بوو سۆندلاند بە فڕۆکەی سەرۆکایەتی ژمارە دوو گەشتەکەی ئەنجام دابوو، توانیبووی بەشدار بێت لەو زانیاری ئاڵوگۆڕنکردنەی کارمەندانی جێگری سەرۆک ڕێکیان خستبوو، ئەمە

سەرەڕای ئەوەی هەوڵی دوورخستنەوەی دەدرا. سۆندلاند دواتر گەواهی ئەوەی دا کە: "لە دوایین خولەک داوەت کرا" بوو.

ئەو بە خۆی خۆی داوەت کردبوو، سەرەڕای ئەوەی کارمەندەکانی جێگری سەرۆک ویستبوویان دووری بخەنەوە. لە ئاڵوگۆڕێ زانیارییەکان، من زۆر بە کورتی پوختەی گەشتەکانم بۆ سێ وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکەی ئەوروپا بە پێنس گوت، بە تایبەت کۆبوونەوەم لەگەڵ زێلێنسکی و ئۆکرانییەکان لە کییڤ. سەرەنجام، لە گەواهیدانەکەی سۆندلاند گوتبووی لە هەمان کۆبوونەوە هاریکارییەکان بەسترابوونەوە بە لێکۆڵینەوەکان کە ترەمپ و جولیانی ویستبوویان و ئەو سەرنجەشی لە لایەن پێنس "لەوکات تێبینیکراوە". بە بیرم نایەت سۆندلان هیچی لەو کۆبوونەوە دیاریکراوەدا گوتبێت.

کات ئەوەندەی نەمابوو بەر لەوەی چوارڕیانی پیلسوودسکی جێ بهێڵین کە شوێنی مەراسیمەکە بوو، ئەو شوێنەی "پاپا جۆنی دووەم" ساڵی ١٩٧٩ نزای تێدا کرد، کە بە باوەڕی پۆڵەندییەکان بووە دەسپێکی کۆتایی شەڕی سارد. تا کاتژمێر ٢:٣٠ی خولەک نەگەڕاینەوە هۆتێل، تەواو لە خشتەی کاتەکانمان لەدواوە بووین، ئەوەش بەهۆی ئەو ڕێکارانەی بەشداری سەرکردە نیشتیمانییەکان کە ئامادە ببوون. لە دەرفەتێکی تر بۆ زانیاریپێدانی پێنس و بەبێ ئامادەبوونی سۆندلاند، ڕوونم کردەوە کە دەبێت کۆبوونەوەکەی زێلێنسکی جێ بهێڵم (کە لە ٣:٣٠ خولەک دەستی پێ دەکرد، دوای یەک کاتژمێر لە کاتی خۆی) بەڵام لە کاتژمێر ٣:٤٥ خولەک زووتر نا. من و پێنس گرنگیمان بە کێشەی هاوکاریی ئەمنی دا، ئەویش دانی بەوە نا کە هێشتا وەڵامێکی باشمان نەبوو بە زێلێنسکی بدەین. کە زێلێنسکی گەیشت، تاقمی ڕاگەیاندنەکان ئەو ناوەیان تەنی و دەستیان بە پرسیارکردن کرد لەسەر بابەتەکە، "پێنس"یش بەپێی توانا هەوڵی خۆدزینەوەی لێیان دەدا. ڕاگەیاندنەکان ڕۆیشتن و منیش بۆ ئەوەی

فڕۆکەکەم لە فڕۆکەخانە جەنجاڵەکەی وارشۆ لە فڕین دوانەکەوێت، ڕاستەوخۆ ڕۆیشتم. دواتر مۆریسۆن پەیوەندیی پێوە کردم و لەوم بیست کە زێلێنسکی ڕاستەوخۆ دوای ڕۆیشتنی ڕاگەیاندنەکان چووبووە سەر بابەتی ئەمن و ئاسایش. پێنس ئەمەی زۆر بە دڵ ببوو، بەڵام نەدەکرا بەردەستنەبوونی وەڵامی "بەڵێ، بە دڵنیاییەوە [هاوکارییەکان] دەگەن". بشاردرێتەوە و ئاشکرا بوو. بە دڵخۆشییەوە، لە کۆبوونەوەکەی زێلێنسکیدا، سۆندلاند کێشەکانی جولیانی باس نەکردبوو بەو شێوەیەی فشاری لە ئێمە دەکرد، ئەو کارە ئەنجام بدەین. سەرەڕای ئەمەش، دواتر، مۆریسۆن گوتی سۆندلاند یەکێک لە ڕاوێژکارەکانی زێلێنسکی، کە ئەندری یێرماک بووە، جیاکردبووەوە؛ ئەو کەسەی بەرپرسی دۆسیەی "کاروباری ئەمریکا" بوو کە پێشووتریش چاوی بە جولیانی کەوتبوو.

مۆریسۆن بەتەواوی ئاگادار نەبوو سۆندلاند و یێرماک چییان تاوتوێ کردووە، بەڵام من گومانم هەبوو کە پەیوەست بووبێت بە کرایمیا و دۆنباس، ئەمە بێجگە لەوەی ئاماژەی نەمانی ڕێککەوتنی مووشەکی ماوەمامناوەند لە ئارادابوو. لە گفتوگۆیەکی دواترماندا سۆندلاند پێی گوتم کە کێشەکانی جولیانی لەگەڵ یێرماک وروژاندبوو.

دوای ڕۆژە ئارامەکەی کرێکاران، بەمەبەستی تەواوکردنی کارەکان سێشەممەم لە کۆشکی سپی بەسەر برد. کاتێک هاسپێل و تیمی هەواڵگری بەر لە بینینی ترەمپ هاتنە لام، هاسپێل گوتی: "ناتوانیت دیسان ئەو کارە ئەنجام بدەیتەوە؟" منیش پرسیم: "چی؟" ئەو گوتی: "هەفتەیەک دووربکەوە". هەمووومان دەستمان بە پێکەنین کرد. لە ٤ی ئەیلوول لەگەڵ پێنس قسەم کرد، ئەو هێشتا لە ئەوروپا بوو، لە هەوارگەکانی ترەمپ بۆ یاریی گۆلف لە دوونبێگ لە ئێرلەندا، کە ببووە تازەترین ڕووداوی ئابڕووبەر. پێنس بە جۆرێك بە زێلێنسکی سەرسام ببوو کە بەم شێوەیە بۆ ترەمپی باس کردبوو: "پێشنیاری من و کۆکراوەی پێشنیاری

ڕاوێژکارەکانت ئەوەیە، ئەو ٢٥٠ ملیۆن دۆلارە تێپەڕێنین." پێنس هانی ترەمپیشی دابوو لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان چاوی بە زێلێنسکی بکەوێت و گوتی: "تەنیا لە نێوان ئێمە کچان (بە گاڵتەجاڕییەوە)،" پێی وابوو ترەمپ بەدوای هەواڵدا دەگەڕێت تا بەو شتەیان بەستێتەوە کە هیوامان دەخواست بڕیارە ڕاستەکە بێت. پێنس گوتی: "زێلێنسکی بابەتەکەی دانەخست [لە کۆبوونەوەکە] من بابەتەکەم بۆ داخست،" کە ئەرێنی دەردەکەوت. لە ئێستادا، ڕایگەیاند بەدوای ئاشکراکردنی پەیوەندیی نێوان هەڵپەساردنی هاریکارییەکان و ئاڵوودەبوونی ترەمپ بە هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٦ و ٢٠٢٠وە بوو، بەهۆی هیلاری کلینتۆن و جۆو بایدن. هەوڵی دوو پارتی لە کۆنگرێس لە دژی هەڵپەساردنی هاریکارییەکان بەرز دەبووەوە (کە بە پێچەوانەوە شکست بوو، هیواخواز بووم دەرەنجامی دروستی لێ بکەوێتەوە). لەگەڵ ئەمەش تا کۆتایی مانگی ئەیلوول ناوەندەکانی ڕاگەیاندن دەستیان کرد بە بەهەندزانینی ئەو شتانەی بەر لە پەیوەندییەکەی ٢٥ی تەممووز ڕوویاندابوو.

لە ماوەی کۆتایی هەفتەدا، گۆڕینەوەی بەندییەکانی زێلێنسکی لەگەڵ ڕووسیا دەستی پێ کرد، ئەمە ڕووداوێکی ئەرێنی بوو و ترەمپیش پێی وابوو ئەمە ئەوەندە دەهێنێت هاریکارییە سەربازییەکان تێپەڕێنێت. من و پۆمپەیۆ لە بەیانیی ٩ی ئەیلوول قسەمان لەسەر کرد و دواتر و لە هەمان ڕۆژیش لەگەڵ ئێسپەر قسەم کرد، لە هەردووکیدا دەمانویست لە فشارەکان بەردەوام بین بۆ سووککردنی ڕێکارە یاساییەکانی لە کۆنگرێس هەن، بۆ ئەوەی کاتی زیاتر بەدەست بهێنین، لە دوای نیوەڕۆی چوارشەممە ترەمپ بڕیاری ناردنی هاریکارییەکانی نۆکرانیای دەرکرد.

لەو کاتە من کەسێکی تایبەت بووم. ڕۆژی دووشەممە ٩ی ئەیلوول، دەوروبەری کاتژمێر ٢:١٥ خولەکی ئێوارە، ترەمپ بانگهێشتی ژوورە

هێلکەییەکەی کردم، کە بە تەنیا چاومان بەیەکتری کەوت. ئەو نیگەرانیی دەربڕی بەهۆی ڕوومالکردنی ڕووداوەکانی ئەفغانستان و هەلوەشانەوەی کۆبوونەوەی کامپ دەیڤد لەگەڵ تالیبان، بەبێ ئاماژەدان بە کاردانەوە نەرێنییە زۆرەکان، بە دڵنیاییشەوە لە نێوان کۆمارییەکان، چ پەیوەست بە ڕێککەوتنەکە یان بە داوەتکردنی تالیبان بۆ کامپ دەیڤد. بێگومان ئەو هەموو کاردانەوە نەرێنیانە بەرهەمی ڕاوێژی خراپی بوو بۆ تویتکردن.

ڕەنگە جێی سەرسوڕمان بووبێ کە هیچ شتێک بەر لە تویتەکان دزەی نەکرد، بەڵام تویتەکان پەردەیان لەسەر چیرۆکەکە لادا. ئەو زۆر تووڕە ببوو کە وەک گەمژە وێنا دەکرا، نەیدەزانی خۆی هۆکارە بووە. ئەو گوتی: "زۆر خەڵك حەز بە چارەی تۆ ناکەن، دەڵێن تۆ دزە بە زانیارییەکان دەکەیت و ئەو کەسە نیت کە بتوانی کاری بە کۆمەڵ بکەی". من ڕێگەم نەدەدا ئەو شتە وەها تێپەڕ بێت. گوتم من بابەتی بانگەشەیەکی نەرێنیم لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوو، کە من دڵخۆش دەبم بە چڕیی باسی بکەم، دڵخۆشیش دەبم پێی بڵێم کە من وای بۆ دەچووم دزەپێکردنەکان لە لایەن کێوە بوون. (باوەڕم وایە زۆربەی زانیارییە دزەکردووەکان لە لایەن پۆمپەیۆ و مولڤانییەوە بوون).

بۆ ئەو بانگەشەیەش کە من دزەپێکەری زانیارییەکان بووبم، بەدوای تەواوی چیرۆکەکانی بڵاوکراوەکانی نیویۆرك تایمز و واشنتۆن پۆست و شوێنی تردا بگەڕێ، کە زۆربەی کات ئاشکرایان دەکرد کێ زانیارییەکانی دزە پێ کردووە، ئەو نەیدەتوانی هیچیان بدۆزێتەوە. ترەمپ بە وردی پرسیاری لەبارەی کۆبوونەوە لەگەڵ تالیبان کرد، منیش تەنیا ئەوەم گوتبوو کە پرۆسەکە دەبێت بە لایەنی کەم بە پێوەری خواستی دوولایەنە بێت. ئەوەی پێم گوت ئەوە بوو کە من بوومایە ڕێککەوتنەکەی وەزارەتی بەرگریم واژۆ نەدەکرد، ترەمپیش پەنجەی بە ئاراستەی من بەرز کردەوە و گوتی: "من هاوڕام." دواتر ڕۆیشت و گوتی: "تۆ فڕۆکەی

خۆتت هەیە،" کە منیش بۆم ڕوون کردەوە نەمبووە. لە تەواوی گەشتە فەرمییەکان بە فڕۆکەی سەربازی گەشتم کردووە و شوێنپێی هەمان ڕێکارەکانی ئەوانەی پێشی خۆم و ئەو بەرپرسانەش بوومە، کە بەرپرسن لە پرسی ئاسایشی نەتەوەیی. من ئەو یاسایانەم نەنووسیبوو، تەنیا پابەندیان بووم و جێبەجێم دەکردن. من دەمزانی ئەمە بە وردی بەهۆی لۆمەی مولڤانیی بووە، سەرچاوەی بەشێکی زۆر لەو پڕوپووچییە بووە. ترەمپ گوتی: "تۆ خەڵکی نزیک لە خۆتت لەوێ هەیە [لە نێو کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی]". سەرچاوەی ئەمەش یەکێک بووە لە لۆمەکردنەکانی مولڤانیی. بە دڵنیاییەوە لۆمە بەردەوامەکەی ترەمپ ئەوە بوو کە گوایە ژمارەیەکی زۆر لە کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەندام و هەڵگری هزری "حکوومەتی ناوەندیی بەهێز" بوون.

ئەمە دوایین قسەکردنی من بوو لەگەڵ ترەمپ. لە دەوروبەری کاتژمێر ۲:۳۰ خولەک ژووری هێلکەییم جێ هێشت. گفتوگۆکەم بە کووپەرمان و تینسلێی گوت، گوتیشم ئەوە کۆتاییەکەیەتی. نووسراوە کورتەکەی دەستلەکارکێشانەوەم، کە چەند مانگێک لەمەوبەر نووسرابوو، دایە دەستی یاریدەدەرەکەم کریستین ساموێلیان تا بیخاتە شوێنی پەیامەکانی کۆشکی سپی. پێم گوت دەچمەماڵەوە و تا بەیانی لەسەر بڕیارەکە دەخەوم و نایدرکێنم، بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر ئامادە بووم دەست لە کار بکێشمەوە. لە ژێر کاریگەری مشتومڕی دواتر، دەبێت تێبینی ئەوە بکەم کە سێشەممە کووپەرمان پێی گوتم، کە دان واڵش، یەکێک لە جێگرەکانی مولڤانیی، درەنگانی دووشەممە پەیوەندی بە مولڤانییەوە کردووە؛ ئەو کات ئەو لەنێو فڕۆکەی سەرۆکایەتی ژمارە یەک لەگەڵ ترەمپ لە بانگەشەی سیاسی کارۆلایناي باکوور دەگەڕانەوە، هەر دوای ئەو کاتەش بوو کە ترەمپ قسە لەگەڵ من کرد. ترەمپ هێشتا پەست بوو دەربارەی بەکارهێنانی فڕۆکەی سەربازی لە لایەن من، هەرچەندە واڵش هەوڵی ڕوونکردنەوەی

بۆ دابوو، بەڵام لەوەدا شکستی پێ هێنابوو کە باوەڕی پێ بێنێ. ترەمپ پێی گوتبوو: "تۆ پێی بڵێ ئەو فڕۆکەیەکی تری بۆ هەڵناکەوێت، مەگەر من ڕێگەی پێ بدەم". ئەو لێدوانەی ترەمپ ئەوە نیشان دەدات کە لە درەنگانی دووشەممەوە هەر پێی وابووە من دوای بینینی ئەو لە ڕۆژی سێشەممە، لە داهاتووش هەر بەو شێوەیە دەمێنمەوە کە داوای ڕێگەپێدانی بەکارهێنانی فڕۆکەی لێ بکەم.

لە بەیانییەکەی سێشەممە، ١٠ی ئەیلوول، زوو هاتم و هەندێک لە ئەرك و کار جێماوەکانم جێبەجێ کرد، ئینجا بۆ ئەوەی، ئەوکاتەی زریانە ئاگربارانەکەی تووڕەبوونی ترەمپ هەڵدەکات لەماڵەوە بم. داوام لە کریستین کرد پەیامەکە بباتە بەردەم ژوورە هێلکەییەکە و لە کاتژمێر ١١:٣٠ی پێش نیوەڕۆش وێنە لەبەرگیراوەکانی بداتە دەستی پێنس، مولڤانێی، سیپۆڵۆن و گریشام. دڵنیام ترەمپ پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، بۆیە لە کاتژمێر ١١:٥٠ خولەک تویتی کردبوو بۆ ئەوەی چیرۆکەکەی خۆی، ئەوەی پێشووتر بگات. دەبوایە من پێش ترەمپ بکەوتمایە، بەڵام من دەمویست پەرچەکرداری تویتەکان بە ڕاستییەکان بێت. دەزانم لە ڕاستیدا چۆن ئەمە کۆتایی هات. لەگەڵ ئەوەش، من جارێکی تر بوومەوە بە پیاوێکی ئازاد.

## بەشی یازدە

# کۆتایی

کاتێک ١٠ی ئەیلوولی ٢٠١٩ وەکو ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی دەستم لە کار کێشایەوە، هیچ کەس پێشبینی چیرۆکی لێپرسینەوە لە ترەمپی نەدەکرد. من ئەو کات نە ئاگاداری سکاڵای ئەو کەسە بەناوبانگە بووم کە زانیارییەکانی درکاندووە، نە مامەڵەکردنیش لەگەڵ پرسەکە لە لایەنی جێبەجێکار، بەڵام سکاڵاکە و ئەو دەنگۆیانەی نێو ڕاگەیاندنەکان، دیمەنی گۆڕەپانی سیاسی واشنتۆنی بەشێوەیەکی پێشبینینەکراو بە تەواوی گۆڕی.

جگە لەوەش، وەک لە بەشی ڕابردوو خراوەتەڕوو، من زۆر لەوە زیاترم دەزانی کە ترەمپ دەیویست پەیوەست بە پرسەکانی ئۆکرانیا ئەنجامی بدات، لەو کاتەشی تەواوی نەتەوەکە سەقاڵی ڕووداوەکانی دوای لێپرسینەوە بوون لە ترەمپ، من سەرقاڵی ئەوە بووم بزانم بەرپرسیارێتیە کەسی و دەستوورییەکانم دەربارەی زانیارییەکان چی بوون. بەلای منەوە لێپرسینەوەکە تەواو هەراسانکار بوو، ئەمە لەو بارەشی ئەگەر ئاکارەکانی ترەمپ گەیشتبنە ئاستی لێپرسینەوەش، بۆیە پەیوەندیم بە ڕاوێژکاری کۆشکی سپی، پات سیپۆلۆن و چوار لە کارمەندەکانی کرد، بێجگە لە داواکاری گشتی بیڵ بار، پێم گوتن کە بۆچی من و پۆمپەیۆ و منوشن لە گفتوگۆکانماندا نیگەرانی بابەتەکە بووین. بۆ گرنگیی هێشتنەوەی دەسەڵاتە دەستوورییەکانی سەرۆک بوو، یاخود ئەوەی هاملتۆن ناوی دەبات بە "وزە لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دایە"، ئەمانە بابەتی بچووک نین. لە هەوڵە تاکییەکانی پارتی دیموکرات بۆ لێپرسینەوە، هەردوولا

(کۆماری و دیموکراتەکان) پێیان وابوو بژاردەکانیان زۆر ئاسانن. من بابەتەکەم بەو شێوەیەم نەدەدیت.

نە من و نە پارێزەرەکانم، کە تیمێکی زیرەکن و چەک کووپەر سەرۆکایەتییان دەکات، قسەمان بۆ ڕاگەیاندنەکان نەدەکرد. چەک کووپەر هاوڕێیەکی کۆن و هاوپیشەمە لە وەزارەتی داد و لەوەتەی ئیدارەی ڕەیگان دەیناسم و بە هۆکاری باش و پێویست تاقی کراوەتەوە. ئەوەی کەمتر واتابەخش بوو، ئالۆزیی و مقۆمقۆی سیاسی و ڕژدیی بابەتەکە بوو لە ئەمریکا، کە لە پرسی لێپرسینەوە واتای خۆی لەدەست دابوو. بە لەبەرچاوگرتنی بابەتەکەش، هەوڵی شیکردنەوە و دەربڕینی بۆچوونەکانم سەرکەوتوو نەدەبوون و هەوڵەکانیشم کاتی زیاتریان دەویست.

سەرەڕای ئەوەش، بەشێکی زۆری هۆکارەکانی دروستکردنی کێشەی لێپرسینەوە لە ترەمپ، ئەجێندای خۆیان هەبوو، زیاتریش بەرەی جەنگەکەیان بۆ ڕاگەیاندنەکان گواستبووەوە، نەک شێوازی ڕووبەڕوو و ڕاستەقینە. بۆیە وەک پێشبینی دەکرا، ڕووماڵی ڕاگەیاندنەکان هەڵە بوون و ئەوەیان دەخستەڕوو کە دەربڕی ئەجێندای چەندین کەسایەتی بوون. ئەمە جگە لە: بابەتینەبوون، تەمبەڵیی ڕاگەیاندکاران، نەبوونی پەروەردەی ئەکادیمی و پیشەیی و گرنگینەدان بە ڕژدیی بابەتەکە. ئەو کات و ئێستاش هیچ هەستم نەکرد ناچار بم ئەو هەڵانە تەنانەت لەسەر خۆشم بێت ڕاست بکەمەوە؛ ئەگەر خۆم بە هەڵەکان سەرقاڵ بکردایە، بێگومان کاتم بۆ هیچ شتێکی تر نەدەبوو. باوەڕم وابوو لە کاتی خۆی قسەم دەبێت (لە کاتی جیاجیا چەند لێدوانێکم بۆ ڕاگەیاندنەکان دا)، سووریش بووم کاتی خۆم بەفیڕۆ نەدەم. بە درێژایی کات، وەک هاملتۆن ئاماژەی پێ دەدات، دەمویست "لە نەپێکانی ئامانجەکەم دوور بکەومەوە"، بە تایبەتیش نەبادا ڕەزامەندی وەڕینی ڕاگەیاندنەکانی لێ بکەوێتەوە، بێجگە لە وەڕینی نوێنەرانی پرۆسەی لێپرسینەوە، بێجگە لە هی داکۆکیکارانی ترەمپ.

بۆچوونەکانم لەسەر پرۆسەی لێپرسینەوە لە ترەمپ تێکەڵ بوون و یەک لایەنە نەبوون. لە هەمووی گرنگتر، لە دەستپێکی پرۆسەی لێپرسینەوە و گوێبیستی گەواهیدەران لە ئەنجوومەنی نوێنەران، ئەوانەی داوای لێپرسینەوەکەیان کردبوو، هەڵەی پیشەیی و ئاکارییان ئەنجام دا. دیار بوو ئەوان لە پرسی لێپرسینەوە و کاراکردنی خاڵە دەستوورییەکانی لێپرسینەوە زیاتر لە ژێر کاریگەری خواستە سیاسییەکانیان بوون، ئەوان دەیانویست پرۆسەکە لە کاتێکدا دەست پێ بکات کاریگەری لەسەر خشتەی کۆنگرەی پاڵاوتنی بەربژێری دیموکراتەکان بۆ سەرۆکایەتی نەبێت، نەک مەبەستیان تەواوکردنی لێکۆڵینەوەیەکی وردی یاسایی بووبێت. ئەگەر ترەمپ شایانی لیپرسینەوە و سزادانی یاساییش بووبێت، کۆمەلگەی ئەمریکاش شایانی هەوڵێکی ڕژد بوون بۆ ساخکردنەوەی ئەو سزایەی بە یەکلابوونەوەی بریتی دەبوو لە لادانی سەرۆکێکی هەڵبژێردراو. ئەوە ڕووینەدا. دیموکراتەکان پێیان وابوو دارشتنەوەی پرۆسەی لێپرسینەوە لە ترەمپ پرسیاری زەق و ئاستەنگی هونەریی مەزنیان بۆ دروست دەکات، بەڵام دواتر ئەوەش هەر هەڵەی خۆیان بوو. ئەو خشتەیەی خۆیان سەپاندبوویان پەلبەستی کردبوون لە وروژاندنی پرسەکە لە ئاستێکی دەستوریدا، پرۆسەکە لە ئاستی سەرۆکایەتیش هەر بوونی نەبوو، لە کاتێکدا دەبووایە ئەمە جێبەجێکردنی بەرپرسیاریەتییەکی دەستووریی بێت. کێشەی خشتەی کات پاساو نەبوو بۆ بڕیارە تاکتیکییەکانی دواتری تۆمەتبەخشەکان (دیموکراتەکان) لە لایەنی پەیڕەونەکردنی ڕێکارەکان، یان بانگهێشتکردنی گەواهیداران لە دادگەییەکردنەکە. بێجگە لەوەش دەبووایە ئامانج تەنیا تۆمارکردنی بەڵگەکان نەبێت، بەڵکو تۆمارێکی متمانەپێکراو و قایلکاری بەڵگەکان بەردەست بێت. بێگومان بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەمە وێنە گەورەکەی پرۆسەی لێپرسینەوەی لایەنی پێشکەشکاری تۆمەتەکان بوو، کە "ترەمپ"یان تۆمەتبار دەکرد: دەسەڵاتی

ڕەوای حکوومەتیان دەکردە قوربانیی ئامانجی ناحکوومیی ناڕەوا.

دەرەنجامەکانی ئەم هەوڵە تاکلایەنە لە ئەنجوومەنی نوێنەران دوو لایەنە بوو. یەکەم، ماوە و مەودای پرۆسەی لێپرسینەوەی لە ترەمپ تەواو تەسک کردەوە و هیچ دەرفەتێکی بەدەستەوە نەدا بۆ دۆزینەوەی تێوەگلانەکەی ترەمپ لە پرسە تاوانکارییە یاسایی و تایبەتییەکان، چ لە ئاستی نێوەخۆیی بێت یان نێودەوڵەتی، کە دەکرا لێپرسینەوەکە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بپرژایەتە سەر خراپبەکارهێنانی دەسەڵات لە لایەن ترەمپ، بە ئامانجی دەستکەوتی کەسیی (سیاسی، ئابووری و یان هەر هۆکاری تر). ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە من هیچ گومانم هەبێت لەسەر باڵاتر بوونی دەسەڵاتی سەرۆک لە مادەی دوو بەسەر وەزارەتی داد. بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە پابەندی دەستووری سەرۆک بۆ "گرنگیدان بە یاساکان دەبێت بەوپەڕی خۆنەویستی بێت"؛ واتا دەبێت یاساکان یەکسان و دادگەرانە کارا بکرێن. ناشێت سەرۆک لەپێناو بەژەوەندییە کەسییەکانی، کە گوایە یەکسانن بە بەرژەوەندییە نیشتیمانییەکان، دەسەڵاتە یاساییە نیشتیمانییە حکوومییەکان خراپ بەکار بهێنێت، یانیش ژێربەژێر هەوڵی دەستخستنی بەرژەوەندییە کەسییەکانی بدات. ئەگەر لێپرسینەوەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران بە تەنیا نەپرژایەتە سەر کێشەکانی ئۆکرانیا و بەرژەوەندییەکانی ترەمپ لەو پرسە (سیاسی بن یان ئابووری)، بەڵکو گرنگی بدایە بە کێشە فراوانەکانی تری لایەنی ئاکار و هەڵسوکەوتەکانی وەک فشاری بانگەشە و تێوەگلانی هالک بانک و زی تی ئی و کۆمپانیای هواوی و کێشەکانی تر، ئەو کات دەکرا دەرفەتێکی باشتر لەئارادابووایە بۆ قایلکردنی ئەوانی تر کە لە ڕاستیدا ترەمپ "تاوانی مەزن و سەرپێچی" ئەنجام داوە. لە ڕاستیدا، بۆ من ئەستەمە لە تەواوی ماوەی کارکردنم هیچ بڕیارێکی گرنگی ترەمپ بدۆزمەوە، کە لەبەر ئامانجی خۆپاڵاوتنەوەی نەبووبێت.

دووەم، خێراکردنی ڕێکارەکان و گاڵتەهاتن و هەستی سەیری هەندێک

لەوانە بوو کە لێپرسینەوەکەیان وروژاندبوو، کە بەرگەی هیچ لە پێشنیارەکانی بەرهەڵستکارانی دۆسیەکەیان نەدەگرت لەسەر لێپرسینەوە لە ترەمپ. ئەمەش وای کرد وا دەربکەوێت دەرەنجامێکی وردی تۆمارەکان بەلایەنی کەم وەک بژاردەی دیموکراتەکان ئامانج نەبووبێت لە لێپرسینەوەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران. لە بەرامبەردا ئەمە بە تەواویی کۆمارییەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی لە دۆسیەکە دوورخستەوە، بە لایەنی کەم بە پاساوی ئەوەی دەکرا بابەتی فراوانتر بکرابوونایە هۆکاری لێپرسینەوە لە ترەمپ. لە ڕۆژە سەرەتاکانی لێپرسینەوەکانەوە دەرکەوت کە تەواوی پرۆسەی لێپرسینەوەکە تاکلایەنە دەبن، هەر بەو شێوەیەش یەکلایی بووەوە. ئەمە پەیوەست بە ماددەی دووەم زۆر ڕاستر بوو (ڕێگریکردن لە کۆنگرێس)، کە بە ڕواڵەتیش هەڵە بوو. ئەوەشی بۆ دۆسیەکە لە ئەنجوومەنی نوێنەران بە ڕاست تەماشا دەکرا، لە ئەنجوومەنی پیران زەقبووەوە بەوەی بڕیارەکان ڕەگی جیاوازی پارتەکانی هەبوو، ئەمە وای کرد بێتاوانیی ترەمپ لە ئەنجوومەنی پیران یەکلایی ببێتەوە بەر لەوەی دەنگدانەکە لە ئەنجوومەنی نوێنەران ئەنجامیش بدرێت. ئەو سیناریۆیە لە دەستپێکەوە پێشبینیەکراو نەبوو، بەڵام لە سایەی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران و وروژێنەرانی دۆسیەکە هەر وا لێک دەدرایەوە.

بە زەقی، ئەمە مامەڵەیەکی خراپ بوو. هەر بەو شێوەیەش بوو کە من لە سەرەتاوە لێکدانەوەم بۆ دەکرد و بەدیاردەکەوت. بە دڵنیاییەوە، ئەمە زۆر بەر لەوە نەبوو کە من و جێگری ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی چارلی کووپەرمان پرسیارمان لەبارەوە لە لێژنەی هەمیشەیی هەواڵگریی ئەنجوومەنی نوێنەران ئاراستە دەکرا، تا بزانن ئێمە گەواهی دەدەین. بە هەمان شێوەی پارێزەران کە لەبەردەم لێژنەکە ئامادە بوون و گەواهییان دا. کووپەر داوای کرد کە بە فەرمی داواکاری پێشکەش بکرێت، دواتر ئەوەشیان لە کووپەر داوا کرد.

هەر لە هەمان کاتدا کۆشکی سپی بە "کووپەرمان"ی ڕاگەیاند کە سەرۆک فەرمانی "پاریزبەندیی گەواهیدان"ی لەسەر ڕاگرتووە، ئەم فەرمانە زۆر ڕژدتر بوو لەوەی گەواهیدەرەکانی تر کە لە لایەن لێژنەی هەوالگری داوا کرابوون، تەنانەت کووپەرمان نەیتوانی تێبینیش لەسەر دۆسیەکە بدات. لەبری ئەوە، کووپەر خێرا دۆسیەیەکی یاسایی کردەوە بۆ داواکردنی ئاراستەکردنی دادگەری پەیوەست بە دوو بابەتی دژ یەک، کە دەبووایە کووپەرمان پێوەیان پابەند بوایە، بەڵام من بوومایە لە شوێنی کووپەرمان ئەو کارەم ئەنجام نەدەدا. ئەو داواکارییانەی کووپەر بۆ کووپەرمانی بەرز دەکردنەوە، دەریانخست کە کووپەر بەرگری لە بنچینە بابەتییەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکار یان لقە دادگەرییەکانی پەیوەست بە ئاکار ناکات، لەبری ئەوە تەنیا داوای ئاراستکردن و ڕوونکردنەوەی دادگەری دەکات.

زۆر لە گۆڕانکارییەکان کە لێکەوتەی دۆسیەکە بوون و بە چەند شێوە و ڕێگەی هەڵە بڵاو دەکرانەوە، بەڵام بە لێکدانەوەی من ئەو لێدوانەی لە ٦ی کانوونی دووەم بڵاوم کردەوە تا ئێستاش باشترین پوختەی ڕووداوەکانە:

بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام هەر لە چوارچێوەی مشتومڕی لێپرسینەوەکان لە ترەمپ، هەوڵم دا لە ئاست داواکارییەکانی ئەرکەکانم بم، ئەمە وەک هاوڵاتییەک بێت یانیش وەك ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی. هاوپیشەکەم، د. چارلس کووپەرمان پێویستی بە چارەسەری دەستووری هەیە، چونکە لە هەمان کات ڕووبەڕووی داوای لێژنەی هەوالگری ئەنجوومەنی نوێنەران و داوای سەرۆکایەتی دەبێتەوە تا گەواهی نەدات، ئەمەش بەهۆی ئەو بەریەککەوتنەی دۆسیەکان لە ئاستی پرۆسەی دادگەریی فیدراڵی، کە کووپەرمان دووچاری بووەتەوە. دوای ئەوەی پارێزەرەکەی من لێژنەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئاگادار

کـردەوە کە داوای چارەسـەرێکی دەسـتووری بـۆ ئەم سۆسـیەیە دەکەم، لێژنەکە بڕیاریدا من بانگهێشت نەکات. سەرەرای ئەوەش ڕامگەیانـد کە دەمەوێـت ڕاوێـژم پـێ بکرێـت و پـێم بگوترێـت دەرەنجامەکانی دۆسیەی د. کووپەرمان چۆن دەبن.

بەڵام هەردووکیـان، سـەرۆک و ئەنجـوومەنی نـوێنەران دژی هەوڵەکەی د. کووپەرمـان وەسـتانەوە لەو کـاتەی ئەو پشـتی بە بنچیـــنەی دادگەری دەبەســـت، هەردوولایـــان بەهـــۆی بەرژەوەندییەکانیان ئەو کارەیان ئەنجام دا. ئەنجـوومەنی نـوێنەران بەوەش نەوەسـتان و بە ئەنقەسـت تەنـانەت بانگهێشـتنامەکەی د. کووپەرمانیشیان کشاندەوە تا دادگا لەو دادگەرییە بێبەش بێت.

لە ٣٠ی کانوونی دووەم، لە بۆچـوونێکی ورددا، دادوەر ڕیچـارد لیـۆن ڕوونـی کـردەوە کە دۆسـیەکەی کووپەرمـان شـایانی لێکـۆڵینەوە و بەدواگەڕانـی زیـاترە، بـۆیە نەگەیشـتووەتە ئاسـتی کێشـەی جیـاکردنەوەی دەسـەڵاتەکان و نێـوان دەسـەڵاتە جیاوازەکان.

"ئەنجـــوومەنی نـــوێنەران گەیشـــتە ئەو دەرەنجـــامەی کە بەرپرســیاریەتییە دەســتوورییەکە بە لەخــۆرگرتنی ماددەکــانی لێپرسینەوە، تەنیا پەیوەستن بە دۆسـیەی ئۆکرانیـا. ئێسـتا ئەو ئەرکە دەکەوێــتە ســەر ئەنجــوومەنی پیــران، بــۆ ئەوەی پابەنــدییە دەسـتوورییەکەی جێبەجـێ بکـات لە لێپرسـینەوەکاندا، بەڵام پـێ ناچێــت دەرەنجــامێکی کۆتــایی پرســیارە دەســتوورییە وەڵامەنەدراوەکانی دادگەری، لە ئەنجوومەنی پیران دەستەبەر بن.

بە دڵنیـایەوە بەوپێـیە بێـت و لەبەر ئەوەی گەواهیـدانەکەی منیش

کێشـەدارە، دەبـوو بەوپەڕی توانـام و بە وریـاییەوە چارەسـەرێک بدۆزمەوە. گەیشتمە ئەو دەرئەنجـامەی ئەگەر ئەنجـوومەنی پیـران بە فەرمی داوای گەواهیدانم بکـات، ئەوا ئامـادە دەبـم گەواهیـی بدەم."

بێگومان ئەنجوومەنی پیران ڕەتی کردەوە گوێ لە گەواهییەکەم بگرێت، بۆیە چووم تا بێتاوانی ترەمپ نیشان بدەم پەیوەست بە دوو ماددەکەی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ لێپرسینەوە لێی. ئەگەر زۆرینەی ئەنجوومەنی پیران دەنگیان لەسەر بانگهێشتکردنی گەواهیدەران بدابایە و منیش گەواهیم بدایە، دەتوانم بڵێم بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی ئەو کات و بە هۆی بەشینەوەی تۆمەتەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەران، ئەوا هیچ گۆڕانکارییەکی وەها لە دەرئەنجامەکانی ئەنجوومەنی پیرانیش ڕووی نەدەدا.

ڕووداوێکی ئەنجوومەنی پیران کە لە کاتی پرۆسەی لێپرسینەوەکە سەرنجێکی زۆری لێ کەوتەوە، ئەو بابەتە بوو کە گوایە پوختەی زانیارییەکانی ئەم پەرتووکە دزەی کردبێت و لە ڕۆژنامەی *نیویۆرک تایمز* بڵاوکرابێتەوە. لە کاردانەوەی ئەو گۆڕانکارییە ناخۆشەدا، کووپەر لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٢٠ لێدوانێکی بڵاو کردەوە، کە نامەیەکی نێردراو بوو (بەروارەکەی بۆ ٣٠ی کانوونی یەکەم ٢٠١٩ دەگەڕایەوە)، نامەکە دەقێک بوو ئاراستەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کرابوو بەمەبەستی پێداچوونەوەی بەر لە بڵاوکردنەوە. ئەو دەقە بۆ ئەوە بوو هیچ زانیارییەکی نهێنی ئاشکرا و بڵاو نەکرێتەوە. هەرچەندە باوەڕمان نەدەکرد داوامان لێ بکەن دەقەکە ڕادەست بکەین، وەک دەربڕی هۆشداریی یاسایی خۆمان و لەبەر ئەوەشی من بە ڕژدی مامەڵە لەگەڵ هەر زانیارییەک دەکەم، کە پێم وابێت نهێنییە. تا ئەو کات ئێمە ئەو ڕاستییەی ڕادەستکردنی دەقەکەمان لە چاوی خەڵك پاراست، بەڵام دیار بوو کە دزەکردنی زانیارییەکان پێویستی

بە وەڵامێک بۆ ڕای گشتی هەبوو. بەشێکی لێدوانەکەی کووپەر بەم شێوەیە بوو:

"بەداخەوە، ڕوونە ئەو وتارەی ئیمڕۆ لە *نیویۆرک تایمز* بڵاو کراوەتەوە کە پرسی 'نهێنیپارێزی' بۆتە قوربانی گەندەڵی و لە لایەن کەسانێک دزە بەو بەشەی زانیارییەکان کراوە، کە پێویستی بە پێداچوونەوە بووە. ئێمە دەقەکەمان خستبووە بەردەستی لایەنی پەیوەندیدار... بەو دڵنیایی و مەرجەی کە "پرۆسەی بینین و پێداچوونەوەی دەقەکان بەرپرسیاریەتیە بۆ بەرپرسانی حکوومەت و کارمەندان' و ئەوەش کە 'پوختەی' دەقەکەی باڵیۆز جۆن بۆڵتن نابێت بۆ هیچ کەسێک، کە بەشدار بووبێت لە پرۆسەکە، بڵاوبکرێتەوە و ئاشکرا بکرێت.'"

کووپەر بە *واشنتۆن پۆستیشی* ڕاگەیاند: "دەتوانم ڕاشکاوانە پێتان بڵێم کە ئێمە هیچ پەیوەندیمان بە دزەکردنی زانیارییەکانی دەقەکەی 'جۆن'ەوە نییە." ڕۆژی داهاتوو، ٢٧ی کانوونی دووەم، ئێمەش ئەم لێدوانەمان بڵاو کردەوە: "باڵیۆز جۆن بۆڵتن، سایمن و شوستەر (کۆمپانیای چاپ و بڵاوکردنەوە) و پەرتووکخانەی جاڤێلین ڕایدەگەیەنین پەیوەست بە زانیارییەکانی ئەم پەرتووکە، "ژووری ڕووداوەکان"، فرۆشیارانی سەرهێڵی ئێنتەرنێت 'هیچ هاوئاهەنگییەکمان لەگەڵ ڕۆژنامەی *نیویۆرک تایمز* و هیچ لایەنێکی تر نەبووە. هەر خەملاندنێک پێچەوانەی ئەمە بێت، هیچ بنچینەیەکی نییە." هەر کەسێک دزەی بە زانیارییەکان کردبێت، ئەمە پرسیارێکە بەداخەوە تا ئێستاش وەڵام نەدراوەتەوە، بەدڵنیاییشەوە کەسەکە هاوڕێی من نییە.

دواتر و ئەستۆپاکیی ترەمپ لە لێپرسینەوەکە جارێکی تر دەرخەری خراپیی مامەڵەی ئەنجوومەنی نوێنەرانە. دیموکراتەکان دەیانویست وا بڵێن

کە تۆمەتەکان تاهەتایە ناوبانگ و کەسایەتیی ترەمپ دزێو دەکەن، ئەوەش نیشانی دەدات بۆچی لە بنەڕەتدا ئەو هەوڵەیان داوە. بە هۆکاری نەزاندراو دیموکراتەکان ڕاستییەکەیان وەلا نا و ئەمەش وای کرد پرۆسەی دادگەی لێپرسینەوەیان لە ترەمپ شکست بهێنێت، چونکە ترەمپ داوای ئەستۆپاکی کرد و هەر ئەوەش ڕوویدا. ئەمە تەواو پێچەوانەی خواستی لایەنی خاوەن داواکە بوو لە ئەنجوومەنی نوێنەران، سەرەڕای ئەوەش داوایان دەکرد ڕێگریی لە بەربەستی پارێزبەندیی دەستووری بکەن، ئەو چەمکەی زۆر دووبارەبووەوە، کە سنوورێک بۆ خراپبەکارهێنانی دەسەڵات لە لایەن ترەمپ دادەنێت. وەک یۆگی بێرا جارێکیان لە *نیویۆرک مێتس* نووسی: "هیچ کەس نازانێت چۆن ئەو یارییە ئەنجام بدات؟"

بە گشتی و بە دڵنیاییشەوە، پارێزبەندی لە ڕووی تیۆرییەوە تەنیا بەربەستێکی دەستورییە لەبەردەم پرسی لێپرسینەوە لە ترەمپ. پاریزبەندیی ڕاستەقینە هەڵبژاردنە کە ترەمپ لە ٢٠٢٠ ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەگەر بیباتەوە ماددەی ٢٢ (پێویستیشە لەسەر ئەوە بەردەوام بێت) ڕێگری دەکات لە هەر کۆتوبەندێکی تر لەبەردەم ترەمپ. لەو کاتەشی لیبراڵ و دیموکراتەکان سەرقاڵی لادانی ترەمپ دەبن، دەبێت کۆماری و پارێزگارەکان ترسیان لە لادانی پارێزبەندیی سیاسی سەر ترەمپ هەبێت، کە ناچاری دووبارە لێپرسینەوەی دەکەن، وەک لەم یادەوەرییە ڕوون کراوەتەوە، چونکە زۆر لە بڕیارەکانی ترەمپ زیاتر لەسەر سیاسەت دەوەستن نەک ئەوەی پشتیان بە فەلسەفە و ستراتیژییەت یان سیاسەتی دەرەوە و پاڵنەرە ژێرییەکان بەستبێت. بە شێوەیەکی فراوانتر، بەهۆی قەیرانی ڤایرۆسی کۆرۆنا ترەمپ جەختی کردەوە و گوتی: "کاتێک کەسێک سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانە، دەسەڵاتەکانی ڕەهان، هەر بەو شێوەیەش دەبێت." ئەو هەڕەشەی لە دواخستنی کارەکانی کۆنگرێس

دەکرد، ئەو بە هەڵە لێکدانەوەی بۆ دەسەڵاتێکی دەستووری کرد، کە تا ئێستا لە لایەن هیچ سەرۆکێك بەکارنەهێندراوە. هەر کەسێکی پارێزگار کە دەستووری خوێندبێتەوە، تەواو سەری لەم دڵنیاییەی ترەمپ سوڕ دەمێنێت.

بە دڵنیاییەوە سیاسەت لە حکوومەت هەر هەبووە، بەڵام خولی دووەمی بەراورد بە خولی یەکەم، ترەمپ زۆر کەمتر پابەندی سنوورە دیموکراتییەکان دەبێت. سەیر لەوەدایە دەشێت دیموکراتەکان بەراورد بە پارێزگار و کۆمارییەکان زۆر دڵخۆشتر بن بە میراتی ترەمپ، کە چاوی لە خولی دووەمە. ئەمە شتێکە شیاوی بیرلێکردنەوەیە.

وەک بڵێیت لێپرسینەوەکە بەس نەبێت، ئێستا ڕووبەڕووی بەرهەڵستی سەرۆکێک دەبمەوە کە هێشتا لە کار و ئەرک بەردەوامە و دژی بڵاوکردنەوەی ئەم پەرتووکەیە، کە سەبارەت بە ئەزموونی خۆم لە کۆشکی سپی نووسیومە. ترەمپ وەکو هەرجار مامەڵەی کرد، دەستی بەسەر بەڵگەنامەکانمدا گرت، سەرەڕای چەندین هەوڵ بۆ گەڕاندنەوەیان، هێشتا ڕێگری لە ڕاوێژکارە کەسییەکانم کرد تا بەڵگەنامە نانهێنییەکانم بەدەست بگاتەوە؛ ئاستەنگیشی بۆ هەژماری کەسیم لە تویتەر دروست کرد و هەڕەشەی چاودێریی خستنە سەر پەرتووکەکەشی کرد. کاردانەوەی ئەو، ئاستی خراپەی کەسیی تێپەڕاند و پەلی بۆ ڕێگریی دەستووری هاوێشت. ئەی کاردانەوە و وەڵامی من؟! ئەوە یارییەکە و دەستی پێ کردووە.

یەکێک لە ڕێگە ڕەواکانی ترەمپ بۆ هێرشەکەی، ڕێکاری پێداچوونەوە و بیرۆکراتیی حکوومەت بوو، بەر لە چاپ و بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکە، منیش ڕەزامەندیم نیشان دا ئەو ڕێکارانە ئەنجام بدرێن، تاوەکو پەرتووکەکە چاپ بکرێت. لە کاتی کارکردنم وەک ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی و هاوشێوەی بەرپرسەکانی تر بۆ دەستکەوتنی زانیاری نهێنی،

چەندین ڕێککەوتنی ڕەزامەندیم واژۆکردووە بۆ نەدرکاندنی زانیارییە نهێنییەکان، ئەمە پێش گرتنەدەستی کارەکە و لە کاتی وازهێنانیش. بێگومان هەر کەسێک زانیاریی نهێنی بچێتە ژێر دەست، پابەند دەبێ بە پاراستنی نهێنییەکان و نەدرکاندنی بۆ هیچ کەسێکی ڕێگەپێنەدراو. ئەمە شتێک بوو هەرگیز نەمدەویست لە نووسینی ئەم پەرتووکە ئەنجامی بدەم. زۆر شت هەبوون کە بیانڵێم بەبێ ئەوەی ناچار بم ئەو پێکهاتە نهێنییانە ئاشکرا بکەم.

لە نموونەییترین بارودۆخ، شێوەی ڕێککەوتنی ئاشکرانەکردنی نهێنی*(1) لەسەر ئەو بابەتانە دادەڕێژرێتەوە کە لەژێر چاپن و ناچاری پێداچوونەوەی بەر لە چاپکردن دەبن، مەبەست لەمەش ئەوەیە هیچ زانیارییەکی نهێنی ئاشکرا نەکرێت. لە ساڵی ٢٠٠٧ پەرتووکی "خۆبەدەستەوەدان بژاردەیەک نییە"م بۆ پێداچوونەوە ڕادەست نەکرد، بەڵام کۆلن پاوڵ بیرەوەرییەکەی "گەشتە ئەمریکییەکەم"ی خستبووە بەردەست بۆ پێداچوونەوە.

بە پێچەوانەی ئەمە، پێشوتر جەیمس بەیکەر پێی گوتم کە هیوای دەخواست پەرتووکەکەی "سیاسەتەکانی کاری دیپلۆماسی" کە لە سەردەمی ئیدارەی بیڵ کلینتۆن بڵاوکرایەوە، پێداچوونەوەی بۆ نەکراوە. ئەو زۆر لەو هەموو هەوڵە ترسابوو کە لە دژی بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکەی هەبوون، چونکە لێدوانەکانی پەیوەست بە کاری دیپلۆماسیی ئەمریکا بەرامبەر بە چین ڕەنگدانەوەی ئیدارەی کلینتۆن نەبوو. ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی چەندین جار پەرتووکەکە لە چاپکردن دوا بخرێت. ئەو هەموو ئەزموونە بۆ من وەک ئامۆژگارییەکیان لێ هات، تا چاودێری و پێداچوونەوەکە نەبنە هۆکاری دواخستن، چ جای ئەمە لە

(١) ڕێککەوتنی ئاشکرا نەکردنی نهێنی لە لایەن کارمەندانی نوێی کۆشکی سپی واژۆ دەکرێت تا نهێنی تەواوی زانیارییەکان بپارێزن و ئاشکرا نەکەن. هەندێک لەو نموونانە: زانیاری نهێنی، پەیوەندییەکان و ڕیپۆرتی کاربەدەستە باڵاکان

سەردەمی سەرۆکایەتییەکی وەکو هی ترەمپ بێت.

لەلایەکی تر، بە لەبەرچاوگرتنی شێوازی دەستلەکارکێشانەوەم لە ئیدارەکە و کاتی نووسینی پەرتووکەکەشم، لە دەستپێکەوە ئەوە ڕوون بوو کە ترەمپ هەموو کارێک کە لە توانایدا بێت دەکات، بۆ ئەوەی ڕێگریی لە بڵاوبوونەوەی پەرتووکەکەم بکات، بەلایەنی کەم تا دوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٢٠. لەژێر ڕۆشنایی ئەو گرژییە بێوێنەیە و لە هەمان کاتیش بەهۆی ڕێنمایی یاسایی چەک کووپەر، بڕیارم دا کە دەقە سەرەتاییەکە بۆ چاوپێداخشاندن ڕادەست بکەم. هەرچەندە هیچ زانیارییەکی نهێنی تێدا باس نەکراوە و پێم وابوو کە مەرج نییە ئەو کارە ئەنجام بدەم. بەڵام لە سەردەمی ترەمپ تەنانەت یاسا ئاساییەکانیش کاریان پێ ناکرێت.

وەک خۆم دەمویست، پرۆسەی پێداچوونەوە بە شێوەیەکی پیشەیی ورد[1] و بە ڕێژەوە ئەنجام درا.

تا پەرتووکەکەش مۆڵەتی بڵاوکردنەوە وەربگرێت، چەندین گۆڕانکاریم لە دەقەکەدا ئەنجام دا، پێم وابێت ڕاستییە بنچینییەکان کە ڕێژە زۆرەکەیە گۆڕانکاری بەسەردا نەهات. لە هەندێک لە تێبینییەکان تەنیا پێویستی دەکرد چەمک و گرێی وەک "بە بۆچوونی من" (تەماشای ڕستەی ڕابردوو بکە)، تا ڕوونی بکەمەوە بۆچوونی خۆم بووە نەک پشتبەست بە هەندێک لە زانیارییە هەستیارەکان. لە هەندێک باریش تێبینیی ئەوەم پێ درابوو کە ئەو ڕاستییانەی باسیان دەکەم، زیاتر پشت بە زانیاری بەرجەستە ببەستم، بۆ نموونە، باسکردنی ئامانجە سەربازییەکانی سەر ئێران، کە بەراورد بە دەقی یەکەم زیاتر بە گشتی باسم کردووە. سەرەرای ئەمەش،

(٢) وەک هەر کارمەندێکی ئاسایی جۆن بۆڵتن لە سەرەتای دەستبەکاربوونی لە ڕێککەوتی ٥ی نیسانی ٢٠١٨ ڕێکەوتنی ئاشکرانەکاردنی زانیارییەکانی واژۆ کردبوو. لەو چوارچێوەیەش ڕەزامەندی دوو لایەنە هەیە بۆ پێداچوونەوەی دەقەکان بەر لەچاپدان.

خوێنەران خۆیان دەتوانن بیهێننە خەیاڵی خۆیان کە من و ئەوانی تر و تەنانەت 'ترەمپ'یش چۆن بیرمان کردووەتەوە.

دوو جۆر گۆڕانکاری ڕوویان دا. یەکەم، داوام لێ کرا لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان نیشانەی دەقی وەرگیراو "..."ی نوێن ترەمپ و سەرکردە جیهانییەکان و من و هاوتا بیانییەکانم لە دەقەکە لابدەم. لە زۆر شوێن هەر ئەوەم ئەنجام داوە؛ واتا نیشانەی وەرگرتنی ڕاستەوخۆی دەقم لاداوە. لە شوێن و باری تردا داڕشتنەوە و لێکدانەوەی خۆم پێویست بوو، وەک دەرخەری ئەوەی من قسەی کەسم بە ڕاستەوخۆیی بەکارنەهێناوە، بە شێوەیەک دەبوو جێناوە کەسییەکانیش بگۆڕم تا بابەتەکان بە ڕوونی بگەن. لە هەندێک شوێنی کەم کە پێم وابوو شایانی گۆڕین نین ڕێگریم لێ کرا لە گواستنەوەی زانیارییەکان، لەبەر ئەوەی زانیاریی وای لەسەر ترەمپ ئاشکرا دەکرد کە بۆ ئەو جێی شەرمەزاری دەبوون، یان ئاماژەی بوونی ئاکاری ڕێگەپێنەدراوی ئەوی دەدا. پلانم هەیە لە تێکۆشان بەردەوام بم بۆ ئەوەی ئەو بەشە گۆڕاوانەی بە پاساوی نهێنیبوون و مافی گەڕانەوەی لێدوان و قسەی ڕاستەوخۆ لادراون، لە چاپەکانی داهاتووی ئەم پەرتووکە و نووسینی تر بگەڕێنمەوە.

خوێنەران دەتوانن لەوە دڵنیا بن کە تا لەتوانامدا بووبێت، بەوپەڕی پیشەییەوە باسم لە گفتوگۆی ترەمپ لەگەڵ سەرکردەکانی جیهان کردووە، هەمان شتیش بۆ گفتوگۆکانی خۆم. لە هەندێک شوێنیش خۆت دەتوانیت نیشانەی قسەی وەرگیراو بخەیتە سەر پارچە نووسینە دیاریکراوەکان؛ زۆر هەڵە نابێت. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە هیچ پێویستی نەدەکرد گۆڕانکاری لە گفتوگۆی نێوان ترەمپ و سەرکردەکان بکەم. ئەمە دەرخەری ئەوەیە پێداچوونەوەی دەقەکە لە بنچینەدا بە ئامانجی ئەوە بووە ببێتە بەربەست نەبادا سەرکردە بیانییەکان نکۆڵی لەوە بکەن کە ترەمپ پێی گوتوون. لەبری ئەوەی ئەوان قسە وەرگیراوەکان ڕەت

بکەنەوە، دەتوانن نکۆڵی لەو پارچە نووسینانە بکەن کە دارِشتنەوەیان بۆ کراوە. دەشێت لێکدانەوەی دیکەش هەبێت کە من درکم پی نەکردبێت. ڕەنگە ترەمپ کەمتر لە من ئەوەی ویستبێت.

کۆمەڵەی سەرەکی دووەم لەو سێ گۆڕانکارییە بریتی بووە لە زیادکردنی سێ ئەوەندەی تێبینییەکان لە پاشکۆدا. ئامانج لەم ڕێگەیە ئەوە بوو لایەنە نەرێنییەکان بسەلمێنم و نیشانی بدەم کە من پشتمم بە زانیارییە نهێنییەکان نەبەستووە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکنی دەقەکە. بەدڵنیاییەوە ئەو تێبینیانە بێزارکەر بوون، بەڵام هەر جارێک ئاماژەم بە شتێک کردبێت، لە سڕینەوەی زانیاریی گرنگ دووردەکەوتمەوە، ئەمە مامەڵەیەک بوو بە ئەنجامدانی دڵخۆش بووم. زۆرێک لە ڕەخنەگران پێیان وایە کە ڕێگەپێدانی پێشوەختەی حکوومەت پڕاوپڕە لە کەموکورتیی دەستووریی؛ ڕێگەی دروستکردنی ئاستەنگ و چاودێری، لە دەرهاویشتەکانی ئەو کەموکورتییانەیە، کە زیان بە گفتوگۆی بابەتی هەستیار و ڕەخنە و سیاسەتی گشتیش دەگەیەنێت. دەتوانیت ناوی منیش بخەیتە ڕیزی ئەو ڕەخنەگرانەوە، بە تایبەت کاتێک پرۆسەکە لە دەستی سەرۆک بێت و ئەوەندەش لە ڕەخنە ڕابکات، کە پەنا بۆ بیرۆکەی ڕەتکردنەوەی پەرتووك بە سروشتی وەربگرێت و ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بۆ بدات.

خاڵێکی تر کە شایانی ئاماژە بۆ کردنە و پەیوەستیش نییە بە پرۆسەی پێداچوونەوە و ڕێگەپێدان، بریتییە لە بیرۆکەی نووسینی پەرتووکی هاوشێوەی ئەمە دوای جێهێشتنی خزمەتی حکوومی. بەشێک لە ڕەخنەگران باوەڕیان وایە کە نەشیاوە هەموو شتێك لە دووتوێی پەرتووکێکدا ئاماژەی پێ بدرێت، بەپێی لێدوانەکانی ترەمپ خۆشی بێت، کارەکە ناپاکییە. من خۆشم لە نووسینی سەرنجێک لەسەر بیرەوەرییەکانی ڕۆبەرت گەیتس "ئەرک: یادنامەی جێگرێک لە جەنگدا" ئەو کێشانەم

باس کردووە، چونکە ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی گەیتس کرانەوە، هەمان ئەوانەن ئاراستەی منیش دەکرێن:

"ڕەخنەگرانی گەیتس دوو خاڵی بنچینەییان درکاندووە: یەکێکیان سیاسی و ئەوەی تریشیان ئاکارییە. یەکەم، ئەوان دەڵێن نەشیاو بووە لەسەر ئیدارەیەک بنووسێت کە هێشتا لە ئەرکدا بێت و جەنگی ئەفغانستان بەردەوام بێت (لایەنێکی سەرەکی پەرتووکەکە) و لە لایەکی تریش وەزیری دەرەوەی ئەوکات، هیلاری کلینتۆن سەرقاڵی بانگەشەی سەرۆکایەتییەکەی ساڵی ٢٠١٦ی خۆی بێت.

"دووەم، ئەوان دەڵێن گەیتس ناپاکی لە متمانەی سەرۆک ئۆباما کردووە، ئەمە جگە لە هاوپیشەکانیشی لە وەزارەتی بەرگری، کە گفتوگۆ و هەڵوێست و هەست و سۆزەکانیانی... درکاندووە.

"من باوەڕم وایە بەرپرسە باڵاکانی پێشوو ئەو ئەرکەیان لەسەر شانە کە ڕوونی بکەنەوە، ئەوکاتەی لە حکوومەت بوون، چییان کردووە... ئەوە ئاشکرایە کە جگە لە کارمەند و کاربەدەستەکانی پێشووی حکوومەت، ئەستەمە کەس تێبگات بارودۆخ چۆنە و چش ڕوودەدات! ڕاگەیاندن و دەقە مێژووییەکانیش زۆربەی کات بەرچاویان لەسەر کاروباری حکوومەت ڕوون نییە. بۆیە هەروەك گەیتس پێی وایە، بیرەوەرییەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن بۆ لادانی پەردە لەسەر ڕووداوەکان.

"پەیوەست بە کاتی بلاوکرانەوەی پەرتووکەکەی گەیتس، پێم وابێت ڕەخنەکان هەڵە و ناڕەوان. هیچ کاتێک لەو کاتە گونجاوتر نییە کە نووسەر کارەکەی جێ دەهێڵێت و ڕاستەوخۆ پەرتووکەکەی بنووسێت، چونکە هێشتا بیری تیژە و

یادەوەرییەکانی تازەن. ئەگەر ئەو کاتە بۆ ئیدارە بەردەوامەکان و هاوپیشە کۆنەکان نەگونجاوە، ئەمە کێشەی خۆیانە نەک کێشەی نووسەر. بە تایبەتیش ئەگەر بابەتەکە وەک ئەو ڕەخنانە بێت کە ئاراستەی باراک ئۆباما کراوە، ئەوا هەرگیز کاتێکی گونجاو نابێت بۆ بڵاو کردنەوە. بیهێنە پێش چاوتان کە ئەوانەی ئێستا ڕەخنە لە کاتی بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکەی گەیتس دەگرن، ئەو کاتە چییان دەگوت ئەگەر پەرتووکەکە لە ئەیلوولی ٢٠١٢ بڵاوبکرابایەوە.

"ڕەخنەکان لە گەیتس بێگومان لەسەر کاتن، لە بەرئەوەی پەرتووکەکەی بەر لە هەڵبژاردنەکەی ٢٠١٢ بڵاونەکردەوە، کە تێیدا لاوازیی تێگەیشتنی ئۆبامای تێدا ڕوون کرابووەوە لەسەر ئەفغانستان و لاوازیی دونیابینی و گرنگینەدان بە شەڕی تیرۆر. بۆ نموونە، بە بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکە، بە لایەنی کەم خوێنەران لە بیرکردنەوەی گەیتس دەگەیشتن لەو کاتەی لە کۆبوونەوەی ئاسایشی نەتەوەیی ئازاری ساڵی ٢٠١٢ لە ژووری هەڵمەتەکانی کۆشکی سپی بەشدار بووە و گوێبیستی فەرماندەی گشتی بووە؛ 'سەرۆک متمانەی بە فەرماندەکەی نییە، بەرگەی حەمید کارازای نەگرتووە، باوەڕی بە ستراتیژییەتە تایبەتەکەی نییە و جەنگەکەش بە هی خۆی نازانێت. بۆ ئەو (واتا بۆ ئۆباما)، هەموو شتێک لەوە قەتیس ببوو کە وڵاتەکەی لە (ئەفغانستان) دەربچێت".

"پرسیارە قورستر و گرنگترەکە ئەوەیە: ئەگەر گەیتس سەرپێچی لە متمانەی ناڕاستەوخۆی سەرۆک و هاوپیشە باڵاکانی کردبێت. لە هەندێک لایەن، ئەو ڕەخنەیە هاوتەریبە لەگەڵ پاساوی 'مافی پاسایی' بە تایبەت بەوەی دەبێت سەرۆک ڕاوێژ لە بەرپرسەکانی خوارووتری وەربگرێت و ئەو بێلایەنییەش هیچ بەهایەکی نابێت، ئەگەر خەڵکی دوای ڕووداوەکان و گۆڕانکارییە ئیدارییەکان

لەسەر ڕووداوەکان بخوێننەوە.

"بە لەبەرچاوگرتنی ڕوونی و ئاشکرایی، بڕیاردان لە لایەن لایەنی جێبەجێکار لە هەموو لایەکەوە دەکەوێتە بەر تانە و تەشەر، ئەمە بابەتێکی بچووک نییە کە ئەو کەسانەی ڕاوێژ پێشەکەش بە سەرۆک دەکەن بێبڕیار و بێدەسەلات بن و ڕاستەوخۆ کاری خۆیان ئەنجام نەدەن.

"پێوەری نموونەیی بوونی لایەنی جێبەجێکار تەنیا بە ڕواڵەتە. کەڵکەبوونی ئەو هەموو مێژوو و کاتە هەڕەشەیە لەسەر نموونەییبوونی جێبەجێکردن. لە سەردەمی 'ئەلیکساندەر هاملتۆن' و 'تۆماس جێفەرسۆن'ەوە زانیارییەکان لە نیوەخۆی ئیدارەکانی ئەمریکاوە دزەیان پێ دەکرێت، ئەو کات ئەم دوو کەسایەتییە لە بانگەشەکانیاندا لە ڕۆژنامەکانەوە دژایەتیی یەکتریان دەکرد. سەرۆك واشنتۆن، بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەمەی تێپەڕاند.

پاساوی ڕاستەقینەی لایەنی جێبەجێکار، بەرگرییە لە بەرامبەر دەستێوەردانەکانی کۆنگرێس یان لایەنی دادگەری، بۆیەش لێکدانەوەکانی لە پێشبینیی ئاسایی جیاوازن، چونکە متمانەکان تا سەر نین. مەگەر زانیارییەکان بچنە ژێر باری یاسای پاراستنی زانیاریی نهێنی، کە ئەمە مەرجە و کێشە نییە، بەڵام لە سایەی ئەم مقۆمقۆیەدا، سیاسییە کامڵەکان وا تێدەگەن کە ئەوان بەردەوام لەسەر سەکۆی ڕووداوەکانن. دواتر هیچ یاسایەکی ئۆمێرتا (یاسای بێدەنگیی ئەندامێتی مافیاکان) لە سیاسەتدا نییە، مەگەر لە شیکاگۆ."

من تا ئەمڕۆش هەر لەسەر ئەو بۆچوونانەی خۆمم.



٢٩ی ئازاری ٢٠١٨، لەبەردەم ژووری پێشوازیی پنتاگۆن لەگەڵ ماتیس بۆ یەکەمین کۆبوونەوە. ١٠ ڕۆژ بەر لە دەستپێکردنی کارەکەم وەک ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی.



٢ی ئایاری ٢٠١٨، کاتە خۆشەکانی بەر لە سوێندخواردنی مایک پۆمپەیۆ وەک وەزیری دەرەوە، وەزارەتی دەرەوە، واشنتۆن.



١٠ی حوزەیرانی ٢٠١٨، کۆبوونەوەی لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی حەوت لە کەنەدا، ئەو کۆبوونەوەیەی ئەوروپییەکان کۆنترۆڵیان کردبوو و چواردەوری "ترەمپ"یان دابوو. دەرکەوت کە کاتێکی باش نەبوو بۆ هاوپەیمانێتیی ڕۆژئاوایی.



٢٢ی حوزەیرانی ٢٠١٨ لە شوێنی مانەوەی باڵیۆزی ئوردن لە واشنتۆن، بەر لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ ترەمپ سەبارەت بە قەیرانی سوریا و هاوکاریی ڕژێمی ئێران بۆ ڕژێمەکەی ئەسەد، چاوم بە شا عەبدوڵلا کەوت.



٢٧ حوزەیرانی ٢٠١٨، چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ڕووسیا "سێرگێی لاڤرۆڤ" بەمەبەستی خواردنی ژەمی نیوەڕۆ لە کۆشکی ئۆبسۆبنیاک لە مۆسکۆ، وەک بەشێك لە ئامادەکارییەکان بۆ کۆبوونەوەی نێوان ترەمپ-پوتین لە هێلسنکی.



٢١ی ئابی ٢٠١٨، دانانی تاجە گوڵینە لەسەر مۆنۆمێنتی یادڤەشیم لە ئۆرشەلیم-ئیسرائیل، شوێنێکی تایبەت و نەریتی بۆ شاند و سەردانیکارە باڵاکان.



٢٣ی ئابی ٢٠١٨، لە چوارچێوەی شاندی ئەمریکا لە ژنێف بۆ یەکەمین جار چاوم بە هاوتا ڕووسییەکەم "نیکۆلاس پاتروشێڤ" کەوت، قسەمان لەسەر پرسی دەستێوەردانەکانی ڕووسیا لە هەڵبژاردنەکان کرد.



٢٣ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٨، لە کرێملین- مۆسکۆ، سەرۆکی ڕووسیا "ڤلادیمێر پوتین" بۆ دووەم کۆبوونەوە پێشوازیم لێ دەکات، ئەوکات پوتین بە پێکەنینەوە هەندێ شتی گوت، یەکێك لەوانەش ئەوە بوو کە گوتی: ئەگەر ئەمریکا چەک بە سعودیە نەفرۆشێ، ئێمە وەك ڕووسیا پێیان دەفرۆشین. فیۆنا هێڵ بەڕێوەبەری باڵا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تەماشا دەکات. ئەی پی. فۆتۆ: ئەلێگزاندەر



٣٠ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٨، من و پۆمپەیۆ چاوەڕوانی ترەمپ دەکەین، کە وەک هەر جارێکی دی دواکەوتووە، بە نیازی ڕووکردنە لووتکەی وڵاتانی کۆمەڵەی ٢٠ لە بۆینس ئایرێس، لە ئەرژەنتین، لەو کاتەی پەیوەندییەکانمان لە گەڵ ڕووسیا گرژ بوون، بەهۆی دەستبەسەرداگرتنی کەشتییەکانی ئۆکرانیا لە دوورگەی کریێج.



٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٨، خاڵێکی وەرچەرخان لە بڕیارەکانی ترەمپ سەبارەت بە سووریا: لە بنکەی سەربازیی عەین ئەسەد، لە لایەن فەرمانندە سەربازییەکانی ئەمریکاوە زانیاریمان پێ دەدرێت. ئەی پی. فۆتۆ: ئەندرو هارنیک




٢٦ی کـانوونی یەکەمـی ٢٠١٨، دوای ئەوەی عـادل عەبدولمەهـدی، سەرۆك وەزیرانی عێراق ڕەتی کردەوە لە بنکەی عەین ئەسەد چاوی بە ترەمپ بکەوێت، ترەمپ بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ دەکات.



٢٨ی شـوباتی ٢٠١٩، دوایـین کۆبـوونەوەی لـووتکەی هـانۆی لە نیـوان ئەمریکا و کۆریای باکوور؛ ئەو کۆبـوونەوەیەی ترەمپ بەبێ ڕێککەوتـن، گەڕایەوە. ئەی پی. فۆتۆ: ئیڤان ڤوچی



٢٣ی ئــازار، هەردەم وەک ئەزموونێــک دەمێنێتەوە، ژمــارەیەک ڕۆژنـامەنووس هاوگەشتمن و بە فـڕۆکەی سـەربازی بـۆ چەنـد وڵاتێکـی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەچین. سارا تینسلی



١١ی نیسانی ٢٠١٩، کۆبوونەوەی ترەمپ لەگەڵ سەرۆکی کۆریای باشوور "موون جای ئین"، بە نیازی قسەکردن لەسەر ئەوەی لە داهاتوودا چی بکرێت، سەبارەت بە مووشەکی بالیستی و بەرنامەی ناوکیی کۆریای باکوور، ئەمەش دوای دوو لووتکەی شکستخواردوو لەگەڵ کیم جۆنگ ئون.




١٧ی نیسانی ٢٠١٩، لە کۆرال گابلێز، فلۆریدا، جۆنی لۆپێز دێ لاکروز، سەرۆکی سەندیکای هێزی بێی ئۆف پیگزی خانەنشینان، ٢٠٥٦ زانیارم لەسەر ساڵیادەکانی سەندیکاکە پێ دەدات، کە تراژیدیانە شکستیان هێنا لە کۆتاییهێنان بە ڕژێمەکەی کاسترۆ. ئەی پی. فۆتۆ: ویلفرێد لی



ای حوزەیرانی ٢٠١٩، دوای ڕۆژێکی تاڵ بۆ ڤەنزوێلا، لە دەرەوەی باڵی چەپی کۆشکی سپی، شیکردنەوە بە ڕاگەیاندنەکان دەدەم لەسەر ئەوەی بەرهەڵستکارەکان چەند لەوە نزیک بوونەوە کە ڕژێمەکەی مادورۆ لە کار لابدەن.



٥ی حوزەیرانی ٢٠١٩ لە پۆرتس ماوس، ئینگلتەرا لە ٧٥ەمین ساڵیادی دەستپێکی "د-دێی"، بەڕێکەوتنی کەشتیی هاوپەیمانان، ئارمادا. ترەمپ چاوی بە جەنگاوەرانی کۆنی ئەمریکی و خانەوادەکانیان دەکەوێ.



٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١٩، بە هەلیکۆپتەر بەرەو دۆڵی ئوردن لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل بنیامین ناتەنیاهۆ، لە لای چەپ ڤیکتوریا کۆوتس، بەڕێوەبەری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئەی پی. فۆتۆ: ئابیر سوڵتان، ئێپا پوول، لە ڕێگەی ئەی پی



٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١٩، بیبی منی لەگەڵ خۆی برد بۆ گەشتێک و ڕوونکردنەوەی گرنگیی ستراتیژی دۆڵی ئوردن. لێرە، لە خاڵێکی پارێزراوی ئیسرائیلەوە تەماشای بەرزاییەکانی کەرتی ڕۆژئاوا دەکەین.



١٠ی ئەیلوول، لە دەرەوەی باڵی چەپ، لە ڕێگەی مۆبایلی کەسیی خۆمەوە (کە ئاسایی لە کاتی کاری پیشەیی و بەدرێژایی ڕۆژ لە سندووقێکدا هەڵمدەگرت) قسە لەگەڵ کچەکەم دەکەم و بۆی ڕوون دەکەمەوە کە دەست لە کار دەکێشمەوە.




خۆبەدەستەوەدان بژاردە نییە


فۆتۆ: فیلیپ بێرمینگهەم

## لەبارەی نووسەر

جۆن بۆڵتن، ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆک دۆنالد ترەمپ. لە نێوان سالانی ۲۰۰۵-۲۰۰٦ وەک بالیۆزی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان خزمەتی کردووە.

سالانێکی زۆری لە خزمەتی گشتیدا بەسەر بردووە و لە ئیدارەکانی هەریەکە لە سەرۆکەکانی ئەمریکا: "ڕۆناڵد ڕەیگان"، "جۆرج ئێچ دەبلیو بوش"، "جۆرج دەبلیو بوش" کاری کردووە.

بالیۆز بۆڵتن پارێزەریشە، لە سالی 1974 تا ۲۰۱۸ لە واشنتۆن دی سی کاری تایبەتی ئەنجام داوە، ئەمە جگە لەو کاتەشی کە لە خزمەتی گشتیی حکوومەت کاری کردووە.

بالیۆز بۆڵتن لە سالی ۱۹٤۸ لە بالتیمۆر لەدایک بووە.

یەکەمین پەرتووکی بە ناونیشانی "خۆبەدەستەوەدان بژاردە نییە" چاپ کردووە.

بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی یێیل بەدەست هێناوە و دکتۆرای یاسای لە کۆلێژی/ قوتابخانەی یاسای زانکۆ یێیل بەدەست هێناوە.

ئێستا لە بێتێسدا، لە میریلاند ژیان بەسەر دەبات.

<u>جۆن بۆڵتن ئەمانەشی هەن:</u>

-خۆبەدەستەوەدان بژاردە نییە: بەرگریکردن لە ئەمریکا لە نێو نەتەوە یەکگرتووەکان.

- باراک ئۆباما چۆن سەروەریی نیشتمانیمان دەخاتە ژێر هەڕەشەوە.

# ئیندێکس

## ت

## چ





## ث



## ج

## ح



## خ



## د

## ڕ



## ز



## ژ



## س



## ڕ



## ر

## ق



## ك



## ڤ

## گ

## م



## گ



## ل

## ئ



## ی



## ئ



## ی



## ئ



## ی





## و

## ئ



## ئ



## ی



## ئ



## ی



## ئ



## ی

## ی



## ئ



## ی



## ئ

## ی



## ئ




ترەمپ گوتیشی: "ئێمە نامانەوێ لە شەڕێکی نێوخۆیی تێوە بگلێین، تورکیا و کوردەکان دوژمنی سروشتیی یەکترن. تورك و کوردەکان ماوەی چەند ساڵێکە لە دژی یەکتر شەڕ بەرپادەکەن. ئێمە تێکەڵ بەو شەڕە نێوخۆییە نابین. بەڵام ئێمە کۆتایی بە داعش دەهێنین."

* * *

من ساڵانێکە سەیری پێشکەوتنەکانی چین دەکەم و وادەبینم کە هەموو ئەوانە هەڕەشەن لەسەر ستراتیژیەتی قووڵی ئەمریکا.

* * *

ترەمپ نە کەیفی بە ماکرۆن دەهات نە بە ترودۆ، بەڵام بەرگەی دەگرتن و جاروباریش لە گفتوگۆکاندا بەرکەوتنی لەگەڵدا دروست دەکردن.

* * *

زۆر بێزار بووم لەو شەیداییەی ترەمپ بۆ دیداری کیم جۆنگ ئوون هەیبوو.

* * *

ترەمپ گوتی کە ئەمریکا پێشتر لەلایەن گەمژەکانەوە بەڕێوە دەبرا، بەڵام بۆ لەمەودوا وا نابێ.

* * *

بەڵام ترەمپ لە قسەکردن بەردەوام بوو، ئەوجارە لەبارەی سووریا گوتی: "من تێناگەم بۆچی ئێمە داعشەکان لە سووریا دەکوژین؟! بۆچی ڕووسیا یان ئێران ئەمە ناکەن؟! ماوەیەکی زۆرە ئەو یارییە دەکەین. بۆچی ئێمە لەبەر خاتری ڕووسیا، ئێران و عێراق داعشەکان بکوژین؟."!

* * *

ترەمپ ناوی زاڵمای خەلیلزادی هێنا و گوتی: "گوێم لێ بووە دەڵێن کە ئەو پیاوێکی ساختەچییە، هەرچەندە بۆ ئەم بابەتەش پێویستت بە پیاوێکی ساختەچی دەبێت."

* * *






دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 775 7176
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication